# فقه السنة

## بەکوردی

سید سابق

وەرگێڕانی

حەمەئەمین ئەحمەد بەرزنجی

پێشەکی و تعلیق

محمد ناصر الدین الالباني

تمام المنة في تعليق علي فقه السنة

شەهید حەسەن بەننا پێشەکی بۆ نوسیوە

تاوانەکان

ئاشتی لە ئیسلامدا

کڕین و فرۆشتن

دادوەری

فقه السنة

چاپی سێیەم

٢٠١٣

# فقه السنة

## بەکوردی

### سید سابق

### وەرگێڕانی

حەمەئەمین ئەحمەد بەرزنجی

### پێشەکی و تعلیق

محمد ناصرالدین الالباني

تمام المنة في تعليق علي فقه السنة

شەهید حەسەن بەننا پێشەکی بۆ نوسیوە

بەرگی سێیەم


چاپی سێهەم

٢٠١٣

بسم الله الرحمن الرحيم


## ناسنامەی کتێب

- ناوی کتێب : فقه السنة بە کوردی
- نـوسـیـنـی : سید سابق
- وەرگـێڕنی : حەمەئەمین ئەحمەد بەرزنجی
- نۆرەی چاپ: سێیەم ٢٠١٣
- تیراژ : ٢٠٠٠ دەورە

لەبەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (٧٧٤)ی ساڵی ٢٠٠٧ ی پێدراوە

**ناوەندی ڕۆشنبیر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

## تۆڵەی تۆمەت هەڵبەستن (القذف)

ئەسڵی (قذف) تێ‌گرتنی بەردو شتی ترە. وە لەوەوەیە فەرمودەی خوای گەورە بە دایکی موسا (علیه السلام).

(أنِ اقْذِفِيهِ فِي التَّابُوتِ فَاقْذِفِيهِ فِي الْيَمِّ)(طـه: من الآية٣٩).

واتە: منداڵەکە هەڵدەرە ناو تابوتێك، پاشان تابوتەکە هەڵدەرە ناو ڕوبارەکەوە.

(قـذف) ی زینـاش لـەوەوە وەرگـیراوە. وە لێـرەدا واتـا شـەرعیەکەی مەبەسـتە، کـە ئـەویش هاویشتنی تاوانی زینایە بۆ کەسێك و تۆمەتبار کردنی‌یەتی بە زینا.

(٢)حەرامێتی (قذف):

ئامانجی ئیسلام پاراستنی عەرز و ناموسی خەڵکە و پارێزگاری کردنی سومعە و کەرامەتیانـە، وە لەبەر ئەوە ئیسلام زمانی خراپە گۆیان ئەبڕێ و دەرگا لەسەر ئەوانە ئەبەستێ کە ئەیانەوێ پاك و بێ گوناهان عەیبەدار بکەن، وە ڕێ لەو دەرون لاوازانە ئەگرێ کە ئەیانەوێ هەستی خەڵکی بریندار بکەن و دەم بدەن لە ناموسیانەوە، وە زۆر بە توندی ڕێگری ئەکات لە بڵاوکردنەوەی ئـەو تاوانـە لـە ناو ئەوانەدا کە بڕوایان هێناوە هەتا ژیان پاکژ بکرێتەوە لە دزە کردنی ئەم شەڕە بۆ ناوی.

هەر بۆیە ئیسلام تاوان دانە پاڵ خەڵك (قذف) بە توندی حەرام ئەکات و ئەیکات بە یـەکێك لـە گوناهە گەورەکان، وە لەسەر تۆمەت چی هەشتا دار پێویست ئـەکات، ژن بێـت یـا پیـاو، وە ئـیتر هەرگیز شایەتی لێ وەرناگیرێ‌و حـوکم ئـەدرێ لـە سـەری بـە فاسـقیەتی و نـەفرین و دەرکـردن لـە ڕەحمەت و بەزەیی خوا، وە بە شایستە بوونی سزایەکی دەردناك لە دونیا و ڕۆژی دوایی‌دا.

مەگەر ئەو کەسە ڕاستی قسەکەی بسەلمێ و سـابت ببـێ بـەو بەڵگانـەی کـە گومـان ڕێیـان پـێ نەبات. ئەویش شایەتی‌دانی چوار شایەتە کە ئەو کەسـەی تاوانەکـەی دراوتـە پـاڵ کەوتۆتـە نـاو ئـەو فاحیشەیەوە.

خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَداً وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ، إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ (النور:٤-٥).

واتە: وە ئەو کەسانەی تاوانی داوێن پیسی ئەدەنە پاڵ مرۆڤە پاکەکان، پاشان چوار شایەت نـاهێنن

لەسەر ڕاستی قسەکەیان، هەشتا دارییان لێبدەن و هەرگیز شایەتییان لێ وەرمەگرن. وە ئەوانە دەرچون لە فەرمانی خواو (فاسقن). مەگەر کەسانێك کە پەشیمان ببنەوەو تۆبە بکەن و دووای ئەوە خۆیان چاك بکەن، کە خوا بەڕاستی لێ خۆشبو و میهرەبانە.

وە هەروەها فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلاتِ الْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ، يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ، يَوْمَئِذٍ يُوَفِّيهِمُ اللَّهُ دِينَهُمُ الْحَقَّ وَيَعْلَمُونَ أَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ الْمُبِينُ﴾ (النور:٢٣-٢٥)

واتە: بەڕاستی ئەو کەسانەی تاوانی داوێن پیسی ئەدەنە پاڵ ئافرەتانی داوێن پاکی بێ ئاگای باوەڕدار، دەرکراون لە ڕەحم و بەزەیی خوا لە دونیاو ڕۆژی دوایی‌دا، وە سزایەکی گەورەشیان بۆ هەیە لە ئاگری جەهەننەمدا، لەو ڕۆژەدا کە زمان و دەست و قاچیان شایەتی ئەدەن بەوەی کە وتویانەو کردویانە. ئەو ڕۆژە خوای گەورە جەزای تەواویان ئەداتەوە لەسەر کردەوەکانیان بە عەدل، وە بۆیان دەرئەکەوێ کە بەڕاستی هەر خوا حەق و ئاشکرایە.

وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَنْ تَشِيعَ الْفَاحِشَةُ فِي الَّذِينَ آمَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لا تَعْلَمُونَ﴾ (النور:١٩).

واتە: بەڕاستی ئەو کەسانەی کە حەز ئەکەن فاحیشە لەناو موسوڵمانانندا بڵاو ببێتەوە سزایەکی پڕ ئازاریان بۆ هەیە، لە دنیادا سزای تۆمەت هەڵبەستن و لە ڕۆژی دوایشدا سزای ئاگر ئەگەر تۆبە نەکەن، وە هەر خوا درۆکەیان ئەزانێ، و ئێوە نایزانن.

وە بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (إجْتنبوا السبع الموبقات. قالوا: و ماهن یا رسول الله؟ قال: الشرك بالله، و السحر، و قتل النفس التي حرم الله، وأكل الربا، وأكل مال اليتيم، والتولي يوم الزحف وقذف المحصنات المؤمنات الغافلات)[1].

واتە: خۆتان لە حەوت لەناوبەرەکان دووربخەنەوە. ووتیان: ئەوانە چین ئەی نێرراوی خوا؟ فەرمووی: هاوبەش بۆ خوا پەیداکردن، جادوو، کوشتنی ئەو گیانەی خوا حەرامی کردووە، سوود (ربا) خواردن، خواردنی ماڵی هەتیو، وە هەڵهاتن لەکاتی پێشڕەوی سوپادا، وە تاوانی داوێن پیسی دانە پاڵ ئافرەتانی داوێن پاکی باوەڕداری بێئاگا.

وە قەدەغە کردنی ئەو کارەش کە ئایەتی بۆ هاتە خوارەوە بە هۆی ئەو ڕووداوەوە بوو کە تووشی عائیشە بوو خوا لێی ڕازی بێت فەرموویەتی:

---

(١) البخاري (٢٧٦٦) ومسلم (٨٩).

کاتێ بەهانەکەم هاتە خوارەوە. پێغەمبەر (ﷺ) چووە سەر دوانگە، باسی کرد و ئایەتەکانی خوێندەوە. کاتێ لە دوانگەکە هاتە خوارەوە فەرمانی دا دوو پیاو و ژنەکەیان دارکاری کرد کە حەسسان و میسطەح و حەمنە بوون، ئەبوداود گێڕاویەتیەوە[1].

ئەوەی بە مەرج گیاوە لە (قذف) تۆمەت هەڵبەستندا:

بۆ تۆمەت هەڵبەستن چەند مەرج هەیە کە ئەبێت بێن، هەتا ئەو تاوانە وەهابێت شایستەی سزای دارکاری بێت.

جا ئەو مەرجانەش هەندێکیان ئەبێ لە تۆمەت چیەکدا هەبێت، وە هەندێکیان لەو کەسەدا بێت کە تۆمەتەکەی بۆ هەڵئەبستێ، وە هەندێکیان لەو تاوانەدابێ کە بۆی هەڵئەبستێ.

مەرجەکانی تۆمەت چی (قاذف):

وە ئەو مەرجانەی پێویستە لە تۆمەت چیەکدا بێن ئەمانەن:

١- ژیری.

٢- پێ‌گەشتن (بلوغ).

٣- ئارەزوو (اختیار).

چونکە ئەمانە بناغەی تەکلیفن، وە بەبێ ئەمانە تەکلیف نیە. ئەگەر شێتێك یا منداڵێك یا کەسێك کە زۆری لێکرابێت تاوانی داوێن پیسی بگرێتە کەسێك تۆڵەی لەسەر نابێت، بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی: (رُفِعَ القلم عن ثلاث: عن النائِم حتى يستيقظ و عن الصبي حتى يحتلم، و عن المجنون حتى يفيق)[2].

واتە: پێنوس لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە: لەسەر نوستو هەتا هەڵئەسێت، وە لەسەر منداڵ هەتا پێ‌ئەگات و بالغ ئەبێ، وە لەسەر شێت هەتا هۆش ئەکاتەوە. فەرموویەتی:

(رفع عن أمتي الخطأ و النسيان، وما استكرهوا عليه)[3].

واتە: هەڵە و لەبیرچوون و ئەوەی بە زۆر پێیان بکرێ لەسەر نەتەوەی من لابراوە.

---

(١) أبوداود (٤٤٧٤).

(٢) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابووررد.

(٣) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابووررد.

جا ئەگەر منداڵەکە موراهیق (هەرزەکار) بوو بە شێوەیەك تۆمەت هەڵبستنەکەی ئازاری ئەگەیاند ئەوە ئەبێ تەمێ یەکی گونجاو بکرێت.

ئەو مەرجانەی کە ئەبێت لەو کەسەدا بێت کە تۆمەتەکەی بۆ هەڵئەبستێ ئەمانەن:

١- ژیری و عەقڵ: چونکە تۆڵە دانراوە بۆ هەرەشەو تەریق کردنەوە لە بریتی ئەو زیانە کەمەی کە توشی تۆمەت تێگیراوەکە ئەبێت جا کەسێك ئاوەزدار نەبێت زیانی پێ ناگات بەو قسەیە کەواتە تۆمەت چی یەکە تۆڵەی لێ ناسەندرێ.

٢- پێ گەیشتوو بێ (بلوغ): وە هەروەها بە مەرج گیراوە لەو کەسەدا کە تۆمەتەکە ئەدرێتە پاڵی کە پێ گەیشتو بێت، چونکە کەسێك تاوان بداتە پاڵ منداڵی کوڕ و کچ حەددی لەسەر نابێت.

وە ئەگەر کەسێك تۆمەتی زینای دایە پاڵ کچێکی منداڵ کە بتوانرێ چوونە لای بکرێ، جەماوەری زانایان وتویانە: ئەوە (قذف) نیە کەواتە حەددی لەسەر نابێت، بەڵام ئەبێت تەمێ بکرێت.

مالیك وتویەتی: ئەو کارە (قذف)ە ئەبێ بکەرەکەی تۆڵەی لێ بسەندرێ،

وە ئیبنو عەرەبی وتویەتی: ئەم کێشەیە گومانیشی لێ ئەکرێ -بەڵام مالیك عەرزو ئابڕوی تۆمەتبار کراوەکەی سەرخستوە، وە زانایانی تر پاراستنی پشتی (قاذف) تۆمەت چی یەکە، ڕیعایەت ئەکەن، وە پاراستنی عەرز و ئابڕوی (مقذوف) تۆمەت بۆ هەڵبەستراوەکە لەپێشترە، چونکە تۆمەت چی حەیاو ئابڕوی هەڵداوەتەوە بە زمانی، لەبەرئەوە پێویستە تۆڵەی لێبسەندرێ،

وە ئیبنو مونذیر وتویەتی: ئەحمەد دەربارەی کچێکی نۆ ساڵە وتویەتی: ئەو کەسەی کە تاوانی زینای تێ ئەگرێو تۆمەت باری ئەکات داری حەددی لێ ئەدرێ، هەروەهایە کوڕیش ئەگەر پێ گەیشتبو.

وە ئیسحاق وتویەتی: ئەگەر منداڵێك کە وێنەی ئەو بتوانێ بچێتە لای ئافرەت تاوانی زینای دایە پاڵ کەسێك ئەوە حەددی لەسەرە. وە کچیش کە لە نۆ ساڵانە تێپەڕی وەك ئەوە.

وە ئیبنو مونذیر وتویەتی: کەسێك کەسێکی پێ نەگەیشتووی قذف کرد تۆڵەی لێ ناسەندرێ، چونکە ئەو قسەیە درۆیە، بەڵام تەمێ ئەکرێو سزا ئەدرێ لەبەر ئازاری قسەکە.

٣- ئیسلامەتی: ئیسلامەتیش مەرجە لە تۆمەتبار کراوەکەدا. چونکە ئەگەر (مقذوف) تۆمەتبار کراو جگە لە موسوڵمانان بێت تۆڵە بۆ تۆمەت چی یەکەی بڕیار نەدراوە لای جەماوەری زانایان، بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەوە بوو گاورێك یا جولەکەیەك تاوانی گرتە موسڵمانێکی ئازاد ئەوە چی لەسەر موسڵمانە ئەوەش لەسەر ئەوە: کە هەشتا دارە لە پشتی.

٤- ئازادی: هەروەها مەرجە کە (مقذوف)ەکە ئازاد بێ چونکە ئەگەر کۆیلە بێت ئەوە (قاذف) تۆمەت چی حەددی لێ نادرێ، ئیتر یەکسانە کۆیلەکە موڵکی (قاذف) بێت یا موڵکی کەسێکی تر بێت، چونکە پلەی کۆیلە جیاوازە لە پلەی ئازاد، هەرچەندە (قذف) کردنی کۆیلە لە لایەن ئازادەوە حەرامە، بەپێی ئەوەی بوخاری و موسلیم گێراویانەتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (من قذف مملوكه بالزنا أقيم عليه الحد يوم القيامة، إلا أن يكون كما قال).

واتە: هەرکەس تاوانی زینای گرتە بەندەکەی خۆی، ڕۆژی دوایی حەددی لەسەر بەجێ دێت، مەگەر قسەکەی ڕاست بێت.

زانایان وتویانە: بۆیە لە ڕۆژی دواییدا تۆڵەی لێ ئەدرێ چونکە لەو ڕۆژەدا خاوەنیەتی لائەچێت ئەوکاتە گەورەو بەرەو خوارو بەندە و ئازاد وەك و یەك ئەبن، وە کەس فەزڵی نابێت بەسەر کەسدا مەگەر بە تەقوا نەبێت. جا کەوابو خەڵکی هەموو هاوتا ئەبن لە حەددەکانا وە لە ڕێزو حورمەتدا، وە تۆڵە لەهەموو کەس ئەسەندرێ بۆ ئەوی تریان، مەگەر ستەم لێکراوەکە لێی ببورێ.

وە بۆیە لەدنیادا بە هاوتا دانەنراون تاوەکو کەس خۆنەگەیەنێتە ئیش و کاری خەڵك و نێوان گەورەو بەندەی بشێوێنێ، ئیتر خاوەن بەندەکان ڕێزیان نەمێنێ وهیچ پایەیەکیان بۆ دانەنێ و سوودی بەندایەتی لابچێت.

وە هەرکەس تاوان بگرێتە کەسێك وا بزانێ بەندەیە کەچی لە دووایی دەرکەوێ کە بەندە نییەو ئازادە ئەوە حەددی لەسەرە، ئەوەش هەڵبژاردەی ئیبنو مونذیرە، وە حەسەنی بەصری وتویەتی: تۆڵەی لەسەر نییە.

بەڵام ئیبنو حەزم ڕای جیاوازە لەگەڵ ئەوەدا کە جومهوری زانایان بۆی چون، ئەو ڕای وایە کەسێك تۆمەتی زینا بداتە پاڵ بەندەیەکیش ئەبێ تۆڵەی لەسەر بەجێ بهێنرێ. چونکە لەم ڕووەوە جیاوازی لە نێوان بەندەو سەروەردا نییە. وتویەتی: ئەوەی کە وتویانە بەندەو کەنیزەك حورمەتی بۆ نییە قسەیەکی سەخیفە. وە ئیماندار حورمەتێکی گەورەی هەیە

وە لەوانەیە بەندەیەکی بێ ماڵ چاکتر بێت لە خەلیفەیەکی قوڕەیشی لای خوا. وە ئەم ڕایەی ئیبنو حەزم ڕایەکی بەرز و حەقە، ئەگەر بەرامبەر دەقەکانی پێش و ونەوستایە.

٥-داوێن پاکی: ئەویش پاکیەتییە لەو (فاحشة) داوێن پیسیەی کە دراوەتە پاڵی، جا پاك بێ لە شتی تریشدا یان نا یەکسانە. تەنانەت ئەگەر کەسێك زینای کردبوو لە سەرەتای پێگەیشتنییەوە لەپاشاندا تۆبەی کردبێ و چاك بوویێت و تەمەنی بردبێتە سەر، ئینجا کەسێك

تۆمەتی تێبگرێ، ئەوە تۆڵەی لەسەر نابێت. هەرچەندە ئەو كارە سەرزەنشت و تەمێ كردن پێویست ئەكات، چونكە شتێكی بڵاوكردۆتەوە كە پێویست بوو داپۆشرابەو بشاررایەتەوە.

ئەو مەرجانەی پێوستە لەو تۆمەتەدا هەبێ كە پێی تاوانبار كراوە :

وە ئەوەی پێویستە لە تۆمەتەكەدا هەبێت، ئەوەیە بە صەراحەت باسی زینا كرابێت یان بە ئیشارەتێكی ئاشكراو دیار، ئیتر قسەو نوسین لەمەدا یەكسانە.

نمونەی صەراحەت ئەوەیە: كە ڕو بكاتە كەسێك و بڵێ: ئەی زیناكەر، یا قسەیەك بڵێ كە جێگەی ئەو قسەیە بگرێتەوە، وەك ئەوەی نەسەبی لاببات و بڵێ لە باوكی خۆت نەبووی.

وە نمونەی ئیشارەت وەك ئەوەی كەسێك بە كەسێك بڵێت: (نە من زیناكەرم نە دایكم) واتە مـن وەك تۆ نیم.

وە زانایان جیاوازییان هەیە لە ئیشارەتدا:

مالیك وتویەتی: ئیشارەتی دیار وەك صەراحەت وەهایە، چونكە جاری واهەیە (كنایـة) قسەی نائاشكرا – بە پێی عادەت و بەكار هێنان- ئەچێتە جێی دان پیانان بە صەراحەت. با زاراوەكـەش لە شوێنی خۆیدا بەكار نەیەت. وە عومەریش خوای لێ ڕازی بێت ئەو بۆچوونەی گرتوە.

مالیك ڕیوایەتی كردوە لە عەمرەی كچی (عبدالرحمن)ەوە:

كە «دوو پیاو لە سەردەمی عومەردا جوێنیان بە یەك ئەدا یـەكێكیان بەوی تریانی ووت: «بە خوا من نە باوكم زینای كردووە نە دایكم».

عومەر ڕاوێژی كرد لەو بارەیەوە.

یەكێك ئەی ووت: مەدحی دایك و باوكی خۆی كردووە.

ئەوانی تر ئەیان ووت: ئەبوایە بە شێوەیەكی تر مەدحی بكردایە. ئێمە ڕامان وایـە داری حەددی لێ بدە، عومەریش هەشتا داری لێدا».

وە ئیبنو مەسعود و ئەبو حەنیفە و شافیعی و ثەوری و ئیبنو ئەبی لەیلا و ئیبنو حەزم و شیعە و ڕیوایەتێك لە ئەحمەدەوە بۆ ئەوە چون كە ئیشارەو قسەی ناڕاستەوخۆ حەد پێویست ناكات.

چونكە ئیشارەت (إحتمال) لەوانەیەی تێدایـە، وە لەوانەیـەش شوبهەیە. وە حەددەكان بـەهۆی شوبهەوە لائەچن.

بەڵام ئەبو حەنیفە و شافیعی ڕایان وایە كە ئەبێ ئەو كەسە تەمێ و سەرزەنشت بكرێت.

خاوەنی (الرَّوضَةُ النَّدِيَّة) ڕووی ڕاستی لەمەدا دەرخستووە و وتوویەتی: ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە کە مەبەست لە تۆمەتبارکردنی ئافرەتانی داوێن پـاك کـە لـە کتێبەکـەی خـوای گـەورەدا بـاس کـراوە ئەوەیە کە (قاذف) تۆمەت چی زاراوەیەك بهێنێ بەڵگە بێت —لە لۆغەتدا یـا لـە شـەرعدا یـا لـە عادەتدا- لەسەر تۆمەتبار کردن بە زینا، وە لە حاڵەتەکەدا نیـشانەیەك هـەبێ ئـەوە بگەیـەنێ کە قسەکەر تەنها مەبەستی ئەوە بووە، وە لێکدانەوەیەکی واشی نەهێنا کە قەبوڵ بکرێت و ڕاست بێ کە قسەکە ئەویش بگرێتەوە، ئەوە بێ‌گومان (قاذف) تۆڵەی قەذفـی لێ ئـەدرێ. وە هـەروەها ئەگـەر لەفزێکی هێنا ئیحتیمالی زیناى نەبوو، یا ئیحتیمالێکی لاوازی هەبوو، بەڵام خۆی دانی بەوەدا نـا کە مەبەستی تاوانبار کردنی ئەو کەسە بووە بە زینا، ئەوە ئەو کەسە تۆڵەی لەسەر پێویست ئەبێت.

بەڵام ئەگەر (قاذف) ئیشارەی کرد بە لەفزێك کە ئەو مانایەی هەڵئەگرت بەڵام نیشانەیەك نەبوو کە بەڵگەی ئەوە بێت مەبەستی تۆمەتبار کردن بوە بە زینـا، ئـەوە هیـچی ناکەوێتـە سـەر، چـونکە دروست نی‌یە بە ئیحتیمالێکی ڕووت تاوانبار بکرێت.

بەچ شتێك حەددی (قذف) سابت ئەبێ؟

بە یەکێ لەم دوو شتە تۆڵە ئەچەسپێ:

١- (قاذف) خۆی دانی پێدابنێت کە ئەو تۆمەتەی تێ‌گرتوە.

٢- یا دوو پیاوی دادپەروەر شایەتی لەسەر بدەن.

سزای دونیایی (قاذف) تۆمەتچی :

ئەگەر (قاذف) بۆ ڕاستی قسەکەی شایەتی نەهێنا، سزایەکی ماددی پێویست ئـەبێت لەسـەری، ئەویش هەشتا دارە لەپشتی. وە سزایەکی ئەدەبیش لەسەری پێویست ئەبێ، ئەویش ئەوەیـە شـایەتی لێوەرناگیرێ هەرگیز، وە حوکم بە فاسقێتی ئەدرێ چونکە ئەب‌چێتە ناعادل لای خواو لای خەڵك.

وە ئەو دوو سزایەیە کە بڕیار دراون لە فـەرموودەی خـوای گـەورەدا کـە فەرموویـەتی: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتوا بِأَرْبَعَةِ شُهَداءَ فاجْلِدوهمْ ثَمانينَ جَلْدَةً ولا تَقْبَلوا لَهُمْ شَهادَةً أَبَداً وَأُولئِكَ هُمُ الْفاسِقون إِلّا الَّذينَ تابوا مِنْ بَعْدِ ذلِكَ وَأَصْلَحوا فَإِنَّ اللهَ غَفورٌ رَّحيم﴾ (النور:٤-٥)

واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە کەسانێکی داوێن پاك تاوانبار ئەکەن لە ژنـان و پیـاوان بـەبێ ئـەوەی کە چوار شایەتی عادل لەگەڵیانا شایەتی بدات، ئـەوە هەشـتا قەمـچی‌یـان لـێ بـدەن، وە هـەرگیز شایەتی‌یان لێ وەرمەگرن، وە ئەوانە کەسانێکن کە لە فەرمانی خوا دەرچوون، مەگەر ئەوانە کە تۆبە بکەن و پەشیمان ببنەوە لەو تۆمەت هەڵبەستنەیان وە کردەوەی چاك بکەن، ئەوە بەڕاسـتی خـوا لـە گوناهەکەیان خۆش ئەبێ‌و تۆبەکەیان قەبوڵ ئەکات.

وە زانایـان لەسـەر ئـەو سـزایانە ڕێکـن ئەگـەر ئـەو کەسـەی تۆمەتەکـە هەڵئەبەسـتێ پەشیمان نەبێتەوەو تۆبە نەکات.

لێرەدا دوو کێشە ئەمێنێتەوە زانایان تێیاندا جیاوازییان هەیە:

(کێشەی یەکەم): ئایا سزای بەندە (کۆیلە) وەك سزای ئازادێك ئەبێت یان نا؟

(کێشەی دووەم): ئەگـەر (قـاذف) تۆبـەی کـرد ئایـا ئیعتیبـاری بـۆ ئەگەڕێتـەوەو شـایەتی لێوەرئەگیرێ یان نا؟.

بۆ کێشەی یەکەم: کە ئەوەیە ئەگەر کۆیلەیەك تاوانی زینا بداتە پاڵ ئازادێکی داوێن پاك تۆڵـەی لەسەر پێویست ئەبێت، بەڵام ئایا تۆڵەکەی وەك تۆڵەی پیاوێکی ئازادە، یا نیوەیەتی؟

حوکمی ئەوە لە سوننەتدا نەچەسپاوە، هەر بۆیـە ڕای زانایـان جیـاوازە، بەشـی زۆری زانایـان بـۆ ئەوە چوون ئەگەر بەندەیەك تاوانی (قذف)ی لەسەر چەسپاو سابت بوو، سـزاکەی چل دارە، چـونکە ئەو حەددە بەهۆی کۆیلەیی‌یەوە نیوە ئەبێتەوە، هـەر وەك حـەددی زینـا. خـوای گـەورە ئەفـەرمووێ: ﴿فإن أتين بفاحشة فعليهن نصف ما على المحصنات من العذاب﴾ النساء ٢٥﴾.

واتە: وە ئەگـەر ئـەو ژنـە کۆیلانـە زینایـان کـرد نیـوەی ئـەو سـزایەیان لەسـەرە کـە لەسـەر ژنـە ئازادەکان هەیە.

مـالیك ووتویەتی: ئەبو زەناد ووتویەتی لەو بارەیەوە پرسیارم لە عبداللەی کوڕی عامیری کـوڕی ڕەبیعە کرد ووتی:

(عمر)ی کوڕی خەططاب و عشمانی کوڕی عەففان و خەلیفەکانی ترم بینیـوە و ئەوانـەی دووای ئەوان، نەم دیوە کەسیان لە چل دار زیاتریان دابێت لە کۆیلە لەسەر تاوان هەڵبەستنی زینا.

وە ئەگێڕنەوە لـە ئیبنـو مەسـعود و زوهـری و عومـەری کـوڕی عبـدالعزیز و قەبیـصەی کـوڕی ذوئەیب و ئەوزاعی و ئیبنو حەزمـەوە، کـە ئـەبێ هەشـتا دار لـە کۆیلـە بـدرێ، چونکە تۆڵەیەکـە پێویست کراوە و مافی ئادەمی‌یە، چونکە تاوانەکە کەوتۆتە سەر ناموسـی تۆمـەت بۆکراوەکـە، وە تاوانیش ناگۆڕێ بە کۆیلەیی و ئازادی.

ئیبنو مونذیر وتوویەتی: ئـەوەی خـەڵك لـە وڵاتـەکان و شـارەکاندا لەسـەری ڕۆیـشتون گفتـی یەکەمە، وە منیش بەو شێوەیە ئەڵێم و بۆچونم وایە.

وە لە (المسوی)دا ووتویەتی: زانایان لەسەر ئەو گفتەن

خاوەنی (الروضة الندية) لە ڕای یەکەم کۆڵاوەتەوە، وە ڕای دووەمی پێش خستوەو وتویەتی:

ئایەتە پیرۆزەکە گشتییە ئازاد و کۆیلە ئەگرێتەوە. وە سوکایەتی کردن بە هۆی تۆمەت تێگرتنی ئازاد لەلایەن کۆیلەوە زۆرترە لەوەی بەەوی تۆمەت هەڵبەستنی ئازادێك بۆ ئازادێکەوە هەیە، وە بەڵگەش نییە لەسەر نیوەکردنی حەددی (قذف) تۆمەت هەڵبەستن نە لە قورئانداو نە لە سوننەتدا، وە گەورەترین بەڵگە کە گەڕانەوەی بۆ ئەکرێ فەرموودەکەی خوای گەورەیە کە فەرموویەتی لە تۆڵەی زینادا: ﴿فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ﴾ (النساء: من الآية٢٥).

واتە: لەسەر ژنە کۆیلەکان نیوەی ئەو سزایە هەیە کە لە سەر ئازادێکە.

وە شارراوە نییە کە ئەوە لەبارەی تۆڵەیەکی ترە جگە لە تۆڵەی (قذف). جا گەیاندنی ئەو تۆڵانە بەیەك ئیشکالی تێدایە، بە تایبەت کە هۆیەکەیان لێك جیایەو یەکێکیان تەنها مافی خوایە، و ئەوی تریان تێکەڵە لە مافی خوا و مافی ئادەمی.

بەڵام کێشەی دووەم: زانایان لەسەر ئەوە رێك کەوتوون کە (قاذف) شایەتی لێوەرناگیرێ هەتا تۆبە نەکات، چونکە تاوانێکی ئەنجام داوە فاسقی دێنێتە سەر، وە فاسقیش عەدالەت لائەبات. وە عەدالەتیش مەرجێکە بۆ وەرگرتنی شایەتی، چونکە لەو فاسقییە تۆبەی نەکردووە، جا حەددی لێدان هەرچەندە کەفارەت و بریتییە بۆ ئەو تاوانەی کردویەتی و نەجات دەریەتی لە سزای رۆژی دوایی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سیفەتی فیسقی لەسەر لانابات کە شایەتی پێ ڕەت ئەکرێتەوە.

بەڵام ئەگەر پەشیمان بووەوە و تۆبەیەکی باشی کرد، ئایا ڕەدی ئیعتیباری بۆ ئەکرێتەوە و شایەتی لێ وەرئەگیرێ یان نا؟

زانایان لەم بارەوە دوو ڕایان هەیە:

(ڕای یەکەم) ئەوەیە شایەتی تۆڵە لێسەندراو لە (قذف)دا وەرئەگیرێ ئەگەر تۆبەی کرد بە تۆبەی نەصوح.

ئەمەش ڕای مالیك و شافیعی و ئەحمەد و لەیث و عەطاء و سوفیانی کوڕی عویەینە و (شعبي) و قاسم و سالم و زوهریە.

عومەر بە هەندێ لەوانەی ئەوت کە حەددی (قذف)ی لێئەدان: ئەگەر تۆبە بکەی شایەتیت لێوەرئەگرم!

بەڵام (ڕای دووەم) ئەوەیە کە شایەتی لێوەرناگیرێ دووای تۆبە و گەڕانەوەش، وە ئەوانەی بۆ ئەو ڕایە چوون: حەنەفییەکان و ئەوزاعی و ثەوری و حەسەن و سەعیدی کوڕی موسەییب و شورەیح و ئیبراهیمی نەخعی و سەعیدی کوڕی جوبەیر.

وە بناغەی ئەم جیاوازی‌یە لە تەفسیری فەرموودەی خوای گەورەدا: ﴿وَلاَ تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَداً وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ إِلاَّ الَّذِينَ تَابوا﴾ (النور: من الآية٤).

واتە: هەرگیز شاهیدی‌یان لێ وەرمەگرن، وە ئەوانە فاسقن مەگەر ئەوانەی تەوبەیان کردبێ.

کە ئایا ئەو جیاکردنەوەیە لە ئایەتەکەدا ئەگەڕێتەوە بۆ دوو شت بەیەکەوە: واتە شایەتی لێوەرنەگرتنی و حوکم بە فاسقی‌یەتی.

یان هەر ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی دوایی کە حوکمە بە فاسقی؟

جا هەر کەس بڵێ ئەو جیاکردنەوە ئەگەڕێتەوە بۆ هەردوو فەرمانەکە لەگەڵ یەکدا ئەڵێ: دروستە شایەتی لێوەربگیرێ دووای تۆبەکردن،

وە هەرکەس بڵێ ئەگەڕێتەوە بۆ حوکم دان بە فاسقی، ئەڵێ: شایەتی لێوەرناگیرێ تۆبەکەی هەرچۆنێك بێت.

چۆنی‌یەتی تۆبەکردن :

عومەر خوای لێ ڕازی بێت فەرموویەتی:

تۆبەی (قاذف) تۆمەت هەڵبەست تەنها بەو شێوەیە ئەبێت کە ئەو (قاذف)ە خۆی بە درۆ بخاتەوە لەو (قذف)ەی کە تۆڵەی تێدا نەبێت.

وە ئەوانەی شایەتی‌یان لەسەر موغیرەدا ووتویانە:

هەرکەس خۆی بە درۆ بخاتەوە شایەتی لێوەرئەگیرێ لەوە دووا، و هەرکەس وا نەکات شایەتی دروست نابێت.

شبلی کوڕی مەعبەد و نافیعی کوڕی حاریثی کوڕی کیلدە خۆیان بە درۆ خستەوە و تۆبەیان کرد، بەڵام ئەبوبەکرە ئەوەی نەکرد، بۆیە شایەتی‌یان لێوەرنەئەگرت.

وە ئەوەش بۆچوونی شەعبی بووە، وە لەخەڵکی مەدینەشەوە ئەگێڕنەوە، وە کۆمەڵێك لە زانایان ووتویانە: تۆبەکەی ئەوەیە کە خۆی چاك بکات، با خۆشی بە درۆنەخاتەوە، وە تەنها پەشیمان بونەوەو گەڕانەوەی بۆ لای خواو واز هێنان لەو کارە بەسە. ئەمەش بۆچونی مالیك و ئیبنو جەریرە.

ئایا کەسێك (قذف)ی باو و باپیری خۆی بکات حەددی لێ ئەدرێ؟:

ئەبو ثەور و ئیبنو مونذیر ووتویانە: ئەگەر کەسێك تاوانی زینای هەڵبەست بۆ کوڕی خۆی ئەو کەسە حەددی لێئەدرێ بەپێی ڕواڵەتی قورئانی پیرۆز چونکە قورئان جیاوازی نەکردوە لە نێوان تۆمەت هەڵبەست و تۆمەت بۆ هەڵبەستراو.

وە حەنەفییەکان و شافیعییەکان ووتویانە: ئەو کەسەی تاوان بداتە پاڵ کوڕی خۆی حەددی لێ نادرێ.

چونکە مەرجە کە (قاذف) ئەسڵ نەبێت، وەك باوك و دایك، چونکە ئەگەر لە تۆڵەی کوشتندا ئەسڵ نەکوژرێتەوە، ئەوە لە تۆڵەی (قذف)دا لەپێشترە، هەرچەندە ووتویانە ئەبێ سەرزەنشت بکرێ چونکە (قذف) ئازاردانە.

چەند جارەکردنەوەی (قذف) بەرامبەر کەسێك :

ئەگەر کەسێك لە جارێك زیاتر تاوانی زینای گرتە یەك کەس، یەك حەددی لەسەرە ئەگەر بۆ جارەکانی تر تۆڵەی لێ نەدرابێت.

بەڵام ئەگەر حەددی لێ درا بۆ جارێك و دووبارە گەڕایەوە بۆ (قذف) کردنەکە ئەبێ بۆ جاری دووەمیش حەددی لێ بدرێ، ئەگەر بۆ جاری سێیەمیش دوبارەی کردەوە هەر حەددی لێئەدرێ بەو پێیە هەتا دووبارەی بکاتەوە لێی ئەدرێ.

(قذف) تاوانی زینادانە پاڵ کۆمەڵێ :

ئەگەر کەسێك تاوانی زینای دایە پاڵ کۆمەڵێك، زانایان لە حوکمی ئەو کارەدا سێ بۆچوونیان هەیە:

(مذهب)ی یەکەم) بۆچونی ئەوانەیە کە ئەڵێن یەك جار تۆڵەی لێئەسەندرێ. ئەوەش مەذهەبی ئەبو حەنیفە و مالیك و ئەحمەد و ثوریە.

(مذهب)ی دووەم) بۆچونی ئەوانەیە کە ئەڵێن بۆ هەرجارە حەددێکی لێئەدرێ، ئەوانیش شافیعی و لەیثە.

(مذهب)ی سێیەم) ئەمانە جیاوازییان کردووە لە نێوان ئەوەی کە بە ووشەیەك تاوان بداتە پاڵ هەموویان، وەك ئەوەی پێیان بڵێت: ئەی زیناکەران. وە ئەوەی کە بە جیا تاوانەکە بگرێتە هەریەکەیان وەك ئەوەی بەهەر یەکەیان بڵێت: ئەی زیناکەر.

لە شێوە ووتنی یەکەمدا هەر یەکجار تۆڵەی لێئەسەندرێ.

وە لە شێوەی دووەمدا بۆ هەریەکەیان تۆڵەیەکی لێئەسەندرێ.

ئیبنو روشد ووتویەتی: پشتیوانی قسەی ئەوانە کە لەسەر (قاذف)ی کۆمەڵ یەك حەد پێویست ئەکەن، حەدیسەکەی ئەنەس و جگە لەوە: کە هیلالی کوڕی ئومەییە تاوانی زینای دایە پاڵ ژنەکەی خۆی لەگەڵ شورەیکی کوڕی سەحمادا. ئەو کێشەیەیان بەرزکردەوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)،

پێغەمبەر (ﷺ) لیعانی پێ کردن و حەددی نەدا لە شوورەیەک. ئەمەش ئیجماعی زانایانە لەسەر کەسێک تاوان بگرێتە ژنی خۆی بە پیاوێکی تر

وە بەڵگەی ئەوانەی ڕایان وەهایە کە بۆ هەر کەسێکیان حەددێکی لێبدرێ ئەوەیە کە دەڵێن لەبەرئەوە مافی ئادەمیزادە، چونکە ئەگەر هەندێکیان لێی ببورن و هەموویان لێی نەبورن داری حەددی لە کۆڵ ناکەوێ.

بەڵام ئەوانەی جیاوازی‌یان کردووە لە نێوان ئەوەدا کە بە یەک وشە تۆمەتی دابێتە پاڵ هەموویان یا بە چەند ووشەیەک، لە کۆڕێکدا، یا لە چەند کۆڕی جیاجیادا، لەبەر ئەوەیە ڕایان وایە کە چەند تۆڵەیەک بە چەند (قذف)ێک پێویست ئەبێت.

چونکە ئەگەر چەند تۆمەت بۆکراو و چەند تۆمەت کردن کۆ بووەوە، وە ئەوە پێویستە تۆڵەکانیش چەند تۆڵەیەک بن.

ئایا حەد مافێکە لە مافەکانی خوا یا مافێکە لە مافەکانی ئادەمیزاد :

ئەبو حەنیفە بۆ ئەوە چووە کە (حد) تۆڵە مافێکە لە مافەکانی خوا، جا لەبەرئەوەی کە مافێکە لە مافەکانی خوا، کاتێ گەیتیشە لای حاکم، پێویستە لەسەری بەجێی بگەیەنێت، با تۆمەت بۆکراویش داوای لێ نەکات. وە ئەو تۆڵەیە لە کۆڵ (قاذف) ناکەوێ بە لێبووردنی (مقذوف) تۆمەت بۆکراو.

وە تۆبەکردن سوودی هەیە بۆ (قاذف) تۆمەتکەر لە نێوان خۆی و خوادا، وە تۆڵەکەش بۆ کۆیلە ئەکرێت بە نیوە وەک تۆڵەی زینا. وە شافیعی بۆ ئەوە چووە کە داری حەد مافێکە لە مافەکانی ئادەمیزاد، وە لەبەر ئەوەی کە مافی ئادەمیزادە لەسەر ئیمام پێویستە بەجێی نەگەیەنێت هەتا توهمەت بۆکراو داوا نەکات، وە بە لێبووردنی ئەو لە کۆڵ (قاذف) ئەکەوێ، وە بە میراتی ئەو مافە ئەمێنێتەوە، وە بە لێبوردنی میرات گرەکانیش هەر لە کۆڵ ئەکەوێ، وە تۆبە سوودی نابێت بۆ (قاذف) هەتا (مقذوف) لێی نەبووری و گەردنی ئازاد نەکات.

لە کۆڵ کەوتنی حەد:

حەددی (قذف) لە کۆڵ ئەکەوێ کاتێ (قاذف) چوار شایەت بهێنێ، چونکە شایەتەکان سیفەتی (قذف) تۆمەت هەڵبستن کە دەبێتە هۆی پێویست بوونی داری حەدد لەکۆڵ کابرا ئەخەن و بە شایەتی‌یەکەیان ڕوودانی زینا سابت ئەکەن.

وە ئەو کاتە حەددی زینا لەسەر تۆمەت بۆکراوەکە بەجێ دێت، چونکە زیناکەرە، هەروەها ئەگەر تۆمەت بۆکراو خۆی دان بە زیناکردنەکەیدا بنێت،

وە ئەگەر ژن تاوانی زیناکردن بداتە پاڵ مێردەکەی داری تۆڵەی لێنەدرێ ئەگەر مەرجەکانی تێدا بەدی هاتبوو. بە پێچەوانەی ئەوەوە کە ئەگەر پیاوەکە تاوان بگرێتە ژنەکەو شایەتی نەبوو، چونکە ئەو داری تۆڵەی لێنادرێ، بەڵکو لیعان لە نێوانیاندا بەجێ دێت، وەك لە بەشی (لعان)دا باس کرا.

## هەڵگەڕانەوە لە دین (الردة)

**پێناسەکەی:**

(ردّة): گەڕانەوەیە لەو ڕێگایەی پێی داهاتووە، وە وەك ووشەی (إرتداد) وایە بەلاّم (ردة) تایبەتە بە بێباوەڕ بوونەوە.

مەبەست لە هەڵگەڕانەوە لێرەدا: هەڵگەڕانەوەی موسڵمانی ژیری پێگەیشتووە لە ئیسلام بە ئارەزووی خۆی بێئەوەی کەس زۆری لێکردبێت - ئەو کەسە نێرینە بێت یا مێینە-. جا هەڵگەڕانەوەی شێت و منداڵ هیچ ئیعتیباری پێ ناکرێ چونکە موکەللەف نین[1].

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (رفع القلم عن ثلاث: عن النائم حتى يستيقظ، و عن الصبي حتى يحتلم، و عن المجنون حتى يعقل) رواه أحمد و أصحاب السنن و حسنه الترمذي. وقال الحاكم: صحيح على شرط الشيخين.

واتە: پێنوس لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە: لەسەر خەوتو هەتا لە خەو هەڵئەستێت، وە لەسەر منداڵ هەتا باڵغ ئەبێت، وە لەسەر شێت هەتا ئەفامێتەوە و بە هۆش دێتەوە.

وە زۆر لێکردن بۆ ووتنی ووشەی بێباوەڕی موسڵمان لە ئاینی ئیسلام دەرناکات مادام دڵنیا بێت لە باوەڕ و ئیمان لە دەروونیدا.

وە عەمماری کوڕی یاسر زۆری لێکرا کە ووشەی بێباوەڕی بڵێت ئەویش ووتی، ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:

﴿مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِهِ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيمَانِ وَلَكِنْ مَنْ شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْراً فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِنَ اللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ (النحل:١٠٦).

واتە: کەسێك درۆ هەڵئەبەستێ کە وشەی کوفری بە دەمیا هێنابێ دوای ئیمانی و پاشگەزبووبێتەوە، مەگەر کەسێك زۆری لێ کرابێ و دڵی دامەزراو بێ لەسەر ئیمان، ئەوە لۆمەی

(١) هەرچەندە ئیسلامەتی منداڵ دروستە و خواپەرستیەکەشی وەرئەگیرێ.

لەسەر نىيە، بەڵام کەسێك وشەی کوفر بەدەمیا بهێنێ‌و دڵی قەرار بگرێ لەسەری، ئەوانە ڕق و غەزەبی خوایان لەسەرەو، سزایەکی گەورەیان بۆ هەیە.

ئیبنو عەبباس وتویەتی: بێباوەڕانی مەککە عەمماریان برد، هەروەها باوکی و دایکی کە ناوی سومەییە بوو، وە صوهەیب و بیلال و خەبباب و سالمیش، وە سزایان دان و سومەییەیان بەستەوە بە دوو ووشترەوە و حەربەیەکیان کرد بە ناو لەشیاو پێیان ووت: تۆ بۆ پیاو موسڵمان بوویت دە بخۆ. ئیتر کوشتنیان و مێردەکەیان کوشت، وە ئەو دووانە یەکەم شەهیدی ئیسلام بوون.

بەڵام عەممار چییان لێ ویست بە زمان ووتی دووای ئەوەی زۆریان لێکرد، ئەمیش ئەوەی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) گێڕایەوە. پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: (کیف تجدُ قلبك؟) واتە: دڵت چۆن بوو؟ ووتی: دڵنیایە بە باوەڕ، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: (ئەگەر دووبارە داوایان لێکردیتەوە تۆش دووبارەی بکەرەوە)[1].

**ئایا ئەگەر کەسێك لە ئاینێکی بێباوەڕییەوە بچێتە سەر ئاینێکی بێباوەڕی تر بە هەڵگەڕاوە دائەنرێ؟ :**

ووتمان: موسڵمان کاتێ لە ئیسلام دەرچوو ئەوە هەڵگەڕاوەیە، وە حوکمی خوای بەسەردا ئەدرێ کە بۆ هەڵگەڕاوەکان دانراوە.

بەڵام ئایا هەڵگەڕانەوە تەنها بۆ موسڵمانانە کە لە ئیسلام دەربچن، یا جگە لە موسڵمانانیش ئەگرێتەوە ئەگەر لە ئاینەکەیانەوە چوونە سەر ئاینێکی تری بێباوەڕی؟.

لە ڕواڵەتدا بێباوەڕ ئەگەر لە ئاینەکەی خۆیەوە بچێتە سەر ئاینێکی تری بێباوەڕی ئەوە وازی لێ ئەهێنرێ لەسەر ئەو ئاینەی کە چۆتە سەری و کەس لەڕویا ناوەستێ چونکە لە ئاینێکی باتڵەوە چووەتە سەر ئاینێکی تری وەك ئاینەکەی، وە بێباوەڕی هەمووی یەك ڕێگایە، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە لە ئاینی ئیسلامەوە بچێتە سەر ئاینێکیتر، چونکە ئەوە گواستنەوەیە لە ڕێنموونی و ئاینی حەقەوە بۆ سەر گومڕایی و بێ باوەڕی. وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلامِ دِيناً فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ﴾ (آل عمران: من الآیة٨٥).

واتە: هەرکەس جگە لە ئاینی ئیسلام ئاینێکی تر هەڵبژێرێ لێی قبوڵ ناکرێ.

وە لە هەندێ ڕێگای حەدیسەوە هاتووە:

---

(١) الحاکم (٣/٣٥٧) والدر المنثور (٥/١٧٠).

(من خالف دينُهُ دينَ الإسلام فاضربوا عُنُقَهُ) أخرجه الطبراني عن ابن عباس مرفوعاً[1].

واتە: هەرکەس ئاینەکەی پێچەوانەی ئیسلام بوو لە گەردنی بدەن.

وە شافیعی لەم بارەیەوە دوو گفتی هەیە:

یەکەمیان: لەو کەسە قبوڵ ناکرێت لە ئاینێکی بێباوەڕییەوە بچێتە سەر ئاینێکی بێباوەڕی تر بۆ سەر ئاینی ئیسلام نەبێت، یا ئەبێ بکوژرێت

ئەم گفتەش لەگەڵ یەکێك لە ڕیوایەتەکانی ئەحمەددا ڕێك ئەکەوێت.

وە (دووەمیان) ئەڵێت: ئەگەر چووە سەر ئاینێك یەکسان بوو لەگەڵ ئاینەکەی خۆی، یا لەو بەرزتر بوو وازی لێ ئەهێنرێ، بەڵام ئەگەر چووە سەر ئاینێکی تر لە ئاینەکەی خۆی کەم تر بوو وازی لێ ناهێنرێ، بۆ نمونە ئەگەر جولەکە بوو بە گاور وازی لێ ئەهێنرێ، چونکە جولەکە وەك گاور وایە لەوەدا کە هەردووکیان لە ئەسڵدا دوو ئاینی ئاسمانین، بەڵام لادان و تێك دانیان چووەتە ناو، وە ئیسلام هەردوکیانی سڕیوەتەوە.

وە هەروها مەجوسی وازی لێ ئەهێنرێ ئەگەر ببێتە جولەکە یا گاور، چونکە چووەتە سەر ئاینێك کە لە ئاینەکەی خۆی بەرزترە.

وە ئەگەر چوونە سەر ئاینی وێنەی ئاینی خۆی دروست بێت، ئەوە چوونە سەر ئاینی بەرزتر لەوەی خۆی باشترو لە پیشترە.

بەڵام ئەگەر جولەکەو گاور چوونە سەر ئاینی مەجوسی وازیان لێ ناهێنرێ، چونکە ئەوە گواستنەوەیە بۆ سەر ئاینێك کە لەئاینەکەی خۆیان کەمترە.

**موسڵمان بە گوناە کافر نابێت :**

ئیسلام عەقیدە و شەریعەتە

عەقیدەش پێك دێ بە باوەڕ:

١- باوەڕ بە خوابوون.

٢- بە پێغەمبەرەکان.

٣- زیندوبوونەوە و پاداشت دانەوە.

شەریعەتیش پێك دێت بە:

---

(١) مجمع الزوائد (٦/٢٦٣).

١- خواپەرستی لە: نوێژ و ڕۆژو و زەکات و حەج

٢- خووڕەوشت لە: ڕاست گۆیی و بە وەفایی و دەست پاکی

٣- مامەڵەکردنی میللی لە: کڕین و فرۆشتن و.. هتد.

٤- پەیوەندییە خێزانییەکان لە: ژن هێنان و تەڵاقدان.

٥- شکەنجە لەسەر تاوانەکان لە: سزادان و حەددەکان.

٦- پەیوەندی نێودەوڵەتان لە: پەیمان نامەو ڕێکەوتنەکان.

بەم جۆرە ئەبینین ئیسلام پرۆگرامێکی گشتییە هەموو کاروباری ژیان ڕێك و پێك ئەکات.

وە ئەوەیە مەفهوم و مانای گشتی لە ئیسلام وەك قورئان و سوننەت بڕیاریان لەسەرداوە، وە وەك ئەوەی موسڵمانەکانی سەردەمی یەکەم لێی تێگەشتوون، وە بەجێیان هێناوە، لە هەموو بوارێك لە بوارەکانی گشتی و تایبەتیدا. وە هەر ئەندامێك قەبوڵی بکردایە وە لای ئەو ئاینە ببێت بە ئەندامێك لە کۆمەڵی موسڵمانان دائەنرا، وە ئەبوو بە تاکێك لە تاکەکانی نەتەوەی ئیسلامی و حوکمەکانی ئیسلامی بەسەردا جێبەجێ ئەکرا.

بەڵام لەناو خەڵکدا زیرەك و دەبەنگ هەیە، وە لاواز و بەهێز هەیە، وە بە تواناو نەتوان هەیە، وە کارکەرو بێکار هەیە، وە هەوڵدەرو کەم تەرخەم هەیە.

چونکە جیاوازییەکی دیاریان هەیە لە توانای جەستەییانا، وە لە بەهرەکانی دەرونی و عەقلی و ڕۆحییانا.

ئیتر بە پێی ئەو جیاوازییەیان هەیانە لە ئیسلام نزیك ئەبێتەوە و هەیانە لێی دورئەکەوێتەوە بە پێی حاڵی هەر کەسێك و بارو دۆخ و شوێنی ژیانی.

خوای گەورە ئەفەرمووێ:

﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ وَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ (فاطر:٣٢).

واتە: پاشان قورئانمان بەخشی بەوانەی کە هەڵمان بژاردون لە نەتەوەی محمد (ﷺ) جا هەیانە ستەم لە خۆی ئەکات بەکردنی هەندێك سەرپێچی، وە هەیانە مام ناوەندییە لە کردنی چاکە و خراپەدا، وە هەیانە پەلە ئەکاو زۆر تێئەکۆشێ بۆ کردەوەی چاك بە فەرزو سوننەتەوە بە فەرمانی خوا.

بەڵام ئەو دوور کەوتنەوەیە درێغی کەرە کە لە بازنەی ئیسلام دەرناکات مادام وەلای هەبێت بۆ ئەو ئاینە.

جا ئەگەر لە موسڵمانێکەوە وشەیەك دەربچێت کە بێباوەڕی بگەیەنێ بەڵام مەبەستی ئەو واتایە نەبوو، یا بە ڕواڵەت کارێکی بێباوەڕی ئەنجام دا بەڵام مەبەستی گۆڕینی ئاینەکەی نەبوو، ئەوە حوکمی بێباوەڕی بەسەردا نادرێ،

هەرچەندە موسوڵمان بهاڵێ لە گوناهەوەو تاوان ئەنجام بدات، ئەو هەر موسڵمانەو دروست نییە تاوانبار بکرێ بە هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام.

بوخاری گێڕاویەتییەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (من شهد أن لا إله إلا الله، واستقبل قبلتنا، وصلى صلاتنا، وأكل ذبيحتنا، فهو المسلم، له ما للمسلم، وعليه ما على المسلم)[1].

واتە: هەرکەس شایەتی بدات کە هیچ خوایەك نییە شایستەی پەرستن بێت بە حەق ئیللا زاتی الله نەبێت و ڕووی کردە قیبلەکەمان و وەك ئێمە نوێژی کرد و وەك ئێمە ئاژەڵی سەربڕراوی خوارد، ئەو کەسە موسڵمانە، موسڵمان چ مافێکی هەیە ئەویش ئەو مافەی ئەبێت، و موسڵمان چ ئەرکێکی لەسەرە ئەویش ئەو ئەرکەی لەسەر ئەبێت.

وە پێغەمبەر (ﷺ) موسڵمانەکانی ئاگادار ئەکردەوە لەوەی تاوانی بێباوەڕی بگرنە یەکتر لەبەر گەورەیی مەترسی ئەو تاوانە. موسلیم ئەگێڕێتەوە لە ئیبنو عومەرەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (إذا كفّر الرجل أخاه، فقد باء بها أحدهما)[2].

واتە: ئەگەر کەسێك بە برا موسڵمانەکەی ووت (کافر) ئەوە هەر ئەگەڕێتەوە بۆ یەکێکیان واتە ئەگەر براکەی کافر نەبوو خۆی بەو ووتەیە کافر ئەبێت.

### کەی موسڵمان ئەبێتە هەڵگەڕاوە لەدین؟ :

بەڕاستی موسڵمان بەدەرچوو لە ئیسلام دانانرێ، وە حوکمی هەڵگەڕاوەی لە ئیسلام نادرێ بەسەردا، مەگەر سنگی کرابێتەوە بۆ کوفر و دڵنیا بێت پێی و بە کردەوە بچێتە ناوی، بە پێی فەرمودەی خوای گەورە: (ولكن مَنْ شَرَحَ بالْكُفْرِ صَدْراً)

واتە: بەڵام ئەو کەسە کافر دەبێ کە سینەی باز بێ بۆ کوفر و دڵنیا بێت پێی.

وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (إنما الأعمال بالنيات، و إنما لكل امرىء مانوى).

---

(١) البخاري (٣٩٣).

(٢) البخاري (٦١٠٤) ومسلم (٦٠).

واتە: کردەوەکان بەپێی نیازەکان ئەبن، جا هەرکەس چی نیاز هەبێت ئەوەی بۆ ئەبێت و لەسەر ئەوە پاداشی ئەدرێتەوە.

جا کاتێك ئەوەی لە دڵدایە لەو نادیارانەیە کە خوا نەبێت کەس نایـان زانێـت، هـەر ئـەبێت ئـەو کەسە شتێکی وەهای لێ ڕووبدات کە بەڵگە بێت لەسەر بێ بڕوایی، بەڵگەیـەکی تـەواوی بـڕاوە کـە لێك دانەوەی تر هەڵنەگرێ.

هەتا قسەیەك دراوەتە پاڵ ئیمامی مـالیك کە ووتویەتی:

هەرکەس شتێکی وەهای لێ ڕوودا کە بێباوەڕی لەنەوەد و نـۆ ڕووەوە هـەڵبگرێ، بـەڵام لـە یـەك ڕووەوە باوەڕ هەڵبگرێ بە باوەڕدار کردەوەی لەگەڵدا ئەکرێ.

وە لەو نمونانەی کە بەڵگەی بێباوەڕین:

١- ئینکاری کردنی ئەوانەی لە ئاین دا بە (ضـرورة) زانـراون. وەك ئینکـاری کردنـی یـەکتایی خـوا و دروسـت کردنـی جیهـان لـە لایـەن خـواوە و ئینکـاری بـوونی فریـشە و ئینکـاری کردنـی پێغەمبەریـەتی (محمـد) (ﷺ) وە ئـەوەی کـە قورئـان وەحیـیە لەلایـەن خـواوە و ئینکـاری کردنـی زیندوبوونەوە و پاداشت دانەوە و ئینکاری کردنی فەرزبوونی نوێژ و زەکات و ڕۆژو و حەج.

٢- ڕەواکردنی شتێك موسڵمانان کۆبن لەسەر حەرام بوونی، وەك بە حەڵاڵ دانانی ئارەق و زینـا و سوود و خواردنی گۆشتی بەراز و حەڵاڵ کردنی خوێنی بێگوناهان و سامانەکانیان[1].

٣- حەرام کردنی شتێك موسڵمانان کۆبن لەسەر حەڵاڵ بـوونی وەك حـەرام کردنـی شـتە پاکژو خاوێنەکان.

٤- جوێنــدان بــە پێغەمبــەر (ﷺ) یــان گاڵتــە پــێ‌کردنی، وە هــەروەها جــوێن دان بەهــەر پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەکان.

٥- جوێندان بە ئاین و تانەدان لە قورئان و سوننەت، وە وازهێنان لـە حوکم پێ‌کردنیـان و بـە چاکتر زانینی یاسا دانراوەکان لەو دوانە.

٦- کەسێك ئیددیعای ئەوە بکات کە وەحی بۆ دێتە خوارەوە.

---

(١) مەگەر ئەو ڕەواکردنە بە تەئویل بێت- وەك تەئویلی خەواریج- بۆ ڕەواکردنی خوێنی صەحابە و تەئویلی قودامەی کوڕی مەظعون بۆ خواردنەوەی ئارەق- لەگەڵ ئەوەشدا جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن کە کافر نین.

٧- فڕێ دانی قورئان بۆ ناو شتی پیس، وە هەروەها كتێبەكانی حەدیس، لەبەر گاڵتە پێكردنیان، وە بە سوك دانانی ئەوەی كە تیایاندایە.

٨- سوكایەتی كردن بە ناوێك لە ناوەكانی خوا، یا فەرمانێك لە فەرمانەكانی، یا قەدەغە كردنێك لە قەدەغە كراوەكانی، یا وەعدێك لە وەعدەكانی، مەگەر لەبەر ئەوە بێت تازە موسوڵمان بێ و ئەحكامی ئیسلام و سنورەكانی نەزانێ، وە ئەو كەسە ئەگەر ئینكاری شتێكی لەوانە كرد بە نەزانی بە كافر دانانرێ

وە ئیسلام چەند مەسەلەیەكی تێدایە كە موسڵمانان لەسەری كۆن بەڵام كەسانی تایبەت نەبێت نایان زانن. جا كەسێك ئینكاری ئەمانە بكات بە كافر دانانرێ، بەڵكو بەهانەی نەزانینی بۆ دائەندرێ، چونكە زانینیان بە تەواوی لەناو خەڵكدا بڵاو نییە. وەك حەرامێتی مارەكردنی پور بەسەر خوشكەزا و برازادا، وە ئەوەی كە پیاوكوژی بەقەست میرات ناگرێ لە كوژراوەكە، وە نەنك شەش یەكی میراتی ئەگرێ و گەلێ شتی تر.

وە وەسوەسە واتە ئەندێشەو بیری خراپ كە شەیتان ئەیخاتە دڵی مرۆڤەوە ناچێتە ناو ئەوانەوە، چونكە وەسوەسە لەو شتانەیە خوا كەسی لەسەر ناگرێ و سزا نادات.

موسلیم لە ئەبی هورەیرەوە ئەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (إن الله عز و جل تجاوز لأمتي عما حدَّثت به أنفسها مالم تعمل أو تتكلم به)[1].

واتە: خوای گەورە چاوپۆشی ئەكات و نایگرێ لە ئومەتی من ئەوەی بە دەروونیدا بێت، بە مەرجێ كاری پێ نەكات یا بە دەم نەیڵێت.

وە موسلیم لە ئەبو هورەیرەوە ئەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی:

چەند كەس لە یارەكانی پێغەمبەر (ﷺ) هاتنە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) لێیان پرسی و ووتیان: شتی وەها بە دڵماندا دێت لەبەر زلی ناوێرین بیڵێین فەرمووی: هەستتان پێ كرد؟ ووتیان: بەڵێ. فەرمووی: ئەوە نیشانەی ڕاستی باوەڕە[2].

وە موسلیم لە ئەبو هورەیرەوە ئەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (لا يزال الناس يتساءلون حتى يقال: هذا، خلق الله الخلق، فمن خلق الله؟ فمن وجد من ذلك شيئاً فليقل آمنت بالله)[1].

---

(١) البخاري (٢٥٢٨) ومسلم (١٢٧).

(٢) أحمد (٤٤١) ومسلم (١٣٢) وأبوداود (٥١١١) والنسائي في عمل اليوم والليلة (٦٦٤).

واتە: خەڵك هەر واز ناهێنن و پرسیار ئەکەن هەتا ئەڵێن: ئەوە خوا ئەمانەی دروست کردووە، ئەی کێ خوای دروست کردووە؟ هەرکەس هەستی بە شتێکی وا کرد با بڵێت: باوەڕم هەیە بە خوا.

سزای (مرتد) هەڵگەڕاوە لەدین :

هەڵگەڕانەوە لەدین تاوانێکە لەتاوانەکان کە هەموو چاکەیەکی ئادەمیزاد هەڵدەوەشێنێتەوە کە لەپێش هەڵگەڕانەوەکەدا بوویەتی، وە سزای توند پێویست ئەکات لەڕۆژی دواییدا، خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَمَنْ يَرْتَدِدْ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُولَئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَأُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ (٢١٧) واتای ئایەتەکە: هەرکەس لە ئێوە لە ئیسلام پاشگەز بێتەوە بەرەو کوفر وە لەسەری بەردەوام بێ هەتا ئەمرێ بە کافری، ئەوە هەر کارو کردەوەیەکی باشی کردبێ بە فیڕۆ ئەڕواو لە بەروبومیان بێ بەش ئەبێ، چونکە ئەو مافانەی کە بۆ موسوڵمانان ئەبێت بۆ ئەم نییە، وە لەنازو نیعمەتەکانی ڕۆژی دوایش بێبەش ئەبێو لەناو سزاو ئەشکەنجەی هەمیشەییدا ئەمێنێتەوە. وە ئیسلام هەر لە دنیادا سزایەکی بەپەلەی داناوە بۆ (مرتد) بێجگە لەو سزایەی کە بەڵێنی پێداوەو چاوەڕوانیەتی لەڕۆژی دواییدا، وە ئەو سزایەش کوشتنە. بوخاری و موسلیم ئەگێڕنەوە لەئیبنو عەبباسەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (من بدَّل دينه فاقتلوه)[2] واتە هەرکەس دینەکەی گۆڕی بیکوژن. وە لەئیبنو مەسعودەوە هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (لا يحل دم امرئ مسلم إلا بإحدى ثلاث: كفر بعد إيمان، وزنى بعد إحصان، وقتل نفس بغير نفس)[3] واتە خوێنی هیچ موسوڵمانێك ڕەوا نییە مەگەر بە یەکێ لەم سێ شتە نەبێت: کوفر کردن لەدووای ئیمان، وە زینا کردن لەدووای ژن هێنان، وە کوشتنی کەسێك بێ ئەوەی کەسێکی کوشتبێ.

لە جابیرەوە خوا لێی ڕازی بێت: ئافرەتێك پێیان ئەوت دایکی مەڕوان لە ئیسلام پاشگەز بووەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد کە داوای لێ بکرێ بگەڕێتەوە بۆ ئیسلام، ئەگەر تۆبەی کرد باشە ئەگینا بیکوژن، بەڵام ژنەکە موسوڵمان نەبووەوە، ئیتر کوژرا. دارە قوطني و بەیهەقی تەخریجیان کردووە، وە ئیسنادەکەی لاوازە.

---

(١) مسلم (١٣٤).

(٢) البخاري (٦٩٢٢) وأبوداود (٤٣٥١) والترمذي (١٤٥٨) والنسائي (٧/١٠٤) وابن ماجة (٢٥٣٥) وأحمد (١/٢٨٢).

البخاري (٦٨٧٨) ومسلم (١٦٧٦/٢٥).

وە سابتە کە ئەبوبەکر جەنگی لەگەڵ هەڵگەڕاوە عەرەبەکاندا کرد هەتا گەڕانەوە بۆ سەر ئیسلام.
وە هیچ کام لە زانایان جیاوازی‌یان نی‌یە لەوەدا کە پێویستە هەڵگەڕاوە لە ئیسلام بکوژرێ. بەڵام جیاوازی‌یان هەیە لە ئافرەتدا ئەگەر هەڵگەڕایەوە لە ئیسلام، ئەبو حنیفە وتویەتی: ئافرەت ئەگەر لە ئیسلام هەڵگەڕایەوە ناکوژرێ، بەڵام بەند ئەکرێ، وە هەموو ڕۆژێ دەرئەهێنرێ و داوای تۆبە کردن و گەڕانەوەی لێ ئەکرێ بۆ سەر ئیسلام، ئیتر هەر بەو شێوەیە هەتا ئەگەڕێتەوە بۆ سەر ئیسلام یان ئەمرێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ کوشتنی ئافرەتانی قەدەغە کردووە.

وە جەماوەری زانایان پێچەوانەی ئەوەن و ووتویانە: سزای ئافرەتی هەڵگەڕاوە وەك سزای پیاوی هەڵگەڕاوەیە، چونکە شوێنەواری هەڵگەڕانەوەو زیانەکانی بۆ پیاو و ژن وەکو یەکە، وە بە پێی ئەو فەرموودەیەی موعاذ کە (حافظ) بە (حسن) ی داناوە: کە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ ناردی بۆ یەمەن پێی فەرموو: (هەر پیاوێك لە ئیسلام هەڵگەڕایەوە داوای گەڕانەوەی لێبکە، ئەگەر گەڕایەوە باشە، ئەگینا لەگەردنی بدە، وە هەر ژنێك لەئیسلام هەڵگەڕایەوە داوای گەڕانەوەی لێ بکە، ئەگەر گەڕایەوە باشە، ئەگینا بدە لەگەردنی)[1].

وە ئەم دەقە جێی کێشەی زانایانە.

بەیهەقی و دارەقوطنی تەخریجیان کردووە کە ئەبوبەکر داوای تۆبەکردنی لە ژنێك کرد پێیان ئەوت (أم قرفە) کە کافر بووبوو دووای ئیسلام بوونی، بەڵام تۆبەی نەکرد، ئەویش کوشتی[2].

بەڵام ئەو حەدیسەی کە کوشتنی ئافرەتی قەدەغە کردووە ئەوە لە حاڵەتی جەنگدایە، لەبەر لاوازی‌یان و هاوبەشی نەکردنیان لەجەنگدا. هەر ئەوەش بووە هۆی قەدەغەکردنی، کە پێغەمبەر (ﷺ) ئافرەتێکی کوژراوی بینی لە مەیدانی جەنگدا فەرمووی: (ما كانت هذه لتقاتل) واتە: ئەمە شەڕ کەر نەبووە، لە پاشاندا قەدەغەی کرد کە ئافرەت بکوژن.

وە ئافرەت هاوبەشی پیاوە لە هەموو تۆڵەکاندا بێ جیاوازی. جا وەك چۆن حەددی ڕەجم کردنی لەسەر بەجێ دێ ئەگەر مێردی کردبوو، بەو پێیەش حەددی هەڵگەڕانەوەی لەسەر بەجێ دێ بێ جیاوازی.

---

(١) والطبراني في المعجم الكبير (٢٠/٥٤) وفتح الباري (١٢/٢٧٣).

(٢) البيهقي (٨/٢٠٣) والدارقطني (٣/١١٤).

## حیکمەتی کوشتنی هەڵگەڕاوە:

ئیسلام بەرنامەیەکی تەواوە بۆ ژیان چونکە ئیسلام بریتییە لە ئایین و دەوڵەت، وە لە خواپەرستی، وە فەرمانڕەوایی، وە قورئان و شمشێر، وە گیان و ماددە، وە دونیا و ئاخیرەت، وە ئیسلام لەسەر عەقڵ و تێ گەیشتن دانراوە، وە لەسەر بەڵگە و سەلماندن ڕاوەستاوە، وە نە لە بیروباوەڕی ئیسلامداو نە لە یاسای ئیسلامدا شتێکی وەها نییە کە دژایەتی و پێکادان بکات لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا یان ببێ بە بەربەست لەڕێگای گەیشتنی بە کەماڵی ماددی و ئەدەبی، وە هەرکەس چووبێتە ناو ئیسلامەوە حەقیقەتەکەی ناسیوەو خۆشی و شیرینییەکەی چەشتووە.

جا ئەگەر لێی دەرچوو و پاشگەز بووەوە دوای ئەوەی چووە ناوی و هەستی پێ کرد، ئەوە لە ڕاستیدا لە حەق و تێگەیشتن دەرچووە، وە دژایەتی بەڵگە و سەلماندنی کردووە، وە لە عەقڵی ساغ و سروشتی ڕاست لایداوە.

وە ئادەمیزاد کاتێ ئەگاتە ئەو ئاستە ئەوە ئەگەڕێتەوە بۆ دورترین پلەکانی هەڵوەشانەوە، وە ئەگاتە ئەوپەڕی لێژبوونەوەو نزمییەوە کەسێکی ئاوا نابێ ژیانی بپارێزرێ، وە پەرۆشی بکرێ لەسەر مانەوەی چونکە ژیانی ئەو سودێکی گەورەو مەبەستێکی پیرۆزی نییە.

ئەوە لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە ئیسلام وەك بەرنامەیەکی گشتی بۆ ژیان، وە یاسایەکی تەواو بۆ خو و ڕەوشتی مرۆڤایەتی، هەر ئەبێ دیوارێکی ببێت کە بیپارێزێ، وە قەڵغانێکی ببێت پارێزگاری بکات، چونکە هیچ یاسایەك ڕاوەستا و نابێت ئیللا بە ئاگاداری کردن و پاراستنی لە هەموو ئەو شتانەی کە پایەکانی ئەلەرزێنێ و بیناکەی ئەجوڵێنێ. وە هیچ شتێك لەوە بەهێزتر نییە کە یاساکە بپارێزرێ لەوانەی لێی دەرئەچن و هەڵئەگەڕێنەوە، چونکە دەرچون و هەڵگەڕانەوە هەڕەشە لە قەوارەو بوونی یاساکە ئەکات و بەرەو کەوتن و لەناوچوونی ئەبات.

بە ڕاستی دەرچوون لە ئیسلام و هەڵگەڕانەوە لێی شۆڕشێکە دژی ئەو وە شۆڕشیش دژی ئیسلام سزاکەی تەنها ئەوەیە کە یاسا دانراوەکان لەسەری ڕێك کەوتوون، دەربارەی ئەوانەی لە یاسای دەوڵەت و شێوە بڕیاردراوەکانی دەرئەچن.

وە هەر ئادەمیزادێك لە دەوڵەتە شیوعییەکان بێت، یالە دەوڵەتە سەرمایەدارەکاندا کاتێ دەربچێت لەیاسای ئەو دەوڵەتە بە خیانەتی گەورە بۆ وڵاتەکەی تاوان باری ئەکەن، وە خیانەتی گەورەش سزاکەی ئیعدامە. هەر بۆیە ئیسلام لە دانانی سزای ئیعدام بۆ ئەو کەسانەی لێی هەڵئەگەڕێنەوە مەنطقییە لەگەڵ خۆیداو و لەگەڵ یاساکانی تریشدا بە یەك ئەگات.

**داوای تۆبەکردن لە هەڵگەڕاوە :**

زۆر جار هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام لە ئەنجامی ئەو شوبهەو گومانانە ئەبێت کە دێنە ناو دەرون و تەنگ بە ئیمان هەڵئەچنن.

وە پێویستە دەرفەتێك بڕەخسێ بۆ ڕزگاربوون لەو شوبهەو گومانانە، وە بەڵگەو سەلماندنی وەها پێشکەش بکرێت کە باوەڕ ئەگەڕێنێتەوە بۆ ناو دڵ و یەقین و دڵنیاییش بۆ ناو دەروون،

وە ویژدان ئەحەوێنێتەوە و ڕزگاری ئەکات لەو شوبهەو گومانانەی کە پێوەی نوساوە. وە لێرەدا پێویستە کە داوای پەشیمان بوونەوە بکرێ لە هەڵگەڕاوە با چەند جارێکیش هەڵگەڕێتەوە، وە ماوەیەکی پێ بدرێ هەتا بە خۆیدا بێتەوە و بیر ئەکاتەوەو ئەو خەیاڵات و گومانانە بەدرۆ ئەخاتەوە، جا ئەگەر هەڵوێستی ڕاست کردەوە دوای ئەوەی گومانەکانی بۆ ڕوون بووەوە، وە گەڕایەوە بۆ ئیسلام و دانی نا بە هەردوو شەهادەکەدا وە دانی بەوەدا نا کە لە پێشەوە ئینکاری لێ ئەکرد، وە خۆی ڕزگار کرد لە هەر ئاینێك کە پێچەوانەی ئاینی ئیسلام بوو، ئەوە تۆبەکەی وەرئەگیرێ، ئەگینا تۆڵەی بەسەردا جێبەجێ ئەکرێ.

وە هەندێ لە زانایان ئەو ماوەیەیان بە سێ ڕۆژ داناوە و هەندێکیان وازیان لە دانانی ماوەی مۆڵەتدان هێناوە، بەڵکو چەند جارێك موناقەشەو لێ کۆڵینەوەی لەگەڵدا ئەکرێ هەتا ئەزانرێ کە ناگەڕێتەوە بۆ سەر ئیسلام، ئەوکاتە تۆڵەی بەسەردا جێبەجێ ئەکرێ.

وە ئەوانەی ڕایان وایە کە ماوەکە سێ ڕۆژە پشتیان بەوە بەستووە کە ئەگێڕنەوە: پیاوێك لە شامەوە هات بۆ لای عومەر خوا لێی ڕازی بێت عومەر پێی فەرموو: ئایا دەنگ و باسی دوور وڵاتت پێیە؟. کابرا وتی: بەڵێ. پیاوێك دووای ئەوەی ئیسلام بووبوو هەڵگەڕایەوە و چووەوە سەر بێباوەڕی. عومەر فەرمووی: ئەی چیتان لێکرد؟ وتی: هێنامان لەملیمان دا. فەرمووی: ئەی بۆ لەماڵێکدا بەندتان نەکرد سێ ڕۆژ و هەموو ڕۆژێك کولێرەیەکتان نەدایە و داوای پەشیمان بوونەوەتان لێنەکرد، بەڵکو بگەڕایەوە بۆ لای فەرمانی خوا، لەپاشاندا فەرمووی: خوایە من ئامادە نەبووم و پێی ڕازی نەبووم و فەرمانم بە کوشتنی نەداوە و کاتێ پێم گەیشت ڕازی نەبووم پێی، خوایە من خۆم لە خوێنی ئەو کابرایە بەری ئەکەم بۆ لای تۆ، شافیعی گێڕاویەتیەوە[1].

وە ئەوانەی بۆ ڕای دووەم چوون پشتیان بەوە بەستووە کە ئەبوداود گێڕاویەتیەوە: موعاذ چوو بۆ لای ئەبو موسا لە یەمەن، پیاوێکی بینی لەلای کە دەست و پێی بەسترابوو.

(١) الشافعي (٢/٨٧).

ووتی: ئەمە چی‌یە؟

ووتی: پیاوێکە لە پێشاندا جولەکە بوو موسوڵمان بوو، لە پاشاندا گەڕاوەتەوە سەر ئاینی جولەکەو بووەتەوە بە جولەکە.

موعاذ ووتی: دانانیشم هەتا نەکوژرێ. ئەوە حوکمی پێغەمبەر بووە. (ﷺ) سێ جار ئەوەی دوبارە کردەوە جا فەرمانی‌دا کوشتیان[1]، وە ئەبوموسا پێش ئەوەی کە موعاذ بچێت بیست ڕۆژ یا نزیکەی ئەوە داوای پەشیمان بوونەوەی لێکردبوو. وە لە ڕێگای عبدالرزاق ەو هاتووە کە دوو مانگ داوایان لێکردبوو بگەڕێتەوە سەر ئیسلام.

شەوکانی ووتویەتی: وە ئەوانەی وتویانە داوای تۆبەی لێ ئەکرێ جیاوازی‌یان هەیە کە ئایا یەك جار بەسە؟ یان ئەبێ سێ جار بێت، وە ئایا ئەو سێ جارە لە یەك دانیشتندا بێت یا لە ماوەی سێ ڕۆژدا بێت، وە ئیبنو (بطال) نەقڵی کردووە لە عەلی یەوە خوا لێی ڕازی بێت کە ئەبێت مانگێ داوای پەشیمان بوونەوەی لێبکرێ، وە لە نەخەعی‌یەوە کە بە بەردەوامی داوای پەشیمان بوونەوەی لێ بکرێ.

### حوکمەکانی (مرتد) هەڵگەڕاوە:

ئەگەر موسڵمانێك هەڵگەڕایەوەو پاشگەز بووەوە لە ئیسلام ئەو حاڵەتەی کە لەسەری بووە ئەگۆڕێت، وە بە پێی ئەو گۆڕانە ئەو مامەڵەیەش ئەگۆڕێت، کە وەك موسوڵمانێك لەگەڵیا ئەکرا، وە چەند حوکمێکی بۆ چەسپاوە بە سوننەت کە لە خوارەوە باسی ئەکەین:

**(١) پەیوەندی ژن و مێردایەتی :**

ئەگەر ژن یا پیاو هەڵگەڕایەوە لە ئیسلام پەیوەندی ژن و مێردایەتی‌یان ئەپچڕێ، چونکە هەڵگەڕانەوەی هەریەکەیان جیابوونەوەیان پێویست ئەکات، وە ئەو جیابوونەوەش بە (فسخ) هەڵوەشاندنەوە دائەنرێت.

جا ئەگەر هەڵگەڕاوەکە پەشیمان بووەوە و گەڕایەوە سەر ئیسلام، ئەبێ عەقدو مارەیی تازە بکەنەوە، ئەگەر بیانەوێ ژیانی ژن و مێردی دەست پێ بکەنەوە[2].

---

(١) البخاري (٦٩٢٣) ومسلم (١٥/١٧٣٣) وأبوداود (٤٣٥٤).

(٢) فوقەها حەنەفی‌یەکان ڕایان وایە کە هەڵگەڕانەوەی مێرد دائەنرێ بە تەڵاقی بائن و ژمارەی تەڵاقەکانی پێ کەم ئەبێت.

وە دروست نیە بۆی کە عەقدی زەواج بکات لەگەڵ ژنێکی تر لەئەهلی ئەو ئاینەی کە چووەتە سەری، چونکە شایستەی کوشتنە.

**(٢) میراتەکەی :**

هەڵگەڕاوە لە ئیسلام میراتی هیچ کەس لە خزمەکانی ناگرێ کە بمرێ، چونکە هەڵگەڕاوە ئاینی نیە، وە کاتێك ئاینی نەبوو میراتی خزمە موسڵمانەکەی ناگرێ، بەڵام ئەگەر ئەو کوژرا یا مرد و نەگەڕابووەوە سەر ئیسلام، ئەوە هەرچی ماڵی هەبێت ئەدرێت بە میرات گرەکانی لە موسوڵمانان چونکە هەر لەوکاتەوە هەڵگەڕاوەتەوە لە حوکمی مردودایە.

پیاوێکی پیریان هێنا بۆ لای عەلی کوڕی ئەبو طالیب کە لە پێشەوە نەصرانی بوو موسڵمان بوو بوو، لە پاشاندا لە ئیسلام هەڵگەڕابووەوە، عەلی پێی فەرموو: لەوانەیە بۆیە هەڵگەڕابیتەوە تا میراتت دەست بکەوێ. لە پاشاندا ئەگەڕێیتەوە سەر ئیسلام؟

ووتی: نەء .

فەرمووی: ئەی لەوانەیە داوای ژنێکت لێکردبن ئەوانیش نەیان دابێ پێت، جا ویستوتە ژنەکەت بدەنێ لە پاشاندا بگەڕێیتەوە سەر ئیسلام؟

ووتی: نەء.

فەرمووی: کەوابێ بگەڕێرەوە سەر ئیسلام.

ووتی: ناگەڕێمەوە. هەتا ئەگەم بەمەسیح. عەلی فەرمانی دا لە ملیان داو میراتەکەیان دا بە منداڵە موسڵمانەکانی.

ئیبنو حەزم ووتویەتی: وە لە ئیبنو مەسعودەوە وەك ئەو بەسەرهاتە هاتووە. وە کۆمەڵێك بەوە گفتیان داوە، لەوانە: لەیسی کوڕی سەعد و ئیسحاقی کوڕی (راهویە). وە ئەوەش مەزهەبی ئەبی یوسف و محمد و یەکێ لە ریوایەتەکانە لە ئەحمەدەوە.

**(٣) نەمانی شیاویەتی ئەوە کە سەرپەرشتیکەربێ لەسەر کەسێکی تر:**

هەڵگەڕاوە لە ئیسلام بۆی نیە سەرپەرشتیکەری کەسێکی تر بێت، جا دروست نیە سەروکاری مارەکردنی کچەکانی بکات، و ژن بۆ کوڕە بچووکەکانی مارە بکات، وە پەیمانەکانی سەبارەت بەوان بەتاڵە، لەبەر ئەوەی بە هەڵگەڕانەوەی لە ئیسلام سەرپەرشتیکردنی لێ سەندراوەتەوە.

**سامانی (مرتد):**

هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام خاوەنێتی هەڵگەڕاوە لانابات و ئەو مافانەی هەیەتی لە ماڵی خۆیدا لێی ناستێنێتەوە و دەست بەرداری ناکات لێی، وە لە ماڵ و سامانیدا هەر وەك کافرێکی ئەسڵی وایە، وە بۆی هەیە بە ئارەزوی خۆی تەصەڕوف لەماڵی خۆیدا بکات، چونکە شیاویەتی تەواوی هەیە، وە بەمە کە موستحەقی کوشتن ئەبێت مافی لە خاوەنیەتی و مامەڵە کردندا ناسڕێتەوە، چونکە یاسادانەری ئیسلام بۆ هەڵگەڕاوە لە ئیسلام جگە لە کوشتن سزایەکی تری دانەناوە.

وە لەوەدا وەك کەسێك وایە کە حوکمی درابێت بە کوشتنەوە یا بە ڕەجم کردن.

چونکە کوشتنەوەی لە تۆڵەدا یا بە ڕەجم کردن مافی خاوەنێتی لێناسێنێتەوە، وە دەست بەرداری سامانەکەی ناکات.

**ڕۆیشتنی هەڵگەڕاوە بۆ خاکی بێباوەڕان :**

وە هەروەها ماڵەکەی ئەمێنێتەوە بە مولکی خۆی ئەگەر خۆی گەیاندە سەر زەوی بێباوەڕان، وە لەلای کەسێکی ئەمین بۆی دائەنرێ، چونکە ئەو ڕۆیشتنەی مافی خاوەنێتی لێناسەنێتەوە.

**هەڵگەڕانەوەی زیندیق :**

ئەبو حاتیمی سەجستانی ووتویەتی:

(زندیق) وشەیەکی فارسیە کراوە بە عەرەبی ئەسڵەکەی (زەندەکرو)یە واتە دەڵێ دونیا کۆتایی نایەت و هەر ئەمێنێ.

لە پاشاندا ووتویەتی: ثەعلەب وتویەتی:

لە زمانی عەرەبیدا ووشەی زندیق نیە بەڵکو ئەگەر کەسێك زۆر فێڵاوی بێت پێی ئەوترێ (زَنْدَقي) وە ئەگەر ئەوەیان ویستبێ کە خەڵك مەبستێتی ووتویانە: مولحید، دەهری. واتە ئەڵێن دونیا کۆتایی نایەت. وە جەوهەری وتویەتی: وشەی (زندیق) لە بت پەرستیەوە.

(حافظ ابن حجر) ووتویەتی: ئەو لێکۆڵینەوەی دانەری کتێبی (الملل والنحل) کردوویەتی ڕاستە: کە ئەسڵی زیندیق شوێن کەوتووانی (دیصان)ن لەپاشاندا (ماني) لە پاش ئەو (مەزدەك).

نەوەوی ووتویەتی: زندیق کەسێکە هیچ ئاینێکی نەبێت. وە لە (المسوی)دا بە کورتی ووتویەتی: ئەو کەسەی کە پێچەوانەیە بۆ ئاینی حەق ئەگەر دان بە ئاین دا نەنێت و مل کەچی نەبێت نە بە ڕواڵەت نە بە ناوەکی، ئەوە کافرە.

بەڵام ئەگەر کەسێك بە زمان دانی پێدا بنێت، وە دڵی لەسەر بێباوەڕی بێت، ئەوە دوو ڕووە (منافق).

بەڵام ئەگەر بە ڕواڵەت و ناوەکی دانی پێدا بنێت بەڵام هەندێ لەو شتانە کە سابت بوون لە دنیا بە زەرورەت بە جۆرێك لێك بداتەوە کە کە پێچەوانەی ئەوە بێت کە صەحابە و تابیعی لێکیان داوەتەوە، و نەتەوەی ئیسلام ئیجماعیان هەیە لەسەری، ئەوە ئەو کەسە زیندیقە.

وەك ئەوەی دان بەوەدا بنێت کە قورئان حەقە، وە ئەوەی کە تیایەتی باسی بەهەشت و دۆزەخ هەر حەقە، بەڵام بڵێت مەبەست لە بەهەشت هەر ئەو خۆشییەیە کە بەدەست دێ بەهۆی سیفەتە چاکەکانەوە، وە مەبەست لە ئاگر ئەو عەیب و نەنگەیە کە بە هۆی سیفەتە خراپەکانەوە پەیدا ئەبێت، ئیتر لە دەرەوە بەهەشت و دۆزەخ نییە، ئەو کەسە زیندیقە. وە ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (أولئك الذين نهاني الله عنهم) واتە: ئەوانە کەسانێکن خوا کوشتنیانی لێم قەدەغە کردووە، ئەوە لە بارەی موونافیقەکانە نەك لەبارەی زیندیقەکانەوە.

پاشان وتویەتی: یاسای ئیسلام وەك چۆن کوشتنی داناوە بە سزای هەڵگەڕانەوە، بۆ ئەوەی هەرەشەو چاوترسێن بێت بۆ هەڵگەڕاوەکان، وە بەرگری بێت لەو دینەی کە پێی ڕازی بووە، هەروەهاش کوشتنی داناوە بۆ سزای بوون بە زندیق، تا هەڕەشە بێت بۆ زیندیقەکان و دوورخستنەوە بێت لە لێکدانەوەی فاسید لە ئاین دا کە دروست نییە بوترێ. لە پاشاندا ووتویەتی: (تەئویل) لێکدانەوە دوو جۆرە:

تەئویلێك کەپێچەوانە نەبێت بۆ شتێك کە قەطعي و بڕاوە بێت لەلایەنی کیتاب و سوننەت و ڕێك کەوتنی نەتەوەی ئیسلام.

وە تەئویلێك کە دژایەتی بکات لەگەڵ ئەوەی کە سابت بووە بە شتێکی قەطعي، جا زەندەقە ئەم جۆرەیانە.

کەواتە هەرکەسێك ئینکاری شەفاعەت بکات و ئینکاری دیتنی خوای بەرز بکات لە ڕۆژی دوایی‌دا، یا ئینکاری سزای ناو گۆڕ و پرسیاری مونکەر و نەکیر و پردی صیراط و لێپرسینەوە بکات. جا یەکسانە کە بڵێت: باوەڕم بەو گێڕەرەوانە نییە. یان بڵێت: باوەڕم پێیان هەیە، بەڵام حەدیسەکە تەئویل هەڵدەگرێ. لە پاشاندا خۆی تەئویلێك باس بکات کە لەوەپێش نەبسترابێت، ئەوە زیندیقە.

وە هەروەها کەسێك بە هەردو شێخ بڵێت: «ئەبو بکر و عمر» ئەهلی بەهەشت نین، لەگەڵ یەك لەدوای یەکدا هاتنی حەدیس لەبارەی مژدە پێ دانیان بە بەهەشت، یا بڵێت: پێغەمبەر (ﷺ)

(خاتم النبوة)ە بەڵام واتای ئەم قسەیە ئەوەیە کە دروست نیىیە دووای ئەو بە کەس بووترێ (نـبـي).
بەڵام واتای (النبوة) کە مرۆڤێك لە لایەن خواوە نێرراوە بۆ سەر خەڵك و فەرزە ئیطاعەی بکرێ و
پاکە لە گوناە، و پاکە لەوەی لەسەر هەڵە بمێنێتەوە لەو شتانەیا کە رای لەسەریەتی، جا ئەو
(نبوة)ە لە ئیمامەکانی دوای پێغەمبەردا (ﷺ) هەیە[1]. تائەوەیە زیندیق.

وە جەماوەری زانایانی دوایی لە حەنەفی و شافیعییەکان لەسەر ئەوە رێکن کە هەرکەس لەسەر
ئەو بۆچونە بڕوات ئەبێ بکوژرێ. و الله أعلم. قسەی خاوەنی (الموسوی) تەواو بوو.

ئایا سیحرباز ئەبێ بکوژرێ :

زانایان لەسەر ئەوە رێکن کە سیحر کاریگەرییەکی هەیە، وە ئەوەی بە حەڵاڵی بزانێ کافرە،
بەڵام جیاوازییان هەیە لەوەدا کە سیحر حەقیقەتی هەیە، یا خەیاڵ کردنە، وەك چۆن جیاوازییان
هەیە لەوەدا کە سیحر کوفرە یا کوفر نییە؟

بەو شێوەیەش جیاوازییان هەیە دەربارەی (ساحر) جادووگەر.

ئەبو حەنیفە و مالیك و ئەحمەد ووتویانە: سیحرباز ئەبێ بکوژرێ بە فێربوونی سیحر و
کارپێکردنی، چونکە کوفرە، ئیتر بێ ئەوەی داوای تۆبەکردنی لێبکرێ. وە شافیعییەکان و
ظاهیرییەکان ووتویانە: ئەگەر ئەو کردەوەیە یا ئەو قسەیەی سیحرەکەی پێئەکات کوفر بێت، ئەوە
سیحربازەکە هەڵگەڕاوەتەوە لە ئاین و حوکمی هەڵگەڕاوەی ئەدرێ بەسەردا، مەگەر تۆبە بکات.

بەڵام ئەگەر کوفر نەبێت ناکوژرێ، چونکە کافر نەبووە، بەڵکو سەرپێچی کەرەو بەس.

لە ڕاوڵەتدا سیحر سەرپێچی کردنی فەرمانی خوایە و لەگوناهە گەورەکانە، وە سیحرباز بە
سیحرکردنەکەی ناکوژرێ، مەگەر باوەڕی وابێت سیحر حەڵاڵە، ئەگەر باوەڕی وەهابوو ئەبێتە
هەڵگەڕاوە لە ئاین، نەك بە سیحرەکەی، بەڵکو بە حەڵاڵ کردنی ئەوەی کە خوا حەرامی کردووە.

ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (إجتنبوا السبع
الموبقات) فقيل: يا رسول الله وماهما قال الشرك بالله، و السحر، و قتل النفس التي حرم الله
قتلها إلا بالحق، و أكل مال اليتيم و أكل الربا، و التولي يوم الزحف، و قذف المحصنات
المؤمنات).

واتە: دووربکەونەوە لە حەوت کوژەرەکان. ووتیان: ئەی نێرراوی خوا ئەوانە چین؟ فەرمووی:
هاوبەش بۆ خوا پەیداکردن، وە سیحر، وە کوشتنی کەسێکە کە خوا کوشتنی حەرام کردووە بە

---

(١) وەك هەندێ قادیانی باوەڕیان بە غولام ئەحمەدە کە بانگەوازی پێغەمبەرێتی ئەکرد بە درۆ.

حەق نەبێت، وە خواردنی ماڵی هەتیو، وە سوود خواردن، وە پشت هەڵکردن لەکافران لەرۆژی جەنگدا.

وە هەڵبەستنی تاوانی زینا بۆ ئافرەتانی باوەڕداری داوێن پاك.

ئیبنو حەزم دووای ئەوەی لە بەڵگەکانی ئەوانە کۆڵاوەتەوە کە ووتویانە سیحرباز کافرە و پێویستە بکوژرێ ووتویەتی: وە بە صەحیحی هاتووە کە سیحرکردن کوفر نیە، جا ئەگەر کوفر نەبێت، ڕەوا نیە کوشتنی بکەرەکەی، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (لا یحل دم امريء مسلم إلا بإحدى ثلاث: كفر بعد إيمان، و زناً بعد إحصان، و نفس بنفس)[1].

واتە: ڕەوا نیە ڕشتنی خوێنی موسڵمان بە یەکێ لەم سیانە نەبێت:

بێباوەڕ بوون دووای باوەڕهێنان، زیناکردن دووای ژن هێنان یا شووکردن، وە گیان بە گیان واتە کوشتنەوە لە جیاتی کوشتن.

جا سیحرباز نە کافرە نە پیاوکوژ وەك ڕوونمان کردەوە، وە نە زیناکەری موحصەنە و نە دەربارەی کوشتنی دەقێکی ڕاست هاتووە، تا بخرێتە سەر ئەو سیانە وەك دەربارەی جەنگاوەری کافر هاتووە. لەپاشاندا ووتویەتی: کەواتە حەرامە ڕشتنی خوێنی سیحرباز بە دڵنیاییەوە کە هیچ گومانی تێدا نیە.

وە ڕای شیعە ئەوەیە کە سیحرباز هەڵگەڕاوەیە لە ئایین و حوکمەکەی حوکمی هەڵگەڕاوەیە.

## (کاهن) و (عراف):[2]

ئیمام ئەبو حەنیفە ڕای وایە : کە (کاهن) و (عراف) هەقی کوشتنیان هەیە بەپێی قسەکەی عومەر کە فەرموویەتی: هەموو سیحربازێك و فاڵچییەك بکوژن.

وە لە ڕێوایەتێکدا کە لێیەوە هاتووە فەرموویەتی: (ئەگەر تۆبەیان کرد نابێ بکوژرێن).

زانایانی پێشینی حەنەفی ڕایان وابووە ئەگەر کاهین و عەڕاف باوەڕیان وابوو شەیتانەکان چی ئارەزوو بکەن ئەیکەن ئەوە کافرن، بەڵام ئەگەر باوەڕیان وابوو کە خەیاڵە و ئەوەی ئەیکەن حەقیقەتی نیە کافر نابن.

---

(١) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابووورد.

(٢) (کاهن) فاڵچی کسێکە جنۆکە ڕائەگرێ بۆ ئەوەی دەنگ و باسی بۆ بهێنن. و (عراف)ئەو کسەیە لە خۆیەوە قسەئەکات و ئیدیعای زانینی غەیب ئەکات.

## ڕێگری و جەردەیی (الحرابة)

**پێناسەکەی :**

حرابة: کە ڕێبڕیشی پێئەڵێن، -دەرچوونی کۆمەڵێکی چەکدارە لەناو خاکی ئیسلامدا بۆ ئاژاوە نانەوەو خوێن ڕشتن و تالآن کردن و ئەتکی ناموس و لەناوبردنی کشتوکاڵ و زەوی و زار و ئاژەڵ.

وە بەو کارە دژایەتی ئاین و ڕەوشت و یاسا ئەکەن.

وە جیاوازی نی‌یە کە ئەو کۆمەڵەیە لە موسڵمانەکان بن، یا لە کافرە ذمی‌یەکان بن، یا هاوپەیمان بن، یا کافری جەنگی بن، مادام لەسەر زەوی ئیسلام بن، وە مادام دەست درێژی‌یەکەیان بۆ سەر ئەوانە بێت کە خوێنیان پارێزراوە لەو کۆمەڵە جا لە موسوڵمانان بن یان ذیمي بن.

وە وەك چۆن (حرابة) جەردەیی بەدەرچوونی کۆمەڵێك لە کۆمەڵەکان پێك دێت، ئاواش بەدەرچونی تەنیا کەسێکیش پێك دێ.

جا ئەگەر تەنیا کەسێك دەسەلاتی کوشتن و بڕینی هەبوو وە توانای بوو کە زاڵ ببێ بەسەر گیان و ماڵ و ناموسی کۆمەڵێکدا، ئەوە ئەو کەسە (محارب) جەردەو ڕێگرە.

وە ئەچێتە ناو مانا و مەفهومی (حرابة)ەوە هەموو (عصابة) چەتە جیاجیاکان، وەك (عصابة)ەی پیاو کوشتن، وە (عصابة)ەی منداڵ ڕفاندن، وە چەتەی دزی و چونە سەر ماڵان و بانکەکان، وە هەروەها چەتەی ڕفاندنی کچان بۆ داوێن پیسی، وە وە چەتەی تیرۆر کردنی حاکم و کاربەدەستان بۆ گێرەشێوێنی‌و تێکدانی ئەمن و ئاسایش هەروەها چەتەی لەناوبردنی دەغڵ و دان و کوشتنی ئاژەڵ و گیانداران.

وە وشەی (حرابة) لە (حرب)ەوە وەرگیراوە. لەبەر ئەوە ئەو کۆمەڵە یاخی بووە لە یاسا دەرچوانە بە (محارب) جەنگ کەر دائەنرێن لە لایەکەوە جەنگ لەگەڵ کۆمەڵدا ئەکەن وە لەلایەکی ترەوە جەنگ لەگەڵ تەعلیمات و ئامۆژگاری‌یەکانی ئیسلام ئەکەن کە هاتوون بۆ بەدەست هێنانی ئەمن و ئاسایشی کۆمەڵ و سەلامەتی کۆمەڵ بە پارێزگاری کردنی مافەکانی.

جا دەرچوونی ئەو کۆمەڵە بەو شێوەیە بە (محاربة) دائەنرێ ئیتر لەوەوە وشەی (حرابة) وەرگیراوە.

وە وەك چۆن ئەو دەرچوونە لە کۆمەڵ و ئاینەکەی بە (حرابة) جەردەیەتی ناو ئەبرێت، هەروەها بە ڕێگا بڕینیش ناوئەبرێت، چونکە بە دەرچوونی ئەو کۆمەڵە خەڵك لە ڕێگا دائەبڕێن و ناوێرن پیێدا بڕۆن، لە ترسی کوشتن و تالآن کردن و ئاتکی ناموسیان یا لە ترسی ئەوەی توشی شتێ بین کە توانایان نەبێ ڕووبەڕووی بوەستن،

وە هەندێ لە زانایان بە (دزی گەورە) ناوی ئەبەن.

(حرابة) تاوانێکی گەورەیە :

جەردەیەتی -یا ڕێگری- بە تاوانە گەورەکان دائەنرێت، هەربۆیە قورئانی پیرۆز بە دوورترین عیبارەت ناوی ئەو کەسانەی بردووە کە خۆیان خستۆتە ناو ئەو تاوانەوە، وە داینـاون بە (محارب) شەڕکەر دژی خواو ڕەوانەکراوی خوا، وە ناوی بردون بە هەوڵدەری فەساد لەسەر زەوی، وە سزایەکی ئەوەندە توندی بۆ داناون کە بۆ هیچ تاوانێکیکەی دانەناوە.

خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الْأَرْضِ فَسَاداً أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلَافٍ أَوْ يُنْفَوْا مِنَ الْأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ (المائدة:٣٣)

واتە: بە ڕاستی سزای ئەو کەسانەی ئەجەنگن دژی خوا و دەست درێژی ئەکەنە سەر حوکمەکانی خواو نێرراوەکەی، و هەوڵی خراپەکاری ئەدەن لە زەویدا، ئەوەیە کە بکوژرێن، یا لەدار بدرێن، یا دەست و قاچیان ببڕدرێ بە پێچەوانەی یەکەوە، یا لە زەویدا دەربەدەر بکرێن، ئەو سزایە لە دونیـادا سەرشۆڕییە بۆیان، و لە ڕۆژی دوایشدا سزایەکی گەورەو توندوتیژیان بۆ ئەبێت ئەگەر تۆبە نەکەن.

وە پێغەمبەر (ﷺ) ڕای گەیاندووە کە ئەو کەسەی ئەو تاوانە ئەنجام ئەدا شەرەفی ئەوەی نییە کە سەر بە ئیسلام بێت، ئەفەرمووێ: (من حمل علينا السلاح فليس منا) رواه البخاري و مسلم من حديث ابن عمر[1].

واتە: هەرکەس چەك دژمان هەڵگرێ لە ئێمە نییە[2].

جا کەسێك شەرەفی سەر بە ئیسلامی نەبێت بە زیندوویی، دووای مردنیش هەر نایبێت، چونکە خەڵکی ئەمرن لەسەر ئەو شێوەیەی کە لە ژیاندا لەسەری بوون، وەك چۆن زیندو ئەکرێنەوە لەسەر ئەوەی کە لەسەری مردون. ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (من خرج على الطاعة، وفارق الجماعة ومات، فميتته جاهلية) أخرجه مسلم[3].

---

(١) البخاري (٧٠٧١) ومسلم (١٠٠/١٦٣).

(٢) هەرکەس چەك دژمان هەڵبگرێ: واتە هەڵی بگرێ بۆ شەڕ کردن لەگەڵ موسوڵمانان بەناحەق. لەئێمە نییە واتە لەسەر ڕێو ڕەوشتی ئێمە نییە، چونکە ڕێو ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ سەرخستنی موسوڵمانەو جەنگ کردنە لە پێناوی موسوڵماندا، نەك تۆقاندنی و شەڕ لەگەڵدا کردنی.

(٣) مسلم (٥٣/١٨٤٨).

واتە: هەرکەس لە طاعەتی ئەو حاکمە دەرچوو کە موسڵمانان لەسەر حاکمێتی ڕازین لەهەر وڵاتێك بێت، لە وڵاتە ئیسلامی‌یەکان، و لە کۆمەڵی ئەو کەسانە دەرچوو کە ڕێك کەووتون طاعەتی ئەو ئیمامە بکەن، وە بەو شێوەیە مرد، ئەوە مردنەکەی مردنێکی جاهیلی‌یە.

مەرجەکانی (حرابة) جەردەیی :

پێویستە (محاربون) جەردەکان چەند مەرجێکیان تێدا بێت بۆ ئەوەی شیاوی ئەو سزادانراوە بن کە بۆ تاوانی جەردەیی و ڕێگری دانراوە ئەو مەرجانەش ئەمانەن:

١- تەکلیف.

٢- بوونی چەك.

٣- دووری لە ئاوەدانی.

٤- ئاشکرایی.

زانایان هەموویان لەسەر ئەو مەرجانە ڕێك نەکەوتون، بەڵکو چەند لێکۆڵینەوەیان تێدا هەیە کە لە خوارەوە باسیان ئەکەین.

(١) مەرجەکانی تەکلیف :

مەرجە کە جەردە و ڕێگر ژیر و پێگەیشتوو بێت، چونکە ئەو دووانە مەرجی تەکلیفن کە تەکلیفیش مەرجە بۆ بەجێ هێنانی تۆڵە.

هەر بۆیە شێت و منداڵ هیچیان بە (محارب) جەردە دانانرێن، هەرچەندە هاوبەشیش بکەن لە کاروباری (محاربة)دا چونکە بەپێی شەرع هیچیان تەکلیفیان لەسەر نیە. وە زانایان لەوەدا جیاوازی‌یان نیە، بەڵام جیاوازی‌یان هەیە لەوەدا ئەگەر منداڵ و شێت هاوبەش بن لە ڕێگری‌دا.

ئایا تۆڵە لە کۆڵ ئەوانەی تر ئەکەوێ کە هاوبەشی‌یان کردوە لەو کارەدا، بەهۆی ئەوەوە کە لەکۆڵ منداڵ و شێتەکە ئەکەوێت؟

حەنەفی‌یەکان ووتویانە: بەڵی تۆڵەیان لە کۆڵ ئەکەوێ، چونکە ئەگەر تۆڵە لە کۆڵ هەندێکیان بکەوێ ئەوانی تریش ئەگرێتەوە بەو پێیەی کە هەموویان بە یەکەوە لێپرسراون بەرامبەر ئەو کارە،

وە ئەگەر تۆڵەی ڕێگری‌یان لەکۆڵ کەوت ئینجا سەیری ئەو تاوانانە ئەکرێ کە کردوویانە بە تاوانی ئاسایی دائەنرێن و سزا ئەدرێن لەسەری بەو شێوەیە کە بڕیار دراوە.

جا ئەگەر تاوانەکە کوشتن بوو کاری ئەو دەدرێتە دەستی خاوەن خوێنەکە، بۆی هەیە یا لێی ببورێ، یا تۆڵەی لێبکاتەوە. وە هەروەهایە بەپێی تاوانەکانی تر.

بەڵام مەزهەبی مالیكی و ظاهیری و جگە لەوانیش ئەوەیە ئەگەر تۆڵەكە لە كۆڵ منداڵ و شێتی ناویان بكەوێ، لە كۆڵ بەشدارەكانی تر ناكەوێ، چونكە ئەو تۆڵەیە مافی خوای گەورەیە، وە ئەو مافەش سەیری تاكە كەسی تیا ناكرێ (بەڵكو تەماشای تاوانەكە دەكرێ).

وە نێرینەیی و ئازادی نەكراون بە مەرج، چونكە مێینەیی و بەندایەتی كار ناكەنە سەر تاوانی جەردەیی.

بەڵكو جاری وا ئەبێت ژن و كۆیلەش ئەو تواناو هێزەیان ئەبێت كە لەخەڵكی تردا هەیە، بۆ رێ و شوێن دانان و چەك هەڵگرتن و یاخی بوون، كەواتە حوكمی جەردەییان بەسەردا ئەدرێ وەك كەسانی تر.

(۲)مەرجی هەڵگرتنی چەك :

مەرجە كە جەردە و رێگرەكان چەكیان پێبێت، چونكە ئەو هێزەی كە پشتی پێ ئەبەستن لە رێگرتنەكەیاندا هێزی چەكە. جا ئەگەر چەكیان پێنەبوو بە جەردە دانانرێن، چونكە ناتوانن رێ لەو كەسانە بگرن كە بۆیان دێن.

بەڵام ئەگەر چەكەكەیان بەرد و تێڵا بوو ئایا هەر بە جەردە دادەنرێن؟

زانایان لەوەدا جیاوازن:

شافیعی و مالیك و حەنبەلیەكان و ئەبو ثەور و ئەبو یوسف و ئیبنو حەزم ووتویانە:

ئەوانەش هەر بە جەردەو رێبڕ دائەنرێن، چونكە جۆری چەك ئیعتباری بۆ ناكرێ، وە هەروەها زۆری چەك، بەڵكو ئیعتیبار تەنها وا لە رێبڕین دا.

ئەبو حەنیفە ووتویەتی: (بە جەردە و رێگر دانانرێن).

(۳)مەرجی بیابان و دووری لە ئاوەدانیەوە :

وە هەندێ لە زانایان بوونیان لە بیاباندا نەكاتە مەرج، جا ئەگەر لە ناو خانو و ماڵاندا ئەو كارە بكەن بەرێگر دانانرێن، چونكە پێویستە كە پێی بووترێ تۆڵەی رێبڕ و رێگەگر، وە رێبڕینیش هەر لەبیاباندا ئەبێت، چونكە لەناو ئاوەدانیدا زۆر جار بە فریای ئەكەون و سامی جەردەكان نامێنێ، بەوە ئەبن بە دز دزیش جەردە و رێگر نیە و تۆڵەی رێگریشی لێ ناسەندرێ.

ئەوەش گفتی ئەبو حەنیفە و ثەوری و ئیسحاق و بەشی زۆری زانایانی شیعەیە. هەروەها قسەی (خرقی)یە لە حەنبەلیەكان، وە لە (الوجیز)دا تەئكیدی ئەو رایەی كردووە.

وە کۆمەڵێکی تر لە زانایان بۆ ئەوە چوون کە حوکمی ئەو جۆرە کەسانە لە بیابان و ئاوەدانیدا وەك یەکە، چونکە ئایەتەکە بە گشتی هەموو موحاریبێك ئەگرێتەوە.

وە لەبەرئەوەی لە ئاوەدانیدا زیانیان گەورەترە، کەواتە لە پێشترە پێیان بووترێ جەردە، وە ئەو یاخیبووانەش ئەگرێتەوە کە رێك کەوتون لەسەر تاوان کاری و کوشتن و برین.

ئەمەش مەزهەبی شافیعی و حەنبەلیەکان و ئەبی ثەورە. وە ئەوزاعی و لەیس و مالیکی و ظاهیریەکانیش گفتیان لەسەر داوە.

وە وادەرئەکەوێ کە ئەو جیاوازییە بەپێی جیاوازی وڵاتەکانە. جا هەرکەس مەرجی بیابانی داناوە سەیری لایەنی زۆری کردووە، یا ئەو لایەنەی گرتووە کە ئەو کارە لە سەردەمی ئەودا لە ئاوەدانیدا رووی نەداوە، وە ئەوانەی ئەوەیان نەکردۆتە مەرج پێچەوانەی ئەوانەن.

لەبەرئەوە شافیعی ئەڵێت: ئەگەر سوڵتان لاواز بوو و جەردەیەتی لە ئاوەدانیدا زۆرتر بوو ئەوە بە جەردە ئەژمێررێن. بەڵام ئەگەر بەو شێوەیە نەبوو بە دز دائەنرێن لای ئەو.

(٤)مەرجی ئاشکرایەتی :

وە لە مەرجەکانی رێگری و جەردەیی ئاشکرایەتییە کە ئەبێت بە ئاشکرا ماڵ و سامانی خەڵك ببەن.

جا ئەگەر بە نهێنی ببەن بە دز ئەژمێررێن، وە ئەگەر رفانیان و هەڵاتن بە تاڵان کەر دائەنرێن نەك بەرێگر.

وە هەروەهایە ئەگەر یەك دوو کەس هێرشیان کردە سەر ئاخری کاروانەکەو شتێکیان لێ رفاند، چونکە کارەکەیان ناگەرێتەوە بۆ هێزو دەسەڵات.

بەڵام ئەگەر کاروانەکە ژمارەیان کەم بوو، وە جەردەکان بە سەریاندا زاڵ بوون، ئەوە بە رێگر دائەنرێن.

ئەوەش مەزهەبی حەنەفی و شافیعی و حەنبەلیە.

وە مالیکی و ظاهیری پێچەوانەی ئەوەن. (إبن العربي مالكي) وتویەتی: ئەو رایەی ئێمە هەڵی ئەبژێرین ئەوەیە کە (حرابة) گشتییە لە ئاوەدانی و چۆڵەوانیدا، هەر چەندە هەندێکیان پیستر بێ لەهەندێکیان، بەڵام ناوی (حرابة) جەردەیەتی ئەیان گرێتەوە، وە واتای جەردەیەتییان تێدا هەیە، وە ئەگەر ئەو کەسە بە تێلایەکەوە لە شاردا دەرچێ بە شمشێر ئەکوژرێت، وە بە شتێکی توندتر

ئەگیرێ نەك بە ئاسانتر. چونکە ئەو بە فرِوفێڵ خەڵکی ڕوت کردۆتەوە. وە کاری فرِوفێڵ ناشیرین ترە لە ئاشکرایی لەبەر ئەوەشە لێبووردن هەیە لە کوشتنی ئاشکرادا، وە بووە بە (قصاص).

بەڵام لەکوشتنی بە فێڵدا نیە چونکە بووە بە (حرابة) کەواتە دەرچوو کە ڕێگری کوشتن پێویست ئەکات.

وە وتویەتی: لەو ڕۆژانەدا کە قازی بووم کێشەی کۆمەڵێکم هاتەبەردەست کە بوبونە جەردە لە کۆمەڵێك ئافرەتێکیان لەو کۆمەڵە دزی بوو بە زاڵ بوون بەسەر مێردەکەیدا کە لەو کۆمەڵەیە بوو وە بردبوویانە چۆڵەوانی یەك، پاشان بەپەلە بە شوێنیانا گەڕان گرتنیان و هێنایانن، منیش پرسیارم کرد لەو کەسانەی کە خوای گەورە منی تاقی کردبۆوە پێیان لەموفتی یەکان لەبارەیانەوە، ئەوانیش وتیان: ئەمانە جەردە نین، چونکە جەردەیەتی لە ماڵ و ساماندایە نەك لە ناموس دا.

منیش پێم وتن: (إنا لله و إنا إليه راجعون) ئەی نازانن کە جەردەیی لەناموسدا زۆر ناشیرینتر و توندترە وەك لە ساماندا، وە بەڕاستی خەڵك ڕازین ماڵ و سامانیان تیدا بچێت و تالان بکرێن، بەڵام ڕازی نابن کە ژن و کچیان بە تالان ببرێت، وە ئەگەر لەو سزایە زیاتر هەبوایە کە خوا فەرموویەتی بۆ ئەوانە ئەبوو کە ناموس و شەرەفی خەڵك بە تالان ئەبەن، جا ئیتر بەستانە و ئاگاتان لە خۆتان بێت هاوڕێیەتی نەفام مەکەن، بە تایبەتی لە فەتواو قەزادا.

(قرطبي) وتویەتی: موغتال وەك جەردە وایە، موغتال کەسێکە بە فێڵ خەڵك لەناو ئەبات بۆ ئەوەی سامانەکەی ببات، با چەکیشی هەڵنەگرتبێ، بەڵام ئەچێتە ماڵەکەیەوە، یا ئەبێتە هاوڕێی لە سەفەردا، زەهری دەرخوارد ئەدات و ئەیکوژێ، جا ئەو کەسە بە تۆڵەی جەردەیەتی ئەکوژرێ نەك لە جیاتی خوێن.

وە نزیك لەم قسەیە ڕای ئیبنو حەزمە کە ووتویەتی: جەردە ئەو کەسەیە کە خۆی بە زل بزانێ و کاروان بترسێنێ و خراپەکاری لە ڕێگا و باندا بکات، چەك بە شان بێت یا هەر بێ چەك بێت. بەشەو بێت یا بە ڕۆژ، لە ئاوەدانیدا بێت یا لە چۆڵەوانیدا، لە کۆشکی خەلیفەدا بێت، یا لەمزگەوتدا، کەسی لەگەڵدا بێت یا بە تەنها، دابڕاوبن لە بیاباندا یا لە دێهاتدا دانیشتووبن لە ماڵەکانیاندا یا لەناو قەڵادا بن، خەڵکی شاری گەورە بن یا بچووك، هەروەها تاکە کەس بێت، یا زۆربن، هەموو ئەو کەسانەی کە ڕێبگرن بە کاروان و خەڵك بکوژن و تالانی بکەن و خەڵك بریندار بکەن و ئابڕووی خەڵك ببەن، ئەوانە جەردە و ڕێگرن، زۆربن یا کەم.

بەوەدا دەرئەکەوێ کە مەزهەبی ئیبنو حەزم فراوانترین مەزهەبە دەربارەی (حرابة) جەردەیی و ڕێگری.

مالیکی‌یەکانیش وەك ئەون، چونکە لای ئەمانیش هەرکەس ڕێگاوبان پڕمەترسی بکات لە هەر شوێنێك بێت، بەهەر شێوەیەك بێت، بە جەردە و ڕێگر دائەنرێن و شایستەی سزای جەردە و ڕێگرن.

سزای (حرابة) ڕێ گری:

خوای گەورە لەبارەی تاوانی (حرابة) ئەم ئایەتانەی ناردۆتە خوارەوە:

﴿إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الْأَرْضِ فَسَاداً أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلافٍ أَوْ يُنْفَوْا مِنَ الْأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ (المائدة: ٣٣-٣٤).

واتە: بە ڕاستی سزای ئەو کەسانەی دژی خوا ئەجەنگن و دەست درێژی ئەکەنە سەر حوکمەکانی خواو نێرراوەکەی، و هەوڵی فسادو خراپەکاری ئەکەن لە زەویدا، ئەوەیە کە بکوژرێن، یا لەدار بدرێن، یا دەست و قاچیان بە پێچەوانە ببڕێت (واتە: دەستی ڕاستی و قاچی چەپی یا دەستی چەپی و قاچی ڕاستی). یا دەربەدەر بکرێن لە زەویدا. ئەو سزاو تۆڵەیە ڕیسوایی‌یە بۆیان لە دونیادا و لە ڕۆژی دوایشدا سزایەکی گەورەیان بۆ ئەبێت. مەگەر ئەوانە کە تۆبە ئەکەن و پەشیمان ئەبنەوەو خۆیان دێن پێش ئەوەی دەستتان بیانگاتێ، ئەوانە مافی خوایان لەکۆڵ ئەکەوێ، جا بزانن کە خوا زۆر لێ خۆشبووە بۆ بەندەکانی و میهرەبانە پێیان.

ئەم ئایەتانە دەربارەی کەسانێك هاتۆتە خوارەوە کە دەرچوون لە موسوڵمانان و ئەبنە جەردەو ڕێگرو هەوڵی بڵاوبونەوەی خراپە ئەدەن لە زەویدا بەپێی ئەوەی ئەفەرموێ : ﴿إلا الَّذين تابُوا مِنْ قَبْلِ أنْ تَقْدِروا عَلَيْهِم﴾ ئەو تۆبەیەش بۆ موسوڵمانانە.

وە زانایان هەموو لەسەر ئەوە ئیجماعیان هەیە کە ئەگەر بێ‌بڕواکان کەوتنە دەستی موسوڵمانان و موسوڵمان بوون، ئەوە ئیسلام گیان و ماڵیان ئەپارێزێ، هەرچەندە پێش ئیسلام بونیان تاوانی وەهایان کردبێ کە کوشتنی پێویست کردبێ لەسەریان.

﴿قُلْ لِلَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ يَنْتَهُوا يُغْفَرْ لَهُمْ مَا قَدْ سَلَفَ﴾ (لأنفال:٣٨).

واتە: بڵێ بەبێ بڕواکان، ئەگەر واز لە کوفرو دوژمنایەتی پێغەمبەر ﷺ بهێنن و بگەڕێنەوە بۆ سەر ئیمان بە خوای تاك و تەنیاو شەڕنەکردن لەگەڵ پێغەمبەرو بڕواداران، ئەوە خوا لەهەموو تاوانە پێشوەکانیان ئەبورێت.

ئەمەش ئەبێتە بەڵگەی ئەوەی کە ئایەتەکە دەربارەی موسوڵمانان هاتووەتە خوارەوە، وە مانای (يحاربون الله ورسوله) واتە: دژی موسوڵمانان ئەجەنگن بەو ئاژاوەو گێرەشێوێنی و ترسەی بڵاوی ئەکەنەوە، وە دژی ئیسلام ئەجەنگن بە دەرچوونیان لە ئامۆژگاری‌یەکانی ئیسلام و سەرپێچی کردنی.

جا (إضافة) لکاندنی وشەی (حرب) بە وشەی (اللّه) وە وشەی (رسول) ڕاگەیاندنەکە جەنگ دژی موسوڵمانان هەر ئەڵێی جەنگ کردنە دژی خواو نێرراوەکەی، هەروەك ئەوەی خوا ئەفەرموێ:

﴿يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا﴾ (البقرة:٩).

واتە: خواو ئەوانەی باوەڕیان هێناوە ئەخەڵەتێنن.

کەواتە وشەی (محاربة) جەنگ کردن لێرەدا مەجازیە.

(قرطبي) وتویەتی: ئەجەنگن دژی خواو پێغەمبەرەکەی ئیستیعارەو مەجازە، چونکە خوای گەورە شەڕ لە دژی ناکرێ، لەبەرئەوەی هەمو سیفاتی کەماڵی هەیە. وە لەبەر ئەوەی کە واجبە بە بەرز و بەڕێز دابنرێ لە پێچواندن و شوبهاندن. وە واتاکەی ئەجەنگن دژی دۆستەکانی خوا. وە خوا دەربڕین و تەعبیری بە نەفسی خۆی کردووە لەبری دۆستەکانی لەبەر ئەوەی ئازاردانی دۆستەکانی زۆر لاگرانە، وەك چۆن لە جیاتی هەژار و کەم دەستەکان بە خۆی تەعبیری کردووە کە ئەفەرموێ:

﴿مَنْ ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضاً حَسَناً﴾ (البقرة من الآية:٢٤٥).

واتە: کێ قەرزێکی چاك ئەدات بە خوا. ئەمەش لەڕووی هاندانەوەیە تا بەزەیی‌یان پێیانا بێتەوە.

وە وێنەی لە سوننەتی صەحیحیشدا

(استطعمتك فلم تطعمني)[1].

واتە: داوای خواردنم لێکردی بەڵام خواردنت نەدامێ -تەواو-

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە:

جەماوەری زانایان دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ووتویانە: کۆمەڵێك لە هۆزی عورەنی هاتنە مەدینەو موسڵمان بوون، لەبەر ئەوەی هەوای مەدینەیان پێنەکەوت نەخۆش کەوتن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێدان بچن بۆ ناووشترگەلەکەی زەکات، ئەوانیش چوون بۆ ناویان، وە فەرمانیدا وشتری شیرداریان بۆ بهێنن تا لە شیرەکەی و میزەکەی بخۆنەوە، کاتێ ئەوەیان کرد چاك بوونەوە، کاتێ چاك بوونەوە شوانەکەیان کوشت و لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو وشترەکانیان دایە بەرخۆیان و بردیان.

(١) مسلم (٢٥٦٩).

پێغەمبەر کۆمەڵێکی نارد بە دوایاندا هێشتا ڕۆژ بەرز نەبوبۆوە هێنایانەوە بۆ مەدینە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دا دەست و قاچیان ببڕن و چاویان دەربهێنن[1]. وە لە دۆڵێکدا بە ناوی حەڕرە بەرەڵایان کردن وە داوای ئاویان ئەکرد و کەس ئاوی نەئەدانێ تاوەکو مردن.

ئەبو قەلابە ووتویەتی: ئەوانە کۆمەڵێك بوون دزییان کردبوو پیاویان کوشتبو و لە ئاین هەڵگەڕابوونەوە دوای ئەوەی باوەڕیان هێنابوو، وە دژی خواو پێغەمبەر (ﷺ) جەنگابوون. جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾[2] (المائدة: من الآية٣٣).

ئەو سزایانەی ئایەتە پیرۆزەکە بڕیاری داوە :

وە ئەو سزایانەی ئەم ئایەتە دایناوە بۆ ئەو کەسانەی دژی خواو پێغەمبەرەکەی ئەجەنگن و هەوڵی بڵاوبوونەوەی خراپە ئەدەن لەسەر زەوی یەکێ لەم چوار سزایانەی لای خوارەوەیە:

١- کوشتن.

٢- یا لەداردان.

٣- یا دەست و قاچ بڕین بە پێچەوانەی یەکەوە.

٤- یا دەربەدەرکردن بە زەویدا.

ئەم سزایانەش بە عەطف کراوەیی هاتوون لە ئایەتەکەدا بە هۆی پیتی (أو)ەوە. جا هەندێ لە زانایان ئەڵێن:

عەطف کردنەوە بە پیتی (أو) هەڵبژاردن ئەگەیەنێ، واتە حاکم بۆی هەیە سزایەك لەو سزایانە هەڵبژێرێ، چۆن بە بەرژەوەندی زانی، بێ ئەوەی سەیری ئەو تاوانە بکات کە جەردەکان کردوویانە.

وە بەشی زۆری زانایان ووتویانە: پیتی (أو) لێرەدا بۆ جۆراوجۆر کردنە نەك بۆ هەڵبژاردن، واتە سزاکان جۆراوجۆرن بەپێی جۆراوجۆری تاوانەکانە، وە سزاکان بەپێی تەرتیبی تاوانەکانە نەك لەسەر هەڵبژاردن.

بەڵگەی ئەوانەی کە ئەڵێن پیتی (أو)ە بۆ هەڵبژاردنە:

---

(١) بۆیە وایان لێ کرا چونکە ئەوان بەوجۆرەیان کرد لە شوانەکە کەواتە تۆڵە بوو. وە جەزای خراپە خراپەیە وەکو خۆی.

(٢) البخاري (٤١٩٢) ومسلم (١٦٧١/٩-١١) وأسباب النزول للواحدي ٢٢٥).

دەستەی یەکەم ووتویانە: زەمانەکە ئەو شێوەیە پێویست ئەکات و لەگەڵ تەرتیبی ئایەتەکەدا ئەڕوات.

وە لە سوننەتدا شتێکی وا سابت نەبووە کە گۆڕینی ئەو واتایە بگەیەنێت. کەواتە هەرکەس دژی خواو پێغەمبەر (ﷺ) بجەنگێ و هەوڵی بڵاوبوونەوەی خراپە بدات لەسەر زەویدا، ئەوە سزاکەی یا کوشتنە، یا لە داردانە، یا دەست و قاچ بڕینە، یا دەربەدەرکردنە بە زەویدا، بەپێی ئەو بەرژەوەندییەی حاکم ئەیگرێتە بەرچاو بۆ جێبەجێ کردنی یەکێ لەو سزایانە. ئیتر خەڵکیان کوشتبێ یا نەکوشتبێ، ماڵیان بردبێ یا نەیان بردبێ، وە یەك تاوانیان کردبێ یا زۆر، وە لە ئایەتەکەدا شتێکی وەها نەهاتووە بێتە بەڵگەی ئەوەی کە لەسەر حاکم پێویست بێت کۆمەڵێ سزا لەسەر کەسێك دابنێت، یا واز لە جەردەکان بهێنێ بێ سزادانیان.

(قرطبی) ئەڵێت: ئەبو ثەور ووتویەتی: ئیمام ئارەزووی خۆیەتی بەپێی ڕواڵەتی ئایەتەکە، وە مالکیش هەروەهای ووتوە، وە ئەوەش لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕراوەتەوە، هەروەها قسەی سەعیدی کوڕی موسەییب و عومەری کوڕی عبدالعزیز و موجاهید و ضەححاك و نەخەعییە، هەموویان ووتویانە:

ئیمام ئارەزووی خۆیەتی لە حوکمدانی (محاب)ەکان، بە هەرکام لەو حوکمانەی کە خوای گەورە واجبی کردووە لە کوشتن، یا لە داردان، یا دەست و قاچ بڕین بە پێچەوانەوە، یا دەربەدەرکردن لە زەویدا بەپێی ڕواڵەتی ئایەتەکە.

ئیبنوعەبباس ووتویەتی: هەرچی پیتی (أو)ێك لە قورئاندا هاتووە بۆ هەڵبژاردن و ئارەزووە، ئەوەش زیاتر هەستی پێ ئەکرێ بە ڕواڵەتی ئایەتەکە.

ئیبنو کەثیر وتویەتی: ڕواڵەتی پیتی (أو)ە بۆ هەڵبژاردنە وەکو هاو وێنەکانی تری کە هاتوون لە قورئاندا وەك فەرمودەی خوای گەورە لەبارەی کەفارەتی ڕاوەوە:

﴿فَجَزَاءٌ مِثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ النَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِ ذَوَا عَدْلٍ مِنْكُمْ هَدْياً بَالِغَ الْكَعْبَةِ أَوْ كَفَّارَةٌ طَعَامُ مَسَاكِينَ أَوْ عَدْلُ ذَلِكَ صِيَاماً﴾ (المائدة: من الآية٩٥).

وە وەك فەرمودەی خوا دەربارەی کەفارەتی سوێند:

﴿فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ﴾ (المائدة: من الآية٨٩).

هەروەها وەك فەرموویەتی دەربارەی کەفارەتی فیدیە: ﴿فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضاً أَوْ بِهِ أَذىً مِنْ رَأْسِهِ فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ﴾ (البقرة: من الآية١٩٦).

پیتی (أو) لەهەموو ئەمانەدا بۆ هەڵبژاردنە، ئەم ئایەتەش با بۆ هەڵبژاردن بێت.

بەڵگەی ئەوانەی وتویانە پیتی (أو) بۆ جۆراوجۆر کردنە:

بەڵام دەستەی دووەم بەڵگەیان بەوە هێناوەتەوە کە ئیبنو عەبباس گێڕاویەتی‌یەوە کە زاناترین کەسە بە زمانی عەرەبی و بە قورئان،

شافیعی ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە موسنەدەکەیدا ئەگێڕێتەوە لێیەوە کە فەرمویەتی:

«ئەگەر خەڵکیان کوشتبوو، وە ماڵیان بردبوو ئەوە لە دار ئەدرێن.

وە ئەگەر خەڵکیان کوشتبوو ماڵیان نەبردبوو ئەوە ئەکوژرێن و لەدارنادرێن.

وە ئەگەر ماڵیان بردبوو کەسیان نەکوشتبوو ئەوە دەست و قاچیان بە پێچەوانەوە ئەبڕرێت.

وە ئەگەر ڕێگایان ترسناک کردبوو ماڵیان نەبردبوو ئەوە لە زەویدا دەربەدەر ئەکرێن».

ئیبنوکەثیر ووتویەتی: شایەتی ئەم ڕوون کردنەوەیە ئەو فەرموودەیەیە کە ئیبنو جەریر لە تەفسیرەکەیدا ڕێوایەتی کردووە، ئەگەر سەنەدەکەی صەحیح بێت.

ئەڵێت: عەلی کوڕی سەهل بۆی گێڕاینەوە، وەلیدی کوڕی موسلیم بۆی گێڕاینەوە، لە یەزیدی کوڕی حەبیبەوە: کە (عبدالملك) ی کوڕی مەڕوان نامەیەکی نووسی بۆ ئەنەسی کوڕی مالیك تێیدا پرسیاری دەربارەی ئەم ئایەتە لێکردبوو. ئەویش نامەکەی بۆ نوسی‌یەوەو پێی ڕاگەیاند کە ئەم ئایەتە دەربارەی چەند کەسە عورەنی‌یەکان هاتە خوارەوە کە لە هۆزی بوجەیلە بوون.

ئەنەس لە نامەکەیدا ووتبوی: ئەوانە لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو شوانەکەیان کوشت و وشترەکانیان بردوو، ڕێگایان ترسناک کردو و، داوێن پیسیشیان کردبوو.

وە وتبوی: پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری لە جوبرەئیل (علیه السلام) کرد بۆ حوکمی ئەوانەی ئەبنە ڕێگر ئەویش ووتبوی:

«هەرکەس ماڵی بردبوو ڕێگای ترسناک کردبوو دەستی ببڕە لە تۆڵەی ماڵ دزینەکەیدا، و قاچی ببڕە لە تۆڵەی ترسناک کردنی ڕێگەدا.

وە هەرکەس کەسی کوشتبوو بیکوژەرەوە، وە هەرکەس کەسێکی کوشتبوو ڕێگای ترسناک کردبوو داوێن پیسیشی کردبوو لە داری بدە»[1].

(١) تفسیر ابن کثیر (٢/٦٧).

وە وتویانە: ئەوەی کە ئەوە پێش ئەخات کە ئایەتەکە بۆ جۆراوجۆرکردنە نەك بۆ هەڵبژاردن، ئەوەیە کە خوای گەورە بۆ ئەو خراپەکاری‌یە سزاکانی پلە پلە کردووە، چونکە خراپەکەیان جیاوازە، لەوانە پیاو کوشتن، وە لەوانە تالآن کردن وە لەوانە ئەتکی ناموس، وە لەوانە لەناوبردنی کشتوکاڵ و ئاژەڵ.

وە لە جەرەدەکاندا هەیە دوو تاوان یا چەند تاوانێك بەسەر یەکەوە ئەکات. جا حاکم بۆی نی‌یە بە ئارەزووی خۆی هیچ کەسیان بەو سزایەی خۆی بیەوێ سزا بدات، بەڵکو لەسەریەتی هەریەکەیان ئەوەندەی تاوانەکەی و پلەی خراپەکاری‌یەکەی سزای بدات. وە ئەوەش دادپەروەری‌یە.

﴿وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا﴾ (الشورى: من الآية٤٠).

واتە: جەزای خراپەی خراپکار سزادانیەتی بە خراپەیەکی وەکو خۆی بەبێ زیادە.

ئەوەش مەزهەبی شافیعی و ئەحمەدە لە ڕاست ترین ڕیوایەتەکانیدا، وە قسەی ئەبی حەنیفەیە لەڕوون کردنەوەیەکدا لەو بارەیەوە.

کاسانی لە (البدائع)[1]دا لە قسەی ئەوانە کۆڵیوەتەوە کە وتویانە پیتی (أو) بۆ هەڵبژاردنە بە لێکۆڵینەوەیەکی زانستی و ووتویەتی:

ئەو هەڵبژاردنەی هاتووە لە حوکمە جاجیاکاندا لەڕوی شێوەوە بە پیتی هەڵبژاردن. کاتێك ڕواڵەتەکەی بەڕێوە ئەبرێت ئەگەر هۆیەکانی پێویست کردنی ئەو سزایانە یەك شت بن، وەك لە کەفارەتی سوێند و کەفارەتی سزای ڕاو کردنی کەسێك کە لە ئیحرامدا بێ.

بەڵام ئەگەر هۆیەکان جیاوازبن ئەوا بۆ هەریەکەیان حوکمی خۆی ئەبێت، وەك لە فەرموودەی خوای گەورەدا هاتووە کە فەرموویەتی:

﴿قُلْنَا يَا ذَا الْقَرْنَيْنِ إِمَّا أَنْ تُعَذِّبَ وَإِمَّا أَنْ تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْناً﴾ (الكهف: من الآية٨٦).

واتە: ووتمان ئەی ذو القرنين یا سزایان بدە یا چاکەیان لەگەڵدا بەکاربهێنە.

لێرەدا ئەو (أو)ە لەنێوان ئەو دوو ڕێگایەدا کە باس کراوە بۆ هەڵبژاردن نی‌یە، بەڵکو بۆ دیاری کردنی حوکمە بۆ هەریەکەیان، لەبەر جیاوازی هۆی پێویست بوون.

ماناکەشی ئەوەیە کە یا سزای ئەو کەسە بدە کە ستەم ئەکات، یا چاکە لەگەڵ ئەو کەسەدا بکە کە باوەڕی هێناوەو کاری چاکە ئەکات.

---

(١) (ج٧ ص٩).

ئایا سەیری فەرموودەی خوای گەورە ناکەیت:

﴿قَالَ أَمَّا مَنْ ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَى رَبِّهِ فَيُعَذِّبُهُ عَذَاباً نُكْراً وَأَمَّا مَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صالِحاً فَلَهُ جَزاءً الحسنى﴾ (الكهف:٨٧-٨٨).

واتە: (ذوالقرنين) وتی: بەڵام هەرکەس ستەم لەخۆی بکات و باوەڕ نەهێنێ، ئێمە لە دنیادا سزای ئەدەین، پاشان ئەگەڕێتەوە بۆلای پەروەردگاری، ئەویش سزایەکی گەورەی ئەدات لەئاگری جەهەننەمدا. بەڵام ئەوەی بڕوا ئەهێنێ لەوان و کردەوەی چاك ئەکات ئەوە لەخواوە پاداشتی بەهەشتەو، ئێمەش چاکەی لەگەڵدا ئەکەین.

وە ڕێ بڕینیش خۆی لە خۆیدا چەند جۆرە، هەرچەندە لە بناغەدا هەر یەك ئەگرنەوە، جاری وا هەیە تەنها بە بردنی سامانە، وە جاری وا ئەبێت بە کوشتنە و هیچی تر، وە جاری وا ئەبێت هەردوکیان بەسەریەکەوە ئەکرێن، وە جاری وا ئەبێت تەنها بە ترساندنە. وە هۆی پێویست بوونی حوکمەکە جیاوازە، کەواتە لەسەر هەڵبژاردن دانانرێت. بەڵکو لەسەر دیاری کردنی حوکم بۆ هەر جۆرەیان.

یا ئەم مانایەش هەڵئەگرێ وە ئەوەی تریش کە باس کرا کەواتە بەڵگە بە شتێك نابێت ئیحتیمال بێت.

وە ئەگەر ئایەتە پیرۆزەکە بە ڕواڵەتەکەی لێك ئەدرایەوە دەربارەی حوکمی (محارب). یان لەسەر تەرتیبەکەی دائەندرێ‌و لە هەموو حوکمێکی باس کراودا جۆرێك لە جۆرەکانی ڕێگری تیا شاراوە ئەبێت، وەك ئەوەی خوای گەورە فەرموویەتی: ئەگەر کەسیان کوشتبوو بکوژرێن، یا لە داربدرێن، ئەگەر ماڵیشیان بردبوو خەڵکیشیان کوشتبوو، یا قاچ و دەستیان بە پێچەوانەوە ببڕرێت ئەگەر تەنها ماڵیان بردبوو، یا دەربەدەر بکرێن بە زەویدا ئەگەر ڕێگایان ترسناك کردبوو،

بەو شێوەیە جبرائیل (علیه السلام) بۆ پێغەمبەری باس کرد (ﷺ) کاتێ ئەبو بەردەی ئەسلەمی لەگەڵ هاوەڵەکانی ڕێگایان بڕی لەو کەسانەی کە هاتبوون موسڵمان بن. چونکە جوبرائیل (علیه السلام) فەرمووی: (إن من قَتَلَ قُتِلَ، ومن أخذ المال ولم يَقْتُلْ قُطِعت يده، ورجله من خلاف، ومن قَتَل وأخذ المال صُلِبَ، و من جاء مسلماً هَدَمَ الإسلامُ ما كان قبله من الشرك)[1].

(١) سەیری سەرچاوەکەی پێشو بکە.

واتە: هەرکەس بکوژێ ئەکوژرێتەوە، وە هەرکەس سامان بدزێت و نەکوژێ دەست و قاچی بە پێچەوانەی یەکەوە ئەبڕرێت، وە هەرکەس بکوژێ و سامانیش ببات لە دار ئەدرێت، وە هەرکەس هاتبێ موسڵمان ببێت ئەوە ئیسلام پێش خۆی ئەڕوخێنێ لە شیرك و کوفر

**روون کردنەوەی ڕای ئەوانەی کە ئەڵێن سزاکان جۆراو جۆر ئەبێ بەپێی جیاوازی تاوانەکان:**

وتمان جەماوەری زانایان ڕایان وایە کە سزاکان جۆراوجۆر ئەبن بە پێی جۆری تاوانەکە.

وە ئەکرێن بە چەند بەشەوە:

١- جەردەیی‌یەکە تەنها ترساندنی کاروانەکان و ڕێ بڕین بێت، وە لەوە زیاتر جەردەکان شتی تر نەکەن، ئەو جۆرانە بە زەویدا دەربەدەر ئەکرێن، مانای دەربەدەریش ئەوەیە ئەو جەردانە لەو شارەی دانیشتون تێیدا و خراپەیان تێدا کردووە دەرئەکرێن بۆ وڵاتێکی ئیسلامی تر، مەگەر ئەو جەردانە کافر بن ئەوکاتە دروستە بۆ وڵاتی بێباوەڕانیش دەربکرێن. وە حیکمەت لەوەدا ئەوەیە ئەو کسانە تاڵاوی دورکەوتنەوە بچەژن وە ناوچەکە لە خراپەیان پاك بکرێتەوە، وە خەڵك ئەو ئازار و ناخۆشی‌یانەیان لەبیر بچێتەوە کە لەوانەوە توشیان بووە. وە لەمالیکەوە ئەگێڕنەوە کە نەفی‌کردن مانای دەرکردنە بۆ وڵاتێکی‌تر، بۆ ئەوەی تێیدا بەند بکرێن هەتا تۆبەیان دەرئەکەوێ. ئیبنو جەریریش ئەوەی هەڵبژاردووە.

حەنەفی‌یەکان ڕایان وایە کە نەفی‌کردن بەند کردنە وە مانەوەیانە لە بەندیخانەدا هەتا چاك ئەبن، چونکە بەندیخانە دەرکردنە لە فراوانی دنیاوە بۆ تەنگەبەری‌یەکەی، جا ئەو کەسەی بخرێتە بەندیخانەوە وەك ئەوە وایە لە زەوی دەربکرێت بۆ شوێنی بەندەکەی، بەڵگەشیان قسەی هەندێ لەو بەندی‌یانەیە کە لەو بارەیەوە وتویانە:

خرجنا من الدنیا ونحن من أهلها فلسنا من الأموات فیها ولا من الأحیاء

إذا جاءنا السجان یوماً لحاجة عجبنا وقلنا: جاء هذا من الدنیا!

واتە: لە دونیا دەرچوین لەکاتێکدا کە ئێمە خەڵکی دونیاین. جا ئێستا ئێمە نە لە مردوانین و نە لە زیندوان. کاتێ پاسەوانی زیندانەکە دێتە سەرمان بۆ کارێکی. لامان سەیرە و دەڵێین لە دونیاوە هاتووە بۆ لامان!

٢- جەردەیی‌یەکە بە بردنی ماڵ و سامان ئەبێت بێ‌ئەوەی کەسی تێدا بکوژرێ، سزای ئەوەش بڕینی دەستی ڕاستە لەگەڵ قاچی چەپ. چونکە ئەم تاوانە لەگەڵ جەردەیی‌یەکەدا دزیشی تیایە، وە ئەو دەست و قاچە کە ئەبڕدرێ دەم و دەست داخ ئەکرێت بە هۆی ئاگر یا ڕۆنی داخ کراو یا بە هەر ڕێگایەکی تر بێت، بۆ ئەوەی تووشی خوێن بەربوون نەبێت و بمرێت. وە بۆیە بەو شێوەیە دەست و

قاچی ئەبڕێت بۆ ئەوەی سوود لەو دەست و قاچە وەربگرێت کە نەبڕاوە. جا ئەگەر ئەوکەسە تاوانەکەی دووبارە کردەوە ئەجارەیان دەستی چەپی و قاچی ڕاستی ئەبڕێت.

زانایان مەرجی ئەوەیان داناوە کە ئەبێت ماڵە تاڵان کراوەکە بگاتە ڕادەی دانراو وە لەجێی قایمدا هەڵگیرابێت چونکە دزێتی جەریمەیەکە سزای دانراوی خۆی هەیە، جا کاتێ جەریمە ئەنجام درا سزاکەی بە دواوەیەتی، ئیتر تەنها کەسێك کردبێتی یا کۆمەڵێك کردبێتیان یەکسانە.

ئەگەر ماڵەکە نەگەیشتبووە (نصاب) ڕادەی دانراو یا باش هەڵنەگیرابوو دەست و قاچ بڕینی تێدا نابێت.

وە ئەگەر جەردەکان کۆمەڵێك بوون ئایا مەرجە بەشی هەریەکەیان بگاتە (نصاب) یان نا؟

ئیبنو قودامە وەڵامی ئەوەی داوەتەوەو فەرمویەتی:

ئەگەر ئەوەی بردبویان بگاتە ڕادەی دانراو، بەڵام ئەگەر بەشی بکەن بەشی هەریەکەیان نەگاتە ڕادەی دانراو دەست و قاچیان ئەبڕێت، بە قیاس بۆ سەر وتەکەمان دەربارەی دزێتی.

وە بە قیاس بۆ سەر قسەی شافیعی و خاوەن ڕاکان، بڕین پێویست نابێت هەتا بەشی هەریەکەیان ڕادەی دانراو تەواو نەکات، وە مەرجیشە کە شوبهەی تێدا نەبێت.

بەڵام مالیکی‌یەکان و ظاهیری‌یەکان لەسەر ئەو ڕایە ڕێك نەکەوتوون، وە ئەوەیان نەکردۆتە مەرج کە ئەبێت ماڵەکە بگاتە (نصاب) و لە شوێنی قایم دا هەڵگیرابێت، چونکە (حرابة) جەردەیی‌یەکە خۆی جەریمەیەکە سزا پێویست ئەکات بێ‌ئەوەی سەیری (نصاب) و باش هەڵگرتنی بکرێت.

چونکە تاوانی (حرابة) جەردەیەتی وەك تاوانی دزێتی نی‌یە، وە سزای هەریەکەیان جیایە. چونکە خوای گەورە بۆ دزێتی (نصاب)ی داناوە بەڵام هیچی بۆ جەردەیەتی دانەناوە.

بەڵکو باسی سزای (محارب)ی کردووە لەبەرئەوە پێویستە سزا بدرێن لەسەر (محاربة) جەردەیەتی‌یان.

بەڵام ئەگەر لەناو تاوان بارەکاندا خزمێکی مەحرەمی ماڵ دزراوەکە هەبێت ئەوەیان بڕینی لەسەر نابێت، بەڵام ئەوانی تر دەست و قاچیان ئەبڕێت، لای حەنبەلی‌یەکان و یەکێ لە ڕاکانی شافیعی.

وە حەنەفی‌یەکان وتویانە: کەسیان دەست و قاچیان نابڕێت لەبەر بوونی شوبهە بەنیسبەت خزمەکە، وە تاوان بارەکان هاوکارن بەیەکەوە ئەگەر لەسەر یەکێکیان سزاکە لاچوو لەسەر ئەوانی تریش لائەچێت. وە ئیبنو قودامە ڕای شافیعی و حەنبەلی‌یەکانی پێش خستوەو وتویەتی: ئەوە

شوبهەیەكە تایبەتە بۆ تەنها كەسێك، جا حەد لەكۆڵ ئەوانی تر ناكەوێت. واتای ئەوە ئەوەیە كە شوبهەی لەكۆڵخستن لە خزم تێناپەڕێت، وە هەر ئەو بە تەنها سزا نادرێ، چونكە شوبهەكە لەو تێناپەڕێ (قسەكەی تەواو بوو).

٣- جەردەیییەكە بە كوشتن بێت بێ‌ئەوەی ماڵی تێدا ببرێت. ئەو جۆرەیان كوشتنی جەردەكان پێویست ئەكات هەركاتێ حاكم دەسەڵاتی بەسەریاندا بێت، وە هەموو جەردەكان ئەكوژرێن با (قاتل) كوژەرەكەش یەكێك بێت. وەك چۆن یاریدەدەریش ئەكوژرێت چونكە هەموویان هاوبەشن لە جەنگین و تێكدانی سەرزەویدا.

وە لێبوردنی خاوەن خوێن یا ڕازی بوونی بە خوێن بایی بە هیچ دانانرێت، چونكە لێبوردنی خاوەن خوێن یا ڕازی بوونی بە (دیە) خوێن بایی لە (قصاص)دایە نەك لە جەردەییدا.

٤- جەردەیییەكە بە كوشتن و ماڵ بردن بێت. لە مەیاندا كوشتن و لەداردانە.

واتە سزاكەیان ئەوەیە بە زیندویی لەدارئەدرێن هەتا ئەمرن، وە ئەو كەسە بە تەختەیەكەوە یا بە كۆڵەكەیەكەوە ئەبەسترێت بە پێوەو دەستەكانی بۆ ئەم لاولا درێژ كرابێت، لە پاشاندا ڕم و شیی لێئەدرێ هەتا ئەمرێت.

وە لە زاناكاندا هەیە وتویەتی: لە پێشەوە ئەكوژرێ پاشان ئەدرێ لەدار بۆ ئامۆژگاری و پەند لێوەرگرتن.

وە هەیە ووتویەتی: لەسەر تەختەكە لە سێ ڕۆژ زیاتر نابێ بمێنێتەوە.

وە ئەوەی لە پێشەوە باس كرا هەمووی ئیجتیهادی زانایان بوو، لەژێر سایەی تەفسیری ئایەتە پیرۆزەكەوە.

وە هەركام لەو زانایانە بیروڕایەكی ڕاستی هەیە، جا هەركەس ڕای وابێت كە ئارەزو ئەدرێتە دەست حاكم بۆ هەڵبژاردنی یەكێ لە سزا دانراوەكان ئەوە بیروڕاكەی لەسەر ئەوەیە كە عەطف كردن بە پیتی (أو) ئەیگەیەنێت،

وە فەرمانەكە وازی لێهێنراوە بۆ حاكم كە سزایەك هەڵبژێرێ خراپەكەی پێ لەناوبەرێ و بەرژەوەندی پێ بێتەجێ.

وە هەركەس ڕای وابێت كە هەر جەریمەیەك سزایەكی دیاری كراوی بۆ دانراوە لە ئایەتەكەدا، ئەوە مەبەستی بەجێ‌هێنانی دادپەروەرییە لەگەڵ چاودێری كردنی ئەوەی خراپەی پێ لەناو ئەچێ و بەرژەوەندی پێ دێتەجێ؟.

چونکە هەموو زانایان کۆن لەسەر بەدیهێنانی مەبەستی شەریعەت بۆ لەناوبردنی خراپەو بەدیهێنانی بەرژەوەندی.

وە ئەو تێکۆشانەی زانایانە کە بۆ کاربەدەستان ئاسان ئەکات لە دەقەکان بگەن و ڕێی تێکۆشان ئاسان ئەکات و یارمەتی زانست خواز ئەدات بۆ گەیشتن بە ڕاستی.

وە بێ‌گومان کاری زۆر ڕوئەدات لە (محارب)، خراپەکارەکانەوە جگە لەو کارانەی زانایان پەنجەیان بۆ ڕاکێشاوە.

وە ئەتوانرێ حوکمی گونجاو بۆ ئەو کارانە دەربهێنرێ لەژێر ڕۆشنایی ئەوەی زانایان دەریان هێناوە لە ئایەتە پیرۆزەکە لە حوکمە جوزئی‌یەکان.

**بەرپەرچ دانەوەی ڕەخنەیەك و لابردنی کێشەیەك :**

لە (المنار)دا ووتوەتی: عەبدی کوڕی حومەید و ئیبنو جەریر گێڕاویانەتەوە لە موجاهیدەوە کە مەبەست لە فساد لێرەدا:

زینا، و دزی، و کوشتن، و لەناوبردنی کشتوکاڵ و ئاژەڵە. ئەم کارانە هەموویان لە خراپەکاری و فسادن لەسەر زەوی، وە هەندێ لەزانایان ئەو قسەیەی موجاهیدیان لێ تێك چووە: بەوەی کە ئەو تاوان و خراپانە سزای تایبەتی‌یان هەیە لە شەرع دا جگە لەوانەی لە ئایەتەکەدا هاتوە.

جا زیناو دزی و کوشتن حەددی خۆیان هەیە، وە لەناوبردنی کشتوکاڵ و ئاژەڵیش دائەنرێ بە گوێرەی خۆی و بکەر زامنی ئەبێ‌و حاکم تەعزیر و سزای ئەدات بە جۆرێك کە بە ئیجتیهادی خۆی پێی بکات.

وە ئەو ڕەخنەگرانە ئەوەیان لە بیر چووە کە ئەو سزا دانراوانە بە دەقی ئایەتەکە تایبەتن بە (محاربین) لەو کۆمەڵە خراپەکارانەی کە خۆیان بە زۆرو بە توانا ئەزانن بەسەر وەلی ئەمردا و مل کەچ نین بۆ حوکمی شەرع، وە ئەو حەددانەی‌تر بۆ تاك تاکی ئەو دزو زیناکەرانەیە کە مل کەچن بۆ حوکمی شەرع.

وە حوکمەکەیان لە قورئانی پیرۆزدا بە سیغەی (إسم الفاعل)ی تەنیا باس کراوە وەك ئەفەرموێ:

﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا﴾ (المائدة: من الآية٣٨).

وە ئەفەرموێ: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ﴾ (النور: من الآية٢).

وە ئەوان کردەوەکانیان ئەشارنەوەو بە ئاشکرا خراپەکە ناکەن هەتا بڵاو ببێتەوە، و خەڵك چاو لە خراپەکەیان بکات، وە عیصابەو کۆمەڵێ پێك ناهێنن بۆ پارێزگاری کردنی خۆیان لە حوکمی

شەرع، هەربۆیە بە (محارب) و (مفسد) واتە بە جەنگ کەر دژی خواو پێغەمبەر و خراپەکار دانانرێن. وە ئەم حوکمەی ئێرە بەستراوە بە هەردوو سیفەتەکەوە بەسەر یەکەوە.

وە کاتێك زانایان لەفزی موحاریبیان باس کرد مەبەستیان موحاریب و موفسیدە، چونکە ئەو دوو سیفەتە بەیەکەوە پەیوەستن. —قسەکە تەواو بوو-.

ئەرکی حاکم و نەتەوە بەرامبەر (حرابة) ڕێگری:

حاکم و نەتەوە هەردوو لایان بە یەکەوە لێپرسراون بەرامبەر ئاگاداری کردنی یاساو جێگیرکردنی ئاسایش و پاراستنی مافی ئەندامانی کۆمەڵ، لە پارێزگاری کردنی گیان و ماڵ و ناموسیان،

جا کاتێك کۆمەڵێك پەرتەوازە بوون و لایانداو هاتوچۆیان تێك داو ڕێیان بڕی و ژیانی خەلکیان ڕووبەڕووی ئاژاوەو ئاشوب کرد. لەسەر حاکم پێویستە لەگەڵ ئەوانەدا بجەنگێ، وەك پێغەمبەر (ﷺ) ئەو کارەی کرد بەرامبەر عورەنیەکان، وە هەروەها وەك خەلیفەکانی دوای ئەو کردویانە، وە لەسەر موسڵمانانیش پێویستە کە هاوکاری یەك بکەن لەگەڵ حاکم بۆ ئەوەی ڕەگ و بنخی ئەو جۆرە کەسانە دەربهێنن، بۆ ئەوەی خەڵك بە خۆشی و ئاسایش بژین، و هەست بە تامی ئاشتی و دامەزران بکەن، و هەرکەس بچێ بەلای کاری خۆیەوەو تێبکۆشێ لە پێناوی خێردا بۆ خۆی و خێزانەکەی و نەتەوەکەی، جا کاتێك ئەو کەسانە تێك شکان لە مەیدانی جەنگ و بەم لاولادا پرت و بڵاو بوون نابێ شوێنیان بکەون و هێرش بکرێتە سەر بریندارەکانیان، مەگەر تاوانی کوشتنیان کردبێ و ماڵیان بردبێت، لەم کاتەدا شوێنیان ئەکەون هەتا ئەیان گرن و تۆڵەی (حرابة) ڕێگرییان بەسەردا جێبەجێ ئەکرێت.

تۆبەو پەشیمان بونەوەی جەردەکان پێش ئەوەی دەست گیر بکرێن:

ئەگەر جەردەو خراپکارەکان تۆبەیان کرد و پەشیمان بونەوە پێش ئەوەی دەستگیر بکرێن و حاکم دەسەلاتی ببێ بە سەریانا، خوا لە کردەوەکانی پێشویان ئەبورێ و ئەو سزایەیان لە کۆڵ ئەکەوێت کە تایبەتە بۆ جەردە و ڕێگر، بە پێی فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ، إلَّا الذين تابوا من قَبلِ أن تَقْدِروا عليهم، فاعلموا أن الله غفور رحيم﴾ (المائدة: من الآية٣٣).

واتە: ئەو سزایانە سەرشۆڕییە بۆیان لە دونیاداو لە ڕۆژی دواییشدا سزایەکی گەورەیان بۆ ئەبێت. مەگەر ئەوانە کە تۆبەیان کردبێ پێش ئەوەی دەست گیر بکرێن. جا بزانن کە خوا لێخۆشبو و میهرەبانە.

وە ئەوەش بۆیە وەهایە چونکە تۆبەکردن پێش گرتنیان و دەسەلات بسەریانا بەلگەی ئەوەیە کە ویژدانیان زینـدو بۆتـەوەو ئەیانـەوێ ژیـانێکی خـاوێن و دوور لـە فسـادو جـەنگ دژی خـواو پێغەمبەرەکەی دەست پێ بکەنەوە، لەبەر ئەوە لێبووردنی خوایی ئەیان گرێتەوەو هەموو مافـەکانی خواییان لەکۆڵ ئەکەوێت ئەگەر شتێکیان کردبێ سزای پێویست کردبێت، بەلام مافـەکانی بەندەکانی خوایان لەکۆڵ ناکەوێت، ئیتر سزاکە وەك سزای موحاریب نابێت بەلکو لە بەشی قیصاصدا ئەبێت، وە کاریان بەدەست ئەو کەسەیە کە تاوانەکەیان بەرامبەر کردووە نەك بە دەست حاکم.

جا ئەگەر کەسیان کوشتبو ئەوە حەتمی بوونی کوشتنەوەیان لەکۆڵ ئەکەوێ، وە خاوەن خوێن بۆی هەیە لێیان ببورێ یا قصاصیان لێ بسێنێ. وە ئەگەر کەسیان کوشتبوو ماڵیشیان بردبوو، ئەوە لە دار دران و کوشتنی حەتمییان لەکۆڵ ئەکەوێ و قیصاص و زەمانەتی ماڵەکەیان لەسەر ئەمێنێ.

وە ئەگەر هەر ماڵیان بردبوو دەست و قاچ برینیان لەکۆڵ ئەکەوێ و ماڵەکەیان لێئەسێنرێتەوە ئەگـەر بـە دەسـتیانەوە مـابوو، ئەوەشـی لەناوچـوو بـوو نرخەکـەیان لێ ئەسـەندرێ، چـونکە ئـەوە داگیرکردنە، دروست نییە ببێتە مولکیـان و ئەدرێتـەوە بـە خـاوەنی، یـا لای حـاکم دائەنرێ هـەتا خاوەنی ئەدۆزرێتەوە، چـونکە تۆبەکـەیان دروسـت نابێـت هـەتا شـتە داگیرکراوەکـان نەگێڕنـەوە بـۆ خاوەنەکانیان.

ئەگـەر کاربەدەسـتی وولات ڕای وەهـا بـوو مـافی مـالی لـە جـەردەکان نەسـێنێ لەبـەر بەرژەوەندییەکی گشتی، پێویستە لە (بیت المال) نرخەکەی بداتەوە بە خاوەنی. وە ئیبنـو ڕوشـد لـە (بداية المجتهد)دا قسەی زانایانی لەم بارەیەوە بە کورتی باس کردووەو ووتویەتی:

وە ئەوەی تۆبە لە کۆڵی ئەخات زانایان جیاوازییان تێیدایە بە چوار قسە:

١- یەکەمیان تۆبە تەنها سزای (حرابة) جەردەیەتی لـە کـۆڵ ئـەخات و بـەس، ئـیتر جگـە لـەوە هەرچی مافی خوا و ئادەمیزادی لەسەر بێت لێی ئەسێنرێ. ئەوە قسەی مالیکە.

٢- قسەی دووەم تۆبەکردن سزای جەردەیی‌و هەموو مافەکانی خوا لە زینـاداو لـە خواردنـەوەداو لە دەست برین بەهۆی دزییەوە لەکۆڵ ئـەخات، بـەلام مـافی خـەلکی لـە کـۆڵ ناخـات لـە مـاڵ و خوێندا مەگەر خاوەن کوژراوەکە خۆی لێی ببورێ[1].

(١) ئەمە عادلانەترین قسەیە کە ئێمە هەڵمان بژاردووەو لە پێشەوە ئاگادارمان لە سەر داوە.

٣- قسەی سێیەم: تۆبەکردن هەرچی مافەکانی خوا هەیە لای ئەبات، وە ئەوانی تر لە خوێن و ماڵدا ئەمێنێتەوە لەسەریان ئەگەر ماڵکە مابوو.

٤- قسەی چوارەم: تۆبەکردن مافی ئادەمیزادی لە کۆڵ ئەخات لە ماڵ و خوێن، جگە لەو ماڵانەی بە ساغی ماوەتەوە لایان.

مەرجەکانی تۆبەکردن:

تۆبە ڕواڵەتی هەیە و باطین و ناوەکی هەیە، وە یاسای ئیسلام سەیری ڕواڵەتەکە ئەکات نەك ناوەکییەکە کە خوا نەبێت کەس نایزانێ، جا ئەگەر جەردە تۆبە بکات پێش دەسەڵات بەسەریا، تۆبەکەی وەرئەگیرێ و شوێنەوارەکانی لەسەر دائەمەزرێت.

بەڵام هەندێ لە زانایان ئەوەیان کردۆتە مەرج کە ئەبێ چەتە داوای ئەمان لە حاکم بکات ئەویش ئەمانی بداتێ.

وە وتراوە: ئەوە مەرج نییە بەڵکو پێویستە لەسەر حاکم هەموو تۆبەکارێك وەربگرێت.

وە ووتراوە: تەنها چەك فڕێدان و دوورکەوتنەوە لە شوێنی تاوان و ئەمین بوونەوەی خەڵك لێی بەسە، بێ ئەوەی پێویست بێت بگەڕێتەوە لای پێشەوا.

ئیبنو جەریر باسێکی هێناوەو ووتویەتی:

عەلی بۆی گێڕامەوە، کە وەلیدی کوڕی موسلیم بۆی گێڕابووەوە و ووتی: (لەیث وتویەتی. وە هەروەها موسای مەدەنی بۆی گێڕامەوە -کاتێ ئەمیر بوو لەلامان- کە عەلی ئەسەدی ببوو بە (محارب)، ڕێگای ترسناك کردبوو خوێنی ڕشتبوو ماڵی بردبوو، خەڵك و کاربەدەستان بەدوایا گەڕان کە بیگرن، بەڵام نەیان توانی هەتا خۆی تۆبەی کردو گەڕایەوە، هۆی تۆبەکەش ئەوەبوو کاتێ گوێی لێ ئەبێت پیاوێك ئەم ئایەتە ئەخوێنێ:

﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعاً إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ﴾ (الزمر:٥٣).

واتە: بڵێ -ئەی محمد- بە بەندەکانی من ئەوانەی ستەمیان لە خۆیان کردووە بە کردنی تاوانی زۆر: لە میهرەبانی خوا هیوابڕاو مەبن، بە ڕاستی خوا لە هەموو گوناهەکان ئەبورێ چونکە هەر ئەو لێبوردەیە لەوانەی تۆبە ئەکەن و بە بەزەییە پێیان. جا ئەویش بە سەریەوە ئەوەستێ و ئەڵێ: ئەی بەندەی خوا: دووبارەی بکەرەوە ئەویش دووبارە بۆی ئەخوێنێتەوە ئیتر شمشێرەکەی ئەکاتەوە بە کالانەکەیداو تۆبە ئەکات و ئەگەڕێتەوە هەتا بەرەبەیان ئەگاتەوە مەدینە، ئینجا خۆی ئەشوات و ئەچێت بۆ مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی بەیانی ئەکات، لەپاشاندا لەناو صەحابەکاندا لە

بەردەم ئەبی هورەیرەدا دائەنیشێ، کاتێ دونیا ڕوناك ئەبێتەوە خەڵکەکە ئەیناسنەوە بۆی هەڵئەسن، ئەویش ئەڵێت: بۆتان نیە هیچم لێبکەن، چونکە بە تۆبەکاری گەڕاومەتەوە پێش ئەوەی ئێوە دەسەڵاتتان بەسەرما بێت. ئەبو هورەیرەش ئەڵێت: (ڕاست ئەکات). دەستی ئەگرێ و ئەیهێنێ بۆ لای مەڕوانی کوڕی حەکەم کە ئەمیری مەدینە بوو لە زەمانی موعاوییەدا، پێی ئەڵێت: ئەمە عەلیە بە تۆبەکاری هاتۆتەوە ئیتر ئێوە ناتوانن هیچی لێبکەن و بیکوژن جا وازیان لێ هێنا لەهەموو سزایەك.

ئەڵێ: عەلی بە تۆبەکاری ئەچێت بۆ جیهاد لە ڕێی خوادا لە دەریا، تووشی ڕۆمەکان ئەبن جا کەشتیەکەیان نزیك کەشتیەکی ڕومەکان ئەخەنەوە عەلی خۆیان بۆ هەڵئەداو ئەچێتە ناو کەشتیەکەیان ئەوانیش لێی ڕائەکەن و ئەچنە لایەکەی تری کەشتیەکە، کەشتیەکە لار ئەبێتەوەو هەموویان نوقوم ئەبن.

**تۆڵەکان لە کۆڵ ئەکەون بە تۆبە پێش ئەوەی تاوان بارەکان بدرێن بە دادگا :**

لە پێشەوە باس کرا کە سزای (حرابة) جەردەیی لەکۆڵ (محاربین) جەردەکان ئەکەوێ ئەگەر تۆبەیان کردو پەشیمان بوونەوە پێش ئەوەی دەسەڵات هەبێت بەسەریاندا، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە کە فەرموویەتی: ﴿إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِنْ قَبْلِ أَنْ تَقْدِروا عَلَيْهِمْ فاعْلَموا أَنَّ اللهَ غَفورٌ رَحيم﴾ (المائدة: ٣٤).

واتە: مەگەر ئەو کەسانە کە پەشیمان ئەبنەوە پێش ئەوەی دەستگیر بکرێن، جا بزانن کە خوا لێ بوردەو میهرەبانە.

وە ئەو حوکمە تەنها بۆ سزای (حرابة) نیە، بەڵکو حوکمێکی گشتیە هەموو تۆڵەکان ڕێك ئەخات.

وە هەرکەس تاوانێکی کرد پێویست بوو سزا بدرێ لەسەری، لە پاشاندا تۆبەی لێکرد پێش ئەوەی بگاتە بەردەستی حاکم ئەو سزایەی لە کۆڵ ئەکەوێ، چونکە ئەگەر بەهۆی تۆبەوە سزاو تۆڵە لە کۆڵ ئەو کۆمەڵە بکەوێ، ئەوە لەپێشترە لە کۆڵ کەسانی تریش بکەوێ کە تاوانەکەیان لەتاوانی ئەوان کەمترە.

وە ئیبنو تەیمیە ئەوەی پێش خستوەو وتویەتی: هەرکەس تەوبە بکات لە زیناو دزی و ئارەق خواردنەوە پێش ئەوەی بگاتە بەردەستی حاکم، ئەوەی ڕاست بێت سزاکەی لە کۆڵ ئەکەوێ. وەك چۆن لە کۆڵ جەردەو ڕێ گرەکان ئەکەوێ بە ئیجماع ئەگەر تۆبە بکەن پێش ئەوەی دەسەڵات بیانگاتێ.

وە قورطوبی ووتویەتی: بەڵام ئارەق خۆر و زیناکەران و دز ئەگەر تۆبەیان کرد و چاك بوون و دەرکەوت تێیاندا، پاشان بیرێنە لای حاکم نابێ تۆڵەیان لێ بسەندرێ. بەڵام ئەگەر برانە لای حاکم ئینجا وتیان: تۆبەمان کردووە. وازیان لێ ناهێنرێ چونکە لەو حاڵەتەدا وەك رێ بڕ وەهان کە گیرابن.

وە ئیبنو قودامە جیاوازی زانایانی لەو بارەیەوە روون کردۆتەوەو وتویەتی: ئەگەر کەسێك لە (محاربین) حەددی لەسەر بوو وە تەوبەی کردو چاك بوو دوو ریوایەتی لەسەرە:

(یەکەمیان) تۆڵەکەی لە کۆڵ ئەکەوێ بەپێی فەرمودەی خوای گەورە: ﴿وَالَّذَانِ يَأْتِيَانِهَا مِنْكُمْ فَآذُوهُمَا فَإِنْ تَابَا وَأَصْلَحَا فَأَعْرِضُوا عَنْهُمَا﴾ (النساء: من الآية١٦).

واتە: ئەو دوانەی ئەو تاوانە ئەکەن لە ئێوە ئازاریان بدەن، جا ئەگەر تۆبەیان کرد و خۆیان چاك کرد وازیان لێ بهێنن. وە باسی تۆڵەی دزی کردووە و فەرمویەتی: ﴿فَمَنْ تَابَ مِنْ بَعْدِ ظُلْمِهِ وَأَصْلَحَ فَإِنَّ اللَّهَ يَتُوبُ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ (المائدة:٣٩).

واتە: هەرکەس دوای دزی کردنەکەی تۆبەی کردو خۆی چاك کرد، ئەوە خوا تۆبەی لێ قەبوڵ ئەکات، چونکە بەڕاستی خوا لێ خۆشبو و میهرەبانە.

وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (التائب من الذنب كمن لا ذنب له)[1].

واتە: تۆبەکار لە گوناه وەك کەسێکە کە گوناهی نەبێت.

وە هەرکەسیش گوناهی نەبوو تۆڵەی لەسەر نییە.

وە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی ماعیز کاتێ هەڵاتنەکەیان پێ ڕاگەیاند فەرمووی: (هلا تركتموه يتوب فيتوبَ الله عليه؟)

واتە: نەئەبوو وازی لێ بهێنن تۆبە بکات و خواش تۆبەکەی لێ وەربگرێت؟

وە لەبەرئەوەی مافی تەواوی خوای گەورەیە بە تۆبە لە کۆڵ ئەکەوێ وەك تۆڵەی جەردە.

(دوهەمیان) تۆڵە لەکۆڵ ناکەوێت، ئەوەش قسەی مالیك و ئەبی حەنیفەو یەکێ لە قسەکانی شافیعیەیە.

بەپێی فەرموودەی خوای بەرز: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ﴾ (النور: من الآية٢).

---

(١) ابن ماجه (٤٢٥٠) ومجمع الزوائد (١٠/٢٠٠).

واتە: زیناکەری نێرومێ هەریەکەیان سەد داری لێ بدەن.. ئەو تۆڵە لێسەندنەش گشتییە بۆ تۆبەکاران و جگە لەوانیش. وە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا﴾ (المائدة: من الآية٣٨).

واتە: دەستی دزی نێرو مێ ببڕن، وە لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) ماعیز و ئافرەتە غامیدییەکەی ڕەجم کردو دەستی ئەوەی بڕی کە پێی لە دزی کردنەکەی ناو ئیقراری کرد.

هەرچەندە ئەوان هاتن بۆلای پێغەمبەر ﷺ بە تۆبەکاری و داوای پاك کردنەوەیان ئەکرد بە حەد، وە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو کارەیانی ناونا تۆبەکردن، جا دەربارەی ژنێك فەرمووی: (لقد تاب توبة لو قسمت على سبعين من أهل المدينة لوسعتهم)[1].

واتە: تۆبەیەکی کردووە ئەگەر دابەش بکرێ بەسەر حەفتا پیاوی دانیشتوانی مەدینەدا هەموویان ئەگرێتەوە.

وە عەمری کوڕی سەمورە هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ووتی: ئەی نێرراوی خوا، من ووشترێکم لە هۆزی فلان دزیوە، پاکم بکەرەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) حەددی دزی لەسەر جێبەجێ کرد[2].

وە لەبەرئەوەی تۆڵەو حەد بریتی و کەفارەتە بە تۆبە لە کۆڵ ناکەوێ، وەك بریتی سوێند و کوشتن، وە لەبەرئەوەی دەسەلات بەسەریا هەیە تۆڵەکەی لە کۆڵ ناکەوێ بە تۆبە وەك جەردە دوای ئەوەی دەسەلات بەسەریا هەبێت. جا ئەگەر ووتمان تۆڵە هەر بە تۆبە لە کۆڵ ئەکەوێ ئایا بە تۆبەکە لە کۆڵ ئەکەوێ، یا ئەبێ کردەوەی چاکیشی لەگەڵدا بێت؟

ئەمەش دوو ڕووی هەیە:

(یەکەم) تۆڵە بە تۆبەی ڕووت لە کۆڵ ئەکەوێ ئەوەش ڕواڵەتی قسەی هاوەڵانی ئێمەیە، چونکە تۆبە حەد ئەخات، جا چوێندراوە بە تۆبەی جەردە پێش توانا بوون بەسەریا.

(دووەم) کردەوەی چاك ئیعتیباری بۆ ئەکرێ بەپێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿فَإِنْ تَابَا وَأَصْلَحَا فَأَعْرِضُوا عَنْهُمَا﴾ (النساء: من الآية١٦).

واتە: ئەگەر تۆبەیان کردو خۆیان چاك کرد بە کردەوەی چاکە وازیان لێبهێنن.

وە فەرموویەتی ﴿فَمَنْ تَابَ مِنْ بَعْدِ ظُلْمِهِ وَأَصْلَحَ فَإِنَّ اللَّهَ يَتُوبُ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ (المائدة:٣٩).

---

(١) أحمد (٤/٤٣٥) ومسلم (١٦٩٦/٤) وأبوداود (٤٤٤٠) والترمذي (١٤٣٥) والنسائي (٤/٦٣).

(٢) ابن ماجه (٢٥٨٨).

واتە: هەرکەس دوای ستەم کردنی تۆبەی کرد و چاکەی کرد لەهەموو کردەوەکانیدا، ئەوە خوا لێخۆش بوو و بە بەزەیی‌یە.

جا لەسەر ئەو قسەیە ماوەیەکی بۆ دائەنرێ بۆ ئەوەی ڕاستی تۆبەکەو چاك کردنی نیەت و نیازی بزانرێت. وە ماوەکەش دیاری کراو نیەیە.

وە هەندێ لە هاوەڵانی شافیعی وتویانە: ماوەی ئەوە ساڵێکە، وە ئەوکات دانانەش دیاری کردنە و دروست نیەیە.

**دیفاع و بەرگری ئادەمیزاد لە گیانی خۆی و لە کەسانی تر:**

ئەگەر کەسێك دەست درێژی کردە سەر کەسێك و ویستی بیکوژێ یا ماڵی ببات یا ئابڕوی ببات، ئەو کەسە مافی خۆیەتی بجەنگێ لەگەڵ ئەو هێرش کەرەدا، بۆ پاراستنی گیان و ماڵ و ئابڕوی وە بەرگری بکات لە سووکەوە بۆ سووك و ئاسان.

جا بە قسە دەست پێ‌ئەکات یا هاوارئەکات یا پەنا ئەبا بە خەڵك ئەگەر توانرا بەوانە ستەم کار دوور بخرێتەوە.

بەڵام ئەگەر هەر بە لێدان دوور ئەخرایەوە بۆی هەیە لێی بدات، وە ئەگەر بە کوشتن نەبوایە دورنەئەخرایەوە بۆی هەیە بیکوژێ بێ‌ئەوەی تۆڵەی بکەوێتە سەر یا بریتی و دیە.

وە خوێنی کوژراوەکەشی ناکەوێتە سەر چونکە ستەم کار و هێرش بەربووە، وە ستەم کاری هێرش بەر خوێنی حەڵاڵە و پێویست نیەیە خوێنی بدرێ.

وە ئەگەر تەعەدا لێکراو کوژرا لەوکاتەدا کە پارێزگاری لە گیان و ماڵ و ناموسی ئەکرد ئەوە شەهیدە.

١- خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلَمَنِ انْتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِ فَأُولَئِكَ مَا عَلَيْهِمْ مِنْ سَبِيلٍ﴾ (الشوری:٤١).

واتە: هەرکەس تۆڵەی خۆی سەندەوە لە ستەمکارەکەی دوای ئەوەی ستەمی لێ کرا، ئەوانە هیچ کەس ڕێی بەسەریانەوە نابێت.

٢- وە لە ئەبو هورەیرەو کە وتویەتی (پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی نێرراوی خوا چی ئەفەرمووی ئەگەر کەسێك هاتە سەرم ویستی ماڵەکەم تاڵان بکات؟ فەرمووی: مەیدەڵە وتی: ئەی ئەگەر شەڕی لەگەڵدا کردم؟ فەرمووی: تۆش شەڕی لەگەڵدا بکە. وتی: ئەی

ئەگەر کوشتمی. فەرمووی: تۆ شەهیدی. ووتی: ئەی ئەگەر من ئەوم کوشت؟ فەرمووی: ئەو ئەچێتە ئاگرەوە[1].

٣- وە بوخاری ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

(من قتل دون ماله فهو شهيد. و من قتل دون عرضه فهو شهيد)[2].

واتە: هەرکەس لە پێناوی ماڵەکەیدا بکوژرێ شەهیدە، وە هەرکەس لە پێناوی ئابڕویدا بکوژرێ شەهیدە.

٤- ،، ئەگێڕنەوە: کە ئافرەتێك ئەچێتە دەر بۆ دارهێنـان، پیاوێـك دوای ئەکـەوێ و داوای کـاری خراپی لێ ئەکات، ئەویش بەردێکی تێئەگرێ ئەیکوژێ. ئـەو کێشـەیەیان گەیانـدە لای عمـر خـوا لێی رازی بێت فەرموی: کوژراوی خوایە، سوێند بە خوا ئەوە خوێنی نیە.

وە وەك چۆن پێویستە ئادەمیزاد پارێزگاری لـە گیـان و مـاڵ و ئـابڕووی خـۆی بکـات هـەر بـەو شێوەیە پێویستە لەسەری بەرگری لە کەسانی تریش بکات ئەگەر توشی کوشتن و ماڵ بـراوی بـوون یا توشی ئابڕوچوون بوون، بەڵام بە مەرجێك گیانی خۆی نەخاتە مەترسییەوە.

چونکە بەرگری کردن لە کەسانی تر لە بەشی گۆڕینی خراپەو پارێزگاری کردنی مافی کەسـانی ترە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (من رأى منكم منكرا فليغيره بيـده، فـإن لم يـستطع فبلـسانه، فإن لم يستطع فبقلبه و ذلك أضعف الإيمان)[3].

واتە: هەرکەس خراپەکارییەکی بینی ئەبێ بە دەستی بیگۆڕێ، جا ئەگـەر بـە دەسـتی نـەیتوانی ئەبێ بە زمانی بیگۆڕێ، ئەگەر نەیتوانی بە زمانی بیگـۆڕێ بـا بـە دڵ پـێی نـاخۆش بێـت ئـەوەش لاواز ترین باوەڕ و ئیمانە.

ئەوەش لە بابی گۆڕاندنی کاری خراپەیە.

## تۆڵەی دزێتی (حد السرقة)

بە ڕاستی ئیسلام ڕێزی بۆ سامان دانـاوە، لـەو ڕووەوە کـە ڕەگـی ژیانـە، وە ڕێـزی خـاوەنییـەتی تاکەکانی داناوە بۆ سامـان[1]، هەموو کەس، وە مافیانی تێدا بەشتێکی پیرۆز دانـاوە. کـە دروسـت نییە بۆ هیچ کەس دەست درێژی بکاتە سەرماڵی کەس بە هیچ شێوەیەك.

---

(١) أحمد (٢/٣٦٠) ومسلم (١٤٠).

(٢) البخاري (٢٤٨٠) ومسلم (١٤١).

(٣) أحمد (٣/١٠) ومسلم (٤٧٨) وأبوداود (١١٤٠) وابن ماجه (١٢٧٥).

هەر لەبەر ئەوەیە ئیسلام دزی و داگیرکردن و ماڵ دزین بە فێڵ و خیانەت و ڕیباو فێڵ بازی و گاڵتە کردن بە پێوانەو کێشانەو بەرتیلی حەرام کردووە، وە هەر ماڵێك بەبێ هۆیەکی شەرعی بە دەست هاتبێ بە ماڵێکی حەرامی داناوەو و دایناوە بە خواردنی ماڵی خەڵکی بە باتڵ .

وە زۆر توندوتیژی کردووە دەربارەی دزی، و حوکمی داوە دەستی دز ببڕێ کە ڕاستەوخۆ دزییەکەی پێ ئەکرێ، وە لەوەدا حیکمەتێکی زۆر ڕوونی هەیە، چونکە دەستی ناپاك وەك ئەندامێکی نەخۆش وایە لە لاشەدا کە پێویستە ببڕێت بۆ ئەوەی لاشەکە تەندروست بێت.

وە بەخت کردن بە هەندێك لە پێناوی هەمووی لەو شتانەیە کە عەقڵەکان و یاساکان لەسەری ڕێك کەوتون. وە هەروەها لە بڕینی دەستی دزدا پەندو عیبرەت هەیە بۆ ئەو کەسانەی دێت بە دڵیاندا ماڵی خەڵك تاڵان بکەن و بیدزن، ئیتر ناوێرن دەست درێژ بکەن بۆ ماڵی کەس، بەوەش ماڵ و سامان پارێزراو ئەبێت. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا جَزَاءً بِمَا كَسَبَا نَكَالاً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ (المائدة:٣٨).

واتە: پیاو و ژنی دز دەستیان ببڕن لە تۆڵەی ئەوەی بە ناحەق ماڵی خەڵکیان بردووە، ئەمە سزایەکە لەلایەن خواوە تا خەڵك چاویان لێ نەکەن، وە خوا بە دەسەڵاتە لە موڵکی خۆیداو کاردروستە.

**حیکمەتی توندوتیژی لە سزاکەدا :**

حیکمەتی توندوتیژی لە سزای دزیدا جگە لە دەست درێژییەکانیتر کە بۆ سەر سامان و ماڵ ئەکرێ ئەوەیە کە لە شەرحی موسلیمی ئیمامی نەوەویدا هاتووە: قازی عەیاض ڕەحمەتی خوای لێ بێت فەرمویەتی: (خوای گەورە سامانەکانی پاراستووە بە واجب بوونی بڕینی دەستی دز، وە ئەوەی دانەناوە بۆ جگە لە دزی، وەك ڕفاندن و تاڵان کردن و داگیرکردن. چونکە ئەمانە کەمن بە نیسبەت دزییەوە، وە لەبەرئەوەی ئەتوانرێ ئەم جۆرە بگێڕرێتەوە بە بانگ کردنی بۆ لای کاربەدەستان و ئاسانی شایەت گرتن لەسەری بە پێچەوانەی دزێتییەوە، چونکە کەم ئەتوانرێ شایەتی لەسەر بگیرێ، هەر بۆیە بە گەورە گیراوەو سزای سەختی بۆ دانراوە، تا کاریگەرتر بێت بۆ دوور کەوتنەوە لێی.

(١) ڕێزگرتنی ئیسلام بۆ خاوەنییەتی یەکەم لەبەر ئەوەیە کە ئەوە سروشتە، دووەم پاڵنەرە بۆ چالاکی، سێهەم عەدالەتە.

**جۆرەکانی دزی :**

**. دزی چەند جۆری هەیە:**

**١- هەندێکیان پێویست بە (تعزیر) تەمێ کردنە.**

**٢- هەندێکیان حەد پێویست ئەکەن.**

**ئەو دزێتی‌یەی تەعزیر پێویست ئەکات: ئەو دزێتی‌یەیە کە ئەو مەرجانەی تێدا نیە کە حەد پێویست بکات.**

**وە پێغەمبەر (ﷺ) حوکمی ئەو دزانەی ئەدا کە تۆڵەیان لەسەر پێویستە بە چەند بەرانبەر پێبژاردن و غەرامەکردن. ئەو حوکمەی دەربارەی ئەو کەسانە دەرئەکرد کە بەری درەختیان ئەدزی کە هێشتا لێنەکرابۆوە، وە هەروەها دزی مەڕی ناو لەوەڕگا. لە شێوەی یەکەمدا دەست بڕینی لەسەر بەری درەختی لێنەکراوەی لائەبرد.**

**ئەی فەرموو ئەو کەسەی هەندێ میوەی لێکردەوە بۆ خواردنی خۆی کە پێویستی بوو هیچی لەسەر نابێت.**

**وە هەرکەس شتێکی لێبردەوە دوو ئەوەندە غەرامەی ئەخرێتە سەرو سزا ئەدرێ.**

**وە ئەگەر شتێك لەو بەری درەختانەی دزی کە لەسەر خەرمانەکەی بوو ئەگەر نرخی دزراوەکە گەشتبووە ڕادەی دانراو (النصاب) کە دەستی پێ ببڕێت دەستی ئەبڕێ.**

**وە لە شێوەی دووەمدا حوکمی دا دەربارەی دزینی مەڕێك لە لەوەڕگادا کە دوو ئەوەندەی نرخەکەی لێ بسەندرێتەوە و لێدانێکی باشیشی لێ بدرێ کە کەسانی تری پێچاو ترسێن بکرێت. و حوکمی داوە دەربارەی ئەوەی لە میگەلدا ئەدزرێ بە دەست بڕین، ئەگەر گەیشتە ئەو ڕادەیەی دەستی پێ ئەبڕێ. ئەحمەد و نسائی و حاکم کە بە صەحیحی گێڕاوە گێڕاویانەتەوە[1].**

**وە ئەو دزیەی سزاکەی دەست بڕینە دو جۆرە:**

**(یەکەم) دزێتی بچووك: ئەوەیە کە پێویستە دەستی لەسەر ببڕێ.**

**(دووەم) دزیەتی گەورە: ئەوەیە کە بە زۆر سامانی خەڵك ببرێ. وە پێی ئەڵێن (حرابة) جەردەیەتی کە لە پێشەوە باس کرا پێش ئەم بەشە. ئێستاش تەنها باسی دزێتی بچووك ئەکەین.**

---

(١) أحمد (٢/١٨٠و٢٠٣).

**پێناسەی دزێتی:**

(السرقة) دزێتی: ئەوەیەماڵێك یا شتێك بە نهێنی ببرێ. ئەوترێ: (إسترق السمع) واتە بە دزیەوە گوێی گرتووە، وە لە قاموس دا هاتووە (سرقة) هاتنە بە پەنهانی بۆ بردنی ماڵی كەسێك تر كە لە شوێنی تایبەتی خۆیدا دانرابوو.

وە ئیبنو عەرەفە وتویەتی: (سارق) لای عەرەب كەسێكە كە بە پەنهانی بێت و شتێكی پارێزراو بەرێ بێ ئەوەی خۆی خاوەنی بوبێت.

لەوەی كە خاوەنی قاموس و ئیبنو عەرەفە باسی ئەكەن دزی كردن سێ شتی تێدایە:

١- بردنی ماڵی كەسێكی تر.

٢- ئەبێ ئەو بردنە بە نهێنی و بە پەنهانی بێت.

٣- ئەبێ ئەو ماڵە لە شوێنی پارێزراودا بوبێت.

جا ئەگەر ماڵەكە بێ خاوەن بێت، یا لە شوێنی ئەمیندا دانەنرابێت، یا بە ئاشكرا هەڵگیرابێت. ئەوە ئەو دزێتییە نییە كە دەست برین پێویست بكات.

**فڕێنەر و تاڵانكەر و ناپاك و خەیانەتكار دز نین :**

لەبەر ئەوانەی پێشوو كە باس كران ناپاك و تاڵان كەرو فڕێنەر بە دز دانانرێن، وە لەسەر هیچیان پێویست نییە دەستیان ببڕێت، هەرچەندە پێویستیان بە تەمێ كردن و تەعزیر هەیە.

لە جابیرەوە خوا لێی ڕازی بێت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لیس على خائن، ولا منتهب ولا مختلس قطع) رواه أصحاب السنن و الحاكم و البيهقي و صححه الترمذي و ابن حبان[1].

واتە: ناپاك و تاڵان كەر و فڕێنەر دەست بڕینیان لەسەر پێویست نییە.

وە لە موحەممەدی كوڕی شیهابی زوهریەوە كە ووتویەتی: كابرایەكیان هێنا بۆ لای مەروانی كوڕی حەكەم كەلوپەلێكی فڕاندبوو ویستی دەستی ببڕێت، ناردی بۆ لای زەیدی كوڕی ثابیت لەو بارەیەوە پرسیاری لێكرد، زەیدیش فەرموی: لە شت فڕاندندا دەست نابڕێت. ماڵیك لە (الموطأ)دا گێڕاویەتییەوە[2].

---

(١) أحمد (٣/٣٨٠) وأبوداود (٤٣٩١) والترمذي (١٤٤٨) والنسائي (٨/٨٨) وابن ماجه (٢٥٩١) والبيهقي (٨/٢٥٤) وابن حبان (٤٤٥٧) والحاكم كما في تلخيص الحبير (٤/٧٣).

(٢) مالك في الموطأ (٢/٨٤٠).

ئیبنو قەیم فەرمویەتی: بڕینی دەستی دز لەسەر سێ درهەم و وازهێنان لە فڕێنەرو تاڵان کەر و داگیرکەر لە تەواویتی حیکمەتی یاسادانەری ئیسلامە.

چونکە دز ناتوانرێ خۆی لێ بپارێزرێ لەبەرئەوەی خانوو کون ئەکات و کیلۆن ئەشکێنێ و جانتا و سندوق ئەبڕێ، ئیتر خاوەن شت لەوانە زیاتر جێی قایمی نیە، جا ئەگەر شەرع دایئەنایە لەسەر ئەوە دەستی دز ببڕێ ئیتر خەڵك هەمویان دزیان لە یەکتر ئەکردو زیانەکە گەورە ئەبوو، وە مەینەتی بەدەست دزەوە زۆر ئەبوو. بە پێچەوانەی تاڵانکەر و شت ڕفێن.

تاڵانکەر کەسێکە بە ئاشکرا لەبەرچاوی خەڵك شت ئەبات کە ئەتوانن دەستی بگرن و نەیەڵن و ستەم لێکراو ڕزگار بکەن، یا لای حاکم شایەتی بۆ بدەن.

بەڵام ڕفێنەر شتەکە کاتی بێئاگایی ئەڕفێنی ئەمەش جۆرە کەم تەرخەمییەکی تێدایە کە ڕێ بەو ڕفێنەرە ئەدات بیبات، چونکە ئەگەر کەم تەرخەم نەبێت و ئاگای لە خۆی بێت ناتوانێ شتەکەی بڕفێنێ چونکە ئەو وەکو دز نیە، بەڵکو زیاتر لە ناپاك و خەیانەتکار ئەچێت.

وە هەروەها ڕفێنەر ئەو ماڵەی ئەی ڕفێنێ بە زۆری لە شوێنی پارێزراودا نیە، چونکە ئەو کاتی بێ ئاگاییت یان چۆڵ کردنت بەهەل ئەزانێ و ماڵەکەت ئەبات، کە ئەمە ئەتوانرێ خۆی لێ بپارێزرێ کەواتە ئەو وەك تاڵانکەر وایە.

وە داگیرکەر کاری ئاشکرایە لەبەر ئەوە ئەم لە پێش ترە لە تاڵان کەر کە دەستی نەبڕێت. بەڵام ئەتوانرێ زیانی ئەمانە دوور بخرێتەوە بە لێدان و بەندکردنی زۆرو غەرامە کردن.

**حاشاکردن لە (عارية) شتی وەرگیراو بە ئەمانەت:**

ئەوەی دوو دڵی تێدا بێت کە بە دزێتی دابنرێت یان نا، حاشاکردنە لە شتی خواستراو، چونکە زانایان جیاوازییان هەیە لەو بارەیەوە.

جەماوەر وتویانە: ئەو کەسەی حاشا بکات لەو شتەی خواستویەتی دەستی نابڕرێت، چونکە قورئان و سوننەت دەست بڕینیان لەسەر دزێتی پێویست کردووە، ئەو حاشاکەرەش دز نیە.

وە ئەحمەد و ئیسحاق و زوفەر و خەواریج و ظاهیرییەکان بۆ ئەوە چوون کە ئەبێ ئەویش دەستی ببڕێت، بە پێی ئەوەی ئەحمەد و موسلیم و نەسائی ئەگێڕنەوە لە عائیشەوە خوالێی ڕازی بێت کە فەرمویەتی: ژنێکی مەخزومی هەبوو شتی لە ماڵان ئەخواست و دوایی حاشای لێ ئەکرد. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دەست بڕینی دا، جا کەس و کاری هاتنە لای ئوسامەی کوڕی زەید تکایان لێکرد کە بچێت بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) تکای بۆ بکات دەستی نەبڕێت، ئەویش هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) تکای لێکرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (يا أسامةُ، لا أراك تشفع في حد من

حدود الله عز وجل) واتە: ئەی ئوسامە ئەت بینم تکا بکەیت لە حەددێك لە حەددەکانی خوای گەورەدا.

لەپاشاندا پێغەمبەر (ﷺ) چووە سەر دوانگەو ووتارێکی داو فەرمووی: (إنما هَلَكَ من كان قبلكم بأنه إذا سرق فيهم الشريف تركوه، وإذا سرق فيهم الضعيف قطعوه، والذي نفسي بيده لو كانت فاطمة بنت محمد لقطعت يدها).

واتە: بە ڕاستی نەتەوەکانی پێش ئێوە بۆیە لەناوچوون چونکە ئەگەر دەسەڵات دارێکیان دزی بکردایە وازیان لێئەهێنا، وە ئەگەر هەژارێکیان دزی بکردایە دەستیان ئەبڕی، بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە ئەگەر فاطمەی کچی محمد بوایە دەستم ئەبڕی.

ئیتر دەستی ژنە مەخزومی‌یەکەیان بڕی[1].

(ابن القيم) پشتی ئەو ڕایە ئەگرێ وە کەسێك حاشا لەشتی ئەمانەت بکات بە دز دائەنێت بەپێی شەرع.

لە (زاد المعاد)دا فەرمویەتی: ئەمە کە پێغەمبەر (ﷺ) حاشاکەر لە شتی ئەمانەت ئەخاتە ژێر ناوی دزەوە وەك خستنە ناوی جۆرەکانی خراپە وایە بۆ ناو عارەق. ئەویش ناساندنی مەبەستی خوایە لەفەرموودەکەیدا بە نەتەوەی ئیسلام.

وە لە (الروضة الندية) دا هاتووە: ئەو کەسەی حاشا ئەکات لەو شتەی بە ئەمانەت خواستویەتی ئەگەر بە زمان و لوغەتیش دز نەبێت بە شەرع دزە، وە شەرعیش پێش زمان خراوە.

ئیبنو قەییم لە (إعلام الموقعين)دا ووتویەتی: حیکمەت و بەرژەوەندی‌یەکەی زۆر دیار و ئاشکرایە، چونکە شتی خواستراو لەو بەرژەوەندی‌یانەیە کە ئادەمیزاد ناتوانێ وازیان لێبهێنێ. ئەمەش کارێکی واجبە کە لەکاتی پێویستی خواستەر بەو شتە بیدرێتێ بە خۆڕایی یا بەکرێ.

وە خەڵکیش ناتوانن هەموو کاتێك شایەت بگرن لەسەر ئەو شتە ئەمانەتە، وە بە پێی شەرع و عادەت و عورف ناکرێ و ناتوانرێ خواستەمەنی نەدرێ بەکەس لە کاتێکا پێویستیان پێ‌یەتی. وە هیچ جیاوازی‌یەك نی‌یە لە نێوان ئەوەدا کەسێك بگاتە شتی خەڵك بەهۆی دزی‌یەوە، وە لە نێوان ئەوەدا بە خواستن بیبات و دوایی حاشای لێبکات، ئەمە پێچەوانەی حاشاکەرە لە سپاردەکە بە ئەمانەت لای دائەنرێ، چونکە ئەمەیان خاوەن کەلوپەل خۆی کەم تەرخەمی کردووە کە بە دەست پاکی داناوەو باوەڕی پێ کردوە.

(١) أحمد (٢/١٦٢) ومسلم (١٦٨٨/٨و٩) والنسائي (٨/٧٣و٧٤و٧٥).

**کفن دز و گۆڕهەڵدەرەوە:**

هەروەها ئەوەی جیاوازی زانایانی لەسەرە لەم بارەیەوە حوکمی گۆڕهەڵدەرەوەیە کە کفنی مردو ئەدزێ، وە جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون کە سزاکەی دەست برینە چونکە ئەمیش دزی ڕاستیە، وە گۆڕیش شوێنی پاراستنە (کەواتە شیاوی دەست برینە).

وە ئەبوحەنیفە و محمد و ئەوزاعی و ثەوری بۆ ئەوە چوون کە سزاکەی تەمێ‌کردنە، چونکە گۆڕهەڵدەرەوە دز نیە، وە حوکمی دز وەرناگرێ، وە لەبەر ئەوەی شتێکی بردووە کە مولکی کەس نیە، چونکە مردو خاوەنی هیچ نیە، وە لەبەر ئەوەی لە شوێنی پارێزراودا هەڵی نەگرتووە.

**ئەو سیفاتانەی پێویستە ئیعتیباری پێ بکرێ لەدزی کردندا:**

لە پێناسەکەی پێشووەوە دەرکەوت کە ئەبێت چەند سیفەتێکی دیاریکراو هەبێت لە دزیدا ئیعتیباری پێ بکرێ. وە هەروەها لە شتە دزراوەکەدا، وە لە شوێنی دزینەکەشدا، بۆ ئەوەی ئەو دزیەتیە بێتەدی کە حەددی تێدا پێوست ئەبێت.

وە لەمەودوا ڕوون کردنەوەی هەریەکەیان دێت:

ئەو سیفاتانەی کە ئەبێت لە دزدا هەبێت هەتا پێی بڵێن دز و حەددی دزێتی پێویست بکات لە مانەی خوارەوەدا باس ئەکەین:

١- تەکلیف: بەوەی کەئەبێت دزەکە پێ‌گەیشتووی ژیر بێت، جا شێت و منداڵ ئەگەر دزیان کرد حەددیان لەسەر نیە، چونکە موکەللەف نین، بەڵام ئەبێ منداڵ تەمێ بکرێ ئەگەر دزی کرد.

وە ئیسلامەتی مەرج نیە بۆ دزیەتی، جا ئەگەر کافری ذمی یا هەڵگەڕاوە دزی کرد دەستیان ئەبڕرێت، وەك چۆن دەستی موسڵمان ئەبڕرێت، ئەگەر دزی لە ذمی بکات.

٢- ئارەزوو: بەوەی کە دزەکە بە ئارەزووی خۆی دزی بکات، ئەگەر بە زۆر دزی پێ کرا بە دز دانانرێت، چونکە زۆر لێکردنەکە ئارەزوی لێ دائەماڵێ، وە داماڵینی ئارەزوش تەکلیف لائەبات.

٣- ئەبێ دزەکە لە شتە دزراوەکەدا شوبهەی نەبێت: ئەگەر شوبهەی هەبوو دەستی‌نابڕرێت. لەبەرئەوە دایك و باوك دەستیان نابڕرێت ئەگەر ماڵی منداڵەکانیان بدزن بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کەئەفەرمویەتی: (أنت ومالك لأبيك)[1].

واتە: خۆشت و ماڵەکەشت هی باوکتن.

---

(١) ابن ماجه (٢٢٩١).

وە هەروەها كوڕو كچ بە دزێتی ماڵی باوك و دایكیان، یا ماڵی یەكێكیان دەستیان نابڕێت چونكە عادەت وایە منداڵ بێ ترسە لە ماڵی باوك و دایك دا.

باپیرەش هەروەك باوك وەهایە دەستی نابڕێت لەلایەنی باوكەوە بێت یا دایك، وەك یەكە، وە كەس لە ستونی نەسەبدا دەستی نابڕێت لەسەر دزینی شتی یەكتری بەرەو خوار یا بەرەو ژوور - مەبەستم باو باپیرانە- وە هەروەها كوڕەكان و نەوەكانیان.

بەڵام خزمانی‌تر جگە لە خزمی پشتی، ئەبو حەنیفە و ثەوری ئەڵێن دەست برین لەسەر هیچ خزمێك نی‌یە. كە مەحرەم بێ، وەك پور (خوشكی باو ك و دایك) وە خوشك و مام و خاڵ و برا، چونكە دەست بڕینیان ئەبێتە پچڕاندنی سیلەی ڕەحم كە خوا فەرمانی داوە بە گەیاندنی.

وە لەبەرئەوە ئەمانە مافی ئەوەیان هەیە بچنە ماڵی یەكترەوە، ئەمەش بۆ خۆی ڕێگا پێدانێكە لە خاوەن ماڵەوە كە مەرجی قایم هەڵگرتنی پێ تێك ئەچێت[1].

وە مالیك و شافیعی و ئەحمەدو ئیسحاق خوایان لێ ڕازی بێت وتویانە: ئەوانەش هەركامیان دزی بكەن دەستیان ئەبڕێت لەبەر نەبوونی شوبهە لە ماڵەكەدا.

وە ژن و مێرد هیچیان دەستیان نابڕێت ئەگەر دزی‌یان لە یەك كرد، لەبەر شوبهەی تێكەڵ بوونیان و شوبهەی ماڵەكە، چونكە تێكەڵی نێوانیان ڕێی ئەوە ئەگرێ ئەو ماڵە بپارێزرێ بە تەواوی، بەوەش شوبهە لە ماڵەكەدا دروست ئەبێت، جا ئەگەر ماڵێك بە تەواوی نەپارێزراو شوبهەی تێدا بوو، دەست بڕین لە كۆڵ ئەخات.

ئەوەش مەزهەبی ئەبی حەنیفە و شافیعی‌یە لە قسەیەكی‌دا ڕەحمەتی خوایان لەسەر بێت، وە یەكێ لە ڕیوایەتەكانی ئەحمەدە ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت.

وە مالیك و ثەوری و ڕیوایەتێك لە ئەحمەدەوە و یەكێ لە قسەكانی شافیعی خوایان لێ ڕازی بێت وتویانە:

ئەگەر هەریەكەیان خانوویەكی تایبەتی هەبوو كەلوپەلەكەی تێ خستبوو، ئەوە دەستی ئەوی تریان ئەبڕێت ئەگەر دزی لێكرد لەبەر بوونی پاراستن لە لایەكەوەو سەربەخۆیی هەریەكەیان لە لایەكی ترەوە.

وە ئەو خزمەتكارەی كە بە خۆی خزمەتی گەورەكەی ئەكات دەستی نابڕێ،

(١) وە ئەمە وەك میوان وایە كە ڕێی ئەدا بەهاتنە ژوورەوە كاتێك دزی كرد دەستی نابڕدرێ.

له عبدالله ی کوڕی عومەرەوە خوا لێی ڕازی بێت کە فەرمویەتی: پیاوێك غولامێکی هێنا بۆ لای عومەر خوا لێی ڕازی بێت پێی ووت: دەستی ببڕە لەبەرئەوەی ئاوێنەیەکی ژنەکەمی دزیوە. عمر خوای لیّ ڕازی بێت فەرموی: دەست بڕینی لەسەر نیە لەبەرئەوەی خزمەتکارتانە و کەلوپەلی بردوون[1].

وە ئەوە مەزهەبی عومەر و ئیبنو مەسعود بووە و کەسیش لە صەحابەکان پێچەوانەی نەبوون.

وە هەرکەس لە (بیت المال) دزی بکات دەست بڕینی لەسەر نابێت ئەگەر موسڵمان بێت، بە پێی ئەوەی ئەگێڕنەوە کە کاربەدەستێکی عومەر خوالێی ڕازی بێت نامەیەکی نووسی بۆ عمر پرسیاری لێکردبوو دەربارەی کەسێك لە (بیت المال) دزی بکات ئەویش فەرموی: (دەستی مەبڕە چونکە کەس نیە مافی تێدا نەبێت).

شیعبی ئەگێڕێتەوە: پیاوێك لە (بیت المال) دزی کردبوو، گەیشتەوە بە عەلی خوا لێی ڕازی بێت ئەویش فەرموی: بەشێکی خۆی تێدایە، ئیتر دەستی نەبڕی.

جا قسەکەی عومەر و عەلی هۆی نەبڕینی دەستی ئەو کەسەی لە (بیت المال) دزی بکات دەرئەخات، چونکە ئەمە شوبهە دروست ئەکات وە شوبهە ڕێ لە بەجێهێنانی حەددی شەرعی ئەگرێ.

ئیبنو قودامە وتویەتی: وەك ئەوەی لە ماڵێك دزی بکات کە خۆی هاوبەش بێ تێیدا.

وە حوکمەکەی هەروەهایە ئەگەر کەسێك لە غەنیمە دزی بکات کە مافی تێیدا هەبێت[2]، یا بەشی منداڵەکانی تێدابێت یا بەشی گەورەکەی، وە ئەوەش مەزهەبی جەماوەری زانایانە[3].

ئیبنو ماجە ئەگێڕێتەوە لە ئیبنو عەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت کە وتویەتی: بەندەیەك لە بەندەکانی پێنج یەکی غەنیمە لە پێنج یەکی غەنیمە، دزی کردبوو، وە گەیاندیانە لای پێغەمبەر (ﷺ) دەستی نەبڕی و فەرمووی:

(مال الله سرق بعضه بعضاً)[4].

واتە: ماڵی خوایە هەندێکی دزی لە هەندێکی کردووە.

---

(١) مالك في الموطأ ٢/٨٤٠.

(٢) وە ئەگەر مافی تیا نەبوو ئەوە دەستی ئەبڕێ بە کۆی زانایان.

(٣) وە مالیك بۆ ئەوە چووە کە دەستی ئەبڕێ، بەپێی ڕواڵەتی ئایەتەکە. کە گشتیەو تایبەت نەکراوە.

(٤) ابن ماجه (٢٥٩٠).

وە هەروەها هەرکەس دزی لەو کەسە بکات کە قەرزی پێدابێت و دوای خستبێ. یان حاشای لێبکات و قەرز کوێر بێت، چونکە ئەو دزییە وەرگرتنەوەی قەرزەکەیەتی، مەگەر قەرزدارەکە دان بە قەرزەکەدا بنێت و توانای دانەوەی هەبێت.

ئەوکاتە قەرزدەر دەستی ئەبڕێ ئەگەر دزی بکات لە خاوەن قەرزەکە. چونکە لەدزییەکەیدا هیچ شوبهەیەك نییە.

وە لەسەر دزینی شتومەکی خوازراو (عارية) کە بە دەستی خوازەرەوە بێت دەست نابڕێت چونکە دەستی خوازەر دەستی ئەمانەتە و دەستی خاوەن شت نییە.

وە کەسێك ماڵێکی زەوت کردبێت و دزیبێتی لە پاشاندا لە شوێنی پارێزراودا دایناێت، پاشان دزێك لێی بدزێت. ئەحمەدو شافیعی ووتویانە: دەستی نابڕێ لەبەرئەوەی لە شوێنێکدا دایناوە خاوەنی پێی ڕازی نەبووە، وە مالیك وتوویەتی: دەستی ئەبڕێت، چونکە شتێکی دزیوە هیچ شوبهەی تێدانییە لە پاراستنی ماڵی ئاوا.

ئەگەر تەنگ و چەڵەمە دروست بوو لەناو خەڵکدا و یەکێك خواردەمەنییەکی دزی، ئەگەر خۆیان خواردنیان هەبوو دەستی ئەبڕێت، چونکە پێویستی بەو دزییە نەبووە.

بەڵام ئەگەر خوادرنیان نەبوو دەستی نابڕێت، لەبەرئەوەی مافی ئەوەی هەیە بەشی پێویستی خۆی بەرێت.

عومەر خوای لێی ڕازی بێت فەرموی: لە ساڵی گرانی و برسیەتیدا دەستی دز نابڕێت.

وە مالیك لە (الموطأ) دا ووتویەتی: چەند بەندەیەکی حاطەب وشتری پیاوێکی موزەنیان دزی و سەریان بڕیبوو. ئەوەیان گەیاندە عمری کوڕی خطاب، عمر فەرمانی دا بە کوثەیری کوڕی صەڵت دەستیان ببڕێت، پاشان عمر فەرموی: وا دیارە برسیت کردوون، لەپاشاندا فەرموی: سوێند بە خوا پێت ئەبژێرم بە شێوەیەك توانات بەسەریا نەشکێ. ئەجا بە کابرای موزەنی فەرموو: نرخی وشترەکەت چەندە بوو؟

ئەویش ووتی: (والله) چوار سەد درهەمیان دامێ نەمداوە، عمر فەرموی: هەشت سەد درهەمی بدەرێ.

ئیبنو وەهەب ئەگێڕێتەوە کە (عمر)ی کوڕی خەططاب دوای‌ئەوەی فەرمانی دا بە کوثەیری کوڕی صەڵت دەستی ئەوانە ببڕێت کە دزییان کردبوو، پیاوێکی نارد بە شوێنیاندا کە بیان هێنێ. ئەویش هێنانی، ئینجا بە عبدالرحمن ی کوڕی حاطبی فەرموو: (من ئەگەر وام نەزانیایە کە ئێوە کاریان پێئەکەن و برسیان ئەکەن بە جۆرێك ئەگەر ماڵێکیشیان دەست کەوێت کە خوا حەرامی

کردوە بیخۆن دەستیانم ئەبڕی، بەڵام سوێند بە خوا چونکە وازت لێ هێناون بە شێوەیەك پێت ئەبڕێرم کە بت تەزێنێ.

ئەو سیفەتانەی کە پێویستە لە ماڵە دزراوەکەدا هەبێت:

ئەو سیفەتانەش کە پێویستە لە ماڵە دزراوەکەدا هەبێت ئەمانەن:

(یەکەم) ئەبێ لەو ماڵانە بێت لەبەردەست دا بێت و خاوەنی هەبێت و دروست بێت بفرۆشرێ وە لە جیاتی شت وەربگیرێ. چونکە هەرکەس عارەق یا بەراز بدزێ دەست برینی لەسەر نیە با خاوەنەکەشی کافری ذمی بێت، چونکە خوا خاوەنێتی ئەوانەی حەرام کردووەو سوود لێوەرگرتنیانی حەرام کردوە بە نیسبەت موسوڵمان و ذمی وەك یەك[1].

وە هەروەها لەسەر دزینی ئامێری ڕابواردن وەك: عود و کەمانچە و شمشاڵ و ئەو جۆرە شتانە دەست برین نیە، چونکە ئەوانە ئامرازێکن دروست نیە بەکارهێنانیان لای بەشی زۆری زانایان، کەواتە لەو شتانە نین کە مامەڵەیان پێ بکرێت و خاوەنیان هەبێت و فرۆشتنیان دروست بێت، وە ئەوانەی بەکارهێنانیشیان بە ڕەوا ئەزانن لەگەڵ ئەوانەدا ڕێك کەوتون کە بە حەرامیان ئەزانن بۆ نەبڕینی دەستی کەسێك کە ئەو شتانە ئەدزێ لەبەر بونی شوبهە تیایاندا، شوبهەش حدد لا ئەبات.

وە زانایان جیاوازییان هەیە لە دزینی منداڵی ئازاد کە تەمیزی نەبێ.

ئەبوحەنیفە و شافیعی ووتویانە: ئەو کەسەی ئەو جۆرە منداڵانە بدزێ دەستی نابڕێ چونکە ماڵ نیە، بەڵکو تەمێ ئەکرێ، وە ئەگەر خشڵ و جلی باشیشی لەبەردا بێت هەر دەستی لەسەر نابڕرێت، چونکە هەرچی پێوەی بێت لە زێڕو زیو لەگەڵ منداڵەکەدایەو مەبەست لە دزینەکەی ئەو شتانە نیە.

ئەبویوسف ووتویەتی: ئەگەر زێڕو زیوەکەی و لیباسەکانی بە ڕادەیەك زۆر بوو کە دەستی دزی لەسەر ئەبڕرا یان شتی دیکەی لەگەڵدا بوو ئەوە دەستی دەبڕێ.

وە مالیك ووتویەتی: لەسەر دزینی ئەو منداڵە دەست ئەبڕرێت، چونکە گەورە ترین ماڵە وە دەستی دزەکە لەسەر ماڵەکە خۆی نابڕرێت، بەڵکو لەبەر ئەوە دەستی ئەبڕرێت چونکە دڵ زۆر بۆ

---

(١) ئەبو حنیفە ڕای وایە کە ڕوایە بۆ ذمی ئارەق و بەراز، وە هەرکەس بیان فەوتێنێ زەمانەتی نرخەکەی لەسەرە، بەڵام لەمەدا ڕێکە لەگەڵ زانایان لە نەبڕانی دەستێك کە بیان دزێ، چونکە دارایی تەواو نین کە ئەوە مەرجە بۆ حدد.

ئەو شتانە لێ ئەدا بە تایبەتی ئەگەر منداڵەكە ئازادبێت زیاتر دڵ بۆی لێئەدات لە منداڵی بەندەیەك.

وە دزی منداڵی بەندەی بچووكی بێ تەمیز دەستی ئەبڕێت، چونكە ماڵە، بەڵام ئەگەر منداڵەكە جیاكەرەوە بوو دزەكەی حەددی بەسەردا جێبەجێ ناكرێت. چونكە هەرچەندە ماڵێكە ئەفرۆشرێت و ئەكڕێت بەڵام دەسەڵاتی بەسەر گیانی خۆیدا هەیە، كەواتە لەجێگەی قایمدا نەدزراوە (پارێزراو نی یە.

بەڵام ئەو شتانەی بە خاوەن بونیان دروست بێت و فرۆشتنیان دروست نەبێ، وەك سەگێك ڕێ درابێت بە فرۆشتنی، و وەك گۆشتی قوربانی، ئەشهەب ووتویەتی كە لە مالیكی‌یەكانە: دەستی دز ئەبڕێت لەسەر دزینی سەگێك ڕێ درابێت بە ڕاگرتنی[1].

هەروەها ئەصبەغ لە مالیكی‌یەكان دەربارەی گۆشتی قوربانی ووتویەتی: ئەگەر ئاژەڵە قوربانی‌یەكەی دزی پێش سەربڕینی دەستی ئەبڕێت، بەڵام ئەگەر دوای سەربڕین دزی دەستی نابڕێت.

بەڵام دزینی ئاوو بەفر و ئاڵف و خوێ و گڵ، خاوەنی (المغنی) ئەڵێت: ئەگەر ئاوی دزی دەستی نابڕێ لەسەری، ئەبوبەكر و ئەبو ئیسحاقیش هەر ئەوەیان وتووە، چونكە ماڵێك نی‌یە مامەڵەی پێبكرێ، وە جیاوازیش نازانم لەناو زانایاندا لەسەری.

بەڵام ئەگەر ئاڵف و خوێی دزی ئەبوبەكر ووتویەتی: دەستی لەسەر نابڕێت، چونكە لە شەرعدا هاتووە خەڵك لەواندا بە گشتی بەشدارن وەك ئاو وەهان.

ئەبو ئیسحاقی كوڕی شاملا ووتویەتی: دەستی لەسەر ئەبڕێت چونكە مامەڵەیان پێ دەكرێ وەك كاو جۆ وەهان.

بەڵام لەبارەی بەفر. قاضی ئەڵێت: ئەمیش وەك ئاوە چونكە ئاوێكە بەستویەتی لە سەهۆڵ ئەچێت، وە زیاتر لە خوێ ئەچێت لەبەرئەوەی زۆر جار خوێ ئەگۆڕێت كەواتە وەك خوێ ئاو وەهایە.

بەڵام گڵ و خۆڵ ئەگەر زۆر بەنرخ نەبێت بۆ خەڵك وەك ئەوانەی ئامادە ئەكرێن بۆ قوردان و خانو پێكردن دەستی لەسەر نابڕێت، چونكە مامەڵەی پێ ناكرێت، بەڵام ئەگەر زۆر بەنرخ بێت وەك

(١) سەگی ڕێدراو بە ڕاگرتن سەگی پاسەوانی و كشت و كاڵ و سەگی ڕاوە.

قوڕی ئەرمەنی کە بۆ دەرمان ئامادە ئەکرێت، یا بۆ شوشتن ئامادە ئەکرێت، یا بۆ ڕەنگ کردن وەکو سرێش، ئەوە دولایەن وەردەگرن.

١- یەکەمیان دەستی لەسەر نابڕرێت، چونکە لەو ڕەگەزانەن کە مامەڵەیان پێ ناکرێت و لەناو ئەچن.

٢- دەستی لەسەر ئەبڕرێت، چونکە مامەڵەیان پێ ئەکرێت و هەڵئەگیرێ بۆ شاران بۆ بازرگانی وەك عودی هندی وایە.

بەڵام دزینی ئەو شتانەی لە ئەسڵدا ڕەوان وەك ماسی و باڵندە کە گیاین و لە شوێنی پارێزراودا دانەنرابن دەست بڕینی لەسەر نیـیە.

بەڵام ئەگەر لە شوێنی پارێزراودا بوون زانایان جیاوازییان هەیە لەسەری.

لە مەزهەبی مالیکی و شافیعیدا ڕەوایە دەستی دزەکەی ببڕرێت، چونکە ماڵێکی دانراوی سودداری سەربەخۆی پارێزراوی دزیوە (کەلە جێگەی تایبەتیدا بووە).

وە حەنەفییەکان و حەنبەلییەکان بۆ ئەوە چوون دەستی لەسەر نابڕرێت بە پێی ئەوەی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕراوەتەوە کە فەرموویەتی: (الصید لمن أخذه).

واتە: (نێچیر بۆ ئەو کەسەیە بیگرێت).

جا ئەم فەرموودەیە شوبهەیەك دروست ئەکات کە تۆڵەی پێ لائەبرێت، عبد الله ی کوڕی یەسار وتویەتی: پیاوێکیان هێنا بۆ لای (عمر)ی کوڕی عبدالعزیز مریشکێکی دزی بوو، ویستی دەستی ببڕێت سالمی کوڕی عبدالرحمن پێی ووت: عثمان خوای لێ ڕازی بێت فەرمویەتی: دەست نابڕرێت بۆ باڵندە.

وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە (عمر)ی کوڕی عبدالعزیز پرسی لە سائیبی کوڕی یەزید، ئەویش ووتی: ئەم دیوە کەس لەسەر دزینی باڵندە دەستی بڕیبێ، وە دەست بڕینی لەسەر نیـیە بۆ ئەوە، عمریش بەرەڵلای کرد. هەندێ لە زانایان ووتویانە: ئەو باڵندانەی بە ڕەوا دانراون ئەوانەن کە ڕاوبکرێن نەك لە مریشك و مراوی، چونکە پێویستە لەسەر دزینی ئەو دوانە دەستی دزەکە ببڕرێت، چونکە ماڵی خەڵکن و نێچیر نین.

وە ئەبو حنیفە ووتویەتی: دەست بڕین نیـیە لەسەر دزینی خواردەمەنی تەڕە وەك ماست و گۆشت و میوەهاتی گەیشتو، وە هەروەها لەسەر دزینی پوش و دار، وە لەسەر دزینی ئەو شتانەی زوو تێك ئەچن، با نرخی شتە دزراوەکە بگاتە ڕادەی دانراو بۆ دەست بڕین، چونکە ئەو شتانە خەڵك

زۆر بە پەرۆشی نین، وە عادەت وایە خاوەنیشی ڕەزیلیيان لەسەر ناکات، ئیتر پێویست بە سەرزەنشتیش ناکات بە نیسبەت ئەوانەوە وە لە شوێنی تەواو قایمیشدا دانانرێن.

وە بەپێی ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لا قطع في ثمر و لا كثر)[1].

واتە: دەست برین نی‌یە لەسەر خورماو ناوەڕۆکی دارخورما.

چونکە ئەمانە شوبهەی بەش پێوە بوونیان تێدا هەیە، لەبەر بوونی هاوبەشی گشتی، بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی: (الناس شركاء في ثلاثة: الماء، و الكلأ، و النار)[2].

واتە: خەڵك هاوبەشن لە سێ شتدا: ئاو و لەوەڕگە و ئاگر.

وە ئەوەی زانایان جیاوازی‌یان هەیە لەسەری، دزینی قورئانە. ئەبو حەنیفە وتویەتی: (هەرکەس قورئان بدزێت دەستی نابڕرێت، چونکە ماڵ نی‌یە، وە لەبەرئەوەی هەموو کەس مافی هەیە تێ‌یدا.

وە مالیك و شافیعی و ئەبو ثەور و ئەبو یوسف لە هاوەڵانی ئەبی حەنیفەو ئیبنو مونذیر وتویانە: کەسێك قورئان بدزێ دەستی ئەبڕدرێ ئەگەر نرخەکەی بەو ئەندازەیە گەیشت کە دەست برینی تێدا هەیە.

(دووەم) مەرجی دووەم کە ئەبێت لە ماڵی دزراودا هەبێت ئەوەیە ئەو شتە دزراوە بگاتە ڕادەی دانراو (نصاب)، چونکە ئەبێت شتێك هەبێت بکرێت بە قاعیدە بۆ بەجێ هێنانی حەدد، وە ئەبێت ئەو شتە ئەوەندە نرخی هەبێت کە خاوەنی بە نەمانی ئەو شتە تووشی زیان بێت، چونکە عادەت وایە کە خەڵك بۆ شتی کەم لێ بووردنیان هەیە، لەبەرئەوە پێشنینان دەستی کەسیان نەبڕیوە لەسەر شتی بێ‌نرخ، وە زانایان جیاوازی‌یان هەیە لە چەندێتی ئەو ڕادەیەدا، جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون کە دەست نابڕرێت هەتا نەگاتە چارەکە دینارێکی زێڕ، یا سێ درهەم زیو، یا ئەو شتانەی نرخەکەیان یەکسان بێت بە چارەکە دینارێك زێڕ یا سێ درهەم زیو.

وە لە دانانی ئەو ڕادەیەدا حیکمەتێك دەرئەکەوێت، ئەویش ئەوەیە ئەو ڕادەیە بەشی خەرجی مام ناوەندی ڕۆژێك ئەکات بۆ خۆی و ئەوانەی بەخێویان ئەکات.

وە دزینی ئەو شتەی بەشی بژیوی ڕۆژێکی ئەو کەسە بکات بۆ خۆی و ئەو کەسانەی بەخێویان ئەکات، مەترسی و زیانی هەیە لای خەڵك.

---

(١) أحمد (٤/١٤٠) وأبوداود (٤٣٨٨) والترمذي (١٤٤٩) والنسائي (٨/٨٧) وابن ماجه (٢٥٩٣).

(٢) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

بەپێی ئەوەی عائیشە خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەستی دزی لەسەر چارەکە دینارێك و بەرەو ژور ئەبڕی[1].

وە لە ڕیوایەتێکی مەرفوعدا کە لە پێغەمبەرەوەیە (ﷺ) هاتووە: (لا تقطع يد السارق إلا في ربع دينار فصاعداً).

واتە: دەستی دز نابڕرێت لەسەر چارەکە دینارێك و بەرو ژوور نەبێت. ئەحمەد و موسلیم و ئیبنوماجە ڕیوایەتیان کردووە[2].

وە لە ڕیوایەتێکی تری نەسائی دا بە مەرفوعی هاتووە: (لا تقطع اليد فيما دون ثمن المجن.)

واتە: دەست نابڕرێت لەسەر شتێك کە نرخەکەی لە نرخی قەڵغان کەمتر بێت.

بە عائیشەیان ووت نرخی قەڵغانێك چەندە؟ فەرموی: چارەکە دینارێك[3].

وە حەدیسەکەی پێشەوەی ئیبنو عومەر پشتگیری ئەکات کە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیم دا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر قەڵغانێك کە نرخەکەی سێ درهەم بوو دەستی بڕیوە[4].

وە مەزهەبی حەنەفییەکان ئەوەیە ڕادەی دانراو کە دەست بڕین پێویست بکات دە درهەمە لەوە کەمتر دەستی لەسەر نابڕرێت، وە بەڵگەشیان ئەوەیە کە بەیهەقی و طەحاوی و نەسائی لە ئیبنو عەبباسەوە گێڕاویانەتەوە، وە هەروەها لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکییەوە لە باپیرەیەوە کە نرخی قەڵغان دانراوە بە دە درهەم[5].

وە حەسەنی بەصری و داودی ظاهیری بۆ ئەوە چوون کە دەست بڕین لەسەر کەم و زۆر سابت ئەبێت لەبەر کار کردن بە گشتێتی ئایەتەکە، وە بە پێی ئەوەی بوخاری و موسلیم لە ئەبی هورەیرەوە گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (لعن الله السارق، يسرق البيضة فتقطع يده، ويسرق الجمل فتقطع يده)[6].

---

(١) البخاري (٦٧٩٠) ومسلم (١٦٨٤/١).

(٢) أحمد (١٠٤/٦) ومسلم (١٦٨٤/٢) والنسائي (٨٠/٨) وابن ماجه (٢٥٨٥).

(٣) النسائي (٨١/٨).

(٤) البخاري (٦٧٩٥) ومسلم (١٦٨٦/٦).

(٥) نيل الأوطار (٦٨٤/٤).

(٦) البخاري (٦٧٩٩) ومسلم (١٦٨٧).

واتە: نەفرینی خوا لە دز کە بەیضەیەك ئەدزێ دەستی ئەبڕن وە ووشتڕێك ئەدزێ دەستی ئەبڕن.

جەماوەری زانایان وەڵامی ئەوەیان داوەتەوە کە ئەعمەش گێڕەرەوەی حەدیسەکە (البیضة)ی بەو ئاسنە لێك داوەتەوە کە بۆ شەڕ لەسەر ئەکرێت، وەك قەڵغانێك وایە، جاری وایە نرخەکەی لە نرخی قەڵغان زیاتر بووە، وە ڕایان وابووە کە ووشتر تێیدا هەیە نرخەکەی چەند درهەمێك ئەبێ.

وە چارەکە دینارێك کە بگۆڕرایەوە بە سێ درەم بوو.

لە (الروضة الندية)دا هاتووە شافیعی ووتویەتی: چارەکە دینارێك لەگەڵ ڕیوایەتی سێ درهەمدا ڕێك ئەکەوێت، چونکە لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) دینارێك دوانزە درهەم بووە.

وە ڕێك ئەکەوێ لەگەڵ ئەوەدا کە خوێنی ئادەمیزاد هەزار دیناری زێڕ بووەو دوانزە هەزار درهەمی زیو بووە.

وە ئەبوحەنیفە و هاوەڵەکانی بۆ ئەوە چون کە نیصابی پێویست کەری دەست بڕین دە درهەمە یا دینارێك، یا نرخی هەریەکەیان بێت لە شتی تر، وە دەست بڕین لەوە کەمتردا نییە، چونکە نرخی قەڵغان لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) دە درهەم بووە، وەك عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە لە باپیرەیەوە گێراویەتییەوە.

وە لە ئیبنو عەبباس و کەسانی ترەوە ئەو دانانە گێڕراوەتەوە، ووتویانە: دانانی نرخی قەڵغان بەو شێوەیە باشترە، چونکە حەددە شەرعییەکان بە بوونی گومان لە کۆڵ ئەکەون، و کارکردن بەوە کەمتر وەك بوونی گومان وایە.

وە لە ڕاستیدا دانانی نرخی قەڵغان بە دە درهەم بەرەنگاری ئەکرێ بە صەحیحتر لەوە وەك لە ڕیوایەتە صەحیحەکاندا هاتووە.

مالیك و ئەحمەد لە ئاشکراترین ڕیوایەتیدا ووتویانە:

نیصابی دزی، چارەکە دینارێکە، یا سێ درهەمە، یا نرخی ئەو دوانە لە کەلوپەل. و دانانی نرخ بە درهەم تایبەتە. وە نرخەکان بنەڕەتن هەندێکیان بە هەندێکی تریان بەراورد ناکرێن.

و لەسەر بڕینی دەست بۆ چارەکە دینارێك ڕەخنە گیراوە، لەگەڵ ئەوشدا خوێنەکەی پێنصەد دینار بێت. یەکی لە شاعیران دەڵێ:

| | |
|---|---|
| يد بخمس مئين عَسْجَد وُ دِيَت | ما بالها قُطِعَت في ربع دينار؟ |

تناقض ما لنا إلا السكوت له      و نستجير بمولانا من العار

واتە دەستێك كە دیەو خوێنەكەی پێنصەد (دیناری تەلاً بێت) چۆنێتی لەسەر چارەكە دینارێك دەبڕێ؟ ئەم كارانە دژی یەكن و یەكتر هەڵئەوەشێننەوە كە ئێمە لە بێ دەنگ بون زیاتر مافمان نیە، وە پەنا بە خوا ئەبەین لەوە كە دوچاری عەیب و عار ببین.

وە ئەو ڕەخنەگرە بۆهاتنەكەی ناڕاستی لەگەڵ كردووە چونكە ئیسلام بۆیە لەسەر ئەو مەبلەغە دەست ئەبڕێ لەبەر پاراستنی سامانی خەلكە. وە بۆیە خوێنەكەی بە پێنج سەد دینار داناوە لەبەر پاراستن و ئاگاداری كردنی ئەو دەستەیە. چونكە ئەو دەستە كاتێ پاك و ئەمینە بە نرخە، وە كاتێكیش ناپاكی كرد بێ‌نرخ ئەبێت.

هەر لەبەر ئەوەیە ووتراوە:

يد بخمس مئين و عَسْجَدٍ وُدِيَتْ     لكنها قُطِعَت في ربع دينار

حماية الدم أغلاها، وأرخصها     خيانة المال فانظر حكمة الباري

واتە: دەستێك خوێنەكەی داندراوە بە پێنسەد دیناری ئاڵتون، بەڵام لەسەر دزینی چارەكە دینارێك ئەبڕێت. لە پاراستنی خوێن و ئەندامی ئادەمیزاددا لایەنی زۆری و گرانی ئەگیرێت، بە ڵام لە ناپاكی و خیانەتی ماڵدا لایەنی كەمی ئەگیرێ، كە لە یەك چارەكە دینارێك دەست ئەبڕێت، جا تۆ تەماشای حیكمەتی خوای دروستكەر بكە.

**كەی شتە دزراوەكە هەڵئەسەنگێنرێ :**

دانانی نرخی شتە دزراوەكە و هەڵسەنگاندنی لای مالیك و شافیعیەیەكان و حەنبەلیەكان ڕۆژی دزێتیەكە ئەبێت.

ئەبوحەنیفە ووتویەتی: شتە دزراوەكە ڕۆژی دادگایی كردنی و حوكمی دەست بڕین بەسەریا هەڵئەسەنگێنرێ.

**دزی بە كۆمەڵ:**

ئەگەر كۆمەڵێك ماڵێكیان دزی بوو بە شێوەیەك ئەگەر بەشیان بكردایە بەشی هەریەكەیان ئەوەندە بوو كە دەستی لەسەر ببڕێت ئەوا دەستی هەموویان ئەبڕێت بە ڕێكەوتنی هەموو زانایان.

بەڵام ئەگەر ماڵەكە هەمووی بگاتە ڕادەی دەست لەسەر بڕین، بەڵام ئەگەر بەش بكرێ لە نێوان دزەكاندا بەشی هەریەكەیان نەگاتە ڕادەی دانراو كە پێویست بێت دەستی لەسەر ببڕێت زانایان لەسەر ئەوە جیاوازییان هەیە.

جەماوەری زانایان وتویانە: پێویستە دەستی هەموویان ببڕێت.

ئەبوحەنیفە وتویەتی: دەست بڕین نابێت هەتا بەشی هەریەکەیان نەگاتە ڕادەی دانراو و دەست بڕین.

ئیبنو ڕوشد وتویەتی:

هەرکەس دەستی هەموویانی لەسەر ببڕێت ڕای وایە سزاکە لەسەر ماڵە دزراوەکەیە واتە ئەو ماڵە دزراوە دەست بڕینی پێویست کردووە ئەویش بۆ پاراستنی ماڵە.

وە هەرکەس ڕای وەها بێت دەست بڕین بەستراوە بەو بڕە ماڵەوە نەک لەوە کەمتر لەبەر بەڕێزی دەست، وتویەتی: دەستێکی زۆر نابڕێت لەسەر ئەو ڕادەیە کە یاسادانەری ئیسلام داینـاوە کە دەستی لەسەر ببڕێت.

**ئەوەی ئیعتیباری بۆ ئەکرێ دەربارەی جێگەو شوێنی ماڵە دزراوەکە:**

بەڵام شوێنەکە ئەبێت (حرز) شوێنێکی قایم بێت.

وە (حرز) ئەو جێگایەیە کە ئامادە کراوە بۆ ئاگاداری کردنی شت وەک خانوو دوکـان و گـەوڕ و شوێنی حەوانـەی ئـاژەڵ و شـوێنی هەڵخستنی میـوە بـۆ ووشـک بوونـەوەو وێنـەی ئەوانـە، وە ئـەو شوێنەش بە پێی عورف و عادەت دائەنرێ نەک لە لایەن شەرعەوە و نەک لەلایەن زمانـەوە. چـونکە لەو بارەیەوە قاعیدەیەک نییە.

وە ئیعتیبار دانان بۆ شوێنی قایم لە لایەن شەرعەوە لەبەرئەوەیە کە پاراستن لە شوێنی تایبـەت بەڵگەیە لەسەر ئاگادار کردنی خاوەن ماڵەکە و پاراستنی بۆ ماڵەکە لە لەناو چوون.

بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە کە عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیرەیـەوە گێڕاویەتییـەوەو وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بووە کاتـێ پیاوێك پرسیاری لێکـرد دەربـارەی ئـاژەڵ کـە لـە لەوەڕگای خۆیدا بێت و شوانی ببێت،

فەرمووی: (فيها ثمنها مرتين وضرب نكال، وما أخذ من عطنه ففيه القطع إذا بلغ مـا يؤخذ من ذلك ثمن المجن).

واتە: لەسەر دزینی ئەوانە دوو ئەوەندەی نرخەکەی و تەمێ کردن هەیە بە لێدان، وە ئەوانـەی لـە پەچەکەیاندا بدزرێن دەست بڕین هەیە ئەگەر ئەوەی برابوو نرخەکەی بگاتە نرخی قەڵغانێك.

وتی: ئەی نێرراوی خوا ئەگەر کەسێك بچێتە ناو باخێك و جلەکانی پڕبکات لە میوەو بیبات؟

فەرمووی: (من أخذ بفيه و لم يتخذ خُبنة فليس عليه شيء، ومن احتمل فعليه ثمنه مرتين و ضرب نكال، وما أخذ من أجرانه ففيه القطع إذا بلغ ما يُؤخَذ من ذلك ثمن المجن).

واتە: هەرکەس بەشی خواردنی خۆی ببات و کۆشی لێ پڕ نەکات، هیچی لەسەر نییە وە هەرکەس کۆشی لێ هەڵگرت دوو ئەوەندەی نرخی خۆی لێ ئەسێنرێتەوە و تەمێ ئەکرێ بە لێدان، وە هەرچی لە شوێنی ووشك کردنەوەیدا ببرێ دەستی لەسەر ئەبڕرێت ئەگەر نرخەکەی بگاتە نرخی قەڵغانێك.

ئەحمەد و نەسائی و حاکم کە بە صەحیحی داناوە و ترمذی کە بە حەسەنی داناوە گێڕاویانەتەوە[1].

عەمری کوڕی شوعەیب ئەگێڕێتەوە لە باوکییەوە لە باپیرەیەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لا قطع في تمر معلق ولا حريسة الجبل، فإذا أواه المراح أو الجرين، فالقطع فيما بلغ ثمن المجن)[2].

واتە: لەسەر خورمای هەڵواسراو و بە دارەکەوە دابەستەی ناو کێوان دەست نابڕرێت، بەڵام ئەگەر ئاژەڵەکە لە شوێنی حەوانەوەدا بوو و خورماکەش لە شوێنی ووشك کردنەوەیدا بوو نرخەکەشی گەیشتە نرخی قەڵغانێك دەستی لەسەر ئەبڕرێت.

ئەم دوو فەرمودەیە بەڵگەن بۆ ئیعتیبارکردن بە شوێنی قایم و پاراستن. ئیبنوقەییم فەرمویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) خۆی دەست بڕینی لە کۆڵ دزی بەری درەخت کە بە دارەکەوە بێت خستووە، و پێویستی کردووە لەسەر دزێتییەك کە لە شوێنی ووشك کردنەوەیدا بێت.

وەلای ئەبو حەنیفە ڕەحمەتی خوای لێ بێت لەبەر ناتەواوی بە ماڵ بوونی ئەو شتەیە بە هۆی زوو تێك چوونییەوە.

ئیتر ئەوەی کردووە بە بنەما بۆ ئەو شتانەی مالیەتیان ناتەواو بێت بە هۆی زوو تێك چوونیانەوە، وە قسەی جەماوەر ڕاست ترە چونکە پێغەمبەر (ﷺ) خۆی ئەوەی کردووە بە سێ حاڵەتەوە:

حاڵەتێك: هیچی لەسەر نییە. ئەوەش ئەوانەن کە بەس بەشی خواردنی خۆیان ئەبەن.

وە حاڵەتێك: دوو قات نرخەکەی لێ ئەسێنرێ و لێی ئەدرێ بێ ئەوەی دەستی ببڕێت، ئەویش ئەوەیە کە لە دارەکەی بکاتەوە و بیبات.

---

(١) أحمد (٢/١٨٠) والترمذي (٢٨٩) والنسائي (٨/٨٥) وابن ماجه (٥٩٥٥) والحاكم (٤/٣٨١).

(٢) مالك (٢/٨٣١)، تلخيص الحبير (٤/٧٣).

وە حاڵەتێك: دەستی لەسەر ئەبڕێت، ئەویش ئەوەیە کە لەسەر خەرمانەکە بدزرێت ووشك بوبێت یان نا، چونکە پەند لە شوێنەکەدایە نەك لە ووشك و تەڕیدا.

وە بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەوەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەست بڕینی لابردووە لەسەر دزینی مەڕ لە لەوەڕگادا، و پێویستی کردووە لەسەر دزینی لە پەچەکەیدا، چونکە قایم کراوە -تەواو-.

وە جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون کە شوێنی قایم ئیعتیباری هەیە.

وە کۆمەڵێك لە زانایان پێچەوانەی ئەوەن و شوێنی قایمیان بە مەرج دانەناوە لەوانە: ئەحمەد و ئیسحاق و زوفەرو ظاهیرییەکانن، چونکە ئایەتی (السارق والسارقة) گشتییە.

وە حەدیسەکانی عەمری کوڕی شوعەیب بۆ تایبەت کردنی ئەو ئایەتە نابن لەبەر جیاوازی زانایان تێیدا.

وە ئیبنو عبدالبر ڕەدی ئەوەی داوەتەوەو ووتویەتی: (حەدیسەکانی عەمری کوڕی شوعەیب کار پێکردنی پێویستە ئەگەر کەسانێك ڕیوایەتیان کردبێت کە جێی بڕوابن.

**جیاوازی شوێنی هەڵگرتن بەپێی جیاوازی ماڵەکان :**

شوێنە تیا قایم کراوەکەش بە پێی جیاوازی ماڵەکان ئەگۆڕێت، ئەوەش ئەگەڕێتەوە بۆ عورف و عادەت، چونکە هەندێ شوێن لە سەردەمێکدا قایمن لە کاتێکی تردا قایم نین.

خانوو شوێنێکی قایمە بۆ ئەو کەلوپەلانەی تێیدایە، وە شوێنی ووشك کردنەوەی میوەش قایمە بۆ میوەهات، و گەوەڕ شوێنی قایمە بۆ ئاژەڵ، وە شوێنی حەوانەوەش (پەچە) بۆ مەڕومالآت، و بەو پێیە.

**ئادەمیزاد خۆی حیرزە بۆ خۆی:**

ئادەمیزاد خۆی ئەبێتە پارێزەر بۆ جلەکانی و نوێنەکانی کاتێ لەسەریان خەوتبێ لە مزگەوت بێت یا لە دەرەوەی مزگەوت.

هەرکەس لەسەر ڕێگایەکدا دابنیشێ و کەلوپەلەکەی خۆی پێ بێت خۆی ئەبێتە پەناگا بۆ شتەکانی، خەوتبێ یا بە ئاگابێت.

جا هەرکەس پارە یا کەلوپەل لە ئادەمیزادێك بدزێت دەستی ئەبڕێت بە بردنی ئەو شتە، لەبەرئەوەی لەژێر دەستی خاوەنی دەری دەهێنێ.

وە زانایان ئەوەیان بە مەرج داناوە کە ئەبێت خەوتووەکە شتەکانی لەژێر خۆیەوە دانابێت یا لەژێر سەریەوە.

بەڵگەشیان ئەوەیە کە ئەحمەد و ئەبو داودو ئیبنوماجە و نەسائی و حاکم ئەگێڕنەوە لە صەفوانی کوڕی ئومەییەوە کە ووتویەتی: لە مزگەوت لەسەر کراسێکی ڕەشی خۆم نوستبوم لێیان دزیم، دزەکەمان گرت. بردمان بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دا دەستی ببڕن. منیش ووتم: ئەی نێرراوی خوا لەسەر کراسێك نرخەکەی سی درهەمە، من پێی ئەبەخشم؟ فەرمووی: ئەی نەئەبوو ئەوە بکەی پێش ئەوەی بیهێنی بۆ لام[1].

لەو فەرموودەیەدا بەڵگەی ئەوە هەیە کە داواکردنی شتە دزراوەکە لە لایەن خاوەنێیەوە مەرجە بۆ دەست بڕین.

جا ئەگەر ئەو شتە دزراوەی پێ ببەخشیایە یا بیفرۆشتایە بە دزەکە دەست بڕینی لە کۆڵ ئەکەوت، وەك پێغەمبەر (ﷺ) ئاشکرای کردوو فەرمووی: (هلا كان قبل أن تأتيني به؟!).

## گیرفان بڕ (الطرار):

زانایان جیاوازییان هەیە دەربارەی گیرفان بڕ.

کۆمەڵێك ووتویانە: دەستی ئەو جۆرە کەسانە ئەبڕێت دەست بکات بەناو گیرفانەکەداو ماڵەکە بدزێ یا بیدڕێنێ ماڵەکە بکەوێتە خوارەوەو بیبات، ئەوەش قسەی مالیك و ئەوزاعی و ئەبو ثەورو یەعقوب و حەسەن و ئیبنو مونذیرە.

ئەبو حەنیفەو محمدی کوڕی حەسەن و ئیسحاق ووتویانە: ئەگەر درهەمەکان لە کیسەدا بەسترابوو لە دەمی گیرفانەکەدا ئەویش دڕاندی و دزی دەستی نابڕێت، بەڵام ئەگەر لە کیسەدا بەسترابوو لە ناوەوەی گیرفانەکەدا ئەمیش دەستی بۆ بردو دزی دەستی ئەبڕێت.

## مزگەوت پەناگایە:

وە مزگەوتیش پەناگای ئەو شتانەیە کە تێیدا دائەنرێت لە فەرش و بەڕەو حەسیر و چراو تەیو کەوان و ئەو شتانە.

وە پێغەمبەر (ﷺ) دەستی دزێکی بڕی کە قەڵغانێکی لە مزگەوتدا دزیبوو لە شوێنی ژنەکاندا نرخەکەی سێ درهەم بوو. ئەحمەد و ئەبو داودو نەسائی تەخریجیان کردووە[2].

---

(١) أحمد (٣/٤٠١) وأبوداود (٤٣٩٤) والنسائي (٨/٦٩-٧٠) وابن ماجه (٢٥٩٥) والحاكم (٤/٣٨٠).

(٢) أحمد (٢/٨١٤٥)، أبوداود (٤٣٨٦)، نسائي (٨/٧٧).

وە هەروەها ئەگەر دەرگای مزگەوتی دزی یا ئەوەی پێی ڕازابووەوە و بەنرخ بوو، چونکە ئەوەش ماڵێکە لە پەناگادایەو بێ شوبهەیە.

شافیعی‌یەکان پێچەوانەن دەربارەی چرا و حەسیری مزگەوت، ئەڵێن هەرکەس بیان دزێ دەستی نابڕێت، چونکە ئەوانە بۆ سوودی موسڵمانان دانراوەو دزەکەش بەشی تێدا هەیە. مەگەر دزەکە ذمی بێت ئەوە دەستی ئەبڕێت لەبەر ئەوەی مافی تێدا نی‌یە.

دزی لە خانوو:

زانایان لەسەر ئەوە ڕێکن کە خانوو پەناگا نی‌یە مەگەر دەرگاکانی داخرابێت.

وەك چۆن ڕێك کەوتون لەسەر ئەوەی ئەگەر کەسێك دزی‌یەك بکات لە خانوویەکدا لەگەڵیا لەو خانووەدا دانەنیشتبێ دەستی نابڕێت هەتا لە خانووەکە نەچێتەدەر.

وە جیاوازن لە چەند شتێکدا لەوانە ئەوەیە کە خاوەنی کتێبی (الإفصاح عن معاني الصحاح) باسی کردوون و ووتویەتی: وە زانایان جیاوازن لەوەدا ئەگەر دو کەس بە هاوبەشی خانوویەك کون بکەن و یەکێکیان بچێتە ناوەو کەلوپەلەکەی بداتە دەست ئەوی تریان کە لە دەرەوەی خانووەکە ڕاوەستاوە، وە هەروەها ئەگەر کەلوپەلەکەی بۆ هەڵبدات و ئەویش بیگرێتەوە.

مالیك و شافیعی و ئەحمەد ووتویانە: ئەوەی ناو خانووەکە دەستی ئەبڕێت و ئەوەی دەرەوە نا.

ئەبو حەنیفە ووتویەتی: هیچیان دەستیان نابڕێت.

وە جیاوازن لەوەدا ئەگەر کۆمەڵێك بە هاوبەشی خانوویەکیان کون کرد و چوونە ناو خانووەکەوە هەندێکیان ئەوەندەی دزی کە شایستەی دەست بڕین بێت و هەندێکیان هیچی نەدزی و دەستی نەکەوت بێ ئەوەی کەسیان یارمەتی کەسی تریان بدات لە دەرهێنانی‌دا.

ئەبوحەنیفە و ئەحمەد ووتویانە: پێویستە ئەو کۆمەڵە هەموویان دەستیان ببڕێت.

مالیك و شافیعی ووتویانە: تەنها دەستی ئەوانە ئەبڕێت کە کەلوپەلیان دەرهێناوە لە دەرگای کونەکەوە، وە لەبارەی ئەوە کە یەکیان شتە دزراوەکە نزیك بکاتەوە لە کونەکەوە و ئەوی تریان دەستی بردبێ دەری هێنابێت.

ئەبوحەنیفە ووتویەتی: هیچیان دەستی نابڕێت.

مالیك ووتویەتی: ئەوەی کە لە کونەکەوە دەری ئەهێنێ دەستی ئەبڕێت لەسەر یەکێ لەقەولەکانی. وە دەربارەی ئەوەی شتەکەی نزیك کردۆتەوە جیاوازی هەیە لەنێوان هاوەڵەکانیدا لەسەر دوو قەول:

شافیعی وتویەتی: دەست برین لەسەر ئەوەیە کە شتەکە دەرنەهێنێت بە تایبەتی.

أحمد وتویەتی: هەموریان دەستیان ئەبڕرێت.

شیخ ئەبو ئیسحاق لە (المهذب)دا باسی کردووەو وتویەتی:

ئەگەر دوو پیاو پەناگایەکیان کون کرد و یەکێکیان چووە ژوورەوەو کەلوپەلەکەی نزیك کونەکە کردەوەو ئەوی تریان دەریهێنا دو گفتی لەسەرە:

یەکەمیان: پێویستە دەستی هەردوکیان ببڕرێت چونکە ئەگەر لەسەر هەردوکیانی پێویست نەکەین ئەبێتە ڕێگا بۆ لە کۆڵ خستنی دەست برین.

(دووەم) : هیچیان دەستیان نابڕرێت وەك قسەکەی ئەبی حنیفە ئەوەش ڕاستە. چونکە هیچیان لە پەناگاکەدا شتی دەرنەهێناوە.

بەڵام ئەگەر یەکێکیان پەناگاکەی کون کردو ئەوی تریان چووە ژوورەوە کەلوپەلەکەی دەرهێنا دوو ڕێگای دەربارەوە هەیە:

لە هاوەڵانی ئێمە هەیە وتویەتی: دوو گفتی لەسەرە وەك کێشەکەی پێشووی وە هایە. و هەندێکیان وتویانە: دەست برینیان لەسەر نییە لە قەولێکدا لەبەر ئەوەی یەکێکیان کونی کردووەو کەلوپەلەکەی دەرنەهێناوە ئەوی تریان کەلوپەلەکەی دەرهێناوە بێ ئەوەی ئەو کەلوپەلە لە پەناگاکەدا بوبێت.

**بە چی حەددی دزی سابت ئەبێت؟ وە ئایا ئەوەستێ لەسەر داوای ئەو کەسەی شتەکەی لێ دزراوە؟:**

حەدد بە جێناهێنرێت هەتا شت لێدزراوەکە خۆی داوای بەجێهێنانی نەکات، چونکە بەرامبەر وەستانی دزی لێکراوەکە و داواکردنی شتە دزراوەکانی مەرجن.

وە حەددەکەش بە شایەتی دوو شایەتی عەدل یا بە پێ‌لێنانی خۆی ئەچەسپێ، وە لای مالیك و شافیعی و حەنەفییەکان جارێك دان پێدانان بەسە. چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەستی قەڵغان دزەکەو دەستی کراس دزەکەی صەفوانی بڕی، وە لێیەوە نەقڵ نەکراوە کە داوای لێ کردبێ ئیعتیرافەکەی دووبارە بکاتەوە.

وە ئەو هەندە جارانەی داوای دووبارە کردنەوەی ئیقرارو پێ‌لێنان کرواە لە ڕووی دڵنیا بوونەوە بووە.

وە ئەحمەد و ئیسحاق و ئیبنو ئەبی لەیلێ ڕایان وایە کە ئیقرار پێ کردن ئەبێ دوو جار بێت.

### ئیدعا كردنی خاوەنی‌یەتی لە لایان دزەوە:

ئەگەر دزەكە بڵێت ئەو شتەی بردوومە لە پەناگاكەداماڵی خۆمە دوای ئەوەی شایەتی لەسەر درا كە لە پەناگاكەدا ڕادەی گەیشتن بە دەست برینی دزیوە. مالیك ووتویەتی: بە هەموو شێوەیەك دەستی ئەبڕرێت و ئەو قسەیەی لێ وەرناگیرێ.

ئەبوحەنیفە و شافیعی ووتویانە: دەستی نابڕرێت، وە شافیعی بەو جۆرە دزانەی ئەووت (السارق الظریف) دزی زیرەك و وورد.

### دز فێری شتێك بكرێ كە حەددەكەی لە كۆڵ بخات:

بۆ قازی پەسەندە كە شتێكی وەها فێری دز بكات بۆ ئەوەی حەددی شەرعی لە كۆڵ بكەوێ.

بەپێی ئەوەی ئەبو ئومەییەی مەخزومی ئەگێڕێتەوە كە دزێكیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) ئیعتیرافی كرد، وە كەلوپەلەكەی پێ نەبوو پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: پێم وانی‌یە تۆ دزیت كردبێت؟ كابرا ووتی: با دزیم كردووە، دوجار یا سێ جار دوبارەی كردەوە.

ئەحمەد و ئەبو داودو نەسائی گێڕاویانەتەوەو پیاوەكانی جێی سیقەن[1].

عەطاء ووتویەتی: ئەوانەی ئەبوونە قازی كە دزیان ئەهێنا بۆ لایان پێیان ئەووت: دزیت كردوە؟ بڵێ: نەء . وە وتویەتی ئەبوبەكر و عومەریش خوا لێیان ڕازی بێت لەوانە بوون.

وە لە ئەبی دەرداتەوە. كە جاری‌یەیەكیان هێنا بۆ لای دزی كردبوو پێی ووت: (دزیت كردووە؟ بڵێ: نەء. جاری‌یەكەش ووتی: نەء) ئەویش بەرەڵلای كرد.

### سزای دزی كردن:

كاتێ تاوانی دزی چەسپا پێویستە حەددی شەرعی بەسەر دزەكەدا بەجێ بێت، جا دەستی ڕاستی ئەبڕرێت لە مەچەكیدا.

بەپێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا﴾ (المائدة: من الآية ٣٨).

واتە: دەستی پیاو و ژنی دز ببڕن.

---

(١) أحمد (٥/٢٩٣) وأبوداود (٤٣٨٠) والنسائي (٨/٦٧) وابن ماجه (٢٥٩٧).

وە دروست نی‌یە لێی ببوورێت نە لە لایەن خاوەن شتەوەو نە لە لایەن حاکمەوە.

وەك چۆن دروست نی‌یە سزاکەی بە سزایەکی تر بگۆڕرێت کە سوکتر بێت، یا بەجێ‌هێنانی دوا بخرێت یا پەك بخرێت.

بە پێچەوانەی شیعەوە کە پێیان وایە دەست برینەکە لەسەر تاوانبار بەرپوە ناچێت بە لێبوردنی خاوەن شتەکە لە دزیەکەیدا.

وە هەروەها ڕایان وایە کە ئیمام لەگەڵ ئەوەی لەسەری پێویستە حەدی شەرعی جێ‌بەجێ بکات بۆی هەیە ئەو سزایەش لە کۆڵ هەندێ کەس بخات لەبەر بەرژەوەندی. وە بۆی هەیە دوای بخات بۆ هەندێ کەس لەبەر بەرژەوەندی.

ئەمەش پێچەوانەی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە کەلە پێغەمبەرەوە ئەگێڕنەوە (ﷺ) کە فەرمویەتی: (تعافوا العقوبة بينكم، فإذا انتهى بها إلى الإمام فلا عفا الله عنه إن عفا)[1].

واتە: لە یەکتر خۆش بن لەسەر سزادان لەنێوان خۆتاندا، بەڵام کاتێ گەیشتە لای ئیمام خوا لێی نەبورێ ئەگەر لێی بورا.

جا ئەگەر بۆ جاری دووەم دزی کردەوە قاچی ئەبڕرێت، لەپاشاندا زانایان جیاوازی‌یان هەیە کە ئەگەر بۆ جاری سێیەم دزی کردەوە دوای برینی دەستێك و قاچی.

ئەبو حەنیفە ووتویەتی: تەمێ ئەکرێ‌و بەند ئەکرێ.

شافیعی و چەند کەسی تر ووتویانە: دستی چەپی ئەبڕرێت، لەپاشاندا ئەگەر دزی بکاتەوە قاچی ڕاستیشی ئەبڕرێت لەپاش ئەوە ئەگەر دزی کردەوە تەمێ ئەکرێت و بەندئەکرێت.

داغ کردنی دەستی دز کاتێ بڕا :

دەستی دز دوای بڕین ئەبێ حەسم بکرێ و بە ئاگر داغ بکرێ یا هەر ڕێگایەکی تر بێت بۆ وستانەوەی خوێنی بڕاوەکە، بۆ ئەوەی لەناو نەچێت.

لە ئەبی‌هورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) دزێکیان هێنا بۆ لای کە شەملەیەکی دزی بوو. ووتیان: ئەی نێرراوی خوا ئەمە دزی کردووە. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (ما إخاله سرق).

---

(١) أبوداود (٤٣٧٦) والنسائي (٨/٧٠) والحاكم (٤/٣٨٣).

واتە: باوەڕناکەم دزی کردبێت[1].

دزەکە وتی: با ئەی نێرراوی خوا دزیم کردووە، فەرموی: (إذهبوا بە فاقطعوه ثم احسموه، ثم ائتوني به).

واتە: بیبەن دەستی ببڕن لە پاشاندا دەستی داخ بکەن و بیهێننەوە بۆ لام.

جا دەستیان بڕی و هێنایانەوە بۆ لای. فەرمووی: تەوبە بکەو بگەڕێرەوە بۆلای خوا. ئەویش وتی: بە ڕاستی تۆبەم کردووەو گەڕاومەتەوە بۆ لای خوا. فەرمووی: (تاب الله علیك) واتە: خوا تۆبەت لێ وەربگرێ.

دارەقوطني و حاکم و بەیهەقی گێڕاویانەتەوەو ئیبنوحیببان بە صەحیحی داناوە[2].

### هەڵواسینی دەستە بڕاوەکە بە ملی دزەکەدا:

بۆ تەمێ‌کردنی دزەکەو ترساندنی کەسانی تر یاسا دانەری ئیسلام فەرمانی داوە بە هەڵواسینی دەستە بڕاوەکە بە ملی دزەکەدا.

ئەبوداود و نەسائی و ترمذي کە وتویەتی: حەسەن و غەریبە، ئەگێڕنەوە لە عبدالرحمن ی کوڕی موحەیریزەوە کە ووتلایەتی: پرسیم لە فوضالە دەربارەی هەڵواسینی دەستە بڕاوەکە بە ملی دزەکەدا ئایا سوننەت وەهایە؟ ووتی: دزێکیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) دەستیان بڕی لەپاشاندا فەرمانی دا دەستەکەیان هەڵواسی بە ملی دزەکەدا[3].

### کۆکردنەوەی (ضمان) بژاردن و حەد:

ئەگەر شتە دزراوەکە مابوو ئەدرێتەوە بە خاوەنەکەی بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرمویەتی: (علی الید ما أخذت حتی تؤدیه)[4].

---

(١) لەمەدا بە گوێیادانی دزەکەی تیایە کە دانی پیانەنێ و پەشیمان بێتەوە.

(٢) الدارقطني (٣/١٠٢) والحاکم (٤/٣٨١) والبیهقي (٨/٢٧١).

(٣) أبوداود (٤٤١١) والترمذي (١٤٤٧) والنسائي (٨/٩٢) وابن ماجه (٢٥٨٧).

(٤) أحمد (٥/٨) وأبوداود (٣٥٦١) والترمذي (١٢٦٦) وابن ماجه (٢٤٠٠) والحاکم (٢/٤٧).

واتە: دەست چی بردبێت هەتا نەیداتەوە هەر لەسەریەتی.

ئەوەش مەزهەبی شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە.

وە ئەگەر شتە دزراوەکە لەناوچووبوو بە دەستی دزەکە پێی نەبژێرێ و دەستیشی نەبڕێ، وە بەجێهێنانی هەریەکەیان ڕێ لە بەجێ هێنانی ئەوی تریان ناگرێ، چونکە پێ بژاردن مافی ئادەمیزادەو دەست بڕینیش پێویستە بۆ خوای گەورە، لەبەرئەوە هیچیان ڕێگری ئەوی تریان ناکات وەك خوێن دان و بریتی (كفارة).

وە ئەبو حەنیفە ووتویەتی: ئەگەر شتە دزراوەکە لەناوچوو بە دزەکە نابژێرێت چونکە پێبژاردن و دەست بڕین کۆنابنەوە لە یەك کاتدا، وە لەبەرئەوەی خوا باسی دەست بڕینی کردووە نەك پێ بژاردن.

وە مالیك و هاوەڵەکانی ووتویانە: ئەگەر لەناوچو بوو، وە دزەکە هەژار نەبوو پێی ئەبژێرێت، وە ئەگەر دەست کورت بوو هیچی لەسەر نابێت.

# تاوانەکان (الجنايات)

(الجنايات) کۆی (جناية) لە ماددەی (جنى يجني) وەرگیراوە کە بەمانای گرتنە. وتراوە (جنى علي قومه جناية) واتە تاوانێکی ئەنجام داوە بەرامبەر نەتەوەکەی کە ئەگیرێ بەو تاوانە. وە مەبەست لە (جناية) لە عورفی شەرعدا: کردنی هەموو کردەوەیەکی حەرامە. کردەوەی حەرامیش: ئەو کردەوانەن کە یاسادانەری ئیسلام قەدەغەی کردوون، چونکە زیان ئەگەیەنن بە ئاین، یا بە گیان، یا بە عەقڵ، یا بە ناموس، یا بە سامان.

وە زانایان رێك کەوتون لەسەر کردنی ئەو تاوانانە بە دوو بەشەوە:

(بەشی یەکەم) کە ناوئەبرێ بە (جرائم الحدود) واتە ئەو تاوانانە کە حەددو سزای خوا پێویست ئەکەن.

وە (بەشی دووەم) کە پێی ئەوترێ (جرائم القصاص) واتە ئەو تاوانانە کە (قصاص) پێویست ئەکەن.

کە بریتین لەو تاوانانە کە بەرامبەر گیان یا خوار ئەو ئەکرێن وەك برینداركردن و برینی ئەندامێك، کە بناغەی ئەو بەرژەوەندییە زەرورییانەیە کە پێویستە ئاگاداری‌یان لێ بکرێ لەبەر پاراستنی خەڵك و ژیانی کۆمەڵایەتی‌یان.

وە لە پێشەوە باسی تاوانەکانی حدود و سزاکانیمان کرد، ماوەتەوە باسی تاوانەکانی (قصاص) تۆڵە بکەین.

لە پێشەوە دەست بە پێشەکی‌یەك ئەکەین کە رای ئیسلام دەرئەخات دەربارەی پاراستنی ئیسلام بۆ نەفس پاشان قسە لەسەر (قصاص) تۆڵە ئەکەین لەنێوان سەردەمی نەفامی و ئیسلامدا، پاشان قسە ئەکەین دەربارەی تۆڵەسەندن لەسەر گیان و تۆڵە سەندن لەسەر کەمتر لە گیان.

بەڵام (جنايات) تاوانەکان لە یاسا دانراوەکاندا خەتەرترین تاوانن کە بکەری ئەو تاوانانە بە ئیعدام سزا ئەدرێ، یا بە بەندی هەمیشەیی و کاری گران، یا بە کاری گرانی کاتی، یا بە بەندکردن.

## پارێزگاری کردن لە گیان

**ڕێزو کەرامەتی ئادەمیزاد:**

بەڕاستی خوای گەورە ڕێزی بۆ ئادەمیزاد داناوە: بە دەستی خۆی دروستی کردووەو گیانی کردووە بە بەرداو کڕنوشی بە فریشتەکان بردووە بۆی، وە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بۆی دابین کردووەو کردویەتی بە جێنشین لە زەویدا و هێزو بەهرەیەکی داوەتێ کە زەوی پێ داگیر بکات، بۆ ئەوەی بگاتە ئەوپەڕی ئەوەی کە بۆی دانراوە لە تەواوی ماددی و بەرزبونەوەی ڕۆحی.

وە ئادەمیزاد ناتوانێ ئامانجەکانی بێنێتەدی و بگات بە مەبەستەکانی هەتا هەموو بنەڕەتەکانی نەشونمای بۆ ئامادە نەکرێت و مافەکانی بە تەواوی وەرنەگرێت. وە لە پێشەوەی ئەو مافانەی کە ئیسلام دابینی کردون: مافی ژیان و مافی خاوەنێتی و مافی پاراستنی ئابڕوو مافی ئازادی و مافی یەکسانی و مافی فێربوونە.

وە ئەم مافانە پێویستن بۆ ئادەمیزاد لەو ڕووەوە کە ئادەمیزادە بێ ئەوەی سەیری ڕەنگ و ئاین و ڕەگەز و نیشتمان و پلەو پایەی کۆمەڵایەتی بکرێت.

خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً﴾ (الاسراء:٧٠).

واتە: بە ڕاستی ئێمە ئادەمیزادمان بەڕێز کردوە بەهۆی عەقڵ و ژیرییەوە، وە بەهۆی ناردنی پێغەمبەرانەوە، وە هەرچی لە بونەوەردایە بۆمان ڕام کردووە، وە هۆیەکانی گواستنەوە لە وشکاییو لە دەریادا، هەروەها ڕۆزیمان داون لە خواردن و خواردنەوە باشەکان، وە فەزڵمان داون بەسەر هەمو ئەوانەی دروستمان کردون.

وە پێغەمبەر (ﷺ) لە حەجی ماڵ ئاواییدا ووتارێکی داو فەرمووی: (أيها الناس، إن دماءكم وأموالكم عليكم حرام كحرمة يومكم هذا، في شهركم هذا، في بلدكم هذا، ألا هل بلغت؛ اللهم فاشهد، كل المسلم على المسلم حرام: دمه، وماله، وعرضه)[1].

---

(١) مسلم (١٢١٣/١٣٦).

واتە: ئەی خەڵکینە بەڕاستی خوێنتان و سامانتان لەسەرتان حەرامە هەروەك حەرامی ئەم ڕۆژەتان لەم مانگەتاندا، وە لەم وولاتەتاندا. ئایا پێم ڕاگەیاندن. خوایە تۆ بە شاهید بە، هەموو شتێکی موسڵمان لەسەر مسڵمان حەرامە: خوێنی، و سامانی، و ئابڕوی.

**مافی ژیان:**

یەکەم ماف و لە پێش ترین ماف لەناو مافەکاندا کە ئەبێ بپارێزرێو چاودێری بکرێ مافی ژیانە، کە مافێکی پیرۆزە، و ڕەوا نییە کەس دەست درێژی بۆ بکات و دەست درێژی کردنە سەری بە ڕەوا دابنێت. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ﴾ (الإسراء: من الآية٣٣).

واتە: خوێنی ئەو نەفسەی کە خوا حەرامی کردووە بە ناهەق مەیڕێژن. وە ئەو هەقەش کە خوێنی کەسێکی پێ ئەڕێژرێ ئەوەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) باسی کردووە لەو فەرمودەیەدا کە ئیبنو مسعود گێڕاویەتیەوە خوا لێی ڕازی بێت کە فەرمویەتی: (لا يحل دم امريء مسلم يشهد أن لا إله إلا الله، وأني رسول الله إلا بإحدى ثلاث: الثيب الزاني، و النفس بالنفس، والتارك لدينه المفارق للجماعة) رواه البخاري و مسلم[1].

واتە: ڕشتنی خوێنی هیچ موسڵمانێك کە شایەتی دابێت هیچ پەرستراوێکی بە هەق نییە کە شایستەی پەرستن بێت جگە لە خوای پەروەردگار و کە من نێرراوی ئەوم ڕەوا نییە مەگەر بە یەکێ لەم سێ شتە نەبێت: ژن و پیاوی زیناکەر[2]، خوێن بە خوێن[3]، کەسێك وازی لە ئاینەکەی هێنابێت و لە (جماعة) کۆمەڵی موسڵمان جیابوبێتەوە.

خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿وَلَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَاقٍ نَحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْئاً كَبِيراً﴾ (الإسراء: ٣١).

واتە: لە ترسی هەژاری منداڵەکانتان مەکوژن؛ هەر ئێمە ڕۆزی ئەوانیش و ئێوەش ئەدەین، بە ڕاستی کوشتنی منداڵ تاوانێکی گەورەیە.

وە خوای گەورە ئەفەرموێ:

---

(١) البخاري (٦٨٧٨) ومسلم (١٦٧٦/٢٥).

(١) کە لەوەو پێش زەواجیان کردبێ.

(٢) واتە کەسێك کەسێکی کوشتبێ بە ئەنقەست و بەبێ حەق.

﴿وإذا الموؤدة سئلت بأي ذنب قتلت﴾ التكوير (٨-٩).

واتە: کاتێ زیندەبەچاڵ کراوەکان پرسیاریان لێ‌ئەکرێ بە چ تاوانێك کوژراون.

وە خوای گەورە سزای‌یەکی وەهای داناوە بۆ ئەو کەسەی کوشتنی ئادەمیزادی داهێنا کە بۆ هیچ کەسێکی تری دانەناوە لە دروست کراوەکانی.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

(ليس من نفس تُقْتَلُ ظلماً إلا كان على ابن آدم كِفْلٌ من دمها؛ لأنه كان أولَ من سنَّ القتل) رواه البخاري و مسلم[1].

واتە: کەس نیە کە بە ستەم بکوژرێ ئیللا بۆ کوڕەکەی ئادەم بەشێك هەیە لەو تاوانەدا، چونکە یەکەم کەس بوو کە کوشتنی داهێنا[2].

وە لە پەرۆشی ئیسلامە بۆ پاراستنی گیانی خەڵك کە هەڕەشەی توندترین سزا ئەکات لەو کسانەی کە کوشتنی ڕەوا ئەکەن. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَمَـنْ يَقْتُـلْ مُؤْمِنـاً مُتَعَمِّـداً فَجَـزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِداً فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَاباً عَظِيماً﴾ (النساء:٩٣).

واتە: وە هەرکەس باوەڕدارێك بە قەستی و بەناحەق بکوژێ، سزاکەی دۆزەخە کە بۆ هەتاهەتایە تێیدا ئەمێنێتەوە و خوا غەزەبی لێ ئەگرێ و نەفرینی لێ‌ئەکات و سزایەکی توندی بۆ ئامادە کردووە.

ئەم ئایەتە بڕیاری ئەوە ئەدات کە پیاوکوژ لە ڕۆژی دوایی‌دا سزایەکی بە ئێشی هەیە و بۆ هەتاهەتایە لە دۆزەخدا ئەمێنێتەوەو خەشم و قینی خوای لەسەر ئەبێت و نەفرینی لێ‌ئەکات و سزایەکی گەورەی ئەدات.

وە لەبەر ئەوە ئیبنو عەبباس خوایان لێ ڕازی بێت فەرمویەتی: (لا توبة لقاتلِ مؤمنٍ عمداً).

واتە: تۆبە بۆ کەسێك نیە باوەڕدارێك بە قەستی ئەکوژێ. چونکە ئەو ئایەتە دوا ئایەتە کە لەوبارەیەوە هاتۆتە خوارەوە وە هیچ ئایەتێکی تر نەیسڕیوەتەوە. هەرچەندە جەماوەری زانایان بە پێچەوانەی قسەکەی ئیبنو عەبباسەوەن.

---

(١) البخاري (٦٨٦٧) ومسلم (١٦٧٧).

(٢) مەبەست بە کوڕەکەی ئادەم قابیلە کە هابیلی کوشت.

وە هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: (لَزَوالُ الدنيا أهون على الله من قتل مؤمن بغير حق) رواه ابن ماجه بسند حسن عن البراء[1].

واتە: لەناوچوونی دونیا لای خوا هێواش ترە لە کوشتنی باوەڕدارێك بە ناهەق.

وە (ترمذي) بە سەنەدێکی حەسەن لە ئەبوسەعیدەوە خوای لێ ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لو أن أهل السماء وأهل الأرض اشتركوا في دم مؤمنٍ ؛ لأكبَّهم الله في النار)[2].

واتە: ئەگەر خەڵکی ئاسمان و خەڵکی زەوی هاوبەش بن لە کوشتنی باوەڕدارێك بە ناهەق، خوای گەورە بەڕەوا ئەیانخاتە دۆزەخەوە.

وە بەیهەقی ئەگێڕێتەوە لە ئیبنو عومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (من أعان على دم امرئٍ مسلم بشطر كلمة؛ كتب بين عينيه يوم القيامة: آيس من رحمة الله)[3].

واتە: هەرکەس بە نیوە ووشەیەکیش یارمەتی کوشتنی موسڵمانێك بدات، ڕۆژی دوایی لە نێوچاوانی ئەنوسرێ: کە هیوابڕاوە لە میهرەبانی خوا.

لەبەرئەوەی کوشتن تێك دانی ئەو بینایەیە کە خوا ویستویەتی ببێت، وە داماڵینی ژیانی کوژراوەکەیە، وە دەست درێژی کردنە بۆ سەر ئەو کەسانەی کە خزم و کەسی ئەو کەسەن و شانازی بە بونیەوە ئەکەن و سودی لێ وەرئەگرن، و بە مردنی بێبەش ئەبن لەو سودە، وە لە حەرامی دا کوشتنی موسڵمانێك و کافرێکی ذمی و ئەو کەسەی خۆی دەکوژێ وەك یەکن.

چونکە دەربارەی کوشتنی کافری ذمی فەرموودەی ڕاست و صەریح هاتووە بە واجب بوونی دۆزەخ بۆ ئەو کەسەی بیکوژێ.

---

(١) ابن ماجه (١٦١٩) والبيهقي في شعب الإيمان (٥٣٤٥) والإصبهاني في الترغيب والترهيب (٢٢٩٥).

(٢) الترمذي (١٣٩٨).

(٣) البيهقي في شعب الإيمان (٥٣٦٤).

وە بوخاری لە عبداللە ی کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە خوا لێیان ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (من قتل مُعاهَداً لم يَرَحْ رائحَةَ الجنَّةِ، وإن ريحها يوجد من مسيرة أربعين عاماً)[1].

واتە: هەرکەس (معاهد) ێك[2] بکوژێ بۆنی بەهەشت ناکات، هەرچەندە لە ماوەی چل ساڵە ڕێ دووری بۆنی ئەکرێت[3].

بەڵام دەربارەی کەسێك کە خۆی بکوژێت، خوای گەورە ئەمان ترسێنێ و لێمان قەدەغە ئەکات، ئەفەرموێ: ﴿وَلا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾ (البقرة: من الآية١٩٥).

واتە: بە دەستی خۆتان خۆتان مەخەنە تالوکە و لەناوچونەوە.

وە هەروەها ئەفەرموێت: (وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُم إِنَّ اللهَ كانَ بِكُم رَحِيْماً). (النساء: ٢٩)

واتە: خۆتان لەناومەبەن چونکە خوا میهرەبانە پێتان.

وە بوخاری و موسلیم ئەگێڕنەوە لە ئەبی هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (من تَرَدّى مِنْ جَبَلٍ فقتل نفسه فهو في نار جهنم يتردّى فيها خالداً مخلداً فيها أبداً، ومن تَحسّى سُمّاً فقتل نفسه فسُمُّه في يده يتحساه في نار جهنم خالداً مخلداً فيها أبداً، ومن قتل نفسه بحديدة فحديدته في يده يتوجأ بها في نار جهنم خالداً مخلداً فيها أبداً)[4].

واتە: هەرکەس لە شاخێکەوە خۆی بخاتە خوارەوەو خۆی بکوژێ، ئەکەوێتە خوارەوە بۆ ناو ئاگری دۆزەخ بۆ هەتا هاتایە تێیدا ئەمێنێتەوە، وە هەرکەس خۆی ژەهر خواردو بکات و خۆی بکوژێ ژەهرەکەی بەدەستەوە ئەبێت و لە ئاگری دۆزەخدا هەر لێی ئەخواتەوە بۆ هەتا هەتایە بەو شێوەیە

---

(١) البخاري (٣١٦٦).

(٢) معاهد: ئەو کەسەیە کە پەیمانی بێ لەگەڵ موسوڵمانانا – یا بە ئەمان لەلایەن موسوڵمانێکەوە – یا بە (هدنە) لەلایەن حاکمەوە – یا عەقدی جزیەی بێ.

(٣) وە بۆن نەکردنی مانای وایە ناچێتە ناوی، حافظ لە (الفتح)دا وتویەتی: مەبەست بەم نەفیە –هەرچەندە گشتیە- تایبەت کردنە بە کاتێکەوە، چونکە بەڵگەی فیعلیو نەقلی هەیە؛ کە هەرکەس بە موسوڵمانی مردبێو تاوانە گەورەکانی کردبێ ئەوە بە ئیسلامەکەی حوکم ئەدرێو هەتا هەتایی لەئاگردا نامێنێتەوە، وە هەرچەندە عەزاب و ئەشکەنجە بدرێ لە دواییدا هەر ئەگەڕێتەوە بۆ ناو بەهەشت.

(٤) البخاري (٥٧٧٨) ومسلم (١٠٩).

ئەمێنێتەوە، وە هەرکەس بە پارچە ئاسنێك خۆی بکوژێ پارچە ئاسنەکە بە دەستیەوە ئەگرێت لە ئاگری دۆزەخدا ئەیدات لە خۆی بۆ هەتا هەتایە تێیدا ئەمێنێتەوە.

وە بوخاری لە ئەبی هورەیرەوە خوای لێ ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (الذي يخنق نفسه يخنقها في النار، والذي يطعن نفسه يطعن نفسه في النار، والذي يقتحم يقتحم في النار)[1].

واتە: هەرکەس خۆی بخنێکێنێ لە ئاگریشا هەر خۆی ئەخنکێنێ، وە ئەوەی تیغ بکات بە خۆیدا و خۆی بکوژێ لە ئاگریشدا بەردەوام تیغ لە خۆی ئەدات، وە هەرکەس خۆی هەڵداتە خوارەوە هەتا بمرێ بەردەوام لە ئاگریشدا هەر خۆی هەڵئەداتە خوارەوە.

وە لە جوندوبی کوڕی (عبدالله)وە کە وتویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (كان فيمن قبلكم رجل به جرح، فجزع، فأخذ سكيناً فحزَّ بها يده، فما رقأ الدم حتى مات. قال الله تعالى: بادرني عبدي بفسه: حرمت عليه الجنة) رواه البخاري[2].

واتە: لە نەتەوەکانی پێش ئێوەدا پیاوێك برینێکی پێوە بوو، نارەحەت بوو خۆی نەگرت، چەقۆیەکی هەڵگرت دەستی خۆی پێ بڕی خوێنی نەوەستایەوە هەتا مرد. خوای گەورە فەرموی: بەندەکەم پەلەی کرد لە گیانی خۆی: منیش بەهەشتم لەسەر حەرام کرد.

وە سابتە لە فەرمودەدا: (من قتل نفسه بشيء عُذِّبَ به يوم القيامة)[3].

واتە: هەرکەس خۆی بکوژێت بە شتێك. لە ڕۆژی دواییدا بەو شتە سزا ئەدرێ.

وە ئەوپەڕی شتێك بەخەیاڵدا بێت لەبارەی ناشیرین وتن و ڕیسوا کردنی بکوژەکان زیاد لەسەر ئەوەش کە باسکرا، ئەوەیە کە ئیسلام بکوژی تاکە کەسێکی وا داناوە وەك هەموو دانیشتوانی دونیای کوشتبێ، ئەوەش خراپترین شتە کە بوترێ بەو کەسانە کە ئەو تاوانە ناشیرینە ئەکەن.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَنَّهُ مَنْ قَتَلَ نَفْساً بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعاً وَمَنْ أَحياها فَكَأَنَّما أحيا الناسَ جميعاً﴾ (المائدة: من الآية٣٢).

---

(١) البخاري (١٣٦٥).

(٢) البخاري (١٣٦٤) ومسلم (١١٣).

(٣) البخاري (٦٦٥٢) ومسلم (١١٠).

واتە: بە ڕاستی هەرکەسێك کەسێك بکوژێت بێ‌ئەوەی کەسی کوشتبێ یان خراپەکاری کردبێ لە زەویدا وەك ئە وە وایە هەموو ئادەمیزادی کوشتبێ، وە هەرکەسێك بەرگری بکات لە کوشتنی کەسێك کە خوا حەرامی کردووە وەك ئەوە وایە هەموو ئادەمیزادی زیندوکردبێتەوە.

وە لەبەرئەوەی خوێن ڕشتن زۆر گرینگ و گەورەو مەترسی‌دارە، یەکەم شتە کە لە ڕۆژی دواییدا لە نێوان خەلکدا پرسیاری لەسەر ئەکرێ[1] وەك موسلیم ئەگێڕێتەوە[2].

وە خوای گەورە (قصاص)و لەناوبردنی بکوژی داناوە لەبەر تۆڵە سەندن لە بکوژو، هەڕەشەو چاوترساندنی کەسانی تریش، وە لەبەر پاك کردنەوەی کۆمەلگا لەو تاوانانە کە یاسای گشتی پێ ئەشێوێ‌و ئەمن و ئاسایشی پێ تێك ئەچێ.

وە فەرمویەتی:

﴿وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَاأُولِي الأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ البقرة (١٧٩).

واتە: لە دانانی (قصاص) تۆڵەی کوشتنەوەداو جێ‌بەجێ کردنی‌دا ژیانی ئاسودە هەیە بۆ ئێوە —ئەی خاوەن ژیری‌یە ساغەکان- بە ئومێدی ئەوەی لە خوا بترسن و گوێ ڕایەڵی بکەن.

وە ئەو عقوبەیە بڕیاری لەسەر دراوە لە هەموو یاسا ئاسمانی‌یەکانی تریشدا.

لە یاسای موسایی‌دا لە بەشی بیست و یەکەم لە (سفر الخروج)دا هاتووە: کە هەرکەس لە کەسێکی تری داو مرد ئەبێ بە کوشتن بکوژرێتەوە، وە ئەگەر پیاوێك دەست درێژی کردە سەر پیاوێکی ترو لەناکاو کوشتی ئەبێ بگیرێ و بکوژرێتەوە، وە هەرکەس لە دایکی یا لە باوکی بدات ئەبێ بە کوشتن بکوژرێ، وە ئەگەر ئازاردان پەیدابوو وەك یەك تۆڵە ئەسێنرێت، گیان بە گیان، چاو بە چاو، دان بە دان، دەست بە دەست، قاچ بە قاچ، برینداركردن بە برینداركردن، ڕوشاندن بە ڕوشاندن.

وە لە یاسای مەسیحی‌دا هەندێ کەس ڕای وایە کە کوشتنەوەی پیاوکوژ لە بیرو باوەڕەکانی مەسیحی‌دا نی‌یە بەلگەشیان بۆ ئەوە ئەوەیە کە لە (الإصحاح الخامس) دا هاتووە لە ئینجیلی مەتادا لەسەر زمانی عیساوە (عليه السلام) کە فەرمویەتی: بەرەنگاری خراپە مەکەن بەلکو هەرکەس زللەیەکی دا لەلای ڕاستت تۆ لای چەپیشتی بدەرێ با لێی بدات.

---

(١) ئەمە لەنێوان بەندەکاندا، بەلام ئەو حەدیسەی کە ئەفەرموێ: یەکەم شت کە بەندەی پێ موحاسەبە ئەکرێ نوێژە ئەوە لەنێوان خواو بەندەدایە.

(٢) البخاري (٦٨٦٤) ومسلم (١٦٧٨/٢٨).

وە هەرکەست بینی دوژمنایەتیت لەگەڵ ئەکات و جلەکانت ئەبات تۆ کراسەکەشتی بدەرێ، و هەرکەس بۆ ماوەی یەك میل تۆی لێخوڕێ تۆ دوومیل لە گەڵیدا برۆ.

وە هەندێکی تر ڕایان وایە کە یاسای مەسیحی سزای ئیعدامی ناسیوە بەڵگەشیان بەوە هێناوەتەوە کە عیسا (ﷺ) فەرمویەتی: (ما جئت لأنقض الناموس، وإنما جئت لأتمم).

واتە: بۆ ئەوە نەهاتوم کە وەحی بسڕمەوە بەڵکو هاتوم بۆ ئەوەی کە وەحی تەواو بکەم.

وە ئەوەی لە قورئاندا هاتووە پشتگیری ئەوە ئەکات کە ئەفەرموێت: ﴿وَمُصَدِّقاً لِمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ﴾ (آل عمران: من الآية٥٠). واتە: وە من ئەوەی لەبەر دەستم دایە لە تەورات تەصدیقی ئەکەم.

وە ئەم ئایەتە پیرۆزەش بۆ ئەوە ئاماژە ئەکات.

﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ وَالْأَنْفَ بِالْأَنْفِ وَالْأُذُنَ بِالْأُذُنِ وَالسِّنَّ بِالسِّنِّ وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ﴾ (المائدة: من الآية٤٥).

واتە: ئێمە لەسەر ئەوانمان فەرز کردووە لە تەوراتدا کە گیان ئەکوژرێ بە گیان و چاو دەرئەهێنرێ بە چاوو لوت ئەبڕدرێ بە لوت و گوێ ئەبڕدرێ بە گوێ و ددان دەردێ بە ددان، وە لە برینیشدا تۆڵە ئەسەندرێتەوە.

وە شەریعەت هیچ گیانێکی لە گیانێك جیانەکردۆتەوە، چونکە (قصاص) حەقە، کوژراوەکە گەورە بێت یا بچووك، پیاو بێت یا ژن. وە هەموو ئەمانە مافی ژیانیان هەیە، وە ڕەوا نییە کە شتێك ڕووبەڕوویان ببێ و ژیانیان لێ تێك بدات بە هیچ شێوەیەك، وە هەتا لە کوشتنی بەهەڵەشدا خوای گەورە بکوژەکەی عەفو نەکردووە لەبەرپرسیەتی، وە لەسەری پێویست کردووە کە بەندە ئازاد بکات و خوێنی بدات وەك خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَنْ يَقْتُلَ مُؤْمِناً إِلَّا خَطَأً وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِناً خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ إِلَّا أَنْ يَصَّدَّقُوا﴾ (النساء: من الآية٩٢).

واتە: بۆ موسڵمان نەهاتووە کە موسڵمان بکوژێت مەگەر بەهەڵە، وەهەر کەس موسڵمانێکی بەهەڵە کوشت ئەبێ بەندەیەکی باوەڕدار ئازاد بکات و خوێنەکەی چەندە بوو بیدات بە خاوەنەکەی مەگەر لێی خۆش بن.

وە ئەو سزا ماڵییە کە ئیسلام پێویستی کردووەو دایناوە بۆ کوشتنی بەهەڵە ڕێزلێنانە لە گیان بۆ ئەوەی کەس بیر لەوە نەکاتەوە کە ئەو گیانە بە کەم بزانێ، و بۆ ئەوەی خەڵك ئیحتیات بکەن و هوشیاری بەکار بێنن لەو شتانەدا کە پەیوەندی بە خوێن و گیانەوە هەیە.

وە بۆ ئەوەی هۆیەکانی فەساد ببەسترێت؛ نەك كەسێك كەسێك بكوژێ و بە درۆ بڵێت بەهەڵە کوشتومە.

وە لەئاگاداری زۆری ئیسلام و گرنگی پێدانی‌یەتی بە پاراستنی گیانەکان کە منداڵ لەبارپردنی قەدەغە کردووە دوای ئەوەی گیانی کرا بەبەردا، مەگەر هۆیەکی ڕاستەقینە ببێت ئەو کارە پێویست بکات؛ وەك مەترسی لە گیانی ژنەکە لە مردن و ئەو جۆرە شتانە.

وە لەسەر ئەو کەسەی سك بە ناهەق لەبار بەرێت واجبی کردووە کە (غرة)[1] بدات

(قصاص) تۆڵە لە نێوان سەردەمی نەفامی و ئیسلام دا

یاسای تۆڵە سەندن دانراوە لەناو عەرەبدا لەسەر بناغەی ئەوەی کە تیرەکە هەمووی بە لێپرسراو دائەنرێ لەو تاوانەدا کە یەکێ لە ئەندامەکانی کردویەتی، مەگەر ئەو تیرەیە ڕاییگەیەنێت لەناو تیرەکانی تردا کە وازی لەو ئەندامە هێناوەو دەری کردووەو پشتگیری ناکات.

هەر بۆیە خاوەن خوێن داوای (قصاص)و تۆڵە سەندن لە بکوژی لە تیرەکە ئەکرد، وە جاری واهەبوو ئەو داوایە گەورە ئەبوەوەو ئاگری شەڕی لە نێوان هەردوو هۆزو تیرەکەدا هەڵئەگیرساند.

جاری وابوو زیاتر پەرەی ئەسەند ئەگەر کوژراوەکە خاوەن پلە و بە دەسەڵات یا گەورە بوایە لەناو هۆزەکەیدا.

لەگەڵ ئەوەش دا هەندێ لە هۆزەکان گوێیان نەئەدا بەو داوایەو بکوژەکەیان ئەپاراست و هیچ گرنگیان بە کەسوکاری کوژراوەکە نەئەدا؛ ئیتر بەو هۆیەوە جەنگ لە نێوانیاندا بەرپا ئەبوو وە ئەبووە هۆی لەناوچوونی گیانی زۆر لە بێ تاوانەکان.

جا کاتێ ئیسلام هات سنووری دانا بۆ ئەو یاسا ستەمکارە وە ڕای گەیاند و بڵاوی کردەوە. کە تاوانبار خۆی بە تەنها لێپرسراوە دەرباری تاوانەکەی، وە تەنها خۆی تۆڵەی لێ ئەسەندرێتەوە لەسەر جینایەتەکەی.

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالْأُنْثَى بِالْأُنْثَى فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ ذَلِكَ تَخْفِيفٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ فَمَنِ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ، وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ (البقرة:١٧٨-١٧٩).

---

(١) لەمەودوا باسی (غرة) دێت.

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە تۆڵەتان لەسەر پێویست کراوە لە کوژراوەکانتاندا، بە مەرجی یەکسانی: لە بری ئازاد، ئازاد و لەبری بەندە بەندە و لە بری مێ‌ینە مێ‌ینە، جا ئەگەر کەسێك خاوەن خوێنەکە لێی بورد و بە ماڵ ڕازی بوو، یا هەردولا چاکە بکەن، خاوەن خوێن داوای زۆر نەکات کە بۆیان هەڵنەسوڕێ، وە بکوژیش بەباشی حەقەکەی بداتێ بەبێ کەمی و دواکەوتن، ئەوە ئەو لێبوردنەو ڕازی بوونە بە ماڵ ئاسان کردنێکی پڕ سوودە لەلایەن پەروەردگارتانەوەیە کە داینـاوە وە میهرەبانی‌یە، جا هەرکەس دوای لێ خۆش بون و وەرگرتنی خوێنەکە بکوژەکەی کوشت، ئەوە سزایەکی توندو تیژی بۆ هەیە، وە بۆ ئێوە -ئەی خاوەن عەقڵ و ژیری‌یە ساغەکان- لە دانانی (قصاص)و جێ‌بەجێ کردنیدا ژیانی پڕ ئاسودەیی هەیە، بە ئومێدی ئەوەی لە خوا بترسن و گوێ ڕایەڵ بن.

**ئەگەر (قصاص)و کوشتنەوەیان ویست و لێی نەبوران:**

(لەسەردەمی نەفامیدا لە نێوان دوو تیرە لە تیرەکانی عەرەبدا کێشەی خوێن هەبوو، یەکێ لە تیرەکان دەسەڵاتی بەسەر ئەوی تریاندا زیاتر بوو، سوێندیان خوارد کە لە جیاتی بەندەیەکمان ئازادێکتان ئەکوژین وە نێرێکتان ئەکوژین لە جیاتی مێ‌یەکمان.

جا کاتێ ئیسلام هات کێشەکەیان بردە لای پێغەمبەر (ﷺ) کە حوکمیان بکات، وە ئەو ئایەتە هاتە خوارەوەو فەرمانی پێدان کە لەگەڵ یەکدا باش بن. -قسەکە تەواو بوو-.

وە ئایەتەکە ئاماژە بۆ ئەمانەی خوارەوە ئەکات:

١- خوای گەورە یاسای سەردەمی نەفامی پوچەڵ کردەوە، وە پێویستی کرد کە ئەبێ تۆڵە سەندن بەرامبەرو یەکسان بێت لە کوشتندا.

بەڵام ئەگەر تۆڵەسەندنەکەیان هەڵبژارد نەك لێبوردنەکە؛ وە ویستیان جێ‌بەجێی بکەن؛ ئازادێك ئەکوژرێ ئەگەر ئازادێکی کوشتبوو، وە بەندە ئەکوژرێتەوە ئەگەر بەندەیەکی کوشتبوو، وە ژن لە جیاتی ژن ئەکوژرێتەوە.

(قرطبي) ووتویەتی: (ئەم ئایەتە هاتووە بۆ ڕون کردنەوەی حوکمی جۆری کوشتنەکە کە هەرکەس بە پێی جۆرەکەی ئەکوژرێتەوە، وە ڕونی کردۆتەوە حوکمی ئازادێك چی‌یە ئەگەر ئازادێکی کوشتبێ، وە عەبدێك ئەگەر عەبدێکی کوشتبێت، وە ئافرەتێك ئەگەر ئافرەتێکی کوشتبێ، وە باسی ئەوەی نەکردووە ئەگەر جۆرێکیان لە جۆرەکەی تری کوشتبێ.

کەواتە ئایەتەکە موحکەمە، وە (إجمال)و کورتی تێدایە کە ئەم فەرمودەیەی خوا ڕوونی ئەکاتەوە: ﴿وَكَتَبْنا عَلَيْهِم فيها أنَّ النفسَ بالنَّفس﴾ هەتا کۆتایی ئایەتەکە.

واتە: وە ئێمە لەسەر ئەوانمان فەرز كردووە لە تەوراتدا كە گیان بە گیان ئەكوژرێ.

وە پێغەمبەر (ﷺ) ڕوونی كردەوە كاتێ جولەكەیەكی كوشتەوە لە جیاتی ژنێك.

٢- موجاهید ووتویەتی: ئەگەر خاوەن خوێنەكە لە تاوان بارەكە بوراو لێی خۆش بوو بۆی هەیە داوای خوێن بایی بكات بە مەرجێ داواكردنەوەكەی بە چاكی بێت، و توندوتیژی تێدا نەبێت، وە لەسەر كوژەرەكەش پێویستە كە خوێنەكە بدات بەبێ دواخستن و دەستی دەستی كردن.

٣-وە ئەو حوكمەی خوای گەورە دایناوە لە دروستی تۆڵەسەندن و لێبوردندا و وەرگرتنی ماڵ لە جیاتی خوێنەكە، ئاسان كردنێكە لە لایەن خواوەو میهرەبانی‌یە كە فراوانی كردوەو یەكێ لەو دوانەی بە حەتمی دانەناوە.

٤-جا هەركەس دەست درێژی كرد بۆ سەر تاوانبارەكەو كوشتی دوای لێبوردنەكە، سزای سەختی بۆ ئەبێت یا بە كوشتنەوەی لە دونیادا یا بە ئاگر سزائەدرێ لە ڕۆژی دواییدا.

بوخاری لە ئیبنو عەبباسەوە ئەگێڕێتەوە خوا لێیان ڕازی بێت كە فەرمویەتی: (لەناو بەنی ئیسرائیل دا تەنها تۆڵە سەندن هەبوو، دیە و خوێن وەرگرتن نەبوو، جا خوا بەم نەتەوەی ئیسلامەی فەرموو: ﴿كتب عليكم القصاص في القتلى..﴾

واتە: (قصاص)تان لەسەر فەرز كرا لە جیاتی كوژراوەكان.

﴿فمن عفي له من أخيه شيء﴾ فەرمویەتی: ئەو عەفوە ئەوەیە كە ماڵ وەربگرێ لە جیاتی تۆڵەكە لە كوشتنی (عمد) قەستیدا، وە ﴿الاتباع بالمعروف﴾ مانای ئەوەیە كە داواكەر بە (معروف و ئەوەی دانراوە) داوای خوێنەكەی بكات، وە داوا لێ كراویش بە چاكی خوێنەكەی بداتێ.

﴿ذلك تخفيف من ربكم ورحمة﴾ لەبری ئەوەی كە لەسەر نەتەوەكانی پێش ئێوە نوسراوە.

٥- وە خوای گەورە بۆیە (قصاص) تۆڵە سەندنەوەی داناوە چونكە ژیانی گەورەو مانەوەی خەڵكی تێدایە.

چونكە ئەگەر پیاوكوژ بزانێ ئەكوژرێتەوە ئەگەڕێتەوە لە كوشتنی خەڵك، بەوەش لە لایەكەوە خۆی ئەژێنێتەوە، وە لەلایەكی ترەوە ئەو كەسەی كە ئەیویست بیكوژێ.

٦- وە ئیسلام خاوەنیەتی هێشتەوە بۆ سەرپەرشتی كوژراوەكە لە داواكردنی (قصاص) كوشتنەوەدا هەر بەو شێوەیەی كە لەلای عەرەب هەبوو پێش ئیسلام. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَنْ قُتِلَ مَظْلُوماً فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَاناً فَلا يُسْرِفْ فِي الْقَتْلِ إِنَّهُ كَانَ مَنْصُوراً﴾ (الاسراء: من الآية٣٣).

واتە: وە هەرکەس بە ستەم کوژرا بەبێ حەقێکی شەرعی ئەوە ئێمە دەسەڵاتمان داوە بە خاوەنەکەی تۆڵە بسێنێتەوە، وە نابێ زیادڕەوی بکات لە تۆڵە سەندندا یا لەشتی تردا، چونکە بەڕاستی خوا یارمەتی ئەدات تا تۆڵەی خۆی ئەسێنێتەوە.

مەبەستیش بە سەرپەرشت ئەو کەسەیە کە داوای خوێن ئەکات، کە ئەویش میرات گریەتی[1]، چونکە ئەو مافی داواکردنی تۆڵەی هەیە نەك سوڵتەی حاکم، وە ئەگەر ئەو داوای تۆڵەسەندن نەکات ئەوە تۆڵە لە تاوانبار ناسەندرێتەوە، وە مەبەست بە (سلطان) لە ئایەتەکەدا: دەسەڵاتە بەسەر بکوژەکەدا، ئەوەش بۆیە وایە نەوەکو عەفو کردن لە کەسێکی ترەوە ببێت بەبێ ڕەزامەندی ئەو، لە کاتێکدا ئەو بە ئاگری ئەو تاوانە داغ کراوەو لە ناخەوە ئەوروژێت و دەست ئەدات بە تۆڵەسەندنەوە، بەو شێوەیە کوشتار و تاوان کردن دووبارە ئەبێتەوە.

٧- خاوەنی (المنار) لە تەعلیق لەسەر ئەو ئایەتە ووتویەتی:

ئایەتە پیرۆزەکە بڕیاری ئەوەی داوە کە خودی ژیان مەبەستە، و تۆڵە سەندنیش هۆیەکە لە هۆیەکانی ژیان، چونکە هەرکەس بزانێ کە کەسێکی کوشت ئەکوژرێتەوە لەو کارە ئەگەڕێتەوە، بەو شێوەیە ژیانی خۆی و ئەو کەسەش کە ئەیویست بیکوژێت ئەپارێزرێ.

وە تەنها ڕازی بوون بە وەرگرتنی خوێن هەموو کەس ناگەڕێنێتەوە لە ڕشتنی خوێنی دوژمنەکەی ئەگەر بتوانێت، چونکە هەیە سامانێکی زۆر سەرف ئەکات بۆ ئەوەی دوژمنەکەی لەناو بەرێت.

و لەم ئایەتەدا لێزانی دەربڕین و ڕەوان بێژی تێدایە لە داڕشتنی ڕستەکەدا، کە قێزەونی لەناوبردنی ڕۆح لە تۆڵەدا لائەبات و نەفس ڕادێنێ لەسەر ڕازی بوون بە بڕیاری یەکسانی، چونکە تۆڵە سەندن و سزادانەکە بە کوشتن و ئیعدام ناو نابات، بەڵکو بە یەکسانی لە نێوان خەڵکدا ناوی ئەبات تاوەکو ژیانێکی بەختەوەرانەیان بۆ دابین بکات.

## تۆڵەسەندن لەسەر گیان

هەموو دەست درێژییەك بۆ سەر گیان تۆڵەسەندن پێویست ناکات، چونکە جاری وا ئەبێت ئەو دەست درێژییە بە قەستی ئەبێت، وە جاری وائەبێت لە قەستی ئەچێت، وە جاری واش ئەبێت بە هەڵە ئەبێت، یا جگە لەوانە ئەبێت.

(١) ئەوە ڕای جومهورە، ئیمام مالیك ئەڵێ: سەرپەرشت خزمی پشتیەیە.

كەواتە پێویستە جۆرەكانی كوشتن ڕوون بكەینەوە، وە ئەو جۆرەی كە تۆڵە پێویست ئەكات ڕوونی بكەینەوە.

### جۆرەكانی كوشتن

كوشتن سێ جۆرە:

١- قەستی (عمد).

٢- هاوشێوەی قەستی (شبه عمد).

٣- هەڵە (خطأ).

**كوشتنی قەستی:**

كوشتنی قەستی ئەوەیە: كە كەسێكی موكەللەف (واتە لەڕووی شەرعەوە فەرمان و قەدەغە كردنی لەسەر بێت) بیەوێ ئادەمیزادێكی بێتاوان بكوژێت كە بەپێی شەرع شایستەی ئەوە نەبێت كە بكوژرێت، بە شتێك كە بزانرێ ئەو شتە بەزۆری كوشتنی پێ ئەكرێ.

وە لەو پێناسەیەوە بۆمان دەرئەكەوێت تاوانی كوشتنی قەستی نایەتە جێ هەتا ئەمانەی خوارەوەی تێدا نەبێت.

١- ئەبێ بكوژەكە ژیرو پێگەیشتوو بێت و مەبەستی كوشتن بێت، وە دانان و ئیعتیبار كردنی ژیری و پێگەیشتوویی بەپێی حەدیسەكەی علی‌یە كە ئەگێڕێتەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (رفع القلمُ عن ثلاث: عن المجنون حتى يُفيق، و عن النائم حتى يستيقظ، و عن الصبي حتى يحتلم) رواه أحمد وأبوداود و الترمذي[1].

واتە: پێنوس لەسەر سێ كەس هەڵگیراوە: لەسەر شێت هەتا هۆشی دێتەوە، وە لەسەر نوستوو هەتا بەئاگا دێتەوە، وە لەسەر منداڵ هەتا باڵق ئەبێت.

بەڵام ئیعتیبار كردن بە قەست بەپێی ئەوەیە كە ئەبو هورەیرە ئەگێڕێتەوە ئەفەرموێت: لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) پیاوێك كوژرا. كێشەكەیان گەیاندنە لای پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش دایە دەستی خاوەن كوژراوەكە كە بیكوژێتەوە؛ كابراش ووتی: ئەی نێرراوی خوا سوێند بە خوا نەم ویستووە بیكوژم.

پێغەمبەر (ﷺ) بە خاوەن كوژراوەكەی فەرموو: (أما إنه إن كان صادقاً ثم قتلته دخلت النار).

(١) أحمد (٦/١٠٠-١٠١) وأبوداود (٤٤٠٣) والترمذي (١٤٢٣).

واتە: ئەگەر ئەو پیاوە ڕاست بكات و تۆ بیكوژیتەوە ئەچیتە دۆزەخەوە. ئیتر ئەویش بەرەڵای كرد.

وە بە قایشێك دەستی بەسترابوو، كە هاتە دەرەوە قایشەكەی ڕادەكێشا. ئەفەرموێ ئیتر پێیان ئەوت (ذا النسعة) (واتە خاوەن قایش). ئەبوداود و نەسائی و ئیبنوماجە و ترمذي گێڕاویانەتەوە و ترمذي بە صەحیحی داناوە[1].

وە ئەبوداود ئەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (العمد قود، إلا أن يعفو ولي المقتول)[2].

واتە: بە قەستی كوشتن (قصاص) كوشتنەوەی هەیە مەگەر خاوەن خوێنەكە لێی ببورێت.

ئیبنوماجە ئەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (من قتل عامداً فهو قودٌ، ومن حال بينه وبينه فعليه لعنة الله والملائكة والناس أجمعين، لايقبل الله منه صرفا ولا عدلاً)[3].

واتە: هەركەس بە قەست كەسێك بكوژێت ئەبێ بكوژرێتەوە، و هەركەس بكەوێتە نێوان خاوەنی خوێنەكە و تاوانبارەكە و ڕێ لە بەجێهێنانی بگرێت نەفرینی خواو فریشتەو هەموو خەڵكی لەسەر بێت، خوا هیچ چاكەو دادپەروەریەكی لێوەرناگرێ.

٢-ئەبێ كوژراوەكە ئادەمیزاد بێت و خوێنی ڕەوا نەبێت.

٣- ئەبێ ئەو شتەی بەكارهاتووە لە كوشتنەكەدا لەو ئامێرانە بێت كە بە زۆری خەڵك بەوە بكوژرێت. ئەگەر ئەو مەرجانەی تێدا نەبوو كوشتنەكە بە كوشتنی قەستی دانانرێت.

**ئامێری كوشتن:**

لە ئامێرەكەدا مەرجی وەها نییە ئەوە ئەبێت لەو ئامێرانە بێت كە بە زۆری خەڵكی پێ بكوژرێت، ئیتر نوك تیژ بێت یا فەوتێنەر بێت یەكسانە، چونكە وەك یەك خوێنیان پێ ئەڕێژرێ.

بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) سەری پیاوە جولەكەكەی لەنێوان دوو بەرددا پان كردەوە[4]، چونكە ئەو بەو شێوەیە جاریەیەكی كوشتبوو[5].

---

(١) أبوداود (٤٤٩٨) والترمذي (١٤٠٧) والنسائي (١٣/٧) وابن ماجه (٢٦٩٠).

(٢) ابن أبي شيبة (٣٦٥/٩).

(٣) أبوداود (٤٥٣٩) وابن ماجه (٢٦٣٥).

(٤) البخاري (٦٨٧٩) ومسلم (١٦٧٢/١٧).

(٥) أحمد (٣٦٤/١) وأبوداود (٤٥٧٢) والنسائي (٢١/٨) وابن ماجه (٢٦٤١).

وە ئەم حەدیسە بەڵگەیە بەسەر ئەبیحەنیفە و شیعبی و نەخەعییەوە کە ئەڵێن تۆڵەسەندن بە شتی کۆڵی قورس جێبەجێ ناکرێت.

وە هەر لەو شێوانەیە کوشتن بە سووتاندن بە ئاگر، یا خنکاندن لە ئاودا، یا بەردانەوە لە شوێنی بەرزەوە، یا دیواری بەسەردا بروخێنرێ، یا هەناسەی بگیرێ، یا بەند بکرێت، یا خواردن و خواردنەوەی نەدرێتێ هەتا ئەمرێت لە برسان، یا بخرێتە بەر گیان لەبەرێکی درندە.

وە هەر لەو شێوازەیە کە کۆمەڵێك شایەتی بدەن لە سەر کەسێکی بێ تاوان بە شتێك کە کوشتنی پێویست بکات، پاشان پەشیمان ببنەوە لەو شایەتیە و بڵێن: قەستمان کوشتنی بووە. ئەمانەی باس کران هەموویان لەو ئامێرانەن کە زۆر جار خەڵکیان پێ ئەکوژرێت.

وە هەرکەس خواردنێکی ژاراوی بدات بە کەسێك و بزانێت ژاراوییە و ئەوی تر نەزانێ و بیخوات و پێی بمرێت ئەبێ تۆڵەی لێ بسەندرێت.

بوخاری و موسلیم ئەگێڕنەوە کە: ئافرەتێکی جولەکە ژەهری کردە ناو گۆشتی بەرخێکەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ)؛ ئەویش ﷺ پارویەکی لێخستە دەمی و تفی کردەوە، وە بیشری کوڕی بەڕراء لێی خوارد، پێغەمبەر (ﷺ) لێی بورا و سزای نەدا.

واتە: لێی بورد پێش ئەوی ڕوداوی مردن ڕوویدات، لە نێوان ئەوانەی لێیان خواردبوو، بەڵام کاتێ بیشری کوڕی بەڕاء مرد کوشتییەوە.

بەپێی ئەوەی ئەبو داود ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دا بە کوشتنەوەی[1].

**قەتلی هاوشێوەی قەستی: (شبه عمد):**

کوشتنی هاوشێوەی قەستی: ئەوەیە کەسێك هەوڵی کوشتنی کەسێك بدات کە خوێنی ڕەوا نەبێت بەهۆی شتێکەوە کە زۆر جار خەڵکی پێ ناکوژرێت. وەك ئەوەی بە دارێکی سوکەڵە یا بەردێکی بچووك یا مشت لێدانێك، یا بە قامچییەك، و ئەو جۆرە شتانە لێی بدات.

جا ئەگەر لێدانەکە بە داردەستێکی سوکەڵە بوو یا بە بەردێکی بچووك (جارێك یا دوو جار بوو) وە ئەو کەسەی پێی مرد، ئەوە ئەو کوشتنە هاوشێوەی قەستییە[2].

---

(١) البخاري (٢٦١٧) ومسلم (٢١٩٠/٤٥) وأبو داود (٤٥٠٨).

(٢) ئەوە مەزهەبی ئەبو حەنیفەو شافیعییە، هەروەها جەماوەری زانایانیش، بەڵام مالیك و لەیس و هادەوییەکان پێچەوانەی ئەمەن: ئەڵێن ئەگەر کوشتنەکە بە ئامێرێکیش بوو کە بە زۆری کوشتنی پێ

بەڵام ئەگەر لێدانەکە لە شوێنی کاریگەر بوو، یا لێدراوەکە تەمەن منداڵ بوو یا نەخۆش بوو بەرگەی ئەو جۆرە لێدانەی نەگرت و پێی مرد، یا بەهێز بوو بەڵام لێدەرەکە زۆری لێداو مرد، ئەم کوشتنە کوشتنی قەستیيە.

وە بۆیە پێی ئەڵێن هاوشێوەی قەستی؛ چونکە کوشتنەکە لە نێوان قەستی و هەڵەدایە، چونکە لێدانەکە مەبەست بووە، بەڵام کوشتنەکە مەبەست نەبووە، بۆیە پێی ئەڵێن هاوشێوەی قەستی، چونکە نە بەقەستیيەکی پەتیيەو نە هەڵەیەکی پەتیيە. جا مادام قەستی پەتی نیيە کوشتنەوەی لە کۆڵ ئەکەوێ، چونکە ئەسڵ و بناغە پاراستنی خوێنی خەڵکە، کەواتە ڕشتنی ڕەوا ناکرێت بە شتێکی ڕوون و ئاشکرا نەبێت.

وە لەبەر ئەوەی هەڵەیەکی پەتی نەبووە؛ چونکە لێدانەکەی مەبەست بووە نەک کوشتنەکەی خوێنێکی قورسی ئەکەوێتە سەر.

دارەقوطنی ئەگێڕێتەوە لە ئیبنو عەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (العمد قود اليد، والخطأ عقل لا قود فيه، ومن قُتِل في عَمِيَّةٍ بحجر أو عصاً أو سوط، فهو دية مغلظة في أسنان الإبل)[1].

واتە: بە کوشتنی قەستی دەست بەجێ ئەکوژرێتەوە، و بە هەڵە کوشتن خوێن ئەدات ناکوژرێتەوە، وە هەرکەس کوژرانە لە نێواندا بە بەرد یا بە داردەست یا بە قامچی بکوژرێ، ئەوە خوێنێکی قورس لە حوشتر پێویستە لەسەر بنەماڵەکە کە بیدات.

ئەحمەد و ئەبو داود لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکیەوە لە باپیرەیەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (عقل شبه العمد مغلظة كعقل العمد، و لايقتل صاحبه، و ذلك أن ينزو الشيطان بين الناس، فتكون الدماء في غير ضغينة ولا حمل سلاح)[2].

---

ناکرێ، وەك دارو قەمچی و زللەو ئەو جۆرە شتانە" کوشتنەکە هەر بە (عمد) قەستی دائەنرێو (قصاص) ی تیایە" چونکە بەلای ئەوانەوە ئامێرەکە ئەسڵ نیيە لە کوشتندا، بەڵکو هەر شتێك گیان دەرچێنێت (قصاص) کوشتنەوە پێویست ئەکات.

(١) دارقطني (٣/٩٤).

(٢) أحمد (٢/١٨٣) وأبوداود (٤٥٦٥).

واتە: خوێن بایی کوشتنی هاوشێوەی قەستی زۆر قورسە، وەك خوێن بایی کوشتنی قەستی وایە، بەڵام خاوەنەکەی ناکوژرێتەوە، ئەمەش بەهۆی ئەوەیە کە شەیتان ئەکەوێتە نێوان خەڵکەوە؛ ئیتر ئەبێ بە خوێن ڕشتن، بەبێ ڕق و کینە و چەك هەڵگرتن.

ئەحمەد و ئەبوداود و نەسائی تەخریجیان کردووە کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژی فەتحی مەککە ووتاری داو فەرمووی: (ألا وإن قتيل خطأ العمد بالسوط و العصا و الحجر)[1].

واتە: بزانن کوژراوی هاوشێوەی قەست بە قامچی و داردەست و بەردە.

**کوشتنی بەهەڵە:**

بە هەڵە کوشتن ئەوەیە: کە کەسێکی موکەللەف کارێك بکات بۆی ڕەوا بێت کردنی، وەك ئەوەی بیەوێ نەچیرێك بکوژێت یا مەبەستێك بەجێ بهێنێ، کابرایەکی بێتاوانی بەرکەوێت و بیکوژێت، وەك ئەوەی بیرێك هەڵکەنێت و کابرایەکی تێ بکەوێ، یا تەڵەیەك بنێتەوە -لە جێگایەك کە دروست نییە- جا کابرایەکی پێوە بێت و بیکوژێت.

کەسێکیش کە تەکلیفی لەسەر نەبێ و بە قەستی کەسێکی تر بکوژێت وەك منداڵ و شێت هەر بە کوشتنی بەهەڵە دائەنرێت.

**ئەو شوێنەوارانەی کە بە هۆی کوشتنەوە پەیدا ئەبن**

ووتمان کە کوشتن یا قەستییە، یا هاوشێوەی قەستییە، یا هەڵەیە. وە هەر یەك لەم جۆرانە چەند شوێنەوارێکی لەسەر پەیدا ئەبێ و دائەمەزرێ.

وا لە خوارەوە باسی هەر یەك لەو جۆرانە ئەکەین.

**ئەو شتانەی کە کوشتنی بە هەڵە پێویستی ئەکەن.**

کوشتنی بەهەڵە دوو شت پێویست ئەکات:

(یەکەمیان) خوێن بایی سوك لەسەر کەسوکاری بکوژ؛ وە دوائەخرێت هەتا سێ ساڵ. کە لە دواییدا لە باسی خوێن باییدا باس ئەکرێت.

(دووەم) بریتی (الکفارە) ئەویش ئازادکردنی بەندەیەکی باوەڕداری ساغی بێ عەیب لەو عەیبانەی لە کاری بخات، ئەگەر دەسەڵاتی نەبوو بەندەیەکی باوەڕدار ئازاد بکات ئەبێت دوو مانگ لەسەر یەك بە ڕۆژوو بێت. ئەسڵ و بنەڕەتی ئەوەش فەرموودەی خوای گەورەیە: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ

---

(١) أحمد (٥/١٦٤) وأبوداود (٤٥٤٧) والنسائي (٨/٤٠) وابن ماجه (٢٦٢٧).

أَنْ يَقْتُلَ مُؤْمِناً إِلَّا خَطَأً وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِناً خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ إِلَّا أَنْ يَصَّدَّقُوا فَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ عَدُوٍّ لَكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثَاقٌ فَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِنَ اللَّهِ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيماً حَكِيماً﴾ (النساء:٩٢).

واتە: دروست نیيە هیچ باوەڕدارێك دەست درێژی بکات بۆ سەر باوەڕدارێك و بیکوژێت مەگەر بە هەڵە ڕوبدات، جا هەرکەس باوەڕدارێکی بەهەڵە کوشت، ئەبێت بەندەیەیکی باوەڕدار ئازاد بکات و خوێن باییش بدات بە کەسوکاری کوژراوەکە مەگەر خۆیان لێی ببورن.

بەڵام ئەگەر کوژراوەکە لە نەتەوەیەك بێت کە دوژمن بە ئێوەن، بەڵام کوژراوەکە باوەڕدار بوو، ئەبێ بکوژەکە بەندەیەیکی باوەڕدار ئازاد بکات، بەڵام ئەگەر لە نەتەوەیەك بوو پەیمان لە نێوانتانا هەبوو، ئەبێ خوێن بایی بدرێت بە کەسوکاری کوژراوەکە و بەندەیەکی باوەڕدار ئازاد بکات، جا هەرکەس دەسەڵاتی نەبوو ئەبێ دوو مانگ لەسەریەك بە ڕۆژوو بێت، تا خوا لێی خۆش ببێت. وە خوای گەورە زانایە بە کاروباری بەندەکانی و کار دروستە.

وە ئەگەر کۆمەڵێك پیاوێکیان کوشت بە هەڵە. جەماوەری زانایان ئەڵێن: هەریەکەیان کەفارەتێکی لەسەر ئەبێت.

وە کۆمەڵێکی تر ئەڵێن: هەموویان یەك کەفارەتیان لەسەر ئەبێت.

**حیکمەت لە کەفارەتی قەتڵ دا:**

قورطوبی ووتویەتی: زانایان جیاوازییان هەیە لە واتاکەیدا، ووتراوە: پێویست کراوە بۆ پاك کردنەوەی کوژەرەکە لە گوناه. وە گوناهەکەشی ئەوەیە کە ئیحتیات و هوشیاری بەکار نەهێناوە لە کارەکەیدا هەتا کەسێکی بێ تاوان بە دەستی ڕۆیشتووە و خوێنی ڕژاوە.

وە وتراوە: لەبر بەئەوە پێویست کراوە چونکە مافەکانی خوا یەك خراوە لە گیانی کوژراوەکەدا، چونکە ئەو کەسە لە خۆیدا مافی هەبووە، ئەویش خۆشی وەرگرتن بووە لە ژیان، وە هەڵس و کەوت کردن لەو شتانەی خوا بۆی ڕەوا کردووە وەك زیندووەکانی تر.

وە هەروەها ئەو نەفسە مافی خواشی بەسەرەوە بووە، چونکە بەندەیەك بووە لە بەندەکانی و بەو ناوە چەند شتێك لەسەری پێویست بووە -گەورە بوبێت یا بچووك، ئازاد بووبێت یا کۆیلە، موسڵمان بووبێت یا ذیمی- کە لە ئاژەڵ جیای ئەکاتەوە. وە هەروەها ئومێدی ئەوەی لێ ئەکرێ کە لە نەوەکانیدا کەسێك پەیدا بێت کە ملکەچی فەرمانەکانی خوا بێت و خوا بپەرستێ.

جا قاتلەکەی ئەو ناو و واتایەی کە باسمان کرد، فەوتاندویەتی، هەر بۆیە ئەبێ بریتی (کفارة) بدات.

وە هەرکام لەو دوو واتایە بێت، ئەوە ڕوون ئەکاتەوە کە دەقەکە هەرچەندە لەسەر قاتلی بە هەڵە باس کراوە بەڵام قاتلی بەقەستیش هەر ئەو حوکمەی هەیە؛ بەڵکو لە پێش تریشە کە کەفارەتی بکەوێتە سەر. -قسەکە تەواو بوو- و لە دوایی‌دا ڕوون ئەکرێتەوە.

**ئەو شتانەی کە کوشتنی هاوشێوەی قەستی (شبه العمد) پێویستی ئەکەن:**

کوشتنی (شبه العمد) دوو شت پێویست ئەکات :

١- گوناح، چونکە کوشتنی کەسێکە کە خوا کوشتنی حەرام کردووە مەگەر بە هەق نەبێت.

٢- خوێن بایی‌یەکی قورس ئەکەوێتە سەر کەس و کاری -بەو شێوەیەی لەمەودوا دێ.

بەڵام کوشتنی عەمد چوار شت پێویست ئەکات:

١- گوناهباری.

٢- بەش برین لە میرات و وەسیەت.

٣- کەفارەت (بریتی).

٤- کوشتنەوە یا لێبوردن.

(١) جا بکوژەکە هیچ لە ماڵی کوژراوەکە بە میرات ناگرێ، نە ماڵەکەی نە لە خوێن بایی‌یەکەی ئەگەر لە وەرەسەی بێت، بە قەستی کوشتبێتی یا بە هەڵە.

وە قاعیدەو بنەمای زانایانی ئاینی لەوەدا ئەوەیە:

(هەرکەس پەلە لە شتێك بکات پێش کاتی گەیشتنی، بەوە سزا ئەدرێ کە بێ بەش بکرێت لێی).

(٢) وە بەیهەقی ئەگێڕێتەوە لە خەللاسەوە کە پیاوێك بەردێکی هەڵدا بەسەر دایکی کەوت و کوشتی جا داوای بەشە میراتی ئەکرد براکانی پێیان وت: تۆ بەشت ناکەوێ، کێشەکەیان گەیاندە لای عەلی خوا لێی ڕازی بێت عەلی پێی فەرموو: مافەکەت لە میراتەکەیدا بەردەکە بوو کە پێت کوشت؛ لە پاشاندا خوێنبایی‌یەکەی لێ سەند و هیچی لە میراتەکەی نەدایە[1].

---

(١) البيهقي (٦/٢٢٠).

عەمری كوڕی شوعەیب ئەگێڕێتەوە لە باوكیەوە لە باپیرەیەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (ليس للقاتل من الميراث شيء)[1].

واتە: قاتیل هیچی لە میرات ناكەوێ.

ئەم حەدیسە مەعلولە وە لە ڕەفع و وەقفیدا جیاوازی هەیە، بەڵام چەند شایەتی هەیە كە بەهێزی ئەكات.

وەئەبو داودو نەسائی و ئیبنو ماجە ئەگێڕنەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (ليس للقاتل شيء، وان لم يكن له وارث، فوارثه أقرب الناس إليه، و لايرث القاتل شيئاً)[2].

واتە: هەركەس كەسێكی خۆی كوشت، لە میراتەكەی هیچی نادرێتێ. ئەگەر كەسی تری نەبوو جگە لەوەی كوشتویەتی، میراتەكەی ئەدرێ بە نزیك ترین كەس لێیەوە و كوژەرەكەی هیچی نادرێتێ لەمیراتەكەی.

وە بەشی زۆر لە زانایان بۆ ئەوە چوون. وە هەروەها حەنەفیەكان و شافیعیەكانیش.

بەڵام هادەویەكان و ئیمامی مالیك بۆ ئەوە چون ئەگەر كوشتنەكە بە هەڵە بوو لە ماڵەكەی میرات ئەگرێ، بەڵام لە خوێن بایەكەی ناگرێ.

زوهری و سەعیدی كوڕی جوبەیر و كەسانی تر ووتویانە: بكوژ لە میرات بەش بڕاو ناكرێت. وە هەروەها وەسێت هەڵئەوەشێتەوە ئەگەر وەسێت بۆ كراو وەسێت كەری كوشت.

لە (البدائع)دا هاتووە: كوشتن بە ناهەق تاوانێكی گەورەیە پێویست بەوە ئەكات كەبە توندترین شێوە خەڵكی لێ بترسێنرێت.

وە بێبەش كردنی بكوژ لە وەسیەت و میرات بۆ چاوترساندن ئەشێ، كەواتە بێ بەش بوونی بكوژ ئەچەسپێ.

جا كوشتنەكە قەستی بێت یە بەهەڵە، چونكە كوشتنی بەهەڵەش هەر كوشتنە و دروستە بەپێی عەقڵ لەسەر ئەوكارە سەرزەنشت بكرێ، جا لە پێش تاوانەكەدا وەسیەتی بۆ كردبێت یا دوایی یەكسانە.

---

(١) الدارقطني (٤/٩٦) وبلوغ المرام (٩٨٠) والترمذي (٢١٠٩) من حديث أبي هريرة.

(٢) أبوداود (٤٥٦٤) والنسائي في الكبرى (٦٣٦٧) والدارقطني (٤/٩٦).

(٣) کەفارەت لەو شێوەیەدا کە خاوەن خوێن لێی بووردبێت یا ڕازی بوبێت بە خوێن بایی، بەڵام ئەگەر قاتیلەکە قیصاصی لێسەندراو کوژرایەوە کەفارەتی لەسەر پێویست نییە.

ئیمامی ئەحمەد لە واثیلەی کوڕی ئەسقەعەوە ئەگێڕێتەوە کە ووتویەتی: (چەند کەس لە بەنی سولەیم هاتنە لای پێغەمبەر (ﷺ) ووتیان: هاوەڵێك لە ئێمە ئاگری لەسەر خۆی پێویست کردووە، فەرمووی: با بەندەیەك ئازاد بکات بۆ ئەوەی خوا بەهەر ئەندامێکی ئەندامێکی پێ ڕزگار بکات لە ئاگر)[1].

وە هەروەها گێڕاویەتییەوە بە سەنەدێکی تر لێیەوە کە ووتویەتی: هاتینە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی هاوەڵێکمان کە دۆزەخی بۆ خۆی پێویست کردبوو، فەرمووی: لە بریتی ئەوە بەندەیەك ئازاد بکەن، خوا بەهەر ئەندامێکی ئەندامێکی لە ئاگر ئازاد ئەکات[2].

ئەوەش ئەبوداود و نەسائی گێڕاویانەتەوە، لەفزەکەی ئەبو داود ئەڵێت ئاگری لەسەر خۆی پێویست کردبوو بەوەی کەسێکی بێ تاوانی کوشتبوو.

شەوکانی لە (نيل الأوطار)دا ووتویەتی: (حەدیسەکەی واثیلە بەڵگەیە لەسەر چەسپانی کەفارەت لە قەستە کوشت دا، ئەوە ئەگەر لە بکوژەکە خۆش بووبوون، یا خاوەن خوێنەکە ڕازی بوبێت بە خوێن بایی، بەڵام ئەگەر قیصاصی لێ سەندرا کەفارەتی لەسەر نابێت، بەڵکو کوشتنەوەکەی کەفارەتە بۆی، بەپێی حەدیسەکەی عوبادە کە لەم بەشەدا باس کرا. وە بە پێی ئەوەی ئەبو نوعەیم تەخریجی کردووە لە (المعرفة)دا کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (القتل كفارة).

واتە: کوشتنەوە کەفارەتە.

ئەمەش لە حەدیسی خوزەیمەی کوڕی ثابتە. وە لە ئیسنادەکەیدا ئیبنو لوهەیعە هەیە.

(حافظ) ووتویەتی: بەڵام لە حەدیسی ئیبنو وەهەب لە ئیبنو لوهەیعەوەیە، کەواتە پلەی (حسن)ی هەیە.

هەروەها طەبەرانی لە (الكبير)دا گێڕاویەتییەوە لە حەسەنی کوڕی عەلییەوە بە مەوقوفی.

(٤) کوشتنەوە یا لێبووردن:

---

(١) أحمد (٤/١٠٧).

(٢) أحمد (٣/٤٩١) وأبوداود (٣٩٤٦) والنسائي في الكبرى (٤٨٩٢).

كوشتنەوەی بكوژ یا لێبووردنی لەسەر خوێن بایی یا ڕێك كەوتن لەسەر شتێكی تر با لە خوێن بایش زیاتر بێت. وەك چۆن بۆ خاوەن خوێن هەیە كە بە خۆڕایی لێی ببورێ كە چاكترین شتە.

﴿وأنْ تَعفوا أقْرَبُ لِلتَّقوى وَلا تَنسَوُا الفَضْلَ بَيْنَكُمْ﴾ البقرة ٢٣٨.

واتە: وە ئەگەر لێبووردنتان ببێ نزیك ترە لە تەقواوە، و نابێ چاكەی نێوانتان لەبیربكەن.

وە ئەگەر خاوەن خوێن لە قاتیل خۆش بوو ئیتر حاكم مافی بەسەریەوە نامێنێ كە تەمێی بكات.

مالیك و لەیث ووتویانە: بە سالێك بەندو سەد دار لێدان تەمێ ئەكرێ[1].

وە ئەصلی پێوست (قصاص) كوشتنەوە یا لێبووردن فەرموودەی خوای گەورەیە كە فەرمویەتی: ﴿يَا أيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالْأُنْثَى بِالْأُنْثَى فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأدَاءٌ إلَيْهِ بِإحْسَانٍ ذَلِكَ تَخْفِيفٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ فَمَنِ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ ألِيمٌ﴾ (البقرة:١٧٨).

ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە تۆڵەسەندنتان لەسەر پێویست كراوە لە كوژراوەكانتانا، بەمەرجی یەكسانی: ئازاد بە ئازاد، بەندە بە بەندە، مێینە بە مێینە، جا هەركەس برا موسڵمانەكەی -خاوەن خوێن- لێی بوراو ڕازی بوو بە خوێن بایی با هەردولا چاكە بكەن، خاوەن خوێن داوای زۆر نەكات كە پێی هەڵنەسورێ وە كوژەریش ئەوەی دانراوە لەسەری بە ڕێك و پێكی بیدات بە خاوەن خوێن، ئائەم لێ بوردنە و ڕازی بوون بە خوێن بایی لە جیاتی كوشتنەوە بارسوكییەكە لە لایەن پەروەردگارتانەوە بۆ ئێوە، جا هەركەس دوای لێبووردنەكەو خوێن وەرگرتنەكە دەست درێژی كردو بكوژی كوشتەوە سزاو ئازارێكی توندی بۆ ئەبێت لە ڕۆژی دوایی‌دا.

بوخاری و موسلیم لە ئەبی هورەیرەوە ئەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (من قُتِل له قتيل فهو بخير النظرين: إما أن يفتدي، وإما أن يقتل)[2].

---

(١) زانایان وتویانە: تاوانبار ئەگەر بەناوبانگ بوو بە خراپە، یا بۆ حاكم دەركەوت كە بەرژەوەندی لەوەدایە كە سزای بدات بۆی هەیە كە تەمێی بكات بەوەی كە بە شیاوی ئەزانێ. بە بەند كردن بێت یان بە كوشتن.

(٢) البخاري (٢٤٣٤) ومسلم (١٣٥٥/٤٤٧).

واتە: هەرکەس کەسێکی لێکوژرا سەرپشکە لە نێوان دوو شتدا: یا خوێن بایی وەرئەگرێ یا قاتل ئەکوژێتەوە.

جا لێبوردن یاتۆڵەسەندن بۆ خاوەن خوێنە، کە ئەوانیش میرات گری کوژراوەکەن، ئارەزوو بکەن داوای کوشتنەوەی ئەکەن و ئارەزوو بکەن لێی ئەبورن، هەتا ئەگەر یەکێك لە میرات گرەکان لێی ببورێ (قصاص) کوشتنەوەی لەسەر لائەچێ، چونکە (قصاص) بەش بەش ناکرێت.

موحەممەدی کوڕی حەسەن هاوەڵی ئەبیحەنیفە ئەگێڕێتەوە کە عومەری کوڕی خەططاب خوای لێ ڕازی بێ کابرایەکیان هێنا بۆ لای زەلامێکی قەستەکوشت کردبوو، ئەویش فەرمانی دا بە کوشتنەوەی؛ جا هەندێ لە کەسوکاری کوژراوەکە لێی بوران، هەر فەرمانیدا بە کوشتنەوەی.

عبدالله ی کوڕی مەسعود خوای لێ ڕازی بێت فەرموی: ئەو گیانە بەشی هەموویان بوو کاتێ ئەو هێندە لێی بوران گیانەکەیان زیندوکردەوە، جا ئەو کەسەی لێی نەبوردووە ناتوانێ مافی خۆی بسێنێ هەتا هەقی کەسێکی تر نەستێنێ. عومەر فەرموی: ئەی تۆ ڕات چیە؟ فەرموی: ڕام وایە خوێن بایی لێ بسێنێ و بەشی ئەوانە وەرئەگری کە لێی بوردوون، عمر خوای لێ ڕازی بێت فەرموی: منیش هەر ڕام وایە.

محمد وتویەتی: منیش ڕام وەك ڕای ئەوانە، وە ئەوەش گفتی ئەبو حەنیفەیە.

وە ئەگەر لەناو وەرەسەکاندا منداڵ هەبوو ئەبێ چاوەڕوان بکرێت هەتا گەورە ئەبێت، بۆ ئەوەی ئەویش ڕای خۆی هەبێت، چونکە تۆڵەسەندن مافی هەموو وەرەسەکانە. منداڵیش ڕای وەرناگیرێ پێش پێگەیشتنی.

وە ئەگەر میرات گرەکان هەموویان یان یەکێکیان خۆش بوون لە قاتیل، ئەوە خوێن باییەکی قورسی ئەکەوێتە سەر لە ماڵەکەی. وەك لە بەشی خوێن باییدا باس ئەکرێت بە درێژی.

## مەرجەکانی پێویست بوونی (قصاص) تۆڵەسەندن

تۆڵەسەندن پێویست نابێت هەتا ئەم مەرجانەی لای خوارەوەی تیدا نەبێت:

١- ئەبێ کوژراوەکە بێتاوان بێت.

جا ئەگەر کافرێکی جەنگی بێت یا زیناکەری موحصەن بێت، یا لە ئیسلام هەڵگەڕابێتەوە، ئەوە هیچ ناکەوێتە سەر بکوژی نە تۆڵەسەندن نە خوێن بایی، چونکە ئەو جۆرانە هەموویان ڕشتنی خوێنیان ڕەوایە.

بوخاری و موسلیم ئەگێڕنەوە لە ئیبنو مەسعودەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لا يحل دم امرئٍ مسلم: يشهد أن لا إله إلا الله، وأني رسول الله إلا بإحدى ثلاثة: الثيب الزاني، والنفس بالنفس، والتارك لدينه المفارق للجماعة)[1].

واتە: خوێنی هیچ موسڵمانێك ڕەوا نیيە كە شایەتی دابێت هیچ پەرستراوێك نییە كە شایستەی پەرستن بێت بە حەق جگە لە خوا و منیش نێرراوی ئەو خوایەم، مەگەر بە یەکێ لەم سیانە نەبێت: ژن و پیاوی زیناكەر، كەسێك كەسێکی بێتاوانی کوشتبێ، هەڵگەڕاوە لە ئیسلام و دورکەوتەوە لە کۆمەڵی موسڵمانان.

٢- بکوژ پێگەیشتوو بێت.

٣- بکوژ ژیر بێت.

چونکە منداڵ تۆڵەی لەسەر نییە هەروەها شێت و بێعەقڵ، چونکە ئەمانە تەکلیفی شەرعیان لەسەر نییە وە ئەمانە نە مەبەستێکی ڕاستیان هەیە و نە ئارەزویەکی ئازاد.

بەڵام ئەگەر شێت جاروبار چاك ئەبووەوە، جا لە كاتی چاك بونەوەكەیدا كەسێك بکوژێ ئەکوژرێتەوە، وە هەروەها كەسێك سەرخۆش بێت و ئاگای لە خۆی نەبێ و لە خواردنەوەكەیدا دەست درێژی بکات.

لە ئیمامی مالیکەوە کە فەرمویەتی پێم گەیشتووە کە مەروانی کوڕی حەکەم نامەیەکی نوسی بۆ موعاویەی کوڕی ئەبی سوفیان، باسی ئەوەی بۆ کرد کە پیاوێکیان هێناوە بۆ لای بە سەرخۆشی پیاوێکی کوشتووە ئەویش فەرمانی دا: کە بیکوژەرەوە پێی.

بەڵام ئەگەر كەسێك شتێکی خواردەوە نەیزانی سەرخۆش كەرە، كەچی هۆشی بە خۆی نەماو لەوکاتەدا كەسێکی كوشت تۆڵەی لەسەر نییە.

لە فەرموودەدا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت: (رفع القلم عن ثلاث: عن الصبي حتى يحتلم، و عن المجنون حتى يفيق، و عن النائم حتى يستيقظ)[2].

واتە: پێنوس لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە: لەسەر منداڵ هەتا پێ ئەگات، وە لەسەر شێت هەتا هۆش ئەکاتەوە، وە لەسەر خەوتوو هەتا بە ئاگا دێتەوە.

---

(١) البخاري (٦٨٧٨) ومسلم (٢٥/١٦٧٦).

(٢) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

مالیك ووتویەتی: ئەوەی لای ئێمە هەموومان لەسەری کۆین: ئەوەیە کە تۆڵەسەندن نییە لە نێوان منداڵاندا، وە کوشتنیان کوشتنی هەڵەیە، ئەگەر حەددی شەرعییان لەسەر پێویست نەبێت و پێ نەگەیشتبن، کەواتە کوژران بەدەستی منداڵ بە هەڵە دادەنرێ.

٤- ئەبێ بکوژەکە ئارەزوو لە دەستی خۆیدا بووبێت، چونکە زۆر لێکردن ویستی لێ ئەسێنێتەوە، وە ئەوەش ویستی نەبێت لێپرسینەوەی لەسەر نییە.

جا ئەگەر خاوەن دەسەڵاتێك زۆری کرد لە کەسێك کەسێك بکوژێت، ئەویش ئادەمیزادێکی بەبێ هەق کوشت. ئەوە خاوەن دەسەڵاتەکەی ئەکوژرێتەوە نەك زۆر لێکراوەکە، وە زۆرلێکراوەکە سزا ئەدرێت.

ئەبوحەنیفەو داود لەسەر ئەوە ڕۆیشتوون، وە هەروەها گفتێکی شافیعییە.

و حەنەفییەکان ووتویانە: ئەگەر کەسێك زۆری لێکرا ماڵی کەسێك لەناوببات وە بەوە ترسێنرا ئەگەر فەرمانەکە بەجێ نەهێنێ بکوژرێ یا ترسی لە ئەندامێك لە ئەندامەکانی هەبوو، بۆی هەیە ئەو کارە بکات وە بۆ خاوەن ماڵەکە هەیە کە بە زۆر لێکەرەکەی بژمێرێ.

بەڵام ئەگەر زۆری لێکرد کە ئەت کوژم فلانە کەسم بۆ نەکوژی، نابێ بیکوژێ بەڵکو ئەبێ ئارام بگرێ یا خۆی بکوژێ، بەڵام ئەگەر کوشتی بەو کوشتنە گوناهبارە، وە قیصاص لەسەر ئەوەیە کە زۆری لێکردووە ئەگەر کوشتنەکە قەست بوو.

کۆمەڵێك لە زانایان ووتویانە: فەرمان پێکراوەکە ئەکوژرێتەوە نەك فەرمان کەرەکە. ئەمەش گفتێکی تری شافیعییە.

وە کۆمەڵێکی تر ئەڵێن لەوانە مالیك و حەنبەلییەکان: ئەبێ هەردوکیان بکوژرێنەوە؛ ئەگەر خاوەن خوێنەکە لێیان خۆش نەبێت. جا ئەگەر خاوەن خوێن لێیان خۆش بوو خوێن بایی پێویست ئەبێت، چونکە بکوژەکە مەبەستی هێشتنەوەی خۆی بووە بە کوشتنی کەسێکی تر.

زۆرکەرەکەش هۆیە لە کوشتنەکەدا بەوکارەی کە زۆر جار ئەبێتە هۆی ئەوە.

ئەگەر کەسێکی موکەللەفی شەرعی فەرمانیدا بە کەسێکی ناموکەللەف، کەسێکی بۆ بکوژێت: منداڵێك بێ یا شێتێك. تۆڵەکە لەسەر ئەوەیە کە فەرمانەکەی داوە، چونکە بکوژەکە ئامێرێك بووە بە دەستییەوە، کەواتە تۆڵەی لەسەر نابێت بەڵکو لەسەر ئەوەیان پێویستە کە بووەتە هۆی کوشتنەکە.

وە ئەگەر حاکم فەرمانی دا بە کوشتنی کەسێك بە ستەم، ئەوە فەرمان پێکراوەکە یان زانایە بەو ستەمکاریيە، يا نازانێت.

جا ئەگەر زانی ستەمە و فەرمانەکەشی بەجێهێنا تۆڵەی لەسەر پێویست ئەبێت، مەگەر خاوەن خوێن لێی خۆش بێت، ئەوکاتە خوێن بایی لەسەر پێویست ئەبێت، چونکە بکوژەکە دەستی لە کوشتنەکەدا هەبووەو زانیویێتی ئەو کارە ستەمە، کەواتە بەهانەی لێ وەرناگیرێ و ناوترێ لە لایەن حاکمەوە فەرمانی پێکراوە. چونکە بنەمای ئیسلامە: (کە گوێ ڕایەڵی هیچ کەسێك ناکرێ لە سەرپێچی کردنی فەرمانی خوادا).

هەروەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم قسەیەی فەرمووە

بەڵام ئەگەر بێئاگا بوو لە بێتاوانی کەسەکە و کوشتی، تۆڵە لەسەر ئەوە ئەبێت کە فەرمانەکەی داوە -ئەگەر خاوەن خوێن لێی خۆش نەبوو یا بە خوێن بایی ڕازی نەبوو- نەك ئەوەی کاری کوشتنەکەی ئەنجام داوە، چونکە بەهانەی ئەوەی هەیە کە گوێڕایەڵی حاکمی کردووە لە شتێك دا کە سەرپێچی نەبووە لە فەرمانی خوا.

وە ئەگەر کەسێك نامێرێکی کوشندەی دایە دەستی کەسێك کە تەکلیفی لەسەر نەبوو، بێ ئەوەی فەرمانی پێبکات کەسی پێ بکوژێ؛ بەڵام ئەو کەسێکی پێ کوشت: ئەوەی نامێرەکەی داوەتە دەستی هیچی لێناکرێ.

٥- بکوژەکە ئەسڵی کوژراوەکە نەبێت، واتە تۆڵە لە باوك ناسەندرێ ئەگەر کوڕی خۆی بکوژێ یا کوڕی کوڕەکەی و بەرەو خوار، بەهەر شێوەیەك بێت لە شێوەکانی کوشتنی قەستی. بە پێچەوانەی ئەوەوە کە کوڕ باوکی خۆی بکوژێ یا دایکی خۆی، ئەو کەسە ئەکوژرێتەوە بە ڕێکەوتنی هەموو زانایان.

چونکە باوك هۆیە بۆ بوون و ژیانی کوڕەکەی، کەوایە کوڕەکەی نابێ ببێتە هۆی کوشتن و ژیان لێ داماڵینی؛ بە پێچەوانەی ئەوەوە ئەگەر کوڕ یەکێ لە دایك و باوکی کوشت تۆڵەی لێ ئەسەندرێ لەسەریان.

(ترمذي) تەخریجی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (لايُقْتَلُ الوالِدُ بالولد)[1].

واتە: باوك لەسەر کوڕی خۆی ناکوژرێتەوە. ئەگەر ئەو باوکە کوڕەکەی خۆی کوشتبوو.

---

(١) أحمد (١/٢٢،١٦) والترمذي (١٤٠٠) والبيهقي (٨/٨٢).

(ابن عبدالبر) ووتویەتی: ئەوە فەرموودەیەکی بەناوبانگە لەناو زانایانی حیجازو عێراقدا، وە کاری خەڵکی مەدینەش بووەو لە ئیبنو عومەرەوە گێڕراوەتەوە.

یەحیای کوڕی سەعید ئەگێڕێتەوە لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە: کە پیاوێکی بەنی مودەلەجی پێیان ئەوت (قەتادە)، شمشێرێکی گرتە کوڕێکی خۆی بەر قاچی کەوت، برینەکەی لێی پیس کرد و مرد، سوراقەی کوڕی (جعشم) هات بۆ لای عومەری کوڕی خەططاب خوالێی ڕازی بێت ئەو بەسەرهاتەی بۆ گێڕاوە عومەریش فەرموی:

لەسەر ئاوی قەدید سەدو بیست حوشترم بۆ ئامادە بکە هەتا دێم بۆ لات. کاتێ عومەر هات بۆ لای لەو وشترانە سی حوققە و سی جەذعە و چل خەلیفەی جیاکردەوە. لەپاشاندا فەرمووی: برای کوژراوەکە لە کوێیە؟ ئەویش ووتی: ئەمەتام لێرە، فەرموی: بگرە ئەوانە بۆ تۆ. چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ليس للقاتل شيء)[1].

واتە: قاتیل هیچی نادرێتێ.

وە ئیمامی مالیك پێچەوانەی ئەوەی کردووە، وە ئەو ڕای وایە کە باوك لەسەر کوشتنی کوڕەکەی ئەکوژرێتەوە؛ کاتێ پاڵی خستبێت و سەری بڕی بێت، چونکە ئەوە قەستە کوشتنی تەواوە هیچ لایەنێکی تر هەڵناگرێ. چونکە ڕواڵەتی بەکارهێنانی تیغ لە کوشتندا قەستە.

عەمدو قەستیەتیش لە کوشتندا کارێکی شاراوەیە، حوکم بە چەسپینی نادرێ هەتا نیشانەو قەرینە حاڵیەکانی دەرنەکەوێت. بەڵام ئەگەر لەسەر ئەو شێوەیە نەبوو، وە لەوانەبوو کە بە مەبەستی گیان دەرچونی نەبوبێت، بەڵکو بە مەبەستی ژێرکردنی و تەمێکردنی بێت، هەرچەندە ئەگەر جگە لە باوك ئەوە بکات بە قەستە کوشت دائەنرێت، بەڵام لێرەدا باوك لە کەسانی تر جیاکراوەتەوە، لەبەر بوونی دڵسۆزی و میهرەبانی لە لایەن باوکەوە، وە مەبەستی تەمێ کردنی دێتە سەر، ئەگەر شتێکی کرد باوکی توڕە کرد، جا لەسەر ئەوە دائەنرێ کە بەمەبەستی کوشتن نەبووە؛ لەبەر بەهێزی ئەو خۆشەویستیەی کە لە نێوان باوك و کوڕدا هەیە.

٦- ئەبێ کوژراوەکە هاوتای بکوژەکە بێت لە کاتی تاوانەکەدا؛ وەك ئەوەی یەکسان بن لە ئاین و ئازادیدا.

(١) أبوداود (٢٥٦٤) والنسائي في الكبرى (٦٣٦٧) والدارقطني (٤/٩٦).

چونکە موسڵمان بە کوشتنی کافر ناکوژرێتەوە، یا ئازاد بە کۆیلە، چونکە هاوتایی نییە لە نێوان کوژراوو بکوژدا؛ بە پێچەوانەی ئەوەوە کە ئەگەر کافرێك موسڵمانێك بکوژێت، یا کۆیلەیەك ئازادێك بکوژێت ئەمانە ئەکوژرێنەوە.

هەرچەندە ئیسلام ئەو جیاوازییانەی لە نێوان موسڵماناندا پوچەڵ کردۆتەوەو جیاوازی نەکردووە لە نێوان گەورەو بێ دەسەڵات و جوان و ناشیرین و دەوڵەمەندو هەژارو کورت و درێژ و بەتواناو لاوازو ساغ و نەخۆش و تەواو ئەندام و کەم ئەندام و گەورە و بچوك و نێرو مێ.

بەڵام لێرەدا جیاوازی نێوان کافرو موسڵمانی داناوە، هەروەها لە نێوان ئازاد و کۆیلەدا، وە لە خوێن دا هاوتای نەکردون.

جا ئەگەر موسڵمانێك کافرێکی کوشت یا ئازادێك کۆیلەیەکی کوشت لە جیاتییان ناکوژرێنەوە. بنەرەتی ئەوەش حەدیسەکەی عەلییە خوای لێ ڕازی بێت کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (ألا لا يقتل مؤمن بكافر) أخرجه أحمد وأبوداود والنسائي و الحاكم و صححه[1].

واتە: بزانن کە باوەڕدار لە جێی بێباوەڕ ناکوژرێتەوە.

وە بوخاری ئەگێڕێتەوە لە عەلییەوە خوای لێ ڕازی بێت کە ئەبی جوحەیفە پێی وتووە: ئایا شتێکتان لایە لە وەحی کە لە قورئاندا نەبێت؟ ئەویش فەرموی: نەء، بەو زاتەی دانەوێڵە ئەڕوێنێ و گیانی لە نەبووەوە دروست کردووە، ئیللا ئەو تێگەیشتنە نەبێت لە قورئان کە خوا بەخشوویەتی بە پیاوێك، وە ئەوەی لەم لاپەڕەدایە. ئەڵێ: ووتم: چی لەو لاپەڕەیەدایە؟ فەرموی: باوەڕداران لە خوێندا هاوتان، وە دیل بەرەڵاکردن، وە ئەوەی کە موسڵمان لەجێی کافر ناکوژرێتەوە[2].

وە ئەمە ئیجماعی زانایانی لەسەرە بەنیسبەت کافری جەنگییەوە: چونکە موسڵمان کاتێ کوشتی؛ پێی ناکوژرێتەوە بە ئیجماعی هەموو زانایان.

بەڵام بە نیسبەت کافری ذیمی و خاوەن پەیمان، ڕای زانایان تێیدا جیاوازە، جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون موسڵمان لە جیاتی ئەمانەش ناکوژرێتەوە، لەبەر ئەو فەرموودە صەحیحانەی لەو بارەیەوە هاتون، وە فەرموودەیەك نەهاتووە پێچەوانەی ئەوە بێت.

---

(١) أحمد (١٧٨و١٨٠) وأبوداود (٤٥٠٦) وابن ماجه (٢٦٥٩) والحاكم (٢/١٤١).

(٢) أحمد (١/٧٩) والبخاري (١١١) والنسائي (٨/٢٣) والترمذي (١٤١٢).

وە حەنەفیيەكان و ئیبنوئەبی لەیلا ئەڵێن: موسڵمان ناكوژرێتەوە ئەگەر كافرێكی جەنگی بكوژێت، وەك جەماوەر ئەڵێن، بەڵام دەربارەی كافری ذمی و خاوەن پەیمان پێچەوانەی جەماوەرن و ئەڵێن:

موسڵمان ئەگەر بە ناحەق ذیمیيەك یا خاوەن پەیمانێك بكوژێت لە جیاتییان ئەكوژرێتەوە چونكە خوای گەورە ئەفەرمووێ:

﴿وكَتَبْنا عَلَيْهِم فيها أنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ﴾

واتە: لە تەوراتدا لەسەرمان فەرز كردوون كە كەسێك كەسێك بكوژێت ئەكوژرێتەوە.

وە بەیهەقی لە حەدیسی عبدالرحمن بەیلەمانییەوە[1] تەخریجی كردووە، كە پێغەمبەر (ﷺ) موسڵمانی كوشتۆتەوە لە جیاتی خاوەن پەیمان و فەرمویەتی: (أنا أكْرَمُ من وفّى بذمته)[2].

واتە: من لە هەموو كەس زیاتر وەفادارم بەوەی خراوەتە ئەستۆم.

وە هەروەها وتویانە: موسڵمانان هەموو لەسەر ئەوە ئیجماعیان هەیە كە ئەگەر موسڵمانێك ماڵی ذیمیيەك بدزێ ئەبێ دەستی ببڕرێت. جا ئەگەر ماڵەكەی وەك ماڵی موسڵمان بێت لە حەرامیدا، ئەوە خوێنەكەشی حەرامە وەك خوێنی موسڵمان.

موسڵمانێك برا بۆ لای ئەبی یوسفی قاضی كە ذمیيەكی كافری كوشتبوو، ئەویش حوكمی دا بە كوشتنەوەی. پیاوێك هات و پارچە كاغەزێكی بۆ هەڵدا ئەمەی تێدابوو:

يا قاتل المسلم بالكافر
جُرْتَ، وما العادل كالجائر
يا من ببغداد وأطرافها
من علماء الناس أو شاعر
استرجعوا وابكوا على دينكم
واصطبروا؛ فالأجر للصابر
جار على الدين أبو يوسف

---

(١) كوڕی بەیلەمانی لاوازە بۆ بەڵگە ناشێ، وە ئەم حەدیسەشی مورسەلە. ئەبو (عبدالقاسم)ی كوڕی سەلام وتویەتی: ئەم حەدیسە سەنەدی نییە، وە وێنەی ئەوە ناكرێ بە ئیمام و خوێنی پێ بڕژێ.

(٢) البيهقي (٨/٣٠).

بقتله المؤمن بالكافر

ئەی بکوژی موسڵمان بە کافر

ستەمت کرد ، وە دادپەروەر وەك ستەم کار نییە

ئەی ئەوانەی لە بەغداد و دەوروبەر پشتین

لە زانایان و دانایان و هۆنەران

وەگەڕێن بۆ لای خواو بگرین بۆ ئاینەکەتان

وە ئارام بگرن، چونکە پاداشت بۆ ئارام گرانە

ئەبو یوسف ستەمی کرد لە ئایین دا

کە موسڵمانی بە کافر کوشتەوە

ئەبو یوسفیش چوو بۆ لای هارونە ڕەشیدی خەلیفە و نامەکەی بۆ خوێندەوە. هارونە ڕەشید وتی: فریای ئەم کارە بکەوە با فیتنەیەك بەرپا نەبێت، ئەبو یوسفیش چووە دەرەوەو داوای لە خاوەن خوێن کرد کە شایەت بێنن لەسەر ئەوەی ئەو کابرایە بە ڕاستی ذمی بووە و سابتی بکەن ئەوانیش شایەتیان نەبوو، ئەویش تۆڵەکەی لەسەر لابرد.

مالیك و لەیث ئەڵێن: موسڵمان لەجێی کافری ذمی ناکوژرێتەوە؛ مەگەر بە فێڵ کوشتبێتی، ئەویش ئەوەیە پاڵی خستبێ و سەری بڕی بێت، بە تایبەت بۆ ماڵەکەی.

ئەوە بە گوێرەی کافر، بەڵام بە گوێرەی عەبد، پیاوی ئازاد لە جیاتی عەبد ناکوژرێتەوە ئەگەر کوشتبوی، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە ئەگەر عەبدێك پیاوێکی ئازادی کوشتبێ، ئەوە ئەکوژرێتەوە.

بەپێی ئەوەی دارەقوطنی گێڕاویەتییەوە لە حەدیسی عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکییەوە لە باپیرەیەوە کە پیاوێك عەبدێکی قستە کوشت کردبوو بە بەندکردن، پێغەمبەر (ﷺ) سەد داری لێداو ساڵێك نەفیکرد ، وە بەشەکەی لەناو موسڵماناندا کوژاندەوە، بەڵام نەیکوشتەوە و فەرمانی پێدا کە بەندەیەك ئازاد بکات[1].

چونکە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿الحر بالحر﴾.

واتە: پیاوی ئازاد لە جێی پیاوی ئازاد ئەکوژرێتەوە.

ئەم دەربڕینەش کە لە ئایەتەکەدا هاتوە بۆ (حصر) بەستنەوەیە.

---

(١) الدارقطني (٣/١٤٤).

مانای وایە كە پیاوی ئازاد لـە جیـاتی بەنـدە ناكوژرێتـەوە. بـەڵام ئەگـەر بەنـدەی كوشـت ئـەبێ نرخەكەی هەرچەند بوو بیدات بە خاوەنی، جا ئەگەر نرخەكەی لە خوێنی ئازادێكیش تێپەڕێت هـەر ئەبێت بیدات. ئەوە بۆ كەسێك كە عـەبدی كەسێكی تر بكوژێت.

بەڵام ئەگەر عەبدی خۆی بكوژێت سزاكەی بەو شێوەیەیە كە لە حەدیسـەكەدا هاتووە، جـەماوەری زانایانیش هەر بۆ ئەوە چوون لەوانە مالیك و شافیعی و ئەحمەد و هادەوییەكان.

ئەبوحەنیفە ووتویەتی: (پیاوی ئازاد لەجێی بەندە ئەكوژرێتەوە، مەگەر گـەورەی بەندەكـە بێـت) چـونكە ئایەتـە پیرۆزەكـە ئەفـەرموێ: ﴿وَكَتَبْنَـا عَلَـيْهِمْ فِيهَـا أَنَّ الـنَّفْسَ بِـالنَّفْسِ﴾ (المائـدة: مـن الآية٤٥).

واتە: لە تەوراتدا لە سەرمان فەرز كردون كە ئەگەر كەسێك كەسێك بكوژێت ئەبێ بكوژرێتـەوە. ئەمەش گشتییە لە هەموو شێوەیەكدا، مەگەر تایبەت بكرێـت، وە سـوننەت تایبـەتی كـردووە بـە حەدیسەكەی بەیهەقی كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویـەتی: (لایقـاد مملـوك مـن مالكـه، ولا ولـد مـن والده)[1].

واتە: خاوەن بەندە بەهۆی بەندەكەوە ناكوژرێتەوە، هەروەها باوك لە بری كوڕەكەی.

وە ئەگەر ئەم حەدیسە صەحیح بوایە بەهێزبوو، بەڵام بە ڕیوایەتی عومـەری كـوڕی عیسایە كـە بوخاری باسی كردووەو ئەفەرموێت حەدیسەكەی مونكەرە.

وە نەخەعی ووتویەتی: ئازاد بە گشتی لە جیاتی بەندە ئەكوژرێتەوە، بـەپێی گشتێتی ئایەتەكـە كە ئەفەرموێ: ﴿أن النفس بالنفس﴾.

واتە: گیان بە گیان بكوژنەوە.

٧- كەس هاوبەشی نەكردبێت لە كوشتنەكەدا، لەو كەسانەی كە تۆڵەیان لەسەر پێویست نییـە؛ بەڵام ئەگەر كەسێك لەو كەسانەی تۆڵەیان لەسەر پێویست نییە هاوبەشی كردبوو لە كوشـتنەكەدا. وەك ئەوەی كەسێك بە قەستی هاوبەشی بكات یا دڕندەیەك یا كەسێك تـەكلیفی لەسـەر بێـت یـان لەسەری نەبێت: وەك منداڵ و شێت، ئـەوە تۆڵـە لەسـەر هیچیان پێویست نابێـت، بـەڵكو خـوێن بارییان لەسەر پێویست ئەبێت، لەبەر بوونی ئەو شوبهەیەی حەدە شـەرعییەكان لـە كـۆڵ ئەخـەن، چونكە كوشتن بەش بەش ناكرێت، چونكە لەوانەیە بە دەستی ئەوەیان ڕووی دابێت كە تۆڵەی لەسەر نییە، وەك لەوانەیە لەسەر ئەوەیان بێت كە تۆڵەی لەسەر پێویستە، وە ئەم شوبهەیە حەددی شەرعی

(١) البيهقي (٨/٣٦).

لە کۆڵ نەخات، وە کاتێ تۆڵەکەی لە کۆڵ کەوت (بدل) لە جیاتی تۆڵەکە پێویست ئەبێت کە خوێن بایی‌یە.

مالیك و شافیعی ڕەحمەتی خوایان لێبێت لەو بارەیەوە جیاوازن و ووتویانە: ئەوەی تەکلیفی شەرعی لەسەر بێت ئەبێ تۆڵەی لێ بسەندرێتەوە، وە ئەوەی تەکلیفی شەرعی لەسەر نەبێت نیوەی خوێنەکەی لەسەر پێویست ئەبێت، وە مالیك خوێن بایی‌یەکە لەسەر کەسوکاری دائەنێت، بەڵام شافیعی‌یەکان لەسەر ماڵی خۆی.

### بەفێڵ کوشتن (قتل الغيلة)

بە فێڵ کوشتن لای ئیمامی مالیك ئەوەیە کەسێك بە فێڵ و تەڵەکە کەسێکی تر بکوژێت وەك ئەوەی بە فێڵ بچێتە ماڵەکەی و بیکوژێت یا ماڵەکەی ببات.

ئیمامی مالیك ووتویەتی: لای ئێمە ئەبێ بکوژرێتەوە، و بۆ خاوەن خوێن نیە لێی ببورێت، بەڵکو بەدەست سوڵتانە.

بەڵام زانایانی تر ووتویانە: جیاوازی نیە لە نێوان بە فێڵ کوشتن و جۆری تردا، چونکە لە هەردوو شێوەکەدا تۆڵە و لێبوردن وەك یەکە، وە کاری هەردوکیان بە دەستی خاوەن خوێنەکە ئەبێت.

وە ئەگەر کۆمەڵێك کوشتبێتی یان، بۆ خاوەن خوێن هەیە کامیانی بوێت بیکوژێتەوە، وە لە کامیان خوێن بایی بسێنێ ئارەزوی خۆیەتی، ئەمەش لە ئیبنوعەبباسەوە ئەگێڕنەوە، وە سەعیدی کوڕی موسەییب و شیعبی و ئیبنوسیرین و عەطاء و قەتادەش بەو شێوەیە گفتیان داوە. هەروەها مەزهەبی شافیعی و ئەحمەدو ئیسحاقە.

ژنێك و دۆستەکەی کوڕی مێردی ژنەکە ئەکوژن، یەعلای کوڕی ئومەییە نامەیەکی نووسی بۆ عومەری کوڕی (خطاب) خوا لێی ڕازی بێت -یەعلا یەکێك بوو لە کاربەدەستەکانی عومەر- تێیدا پرسیاری کردبوو دەربارەی ڕای عومەر لەو کێشەیەدا؟ ئەویش هەڵوێستەی کرد. هەتا عەلی کوڕی ئەبی طالیب فەرمووی: ئەی ئەمیری موسڵمانان ئەگەر کۆمەڵێك هاوبەشی‌یان کرد لە دزینی ووشترێکدا هەریەکەیان پارچەیەکی لێبرد ئایا تۆ دەستیان ئەبڕی؟ فەرمووی: بەڵێ، عەلی فەرمووی: ئەمەش وەك ئەوەیە.

عومەر خوا لێی ڕازی بێت نوسی‌یەوە بۆ یەعلای کاربەدەستی: (هەردووکیان بکوژەرەوە، ئەگەر خەڵکی صەنعاء هەموو هاوبەش بوونایە لە کوشتنیدا هەموویانم ئەکوشتەوە.

وە شافیعی بۆ ئەوەچوو کە خاوەنی کوژراوەکە بۆی هەیە هەموویان لە جیاتیدا بکوژێتەوە، یان کێیانی ئارەزوو کرد بیکوژێتەوەو بۆی هەیە لەوانی تر خوێن بایی وەربگرێت، هەرچەندیان بکەوێت.

جا ئەگەر دوو کەس هاوبەش بوون و یەکێکیان کوژرایەوە، بۆی هەیە (خاوەن خوێنەکە) نیوەی خوێن باییەکە لەوی تریان بستێنێ.

بەڵام ئەگەر سیان بوون، دوانیانی کوشتەوە، بۆی هەیە سێیەکی خوێنەکە لە سێیەم بسێنێ.

**کۆمەڵێك لە جیاتی کەسێك ئەکوژرێنەوە:**

ئەگەر کۆمەڵێك کۆبوونەوە لەسەر کوشتنی تەنها کەسێك ئەبێ هەموویان بکوژرێنەوە، کۆمەڵەکە زۆر بێت یا کەم، با هەمووشیان کاری کوشتنەکەیان بەجێ نەهێنابێت، بەپێی ئەوەی مالیك لە (الموطأ)دا گێڕاویەتیەوە: کە عومەری کوڕی خەطاب کۆمەڵێکی لە جیاتی تاکە پیاوێك کوشتەوە[1]. کە بە فێڵ کوشتبویان و فەرموی: ئەگەر هەموو خەڵکی صەنعاء هاوبەش بونایە لە کوشتنیدا هەموویانم ئەکوشتەوە[2].

بەڵام شافیعیەکان و حەنبەلیەکان مەرجی ئەوەیان داناوە کە ئەبێ هەموویان کاری کوشتنەکەیان بەجێهێنابێت بە شێوەیەك ئەگەر جیابێتەوە بە جیا قاتیل بێت، جا ئەگەر کاری هەریەکەیان لە کوشتنەکەدا بە جیا کوشتن نەبوو ئەوە تۆڵەیان لەسەر نییە.

وە مالیك ووتویەتی: ئەم کارە لای ئێمە ئەوەیە: کە لە کوشتنی (عمد) قەستیدا کۆمەڵێك پیاوی ئازاد ئەکوژرێنەوە بەکوشتنی یەك پیاوی ئازاد، وە کۆمەڵێك ژنیش بە یەك ژن، هەروەها کۆمەڵێك بەندە بە یەك بەندە ئەکوژرێنەوە.

وە لە (المسوى)دا ووتویەتی: لەلای بەشی زۆری زانایان کار بەوە ئەکرێت و ووتویانە: ئەگەر کۆمەڵێك کۆبوونەوە لەسەر کوشتنی تاکە کەسێك، هەموویان لە تۆڵەیدا ئەکوژرێنەوە، وە ئەو زانا ئاینیانە رایان وایە ئەو کارە لەبەر بەرژەوەندییە، چونکە (قصاص) کوشتنەوە کە دانراوە بۆ ژیاندنەوەی گیانەکانە. جا ئەگەر کۆمەڵێك لە جیاتی تاکە کەسێك نەکوژرێنەوە. هەرکەس بیەوێ کەسێك بکوژێت پەنائەباتە بەر کۆمەڵێك کە یارمەتی بدەن هەتا خۆی نەکوژرێتەوە، بەوەش حیکمەتی دانانی (قصاص) پوچەڵ ئەبێتەوە.

---

(١) ئەڵێن ژمارەیان پێنج کەس بوون، وە ئەڵێن حەوت کەس بوون.

(٢) الموطأ (٢/٨٧١).

ئیبنوزوبەیر و زوهری و داود و ئەهلی ظاهیر بۆ ئەوە چون کە کۆمەڵێك لە تۆڵەی تاکە کەسێکدا ناکوژرێنەوە، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أن النفس بالنفس﴾.

واتە: گیان بە گیان

**ئەگەر پیاوێك پیاوێك بگرێت و یەکێکی تر بیکوژێ:**

ئەگەر پیاوێك پیاوێکی گرت و بە پیاوێکی تر کوشتی، بە شێوەیەك ئەو بکوژە نەی ئەتوانی ئەو پیاوە بکوژێت ئەگەر بۆی نەگیرایە، وە کوژراوەکەش بەو گرتنەی توانای ڕاکردنی نەبوو، ئەوە هەردوکیانی لەسەر ئەکوژرێنەوە، چونکە هەردوکیان هاوبەش بوون لە کوشتنەکەیدا.

ئەوەش مەزهەبی لەیث و مالیك و نەخەعییە.

شافیعییەکان و حەنەفییەکان لەوەدا پێچەوانەی ئەوانن، ووتویانە: تەنها ئەوە ئەکوژرێتەوە کە کوشتویەتی، وە ئەوی تریان کە گرتویەتی بەند ئەکرێت هەتا مردن لە تۆڵەی گرتنەکەدا.

بەپێی ئەوەی دارەقوطنی لە ئیبنو عومەرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (إذا أمسك الرجل الرجل وقتله الآخر، يقتل الذي قتل، و يحبس الذي أمسك).

واتە: ئەگەر پیاوێك پیاوێکی گرت و پیاوێکی تر کوشتی، ئەوەیان کە کوشتویەتی ئەکوژرێتەوە و ئەوی تریان بەند ئەکرێت.

وە ئیبنوقەطان ئەم حەدیسەی بە صەحیح داناوە. وە حافظ ئیبنو حەجەر ووتویەتی: پیاوەکانی ئەم فەرمودەیە جێی سیقەن[1].

وە شافیعی لە عەلییەوە تەخریجی کردووە کە عەلی حوکمی کابرایەکی دا کەکابرایەکی کوشتبوو بە قەستی وە پیاوێکی تر بۆی گرتبو، بەوەی بکوژەکە بکوژنەوە و ئەوی تریان بەند بکەن هەتا مردن.

**سابت کردنی تۆڵە (قصاص) :**

(قصاص) بەمانەی لای خوارەوە سابت ئەبێت:

یەکەم: بە پێ لێنان و ئیقرار، چونکە پێ‌لێنان وەك وتویانە (گەورەی بەڵگەکانە)

(١) الدارقطني (٣/١٤٠) والبيهقي (٨/٥٠).

وە لە وائیلی كوڕی حوجرەوە كە فەرمویەتی: مـن لـە خزمـەت پێغەمبـەردا (ﷺ) دانیشتبوم، پیاوێك پیاوێكی پەت كردبوو هێنای بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) وتـی: ئـەی نێـرراوی خـوا ئـەم پیـاوە براكەمی كوشتووە.

وە وتی: ئەگەر پێی لێ نەنێت شایەتم هەیە لەسەری.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئایا تۆ برای ئەوت كوشتووە؟

وتی: بەڵێ كوشتومە... هتد... موسلیم و نەسائی ڕیوایەتیان كردووە[1].

دووەم: سابت ئەبێ بە شایەتی دوو پیاوی دادپەروەر:

لە ڕافیعی كوڕی خەدیجەوە كە ووتویەتی:

بەیانیەیەك پیاوێكی ئەنصاری لە خەیبەر كوژرابوو. كەسوكـاری چوون بـۆ خزمـەت پێغەمبـەر (ﷺ) بۆیان گێڕایەوە.

فـەرمووی: دوو شـایەتتان هەیـە شـایەتی بـدات لەســەر كوشـتنی؟.. هتـد. ئـەبو داود گێڕاویەتیەوە[2].

ئیبنوقودامە لە (المغنـی)دا ووتویـەتی: شـایەتی پیاوێـك و دوو ژن لـەم كێشـەیەدا وەرنـاگیرێ، هەروەها شایەتێك و سوێندی داواكاریش. وە لە نێوان زانایان كەسێك نازانین پێچەوانەی ئەوە بێت. چونكە (قصاص) تۆڵەسەندن خوێن ڕشتنە لە سزای تاوانێكدا، لەبەر ئـەوە ئیحتیـاتی بـۆ ئـەكرێ بەوەی مەرجە دوو شایەتی دادپەروەر شایەتی بدەن، وەك حەددە شەرعیەكان. جا تۆڵەكـە لەسـەر موسڵمان پێویست بێت، یا كافر، یا ئازاد، یا بەندە وەك یەكە، چونكە سزادان ئەبێ ئیحتیـاتی بـۆ بكرێ بۆ دوورخستنەوەی.

**بەجێهێنانی تۆڵە (قصاص) :**

بۆ بەجێ هێنانی تۆڵە سێ مەرج هەیە:

١- ئەبێ ئەوەی مافی جێبەجێ كردنی تۆڵەی هەیە ژیرو پێگەیشتوو بێت، چونكە ئەگەر ئـەوەی مافی جێبەجێ كردنی هەیە منداڵ بێت یا شێت، كەس لە جیاتی ئەو ئەوكارە جێبەجێ ناكات: نـە

---

(١) مسلم (١٦٨٠/٣٢)، نسائي (٨/١٥)، أبوداود (٤٥٠١).

(٢) أبوداود (٤٥٢٤).

باوکی نە وەصییەکەی نە حاکم بۆیان نییە لە جیاتی ئەو کەسە کارەکە بکەن، بەڵکو ئەبێت تاوان بارەکە بەند بکرێت هەتا منداڵەکە گەورە ئەبێت و شێتەکە چاك ئەبێتەوە.

وە موعاویە هودبەی کوڕی خەشرەمی بەند کرد لە تۆڵەدا هەتا کوڕی کوژراوەکە پێگەیشت. وە ئەم کارە لەسەردەمی صەحابەدا بووەو کەسیشیان ئینکاری لێنەکردووە.

٢- ئەبێ کەس و کاری کوژراو هەموو رێك کەوتبێ لەسەر جێبەجێ کردنی، وە نابێ هەندێکیان بە تەنها بەجێی بهێنن، وە ئەگەر هەندێکیان غایب بوون، یا منداڵ یا شێت بوون، ئەبێ چاوەڕوانی بکرێ هەتا غاییبەکە دێتەوە و منالەکە پێ ئەگات و شێتەکە چاك ئەبێتەوە، پێش ئەوەی خۆی هەڵبژێری ئیختیاری بدرێتە دەست، چونکە هەرکەس هەڵبژاردنی بۆ هەبێت لە فەرمانێکدا دروست نییە لێی لەدەست بدرێ، چونکە ئەوە هەڵبژاردنەکەی پوچەڵ ئەکاتەوە.

ئەبو حەنیفە ووتویەتی: گەورەکان بۆیان هەیە مافی خۆیان لە تۆڵە سەندندا جێبەجێ بکەن و نابێت چاوەڕوانی بکەن هەتا بچووکەکان گەورە ئەبن.

جا ئەگەر یەکێ لە کەس و کاری کوژراوەکە لێی بوورا (قصاص) تۆڵەکەی لە کۆڵ ئەکەوێ، چونکە تۆڵە پارچە پارچە ناکرێت.

٣- نابێت تۆڵە سەندنەکە کەسێکی تر بگرێتەوە، جا ئەگەر ژنێك تۆڵەی لەسەر پێویست بوو بەڵام دوگیان بوو، نابێ بکوژرێتەوە هەتا منداڵەکەی ئەبێت و ژەگی ئەداتێ، چونکە ئەگەر بکوژرێتەوە کۆرپەلەکەی زگی ئەگرێتەوە، وە کوشتنەوەشی پێش ژەك پێدانی زیان بە منداڵەکە ئەگەیەنێت، جا ئەگەر لەپاش ئەوەی ژەکی دایە کەسێك هەبوو شیر بدات بە منداڵەکە منداڵەکەی پێ ئەدرێت و نافرەتەکە تۆڵەکەی لێ ئەسەندرێتەوە، چونکە کەسێك هەیە دایەنی بکات بەڵام ئەگەر کەس نەبوو شیری پێ بدات و بەخێوی بکات، وازی لێ ئەهێنرێ هەتا دوو ساڵ لە شیری ئەبڕێتەوە.

ئیبنوماجە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

(إذا قَتَلَتِ المرأة عمداً، لم تُقتل حتى تضع ما في بطنها إن كانت حاملاً، و حتى تكفل ولدها، وإذا زنت لم ترجم حتى تضع ما في بطنها، إن كانت حاملاً و حتى تكفل ولدها)[1].

واتە: ئەگەر ژنێك کەسێکی بە قەست کوشت، ناکوژرێتەوە هەتا زگەکەی دائەنێت ئەگەر دوگیان بوو، وە لە پاشاندا هەتا منداڵەکەی بەخێو ئەکات، وە ئەگەر زینای کرد بەردباران ناکرێت هەتا زگەکەی دائەنێت ئەگەر دوگیان بوو، وە لەپاشاندا هەتا منداڵەکەی بەخێو ئەکات.

---

(١) ابن ماجه (٢٦٩٤).

وە هەروەها تۆڵە لە ژنی دوگیان ناسەندرێ لە تاوانی شکاندن یا لە ناوبردنی ئەندامی لەشی کەسێکی تردا، هەتا زگەکەی دائەنێت و تا ژەکیشی پێ ئەدات.

**کەی تۆڵە سەندن ئەبێت؟**

(قصاص) تۆڵە سەندن جێبەجێ ئەکرێت کاتێ کە خزم و کەسی کوژراوەکە ئامادە بن، وە پێی گەیشتوبن، وە داوای خوێنەکەش بکەن؛ ئەوە دەستبەجێ جێبەجێ ئەکرێ، هەر کە سابت بوو بە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی ئیسبات، مەگەر بکوژەکە ژنێکی دوگیان بێت، ئەوە دوا ئەخرێت هەتا منداڵەکەی لێ ئەبێتەوە، وەك لە پێشەوە باس کراوە.

**بەچی تۆڵەکە جێبەجێ ئەکرێت:**

ئەسڵ و بناغە لە تۆڵە سەندنەوەدا ئەوەیە بکوژەکە بەو رێگایە بکوژرێتەوە کە کەسەکەی پێ کوشتووە، چونکە بەوە یەکسان و هاوتا ئەبنەوە، مەگەر بەو شێوەیە ئازاردانی درێژە بکێشێ، ئەوکاتە شمشێر بۆ تۆڵسەندن زۆر رەحەت ترە بۆی، چونکە خوای گەورە ئەفەرموێت:

﴿فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾ (البقرة: من الآية١٩٤).

واتە: جا هەرکەس دەست درێژی کردە سەرتان ئێوەش سزایەکی بدەن کە هاوشێوەی تاوانەکەی بێت.

وە ئەفەرموێت: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ﴾ (النحل: من الآية١٢٦).

واتە: وە ئەگەر ویستتان تۆڵە بسەننەوە لەوانەی کە دەست درێژیان کردۆتە سەرتان زیاتر لەوە مەکەن کە ئەوان بە ئێوەیان کردووە.

بەیهەقی لە حەدیسی بەرِرائەوە ئەخریجی کردووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (من غرَّضَ غرَّضْنَا له، ومن حرَّق حرَّقناه، ومن غرَّق غرَّقناه)[1].

واتە: هەرکەس کەسێکی کردبێتە نیشانە ئەیکەینەوە بە نیشانە، وە هەرکەس کەسێکی سووتان ئەی سوتێنینەوە، وە هەرکەس کەسێکی لە ئاودا نوقوم کرد نوقمی ئەکەینەوە.

وە پێغەمبەر (ﷺ) سەری جولەکەیەکی بە بەرد پان کردەوە وەك چۆن ئەو سەری ژنێکی پان کردبۆوە.

---

(١) تلخيص الحبير (٤/ ٢٣).

زانایان ئەوەیان بەستۆتەوە بەوەوە کە دروست بێت ئەو شتە بەکاربێت، بەڵام ئەگەر دروست نەبێت -وەك ئەوەی بە سیحر کوشتبێتی- ئەوە بە سیحر ناکوژرێتەوە، چونکە سیحر حەرامە.

هەندێ لە شافیعییەکان وتویانە: ئەگەر بە ئاوەق تەقێنرابێت، ئەو کەسەش بە سرکە ئەتەقێنرێتەوە، وە ووتراوە ئیعتیبار بۆ ئەو یەکسانییە ناکرێت.

وە حەنەفییەکان و هادەوییەکان رایان وایە: تۆڵە سەندن بە شمشێر نەبێت نابێت. بەپێی ئەوەی بەززار و ئیبنو عەدی تەخریجی کردووە لە ئەبی بەکرەتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (لا قود إلا بالسيف)[1]. واتە: تۆڵەسەندنەوە بە شمشێر نەبێت نابێت.

وە چونکە پێغەمبەر (ﷺ) نەهی کردووە لە ئەتك کردن وە فەرمویەتی: (إذا قتلتم فأحسنوا القِتْلَةَ وإذا ذبحتم فأحسنوا الذِّبحة)[2].

واتە: ئەگەر کەسێکتان لە تۆڵەدا کوشتەوە بە چاکی بیکوژنەوە، وە ئەگەر ئاژەڵێکتان سەربڕی بە چاکی سەری ببڕن.

وە وەڵامی حەدیسەکەی ئەبی بەکرەت بەوە دراوەتەوە کە رێگاکانی هەموو لاوازن.

بەڵام نەهی کردنی لە ئەتك کردن تایبەت کراوە بە فەرموودەی خوای گەورە کە فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ﴾ (النحل: من الآية١٢٦).

وە بەوەی کە ئەفەرموێ: ﴿فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ ﴾ (البقرة: من الآية١٩٤).

**ئایا بکوژ لە حەرەم دا ئەکوژرێتەوە؟:**

زانایان لەسەر ئەوە رێك کەوتوون کە هەرکەس کەسێکی کوشت لە حەرەم دا دروستە لە حەرەم دا بکوژرێتەوە.

بەڵام ئەگەر لە دەرەوەی حەرەم کەسەکەی کوشتبو پاشان پەنای بردبووە بەر حەرەم، یا بەهەر هۆیەك کوشتنەوەی لەسەر پێویست بوو، وەك هەڵگەڕانەوە لە دین، لەپاشاندا پەنای بردبووە ناو حەرەم.

مالیك فەرمویەتی: لە حەرەم دا ئەکوژرێتەوە.

---

(١) ابن ماجه (٣٦٦٧) والبيهقي (٨/٦٢).

(٢) مسلم (١٩٥٥/٥٧) وأبوداود (٥/٢٨) والنسائي (٧/٢٢٧) وابن ماجه (١٣٧٠).

وە ئەحمەد و ئەبو حەنیفە ووتویانە: لە حەرەم دا ناکوژرێتەوە، بەڵام تەنگی پێ هەڵئەچنرێت، کەس هیچی پێ نافرۆشێت و کەس هیچی لێ ناکڕێت هەتا ئەچێتە دەر لە حەرەم. ئەنجا ئەکوژرێتەوە.

**تۆڵە لە کۆڵ کەوتن:**

تۆڵە دوای پێویست بوونی بە یەکێ لەم هۆیانەی لای خوارەوە لە کۆڵ ئەکەوێت:

١- خاوەن خوێنەکان هەموویان یا یەکێکیان لێی ببورێت، بە مەرجێ ئەوەی لێی ئەبورێت، ژیرو جیاکەرەوە بێت، چونکە لێبوردن لەو کارانەیە کە منداڵ و شێت خاوەنی نین.

٢- مردنی تاوانبار یا لەناوچوونی ئەو ئەندامەی کە تاوانەکەی پێ کردووە، جا ئەگەر تاوانبار مرد یا ئەو ئەندامەی کە تاوانەکەی پێکردووە لەناوچوو، تۆڵەکەی لەمل ئەکەوێت لەبەر گرانی بەجێهێنانی.

جا ئەگەر تۆڵە لە مل کەوت خوێن بایی پێویست ئەبێت لەو ماڵەی کە بەجێی ئەهێڵێ بۆ کەسوکاری لای حەنبەلیەکان، وە لە گفتێکی شافیعیدا.

وە مالیك و حەنەفیەکان ووتویانە: خوێن بایی پێویست نابێت چونکە مافەکەیان لە ملی تاوانبارەکەدایە، ئەویش لەناوچووە ئیتر ڕێگایان نییە بۆ سەر میرات گرەکان لەوەدا کە بووە بە مولکیان.

وە بەڵگەی ئەوانەی پێشو ئەوەیە کە ئەڵێن مافەکەیان هەڵواسراوە یا بە گەردنەوە، یا لە زەمانەت و ئەستۆدا، ئیتر خاوەن خوێن ئارەزوی خۆیانە تێیدا هەر کاتێ یەکێکیان لەناوچوو ئەویتریان پێویست ئەبێت (واتە: ئەگەر کابرا لەناوچو بۆیان هەیە داوای خوێن بکەن).

٣- ئەگەر ڕێك کەوتن کرا لە نێوان تاوانبار و ئەوەی تاوانەکەی بەرامبەر کرا وە یا کەس و کاری وە صولحیان کرد، تۆڵەکە لە کۆڵ ئەکەوێت.

**(قصاص) تۆڵە مافی حاکمە :**

داواکردنی تۆڵە مافی خاوەن خوێنە وەك لە پێشەوە باس کرا، وە دەسەڵات دان بە خاوەن خوێن بۆ بەجێهێنانی تۆڵەکە مافی حاکمە.

قورطوبی ووتویەتی: جیاوازی نییە لەسەر ئەوەی (قصاص) تۆڵە لە کوشتندا تەنها (أولو الأمر) بەڕێوەی ئەبات، وە پێویستە لەسەریان جێبەجێی بکەن، وە هەروەها جێبەجێ کردنی

حەددە شەرعی‌یەکان و شتی تر، چونکە خوای گەورە داوای لە هەموو باوەڕدارەکان کردووە بۆ تۆڵەسەندن.

لەپاشاندا ئەو کارە ساز نابێت بۆ هەموو باوەڕدارەکان کە کۆببنەوە لەسەر تۆڵەسەندن، لەبەر ئەوە سوڵتانیان لەجێی خۆیان داناوە بۆ بەجێ‌هێنانی (قصاص) و حەددەکانی تر.

هۆی ئەوەش ئەوەیە کە (صاوی) لە حاشیەی تەفسیری جەلالەیندا باسی کردووە وتویەتی: هەر کاتێك سابت بوو کە کوشتنەکە قەستەو دەست درێژی‌یە، پێویستە لەسەر حاکمی شەرعی کارێك بکات خاوەنی کوژراوەکە بتوانێ دەسەڵاتی هەبێت بەسەر بکوژەکەدا، وە حاکم ئەوە بکات کە خاوەن خوێن ئەیەوێت: کوشتن، یا لێبوردن، یا خوێن بایی، وە دروست نی‌یە خاوەن خوێن سوار ملی بکوژەکە ببێت بێ ڕێ پێدانی حاکم[1]، چونکە ئەو کارە خراپە و تێکدانی تێدا ئەبێت.

جا ئەگەر بکوژەکەی کوشتەوە پێش ئیزنی حاکم ئەبێ تەمێ بکرێت. وە لەسەر حاکم پێویستە ئامێری کوشتن پەیدا بکات کە تۆڵەکەی پێ جێبەجێ بکەن نەك ئازاردانی زۆری تێدا بێت، وە بە کەسێکی بسپێرێ کە باش بەکاری بهێنێ، وە کرێی جێبەجێ‌کردنەکەش لەسەر (بيت المال) بێت.

**لە دەست چوونی تۆڵە:**

ئیبنو قودامە وتویەتی: ئەگەر کەسێك جگە لە خاوەن خوێن بکوژەکەی کوشتەوە تۆڵە لەسەر بکوژی بکوژەکە پێویست ئەبێت، و بۆ خاوەن خوێنی یەکەم هەیە داوای خوێن بایی بکات.

شافیعی خوای لێ ڕازی بێت بەو شێوەیە گفتی داوە:

حەسەن و مالیك وتویانە: بکوژی بکوژەکە ئەبێ بکوژرێتەوە، وە خوێنی یەکەم بە فیڕۆ ئەڕوات، چونکە شوێنەکەی نەماوە.

وە لە قەتادەو ئەبی هاشمەوە گێڕراوەتەوە کە دووەم کوشتنەوەی لەسەر نی‌یە، چونکە یەکەم خوێن ڕشتنی ڕەوایە، لەبەرئەوە بە کوشتنی تۆڵەسەندن پێویست نابێت، وە بەڵگەی جەماوەر لە پێویست بوونی تۆڵە لەسەر بکوژەکە ئەوەیە کە ئەو کوشتنە حەتمی نەبووە، وە ڕەواش نەبووە جگە لە خاوەن خوێن بیکوژێتەوە، لەبەر ئەوە بە کوشتنی لەلایەن کەسێکی ترەوە (قصاص) پێویست ئەبێت.

---

(١) وە ئەگەر کوژراوەکە وەرەسەی نەبوو ئەوە فەرمان ئەگەڕێتەوە بۆ حاکم هەرچی بە بەرژەوەندی موسوڵمانانی زانی ئەوە ئەکات" ئەگەر بیەوێ ئەی کوژێتەوە، وە ئەگەر بیەوێ لێی خۆش ئەبێ لەسەر ماڵ، بەڵام بۆی نی‌یە کە لێی خۆش ببێ بەبێ ماڵ، چونکە ئەوە بۆ ئەو نی‌یە، بەڵکو مولکی موسوڵمانانە.

**(قصاص) تۆڵەسەندن لە نێوان مانەوەو لابردندا:**

بەڕاستی لێکۆڵینەوەو گفتوگۆی زۆر کراوە لەسەر سزای (إعدام) کوشتنەوە، و پێنوسی نوسەران زۆریان لەسەر نوسیوە، لە فەیلەسوفەکان و پیاوەکانی یاسا وەك: (رۆسۆ، و بنتام، و بکاریا) و چەند کەسانی تر.

جا لەناو ئەوانەدا هەبووە کە پشتگیری لەو سزایە کردووە، وە هەبووە بەرامبەری وەستاوەو داوای هەڵوەشاندنەوەی کردووە، وە ئەوانەی بانگەوازی نەهێشتنی ئەکەن پشتیان بەم بەڵگانەی خوارەوە بەستووە:

(یەکەم) سزادان مافێکە دەوڵەت بەناوی ئەو کۆمەڵەی بەرگری لێ ئەکات بووەتە خاوەنی، لەبەرئەوە ئەبێ پارێزگاری لێبکات. وە کۆمەڵیش ژیانی نەبەخشیوە بە ئەندامەکانی هەتا توانای لەناوبردنی هەبێت.

(دووەم) وە لەبەرئەوەی هەندێك جار بارودۆخ و بەختی ڕەش بێ تاوانێك ئەگرێتەوەو حوکمی ئیعدامی ئەدرێت، ئەوکاتەش ئەو هەڵەیە ڕاست ناکرێتەوە؛ چونکە ڕێگایەك نی‌یە بۆ گێڕانەوەی ژیانی حوکم دراوەکە.

(سێ‌یەم) وە لەبەرئەوەی ئەو سزایە توندوتیژ و سەخت و ناعادلانەیە.

(چوارەم) لەبەرئەوەی لەم دوایی‌یەدا پیویست نی‌یە، چونکە بەڵگەی وا بە دەست نەهاتووە کە بوبێتە هۆی کەم کردنەوەی ئەو تاوانانەی حوکم بە کوشتنەوە پێویست ئەکەن.

وە ئەوانەی ئەڵێن بە مانەوەی سزای ئیعدام ئەو بەڵگانەیان ڕەد داوەتەوە:

وە دەربارەی بەڵگەی یەکەم: کە ئەڵێن: (کۆمەڵ ژیانی نەبەخشیوە بە کەس هەتا دەست بەسەر ژیانی‌دا بگرێ). ڕەدیان داوەتەوە وتویانە: هەروەها ئازادیشی نەبەخشیوە بە کەس، لەگەڵ ئەوەشدا حوکم ئەدات بە دەست بەسەراگرتنی لە سزاکانی تردا کە ئازادی ئەبەستنەوە. وە ئەگەر ئەو بەڵگەیە بە گشتی‌یەکەی وەربگیرێت حەتمەن ئەوەی بە شوێنا دێت کە بوترێ هەر سزایەك ئازادی ببەستێتەوە نامەشروع و ناڕەوایە.

لەسەر ئەوەشەوە سزادان تەنها بۆ شۆردنەوەی هەڵەی تاوانبار نی‌یەو هیچی تر، بەڵکو بۆ بەرگری کردنیشە لە مافی کۆمەڵ لە مانەوەدا، بە بڕینەوەی هەر ئەندامێك کە هەڕەشەو مەترسی هەبێت بۆ قەوارەو بونیەتی ئەو کۆمەڵەو ڕێبازەکانی، کە پێویستە لەگەڵ ئەوەدا بوترێ کە سزای ئیعدام ناچاری‌یەکە کە پاك ڕاگرتنی نەفس و پارێزگاری کردن لە قەوارەی کۆمەڵگە پێویستی ئەکات.

وە دەربارەی بەڵگەی دووەمیان كە ئەڵێن: (سزادان زیانێكی گەورە بەدی دێنێ كە ڕێگا نییە بۆ چاك كردن و وەستانی -كاتێ بە ستەم حوكمی ئەو سزایە درا-

بەوە وەڵامیان داوەتەوە: كە لەوانەیە و ڕێی تێ ئەچێ هەڵە لە سزاكانی تریشدا بكرێت و ڕێگاش نییە بۆ ڕاست كردنەوەو پینەكردنی دوای ئەوەی بە هەڵە ئەنجام درا.

هەرچەندە حاڵاتی ئیعدام بە هەڵە نزیكە هەر نەبێت، چونكە دادوەرەكان زۆر خۆیان ئەپارێزن لەوەی كە حوكمی سزادان بدەن، مادام بەڵگەی ڕون و ئاشكرا نەبێت لەسەر تاوانەكە.

وە ڕەدی ئەو قسەیەشیان داوەتەوە كە ئەڵێن: (ئەو سزایە عادلانە نییە) بەوەی كە سزاكە بەپێی كردەوەكەیەو لە ڕەگەزی كارەكەیە.

وە ئەمما ئەو قسەیەی كە ئەڵێن: ئەو سزادانە لەم سەردەمەدا پێویست ناكات. بە وە ڕەد دراوەتەوە كە فەرمانی سزادان -لەسەر ڕای پەسەند لە زانستی سزادانەدا- فەرمانێكی بەكەڵكە: واتە لەناوەڕۆكیدا پاراستنی كۆمەڵی تێدایە لە شەڕی ئەو تاوانە. ئەوەش ئەوە پێویست ئەكات كە سزاكە گونجاو بێت لەگەڵ پلەو گەورەیی تاوانەكەدا.

چونكە ئەو تاوانە ئارەزوییەك لە نەفسی تاوانبارەكەدا دروست ئەكات؛ كە ترسانی لە سزادان بەرامبەری ئەوەستێت، وە هەرچەندە سزادانەكە گونجاو بێت لەگەڵ تاوانەكەدا. تاوانبار خۆی لائەدا لە كردنی ئەو تاوانانە.

چونكە ئەو هەڵسەنگاندن ئەكات لە نێوان ئەو دوو شتەدا (لەنێوان ئەو تاوانەدا كە بەرەو ئەنجامدانی ئەچێت وە لە نێوان ئەو سزایەدا كە بۆی بڕیار دراوە، لەبەرئەوە ترسی سزاكە هەتا توندو تیژتر بێت پاڵی پێوە ئەنێت كە ئەچێت بەلای ئەو تاوانەدا).

وە لەژێر سایەی ئەو دوو ڕایەدا بەشی زۆری یاساكان سزای ئیعدامیان بڕیار داوە.

لەوانە یاسای سزادانی میسری، لەهەندێ حاڵەتی دیاری كراودا، وە هەندێك وڵات ئەو سزادانەیان لابردووە، و بە گوێی ئەو كەسانەیان كردووە كە دژی وەستاون.

### ئەو تۆڵەسەندنانەی كە لە كوشتنەوەی نەفس كەمترن

وەك تۆڵە لەسەر گیان ئەچەسپێت هەروەها بۆ كەمتر لە گیانیش ئەچەسپێ كە دوو جۆرە:

١- (أطراف) ئەندامەكان.

٢- بریندار كردن.

قورئان دەربارەی ڕێبازی تەورات لە (قصاص)دا ئەگێڕێتەوەو ئەفەرموێ: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ وَالْأَنْفَ بِالْأَنْفِ وَالْأُذُنَ بِالْأُذُنِ وَالسِّنَّ بِالسِّنِّ وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ فَمَنْ تَصَدَّقَ بِهِ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ (المائدة:٤٥).

واتە: ئێمە لە تەوراتدا لەسەر جولەکەکانمان فەرز کردووە هەرکەس کەسێکی کوشت ئەبێ بکوژرێتەوە، وە هەرکەس چاوی کەسێکی کوێر کرد چاوی کوێر ئەکرێتەوە، وە هەر کەس لوتی کەسێکی بڕی لوتی ئەبڕرێتەوە، وە هەرکەس گوێی کەسێکی بڕی گوێی ئەبڕرێتەوە، وە هەرکەس دانی کەسێکی هەڵکەند دانی هەڵئەکێشرێتەوە، وە لە بریندار کردنیشدا تۆڵە ئەسەندرێتەوە، جا هەرکەس لە مافی خۆی خۆش بوو لە تۆڵە سەندنەوەدا ئەبێ بە کەفارەت بۆ گوناهەکانی. وە هەرکەس حوکم نەکات بەوەی خوا ناردویەتی‌یە خوارەوە لە تۆڵە سەندنەوەو شتی تردا، ئەوە ئەوانە دەرچون لە سنووری خوا.

وە ئەو حوکمە هەرچەندە لەسەر نەتەوەکانی پێش نەتەوەی ئیسلام نوسراوە، بەڵام بۆ ئێمەش شەرعە بە بڕیاردانی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەری، بوخاری و موسلیم لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ئەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت. کە ڕوبەییعی کچی نەضری کوڕی ئەنەس ددانی خزمێکی کچێکی شکاند؛ ئەوانیش پارەو ماڵیان بۆ دانان لە جیاتی، بەڵام ئەوان هەر داوای تۆڵەسەندنیان کرد.

ئەنەسی کوڕی نەضری برای هات وتی: ئەی نێرراوی خوا خزمێی ڕوبەییع ئەشکێنرێتەوە، بەو زاتەی تۆی بە هەق ناردووە ناشکێنرێتەوە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەنەس قورئان (قصاص) تۆڵەی داناوە، ئەڵێت: لەپاشان کەس‌وکارەکەی لێی خۆش بوون، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (إن من عباد الله من لو أقسم على الله لأبرَّه).

واتە: بە ڕاستی لەناو بەندەکانی خوادا کەسانێك هەن ئەگەر سوێند بخۆن بەخوا بۆیان جێبەجێ ئەکات و سوێندەکەیان ناخات.

ئەوانە هەمووی دەربارەی (عمد) قەست بوو بەڵام ئەگەر بە هەڵە بوو خوێن بایی لەسەرە.

مەرجەکانی تۆڵە سەندنەوە لەو حاڵەتانەدا کە تاوانەکە لە گیان کەمتر بێت:

چەند مەرجێك هەیە لە تۆڵەسەندن بۆ خوار گیانەوە کە ئەمانەن:

١- ژیری.

٢- پێگەیشتویی[١].

٣- تاوانەکەی بە قەستی کردبێ.

٤- ئەبێ خوێنی ئەوەی تاوانی بەرامبەر کراوە هاوتای خوێنی ئەوە بێت کە تاوانەکەی کردووە.

وە لە هاوتاییدا بەندایەتی و بێباوەڕی کاریگەرن، جا تۆڵە لە کەسێکی ئازاد ناکرێتەوە کە عەبدێکی بریندار کردبێت، یا ئەندامێکی بڕیبێت. وە هەروەها تۆڵە لە موسڵمانێك ناکرێتەوە کە کافرێکی ذمی بریندار کردبێت، یا ئەندامێکی بڕیبێت، لەبەر هاوتا نەبوونی خوێنەکەیان، چونکە خوێنی عەبد کەمترە لە خوێنی ئازادێك. وە خوێنی ذمییەك کەمترە لە خوێنی موسڵمانێك. وە ئەگەر تۆڵە پێویست نەبوو بڕیتییەکەی پێویست ئەبێت کە خوێن بایییە. بەڵام ئەگەر بریندارکردنەکە لە لایەن عەبدێکەوە یا ذمییەکەوە بوو تۆڵەی لێ ئەسەندرێ.

وە حەنەفییەکان ڕایان وایە کە تۆڵەسەندن پێویستە لە بڕینی ئەندام و لایەکاندا لە نێوان موسڵمان و کافردا.

وە هەروەها وتویانە: تۆڵەسەندن نییە لە نێوان ژن و پیاودا لە گیان بەرەو خوارتردا.

## تۆڵە سەندنی ئەندامەکانی لەش

بنەمای ئەو شوێنانەی تۆڵەسەندنیان تێدایە لە ئەندامەکانی لەش، وە ئەوانەی تۆڵەسەندنیان تێدا نییە ئەوەیە : کە هەر ئەندامێك جومگەی دیاری کراوی تێدابێت وەك ئەنیشك و پەنجەکان تۆڵەیان لەسەرە. وە ئەوەی جومگەی تێدا نەبێت تۆڵەی لەسەر نییە، چونکە ئەتوانرێ لە شێوەی یەکەمدا هەق و تۆڵە بکرێتەوە وەك خۆی، بەڵام لە شێوەی دووەمدا ناتوانرێت.

جا ئەوەی پەنجەی کەسێك لە بندا ببڕێت، یا دەستی لەمەچەکیدا، یا لە ئەنیشکیدا، یا قاچی لە جومگەکەیدا. یا چاوی کوێر بکات، یا لوتی ببڕێت، یا گوێی ببڕێت، یا ددانی هەڵکەنێت، یا زەکەری ببڕێت، یا گونەکانی ببڕێت، تۆڵەی لێ ئەسەندرێتەوە وەك خۆی.

**مەرجەکانی تۆڵەسەندن لە ئەندامەکاندا:**

سێ مەرج هەیە لە تۆڵەسەندنی ئەندامەکاندا کە ئەمانەن:

---

(١) پێگەیشتن یان بە (إحتلام) ئەبێ یان بە تەمەن، وە لای زۆروی تەمەنی پێگەیشتویی ١٨ساڵە، وە لای کەمی ١٥ ساڵە، بەپێی حەدیسەکەی ئیبنو عومەر، وە جیاوازی هەیە لە سەلماندنیدا.

١- دڵنیایی لە ستەم نەكردن بەم جۆرە كە برینەكە لە جومگەدا بێت، یا سنووریكی هەبێت كە تێیدا كۆتایی دێت، وەك لە پێشەوە نمونەكانی باس كرا.

جا لەسەر شكاندنی ئێسك تۆڵە ناسەندرێتەوە جگە لە ددان. یا لەسەر سەرشكاندن یا لەسەر برینی قوڵ، یا لەسەر هەندێك لە باسك، چونكە ئەمانە لە كاتی تۆڵە لێكردنەوەكەدا ترسی ستەم تیاكردنیان لێ ئەكرێ.

٢- هاو وێنەیی لە ناو و جێگەدا، جا نابێت لای چەپ لە جیاتی لای ڕاست ببڕێت، و ڕاست لە جیاتی چەپ، وە نابێت پەنجە گەورە بە پەنجە توتە و پێچەوانە، لەبەرئەوەی لەناودا وەك یەك نین، وە نابێت شوێنی ئەسڵی بە شوێنی زیادە ببڕێت -با هەردوولاش ڕازی بن- لەبەر یەكسان نەبونی شوێن و سودی، وە شوێنی زیادە وەرئەگیرێت بە هاو وێنەی خۆی لەڕووی جێگاو ڕواڵەتەوە.

٣- یەكسانی هەردوو ئەندامی تاوانبار و تاوان لێكراو لە ساغی و تەواویەتیدا، جا نابێت ئەندامێكی ساغ لە جیانی ئەندامێكی ناتەواو ببڕێت، وە نابێت دەستی تەواو لە جیاتی دەستێك ببڕێتەوە كە پەنجەكانی ناتەواو بن، بەڵام بە پێچەوانەوە دروستە، وە دەستی ناتەواو لە جیاتی دەستی تەواو ئەبڕرێتەوە.

## تۆڵەسەندن لەسەر بریندارکردنی قەستی

بەڵام بریندارکردنی بەقەستی تۆڵەسەندنەوەی پێویست نیە مەگەر بتوانرێت، وەك ئەوەی بریندار كردنەكە بە شێوەیەك بێت كە برینەكانیان یەكسان بێت بێ‌كەم و زیاد.

بەڵام ئەگەر یەكسانی و وەك یەكی نەهاتە دی بە تێپەڕبوون و زیان گەیاندن و مەترسی نەبێت، ئەوكاتە تۆڵەسەندن پێویست نیە بەڵكو (دیة) ماڵ پێویست ئەبێت، چونكە پێغەمبەر (ﷺ) لە بریندار كردنی تەوقی سەرو كەمێكی ئێسقان و بڕینی قوڵ تۆڵەی نەسەندووە.

وە ئەمەش حوكمە بۆ ئەو برینانەی كە زیان و خراپ بوونە: وەك شكاندنی ئێسكی گەردە مل و پشت و ڕان و وێنەی ئەوانە كە ناتوانرێ بەو شێوەیەی خۆی تۆڵەكە بسەنرێتەوە، هەروەها بریندارکردنی سەر و چاو تۆڵەی لەسەر ناسەندرێت مەگەر شێوەیەك بێت كە پێستی سەر تێیدا چوبێت و ئێسكی دەركەوتبێت ئەگەر بەقەستی بوو.

وە پاشماوەی بریندارکردنەكانی سەر لە بەشی خوێن بایی‌دا باس ئەكرێت.

هەروەها تۆڵە لەسەر زمان و شكاندنی ئێسك ناكرێتەوە، جگە لە ددان چونكە لەوانەدا ناتوانرێ بێ‌ستەم كردن بەجێ‌بێت.

وە هەرکەس سەری پیاوێکی بریندار کرد بەشێوەیەکی قوڵ و چاك بووەوە یا دەستی بڕی لە ناوەڕاستی قۆڵیدا، تۆڵەسەندنی لەسەر نییە، وە بۆی نییە دەستی تاوانبار لەو شوێنەدا بپڕێتەوە، بەڵام بۆی هەیە تۆڵەی دەستی بڕاو لە مەچەکدا بسەنێتەوە، وە بۆ نیوەی قوڵ بۆی هەیە ماڵ وەربگرێت، وە ئەگەر ئێسك شکا جگە لە ددان: وەك پەراسو، یا بڕینی دەستێکی گۆچ یا قاچێك پەنجەی پێوە نەبێت، یا زمانێکی لاڵ، یا چاوێکی کوێر دەرهات، یا پەنجەیەکی زیادە بپڕێت، بۆ ئەمانە هەموو بژێوییەکی عادلانە دائەنرێ.

هاوکاری کۆمەڵێك لە ئەندام بڕیندا یا لە بریندار کردندا :

حەنبەلییەکان بۆ ئەوە چوون کە ئەگەر کۆمەڵێك هاوبەش بوون لە بڕینی ئەندامی لەشی کەسێکدا، یا کەسێکیان بە شێوەیەك بریندار کرد کە تۆڵە پێویست بکات، ئەوە ئەگەر کردەوەکەیان لەو کارەدا جیانەکرایەوە، هەموویان تۆڵەیان لەسەر پێویست ئەبێت.

بەپێی ئەوەی ئەگێڕنەوە لە عەلییەوە خوا لێی ڕازی بێت: کە دوو شایەت هاتنە لای شایەتییان دا لەسەر پیاوێك کە دزی کردووە، ئەویش دەستی بڕی. لە پاشاندا یەکێکی تر هات وتیان: ئەوە دزەکەیە و ئەوەی پێشوومان بە هەڵە ووت: شایەتییەکەیانی لەسەر دووەم ڕەت کردەوە و خوێنی دەستی یەکەمی لێ سەندن،

وە وتی: ئەگەر بمزانیبایە بە قەستی ئەوەتان کرد دەستی هەردووکتانم ئەبڕییەوە.

بەڵام ئەگەر کردەوەکەیان جیاجیا بوو، یا هەرکەسیان لایەکی لێ بڕی بوو، تۆڵەیان لێ ناکرێتەوە.

مالیك و شافیعی ووتویانە: تۆڵەیان لێ ئەکرێتەوە هەرکاتێ ئەو کارە بکرێت، جا ئەو ئەندامانەیان ئەبڕێت کە بڕیویانە، وە بۆ بریندارکردنیش هەر تۆڵەیان لێ ئەکرێتەوە، وەك ئەوەی کۆمەڵێك هاوبەش بن لە کوشتنی کەسێکدا، ئەکوژرێنەوە.

حەنەفییەکان و ظاهیرییەکان بۆ ئەوە چوون کە دوو دەست نابڕێت لە جیاتی دەستێك، جا ئەگەر دوو پیاو دەستی پیاوێکیان بڕی تۆڵە لە هیچیان ناکرێتەوە، بەڵکو هەریەکەیان نیوەی خوێنەکەی ئەدات.

**تۆڵەسەندن لە مشت لێدان و لێدان و جوێن پێداندا :**

دروستە ئادەمیزاد تۆڵەی خۆی بکاتەوە لە کەسێك مستی لێدابێت یا لێی دابێت یا جوێنی پێدابێت، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێت: ﴿فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ (البقرة: من الآية١٩٤).

واتە: هەرکەس دەست درێژی کردە سەرتان ئێوەش دەست درێژی بکەنە سەری وەك دەست درێژییەکەی خۆی وە لە خوا بترسن.

وە فەرموودەی خوای گەورە ﴿وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا﴾ (الشورى: من الآية٤٠).

واتە: جەزای خراپە خراپەیەکی وەك خۆیەتی.

وە مەرجە کە مست لێدان و لێدان و جوێن پێدانی لێدراو یەکسان بێت، بە لێدان و مست لێدان و جوێن پێدانی تاوان بارەکە، چونکە ئەوە ئەو عەدالەتە داواکراوەیە کە لە پێناوی‌دا (قصاص) تۆڵە دانراوە.

وە هەروەها مەرجە کە تۆڵە لێکردنەوە لە مست لێداندا نەکێشرێت بە چاودا یا بە شوێنێکدا کە ترسی لەناوچوونی تێدابێت.

وە مەرجیشە لە تۆڵە سەندندا بە تایبەتی لە جوێن داندا شتێ نەوترێ کە خۆی حەرام بێت لە رەگەزدا، جا بۆ کەس نییە لە تۆڵەی ئەوەدا کە پێی ووتراوە کافر، ئەمیش بڵێت کافر، یا درۆ دەربارەی کەسێك بکات کە درۆی دەربارە کردبێت، یا نەفرین لە باوکی کەسێك بکات کە نەفرینی لە باوکی کردبێت، یا جوێن بە دایکی کەسێك بدات کە جوێنی بە دایکی دابێت، چونکە کافر کردنی موسڵمان یا درۆ هەڵبەستن بە دەمی‌یەوە شتێکە لەسەرەتاوە لە ئیسلام دا حەرامە، وە هەروەها لەبەرئەوەی باوکی نەفرینی لێنەکردووە هەتا نەفرینی لێبکاتەوە، وە هەروەها دایکی جوێنی پێنەداوە هەتا جوێنی پێبدات.

وە بۆی هەیە نەفرین لەو کەسە بکات کە نەفرینی لێکردووە، و کەسێك ناشیرین بکات کە ناشیرینی کردبێت، وە ئەو ووشەیەی کە پێی ووتراوە بە خاوەنەکەی ئەڵێتەوە لە تۆڵەدا.

قورطوبی ووتویەتی: هەرکەس ستەمی لێ کردیت هەقی خۆتی لێبکەرەوە ئەوەندەی ئەو ستەمەی لێت کراوە، و هەرکەس جوێنی پێدایت وەك خۆی جوێنەکەی پێ بدەرەوە، و هەرکەس ئابڕوی بردی ئابڕوی بەرە؛ بەڵام دەست درێژی مەکە بۆ سەر باوك و دایك و کوڕو خزمەکانی. وە

بۆت نی‌یە درۆی بە دەمەوە بکەیت، با ئەو درۆی بە دەمەوە کردبیت، چونکە گوناه بە گوناه تۆڵە ناکرێتەوە.

بۆ نمونە ئەگەر کەسێك پێی ووتیت: ئەی بێباوەڕ دروستە بۆت پێی بڵێتەوە تۆ بێباوەڕی، وە ئەگەر پێی ووتیت زیناکەر، تۆڵەکەت ئەوەیە پێی بڵێیتەوە: هەی درۆزن هەی شایەنی دەری درۆ. بەڵام ئەگەر پێی بڵێیتەوە: تۆ زیناکەری، بەوە تۆ درۆزنی، وە لەو درۆیەدا گوناهباریش بووی، بەڵام ئەگەر قەرزت دا بە کەسێك و دانەوەکەی دواخست بێ بەهانەو هەی بوو پێی بڵێ: ئەی ستەمکار ئەی ماڵی خەڵك خۆر.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ليُّ الواجد يُحلّ عرضه و عقوبته)[1].

واتە: قەرزکوێری دەوڵەمەند ئابڕوبردنی و سزادانی ڕەوا ئەکات.

ئابڕو بردنی بەو شێوەیە کە باس کرا، و سزادانەکەشی بەند کردنی‌یەتی -تەواو-

وە تۆڵەسەندن لەسەر مشت لێدان و لێدان و جوێن پێدان سابتە و هاتووە لە خەلیفەکانی ڕاشدین و جگە لەوان لە صەحابەو تابیعی‌یەوە:

بوخاری لە ئەبی بەکرو عەلی و ئیبنو زوبێر و سوەیدی کوڕی موقەڕڕەنەوە باس ئەکات کە ئەوان تۆڵەیان سەندۆتەوە لەسەر مشت لێدان و ئەو جۆرە شتانە.

ئیبنو مونذیر ووتویەتی: ئەوەی بەدار لێی بدرێت، یا بە قامچی، یا بە بەرد، وە لە خوار گیانەوە بوون، ئەوە تاوانێکی قەستین، ئەبێ تۆڵەی لەسەر بسەندرێ.

وەلە بوخاری‌دا هاتووە: عومەر تۆڵەی سەندۆتەوە لەسەر لێدانێك بە قامچی، وە عەلی خوا لێی ڕازی بێت تۆڵەی سەندووە لەسەر لێدانی سێ قامچی، وە شورەیح تۆڵەی سەندووە لەسەر قامچی و ڕوشاندن[2].

بەڵام زۆر لە زانایانی وڵاتەکان پێچەوانەی ئەوەن و ووتویانە: تۆڵەسەندن لەسەر ئەوانە مەشروع نی‌یە چونکە یەکسان بوون تێیاندا گرانە.

وە کاتێك تۆڵە پێویست نەبوو لەسەر ئەوانە، تەمێ‌و سەرزەنش کردن پێویستە.

---

(١) أحمد (٤/٣٨٨) وأبوداود )٣٦٢٨) و النسائي (٧/٣١٦-٣١٧) وابن ماجه (٢٤٢٧) والبخاري تعليقاً (٥/٦١).

(٢) البخاري (٦٨٦).

شێخی ئیسلام ئیبنوتەیمیەیە ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت ڕای یەکەم تەئکید ئەکات و ئەڵێت: بەڵام ئەوەی ئەڵێت یەکسان کردنیان زۆر گرانە. پێی ئەوتری: هەر ئەبێت ئەم تاوانانە سزایان لەسەر بێت: جا یا تۆڵەیە یا تەمیکردن و تەعزیرە.

جا کاتێك ڕێ درا بە تەمیکردنێکی نارێك و پێك لە ڕەگەز و چەندێتیدا. ئەوە ئەگەر سزا بدرێت بە رێك و پێك ترو نزیکتر لە یەکسانیەوە ئەوە لەپێشترە و شیاوترە.

وە عەدالەت لە (قصاص) تۆڵەدا گرینگی هەیە بە پێی توانا.

وە ئاشکرایە ئەگەر لە لێدەر بدرێتەوە بەو شێوەیەی کە ئەو لەوکەسەی داوە یان نزیك لەوەوە، ئەوە لە دادپەروەریەوە نزیك ترە لە تەمی کردنی بە قامچی یا بە لێدان، وە ئەو کەسەی ڕێ لە تۆڵەسەندن ئەگرێت -لە ترسی ستەم- ستەمی لەوە گەورەوتر ڕەوا ئەکات کە خۆی ڕای کردووە لێی، جا لەوەوە ئەزانرێ کە ئەوەی سوننەت هێناویەتی دادپەروەرانەترو چاکترە -تەواو-

**تۆڵەسەندن لەسەر لەناوبردنی ماڵ:**

ئەگەر کەسێك ماڵی کەسێکی تری لەناوبرد. وەك ئەوەی دارەکانی ببڕێت، یا کشتوکاڵەکەی لەناوبەرێت، یا خانووەکەی بڕوخێنێ، یا جلەکانی بسووتێنێ؛ ئایا خاوەنەکەی بۆی هەیە تۆڵەی لێبکاتەوە و ئەو چی لێکردووە بیکات؟

زانایان لەسەر ئەوە دوو ڕایان هەیە:

١- یەکێك لەو ڕایانە ئەوەیە تۆڵەسەندنەوە لەوانەدا مەشروع نیيە، چونکە تێك دانە لە لایەکەوە، وە لەبەرئەوەی خانوو جل و بەرگ وەك یەك نین لە لایەکی ترەوە.

٢- وە ڕاکەی تریان ئەوەیە کە تۆڵەسەندنەوە لەوانەشدا شتێکی شەرعیيە، چونکە تۆڵە لە گیان و ئەندامانی لەشدا دروستە، جا بێگومان گیان و ئەندامانی لەش بەنرخ ترن لە سامان و ماڵ، جا ئەگەر ئەوانە تۆڵە سەندنەوە لەسەریان دروست بێت، سامان و ماڵ -کە لەوانە نرخی کەمترە- لەپێشترە.

لەبەر ئەوە دروستە بۆمان سامان و ماڵی بێباوەڕانی جەنگی تێك بدەین، ئەگەر ئەوان ئەوەیان کرد، وەك بڕینی داری بەردار، هەرچەندە قەدەغەکراوە لە لایەن هەندێکەوە لەبەر پێویستی نەبێت.

وە ئیبنو قەیم ئەم ڕایەی پارسەنگ داوەتەوەو وتویەتی: لەناوبردنی ماڵ، ئەگەر ئەو شتە حورمەت و ڕێزی هەبێت، وەکو ئاژەڵ و بەردە، ئەوە لەناو بردنیان دروست نیيە لە بەرامبەر لەناو بردنی ئەوان بۆ ئەو شتانە. بەڵام ئەگەر حورمەت و ڕێزیان نەبوو، وەك جلوبەرگ کە بدڕێنرێت، یا

قاپ و قاچاخ کە بشکێنرێن. ئەوەی بە ناوبانگ بێت ئەوەیە کە بۆ کەس نییە چی لەناوبراوە لەناوی بەرێتەوە بەڵکو ئەبێ نرخەکەیان یا وێنەی ئەوان وەربگرێتەوە.

بەڵام قیاس وا پێویست ئەکات کە بۆی هەیە چی لە ماڵەکەی کراوە ئەویش ئاوها لە ماڵی ئەوکەسە بکاتەوە کە تاوانەکەی کردووە، جا جلو بەرگی بدڕێنێ وەك ئەو دڕاندویەتی، وە داردەستی بشکێنێ وەك ئەو شکاندویەتی، ئەگەر یەکسان بوون لە نرخدا، ئەمەش لە دادپەروەرییەوەیە.

وە ئەوانەی قەدەغەی ئەو تۆڵەسەندنەوانە ئەکەن نە دەقێکیان لە قورئان و حەدیس بە دەستەوەیە نە قیاس و نە ئیجماع.

چونکە ئەوە حەرام نییە لەبەر بوونی مافی خوا، وە حورمەتی ماڵ گەورەتر نییە لە حورمەتی گیان و ئەندامەکانی گیان.

جا ئەگەر یاسادانەری ئیسلام ڕێگەی دابێت کە ئەندامی مرۆڤێك لەناو ببرێت لە تۆڵەی ئەوەی کە لەناوی بردووە، ئەوە ڕێگە پێدانی بۆ لەناوبردنی ماڵێك لە جیاتی ماڵێك لە پێش ترە.

وە بەڕاستی حیکمەتی تۆڵە لە چاکبوونەوەی ڕق و کینەی ناو دڵ و لابردنی بەوە نەبێت بەجێ نایەت.

چونکە جاری وا هەیە مەبەستی کەسێك لە دڕاندنی جل و بەرگی کەسێکدا ئازاردانی ئەبێت، ئیتر نرخەکەشی ئەداتێ و بەلایەوە گرنگ نییە، چونکە دەسەڵاتی هەیە و توانای ماڵی زۆرە، جا بەوە داخی دڵی خۆی پێ ئەڕێژێ، بەڵام تاوان لێکراو بەداخ و ڕقەکەیەوە ئەمێنێتەوە.

ئیتر چۆن بە پێدانی نرخی شتەکەی ڕق و کینەی دڵی لائەچێت و بە تۆڵەی خۆی ئەگات و تاوانباریش ئەوە ئەچەژێ کە ئەم چەشتویەتی.

پاشان حیکمەتی ئەم یاسای ئیسلامە تەواو بەرزە و پێوانەکردنی هەردوکیان بەوە ڕازی نین.

وە خوای گەورە کە ئەفەرموێت: ﴿فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾(البقرة: من الآية١٩٤).

واتە: دەست درێژی بکەنە سەریان وەك ئەو دەست درێژییەی ئەوان کردویانەتە سەرتان.

وە هەروەها ﴿وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا﴾ (الشورى: من الآية٤٠).

واتە: وە جەزای خراپە خراپەیەکی وەك خۆیەتی.

وە هەروەها: ﴿وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ﴾ (النحل: من الآية١٢٦).

واتە: ئەگەر ویستتان تۆڵە بسەننەوە لەو کەسانەی کە دەست درێژیـیان کردۆتە سەرتان، با تۆڵەکەتان زیاتر نەبێت لەدەست درێژییەکەی ئەوان.

زانایان بە دروستیان داناوە سوتاندنی دەغڵ و دانی بێباوەڕان و بڕینەوەی درەختەکانیان ئەگەر ئەوان ئەوەیان کرد. ئەمەش وەك ئەوەی پێشوو وایە.

وە خوای گەورە ڕێگای دا صەحابەکان دارخورماکانی جولەکەکان بڕنەوە، چونکە سەرشۆڕی تێدابوو بۆیان. ئەوەش بەڵگەیە کە خوای گەورە سەرشۆڕکردنی تاوانباری ستەمکاری پێ خۆشە و بە یاسای ئیسلامی دائەنێت، وە ئەگەر دروست بێت کەلوپەلی ئەو کەسە بسوتێنرێت کە دزی لە غەنیمە کردووە لەبەرئەوەی دەست درێژی کردووە بۆ سەر ماڵی موسڵمانان و خیانەتی لە بەشێکی غەنیمە کردووە، ئەوە سوتاندنی کەلوپەلی لەکاتێکدا کە کەلوپەلی موسڵمانێکی بێتاوانی سوتاندبێت لەپێشترو شیاوترە.

وە ئەگەر لە یاسای ئیسلامدا سزا ماڵییەکان دانرابێت لەبەربوونی مافی خوایی کە چاوپۆشی و لێبوردنی بۆ مافەکەی زۆرترە لە وەرگرتنەوەی، ئەوە دانانی لەبەر مافی بەندەی پیسکە لەپێشترو شایانترە.

وە لەبەر ئەوەی خوای پاك و بێگەرد تۆڵەی داناوە بۆ تەمێ کردنی دەروونەکان لە دەست درێژی، وە ئەشکرا کە نرخی ئەو شتانەی پێویست بکردایە بۆ تۆڵە سەندنەوەی ستەمی تاوان لێ کراو، بەڵام ئەوەی کە داینراوە تەواوتر و گونجاوترە بۆ بەندەکانی، وە چاکترە بۆ سارێژکردنی ڕق و تورەیی تاوان لێ کراو، وە پارێزەرترە بۆ گیان و ئەندامەکانی،

ئەگینا هەر کەسێك بەرامبەر کەسێکی تر شتێکی لە دەرووندا بوایە. - لە کوشتنی یا بڕینی ئەندامێکی --ئەنجامی ئەداو (دیە) خوێنەکەی ئەدا وە ژیری و بەزەیی و بەرژەوەندی بەوە ڕازی نی یە.

وە هەر هەمان شتە کە لەدەست درێژی کردن بۆ سەر ماڵیشا هەیە. جا ئەگەر ووترا: ئەو زیان و ڕق و کینەیە چاك نەبێتەوەو سارێژ نەبێ بەوەی کە ماڵی پێ بدا.

ئەوتری: ئەوە کاتێك ئەبێت کە تاوان لێکراوەکە خۆی ڕازی بێت بەوکارە، وەك ئەوەی لە جیاتی ئەندامێکی لەشی خوێن بایی وەربگرێت، ئەوەش قیاسێکی پەتییە.

هەردوو ئەحمەد (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئەحمەدی کوڕی تەیمیە) بەو شێوەیە گفتیان داوە.

لە ڕیوایەتی موسای کوڕی سەعیدا فەرمویەتی:

خاوەن شت ئارەزوی خۆیەتی: یا جلی کابرا ئەدڕێنێتەوە، یا وێنەی ئەو وەرئەگرێتەوە -تەواو-

**(ضمان) دانەوە وەك خۆی:**

زانایان هەموو لەسەر ئەوە رێك کەوتون ئەگەر کەسێك خواردەمەنی یا خواردنەوە یا شتی کێشراوی کەسێکی بەکارهێنا یا لەناوی برد، ئەوە زامن ئەبێ وە ئەبێ ئەو شتەی وەك خۆی بۆ پەیدا بکاتەوەو بیداتەوە.

عائیشە خوا لێی رازی بێت فەرمویەتی: کەسم نەدیوە وەك صەفییەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ چاك خواردنی دروست کردبێت، جارێکیان خواردنێکی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دروست کردو بۆی نارد؛ منیش لە رقاندا قاپەکەیم شکاند. لە پاشاندا وتم: ئەی نێرراوی خوا کەفارەتی ئەو کارەم چییە؟ فەرمووی: قاپێك وەك قاپەکەی خۆی وە خواردنێك وەك خواردنەکەی. ئەبو داود گێراویەتییەوە[1].

بەڵام زانایان جیاوازییان هەیە لەوەدا ئەگەر ئەو شتەی بەکارهات، یا لە ناوبرا، لەوانە بوو کە نەئەپێورا یا کێشانە نەئەکرا.

حەنەفییەکان و شافیعییەکان بۆ ئەوە چوون: ئەو کەسەی ئەوانەش بەکار بهێنێ یا لە ناویان بەرێت، ئەبێ شتێکی وەك خۆی بۆ خاوەنەکەی پەیدا بکاتەوە، وە نابێت نرخەکەی بدرێتەوە لە کاتێکدا نەبێت کە وەك خۆی دەست نەکەوێتەوە، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێت: ﴿فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾ (البقرة: من الآية١٩٤).

واتە: هەرکەس دەست درێژییەکی کردە سەرتان، سزایەکی بدەن کە وەك تاوانەکەی خۆی وابێت.

وە ئەوەش لە هەموو شتێکدا گشتییە، وە حەدیسەکەی عائیشەش پشتگیری ئەکات کە لە پێشەوە باسکرا.

مالیکییەکان بۆ ئەوە چوون کە زامنی نرخەکەی ئەبێت، نەك کەلوپەلەکە وەك خۆی پەیدا بکاتەوە.

## دەست درێژی کردن بە بریندارکردن یا ماڵ لێسەندن

ئەگەر کەسێك دەست درێژی کردەسەر کەسێك و بریندار کرد یا ماڵی لێسەند. ئایا بۆ دەست درێژی لێکراو هەیە هەقی خۆی بسەنێت ئەگەر کەوتەوە بەردەستی؟

زانایان لەم بارەیەوە رای زۆریان هەیە. وە (قرطبي) دروستی ئەو کارەی پێش خستووە و وتویەتی:

---

(١) أحمد (٦/١٤٨) وأبوداود (٣٥٦٨) والنسائي (٧/٧١).

ئەوەی ڕاست بێت ئەو کارە دروستە، هەرکاتێك خاوەن ماف گەیشتەوە بە مافی خۆی، بە مەرجێك کابرا بە دز دانەنرێت. ئەمەش مەزهەبی شافیعیيە، هەروەها داودی لە مالیکەوە ئەو بۆچوونەی گێڕاوەتەوە.

وە ئیبنو مونذیریش بەوەگفتی داوە. وە ئیبنوعەرەبی هەڵی بژاردووە، وە ڕای وابووە کە ئەو کارە خیانەت نيیە. بەڵکو گەیشتن بە مافە.

وە پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت: (أنصر أخاك ظالماً أو مظلوماً)[1].

واتە: دەستی براکەت بگرە و یارمەتی بدە ستەمکار بێت یا ستەم لێکراو.

وە ماف سەندن لە ستەمکار دەست گرتن و یارمەتی دانیەتی.

وە پێغەمبەر (ﷺ) بە هیندی کچی عوتبەی ژنی ئەبی سوفیانی فەرموو: کاتێك ئەو پێی ووت: ئەبو سوفیان پیاوێکی ڕەزیلە ئەوەندەمان ناداتێ بەشی خۆم و منداڵەکانم بکات، مەگەر بە دزیيەوە بەشی خۆمان هەڵگرین و ئەو ئاگای لێ نەبێ، ئایا گوناهبار ئەبم لەسەری؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (خذي ما يكفيك و يكفي ولدك بالمعروف)[2].

واتە: بەشی خۆت و منداڵەکەت ببە ئەوەندەی کە باوەو بەشتان ئەکات.

پێغەمبەر (ﷺ) بۆی بە ڕەوا دانا لە ماڵەکەی ببات، بەڵام تەنها ئەوەندەی کە پێویستیێتی. ئەمانە هەموو چەسپاوە لە صەحیح دا.

وە فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێ: ﴿فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾ (البقرة: من الآية١٩٤).

واتە: هەرکەس دەست درێژی کردە سەرتان ئێوەش وەك ئەو دەست درێژيیە دەست درێژی بکەنە سەری. کێشەکان دەبڕێ.

وتویەتی: وە زانایان جیاوازیيان هەیە لەوەدا ئەگەر ئەو کەسە ماڵێکی کەوتەوە بەردەست کە لە جۆری ماڵەکەی خۆی نەبوو.

ئەڵێن: بە حوکمی حاکم نەبێت نابێت ئەو ماڵە بباتەوە.

---

(١) أحمد (٣/٢٠١) والبخاري (٢٤٤٣) والترمذي (٢٢٥٥).

(٢) البخاري (٥٣٦٤) ومسلم (١٧١٤/٧).

وە ئیمامی شافیعی لەو بارەیەوە دوو گفتی هەیە: ڕاست ترینیان ئەوەیە کە قیاسی ئەکات بەو ماڵەی کە لە جۆری ماڵەکەی خۆی بێت، چۆن بۆی هەیە بیباتەوە بەو شێوەیەش ئەو ماڵەی لە جۆری ماڵەکەی خۆی نیەیە ئەیباتەوە.

گفتی دووەمی ئەوەیە نابێ بیباتەوە، چونکە لە جۆری ماڵەکەی خۆی نیەیە، وە لە زانایان هەیە کە ئەڵێن: ئەبێ نرخی ماڵەکەی خۆی بزانێت و ئەو مەبلەغە وەربگرێتەوە، ئەمەش ڕاستترینیانە بەپێی ئەو بەڵگانەی ڕوغان کردنەوە. -تەواو-

**تۆڵە سەندنەوە لە حاکم**

حاکمیش یەکێکە لە ئەندامی ئەو کۆمەڵەی تێیدا ئەژی، و لە کەس جیاناکرێتەوە مەگەر کاتێك کە وەك وەصی و وەکیل لە کەسانی تر جیا بکرێتەوە.

لەبەرئەوە هەرچی حوکمی شەرعی هەیە وەك هەموو ئەندامەکانی تر بەسەریا جێبەجێ ئەکرێت.

جا ئەگەر هاتوو دەست درێژی کردە سەر کەسێك لە ئەندامی کۆمەڵەکە، تۆڵەی لێئەسەندرێتەوە؛ چونکە جیاوازی نیەیە لە نێوان ئەوو کەسانی تردا لە شەرعی خوادا. چونکە حوکمەکانی خوا گشتێن و هەموو موسڵمانان ئەگرنەوە، لە ئەبی ئەضرەوە لە ئەبی فیراسەوە کە ووتویەتی: عومەری کوڕی خەطاب خوا لێی ڕازی بێت ڕۆژێك ووتاری بۆ ئەداین و فەرمووی:

ئەی خەڵکینە سوێند بە خوا من کاربەدەست نانێرم بۆ سەرتان تاوەکو لێتان بدات و ماڵەکانتان بەرێت، بەڵکو بۆیە ئەیان نێرم کە فێری ئاینەکەتان و ڕەفتاری پێغەمبەرەکەتان بکات، جا هەرکەس لە لایەن ئەو کاربەدەستانەوە شتێکی تری پێ کرا، پێم ڕابگەیەنن، بەو زاتەی گیانی عومەری بە دەستە تۆڵەی لێ ئەکەمەوە.

عەمری کوڕی عاص خوای لێ ڕازی بێت ووتی: ئەگەر کەسێك هەندێ لە ژێردەستەکانی تەمێ کرد، ئایا تۆڵەی لێئەکەیتەوە؟

فەرمووی: بەڵێ بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە، تۆڵەی لێئەکەمەوە. چۆن تۆڵەی لێناکەمەوە پێغەمبەرم بینیوە (ﷺ) تۆڵەی لە خۆی ئەسەند. ئەبو داودو نەسائی ڕیوایەتیان کردووە[1].

وە نەسائی و ئەبو داود لە حەدیسی ئەبی سەعیدی کوڕی خودرییەوە گێڕاویانەتەوە کە ووتویەتی: جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) شتی بەش ئەکرد لە نێوانماندا، کابرایەك لەوکاتەدا هاتە

(١) أبوداود (٤٥٣٧) والنسائي (٤٧٨١).

پێشەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) پێغەمبەریش (ﷺ) دارەکەی دەستی کرد بە ورگیدا، کابراش هاواری لێ بەرزبووەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (تعال فاستَقِدْ).

واتە: وەرە تۆڵەم لێبکەرەوە.

کابرا ووتی: لێت خۆش بووم ئەی نێرراوی خوا[1].

وە لە ئەبوبەکری صدیقەوە خوا لێی ڕازی بێت کە کابرایەك هاتە لای ووتی: کە کاربەدەستێك دەستی بڕیوم. ئەویش پێی فەرموو: ئەگەر ڕاست بکەی تۆڵەی تۆی لێئەسەنمەوە.

وە شافیعی لە ڕیوایەتی ڕەبیعدا ووتویەتی: وە ئەگێڕنەوە لە حەدیسی عومەردا خوا لێی ڕازی بێت کە فەرمویەتی: پێغەمبەرم (ﷺ) بینیوە ڕێی تۆڵەسەندنەوەی لە خۆی داوە، وە ئەبوبەکر هەروەها، وە منیش ڕێی تۆڵەسەندنەوە لە خۆم ئەدەم.

**ئایا ئەگەر پیاو ژنەکەی بە شتێك بریندار بکات تۆڵەی لێ ئەکرێتەوە:**

ئیبنو شیهاب ووتویەتی: سوننەت وا ڕۆیشتووە ئەگەر پیاوێك ژنی خۆی بریندار بکات، تۆڵەی لێ ناکرێتەوە بەڵکو خوێن بایی لێ ئەسەندرێت.

مالیك ئەوەی لێکداتەوەو ووتویەتی:

ئەگەر پیاوێك چاوی ژنەکەی خۆی کوێر کرد، یا دەستی شکاند، یا پەنجەی قرتاند، یا وێنەی ئەوانە، ئەوە تۆڵەی لێئەکرێتەوە ئەگەر قەستی بوو، بەڵام ئەگەر پیاوێك بە گوریسێك یا قامچییەك لە ژنەکەی بدات و توشی شتێکی بکات کەنەیویستبێ و قەستی نەبووبێت. ئەوکاتە خوێن باییەکەی لێ ئەسەندرێت و تۆڵەی لێناکرێتەوە.

لە (المسوی)دا ووتویەتی: زانایانی ئایین هەموو بەو شێوەیە لێکی ئەدەنەوە.

**هەتا برینەکان چاك نەبنەوە تۆڵە ناکرێتەوە:**

هەتا بریندار تەواو چاك نەبێتەوە لە برینەکانی کە توشی بووە، تاوانبار تۆڵەی لێ ناکرێتەوە، وە ئەبێ کارێك بکرێت برینەکە شوێنی تری نەگرێتەوە، جا ئەگەر شوێنی تریشی گرتەوە لە لەشی بریندارەکە لەسەر تاوانبارەکەیەو تاوانبار زامن دەبێ.

---

(١) أبوداود (٤٥٣٦) والنسائي (٤٧٧٧).

وە لە کاتی سەرماو گەرمای توندا تۆڵە لە کەس ناکرێتەوە، بەڵکو ئەبێ دوا بخرێ تەك ئەوەی تۆڵەکەی لێئەکرێتەوە بەو هۆیانەوە بمرێت، جا ئەگەر لە گەرماو سەرمادا یا بە تامێرێکی کول یا ژاراوی تۆڵەسەندراوە، ئەبێ خوێن بایی بدرێت بە تۆڵە لێسەندراوەکە ئەگەر تیاچوو.

لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکییەوە لە باپیرەیەوە کە وتویەتی:

پیاوێك کەڵەشاخێکی کردبوو بە ئەژنۆی پیاوێکی تردا، هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) ووتی: ئەی نێرراوی خوا تۆڵەم بۆ بکەرەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئێستا نابێ با چاك بیتەوە، لەپاشاندا هاتەوە لای ووتی: تۆڵەم بۆ بکەرەوە، پێغەمبەریش تۆڵەی لە کابرا بۆ کردەوە. پاش ماوەیەك کابرای کە تۆڵەکەی بۆ کرایەوە هاتەوە لای پێغەمبەر (ﷺ) ووتی: ئەی نێرراوی خوا شەل بوم، ئەویش ﷺ فەرمووی: پێم وتی و سەرپێچیت کرد، ئیتر خوا دووری خستیتەوە و هەقی شەلیەکەشت پوچەڵ بۆتەوە.

لەپاشاندا پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی کرد تۆڵە لەکەس بکرێتەوە هەتا برینداره‌کە چاك ئەبێتەوە لە برینەکەی. ئەحمەد و دارەقوطنی گێڕاویانەتەوە[1].

شافیعی وا لەوە تێ گەیشتووە کە چاوەڕوان کردن پەسەندە؛ چونکە پێغەمبەر (ﷺ) توانای تۆڵەسەندنی هەبووە پێش چاك بوونەوە.

بەڵام زانایانی تر جگە لە شافیعی بۆ ئەوە چوون کە چاوەڕوان کردنی چاك بوونەوە پێویستە، وەئەو تۆڵەیەی کە بۆ کابرای کردەوە پێش ئەوە بووە کە سەرئەنجامی خراپی ئەو کارە بزانێت.

جا ئەگەر تاوانبارێك بە قەستی پەنجەی کەسێکی قرتاند، وە پەنجە قرتاوەکە لە تاوانبار خۆش بوو، لە پاشاندا برینەکەی دەستی گرتەوە یا بەو برینە مرد، ئەوە ئەگەر لەسەر هیچ لێی بورابوو تەنینەوەکەش هەر لێ بوراوە، بەڵام ئەگەر لەسەر ماڵ بوو، ئەبێ هەقی تەنینەوەکەش بدات بەوە کە تاوانبار بە ئەندازەی پەنجە قرتاوەکەی بۆ دەرئەکرێت و ماڵی لێ ناسەندرێت و ئەوەشی کە ماوەتەوە ئەبێ بیدات بە تاوان لێ کراوەکە.

(١) أحمد (٢/٢١٧) والدارقطني (٣/٨٨).

**مردنی تۆڵە لێکراوە:**

ئەگەر تۆڵە لێکراوە بەهۆی برینەکەیەوە مرد -برینی (قصاص) تۆڵەکە- زانایان لەم کێشەیەدا بۆچونیان جیاوازە.

جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون: کە ئەو کەسەی تۆڵەی سەندوە هیچی لەسەر نییە؛ چونکە دەست درێژی نەکردووە. وە لەبەرئەوەی ئەگەر دز بمرێ بەهۆی دەست برینەکەی هیچ لەسەر ئەو کەسە نابێت کە دەستی بڕیوە بە ئیجماع. وە ئەمەش وەك ئەوە وایە.

ئەبو حەنیفە و ثەوری و ئیبنو ئەبی لەیلا ووتویانە:

ئەگەر تۆڵە لێسەندراو مرد بەو برینە خوێنی ئەکەوێتە سەر کەس و کاری ئەو کەسەی تۆڵەکەی سەندەوە، و ئەبێ خوێن بایی یەکەی بدەن چونکە کوشتنی هەڵەیە.

## خوێن بایی (الدية)

**پێناسەکەی:**

خوێن بایی ئەو ماڵەیە کە پێویست ئەبێت بەهۆی تاوانەوە، وە ئەدرێت بە تاوان لێ کراو یا بە کەس و کاری.

وە خوێن بایی هەموو ئەوانە ئەگرێتەوە کە تۆڵەیان تێدایە و هەروەها ئەوانەش کە تۆڵەیان تێدا نی یە.

وە لە زمانی عەرەبیدا (الدية) و (العقل) ی پێ ئەوترێ.

وە بنەمای ووشەی (العقل) لەوەوە هاتووە کە ئەگەر کەسێك کەسێکی بکوشتایە ووشتری کۆئەکردەوە بۆ خوێن بایی یەکەی و ئەژنۆی هەموویانی ئەبەستەوە لە سێبەری ماڵی کوژراوەکەدا بە (عقال) پێوەند، بۆ ئەوەی دوایی بیدات بە خاوەن خوێن. وە یاسای خوێن بایی لای عەرەبەکانی سەردەمی نەفامی باو بووەو کاتێ ئیسلام هات هێشتی یەوە.

وە بنەمای ئەوەش لە ئیسلامدا فەرموودەی خوای گەورەیە کە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَنْ يَقْتُلَ مُؤْمِناً إِلَّا خَطَأً وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِناً خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ إِلَّا أَنْ يَصَّدَّقُوا فَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ عَدُوٍّ لَكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ وَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثَاقٌ فَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِنَ اللَّهِ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيماً حَكِيماً﴾ (النساء:٩٢).

واتە: بۆ هیچ باوەڕدارێك نییە باوەڕدار بکوژێت مەگەر بەهەڵە ئەوە ڕوبدات. جا هەرکەس باوەڕدارێکی بە هەڵە کوشت ئەبێت کۆیلەیەکی باوەڕدار ئازاد بکات، و خوێن بایییەکشی بدات بە کەس و کاری، مەگەر کەس و کاری کوژراوەکە لە ڕێی خوادا لێی خۆش بن. جا ئەگەر کوژراوەکە لە کۆمەڵێکی بێباوەڕ بوو بەڵام خۆی باوەڕدار بوو ئەبێ بکوژەکە کۆیلەیەکی باوەڕدار ئازاد بکات، بەڵام ئەگەر لە کۆمەڵێك بوو کە لە نێوان موسڵمانان و ئەواندا پەیمان هەبوو؛ ئەبێ خوێن باییەکەی بدات بە کەسوکاری و کۆیلەیەکی باوەڕدار ئازادبکات، جا هەرکەس دەسەڵاتی نەبوو بەندەکە ئازادبکات ئەبێت دوو مانگ لەسەر یەك بەڕۆژو بێت، ئەوەش گەڕانەوەیەکە بۆ لای خواو پەشیمان بونەوەیە لە تاوان، وە خوا زانایە بەڕاستی کاروباری بەندەکانی و کاردروستە لەوەدا کە بۆی داناون.

ئەبوداود ئەگێڕێتەوە لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکییەوە لە باپیرییەوە کە ووتویەتی: نرخی خوێنی ئادەمیزاد لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) هەشت سەد دینار بوو یا هەشت هەزار درهەم. وە خوێنی پیاوێکی خاوەن کتێب ئەو کاتە نیوەی خوێنی موسڵمانێك بوو.

ووتویەتی: بەو شێوەیە مارەتەوە هەتا عومەری کوڕی خەطاب خوای لێ ڕازی بێت بو بە جێنشین. ووتارێکی داو فەرمووی:

وەك ئەزانن ووشتر نرخی گران بووە. ئیتر عومەر خوێن بایی لەسەر ئەوانەی بە زێڕ مامەڵەیان ئەکرد کرد بە هەزار دینار، وە لەسەر ئەوانەی مامەڵەیان بە زیو ئەکرد کردی بە دوانزە هەزار درهەم.

وە لەسەر ئەوانەی ڕەشە ووڵاغیان ئەدا دووسەد مانگا، وە لەسەر ئەوانەی مەڕیان ئەدا دوو هەزار مەڕ، وە لەسەر ئەوانەی جلوبەرگیان ئەدا دوو سەد پارچەی دوو بەرگی.

شافیعی ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت لە میسر ووتویەتی: ئەوانەی کە بە ئاڵتون یا بە زیو مامەڵە ئەکەن ئەبێ نرخی ووشترەکان بدەن، جا هەرچەندە نرخەکەشیان بەرز بێت.

وە ئەوەی ڕاست بێت ئەوەیە بە هیچ ڕێگایەکی بێ گومان نەچەسپاوە کە پێغەمبەر (ﷺ) لە ووشتر زیاتر نرخی خوێنی دانابێت، وە عومەر بەوکارەی لە جنسی شتەکەی زیاد کردووە بە هۆی ئەوەوە کە سەردەمی ئەو ئەوەی پێویست بوو.

**حیکمەتی خوێن بایی:**

مەبەست لە پێویست بوونی خوێن بایی تەمێ‌کردن و دورخستنەوەی خەڵکە لە تاوانی کوشتن و پارێزگاری کردنی ژیانی ئادەمیزادە.

هەر بۆیە ئەبێ بە شێوەیەك بێت کە خوێن بایی‌دەرەکان توشی ڕەنج کێشان و ناخۆشیەیەکی قورس و گران بێن لە بەجێ هێنانیا، وە ئەو ئەرك و ئازارەش ناكێشن هەتا سامانێکی زۆر نەخرێتە سەریان کە تەنگیان پێ هەڵبچنێ‌و تووشی تەنگانەو نەبوونی بێن پێی و بیدەن بەو کەسەی تاوانەکەی دەرحەق کراوە یان بە وەرەسەو کەسوکاری. کەواتە (دیة) خوێن بایی جەزایە کە هەم سزاو هەم قەرەبو کردنەوە لە خۆیدا کۆئەکاتەوە.

**چەندێتی خوێن بایی:**

پێغەمبەر (ﷺ) خوێن بایی پێویست کردووەو نرخاندویەتی. جا نرخی خوێنی پیاوی موسڵمانی ئازادی داناوە بە سەد سەر ووشتر لەسەر ئەوانەی خاوەنی ووشتر بوون، وە دوو سەد سەر مانگا لەسەر ئەوانەی خاوەنی ڕەشە ووڵاغ بوون، وە دوو هەزار سەر مەڕ لەسەر ئەوانەی ئاژەڵدار بوون، وە هەزار دینار لەسەر خاوەن زێڕ، و دوانزە هەزار درهەم لەسەر خاوەن زیو، وە دووسەد دەست جلو بەرگ لەسەر خاوەن قوماش. جا ئەو کەسەی خوێن بایی لەسەرە هەرکام لەمانەی ئامادە کرد ئەبێ خاوەن خوێن وەری بگرێت، ئیتر خۆی خاوەنی ئەو جۆرە شتە بێت کە ئامادەی کردووە یان نا، چونکە ئەوەی لە بناغەدا لەسەری پێویست بووە هێنارێتی کەواتە ئەبێ لێی وەربگرێ.

**ئەو کوشتنەی خوێن بایی تێیدا پێویستە:**

وە ئەوەی زانایان لە نێوان خۆیاندا لەسەری ڕێك کەوتون ئەوەیە کە خوێن بایی لە کوشتنی هەڵەو هاوشێوەی قستیدا پێویست ئەبێت، هەروەها لە کوشتنی قستیدا ئەگەر لە کەسێکەوە ڕوویدات کە مەرجێك لە مەرجەکانی تەکلیفی تیا نەبێ، وەك منداڵ و شێت.

وە لەو قستە کوشتانەشدا کە حورمەتی کوژراوەکە کەم تر بێت لە حورمەتی بکوژەکە، وەك ئەوەی ئازادێك بەندەیەکی کوشتبێ.

وە هەروەها خوێن بایی پێوست ئەبێت لەسەر کەسێکی خەوتو کە بکەوێت بەسەر کەسێکی ترداو بیکوژێ، وە لەسەر ئەو کەسەی کە بکەوێتە خوارەوە بەسەر کەسێکدا بیکوژێت.

وە هەروەها پێویست ئەبێت لەسەر کەسێك چاڵێکی هەڵکەندبێت و کەسێکی تری بکەوێتە ناوو بمرێت، وە لەسەر کەسێك لە قەرەباڵغیدا بمرێت.

وە لەو بارەیەوە لە حەنەشی کوڕی موعتەمیرەوە هاتووە لە عەلیەوە خوا لێی ڕازی بێت کە فەرمویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) ناردمی بۆ یەمەن، کە چوینە یەمەن توشی کێشەی کۆمەڵێك بوین کە چاڵیان هەڵکەندبوو بۆ شێر، شێرەکەی تێکەوتبو ئەو کۆمەڵە چوبونە سەر چاڵەکەو قەرەباڵغییان لێ کردبوو، یەکێکیان ئەکەوێتە چاڵەکەو خۆی بە یەکێ لەوانەی ترەوە ئەگرێتەوە

ئەویش لەگەڵ خۆی ڕائەکێشێ، ئەویش یەکێکی تر ڕائەکێشێ لەگەڵ خۆی هەتا ئەبنە چوارکەس، شێرەکەش هەر چواریان بریندار ئەکات، کابرایەکی تر نێزەیەکی لێئەدات و ئەیکوژێت، بەڵام برینداره‌کان هەموویان بە برینەکانیان ئەمرن، کەسوکاری هەریەکیان پەلاماری کەس و کاری ئەوی تر ئەدات و چەك لە یەکتری ئەکێشن و خەریك ئەبێت کوشتار لەیەك بکەن، عەلی خوا لێی ڕازی بێت هاتە لایان لەو کاتەداو پێی فەرمون: ئەتانەوێ یەکتر بکوژن کە پێغەمبەر (ﷺ) هێشتا زیندووە. من ئەمە دادوەرو حوکمێکتان بۆ دائەنێم، جا ئەگەر پێی ڕازی بوون باشە، ئەگینا ڕێ لە هەندێکتان ئەگیرێ هەتا ئەچن بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) ئەو حوکمتان بۆ دەرئەکات و هەرکەس لەوە لابدات ئەوە مافی نابێت.

(لە هۆزی ئەو کەسانەی چاڵەکەیان هەڵکەندووە: چواریەکی خوێن بایی و، سێ‌یەکی و، نیوەیی و، خوێن بایی‌یەکی تەواو کۆبکەنەوە)

جا بۆ یەکەم کەس: چارەکە خوێن بایی‌یەکەی دانا چونکە ئەو لە سەرو سیانەکەوە لەناو چوبوو.

وە بۆ دووەم: سێ‌یەکەکە.

وە بۆ سێیەم: نیوەکە.

وە بۆ چوارەم: خوێن بایی‌یە تەواوەکەی دانا.

ئەوانیش ڕازی نەبوون ووتیان ئەچین بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە پاشاندا هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) لای مەقامی ئیبراهیم بوو. باسەکەیان بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەر (ﷺ) حوکمەکەی عەلی بە دروست دانا.

ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە، وە بە لەفزێکی تری وەك ئەوە گێڕاویەتی‌یەوە، بەڵام لەو لەفزەیاندا خوێن بایی‌یەکەی خستۆتە سەرئەوانەی قەرەباڵغی‌یەکەیان کردبوو[1].

وە لە عەلی کوڕی ڕەباحی لەخمی‌یەوە کە کابرایەکی کوێر لەکاتی حەجدا لە سەردەمی خیلافەتی عومەردا هۆنراوەی ئەوت و ئەی ووت:

يا أيها الناس لقيت منكراً     هل يعقل الأعمى الصحيحَ المبصرا

جرا معاً كلاهما تكسرا

ئەی خەڵکینە تووشی خراپە بووم     ئایا ئەبێت کوێر خوێن بایی چاوساغ بدات

(١) أحمد (١/٧٧) والبيهقي (٨/١١١) والبزار (١٥٣٢).

کە هەردوکیان بەیەکەوە کەوتبنە خوارەوەو تێك شکابن

ئەویش ئەوەیە کە کوڕێك چاوساغێك پەلی ئەگرێت و هەردوکیان ئەکەونە بیرێکەوەو کوڕەکە ئەکەوێ بەسەر چاوساغەکەداو ئەیکوژێت، جا عومەر خوا لێی ڕازی بێت خوێن بایی ئەخاتە سەر کوڕەکە. دارەقوطنی گێڕاویەتیەوە[1].

وە هاتووە کە کابرایەك شەوێك ئەچێتە ناو کۆمەڵێك ماڵەوە تینوی ئەبێت، داوای ئاویان لێئەکات ئەوانیش ئاوی نادەنێ هەتا ئەمرێت، عومەر خوا لێی ڕازی بێت خوێنەکەیان لێ ئەسەنێ. ئەحمەد گێڕاویەتیەوە لە ڕیوایەتی ئیبنو مەنصوردا و ووتویەتی: منیش بەو شێوەیە گفت ئەدەم[2].

وە هەرکەس لەپڕ نەڕاندی بەسەر کەسێکدا ئەویش بەهۆی ئەو نەڕەیەوە ڕاپەڕی و مرد، ئەبێ خوێنەکەی بدات. وەئەگەر کەسێك شێوەی خۆی گۆڕی و منداڵێکی ترساند و منداڵەکە شێت بوو. ئەبێ خوێنەکەی بدات.

خوێن بایی قورس و سوك:

خوێن بایی جاری وایە قورس ئەبێت وە جاری وایە سوك ئەبێت، خوێن بایی سوك لە کوشتنی بەهەڵەدا پێویست ئەبێ، وە خوێن بایی قورس لە کوشتنی وەك (عمد) قەست پێویست ئەبێت.

بەڵام خوێن بایی کوشتنی عەمد کاتێك خاوەن خوێن لە کوشتنەوەی خۆش بێت:

شافیعی و حەنبەلیەکان ڕایان وایە کە لەم شێوەیەشدا خوێن بایی قورس پێویست ئەبێت.

بەڵام ئەبوحەنیفە ڕای وایە لە کوشتنی قەستیدا خوێن بایی نیە. بەڵکو ئەوە پێویستە کە هەردوولا لەسەری ڕێك ئەکەون و ئەبێت دەستبەجێ بدرێت و دوا نەخرێ.

خوێن بایی قورس سەد سەر ووشترە، کە چلیان ئاوس بێت. بە پێی ئەوەی ئەحمەد و ئەبوداود و نسائی و ئیبنو ماجە لە عوقبەی کوڕی ئەوسەوە ئەگێڕنەوە لە پیاوێکی صەحابەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (ألا إن قتل خطأ العمد بالسوط، والعصا، والحجر فيه دية مغلظة: مائة من الإبل، منها أربعون من ثنية إلى بازل عامها، كلهن خلفة)[3].

---

(١) الدارقطني (٣/٩٨).

(٢) الدارقطني (٣/٩٨).

(٣) أحمد (١/٤٩و٣/٤١٠) وأبوداود (٤٥٤٧) والنسائي (٤٧٩٧) وابن ماجه (٢٦٢٨).

واتە: بزانن كوشتنی هاوشێوەی قەست بە قامچی، یا بە داردەست، یا بە بەرد خوێن باییەكەی قورسە: سەد سەر وشتر چلیان لە تەمەنی شەش ساڵییەوە هەتا نۆ ساڵی بن و هەموویان ئاوس بن.

قورسی خوێن بایی تەنها لە وشتردا ئیعتیباری بۆ ئەكرێت. چونكە یاسای ئیسلام بەو شێوەیە هاتووە، ئەوەش ڕاگیراوە (موقوف) و بە بیستن نەبێت كە ئیتر ڕێگا نامێنێ بۆ ڕاو فتوادان تێیدا، چونكە لەو شتانەیە دانراوەو بڕیاری لەسەر دراوە.

قورس كردنی خوێن بایی لە مانگە حەرامەكانداو لە شارە حەرامەكانداو وە لە تاوان كردندا بەرامبەر خزم و كەسی نزیك:

شافیعی و كەسانی تر ڕایان وایە: كەخوێن بایی قورس ئەكرێت لەسەر گیان و برینداركردن بەهۆی تاوان كردن لە شاری حەرامدا، وە لە مانگی حەرامدا، وەلە تاوان كردندا بەرامبەر خزم و كەسی پێ نەشیاو، چونكە شەرع ئەم حەرام كراوانەی بە گەورە داناوە، جا لەبەرئەوە خوێن بایی قورس ئەبێت بە گوێرەی گەورەیی تاوانەكە.

وە لە عومەرەوە ئەگێڕنەوە، وە هەروەها لە قاسمی كوڕی محمدەوە، وە لە ئیبنو شیهابەوە كە وتویانە: لە نرخی خوێن بایی ئەوەندەی سێ‌یەكێ زیاد ئەكرێت.

وە ئەبوحەنیفە و مالیك بۆ ئەوە چوون: كە خوێن بایی قورس ناكرێت بەو هۆیانەوە، چونكە بەڵگە نەهاتووە لەسەر قورس كردنیان، وە خوێن باییەكان لەسەر فەرمانی یاسادانەر ئەوەستێ. وە قورس كردنی لەو تاوانانەدا كە بە هەڵە ڕوی داوە دورە لە بنەمای شەرعەوە.

خوێن بایی لەسەر كێ پێویست ئەبێت:

ئەو خوێن باییەی كە پێویستە لەسەر بكوژ دوو جۆرە:

١- جۆرێكیان لە ماڵی تاوان بار[1] پێویست ئەبێت: ئەویش قەستەكوشتە كاتێ تۆڵەی كوشتنەوەی لە كۆڵ ئەكەوێت.

ئیبنوعەبباس وتویەتی: خوێن بایی لەسەر كەس و كاری بكوژ نییە لە كوشتنی قەستیدا، هەروەها لە حاڵەتی ئیعتیراف و دركاندندا، هەروەها لە حاڵەتی ڕێكەوتن لە كوشتنی قەستدا. وە كەسیش لە صەحابە پێچەوانەی ئەو وتەیەیان نەكردووە.

---

(١) پیاو بێت یا ژن.

وە مالیك لە ئیبن شیهابەوە ئەگێڕێتەوە کە ووتویەتی: سوننەت وا ڕۆیشتووە لە کوشتنی قەستیدا کاتێ خاوەن خوێن لێی خۆش ئەبن، ئەبێ خوێن باییەکە لە مالّی بکوژەکە بێت بە تەنها، مەگەر کەسوکاری بە ئارەزووی خۆیان بە دلّ یارمەتی بدەن.

وە بۆیە کەسو کاری بکوژ لەم سێ حالّەتەدا خوێن باییان لەسەر نییە:

واتە نە لە کوشتنی عەمددا، وە نە لە حالّەتی پێ لێنانا، وە نە لە حالّەتی ڕێکەوتنىدا، چونکە کوشتنی قەستی سزا پێویست ئەکات وە بکوژ شیاوی ئەوە نییە کە باری سوك بکرێت لە خوێن باییەکەی لە لایەن کەس و کارییەوە،

هەروەها ئیقرارِ کردن و پێ لێنانیش نایانگرێتەوە، چونکە خوێن بایی کە بە ئیقرارکردنەکە پێویست ئەبێت نەك بە خودی کوشتنەکە. وە ئیقرار بەلّگەیەکی (قاصر) واتە: تەنها دەرهەق بەو کەسەی ئیقرار ئەکات بەلّگەیە؛ کەواتە کەسوکاری ناگرێتەوە.

هەروەها ئیقرار بە صولّح و ڕێکەوتنیش نایان گرێتەوە، چونکە ئەو شتەی کە لە جیاتی ڕێکەوتنەکە دانراوە بە کوشتن پێویست نەبووە، بەلّکو بە پەیمانی صولّح پێویست بووە، وە لەبەر ئەوەی تاوانبار خۆی بەرپرسیارییەتی تاوانەکەی هەلّئەگرێت، وە بەدەل و بریتی لەناوچووەکە لەسەر ئەو کەسەیە کە لە ناوی بردووە.

٢- وە جۆرێکی تریان لەسەر بکوژ خۆیەتی، بەلاّم کەسوکاری بۆیان هەیە یارمەتی بدەن، ئەگەر کەسوکاری هەبوو لە خوێندا یارمەتی یەکیان ئەدا. ئەویش لە کوشتنی هاوشێوەی قەستداو کوشتنی بەهەلّەدایە[1].

وە بکوژیش یەکێکە لە ئەندامانی ئەو خێزانە و بۆخۆی بکوژە ئیتر مانای نییە دەربکرێت.

شافیعی ووتویەتی: بکوژ هیچی لەسەر پێویست نابێت لە خوێن باییەکە چونکەبەهانەی هەیە.

وە ئەو کەسوکارانەی خوێن باییان ئەکەوێتە سەر، کەسە نێرینە نزیکەکانییەتی -لە باوکەوە- کە پێ گەیشتوو ژیرو دەولّەمەند بن، وە کوێر و نەخۆش و پیرەکانیشیان ئەگرێتەوە ئەگەر دەولّەمەند بن.

---

(١) هەروەها کوشتنی عەمد لە منداڵ و شێتەوە ڕوبدات خوێن باییەکەی لەسەر کەس و کاریانە، قەتادەو ئەبو ثەورو ئیبنو ئەبی لەیلاو ئیبنو شیبرمە وتویانە: خوێن بایی کوشتنی هاوشێوەی عەمدیش هەر لە مالّی تاوانبارەکە ئەدرێ. وە ئەم ڕایە لاوازە.

وە خوێن بایی ژن و هەژار و منداڵ و شێت و ئەوەیان کە لەسەر ئاینی تاوانبار نییە ناگرێتەوە. چونکە ئەو کارە لەسەر یارمەتی دانراوە، ئەوانەش ئەهلی ئەوە نین کە یارمەتی بدەن.

وە بنەمای پێوست بوونی خوێن بایی لەسەر کەوس و کاری تاوانبار ئەوەیە: چەسپاوە کە دوو ژن لە بەنی هوزەیل شەڕیان ئەبێت یەکێکیان بەردێك ئەگرێتە ئەوی تریان خۆی و منداڵەکەی ناو سکیشی ئەکوژێ، جا پێغەمبەر (ﷺ) خوێن بایی ئەو ژنەی لەسەر کەسوکاری ژنە بکوژەکە دانا. بوخاری و موسلیم لە حەدیسی ئەبی هورەیرەوە گێڕاویانەتەوە[1].

وە لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) ئەوانەی ئەبوایە خوێن باییەیان بدایە هۆزی تاوانبارەکە بوو، بەو شێوەیە مایەوە هەتا سەردەمی عومەر هات، کاتێ سوپای ڕێك خست و دەفتەری تۆماری دانا کەسو کار (عاقلة)ی دانا کە ئەبێت لەوانە بن کە شیاوی ئەوە بن لەو دەفتەرەدا بنوسرێن، بە پێچەوانەی ئەو شێوەیەی لە سەردەمی پێغەمبەردا بوو (ﷺ).

سەرەخسی وەڵامی ئەوەی داوەتەوە کە عومەر داینا وە، ووتویەتی: ئەگەر وترا: چۆن ئەبێت بۆ صەحابە هەموویان لەسەر ئەوە ئیجماع بکەن کە پێچەوانەی ئەوە بێت کە پێغەمبەر (ﷺ) دایناوە؟

ئێمەش ئەڵێین: ئەوە ئیجماعێکە موافق و ڕێکە لەگەڵ ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) دایناوە، چونکە ئەیان زانی ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) دایناوە لەسەر هۆزەکە بە ئیعتیبارو ڕەچاوکردنی یارمەتیو پشتیوانییە، لەبەر ئەوەی ئەو کاتە یارمەتی و توانا بە هۆزەوە بوو.

بەڵام کاتێك عومەر ڕەزای خوای لێ بێت دەفتەری تۆماری دانا توانا و یارمەتی لەو کەسانەوە بووە کە لەو تۆمارەدا نوسرابوون، چونکە خەڵك وای لێهات دژی هۆزەکەی ئەجەنگا لەسەر لەشکرو دەفتەرەکەی. -تەواو-

هەرچەندە حەنەفییەکان بەوە ڕازی بوون، بەڵام مالیکییەکان و شافیعییەکان وەریان نەگرتووە، لەبەر ئەوەی لە دوای پێغەمبەرەوە (ﷺ) هیچ شتێك نەسخ نەبۆتەوەو نەسڕاوەتەوە، وە کەس مافی ئەوەی نییە ئەو شتە بگۆڕێت کە لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) هەبووە.

---

(١) البخاري (٦٧٤٠) ومسلم (٣٦/١٦٨١).

وە ئەو خوێن بایییەی لەسەر کەس و کارە بیدات (مؤجل) دواخراوەو ئەتوانێ بە سێ ساڵ بیدات[1] بە رێك کەوتنی هەموو زانایان.

بەڵام ئەوەی لە ماڵی بکوژ پێویست کراوە کە بدرێ ئەبێ دەم و دەست بێت لای شافیعی خوای لێ رازی بێت.

چونکە دواخستنی لەسەر کەسوکاری خوێن بایی بۆ ئاسان کردنەو لە کوشتنی هەڵەو هاوشێوەی قەستدا ئەبێت، وە قەستە کوشتنی پەتی ناگرێتەوە.

وە حەنەفییەکان رایان وایە کە ئەویش هەتا سێ ساڵ مۆڵەتی ئەدرێ، وەك خوێن بایی کوشتنی هەڵە.

وە پێویست بوونی خوێن بایی کوشتنی هاوشێوەی قەست و کوشتنی بەهەڵە لەسەر کەس و کاری بکوژ جیاکردنەوەیە لە بنەمای گشتی ئیسلام. بەهۆی ئەمانەی خوارەوە:

چونکە ئادەمیزاد لێپرسراوە بەرامبەر بە خۆی و هەڵس و کەوتەکانی، بەپێی فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ (الأنعام: من الآية١٦٤).

واتە: هیچ تاوانبارێك تاوانی کەسێکی تر نادرێت بەسەریدا.

وە بە پێی فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی (لايؤخذ الرجل بجريرة أبيه، ولا بجريرة أخيه) رواه النسائي عن ابن مسعود رضي الله عنه[2].

واتە: کەس بە تاوانی باوکی و برای ناگیرێ.

وە ئیسلام بۆیە کەس و کاری بکوژ هاوبەش ئەکات لە خوێن بایی دانا بەو شێوەیە، بۆ دڵدانەوەی تاوانبارە، وە بۆ یارمەتی دانییەتی لەو تاوانەدا کە ڕوی داوە لێی بێ ئەوەی مەبەستی بووبێت.

وە ئەوە بڕیاردان بوو لەسەر ڕێو ڕەوشتێکی عەرەبی کە هاوکاری و پشتگیری و یارمەتی نێوان هۆزەکان پێویستی کردبوو.

---

(١) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەیەك جار خوێن بایی ئەدا، لەبەر هۆگری دڵەکان و چاك کردنی نێوانیان، وە کاتێك ئیسلام فراوان بوو صەحابەش هەر بەو شێوەیە دایان نا. جا وە کاتێك حاکم بەرژەوەندی لەوەدا زانی کە خێرا بدرێ بۆی هەیە.

(٢) النسائي (١٢٧/٧) والبزار (٣٣٥٠).

وە لەوەدا حیکمەت و ژیری‌یەکی ئاشکرا هەیە، ئەویش ئەوەیە کاتێ هۆزەکە بزانێت کە ئەویش ئەبێ خوێن بایی بدات لەو شێوانەدا، لەلایەن خۆیەوە کارێك ئەکات کە ئەندامانی لەو تاوانانە بەدووربن و تاوان نەکەن وە بە شێوەیەك ڕێنمایی‌یان ئەکات بۆ ڕەوشتی ڕاست کە هەڵە نەکەن و نەکەونە ناو هەڵەوە.

وە جەماوەری زانایان ڕایان وایە کە نابێت کەس و کار هاوبەشی خوێن بایی بکەن مەگەر ئەوەی کە لە سێ‌یەك تێپەڕی کرد، وە ئەوەی لە خوار سێ‌یەکەوەیە لە ماڵی تاوانبار دەردەکرێت[1].

مالیك و ئەحمەد خوا لێیان ڕازی بێت ڕایان وایە کەس لە خزمەکان نرخێکی دیاری کراویان لەسەر پێوست نی‌یە، بەڵکو حاکم خۆی هەوڵ ئەدات هەرکەس بەپێی توانای بەشێکی بخاتە سەر کە ئاسان بێت بەلایەوە، وە لە نزیك ترینەوە دەست پێ‌ئەکات.

بەڵام شافیعی خوا لێی ڕازی بێت ڕای وایە لەسەر خزمی دەوڵەمەند دینارێك دائەنرێ و لەسەر هەژار نیو دینار، وە خوێن بایی لای شافیعی ڕێك ئەخرێت لەسەر خزم و کەس بەپێی نزیکیان لە باوکەوە بەرەو خوار، پاشان لە باپیرەوە بەرەو خوار، وە وتویەتی: ئەگەر بکوژ کەسی نەبوو نە لە ڕوی خزمایەتی‌یەوە نە بەهۆی بەندە ئازاد کردنەوە، ئەبێ خوێن بایی‌یەکەی لە (بيت المال) بدرێت بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی: (أنا ولي من لاولي له)[2].

واتە، من کەسی ئەوانەم کە کەسیان نی‌یە و بێ‌کەسن.

وە هەروەها ئەگەر بکوژەکە هەژارو کەم دەست بوو، وە کەس و کاریشی کەم دەست بوون، ئەو پارەیان پێ نەئەدرا، ئەوە (بيت المال) ئەبێت بیدات.

وە ئەگەر موسڵمانان لە جەنگێکدا پیاوێکیان کوشت وایان ئەزانی کافرە، لەپاشاندا دەرکەوت موسڵمان بوو، خوێن بایی‌یەکەی هەر لە (بيت المال) دەرئەچێت.

شافیعی و چەند کەسێکی تر خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕنەوە: کە پێغەمبەر (ﷺ) خوێن بایی یەمانی باوکی خوذەیفەی دا کاتێ موسڵمانان لەشەڕی ئوحددا کوشتبویان و نەیان ناسی بوو[3].

---

(١) بەڵام شافیعی ڕای وایە: خوێن بایی کوشتنی بەهەڵە لەسەر کەس و کارە کەم بێت یا زۆر، چونکە هەرکەس زۆرتری بژارد کەمتریش ئەبژێرێ" وەك چۆن خوێن بایی کوشتنی قەستی لە ماڵی تاوانبار خۆی دەرئەکرێت کەم بێت یا زۆر.

(٢) أحمد (١٣٣/٤).

(٣) الشافعي (١٠٢/٢).

وە هەروەها کەسێك لە قەرەباڵغیدا بمرێت خوێن باییەکەی پێویستە لە (بیت المال) بدرێت، چونکە موسوڵمانەو بە کردەوەی کۆمەڵێك موسوڵمان مردووە، کەواتە خوێن باییەکەی لەسەر (بيت المال) پێویست ئەبێت.

موسەددەد ئەگێڕێتەوە: کە پیاوێك لە ڕۆژی هەینیدا لە قەرەباڵغیدا ئەمرێت، عەلی خوا لێی ڕازی بێت لە (بيت المال) خوێنەکەی دا.

وە ئەوەی لە قسەی حەنەفییەکان تێئەگەین ئەوەیە کە خوێن بایی لەم زەمانەیدا لەسەر ماڵی تاوانبارە، لە کتێبی (الدر المختار)دا هاتووە:

(بەڕاستی یارمەتی و پشت گیری بنەمایە لەم کارەدا، جا هەرکاتێ ئەوە هەبوو ئەوە بکوژ خزم و کەسی هەیە، ئەگەر نا ئەوە نییە).

جا کاتێ نە هۆزایەتی و نە گیانی یارمەتی نەما، ئەوە خوێن بایی لەسەر (بيت المال) ئەبێت، وە ئەگەر (بيت المال) نەبوو یا ڕێك و پێك نەبوو ئەبێ لە ماڵی تاوانبار دەربکرێت.

ئیبنو تەیمیەیە فەرمویەتی: لە کوشتنی هەڵەدا خوێن بایی لە تاوانبار ئەسەندرێت ئەگەر کەسوکاری نەبوو لە ڕاسترین دوو وتەی زانایاندا.

### خوێن بایی ئەندامەکانی لەش

لە لەشی ئادەمیزاددا ئەندامی وا هەیە کە یەك ئەندامە وەك: لوت و زمان و ئالەتی پیاو.

وە ئەندام هەیە دوو ئەندامی تێدایە وەك: هەردوو چاوو هەردوو گوێ و هەردوو لێوو هەردوو لای دەموچاوو هەردوو دەست و هەردوو قاچ و هەردوو هێلکە گون و هەردوو مەمکی ئافرەت و هەردوو شوێن مەمکی پیاوو هەردوو سمت و دوو لچی شەرمگەی ئافرەت.

وە ئەندامیشی تێدایە لەوانە زیاترە.

جا ئەگەر ئادەمیزادێك یەکێ لەو ئەندامانەی یا هەر دوو ئەندامەکەی ئادەمیزادێکی تری لەناوبرد ئەوە خوێن بایی ئەو بەشە بە تەواوی پێویست ئەبێت لەسەر تاوانبار، بەڵام ئەگەر یەکێك لە دوو بەشی ئەندامەکەی لەناوبرد نیوەی خوێن باییەکە پێویست ئەبێت لەسەری.

لوت خوێن بایی تەواوی لەسەرە، چونکە سوودەکەی کۆ کردنەوەی بۆنە لە ئێسقانی لوتاو بەرز کردنەوەیەتی بۆ دەماغ، ئەو سوودەش بە بڕینی نەرمایەکەی نامێنێ.

وە هەروەها لەسەر زمان بڕینیش خوێن بایی پێویستە لەبەر نەمانی قسە، کە ئادەمیزادی لە ئاژەڵ پێ جیا ئەکرێتەوە، وە قسەکردن سودێکی تایبەتی هەیە کە بە نەمانی بەرژەوەندییەکانی ئادەمیزاد لە دەس ئەچن، لە تێگەیاندنی کەسانی ترو دەربڕینی مەبەستەکانی.

وە هەروەها ئەگەر هەندێکی زمانیش ببڕێت هەر خوێن بایی پێویست ئەکات، ئەگەر بەو بڕینە توانای ڕستە دروست کردنی نەمێنێ لە قسەکردندا لەبەرئەوەی ئەو کەڵکو سودەی لە دەست ئەچێت بەو هەندەو وەك بە تەواوی بڕرابێت وەهایە.

بەڵام ئەگەر توانای ئەما هەندێ پیت لە قسەکردندا دەربخات، وە توانی هەندێکی تر دەربخات، ئەو کاتە خوێن بایییەکە بەپێی ژمارەی پیتەکان بەش ئەکرێت.

لە عەلییەوە خوا لێی ڕازی بێت: کە ئەو خوێن بایی بەش کردووە بەسەر پیتەکاندا چەند پیتی توانییەوە بڵێت، ئەوەندەی لێ لابردووە، و ئەوانەی کە بۆی نەهاتووە بیڵێت ئەوانەی حساب کردووەو سەندویەتی.

وە هەروەها بڕینی ئامێری پیاو خوێن بایی تەواو پێویست ئەکات، ئەگەر تەنها سەرەکەشی بڕبێت چونکە سوودی چونە لای ئافرەتی تێدایە، وە هەروەها سوودی ڕاگرتنی میزی تێدایە.

وە هەروەها ئەگەر لە پشت بدرێت و پەکی ڕۆیشتن بکەوێ هەر خوێن بایی تەواو پێویست ئەبێت، وە لەسەر هەردوو چاو خوێن بایی تەواو پێویستە، بەڵام لەسەر چاوێك نیوەی خوێن بایی، وە لەسەر هەردوو پێڵوی هەردوو چاو خوێن بایی تەواو هەیە، لە پێڵوی سەرو خواری چاوێك دا نیوە خوێن بایی پێویستە، و لە یەك پێڵودا چارەکێکی خوێن بایییەکە.

وە لەسەر هەدوو گوێچکە خوێن بایی تەواوی پێویستە، بەڵام لەسەر یەك گوێ نیوەی. وە لەسەر هەردوو لێو خوێن بایی تەواوە، و یەکێکیان نیوەی خوێن بایییە، جا نیوەی لێوی سەرو خوار یەکسانن لە نرخدا. وە بۆ هەردوو دەست خوێن بایی تەواو هەیە، و لەسەر یەك دەست نیوەی خوێن بایی هەیە. وە بۆ هەردوو قاچ خوێن بایی تەواو هەیە، ولەسەر یەك قاچ نیوەی هەیە. وە لەسەر پەنجەکانی هەردوو دەست و هەردوو قاچ خوێن بایی تەواو هەیە. وە هەر پەنجەیەك خوێن بایییەکەی (١٠) وشترە. وە پەنجەکان لە نرخدا یەکسانن، جیاوازی نییە لە نێوان پەنجە توتە و پەنجە گەورەدا، وە لەسەری سەری پەنجەکانی دەست یا قاچ سێیەکی دەیەکی خوێن بایییەکە پێویستە، وە هەر پەنجەیەك سێ جومگەی تێدایە، وە پەنجە گەورە دوو جومگەی هەیە، جا بۆ هەر جومگەیەك نیوەی دەیەکی خوێن بایییە کەیە.

وە لەسەر هەردوو هێلکە گون خوێن بایی تەواو پێویستە، بەڵام لەسەر یەکێکیان نیوەی پێویستە، وە هەر بەو شێوەیە لەهەردوو سمت داو هەردوو لچی شەرمگەی ئافرەت و هەردوو مەمکی و هەردوو شوێنە مەمکەکانی پیاو، ئەمانە لەسەر هەردوکیان خوێن بایی تەواو پێویستە بدرێت، و لەسەر یەکێکیان نیوە پێویستە. وە لەسەر هەموو ددانەکان خوێن بایی تەواو پێویستە، و لەسەر هەر ددانێك پێنج ووشتر هەیە، جا ددانەکان یەکسانن جگە لە ددانەکانی پێشەوەو خرێکان. وە هەر ددانێك فەوتا خوێن بایی خۆی هەیە، هەروەها ئەگەر دەرکرا پاش ئەوەی ڕەش بووەوە.

**خوێن بایی سوودی ئەندامەکانی لەش**

ئەگەر ئادەمیزادێك لە ئادەمیزادێکی تر بدات و عەقڵ و ژیری لەدەست بدات، خوێن بایی تەواوی ئەکەوێتە سەر، چونکە هەر عەقڵی ئادەمیزادە کە ئادەمیزاد لە ئاژەڵ جیائەکاتەوە. وە هەروەها ئەگەر یەکێ لە هەستەکانی نەهێڵێ: وەك (بیستن، بینین، بۆن کردن، تام کردن، یان قسەکردن بە هەموو پیتەکان. چونکە هەر هەستێك لەو هەستانە کەڵکی وویستراوی هەیە، و ئەو کەڵکانە جوانی و تەواوێتی ژیانی تێدایە.

عومەر خوای لێ ڕازی بێت چوار خوێن بایی سەند لە کابرایەك کە لە کابرایەکی تری دابوو، بیست و بینین و جیماع و هۆشی نەهێشتبوو کابراش هەر زیندوو بوو.

جا ئەگەر بینینی یەك چاو نەما، یا بیستنی یەك گوێ، ئەوە نیوەی خوێن بایی لەسەرە، ئیتر ئەوەی ماوە ساغ بێت یا ناساغ وەك یەکە.

وە لەسەر هەردوو مەمکی ئافرەت خوێن بایی تەواوی هەیە، وە لەسەر یەك مەمك نیوەی هەیە.

وە لەسەر هەردو لچی شەرمگەی ئافرەت خوێن بایی تەواو پێویستە، و لەسەر یەکێکیان نیوەی هەیە.

وە ئەگەر کەسێك چاوێکی ساغی هەبێت و ئەوی تریان کوێر، و چاوە ساغەکەی کوێر بکرێ ئەوە خوێن بایی تەواوی بۆ هەیە.

عومەر و عوثمان و عەلی و ئیبنو عومەر وایان حوکم داوە. وە کەسێك لە صەحابەکان پێچەوانەیان نەبوون.

لەبەر ئەوەی بە لەناوبردنی ئەو چاوە ساغەی تەواو کوێر ئەبێت، چونکە ئەو چاوە لەجێی هەردوو چاوی بووە.

وە لەسەر ئەم چوار موانەی خوارەوە خوێن بایی تەواو پێویستە:

١- مووی سەر.

٢- مووی ڕیش.

٣- مووی هەردوو برۆ.

٤- برژانگەکانی هەردوو چاو

وە برۆیەك نیوەی خوێن بایی لەسەرە، و برژانگی چاوێك چارەکێکی خوێن بایی‌یەکە.

وە لەسەر سمێڵ ئەدرێتە دەست قازی چەندی دانا ئەوەندە پێویستە.

## خوێن بایی بریندارکردنی سەر و ڕوخسار (دية الشجاج)

شجاج: لە زمانی عەرەبیدا بە بریندارکردنی سەرو ڕوخسار ئەوترێ.

ئەمیش دە جۆرە: هیچیان تۆڵەیان لەسەر نی‌یە ئەو بریندارکردنە نەبێت کە ئێسك دەرکەوێت تێیدا، چونکە ئەو جۆرە بریندارکردنانە ناتوانرێت وەك خۆی بە یەکسانی تۆڵەیان بکرێتەوە.

وا لە خوارەوە جۆرەکانی (الشجاج) ڕوون ئەکەینەوە:

١- الخارصة: ئەوەیە پێستەکە کەمێك لەت بێت.

٢- الباضعة: ئەوەیە گۆشت لەدووای پێست لەت بکات.

٣- الدامية أو الدامغة: ئەوەیە خوێنی لێ بێنێت.

٤- المتلاحمة: ئەو برینەیە کە ڕۆ بچێت لەناو گۆشتدا.

٥- السِّمحاق: ئەوەیە کە لە نێوان برینەکە و ئێسکدا پەردەیەکی تەنك مابێت.

٦- الموضحة: ئەوەیە کە ئێسکی دەرخستبێت.

٧- الهاشمة: ئەوەیە کە ئێسکی تێدا شکابێت و ورد بووبێت.

٨- المنقلة: ئەو برینەیە کە ئیسکی دەرخستبێت و شکاندبێتی بە جۆرێك ئێسکی لێ بوەرێ.

٩- المأمومة، أو الآمة: ئەوەیە کە گەیشتبێتە پەردەی سەر مێشك.

١٠- الجائفة: ئەوەیە گەیشتبێتە ناو بۆشایی لەشەوە.

وە ئەو برینانەی لە (الموضحە) کەمتربن حوکمێکی عادل و ڕاست لەبارەیانەوە ئەدرێت، وە وتراوە تەنها پارەی تیمارکردن و پزیشك پێویستە لە سەریان.

بەڵآم (الموضحه) تۆڵەکردنەوەی لەسەرە ئەگەر بە قستی بوبێت وەك وتمان، وە نیوەی دەیەکی خوێن بایی لەسەرە ئەگەر بە هەڵە بوبێت، جا برینەکە گەورە بێت یا بچووك، کە ئەویش پێنج سەر ووشترە.

وەك سابت بووە لە نامەکەی پێغەمبەردا (ﷺ) کە بۆ عەمری کوڕی حەزمی نوسیوە.

و (الموضحة) ئەگەر لە چەند شوێنێکی جۆراوجۆردا بوو، ئەوە بۆ هەر شوێن برینێکی سەربەخۆ پێنج ووشتر هەیە. بەڵآم ئەگەر لە سەرو دەم و چاودا نەبوو هەر کرێی تەداوی و پزیشکی لەسەرە.

وە (الهاشمة) دەیەکی خوێن بایی بۆ ئەسەندرێ، کە دە ووشتر ئەکات، ئەمەش لە زەیدی کوڕی ثابتەوە گێڕراوەتەوە. وە کەس لە صەحابەش موخالیفی نەبووە.

بەڵآم (المنقلة) دەیەك و نیوەی دەیەکی خوێن بایی بۆ ئەسەندرێ، کە ئەکاتە پانزە سەر ووشتر.

وە (الآمة) سێ‌یەکی خوێن بایی بۆ ئەسەندرێ بە ئیجماعی هەموو زانایان.

وە (الجائفة) سێ‌یەکی خوێن بایی بۆ ئەسەندرێ بە ئیجماع، بەڵآم ئەگەر دوو برین بوو هەردوکیان (الجائفة) بوون، ئەوە دوو سێ‌یەکی خوێن بایی لەسەرە.

## خوێن بایی ئافرەت

خوێن بایی ئافرەت ئەگەر بەهەڵە کوژرابوو نیوەی خوێنی پیاوە، وە هەروەها خوێن بایی ئەندامانی لەشی، وە بریندارکردنیشی خوێن بایی‌یەکەی نیوەی خوێن بایی بریندارکردنی پیاوە، وە بەشی زۆری زانایان بۆ ئەوە چوون.

وە ئەگێڕنەوە لە عومەر و عەلی و ئیبنومەسعود و زەیدی کوڕی ثابیتەوە خوایان لێ ڕازی بێت کە هەموویان دەربارەی خوێن بایی ئافرەت ووتویانە: نیوەی خوێن بایی پیاوە. و نەقل نەکراوە کەسیش ئینکاری لەو گفتەیان کردبێت، ئیتر بەوە بووەتە ئیجماع.

چونکە ئافرەت لە میرات و شایەتی‌دا بە نیو پیاو دائەنرێت. وە ووتراوە: خوێن بایی ژن و پیاو یەکسان ئەبێت هەتا سێ‌یەکی خوێنێك، لەپاشان نیوەی ئەوەی ئەمێنێتەوە.

نەسائی و دارەقوطنی تەخریجیان کردووە و ئیبنوخوزەیمە بە صەحیحی داناوە لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکی‌یەوە لە باپیرەیەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (عقل المرأة مثل عقل الرجل حتى يبلغ الثلث من ديته)[1].

(١) النسائي (٨/٤٥) والدارقطني (٣/٩١).

واتە: خوێن بایی ژن وەك خوێن بایی پیاوە هەتا ئەگاتە سێیەکی خوێن بایی پیاو.

وە مالیك لە (الموطأ)دا تەخریجی کردووە. وە بەیهەقی لە ڕەبیعەی کوڕی عبدالرحمانەوە کە ووتویەتی: پرسیم لە سەعیدی کوڕی موسەییب: خوێن بایی پەنجەی ئافرەت چەندە؟ فەرمووی: دە سەر ووشترە. ووتم: ئەی دوو پەنجەی؟ فەرمووی: بیست سەر ووشتر. ووتم: ئەی سێ پەنجەی؟ فەرمووی: سی سەر ووشترە. ووتم ئەی چوار پەنجە؟ فەرمووی: بیست سەر ووشترە.

ئەڵێ: ووتم: کاتێ برینەکەی گەورە ئەبێت و موسیبەتەکەی توند ئەبێت خوێن باییەکەی کەم ئەکات؟! سەعید فەرمووی: ئایا تۆ عێراقیت؟ ووتم: بەڵکو یا زانام ئەمەوێ دڵنیابم، یا نەزانم ئەمەوێ فێربم. سەعید ووتی: ئەوە سووننەتە کوڕی برام.

ئیمامی شافیعی لەو ڕایە کۆڵاوەتەوەو دەری خستووە ووشەی ئەوە سووننەتە مەبەستی سووننەتی زەیدی کوڕی ثابت بووە خوا لێی ڕازی بێت، چونکە ئەو بووە ئەو ڕایەی دەربڕیوە، نەك سووننەتی پێغەمبەر (ﷺ).

پاشان شافیعی خوای لێ ڕازی بێت ووتویەتی: ووشەی (سووننەت) ئەگەر بە گشتی ووترا مەبەست سوننەتی پێغەمبەرە (ﷺ).

وە ئەگێڕنەوە کە گەورە پیاوانی صەحابە خوایان لێ ڕازی بێت بە پێچەوانەی ئەوەوە گفتیان داوە. جا ئەگەر ئەوە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بوایە بە پێچەوانەی گفتیان نەئەدا.

وە ئەوەی سەعید ووتویەتی (سووننەتە) لەسەر ئەوە دائەنرێ کە سووننەتی زەیدە. چونکە بە مەوقوفی نەبێت لێوەی نەگێڕراوەتەوە، وە لەبەر ئەوەی ئەوە سەرنەکێشێ بۆ شتێکی نەشیاو، ئەویش ئەوەیە کاتێ ئازاری زیادتر بێت و تووش بوون زۆرتر بێت، نرخی کەم ببێتەوە، وە حیکمەتی یاسا دانەری ئیسلام لەو ئازار و موسیبەتەوە دروست ببێ.

وە دروست نیيە ئەوە بدرێتە پاڵ پێغەمبەر (ﷺ) چونکە دوورە کە تاوانێك هیچ پێویست نەکات بە شەرع، وە ناشیرینە شتێك کە بە هۆی کەسێکی ترەوە پێویست بوبێت لە کۆڵی لابچێت و ئیعتیباری بۆ نەکرێ.

## خوێن بایی خاوەن کتێبە ئاسمانیيەکان (دية أهل الكتاب)

وە خوێن بایی خاوەن کتێبەکان[1]، ئەگەر بەهەڵە کوژران نیوەی خوێن بایی موسڵمانە، جا خوێن بایی نێرینەکانیان نیوەی خوێن بایی نێرینەی موسڵمانە، وە خوێن بایی ئافرەتیان نیوەی

(١) (ذمي) خاوەن کتێب بن یا خاوەن پەیمان بن و لە ئەمانی موسوڵماندا بن یەکسانە.

خوێن بایی ئافرەتی موسڵمانە، بەپێی ئەوەی عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیرەیەوە ئەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر (ﷺ) خوێن بایی خاوەن کتێبی بە نیوەی خوێن بایی موسڵمان داناوە. ئەحمەد خوای لێ ڕازی بێت ڕیوایەتی کردووە[1].

وەك چۆن خوێن بایییەکەیان نیوەی خوێن بایی گیانی موسڵمانە بەو شێوەیە خوێن بایی بریندار کردنیشیان نیوەی خوێن بایی بریندار کردنی موسڵمانە.

مالیك و عومەری کوڕی عبدالعزیز بۆ ئەوە چون.

وە ئەبوحەنیفە و ثەوری بۆ ئەوە چوون کە خوێن بایییەکەیان وەك خوێن بایی موسڵمانە، وە ئەمەش لە عومەر و عوثمان و ئیبنومەسعودەوە ئەگێڕنەوە خوا لێیان ڕازی بێت.

بەپێی فەرموودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێت:

﴿وَإِنْ كَانَ مِنْ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثَاقٌ فَدِيَةٌ مُسَلَّمَةٌ إِلَى أَهْلِهِ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ﴾ (النساء: من الآية٩٢).

واتە: ئەگەر کوژراوەکە لە نەتەوەیەك بوو کە لە نێوانتاندا پەیمان هەبوو، ئەبێ خوێن بایی بدرێت بە کەسوکاری و کۆیلەیەکی باوەڕداریش ئازاد بکات.

زوهری ووتویەتی: خوێن بایی جولەکەو گاورو هەموو ذمییەك وەك خوێن بایی موسڵمانە.

وە ووتویەتی: (وە هەر بەو شێوەیەش ماوەتەوە لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) و ئەبوبەکر و عومەر و عوثمان و عەلیدا، هەتا موعاوییە (خوا لێیان ڕازی بێت) هاتوەو نیوەی خوێن بایییەکەی لە (بيت المال) دەرکردووە وە نیوەکەی تری بکوژ داوێتی.

لەپاشاندا عومەری کوڕی عبدالعزیز کردوویەتی بە نیوە، وە ئەوەی لە (بيت المال) دەرئەکرا لای برد.

زوهری ووتویەتی: بۆم ڕێك نەکەوت وەبیری عومەری کوڕی عبدالعزیزی بخەمەوە و پێی ڕابگەیەنم کە خوێن بایی ئەوانیش بە تەواوی ئەدرێت.

وە شافیعی خوای لێی ڕازی بێت بۆ ئەوە چووە کە خوێن بایییەکەیان سێیەکی خوێن بایی موسڵمانە، وە خوێن بایی بت پەرست و مەجوسی موعاهید یا موستەئمین دوو سێیەکی دەیەکی خوێن بایی موسڵمانە.

---

(١) أحمد (٢/١٨٠).

وە بەڵگەیان ئەوەیە کە ئەوە کەمترین نرخە ووتراوە لەو بارەیەوە، وە ئادەمیزاد لە کوشتنی ذمی بەرییە و بە دڵنیایی و بەڵگەوە نەبێت هیچی ناکەوێتە سەر، بەو حیسابە هەشت سەد درهەمە لە دوانزە هەزار درهەم.

وە ئەگێڕنەوە لە عمر و عثمان و ئیبنو مەسعودەوە کە خوێن بایی ئافرەتیان لەسەر نیوەیە.

وە ئایا لە کوشتنی ذمی و موعاهیددا کەفارەتیش پێویست نەبێت لەگەڵ خوێن باییەکەی؟ ئیبنو عەبباس و شیعبی و نەخەعی و شافیعی ووتویانە کەفارەت پێویستە، وە طەبەریش ئەوەی هەڵ بژاردوە.

## خوێن بایی کۆرپەلە (دية الجنين)

ئەگەر کۆرپەلە بمرێت بە هۆی ئەوەی تاوانێك بەرامبەر دایکی بکرێت قەست بێت یا هەڵە و دایکەکە نەمرێت، غوررەیەك پێویست نەبێت لەسەر ئەو کەسە. ئیتر بە مردویی لەدایکی ببێت، یا لە زگیدا بمرێت نێر بێت یا مێ وەك یەکە.

بەڵام ئەگەر لە زگی دایکەکە هاتە دەر و زیندو بوو، لە پاشاندا مرد خوێن بایی تەواو پێویست نەبێت.

جا ئەگەر کوڕ بوو سەد ووشتر و ئەگەر کچ بوو پەنجا ووشتر پێویست ئەبێت، زیندو بونیش بە پژمین یا هەناسەدان یا گریان یا قیژاندن یا جوڵە و ئەو جۆرە شتانە دەرئەکەوێ.

وە شافیعی بە مەرجی داناوە بۆ ئەوانەی لە زگی دایکدا ئەمرن، ئەبێ بزانرێ کە بووەتە ئادەمیزاد و گیانی پێدا کراوە. وە ڕوونی کردۆتەوە بەوە کە ئەبێ لەسەر وێنەی ئادەمیزاد بێت: لە دەست و پەنجەدا.

بەڵام مالیك ئەو مەرجەی دانەناوەو ووتویەتی:

هەرچی ئافرەتەکە لە باری چوو پارچە گۆشت بێت، یا پارچە خوێن بێت، بەجۆرێك هەست بە بوونی بکرێت ئەوە خوێن باییەکەی (غرة)یە.

بەڵام بۆچونەکەی شافیعی پێش ئەخرێت، چونکە بنەما لێرەدا پاك بوونەوەی گەردنە لە گوناح و پێویست نەبوونی غوررەیە، جا ئەگەر دروست بوونی نەزانرا ئەوە هیچی لەسەر پێویست نابێت.

غوررە چەندەیە:

شیعبی و حەنەفییەکان ووتویانە: پێنج سەد درهەمە یا سەد سەر مەڕ. وەك لە حەدیسەکەی ئەبو بوڕەیدەدا هاتووە لای ئەبو داودو نەسائی. وە وتراوە: پێنج سەر ووشترە.

وە لە ئەبی هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت کە فەرمویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) خوێن بایی کورپەلەی دانابوو بە غوررەیەک: کۆیلەیەك یا کەنیزەکێك[1].

وە مالیك لە ئیبنو شیهابەوە ئەگێڕێتەوە لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) خوێن بایی ئەو کورپەلەیەی لە سکی دایکیدا ئەمرێت دانابوو بە غوررە: سەرێك بەندە، یا کەنیزەك. جا ئەو کەسەی ئەوەی لەسەر دانرا ووتی: چۆن شتێکم پێ ئەبڕێن کە چەژی ئاوو نانی نەکردووە. نە ورتەی لە دەم هاتووەو نە جوڵاوە، وە شتی وا بە فیڕۆ ئەچێ.

پێغەمبەریش ﷺ فەرموی: (إن هذا من إخوان الكهان)[2].

واتە: ئەوە برای جادوگەرەکانە.

ئەوە بە نیسبەت کۆرپەلەی موسڵمان بوو، بەلام کۆرپەلەی ذمی. خاوەنی (بداية المجتهد) ووتویەتی: مالیك و شافیعی و ئەبو حەنیفە ووتویانە: دەیەکی خوێن بایی دایکی ئەکەوێتە سەر.

بەلام ئەبو حەنیفە هەر لەسەر ئەو بنەمایەیە کە خوێن بایی ذمیش ئەوەندەی خوێن بایی موسڵمانە.

وە شافیعی لەسەر ئەو بنەمایەیە کە خوێن بایی ذمی سێیەکی خوێن بایی موسڵمانە، وە مالیك لەسەر ئەو بنەمایەیە کە خوێن بایی ذمی نیوەی خوێن بایی موسڵمانە.

**خوێن بایی کۆرپەلە لەسەر کێ پێویست ئەبێت:**

مالیك و هاوەڵەکانی و حەسەنی بەصری و بەصرییەکان ووتویانە: لەماڵی تاوانبار پێویست ئەبێت.

وە حەنەفییەکان و شافیعییەکان و کوفییەکان بۆ ئەوە چوون کە پێویست ئەبێت لەسەر کەسوکاری تاوانبار، لەبەر ئەوەی تاوانێکە بە هەڵە کراوە، و لەسەر کەس و کاری پێویستە خوێنەکەی بدەن.

وە لە جابیرەوە ئەگێڕنەوە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر (ﷺ) خوێن بایی کۆرپەلەی بە غوررە داناوە لەسەر کەس و کاری لێدەر: وە لەپێشەوە داویەتی بە مێردی ژنەکەو منداڵەکانی[3].

---

(١) البخاري (٦٧٤٠) ومسلم (١٦٨١/٣٦).

(٢) أحمد (٤/٢٤٦) ومسلم (١٦٨٢/٣٧) وأبوداود (٤٥٦٨) والنسائي (٨/٥١) والترمذي (١٤١١).

(٣) أحمد (٢/٢٧٤) والبخاري (٦٧٤٠) ومسلم (١٦٨١/٣٦) من حديث أبي هريرة.

بەڵام مالیك و حەسەن: خوێن بایی کورپەلەیان وەك خوێن بایی کوشتنی عەمەد داناوە ئەگەر لێدانەکە بەقەستی بوو بێت، وە ڕای یەکەم ڕاست ترە.

**خوێن بایی کورپەلە بۆ کێ پێویستە:**

مالیك و شافیعیو کەسانی تر لە زانایان بۆ ئەوە چوون کە خوێن بایی کۆرپەلە پێویستە بدرێت بە میراتگرە شەرعیەکان، وە حوکمەکەشی حوکمی خوێن باییە لەمەدا کە میراتیە.

وە وتراوە: تەنها بۆ دایکەکە ئەبێت، چونکە کورپەلەکە وەك ئەندامێکە لە ئەندامانی لەشی، کەواتە خوێن باییەکەی تایبەتە بە دایکەکەوە.

**پێویست بوونی کەفارەت:**

زانایان لەسەر ئەوە ڕێکن کە ئەگەر منداڵەکە بە زیندویی لە دایك بوو لەپاشاندا مرد، ئەوە ئەبێ بکوژەکەی لەگەڵ خوێن باییەکەدا کەفارەتیشی بدات. بەڵام ئایا ئەگەر بە مردوویی لە دایك بوو لەگەڵ غوررەکەدا کەفارەتیشی پێویست ئەبێت؟

شافیعی و زانایانی تر ووتویانە: کەفارەتیش پێویست ئەبێت، چونکە لای شافیعی کەفارەت لە کوشتنی هەڵەو کوشتنی قەستیشدا پێویستە.

وە ئەبوحەنیفە ووتویەتی: کەفارەت پێویست نابێت، چونکە حوکمی قەستەکوشتی بەسەردا زاڵ ئەبێت، وە کەفارەتیش لای ئەم لە قەستەکوشتدا پێویست نابێت. وە مالیك کەفارەت دان بە پەسەند دائەنێت، چونکە لەنێوان هەڵە و قەستدایە.

**خوێن بایی نادرێ هەتا بریندار چاك ئەبێتەوە**

مالیك وتویەتی: ئەوەی ئیجماعی لەسەرە لای ئێمە دەربارەی تاوانی هەڵە، ئەوەیە کە هەتا بریندارەکە چاك نەبێتەوە خوێن بایی نادرێت.

جا ئەگەر ئەو کەسە ئێسکی کەسێکی شکاندبوو: دەستی یا قاچی، یا هەر شوێنێکی تری لەشی بە هەڵە، وە کابرای لێدراو چاك بێتەوەو وەك خۆی لێبێتەوە، خوێن بایی تێدا نابێت[1].

(١) ئەوە مەزهەبی ئەبو حەنیفەیە، چونکە تاوان لێکراو تەنها ئازاری پێ گەیشتووە، وە تەنها ئازاریش نرخی نیە، چۆن کەسێك جوێن بدا بە کەسێك دڵی بڕەنجێنێو ئازاری بدات زامنی هیچ نابێ، ئەمیش بەو جۆرەیە. هەرچەندە جوێندەر وازی لێ ناهێنرێ لە بەرپرسیەتی جوێنەکەی چونکە سزاو تەمێ ئەکرێ، یان تۆڵەی لێ ئەسەندرێ، بەپێی ئەو جیاوازیەی کە لەو بارەیەوە هەیە وەك لە جێی خۆیدا ڕون کراوەتەوە لەم

بەڵام ئەگەر نوقسان بوو بە پێی ناتەواوی‌یەکەی خوێن بایی ئەدرێت.

وە وتویەتی: جا ئەگەر ئەو ئێسکە شکاوە لەوانە بوو کە پێغەمبەر (ﷺ) خوێن بایی بۆ دانابوو ئەبێ وەك ئەوەی بدرێتی کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆی داناوە، بەڵام ئەگەر لەوانەبوو کە پێغەمبەر (ﷺ) ناوی نەبردبوو سوننەتیشی لەسەر نەبوو، ئەوە ئەبێ حاکم یا قازی ئیجتیهادی تێدا بکات.

### کەسێك بکوژرێت لە نێوان کۆمەڵێك شەڕکەردا

ئەگەر کۆمەڵێك بووە شەڕیان و نیشتنە یەك، سەیریان کرد کەسێك لە نێوانیاندا کوژراوەو نەئەزانرا کێ کوشتویەتی، و ڕوون نەئەبووەوە، خوێن بایی تێدا ئەبێت.پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (من قُتِلَ في عميًا في رميًا، يكون بينهم بحجارة أو بالسياط، أو ضرب بعصا، فهو خطأ، و عقله عقل الخطأ، و من قُتِلَ عمداً فهو قود، ومن حال دونه، فعليه لعنة الله وغضبه، لا يقبل منه صرف ولا عدل) رواه أبوداود[1].

واتە: کەسێك کوێر کوێرانە کوژرا لەناو هاویشتنی تیر یا بە بەرد یا بە قامچی یا بە داردەست، و کەس نەیزانی کێ کوشتویەتی، ئەوە حوکمی هەڵە کوشتنی هەیە، وە خوێن بایی‌یەکەی خوێن بایی هەڵەکوشتە، وە کەسێك قەستەکوشت بکرێت تۆڵەی بۆ ئەکرێتەوە، وە هەرکەس ڕێگری ئەو کارە بوو، نەفرین و ڕق و کینەی خوای لەسەر ئەبێت، نە کاری خێری لێوەرئەگیرێ نە فەرز.

وە زانایان جیاوازن لەوەدا کە ئەبێ خوێن بایی‌یەکە کێ بیدات.

ئەبو حەنیفە فەرمویەتی: لەسەر خوێن بایی دەرەکانی ئەو هۆزە ئەبێت کە لە ناویاندا دۆزراوەتەوە، بە مەرجێ خاوەن کوژراو نەیدا بەسەر کەسی تردا.

مالیك فەرمویەتی: خوێن بایی‌یەکەی لەسەر شەڕ فرۆشەکان ئەبێت. شافیعی فەرمویەتی: ئەبێ (قسامة) سوێنددان بکرێت ئەگەر خستبێتیانە سەر کەسێکی دیاری کراو، یا کۆمەڵێکی دیاری کراو، ئەگینا نە تۆڵەی ئەسەندرێ نە خوێن بایی.

ئەحمەد فەرمویەتی: ئەکەوێتە سەر خوێن بایی دەری کۆمەڵانی تر، مەگەر ئیدعای بکەن لەسەر کەسێك ئەوکاتە ئەبێ (قسامة) بکرێت.

---

کتێبەدا" وە ئەبو یوسف وتویەتی: تاوانبار ئەبێ شتێك بدات لە جیاتی ئەو ئازارە بە شێوەیەکی عادڵانە، وە محمد وتویەتی: ئەبێ کرێی پزیشك و نرخی دەرمان بدات.

(١) أبوداود (٤٥٣٩)و ابن ماجه (٢٦٣٥).

وە ئیبنو ئەبی لەیلا و ئەبویوسف وتویانە: خوێن بایییەکەی ئەکەوێتە سەر ئەو دوو کۆمەڵەی کە شەڕەکەیان دژی یەك کردووە.

وە ئەوزاعی وتویەتی: خوێن بایییەکەی لەسەر هەردوو کۆمەڵەکە ئەبێت، مەگەر شایەت هەبێت: کە فڵانەکەس کوشتویەتی و لەو دوو کۆمەڵە نەبووە، ئیتر خوێن بایی و تۆڵە ئەکەوێتە سەرئەو کەسە.

**کوشتنەوەی تاوانبار دوای وەرگرتنی خوێن بایی:**

وە ئەگەر خاوەن خوێن خوێن بایی وەرگرت، ئیتر بۆی دروست نییە کە بکوژەکە بکوژێتەوە.

ئەبو داود ئەگێڕێتەوە لە حەسەنەوە، لە جابیری کوڕی عبداللەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (لا أُعْفِيَ من قتل بعد أخذ الدية)[1].

واتە: خوا ماڵ و سامانی ئەو کەسە زۆر نەکات کە دوای وەرگرتنی خوێن بایی بکوژەکە ئەکوژێتەوە.

وە دارەقوطنی ئەگێڕێتەوە لە ئەبی شورەیحی خوزاعییەوە وتویەتی: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بووە ئەیفەرموو: (من أصيب بدم أو خَبْل، فهو بالخيار بين إحدى ثلاث فإن أراد الرابعة فخذوا على يديه: بين أن يقتص، أو يعفو، أو يأخذ العقل، فإن قبل شيئاً من ذلك ثم عَدا بعد ذلك، فله النار خالدا فيها مخلدا)[2].

واتە: هەرکەس کەسێکی لێکوژرا یا شەل کرا بە لێدان، لەم سیانە ئارەزوی خۆیەتی کامیان هەڵئەبژێرێ، جا ئەگەر چوارەمی ویست دەستی بگرن: یا تۆڵە بکاتەوە، یا لێی ببورێت، یا خوێن بایی وەربگرێت، ئەگەر بە یەکێ لەوانە ڕازی بوو لەپاشاندا دەست درێژی کرد جەزاکەی -دوای مردن- ناو ئاگرە، بۆ هەتا هەتایە تێیدا ئەمێنێتەوە.

جا ئەگەر بکوژی کوشتەوە. لە زانایاندا هەیە وتویەتی: وەك کەسێکە کە لە پێشەوە کەسێکی کوشتبێت، خاوەن خوێن ئارەزوی لێ بوو لێی ئەبورێت یا ئەیکوژێتەوە، بەڵام سزاکەی بۆ ڕۆژی دواییە.

وە هەیە لە زانایاندا وتویەتی: هەر ئەبێ بکوژرێتەوە، وە نابێ حاکم ڕێگە بدات کە سەرپەرشتی کوژراو لێی ببورێت.

---

(١) أبوداود (٤٥٠٧).

(٢) أحمد (٤/٣١) وأبوداود (٤٤٩٦) وابن ماجه (٢٦٢٣) والدارقطني (٣/٩٦).

وە وتراوە: ئەدرێتە دەست حاكم چی بەباش زانی ئەیكات.

لێك دانی دوو سوار:

ئەبو حەنیفەو مالیك بۆ ئەوە چوون: ئەگەر دو سوار كێشایان بەیەكدا و هەردووكیان مردن خوێن بایی هەریەكەیان لەسەر ئەوی تریان ئەبێت، وە خوێن دەرەكانیان خوێنەكەیان ئەدەن.

وە شافیعی ووتویەتی: هەریەكەیان نیوەی خوێن بایی ئەوی تری ئەكەوێتە سەر، چونكە هەریەكەیان بە كاری خۆی و ئەوەی تریان مردووە.

## زامن بوونی خاوەن وولاغ (ضمان صاحب الدابة)

ئەگەر وولاغێك بە دەستی یا بەقاچی یا بەدەمی زیانی بە شتێك گەیان، خاوەنەكەی دەستەبەر ئەبێت و پێی ئەبژێررێت لای شافیعی و ئیبنوئەبی لەیلا و ئیبنو شیبرمە.

وە مالیك و لەیث و ئەوزاعی ووتویانە: دەستەبەر نابێت ئەگەر بە هۆی سوارەكەیەوە یا لێخوڕەكەیەوە نەبوبێت، بە هۆی تێوەژەنین یا لێدانەوە، جا ئەگەر هۆیەك هەبوو، وەك ئەوەی وای لێ كردبێت ئەو شتە لەناوببات، ئەوە حوكمی لەناوبردنی ئەو شتەی ئەدرێ بەسەردا.

بەڵام ئەگەر تاوانەكە دەستەبەر بوونی بە تۆڵە ئەبوو، وە بە دەستی قەست وا لەو وولاغە كرابوو ئەو تاوانە بكات، ئەبێ تۆڵەی بسەندرێ، چونكە وولاغەكە لەم حاڵەتەدا وەك ئامێرێك وایە.

بەڵام ئەگەر بە قەست نەبوو، ئەوە خوێن باییەكەی لەسەر كەس و كاری ئەبێت، وە ئەگەر شتە لەناو براوەكە ماڵ بوو بژاردنەكە لە ماڵی تاوانبار دەرئەكرێت.

ئەبو حەنیفە ووتویەتی: ئەگەر ولاغی كەسێك كەسێكی تری شێلا ـوە خۆشی بەسەریەوە بوو- ئەوە ئەگەر شێلانەكە بە قاچەكانی بوو خوێنەكەی بە فیڕۆ ئەڕوات، و ئەگەر بە دەستەكانی بوو، ئەوە سوارەكە زامنە، چونكە ئەیتوانی لای بدات لە پێشەوە، بەڵام بۆ قاچەكانی دەسەڵاتی نییە.

وە وتویەتی: ئەگەر وولاغێك لێخوڕرا زینەكەی یا ڕەشمەكەی یا هەرچی شتێكی تر كە بەسەر ولاغەكەوە بێت، بكەوێتە خوارەوە بەسەر كەسێك دا، ئەوە لێخوڕەكەی دەستەبەر ئەبێت بەپێی زیانەكە.

وە ئەگەر ئاژەڵێك بەرەڵڵا بوو هەڵات و زیانێكی گەیاند بە ماڵ یا بە ئادەمیزاد، شەو بێت یا ڕۆژ، خاوەنی دەستەبەر نابێت چونكە بەدەستی قەست نەبووە. وە هەركەس سوار وڵاغێك بوو پیاوێكی تر تێوەی ژەند یا لێی دا، جا ڕاپەری لوتی دا لە زەلامێك یا بە دەستی شێلای، یا

سڵەمیەوەو لە زەلامێکی داو کوشتی، ئەو کەسە دەستەبەر نەبێت کە تێوەی ژەنووە نەك سوارەکە، وە ئەگەر لە تێوەژەنەکەی دا خوێنی بە فیڕۆ ئەڕوات چونکە خۆی هۆ بووە بۆ ئەوە.

بەڵام ئەگەر بە تێوەژەنینەکە سوارەکەی خستە خوارەوە و کوشتی، خوێنەکەی ئەکەوێتە سەر کەس و کاری تێوەژەنەکە. وە ئەگەر وڵاغێك بەڕێوە ئەڕۆیشت میزی کرد یا تەرسیکرد جا کەسێك لێی هەڵخلیسکاو تووشی زیان بوو خاوەنەکەی دستەبەر نابێت، وە هەروەها ئەگەر وەستاندبوی بۆ ئەوە.

## دەستەبەری ڕاکێشەر و سوار و لێخوڕ

ئەگەر وڵاغێك ڕاکێشەری هەبوو یا سوار یا لێخوڕ و خۆی دا لە شتێك و زیانی پێ گەیاند، ئەو کەسە دەستەبەری ئەو زیانە ئەبێت کە ڕوی داوە.

عومەر خوای لێ ڕازی بێت، فەرمانی دا بە خوێن بایی لەسەر ئەو کەسەی ئەسپەکەی لێئەخوڕی و کەسێکی تری شێلا.

ظاهیرییەکان ڕایان وایە کە هیچ کام لە مانە دستەبەر نابن، بەپێی فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرمویەتی: (جرح العجماء جُبارٌ، والبئر جُبار، والمعدن جُبار، وفي الركاز الخمس)[1].

واتە: بریندار کردنی ئاژەڵ بەفیڕۆ ئەڕوات، وە بیرو کانزا ئەگەر کەسێك پێیان لەناو بچێت خوێنەکەی بەفیڕۆ ئەڕوات، وە لە گەنجی دۆزراوەدا پێنج یەکی زەکات ئەکەوێت.

وە ئەوەی ظاهیرییەکان کردویانەتە بەڵگە بۆ ئەو وڵاغانە ئەبێت کە نە ڕاکێشەر و نە سوار و نە لێخوڕیان لەگەڵدا نەبێت، چونکە لەو حاڵەتەدا کە ئەمانەیان لەگەڵدا نەبێت هەرچی لەناوبەرن خاوەنی دستەبەرو زامن نییە بە ڕای هەموو زانایان.

## وڵاغی بەستراوە

وڵاغی بەستراوە ئەگەر زیانی گەیاند بە شتێك، لای ئەبوحەنیفە ئەو شتە بە خاوەن وڵاغ ئەبژێرێت، وە ئەوە کە لە شوێنێکدا بەستبویەوە کە شوێنی بەستنەوەی ئەو جۆرە وڵاغانە بوو، زامن بوونی لەسەر لانابات.

لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (من وقف دابة في سبيل من سبل المسلمين، أو في سوق من أسواقهم، فأوطأت بيد أو رجل فهو ضامن) رواه الدارقطني[2].

---

(١) البخاري (١٤٩٩) ومسلم (١٧١٠/٤٥).

(٢) الدارقطني (٣/١٧٩).

واتە: هەرکەس لەسەر ڕێگایەك لە ڕێگاکانی موسڵمانان، یا لە بازاڕێك لە بازاڕەکانیان وڵاغێکی بەستەوەو وزیانێکی دا بە دەستی یا بە قاچی، ئەوە خاوەنی زامنی‌یەتی.

شافیعی ووتویەتی: ئەگەر لەو شوێنەدا بەستبویەوە کە پێویست بوو لەو شوێنەدا ببەسترێتەوە خاوەنی زامن نی‌یە، بەڵام ئەگەر لەو شوێنەدا نەی بەستبۆوە کە پێویست بوو تێیدا ببەسترێتەوە خاوەنی زامن ئەبێت.

**دەستبەری ئەو شتانەی ئاژەڵ لەناوی ئەبەن لە کشتوکاڵ و میوەهات و بەروبوم و شتی‌تر**

جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون —لەوانە: مالیك و شافیعی و گەورە زانایانی حیجاز- کە ئەو شتانەی ئاژەڵ بە ڕۆژ لە ناوی ئەبەن لە: گیان، یا ماڵی کەسانی تر خاوەنی زامن نی‌یە، چونکە عادەتە لە ناو خەلکدا ئەبێ خاوەن باخ و باخات بە ڕۆژ پارێزگاری بکەن، وە خاوەن ئاژەڵ ئاژەڵەکانیان بە ڕۆژ ئەبەن بۆ لەوەڕ و بە شەو ئەیان گێڕنەوە بۆ شوێنی حەوانەوە. جا هەرکەس بە پێچەوانەی ئەوەوە کار بکات دەرچووە لە یاسای پارێزگاری بۆ لەناوبردن.

ئەوەش ئەگەر ئەو ئاژەڵانە خاوەنیان لەگەڵدا نەبوو، بەڵام ئەگەر خاوەنیان لەگەڵدا بوو دەستبەری ئەو شتانە ئەبێت کە لە ناوی بردووە، سوار بوبێت یا لە دوایەوە لێی خوڕی بێت یا وەستابێت لە تەنیشتی‌یەوە، وەك یەکە، وە بە دەستی یا بە قاچ یا بەدەم لەناوی بردبێت و زیانی دابێت هەروەك یەکە.

بەڵگەشیان بۆ بۆچونەکەیان ئەوەیە کە مالیك گێڕاویەتی‌یەوە لە ئیبنوشیهابەوە لە حەرامی کوڕی سەعیدی کوڕی موحەییصەوە: کە وشترێکی بەڕائی کوڕی عازیب چووە ناو باغی پیاوێکەوە زیانی پێ‌گەیاند. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دا کە پاراستنی باغەکان بە ڕۆژ لەسەر خاوەن باغەکانە، وە هەرچی ئاژەڵ بەشەو لەناوی برد خاوەن ئاژەڵ دەستەبەری‌یەتی و دەبێ بۆی‌بژێرێ[1].

ئەبو عومەری کوڕی عبدالبر ووتویەتی: ئەم حەدیسە هەرچەندە مورسەلە بەڵام حەدیسێکی بەناوبانگە، پێشەوا ئاینی‌یەکان ئیرسالیان کردووەو ئەوانەی جێی باوەڕن گێڕاویانەتەوە، وە زانایانی حیجاز لە شەرع دا بەکاریان هێناوە و وەریان گرتووە. وە لە مەدینەشدا کاری پێ‌کراوە، ئیتر بەسە بۆ تۆ کە خەلکی مەدینەو هەموو حیجاز بەکاریان هێناوە. وە سەحنونی مالیکی ڕای وایە ئەم حەدیسە تەنها بۆ خەلکی مەدینەیەو ئەو شوێنانەی وەك مەدینەن کە باغچەکانیان جیاجیا

---

(١) أحمد (٤/٢٩٥) وأبوداود (٣٥٦٩) وابن ماجه (٢٣٣٢).

کراوەتەوە بە دیوار، بەڵام ئەو شوێنانەی کێڵگەکانیان بە یەکەوە نوساوەو بێ پەرژینە، ئەبێ خاوەن ئاژەڵ دەستەبەری ئەو زیانانە بێت کە ئاژەڵەکانیان بە شەو یا بە ڕۆژ ئەیدەن.

وە حەنەفییەکان بۆ ئەوە چون: ئەگەر ئاژەڵەکە خاوەنیان لەگەڵدا نەبوو دەستەبەر نین شەو بێت یان ڕۆژ، بەپێی فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی (جرح العجماء جُبار). واتە بریندارکردنی ئاژەڵ بەفیڕۆ ئەڕوات.

جا حەنەفییەکان هەموو کارێکی ئاژەڵ لەسەر ئەوە قیاس ئەکەن.

بەڵام ئەگەر خاوەنیان لەگەڵدا بوو: ئەگەر لێی خوڕین هەرچی زیانیان دا دەستەبەرە، و ئەگەر سواری بوو دەستەبەری ئەو شتانە ئەبێت کە بە دەمی یا دەستی لەناوی ئەبات، وە پێویست نىیە ئەوەی بە قاچی لەناوی ببات دەستەبەری بێت.

جەماوەر وەڵامیان داوەتەوە: ئەو حەدیسەی حەنەفییەکان کردویانەتە بەڵگە گشتییە و حەدیسەکەی بەڕاء تایبەتی کردووە. ئەمە لەبارەی ئەو زیانانەی کە پەیوەندییان بە کشتوکاڵ و بەروبومەوە هەبێت. بەڵام جگە لەوانە ئیبنو قودامە لە (المغنی)دا ووتویەتی:

ئەگەر ئاژەڵ زیانی دا لە شتێك کە چێنراو نەبوو، خاوەنی دەستەبەری ئەوە نابێت کە لەناوی بردووە، شەو بێت یان ڕۆژ، بەمەرجێ دەستی خۆی تێدا نەبووبێت، وە لە شورەیحەوە گێڕراوەتەوە: کە ئەو حوکمی داوە لەبارەی مەڕێك کە بە شەو چووبووە قەراغی باغێك، ئەبێ خاوەنی دەستەبەری ئەو شتانە بێت کە لە ناوی بردووە، وە شورەیح ئەم ئایەتەی خوێندبۆوە: ﴿إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ الْقَوْمِ﴾ (الانبياء: من الآية٧٨).

واتە: کاتێ مەڕوماڵاتی کۆمەڵێك بە شەو کەوتە ناو کێڵگەی کۆمەڵێکی ترەوە. وە وتویەتی (نفش) بەشەو نەبێت نابێت. وە لە ئەورییەوە هاتووە کە ووتویەتی: ئەگەر ڕۆژ بوو خاوەنی دەستەبەرە چونکە کەمتەرخەمی کردووە لە بەرەڵاکردنیدا.

وە فەرموودەکەی پێغەمبەرمان هەیە (ﷺ) کە فەرمویەتی: (العجماء جرحها جبار) متفق عليه.

واتە: ئاژەڵ زەرەر و زیانەکەی بە فیڕۆ ئەڕوات و نابژێرێ.

بەڵام (نفش) کە لەئایەتەکەدایە لەوەڕاندنە بە شەو. ئەوەش بۆ زەرعێکە کە ئاژەڵ لەناویدا بە سروشتی بلەوەڕێنرێو خراپی بکات بەپێچەوانەی جگە لەوە، جا نابێ هیچی تری لەسەر قیاس بکرێت -تەواو-

دەستەبەری ئەو شتانەی باڵندە لەناوی ئەبەن

هەندێ لەزانایان ڕایان وایە کە هەنگ و کۆتر و قازو مراوی و مریشك و باڵندە وەك وولاغن.

ئەگەر خاوەنی بەخێوی کردن و بە ڕۆژ بەری دان دانەوێڵەیان کۆ کردەوە خاوەنی دەستەبەر نیە، چونکە عادەت وایە بەرەڵا بکرێن. وە هەندێکی تر ڕایان وایە: دەستەبەربوونی تێدایە ئەگەر بەرەڵا کران و زیانیان دا لە شتێك.

وە هەروەها ئەگەر باڵندەی گۆشت خۆری هەبوو وەك صەقر و باز. جا زیانیان گەیاند بە باڵندەو گیان لەبەری خەڵك خاوەنی دەستەبەرە. وە ئەم ڕایەش ڕاستە.

دەستەبەری ئەو زیانانەی سەگ و پشیلە ئەیدەن.

لە کتێبی (المغنی)دا هاتووە:

هەرکەس سەگێکی نەهێن گری ڕاگرت و بەرەڵای کرد کەسێك یا ئاژەڵێکی گرت، شەو بوو یا ڕۆژ، یا جلوبەرگی کەسێکی دڕاند، لەسەر خاوەنی سەگەکەیە چ زیانێکی داوە بیبژێرێت، چونکە کەمتەرخەمی کردووە لە ڕاگرتنیدا، مەگەر کەسێك کە بێ ئیزنی خاوەن سەگەکە چوبێتە ماڵەکەیەوە، ئەو کاتە خاوەن سەگ دەستەبەر نابێت، چونکە دەست درێژی کردووە کە چووەتە ماڵەکەی و خۆشی هۆ بووە کە سەگەکە گرتویەتی.

بەڵام ئەگەر بە ئیزنی خاوەنی چوبێتە ماڵەکەی ئەوە خاوەنی دەستەبەرە، ئەگەر زیانێکی لێ کەوت.

بەڵام ئەگەر سەگ زیانی تری گەیاند جگە لە گرتن، وەك ئەوە: دەمی خستبێتە ناو کاسە و دەفری کەسێکەوە، یا میزی تێکردبێت، خاوەن سەگ دەستەبەر نابێت، چونکە ئەوە تایبەت نیە بە سەگی نەهێن گرەوە.

قازی ووتویەتی:

ئەگەر کەسێك پشیلەیەکی ڕاگرت جوجەڵەی خەڵکی ئەخوارد، ئەبێ بیسان بژێرێت، وەك چۆن سەگی نەهێنگر هەرچیزیانێکی دا خاوەنی ئەیبژێرێتەوە، وە جیاوازی نێوان شەوو ڕۆژ نیە، بەڵام ئەگەر عادەتی جوجەڵە خواردن نەبوو خاوەنی دەستەبەر نیە، وەك سەگێك کە نەهێن گر نەبێت وایە.

ئەگەر سەگێکی نەهێنگر یا پشیلەیەك کەوتە لای بێ ئەوەی ڕای گرتبێت بە ئارەزوی خۆی، ئەوە ئەگەر زیانیان دا دەستەبەر نیە. چونکە ئەو دوانە خۆیان بوونە هۆی زیان گەیاندنەکە.

### ئەو گیان لەبەرانەی دروستە بكوژرێن و ئەوانەی دروست نیيە بكوژرێن

دروست نیيە هیچ گیان لەبەرێك بكوژرێت ئەوانە نەبێت كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی داوە بە كوشتنیان وەك: قەلەڕەش، و كولارەو، مشك و، مـارو، دوپشك و، سـەگی نـەهێنكرو، جۆرێـك لـە مارمێلكە كە پێی ئەوترێ (وزغ - بزن مژە). وە ئەمانەشیان ئەخرێنە پاڵ لەبەر ئـەوەی وەك ئـەوان زیانیان هەیە وەك: زەردەواڵەیەك كـە ئـازار ئـەدات، و پڵـنگ، و شـێر، و پشیلە كێـوی، ئەمانـە ئەكوژرێن با پەلاماریش نەدەن.

عائیشە فەرمویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی داوە بە كوشتنی پێنج جۆر گیانەوەری فاسق لـە حەرەم و دەرەوەی حەرەمدا، ئەوانیش: قەلەڕەش و كۆلارە، و دوپشك، و مـشك و، سـەگی نـەهێنكر. بوخای و موسلیم ڕیوایەتیان كردووە[1].

وە لەهەر دو صەحیح دا هاتووە لە حەدیسی ئومو شورەیكەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فـەرمانی داوە بە كوشتنی بزن مژە و بە (فویسقة) نـاوی بـردون[2]. جـا ئەگـەر بكـوژرێن دەسـتەبەر بـوون نیيـە لەسەریان.

وە هەروەها دڕندە و جانەوەری تر دەستەبەری نیيە، بـا مـاڵیش بوبێـت بـە ئیجماعی زانایـان، پشیلە نەبێت نرخەكەی لە بكوژی ئەسەندرێ، مەگەر پەلاماری دابێت، وە پەپۆسلێمانە و مێرولـە و هەنگ و (خطاف) جۆرێك باڵندەیە، و قالۆنچە و بۆق، ناكوژرێن، چونكە زیانیان بۆ كەس نیيە.

نسائی ئەگێڕێتەوە لە ئیبنو عەمرەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمورویەتی: (ما مـن إنـسان يقتـل عصفوراً، فما فوقها، بغير حقها إلا سأله الله يوم القيامة عنها، قيـل يـا رسـول الله، ومـا حقهـا؟ قال: يذبحها ويأكلها، ولا يقطع رأسها و يرمي بها)[3].

واتە: كەس نیيە چۆلەكەیەك یا گەورەتر لەو بكوژێ بـەبێ مـافی خـۆی، خـوای گـەورە لـە ڕۆژی قیامەتدا پرسیاری لێ نەكات لەسـەری، ووتیـان: ئـەی نێـرراوی خـوا مافەكەی چیيە؟ فـەرمووی: سەری ببڕێت و بیخوات، نەك سەری ببڕێت و فڕێی بدات.

وە ئەگەر ئەو جۆرانەی كوشت ئەبێ تۆبە بكات و دەستەبەری لەسەر نیيە.

---

(١) أحمد (٦/٩٨) ومسلم (١١٩٨/٦٧) والترمذي (٨٣٧) وابن ماجه (٣٠٨٧).

(٢) البخاري (٣٣٠٧) ومسلم (٢٢٣٧/١٤٢).

(٣) أحمد (٤/٤٨٩) والنسائي (٧/٢٣٩) وابن حبان (٥٨٩٤).

وە لە ئیبنوعەباسەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرمویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی کردبوو چوار جۆر لە گیانەوەر بکوژرێت: مێروولە و هەنگ و پەپوسلێمانە و قالۆچە.

**ئەوانەی دەستەبەرییان تێدا نییە**

ئەگەر تاوانەکە بە هۆی دەست درێژی خودی ستەمکارەوە بوو ئەوە بە فیڕۆ ئەڕوات: نە تۆڵەی لەسەر ئەبێت نە خوێن بایی ئەسەندرێت نمونەی ئەمە:

**(١) کەوتنی دانی گازگر:**

ئەگەر کەسێك کەسێکی تری گەزی، ئەو کەسە شوێنە گاز لێ گیراوەکەی ڕاکێشاو لە دەم گازگرەکەی دەرهێناو دانی خست یا چەناگەی لار کرد، ئەو کەسە لێپرسراو نییە بەرامبەر بەو کەسەی گازەکەی گرتووە، هەرچی لێ بێت، چونکە گاز لێ گیراو دەست درێژی نەکردووە.

بوخاری و موسلیم ئەگێڕنەوە لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە، پیاوێك گازی گرت لە دەستی پیاوێکی تر، ئەویش دەستی لە دەمی کابرا دەرهێناوە دوو ددانی پێشەوەی هەڵکەند، کێشەکەیان بردە لای پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (يعض أحدهم يد أخيه كما يعض الفحل.. لا دية لك)[1].

واتە: یەکێك لە ئێوە وەك نێرەوشتر دەستی براکەتان ئەگەزن.. خوێن باییت نییە.

مالیك ووتویەتی: ئەو کەسە دەستەبەرو زامن ئەبێت. بەڵام حەدیسەکە بەڵگەیە بەسەر مالیکەوە.

**(٢) سەیرکردنی ناو ماڵی کەسێکی تر بێ پرسی خاوەن ماڵ :**

هەرکەس سەیری ماڵی کەسێکی تر بکات لە کونی دیوارەوە بێت، یا لە درزی دەرگاوە، یا بەهەر شێوەیەکی تر، ئەوە ئەگەر سەیرکردنەکە بەقەست نەبێت قەیناکە.

موسلیم ئەگێڕێتەوە پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری سەیرکردنی لە پڕیان لێکرد؟ فەرمووی: چاوت لەسەری لابەرەو خێرا ڕووبکە بەولاوە[2].

ئەبوداود و (ترمذي) ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ)بە عەلی فەرموو: (لا تتبع النظرة النظرة، فإن لك الأولى، وليس لك الثانية)[3].

(١) البخاري (٦٨٩٢) ومسلم (١٦٧٣/١٨).

(٢) مسلم (٢١٥٩) وأبوداود (٢١٤٨) والترمذي (٢٧٧٦) والدارمي (٢/٢٧٨).

(٣) أحمد (٥/٣٥٣) وأبوداود (٢١٤٩) والترمذي (٢٧٧٧).

واتە: بەدوای سەیرکردندا سەرنج مەدە، چونکە سەیر کردنی جاری یەکەمت بۆ هەیە، بەڵام سەیر کردنی جاری دووەمت بۆ نییە.

بەڵام ئەگەر بە قەست و بێ پرس سەیری ماڵی کەسێك بکات خاوەن ماڵ بۆی هەیە چاوی کوێر بکات، و زامن و دەستەبەریش نابێت.

ئەحمەدو نەسائی ئەگێڕنەوە لە ئەبی هورەیرەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (من اطلع في بيت قوم بغير إذنهم، ففقؤوا عينه فلا دية له، و لا قصاص)[1].

واتە: هەرکەس سەیری ماڵی خەڵکی کرد بەبێ پرسیان، ئەوانیش چاویان کوێر کرد، نە خوێن بایی بۆ هەیە نە تۆڵە.

وە بوخاری و موسلیم هەر لە ئەبو هورەیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (لو أن رجلاً اطلع عليك بغير إذن، فخذفته بحصاة ففقأت عينه، ماكان عليك جناح)[2].

واتە: ئەگەر پیاوێك بێ پرس سەیری ناو ماڵەکەتی ئەکرد، تۆش بە بەردوچکەیەك چاویت کوێر کرد تاوانت لەسەر نییە.

وە لە سەهلی کوڕی سەعدەوە کە پیاوێك لە کونی دەرگاکەوە سەیری ژوورەکەی پێغەمبەری ئەکرد، (ﷺ) پێغەمبەر (ﷺ) شانەیەکی پێ بوو سەری پێ دائەهێنا، فەرمووی: ئەگەر ئەمزانی سەیر ئەکەیت ئەمکرد بە چاوتا، ئیزن وەرگرتن بۆیە دانراوە بۆ ئەوەی سەیر نەکرێت[3].

شافیعیییەکان و حەنبەلییەکان لەسەر ئەوە ڕۆیشتوون.

وە حەنەفییەکان و مالیکییەکان پێچەوانەی ئەوەن و وتویانە: هەرکەس بێپرسی خاوەن ماڵ سەیری ماڵەکەی کردو ئەویش بەردوچکەیەکی تێ گرت یا دارێکی کرد بە چاویاو کوێری کرد، ئەو کەسە دەستەبەر ئەبێت. چونکە پیاو ئەگەر چووە ماڵێك و پیاروانی و پەلاماری ژنی خاوەن ماڵی دا بەڵام زینای لەگەڵ نەکرد، دروست نییە خاوەن ماڵ چاوی کوێر بکات، یا تووشی شتێکی خراپی بکات، چونکە ئەو جۆرە تاوانە نابێ ئەو سزایەی لەسەر بدرێت. ئەوەش پێچەوانەی ئەو حەدیسە صەحیحانەن کە لەم بارەیەوە هاتوون و باس کراون.

---

(١) البخاري (٦٨٨٨) ومسلم (٢١٥٨).

(٢) أحمد (٢/٢٤٣و٤٢٨) ومسلم (٢١٥٨/٤٤) وأبوداود (٥١٧٢) والنسائي (٨/٦١).

(٣) البخاري (٥٩٢٤) ومسلم (٢١٥٦).

ئیبنوقەییمی جەوزی ڕای یەکەمی پێش خستوەو فەرمویەتی: ئەم سوننەتانە ڕەت کراونەتەوە بەوەی کە پێچەوانەی (أصول) بنەماکانن، چونکە خوای گەورە تەنها کاتێک ڕەوای کردووە چاو دەربێت لە جێی چاو، نەك بە تاوانی سەیرکردن، وە لەبەرئەوە ئەگەر بە زمان تاوانی بەرامبەر بکات نابڕێت، وە ئەگەر بە گوێ گوێی لێ بگرێ دروست نی یە گوێی بپڕێت، جا لە وەلامی ئەمەدا ئەوتری: بەلکو ئەو سوننەتانە لە گەورەترین ئەسلّ و بنەماکانن، وە هەرچی پێچەوانەی ئەو سوننەتانە نەبێت ئەوە پێچەوانەی ئوسولّە، وە ئەوەی ووتوتانە:

"یاسای خوا وا دانراوە کە چاو بە چاو دەربێت. ئەوە مافێکە لە تۆلّەسەندندایە. بەلام ئەو ئەندامە دەست درێژکەرەی کە ناتوانرێ دووربخرێتەوە ئیللا بەوە نەبێت کە شتێکی تێبگیرێت، ئەوە ئایەتەکە باسی ناکات نە بە نەفی کردن نە بە ئیسبات کردن، وە سوننەت بە ڕون کردنەوەی حوکمەکەی هاتووە ڕون کردنەوەیەکی سەرەتایی، لە بەرئەوەی قورئان لێی بێ دەنگ بووە، نەك پێچەوانەی ئەوە بێت قورئان حوکمی پێ داوە، ئەوەش ناوێکی ترە جیایە لە کوێرکردنی چاو لە (قصاص) تۆلّەدا، وە جیایە لە دوورخستنەوەی ئەو پەلامارەدەرەی کە بە ئاسانتر لەدوای ئاسانتر دوورنەخرێتەوە، چونکە مەبەست دوورخستنەوەی زیانەکەیەتی، جا بۆیە ئەگەر بکرێ بە تێلّا دووربخرێتەوە، بە شمشێر دوورناخرێتەوە.

بەلّام ئەم دەست درێژی کەرە بە سەیر کردنی حەرام کە ناکرێت خۆی لێ بپارێزرێت، چونکە بەشاراوەیی و فێلّەوە ئەکرێت، ئەوە جۆرێکی ترە جیایە لەگەلّ تاوانبارو پەلامارەدەرەکە کە دەست درێژی‌یەکەی نەهاتۆتەدی، وە ئەو سەیرکردنە بەزۆری بە دزی‌یەوە ئەکرێ، هەربۆیە ئەگەر سەیرکراو داوای ئەوەی لێبکرێت کە بەلّگە لەسەر تاوانی ئەو سەیرکەرە بهێنی شتێکی گرانە بۆی. وە ئەگەر فەرمانی پێ بدرێت بە ئاسانترین شێوە دووربخرێتەوە تاوانی دەست درێژی‌یەکەی کە بەچاو کردویەتی و سەیری خاوو خێزانی کردووە ئەرواو بە فیڕۆ ئەچێت.

وە شەریعەت و یاسای تەواویش نە بەمەیان و نە بەوەیان ڕازی نی‌یە، کەواتە چاکترین و گونجاوترین شت کە بکرێو بەس بێ بۆ ئێمەو بۆ تاوانبار، ئەوەیە کە سوننەت هێناویەتی ئەو سوننەتەی کە بەرەنگاری نی‌یەو بەرگر نی‌یە بۆ ڕاستی‌یەتی‌یەکەی، کە ئەوەیە هەر بەردوچکەیەك لەوێدابو تێی بگیرێ، جا ئەگەر چاوێکی دەست درێژکەر نەبوو زیانی پێ ناگات لە هاویشتنی ئەو بەردوچکەدایە، وە ئەگەر چاوێکیش بوو دەست درێژی کردبوو لۆمەی کەس ناکات خۆی نەبێت، چونکە خۆی چاوی تووشی فەوتان و لەناوچون کردووە، وە بەردوچکەهاوێژ ستەمکار نی‌یە بەرامبەری، بەلّکو سەیرکەر خائین و ستەمکارە، وە یاسای ئیسلام بەرزترو تەواوترە لەوەی کە مافی ئەو کەسە بە فیڕۆ بدات کە تاوان بەرامبەری کراوەو ئەتکی حورمەتی کراوەو نەیتوانیوە

لەوکاتەدا شایەت بێنێت و بەهانە بۆ سزادانەکەی دروست بکات: حوکمی خوایە کە دایناوە لەسەر پێغەمبەرەکەی ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْماً لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ (المائدة: من الآية٥٠).

واتە: ج کەسێ دادوەرترە لە خوا لە حوکمیدا بۆ کەسانێك کە لەپاسای خوا تێ بگەن و باوەڕ و یەقینیان هەبێ.

**(٣) کوشتن بۆ بەرگری کردن لە گیان و ماڵ و شەرەف:**

هەرکەس کەسێك یا ئاژەڵێك بکوژێ، لە پێناوی پاراستنی گیانی خۆی یا گیانی کەسێکی تردا، یا لە پێناوی ماڵی خۆی، یا ماڵی کەسێکی تردا، یا لە پێناو پاراستنی شەرەف و ناموسیدا، ئەوە هیچی لەسەر نیە. چونکە دوورخستنەوەی زیان لە گیان و ماڵ واجبە.

جا ئەگەر بە کوشتن نەبوایە لێی دور نەئەکەوتەوە، بۆی هەیە بیکوژێت و بکوژەکە هیچی لەسەر نیە.

موسلیم لە ئەبوهورەیرە ئەگێڕێتەوە خوا لێی ڕازی بێت کە فەرمویەتی: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ووتی:

ئەی نێرراوی خوا ئایا، ئەگەر کەسێك بێتە سەرم بیەوێ ماڵم ببات چی بکەم؟

فەرمووی: ماڵەکەتی مەدەرێ.

ووتی: ئەی ئەگەر شەڕی لەگەڵدا کردم؟

فەرمووی: شەڕی لەگەڵدا بکە.

ووتی: ئەی ئەگەر کوشتمی؟

فەرمووی: شەهید ئەبیت.

ووتی: ئەی ئەگەر من ئەوم کوشت؟

فەرمووی: ئەچێتە ئاگرەوە[١].

ئیبنوحەزم فەرمویەتی: هەرکەس بیەوێ ماڵی کەسێك بە ستەم ببات دز بێت یا کەسی تر. ئەگەر توانی و بۆی لوا دەری بکات، وەرێی لێ بگرێت، ئەوکاتە بۆی ڕەوا نیە بیکوژێ، جا ئەگەر کوشتیشی ئەبێ بکوژرێتەوە، بەڵام ئەگەر کەمترین پێشبینی کرد کە دزەکە پێش دەستی ئەکات بۆی هەیە بیکوژێ و هیچیشی لەسەر نابێت، چونکە بەرگری لە خۆی کردووە.

---

(١) أحمد ٢/٣٦٠) ومسلم (١٤٠).

### کەسێك ئیدیعای ئەوە بکات کە کوشتنەکەی لەبەر دیفاع و بەرگری بووە

ئەگەر بکوژ ئیدیعای ئەوە بکات کە بۆیە تاوان لێکراوی کوشتووە لەبەر دیفاع و بەرگری کردن لەگیانی، یا ناموسی، ئەوە ئەگەر لەسەر قسەکەی شایەت و بەڵگەی هێنا، قسەکەی وەرئەگیرێت و تۆڵە و خوێن بایی لە کۆڵ ئەکەوێت، بەڵام ئەگەر شایەتی نەهێنا، قسەکەی وەرناگیرێ و کارەکەی ئەدرێ بە خاوەن خوێن: نارەزوی خۆیەتی یا لێی ئەبورێت یا تۆڵەی لێئەکاتەوە، چونکە ئەسڵ ڕزگاربوونە هەتا تاوانبار کردن ئەچەسپێت.

وە پرسیار لە عەلی کرا خوا لێی ڕازی بێت دەربارەی کەسێك لەگەڵ ژنەکەیدا پیاوێکی بێگانە ببینێت و هەردوکیان بکوژێت؟

فەرمووی: ئەگەر چوار شایەت نەهێنێ لەسەر ئەوەی ئەو پیاوە لەگەڵ ژنەکەیدا جووت بووە، ئەدرێتە دەست خاوەن خوێن کە بیکوژێتەوە.

جا ئەگەر بکوژ شایەتی نەبوو، بەڵام خاوەن خوێن دانی بەوەدا نا کە کوشتنەکە بەهۆی بەرگری بووە، ئەوە لێپرسراوییەتی لە کۆڵ ئەکەوێ و تۆڵەو خوێن باییشی لەسەر لائەچێت.

سەعیدی کوڕی مەنصور لە سوننەنەکەیدا ئەگێڕێتەوە لەعومەرەوە خوا لێی ڕازی بێت کە ڕۆژێك نانی نیوەڕۆی خواردووە، کابرایەك بەرەو لای ڕای کردووە شمشێرێکی خوێناوی بەدەستەوە بووە، کۆمەڵێکیش بە دوایەوە بوون، کابرا نەوەستا هەتا هاتە لای عومەر و دانیشت، ئەوانی تریش هاتن و وتیان: ئەی پێشەوای موسڵمانان ئەو کابرایە کەسێکی کوشتووین،

عومەر بە کابرای فەرموو: ئەوانە ئەڵێن چی؟

کابرا وتی: ئەی گەورەی موسڵمانان من بەم شمشێرە لەنێوان ڕانەکانی ژنەکەمم داوە ئەگەر کەسێك لە نێوان ڕانەکانیدا بووە کوشتومە.

عومەر بە کۆمەڵەکەی فەرمو: ئەو کابرایە چی ئەڵێت؟

وتیان: ئەی گەورەی موسڵمانان ئەو کابرایە کە شیرەکەی وەشاندووە بەر ناوقەدی پیاوەکە کەوتووە لە نێوان ڕانەکانی ژەنەکەیدا.

عومەر شمشێرەکەی لە کابرا گرت و ڕای وەشاند، لە پاشاندا دایەوە دەست کابراو فەرمووی: ئەگەر دووبارەیان کردەوە تۆش دووبارەی بکەرەوە.

لە زوبەیرەوە ئەگێڕنەوە کە جارێکیان لە سوپاکەی دوا ئەکەوێ و کەنیزەکێکی لەگەڵدا ئەبێت. دوو پیاو دێنە سەر ڕێی و ئەڵێن: شتێکمان بدەرێ، ئەویش ئەو خواردنەی پێی ئەبێت بۆیان هەڵئەدا. ئەڵێن: ئەو کەنیزەکەمان بدەرێ. ئەویش شمشێرێکیان لێئەدا هەردوکیان لەت ئەکات.

ئیبنو تەیمیە وتویەتی: ئەگەر بکوژ بڵێت پەلاماری دراوە لە لایەن کوژراوەوە، بەڵام کەس و کاری کوژراوەکە ئینکارییان کرد لەو قسەیە، ئەگەر هاتو کوژراو بە پیاوچاک ناسرابوو وە لە شوێنێکدا کوژرابوو گومان لە بێ‌تاوانی ئەکرا. قسەی بکوژ وەرناگیرێ.

بەڵام ئەگەر کوژراو بە پیاوخراپ ناسرابوو بکوژیش بە پیاوچاک، قسە قسەی بکوژە لەگەڵ سوێندداني، بە تایبەتی ئەگەر زانرابوو جاری تر ڕێی پێ‌گرتووە.

### دەستەبەری ئەو شتانەی ئاگر لە ناویان ئەبات

کەسێك لە ماڵی خۆیدا ئاگر بکاتەوە وەك عادەتی خۆی، بەڵام با پریشکی بڵاوبکاتەوە و بەو پریشکانە کەسێك یا ماڵی کەسێك بسوتێنێ، ئەو کەسە دەستبەر نابێت.

وەکیع ئەگێڕێتەوە لە عبدالعزیزی کوڕی حوصەینەوە لە یەحیای کوڕی یەحیای غەسسانیەوە وتویەتی:

پیاوێك ئاگر بۆ خۆی ئەکاتەوە پریشکەکەی دەرئەچێت و شتی دراوسێیەکی ئەسوتێنێ، ئەڵێ: ئەو کێشەیە ئەنوسن بۆ عبدالعزیزی کوڕی حوصەین ئەویش بۆی نوسیەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (العجماء جُبار) وە من ڕام وایە کە زیانی ئاگریش بە فیڕۆ هەدەر ئەڕوات.

### لەناوبردنی کشتوکاڵی خەڵك

ئەگەر کەسێك زەویەکەی خۆی زیاد ئاوبدات و کشتوکاڵی دراوسێیەکانی لەناوبرد ئەو کەسە دەستەبەرو زامنە.

بەڵام ئەگەر ئاوەکە لەلایەکەوە داشکا و پێی نەزانی دەستەبەر نییە، چونکە لەلایەن ئەوەوە دەست درێژی نەبووە.

### نوقوم بوونی کەشتی

ئەگەر کەسێك کەشتییەکی هەبوو خەڵك و کەلوپەلی پێ ئەپەڕاندەوە، کەشتییەکە بێ ئەوەی دەستی خاوەنی تێدابێت نوقوم بێت وە هەرچی تێدایە لەناوبچێت، ئەو کەسە زامن و دەستەبەر نابێت.

بەڵام ئەگەر بە هۆی خۆیەوە نوقوم بوو ئەوە دەستەبەرە.

## دەستەبەری پزیشك

زانایان جیاوازی‌یان نی‌یە لەوەدا ئەگەر کەسێك شارەزایی نەبوو لە پزیشکی‌داو ویستی کەسێك چارەسەر بکات بەڵام بە دەرمانەکانی ئەو توشی عەیبداری‌یەك بوو، ئەو کابرایە لێپرسراوە بەرامبەر ئەو تاوانەی، وە دەستەبەرە بەپێی ئەو زیانەی داوێتی، چونکە بەو کارەی بەدەست درێژکار دائەنرێ، وە ئەبێ لە ماڵی خۆی نرخەکەی بدات.

بەپێی ئەوەی عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکی‌یەوە لە باپیری‌یەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من تطبب، و لم يعلم منه قبل ذلك الطب، فهو ضامن) رواه أبوداود، والنسائي، وابن ماجه[1].

واتە: کەسێك خۆی بکات بە پزیشك و لەوەپێش بە پزیشك نەناسرابێت. دەستەبەری هەر زیانێکە کە بیدات.

وە عبدالعزیزی کوڕی عومەری کوڕی عبدالعزیز ووتویەتی: هەندێ لەو کۆمەڵانەی کە ئەهاتنە لای باوکم بۆیان گێڕامەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أيما طبيب تطبَّب على قوم لا يُعْرَفُ له تَطَبُّبٌ قبل ذلك، فأعنت فهو ضامن) رواه أبوداود[2].

واتە: هەر پزیشکێك خۆی کردە پزیشکی خەڵکی و لەوەپێش بە پزیشك نەناسرابو، و زیانی گەیاند بە نەخۆشێك ئەو کەسە دەستەبەرە.

بەڵام ئەگەر پزیشکەکە هەڵەی کرد، لەکاتێکدا زانابوو لە پزیشکی‌دا، زانایان رایان وایە کە ئەبێ خوێن بایی بدات، وە لای بەشی زۆریشیان خوێن بایی‌یەکەی لەسەر خزم و کەسی پزیشکەکەیە[3].

وە وتراوە: ئەبێ لە ماڵی پزیشکەکە خوێن بایی بدرێت.

وە دانانی دەستەبەر بوون و لەبەر پاراستنی رۆحەکانە، وە ئاگادار کردنەوەی پزیشکەکانە بۆ ئەرکەکانی خۆیان و وەرگرتنی هوشیاری پێویست لەو کارانەیاندا کە پەیوەندی هەیە بە ژیانی خەڵکەوە.

---

(١) أبوداود (٤٥٨٦) والنسائي (٨/٥٢و٥٣) وابن ماجه (٣٤٦٦).

(٢) أبوداود (٤٥٨٧).

(٣) وە ئەگەر نەخۆشەکە مرد پزیشکەکە ناکوژرێتەوە، بەڵام خوێن بایی پێویست ئەبێت، چونکە چارەسەرکردنەکە بە ئیزنی نەخۆشەکە بووە.

وە لە مالیكەوە ئەگێڕنەوە: كە پزیشكەكە هیچی لەسەر نابێت.

### پیاوێك ژنەكەی خۆی بدڕێنێ

ئەگەر پیاوێك چووە لای ژنەكەی و لاقەی كرد و دڕاندی. جا ئەگەر ئەو ژنە گەورە بوو بە جۆرێك كە ئافرەتی وەك ئەو مێردی ئەكردو توانای چونەلای هەبوو، ئەو پیاوە دەستەبەر نابێت. بەڵام ئەگەر بچووك بوو، و ئافرەتی وەك ئەو بۆ شوكردن و چونەلا نەئەشیا. ئەو پیاوە ئەبێ خوێن بایییەكەی بدات.

وە دڕاندن لێرەدا مانای ئەوەیە كە ئەو پە ردەیە بدڕێنێ كەلە نێوان كۆم و پێشدا هەیە.

### دیوارێك بكەوێ بەسەر كەسێكداو بیكوژێت

ئەگەر دیوارێك لاربووبۆوە بۆ لای ڕێگای گشتییەوە، یا بەولای مولكی كەسێكەوە، لەپاشاندا بكەوێت بەسەر كەسێكداو بیكوژێت. ئەوە ئەگەر لە پێشەوە داوا لە خاوەنەكەی كرابێت ئەو دیوارە لا بدات و دەسەڵاتی چاك كردنی هەبوو، بەڵام چاكی نەكردبوو، هەرچی بە هۆی ڕوخاندنی ئەو دیوارەوە لەناوچوو خاوەن دیوار دەستەبەرە، بەڵام ئەگەر كەس داوای لێنەكردبوو دەستەبەر نابێت.

وە ڕیوایەتی ئەشهەب لە مالیكەوە: ئەگەر ترسی ڕوخاندنی گەیشتە پلەیەك كە كەس ئەمین نەئەبوو لەوەی كە ئەگەر بڕوخێ بێزیان ئەبێت، هەرچی زیانێك بەهۆی ئەوەوە ڕویدا خاوەنی دەستەبەرە، لەپێشەوە داوای چاك كردنی لێ كرابێت یا نەكرابێت، شایەت هەبێ لەسەری یا نەبێت.

وە بەناوبانگترین ڕوایەت لە ئەحمەدەوە، وە ڕوون ترین ڕاو بۆچوون لای شافیعییەكان ئەوەیە كە خاوەنی دەستەبەر نابێت.

### دەستەبەری بیرهەڵكەن

ئەگەر كەسێك بیرێكی هەڵكەندو كەسێكی تری تێكەوت، ئەوە ئەگەر لە ملكی خۆیدا بوو یا لە ملكی كەسێكی تردا بوو، بەڵام بە پرسی خاوەنی هەڵی كەندبوو دەستەبەر نابێت.

بەڵام ئەگەر لە مولكی كەسێكی ترداو بێ پرسی خاوەنی هەڵیكەندبوو دەستەبەر ئەبێت، بەڵام ئەگەر لە مولكی خۆیدا بوو، یا بە پرسی خاوەن مولك بوو، یا لە زەوی بێ خاوەن و وێرانەدا بوو، دەستەبەری لەسەر نییە، بەپێی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ كە فەرمویەتی: (البئر جُبار) واتە: ئەگەر بیرەكە بەو شێوەیە بوو هەرچی تێكەوت خوێنی بە فیڕۆ ئەڕوات و خوێن بایی نییە، وە مالیك وتویەتی: ئەگەر لە شوێنێكدا بیرەكەی هەڵكەند كە عادەت وابوو لەو شوێنانەدا بیر هەڵئەكەندرا دەستەبەر نییە، بەڵام ئەگەر زیادەڕەوی كردبوو لە هەڵكەندنیا ئەوە دەستەبەرە.

وە ئەگەر کەسێك بە کەسێکی موکەللەفی وت بچۆ ناو ئەو بیرە، یا بچۆ سەر ئەوداره، ئەو کەسەش بە قسەی کرد و بە چونە ناوبیرەکە یا بە چونەسەر دارەکە مرد، ئەو کەسە دەستبەر نابێت چونکە زۆری لێ نەکردووە.

وە هەروەها ئەگەر حاکمێك کەسێك بە کرێ بگرێ بۆ ئەوکارە، هەر دەستبەر نییە لەبەر نەبوونی تاوان و دەست درێژی لەوەوە.

وە ئەگەر کەسێك خۆی یا کورێکی دایە دەست مەلەوانێك کە بە چاکیش مەلەی ئەزانی کەچی خنکا، ئەو مەلەوانە هیچی لەسەر نابێت.

**پرس کردن بۆ بردنی خواردەمەنی و شتی تر**

جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون: کە دروست نییە کەس ئاژەڵ و ماڵاتی کەس بدۆشێت بەبێ پرسی خاوەنی. بەڵام ئەگەر ناچاربوو و خاوەنی ئامادە نەبوو، بۆی هەیە شیرەکەی بدۆشێ و بیخواتەوە و دوایی نرخەکەی بدات بە خاوەنی.

وە هەروەها هەموو خواردەمەنییەك و میوەو بەری درەخت کە بەدارەوەیە هەر بەو شێوەیەیە، چونکە ناچاری مافی کەس نافەوتێنێ.

مالیك ئەگێڕێتەوە، لە نافیعەوە، لە ئیبنو عومەرەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا يَحْتَلِبَنَّ أحدٌ ماشيةَ أحدٍ بغير إذنه. أيحب أحدكم أن يؤتى مشربته فتكسر خزانته، فينتقل منها طعامه، وإنما تخزن لهم ضروع مواشيهم أطعماتهم، فلا يحتلبن أحدٌ ماشية أحدٍ إلا بإذنه)[1].

واتە: کەس بەبێ پرسی خاوەنی ئاژەڵ، ئاژەڵەکەی نەدۆشێ، ئایا کەس لە ئێوە حەزئەکات یەکێك بچێتە ناو ژوورەکەیەوەو شوێنی قایم کردنی خواردنەکەی بشکێنێ و بیبات، جا گوانی ئاژەڵەکانیشیان شوێنی قایم کردنی خواردەمەنییەکانیانن و خواردەمەنییەکانیان بۆ هەڵئەگرن، لەبەر ئەوە کەس بەبێ پرسی خاوەنی ئاژەڵ، ئاژەڵ نەدۆشێت.

شافیعی فەرمویەتی: دەستبەر نابێت، چونکە بە ناچاربوون دەستبەربوون لە کۆڵ ئەکەوێت، لەبەرئەوەی یاسادانەری ئیسلام رێگەی داوە بە کەسێك کە ناچار بێت، وە رێ پێدان و دەستبەری کۆنابنەوە.

(١) أحمد (٢/٦) والبخاري (٢٤٣٥) ومسلم (١٧٢٦/١٣) ومالك في الموطأ (٣٥٥).

## سوێند دان (القسامة)

مەبەست لە (قسامة) سوێنددانە.

شێوەی سوێنددانەکە ئەوەیە: کەسێك بە کوژراوی ئەدۆزرێتەوە کەس نازانێ کێ کوشتویەتی. جا ئەو کۆمەڵەی گومان هەیە بکوژەکەیان لەناودایە، یەك یەك سوێند ئەدرێن، بەمەرجێ نیشانەیەکی ئاشکرا هەبێت کە ئەو کۆمەڵە یەکێکیان یا هەموویان دەستیان لە کوشتنەکەدا هەبێت. وەك ئەوەی کوژراوەکە لەناو کۆمەڵێکدا بێت کە دوژمنی بن، وە ئەو کۆمەڵە کەسیش تێکەڵیان نەبێت.

یا کۆمەڵێك کۆببنەوە لە ماڵێك دا یا لە بیابانێکدا، کەسێك لەناویاندا بکوژرێت یا لە نزیکیانەوە کوژرابێت، وە پیاوێك هەبێت دەستی خوێناوی بێت.

جا ئەگەر کوژراوەکە لە ئاوەدانییەکدا بێت یا لە ڕێگایەك لە ڕێگاکانیدا بێت، یا نزیك ئەو ئاوەدانییە بێت، ئەو دانیشتوانە هەموویان سوێند ئەدرێن، بەڵام ئەگەر لاشەی کوژراوەکە لە نێوان دوو ئاوەدانیدا بێت، (قسامة) لەسەر ئەوەیان بەجێ دێت کە نزیك ترە لەلاشەی کوژراوەکەوە.

وە چۆنییەتی (قسامة)یش بەم شێوەیە دەبێت:

خاوەن خوێن دێت پەنجا پیاو لەو ئاوەدانییە هەڵئەبژێرێت کە سوێند بخۆن بە خوا ئەوان نەیان کوشتووەو نازانن کێ کوشتویەتی.

جا ئەگەر سوێندیان خوارد خوێن باییەکەیان لە کۆڵ ئەکەوێت، بەڵام ئەگەر سوێندیان نەخوارد ئەوە خوێنی ئەو کوژراوە پێویست ئەبێت لەسەر هەموو دانیشتووەکان.

بەڵام ئەگەر ڕوون نەبۆوە کێ کوشتویەتی خوێن باییەکەی لەسەر (بيت المال) ئەبێت.

### ئەو ڕێبازە عەرەبییەی ئیسلام بڕیاری لەسەر مانەوەی داوە

پێشان (قسامة) لە سەردەمی نەفامیدا کاری پێ ئەکرا، جا کە ئیسلام هات بڕیاریدا لەسەر مانەوەی بەو شێوەیە کە هەبووە.

وە حیکمەتی بڕیارەکەی ئیسلام لەسەر مانەوەی (قسامة)، ئەوەیە کە (قسامة) دیاردەیەکە لە دیاردەکانی پارستنی سەر، وە بۆ ئەوەی خوێنی کوژراو بە فیڕۆ نەڕوات.

بوخاری و نەسائی لە ئیبنو عەبباسەوە، خوا لێیان ڕازی بێت ئەخرجیان کردووە کە فەرمویەتی: یەکەم (قسامة) کە کرا لەسەردەمی نەزانیدا بوو:

کابرایەکی قورەیشی پیاوێکی لە بەنی هاشم بەکرێ گرت ووشتری لەگەڵدا بلەوەڕێنێ ئەویش لەگەڵیا ووشترەکانیان برد بۆ لەوەڕ لە ڕێگا کابرایەکی بەنی هاشمی توش ئەبێت کە قوڵفی جەواڵی

وشترەکەی ئەپچڕێت. هاوار ئەبات بۆ کابرای بەکرێ گیراو کە لە بەنی هاشمە پێوەندێکی بداتێ قوڵفی جەواڵەکەی پێ ببەستێتەوە ئەویش ئەیداتێ.

کاتێ ووشترەکان لائەدەن بۆ حەوانەوە ووشترەکان ئەبەستنەوە خاوەن ووشتر ئەڵێت: پەتی ئەو ووشترەیان کوا ئەویش ئەڵێت: پەتی بەستنەوەی نەبووە.

خاوەن ووشتر ئەڵێت ئەی پەتەکەی کوا؟ لە پاشاندا داردەستەکەی تێئەگرێت ئەی کوژێت و بەجێی ئەهێڵێ. هێشتا گیانی دەرناچێت کابرایەکی یەمەنی بەلایدا تێئەپەڕێت.

بە یەمەنی‌یەکە ئەڵێت: ئەمساڵ ئەچیت بۆ حەج؟

ئەویش ئەڵێت: بە تەمانیم. بەڵام لەوانەشە بچم.

ئەڵێ: ئایا پەیامێك لەمنەوە ناگەیەنیتە مەککە هەرکاتێك بۆت ڕێك کەوت؟

ئەویش ئەڵێت: بەڵی ئەیگەیەنم.

ئەڵێت ئەگەر چوویت: هاوار بکە. ئەی قورەیش. ئەگەر وەڵامیان دایتەوە بڵێ: ئەی ئالی بەنی هاشم، ئەگەر هاتن بە دەنگتەوە، بپرسە ئەبی طالیب کامەیە و پێی بڵێ فلانە کەس فلانە کەسی لەسەر پەتێکی ووشتر بەستنەوە کوشتووە.

لە پاشاندا بەکرێ گیراوەکە ئەمرێت.

کاتێ کابرای خاوەن ووشتر دێتەوە، ئەبوطالب ئەچێتە لای و ئەڵێ هاوەڵەکەمان چی بەسەر هات.

ئەویش ئەڵێت: نەخۆش کەوت و مرد، منیش بە جوانترین شێوە سەروکاری شاردنەوەیم کرد.

ئەڵێ: ئەو کارە هەر لە تۆ ئەوەشێتەوە.

ماوەیەکی بەسەردا تێپەڕ ئەبێت ئەو پیاوەی کوژراوەکە ڕای ئەسپێرێ، ئەچێ بۆ حەج.

هاوار ئەکات: ئەی قورەیش.

ئەڵێن: ئەوانە قورەیشین.

ئەڵێ: ئەی ئالی بەنی هاشم.

ئەڵێن: ئەمانە بەنی هاشمن.

ئەڵێ: ئەبو طالیب لەکوێیە؟

ئەڵێن: ئەوە ئەبو طالیبە.

ئەڵێت: فلانە کەس ڕای سپاردوم پەیامێکت پێ بگەیەنم ئەویش ئەوەیە: فلانە کەس کوشتویەتی لەسەر پەتێکی ووشتر بەستنەوە. ئەبو طالیب ئەچێتە لای کابراو پێی ئەڵێت: لەم سیانە یەکێکیان هەڵبژێرە.

ئەگەر حەز ئەکەی سەد ووشتر بدە. چونکە هاوەڵەکەمان تۆ کوشتوتە، وە ئەگەر حەزئەکەی پەنجا پیاو لە هۆزەکەت سوێند ئەدەین کە بڵێین تۆ ئەت کوشتووە.

ئەگینا ئەت کوژینەوە لە جیاتی ئەو کوژراوەمان، کابراش هاتە لای هۆزەکەی و پێی ڕاگەیاندن.

ئەوانیش ووتیان: سوێند ئەخۆین.

ژنێکی بەنی هاشم هاتە لای ئەبی طالیب کە ژنی پیاوێك بوو لەوان و کوڕێکی لێی هەبوو ووتی:

ئەی ئەبی طالیب حەز ئەکەم پیاوێکی تر بخەیتە جێی کوڕەکەم و پەنجا پیاوەکەی پێ تەواوبکەو کوڕی من سوێند مەدە لەجێیەکدا کە سوێندەکان خاوەنەکەیان ئەگرن، ئەویش کارەکەی بە گوێ کرد ، لە دواییدا پیاوێك لەوان هاتە لای ووتی:

ئەی ئەبا طالیب پەنجا کەست ئەوێت لە جیاتی سەد سەر ووشتر سوێند بخوات کە هەریەکەیان دوو سەر ووشتری بەرئەکەوێت.

ئەوە دوو ووشتری خۆم و سوێندم مەدە، چونکە سوێند خواردن خاوەنەکەی ئەگرێت، ئەویش دوو ووشترەکەی لێوەرگرت.

بەڵام چل و هەشت کەسەکەی تر هاتن سوێندیان خوارد. ئیبنوعەبباس خوا لێیان ڕازی بێت فەرمویەتی:

بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە، ساڵ نەگەڕاوە بەسەریاندا، لەو چل و هەشت کەسە چاو تروکێنەریان لێ نەما (مردن)[1].

## جیاوازی زانایان لە حوکمی (قسامة) دا:

زانایان جیاوازییان هەیە لە پێویست بوونی حوکمی (قسامة) دا، جەماوەری زانایان ووتویانە: پێویستە حوکمی پێ بکرێ.

(١) البخاري (٣٨٤٥) والنسائي في السنن الكبرى (٦٩٠٩).

وە کۆمەڵێکی تر ووتویانە: دروست نییە حوکم پێ‌کردنی.

ئیبنوڕوشد لە کتێبی (بداية المجتهد)دا ووتویەتی: حوکم پێ‌کردنی بە گشتی، زانایانی وولاتانی ئیسلامی گفتیان لەسەر داوە، وەك مالیك و شافیعی و ئەبو حەنیفەو، ئەحمەد و سوفیان و داودو هاوەڵەکانی، وە گەلێ کەسی تر لە زانایانی وولاتانی ئیسلامی.

وە کۆمەڵێکی تر لە زانایان ووتویانە: دروست نییە حوکم پێ‌کردنی لەوانە: سالیمی کوڕی عبدالله و ئەبو قەلابەو، عومەری کوڕی عبدالعزیز، و ئیبنو عولەییەیە. وە پشتیوانی جەماوەر ئەوەیە کە سابت بووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ لە حەدیسەکەی حوەیصە و موحەیصە.

کە ئەم فەرموودەیە ئەهلی حەدیس ڕێکن لەسەر ئەوە کە صەحیحە، بەڵام جیاوازی هەیە لە زاراوەکانیدا.

وە پشتیوانی کۆمەڵی دووەم لە دروست نەبوونی کار پێ‌کردنیا ئەوەیە کە (قسامة) پێچەوانەی (أصول) بنەماکانی یاسای ئیسلامە کە ئیجماع هەیە لەسەر ڕاستی‌یەتی‌یان، جا لەو بنەمایانە: ئەوەیە کە نابێت کەس سوێند بخوات لەسەر شتێك کە بە تەواوی نەیزانێت، یا خۆی نەی بینێت، جا کە ئاوایە چۆن سەرپەرشتیاری خوێن سوێند ئەدرێن، لە کاتێکدا کوژراوەکەیان نەدیوە، بەڵکو جاری وائەبێت ئەمان لە شارێکن و کوشتنەکە لە شارێکی تر ئەبێت.

لەبەرئەوە بوخاری لە ئەبو قەلابەوە ئەگێڕێتەوە:

کە عومەری کوڕی عبدالعزیز ڕۆژێك شوێنی خۆی بۆ خەڵك دەرخست، لە پاشاندا ڕێی دا بە خەڵکەکە بچنە لای، پاشان لێی پرسین ئێوە چی ئەڵێن دەربارەی (قسامة)؟. خەڵکەکە بە جارێك ووتیان: ئێمە ئەڵێین (قسامة) تۆڵەسەندن پێی هەقە. وە خەلیفەکان تۆڵەیان پێ سەندووە.

عومەر فەرمووی: ئەبو قەلابە تۆ چی ئەڵێیت؟ وە وای لێ کردم خەڵك هەموویان سەیرم بکەن.

منیش ووتم: ئەی ئەمیری موسڵمانان، گەورە پیاوانی عەرەب لە خزمەتتان، وە سەرۆکی سوپاکانیشت لە دەورە.

ئایا ئەگەر پەنجا پیاو لێرەدا شایەتی بدەن لەسەر پیاوێك کە لە دیمەشق زینای کردووەو چاویشیان پێی نەکەوتووە، ئایا تۆ ئەو پیاوە ڕەجم ئەکەیت؟

فەرمووی: نەء.

ئەڵێ ووتم: ئەی ئەگەر پەنجا پیاو شایەتی بدەن لەسەر پیاوێك کە لە (حمص) دزی کردووە چاویشیان پێی نەکەوتووە، ئایا تۆ دەستی ئەبڕیت؟

فەرمووی: نەء.

وە لە هەندێ ڕیوایەت دا هاتووە:

ئەڵێ ووتم: ئەی چۆن ئەگەر لای تۆ شایەتی بدەن كە ئەو پیاوەی كوشتووە لە فلانە شوێن ئەوانیش لای تۆن. ئەچی تۆڵەی پێ بسێنی؟

ئەڵێ: ئینجا عومەری كوڕی عبدالعزیز بۆ بەشەكانی وولاتی ئیسلامی نووسی دەربارەی (قسامة) سوێندان، ئەگەر دوو شایەتی دادپەروەریان هێنا لەسەری: كە فلانە كەس كوشتویەتی تۆڵەی لێ بكەنەوە، بەڵام بە شایەتی پەنجا پیاوی لای خۆیان ناكوژرێتەوە كە سوێندی لەسەر بخۆن.

وە هەروەها كۆمەڵی دووەم وتویانە: كە لە بنەماكانی یاسای ئیسلامە: كە سوێند خواردن كار ناكاتە سەر خوێن ڕشتن و كوشتنەوە، وەكاری پێ ناكرێت، وە هەروەها ووتویانە: لەو بنەمایانە ئەوەیە: كە داواكار (مدعي) ئەبێ شایەت و بەڵگە بهێنێ، وە ئەوەی ئینكاری كرد سوێند بدرێت.

وە لە بەڵگەكانیان ئەوەیە كە: ئەڵێن لەم فەرموودانەدا ئەگێڕراوەتەوە كە پێغەمبەر ﷺ حوكمی بە قسامە كردبێت، بەڵكو ئەوە حوكمێكی سەردەمی نەفامی بووە، وە پێغەمبەر لەگەڵیانا دڵنەرمی نواندو نیشانی دان كە چۆن نابێت حوكمی پێ بكرێت لەسەر بنەماكانی ئیسلام.

لەبەرئەوە پێی فەرموون: ئایا پەنجا پیاو لە ئێوە سوێند ئەخۆن؟ (مەبەستم خاوەن خوێنەكانە كە ئەنصار بوون) ئەوانیش ووتیان: چۆن سوێند لەسەر شتێك بخۆین كە نەمان بینیوە؟ فەرمووی: جولەكەكان سوێند ئەخۆن بۆتان.

وتیان: چۆن سوێندی ئەو بێباوەڕانە وەرئەگیرێن؟

وتویانە: ئەگەر ئەو سوێندخواردنە سوننەت بوایە با چاویشیان پێی ئەكەوتایە، ئەوە پێغەمبەر ﷺ پێی ئەفەرموون: سوننەت وایە.

ئیبنو ڕوشد ئەفەرموێت: ئەگەر ئەم فەرمودانە دەق نەبن لەبارەی حوكم كردن بە (قسامة)، وە لێكدانەوەو تەئویل ڕێیان پێ بەرێت، ئەوە تەئویل كردنیان و گێڕانەوەیان بۆ بنەماكانی ئیسلام باشترە.

بەڵام ئەوانەی گفتیان داوە لەسەر حوكم كردن بە (قسامة) بە تایبەتی مالیك، ڕای وایە كە سوننەتی (قسامة) سوننەتێكی تاكە لە خۆیداو تایبەتكەرە بۆ بنەماكان، هەروەك هەموو ئەو سوننەتانەی تایبەتكەرن.

وە ڕای وایە کە هۆیەکەی پاراستنی خوێنەکانە، چونکە لەکاتێکدا خوێن ڕشتن زۆر ئەبێت و شایەتیدان لەسەری کەم ئەبێتەوە، لەبەر ئەوەی بکوژ بۆ شوێنێك ئەگەڕێ بۆ ئەو کەسەی کە ئەیەوێ بیکوژێ تێیدا چۆڵەوانی بێت، ئەم سوننەتە دانراوە لەبەر پاراستنی خوێنی خەڵك.

بەڵام ئەم هۆیە جەردەو ڕێگریش ئەگەرێتە ناوی، چونکە دزو جەردە شایەتی دان لەسەریان گرانە.

لەبەرئەوەیە مالیك شایەتی ڕووت کراوەکانی لەسەر جەردەکان بە دروست داناوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە پێچەوانەی بنەماکانی شەرعە، ئەویش بەوەی کە ڕووت کراوەکان بە (مدعي) داواکار دائەنرێن لەسەر ڕووت کردنەوەکەیان -تەواو-

## تەمێ کردن (التعزیر)

١- پێناسەکەی:

(تعزیر) دێت بەمانای بەگەورەدانان و یارمەتی دان، وەك فەرمودەی خوای گەورە: ﴿لِتُؤمِنوا بِاللهِ وَرَسولِهِ وتُعَزِّروهُ﴾ (فتح الآیة ٩) واتە: بۆ ئەوەی باوەڕ بە خواو پێغەمبەرەکەی بهێنن و یارمەتی پێغەمبەرەکەی بدەن و ڕێزی لێ بگرن.

وە هەروەها بە مانای سوکایەتی پێ کردنیش دێت، ئەوترێ: فلان کەس فلان کەسی (تعزیر) کردووە، کاتێك سوکایەتی پێ بکات لەبەر تەمێ کردن لەسەر تاوانێك کە ئەنجامی داوە.

وە مەبەست بە (تعزیر) لە شەرعدا: تەمێ کردنە لەسەر تاوانێك کە نە تۆڵەی لەسەرە نە بریتی (کفارە).

واتە سزایەکە بۆ تەمێ کردن و پەروەردە کردن حاکم دایئەنێ لەسەر تاوانێك یا گوناهێك کە شەرع سزای بۆ دانەناوە.

یاخود سزایەکی بۆ داناوە، بەڵام مەرجەکانی جێبەجێکردنی تێدانییە، وەك پەلاماردانی ئافرەت و زینا لەگەڵدا نەکردنی، یا دزینی شتێك کە دەستی لەسەر نابڕرێت، یا تاوانێك تۆڵەی لەسەر نەبێت، یا ژن سواری ژن ببێت، یا تۆمەت هەڵبەستن بۆ کەسێك جگە لە تۆمەتی زینا

چونکە سەرپێچی کردن سێ جۆرە:

١- جۆرێکیان حەددی لەسەرەو کەفارەتی لەسەر نییە، وەك ئە حەددانەی لە پێشەوە باسکران.

٢- جۆرێکی تریان کەفارەتی لەسەرە و حەددی لەسەر نییە وەك: چونە لای ژن لە ڕۆژی ڕەمەزان، وە لەکاتی ئیحرامدا.

٣- جۆرێكی تریان نە بریتی لەسەرە نە حەددی لەسەرە: وەك ئەو سەرپێچی كردنانەی باسمان كردن كە تەنها تەمێ‌كردن پێویستە.

(٢) دانانی تەمێ كردن لە یاسای ئیسلام دا:

بناغەی دانانی تەعزیر لە یاسای ئیسلامدا ئەوەیە كە ئەبو داود و (ترمذي) و نەسائی و بەیهەقی لە بەهزی كوڕی حەكیمەوە گێڕاویانەتەوە لە باوكییەوە لە باپیرەیەوە كە پێغەمبەر ﷺ لەسەر سەرپێچی خەڵكی بەند كردووە. حاكم بە صەحیحی داناوە[1].

وە ئەو بەندكردنەی بۆ ئیحتیات بووە هەتا ڕاستی دەركەوێت.

وە بوخاری و موسلیم و ئەبوداود تەخریجیان كردووە، كە هانی كوڕی نەییار خۆی گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە فەرمویەتی: (لا تجلدوا فوق عشرة أسواط، إلا في حدّ من حدود الله تعالى)[2].

واتە: لە دە قامچی زیاتر مەدەن لە كەس لەسەر تەمێ كردن، جگە لەو تاوانانەی كە حەددی شەرعییان لەسەرە.

وە سابتە كە عومەری كوڕی خەططاب خوای لێ ڕازی بێت خەڵكی بە سەرتاشین و دوورخستنەوە لێدان تەمێ ئەكرد. وە هەروەها دوكانی ئارەق خۆرەكانی ئەسوتاند، وە ئەو دێهاتانەی ئەسوتاند كە ئارەقیان تێدا ئەفرۆشرا، وە كۆشكەكەی سەعدی كوڕی ئەبی وەققاصی سوتاند لە كوفەدا، كاتێ خۆی لە خەڵك گرتبۆوە تێیدا.

وە دوڕڕەیەكی دروست كردبوو لەو كەسانەی ئەدا پێی كە شایستەی لێدان بوون. وە خانوویەكی دانابوو بۆ بەندیخانە، وە دای لە شیوەنكەر و ئەوانەی ئەیان لاواندەوە بۆ مردوو هەتا قژی دەرخست.

وە هەرسێ پێشەواكە وتویانە: تەمێ كردن واجبە.

وە شافیعی وتویەتی: تەمێ كردن (واجب) نیە.

---

(١) أحمد (٥/٢) وأبوداود (٣٦٣٠) والترمذي (١٤١٧) والنسائي (٨/٦٧) والحاكم (٤/١٠٢) والبيهقي (٦/٥٣).

(٢) أحمد (٣/٤٦٦) والبخاري (٦٨٥٠) ومسلم (١٧٠٨) وأبوداود (٤٤٩١) والترمذي (١٤٦٣) وابن ماجه (٢٦٠١).

**(٣) حیکمەتی دانانی تەمبێ کردن و جیاوازی لە نێوان تەمبێ کردن و حدود:**

ئیسلام تەمبێکردنی داناوە بۆ تەمبێ کردنی سەرپێچیکەران و دەرچووان لە یاسا، کەواتە حیکمەت لە دانانی تەمبێ کردندا وەك حیکمەتی دانانی حەددە شەرعییەکانە کە لە پێشەوە باس کران، بەڵام تەنها لە سێ ڕووەوە جیاوازی هەیە لەگەڵ حەددەکاندا.

١- حەددە شەرعییەکان خەڵك هەموو یەکسانن تێیاندا، بەڵام تەمبێکردن بەپێی جیاوازییان ئەگۆڕێت.

جا ئەگەر پیاو چاکێك هەڵەیەکی کرد، دروستە چاوپۆشی بکرێ لە هەڵەکەی، وە ئەگەر سزاش بدرێت لەسەری ئەبێ سزاکەی سوکتر بێت لەسزای ئەو کەسانەی وەك ئەو نین لە پیاو چاکیداو ئەو هەڵەیە ئەکەن.

ئەحمەدو ئەبوداود و نەسائی و بەیهەقی ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أقيلوا ذوي الهيئات عثراتهم، إلا الحدود)[1].

واتە: لە هەڵەی پیاوچاکان چاوپۆشی بکەن، مەگەر لە تۆڵەدا بێت.

واتە: ئەگەر پیاوێك هەڵەیەکی کردو ئەو پیاوە خراپەی لێوە نەئەزانرا، یا تاوانێکی بچووکی کرد. یا ملکەچی یاسا بوو، بەڵام ئەوە یەکەم هەڵەی بوو، لێی مەگرن. وە ئەگەر هەر لێ گرتن پێویست بوو، ئەبێ بە سووکی لێی بگیرێ.

٢- حەددە شەرعییەکان تکاکردن دروست نییە تیایاندا، دوای ئەوەی خرایە بەردەم حاکم، بەڵام تەمبێکردن لە بەردەم حاکمیشدا دروستە تکای بۆ بکرێت.

٣- ئەگەر کەسێك بە سزای تەمبێ کردن مرد ئەو کەسەی تەمبێکەی کردوە زامنە، عومەری کوڕی خەططاب خوای لێ ڕازی بێت ئافرەتێکی، ترساند ئەویش لە ترسانا منداڵەکەی لەبار چو، عومەر خوێن بایی کۆرپەلەکەی دا.

ئەبوحەنیفە و مالیك ووتویانە: نە دەستبەری تێدایە نە هیچ شتێك، چونکی تەمبێ کردن و حەددی شەرعی لەو بارەیەوە وەك یەکن.

(٤) شێوەی تەمبێ کردن:

تەمبێ کردن بە قسە ئەبێت: وەك توڕەبوون و قسە پێ ووتن و ئامۆژگاری کردن.

---

(١) أحمد (٦/١٨١) وأبوداود (٤٣٧٥) والنسائي في الكبرى (٧٢٩٣و٧٢٩٤) والبيهقي (٨/٢٦٧).

وە بە کردەوەش ئەبێت بە پێی ئەو حاڵەی کە پێویستی ئەکات، وە هەروەها بە لێدان و بەندکردن و پێوەندکردن و دورخستنەوەو دابڕین لە خەڵکی و شکاندن ئەبێت.

ئەبو داود ئەگێڕێتەوە کە کەسێکی نێرەموکیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ کە دەست و قاچی لە خەنە گرتبوو.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەمە چیەتی؟

وتیان: خۆی وەکو ژن لێ ئەکات.

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا دووریان خستەوە بۆ بەقیع.

ووتیان: ئەی نێرراوی خوا! بیکوژین؟

فەرمووی: (إني نهيت عن قتل المصلين)[1].

واتە: من کوشتنی نوێژکەرانم لێ قەدەغە کراوە.

و دروست نیەیە تەمێ کردن بە ڕیش تاشین و خانو تێک دان و هەڵکەندنی باغ و کشتوکاڵ و بەروبوم و درەخت.

وە هەروەها نابێت بە لوت قرتاندن و گوێ بڕین و لچ بڕین و سەرپەنجە بڕین، چونکە ئەمانە لە هیچ صەحابەیەکەوە نەبیستراوە کە کردبێتیان.

(٥) زیاتر لەلێدانی دە قامچی لە تەمێ کردندا:

لە پێشەوە لە حەدیسەکەی هانیئی کوڕی نەییاردا باس کرا کە لە تەمێ کردندا نابێت لە دە قامچی زیاتر لەکەس بدرێت.

ئەحمەد و لەیث و ئیسحاق و کۆمەڵێك لە شافیعیەیەکان لەسەر ئەوە ڕۆیشتون و ووتویانە:

دروست نیەیە لە دە قامچی زیاتر لە کەس بدرێت لە تەمێ کردندا وەك یاسادانەری ئیسلام بڕیاری لەسەر داوە.

وە مالیك و شافیعی و زەیدی کوڕی عەلی و کۆمەڵێکی تر بۆ ئەوە چون کە دروستە لە تەمێ کردندا لە دە قامچی زیاتر لە تاوانبار بدرێت، بەڵام نابێت بگاتە کەمترین حەددی شەرعی.

---

(١) أبوداود (٤٩٢٨).

وە هەندێك ووتویانە: نابێت تەمێ کردن لە هیچ تاوانێکدا بگاتە ڕادەی حەد لەو تاوانەدا. وە نابێت سەیرکردن و دەست دان لە ئافرەت بگەیەنرێتە حەددی زینا، وە دزی کردن لە شتی نەپارێزراو بگەیەنرێتە حەددی دەست بڕین.

وە نابێت خوێن دان بەبێ تاوان هەڵبەستن بگەیەنرێتە حەددی قەذف.

وە وتراوە: حاکم ئیجتیهاد ئەکات و سزاکە بە پێی بەرژەوەندی و ئەوەندەی تاوانەکە دائەنێت.

(٦) تەمێ کردن بە کوشتن:

هەندێ لە زانایان ڕێیان داوە کە لە تەمێ کردندا کوشتنیش هەبێت، وە هەندێکی تر قەدەغەیان کردووە.

لە ئیبنوعابدینەوە هاتووە کە نەقڵی ئەکات لە (حافظ ئیبنو تەیمیە): لە بنەماکانی مەزهەبی حەنەفیدا هاتووە، کە ئەو تاوانانەی کوشتنی تێدا نیە بەلای ئەوانەوە. وەك کوشتن بە شتێکی قورس، یا زینای پیاوان ئەگەر چەند جارە کرابەوە، بۆ پێشەوا هەیە کە بکەرەکەی بکوژێت. وە هەروەها بۆی هەیە کە لەو سزایەی بۆی دانراوە زیاتر بکات ئەگەر لەوەدا بەرژەوەندی بزانێت.

(٧) تەمێ کردن بە سەندنی ماڵ و سامان:

وە دروستە تەمێ کردن بە ماڵ لێسەندن. ئەمەش مەزهەبی ئەبی یوسفە و مالیکیش لەسەری ڕۆیشتووە.

خاوەنی کتێبی (معين الحكام) ووتویەتی: هەرکەس بڵێت: سزا مالیەکان نسخ بوون و سڕاونەتەوە، هەڵەی کردووە لە مەزهەبی هەر چوار پێشەواکەدا، لەڕوی نەقڵ کردن و بەڵگە هێنانەوە، وە فتوادان بە سڕانەوەی ئەو سزایە ئەوەندە ئاسان نیە. وە ئەوانەی ئەڵێن سڕاوەتەوە نە سوننەتیان لەگەڵدایە نە ئیجماعی زانایان کە قسەکەیان بە ڕاست دابنێت، ئەوەندە نەبێت بڵێن: بەپێی مەزهەبی هاوەڵەکانمان دروست نیە.

ئیبنوقەیم فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ خەڵکی تەمێ کردووە بەوەی بێبەشی کردووە لە کەلوپەلی گیراوی جەنگ، واتە بەشی غەنیمەتی نەداوەتێ.

وە ڕای گەیاندووە كە هەركەس زەكات نەدا ئەبێ تەمێ بكرێت بەوەی نیوەی ماڵەكەی لێ بسەندرێت.

بە پێی ئەوەی ئەحمەد و ئەبوداد و نەسائی گێڕاویانەتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من أعطاها مؤتجراً فله أجرها، ومن منعها فإنّا آخذوها، وشطْرَ ماله، عَزْمةً من عَزَماتِ ربّنا)[1].

واتە: هەركەس زەكاتی دا بە هیوای پاداشتی خوا ئەوە پاداشتی هەیە، وە هەركەس نەیدا ئێمە زەكاتەكەو نیوەی ماڵەكەی لێ ئەسەنین، ئەمەش حەقێكی واجب و سابتە لە حەقەكانی پەروەردگارمان.

(٨) تەمێ كردن مافی حاكمە:

وە تەمێ كردن مافی حاكمە، صچونكە ئەو سەرپەرشتیاری گشتی موسڵمانانە.

لە (سبل السلام) دا هاتووە: تەمێ كردن بۆ حاكم نەبێت نییە جگە لە سێ كەس:

١- باوك، بۆی هەیە لەسەر فێربوون و خوێندن و دوورخستنەوەی لەڕەوشتی خراپ، منداڵی خۆی تەمێ بكات، وە ئاشكرایە كە دایكیش بۆ سەرپەرشتی كردنی منداڵەكانی بە منداڵی ئەوەی بۆ هەیە، وە هەروەها بۆی هەیە فەرمانی پێ بكات نوێژ بكات و لێی بدات ئەگەر نەیكرد. وە بۆ باوك نییە تەمێی منداڵی گەورەی خۆی بكات ئەگەرچی عەقڵ و ئاوەزیشی كەم بێ.

٢- گەورە، بۆی هەیە بەندەكەی خۆی تەمێ بكات لەسەر مافی خۆی و مافەكانی خوای گەورە لەسەر ڕاسترین گفت.

٣- مێرد، بۆی هەیە ژنی خۆی تەمێ بكات لەسەر نشوز و سەرپێچی، وەك قورئان بە ئاشكرا باسی كردووە.

وە ئایا بۆی هەیە لەسەر نەكردنی نوێژ بەلێدان ژنی خۆی تەمێ بكات؟

لە ڕواڵەتدا بۆی هەیە ئەگەر هەڕەشەكردن سوودی نەبوو. چونكە ئەمە لە بابی ئینكاری كردنە لە خراپە.

---

(١) أحمد (٥/٢،٤) وأبوداود (١٥٧٥) والنسائي (٢٤٤٦).

مێردیش لەوانەیە کە بۆیان هەیە لە بەرگریکردن لە خراپە دەست یا زمان یا دڵ بەکار بهێنێ، وە لێرەدا مەبەست لە دوانەکەی یەکەمە واتە زبان و دەست. قسەی (سبل السلام) تەواو بوو. وە هەروەها بۆ مامۆستا هەیە قوتابی تەمێ بکات لەسەر ڕەوشت و ئەخلاق.

(٩) دەستەبەری لە تەمێ کردندا:

باوك دەستەبەر نابێت کاتێك منداڵی خۆی پەروەردە بکات ئەگەر تووشی زیانی کرد. وە هەروەها مێرد لە تەمێ کردنی ژنی خۆیدا.

وە حاکمیش دەستەبەر نیيە ئەگەر تاوانبار تەمێ بکات، بە مەرجێ هیچ کام لەمانە زیادەڕەوی نەکات لە تەمێ کردندا، وە لەو ئەندازەی کە مەبەستی پێ دێتە جێ زیادەڕەوی نەکات.

جا ئەگەر هەرکامیان زیادڕەوی کرد، ئەوە دەست درێژی کردووە، وە لەسەر ئەوەی هەرچی شوێنێك بشکێنێ یا بریندار بکات دەستەبەر و (ضامن)ە.

# (سلام) ئاشتی لە ئیسلامدا

بەڕاستی ئاشتی ڕێبازێکە لەو ڕێبازانەی کە ئیسلام ڕیشەکانی بردۆتە ناخی دەرونی موسڵمانانەوە، هەتا بووەتە بەشێك لە بونیانو بیرو باوەڕێك لە بیرو باوەڕەکانیان، وە ئیسلام لە یەکەم ڕۆژی دەرکەوتنی پرشنگی پیرۆزییەوە بانگەوازی بۆ ئاشتی کردووە، بانگەوازێك دەنگی داوەتەوە لە هەموو بونەوەردا، وە ئەخشەو پلانێکی بێ وێنەی بۆ داناوە کە مرۆڤایەتی پێی بگات.

بەڕاستی ئیسلام ژیانی لا خۆشەویستەو بە پیرۆزی دائەنێت، وە خۆشەویستی ئەکات بەلای خەلکەوە، هەر بۆیە ڕزگاریان ئەکات لەترس و بیم و ڕێگەو ڕێبازێکی نمونەییریان بۆ دائەنێ تاوەکو مرۆڤایەتی بڕیەت و بڕوات بەرەو مەبەستەکانی لەژێر سێبەری بەرفراوانی ئەمن و ئاسایشدا.

وە زاراوەی ئیسلام –کە ناونیشانی ئەم ئاینەیە- لە (السلام)ەوە وەرگیراوە، چونکە ئیسلام و ئاشتی لە بەدی هێنانی دڵنیایی و هێمنی و ئارامیدا یەك ئەگرنەوە.

وە یەکێ لە ناوەکانی پەروەردگاری ئەم ئاینە (السلام)ە چونکە خەڵك هێمن ئەکاتەوە بەو بیرو باوەڕەی بۆی داناون، وە بەو پلانو بەرنامەیەی بۆی کێشاون.

وە هەڵگری ئەم بەرنامەیە هەڵگری ئاڵای ئاشتییە، چونکە ڕێ نمایی‌و روناکی‌و خێرو سەربەرزی بۆ نەوەی ئادەم هەڵئەگرێ، وە ئەو باسی خۆی ئەکات و ئەفەرموێ: (إنما أنا رحمة مهداة)[1] واتە: من میهرەبانی‌یەکی بەخشراوم بەنەوەی ئادەم لەلایەن پەروەردگارەوە.

وە قورئانیش کە باسی ڕیسالەتەکەی ئەکات ئەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ﴾ (الانبياء: ١٠٧) واتە: بۆ ئەوەنەبێ کە ئەبیتە رەحمەتێك بۆ جیهانیان تومان نەناردووە.

وە سڵاوی موسڵمانان کە دڵەکان لە یەك نزیك ئەکاتەوەو پەیوەندیان پتەو ئەکات‌و ئادەمیزاد پەیوەند ئەکات بە برای ئادەمیزادی‌یەوە، وشەی (السلام)ە واتە ئاشتی.

و لە پێش ترین کەس‌و نزیك ترین کەس لە خواوە ئەو کەسانەن کە لە پێشەوە سڵاوەکە ئەکەن لەیەك، وە بڵاو کردنەوەی ئاشتی‌و دابین کردنی بۆ هەموو عالەم و جیهان بەشێکە لە باوەڕو ئیمان. وە خوای گەورە سڵاوی موسڵمانانی بەو زاراوەیە داناوە، بۆ ئەوەی خەڵك بزانن کە ئاینەکەیان ئاینی ئاشتی و دڵنیایی‌یە. وە موسڵمانانیش ئەهلی ئاشتین و ئاشتی‌یان لا خۆشەویستە.

---

(١) طبراني (المعجم الصغير ١/٩٥)، حاكم (١/٣٥)، والقضاعي (مسند الشهاب ٧٣٣).

وه له فەرموودەدا هاتووه که پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إن الله جعل السلام تحية لأمتنا وأماناً لأهل ذمتنا)[1]. واته: بەڕاستی خوا سەلامی کردۆته سڵاو بۆ نەتەوەکەمان و به دڵنیایی بۆ ئەوانەی لەگەڵمانا ئەژین و بیرو باوەڕیان جیایه لەگەڵمان.

وه دروست نیيه بۆ هیچ کەس قسه لەگەڵ کەسی تر بکات پێش ئەوەی سڵاوی لێ بکات.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (السلام قبل الكلام)[2]. واته: سڵاوکردن پێش قسه کردنه.

هۆی ئەمەش ئەوەيه که قسەکردن نیيه هەتا ئەو کەسه دڵنیایی نەدرێتێ، وه موسڵمان لەسەریەتی کاتێك ڕازو نیاز ئەکات لەگەڵ پەروەردگاری سڵاو بکات لەسەر پێغەمبەرەکەی و خۆی و بەندە چاکەکانی خوا.

جا کاتێ له موناجات ئەبێتەوه و بەرەو کارەکانی دونیایی ئەچێت، بەشێوەیەك بەرەو ڕوویان ئەڕوات که ئاشتی و میهرەبانیو پیرۆزی تێدا بێت.

وه له مەیدانی جەنگ و کوشتاردا، کاتێ جەنگاوەری بێ باوەڕو وشەی (السلام) هات بەدەمیەدا ئەبێ جەنگ کردن بەرامبەری ڕابوەستێنرێت.

خوای گەوره ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقُولُوا لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلَامَ لَسْتَ مُؤْمِنًا﴾ (النساء: من الآية٩٤) واته: بەوکەسانه مەڵێن کەوشەی (السلام) تان بەرەو ڕوو ئەڵێن ئێوه باوەڕدانین.

وه سڵاوی خوا بۆ باوەڕداران سڵاوی ئاشتیيه که ئەفەرموێت: ﴿تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُ سَلَامٌ﴾ (الأحزاب: من الآية٤٤) واته: سڵاوەکانیان کاتێ ئەگەن بەپەروەردگاریان سەلامه.

وه سڵاوی فریشتەکان بۆ ئادەمیزاد له ڕۆژی دواییدا سەلامه، وەك خوای گەوره ئەفەرموێت: ﴿وَالْمَلَائِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِمْ مِنْ كُلِّ بَابٍ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ﴾ (الرعد: من الآية٢٣) واته: فریشتەکان که ئەچن بۆلایان له هەموو دەرگایەکەوه ئەڵێن (سلام عليكم) واته: ئاشتی و ئاسودەییتان لەسەر بێت.

وه ئارامگای پیاوچاکان خانەی هێمنی و ئاشتیيه، خوای گەوره ئەفەرموێت: ﴿وَاللَّهُ يَدْعُو إِلَى دَارِ السَّلَامِ﴾ (يونس: من الآية٢٥) واته: وه خوا بانگەواز ئەکات بۆ خانەی ئاشتی و ئاسودەیی. وه هەروەها ئەفەرموێت: ﴿لَهُمْ دَارُ السَّلَامِ عِنْدَ رَبِّهِمْ﴾ (الأنعام: من الآية١٢٧) واته: ئەوان لای پەروەردگاری خۆیان ماڵی ئاسودەیی و دڵنیاییان ئەدرێتێ، که بەهەشته.

(١) مجمع الزوائد (٨/٣٣).

(٢) الترمذي (٢٦٩٩).

وە بەهەشتی‌یەکان هیچ وتەیەك و نابیستن و قسە ناکەن بەهیچ زیانێك جگە لەسەلام: ﴿لا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْواً ولا تأثيماً إلّا قيلاً سَلاماً سلاماً﴾ (واقعة: ٢٥-٢٦).

واتە: بەهەشتی‌یەکان لە بەهەشتا قسەی پڕوپوچ و شتێك کە پێی تاوانبار بن نابیستن جگە لە وتەی سەلام، سەلام لەیەکتری ئەکەن.

وە دووبارە بوونەوەی زۆری ئەم وشەی (سلام)ە بەو شێوەیە لەگەڵ دەوروەدانی بەکەشێکی ئاینی دەرونی شیاوە کە هەموو هەست و هۆشەکان بجوڵێنێ و بیرو بۆچونەکان بەرەو ئەو ڕێبازە بەرزە گەوریە بکات.

رووکردنی ئیسلام بەرەو نمونەیی

بەڵکو ئیسلام دادپەروەری پێویست ئەکات و ستەم کاری حەرام ئەکات، و وانەکات کە ئامۆژگاری و ڕێنمایی‌یە بەرزەکانی کە خۆشەویستی و میهرەبانی و هاوکاری و لە خۆبوردن و قوربانی دان ژیان خۆش بکەن و دڵەکان پڕ سۆز بکەن، و برایەتی بخاتە نێوان ئادەمیزادو برای ئادەمیزادی‌یەوە.

وە دوای هەموو ئەمانەش ڕێز لەبیرو هۆشی ئادەمیزاد ئەگرێت و ئەیانکات بە دوو هۆ لە هۆیەکانی تێگەیشتن و ڕازی کردن.

جا ئیسلام بە هیچ شێوەیەك زۆر لە کەس ناکات بچێتە سەر بیرو باوەڕێکی دیاری کراو، و زۆر لە هیچ ئادەمیزادێك ناکات لەسەر بۆچوونێکی تایبەتی کە لە سروشت یا لە ئادەمیزاددا بێت، تەنانەت لە فەرمانەکانی ئاینیش دا بڕیاری ئەوە ئەدات کە ﴿لا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾ (البقرة: من الآية٢٥٦) واتە: زۆر کردن لە دیندا نی‌یە، بەڵکو داوایان لێ ئەکات هۆش و بیر بەکار بهێنن دەربارەی ئەو شتانەی خوا دروستی کردون. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ﴾ (البقرة: من الآية٢٥٦) واتە: زۆر کردن لە ئایین دا نی‌یە, چونکە ڕێنمونی و ڕاستی لە گومڕایی و ناڕاستی دەرکەوتووە.

وە هەروەها ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَنْ فِي الْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعاً أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ﴾ (يونس:٩٩).

واتە: ئەگەر پەروەردگارت -ئەی پێغەمبەر- بیویستایە هەموو خەڵکی سەرزەوی باوڕدار ئەکرد, جا ئایا تۆ ئەتەوێ زۆر بکەی لەخەڵك هەتا ببنە باوەڕدار؟

وه هەروەها ئەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَنْ تُؤْمِنَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ وَيَجْعَلُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لا يَعْقِلُونَ﴾ (يونس:١٠٠). واتە: بۆ هیچ گیانێك نییە باوەڕ بهێنێ بەبێ فەرمانی خوا، وه خوا سزاو سەرشۆڕی دائەنێ بۆ ئەو کسانەی کە لەفەرمان و قەدەغە کردنی تێناگەن.

وه هەروەها ئەفەرموێت: ﴿قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا تُغْنِي الْآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَنْ قَوْمٍ لا يُؤْمِنُونَ﴾ (يونس:١٠١) واتە: -ئەی پێغەمبەر- بڵێ بەگەلەکەت: بیربکەنەوەو پەند وەربگرن لەو نیشانە ئاشکرایانەی کە لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە. بەڵام ئەوانەی باوڕ ناهێنن نیشانەکانو ترسێنەرەکان بۆیان بێهودەیە.

وه پێغەمبەر ﷺ خۆی تەنها گەیەنەر بووە لە خواوەو بانگەوازی کردووە بۆلای خوا.

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرسَلْنَاكَ شَاهِداً وَمُبَشِّراً وَنَذِيراً وَدَاعِياً إِلَى اللَّهِ بِإِذْنِهِ وَسِرَاجاً مُنِيراً﴾ (الأحزاب:٤٦) واتە: ئەی نێرراوی خوا ئێمە تۆمان بۆیە ناردووە کە شاهید و مژدەدەر و ترسێنەر بیت، و بانگەواز بکەی بۆسەر ئاینی خوا بە فەرمانیخواو چرایەکی رۆشن بیت.

## پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکان:

ئیسلام تەنها بەوەوە ناوەستێ کە باسی چاکی ئەم بیرو باوڕە بکات و بەس، بەڵکو پەیوەندی نێوان تاکەکان و کۆمەڵەکان و دەوڵەتەکانی کردووە بەپەیوەندی ئاشتی و ئاسودەیی، بەشێوەیەك پەیوەندی نێوان موسڵمانان خۆیان لەناو خۆیاندا و پەیوەندییان لەگەڵ جگە لەخۆیان یەکسان بێت. وا لە خوارەوە ئەوە ڕوون ئەکرێتەوە:

١- پەیوەندی موسڵمانان لەنێوان خۆیاندا:

ئیسلام هاتووە تا دڵەکان لەگەڵ یەکدا کۆبکاتەوە، وەڕیزەکانیان بە یەکەوە پەیوەست بکات بۆ ئەوەی گیان و قەوارەیەکی یەك پارچەیان بۆ پێك بێنێ، و بیان پارێزێ لە هۆیەکانی جیاوازی و لاوازبوون، تاوەکو ئەو قەوارە یەك گرتووە توانای بەجێهێنانی مەبەستە بەرزو و بەرزەکانی هەبێت کە نامە گەورەکەی ئیسلام هێناویەتی: لە خوا پەرستی و بەرز کردنەوەی وشەی خوا و ڕاگرتنی دادپەوەری و چاکە و تێکۆشان بۆ جێگیر کردنی ئەو بیرو باوەڕانەی کە خەڵك لە ژێر سایەیاندا دڵنیاو هێمن ئەبن.

جا لەبەر ئەمانە هەمووی ئیسلام ئەو پەیوەندیو یەکگرتوویییە پێك دێنێت لەنێوان ئەندامانی کۆمەڵدا، بۆ ئەوەی ئەو قەوارەیە دروست بکات و پاڵپشتی بێت، وه ئەم پەیوەندیانە جیائەبنەوە بەوەی کە پەیوەندیەکی ڕەوشتین، وه توانای گەشەکردن و مانەوەیان هەیە، و وەك ئەو پەیوەندییە

مادی‌یانە نین کە کۆتایی‌یان دێت بە کۆتایی هاتنی هاندەرەکانی و نەمانی نیاز پێیان. ئەم پەیوەندیانە زۆر بەهێزترن لە پەیوەندی‌یەکانی خوێن و ڕەنگ و زمان و نیشتمان و بەرژەوەندی‌یە ماددی‌یەکان، وە هەروەها زۆر بەهێزترن لە پەیوەندیەکانی تر کە خەڵك بە یەکەوە ئەیبەستێ، وە ئەم پەیوەندی‌یانە ئەتوانن وا لە موسڵمانان بکەن کە یەك پارچە و بەهێزتر بن، وە بوون و قەوارەیەکیان لێ پێك بهێنێ کە زۆر پتەو بێت و پچڕاندن و توانەوەی نەگونجاو بێ.

وە یەکەم پەیوەندی لە پەیوەندی‌یە ڕەوشتی‌یەکان پەیوەندی باوەڕە، کە ئەو خولگەیەیە کۆمەڵی باوەڕداران لەلای ئەگەنە یەك. کەواتە باوەڕ وا لە باوەڕداران ئەکات کە برایەتی‌یان بەهێز تر بێت لە برایەتی دایك و باوکی. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ (الحجرات: من الآية١٠) واتە: بەڕاستی باوەڕداران برای یەکن.

﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ﴾ (التوبة: من الآية٧١) واتە: باوەڕدارانی پیاو و ئافرەت دۆست و پاڵپشتن بۆ یەکتر.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (المسلم أخو المسلم)[1]. واتە: موسڵمان برای موسڵمانە.

وە سروشتی باوەڕ بەشێوەیەکە کۆمەڵ لەیەك نزیك ئەخاتەوە و دووریان ناخاتەوە، وە یەکیان ئەخات و پەرش و بڵاویان ناکات.

وە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (المؤمن ألف مألوف، ولا خير فيمن لايَألفُ ولا يُؤلَفُ)[2]. واتە: باوەڕدار هۆگرەو هۆگری پێوە کراوە، وە هەرکەس نە هۆگربێ‌و نە هۆگری پێوە بکرێ خێری تێدا نی‌یە.

وە باوەڕدار هێزو توانایە بۆ برای باوەڕداری. پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضاً)[3]. واتە: باوەڕدار بۆ باوەڕدار وەك خانویەك وایە کە هەندێکی هەندەکەی تر قایم ئەکات.

وە موسڵمان هەست بە هەستەکانی برای موسڵمانی ئەکات، دڵخۆش ئەبێت بە دڵخۆش بوونی، و غەمبار ئەبێت بە غەمباربوونی، وە خۆی بەبەشێك لە برا موسڵمانەکەی ئەزانێ.

---

(١) مسلم (٢٥٦٤).

(٢) مسند الشهاب (٢٤) ومجمع الزوائد (٨٧/٨)، والمقاصد الحسنة (١٢٣٣)، وصحيح الجامع (٦٦٦١و٦٦٦٢).

(٣) البخاري (١٤٣٧) ومسلم (٢٥٨٥).

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (مثل المؤمنين في توادِّهم وتراحمهم وتعاطفهم كمثل الجسد إذا اشتكى منه عضوٌ تداعى له سائر الجسد بالحمى والسهر)[1]. واته: باوڕەدارەکان له خۆشەویستی و میهرەبانیو دڵسۆزییاندا وەك یەك لاشە وان، که شوێنێکی توشی ئازار بوو هەموو بەشەکانی تریشی لەرزو تا ئەیان ئەگرێ و خەویان ئەزڕێت.

وە ئیسلام پاڵپشتی ئەو پەیوەندییە ئەکات‌و بەهێزی ئەکات بە بانگەوازکردن بۆ تێکەڵاوبوون لەناو جەماعەت‌او ڕێك و پێکی لەریزەکەیدا.

وە هەموو ئەو شتانە قەدەغە ئەکات که کۆمەڵ بێ هێز ئەکات‌و له توانای ئەخات. جا کۆمەڵ هەمیشە لە ژێر دەستی خواو چاودێری ئەودایە: (يد الله مع الجماعة، ومن شذَّ، شذَّ في النار)[2]. واته: دەستی خوا لەگەڵ کۆمەڵدایە، و هەرکەس تاك بووەوە لەئاگردا تاك ئەبێتەوە.

وە جۆی هەناسەدانی سروشتی بۆ ئادەمیزاد هەر کۆمەڵە، هەر لەبەر ئەوەیە پێغەمبەر ﷺ وای داناوە کە: (الجماعة رحمة، والفرقة عذاب) واته: بە کۆمەڵ بوون میهرەبانیو ڕەحمەتە، و لە یەك جیابوونەوە سزایە. جا کۆمەڵ هەرچەندە بچوکیش بێت، و بەهەرشێوەیەك بێت، چاکترە لە تەنیایی، وە هەتا ژمارەیان زۆر بێت چاکترو پڕخێرترە: (الإثنان خير من واحد، والثلاثة خير من الإثنين، والأربعة خير من الثلاثة، فعليكم بالجماعة، فإن الله لن يجمع أمتي إلا على هدى)[3]. واته: دوان چاکترە لەیەك، و سیان چاکترە لە دوان، و چوار چاکترە لە سیان، وە داواتان لێ ئەکەم بە کۆمەڵ بن، چونکە خوا نەتەوەی من لەسەر هیدایەت نەبێت کۆ ناکاتەوە.

وە خواپەرستییەکان لە ئیسلامدا بە کۆمەڵ نەبێت جێبەجێ ناکرێن، چونکە نوێژ بە کۆمەڵ سوننەتەو نوێژی جەماعەت لە نوێژی تاك چاکترە بە بیست‌و حەوت پلە. وە زەکاتیش مامەڵەیە لەنێوان دەوڵەمەندو هەژاراندا. وە ڕۆژو هاوبەشییەکی بە کۆمەڵە لە برسییەتیدا لەکاتێکی دیاری کراودا. وە حەج بەیەك گەیشتنی هەموو موسڵمانانە کە هەموو ساڵێك لەهەموو لایەکی وڵاتانی ئیسلامەوە دێن بۆ پیرۆزترین مەبەست: (وما اجتمع قوم في بيت من بيوت الله يقرؤون القرآن ويتدارسونه بينهم، إلا نزلت عليهم السكينة، وحفتهم الرحمة، وذكرهم الله في ملأ عنده)[4].

---

(١) أحمد (٤/٢٦٨) ومسلم (٢٥٨٦/٦٦و٦٧).

(٢) الترمذي (٢١٦٧).

(٣) مجمع الزوائد (١/١٧٧و٥/٢١٨).

(٤) مسلم (٢٦٩٩) وأبوداود (٤٩٤٦) والترمذي (١٩٣٠) وابن ماجه (٢٢٥).

واتە: کۆمەڵێك نیيە كە كۆببنەوە لە خانەيەك لە خانەكانی خواداو قورئان بخوێنن و يەكتر فێر بكەن ئيللا ئارامی ئەڕژێ بەسەريانداو ميهرەبانی دەوريان ئەدا، وە خوا لای فريشتەكانی خۆی باسيان ئەكات.

وە پێغەمبەر ﷺ بە پەرۆش بوو لەسەر ئەوەی موسڵمانان كۆبن هەتا لەڕواڵەت و شێوەشدا: ڕۆژێك موسڵمانانی بينی بەجيا جيا دانيشتبون، پێی فەرمون: (كۆببنەوە)، ئەوانيش كۆبونەوە بە شێوەيەك ئەگەر عەباكەی بدايە بەسەرياندا هەمووريانی دائەپۆشی[1].

جا كاتێك كۆمەڵ ببێ بەوهێزەی كە ئايينی خواو دونيای موسوڵمانان بپارێزێ، ئەوە جيابوونەوەو دابڕان ئايين‌و دونيايان بەيەكەوە لەناو ئەبات، وە ئيسلام زۆر بەتوندوتيژی تەفرەقەو جيابوونەوەی قەدەغە كردووە، چونكە تەفرەقە ڕێگايەكی ئاواڵەيە بۆ شكان و بەزين، وە هيچ شتێك وەك تەفرەقەو جيابونەوە هێزو دەسەڵاتی موسڵمانانی لەناو نەبردوە, كە زيان و دۆڕان و ڕيسوايی و هەموو ئەو گرفتاريانەی كە موسوڵمانان تووشی بوون بە شوێنيەوەيەتی: ﴿وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ تَفَرَّقُوا وَاخْتَلَفُوا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ وَأُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ (آل عمران:١٠٥) واتە: ئەی موسڵمانەكان ئێوەش وەك ئەهلی كيتاب مەبن كە جياوازی و دوژمنايەتی كەوتە نێوانيان و بوون بەچەند دەستەو كۆمەڵ دوای ئەوەی نيشانەو بەڵگەی ڕوون و ئاشكرايان بۆ هاتە خوارەوە، وە ئەوانە شياوی سزای گەورەن:﴿وَلَا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ﴾ (الأنفال: من الآية٤٦) واتە: جياوازی و ناكۆكی نەكەوێتە نێوانتان و لاواز بن، وە هێزو دەسەڵاتتان لەدەست بدەن.

﴿وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعاً وَلَا تَفَرَّقُوا﴾ (آل عمران: من الآية ١٠٣).

واتە: خۆتان پەيوەست كەن بە ئايينی خواوە بەكۆمەڵ‌و جياوازی نەكەوێتە ناوتان.

﴿وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُم وَكَانُوا شِيَعاً﴾ (الروم: من الآية٣١) واتە: لە هاوتادانەران مەبن ئەوانەی جياوازيیان خستە ناو ئايينەكەيان‌و پارچە پارچە بوون.

﴿إِنَّ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعاً لَسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ﴾ (الأنعام: من الآية ١٥٩). واتە: بەڕاستی ئەوانەی جياوازيان خستە نێوان ئايينەكەيانەوەو پارچە پارچە بوون، تۆ لە هيچدا ئەی پێغەمبەر لەوان نيت.

---

(١) أحمد (٣/١٠٥) وأبوداود (٣٧٦٤) وابن ماجه (٣٢٨٦) وابن حبان (٥٢٢٤) والحاكم (٢/١٠٣).

وە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لاتختلفوا, فإن من كان قبلكم إختلفوا فهلكوا) واتە: جیاوازی نەکەونە نێوانتانەوە، چونکە ئەو نەتەوانەی کە پێش ئێوە بوون جیاوازی کەوتە نێوانیانەوە پاشان لەناو چوون.

وە کۆمەڵ ناگاتە رادەی یەکپارچە بوون هەتا هەموو یەکێك لە ئەندامەکانی لە خۆیان و لەماڵ و دەسەلآتیان پێی نەبەخشن، وە نەبنە یارمەتی و پاڵپشت بۆ ئەو کۆمەڵە لەهەموو کارو پێویستی‌یەکیدا، جا ئەو یارمەتی دانە ماددی بێت یا ئەدەبی، وە بەسامان بێ، یا بە زانست، یا بە را، یان بە راوێژ کردن.

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (فالناس عيال الله، أحبهم إلى الله أنفعهم لعياله)[1]. واتە: خەڵکی خێزانی خوان، جا خۆشەویسترین کەس لای خوا ئەوەیانە کە سودی زۆر تر بێت بۆ خێزانەکەی.

وە ئەفەرموێت: (خير الناس أنفعهم للناس)[2]. واتە: باشترین کەس ئەوەیە کە سوود بەخشتر بێت بۆ خەڵك.

وە دەفەرموێ: (إن الله يحب إغاثة اللهفان)[3]. واتە: خوا چوون بە دەنگ لێ قەوماوانی پێ خۆشە.

وە دەفەرموێ: (استشفعوا تؤجروا)[4]. واتە: تکا بۆ یەك بکەن خوا پاداشتان ئەداتەوە.

وە دەفەرموێ: (المؤمن مرآة المؤمن, يكف عنه ضَيْعَته ويحوطه من ورائه)[5]. واتە: باوەڕدار ئاوێنەی باوەڕدارە ڕەوشتی ناشیرینی لێ دور ئەکاتەوەو لە دوواوە ئەیپارێزێ.

وە دەفەرموێ: (إن أحدكم مرآة أخيه, فإن رأى منه أذى فليحطّه عنه)[6]. واتە: هەریەکەتان ئاوێنەی برا موسڵمانەکەیەتی، جا ئەگەر نەنگی‌یەکی پێوە بینی با لەسەری لابدات.

بەم جۆرە ئیسلام کارئەکات بۆ بەدیهێنانی ئەو پەیوەندیانە هەتا کۆمەڵێکی یەکگرتو و قەوارەیەکی بەهێز دروست بکات، کە بتوانێت ڕوبەڕوی ڕوداوەکان بوەستێو بەرپەرچی دەست

---

(١) البزار (١٩٤٩) ومسند الشهاب (٨١٣) وابن أبي الدنيا في قضاء الحوائج (٢٤).

(٢) الطبراني في المعجم الكبير ١٣٦٤) والصغير ٢/٣٥) ومسند الشهاب (٧٧١).

(٣) ضعيف الجامع (١٦٩٨).

(٤) البخاري (٤٣٢) ومسلم (٢٦٢٧).

(٥) البخاري في الأدب المفرد (٢٣٩) وأبوداود (٤٧٩٨) ومسند الشهاب (٨٦).

(٦) الترمذي (١٩٢٩) وضعيف الجامع (١٣٧١).

دەرتژیکەران بداتەوە. چەندە موسڵمانان پێویستی‌یان بەو یەك بوونە هەیە لەم کاتانەدا. ئەوان بەو کارەیان فەرزێکی ئیسلامی جێ‌بەجێ ئەکەن‌و دەستکەوتێکی رامیاری بە دەست ئەهێنن، وە هێزێکی سەربازیش بەدی ئەهێنن بۆ ئەوەی خۆیانی پێ بپارێزن، هەروەها یەکەیەکی ئابوری پێك ئەهێنن  کە هەرچی سامانێك پێویستیان پێی هەیە دابینی ئەکات.

بەراستی ئیستیعمار شوێنەوارێکی خراپی لە وڵاتانی ئیسلامیدا جێ هێشتووە، لە: لاوازی لە دینداریداو، داڕوخان لە خۆوڕەوشت داو، دواکەوتن لە زانست دا، وە ئاکرێت ئەو دەردە ترسناکە کۆمەڵایەتی‌یانە لەناو ببردرێن هەتا نەتەوەی ئیسلام نەگەڕێتەوە بۆ یەك پارچەیەتی‌یەکەی سەردەمی دروست بوونی، ئامانجیان یەك بێت و ڕیزیان پتەوبێت، و قسەیان کۆبێت، وەك بینای داڕژاو یەك ببەستنەوە.

جەنگ دژی دەست درێژیکەران (بغاة)

ئەوە بنەمای ئەو پەیوەندیانەیە کە موسڵمانان ئەبەستێ بەیەکەوە؛ جا ئەگەر ڕوی داو ئەو پەیوەندی‌یانە پچران‌و پەتی برایەتی لە یەك جیابووەوە، وە هەندێك ستەم‌و دەست درێژی کردە سەر هەندێکی تر، پێویستە دژی ئەو دەست درێژی کەرە جەنگ بکرێ هەتا ئەگەڕێتەوە بۆ ڕاستی و دادپەوەری و دێتەوە ناو ڕیزی کۆمەڵ، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ (الحجرات:٩) واتە: وە ئەگەر دوو دەستە لە براداران پێکەوە بجەنگن ئێوە ڕێکیان بخەنەوە, جا ئەگەر دەستەیەکیان دەست درێژی بۆ دەستەکەی تر کرد, لەگەڵ ئەو دەستەیان کە ستەم دەکا بجەنگن تا دەگەڕێتەوە بۆ حوکمی خواو پێغەمبەرەکەی، جا هەرکاتێ گەڕایەوە دادگەرانە ئاشتیان بکەنەوە و دادگەر بن بەڕاستی خوا دادگەرانی خۆش دەوێ.

ئایەتەکە بڕیاری ئەوە ئەدات ئەگەر موسڵمانان بووە شەڕیان، پێویستە لەسەر پیاو ماقوڵان‌و خاوەن ڕایان دەست بەجێ بچنە ناو کێشەکەوە و هەردوولا ڕێك بخەنەوە، بەڵام ئەگەر کۆمەڵێکیان ستەم و دەست درێژی کردە سەر ئەوی تریان و ملی نەدا بۆ ڕێك کەوتن، و وەڵامی کەسی نەداوە لەو بارەیەوە، پێویستە لەسەر موسڵمانان هەمویان کۆببنەوە دژی ئەو کۆمەڵە ستەمکارە بجەنگن.

وە ئیمامی عەلی دژی تاقمە باغی‌یەکە جەنگا، وەك چۆن ئەبوبکر دژی ئەوانە جەنگا کە زەکاتیان نەئەدا.

وە زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە ڕێك كەوتون كە ئەو كۆمەڵە باغیيە بەو كارەی لە ئيسلام دەرناچێت، چونكە قورئان بە باوەڕدار باسی ئەكات، لەگەڵ ئەوەشدا كە فەرمانی ئەوەی داوە دژيان جەنگ بكرێت، و فەرمويەتی: ﴿وإن طائفتان من المؤمنين اقتتلوا﴾. جا لەبەر ئەوە كۆمەڵەی هەڵاتويان لە جەنگ ناكوژرێ، وە هەروەها بريندارەكانيان, وە ماڵو سامانيان بە غەنيمەت نابرێ، و ژنو منداڵيان بەديلی ناگيرێ، وە دەستبەر نابن بۆ هەرچی لەكاتی جەنگدا لەناويان برد لە گيان و سامان، وە هەركەسێكيان كوژرا ئەشۆرێ و كفن ئەكرێو نوێژی لەسەر ئەكرێ.

بەڵام ئەوانەی لە كۆمەڵە دادپەروەرەكە بكوژرێ، شەهيدە، نە ئەشۆرێ و نەنوێژی لەسەر ئەكرێت، چونكە لە جەنگێكدا كوژراوە كە خوا فەرمانی پێ داوە، جا ئەو وەك شەهيدێكە كە لەگەڵ بێ باوەڕاندا جەنگابێت.

ئەمەش كاتێكە كە دەرچوونەكە دژی پێشەوايەكی موسڵمانان بێت، كە كۆمەڵێك موسڵمان لە گەڵيا بن لە يەكێ لە وڵاتانی ئيسلام، وە ئەو دەرچوونەش بەهۆی بەجێ نەهێنان و نەدانی مافە برِيار دراوەكان بۆ بەرژەوەندی تاك يا كۆمەڵ بێت، وەك ئەوەی مەبەستيان لابردنی ئەو پێشەوايە بێت. بە كورتی ئەبێ ئەمانە هەندێ سيفەتيان تيا بێت كە تايبەتی (بغاة) دەرچوەكانە.

وە كۆی ئەو سيفەتانەش ئەمانەن:

١ ـ دەرچونەكە لە گوێ ڕايەڵی حاكمێكی دادپەروەر بێت كە خوا ئەو گوێ ڕايەڵیيەی پێويست كردووە لەسەر موسوڵمانان بۆ حاكمەكەيان.

٢- ئەبێ ئەو كۆمەڵە دەرچووە كۆمەڵێكی بەهێز بن خەڵك ترسی لێيان هەبێت، بەشێوەيەك حاكم بۆ گێڕانەوەيان پێويستی بە ئامادەكردنی سوپاو ماڵو جەنگ هەبێت. بەڵام ئەگەر بێ هێز بوون، يان تاك تاكە بوون، يا ئەوەندەيان چەك نەبوو پارێزگاری خۆيانی پێ بكەن، بە باغی دانانرێن، چونكە دابين كردنو گێڕانەوەيان ئاسانە.

٣ ـ ئەبێ تەئويلو لێدانەوەيەكی دروستيان هەبێت كە وايان لێ بكات لە ژێر دەسەڵاتی ئەوحاكمە دەرچن.

جا ئەگەر لێكدانەوەی دروستيان نەبێت ئەوە جەردەو ڕێگرن و باغی نين.

٤- ئەبێ سەرۆكێكی فەرمانڕەوايان هەبێت كە سەرچاوەی هێزو توانايان بێت، چونكە ئەو كۆمەڵەی پێشەوای نەبێت هێزی نيیە. ئەوەيە كاروباری (بغاة) و حوكمی خوا دەربارەيان.

بەڵام ئەگەر جەنگەکە لە پێناو دونیادا بوو، وە بۆ بە دەست هێنانی سەرۆکایەتی و ململانێی پێشەواکە بوو —ئەوە ئەو دەرچوانە بە موحاریب دائەنرێن و حوکمێکی تریان هەیە کە جیاوازە لەگەڵ حوکمی باغیەکان- وە حوکمەکەی ئەوەیە کە خوا لە قورئاندا باسی کردووە ئەفەرموێ:

﴿إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الْأَرْضِ فَسَاداً أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلافٍ أَوْ يُنْفَوْا مِنَ الْأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِنْ قَبْلِ أَنْ تَقْدِرُوا عَلَيْهِمْ فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ (المائدة ٣٣-٣٤)

واتە: بەڕاستی جەزای ئەوانەی ئەجەنگن دژی خواو پێغەمبەرەکەی‌و هەوڵی خراپەکاری‌ئەدەن لەسەر زەوی، کوشتنە یا لەداردانە یا دەست و قاچ بڕینە بە پێچەوانەی یەکەوە، یا دەرکردنە لە وڵات. ئەو جەزایە لە دونیادا سەرشۆڕی‌یە بۆیان و لە ڕۆژی دواییشدا سزایەکی گەورەیان بۆ هەیە. ئەوانە نەبن کە پەشیمان ئەبنەوەو ئەگەڕێنەوە پێش ئەوەی ئێوە دەستتان بیان گاتێ، جا بزانن کە بەڕاستی خوا لێ بوردەو میهرەبانە بە بەندەکانی.

جا ئەو جەردەو ڕێگرانە کە لەو ئایەتەدا هاتوون، سزاکەیان کوشتنە یا لەداردانە یا دەست و قاچ بڕینە بە پێچەوانەی یەکەوە، یا بەند کردن‌و دوورخستنەوەیە لە زەوی. بە پێی ڕای حاکم لەوبارەیەوە، وە بە پێی ئەو تاوانانەی کردویانە. جا هەرکەسێك لەوانە بکوژرێ جێگەی دۆزەخە، وە هەرکەس بکوژرێ لەوانەی کە دژیان ئەجەنگێ شەهیدە. وە ئەگەرجەنگی نێوان دوو کۆمەڵی موسڵمان لەسەر ڕەگەز بێت، یا لەسەر کورسی سەرۆکایەتی بێت، ئەوە هەردوو کۆمەڵەکە باغین و حوکمی باغی ئەدرێت بەسەریاندا.

## پەیوەندی نێوان موسڵمانان و جگە لەخۆیان

پەیوەندی نێوان موسڵمانان لەگەڵ جگە لە خۆیان پەیوەندی یەکتر ناسین‌و هاوکاری‌و چاکەو دادپەروەریە. خوای گەورە دەربارەی ئەو یەکتر ناسینەی کە ئەبێتە هۆی هاوکاری ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾ (الحجرات:١٣) واتە: ئەی خەڵکینە، ئێمە ئێوەمان لە نێرو مێیەك دروست کردوە جا جیاکاری نی‌یە لەنێوانتاندا بەهۆی بنەماڵەوە، وە چەندەها هۆزو گەلمان لێ پێك هێناون بۆ ئەوەی ئاشنا بن بە یەك، بەڕاستی چاکترینتان و بەرێزترینتان ئەوەتانە کە زۆرتر لە خوا بترسێت، بەڕاستی خوا زانا و خەبیرە.

وە دەربارەی ئامۆژگاری بۆ چاکەو دادپەروەری فەرموویەتی: ﴿لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ (الممتحنة:٨) واتە: خوا رێی ئەوەتان لێ ناگری کە چاکە بکەن‌و داد پەروەر بن لەگەڵ ئەوانەدا کە نەجەنگاون دژتان بەهۆی ئاینەوەو لە شوێن‌و جێی خۆتان دەریان نەکردوون، لە بێباوەڕەکان، چونکە بەراستی خوا دادپەروەرانی خۆش ئەوێت. وە ئەو شتانەی ئەو پەیوەندییانە پێویستی ئەکەن، گۆڕینەوەی بەرژەوەندیەکان‌و گەیاندنی کەڵك‌و سوودو بەهێزکردنی پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکانە.

وە وەم مانایە ناچێتە ناو بازنەی قەدەغە کردن لە (موالاة) پشت گیری و هاوکاری بێ باوەڕان، چونکە مەبست لە قەدەغە کردنی هاوکاری بێ باوەڕان قەدەغە کردنە لەهاوپەیمانی و یارمەتی دان دژی موسوڵمانان، هەروەها قەدەغە کردن لەڕازی بوون بەو بێ باوەڕییەی کە ئەوان لەسەرین، چونکە پشت گرتنی بێ باوەڕان دژی موسڵمانان زیانێکی گەورە ئەدات لە قەبارەی ئیسلام‌و لاوازکردنی توانای کۆمەڵی باوەڕدارانە. وە هەروەها ڕازی بوون بە بێباوەڕی بۆ خۆی بێ باوەڕییەو کارێکە ئیسلام دژی ئەوەستێ، بەڵام (موالاة) بە واتای ئاشتی خوازێتی و تێکەڵی جوان و مامەڵە بەچاکی و گۆڕینەوەی بەژەوەندییەکان و هاوکاری لەسەر چاکەو لە خواترسان، ئەوەیە کە ئیسلام بانگەوازی بۆ ئەکات.

**دابین کردنی ئازادی ئاینی بۆ جگە لە موسڵمانان**

لەبەر ئەو پەیوەندیانەی باس کران ئیسلام بڕیاری داوە بە یەکسانی لەنێوان موسڵمانان‌و زیممییەکان -ئەوانەی لە ژێر سایەی ئیسلامدا ئەژین- بەوەی چ مافێ بۆ موسڵمانان هەیە بۆ ئەوانیش هەبێت، و چی لەسەر موسڵمانانە لەسەر ئەوانیش پێویست بێت.

وە سەربەستی ئاینی بۆ دابین کردون سەربەستییە ئاینییەکانیش لە مانەی خوارەوەدا ئەبن.

(یەکەم) : نابێت زۆر لەکەسیان بکرێت کە واز لەئاینەکەی خۆی بهێنێ، یا زۆری لێ بکرێت بچێتە سەر بیرو باوەڕێکی دیاری کراو. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ﴾ (البقرة: من الآية٢٥٦) واتە: زۆر کردن نییە لە ئایینا، چونکە ڕێگەی ڕاست لە گومڕایی دەرکەوتووەو ئاشکرا بووە.

(دووەم) : خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان مافی ئەوەیان هەیە دروشمە ئاینییەکانیان بەجێ بهێنن، وە نابێت کڵێسەکانیان بڕوخێنرێ‌و خاچەکانیان بشکێنرێت. پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: (أتركوهم وما يدينون). واتە: واز لە خۆیان و ئاینەکانیان بهێنن، هەتا ژنی پیاوی موسڵمان ئەگەر لەوان

بێت (جولەکە یا گاور) مافی چونە کلیساکانیان و پەرستگاکانیانی هەیە و مێردە موسڵمانەکەی مافی ئەوەی نییە ڕێی لێ بگرێت.

(سێیەم) : ئیسلام ئەوانەی بۆ حەڵاڵ کردون کە ئاینەکانی خۆیان بۆیانی حەڵاڵ کردووە، لە خواردن و شتی تر، جا نابێت بەرازەکانیان بکوژرێت، وە نابێت خواردنەوەکانیان بڕژێنرێت، مادام دروست بێت لە ئاینی خۆیاندا، وە ئیسلام بەو کارەی ئازادی فراوان تری داوە بەوان لە موسڵمانان کە گۆشتی بەرازو ئارەقی لەسەر حەرام کردوون.

(چوارەم) : ئازادی ژن هێنان و تەڵاق دان و نەفەقە کێشانیان هەیە بەپێی یاسای خۆیان، وە بۆیان هەیە چۆنیان بوێت کاری تێدا بکەن، بێ ئەوەی بەستنەوە یا سنوریان بۆ دابنرێت.

(پێنجەم) : ئیسلام کەرامەت و مافەکانیان ئەپارێزێ، وەئازادیان ئەداتێ لە لێکۆڵینەوە، و گفتوگۆ کردن لە سنوری عەقڵ و زیرەکییدا، لەگەڵ پابەندبوون بە ئەدەب و دوورکەوتنەوە لە زبری و توندو تیژی، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَلَا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ وَقُولُوا آمَنَّا بِالَّذِي أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَأُنْزِلَ إِلَيْكُمْ وَإِلَهُنَا وَإِلَهُكُمْ وَاحِدٌ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾ (العنكبوت:٤٦) واتە: مشت و مڕ مەکەن —ئەی بڕواداران- لەگەڵ جولەکەو گاورەکاندا ئیللا بەشێوازێکی جوان نەبێت، وە بە بانگ کردن بۆلای حەق و ڕاستی بەئاسانترین شێوە، مەگەر ئەوانەی لایان داوە لە حەق و ستەمیان کردووە و شەڕیان ڕاگەیاندوە دژی ئێوە، وە پێیان بڵێن ئێمە باوەڕمان هەیە بەو قورئانەی بۆ ئێمە هاتۆتە خوارەوە، وە بەو تەورات و ئینجیلەش کە بۆ ئێوە هاتۆتە خوارەوە، وە خوای ئێمە و خوای ئێوە یەکە، وە ئێمە بۆ ئەو مل کەچ و گوێ ڕایەڵین.

(شەشەم) : لەسزاداندا یەکسانی کردون لەگەڵ موسڵماناندا بە ڕای هەندێ لە مەزهەبەکان.

وە لە میراتدا زیمی و موسڵمانی لە بێ بەش بووندا یەکسان کردووە، زیمی میراتی خزمی موسڵمانی ناگرێت، وە موسڵمانیش میراتی زیمی ناگرێت.

(حەوتەم) : ئیسلام خواردەمەنییەکانیانی حەڵاڵ کردووە، وە هەروەها خواردنی گۆشتی سەربڕاوەکانیان و هێنانی ئافرەتەکانیان، خوای گەورە لەو بارەیەوە ئەفەرموێت: ﴿الْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَهُمْ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِي أَخْدَانٍ وَمَنْ يَكْفُرْ بِالْإِيمَانِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ (المائدة:٥) واتە: ئەمڕۆ هەرچی خواردەمەنی و شتی پاکژە حەلاڵ کرا بۆتان، وە خواردەمەنی و سەربڕاوی ئەوانەی کتێبی خواییان بۆ هاتووە حەلاڵە بۆتان، و خواردەمەنییەکانی ئێوەش حەڵاڵە بۆیان، وە

هەروەها مارەکردنی ئافرەتە داوێن پاکە باوەڕدارەکان و ئافرەتە داوێن پاکەکانی ئەوانەی پێش ئێوە کتێبی ئاسمانیان بۆ هاتووە لە جولەکەو گاور، بە مەرجێ مارەییان بدەنێ، وە ئێوەش پاك بن و داوێن پیس و دۆستگر نەبن. وە هەرکەس کافر بێت بە حوکمەکانی ئیمان کردەوەکانی پوچەڵ ئەبێتەوە، وە لە ڕۆژی دواییدا لەوانەیە کە دۆڕاوو زیان لێ کەوتون.

(هەشتەم) : ئیسلام بە ڕەوای داناوە سەردانیان و چونەلای نەخۆشییان بۆ هەواڵ پرسین‌و دیاری بەخشین پێیان، وە هەروەها مامەڵەی کڕین‌و فرۆشتن لەگەڵیاندا و وێنەی ئەوە لە مامەڵەکان، وە سابتە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ کۆچی دوایی کردووە دیرعەکەی بارمتە بووە لای جولەکەیەك کە قەرزی لێ کردبوو[1].

وە هەندێ لە صەحابەکان کاتێ مەڕێك یا ئاژەڵێکی سەر بڕیایە بە خزمەت کارەکەی ئەووت لە ماڵە جولەکەکەی دراوسێمانەوە دەست پێ بکە.

خاوەنی کتێبی (البدائع) ووتویەتی: ئەو خاوەن کتێبانە لە وولاتی موسڵماناندا دائەنیشن‌و مامەڵەی کڕین‌و فرۆشتن ئەکەن، وە پەیمانی پاراستنیان بۆیە بۆ دانراوە بۆ ئەوەی ببێتە هۆ بۆ موسڵمان بونیان, وە ڕێ پێدانیان بەمانەوە لە وڵاتی ئیسلامدا چاکترین شتە بۆ ئەو مەبەستە, وە هەروەها سودی موسڵمانانیشی تێدایە لەو کڕین‌و فرۆشتنەدا.

**ئەو دۆستایەتی و پاڵپشتییەی ئیسلام قەدەغەی کردووە**

ئەوە ئەسڵ و بنەما لە پەیوەندی نێوان موسڵمانان و لەگەڵ غەیری موسڵماناندا، وە ئەم پەیوەندیە ناگۆڕێت مەگەر ئەوان لەلایەن خۆیانەوە کارێك بکەن ئەو پەیوەندیانە پێکدا بدات، بە دژایەتی موسڵمانان‌و بانگەوازیان بۆ جەنگ دژی موسڵمانان, ئەوکاتە خۆ دابڕین لێیان فەرمانێکی ئاینی‌و واجبێکی ئیسلامییە، جگە لەوەش کە کارێکی ڕامیاری و عادلانەیە، چونکە مامەڵەیە بە وێنەی خۆی.

وە قورئان سەرنجی شوێن کەوتوانی بەرەو ئەو ڕاستییە ئەبات و حوکمی جیاکەرەوەی تێدا ئەدات کە ئەفەرموێت: ﴿ لا يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ إِلَّا أَنْ تَتَّقُوا مِنْهُمْ تُقَاةً وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ ﴾ (آل عمران: من الآية ٢٨). واتە: موسڵمانان نابێت دۆستایەتی و خۆشەویستی لەگەڵ بێباوەڕاندا بگرن جیا لە خۆشەویستی خواو دۆستایەتی موسڵمانان, وە هەرکەس کاری وەها بکات هیچی لە لایەنی خوا نەگرتووە, لەکاتێکدا

---

(١) البخاري (٢٥١٣) ومسلم (١٦٠٣).

نەبێت کە لاوازبن و بتانەوێ خۆتان لە شەڕی بێ باوەڕان بپارێزن, وە خوای گەورە ئەتان ترسێنێت و ئاگادارتان ئەکاتەوە لە سزای خۆی.

ئەم ئایەتە بەگشتی ئەم واتایانەی خوارەوەی تێدایە:

(یەکەم) ترساندن لەوەی پاڵپشتو یارمەتی کافران بدرێت،لەبەر ئەوەی کارێکی ترسناکە بۆ سەر موسڵمانان.

(دووەم) هەرکەس کاری وابکات ئەوە لە خوا پچڕاوەو هیچ پەیوەندیەکی نیە بە خواوە. وە لەکاتی لاوازی و ترسان لە ئازاریان، دۆستایەتی بە ڕواڵەت دروستە، هەتا خۆیان بەهێز ئەکەنەوە دژی ئەوەی بەرەنگاریان ئەبێتەوە.

لە شوێنێکی تری قورئانی پیرۆزدا ئەفەرموێت: ﴿بَشِّرِ المنافقينَ بأنَّ لهم عذاباً أليماً الَّذِينَ يَتَّخِذُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ أَيَبْتَغُونَ عِنْدَهُمُ الْعِزَّةَ فَإِنَّ الْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعاً ، وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ إِنَّكُمْ إِذاً مِثْلُهُمْ إِنَّ اللَّهَ جَامِعُ الْمُنَافِقِينَ وَالْكَافِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعاً) ، الَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ فَإِنْ كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِنَ اللَّهِ قَالُوا أَلَمْ نَكُنْ مَعَكُمْ وَإِنْ كَانَ لِلْكَافِرِينَ نَصِيبٌ قَالُوا أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُمْ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ فَاللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَنْ يَجْعَلَ اللَّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلاً﴾ (النساء: ١٣٩-١٤١)

واتە: مژدە بدە بە مونافیقەکان کە بەڕاستی سزایەکی توندو پڕ ئازاریان بۆ هەیە، ئەوانەی کە بێ باوڕان ئەکەنە دۆستو پەنای خۆیان و وازئەهێنن لەدۆستایەتی موسڵمانان, ئایا بەو کارەیان هێزو یارمەتی‌یان ئەوێ لە بێ باوەڕان؟ بەڕاستی ئەوان خاوەنی ئەوە نین، چونکە یارمەتی و هێزو سەربەرزی هەمووی لەلای خواوەیە، وە بەڕاستی لە قورئاندا بۆتان هاتۆتە خوارەوە ئەگەر ببیستن ئایەتەکانی خوا بێ باوەڕی و گاڵتەیان بەرامبەر ئەکرێت ئێوە لەگەڵیاندا دامەنیشن هەتا ئەچنە ناو باسێکی ترەوە، جا ئەگەر واتان نەکرد ئێوەش وەك ئەوانن، بەڕاستی خوا کۆکەرەوەی دووڕووەکانو بێ باوڕەکانە هەموویان لە دۆزەخدا.

ئەوانەی خۆیان مات کردوەو چاوەڕێی ئەوەن کە لەشەڕدا بەسەرتان دێت، جا ئەگەر سەرکەوتن لەخواوە بۆ ئێوە بوو، ئەڵێن: ئەی ئێمە لەگەڵتان نەبوین و یارمەتیمان نەدان؟ بەڵام ئەگەر بۆ کافرەکان بە شێك لە سەرکەوتن هەبێت ئەڵێن: ئایا ئێمە پشتو پەناتان نەبووینو لەموسڵمانەکان نەمان پاراستن، جا با باش بزانن خوا لە ڕۆژی دوایےدا دادوەری نێوانتانە، وخوا ڕێگایەك دانانێ بۆ بێباوەڕان کە سەرکەون بەسەر بەندە چاکەکانیدا.

وە ئەم ئایەتانە بەگشتی ئەمانەی خوارەوەی تێدایە:-

(یەکەم) دووڕووەکان ئەوانەن کە خۆیان ئەدەنە پاڵ کافرەکانو خۆشەویستیان بۆ دەرئەبڕنو بەنهێنی یارمەتییان ئەدەن، و لە پاڵپشتی موسڵمانان ڕوو وەرئەگێڕن.

(دووەم) ئەو دووڕووانە بەو کارەیان داوای عیززەت و سەربەرزی ئەکەن هەرچەندە لەوەدا بەهەڵەدا چوون؛ چونکە سەربەرزی و هێزو توانا هەمووی بۆ خواو بۆ باوەڕدارانە:

﴿وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لا يَعْلَمُونَ﴾ (المنافقون: من الآية ٨) واتە: شکۆو سەربەرزی بۆ خوا و پێغەمبەر و باوەڕدارانە، بەڵام دوو ڕووەکان نازانن.

(سێیەم) ئەو دوو ڕووانە هەمیشە چاوەڕوانی ئەوەن کە چ شتێك تووشی موسڵمانان ئەبێت, جا ئەگەر لەخواوە سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، پێیان ئەڵێن ئێمە لەگەڵ ئێوەداین لە ئایینو جیهادا، بەڵام ئەگەر شتێ لەسەرکەوتن بووە بەشی بێباوەڕان، ئەو دووڕووانە بەبێ باوەڕەکان ئەڵێن: ئایا ئێمە پارێزگاری ئێوەمان نەکردو بەرگریمان لێ نەکردن لە موسڵمانان، بەوەی لە نهێنی موسڵمانەکان ئاگادارمان کردنەوە هەتا سەرکەوتن؟ کەواتە بەشی ئێمەش لەو دەست کەوتانە بدەن.

(چوارەم) هەرگیز خوای گەورە ڕێگا بە بێباوەڕان نادا بەسەر موسڵمانانی ڕاست و دڵسۆزدا سەربکەون ئەوانەی کە سنوری خوا ڕائەگرن لە ئاینەکەیاندا، واتە: ناهێڵێ کە سەرکەون بەسەر موسڵماناندا.

وە کۆمەڵێ لە موسڵمانەکان کۆمەڵێ لەبێ باوەڕانیان خۆش ئەویست، لەبەر خزمایەتی یا لەبەر دراوسێیەتی، یا لەبەر پەیمان بەستن، وە ئەو دۆستایەتییەش مەترسی هەبوو بۆسەر موسڵمانان، ئیتر خوای گەورە ئایەتی ناردە خوارەوە بۆیان و ئەو خۆشەویستییە زیان بەخشەی لێ قەدەغە کردن، ئەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَتَّخِذُوا بِطَانَةً مِنْ دُونِكُمْ لا يَأْلُونَكُمْ خَبَالاً وَدُّوا مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ الْبَغْضَاءُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الْآيَاتِ إِنْ كُنْتُمْ تَعْقِلُونَ﴾ (آل عمران:١١٨). واتە: ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە بێباوەڕان مەکەن بە دۆست و هاوڕێی خۆتان و ئاگاداریان بکەن لە نهێنییەکانتان، چونکە ئەوان درێغی ناکەن لەوەدا کە زیانتان پێ بگەیەنن وە پێیان خۆشە کە تووشی زەرەرو زیان ببن، وە ئەو ڕق و کینەیە لە قسەکانیاندا دەرکەوتووە، وە ئەو دوشمنایەتییەی لەدڵیاندا حەشاریان داوە زۆر گەورەترە. بەڕاستی ئێمە بەڵگەو نیشانەکانمان بۆ ڕوون کردونەتەوە؛ بۆ ئەوەی پەند وەربگرن و خۆتان بپارێزن ئەگەر ئێوە ژیری و تێگەیشتنتان هەبێت.

لەم ئایەتەدا قەدەغە کراوە کە بێباوەڕان بکرێن بە دۆست و هاوڕێ، واتە تایبەتیڕیان بکەن و نهێنی خۆتانیان بۆ دەرخەن, چونکە ئەو خۆشەویستییە شاراوەیە درێغی ناکات لەتێکدانی کاروبارتان، چونکە ئەوان هەمیشە حەز ئەکەن و بەهیوای ئەوەن زیانتان پێ بگەیەنن، وە بەڕاستی نیشانەکانی ڕق و کینەیان بەرامبەرتان لەقسەکانیاندا دەرکەوتوە، لەبەر توندی ئەو کینەیە ناتوانن بیشارنەوە، بەڵام ئەوەی لە دڵیاندایە لەرق‌وکینە بەرامبەرتان زۆر لەوەی کە لە دەمیان دەرئەچێت گەورەترە.

وە سروشتی ئیمانی ڕێ لە موسڵمانان ئەگرێ ئەو دوژمنەی خۆش بوێ کە هەمیشە چاوەڕوانی ئەوەی لێ ئەکات کارەساتێکی بەسەردا بێت، با ئەو دوژمنە بێباوەڕەش نزیکترین کەسی بێت.

قورئانی پیرۆز ئەفەرموێت: ﴿لا تَجِدُ قَوْماً يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُولَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْأِيمَانَ وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِنْهُ﴾ (المجادلة: من الآية٢٢) واتە: نابینی ـ ئەی محمد ـ نەتەوەیەك کە بەڕاستی باوەڕیان بەخواو ڕۆژی دوایی هەبێت و کار بەیاسای خوا بکەن، کەچی ئەوانەیان خۆش بوێت کە دژی خواو پێغەمبەر بن، با باوك‌و کوڕو براو هۆزیان بن، ئەو باوەڕدارانەی بەو شێوەیەن خوا باوەڕی لەسەر دڵیان نوسیوەو بە گیانێك لە خۆیەوە پشتگیریان ئەکات. بەڕاستی حوکمی قورئان سەبارەت بەوانەی یارمەتی ئیستعمارو دوژمنانی موسڵمانان ئەدەن دیارو ئاشکرایە, چونکە ئەوە خیانەتە بەرامبەر خواو قورئانەکەی و پێغەمبەرەکەی و پێشەوای موسڵمانان و نەتەوەی ئیسلامی بەگشتی، وە بەڕاستی ئەوانە بەو کارەیان حیسابیان بۆ مافی ئیسلام‌و مافی مێژو و مافی دراوسێیەتی و مافی ستەم لێکراوان نەکردووە.

وە هەروەها حیسابیان بۆ مافی ئێستاو پاشەڕۆژی ئەم ناوچەیە نەکردووە، و ئەو خائینانە بەو کارەیان؛ خۆیان بەشەیتان فرۆشتووە، وە لەسەر لاپەڕەکانی مێژوو سەر شۆڕی و نەنگی هەتاهەتایی و بێ‌کۆتایی خۆیان تۆمار کردووە.

## ئیعتراف بە مافی تاك

ئیسلام -دوای ئەوەی کە بەباشی باسی ڕێبازی ئاشتی کردووە، و پەیوەندی نێوان خەڵکی کردووە بە پەیوەندی ئاشتی و ئاسایش- ڕێزی بۆ ئادەمیزاد داناوە لەو ڕووەوە کە ئادەمیزادە، بێ ئەوەی سەیری ڕەگەزو ڕەنگ‌و ئایین‌و زمان‌و نیشتمان‌و نەتەوەو پلەو پایەی کۆمەڵایەتی بکرێت, خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً﴾ (الاسراء:٧٠) واتە: بەڕاستی ئێمە ڕێزمان لە

ئادامیزاد گرتووەو هەرچی لە بونەوەردایە بۆمان رام کردون، هەروەها هۆیەکانی گواستنەوە لە زەوی و لە دەریادا، و رۆزیمان داون لە خواردنە پاکەکان، و پەسەندمان کردون و ڕێزمان داون بەسەر زۆر لە دروستکراوەکاندا.

و لە دیمەنەکانی ئەو ڕێزگرتنە ئەوەیە کە خوا ئادەمیزادی بە دەستی خۆی دروست کردووە، و لە ڕۆحی خۆی کردووە بەبەرداو کورنوشی بە فریشتەکان بردووە بۆی و هەموو ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدایە بۆی رام و موسەخخەر کردووە. وە کردویەتی بە گەورەی ئەم ئەستێرەی زەوییە، وە کردویەتییە جێنشین لەوێدا بۆ ئەوەی ئاوەدان و چاکی بکات.

وە بۆ ئەوەی ئەم ڕێزە ببێتە ڕاستەقینەو ئوسلوبی ژیان، ئیسلام هەموو مافەکانی بۆ مرۆڤ دابین کردووە. وە پارێزگاری کردنی واجب کردووە, جا ئەو مافانە مافی ئاینی بن، یا شارستانی بن، یا ڕامیاری.

وە لەو مافانەش:

(١) مافی ژیان:

هەموو تاکێك مافی پاراستنی گیان و خودی خۆی هەیە، وە ڕەوا نییە دەست درێژی بکرێتە سەر ئەو گیانە مەگەر کەسێکی کوشتبێ، یا لە زەویدا خراپەکاری کردبێ، خراپەکارییەکی وەها کوشتن پێویست بکات.

خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنَّهُ مَنْ قَتَلَ نَفْساً بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعاً وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعاً﴾ (المائدة: من الآية٣٢) واتە: هەر لەبەر ئەوە لەسەر بەنی ئیسرائیلمان نوسیوە کە هەرکەس کەسێك بکوژێت بێ ئەوەی کەسی کوشتبێت یا خراپەکارییەکی کردبێت لەسەر زەوی، وەك ئەوە وەهایە کە هەموو دانیشتوانی سەرزەوی کوشتبێ، وە هەرکەس گیانێکی زیندو کردبێتەوە وەك ئەوە وایە هەموو خەڵکی سەرزەوی زیندو کردبێتەوە.

وە لە فەرموودەی صەحیح دا هاتووە: (لایحل دم امرئ مسلم إلا بإحدى ثلاث: النفس بالنفس، والثيب الزاني، والتارك لدينه المفارق للجماعة)[1]. واتە: خوێنی هیچ موسڵمانێك حەڵاڵ نییە لەیەکێك لەم سێ حاڵەتەدا نەبێت: گیان بە هۆی کوشتنی گیان، وە ژن و پیاوی زیناکەر، وە ئەوکەسەی لە دین پاشگەز دەبێتەوە و جیا دەبێتەوە لە کۆمەڵی موسڵمانان.

---

(١) البخاري (٦٨٧٨) ومسلم (١٦٧٦/٢٥).

(٢) مافی پاراستنی ماڵ و سامان:

وەك چۆن گیان پارێزراوە بەو شێوەیە ماڵ و سامانیش پارێزراوە، وە دروست نییە ماڵ ببرێت بە هیچ ڕێگایەك جگە لەو ڕێگایانەی مەشروعە, خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلَّا أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ﴾ (النساء: من الآية٢) واتە: ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە ماڵی یەکتر مەخۆن بە ناڕەوا، مەگەر بازرگانی و کڕین و فرۆشتنێك بێت بە ڕەزامەندی خۆتان.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من أخذ مال أخيه بيمينه, أوجب الله له النار، وحرم عليه الجنة، فقال رجل: وإن كان شيئاً يسيراً يا رسول الله؟ فقال: وإن كان عوداً من أراك)[١].

واتە: هەرکەس بە سوێندی درۆ ماڵی براکەی بخوات، خوا دۆزەخی بۆ پێویست ئەکات، و بەهەشتی لەسەر حەرام کراوە، پیاوێك ووتی: ئەگەر شتێکی کەمیش بێت ئەی نێرراوی خوا فەرمووی: ئەگەر چیلکەیەکیش بێت لە ئەراك. ئەراك ئەو دارەیە کە سیواکی لێ دروست دەکرێ.

(٣) مافی عیزو ناموس:

سوکایەتی کردن بە عیزو ناموس ڕەوا نییە با بە ووشەیەکی ناشیرینیش بێت. خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَيْلٌ لِكُلِّ هُمَزَةٍ لُمَزَةٍ﴾ (الهمزة:١) واتە سزای توندوتیژ بۆ ئەوکەسەی کە ئەنگ و شورەیی ئەنێ بە خەڵکەوە، و گاڵتە بە خەڵك ئەکات.

(٤) مافی ئازادی:

ئیسلام بەوەوە نەوەستاوە کە بڕیاری پاراستنی گیان و سامان و ناموسی خەڵکی داوە، بەڵکو بڕیاری ئازادی ئایینی و ئازادی بیرو ئازادی هەڵبژاردنی ئەو کارەی داوە کە ئادەمیزاد خۆی پێ بژێنێ، وە هەروەها بڕیاری ئازادی کەڵك وەرگرتنی لەهەموو دامەزراوەکانی دەوڵەت داوە.

وە ئیسلام لەسەر دەوڵەتی پێویست کردووە کە هەموو ئەو مافانە بپارێزێ، وە مافەکانی ئادەمیزاد هەر ئەوەندە نین بەڵکو مافی تری زۆرە لەوانە:

(١) مافی نیشتگە:

ئادەمیزاد مافی ئەوەی هەیە بچێتە هەر شوێنێك، وە لە هەر لایەك دابنیشێ و جێگیر بێت، وە مافی ئەوەی هەیە هاتوچۆ بکات لەزەویدا بێ ئەوەی ڕێی لێ بگیرێ یا تەگەرە بخرێتە ڕێگای.

---

(١) مسلم (١٣٧/٢١٨) وأحمد (٥/٢٦٠) والنسائي (٨/٢٤٦).

وە دروست نییە کەس نەفی بکریت یا دوور بخرێتەوە یا بەند بکرێت بێ ئەوەی تاوانێکی کردبێت بەرامبەر مافی کەسانی تر، بەڵام ئەگەر تاوانێکی کرد بۆ یاسا هەیە سزای بدات یا دەری بکات یا بەندی بکات. ئەوەش لەو کاتەدا ئەبێت کە دەست درێژی بکاتە سەر مافی کەسانی تر، و ئاسایشی کۆمەڵ بشێوێنێ، وە بێ‌گوناهان بترسێنێ، لەوبارەیەوە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الْأَرْضِ فَسَاداً أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلافٍ أَوْ يُنْفَوْا مِنَ الْأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ، إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِنْ قَبْلِ أَنْ تَقْدِرُوا عَلَيْهِمْ فَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ (المائدة ٣٣-٣٤).

واتە: بەڕاستی جەزای ئەوانەی دژی خواو پێغەمبەرەکەی ئەجەنگن‌و هەوڵی خراپەکاری ئەدەن لەسەر زەویدا، ئەوەیە کە بکوژرێن یا لە دار بدرێن، یا دەست‌و قاچیان بە پێچەوانەوە ببڕرێت، یا لە زەویدا نەفی بکرێن، ئەو جەزایە لە دونیادا سەرشۆڕییە بۆیان و لە ڕۆژی دواییشدا سزای گەورەیان بۆ ئەبێت, ئەو کەسانە نەبن کە پەشیمان ئەبنەوەو ئەگەڕێنەوە پێش ئەوەی ئێوە دەستتان بیان گاتێ. جا بزانن کە بەڕاستی خوا لێخۆشبو و میهرەبانە.

(٢) مافی فێربوون و ڕادەربڕین:

فێربوونیش مافێکە لە مافەکانی ئادەمیزاد: چونکە هەموو کەس مافی ئەوەی هەیە ئەوەندە بخوێنێ و فێر ببێ کە بیری ڕۆشن بکاتەوەو ئاستی خۆی بەرز بکاتەوە.

وە هەروەها لە مافی ئادەمیزادە کەڕای خۆی دەربڕێ و بەڵگەکانی دەربخات, و بە ئاشکرا حەق بڵێت و بەرپەوەی بەرێت.

وە ئیسلام قەدەغەی ئەوە ئەکات کە ڕاو بۆچون دەستی بەسەردا بگیرێ‌و دژایەتی بیری ئازاد بکرێت، مەگەر ئەو ڕاوبۆچونە زیانی هەبێت بۆ کۆمەڵ.

وە پێغەمبەر ﷺ بەیعەتی ئەکرد لەگەڵ هاوەڵەکانی لەسەر ئەوە کە ڕاستی دەربخەن، با تاڵیش بێت. وە لەسەر ئەوە کە لەبەر خوا لە لۆمەی کەس نەترسن، وە پێمان ڕائەگەیەنێت کە: (الساكت عن الحق شيطان أخرس) واتە: ئەوەی لە حەق‌و ڕاستی بێ دەنگ بێ شەیتانێکی لاڵە.

وە لەوبارەیەوە قورئانی پیرۆز ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنْزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى مِنْ بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُولَئِكَ يَلْعَنُهُمُ اللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ ، إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا وَأَصْلَحُوا وَبَيَّنُوا فَأُولَئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ وَأَنَا التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾ (البقرة:١٥٩-١٦٠).

واتە: بەڕاستی ئەوکەسانەی ئەو ڕاستی و ڕێنماییەی ناردومانەتە خوارەوە ئەشارنەوە دوای ئەوەی ئێمە لە کتێبەکەماندا بۆ خەڵکمان ڕوون کردۆتەوە، ئەو جۆرە کەسانە خوا نەفرینیان لێ

ئەكات، وە هەروەها نەفرین كەران نەفرینیان لێ ئەكەن, ئەوانە نەبن كە پەشیمان ئەبنەوەو خۆیان چاك ئەكەن‌و ڕاستی‌یەكان دەرئەخەن، ئەوكەسانە تۆبەیان لێ وەرئەگرم، چونكە من زۆر لێبوردە و میهرەبانم.

لەدوواییدا كە كۆتایش نی‌یە: ئیسلام بڕیاری ئەوەی داوە كە مافی برسی ئەوەیە خواردنی بدرێتێ و مافی بێ‌بەرگ ئەوەیە پۆشاكی بدرێتێ، و نەخۆش تەداوی بكرێت، و ترساو هێمن بكرێتەوە، بێ ئەوەی جیاوازی بكرێت لەنێوان ڕەنگێك و ڕەنگێكی تردا، و لەنێوان ئایینێك و ئایینێكی تردا، چونكە ئادەمیزاد هەموو یەكسانن لە مافەكانیاندا.

ئائەوە ڕێنمایی و ئامۆژگاری ئیسلامە دەربارەی ئیعتراف‌و دان نان بە هەندێ لە مافەكانی ئادەمیزاددا، وە ئەو ڕێنمایی و ئامۆژگاری‌یانە خێرو چاكەی هەموو دونیای تێدایە, وە گەورەترین شتیش كە لەمەدا هەبێت ئەوەیە كە ئەو ڕێنمایی‌یانە پێش هەموو ئەو مەزهەب و ڕێچكانە كەووتوە كە باسی مافی ئادەمیزاد ئەكەن، وە ئیسلام ئەو ڕێنمایی‌یانەی وەها لێ كردوە كە بەجێ هێنانیان بەشێك لە ئایین بێت و خوا پەرستی و لە خوا نزیك بونەوە بێت. وەك چۆن ئادەمیزاد بە نوێژو هەموو خواپەرستی‌یەكانی تر لەخوا نزیك ئەبێتەوە.

**تاوانی لەناوبردنی مافەكان:**

بەڕاستی هەر ئەو مافانەن كە ئادەمیزاد ئەگەیەننە ئەوپەری بەرزی و دەتوانێ بەو پلەیە بگا كە بۆی بڕیاردراوە، ماددی بێ یا مەعنەوی. جا لەبەر ئەوەیە كە هەر جۆرە فەوتاندن یان كەم كردنەوەی مافێك لە مافەكانی ئادەمیزاد بە تاوانێك لە تاوانەكان دائەنرێت.

وە هەر بەوهۆیەوەیە كە ئیسلام قەدەغەی جەنگ ئەكات بەهەموو جۆرەكانی‌یەوە، چونكە جەنگ لەگەڵ ئەوەدا كە پەلاماردانە بۆ سەر ژیان –كە ژیانیش مافێكی پیرۆزە- ئەو شتانەش لەناو ئەبات كە ژیانیان پێ چاك ئەبێت و ژیانیان پێ ئەچێ بەڕێوە.

وە ئیسلام جەنگی داگیركاری‌و بڵاوكردنەوەی هێزو دەسەڵاتی قەدەغە كردووە.

وە فەرمویەتی: ﴿تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لا يُرِيدُونَ عُلُوّاً فِي الْأَرْضِ وَلا فَسَاداً وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾ (القصص:٨٣) واتە: ئەوە خانەی بەرزی ڕۆژی دوایی‌یە، كە ئەیكەینە شوێنی ئەو كەسانەی كە نایانەوێت تەكەببورو گەورەیی بكەن لەسەر زەوی و ڕوو لەحەق وەرگێڕن، وە نایانەوێ ستەم و خراپە بكەن، وە ئەنجامی باشیش بۆ ئەوانەیە كە لە خوا ئەترسن.

وە جەنگی تۆڵەكردنەوە و دوژمنكاری قەدەغە كردووە و فەرمویەتی: ﴿وَلا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ على أن لا تَعْدِلُوا إِعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ للتَّقوى، وتعاونوا على البِرِّ والتَّقوي وَلا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ

وَالْعُدْوَانِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ (المائدة: من الآية٢) واته: ڕق و كینه‌ی كۆمه‌ڵێك له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئێوه‌یان مه‌نع كرد له‌گه‌یشتن به‌ مزگه‌وتی حه‌رام -وه‌ك له‌ساڵی (حديبية) ڕوویدا- هه‌ڵتان نه‌نێ بۆ ئه‌وه‌ی واز له‌ عه‌دل و ڕاستی بهێنن سه‌باره‌ت به‌وان.

وه‌ یارمه‌تی یه‌كتر بده‌ن له‌سه‌ر چاكه‌و خواپه‌رستی نه‌ك له‌سه‌ر تاوان و دوژمنكاری، وه‌ له‌ خوا بترسن چونكه‌ به‌ڕاستی تۆڵه‌و سزای توندوتیژه‌.

وه‌ هه‌روه‌ها جه‌نگی تێكدان و وێرانكاریشی قه‌ده‌غه‌ كردووه‌و فه‌رموویه‌تی: ﴿وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا﴾ (الأعراف: من الآية٥٦) واته: خراپه‌ مه‌كه‌ن له‌سه‌ر زه‌وی، دووای ئه‌وه‌ی كه‌ خوا چاكی كرد به‌ ڕه‌وانه‌ كردنی پێغه‌مبه‌ران -سه‌لامی خوایان له‌سه‌ربێ-

## كه‌ی جه‌نگ ڕه‌وا ئه‌بێت

كاتێك بنه‌ما ئاشتی بێت، و جه‌نگ نائاسایی بێت, ئیتر هیچ شتێك نی‌یه‌ كه‌ جه‌نگ ڕه‌وا بكات -له‌ڕوانگه‌ی ئیسلامدا- بارو دۆخ هه‌رچۆنێك بێت، ته‌نها له‌ دوو حاڵه‌تدا نه‌بێت:

حاڵه‌تی یه‌كه‌م:

كاتی پارێزگاری له‌ گیان، و عه‌رز، و ناموس، و سامان، و نیشتمانه‌ له‌كاتی ده‌ست درێژی كردندا. خوای گه‌وره‌ فه‌رموویه‌تی: ﴿وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾ (البقرة:١٩٠) واته: بجه‌نگن له‌ ڕێگای خوادا له‌ دژی ئه‌وانه‌ی جه‌نگتان له‌ دژ ئه‌كه‌ن، وه‌ ده‌ست درێژی مه‌كه‌ن چونكه‌ خوا ئه‌وانه‌ی خۆش ناوێ كه‌ ده‌ست درێژی ئه‌كه‌ن.

وه‌ له‌ سه‌عیدی كوڕی زه‌یده‌وه‌ هاتووه‌ كه‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی: (من قتل دون ماله؛ فهو شهيد، ومن قتل دون دمه؛ فهو شهيد، ومن قتل دون دينه؛ فهو شهيد، ومن قتل دون أهله؛ فهو شهيد). رواه أبوداود والترمذي والنسائي[1].

واته: هه‌ركه‌س له‌ پێناوی سامانیدا بكوژرێ شه‌هیده‌، وه‌هه‌ركه‌س له‌ پێناوی گیانی‌دا بكوژرێ شه‌هیده‌، وه‌هه‌ركه‌س له‌پێناوی ئایینی‌دا بكوژرێ شه‌هیده‌، وه‌هه‌ركه‌س له‌ پێناوی كه‌س‌و كاریدا بكوژرێت ئه‌وه‌ شه‌هیده‌.

---

(١) أبوداود (٤٧٧٢) والترمذي (١٤٢١) والنسائي (١١٥/٧) وابن ماجه (٢٥٨٠).

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَمَا لَنَا أَلَّا نُقَاتِلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا مِنْ دِيَارِنَا وَأَبْنَائِنَا﴾ (البقرة: من الآية ٢٤٦) واتە: بۆچی نەجەنگێین لە ڕێگای خوادا لە کاتێکدا کە دوژمنەکەمان لەناو ماڵ و منداڵەکانماندا دەریان کردووین.

حاڵەتی دووەم:

حاڵەتی بەرگری کردنە لە بانگەواز بۆلای خوا, کاتێ کەسێك لە ڕێگەیدا بوەستێ، بە سزادانی ئەوانەی کە باوەڕ بەو بانگەوازە دێنن، یا بە گێڕانەوەی ئەوانەی ئەیانەوێت بچنە ناوی، یا بەوەی بانگەوازکەر قەدەغە بکرێ لە بانگەوازەکەی. بەڵگەی ئەمەش:

(یەکەم) خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ ، وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأَخْرِجُوهُمْ مِنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ وَالْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ الْقَتْلِ وَلَا تُقَاتِلُوهُمْ عِنْدَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ حَتَّى يُقَاتِلُوكُمْ فِيهِ فَإِنْ قَاتَلُوكُمْ فَاقْتُلُوهُمْ كَذَلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ، فَإِنِ انْتَهَوْا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ فَإِنِ انْتَهَوْا فَلَا عُدْوَانَ إِلَّا عَلَى الظَّالِمِينَ﴾ (البقرة: ١٩٠-١٩٣).

واتە: وە بجەنگن لە ڕێی خوادا لەگەڵ ئەوانەدا کە جەنگتان لەگەڵدا ئەکەن و دەست درێژی مەکەن، چونکە خوا ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە لە سنورەکانی خوا دەرئەچن و ئەوەی خواو نێرراوەکەی حەرامیان کردووە ڕەوای ئەکەن. وە بیان کوژن لە هەرکوێ توشیان بوون و دەریان بکەن لەو شوێنەی ئێوەیان دەرکرد, وە فیتنە —کە کوفرو شیرك و بەرگرتنە لە ئیسلام- توندترە لەوەی کە بیان کوژن. وە ئێوە دەست بە جەنگ مەکەن لە گەڵیانا لای مزگەوتی حەرام هەتا ئەوان نەجەنگن دژی ئێوە لەو شوێنەدا, جا ئەگەر لەوێدا جەنگین لەگەڵتان ئێوەش بجەنگن لە گەڵیانا، وە جەزای بێباوەڕان بەو شێوەیە ئەبێت، وە ئەگەر وازیان هێنا لەو کردەوانەیان کە ئەیکەن، ئەوە بەڕاستی خوا لێ خۆشبووە بۆ بەندەکانی و میهرەبانە پێیان. وە بەردەوام بجەنگن لەگەڵیاندا هەتا فیتنە نەمێنێ و ئایین هەر تەنها بۆ خوا بێت، جا ئەگەر وازیان هێنا ئەوە هێرش کردن تەنها بۆ سەر ستەمکاران دەبێت.

وەئەم ئایەتانە ئەم حاڵانەی خوارەوەی تێدایە:

١- فەرمان دان بە جەنگین دژی ئەوانەی دەست پێشکەری ئەکەن بۆ جەنگ، و کوشتنی دەست درێژی کەران، بۆ بنەبڕکردنی دەست درێژیان. وە جەنگین لە پێناوی پاراستنی گیاندا کارێکی شەرعی و یاسایی‌یە لە هەموو یاساکاندا، وە لە هەموو ڕێچەکەکاندا, ئەمەش ئاشکرایە لە فەرموودەی خوادا کە ئەفەرموێ: ﴿وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ﴾

٢- بەڵام ئەوانەی دەست پێشکەری ناکەن بۆ جەنگ، دروست نیە لە پێشەوە جەنگیان لەگەڵدا بکرێت, چونکە خوای گەورە ستەم و پەلاماردانو دەست درێژی کردنی قەدەغە کردووە، لەم فەرمودەیەدا: ﴿وَلا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾

٣- وە ئەوە کە هۆی قەدەغەکردنی دەست درێژی بەوە دانراوە کە خوا دەست درێژیکەرانی خۆش ناوێت، بەڵگەیە کە ئەم قەدەغە کردنە هەر پتەوو بەردەوامە و ناشێ بۆ سڕینەوە، چونکە ئەوە ڕاگەیاندێکە کە خوا دەست درێژی کردنی لا خۆشەویست نیە، وە ڕاگەیاندنیش سڕینەوەی نیە، چونکە دەست درێژیکردن ستەمکارییە وە خواش هەرگیز ستەمکاری لا خۆشەویست نیە.

٤- بۆ ئەو جەنگە مەشروعەش مەبستێك هەیە کە تێیدا کۆتایی دێ، کە ئەویش ڕێ گرتنە لە هەڵگێڕانەوی موسڵمانان؛ بە وازهێنان لە ئازاردانیان و وازهێنان لە ئازادییان تاوەکو بتوانن بە ئازادی خواپەرستی بەجێ بهێنن و ئاینەکەیان ڕابگرن، وە لە گیانیان دڵنیا بن لە هەموو دوژمنکارییەك.

(دووەم) خوایگەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا لَكُمْ لا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ وَلِيّاً وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ نَصِيراً﴾ (النساء:٧٥)

واتە: ئەوە چیتانە بۆچی ناجەنگن لەڕێی خواو ئەو لاوازو بێ دەسەڵاتانە لە ژن و پیاوو منداڵان کە دەست درێژی کراوەتە سەریان، ئەوانەی ئەڵێن: ئەی پەروەردگارمان لەم دێیە -مەبەست مەککەیە- کە دانیشتوانەکانی ستەمکارن ڕزگارمان بکەو لەلایەن خۆتەوە پاڵپشتو یارمەتی دەرمان بۆ دابنێ.

وە ئەم ئایەتە دوو هۆی لە هۆیەکانی جەنگ ڕوون کردۆتەوە:

(یەکەمیان) جەنگین لەڕێی خوادا. ئەو مەبەستەیە کە ئایین هەوڵی بۆ ئەدات، بۆ ئەوەی فیتنەو ڕێگری لە ئایین نەمێنێو ئایین هەربۆ خوا بێت.

(دووەمیان) جەنگین لە پێناوی لاوازو بێ دەسەڵاتاندا، ئەوانەی لە شاری مەککە موسڵمان بوبون، بەڵام توانای کۆچ کردنیان نەبوو وە قورەیش ئازاری ئەدان بۆ ئەوەی لە ئایینەکەیان هەڵگەڕێنەوە هەتا وایان لێ کردبوون داوای ڕزگارییان لە خوا ئەکرد. جا ئەوانە پێویستییان بە حیمایەو بەرگرییە کە ئەزیەت و ئازاری ستەمکارانیان لێ دوور بخاتەوە، بۆ ئەوەی بتوانن بە ئازادی ئایین و باوەڕەکەیان ڕابگرن.

(سێیەم) خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿فَإِنِ اعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَاتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْاْ إِلَيْكُمُ السَّلَمَ فَمَا جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلاً﴾ (النساء: من الآية٩٠) واتە: ئەگەر هاتو وازیان هێناو نەجەنگان دژی ئێوەی موسڵمان، وە داوای ئاشتیيان کرد, ئیتر خوا ڕێگەتان نادا بجەنگن دژیان‌و بچنە سەریان.

جا ئەو کۆمەڵە کە نەجەنگان لەگەڵ هۆزەکانیان و نەجەنگان لەگەڵ موسڵماناناندا، وازیان لە هەردوو لایەن هێنا، وە بەڕاستی وازهێنانەکەیان بە مەبەستی ئاشتی بوو، ئەوە موسڵمانان ڕێگە نادرێن جەنگ دژی ئەوانە بکەن.

(چوارەم) خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِنْ جَنَحُوا لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ) وَإِنْ يُرِيدُوا أَنْ يَخْدَعُوكَ فَإِنَّ حَسْبَكَ اللَّهُ﴾ (لأنفال: من الآية٦١-٦٢)
واتە: ئەگەر بێباوەڕکان مەیلی ئاشتیان کرد تۆش مەیلی ئاشتی بکە و پشت بە خوا ببەستە چونکە بەڕاستی خوا بیسەری وتەکانیانو زانایە بە مەبەستیان، بەڵام ئەگەر بەوکارەیان ویستیان فێڵت لێ بکەن تۆ مەترسە چونکە تەنها خوات بەسە بۆ سەرکەوتن.

لەم ئایەتەدا فەرمان بە مەیل کردنی تێدایە بۆ ئاشتی، کاتێ دوژمن مەیلی کرد، هەرچەندە مەیل کردنەکەیان فێڵ و تەڵەکە بێت.

(پێنجەم) جەنگەکانی پێغەمبەر ﷺ هەموویان جەنگی دیفاع و بەرگری بوون، نەك دوژمنکاری، وە جەنگ لەگەڵ عەرەبە هاوتادانەرەکان و پشت گوێ خستنی پەیمانەکەیان دوای فەتحی مەککە لەسەر ئەو بنەمایە بوو، وە ئەمەش ئاشکرایە لە فەرمودەی خوای گەورەدا کە فەرمویەتی: ﴿أَلا تُقَاتِلُونَ قَوْماً نَكَثُوا أَيْمَانَهُمْ وَهَمُّوا بِإِخْرَاجِ الرَّسُولِ وَهُمْ بَدَأُوكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ أَتَخْشَوْنَهُمْ فَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَوْهُ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ)(قَاتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنْصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ) (وَيُذْهِبْ غَيْظَ قُلُوبِهِمْ وَيَتُوبُ اللَّهُ عَلَى مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ (التوبة:١٣-١٥).
واتە:ئایا ناجەنگن دژی نەتەوەیەك کە پەیمانەکانیان شکاند، و ئەیانویست پێغەمبەر ﷺ دەربکەن, وە هەر ئەوانیش دەست پێشخەربوون لە جەنگدا دژتان یەکەم جار، ئایا ترستان لێیان هەیە وا ناجەنگن دژیان، بزانن خوا شایستەترە کە لێی بترسن ئەگەر ئێوە بەڕاستی بڕوا دارین.

بجەنگن لەگەڵ دوژمنانی خوا خوا بە دەستی ئێوە سزایان ئەدات‌و سەریان شۆڕ ئەکات‌و ئێوە سەر ئەخات. بسەریانداو دڵی موسڵمانان سارێژ ئەکات. وە ڕق‌و کینەی دڵیان ئەتارێنێ. وە هەرکەسیش لەو سەرکەشانە تۆبە بکاو پەشیمان بێتەوە خوا تۆبە وەرئەگرێ لە هەرکەس کە بیەوێ. وە خوا زانا و کاردروستە.

وە کاتی هەموو بێباوەڕەکان کۆبوونەوەو لە کەوانێکەوە تیریان گرتە موسڵمانان، خوای گەورە فەرمانی پێدان کە دژی هەموویان بجەنگن، ئەفەرموێ: ﴿وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾ (التوبة: من الآية٣٦) واتە: بجەنگن دژی بێ باوەڕان بەهەمووتان، وەك چۆن ئەوان ئەجەنگن دژی ئێوە بە هەموویان، وە بزانن کە بەڕاستی خوا لەگەڵ ئەوانە دایە کە لە خوا ئەترسن.

بەڵام جەنگ کردن لەگەڵ جولەکەکاندا لەبەر ئەوە بوو کە ئەوان پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بەستبوو کاتێ چووە مەدینەو کۆچی کرد، بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو پەیمانەکەیان شکاندو چوونە پاڵ بێ باوەڕانو دوو ڕووەکان دژی موسڵمانەکان، وەکاتی جەنگی ئەحزاب شەڕیان کرد لەگەڵ موسوڵمانەکان، جا خوای گەورە ئەم ئایەتانەی نارده خوارەوە: ﴿قَاتِلُوا الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَا بِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ﴾ (التوبة:٢٩) واتە: بجەنگن دژی ئەوانەی باوەڕیان بەخواو ڕۆژی دوایی نییە، وە ئەو شتانە بەحەرام نازانن کە خواو پێغەمبەرەکەی حەرامیان کردووە. وە لەوانەی کتێبی ئاسمانیـیان بۆ هاتووەو ناچنە سەر ئاینی ڕاستو هەق، شەڕ بکەن دژ بەوان هەتا بەدەستی خۆیان سەرانە ئەدەن بە سەرشۆڕی.

وە هەروەها ئەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قَاتِلُوا الَّذِينَ يَلُونَكُمْ مِنَ الْكُفَّارِ وَلْيَجِدُوا فِيكُمْ غِلْظَةً وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾ (التوبة:١٢٣)

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوڕتان هێناوە بجەنگن لەگەڵ ئەوانەی نزیکن لێتانەوە لە بێباوەڕان، وە با توندوتیژیتان لێ ببینن لە جەنگەکەدا، وە بزانن کە خوا لەگەڵ لە خوا ترسەکاندایە.

(شەشەم) پێغەمبەر ﷺ جارێك بەلای ئافرەتێکی کوژراودا تێ پەڕی فەرمووی: (ماكانت هذه لتقاتل)[1].

واتە: ئەمە شەڕکەر نەبووە بۆچی کوشتویانە.

لەوەوە ئەزانرێ کە هۆی حەرام کردنی کوشتنی ئەو ژنە ئەوە بووە کە جەنگاوەر نەبووە لەگەڵ جەنگاوەرەکاندا. کەواتە جەنگ کردنی ئەوان بە دژی موسڵمانان بووەتە هۆی جەنگ کردنی موسڵمانان دژیان، وە کوفرەکەیان هۆ نەبووە.

(١) أحمد (٣/٤٨٨) وأبوداود (٢٦٦٩) والنسائي في الكبرى (٨٦٢٥) وابن ماجه (٢٨٤٢).

(حەوتەم) پێغەمبەر ﷺ کوشتنی ڕاهیبان و منداڵانی قەدەغە کرد[1] هەر لەبەر ئەو هۆیەی کە کوشتنی ئافرەتی پێ قەدەغە کرد.

(هەشتەم) ئیسلام زۆرەملی نەکردۆتە هۆیەك لە هۆیەکانی خەڵك هێنانە ناو ئیسلام، بەڵکو ژیری و بیرکردنەوەو وورد بوونەوە لەئاسمانەکان و زەوی کردبووە هۆ بۆ ئەوە.

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَنْ فِي الْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعاً أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ ، وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَنْ تُؤْمِنَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ وَيَجْعَلُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لا يَعْقِلُونَ ، قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا تُغْنِي الْآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَنْ قَوْمٍ لا يُؤْمِنُونَ﴾ (یونس:٩٩-١٠١)

واتە: ئەگەر پەروەردگارت بیوستایە –ئەی محمد- هەرچی لەسەر زەویدا هەبوو باوەڕی ئەهێنا بەوەی هێناوتە بۆیان, ئایا تۆ زۆر لە خەڵك ئەکەیت باوەڕ بهێنن, وە هیچ کەسێك نییە باوەڕ بهێنێ بەبێ ئیزنی خوا، وە خوا سزاو سەرشۆڕی ئەدا بەسەر ئەوانەدا کە ژیری و تێگەیشتنیان نییە، بڵێ وورد‌بنەوەو پەند وەربگرن لەوەی کە لە ئاسمانەکانو زەویدایە، بەڵام ئەو نەتەوەیەی باوەڕ ناهێنن نیشانەکانی خواو ترساندن بێ‌سوودە لەگەڵیان.

وە ئەفەرموێ: ﴿لا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ﴾ (البقرة: من الآية٢٥٦) واتە: لە ئاییندا زۆر کاری نییە، چونکە ڕێنموونی لە گومڕایی ئاشکرا بووەو جیا بۆتەوە.

وە بە صەحیحی سابت بووە کە پێغەمبەر ﷺ دیلی ئەگرت لە جەنگدا، بەڵام نەبیستراوە زۆری کردبێت لە کەسیان کە موسوڵمان ببێت. وە صەحابەکانیشی هەر بەو جۆرە بوون.

ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبی هورەیرەوە کە ثومامەی حەنەفی دیل کرابوو پێغەمبەر ﷺ بەیانیان ئەهاتە لای پێی ئەفەرموو: (ئەی ثومامە چیت لایە؟..).

ئەویش ئەی ووت: ئەگەر بمکوژیت خاوەن خوێن ئەکوژیت, وە ئەگەر منەت باریشم کەیو ئازادم کەی کەسێکی ستایشکەر منەت بار ئەکەی, وەئەگەر ماڵیشت ئەوێت چەندت بوێت ئەت دەینێ.

وە صەحابەکان حەزیان لەوە ئەکرد کە بریتی بدات و ئەیان ووت: چی بکەین لە کوشتنی ئەمە.

پێغەمبەر ﷺ چوو بۆلای ئەویش موسڵمان بوو، ئینجا کردیەوەو ناردی بۆ ناو باغچەکەی ئەبی طەلحە خۆی بشۆرێ, ئەویش خۆی شۆردو دوورکات نوێژی کرد. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لقد حَسُنَ إسلام أخيكم)[1].

---

(١) البخاري (٣٠١٥) ومسلم (٢٥/١٧٤٤).

واتە: براکەتان بە چاکی موسوڵمان بووە.

بەڵام گاورەکان و ئەوانەی تر پێغەمبەر ﷺ دژی هیچیان نەجەنگا، هەتا دوای پەیمانی حودەیبیەیە کە نێرراوی نارد بۆ هەموو پاشاکانو داوای لێ کردن موسڵمان بن.

جا نامەی بۆ قەیسەرو کیسراو (مقوقس)و نەجاشی و بۆ پاشا عەرەبەکانی شامو ڕۆژهەڵات نارد، وە چەندەها کەس لە گاورەکانو ئەوانی تریش هاتنە ناو ئیسلامەوە.

بەڵام گاورەکانی شام دەستیان کرد بە کوشتنی ئەوانەی کە موسوڵمان بوبون.

جاکاتێ گاورەکان دەستیان کرد بە کوشتنی موسڵمانان پێغەمبەر ﷺ لەشکرێکی بە سەرۆکایەتی زەیدی کوڕی (حارثة) ناردە سەریان، وە فەرمانی پێدان کە دوای زەید جەعفەر بێتە سەرکردە، دوای جەعفەریش عبدالله ی کوڕی ڕەواحە، ئەوەش یەکەم جەنگ بوو کە موسڵمانەکان دژی گاورەکان جەنگین لە موئتە لە سەرزەوی شام، کە ژمارەیەکی زۆر گاور هاوبەشی کردبوو، وە هەموو سەرکردەکان شەهید کران، هەتا خالیدی کوڕی وەلید ئاڵاکەی گرتە دەست.

وە لەوە کە باسکرا بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە ئیسلام ڕێی جەنگی نەداوە بۆ لابردنی دەست درێژی نەبێت، یا بۆ پاراستنی بانگەوازی ئیسلام، وە بۆ نەهێشتنی چەوساندنەوەو ئازادی بیروڕای ئاینی نەبێت، کەواتە جەنگ لەو کاتەدا ئەبێ بە فەرزێك لە فەرزەکانی ئاین، وەئەبێ بەواجبێك لەواجبە پیرۆزەکانو ناو ئەبرێت بە (جهاد).

### جەنگین لەڕێی خوادا (جهاد)

جیهاد لەڕەوشی تازەدا پێی ئەوترێ (حرب) وە حەربیش بەگژ یەکداچونی چەکدارییە لەنێوان دوو دەوڵەتدا یا زیاتر. ئەمیش شتێکی سروشتییە لە ناو ئادەمیزاددا، چونکە هیچ نەتەوەو هیچ چەرخێك نییە جەنگی تێدا ڕوو نەدابێت.

وە نامەو یاسا ئاسمانییەکانی پێشوو بڕیاریان لەسەر داوە.

لە سیفرەکانی تەوراتدا کە جولەکە دەستاوەستی پێ ئەکات بڕیاری جەنگی تێدایە, بە ترسناکترین شێوە لە شێوەکانی کوشتنو بڕینو تاڵان کردنو وێران کاری.

لە (سفر التثنية)دا هاتووە لە (الإصحاح العشرين) ژمارە (١٠) و دوای ئەو، ئەم دەقە هاتووە دەربارەی جەنگ:

---

(١) البخاري (٤٣٧٢) ومسلم (١٧٦٤/٥٩) وأحمد (٨٢/٣).

کاتێ خۆت و لەشکرەکەت لەشارێك نزیك ئەبیتەوە کە ئەتەوێ داگیری بکەی، بانگیان بکە بۆ صولح، جا ئەگەر هاتن بە دەنگتەوە و صولحیان کردوو شارەکەیان بۆ کردیتەوە، ئەو کاتە هەرچی لەو شارەدایە ژێر دەستەی تۆ ئەبن و ئەبنە بەندەو کۆیلەت.

بەڵام ئەگەر نەهاتن بە دەنگتەوەو جەنگیان ویست، چوار دەوری بگرە، ئەگەر خوا دەستی دایت و داگیرت کرد نێرینەکانی بکوژەو ژنو منداڵەکانیان و ئاژەڵەکانیان و هەرچی لە شارەکەدا هەیە بیکە بە دەست کەوت و بیخو، جا تۆ تاڵانی دوژمنەکانت ئەخۆی کە خوا پێی داوی، بەم شێوەیە رەفتار بکە لەگەڵ وڵاتە دوورەکان کە لەم نەتەوانە نین، وە ئەو شارانە کە حیثی‌یەکانو ئامورییەکان و کەنعانی‌یەکان و فەرزیەکان و حوەینی‌یەکان و یوسی‌یەکانە، ئەوە کەسی تێدا مەهێڵە، وەك پەروەردگارت فەرمانی پێ کردوی.

وە لە ئینجیلی مەتادا کە لە دەستی گاورەکاندایە هاتووە لە (الإصحاح العاشر) ژمارە (٢٤) و ژمارەکانی دوایی‌دا ئەڵێت:

وا مەزانن من هاتووم ئاشتی بخەمە سەر زەوی، نەهاتوم ئاشتی بخەمەوە، بەڵکو شمشێر بخەمە ناو خەڵکەوە، وە من هاتووم ئادەمیزاد لێك جیا بکەمەوە، کوڕ بکەمە دوژمنی باوك و کچ دژی دایك و بوك بکەمە دژی خەسوانی. بزانن دوژمنی ئادەمیزاد کەس و کاریەتی، جا هەرکەس دایکی یا باوکی لە من خۆشتر بوێ شایستەی من نی‌یە، وە هەکەس کورەکەی یا کچەکەی خۆی لە من خۆشتر بوێ شایستەم نی‌یە، وە هەرکەس خاچەکەی هەڵنەگرێ و شوێنم نەکەوێ شایستەم نی‌یە، وە هەرکەس ژیانی بەدەست بێنێ وونی ئەکات، وە هەرکەس لەپێناوی مندا ژیانی لەناو بەرێت وە دەستی ئەهێنێتەوە.

وە یاسا دەوڵەتی‌یەکان بڕیاریان داوە لەسەر ئەو کات و بارودۆخەی جەنگی تیدا ئەکرێت و بنەما و شێواز و یاسایان بۆ داناوە، بەشێوەیەك کە بارە ناهەموارەکەی و خراپەکانی سوك و ئاسان بکەن، هەر چەندە لەکاتی جەنگەکەدا جێ‌بەجێ ناکرێن.

## دانانی جیهاد لە ئیسلام دا

خوای گەورە محمدی ﷺ ناردووە بە پێغەمبەر بۆ سەر هەموو ئادەمیزاد، وە فەرمانی پێ داوە خەڵك بانگ بکات بۆ رێنمایی و ئایینی ڕاست، وە بەو شێوەیە لە مەککە مایەوە بانگەوازی خەڵکی ئەکرد بە دانایی و مەوعیزەو ئامۆژگاری جوان. وە هەر ئەبوو ئەو خەڵکەی کە لەناویاندا بوو دژی بوەستن کاتێ بینیان ئەم بانگەوازە نوێ‌یە جێی مەترسی‌یە بۆ سەر بوونیان لە ڕووی

ماددی و ئەدەبی‌یەوە. بەڵام ڕێنامیی خوا لەم کاتەدا بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەوە بووە کە بەرامبەر ئەو دژایەتی‌یە بە ئارامی و لێبوردەیی بوەستی و بە شێوەی جوان وەڵامیان بداتەوە.

﴿وَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا﴾ (الطور: من الآية ٤٨) واتە: ئارام گر بە بۆ فەرمانەکانی پەروەردگارت بەراستی ئێمە پارێزگاری تۆ ئەکەین و لەژێر چاودێری خۆماندایت.

﴿فَاصْفَحِ الصَّفْحَ الْجَمِيلَ﴾ (الحجر: من الآية٨٥) واتە: بە جوانترین شێوە لێیان ببورە.

﴿فَاصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلامٌ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ﴾ (الزخرف:٨٩) واتە: لێیان ببورەو هەر سەلام بڵێ پێیان کە خاوەن ژیری‌یەکان ئەیڵێن بە نەزانەکان، دوایی ئەزانن تووشی چی ئەبن.

﴿قُلْ لِلَّذِينَ آمَنُوا يَغْفِرُوا لِلَّذِينَ لا يَرْجُونَ أَيَّامَ اللَّهِ﴾ (الجاثية: من الآية١٤) واتە: بڵێ بە باوەڕدارەکان لەو کەسانە ببورن کە ناترسن لە سزاو تۆڵەی سەختی خوا کاتێك ئەزیەت و خراپەیان پێ گەیاندن.

خوای گەورە ڕێی نەداوە کە خراپە بە خراپە بەرپەرچ بداتەوە، یا جەنگ بکات دژی ئەوانەی بەرامبەر بانگەوازەکەی راوەستابون، یا دژی ئەوکەسانە بجەنگێت کە ئەوانەیان هەڵئەگێڕاوە.

﴿ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ السَّيِّئَةَ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ﴾ (المؤمنون:٩٦) واتە: خراپەکەیان بەوە دوور بخەنەرەوە کە چاکەیان لەگەڵدا بکەیت، ئێمە زاناترین بەوەی کە ئەیڵێن،

وە هەموو ئەو جیهادەی کە خوای گەورە فەرمانی دابوو بکرێت لەو ماوەیەدا ئەوە بوو کە جیهاد بکرێ بە قورئان و بەڵگە و سەلماندن.

﴿وَجَاهِدْهُمْ بِهِ جِهَاداً كَبِيراً﴾ (الفرقان: من الآية٥٢) واتە: بە قورئان جیهادێکی گەورەیان لەگەڵدا بکە.

وە کاتێ ئازاردانیان زیادی کردو چەوسانەوە بەردەوام بوو، هەتا گەیشتە ئەوپەڕی بەشێوەیەك موئامەرەو پیلانیان دانا بۆ کوشتنی خودی پێغەمبەر ﷺ ناچاربوو کە کۆچ بکات لە مەککەوە بۆ مەدینە و فەرمان بدات بە صەحابەکانی کوچ بکەن دوای سیانزە ساڵ لە بوونی بە پێغەمبەر: ﴿وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾ (الأنفال:٣٠) واتە: کاتێ بێ باوەڕکانی قورەیش کۆ بوونەوەو کەوتنە فروفێڵ بۆ بەندکردنت یا لەناو بردنت یا دەرکردنت لە شاری مەککە. بەڵام خوای گەورە بەهێزو توانای خۆی نەی هێشت فروفێڵی ئەو بێ باوڕانە سەر بگرێ.

﴿إِلاَّ تَنْصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ اللَّهُ﴾ (التوبة: من الآية٤٠) واتە: ئەگەر ئێوەش یارمەتی پێغەمبەر ﷺ نەدەن، خوا پشتی گرتوەو یارمەتی داوە.

وە لە مەدینەدا -پایتەختە تازەکەی ئیسلام- بڕیاری ڕێدان بە جەنگین درا کاتێ دوژمنان لە هەموو لاوە سەریان هەڵدا, وە ناچار بوون کە بجەنگن و شمشێر هەڵبکێشن لەپێناوی پاراستنی گیانی خۆیان و پاراستنی بانگەوازەکە، وە یەکەم ئایەت هاتە خوارەوە لەو بارەیەوە ئەم فەرمودەیەی خوای گەورە بوو کە ئەفەرموێت: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ، الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ بِغَيْرِ حَقٍ إِلَّا أَنْ يَقُولُوا رَبُّنَا اللَّهُ وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَهُدِّمَتْ صَوَامِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَاتٌ وَمَسَاجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا اسْمُ اللَّهِ كَثِيراً وَلَيَنْصُرَنَّ اللَّهُ مَنْ يَنْصُرُهُ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ) (الَّذِينَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ﴾ (الحج: ٣٩-٤١).

واتە: ڕێ درا بەوکەسانەی جەنگیان دژ کراوە کە بجەنگن لەبەر ئەوەی ستەمیان لێ کراوە, بەڕاستی خوا توانای سەرخستنیانی هەیە. ئەوانەی لە وولاتیان دەرکران بەناهەق، تەنها لەبەر ئەوەندە نەبێت کە ئەیان ووت الله پەروەردگاری ئێمەیە. جا ئەگەر خوا ڕێی نەدایە بە پێغەمبەر و باوەڕداران کە بجەنگن دژی ستەم و باتڵ ئەوە پەرستگاو مزگەوتی موسوڵمانەکان کە نوێژی تێدا ئەکەن و زۆر ناوی خوای تیادا یاد ئەکەن ئەڕوخێندران. وە هەرکەس کۆشش بکات بۆ سەرکەوتنی ئاینی خوا، خوا یارمەتی ئەدا بەسەر دوژمندا، چونکە بەڕاستی خوا بەهێزو بەتوانایە. ئەوانەی بەڵێنمان داوە بە یارمەتیان کەسانێکن کە ئەگەر جێگیرمان کردن لەسەر زەوی نوێژیان ئەکردو زەکاتیان ئەداو فەرمانیان بە چاکە ئەکرد و قەدەغەی خراپەیان ئەکرد، وە ئەنجامی هەموو کارەکان هەر بۆ خوایە:

لەم ئایەتانەدا هۆی ڕێدان بۆ جەنگین بە سێ شت دانراوە:

١- ئەمە کە ئەوانە ستەمیان لێ کراوە بەدەست درێژی کردن بۆ سەریان و دەرکردنیان لەشوێن و جێی خۆیان بەناهەق تەنها ئەوە نەبێ کە ئاینی ڕاستیان هەڵبژاردبوو وە ئەیان ووت: پەروەردگارمان الله یە.

٢- ئەگەر ئەو ڕێ پێدانە نەبوایە لەلایەن خواوە هەرچی پەرستگا هەبوو کە یادی خوای تێدا ئەکرێ ئەڕوخێنرا بە هۆی ستەمی ئەو بێباوەڕانەی کە باوەڕیان بەخواو ڕۆژی دوایی نەبوو.

٣- مەبەست لەسەرخستنی موسڵمانان‌و جێگیرکردنیان لەزەویدا: نوێژکردن و زەکات دان و فەرمان بە چاکەکردن و قەدەغە کردنی خراپەیە.

### واجب بوونی جیهاد

لە ساڵی دووەمی کۆچیدا جەنگین دژی بێ باوەڕان فەرز کراوە بە فەرمودەی: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئاً وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تُحِبُّوا شَيْئاً وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ

﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لا تَعْلَمُونَ﴾ (البقرة:٢١٦) واتە: خوا جیهادی دژی بێباوەڕانی لەسەر پێویست کردن هەرچەندە لاتان ناخۆشە، بەڵام زۆر شت هەیە کە پێتان ناخۆشە بەڵام ئەبێتە مایەی خێر بۆتان، وە زۆر شت هەیە کە پێتان خۆشە بەڵام ئەبێتە مایەی خراپە بۆتان. وە خوا خۆی ئەزانێ و ئێوە نازانن,

**جیهاد فەرزی کیفایەتە :**

جیهاد لەسەر هەموو یەکێ لە موسڵمانەکان فەرز نییە بەڵکو فەرزە لەسەر شێوەی کیفایەت، ئەگەر هەندێکیان پێی هەڵسان و دوژمنی پێ دور خرایەوە و پێویستی پێ بەجێ هات، ئەوە لەکۆڵ موسڵمانەکانی تر ئەکەوێت.

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنْفِرُوا كَافَّةً فَلَوْلا نَفَرَ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنْذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ﴾ (التوبة:١٢٢) واتە: باوەڕدارەکان نابێت هەموویان بچن بۆ جیهاد و جەنگ دژی بێباوەڕان، با چەند کەسێك لەهەر کۆمەڵێك بچن تا دانیشتووەکان شارەزا بن لە ئایندا و ئەوانیش ئامۆژگاری بکەن کاتێ گەڕانەوە، بە ئومێدی ئەوەی خۆیان بپارێزن لە عەزابی خوا بە بەڕێوە بردنی فەرمانەکانی و خۆپاراستن لە قەدەغە کراوەکانی.

وە هەروەها ئەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا خُذُوا حِذْرَكُمْ فَانْفِرُوا ثُبَاتٍ أَوِ انْفِرُوا جَمِيعاً﴾ (النساء:٧١) واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ئاگاتان لە خۆتان بێت بە جیا جیا یا هەموو بەیەکەوە بچن بۆ جەنگ دژی کافران.

وە هەروەها فەرمویەتی: ﴿لا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ فَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً وَكُلّاً وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى وَفَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْراً عَظِيماً﴾ (النساء: ٩٥) واتە: کەسانێ لە براداران کە بێ بەهانە لە جیهاد دوا کەوتوون و لەماڵ دانیشتون، یەکسان و بەرابەر نین لەگەڵ ئەو موجاهیدانەی کە بە ماڵ و گیانی خۆیان لە ڕێگای خوادا تێئەکۆش خوا پایە و پلەی ئەوانەی کە بە ماڵ و گیان کۆشەرن بەسەر ئەوانەی کە لە ماڵ دانیشتوون بەرزتر کردۆتەوە، وە خوا بە هەمووان بەڵێنی چاکەی داوە، بەڵام موجاهیدەکانی پێش دانیشتووەکان خستووە بە پاداشتی گەورە.

وە مسلم لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە ئەگێڕێتەوە خوالێی رازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ نێرراوێکی نارد بۆ بەنی لەحیان لە هوزەیل و فەرموی: (لِيَنْبَعِثْ من كل رَجلَينِ أحدهما, والأجر

بینهما)[1]. واتە:

با لە دوو پیاو پیاوێك بێت بۆ جیهاد، وە لە پاداشتەکەشدا هەردووکیان هاوبەش ئەبن تێیدا.

چونکە ئەگەر جیهاد لەسەر هەمووان پێویست بوایە بە یەك جار بەرژەوەندییەکانی دونیایی خەڵك لەناو ئەچوون، لەبەر ئەوە پێویست بووە کە تەنها هەندێك هاوبەش بن تێیدا.

کەی جیهاد فەرزی عەینەو لەسەر هەموو کەس واجبە:

جیهاد لەم شێوانەی خوارەوەدا نەبێت فەرزی عەین نییە:

١- کەسێك تەکلیفی شەرعی لەسەر بێتو لە ریزەکانی جەنگدا بێت, جیهاد لەم شێوەیەدا لەسەری فەرزە, خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُوا﴾ (الأنفال: من الآية٤٥) واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر لەگەڵ کۆمەڵێك بێ باوەڕان جەنگین, ئارام گرو خۆڕاگر بنو لە دوژمن هەڵ مەیەن.

وە هەروەها خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا زَحْفاً فَلا تُوَلُّوهُمُ الْأَدْبَارَ﴾ (الأنفال:١٥).

واتە: ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە کاتێ لەگەڵ بێباوەڕاندا داتان بەیەکداو جەنگین هەڵمەیەن و پشتیان تێ مەکەن، چونکە خوا لەگەڵتانەو یارمەتیتان ئەکات.

٢- ئەگەر دوژمن هەڵی کوتا بۆ سەر ئەوشوێنە یا ئەو شارەی موسڵمانانی تێدا بێت, ئەو کاتە لەسەر خەڵکی ئەو شوێنە پێویستە هەموو بە جارێك دەربچن بۆ شەڕ دژی ئەو دوژمنە.

وە دروست نییە بۆ کەس لە واجبەکەی خۆی خۆ دوا بخات ئەگەر هاتوو بە هەموویان نەبوایە دوژمنەکە دەر نەئەچوو, خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قَاتِلُوا الَّذِينَ يَلُونَكُمْ مِنَ الْكُفَّارِ﴾ (التوبة: من الآية ١٢٣).

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە شەڕ بکەن لەگەڵ ئەو بێباوەڕانەی نزیك ئەکەونەوە لێتان.

٣- ئەگەر کار بەدەستی ئەو شوێنە یەکێك دیاری بکات کە بچێت بۆ جیهاد، ئیتر ئەو کەسە بۆی نییە ئەو واجبە واز لێ بهێنێ، بەپێی ئەوەی ئیبنوعەبباس خوایان لێ ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە

---

(١) مسلم (١٨٩٦/١٣٧و١٣٨) وأبوداود (٢٥١٠).

کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لاهجرة بعد الفتح, ولكن جهاد ونِيَّة، وإذا استُنْفِرْتُم فانفروا) رواه البخاري[1].

واتە: دوای فەتحی مەککە کۆچ کردن نی‌یە، بەڵام جیهاد و نی‌یەتەکەی هەر ئەمێنێ, وە ئەگەر داواتان لێ کرا بۆ جیهاد لەلایەن کار بەدەستەوە ئەبێ هەر بچن[2].

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ انفِرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ اثَّاقَلْتُمْ إِلَى الْأَرْضِ أَرَضِيتُم بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا مِنَ الْآخِرَةِ فَمَا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فِي الْآخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ﴾ (التوبة: ٣٨). واتە: ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە ئەوە چیتانە کاتێ پێتان ئەوترێ بچن بۆ جیهاد لە ڕێگای خوادا تەمەڵی ئەکەن و لەماڵەکانتانا ئەمێننەوە؟ ئایا بەشی دنیا هەڵئەبژێرن بەسەر خۆشی ڕۆژی دواییدا؟ لەکاتێکدا خۆشی‌یەکانی دنیا شتێکی بێ نرخە لە چاو خۆشی ڕۆژی دوایی‌دا.

## جیهاد لەسەر کێ پێویستە؟

جیهاد پێویستە لەسەر موسڵمانی نێرینەی ژیری تێگەیشتووی لەش ساغ، کە ئەوەندەی ماڵ هەبێت بەشی خۆی و خێزانەکەی بکات هەتا لە جیهادەکە ئەگەڕێتەوە.

کەواتە جیهاد لەسەر ناموسڵمان و منداڵ و شێت و نەخۆش پێویست نی‌یە, وە دواکەوتنی ئەوانەو نەچونیان زیانی نی‌یە بۆیان، چونکە لاوازی‌یەکەیان بووەتە هۆی بەشدار نەبونیان، وە ئامادەبونیان لە مەیداندا هیچ سودێکی نی‌یە، وە لەوانەیە ئامادەبونیان زیانی زۆرتر بێت، لەگەڵ سودەکەمەکەیدا.

لەم بارەیەوە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَيْسَ عَلَى الضُّعَفَاءِ وَلَا عَلَى الْمَرْضَى وَلَا عَلَى الَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنْفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا لِلَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ (التوبة: من الآية ٩١) واتە: لاوازو نەخۆش و ئەوانەی دەستیان کورتە هیچیان لەسەر نابێت ئەگەر بەشداری جیهاد نەکەن، بە مەرجێ دڵسۆزبن بۆ خواو بۆ ڕەسولی خوا. وە هەروەها ئەفەرموێت: ﴿لَيسَ على الأعمى حرجٌ ولا على الأعرج حرجٌ

---

(١) البخاري (٢٧٨٣) ومسلم (١٣٥٣/٨٥).

(٢) واتە کۆچ کردن نی‌یە لە مەککەوە بۆ مەدینە دوای فەتح کردنی مەککە، وە پێشان ئەو کۆچ کردنە فەرز بوو لە ئیسلامدا، ئیتر بەم حەدیسە سڕرایەوە. بەڵام کۆچ کردن لەسەر زەوی کوفرەوە بۆ سەر زەوی ئیسلام ئەوە نەسڕراوەتەوە بەڵکو فەرزە لەسەر ئەو کەسەی دڵنیا نەبێت لەسەر ئاینەکەی.

ولا على المريض حرج﴾ (الفتح آية ٧) واتە: تاوان نی‌یە لەسەر کوێرو شەل و نەخۆش کە لەجیهاددا هاوبەش نەبن.

وە لە ئیبنوعومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت فەرمویەتی: ڕۆژی جەنگی ئوحود نیشان پێغەمبەر ﷺ درام کە تەمەنم چواردەساڵ بوو ئەویش ڕێی پێ نەدام هاوبەشی بکەم. بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە[1].

وە لەبەر ئەوەی جیهاد خواپەرستی‌یە، جا لەسەر پێگەیشتوو نەبێت پێویست نی‌یە.

ئەحمەد و بوخاری لە عائیشەوە ئەگێڕنەوە خوا لێیان ڕازی بێت کە فەرمویەتی: ووتم: ئەی نێرراوی خوا ئایا ئافرەت جیهاد کردنی لەسەرە؟ فەرموی: جیهادی بێ کوشتاری لەسەرە: کە حەج و عومرەیە[2].

وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: بەڵام چاکترین جیهاد بۆ ئافرەت حەجێکی (مبرور) پەسەند کراوە[3].

واحیدی و سیوطی لە (الدر المنثور)دا ئەگێڕنەوە لە موجاهیدەوە کە وتویەتی: ئوموسەلەمە خوا لێی ڕازی بێت فەرموی: ئەی نێرراوی خوا، پیاوان غەزا ئەکەن و ئێمە غەزا ناکەین‌و هەر نیوەی میراتمان بۆ هەیە؟!.

خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَلَا تَتَمَنَّوْا مَا فَضَّلَ اللَّهُ بِهِ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ لِلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِمَّا اكْتَسَبُوا وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِمَّا اكْتَسَبْنَ وَاسْأَلُوا اللَّهَ مِنْ فَضْلِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيماً﴾[4] (النساء: ٣٢) واتە: ئاواتەخواز مەبن بۆ شتێك کە خوا بەو شتە هەندێکتانی پێش هەندێکتان خستووە، چونکە بۆ پیاوان بەشێکی داناوە لەجەزا بەپێی کردەوەکانیان، وە بۆ ژنانیش بەشێك، وە داوا لەخوای گەورەو بەخشندە بکەن لەفەزڵ و چاکەی پێتان ئەبەخشێ، بەڕاستی خوا بەسەر هەموو شتێکدا زانا و ئاگایە.

---

(١) البخاري (٢٦٦٤) ومسلم (١٨٦٨).

(٢) أحمد (٦/٦٥و١٦٦) والبخاري (٢٨٧٥).

(٣) أحمد (٦/٧١) والبخاري (١٥٢٠).

(٤) الترمذي (٣٠٢٥) والحاكم (٢/٣٠٥) والدر المنثور (٢/٥٠٧).

وه هەر واحیدی و سیوطی له عیکرەمەوه ئەگێڕنەوه که ئافرەتان داوای جیهادیان کردو ووتیان: ئێمەش حەزمان ئەکرد خوا غەزای لەسەرمان دابنایه، بۆ ئەوەی ئەو پاداشتەی پیاو دەستی ئەکەوێ ئێمەش دەستمان بکەوێ. ئیتر خوای گەورە ئەو ئایەتەی نارده خوارەوه[1].

وه ئەمه ڕێی ئەوەیان لێ ناگرێ که دەربچن بۆ برینپێچی و تەداوی و دەرمان کردنی بریندارەکان.

له ئەنەسەوه خوا لێی ڕازی بێت که فەرمویەتی: ڕۆژی جەنگی ئوحود کاتێك خەڵك هەڵهاتن و پێغەمبەریان بەجێ هێشت، عائیشەی کچی ئەبوبەکر و ئومومسولەیم بینی چاکیان لێ کُردبوو بەلادا، خرخاڵەکانی قاچیانم ئەبینی که کونه ئاویان ئەدا به کۆڵیاندا، لەپاشاندا ئەیانکرد به دەمی بریندارەکاندا، پاشان ئەگەڕانەوەو پڕیان ئەکردەوه و دووباره ئەیانکرد به دەمی بریندارەکاندا. شەیخەین ڕیوایەتیان کردووه[2].

وه هەر له ئەنەسەوه که فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ غەزای به ئومو سولەیم و چەند ئافرەتێکی ئەنصاری ئەکرد لەگەڵیدا، که ئاویان ئەدا به جەنگاوەران و نەخۆشیان تیمار ئەکرد. موسلیم و ئەبوداود و (ترمذي) گێڕاویانەتەوه[3].

**پرسکردن به خاوەن قەرز**

وه هەروەها پیاوی قەرزار که نەتوانێت قەرزەکەی بداتەوه نابێت بچێت بۆ جیهادی خۆویست مەگەر خاوەن قەرزەکەی ڕێی بدات، یان بارمتەیەکی پارێزراو دانێت، یا کەسێکی خاوەن دەسەڵات ئەکاته کەفیلی خۆی. لای ئەحمەد و موسلیم له حەدیسی ئەبو قەتادەوه هاتووه: که وتی: ئایا ئەگەر بکوژرێم له ڕێگای خوادا ئەکەوێته بریتی گوناهەکانم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (نعم وأنت صابر محتسب، مقبل غير مدبر، إلا الدَّيْن، فإن جبريل قال لي ذالك).

واته: بەڵێ ئەگەر بەهیوای پاداشت بیت و بەرەو ڕووی بێ باوەڕان بچیت و پشتیان تێ نەکەی، ئیللا قەرز نەبێت، چونکه جوبرەئیل ئەوەی پێ ڕاگەیاندم[4].

---

(١) الدر المنثور (٢/٥٠٧).

(٢) البخاري (٢٨٨٠) ومسلم (١٨١١).

(٣) مسلم (١٨١٠) وأبوداود (٢٥٣١) والترمذي (١٥٧٥).

(٤) مسلم (١٨٨٥) وأحمد (٥/٣٠٤).

## داوای یارمەتی کردن لەتاوانبار و بێ باوەڕ بۆ غەزا

دروستە یارمەتی لەمونافیق و تاوانبار وەربگیرێ بۆ جەنگ دژی بێباوەڕان، چونکە عەبدوللای کوڕی ئوبەی و ئەو دووڕوانەی کە لەگەڵیا بوون لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ئەچوون بۆ جەنگ.

وە بەسەرهاتی ئەبی میحجەنی پەقەفی کە پیاوێکی عەرەق خۆر بوو، وە کارەساتەکەی کاتی جەنگ دژی فارسەکان بەناو بانگە.

بەڵام لەبارەی جەنگینی بێباوەڕان لەگەڵ موسڵمانانەدا دژی بێ باوەڕانیتر، ڕای زانایان لەوەدا جیاوازە:

مالیك و ئەحمەد وتویانە: دروست نیەیە داوای یارمەتییان لێبکرێت، وە نابێت هاوکاری بکەن بە گشتی. مالیك وتویەتی: مەگەر بە خزمەتکاری لەگەڵ موسولمانانەدا بن، ئەو کاتە دروستە.

وە ئەبوحەنیفە وتویەتی: دروستە یارمەتییان لێ وەربگیرێ و هاوکاری بکەن بە گشتی. وە حوکمی ئیسلام بە سەریاندا زاڵ ئەبێت و جێبەجێ ئەکرێت، بەڵام ئەگەر حوکمی (شرك) هاوتادان غالب بوو، ئەوە کەراهەتی هەیە کە یارمەتییان لێ وەربگیرێ.

وە شافیعی وتوویەتی: یارمەتی لێ وەرگرتنیان بە دوو مەرج دروستە.

یەکەم: کاتێك موسوڵمانان کەم بن و موشریکەکان زۆر بن.

دووەم: بزاندرێ کە ئەو موشریکانە ڕای باشیان هەیە لەبارەی ئیسلامەوە مەیلیان هەیە بۆ ئیسلام.

وە هەرکاتێك داوای یارمەتییان لێکرا، ئەوە ئەبێ بەخششیان بدرێتێ نەك بەشی غەنیمەت، واتە بە ناوی خەڵات بیاندرێتێ، وە هاوبەش نەکرێن لەبەشی موسوڵمانان لە غەنیمەت.

## پرسکردن بەدایك و باوك

لەجیهادی پێویستدا پرسکردن بە دایك و باوك ئیعتیباری بۆ ناکرێ، بەڵام لەجیهادی خۆویست ئەبێ هەر پرس بە دایك و باوکی ئازادی موسوڵمان بکرێ و ڕێ بدەن، یا یەکێکیان ڕێی بدات.

ئیبنو مەسعود فەرمووییەتی: پرسیم لە پێغەمبەر ﷺ چ کارێك لای خوا خۆشەویست ترە؟ فەرمووی: نوێژ لەکاتی خۆیدا. وتم: ئەی پاش ئەو؟ فەرمووی: چاکە لەگەڵ دایك و باوك، وتم: ئەی پاش ئەو؟ فەرمووی: جیهاد لە ڕێگای خوادا، بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە[1].

وە ئیبنو عومەر خوای لێ ڕازی بێت فەرموویەتی: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ داوای لێکرد ڕێی بدات بچێت بۆ جیهاد لە ڕێگای خوادا، فەرمووی: ئایا دایك و باوکت ماون ؟ وتی: بەڵێ. فەرمووی: بڕۆ جیهاد لەواندا بکە. بوخاری و ئەبو داود و نەسائی و (ترمذي) گێڕاویانەتەوە، و ترمذي بە صەحیحی داناوە[2].

وە لەکتێبی (شرعة الإسلام)دا هاتووە. وە کەسێك دروستە بچێت بۆ جیهاد کە کەس و کار و منداڵەکانی کاریان پێی نەمابێت و دایك و باوکی پێویستیان بە خزمەت نەبێ، چونکە سەرپەرشتی و خزمەتی ئەوان لەپێشترە لەجیهاد کردن، بەڵکو ئەوە باشترین جیهادە.

### داوای سەرکەوتن بە لاوازەکان

١- لە موصعەب ی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصەوە کە وتوویەتی:

باوکم خۆی بەمزلتر ئەزانیّ لە خەڵك، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (هل تنصرون وترزقون إلا بضعفائكم؟!) رواه البخاري و النسائي و لفظ النسائي (إنما ينصر الله هذه الأمة بضعيفها، بدعوتهم، وصلاتهم، و إخلاصهم)[3].

واتە: مەگەر ئێوە بە هۆی لاوازەکانتان نەبێت سەرئەخرێن و ڕۆزی ئەدرێن؟.

وە لە لەفزی نەسائی دا هاتووە: خوا ئەم نەتەوەی ئیسلامە بەهۆی لاوازەکانیانەوە سەرئەخات، بە پاڕانەوەکانیان، بە نوێژەکانیان، بە دڵسۆزییان.

٢- وە لەئەبی دەرداءەوە، فەرموویەتی: گوێم لە پێغەمبەر بووﷺ کە ئەیفەرموو: (أبغوني في الضُّعَفاء؛ فإنما ترزقون وتنصرون بضعفائكم) رواه أصحاب السنن[4].

---

(١) البخاري (٥٢٧) ومسلم (٨٥).

(٢) البخاري (٣٠٠٤) ومسلم (٢٥٤٩) رأبوداود (٢٥٢٩) والترمذي (١٦٧١) والنسائي (٦/١٠).

(٣) البخاري (٢٨٩٦) والنسائي (٦/٤٥) وأحمد (١/١٧٣).

(٤) أبوداود (٢٥٩٤) والترمذي (١٧٠٢) والنسائي (٦/٤٥).

واته: هەوڵم بۆ بدەن لەناو لاوازەکان، چونکە ئێوە بە هۆی لاوازەکانتانەوە ڕۆزی ئەدرێن و سەرئەخرێن.

٣- وە لەئەبی هورەیرەوە خوای لێ ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (رب أشعث مدفوع بالباب لو أقسم على الله لأبره)[1].

واته: زۆر پیاوی قژ هەڵچووی بێزراو هەیە، کە دەرکراوی بەردەرگاکانن، بەڵام ئەگەر سوێند بخوات و داوای هەرچی بکات لە خوا بۆی جێبەجێ ئەکات.

## فەزڵی جیهاد

جیهاد: چاکترین جۆرەکانی (تطوع) خوا پەرستییە:

جیهاد: بەرزکردنەوەیە بۆ ووشەی خوا و جێگیرکردنی ڕێنماییەکانی لەزەویدا و چەقاندنە بۆ ئاینی ڕاست، هەر بۆیەشە لە حەج و عەمرە و نوێژ و ڕۆژووی سوننەت چاکترە.

وە جیهاد لەگەڵ ئەوەشدا هەموو جۆرە خوا پەرستیەکانی تریش ڕێك ئەخات، ئیتر ئەو خواپەرستییە دیار بێت یا نادیار، چونکە لە جیهاددا خوا پەرستی نادیار هەیە ئەویش زوهد و وازهێنانە لەدونیاو دورکەوتنەوە، لە نیشتمان و دەست بەردار بوونە لەئارەزووەکان، تەنانەت ئیسلام ناوی ناوە (الرهبنة) گۆشەنشینی و ڕەهبانییەت، چونکە لەحەدیسدا هاتووە: (رهبانية أمتي الجهاد في سبيل الله)[2].

واته: ڕەهبانییەتی ئەتەوەی من: جیهادە لەپێناوی خوا.

هەروەها لە جیهاد دا هەیە بەخت کردن بە گیان و ماڵ و فرۆشتنیان بەخوا، کە بەرهەمێکە لە بەرهەمەکانی خۆشەویستی و باوەڕ، و یەقین، و تەوەککول: ﴿إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنْفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ وَعْداً عَلَيْهِ حَقّاً فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ وَالْقُرْآنِ وَمَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ مِنَ اللَّهِ فَاسْتَبْشِرُوا بِبَيْعِكُمُ الَّذِي بَايَعْتُمْ بِهِ وَذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ (التوبة:١١١)

واته: بەڕاستی خوا گیان و ماڵ لە باوەڕداران ئەکڕێت، بەوەی بەهەشتیان پێ ببەخشی، ئەجەنگن لە ڕێگەی خوادا و ئەکوژن و ئەکوژرێن، پەیمانێکی ڕاستە لە خواوە دراوە لەتەورات و ئینجیل و

(١) مسلم (٢٦٢٢).

(٢) أحمد (٣/٢٦٦،٨٢).

قورئاندا، چاکێ لە خوا بەوەفاتره بۆ بەجێ هێنانی پەیمانەکەی؟ باوەڕداران مژدەی ئەو مامەڵە کردنە لەگەڵ خوادا بە یەکتر بدەن، وە ئائەوەیە سەرکەوتنی گەورە.

بە ڕاستی ئیسلام کاری جیهادی بەگەورە داناوە، وەلە هەموو سورەتە مەدەنیەکاندا باسی کردوەو بەخراپی باسی ئەوانەی کردووە واز لەجیهاد ئەهێنن و ڕووی لێ وەرئەگێڕن و بەمونافیق و دڵنەخۆش ناوی بردوون.

## موجاهید چاکترین کەسە

لەئیبنو عەبباسەوە خوا لێی ڕازی بێت: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ألا أخبركم بخير الناس ؟ رجل ممسك بعنان فرسه في سبيل الله. ألا أخبركم بالذي يتلوه: رجل معتزل في غُنَيْمَةٍ له يؤدّي حق الله فيها. ألا أخبركم بشر الناس: رجل يُسأل بالله ولايُعطي به)[1].

واتە: پێتان بڵێم چاکترین کەس کێیە؟ پیاوێك لغاوی ئەسپەکەی گرتبێ لە ڕێی خودا بچێت بۆ جیهاد. ئەی پێتان بڵێم دووای ئەو کێیە لە چاکیدا: پیاوێکە بە دیار چەند مەڕێکیەوە گۆشەنشین بووبێت و مافی خوای لێ بدات، ئەی پێتان نەڵێم خراپترین کەس کێیە: کەسێکە داوای شتێکی لێ نەکرێ کە لەبەر ناوی خوا بیدات بەڵام نایدات.

وە لە پێغەمبەر ﷺ پرسیار کرا، چاکترین کەس کێیە؟ فەرمووی: (مؤمن يجاهد في سبيل الله بنفسه وماله).

واتە: باوەڕدارێك کە بە گیان و بەماڵ تێ بکۆشی لەڕێی خوادا.

وتیان: دووای ئەو کێیە ؟

فەرمووی: (مؤمن في شِعْبٍ من الشعاب يعبد ربه ويتقي الله ويدع الناس من شره)[2].

واتە: باوەڕدارێك لەشیوێك لە شیوەکاندا خواپەرستی بکات و شەڕی خۆی لەخەڵك لابدات.

ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەو کەسانەیە کە ئەڵێن گۆشەنشینی چاکترە لە تێکەڵی خەڵك کردن.

وە لەم بارەیەوە جیاوازی لەنێوان زانایاندا هەیە کە مەشهورە:

---

(١) الترمذي (١٦٥٢) والنسائي (٥/٨٣) وابن حبان (٦٠٣) ومالك (٢/٤٤٥) مرسلاً.

(٢) البخاري (٢٧٨٦) ومسلم (١٨٨٨) وأبوداود (٢٤٨٥) والترمذي (١٦٦٠) والنسائي (٦/١٦) والحاكم (٢/٧١).

مەزهەبی شافیعی و بەشی زۆری زانایان ئەوەیە کە تێکەڵی خەڵك کردن چاکترە بە مەرجی ئەوەی ئومێدی سەلامەتی و دوورکەوتنەوە هەبێت لەفیتنە.

وە بە مەزهەبی چەند کۆمەڵێك: گۆشە نشینی چاکترە:

جەماوەری زانایان وەڵامی ئەوەیان داوەتەوە کە ئەم حەدیسە بۆ کاتێك ئەبێت کە فیتنە و شەڕ و ئاشوب لەناودا هەبێت، یان ئەو کەسە لە کەسانێك بێت کە خەڵك بێ وەی نابن لەدەستی و خۆشی توانای ئارامگرتنی نەبێت لەسەر ئازارەکانیان، یان ڕێنەی ئەوە.

بەڕاستی پێغەمبەران سەلامی خوایان لەسەربێ و جەماوەری صەحابە و تابیعی و زانایان و خواناسان تێکەڵی خەڵك ئەبوون و کەڵکی ئەو تێکەڵیەشیان وەدەست ئەهێنا ، وەك ئامادەبوونی نوێژی هەینی و نوێژی جەماعەت و جەنازە و سەردانی نەخۆش و کۆڕی یادکردنی خواو گەلێ شتیتر. بەڵام باسی ئەو شێوەی کە لەحەدیسەکەدا هاتووە مەبەست پێی ئەو چۆڵەوانیەیە کە لەنێوان دوو کێودا هەبێت، وە مەبەستی تەنها شیو نیە، بەڵکو مەبەستی گۆشەگیری کردنە و تەنها بوونە، وە باسی شیوی کردووە بۆ نمونە چونکە بەزۆری شیو چۆڵەوانیە.

وە ئەم فەرموودەیە وەك ئەو فەرموودەیە وەهایە کاتێ پرسیاری ڕزگاریان لێ کرد فەرمووی: (أمسك عليك لسانك، وليسعك بيتك، وابك على خطيئتك)[1].

واتە: زمانی خۆت بگرە، و لەماڵەوە دانیشە، و بەسەر تاوانەکانتا بگری.

بەهەشت بۆ موجاهیدە

ترمزی ئەگێڕێتەوە: کە یارێك مەیلی گۆشە نشینی ئەکرد پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد لەو بارەیەوە فەرموی:

(لاتفعل فإن مُقامَ أحدكم في سبيل الله أفضل من صلاته في بيته سبعين عاماً، ألا تحبون أن يغفر الله لكم ويدخلكم الجنة، أغزوا في سبيل الله. و من قاتل في سبيل الله فُواق ناقةٍ وجبت له الجنة)[2].

واتە: کاری وامەکە چونکە پلەی یەکێکتان لە ڕێگای خوادا چاکترە لەوەی حەفتا ساڵ لە ژوورەوە نوێژ بکات، ئێوە ناتانەوێ خوا لە گوناهەکانتان ببورێ، وە بتانخاتە بەهەشت؟ لە ڕێی خوادا غەزا

(١) الترمذي (٢٤٠٦) وأحمد في المسند (٥/٢٥٩) وفي الزهد (٨٢) وإبن أبي الدنيا في الصمت (٢) والبيهقي في شعب الإيمان (٨٠٥) وفي الزهد (١٣٤) وأبو النعيم في الحلية (٢/٩).

(٢) الترمذي (١٦٥٠) وأحمد (٢/٥٢٤) والحاكم (٢/٦٨).

بکەن، وە هەرکەس ئەوەندەی نێوان دووجار ووشتر دۆشین لە رێگای خوادا جەنگ بکات خوا بەهەشتی پێ ئەبەخشێ...

موجاهید سەد پلە لە بەهەشتدا پایەی بەرز ئەبێتەوە:

لەئەبی سەعیدی خودرییەوە خوا لێی رازی بێت، کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (یا أبا سعید من رضي بالله رباً، وبالإسلام دیناً، وبمحمد نبیاً، وجبت له الجنة).

واتە: ئەی ئەبو سەعید هەرکەس رازی بێت خوا پەروەردگاری بێت، و ئیسلام ئاینی بێت، و موحەممەد پێغەمبەری بێت، بەهەشتی بۆ واجب ئەبێت.

ئەبو سەعید ئەو فەرموودەیەی لا خۆش بوو، ووتی: بۆم دووبارە بکەرەوە ئەی نێرراوی خوا، ئەویش ﷺ بۆی دووبارە کردەوە.

لەپاشاندا فەرمووی: (وأخری یرفع بها العبد مائة درجة في الجنة، ما بین کل درجتین کما بین السماء و الأرض).

واتە: کردەوەیەکی تریش هەیە کە بەندە لە بەهەشتدا سەد پلە پێی بەرز ئەبێتەوە، کە نێوان هەرپلەیەکی ئەوەندەی نێوان ئاسمان و زەوییە، ئەبو سەعید وتی: ئەو کردەوەیە چییە ئەی نێرراوی خوا؟

فەرمووی: (الجهاد في سبیل الله ، الجهاد في سبیل الله)[1].

واتە: جیهاد لەرێگەی خودا، جیهاد لەرێگەی خوادا.

وە هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إن في الجنة مائة درجة، أعدها الله للمجاهدین في سبیل الله، مابین الدرجتین کما بین السماء والأرض، فإذا سألتم الله فاسألوه الفردوس، فإنه أوسط الجنة، وأعلی الجنة، وفوقه عرش الرحمن، ومنه تفجر أنهار الجنة)[2].

واتە: لە بەهەشتدا شوێنێك هەیە سەد پلە بەرزی هەیە، خوا بۆ موجاهیدەکانی داناوە کە لەرێی خوادا ئەجەنگن، لەنێوان هەر پلەیەك و پلەیەکیتر، ئەوەندەی نێوان ئاسمان و زەوییە.

---

(١) مسلم (١٨٨٤) والنسائي (٦/١٩).

(٢) البخاري (٢٧٩٠).

جا ئەگەر ئێوە لەخوا پاڕانەوە داوای فیردەوس بکەن، چونکە فیردەوس ناوەڕاست و بەشی سەرەوەی بەهەشتە، وە عەرشی خوای بەسەرەوەیە، وەهەر لە فیردەوسەوە ڕووبارەکانی بەهەشت دێنە دەرەوە.

## هیچ شتێك هاوتای جیهاد نییە

لە ئەبو هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت کە فەرموویەتی: ووتیان ئەی نێرراوی خوا کام کردەوە هاوتای جیهادە لەڕێی خوادا؟ فەرموی: ئێوە توانای کردنی ئەو کارەتان نییە.

دوو یا سێ جار لێیان دووبارە کردەوە هەمووجارێ ئەیفەرموو: ئێوە توانای ئەو کارەتان نییە.

وە لەجاری سێهەمدا فەرمووی: کەسێك لە موجاهید ئەچێت کە هەمیشە بەڕۆژوو بێت و هەمیشە نوێژ بکات و باوەڕی بە ئایەتەکانی خوا هەبێت و لە نوێژ و ڕۆژووەکەی نەبێتەوە هەتا موجاهیدەکە ئەگەڕێتەوە (رواه الخمسة)[1].

## فەزڵ و گەورەیی شەهید بوون

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لايُكْلَم أحد في سبيل الله- والله أعلم بمن يكلم في سبيل الله- إلا جاء يوم القيامة و جرحه يَثْعَبُ دماً، اللون لون الدم، و الريح ريح المسك) رواه الخمسة[2].

واتە: کەسێك نییە لەڕێی خوادا بریندار کرابێت – وە خوا ئەزانێ کێ لە ڕێی خوادا بریندار ئەکرێت- ئیللا ڕۆژی دوایی کەدێت برینەکەی دەزوولەی خوێن ئەکات، ڕەنگەکەی ڕەنگی خوێنە و بۆنەکەی بۆنی میسکە.

موحەممەدی کوڕی ئیبراهیم ئەڵێت: کاتێ عەبدوڵڵای کوڕی موبارەکم بەڕێ‌کرد بۆ غەزا، چەند دێڕ هۆنراوەی بۆ خوێندمەوە کە بینووسم و پێما ناردی بۆ لای فوچەیلی کوڕی عیاض:

| | |
|---|---|
| ياعابد الحَرَمَيْنِ لو أبصرْتَنا | لعلمت أنك في العبادة تلعب |
| من كان يخضب خده بدموعهِ | فنحورنا بدمائنا تتخضَّب |
| أو كان يُتعب خيله في باطلٍ | فخيولنا يوم الصبيحة تتعب |
| ريح العبير لكم، ونحن عبيرنا | وهج السنابك والغبار الأطيب |
| ولقد أتانا من مقال نبيِّنا | قول صحيح صادقٌ ...لايكذب |

---

(١) البخاري (٢٧٨٧) مسلم (١٨٧٨).

(٢) مسلم (١٨٧٦/١٠٥).

لایستوی غبار أهل الله في | أنف أمريءٍ ودخان نار تلهب
هذا كتاب الله ينطق بيننا | ليس الشهيد بميتٍ لايكذب

ئەی ئەو کەسەی لەدووحەرەم عیبادەت ئەکەی، ئەگەر ئێمەت ببینیایە وات دەزانی کە لەعیبادەت کردندا یاری دەکەی.

هەرکەسێك کە گۆنا و ڕوومەتی بەفرمێسکی ڕەنگین ببێ، ئەوە گەردنەکانی ئێمە بەخوێن ڕەنگین دەبێ.

یا ئەسپەکەی لە پڕ و پوچ دا ماندوو ئەکات ئەوە ئەسپەکانی ئێمە بەرەبەیانی دەرچوون بۆ جەنگین ماندوو دەبن.

بۆنی خۆش بۆ خۆتان بێ، ئێمە بۆنی خۆشمان درەوشانەوەی شمشێرەکان و تەپو تۆزی مەیدانە کە چاکترە

وە بەڕاستی لە پێغەمبەرمانەوە فەرموودە هاتووە کە ڕاست و دروستە . . . درۆی تیانی‌یە کە فەرمویەتی:

تەپ و تۆزی ڕێگەی جیهاد و دووکەڵی دۆزەخ لە لوتی تێکۆشەرێکدا کۆنابێتەوە، درۆی تیا نی‌یە

ئەوە کتێبەکەی خوایە لەناوماندا قسە ئەکا و دەفەرمووێ: شەهید نامرێ، وە ئەو کتێبەش درۆ ناکات

ئەڵێ جا گەیشتم بە فوضەیلی کوڕی عیاض و نامەکەم دایە، کاتێ هۆنراوەکەی خوێندەوە فرمێسک بە چاوەکانیدا هاتە خوارەوە وتی: ئەبوو عەبدولڕەحمان ڕاست ئەکات و ئامۆژگاری کردووم، لە پاشاندا وتی:

ئایا تۆ لەو کەسانەی حەدیس ئەنوسیتەوە؟ ووتم: بەڵێ، ووتی: ئەم حەدیسە بنووسە لە پاداشتی ئەوەدا کە ئەو نامەیەت بۆ هێناوم، ئەنجا بۆی ووتم (مەنصوری کوڕی موعتەمیر بۆی گێڕامەوە لە ئەبی صالحەوە، لە ئەبی هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت کە پیاوێك ووتی: ئەی نێرراوی خوا کردەوەیەکم فێر بکە پاداشتی موجاهیدم دەست بکەوێ، ئەویش ﷺ فەرمووی: (هل تستطيع أن تصلي فلا تفتر، وتصوم فلا تفطر؟!).

واتە: ئایا ئەتوانی هەر نوێژ بکەیت سست نەبی؟ و هەر بەڕۆژو بیت نەیشکێنیت.

کابرا ووتی: ئەی نێرراوی خوا من لەوە لاوازترم کە ئەوکارە بتوانم.

لە پاشاندا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (فو الذي نفسي بيده لو طُوِّقتَ ذلك ما بلغتَ المجاهدين في سبيل الله) واتە: بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر بشتوانی ناگەیتە موجاهیدەکانی ڕێگای خوا.

(أو ما علمت أن المجاهد لَيَسْتَنُّ في طوله فيكتب له بذلك الحسنات)[1].

واتە: ئەی نەتزانیوە موجاهید بەدرێژی جەنگەکەی چاکەی بۆ ئەنوسرێت

وە پێغەمبەر ﷺ بە صەحابەکانی ئەفەرموو: کاتێ برا موجاهیدەکانتان لەجەنگی ئوحودا پێکران، خوا گیانی ئەوانی کردە بەر پەلەوەری سەوز و ئەچوون بۆ سەر ڕوبارەکانی بەهەشت و بەری میوەکانیان ئەخوارد، کە شەویش ئەهات ئەچوونە ناو چرای ئاڵتونی‌یەوە، کە هەڵواسرابوون لە سایەی عەرشدا، کاتێ ئەو خواردن و خواردنەوە و شوێنی حەوانەوە خۆشەیان بینی ووتیان: کێ بێت بە برا موسڵمانەکانمان ڕابگەیەنێت کە ئێمە زیندوین و خوا ڕۆزیمان ئەدات، ئەوەك تەمەڵی بکەن لە جیهادکردندا،[2] جا خوای گەورە فەرموی: (من پێیان ڕائەگەیەنم لە ئێوەوە) وە ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە: ﴿وَلا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتاً بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ (١٦٩) فَرِحِينَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا بِهِمْ مِنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ (١٧٠) يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ وَأَنَّ اللَّهَ لا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ( آل عمران: ١٩٦-١٧١).

واتە: وانەزانن ئەوانەی لە ڕێگای خوادا کوژراون مردون، بەڵکو زیندوون بە ژیانی بەرزەخی، لای پەروەردگاریان ڕۆزی ئەدرێن، دڵخۆشن بەوەی خوا بە فەضلی خۆی پێیان ئەبەخشێ، و مژدەش ئەدەن بەوانەی هێشتا پێیان نەگەیشتوون و بەجێ ماون پێیان ئەڵێن: نە ترسیان لەسەرە و نە غەمباری ئەبینن، زۆر شادومانن و مژدە ئەدەن بە نیعمەتەکانی خوا و فەضلی خوا، وە بەڕاستی خوا پاداشتی باوەڕداران وون ناکات.

وە پێغەمبەرمان ﷺ فەرمووریەتی: (أرواح الشهداء في حواصل طير خُضر، تسرح في الجنة حيث شاءت).

واتە: گیانی شەهیدان لە جیکڵدانی پەلەوەری سەوزدان، لە بەهەشتدا بە ئارەزووی خۆیان ئەسوڕێنەوە.

---

(١) البخاري (٢٧٨٧) والنسائي (١٨/٦).

(٢) أبوداود (٢٥٢٠) والحاكم (٢٩٧/٢).

وە هەروەها ﷺ فەرموویەتی: (الشهيد لايجد ألم القتل إلا كما يجد أحدكم ألَمَ القرصة)[1].

واتە: شەهید هەست بە ئازاری کوشتنەکەی ناکات، ئەوەندە نەبێت کە ئێوە هەست بە ئازاری پێوە دانی هەنگێك ئەکەن.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أفضل الجهاد أن يعقر جوادك و يراق دمك)[2].

واتە: چاکترین جیهاد ئەوەیە کە وولاغەکەتی تێدا بریندار بێت و خوێنی خۆتی تێدا برژێ.

لەجابیری کوڕی عەتیقەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: شەهید بوون -جگە لەشەهید بوون لەڕێگەی خوادا- حەوتن: (المطعون شهيد، والغرق شهيد، وصاحب ذات الجنب شهيد، و المبطون شهيد، وصاحب الحرق شهيد، والذي يموت تحت الهدم شهيد، والمرأة تموت بجمع شهيدة) رواه أحمد و أبوداود و النسائي بسند صحيح[3].

واتە: هەرکەس بە تاعون بمرێ شەهیدە، وە ئەوەی بە خنکاندن لەئاودا بمرێ شەهیدە، وە ئەوەی بە نەخۆشی تەنیشتی بمرێ[4] شەهیدە، وە ئەوەی بە سك ئێشە بمرێ شەهیدە، وە ئەوەی بە سوتان بمرێ شەهیدە، وە ئەوەی لە ژێر خانووی ڕوخاودا بمرێ شەهیدە، وە ئەو ئافرەتەی بەمندالبوون ئەمرێ شەهیدە.

وە لەئەبو هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ما تعدون الشهيد فيكم).

واتە: ئێوە کێ بە شەهید ئەزانن.

وتیان: ئەی نێرراوی خوا هەرکەس لە ڕێگای خودا کوژرا ئەوە شەهیدە.

فەرمووی: (إن شهداء أمتي إذن لقليل).

واتە: کەواتە شەهیدەکانی ئۆمەتی من کەم ئەبن.

ئەوانیش ووتیان: ئەی کێن ئەی نێرراوی خوا؟

---

(١) مسلم (١٨٨٧) والترمذي (٣٠١١).

(٢) أبوداود (١٤٤٩).

(٣) أحمد (٥/٤٤٦) وأبوداود (٣١١١) والنسائي (٤/١٣) وابن ماجة (٢٨٠٣) وابن حبان (٣١٧٩و٣١٨٠)

(٤) نەخۆشی تەنیشت ئەو برینانەیە کە لەتەنشتی مرۆڤ ئەدات لەڕوی ناوەوە، وە بەو هۆیەوە توشی کۆکەو لەرزو تا نەبێت.

فەرمووی: (من قتل في سبيل الله فهو شهيد، ومن مات في سبيل الله فهو شهيد، ومن مات في الطاعون فهو شهيد، ومن مات في البطن فهو شهيد، و الغريق شهيد) رواه مسلم[1].

واتە: هەرکەس لەرێگەی خوادا بکوژرێت ئەوە شەهیدە، وە هەرکەس لە تاعەتی خوادا بمرێت ئەوە شەهیدە، وە هەرکەس بەتاعون بمرێت ئەوە شەهیدە، وە هەرکەس بە ئازاری سك بمرێت ئەوە شەهیدە، وە خنکاو بە ئاو شەهیدە.

وە لەسەعیدی کوڕی زەیدەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من قُتِل دون ماله، فهو شهيد ، ومن قتل دون دمه، فهو شهيد، ومن قتل دون دينه، فهو شهيد، ومن قتل دون أهله، فهو شهيد) رواه أحمد والترمذي وصححه[2].

واتە: هەرکەس لە پێناو ماڵی خۆیدا بکوژرێت شەهیدە، وە هەرکەس لە پێناوی خوێنی خۆیدا بکوژرێت شەهیدە، وە هەرکەس لە پێناوی ئاینەکەیدا بکوژرێت شەهیدە، وە هەرکەس لەپێناو کەس و کاریدا بکوژرێت ئەوە شەهیدە.

زانایان وەتوویانە: مەبەست لەشەهیدی ئەوانە هەمووی جیایە لەگەڵ شەهیدی ئەوانەی کە لەرێگای خوادا کوژراون، بەڵکو لە ڕۆژی دوایدا پاداشتی شەهیدیان ئەدرێتی، بەڵام لە دونیادا ئەشۆردرێن و نوێژیان لەسەر ئەکرێت.

ڕوون کردنەوەی ئەوەش ئەوەیە کە شەهیدەکان سێ بەشن:

شەهید لەدونیا و ئاخیرەتدا، ئەویش کەسێکە لەجەنگی دژ بە کافراندا کوژرابێ، وە شەهید لە ئاخیرەتدا نەك لە حوکمەکانی دونیا، کە ئەویش ئەوانەن کە باسکران، وەشەهید لە دونیادا نەك لە ئاخیرەتدا، کە ئەویش کەسێکە کە دزی لەغەنیمەت کردبێت و کوژرابێت، یا لەترسی بێ باوەڕان هەڵهاتبێت پشتی تێ کردبێ و کوژرابێت.

وە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (يغفر الله للشهيد كل ذنب، إلا الدَّيْن)[3].

واتە: خوا لە هەموو گوناهەکانی شەهید خۆش ئەبێت جگە لە قەرز

(١) مسلم (١٩١٥).

(٢) أبوداود (٤٧٧٢) والترمذي (١٤٢١) والنسائي (١١٦/٧) وابن ماجة (٢٥٨٠) وأحمد (٧٩/١و١٦٣/٢).

(٣) مسلم (١٨٨٦).

وە ستەم کردن لە خەڵکیش ئەخریتە پاڵ قەرز، وەك: کوشتن و ماڵی خەڵك خواردن بە باتڵ و ئەو جۆرە شتانە.

## جیهاد کردن بۆ بەرزکردنەوەی ووشەی خوا

جیهاد پێی ناوترێ جیهادی حەقیقی ئەگەر مەبەست پێی ڕەزامەندی خوا نەبێت، هەروەها ئەگەر بۆ بەرز کردنەوەی ووشەی خوا نەبێت و ئاڵای حەقی پێ بەرزنەکرێتەوە، و شتی پڕو پوچی پێ لەناو نەبرێت، وەلەڕێی خودا گیان نەبەخشرێت.

وە ئەگەر جگە لەوانە شتێکی تری تێدا مەبەست بێت لەشتی دونیایی، ئەوە بەجیهادی ڕاستی ناو نابرێت.

جا هەرکەس بجەنگێ بۆ بەدەست هێنانی پلەو پایە؛ یا غەنیمەت، یا ئازایەتی خۆی پێ دەربخات، یا ناوبانگی پێ پەیدا بکات، ئەوە هیچ پاداشتی نادرێتەوە.

لەئەبی موساوە کە فەرموویەتی: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ووتی: پیاوی واهەیە بۆ غەنیمەت ئەجەنگێ، وەپیاوی واهەیە بۆ ئەوەی لەناو خەڵکدا باس بکرێت ئەجەنگێ، وە پیاوی واهەیە بۆ ئەوەی بە ئازا ناو ببرێ ئەجەنگێ، ئەی کامە لەڕێی خوادایە؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (من قاتل لتكون كلمة الله هي العليا، فهو في سبيل الله)[1].

واتە: هەرکەس بجەنگێ لە پێناوی ئەوەدا کە وشەی خوا بەرز بێت ئەوە لە ڕێگای خوادایە.

وە ئەبوداود و نسائی ئەگێڕنەوە: کە پیاوێك وتی: ئەی نێرراوی خوا ئایا پیاوێك غەزا بکات بەهیوای پاداشت و ناوبانگ پەیداکردن چی بۆ هەیە؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لاشيء له) واتە: هیچی بۆ نییە، سێ جار کابرا دووبارەی کردەوە.

هەموو جارێك ئەی فەرموو: ﷺ (لاشيء له، إن الله لايقبل من العمل إلا ماكان خالصاً وابْتُغِيَ به وجهه)[2].

واتە: هیچی بۆ نییە، چونکە خوا هیچ کارێك وەرناگرێ کە خالیص نەبێت و مەبەستی ڕەزامەندی خوای تێدا نەبێت.

---

(١) البخاري (٢٨١٠) ومسلم (١٩٠٤).

(٢) أحمد (٤/١٢٦) والنسائي (٦/٢٥) وأبوداود كما في الترغيب والترهيب للمنذري (١٩٩١).

بەڕاستی نیەت و نیاز: گیانی کردەوەیە، جا هەر کارێك نیازی تێدا نەبێت کارێکی مردووە و لای خوا کێشی نیەیە.

بوخاری ئەگێڕێتەوە لە عومەری کوڕی خەططابەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنما الأعمال بالنیات ، وإنما لكل امرئ مانوی)[1].

واتە: کردەوەکان بە پێی نیازەکانن، و هەرکەس نیازی چی بێت لەکارەکەیدا ئەوەی بۆ ئەبێت.

وە بە ڕاستی ئیخلاصەکە نرخی ڕاستەقینە ئەدات بە کردەوەکان، هەر بۆیە ئادەمیزاد بە ئیخلاص و بە خاوێنیێتی لە کارەکانیدا ئەگاتە پلەی شەهیدەکان، با شەهیدیش نەکرێت.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من سأل الله الشهادة بصدق، بلغه الله منازل الشهداء، وإن مات على فراشه)[2].

واتە: هەرکەس بەڕاستی داوای شەهید بوون بکات لە خوا، خوای گەورە ئەیگەیەنێتە پایەی شەهیدەکان، ئەگەر لەسەر جێگاکەشی مردبێت.

وە پێغەمبەر ﷺ ئەی فەرموو: (إن بالمدينة أقواماً ماسرتم مسيرًا، ولاقطعتم وادياً، إلا كانوا معكم، حبسهم العذر)[3].

واتە: لەمەدینەدا کۆمەڵێك هەیە ماوەیك نەڕۆیشتوون و دۆڵێکتان نەبڕیوە کە لەگەڵتان نەبووبن، ئەوان بەندی بەهانەی شەرعی بوون و نەیان توانیوە بڕۆن بۆ جیهاد.

وە ئەگەر ئیخلاص و خاوێنیێتی پاڵپێوەنەری جیهادکردنەکە نەبوو، بەڵکو شتێکی دونیایی تر بوو ئەوە ئەو موجاهیدە تەنها بەش بڕاو نابێت لەپاداشت و بەس، بەڵکو خۆی ئەخاتە بەر سزای ڕۆژی دوایی

لە ئەبی هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرموویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە کە ئەیفەرموو: (إن أول الناس يقضي يوم القيامة عليه : رجل أستُشهد، فأُتِيَ به فعرَّفه نعمه، فعرفها، قال : فما عملت فيها؟

---

(١) البخاري (١) ومسلم (١٩٧).

(٢) مسلم (١٩٠٩) وأبوداود (١٥٢٠) والترمذي (١٦٥٣) والنسائي (٣٧١٦) وابن ماجة (٢٧٩٧).

(٣) البخاري (٢٨٣٩) وأبوداود (٢٥٠٨) وابن ماجة (٢٧٦٤) من حديث أنس، ومسلم (١٩١١) وابن ماجة (٢٧٦٥) من حديث جابر.

قال: قاتلت فيك حتى استشهدتُ، قال: كذبت، ولكنك قاتلت لأن يقال: جري، فقد قيل، ثم أمر به فسحب على وجهه حتى أُلقيَ في النار.

واتە: یەکەم کەسێك رۆژی قیامەت کە لێی ئەپرسرێتەوە کەسێکە شەهیدکراوە، ئەیهێنن خوای گەورە نیعمەتەکانی خۆی نیشان ئەدات کە پێی بەخشیبوو لەدونیا، ئەویش ئەیان ناسێتەوە.

پێی ئەفەرمووێ: چیت کردووە لە پێناوی ئەم نیعمەتانەدا؟

ئەڵێت: لە پێناوی تۆدا جەنگیوم هەتا شەهید کراوم.

پێی ئەفەرموێت: درۆ ئەکەیت، بەڵام بۆیە جەنگیویت بۆ ئەوی پێت بڵێن چاو نەترسی و ئازا و بەجەرگی، وە پێشت ووترا، لە پاشاندا فەرمان ئەکات بەسەردەمدا ڕای ئەکێشن هەتا ئەخرێتە ناو دۆزەخ.

وە پیاوێك خۆی فێری زانستی ئەکات و خەڵکیش فێر ئەکات و قورئانیش ئەخوێنێ، ئەیهێنن خوای گەورە نیعمەتەکانی نیشان ئەدات، ئەویش ئەیان ناسێتەوە.

ئەفەرموێت: لە پێناویدا چیت کردووە؟

ئەڵێت: فێری زانست بووم و خەڵکیشم فێر کردووە و لە پێناوی تۆدا قورئانم خوێندووە،

ئەفەرمووێ: درۆ ئەکەی، بۆ ئەوەی پێت بڵێن زانایە خۆت فێری زانستی کردووە. وە قورئانت بۆیە خوێندووە تا پێت بڵێن: قورئان خوێنە. وە ئەمەشیان پێ ووتویت.

لە پاشاندا فەرمان ئەکات بەسەردەمدا ڕای ئەکێشن هەتا ئەخرێتە ناو دۆزەخەوە.

وە پیاوێکیش کە خوا سامانداری ئەکات و جۆرەها ماڵی پێ ئەدا، ئەی هێنێ نیعمەتەکانی خۆی نیشان ئەدات، ئەیان ناسێتەوە، ئەفەرمووێ: چیت لە پێناوی ئەم نیعمەتانەدا کردووە؟

ئەڵێت: ڕێگا نەماوە تۆ پێت خۆش بێت ماڵی تێدا سەرف بکرێ ماڵم سەرف نەکردبێت لە پێناوی تۆدا.

ئەفەرمووێ: درۆ ئەکەیت.

بۆیە ئەوەت کردووە کە پێت بڵێن: دڵی باشە و سەخیە، وە ئەوەشت پێ ووتراوە.

لەپاشاندا فەرمان ئەکات بەسەردەمدا ڕائەکێشرێت هەتا ئەی خەنە ناو ئاگرەوە. موسلیم گێڕاویەتیەوە[1].

پاداشتی ئەو تێکۆشەرە کە کرێ وەربگرێ :

هەرچەندە موجاهیدەکە نیازی پاك بێت، بەلاّم لەغەنیمەتەکەی وەرگرت، ئەو وەرگرتنە لە پاداشتی جیهادەکەی کەم ئەکاتەوە.

لەعەبدوللاّی کوڕێ عەمرەوە کە فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مامن غازیة، أو سرِیَّةٍ تغزو، فتغنم و تسلم، إلا کانوا قد تعجلوا ثلثي أجورهم).

واتە: غەزا کەرێك نىیە یا کۆمەڵێك غەزاکەر نىیە غەنیمەتێکیان بە دەست هێنابێت و سەلامەت بووبێتن، کە دوو سێ یەکی پاداشتەکەی وەرنەگرتبێ.

وە هەروەها فەرموویەتی: (وما من غازیة أو سریة تخفق أوتصاب، إلا تم أجورهم) رواه مسلم[2].

واتە: غەزاکەر نىیە یا کۆمەڵێك غەزاکەر نىیە ماندو بووبێتن، و یا بپێکرێن، کە پاداشتەکەی بەتەواوی وەرنەگرێت.

ئیمامی نەوەوی فەرموویەتی: مانای حەدیسەکە کە هیچ مانایەکی ڕاستی تری نىیە جگە لەوە ئەوەیە موجاهیدەکان ئەگەر سەلامەت بورن یاغەنیمەتیان بەدەست هێنا، پاداشتیان کەمتر ئەبێت لەپاداشتی ئەو کەسەی سەلامەت نەبێت یا سەلامەت بێت و غەنیمەتی دەست نەکەوتبێ، چونکە غەنیمەت لە بەرامبەری بەشێکە لە پاداشتی غەزاکەیانە، جا ئەگەر ئەوەیان بەدەست هێنا؛ ئەوە دوو سێ یەکی پاداشتی غەزاکەیان بۆ پێش خراوە کە کردوویانە، وە ئەو غەنیمەتە لە تێکڕای پاداشتەکە ئەبێت.

وە ئەوە ڕێك ئەکەوێ لەگەڵ ئەو حەدیسە ڕاستە بەناوبانگانەدا کە لەصەحابەوە ئەگێڕنەوە وەك: (منا من مات ولم یأکل من أجره شیئا).

واتە: لە ئێمە هەبوو مردووە و هیچ لە پاداشتی جیهادەکەی نەخواردووە.

---

(١) مسلم (١٩٠٥) والنسائي (٦/٢٣) والترمذي (٢٣٨٢) وابن حبان (٢٥٠٢) موارد البيهقي في السنن (٩/١٦٨).

(٢) مسلم (١٩٠٦) وأبوداود (٢٤٩٧) والنسائي (٦/١٨) وابن ماجة (٢٧٨٥).

(ومنا من ينعت له ثمرته فهو يهديها: أي يجتنيها)[1].

واتە: وەلە ئێمە هەبووە کەبەری جیهادەکەی پێ گەیشتووە و چنیویەتی یا بەخشیویەتی بە دیاری.

ئەوەی باسمان کرد هەر ئەو ڕاستە. وە ڕواڵەتی حەدیسەکەش هەر ئەوەیە حەدیسێکی تری ئاشکراو ڕاست نەهاتووە پێچەوانەی ئەوە بێت، لەبەر ئەوە هەر بەو شێوەیە لێك ئەدرێتەوە کەباسمان کرد، وە قازی عەیاض ئەو مانایەی هەڵبژاردووە کە باسمان کرد.

وە ئەبوداود لەئەبی ئەیوبەوە گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ستفتح عليكم الأمصار، وستكونون جنوداً مجندة، يقطع عليكم فيها بعوث، فيكره الرجل منكم البعث فيها، فيتخلص من قومه، ثم يتصفح القبائل يعرض نفسه عليهم ، يقول من أكفه، بعث كذا ، وذلك الأجير، إلى آخر قطرة من دمه)[2].

واتە: بەری هێرشتان فراوان ئەبێت و وڵاتان ئەگرن و سوپاتان لێ دروست ئەکرێت و لەسەرتان دا ئەنرێ هاوبەشی ئەو سوپایە بکەن بۆ جەنگ دژی بێ باوەڕان ، پیاوی وەهاتان تێدا پەیدا ئەبێت لای ناخۆش ئەبێت هاوبەشی بکات، هۆزەکەی خۆی بەجێ ئەهێڵێ و هۆز بەهۆز ئەگەڕێ و ئەڵێت کێ لە جیاتی من ئەچێت بۆ ئەو هێرشە، ئیتر ئەو کەسەی ئەچێت بەکرێ گیراوە هەتا دوا تنۆکی خوێنی.

### فەزڵ و گەورەیی پاسەوانی لە ڕێگەی خوادا

چەند کەلێنێك هەیە کە دوژمن ئەتوانێ لەوێوە بێتە ناو خاکی ئیسلامەوە، وە ئەوەی پێویستە ئەوەیە کە ئەو شوێنانە باش قایم بکرێن و پاسەوانی تێدا دابنرێت، بۆ ئەوەی نەبنە شوێنێك دوژمنان بەکاری بهێنن بۆ هێرش بردنە سەر وڵاتانی ئیسلام.

وە ئیسلام پاڵ بەموسڵمانانەوە ئەنێت کە ئەوشوێنانە بپارێزن بە دانانی سەرباز تێیاندا بۆ ئەوی ببنە هێزێکی پاڵپشت بۆ موسڵمانان.

وە بەگرتنی ئەو شوێنانانە لەلایەن سەربازانی موسڵمانەوە و مانەوەیان تێیدا لە پێناوی جیهاد لە ڕێی خوادا ئەووترێ (الرباط)، وە کەمترین ماوەی مانەوە لەو شوێنانەدا ساتێکە، بەڵام ئەگەر کەسێك بیەوێت ماوەی تەواو لەو شوێنانەدا بمێنێتەوە ئەبێ چل ڕۆژ تەواو بکات.

---

(١) البخاري (١٢٧٦) ومسلم (٩٤٠).

(٢) أبوداود (٢٥٢٥).

وه چاكترین و خێرترین پاسەوانی، پاسەوانی ئەو شوێنانەیە كە ترسناكترین شوێن بن، زانایان لەسەر ئەوه رێك كەوتوون كەمانەوه لەو شوێنانەدا چاكتره لەمانەوه لەمەككەدا.

وه له بارەی فەزڵ و چاكی پاسەوانیەوه ئەم فەرموودانە هاتوون:

موسلیم له سەلمانەوه ئەگێڕێتەوه كە فەرموویەتی: بیستوومه له پێغەمبەر ﷺ كە ئەیفەرموو: (رباط یوم و لیلة خیر من صیام شهر و قیامه، وإن مات جرى علیه عمله الذي كان یعمله، و أجري علیه رزقه، وأمن الفَتَّان)[1].

واته: پاسەوانی شەو و رۆژێك خێرتره له مانگێ بەرۆژوو بوون و شەونوێژكردن، وه ئەگەر لەو شوێنەدا مرد كه پاسەوانی كردووه، ئەوه ئەو كردەوەیەی كردویەتی بۆی بەردەوام ئەبێت، وه رۆزی بەردەوامی لای خوا ئەدرێتێ، و وەله شەیتان ئەمین ئەبێت.

وه فەرموویەتی: (كل میت یختم علي عمله، إلا الذي مات مرابطاً في سبیل الله، فإنه ینمي عمله إلى یوم القیامة، ویأمن فتنة القبر)[2].

واته: هەموو مردوویەك به مردنەكەی كردەوەی كۆتایی دێت، ئەوانە نەبن كه پاسەوانی ئەكەن لەرێی خوادا ، ئەوانە كردەوەكانیان پەرەئەسێنێ و بەردەوامە هەتا رۆژی دوایی، وه لەفیتنەی ناوگۆڕ ئەمین ئەبن.

## فەزڵی مەشق كردن لەسەر چەك بەنیازی جیهاد

ئیسلام پاڵ بەموسڵمانانەوه ئەنێت بۆ ئەوەی به باشی مەشق بكەن لەسەر چەك و شێوەی جەنگ لەرێی خوادا، وه خۆڕاهێنان لەسەر بەكارهێنانی چەك و كەرەسەی جەنگی به باش داناوه.

١- له عوقبەی كوڕی عامیرەوه كه فەرموویەتی: بیستومه له پیغەمبەرەوه ﷺ لەسەر دوانگەكەی ئەیفەرموو: (وأعدوا لهم ماستطعتم من قوة). ألا إن القوة الرمي، ألا إن القوة الرمي، ألا إن القوة الرمي) رواه مسلم[3].

---

(١) مسلم (١٩١٣) والترمذي (١٦٦٥).

(٢) أبوداود (٥٠٠/٢) والترمذي (١٦٢١).

(٣) مسلم (١٩١٧) وأبوداود (٢٥١٤) والترمذي (٣٠٨٣) وابن ماجة (٢٨٨٣).

واتە: بەپێی تواناتان هێز ئامادە بکەن، بۆ جەنگ دژی کافران، هێزیش خۆ فێرکردنی چەکە جەنگیەکانە، سێ جار دووبارەی کردەوە.

٢- وە هەر لەعوقبەوە خوای لێ ڕازی بێت فەرموویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو ئەی فەرموو: (ستفتح عليكم أرضون؛ فلا يعجز أحدكم أن يلهو بأسهمه[1]، إن الله يدخل بالسهم الواحد الجنة ثلاثة نفر: صانعه، و المُمِدَّ بِهِ، و الرامي به في سبيل الله)[2].

واتە: زەوی و وڵاتانتان بۆ ئەکرێتەوە و ئەچنە ناوی، کەستان لەیاری کردن بەتیرەکەی ماندوو نەبێت، هەرمەشقی لەسەر بکات، چونکە خوا بە تیریك سێ کەس ئەخاتە بەهەشتەوە: ئەوەی دروستی ئەکات، ئەوەی ئەی داتە دەست جەنگاوەرەکە، ئەوجەنگاوەرەش کە ئەی هاوێژێ لە ڕێگەی خوادا.

وە ئیسلام زۆر بەتوندوتیژی فشار ئەخاتە سەر ئەوانەی بەکاری هێنانانی چەك لەبیر خۆیان ئەبەنەوە دوای فێربوونی، وە بە کارێکی زۆر خراپی داناوە بۆ ئەو کەسانەی بەبێ بەهانە وازی لێ ئەهێنن.

٣-پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من عَلِمَ الرمي ثم تركه فليس منا، أو (قد عصى) رواه مسلم.

واتە: هەرکەس فێری بەکارهێنانی چەك بوو لە پاشاندا وازی لێ هێنا لە ئێمە نیيە، یا سەرپێچی فەرمانی ئێمە ئەکات. موسلیم گێڕاویەتیەوە[3].

٤- وە هەروەها فەرموویەتی: (كل شيء يلهو به الرجل باطل ، الا رميه بقوسه، وتأديبه فرسه، وملاعبته أهله، فإنه من الحق)[4].

واتە: هەرچی شتێك پیاو خۆی پێوە خەریك بکات و پێوەی ڕابوێرێ کارێکی پوچەڵە، تیر هاویشتن و مەشق بە ئەسپ کردن و یاری لەگەڵ خێزاندا نەبێت کە کارێکی هەقن.

قورطوبی فەرموویەتی: مانای ئەم فەرموودەیە هەرچەندە خوا خۆی ئەزانێ، ئەوەیە کە پیاو بەهەرچی شتێك ڕابوێرێ لەو شتانەی کە سوودی بۆ ئیستاو دوایی نابێت، ئەوە کارێکی پوچەڵەو

---

(١) مسلم (١٩١٨).

(٢) أبوداود (٢٥١٣) والترمذي (١٦٣٧) والنسائي (٦/٢٢٢و٢٢٣) والحاكم (٢/٩٥).

(٣) مسلم (١٩١٩) وابن ماجة (٢٨١٤).

(٤) الحاكم (٢/٩٥).

چاکترە کە ئادەمیزاد لێی دوور بکەوێتەوە، جگە لەو سێ شتە نەبێت بابۆ ڕابواردن و خۆگورج کردنەوەش بێت، کارێکی هەق و ڕاستن، لەبەر پەیوەندی‌یان بە شتی بەسوودەوە، چونکە تیر هاوێشتن و مەشق بە ئەسپ لەو کارانەن کە ئەبنە هۆی یارمەتی بۆ جەنگ دژی بێ باوەڕان.

وە دەست بازی کردن لەگەڵ خێزاندا لەوانەیە کە ئەبێتە هۆی دروست بوونی منداڵێکی خواناس و یەکتا پەرست، لەبەر ئەوەیە ئەم سێ کارە لەکارە هەقەکانن.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (یا بني إسماعیل، ارموا فإن أباكم كان رامیاً)[1].

واتە: ئەی نەوەی ئیسماعیل تیر بهاوێژن، چونکە باوکتان تیر هاوێژ بووە. وە فێربوونی ئەسپ سواری و بەکار هێنانی چەك فەرزی کیفایەتە، وە جاری واش دەبێت کە ئەبێتە فەرزی عەین و لەسەر هەموو کەس واجبە.

**جەنگین لەدەریادا چاکترە لە جەنگین لەووشکانیدا:**

کاتێ جەنگی دەریایی زۆر ترسناك ترە لە جەنگی زەمینی پاداشتی زۆر ترە.

١- ئەبوداود ئەگێڕێتەوە لە ئومو حەرامەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (المائد في البحر له أجر شهید، و الغَرِق له أجر شهیدین)[2].

واتە: ئەوەی لە دەریادا تووشی ڕشانەوە بێت و بمرێت پاداشتی شەهیدێکی هەیە، وە هەرکەس تێیدا بخنکێ پاداشتی دوو شەهیدی هەیە .

٢- وە ئیبن ماجە ئەگێڕێتەوە لە ئەبی ئومامەوە کە فەرموویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە ئەی فەرموو: (شهید البحر مثل شهیدي البر، و المائد في البحر كالمتشحط في دمه في البر وما بین الموجبتین كقاطع الدنیا في طاعة الله، وإن الله وكَّلَ ملك الموت یقبض الأرواح، إلا شهید البحر، فإنه یتولی قبض أرواحهم، ویغفر لشهید البر الذنوب كلها إلا الدین، ویغفر لشهید البحر الذنوب و الدین)[3].

واتە: شەهیدی دەریا پاداشتی دوو شەهیدی زەمینی هەیە، وە ئەو کەسەی لە دەریا تووشی ڕشانەوە ئەبێت و ئەمرێت وەك ئەو شەهیدەیە کە لەسەر زەوی لە خوێنی خۆیدا ئەتلێتەوە،

---

(١) البخاري (٢٨٩٩).

(٢) أبوداود (٢٤٩٣).

(٣) إبن ماجة (٢٧٧٨).

وه برینی نێوان دوو شەپۆل وەك برینی دونیا وایه به خوا پەرستی، وەخوای گەوره فریشتەی گیان کێشانی کردۆته وەکیلی خۆی گیانی خەلکی بکێشێ، شەهیدی دەریا نەبیت خوا خۆی سەرپەرشتی گیان کێشانیان ئەکات، وه خوا لەهەموو گوناهەکانی شەهیدی زەمینی ئەبورێ قەرز نەبێت، بەلاّم شەهیدی دەریا خوا لەهەموو گوناهەکانی و قەرزیشی ئەبوورێ.

## سیفەتەکانی سەرکردە

(فەخری) ئەو سیفەتانە که پێویسته له سەرکردەی سوپادا هەبێت ژمارەی کردووه، و ئەڵێت:

هەندێ له دانایانی تورك وتوویانه:

پێویسته سەرکردەی سوپا ده ڕەوشتی ئاژەڵی تێدا بێت:

١- ئازایەتی و چاو نەترسی شێر.

٢- فێڵبازی ڕێوی.

٣- شێوه ڕووهاتنی بەراز.

٤- ئارام گرتنی سەگ لەسەر بریندار بوون.

٥- هێرش بردنی گورگ.

٦- پاسەوانی و ئێشك گرتنی (کُرکي) قولنگ.

٧- دڵنەرمی کەڵەشێر.

٨- بەسۆزی کەڵەشێر بەرامبەر جوجەڵه.

٩- به ئاگایی قەلەڕەش .

١٠- قەڵەوی (تەعرو).

تەعرو: گیانلەبەرێکه له خۆراسان به ماندوو بوون و ڕۆیشتن قەڵەو دەبێت.

## جیهاد کردن لەتەك پیاو چاك و پیاو خراپدا:

له جیهادا مەرج نیيه حاکم دادپەروەربێت، یاسەرکرده بێ تاوان بێت و پیاو چاك ، بەڵکو جیهاد بەهەموو شێوەیەك پێویسته، چونکه جاری وا ئەبێت کابرایەکی تاوانکار له گۆڕەپانی جەنگدا کارێك به دوژمن ئەکات که کەسانێتر بۆیان ناکرێ.

**ئەوەی پێویستە لەسەر سەرکردەی سوپا:**

پێویستە لەسەر سەرکردەی سوپا ئەم کردارانەی خوارەوە بکات بەرامبەر سەربازەکانی:

١- ڕاوێژیان پێ بکات و ڕایان وەربگرێت، ڕای خۆی نەسەپێنێ بەسەریانا، بە پێی فەرموودەی خوای گەورە کە فەرموویەتی: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ﴾ (آل عمران:١٥٩)

واتە: لەکار و بارەکاندا ڕاوێژیان پێ بکە.

وە لەئەبی هورەیرەوە خوا لێی ڕازی بێت فەرموویەتی: هەرگیز کەسم نەدیوە ئەوەندەی پێغەمبەر ﷺ ڕاوێژی بە یارەکانی کردبێت، ئەحمەد و شافیعی خوایان لێ ڕازی بێت تەخریجیان کردووە[١].

٢- دڵ نەرم بێت بەرامبەریان و نەرم و نیان بێت، عائیشە دایکی موسڵمانان خوا لێی ڕازی بێت فەرموویەتی: گوێم لە پێغەمبەر بوو ﷺ کە فەرموویەتی: (اللهم من ولي، من أمر أمتي شيئاً فرفق بهم، فارفق به) أخرجه مسلم[٢].

واتە: خوایە هەرکەس کاری ئەم نەتەوەیەی منی گرتە دەست و بە بەزەیی بوو بۆیان، تۆش بەبەزەیی بە بۆ ئەو کەسە.

وە لەمەعقەلی کوڕی یەسارەوە ئەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مامن أمير يلي أمورَ المسلمين، ثم لايجتهد لهم، ولاينصح لهم، إلا لم يدخل الجنة)[٣].

واتە: هیچ ئەمیرێك نی‌یە کە کاری موسوڵمانان بگرێتە دەست، پاشان تێ بکۆشێ لە پێناویاندا و ڕاوێژیان پێ بکات، ئیللا ئەچێتە بەهەشتەوە.

وە ئەبوداود ئەگێڕێتەوە لە جابیرەوە خوا لێی ڕازی بێت کە فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ لەکاتی ڕۆیشتن لەگەڵ سوپادا خۆی دووا ئەخست و کەل و پەلی بۆ لاوازەکان هەڵئەگرت و لەگەڵ خۆیدا سوواری ئەکردن، وە ڕێنمایی ئەکردن[٤].

٣- فەرمانی بە چاکە کردن و قەدەغە کردنی لە خراپە، بۆ ئەوەی تووشی تاوان نەبن.

---

(١) أحمد (٤/٣٢٨) والشافعي (٢/١٧٧).

(٢) مسلم (١٨٢٨) نسائي (٦/٦٢و٩٣) نسائي في الكبرى (٨٨٧٣).

(٣) مسلم (٢٢/١٤٢).

(٤) أبوداود (٢٦٣٩).

٤- بەسەرکردنەوەی سوپا جاروبار، بۆ ئەوەی ئاگاداری سەربازەکان بێت، ئەوەی بۆ جەنگ نەشێت لە پیاو و کەرەسەی جەنگ، نەیانبات بۆ جەنگ، وەك ئەو پیاوانەی ترس ئەخەنە دڵی سەربازەکان و ئەوانەی پڕوپاگەندە بڵاوئەکەنەوە وەك ئەوەی بڵێن: هێزو چەك و توانایان نییە . . یا ئەو کەسانەی نهێنی و هەڵس و کەوتی سوپا ئەبەنە دەرەوە یا فیتنەو ئاشوب بەرپا ئەکەن.

٥- دانانی سەردەستە.

٦- هەڵواسینی ئاڵای جەنگی و دروشمە جەنگیەکان.

٧- هەڵبژاردنی شوێنە چاکەکان و پاراستنیان.

٨- ناردنی جاسوس بۆ زانینی حاڵی دوژمن.

وە پێغەمبەر ﷺ خۆی ئەگەر بیویستایە غەزایەك بکات بە شتێکیتر ئەی شاردەوە، هەتا دوژمن نەزانێ کە ئەیەوێ بچێت بۆ کوێ.

وە جاسوسی ئەنارد بۆ ئەوەی هەواڵی دوژمنان بێنێتەوە، وەخۆی سوپاکەی ڕێك ئەکرد و ئاڵا و دروشمی بۆ دائەنان .

ئیبنو عەبباس خوای لێ ڕازی بێت فەرموویەتی: ئاڵاکەی پێغەمبەر ﷺ ڕەش بوو، وە لیواکەی سپی بوو. ئەبو داود گێڕاویەتیەوە[1] .

### ئامۆژگاریەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ سەرکردەکانی

لە ئەبو موساوە خوای لێ ڕازی بێت فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر کەسێکی لە یارەکانی بناردایە بۆ کارێکی ئیداری، پێی ئەفەرموو: (بشّروا، ولاتنفروا، ویسروا، ولا تعسروا)[2] .

واتە: مژدەی خۆشی بدەن و خەڵك مەڕەوێننەوە، و شت ئاسان بکەن لەسەر خەڵك و گرانی مەکەن.

وە هەر لە ئەبی موساوە فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ من و موعاذی ڕەوانەی یەمەن کرد و فەرمووی:

(یسروا ولاتعسروا، وبشروا ولاتنفروا، وتطاوعا ولاتختلفا) رواهما الشیخان[3] .

---

(١) ابن ماجة (٢٨١٨).

(٢) بخاري (٣٠٣٨) مسلم (١٧٣٣).

(٣) بخاري (٤٣٤١و٤٣٤٢) مسلم (١٥٨٧/١٧١).

واتە: ئاسان کار بن و شت لەسەر خەڵك گران مەکەن، و مژدەی خۆشی بدەن و خەڵك مەتۆقێنن، وە لەگەڵ یەکا هەردووکتان رێك کەوتووبن و جیاوازیتان نەبێت.

وە لە ئەنەسەوە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر فەرموویەتی: (إنطلقوا باسم الله، وبالله، وعلى ملة رسول الله صلّي الله عليه وسلم. ولا تقتلوا شيخاً فانياً، ولاطفلاً صغيراً، ولا إمرأة، ولاتغلوا، وضموا غنائمكم، وأصلحوا، وأحسنوا، إن الله يحب المحسنين) رواه أبو داود[1].

واتە: بکەونە رێ بەناوی خواوە، لە ڕێی خوادا و لەسەر ئاینی نێرراوی خوا، وە پیری بەساڵاچوو مەکوژن، و منداڵی بچوك مەکوژن، و ئافرەت مەکوژن[2]. لە دەستکەوتەکانی جەنگ لە خۆتانەوە هەڵ مەگرن بۆ خۆتان، بەڵکو کۆیان بکەنەوە و چاك کەرەوە و چاکە کاربن، چونکە خوا چاکەکارانی خۆش ئەوێ.

## ئامۆژگاری‌یەکەی عومەر خوا لێی ڕازی بێت

عومەری کوڕی خەططاب خوا لێی ڕازی بێت ئەم ئامۆژگاری‌یەی خوارەوەی نووسی بۆ سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و ئەو سەربازانەی لەگەڵیا بوون:

پاش ئەوە:

فەرمان بەخۆت و سەربازەکانت ئەکەم کە لە خوا بترسن لەهەمووکات و شێوەیەکدا، چونکە لە خوا ترسان چاکترین چەکە دژی دوژمن، وە بەهێزترین فێڵ و پیلانە لە جەنگدا، وە فەرمانتان پێ دەکەم کە ئەبێ زۆر خۆتان بپارێزن لە تاوان زیاتر لەوەی خۆتان لە دوژمن ئەپارێزن.

چونکە تاوانی سوپا لە دوژمنەکەیان ترسناك ترە بۆیان، وە موسڵمانان بەتاوانکاری دوژمنانیان سەرکەوتوون، وە ئەگەر وەها نەبوایە ئێمە توانای ئەوانمان نەبوو، چونکە ژمارەمان ئەوەندەی ژمارەیان نی‌یە و چەکمان ئەوەندەی چەکیان نی‌یە، جا ئەگەر لەتاوان و گوناهدا یەکسان بین، ئەوان هێزیان لەئێمە زیاترە، وە ئەگەر بە فەزڵ و چاکەمان سەرنەکەوین بەسەریانا بەهێزمان سەرناکەوین بەسەریانا.

بزانن کاتێ ئەڕۆن بۆ جەنگ، فریشتەکانی خوا بەسەرتانەوەن ئەزانن چی ئەکەن، جا ئێوەش شەرمیان لێ بکەن، وە تاوان و سەرپێچی خوا مەکەن لە کاتێکدا ئێوە لە ڕێگای خوادا ئەجەنگن

---

(١) أبوداود (٢٦١٤).

(٢) بەمەرجێ هاوبەشی جەنگەکەیان نەکردبێت و ڕایان هەبووبێت تێیدا.

وه مه‌لێن دوژمنه‌که‌مان له ئێمه خراپتره، و زاڵ نابن به‌سه‌رماندا، چونکه چه‌نده‌ها نه‌ته‌وه هه‌یه له‌خۆیان خراپتر زاڵکراوه به‌سه‌ریاندا، وه‌ك چۆن به‌نی ئیسرائیل مه‌جوسه‌كان زاڵ بوو بوون به‌سه‌ریاندا كاتێ تاوانیان ئه‌كرد، جا به شوێن ئه‌واندا و بۆ كوشتنیان ماڵ به ماڵیان ئه‌كرد تا بیان گرن. ئه‌وه‌ش په‌یمانێك بوو له خواوه كه ئه‌بوو به‌دی بێت بۆیان .

داوای یارمه‌تی له خوا بكه‌ن به‌سه‌ر نه‌فسی خۆتانا، وه‌ك چۆن داوای سه‌ركه‌وتنی لێ ئه‌كه‌ن به‌سه‌ر دوژمنتانا. منیش داوای ئه‌وه ئه‌كه‌م له خوا بۆ خۆم و بۆ ئێوه.

وه دڵ نه‌رم به به‌رامبه‌ر به موسڵمانان له ڕۆیشتنیاندا، په‌له‌یان لێ مه‌كه و ماندوویان مه‌كه، ته‌مه‌ڵی‌یان پێ مه‌كه له شوێنێكداو پاڵ بده‌نه‌وه بۆ ئه‌وه‌ی زوو بگه‌ن به دوژمنیان، و سه‌فه‌ر توانایان كه‌م نه‌كاته‌وه، چونكه ئه‌مان به‌ره‌و دوژمنێك ئه‌ڕۆن كه جێگیره وخۆیان و ئه‌سپه‌كانیان په‌ناداوه، وه هه‌موو هه‌فته‌یه‌ك شه‌و و ڕۆژێك له شوێنێكدا بوه‌ستن بۆ ئه‌وه‌ی به‌ته‌واوی بحه‌وێنه‌وه، و چه‌كه‌كانیان له‌و شه‌و و ڕۆژه‌دا له‌خۆ بكه‌نه‌وه، وه باشوێنه‌كه‌یان نزیك نه‌بێت له‌دانیشتوانی ئه‌و دێیانه‌وه كه ئه‌هلی صولح و ذیمه‌ن، وه كه‌س له سه‌ربازه‌كانت نه‌چێته ناویان ئه‌وانه نه‌بن كه باوه‌ڕت به ئاینیان هه‌یه، وه‌كه‌س هیچیان لێ نه‌سێنێ چونكه ئه‌وان حورمه‌ت و ذیمه‌یان هه‌یه، كه ئێوه به‌وه تاقی ئه‌كرێنه‌وه، وه‌ك چۆن ئه‌وان تاقی ئه‌كرێنه‌وه به‌ئارام گرتن له سه‌ری.

وه هه‌رچی ئه‌وانه ئارامیان گرت له‌سه‌ری بۆتان ئێوه‌ش به‌جوانی پاداشتیان بده‌نه‌وه، هه‌وڵ مه‌ده‌ن به‌هۆی سته‌م كردن له‌وانه‌ی كه ئه‌هلی صولح و ڕێككه‌وتنن سه‌ركه‌وتن به‌ده‌ست بێنن به‌سه‌ر شه‌ڕكه‌ره‌كاندا.

وه ئه‌گه‌ر پێت نایه خاكی دوژمنه‌وه، جاسوس له‌نێوان خۆتان و ئه‌واندا دابنێ، و كار وباری دوژمنت لێ نه‌شارڕێته‌وه، باعه‌ره‌ب له ده‌وروپشتت بێت، یا كه‌سانێك له خه‌ڵكی ئه‌و سه‌رزه‌وی‌یه كه‌دڵنیای له ئامۆژگاری‌و ڕاستگۆیی‌یان، چونكه دره‌ۆزن هه‌واڵه‌كه‌ی بێ كه‌ڵكه با له‌هه‌ندێكی قسه‌كانیدا ڕاست بكات، وه پیاوی ناپاك و خائین جاسوسه به‌سه‌رته‌وه، نه‌ك جاسوس بێت بۆت.

وه ئه‌بێ كاتی نزیك بوونه‌وه‌ت له خاكی دوژمن پێشڕه‌و زۆر بنێریت و په‌ل و لق له‌جه‌نگاوه‌ره‌كان بنێریته نێوان خۆت و دوژمن، وه ئه‌بێ پێشڕه‌وه‌كان كه‌م و كوڕی دوژمن ده‌ربخه‌ن.

وه ئه‌و پێشڕه‌وانه‌ش با كه‌سانێكی خاوه‌ن ڕاو به‌هێز له هاوه‌ڵه‌كانت بن، وه تیژترین ئه‌سپیان بۆ ئاماده بكه.

تا ئه‌گه‌ر گه‌یشتن به دوژمن، یه‌كه‌م شت پێیان بگات هێزێك بێت له‌لای خۆت، سه‌ركرده‌ی لقه‌كان باله موجاهیده‌كان بن، و له‌و كه‌سانه بن كه ئارام گرن له جه‌نگدا، وه هیچ كه‌س له‌به‌ر

ئارەزووی خۆت مەکە بەسەرکردە، بەوە ڕاو فەرمانت لەدەست ئەچێت لەجیاتی ئەوەی خۆشەویستی نزیکانی خۆت بۆ خۆت ڕابکێشی.

نە پێشڕەو نەپەل بەلایەکدا مەنێرە کە ترسی شکاندن و ترسی ئەوەت هەبێت کە شتێکیان پێ بکەن.

جا ئەگەر گەیشتیت بەدوژمن دوورەکان و پێشڕەوەکان و پەلەکان لەخۆت کۆبکەرەوە و هەموو فێڵ و هێزی خۆت ئامادە بکە، لەپاشاندا دەست پێشخەری مەکە لەجەنگدا، تاوەکو ناچار نەبیت، وە تاوەکو بە باشی نهێنی‌یەکانی دوژمن و سەرکردەکانیان نەزانی، وە باش شارەزای ئەو خاکە ببە وەك شارەزایی خەڵکی سەر ئەو خاکە، بۆ ئەوەی دوژمن چی بەتۆ ئەکات تۆش بەدوژمنەکەتی بکەی.

لەپاشاندا چاو لەسەر سوپاکەت دابنێ و توانا و هێزی شاراوەت دەربخە، وە بەسەر هیچ دیلێکدا تێمەپەڕە کە عەقدی فەرمانڕەوایی هەبێت هەتا لەملی نەدەی، بۆ ئەوەی دوژمنانی خوا و خۆت چاوترسێن بکەی.

وە خوا سەروکاری فەرمانی تۆ و سوپاکەتە، وە سەروکاری سەرکەوتنتە بەسەر دوژمندا، ئیتر خوا یارمەتی دەربێت. -تەواو-.

## ئەرکی سەرشانی سەربازەکان

وە ئەرکی سەرشانی سەربازەکان بەرامبەر سەرکردەکەیان ئەوەیە کە گوێ ڕایەڵی بن لەهەموو شتێکدا جگە لە تاوان کردن.

بوخاری و موسلیم لە ئەبو هورەیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من أطاعني فقد أطاع الله، ومن عصاني فقد عصى الله، ومن يطع الأمير فقد أطاعني، ومن يعص الأمير فقد عصاني)[1].

واتە: هەرکەسێ گوێڕایەڵی من بکات ئەوە گوێڕایەڵی خوای کردووە، وە هەرکەس سەرپێچی فەرمانەکانم بکات سەرپێچی فەرمانی خوای کردووە، وە هەرکەس گوێڕایەڵی سەرکردەکەی بکات ئەوە گوێڕایەڵی منی کردووە، وە هەرکەس سەرپێچی فەرمانەکانی سەرکردەکەی بکات ئەوە سەرپێچی فەرمانی منی کردووە.

---

(١) البخاري (٧١٣٧) ومسلم (٣٢/١٨٣٥).

بەڵام گوێڕایەڵی کردن بۆ ئاوان قەدەغەیە، چونکە گوێڕایەڵی هیچ کەس ناکرێت بۆ سەرپێچی فەرمانی خوا.

بوخاری و موسلیم لە عەلی‌یەوە ئەگێڕنەوە کە فەرموویەتی:

پێغەمبەر ﷺ کۆمەڵێکی نارد بۆ غەزا، پیاوێکی ئەنصاری کردە سەکردەیان و فەرمانی پێدان گوێڕایەڵی بن و مل کەچی بن، بەڵام ئەوان سەرپێچی‌یان کرد لەیەکێ لەفەرمانەکانی، ئەویش پێی ووتن: دارم بۆ کۆبکەنەوە، ئەوانیش داریان بۆ کۆکردەوە، لەپاشاندا پێی ووتن: ئاگری تێ بەربدەن، ئەوانیش ئاگریان تێ بەردا.

لەپاشاندا ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ نەکردن کە گوێڕایەڵ و مل کەچم بن؟ ووتیان: بەڵێ فەرمانی پێ کردووین، ووتی: دەبچنە ناو ئەو ئاگرەوە، ئەوانیش سەیری یەکیان کردوو وتیان: ئێمە بۆیە هەڵهاتووین بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە دەستی ئاگر، ئیتر بەم شێوەیە مانەوە، تا ڕق و قینی نیشتەوە و ئاگرەکەشی کوژایەوە، جا کاتێ گەڕانەوە بۆ پێغەمبەریان گێڕایەوە ئەویش فەرمووی:

(لو دخلوها، ماخرجوا منها أبداً، وقال: لاطاعة في معصية الخالق، إنما الطاعة في المعروف)[1].

واتە: ئەگەر بچونایەتە ناو ئەو ئاگرەوە هەرگیز لێی نەئەهاتنە دەرەوە، وە فەرمووی: گوێ ڕایەڵی نی‌یە بۆ سەرپێچی کردنی فەرمانی پەروەردگار، گوێ ڕایەڵی تەنها بۆ چاکەیە.

## بانگەواز کردنی دوژمن پێویستە پێش جەنگ

پێویستە لەسەر موسڵمانان پێش جەنگ بانگەوازی دوژمن بکەن بۆ ئیسلام و ئاشتی.

موسلیم تەخریجی کردووە لە بورەیدەوە خوا لێی ڕازی بێت کە فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر کەسێکی بکردایە بەسەرکردەی سوپایەك یا پۆلێك، لە پێشدا ئامۆژگاری ئەکرد کە لەخوا بترسێت، و چاك بێت لەگەڵ موسڵماناندا لە پاشاندا ئەی فەرموو:

بەناوی خواوە، لە ڕێگای خوادا بجەنگن، بجەنگن لەگەڵ ئەوانەدا کە باوەڕیان بەخوا نی‌یە بجەنگن و غەنیمەت مەدزنەوە، و غەدر مەکەن، و کوژراوی دوژمن ئەتك مەکەن، و منداڵ مەکوژن، وە

(١) البخاري (٧١٤٥) ومسلم (١٨٤٠/٤٠).

کاتێ گەیشتی بە دوژمنی بێ باوەڕت بۆ سێ شت بانگیان بکە، بەرەو هەرکامیان هات لێیان وەربگرە و وازیان لێ بێنە:

بانگیان بکە بۆ سەر ئیسلام، ئەگەر وەڵامیان دایتەوە لێیان وەربگرە و وازیان لێ بهێنە.

لە پاشاندا بانگیان بکە بۆ ئەوەی کۆچ بکەن بۆ مەدینە بۆ لای کۆچ کەرەکان، وە پێیان رابگەیەنە ئەگەر ئەوە بکەن کۆچ کەرەکان چییان بۆ هەیە ئەوەش بۆ ئەوان ئەبێت و چییان لەسەرە ئەوەش لەسەر ئەوان پێویست ئەبێت.

جا ئەگەر نەیان ویست کۆچ بکەن پێیان رابگەیەنە ئەوانیش وەك عەرەبە موسڵمانەکان ئەبن وە حوکمی خوا بۆیان بەو شێوەیە ئەبێت کە بۆباوەڕدارانە.

وە لەغەنیمە و دەستکەوتە جەنگی یەکان بەشیان نابێت هەتا لەگەڵ موسڵمانانندا جیهاد نەکەن.

جا ئەگەر موسوڵمان نەبوون داوای سەرانەیان لێ بکە، ئەگەر وەڵامیان دایتەوە مەجەنگە دژیان و لێیان وەربگرە، جا ئەگەر نەیان ویست سەرانە بدەن بە پشتیوانی خوا بجەنگە دژیان.

وە ئەگەر ئابلۆقەی کەسانێکتدا لەناو قەڵایەکدا و داوایان لێ کردی کە (ذمة) پەیمانی خواو پێغەمبەری خوایان بۆ دابنێی قبوڵی مەکە، بەڵکو لەسەر زیمەی خۆت و هاوەڵەکانت قبوڵی بکە، چونکە ئەگەر پەیمانی خۆت و هاوەڵەکانت بشکێنی سوکترە لەوەی پەیمانی خواو پێغەمبەر بشکێنی.

وە ئەگەر کەسانی ناوقەڵایەکت ئابلۆقەداو داوایان لێ کردی بە پێی فەرمانی خوا بیان هێنیتە خوارەوە قبوڵی مەکە، بەڵکو لە سەر فەرمانی خۆت بیانهێنە خوارەوە، چونکە نازانی تۆ فەرمانی خوایان بەسەردا ئەپێکی یان نا. جگە لە بوخاری هەر پێنجەکان گێڕاویانەتەوە[1].

وە یەکێ لە سوپاکانی ئیسلام کۆشکێکی لە کۆشکەکانی فارس ئابلۆقەدا، بەسەرکردایەتی سەلمانی فارسی.

وتیان: ئەی ئەبا عبدوڵلا، هێرش نەکەینە سەری یان.

وتی: وازم لێ بێنن با بانگەوازیان بکەم، وەك چۆن گوێم لێ بووە پێغەمبەر ﷺ بانگەوازی ئەکرد.

(١) أحمد (٥/٣٥٢) ومسلم (٣/١٧٣١) والترمذي (١٦١٧) وابن ماجة (٢٨٥٨).

ئینجا هاتە پێشەوە و پێی وتن: منیش پیاوێکی فارسیم لە ئێوە، ئەمانەش عەرەبن و گوێ رایەڵیم ئەکەن، جا ئەگەر ئێوە موسڵمان بن چیمان بۆ هەیە ئەوەش بۆئێوە ئەبێت و چیمان لەسەرە ئەوەش لەسەر ئێوە ئەبێت، بەڵام ئەگەر ڕازی نەبن و لە سەر ئاینی خۆتان ئەمێننەوە وازتان لێ ئەهێنین بە مەرجێ سەرانەمان بەسەرشۆڕی.

وە بە فارسی پێی وتن ئەگەر بە سەرانەدان ڕازیبن کارێکی باش ناکەن، وە ئەگەر ڕازی نابن ئەوا پێمان ڕاگەیاندوون و ئەجەنگین دژتان.

ئەوانیش وتیان: ئێمە لەوانە نین سەرانە بدەین، بەڵام جەنگ ئەکەین لەگەڵتان، موسڵمانەکان وتیان: ئەبا عەبدوڵڵا هێرش نەکەینە سەریان .

ئەڵێ: سێ ڕۆژ بەو شێوەیە بانگی کردن، ئینجا فەرمووی: هێرش بکەنە سەریان، ئەڵێ: کە هێرشمان کرد بۆیان کۆشکەکەمان گرت) ترمذي گێڕاویەتیەوە[1] .

ئەبو یوسف وتوویەتی: بەپێی ئەوەی پێمان گەیشتووە هەرگیز پێغەمبەر ﷺ نەجەنگاوە هەتا بانگی نەکردبن بۆ لای خوا و پێغەمبەرکەی

خاوەنی کتێبی (الأحكام السلطانية) فەرموویەتی: ئەوانەی بانگەوازی ئیسلامیان پێ نەگەیشتبێت حەرامە لەسەرمان لەناکاو شەڕیان لە گەڵدا بکەین، و بیان کوژین و ماڵیان بسووتێنین، وە حەرامە لەسەرمان دەست پێشخەری بکەین بەشەڕ دژیان، پێش ئەوەی بانگەوازی ئیسلامیان بۆ بڵاوبکەینەوە، و موعجیزەکانی پێغەمبەریان بۆ باس بکەین، و بە بەڵگەی ڕۆشن بۆیان ڕوون بکەینەوە، بە شێوەیەك پاڵیان پێوە بنێت وەڵام بدەنەوە

سەرەخسی کە یەکێکە لەئیمامەکانی پیاوانی مەزهەبی حەنەفی ڕای وایە: واچاکە دوای بانگەوازەکە یەکسەر شەڕنەکەین لەگەڵیان، بەڵکو شەوێك مۆڵەتیان بدەین هەتا بیر ئەکەنەوە و ڕاوێژ ئەکەن دەربارەی ئەوەی بەرژەوەندییانی تێدایە.

وە زانایانی ئیسلام ڕایان وایە ئەگەر سەرکردەی سوپای ئیسلام دەست بەجەنگ بکات، پێش ئەوی دوژمن ئاگادار بکاتەوە بە بەڵگە و بانگەوازکردن بۆ یەکێ لەو سێ شتە، و لەناکاو هێرشی کردە سەریان، ئەوە هەرچی لە دوژمن بکوژێت ئەبێ خوێنەکەی بدات.

(بلاذري) لە کتێبی (فتوح البلدان) دا ئەگێڕێتەوە کە ئەهلی سەمەرقەند بەفەرماندارەکەیان وت کە ناوی (سلێمانی کوڕی ئوبەی سوری) بوو کە قوتەیبەی کوڕی موسلیمی باهلیی ستەم و

(١) ترمذي (١٥٤٨).

ناپاکی لەگەڵ کردین، و وولاّتی داگیرکردین، وە خوا داد و ڕاستی دەرخستووە، جا ڕێمان بدە با چەند کەسمان بچینە لای خەلیفەی موسڵمانان بۆ سکالاّی ئەو ستەمە تا ئەگەر مافێکمان هەبێت بمان درێتەوە، چونکە ئێمە پێویستیمان بەوە هەیە، ئەویش ڕێی دان و کۆمەڵێکیان چوونە خزمەت (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) خوای لێ ڕازی بێت -کاتێ بەستەمکاری‌یەکەی زانی نامەیەکی نووسی بۆ سلێمان و پێی فەرموو: ئەهلی سەمەرقەند سکالاّیان کردووە لام لەو ستەم و چەوسانەوەیە کە لێیان کراوە لەلایەن قوتەیبەوە کە هێرشی کردۆتە سەریان و لەخاکی خۆیان دەری کردوون.

جا کاتێ ئەم نامەیەی منت پێ ئەگات دادوەرێکیان بۆ دابنێ تەماشای سکالاّیان بکات ئەگەر ڕاستیان کرد هەرکەس بچێتەوە شوێنی خۆی وەك پێش جەنگ و سەرکەوتنەکەی قوتەیبە.

سلێمانیش (جەمیعی کوڕی حاضر) ی کردە قازی، و ئەویش حوکمی‌دا کە ئەبێ عەرەبی سەمەرقەند بچنەوە شوێنی سوپاکەیان و دژایەتی‌یان بکەن، جا یا صوڵح بکەنەوە سەرلەنوێ یا سەرکەونەوە بەزۆر،

ئەهلی (سند) وتیان ئێمە بەو شێوەیە ڕازی ئەبین و جەنگ تازە ناکەینەوە، چونکە پیاوە ژیرەکانیان وتیان: ئێمە لەگەڵ ئەم کۆمەڵەدا تێکەڵ بووین و لەگەڵیان هەڵساوین و دانیشتوین و ئەمین بووین لێیان، و ئەوانیش ئەمین بوون لە ئێمە، جا ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ جەنگ، نازانین سەرکەوتن بۆ کێیە، جا ئەگەر سەرکەوتن بۆ ئێمە نەبوو، ئەوە دوژمنایەتی ئەهێنینەوە سەرخۆمان لەم بەریەرەکانی‌یەدا، ئیتر ڕازیان هێنا و ڕازی بوون بەوەی پێشوو دووای ئەوەی دادپەروەری ئیسلام و موسڵمانانیان بۆ دەرکەوت و زۆربەلایانەوە گەورە بوو، وە هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە بێنە ناو ئیسلامەوە بە ئیختیاری خۆیان.

وە ئەمە کردەوەیەکە هەتا ئێستا نازانین کەس گەیشتبێت پێی لە دادپەروەری‌دا.

## پاڕانەوە لە خوا لەکاتی جەنگدا:

لە ڕەووشتەکانی جەنگ ئەوەیە کە موجاهیدەکان پەنا بەرنە بەریەروەردگاری پاك و داوای یارمەتی و سەرکەوتنی لێ بکەن، چونکە سەرکەوتن تەنها بەدەست خوایە.

ئەوەش کاری پێغەمبەرو ﷺ صەحابەکانی بووە دووای خۆی

١- لەئەبوداودەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ثنتان لاتردان: الدعاء عند النداء، و عند البأس، حين يلحم بعضهم بعضاً)[1].

واتە: دووشت گەڕانەوەیان نییە: پاڕانەوە کاتی بانگدان، و پاڕانەوەی کاتی جەنگ ئەو کاتەی هەردوولا ئەدەن بەیەکدا.

٢- خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ﴾ (الأنفال:٩).

واتە: کاتێ هاوارتان ئەبرد بۆ پەروەردگارتان، ئەویش وەڵامی دانەوە و سەری خستن. (ئەمەش لە غەزادا بووە).

٣- سێ‌کان (لە زانایانی فەرمووده). ئەگێڕنەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ئەوفاوە کە پێغەمبەر ﷺ لە هەندێ لە جەنگەکانیدا کاتێ ئەگەیشت بە دوژمن ئەوەستا هەتا ڕۆژ لەکەل لای ئەدا، پاشان وتاری ئەدا و ئەیفەرموو: (أيها الناس: لاتتمنوا لقاء العدو، وسألوا الله العافية، فإذا لقيتموهم فاصبروا وأعلموا أن الجنة تحت ظلال السيوف).

واتە: موسڵمانینە تەمەنای گەیشتن بەدوژمن مەکەن، وە داوای سەلامەتی لەخوا بکەن، جا ئەگەر گەیشتن بە دوژمن ئارام گربن و بزانن بەهەشت لە ژێر سێبەری شمشێرەکاندایە.

لەپاشاندا ئەی فەرموو: (أللهم مُنَزِّلَ الكتاب، ومُجْرِيَ السحاب، وهازم الأحزاب، اهزمهم وأنصرنا عليهم)[2].

واتە: خوایە: ئەی نێرەرەخوارەوەی قورئان و لێخوڕی هەور، و تێك شکێنەری هەموو گروپەکان و حیزبەکانی کافر، ئەم دوژمنەمان بۆ تێك بشکێنە و سەرمان بخە بە سەریاندا.

٤- وە پێغەمبەر ﷺ لە پاڕانەوەکانی جەنگا ئەیفەرموو: (اللهم أنت عَضُدي ونصيري، بك أحول، وبك أصول، وبك أقاتل) رواه أصحاب السنن[3].

واتە: خوایە تۆ پشت و پەنای منی، بە تۆوە فێڵ لە دوژمن ئەکەم، وە بە تۆوە هەڵئەکوتمە سەریان و بە پشت و پەنای تۆ ئەجەنگم).

(١) إبن حبان (١٧٦١) والحاكم (١/١٩٨) ومالك موقوفاً (١/٧٠).

(٢) أحمد (٤/٣٥٣) والبخاري (٢٩٣٣) ومسلم (١٧٤٢/٢٠و٢١) وأبوداود (٢٦٣١).

(٣) أبوداود (٢٦٣٢) والترمذي (٣٥٧٨) والنسائي في الكبري (١٠٤٤) وابن حبان (٤٧٦١).

٥- بوخاری و موسلیم ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی جەنگی ئەحزاب ئەپاڕایەوەو ئەیفەرمو: (اللهم مُنَزِّلَ الكتاب ، سريع الحساب، أهزم الأحزاب، اللهم أهزمهم و زلزلهم)[1] .

واتە: خوایە ئەی دابەزێنەری قورئان، لێ پرسەرەوەی بە پەلە، ئەم گروپانە تێك بشکێنە، خوایە تێکیان بشکێنە، و ژێر پێیان بلەرزێنە.

## جەنگین (القتال)

ئیسلام گرنگی ئەدات بە بانگەواز کردنی جیهان بۆ چوونە ناو ئیسلام و ڕێنماییەکانی بۆ ئەوەی لە ژێر سایەی ڕێنماییەکانیدا خۆشگوزەران بن.

وە نەتەوەی ئیسلام ئەو نەتەوەیە کە لەلایەن خواوە هەڵبژێرراوە بۆ بەرزکردنەوەی ئاینەکەی و گەیاندنی وەحی خوا، وە هەروەها هەڵبژێرراوە بۆ ڕزگارکردنی گەل و نەتەوەکان.

بەوەش نەتەوەی ئیسلام چاکترین نەتەوەیە، وە پلەو پایەی لەناو نەتەوەکانی تردا وەك مامۆستا وایە بۆ قوتابییانی.

مادام بەو شێوەیە بێ لەسەر نەتەوەی ئیسلام واجبە قەبارەی ناوخۆیی خۆی بپارێزێ، وە تێبکۆشێت بۆ ئەوی مافی خۆی بستێنێتەوە بەدەستی خۆی، وە هەوڵ بدات ئەو شوێنە بگرێتەوە کە خوا بۆی داناوە، وە هەر درێغی کردنێك لەو بارەیەوە، بە تاوانێکی گەورە دائەنرێت کەخوا لە تۆڵەیدا سەرشۆڕ و زەلیلی ئەکات و لەناوی ئەبات.

جا ئیسلام لاوازی و بانگەوازی بۆ ئاشتی قەدەغە کردووە، کاتێ کە نەتەوە نەگەیشتبووە مەبەستەکانی و ئامانجەکانی بەجێ نەهاتبوو، وە ئاشتی لەم هەل و مەرجەدا بەبێ مانا داناوە و بە ترسنۆکی و ڕازی بوون بە نزمی و ڕیسوایی ژماردووە.

وە لەو بارەیەوە خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿فَلَا تَهِنُوا وَتَدْعُوا إِلَى السَّلْمِ وَأَنْتُمُ الْأَعْلَوْنَ وَاللَّهُ مَعَكُمْ وَلَنْ يَتِرَكُمْ أَعْمَالَكُمْ﴾ (محمد:٣٥) واتە: لاواز مەبن لە جیهادی بێ باوەڕان و بانگەوازی ئاشتی بکەن، لەکاتێکدا ئێوە سەرکەوتوون بەسەریانا، وە خوا لەگەڵتانایەو هیچ لەپاداشتی تێکۆشانتان کەم ناکاتەوە.

واتە ئێوە لەوان سەرکەوتووترن: لە ڕوی بیر و باوەڕ و خواپەرستی و ڕەوشت و ئەدەب و زانست و کردەوەوە.

---

(١) البخاري (٢٩٣٣) ومسلم (١٧٤٢).

ئەم ئایەتە دەری دەخات کە ئاشتی لە ئیسلامدا بێ هێز و توانا بەجێ نایەت.

لەبەر ئەوە خوای گەورە بە گشتی فەرمانی بە ئاشتی نەکردووە، بەڵکو بەستویەتی بەمەرجی ئەوەی کە دوژمن وازبهێنێ لەدوژمنکارییەکەی، وە بە مەرجی ئەوەی کە ستەم لەسەر زەویدا نەمێنێ و کەس بەزۆر لە ئاینی خۆی وەرنەگێڕرێت.

جا ئەگەر یەکێ لەو هۆیانە هەبوو، ئەوە خوا ڕێی جەنگ ئەدات بە باوەڕداران. وە ئەو جەنگەیە کە لاشە تێیدا بێ نرخەو ڕۆح و گیانەکان لە ڕێیدا ئەکرێنە قوربانی.

لەناو ئاینەکاندا ئاینێك نییە جگە لە ئیسلام پاڵ بە ئادەمیزادەکانییەوە بنێت بۆ جەنگ وەفرێیان بداتە گۆڕەپانی جەنگەوە لە ڕێگای خوا و ڕاستیدا و لە ڕێگای لاوازەکانی نەتەوەکەیدا، وە لەپێناوی ژیانێکی ئازاد و پیرۆزدا، وە هەرکەس بە باشی سەیری ئایەتەکانی قورئان و ژیاننامەی پێغەمبەر و هاوەڵەکانی بکات ئەوە بە ئاشکرا ئەیبینێ.

خوای گەورە ئەم نەتەوەیەوە هەڵئەبژێرێت کە ئەو پەڕی هەوڵ و کۆششی خۆی سەرف بکات لەو ڕێگایەدا، بۆیە ئەفەرمووێ: ﴿وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ﴾ (الحج:٧٨).

واتە: وە تێبکۆشن لەڕێی خوادا تێکۆشانێك شایستەی ئەو بێت.

وە ڕوونی کردۆتەوە کە ئەو تێکۆشانە باوەڕی کردەوەیییە، کە ئاینی بەوە نەبێت تەواو نابێت، وە ئەفەرمووێ: ﴿أَحَسِبَ النَّاسُ أَنْ يُتْرَكُوا أَنْ يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لا يُفْتَنُونَ (٢) وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ﴾ (العنكبوت:٣) واتە: ئایا خەڵك وا ئەزانن کە وتیان باوەڕمان هێنا، وازیان لێ ئەهێنرێت و تاقی ناکرێنەوە، وە بەڕاستی ئێمە ئەوانەی پێش ئەوانمان تاقیکردۆتەوە، جا خوا بە تەئکید ئەزانێ ئەوانەی ڕاستگۆن لە باوەڕەکەیاندا، وە ئەوانەش کە درۆ ئەکەن.

وە خوای گەورە ڕوونی کردۆتەوە کە ئەمە سوننەتی خوایە لەگەڵ باوەڕداراندا، وە بۆ سەرکەوتن و بەهەشت ڕێگایەکی ترمان نییە جگە لە تێکۆشان (جهاد)، خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَنْ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُمْ مَثَلُ الَّذِينَ خَلَوْا مِنْ قَبْلِكُمْ مَسَّتْهُمُ الْبَأْسَاءُ وَالضَّرَّاءُ وَزُلْزِلُوا حَتَّى يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ مَتَى نَصْرُ اللَّهِ أَلا إِنَّ نَصْرَ اللَّهِ قَرِيبٌ﴾ (البقرة:٢١٤) واتە: ئایا واتان زانیوە کە ئەچنە بەهەشتەوە لەکاتێکدا هێشتا ئەوەی تووشی ئەوەکانی پێش ئێوە بووە تووشی ئێوە نەهاتووە، کە ئەوان لە ڕێی خوادا تووشی ناخۆشی و زیان بوون و ژێر پێیان کەوتە لەرزە بە شێوەیەك پێغەمبەرەکەیان و ئەوانەی لەگەڵیا بوون ئەیان وت ئەم یارمەتییەی خوا کەی ئەبێت، ئاگادارین کە یارمەتی خوا نزیکە لەباوەڕدارانەوە.

وە ئەبێ کەرەسەی جەنگی ئامادە بکرێت و ئامادەیی وەربگیرێت، خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ﴾ (الأنفال:٦٠).

واتە: وە چەند لە توانا‌تانا هەبوو لە کەرەسەی جەنگی بۆیان ئامادە بکەن بۆ ئەوی دوژمنەکانی خوا و دوژمنەکانی خۆتانی پێ بتۆقێنن.

وە ئامادە کردنیش بەپێی بارو سەردەم ئەگۆڕێ و زاراوەی (القوة) لە ئایەتەکەدا هەموو ئەو ئامێرانە ئەگرێتەوە کەئەبنە هۆی شکاندنی دوژمن.

وە لەفەرموودەی صەحیح دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ألا إن القوة الرمي، ألا إن القوة الرمي، ألا إن القوة الرمي)[1].

واتە: بزانن کە هێز بەکارهێنانی چەکە، سێ جار.

وە هەروەها وەرگرتنی هوشیاری و سەربازگرتنیش، لەوانەی توانایان هەیە هەر لەئامادە کردنە.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا خُذُوا حِذْرَكُمْ فَانْفِرُوا ثُبَاتٍ أَوِ انْفِرُوا جَمِيعاً﴾ (النساء:٧١) واتە: ئەی ئەو کسانەی باوەڕتان هەیە، ئاگاداری خۆتان بن و بە جیا جیا یا بە کۆمەڵ بچن بۆ جەنگ.

وە ئاگا لەخۆبوون بە خۆئامادەکردنی دەریایی و زەمینی و ئاسمانی نەبێت نابێت،

وە خوای گەورە فەرمان ئەدات بە دەرچوون بۆ جەنگ دژی دوژمنانی خوا لەخۆشی و ناخۆشیدا، بە ئارەزو بێت یا بە زۆر، ئەفەرمووێ: ﴿انْفِرُوا خِفَافاً وَثِقَالاً﴾ (التوبة:٤١).

واتە: دەربچن بۆ جەنگ بە پیرو لاوەوە لەخۆشی و ناخۆشیداو لەهەر حاڵەتێکدا بن.

وە ئیسلام پشت بە گیانی مەعنەوی ئەبەستێت زۆرتر لەوەی کە پشت بەهێزی ماددی ئەبەستێ، هەربۆیە ورەو تواناکان ئەوروژێنێ و ئەفەرمووێ: ﴿فَلْيُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يَشْرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا بِالْآخِرَةِ وَمَنْ يُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيُقْتَلْ أَوْ يَغْلِبْ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْراً عَظِيماً (٧٤) وَمَا لَكُمْ لاَ تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَل لَنَا مِنْ لَدُنْكَ وَلِيّاً وَاجْعَل لَنَا مِنْ لَدُنْكَ نَصِيراً(٧٥)﴾ (النساء:٧٤ و٧٥) واتە: بابجەنگن لەرێی خوادا ئەوانەی ژیانی دونیایی ئەفرۆشن بە ژیانی رۆژی دواییو پاداشتەکەی، وە هەرکەس لە رێگای خوادا بجەنگێت و بکوژرێت یا بشکێت، لە پاشەرۆژدا پاداشتێکی گەرەی ئەدرێتەوە. ئەوە چی تانە ناجەنگن لە رێگای خوادا و لەپێناوی ئەو لاوازو بێ

(١) تەخریجی ئەم حەدیسە رابوورد.

دەسەڵاتانەی دەست درێژی کراوەتە سەریان لە مەککە لە ژن و پیاو و منداڵ، ئەوانەی ئەپاڕێنەوە و ئەڵێن: پەروەردگارمان لەودێیە دەرمان بهێنە کە خەڵکەکەی ستەمکارن، وە لەلایەن خۆتەوە سەرپەرشت و یاریدەدەرمان بۆ دابنێ کە یارمەتیمان بدات بۆ زاڵبوون بەسەر ستەمکارانا.

وە داوا لەباوەڕداران ئەکات کە ئارامگربن چونکە هەر چەندە ئەمان تووشی ئازار و ناڕەحەتی بێن دوژمنەکانیشیان هەر تووشی ئەبن، لەگەڵ دووری و جیاوازی مەبەست و ئامانجی هەریەکەیان، ئەفەرمووێ: ﴿وَلا تَهِنُوا فِي ابْتِغَاءِ الْقَوْمِ إِنْ تَكُونُوا تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ وَتَرْجُونَ مِنَ اللَّهِ مَا لا يَرْجُونَ﴾ (النساء:١٠٤).

واتە: تەمەڵی مەکەن لەشوێن کەوتنی دوژمن دا، ئەگەر ئێوە ئازارتان هەبێت بەهۆی برینەکاناتەوە ئەوانیش ئازاریان هەیە، بەڵام ئەوەی ئێوە ئومێدی ئەکەن لەپاداشت و سەرکەوتن و پشتگیری کردن، ئەوان هەر بە ئومێدی نین.

وە ئەفەرمووێ: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفاً﴾ (النساء:٧٦) واتە: باوەڕدارەکان لە ڕێگای خوادا ئەجەنگن و بێ باوەڕەکان لەپێناوی شەیتان و مل هوڕەکاندا، جا ئێوە ئەی باوەڕداران لەگەڵ دۆستانی شەیتان بجەنگن، وە مەترسن چونکە فێڵ و تەڵەکەی شەیتان لاوازە.

واتە: باوەڕدارەکان مەبەست و ئامانجێکی بەرزیان هەیە، هەروەها پەیامێکیان هەیە کە لە پێناویدا تێ ئەکۆشن، ئەویش نامەی ڕاستی و خێر و بەرزکردنەوەی ووشەی خوایە.

وە پێویستی ئەکات لەسەر موسڵمانان کە قایم و جێگیربن لە کاتی گەیشتن بەیەک لەگەڵ دوژمندا ئەفەرمووێ:

﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا زَحْفًا فَلاَ تُوَلُّوهُمُ الأَدْبَارَ(١٥) وَمَنْ يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُ إِلَّا مُتَحَرِّفاً لِقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزاً إِلَى فِئَةٍ فَقَدْ بَاءَ بِغَضَبٍ مِنَ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ (الأنفال:١٦) واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، کاتێ گەیشتن بە دوژمن و جەنگین پشتیان تێ مەکەن ، وە هەرکەس لەو کاتەدا پشت بکاتە دوژمن بە فێڵ و تەڵەکەی جەنگی نەبێت یا بۆ ئەوەی بچێتە پاڵ کۆمەڵێك لە سوپای ئیسلام، ئەوە دووچاری ڕق و تووڕەیی خوا ئەبێت و جێگاشی جەهەننەم و پاشەڕۆژی خراپ ئەبێت.

وە خوا ڕێنمایی‌مان ئەکات بۆ هێزی (معنوي) ئەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُوا وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيراً لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (٤٥) وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا

وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ وَاصْبِرُوا إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ (الأنفال:٤٦) واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر گەیشتن بە کۆمەڵێك لە بێباوەڕان کە ئامادە بوون جەنگتان لەگەڵ بکەن، جێگیربن و ڕامەکەن لێیان، وە یادی خوا زۆر بکەن، بە ئومێدی ئەوەی سەرکەوتووبن، وە مل کەچی فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەرەکەی بن و ئاژاوە و ناکۆکی نەکەوێتە ناوتانەوە لاواز ببن و هێزو سەرکەوتنتان بڕوا، وە ئارام بگرن، چونکە خوا لەگەڵ ئارام گراندایە.

وە خوا نەفسیەت و باری دەروونی باوەڕداران دەرئەخات کە تەنها ڕێگای ئەوەیە خۆی بدات بە کوشت لە پێناوی پاراستنی ئایینەکەیدا، چونکە ئەوان لەنێوان دووشت دان کە سێیەمی نی یە، یا بکوژن یا بکوژرێن ئەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنْفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيَقْتُلُونَ وَيُقْتَلُونَ وَعْداً عَلَيْهِ حَقّاً فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ وَالْقُرْآنِ وَمَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ مِنَ اللَّهِ فَاسْتَبْشِرُوا بِبَيْعِكُمُ الَّذِي بَايَعْتُمْ بِهِ وَذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ (التوبة:١١١) واتە: بەڕاستی خوای گەورە گیان و ماڵی کڕیوە لەباوەڕداران، بەوەی کە بەهەشتیان پێ ببەخشێ، بەوەی بجەنگن لە ڕێگای خوادا جا بکوژن و بکوژرێن، ئەمە پەیمانێکی ڕاستە لە خواوە کە لەتەورات و ئینجیلیشدا ئەو پەیمانەی داوە، جا کێ هەیە لەخوا چاکتر پەیمانی بەجێ بهێنێ، ئەی باوەڕداران دڵخۆش بن بەو مامەڵەیە کە کردوتانە، وە ئەوەیە سەرکەوتنی گەورە.

جا لەحاڵەتی یەکەمدا سەرکەوتن بۆ ئەوانە، وە لەحاڵەتی دووەمدا شەهید بوون: ﴿قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَا إِلَّا إِحْدَى الْحُسْنَيَيْنِ﴾ (التوبة:٥٢).

واتە: بڵێ -ئەی محمد- چاوەڕێ ئەکەن لێمان بێجگە لە شەهید بوون و سەرکەوتن؟

وە بەڕاستی کوژران لە ڕێگەی خوادا مردنێکی هەمیشەیی نی یە، بەڵکو گوێزانەوەیەکە بۆ شتێکی بەرزترو بە بەردەوامتر، وە لەناو چوون لەڕێی خوادا خودی مانەوەیە، خوا ئەفەرمووێ: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتاً بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ (١٦٩) فَرِحِينَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا بِهِمْ مِنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (١٧٠) يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ (آل عمران:١٦٩-١٧١) واتە: وامەزانن ئەوانەی لە ڕێگای خوادا گیانیان لەدەست داوە مردوون، بەڵکو لای پەروەردگاریان ژیان بەسەر ئەبەن و ڕۆزی ئەدرێن، دڵخۆشن بەوەی خوا بەفەزڵی خۆی پێی بەخشیون، وە مژدەی خۆشی ئەدەن بەوانەی لەدوایانەوەن و هێشتا پێیان نەگەیشتوون، کە ئەوان بێترس و بێ غەم ئەبن، وە شادمان ئەبن بەهۆی ئەو نیعمەت و بەخششەی کە لەخواوە پێیان دراوە، وە بەڕاستی خوا پاداشتی باوەڕدران وون ناکات.

وە خوا هەمیشە لەگەڵ تێکۆشەرەکانە و هەرگیز وازیان لێ ناهێنێ هەرگیز.

﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلائِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ فَاضْرِبُوا فَوْقَ الْأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ﴾ (الأنفال:١٢)

واتە: کاتێ پەروەردگارت وەحی نارد بۆ ئەو فریشتانەی کە یارمەتی موسوڵمانانی پێ دان لەجەنگی بەدردا، کە من لەگەڵتانم، ورەی باوەڕداران بەهێز بکەن، وە من ترس ئەخەمە دڵی ئەوانەی بێ باوەڕن، ئێوەش -ئەی بڕواداران- لەسەرو گەردنی بێ باوەڕان و لەهەموو سەرەپەنجەکانیان بدەن.

پاشان خوای پاك و بێ گەرد لەسەر ئەوە بەڵێنی پاداشتی دونیا، وە پاداشتی جوانی ئاخیرەتیان پێ ئەدات، وە ئەفەرمووێ:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى تِجَارَةٍ تُنْجِيكُمْ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ (١٠) تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ (١١) يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ (١٢) وَأُخْرَى تُحِبُّونَهَا نَصْرٌ مِنَ اللَّهِ وَفَتْحٌ قَرِيبٌ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ (الصف:١٣) واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ئایا ڕێنماییتان بکەم بۆ بازرگانییەك کە ڕزگارتان بکات لە سزای توند و بە ئازار؟ ئەویش ئەوەیە کە بەردەوام باوەڕتان بەخوا و پێغەمبەرکەی هەبێت و تێبکۆشن لەرێگای خواداو بۆ سەرکەوتنی دینی خوا بە سامان و گیانتان، ئەوە چاکترە بۆتان لە بازرگانی دنیا، ئەگەر بزانن، جا کە ئەوەتان کرد خوای گەورە لەتاوانتان ئەبورێ، و ئەتانخاتە بەهەشتێك کە بە ژێر باخەکانیا ڕووبار ئەڕوات و شوێنی چاکتان ئەداتێ لە بەهەشتی عەدنا، ئا ئەوەیە بردنەوەی گەورە، وە نیعمەتێکی تریش کە حەزی پی ئەکەن ئەویش سەرکەوتنە لە خواوە و فەتحی نزیکە، وە مژدە بدە بە باوەڕداران .

بەم چەشنە قورئان موسوڵمانانی یەکەمینی پەروەردەکردووە، وە لەدەروونیاندا باوەڕێکی دروست کردووە کە دادوەر بووە لەنێوان حەق و باتڵدا، وە ڕای پەڕاندوون بەرەو سەرکەوتن و فەتح و جێ گیربوون لەزەویدا: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ تَنْصُرُوا اللَّهَ يَنْصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ﴾ (محمد:٧) واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر یارمەتی دینی خوا بدەن، خوا سەرتان ئەخات و قاچتان قایم و جێگیر ئەکات لە جەنگدا.

﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْناً يَعْبُدُونَنِي لا

يُشْرِكُونَ بِي شَيْئاً﴾ (النور:٥٥) واته: خوا بەڵێنی داوه بەوانەی باوەڕیان هێناوه و کردەوەی چاك ئەکەن، که زەوی موشریکەکان بکات به میراتی بۆیان و بیان کاته جێ نشین تێیدا، وەك چۆن ئەوانەی پێش ئەوانی جێ نشین کردووه، وه خوا ئەو ئاینەی که خۆی پێی ڕازییه بۆیان جێگیر و بەهێز ئەکات، وه ترسەکەیان بۆ ئەگۆڕێ به هێمنی و ئاسایش، ئەگەر تەنها خوا بپەرستن و هیچ نەکەن به هاوبەشی.

### واجبێتی سابت بوون لەکاتی هێرش بردندا

پێویسته موسڵمانان قایم و جێگیر بن کاتی گەیشتن به دوژمن، وه هەڵاتن حەرامه لەسەریان.

خوای گەوره ئەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُوا وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيراً لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ (الأنفال:٤٥) واته: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوه کاتێ گەیشتن بەکۆمەڵێك له بێباوەڕان، قایم و پتەوبن و یادی خوا زۆر بکەن به ئومێدی ئەوەی سەرکەون.

وه خوای گەوره ئەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا زَحْفاً فَلا تُوَلُّوهُمُ الْأَدْبَارَ (١٥) وَمَنْ يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُ إِلَّا مُتَحَرِّفاً لِقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزاً إِلَى فِئَةٍ فَقَدْ بَاءَ بِغَضَبٍ مِنَ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ (الأنفال:١٦) واته: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوه کاتێ گەیشتن به بێباوەڕان پشتیان تێمەکەن، وه هەرکەس پشتیان تێ بکات، بۆ فێڵی جەنگی یا بۆ چوونه پاڵ کۆمەڵێ جەنگاوەریتر نەبێت، ئەوه شیاوی ڕق و توڕەیی خوا ئەبێت و جێگاشی جەهەننەم و خراپترین چارەنوسه.

وه ئایەتەکه سابت بوون به پێویست دائەنێ و هەڵاتن حەرام ئەکات، له دوو حاڵەتا نەبێت که پشت کردنه دوژمن دروسته.

حاڵەتی یەکەم:

ئەوەیه لەلایەکی جەنگەکەوه بچێته لایەکیتر بەپێی پێویست، چونکه بۆی هەیه له شوێنی تەنگدا بچێته شوێنی بەرفراون، یا لەشوێنێکی بینراوەوه بۆ شوێنێکی نادیار، یا لەلای خوارەوه بچێته لای سەرەوه ئیتر بەو پێیه چۆن چاکتر بێت بۆی له گۆڕەپانی شەڕەکەدا.

حاڵەتی دووەم:

بچێت بۆلای کۆمەڵێك جەنگاوەریتر، یارمەتییان بدات یاپەنایان بۆ ببات کەیارمەتی بدەن، ئەو کۆمەڵە جەنگاوەره نزیك بێت یا دوور.

سەعیدی کوڕی مەنصور ئەگێڕێتەوە: کە عومەر خوای لێ ڕازی بێت فەرموویەتی: ئەگەر ئەبو عوبەیدە هەڵبهاتایە بۆلام من ئەبومە کۆمەڵ بۆی، ئەبو عوبەیدە لە عێراق بووە عومەریش لەمەدینە!

هەروەها عومەر فەرموویەتی: (أنا فئة كل مسلم).

واتە: من ئەو کۆمەڵەم کە قورئان باسی ئەکات بۆ هەموو موسڵمانێك،

وە ئیبنو عومەر خوایان لێ ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە، کە ئەوان هاتن بەرەو ڕووی پێغەمبەر ﷺ پێش نوێژی بەیانی کاتێ لەماڵ هاتە دەرەوە بۆ نوێژ -وە ئەوان لەدوژمن هەڵاتبوون﴾ و وتیان ئێمە هەڵهاتووین،

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بل أنتم العكارون، أنا فئة كل مسلم)[1].

واتە: بەڵکو ئێوە ئەتانەوی هێرش ببەنەوە سەر دوژمنەکەتان، وە من فیئە و کۆمەڵی هەموو موسڵمانێکم (واتە من ئەو کۆمەڵەم کە خوا ئیزنی داوە بچن بۆلای و پشت لەجەنگەکە بکەن لەو کاتەدا).

لەو دوو شێوەیەدا کە باسکران: دروستە بۆ جەنگاوەر لەدوژمن ڕابکات، وە ئەوە هەرچەندە بەرواڵەت ڕاکردنە بەڵام لەڕاستیدا هەوڵ دانێکە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی چاکتر بۆ بەرەنگاری دوژمن، وە جگە لەم دوو شێوەیە هەڵاتن لە دوژمن گوناهێکە لە گوناهەگەورەکان کە سزای توند و تیژ پێویست ئەکات.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إجتنبوا السبع الموبقات).

واتە: خۆتان بپارێزن لەحەوت تاوانە لەناوبەرەکان.

وتیان: ئەو حەوت تاوانە چییە ئەی نێرراوی خوا؟

فەرمووی: (الشرك بالله، والسحر، وقتل النفس التي حرم الله، وأكل الربا، وأكل مال اليتيم، والتولي يوم الزحف، وقذف المحصنات المؤمنات الغافلات)[2].

---

(١) أحمد (٢/٨٦،٧٠) وأبوداود (٢٦٤٧) والترمذي (١٧١٦).

(٢) البخاري (٢٧٦٦) ومسلم (٧٩).

واتە: هاوبەش بۆ خوادانان، جادوو کردن،، کوشتنی کەسێك کە خوا حەرامی کردووە، سوود خواردن، خواردنیماڵی هەتیو بەناهەق، هەڵاتن لەدوژمن ڕۆژی جەنگ، تاوانی داوێن پیسی دانە پاڵ ئافرەتانی موسڵمانی بێئاگا).

**درۆکردن و هەڵخەڵەتاندن لەکاتی جەنگدا:**

دروستە لەکاتی جەنگدا هەڵخەڵەتاندن و درۆکردن بۆ سەرلێشێواندنی دوژمن، بە مەرجێ ئەو کارە پەیمان هەڵوەشاندنەوە و تێك دانی ئەمان نەبێت.

لەو هەڵخەڵەتاندنە ئەوەیە کە سەرکردەی سوپا دوژمن فریو بدات و وەهای دەربخات کە ژمارەی سەربازەکانی زۆرن و بەتوانا و پڕ چەك و کەرەسەی جەنگن بەجۆرێك تێك ناشکێن

وە لەو فەرمودەیەدا هاتووە کە بوخاری لە جابیرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الحرب خدعة)[1] واتە: جەنگ هەڵخەڵەتاندنە.

وە موسلیم تەخریجی کردووە لەحەدیسی ئوممو کلثومی کچی عوقبەوە خوا لیی ڕازی بێت کە فەرموویەتی: هەرگیز گوێم لە پێغەمبەرﷺ نەبوو لەهیچ شتێکدا ڕێ بدات درۆ بکرێت جگە لەکاتی جەنگ و چاککردنی نێوان خەڵك، و قسەی پیاو بۆ ژنەکەی، و قسەی ژن بۆ مێردەکەی)[2].

**هەڵهاتن کاتێ دوژمن دوو بەرامبەر بوو.**

لەپێشەوە باسکرا کە حەرامە هەڵاتن کاتی جەنگ لەدوو شێوەدا نەبێت: (شوێن گۆڕین، یا لایەنگیری کۆمەڵێکی تر).

ماوەتەوە بڵێین : کە دروستە جەنگاوەر ڕابکات ئەگەر هاتوو دوژمن لەدوو ئەوەندەی خۆیان زیاتر بوون، بەڵام ئەگەر دوو ئەوەندە، یان کەمتر بوو، حەرامە هەڵاتن لەدەست دوژمن، خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿الْآنَ خَفَّفَ اللَّهُ عَنْكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفاً فَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ مِائَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ وَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوا أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ (الأنفال:٦٦) واتە: ئائێستا خوا لەسەری سووك کردن و زانی کە لاوازیتان تێدایە، جا ئەگەر سەدکەسی ئارامگر لەئێوە بن سەرئەکەون بەسەر دووسەد کەس لەبێ باوەڕاندا، وە ئەگەر هەزار لە ئێوە بن، سەرئەکەون بەسەر دوو هەزار بێ باوەڕدا بە ئیزنی خوا، وە خوا لەگەڵ ئارام گراندایە.

---

(١) البخاري (٣٠٣٠) ومسلم (١٧٣٩/١٧).

(٢) أحمد (٦/٤٠٣) ومسلم (٢٦٠٥/١٠١) وأبوداود (٤٩٢١).

لە کتێبی (المهذب)دا هاتووە: ئەگەر ژمارەی بێ بڕوایان لە دوو ئەوەندەی موسڵمانەکان زیاتر بوو، دروستە هەڵهاتن لێیان، وە ئەگەر ئەیان زانی کە دوژمن لەناویان نابات واچاکترە چەسپاو بن، بەڵام ئەگەر گومانی لەناو چوونیان هەبوو دوو ڕووی هەیە:

یەکەم: ئەبێ دوژمن بەجێ بهێڵن، بە پێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾ (البقرة:١٩٥).

واتە: بەدەستی خۆتان خۆتان مەخەنە تالوکە و لەناوچوونەوە.

دووەم: هەڵاتن پەسەندە نەك واجب، چونکە ئەگەر کوژران شەهادەتیان دەست ئەکەوێت.

بەڵام ئەگەر ژمارەی بێباوەڕان لە دوو ئەوەندەی موسڵمانان زیاتر نەبوو، ئەگەر گومانی لەناو چونیان نەبوو هەڵاتن دروست نیەیە، بەڵام ئەگەر گومانیان هەبوو دوو ڕووی هەیە:

یەکەم: هەڵاتن دروستە بە پێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾

دووەم: دروست نیەیە،

وە بەپێی ڕواڵەتی ئایەتەکە یەکەم بە ڕاست دانراوە.

حاکم ئەڵێت: ئەو کارە ئەگەڕێتەوە بۆ گومانی جەنگاوەرەکە و ئیجتیهادەکەی، جا ئەگەر زانی ئەتوانێ بەرهەڵستی بکات هەڵاتن ڕەوا نیەیە، بەڵام ئەگەر گومانی لەناو چوونی هەبوو، ئەوە دروستە هەڵبێت بۆ لای کۆمەڵێك، با دووریش بێت، ئەگەر مەبەستی وازهێنان لە جیهاد کردن نەبێت.

ئیبنو ماجیشون بۆ ئەوە چووە، وە لەمالیکیشەوە ئەگێڕێتەوە کە: لاوازی لەهێزدایە نەك لەژمارەدا، بۆیە دروستە تەنها کەسێك لەتەنها کەسێکی بێباوەڕ هەڵبێت ئەگەر ئەسپی باشترو چەکی چاکتری پێ بێت، وە لەویش زۆر بە هێزتر بێ ئەمەش ڕاسترە و ئاشکراترە.

## میهرەبانی لەکاتی جەنگدا

هەرچەندە ئیسلام جەنگی ڕەوا کردووە وەك پێویستییەك لە پێویستەکان، بەڵام ئەندازەی بۆ ئەو جەنگە داناوە، جا نابێت هەرکەسێك جەنگاوەری بەرەی جەنگ نەبێت بکوژرێت، بەڵام ئەو جەنگاوەرەی بەشداری جەنگی نەکردبێت ڕەوا نیەیە کوشتنی و بەگژداهاتنی بەهیچ جۆرێك.

وە هەروەها ئیسلام کوشتنی ئافرەت و منداڵ و نەخۆش و پیر و ڕوهبان و خوا پەرست و بەکرێ گیراوی حەرام کردووە، وە هەروەها ئەتك کردن و کوشتنی ئاژەڵ و خراپکردنی دەغڵ و دان و سەرچاوەی ئاو و پیس کردنی بیرەکان و خانوو ڕوخاندنی حەرام کردووە.

وە حەرامی کردووە هەڵکوتانە سەر بریندارو شوێن کەوتنی هەڵاتووان، چونکە جەنگ وەك نەشتەرگەری‌یەکە، کە نابێت لەشوێنی نەخۆشی‌یەکە تێپەڕ بێت.

لەو بارەیەوە سولەیمانی کوڕی بوڕەیدە لە باوکی‌یەوە ئەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ ئەگەر کەسێکی بکردایە بەسەرکردەی سوپایەك یا لقێك، ئامۆژگاری خۆی ئەکرد بە تایبەتی کە لەخوا بترسێ، وە ئامۆژگاری ئەوانەی ئەکرد کە لەگەڵیان چاکە بکەن، لە پاشاندا ئەی فەرموو:

(أغزوا باسم الله، في سبيل الله، قاتلوا من كفر بالله، أغزوا ولاتغلوا، ولاتغدروا، ولاتمثلوا، ولاتقتلوا وليداً)[1].

واتە: بەناوی خواوە، لە ڕێگای خوادا بچنە غەزا کردن، بجەنگن لەگەڵ ئەوانەدا کە باوەڕیان بەخوا نی‌یە، و بجەنگن و دزی لەغەنیمەت مەکەن، وە غەدر مەکەن و کەس ئەتك مەکەن و منداڵ مەکوژن،

نافع لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ئەگێڕێتەوە کە لەیەکێك لەجەنگەکانی پێغەمبەردا ﷺ ئافرەتێك بەکوژراوی بینرا، پێغەمبەر ﷺ زۆری لا ناخۆش بوو، وە ژن و منداڵ کوشتنی قەدەغە کرد. موسلیم گێڕاویەتی‌یەوە[2].

وە ڕەباحی کوڕی ڕەبیع ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لەیەکێ لەغەزاکاندا بەلای ئافرەتێکی کوژراودا تێپەڕی، وە لەوانەیە هەر ئەو ئافرەتە بێت کە لەحەدیسەکەی پێشوودا باسکرا. بەسەریەوە وەستا، پاشان فەرمووی: (ماكانت هذه لتقاتل)

واتە: ئەوە نەئەبوو بکوژرایە.

لەپاشاندا ڕووی کردە یارەکانی و بە یەکێکیانی فەرموو:

(إلحق بخالد بن الوليد: فلايقتلن ذرية، ولاعيسفاً، ولاامرأة)[3].

واتە: بگە بەخالیدی کوڕی وەلید، با منداڵ و کرێ گرتە و ئافرەت نەکوژێت.

وە لە عەبدوڵڵای کوڕی زەیدەوە کە فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ تاڵانی و ئەتك کردنی لێ قەدەغە کردووین، بوخاری گێڕاویەتی‌یەوە[1].

---

(١) أحمد (٥/٣٥٢) ومسلم (٣/١٧٣١) والترمذي (١٦١٧) وابن ماجة (٢٨٥٨).

(٢) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابوورد.

(٣) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابوورد.

عیمرانی کوڕی حوصەین فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ هانی ئەداین بۆ چاکەکردن وئەتك کردنی لێ قەدەغە کردوین[2].

وە لەڕاسپاردەکەی ئەبو بەکر خوا لێی ڕازی بێت بۆ ئوسامەی کوڕی زەید کاتێ بە سوپاکەیەوە ناردی بۆ شام:

خیانەت مەکەن و لەغەنیمەت مەدزن و غەدرمەکەن، و کەس ئەتك مەکەن، ومندالّی بچووك و پیری پەك کەوتە و ئافرەت مەکوژن، وە داری خورما مەبڕن و مەی سوتێنن، وە مەڕ و مانگا و ووشتر مەکوژن بۆ خواردن نەبێت، وە لەداهاتوودا بەلای هەندێ کەسدا تێ ئەپەڕن کە خۆیان تەرخان کردووە بۆ خواپەرستی لە پەرستگاکاندا، جا وازیان لێ بێنن لەوەی خۆیان بۆ تەرخان کردووە. (مەبەستی ڕاهیبەکان بووە).

وە هەروەها گەورەی موسڵمانان عومەری کوڕی خەططاب بەو شێوەیە ئەجولایەوە، وە لەنامەکەیدا هاتووە: دزی لەغەنیمەت مەکەن، و غەدرمەکەن، و مندالّ مەکوژن، و لەخوا بترسن بەرامبەر جوتیاران، وە لە ڕاسپاردەکانی بۆ سەرکردەی سوپاکان: پیاوی پیری پەك کەوتە مەکوژن، وە ژن و منالّ مەکوژن، وە خۆتان لە کوشتنیان بپارێزن کاتێ هەردوولا بەیەکدا ئەدەن، و کاتی هێرش و پەلاماردان.

### هێرش بردنە سەر دوژمن بەشەو

دروستە بەشەو پەلامار و هێرش بکرێتە سەر دوژمن.

ترمذی وتوویەتی: هەندێ لە زانایان ڕێیان پێداوە و هەندێکیان بە خراپیان داناوە.

ئەحمەد و ئیسحاق ووتوویانە: قەیناکە بە شەو پەلاماری دوژمن بدرێت.

وە پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا دەربارەی بێ باوەڕەکان کە لەشوێنەکانیاندا بەشەو هێرش بکرێتە سەریان، جا ژن و مندالّیان بەر ئەو هێرشە بکەون، ئەویش فەرمووی: (هم منهم) ئەوانیش هەر لەوانن. بوخاری و موسلیم لە حدیسی صەعبی کوڕی جوسامەوە گێڕاویانەتەوە[3].

شافیعی فەرموویەتی: قەدەغە کردنی کوشتنی ژن و مندالّیان بۆ کاتێکە کە ژن و مندالّ لە جەنگاوەر جیا بکرێتەوە. بەلام بەشەو هێرش بردن دروستە با ژن و مندالّیشیان بەرکەوێ.

---

(1) البخاري (٢٧٧٤).

(2) أبوداود (٢٦٦٧).

(3) بخاري (٣٠١٢) مسلم (١٧٤٥/٢٦).

## کۆتایی هاتنی جەنگ

جەنگ بە یەکێ لەمانەی خوارەوە کۆتایی دێت:

١- موسوڵمان بوونی جەنگاوەرەکان، یا موسڵمان بوونی هەندێکیان و چوونیان بۆ ناو ئاینی ئیسلام، لەم حاڵەتەدا ئەوانیش وەك موسڵمانانیان لێدێت، و موسڵمان چی مافێکی بۆ هەیە بۆ ئەوانیش هەیە، وە چی لەسەر موسوڵمان پێویستە لەسەر ئەوانیش پێویست ئەبێت.

٢- داوای وەستانی جەنگ بۆ ماوەیەکی دیاری کراو لەلایەن دوژمنەوە، لەم کاتەدا پێویستە وەڵامی داواکەیان بدرێتەوە، وەك پێغەمبەر ﷺ کردی لە ڕێکەوتنی حودەیبیەدا.

٣- حەز بکەن لەسەر ئاینەکەیان بمێننەوە و سەرانە بدەن.

بەو پێیە پەیمانی (ذمة) لەنێوان موسڵمانان و ئەواندا ئەبەسترێت .

٤- شکاندنی لەشکریان، و سەرکەوتن و زاڵ بوونمان بەسەریاندا، وە بەو سەرکەوتنە ئەبنە غەنیمەت بۆ موسڵمانان.

٥- جاری وا ئەبێت هەندێ لەجەنگاوەرانی دوژمن داوای ئەمان ئەکەن، جا وەڵامی داواکەیان ئەدرێتەوە، وە هەروەها ئەگەر داوایان کرد بچنە ناو خاکی موسڵمانانەوە.

وە لەوێوە ئێمە بە کورتی باسی ئەمانەی خوارەوە ئەکەین:

١- پەیمانی شەڕ وەستاندن (عقد الهدنة والموادعة).

٢- پەیمانی زەمانەت و متمانە (عقد الذمة).

٣- غەنیمەت.

٤- پەیمانی دڵنیایی (عقد الأمان).

## ڕێکەوتن (الهدنة)

چ کاتێك ڕێکەوتن و ئاشت بوونەوە پێویست ئەبێت:

پەیمانی ڕێکەوتن و ئاشت بوونەوە ڕێکەوتنێکە لەسەر وازهێنان لە جەنگ بۆ ماوەیەك، کە جاری وا هەیە بە صوڵح و ئاشتی کۆتایی دێت، وە لەدوو حاڵەتا پێویست ئەبێ:

حاڵەتی یەکەم: ئەگەر دوژمن داوای وەستانی جەنگی کرد، ئەوە لەو کاتەدا وەڵامی داواکەی دوژمن ئەدرێتەوە با مەبەستیشی فرو فێڵ بێت، بەڵام ئەبێ موسڵمانان هۆشیار و ئامادەبن، خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَإِنْ جَنَحُوا لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ (٦١)

وَإِنْ يُرِيدُوا أَنْ يَخْدَعُوكَ فَإِنَّ حَسْبَكَ اللَّهُ﴾ (الأنفال:٦٢) واتە: ئەگەر مەیلیان کرد بۆ ئاشتی، تۆش مەیل بکەو پشت بەخوا ببستە، چونکە هەر ئەو بیسەر و زانایە، وە ئەگەر بیانەوێت هەڵت بخەڵەتێنن ئەوە تۆ خوات بەسە.

لەغەزای حودەیبیەدا پێغەمبەر ﷺ هودنەی لەگەڵ بێ باوەڕانی مەککەدا بەست، وە پەیمانی پێدان ماوەی دە ساڵ جەنگ نەکرێت، مەبەستی ئەوە بوو خوێن نەڕژێ و حەزی لەئاشتی ئەکرد.

لەبەڕائەوە خوای لێ ڕازی بێ فەرموویەتی: کاتێ پێغەمبەر ﷺ بەری لێ گیرا و نەیان هێشت بچێتە مەککە، ئەهلی مەککە ڕێك کەوتن لەگەڵیا کە بچێتە ناو مەککە و سێ ڕۆژ تێیدا بمێنێتەوە، وە نابێ چەکیان پێ بێت لەشمشێرو کالان بەولاوە، وە نابێ کەسیش لە خزمانی خۆی لەشاری مەککە دەربکات، و نابێت ڕێی کەسیش بگرێت کە لەگەڵیا بووە ئەگەر بیەوێت لەمەککەدا بمێنێتەوە، پێغەمبەر ﷺ بە عەلی فەرموو: مەرجەکە بنووسە لەنێوانماندا:

بسم الله الرحمن الرحیم: ئەمە ئەو پەیمانەیە کە موحەممەد نێرراوی خوا لەسەری ڕێك کەوتووە.

بێ باوەڕەکان ووتیان : ئەگەر ئێمە بمان زانیایە تۆ نێرراوی خوای شوێنت ئەکەوتین، بەڵکو بنووسە: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی کرد بە عەلی بیسڕێتەوە، ئەویش فەرموی: نا سوێند بەخوا نایسڕمەوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: شوێنەکەم نیشان بدە، ئەویش نیشانیدا خۆی سڕییەوە.

ئیتر نووسی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵا، ئینجا سێ ڕۆژ لەمەککەدا مایەوە، ڕۆژی سێیەم بە عەلییان وت: ئەمە دووا ڕۆژی مەرجەکەی هاوەڵەکەتە؛ پێی بڵێ با بڕواتە دەر، عەلیش پێی ڕاگەیاند پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئیتر دەرچوو[1].

لە میسوەری کوڕی مەخرەمەوە خوا لێی ڕازی بێت کە: ڕێکەوتن هەتا دەساڵ جەنگ لە نێوانیاندا روونەدات، و خەڵك بە ئاسایش بژی لەو ماوەیەدا و لەنێوانماندا پەیمانێکی توند و پتەو هەبێت، و لەنێوانماندا نە دزی و نە ناپاکی و نە خیانەت نەبێت. بوخاری و موسلیم و ئەبو داود گێڕاویانەتەوە[2].

---

(١) مسلم (١٧٨٣).

(٢) أحمد (٤/٣٢٨) وأبوداود (٢٧٦٦).

حاڵەتی دووەم: کە جەنگ وەستانی تێدا پێویست بێت مانگە حەرامەکانە، چونکە دروست نی‌یە لەو مانگانەدا دەست بە جەنگ کردن، کە ئەوانیش (ذو القعدة، ذو الحجة، محرم، و رجب)ن.

بەڵام ئەگەر دوژمن لەو مانگانەدا دەستی کرد بەشەڕ ئەو کاتە جەنگین پێویستە بۆ پاراستنی گیانی خۆیان.

وە هەروەها جەنگ لەم مانگانەدا ڕەوایە ئەگەر شەڕەکە لەوەو پێش دەستی پێ‌کردبێت، و دوژمن وەڵامی نەدابێتەوە بۆ صولح و جەنگ وەستاندن لەو مانگانەدا، خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿إِنَّ عِدَّةَ الشُّهُورِ عِنْدَ اللَّهِ اثْنَا عَشَرَ شَهْراً فِي كِتَابِ اللَّهِ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ فَلا تَظْلِمُوا فِيهِنَّ أَنْفُسَكُمْ﴾ (التوبة:٣٦).

واتە: ژمارەی مانگەکانی ساڵی قەمەری لای خوا کە دایناوە لەوکاتەوە کەئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە دوانزە مانگە، چواریان جەنگی تێدا حەرام کراوە، ئائەوەیە ئایینی ڕاست، جا ئێوە لەو مانگانەدا ستەم لەخۆتان مەکەن بەوەی تاوانیان تێدا بکەن.

وە پێغەمبەر ﷺ لە ووتاری ماڵ ئاوایی‌کەیدا ووتاریدا و فەرمووی: ئەی خەڵکینە گۆڕینی جێگای مانگە حەرامەکان و دواخستنی هەندێکیان یان پێش خستنیان و دانانی مانگەکانی تر لەجێگایان، زیادکردنێکە بۆ بێ‌باوەڕی، شەیتان ئەوانەی پێ گومڕا ئەکات کە باوەڕیان نەهێناوە، کە بە ئارەزووی خۆیان ساڵێك ئەیانکەنە مانگی حەڵاڵ و ساڵێك مانگی حەرام، بۆ ئەوەی ژمارەی مانگە حەرامەکان ڕێك بخەن و ئەو شتانەی خوا لەو مانگانەدا حەرامی کردووە ڕەوای بکەن.

وە زەمانە وەك خۆی گەڕایەوە وەك ئەو کاتەی خوا ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە و مانگەکان چونەوە شوێنی خۆیان بەهاتنی ئاینی ئیسلام کە چوار مانگیان بە دووای یەکدا دێن و ئەوی تریان تاکە ئەوانیش، ذو القعدة و ذو الحجة و موحەڕڕەم و ڕەجەبن، ئەویش ئەو مانگەیە کە لەنێوان جمادا و شەعباندایە ئایا پێم ڕاگەیاندن؟

خوایە تۆ خۆت شایەت بە (اللهم فشهد)[1].

وە ئەوەی هاتووە کە ئەوە نسخ بۆتەوە، لاوازە چونکە بەڵگەیەکی تێدا نی‌یە ببێتە بەڵگەی سڕانەوە.

---

(١) البخاري (١٠٥) ومسلم (١٦٧٩/٢٩و٣٠و٣١).

## پەیمانی زەمانەت و متمانە (عقد الذمة)

(ذمة) پەیمان و ئەمانە:

وە عەقدی زیممە ئەوەیە کە حاکم یا جێگرەکەی بڕیار بدەن کە هەندێ لە خاوەن کتێبە ئاسمانییەکانە- یا کسانی بێباوەڕی تر – لەسەر ئاینی خۆیان بمێننەوە بە دوو مەرج:

مەرجی یەکەم:

پابەند بە حوکمەکانی ئیسلام بن بە گشتی.

مەرجی دوەم:

سەرانە بدەن بە موسڵمانان.

وە ئەم پەیمانە ئەو کسە ئەگرێتەوە کە بەستویەتی، مادام زیندو بێت، وە نەوەکەشی لەدووای خۆی.

بنەمای ئەم پەیمانەش فەرموودەی خوای گەورەیە: ﴿قَـاتِلُوا الَّـذِينَ لا يُؤْمِنُـونَ بِاللَّـهِ وَلا بِـالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَلا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صَـاغِرُونَ﴾ (التوبـة:٢٩) واتـە بجەنگن دژی ئەوانەی باوەڕیـان بـە خـواو ڕۆژی دوایی‌و بە زیندو بوونەوەو جەزا نییـە، وە خۆیـان ناپـارێزن لـەوەی خـواو نێـرراوی خـوا قەدەغـەیان کردووە، وە پابەند نین بە حوکمەکانی یاسای ئیسلام، لە جولەکەو گاور، هەتا بەدەستی خۆیان سەرانەتان ئەدەنێ بە سەرشۆڕی.

بوخـاری ئەگێڕێتـەوە کـە موغـەیرە لەشـەڕی نەهاوەنـدا ووتـی: پێغەمبەرەکـەمان ﷺ فـەرمانی پێداوین بجەنگین دژتان هەتا خوای تاك و تەنها ئەپەرستن یا سەرانە ئەدەن.

ئەم پەیمانەش هەمیشەیییە و نەبەستراوە بەکاتێکی دیاریکراوەوە ئەگەر شتێك نەبێت ئەو پەیمانە هەڵبوەشێنێتەوە.

### ئەو شتانەی کە ئەو پەیمانە پێویستی ئەکات

ئەگەر پەیمان بەستنەکە کۆتایی‌هات، ئیتر جەنگ دژیان حەرامـە و پێویستە لەسـەر موسڵمانان ماڵ و ناموسیان بپارێزن و ئازادی بیر و باوەڕیان بۆ دابین بکەن، و واز لـە ئازاردانیـان بهێـنن؛ بـە پێی ئەوەی لەعـەلی‌یـەوە خـوای لـێ ڕازی بێـت گێڕراوەتـەوە کـە فەرمویـەتی: بۆیـە سـەرانە ئـەدەن کەخوێنیان وەك خوێنمان پارێزراو بێت و ماڵ و سامانیان وەك ماڵ و سامانمان بێت.

ئەو بنەما گشتی‌یەی کە زانایان ڕایان لەسەریەتی ئەوەیە: چی بۆ ئێمە بێت بۆ ئەوانیشە وە چی لەسەر ئێمە بێت لەسەر ئەوانیشە.

ئەو حوکمانەی کە ئەهلی ژیمە ئەگرێتەوە:

حوکمە ئیسلامی‌یەکان لەدوو ڕووەوە ئەیان گرێتەوە:

ڕووی یەکەم:

مامەڵە ماڵی‌یەکان: جا دروست نی‌یە لەومامەڵانەدا کارێك بکەن لەگەڵ ڕێنمایی‌یەکانی ئیسلامدا نەگونجێ، وەك پارە بە سووددان و جگە لەو لە پەیمانە حەرام کراوەکان.

ڕووی دووەم:

سزا بڕیار لەسەر دراوەکان: جا تۆڵەیان لێ ئەسەندرێ بە تاوانی تۆڵە و حەددی شەرعیان بەسەردا جێبەجێ ئەکرێ بەو تاوانانەی کە حەدیان لەسەرە.

وە سابت بووە کە پێغەمبەر ﷺ دوو جولەکەی ڕەجم کردووە کاتێ زینایان کردووە دووای ئەوەی کە موحصەن بوون (واتە هاوسەریان گرتبوو).

بەڵام ئەو حوکمانەی کە پەیوەندیان هەیە بە دروشمە ئاینی‌یەکان لەبیر و باوەڕو خوا پەرستی‌یەکان و ئەو حوکمانەی کە پەیوەندی‌یان هەیە بە دیل و ژن هێنان و تەڵاقەوە ئازادی تەواویان تێیدا هەیە، بە پێی ئەو بنەما فیقهی‌یەی کە بڕیاری لەسەر دراوە: (أترکوهم وما یدینون).

واتە: واز لە خۆیان و لە ئاینەکانیان بهێنن.

بەڵام ئەگەر هاتنە لای ئێمە بۆ دادوەری ئەتوانین بە پێی حوکمی ئیسلام حوکمیان بۆ دابنێین، یا نەیکەین.

خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿فَإِنْ جَاءُوكَ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ وَإِنْ تُعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَنْ يَضُرُّوكَ شَيْئاً وَإِنْ حَكَمْتَ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِالْقِسْطِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ (المائدة:٤٢).

واتە: ئەگەر هاتن بۆ لات بۆ ئەوەی حوکم لەنێوانیاندا بدەیت، یا حوکم بدە لەنێوانیاندا، یا ڕوویان لێوەرگێڕە، جا ئەگەر حوکمت نەدا لە نێوانیانا ناتوانن زیانت پێ بگەیەنن بە هیچ شێوەیەك، بەڵام ئەگەر حوکمتدا لەنێوانیاندا بە دادپەروەری حوکم بکە چونکە خوا دادپەروەرانی خۆش ئەوێ.

ئەمە ئەوەیە کە پەیوەندی هەیە بە مەرجی یەکەمەوە. بەڵام مەرجی دووەم کەسەرانەیە وا لەخوارەوە باسی ئەکەین:

## سەرانە دان (الجزية)

(جزية) لە ماددەی (جزاء) وەرگیراوە، وە (جزية): مەبلەغێکە لەماڵ لەسەر ئەو کەسانە دائەنرێت کە ئەچنە ژیمە و پەیمانی موسڵمانانەوە لە خاوەن کتێبە ئاسمانیەکان:

### بنەمای دانانی (جزية):

بنەمای دانانی (جزية) فەرموودەی خوای گەورەیە کە ئەفەرمووێت: ﴿قَاتِلُوا الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلا بِالْيَوْمِ الآخِرِ وَلا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَلا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ﴾ (التوبة:٢٩) روون کراوەتەوە.

بوخاری و ترمذي لە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفەوە ئەگێڕنەوە: کە پێغەمبەر ﷺ سەرانەی لە مەجوسی‌یەکانی (هجر) سەندووە[١].

وە ترمذی ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە مەجوسەکانی (بەحرەین)یشی سەندووە، وە عومەر خوای لێ ڕازی بێت لە فارسەکانی سەندووە، وە عوسمان خوای لێ ڕازی بێت لە فارس یا لە بەربەرەکانی سەندووە[٢].

### حیکمەتی دانانی (جزية) سەرانە:

ئیسلام سەرانەی لەسەر کافرە ژیمی‌یەکان فەرز کردووە لە بەرامبەری فەرز کردنی زەکات لە سەر موسڵمانەکان، بۆ ئەوەی هەردوولا یەکسان بن، چونکە موسڵمانان و ژیمی‌یەکان لەژێر سایەی یەك ئاڵادان، وە هەردوولایان هەموو مافێکیان بۆ دابین کراوە و هەردوو لایان سوود لە دەزگاکانی‌دەوڵەت وەرئەگرن بەیەك ڕێژە.

جا لەبەر ئەوە خوا سەرانەی پێویست کردووە بۆ موسڵمانان بەرامبەر ئەوەی هەڵئەسن بە بەرگری کردن لە ژیمی‌یەکان و پاراستنیان لە وڵاتانی موسڵماناندا کە تێیدا نیشتەجێن.

وە هەر لەبەر ئەوەیە پێویستە، -دووای دانی سەرانەکە- بیان پارێزن و ڕێ لەو کەسانە بگرن کە ئەیانەوێ ئازاریان بدەن.

---

(١) البخاري (٣١٥٦) والترمذي (١٥٨٧).

(٢) الترمذي (١٥٨٨).

**کێ سەرانەی لێ ئەسەندرێ:**

سەرانە لەهەموو نەتەوەیەك وەرئەگیرێ، خاوەن کتێب بن، یا مەجوسی، یا جگە لەوان بن، عەرەب بن یا عەجەم[1].

وە سابت و چەسپاوە بە قورئانی پیرۆز کە سەرانە لە خاوەن کتێبە ئاسمانی‌یەکان وەرئەگیرێت، وەك بە سوننەت چەسپاوە کە لە مەجوسیش وەرئەگیرێ، وە ئەوانەی وەك ئەوانن ئەخرێنە پاڵیان.

ئیبنو قەییم وتویەتی: لەبەر ئەوەی مەجوس ئەهلی شیرکن و کتێبی ئاسمانی‌یان نی‌یە، جا وەرگرتنی سەرانە لە مەجوس بەڵگەی ئەوەیە کە لە هەموو موشریکەکان وەرئەگیرێت.

وە پێغەمبەر ﷺ بۆیە لە بتپەرستەکانی عەرەبی وەرنەگرتووە، چونکە هەموویان موسڵمان بوون پێش ئەوەی ئایەتی (جزیة) سەرانە بێتە خوارەوە، چونکە ئایەتەکە دووای شەڕی تەبوك هاتۆتە خوارەوە، کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە جەنگ بۆوە لەدژی عەرەب، و هەموویان موسڵمان بوو بوون.

وە لەبەر ئەوە بوو لەو جولەکانەی جەنگیان لەگەڵدا ئەکرد سەرانەی وەرنەگرت، چونکە ئایەتەکە هێشتا نەهاتبووە خوارەوە، جا کاتێ هاتە خوارەوە لە گاورە عەرەبەکان و مەجوسەکانی سەند، و ئەگەر لەو کاتەدا کەسێکیش لەعەرەب بمایە بت پەرست بوایەو سەرانەی بدایە لێی وەرئەگرت، وەك چۆن لە خاچ پەرست و ئاگر پەرست و بتپەرستەکانی وەرئەگرت.

وە جیاوازی و کاریگەری نی‌یە بۆ ئەستوری کوفری هەندێك لەتیرەو هۆزەکان بەسەر هەندێکی تردا، پاشان بەڕاستی کوفری بت پەرستەکان ئەستورتر نی‌یە لە کوفری مەجوس، وە چ جیاوازی‌یەك هەیە لەنێوان بت پەرست و ئاگر پەرستدا، بەڵکو کوفری مەجوس ئەستورترە، چونکە بت پەرستەکان بڕیاری تەنهایی پەروەردگار ئەدەن و ئەڵێن هیچ دروستکەرێك نی‌یە جگە لە خوا، وە ئەڵێن ئەم بتانە بۆیە ئەپەرستین کە لەخوامان نزیك بکاتەوە، وە هەرگیز نەیان وتوە دوو دروستکەر هەیە بۆ بونەوەر یەکێکیان دروستکەری خێرە و ئەویتر دروستکەری شەڕ، وەك مەجوسەکان ئەڵێن، هەروەها هێنانی دایك و کچ و خوشکیان بەڕەوا نەزانیوە، وە لەسەر پاشماوەیەك بوون لەدینی ئیبراهیم سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت، بەڵام مەجوسەکان هەر

---

(١) وە ئەوە مەزهەبی مالیك و ئەوزاعی و زانا فیقهی‌یەکانی شامە.

شافیعی خوای لێ ڕازی بێت فەرمویەتی: سەرانە وەرئەگیرێ لە خاوەن کتێب عەرەب بێت یا عەجەم بێت، وە مەجوسیش ئەخرێتە پاڵیان. بەڵام سەرانە وەرناگیرێ لەبت پەرستەکان بە تێکڕایی.

وە ئەبو حەنیفە خوای لێ ڕازی بێت فەرمویەتی: عەرەب جگە لە موسوڵمان بوون یا شمشێر هیچیان لێ وەرناگیرێ.

کتێبیان نەبووە لەسەرەتاوە، وە هەرگیز لەسەر ئاینی هیچ پێغەمبەرێك نەبوون، نە لەبیر و باوەڕیاندا، وە نە لەیاساکانیاندا.

وە ئەوەی ئەگێڕنەوە کە نامەیەکیان هەبووە و هەڵگیراوە و خوا شەریعەتەکەشی هەڵگرتوون، کاتێ شاکەیان داوێن پیسی لەگەڵ کچەکەی کرد، ئەمەش ڕاست نیە.

وە ئەگەر ڕاستیش بێت بەوە نەبوون بە خاوەن کتێب، چونکە کتێبەکەیان هەڵگیراوە و شەریعەتەکەیان بەتاڵ بۆتەوە و لەسەر هیچ کامیان نەماون.

وە ئاشکرایە کە عەرەب لەسەر ئاینی ئیبراهیم بوون سڵاوی خوای لەسەر بێت، وە ئیبراهیم نامەو شەریعەتێکی ئاسمانی هەبووە، جا گۆڕینی ئاینەکەی ئیبراهیم لەلایەن بتپەرستەکانەوە گەورەتر نیە لە گۆڕینی مەجوسەکان و ئاینی پێغەمبەرەکەیان و کتێبەکەیان ئەگەر ڕاستیش بێت، چونکە نەزانراوە کە مەجوسەکان لەسەر هیچ یاسایەکی پێغەمبەران بووبن، بە پێچەوانەی عەرەبەوە، ئیتر چۆن مەجوسیەکان کە خراپترین بیر و باوەڕیان هەیە، لە موشریکەکانی عەرەب بەچاکتر دائەنرێن؟

ئەو قسەیەش ڕاسترە لە بەڵگە وەك ئەیبینی.

مەرجەکانی وەرگرتنی سەرانە:

لە وەرگرتنی سەرانەدا ئازادی و دادپەروەری و میهرەبانی خراوەتە پێش چاو.

هەر بۆیە چەند مەرجێکیان داناوە لەسەر ئەوانەی لێیان وەرئەگیرێ.

١- نێرینەیی.

٢- تەکلیف.

٣- ئازادی.

بە پێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿قَاتِلُوا الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلا بِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَلا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ﴾ (التوبة:٢٩) واتە: بجەنگن لە دژی ئەوانەی باوەڕیان بە خوا و ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوە جەزا نیە، وە خۆیان ناپارێزن لەوەی خواو نێرراوی خوا قەدەغەیان کردووە، وە پابەند نین بە حوکمەکانی یاسای ئیسلام، لە جولەکەو گاور، هەتا بەدەستی خۆیان سەرانەتان ئەدەنێ بە سەرشۆڕی.

واتە: لەکاتی بەدەسەلاتی و دەوڵەمەندیدا لێیان وەرئەگیرێت. کەواتە لەسەر ئافرەت و منداڵ و کۆیلە و شێت پێویست نییە.

وە هەروەها پێویست نییە لەسەر ئەو هەژارانەی خەڵك خێریان پێ ئەکات، وە لەسەر ئەوانەیش پێویست نییە کە توانای کاریان نییە، وە هەروەها دانانرێت لەسەر کوێر و پەك کەوتە و ئەوانەی نەخۆشییان هەیە، وە هەروەها لەسەر ئەوانەیان پێویست نییە کە گۆشەگیرن و خواپەرستی ئەکەن مەگەر دەوڵەمەندبن.

مالیك خوای لێ ڕازی بێت فەرموویەتی: سوننەت واهاتووە کە سەرانە لەسەر ئافرەت و منداڵی خاوەن کتێبە ئاسمانیەکان دانەنراوە، وە سەرانە تەنها لەو پیاوانە سەندراوە کە باڵغ بوون.

ئەسلەم ئەگێڕێتەوە: کە عومەر خوای لێ ڕازی بێت نامەی بۆ سەرکردەکانی سوپاکان نارد: سەرانە دامەنێن لەسەر ژن و منداڵەکانیان، وە لەسەر ئەو پیاوانە نەبێت کە موس بەکار ئەهێنن زیاتر دامەنێن.

وە شێتیش حوکمی منداڵی هەیە.

**چەندێتی و ڕادەی سەرانە:**

خاوەن سوننەکان ئەگێڕنەوە لە موعاژەوە خوا لێی ڕازیبێت کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ ناردی بۆ یەمەن فەرمانی پێدا کە لەهەموو نێرێك پێگەیشتبێ دینارێك وەرگرێ یا بەرامبەر دینارەکە (معافرة) وەربگرێ[1]. لە پاشاندا عومەر خوالێی ڕازی بێت زیادی کرد بە چوار دینار لەسەر ئەوانەی زێڕیان بەکارئەهێنا، وە چل درهەم لەسەر ئەوانەی زیویان بەکار ئەهێنا لەهەموو ساڵێکدا.

جا پێغەمبەر ﷺ بە دەست کورتی خەلکی یەمەنی زانی و عومەریش خوای لێ ڕازی بێت دەوڵەمەندی و توانای خەڵکی شامی بۆ دەرکەوتبوو بۆیە لێیانی زیاد کرد.

وە بوخاری ئەگێڕێتەوە کە بە موجاهیدیان ووت: بۆچی خەڵکی شام چوار دیناریان لەسەر پێویستە و خەڵکی یەمەن دینارێك؟

ووتی: ئەوە بە پێی دەسەلات دانراوە[2].

---

(١) (معافرة) عافیرە جۆرە قوماشێکی یەمەنی بووە کە لە عافیرە وە هاتووە عافیرەش گەرەکێك بووە لەهەمەدان.

(٢) البخاري تعليقاً (٦/٢٥٧).

وە ئەبو حەنیفە ڕەحمەتی خوای لێ بێت بەوەکاری کردووە، وە ڕیوایەتێکیش لە ئەحمەدەوە کە فەرموویەتی: دەوڵەمەند چل و هەشت درهەم و مام ناوەندی بیست و چوار درهەم وکەم دەست دوانزە درهەم. بەلای کەم و زۆرەوە دایناوە.

وە شافیعی بۆ ئەوە چووە، وە ڕیوایەتێکیتر لە ئەحمەدەوە: کە ئەبێت بە لایەنی کەمەوە دابنرێت ئەویش دینارێکە، بەڵام لای ژۆرووی دانەنراوە، چونکە ئەگەڕێتەوە بۆ ڕای کاربەدەستەکان.

وە مالیك و یەکێ لەڕیوایەتەکان لە ئەحمەدەوە، کە ئەوەش بەهێزترە وتوویانە:

(لای کەم و لای زۆری سنووری بۆ دانەنراوە، و ئەو کارە دراوەتە دەست کاربەدەستی وڵات کە هەرکەس بە پێی حاڵی خۆی بۆی دابنێت).

(وە نابێت لەتوانای خۆی بەولاوە هیچی لەسەر دابنرێت).

**زیاد کردن لەسەر سەرانە**

وە دروستە مەرج کردن لەگەڵیاندا کە لەسەرانە بەو لاوە شتی تریشی یان لەسەر دابنرێت، وەك نان دان بەو موسڵمانانەی بەوناویانا تێ ئەپەڕن.

ئەحنەفی کوڕی قەیس گێڕاویەتی‌یەوە کە عومەر خوای لێ ڕازی بێت مەرجی میوانداری شەو و ڕۆژێکی لەسەر ئەهلی (ذمة) دائەنا و ئەبوایە ئاو و جۆگە و ئاودێرەکانیان چاك بکردایەوە، وە هەرموسڵمانێك لەسەر زەوی ئەوان بکوژرایە ئەبوایە خوێنەکەیان بدایە، ئەحمەد گێڕاویەتی‌یەوە.

وە ئەسلەم ئەگێڕێتەوە، ئەو شامی‌یانەی سەرانەیان لەسەر بوو هاتنە لای عومەر خوالێی ڕازی بێت وتیان: موسوڵمانەکان کاتێ بە ناوماندا تێئەپەڕن داوامان لـی ئەکەن مەڕ و مریشکیان بۆ سەربڕین لەمیوانداری‌یەکەماندا، عومەریش فەرمووی: خۆتان چی ئەخۆن ئەوەیان دەرخوارد بدەن و لەوە زیاتریان مەدەنێ.

**وەرنەگرتنی ئەوەندە کە گران بێت لەسەر خاوەن کتێبەکان و جگە لەوانیش**

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی داوە کە دڵنەرمی بەکار بهێنن لەگەڵ خاوەن کتێبەکان و لەتوانای خۆیان زیاتریان داوا لـێ نەکرێت.

وە لە ئیبنو عومەرەوە خوایان لـێ ڕازی بێت ئەگێڕنەوە: دووا ووشەی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بووە کە فەرمووی: (أحفظوني في ذمتي). پارێزگاری ئەوانە بکەن کە لە زیمەی مـن دان[1].

---

(١) إبن عدي في الكامل (٣/١٠١٨).

وە لە فەرموودەدا هاتووە: (من ظلم معاهَداً أو كلفه فوق طاقته فأنا حجيجه)[1].

واتە: هەرکەس ستەم لە خاوەن پەیمانێك بکات، یا لەسەرو توانایەوە داوای شتی لێ بکات، ئەوە من بەسەریەوە داوا کارم.

وە لە ئیبنو عەبباسەوە ئەگێڕنەوە خوا لێیان ڕازی بێت: هەرچی لەئەهلی زیمە زیاد نەبێت نادرێت بەسەرانە.

لاچوونی سەرانە لەسەر ئەوانەی موسڵمان ئەبن:

هەرکەس موسوڵمان بێت سەرانەی لەکۆڵ ئەکەوێت، بەپێی حەدیسەکەی ئیبنو عەبباس خوا لێیان ڕازی بێت کە مەرفوعە: (ليس على المسلم جزية) واتە: موسڵمان سەرانەی لەسەر نیە، ئەحمەد و ئەبوداود گێڕاویانەتەوە[2].

ئەبو عوبەیدە گێڕاویەتەوە: کە جولەکەیەك موسڵمان بوو داوای سەرانەی لێ کرا، ووتیان: لەبەر سەرانەکە موسڵمان بوویت؟ ووتی: ئیسلام پەناگایە.

ئەو کێشەیە بەرزکراوە بۆ لای عومەر فەرمووی: (إن في الإسلام معاذاً) بەڕاستی ئیسلام پەناگایە.

وە بۆی نوسی کە سەرانەی لێ نەسەنن.

بەستنی پەیمانی زیمە بۆ ئەوانەی کە هاو وڵاتین وە بۆ ئەوانەی کە سەربەخۆ ئەژین

وەك چۆن دروستە ئەو پەیمانە ببەسترێت لەگەڵ ئەوانەدا کە لەگەڵ موسڵماندا ئەژین و لەژێر سایەی ئیسلامەدان، دروستیشە ببەسترێت لەگەڵ ئەوانەدا کە سەربەخۆو دوورن لە موسڵمانانەوە و لە شوێنی خۆیان ئەمێننەوە،

پێغەمبەر ﷺ پەیمانی لەگەڵ گاورەکانی نەجران بەست هەرچەندە لەجێ و شوێنی خۆیان و وڵاتی خۆیاندا مانەوە، بێ ئەوەی کەسێك لە موسڵمانان لەگەڵیان بێت.

پەیمانەکەش ئەمانەی تێدا بوو: ئاگاداریان و پاراستنی سەربەستی خۆیی و سەربەستی ئاینیان، وە ڕاگرتنی دادپەروەری لە نێوانیاندا، و سەندنی تۆڵە لەستەمکاران.

(١) أبوداود (٣٠٥٢).

(٢) أحمد (١/٢٠٥و٢٥٣) وأبوداود (٣٠٥٣).

خەلیفەکانی دووای خۆشی ئەو پەیمانەیان ڕاگرت هەتا سەردەمی هارونە ڕەشید: ویستی ئەو پەیمانە هەڵبوەشێنێتەوە، موحەممەدی کوڕی حەسەن کە هاوەڵی ئەبو حەنیفە بوو نەی هێشت، ئەمەش دەقی پەیمانەکەیە: پەنای خواو (ذمة) پەیمان و ئەمانی محمدی پێغەمبەرو نێرراوی خوا ﷺ بۆ خەلکی نەجران و دەورو پشتی لەسەر ئەوەی لەژێر دەستیاندایە لەکەم یا زۆر، کە هیچ قەشەیەك ناگۆڕرێ لە قەشەیەتی‌یەکەی، وە هیچ ڕاهیبێك لە ڕاهیبی‌یەکەی، وە هیچ کاهینێك لە کاهینی‌یەکەی، وە مامەڵەی لاوازی لەگەڵ ناکرێت و بە خوێنی سەردەمی نەفامی ناکۆڵرێتەوە، وە نە زیانیان لێ ئەدرێ و نەباریان گران ئەکرێ، نە سوپا پێ ئەنێتە خاکیان، وە هەرکەس داوای مافێکیان لێ بکات داد لەنێوانیاندا ئەبێت، نە ستەمکار بن، وە نە ستەمیان لێ بکرێ.

وە هەرکەس لەوان سوودی خوارد دووای ئەم پەیمانە، لە زیمەی مندا نامێنێت، وە کەس بەتاوانی کەسی‌تر ناگیرێ.

وە لەسەر ئەوەی کە لەم نامەیەدایە لەپەنای خوا و زیمەی موحەممەد پێغەمبەردا ئەبن ﷺ بۆ هەمیشە، هەتا خوا خۆی ئەی گۆڕێت.

جا ئەگەر سەرۆکێك بیەوێ ئەو پەیمانەی بەکاربهێنێ بۆ حسابی خۆی و ستەم لەگەلەکەی بکات، ڕێی پێ نادرێت).

لە کتێبی (المبسوط)ی سەرەخسی‌دا هاتووە: ئەگەر سەرۆکێك داوای پەیمانی زیمەی کرد کە وازی لێ‌بهێنرێت فەرمان ڕەوایی وولاتەکەی بکات بە ئارەزوی خۆی لە: کوشتن، یا لەداردان، یا جگە لەوە لەو شتانەی کە دروست نی‌یە لە خاکی ئیسلامدا، نابێت وەلام بدرێتەوە، چونکە بڕیاردانی ستەم لە کاتێکدا توانای قەدەغە کردنی هەبێت حەرامە.

وە لەبەر ئەوەی زیمی لەو کسانەیە کە ئەبێ پابەند بێ بە حوکمەکانی ئیسلامەوە لە مامەڵەکاندا، کەواتە ئەگەر مەرجێکی هەبوو پێچەوانەی ئەوەبوو کە پەیمانی زیمە پێویستی ئەکات، ئەو مەرجە پوچەڵە، جا ئەگەر لەسەر ئەوە سوڵحی لەگەڵ کراو پەیمانی درایە، ئەوە ئەو مەرجانەی لە ئیسلامدا ڕەوا نین پوچەڵ ئەبنەوە؛ بە پێی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (كل شرط ليس في كتاب الله باطل)[1].

واتە: هەر مەرجێك لە کتێبەکەی خوادا نەبێت پوچەڵە.

---

(١) طبقات إبن سعد (١/٣٥-٣٦) والخراج لأبي يوسف (٤١) والأموال لأبي لبيد (٥٠٢) وزاد للعاد (٢/٤٠).

**بەچی پەیمانەکە هەڵ ئەوەشێتەوە؟**

پەیمانەکە هەڵئەوەشێتەوە بەندەدانی سەرانە، یا ڕازی نەبوون بە حوکمی ئیسلام، کاتێك حاکمێك حوکمی پێ دا، یا دەست درێژی کردن بۆ سەر موسوڵمانێك بە کوشتن، یا بە هەڵگەڕانەوەی لە ئاینەکەی، یا زینا بکات لەگەڵ ئافرەتێکی موسوڵماندا، یا بەهێنان بچێتە لای، یا کاری نەتەوەی لوط بکات، یا ببێتە ڕێگر، یا ببێتە جاسوس، یا پەنای جاسوس بدات، یا بەخراپی باسی خوا و پێغەمبەر و ئاینەکەی بکات.

چونکە ئەمانە زیانێکن هەموو موسڵمانان ئەگرێتەوە، لە ڕووی گیانی و ناموسی و ماڵی و ڕەوشتی و ئاینی‌یانەوە.

بە ئیبنو عومەریان ووت، خوا لێی ڕازی بێت ڕاهیبێك جوێن بە پێغەمبەر ﷺ ئەدات، فەرمووی: ئەگەر من لێی ببیستم ئەی‌کوژم، چونکە ئێمە ئەمانمان لەسەر ئەوە نەداوەتێ.

وە هەروەها پەیمانەکە هەڵئەوەشێتەوە ئەگەر ڕابکات و بچێتە خاکی کافرانەوە.

بە پێچەوانەی ئەوەوە کە خراپەیەك بکات یا تاوانی داوێن پیسی بداتە پاڵ موسڵمانێك، بەوە پەیمانەکەی هەڵناوەشێتەوە،

وە کاتێك لەلایەن کەسێکەوە پەیمانەکە هەڵوەشێتەوە پەیمانی ژن و منداڵەکانی هەڵناوەشێتەوە، چونکە ئەوە تایبەتە بەخۆیەوە.

**ئەوەی هەڵوەشاندنەوە پێویستی ئەکات:**

ئەگەر پەیمانەکەی هەڵوەشاندەوە، ئەوە حوکمەکەی وەکو حوکمی دیل وەهایە، ئەگەر موسڵمان بوو کوشتنی حەرام ئەبێت، چونکە ئیسلام پێش خۆی ئەسڕێتەوە.

## چوونی جگە لە موسوڵمانان بۆ ناو مزگەوت و وڵاتی ئیسلام

زانایان جیاوازیان هەیە لە چوونی جگە لە موسوڵمانان بۆ ناو مزگەوتی حەرام و مزگەوتەکانی‌تر و خاکی ئیسلامەوە.

وە خاکی ئیسلام بەگشتی دەرهەق بە بێ باوەڕان سێ بەشە:

بەشی یەکەم:

حەرەمە، جا دروست نی‌یە بۆ بێ باوەڕ کە بچێتە ناو حەرەمەوە زیمی بێت، یا ئەمانی دراییتی، بە پێی ڕواڵەتی فەرموودەی خوای گەورە کە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلا يَقْرَبُوا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَذَا﴾ (التوبة:٢٨).

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە بێ باوەڕەکان پیسن لەدووای ئەمساڵەوە نابێت نزیکی مزگەوتی حەرام بکەون،

شافیعی و ئەحمەد و مالیك ڕەحمەتی خوایان لێ بێت بەو شێوەیە گفتیان داوە،

جا ئەگەر نێرراوێك هات لە خاکی بێ باوەڕەکانەوە، وە پێشەوای وڵات لەحەرەم بوو، نابێ ڕێی پێ بدرێت بچێتە حەرەمەوە، بەڵکو ئەبێت ئەو خۆی بێتە دەرەوە بۆ لای یا کەسێك بنێری لە دەرەوەی حەرەم نامەکەی لێوەربگرێ.

وە ئەبو حەنیفە و خەڵکی کوفە بە دروستیان داناوە کە بێ باوەڕی پەیمان پێ دراو بچێتە حەرەمەوە[1]. وە ئەوەندەی ڕێبوارێکی تێدا بمێنێتەوە بەڵام جێگیر نەبێت تێیدا.

وە لای ئەبو حەنیفە دروستە تەنها کەسێك لەبێ باوەڕەکان بچێتە ماڵی کەعبەوە.

بەشی دووەم:

لەخاکی ئیسلام حیجازە، وە سنوورەکەی لە نێوان یەمامە و یەمەن و نەجد، و مەدینەی پیرۆزە، وە ووتراوە کە نیوەی تیهامی‌یەو نیوەی حیجازی، وە وتراوە هەمووی حیجازی‌یە

کەلبی ووتوویەتی: سنووری حیجاز: لەنێوان شاخەکانی طەی و ڕێگای عێراقدایە، وە بۆیە پێی ئەڵێن حیجاز چونکە جیاکەرەوەیە لەنێوان نەجد و تیهامەدا، وە وتراوە لەبەر ئەوەی جیاکەرەوەیە لە نێوان نەجد و سەراتدا، وە وتراوە لەبەر ئەوەی جیاکەرەوەیە لەنێوان نەجد و تیهامە و شامدا.

حەربی وتویەتی: تەبوکیش لەسەر حیجازە، درووستە بۆ بێ باوەڕ بچنە خاکی حیجازەوە بە ڕێ پێدان، بەڵام نابێت لەمانەوەی ڕێبوار زیاتر بمێنێتەوە کەسێ ڕۆژە.

ئەبو حەنیفە وتوویەتی: ڕێگایان لێ ناگیرێ جێگیر بن یا بمێننەوە لە حیجازدا.

وە بەڵگەی جەماوەر ئەوەیە کە موسلیم لەئیبن و عومەرەوە ئەگێڕێتەوە کە گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە فەرموویەتی: (لأُخرِجَنَّ اليهودَ والنصارى من جزيرة العرب، فلا أترك فيها إلامسلماً)[2].

واتە: بە تەئکید جولەکە و گاور لە دوورگەی عەرەب دەرئەکەم وموسڵمان نەبێت کەسی تیا ناهێڵم.

---

(١) بە مەرجێ پێشەوا یا جێگرەکەی ڕێی پێ بدات

(٢) أحمد (١/٢٩) ومسلم (١٧٦٧/٦٣) والترمذي (١٦٠٧).

وە لەڕیوایەتی غەیری موسلیم ئەم زیادەیە هاتووە کە وەسیەتی کردووە و فەرموویەتی: (أخرجوا المشركين من جزيرة العرب)[1].

واتە: هەرچی موشریکە لە دورگەی عەرەب دەری بکەن.

بەڵام ئەبو بەکر ماوەی ئەوەی نەبوو، هەتا عومەر هات دەریکردن، و بۆی دانان ئەوەی بە بازرگانی دێتەوە سێ رۆژ زیاتر نابێ بمێنێتەوە.

وە لەئیبنو شیهابەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لايجتمع دينان في جزيرة العرب) أخرجه مالك في الموطا مرسلاً[2].

واتە: دوو ئاین لە دورگەی عەرەبیدا کۆنابنەوە.

وە موسلیم لە جابیرەوە ئەگێڕێتەوە وتوویەتی: بیستوومە لە پێغەمبەر ﷺ ئەی فەرموو: (إن الشيطان قد يئس أن يعبده المصلون في جزيرة العرب، ولكن في التحريش بينهم)[3].

واتە: شەیتان ئومێد بڕاو بووە لەوەی نوێژکەرانی دورگەی عەرەب بیپەرستن، بەڵام هەر خۆی ئەکوتێتەوە نێوانیانەوە بۆ ئەوەی تووشی شەڕیان بکات.

سەعیدی کوڕی عەبدولعەزیز ووتوویەتی: دورگەی عەرەب ئەکەوێتە نێوان دۆڵەکانی لای خواروی یەمەنەوە هەتا سنووری عێراق و هەتا ئەگاتە سەر دەریا.

وە جگە لەسەعید وتوویەتی: سنووری دورگەی عەرەبی لەو سەری عەدەنەوە هەتا دێیەکانی عێراقە لەباری درێژیدا، وە لەجددە و دەور و بەرییەوە لەدەریاوە هەتا دەور و بەری شام لەباری پانییەوە.

بەشی سێیەم:

هەموو وڵاتانی ئیسلامە، جا دروستە بۆ بێ باوەڕ کە تێیدا جێگیر بێت، بە پەیمان و ئەمان و زیمە، بەڵام نابێ بچنە ناو مزگەوتەکانەوە هەتا موسڵمانێك ڕێیان پێ نەدات، لای شافیعی.

وە ئەبوحەنیفە وتوویەتی: بەبێ ئیزن بۆیان هەیە بچنە مزگەوتەوە

مالیك و ئەحمەد وتوویانە: بەهیچ شێوە یەك دروست نییە بچنە مزگەوتەوە.

---

(١) أحمد (١/٢٢٢) والبخاري (٣٠٥٣) ومسلم (١٦٣٧/٢٠).

(٢) مالك في الوطأ (١٦٥٣) وأحمد (٦/٢٧٥).

(٣) أحمد (٣/٣١٣) ومسلم (٢٨١٢) والترمذي (١٩٣٨).

## دهستكهوتهكانی جهنگ (الغنائم)

(غنائم) كۆی (غنيمة)ە، كه لهلۆغهتدا بهوه ئهوترێ كه مرۆڤ به تێكۆشان بهدهستی ئههێنێ. وه لهیاسای ئیسلام دا ئهو ماڵه بهدهست هێنراوهیه كه بهرێگای جهنگ و كوشتار له دوژمنی ئیسلامی ئهسهندرێ، وه ئهم جۆره ماڵانهی خوارهوه ئهگرێتهوه:

١- كهلوپهلی گوازراوه.

٢- دیلی جهنگی.

٣- زهوی و زاری دوژمن.

وه به غهنیمهت ئهنفالیش ئهوترێ كه كۆ (نفل)ه، لهبهر ئهوهی زیادهیه لهماڵی موسڵمانان، وه هۆزه عهرهبییهكان لهسهردهمی نهفامیدا ئهگهر جهنگیان بكردایهو بهسهر یهكتردا سهربكهوتنایه، غهنیمه و تالانییان ئهگرت و بهسهر جهنگاوهرهكاندا دابهشیان ئهكرد، وه بهشێكی زۆریان بۆ سهركردهكهیان دائهنا.

**حهڵاڵ كردنی غهنیمه بۆ ئهتهوهی ئیسلام جگه له ئهتهوهكانی تر:**

خوای گهوره دهستكهوتهكانی جهنگی بۆ ئهتهوهی ئیسلام حهڵاڵ كردووه، وه ڕێنماییان ئهكات بۆ ڕهوایی وهرگرتنی ئهو ماڵانه به فهرموودهی: ﴿فَكُلُوا مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلالاً طَيِّباً وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ (الأنفال:٦٩) واته: لهو غهنیمهتانهی بهدهستتان هێناوه بخۆن، چونكه پاك و ڕهوایه، وه لهخوا بترسن بهڕاستی خوا لێ خۆشبوو و میهرهبانه.

وه فهرموودهی صهحیح نیشان ئهدات كه خواردنی ئهو دهست كهوته جهنگیانه تایبهته به موسڵمانانهوه، و ئهتهوهكانی پێشوو هیچ شتێك لهوانهیانهیان پێ ڕهوا نهبووه .

بوخاری و موسلم له جابیری كوڕی عبدالله وه ئهگێڕنهوه: كه پێغهمبهر ﷺ فهرموویهتی: (أُعطيتُ خمساً لم يعطهن نبي قبلي: نصرت بالرعب مسيرة شهر. وجُعِلت لي الأرض مسجداً وطهوراً، فأيما رجل من أمتي أدركته الصلاة، فليصل. و أُحِلَّت لي الغنائم؛ ولم تحلَّ لأحدٍ من قبلي. وأُعطيتُ الشفاعة. وبُعِثْتُ إلى الناس عامة)[1].

واته: پێنج شتم پێ بهخشراوه كه به هیچ پێغهمبهرێكی پێش خۆم نهبهخشراوه: مانگه ڕێیهك دوژمن لێم ئهتۆقێ. وه زهویم بۆ كراوه به مزگهوت و پاك كهرهوه، جا ههر پیاوێك لهم ئهتهوهیهم

(١) البخاري (٣٣٥) ومسلم (٥٢١).

کاتێ نوێژ هات بەسەریا لەهەر شوێنێك بێت نوێژی خۆی بکات. وە دەست کەوتی جەنگیم بۆ ڕەوا کراوە کە بۆ هیچ کەس لەپێش مندا ڕەوا نەکراوە. وە شەفاعەتم پێبەخشراوە. وە نێرراوم بۆ سەرهەموو خەڵك بە گشتی

وە هۆی ئەوەش ئەوەیە کە بوخاری و موسلم لەئەبی هورەیرەوە ئەگێڕنەوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لم تحل الغنائم لأحد من قبلنا، ذلك لأن الله تبارك وتعالى رأى ضعفنا وعجزنا فطيَّبها لنا)[1].

واتە: دەست کەوتەکانی جەنگی بۆ هیچ کەسێکی پێش ئێمە ڕەوا نەبوون، ئەویش بەهۆی ئەوەوە بوو کە خوای گەورە هەژاری و کەم دەستی ئێمەی چاو لێوە بووە جا بۆی حەڵاڵ کردین.

ئەوانەی غەنیمەیان ئەدرێتێ:

یەکەم: پێکادان لە نێوان پێغەمبەر ﷺ و موشریکەکاندا حەڤدەی ڕەمەزانی ساڵی دووەمی کۆچی بوو لە شوێنێکدا پێی ئەوترێ بەدر، وە ئەو پێکادانە کۆتایی هات بەبردنەوەو سەرکەوتنی گەورە بۆ پێغەمبەر و ﷺ یارەکانی.

وە بۆ یەکەجار بوو کە موسوڵمانان هەست بەخۆشی سەرکەوتن بکەن لەوکاتەوە خوا پێغەمبەری بۆ ناردبوون، وە یەکەم جاریان بوو کە خوا زاڵی کردن بەسەر ئەو دوژمنەیاندا کەماوەی پانزە ساڵ بوو ئەیانی چەوساندنەوە، وە سەری خستن بەسەر ئەوانەدا کەلەماڵ و جێگای خۆیان بەناهەق دەریان کردبوون تەنها لەبەر ئەوەی ئەیان وت: (پەروەردگارمان الله)یە.

جا موشریکە تێك شکاوەکان لە دووای خۆیانەوە ماڵێکی زۆریان بەجێ هێشتبوو، موسڵمانە سەرکەوتووکان هەموویان کۆکردەوە، لە پاشاندا جیاوازی کەوتە نێوانیان لەسەر ئەوەی ئەم ماڵانە بۆ کێ بێت؟

ئایا بۆ ئەوانە بێت کە دووای دوژمن کەوتبوون؟

یان بۆ ئەو کەسانە بێت کە چواردەوری پێغەمبەریان ﷺ دابو ئەیان پاراست لە دووژمن؟

هەتا خوای گەورە ڕێنمایی کردن کە حوکمەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ خوا و پێغەمبەرکەی.

لە ئایەتی یەکەمی سورەتی (الأنفال)دا خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَنْفَالِ قُلِ الْأَنْفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ﴾ (الأنفال:١).

---

(١) أحمد (٢/٣١٧و٣١٨) والبخاري (٥١٥٧) ومسلم (١٧٤٨).

واتە: لەبارەی دەسکەوتی جەنگی لێت ئەپرسن کە بۆ کێیە؟ تۆش پێیان بڵێ ئەو سامان و ماڵەی بە دەست هاتووە لە جەنگدا بۆ خوا و پێغەمبەرەکەیەتی.

**چۆنیەتی دابەش کردنی (غنیمة) دەستکەوتی جەنگی:**

خوای گەورە ڕوونی کردۆتەوە چۆن دەست کەوتی جەنگی دابەش ئەکرێت؛ فەرمویەتی: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ إِنْ كُنْتُمْ آمَنْتُمْ بِاللَّهِ وَمَا أَنْزَلْنَا عَلَى عَبْدِنَا يَوْمَ الْفُرْقَانِ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (الأنفال:٤١) واتە: بزانن ئەوەی لەجەنگدا بە جیهاد بە دەستتان هیناوە چوار لەسەر پێنجی ئەدرێ بە جەنگاوەرەکان، وە پێنج یەکی بۆ خوا و پێغەمبەر و خزمانی پێغەمبەر و هەتیوان و کەم دەستان و ڕێبوارانە، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بەخوا و بەوە هەیە کە ناردومانەتە خوارەوە بۆ سەربەندەی خۆمان ڕۆژی جیاکردنەوەی هەق لەناهەق، لە (بدر)، ئەو ڕۆژەی کۆمەڵی بێ‌پروادارو کۆمەڵی موشریك دایان بەیەکدا، وە خوا بەسەر هەموو شتدا دەسەڵاتی هەیە.

ئایەتە پیرۆزەکە ڕوونی ئەکاتەوە کە پێنج یەکی ئەدرێ بەوانەی خوا باسی کردون ئەوانیش خوا و پێغەمبەر و خزم وکەس وکاری پێغەمبەر و هەتیوان و هەژاران و ڕێبوارانن،

وە لێرەدا کەناوی خوا هاتووە تەنها لەبەر پیرۆزیە، چونکە بەشەکەی خوا و پێغەمبەرەکەی هەر سەرف ئەکرێتەوە بەسەر هەژاران و کرینی چەك و ڕێگای جیهاد و ئەو جۆرە شتانەی کە بەرژەوەندی گشتیان تێدایە.

ئەبو داود و نەسائی ئەگێڕنەوە لە عەمری کوڕی عەبەسەوە کە ووتوویەتی: (پێغەمبەر ﷺ لەپشت ووشترێکی بەغەنیمەت گیراوەوە نوێژی بۆکردین، کاتێ سەلاوی داوە، دەستی برد هەندی توکی لە تەنیشت ووشترەکە کردەوە لە پاشاندا فەرمووی: (لایحل لي من غنائمكم مثل هذا إلا الخمس، و الخمس مردود فيكم)[1].

واتە: لە پێنج یەکی غەنیمەتەکانتان زیاتر ئەوەندەی ئەوە بۆ من ڕەوا نیە، وە پێنج یەکەکەش لەخۆتاندا سەرف ئەکرێتەوە.

واتە: سەرف ئەکرێتەوە بۆ هەژاران و کرینی چەك و پێویستی جیهاد.

بەڵام موچەی پێغەمبەر ﷺ خۆی لە سامان و ماڵەکەی بەنی نەچیر بوو کەخوا پێی بەخشی بوو.

---

(١) البخاري (٤٨٨٥) ومسلم (٤٨/١٧٥٧).

موسلیم لە عومەرەوە ئەگێڕێتەوە کە (سامان و ماڵی بەنی نەچیر لەو ماڵانە بوو کە خوا بەخشی بووی بە پێغەمبەر ﷺ بەتایبەتی، چونکە موسڵمانەکان نە خۆیان و نە ولاغیان ماندو نەکردبوو لەگرتنیدا، پێغەمبەریش موچەی خێزانەکەی بۆ ماوەی ساڵێك لێ دەرئەکرد و ئەوەی ئەمایەوە ئەیدا بە ئەسب و چەك و کەرەسەی جەنگ لەرێی خوادا[1].

وە بەشی (ذي القربى) واتە خزمەکانی پێغەمبەر ﷺ کە بەنی هاشم و بەنی (مطلب)ن ئەوانەی باوەشیان بۆ پێغەمبەر ﷺ گرتبوّوە و یارمەتییان ئەدا، نەك ئەو خزمانەی دوژمنایەتیان لەگەڵدا ئەکرد و بەرامبەری ئەوەستان.

بوخاری و ئەحمەد رەحمەتی خوایان لەسەر بێت ئەگێڕنەوە لە جوبەیری کوڕی موطعیمەوە وتوویەتی: (کاتێ جەنگی خەیبەر کۆتایی‌هات. و پێغەمبەر ﷺ بەشی (ژوی القربى)ای دابەش کرد لەنێوان بەنی هاشم و بەنی (مطلب) من و عوسمانی کوڕی عەففان چوینە خزمەتی ووتمان: ئەی نێرراوی خوا، ئێمە ئینکاری ناکەین لە چاکی بەنی هاشم کە خوا تۆی لەناویاندا هەڵبژاردووە، ئەی بەنی (مطلب) چی، بەشی ئەوان ئەدەیت و واز لە ئێمە ئەهێنی، لەکاتێکدا ئێمەو ئەوان بۆ تۆ لەیەك پلەداین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

ئەوان منیان بەجێ نەهێشتووە نە لەسەردەمی نەفامیدا و نە لەسەردەمی ئیسلامدا، وە بەنی هاشم و بەنی موطەلیب هەریەکن -وە پەنجە پیرۆزەکانی خستەناو یەك-

دەوڵەمەند و هەژاریان و نزیك و دووریان بەشی خۆی وەرئەگرێ، وە هەروەها نێر و مێیان: ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ﴾ (النساء:١١). واتە: هەر نێرێکیان ئەوەندەی بەشی دوو مێیان وەرئەگرێ.

ئەمەش مەزهەبی شافیعی و ئەحمەدە.

وە لە ئیبنو عەبباس و زين العابدين و باقرەوە ئەگێڕنەوە :

کە بە دەوڵەمەندو هەژاریان وەك یەك ئەدرێ، وە هەروەها بەنێر و مێ و گەورە و بچوکیان، لەبەر ئەوەی ناوی خزمایەتی ئەیان گرێتەوە.

وە لەبەر ئەوەی لەجیاتی زەکات بووە کە حەرام بوو لەسەریان، وە لەبەر ئەوەی خوا خۆی ئەوەی بۆ داناون، وە پێغەمبەریش دابەشی کردووە بۆیان، وە لەفەرموودەدا نەهاتووە کە کەسیانی لەکەسیان بە چاکتر زانیبێت.

---

(١) أحمد (٢/٣١٧) ومسلم (١٧٥٦) وأبو داود (٣٠٣٦).

وە شافیعی وای داناوە کە بەشەکەیان بەوە پێویست بووە کە خزمی پێغەمبەرن ﷺ جیا چوێنراوە بە میراتەوە.

وە پێغەمبەر ﷺ بەشی عەبباسی مامی جیا ئەکردەوە هەرچەندە دەوڵەمەند بوو، وە هەروەها بەشی صەفیەی پوریشی ئەدا

بەڵام بەشی هەتیوان کەمنداڵی بێ باوکی موسڵمانان ئەگرێتەوە، وتراوە: تایبەتە بە هەژارەکانیانەوە.

وە وتراوە: دەوڵەمەند و هەژاریان ئەگرێتەوە، لەبەر ئەوەی لاوازن با دەوڵەمەندیش بن.

بەیهەقی بە ئیسنادێکی صەحیح ئەیگێڕێتەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی شەقیقەوە لە کابرایەکەوە وتوویەتی: هاتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ لە دۆڵی (القری) بوو وە لەبەردەم ئەسپێکدا ڕاوەستا بوو، پێم ووت: ئەی نێرراوی خوا دەربارەی غەنیمەت چی ئەفەرمویت؟

فەرموی: (لله خمسها، وأربعة أخماسها للجيش).

واتە: پێنج یەکی بۆ خوایە و چوار لەسەر پێنجەکەی تری بۆ سوپایە.

ئەڵێ ووتم: کەواتە کەس لەکەس لەپێشتر نییە بۆی؟

فەرمووی: (لا، ولا السهم تستخرجه من جيبك، ليس أنت أحق به من أخيك المسلم)

فەرموی: نەو، و نە ئەو بەشەی لەگیرفانی خۆت دەری ئەهێنی، تۆ شایستەتر نیت پێی لە براموسڵمانەکەت[1].

وە لەفەرمودەدا هاتووە: (أيما قرية عصت الله ورسوله، فإن خمسها لله ورسوله، ثم هي لكم)[2].

واتە: هەر ئاوەدانییەك سەرپێچی خوا و پێغەمبەرەکەی کرد، پێنج یەکی بۆ خوا و پێغەمبەرەکەیەتی، لەپاشاندا ئەوی‌تری بۆ ئێوە ئەبێت،

بەڵام چوار پێنج یەکەکەی کە ئەمێنێتەوە بۆسوپاکە ئەبێت.

وە لەناو سوپاکەشدا تایبەتە بۆ نێرینە و ئازادەکان و باڵغەکان و ژیرەکانیان.

بەڵام ئافرەتەکان و بەندەکان منداڵ و شێتەکانی ناو سوپاکە بەشیان بۆ دانانرێ، چونکە نێرینەیی و ئازادی و پێ گەیشتوویی و ژیری مەرجن لە بەشداربوونی غەنیمەتدا.

---

(١) البيهقي (٦/٣٢٤).

(٢) أحمد (٢/٣١٧) ومسلم (١٧٥٦) وأبو داود (٣٠٣٦).

وە بەهێز و لاواز و شەڕکەر و شەڕنەکەر وەك یەكن لە بەخشینـا.

ئەحمەد ئەگێڕێتەوە لە سەعدی کوڕی مالیکەوە وتوویەتی: وتم: ئەی نێرراوی خوا پیاوی وا هەیـە پارێزەری کۆمەڵەکەیەتی ئایا بەشی ئەو و یەکێکیتر وەك یەکە؟

فەرمووی: (ثكلتك أمك ابن أمِّ سعد، وهل ترزقون وتنصرون إلا بضعفائكم)[1].

واتە: دایکت جەرگ سوتاو بێ بۆت ئەی کوڕی دایکی سەعد، ئایا بەهۆی لاوازەکانەوە نەبوایە ئێوەش ڕۆزی ئەدران و سەرئەکەوتن.

لە کتێبـی (حجة الله البالغة)دا هاتووە:

ئەو کەسەی سەرکردە بۆ بەرژەوەندی سوپاکە بینێـری بەلایەکـدا وەك بـۆ پۆسـتە و پێشڕەوی، و جاسوسی، بەش بۆ ئەویش دائەنرێت با ئامادەی جەنگەکەش نەبووبێت، وەك چۆن بۆ عوسـمـان دانـرا لە جەنگی بەدردا، هەرچـەنـدە ئامـادەش نـەبوو تێیـدا بەفـەرمـانی پێغەمبـەر ﷺ ، لەبـەر نەخۆشـی ژنەکەی، کە ڕوقیـەی کچی پێغەمبەر ﷺ بوو، وە پێغەمبەر ﷺ پێی فـەرموو: (إن لـك أجـر رجـل ممن شهد بدراً و سهمه) رواه البخاري عن ابن عمر رضي الله عنهما[2].

واتە: پاداشت و بەشی پیاوێکت هەیە لەوانەی ئامادەی جەنگی بەدر بوون.

وە ئەو دەستکەوتە دابەش ئەکرێت لەسەر بنەڕەتی ئەوە کە بۆ پیادە یەك بەشە، وە بۆ سوارە سـێ بەش.

وە چەند فەرموودەی ئاشکراو ڕاست هاتوون کە پێغەمبـەرﷺ بۆ سوارە سێ بەشی دائەنا بۆ خـۆی و وڵاغەکەی، و بۆ پیادە یەك بەش،

لەبەر ئەوەی وڵاغ مەسرەفی زیاترە و پێویستی بە کەسـێك هەیـە کـە بـە کارەکـانی ڕابگـات، وە لەوانەیە دەسەڵاتی سوارێك بە وڵاغەوە لە شەڕدا سێ بەرابەری دەسەڵاتی پیادە بێت.

وە جگە لە ئەسپ بەشی بۆ دانانرێ، لەبەر ئەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەقڵ نەکراوە کە بۆ جگە لـە ئەسـپ بەشـی دانـا بێـت، وە ڕۆژی جـەنگی بـەدر حـەفتا وشـتری لەگەڵـدا بـووە، وە هـیچ یـەك لەجەنگەکانی بەبێ وشتر نەبووە، چونکە زۆربەی وڵاغیان وشتر بووە، وە ئەگـەر بەشـی بـۆ دابنایـە پێمان ئەگەیشت، وە هەروەها یارەکانیشی دووای خۆی بەشیان بۆ وشتر دانەناوە.

---

(١) أحمد (١/١٧٣).

(٢) أحمد (٢/١٢٠) والبخاري (٣١٣٠) والترمذي (٣٧٠٦).

وە لەئەسپێك زیاتر بەشی بۆ دانانرێت، لەبەر ئەوەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەگێڕراوەتەوە، وە هەروەها لەیارەکانیشییەوە کە بۆ ئەسپێك زیاتر بەشیان دانا بێت، چونکە لەسەر یەك ئەسپەوە نەبێت جەنگ لەگەڵ دوشمن ناکرێت.

وە ئەبوحەنیفە خوا لێی ڕازی بێت وتویەتی: لەیەك ئەسپ زیاتریش بەشی بۆ دائەنرێ، چونکە هێزی سوودی زۆرترە و قازانجی گەورەترە

هەروەها بەش دائەنرێ بۆ ئەسپی خواستراو و ئەسپی بەکرێ گیراو، وە بۆ ئەسپی داگیرکراویش وە بەشەکەی بۆ خاوەنەکەی ئەبێت.

**زیاتر دانان لە بەشی غەنیمەدا:**

دروستە پێشەوا بۆ هەندێ جەنگاوەر زیاتر دابنێت لە بەشی خۆی، ئەوەندەی سێیەك یا چواریەك،

وە ئەو زیادەیە هەر لە غەنیمەتەکە خۆی بێت، ئەگەر ئەو کەسە لەجەنگەکەدا ئازایەتی نواندن و شکانیدا بە دوژمن بە شێوەیەك شایستەی ئەو زیادەیە بێت، ئەمەش مەزهەبی ئەحمەد و ئەبی عوبەیدەیە[1].

وە بەڵگەی ئەوەش حەدیسی حەبیبی کوڕی موسلیمەیە: کە پێغەمبەر ﷺ چارەکە بەشێك زیادەی ئەدا بەهەندێ سریە، دووای لێدەرکرنی پێنج یەك، وە دووای لێدەرکردنی پێنج یەك جاری وا هەبووە سێیەکی داوە بە هەندێك لە گەڕانەوەدا، ئەبوداود و ترمزی گێڕاویانەتەوە[2].

وە لە هەندێ جەنگدا بەشی پیادەیەك و سوارەیەکی ئەدا بەسەلەمەی کوڕی ئەکوەع، وە پێنج بەشی داوەتێ لەبەر کۆشش و ماندو بوونی لەو جەنگەدا.

**(سلب) کەلوپەلی کوژراوەکە بۆ ئەو کەسەیە ئەی کوژێت:**

ئەو کەلوپەلانەی بەکوژراوەکەوە بێت لەچەك و کەرەسەی جەنگی و ئەو شتانەی خۆی پێ ڕازاندۆتەوە، بۆ ئەو کەسەیە کە ئەیکوژێت،

بەڵام پارە و زێڕ بۆ ئەو نییە و بە (سلب) دانانرێت، بەڵکو غەنیمەتە.

---

(١) مالیك ڕای وایە کە ئەو زیادەیە لەو پێنج یەکە ئەبێت کە واجب کراوە بۆ (بیت المال). وە شافیعی وتوویەتی: لە پێنج یەکی پێنج یەك ئەبێت، کە بەشی ئیمامە.

(٢) أحمد (٦/٢٦) وأبوداود (٢٧٢١).

وە جاری وا ئەبێت کە سەرکردەکە جەنگاوەرەکان هان ئەدات لەجەنگەکەدا، و ئەڵێت هەرکەس کەسێك لە دوژمن بکوژێت (سەلەبەکەی) بۆخۆی، نەك بۆ باقی سوپاکە، وە پێغەمبەر ﷺ کاری وای کردووە، وە پێنج یەکیشی لێ‌دەرنەکردووە، ئەبوداود لە عەوفی کوڕی مالیك ی ئەشجەعی و خالیدی کوڕی وەلیدەوە گێڕاوەیەتی‌یەوە[1].

ئیبن و ئەبی شەیبە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ئەگێڕێتەوە: کە بەڕڕائی کوڕی مالیك لەڕۆژی جەنگی (الدارة) بەلای مەرزەباندا تێپەڕی و ڕمێکی لێ‌دا بەسەر قەڵپۆزی زینەکەیەوە و کوشتی، جا (سەلەبەکەی) نرخی گەیشتە سی هەزار، ئەوە بە عومەر گەیشت خوا لێی ڕازی بێت بە ئەبی طەلحەی فەرموو: ئێمە پێنج یەکمان لە سەلەب وەرنەئەگرت، بەڵام سەلەبەکەی بەڕاو ماڵێکی زۆرە. وە من وائەزانم کە پێنج یەکی هەر لێ دەربکرێت).

ئیبن و ئەبی شەیبە ئەڵێ ئیبن و سیرین ووتوویەتی: ئەنەسی کوڕی مالیك بۆی گێڕامەوە: کە ئەوە یەکەم سەلەب بووە لە ئیسلام دا پێنج یەکی لێ‌دەرکراوە.

لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە ووتویەتی: جاسوسێك لە موشریکەکان هاتەلای پێغەمبەر ﷺ لە گەشتێکدا، ماوەیەك لەگەڵ صەحابەکان دانیشتوو لەپڕ دیارنەما، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بگەڕێن بەدوایا بیکوژن، ئەڵێ من دۆزیمەوە و کوشتم پێغەمبەر ﷺ سەلەبەکەی دامێ[2].

**ئەو کەسەی بەشی نی‌یە لە غەنیمەتدا:**

لە پێشەوە باسکرا مەرجی بەشدار بوون لە غەنیمەتدا:

باڵغی و ژیری و نێرینەیی و ئازادی‌یە.

جا هەرکەس ئەو مەرجانەی تێدا نەبوو لە غەنیمەت بێ‌بەشە، هەرچەندە بۆی هەیە کە شتێکی پێ بدرێت.

سەعیدی کوڕی موسەییب ووتویەتی: منداڵ و کۆیلەکان لەسەرەتاوە لە غەنیمەت بەشیان نەدراوە.

---

(١) أحمد (٤/١٦٠) وأبوداود (٢٧٤٩) وإبن ماجة (٢٨٥١).

(٢) أحمد (٤/٥١) والبخاري (٣٠٥١) وأبوداود (٢٦٥٣).

وە ئەبوداود ئەگێڕێتەوە لە عومەیرەوە کە ووتوویەتی: لەگەڵ خاوەنەکەمداچوومە جەنگی خەیبەر، لای پێغەمبەر ﷺ باسی منیان کرد و پێیان ڕاگەیاند کە کۆیلەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا لەلای خراپی غەنیمەکەوە بەشیاندام[1].

وە لە حەدیسێکی ئیبن و عەبباس دا هاتووە کاتێ پرسیاریان لێکردوە، دەبارەی ئافرەت و بەندە کە ئایا بەشی دیاری کراویان هەیە؟

وەڵامی دایەوە ئەوانە بەشی دیاری کراویان نەبووە، مەگەر لە بەشی خەڵکەکە بەشیان بدرێت[2].

وە لە ئومو عەگیەوە کە فەرموویەتی: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ئەچوینە غەزا بریندارمان تەداوی ئەکرد و یارمەتی نەخۆشمان ئەدا، ئەویش ﷺ لە غەنیمەتەکە شتێکی بەش ئەداین[3].

وە ترمیزی لە ئەوزاعیەوە بە مورسەلی تەخریجی کردووە فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ لە خەیبەر بەشی منداڵانیشیدا[4]. مەبەست لەو بەشە بەخششێکی کەم بووە.

وە لەیەزیدی کوڕی هورمـوزەوە کە نەجدەتی حەروری نامەیەکی نووسی بۆ ئیبنو عەبباس پرسیاری دەربارەی پێنج شت لێکرد:

پاشان، پێم بڵێ :

ئایا پێغەمبەر غەزای بە ئافرەت ئەکرد؟

وە ئایا لەغەنیمەت بەشی بۆ دائەنان؟

وە ئایا منداڵی بێ باوەڕەکانی ئەکوشت؟

وە کەی هەتیو لە هەتیوی دەرئەچێت؟

وە ئایا پێنج یەکی غەنیمەت بۆ کێیە؟

ئیبنو عەبباس فەرمووی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێ بە شاردنەوەی زانیاری تاوانبار ئەبم وەڵامم نەئەدایەوە[5].

---

(١) أحمد (٥/٢٢٣) وأبوداود (٢٧٣٠) والترمذي (١٥٥٧).

(٢) أحمد (١/٣٤٩) ومسلم (١٨١٢/١٤٠).

(٣) أحمد (٦/٤٠٧) ومسلم (١٨١٢/١٤٢) وإبن ماجة (٢٨٥٦).

(٤) الترمذي (١٥٥٦).

(٥) لەبەر ئەوەی لە نەسلی بیدعە بوو.

لەپاشاندا بۆی نوسییەوە، فەرمووی:

لە نامەکەتدا پرسیارت لێ کردوم: ئایا پێغەمبەر ﷺ ئافرەتی ئەبرد بۆ غەزا؟

پێغەمبەر ﷺ ئافرەتی ئەبرد بۆ غەزا تەداوی بریندارەکانیان ئەکرد و لە غەنیمەتەکە بەشی ئەدان بەڵام ئەو بەشە دیاری کراو نەبوو وەك بەشەکانی تر.

وە پێغەمبەر ﷺ منداڵی نەئەکوشت لە جەنگدا، تۆش مەیان کوژە.

وە نوسیوتە کەی هەتیو لە هەتیوی تەواو ئەبێت؟

پیاوی وا هەیە ڕیشی دەردێت ئەوەندە بێدەسەڵاتە ناتوانێت شت بۆ خۆی پەیدا بکات، جا هەرکاتێ ئەو بەرژەوەندییانەی خەڵك بۆ خۆیان وەری ئەگرن ئەویش وەری گرت، ئەوە لە هەتیوی دەرچووە.

وە نوسیوتەو پرسیارم لێ ئەکەیت کە پێنج یەك بۆ کێیە؟

ئێمە لەوەو پێش ئەمان وت: بۆ ئێمەیە، بەڵام قەومەکەمان ئەوەیان پەسند نەکرد. هەر پێنج کەسەکە ڕیوایەتیان کردوە بوخاری نەبێت[1].

بەکرێ گیراو و جگە لە موسڵمانان بەشیان نییە :

وە هەروەها ئەو بەکرێ گیراوانەی لەگەڵ سوپاکەدان بۆ ئەوەی لە غەنیمەت دەستیان بکەوێت مافی بەشیان نییە، با شەڕیشیان کردبێت، چونکە مەبەستیان جەنگ کردن نەبووە و بۆ جیهاد دەرنەچوون، وە سوپای تازەی ئێستاش ئەگرێتەوە، چونکە وەك پیشە وکاری لێ هاتووە.

بەڵام ئەوانەی موسڵمان نین لە زمی‌یەکان ڕای زانایان جیاوازە لەسەریان، لەوەدا ئەگەر داوای یارمەتییان لێ بکرێت بۆ جەنگ و یارمەتی موسڵمانەکانیان دابێت لەجەنگدا.

جا حەنەفی‌یەکان ووتوویانە: وە لە شافیعیشەوە گێڕاویانەتەوە ڕەحمەتی خوایان لەسەربێت: کە بەشیان ئەدرێ؛ بەڵام وەك سەهم نایان درێتێ

وە هەروەها لە شافیعییەوە گێڕراوەتەوە: کە سەرۆکی موسڵمانان بەکرێیان ئەگرێت لەو ماڵەی خاوەنی نییە، جا ئەگەر ئەوەی نەکرد سەهمەکەی پێغەمبەریان ﷺ ئەداتێ.

وە پەوری و ئەوزاعی وتوویانە: سەهمیان بۆ دائەنرێت.

---

(١) أحمد (١/٢٩٤) ومسلم (١٨١٢/١٣٧) وأبوداود (٢٧٢٧).

## دزی کردن لە غەنیمەت (الغلول)

دزی کردن لە غەنیمەت حەرامە چونکە دڵی موسڵمانانی پێ ئەشکێت، وە ئەبێتە هۆی تێک چوونی نێوانیان، و سەرقاڵ کردنیان بە تاڵانی‌یەوە، کە ئەمانەش هەمووی هۆیە بۆ شکان لە جەنگدا.

لەبەر ئەوە دزی کردن لە غەنیمەت لە گوناهە گەورەکانە بەکۆی هەموو موسڵمانان.

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَغُلَّ وَمَنْ يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ (آل عمران:١٦١).

واتە: بۆ هیچ پێغەمبەرێك ﷺ نەهاتووە کە لە غەنیمەت غەش بکات بەوەی شتێك لە غەنیمەت هەڵبگرێ جگە لەوەی خوا بۆی تایبەت کردووە، جا هەرکەس لە ئێوە دزی لە غەنیمەت بکات رۆژی قیامەت کە دێت ئەیگرێت بەکۆڵەوە، بۆ ئەوەی ڕیسوا ببێت.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی‌داوە هەرکەس دزی بکات لە دەست کەتەوتەکانی جەنگی، کەل و پەلەکەی بسوتێنرێت و لێی بدرێت بۆ دورخستنەوەی خەڵك و چاو ترساندنیان کە شتی وایان لێ ڕونەدات.

ئەبوداود و ترمذي ئەگێڕنەوە لە عومەرەوە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا وجدتم الرجلَ قد غَلَّ، فاحرقوا متاعه واضربوه).

واتە: ئەگەر پیاوێکتان بینی دزی کردبوو لە غەنیمەت کەل و پەلەکەی بسوتێنن و لێی بدەن).

وتوویەتی: لەناو کەل و پەلەکانی پیاوێکدا قورئانێکمان بینی لە سالمان پرسی چی لێ بکەین؟ ووتی: بیفرۆشن و نرخەکەی بکەنە خێر[1].

لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکی‌یەوە لە باپیرەیەوە: کە پێغەمبەر ﷺ و ئەبا بەکرو عومەر کەل و پەلی ئەو کەسەیان ئەسوتاند کە دزی لە دەستکەوتە جەنگی‌یەکان ئەکرد و لێیان ئەدا[2].

وە فەرموودەی تر لەپێغەمبەر ﷺ گێڕراوەتەوە و تێی‌دا نەهاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دابێت بە سوتاندی کەل وپەلی ئەو کەسەی دزی لە غەنیمەت کردبێ و لێی دابێت.

---

(١) أحمد (١/٢٢) وأبوداود (٢٧١٣).

(٢) أبوداود (٢٧١٥) والحاكم (٢/١٣١) والبيهقي في الكبرى (٩/١٠٢).

لەمەوە بۆمان دەرئەکەویت کە کاربەدەست بە دەست خۆیەتی کە چی بە بەرژەوەندی بزانێ بەو شێوەیە بکات.

جا ئەگەر بەرژەوەندی بەو شێوەیە بوو کەلوپەل بسوتێنرێت و لێی بدرێت بیکات، بەڵام ئەگەر بەو شێوەیە بەرژەوەندی نەبوو کارێ بکات بەرژەوەندی تێدا بێت.

بوخاری لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: لەسەر کەل و پەلەکانی پێغەمبەر ﷺ کابرایەك دانرابوو پێیان ئەوت کیرکیرە، مرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (هو في النار).

واتە: وا لە دۆزەخدا.

خەڵکەکە چوون سەیری کەل و پەلەکانیان کرد، عەبایەکیان دۆزیەوە لە غەنیمەت دزی بووی[1].

وە ئەبوداود ئەگێڕێتەوە: کە پیاوێك لە صەحابەکان ڕۆژی خەیبەر کۆچی دوایی کرد، کاتێ بە پێغەمبەریان ﷺ ڕاگەیاند فەرمووی: (صلوا على صاحبكم) واتە: نوێژ لەسەر هاوەڵەکەتان بکەن.

ئەوانیش بەو قسەیە ڕوخساریان تێك چوون، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إن صاحبكم غل في سبيل الله).

واتە: هاوەڵەکەتان دزی کردووە لە غەنیمەت، ئەوانیش کەل و پەلەکەی گەڕان موروویەکیان لە مورووەکانی جولەکەی تێدا بوو کە دوو درهەمی نەئەهێنا[2].

**سوود وەرگرتن لە خواردەمەنی پێش بەشکردنی غەنیمەتەکە:**

خواردەمەنی و ئالفی وڵاخ لەوانە جیانەکرێتەوە و ڕەوایە بۆ جەنگاوەرەکان سوودی لێ وەربگرن هەتا لەخاکی دوژمندا بن، با دابەشیش نەکرابێت.

١- بوخاری و موسلیم لە عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەلەوە ئەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: ڕۆژی خەیبەر هیزەیەك پیوم دەست کەوت و گرتمە لای خۆم ووتم: ئەمڕۆ لەمە بەشی کەس نادەم، لام کردەوە، سەیرم کرد پێغەمبەر ﷺ زەردەخەنە ئەیگرێ[3].

---

(١) أحمد (٢/١٦٠) البخاري (٣٠٧٤).

(٢) أحمد (٤/١١٤) وأبوداود (٢٧١٠) والنسائي (٤/٦٤) وابن ماجة (٢٨٤٨).

(٣) البخاري (٤٢١٤) ومسلم (١٧٧٢/٧٢).

٢- ئەبو داود و حاكم و بەیهەقی لە ئیبن و ئەبی ئەوفاوە ئەخریجیان كردووە ووتوویەتی: ڕۆژی خەیبەر خواردنێكی زۆرمان دەست كەوت، هەركەس ئەهات بەشی خۆی لێ ئەبرد و ئەڕۆی[1].

٣- بوخاری لەئیبنو عومەرەوە ئەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: لە غەزاكانماندا هەنگوین و ترێمان دەست ئەكەوت ئەمان خوارد بێ ئەوەی كۆی بكەینەوە لەناو دەست كەوتەكاندا[2].

وە لە هەندێ ڕیوایەتی حەدیسەكەدا لای ئەبی داود هاتووە: كە پێنج یەكیان لێ‌دەر نەئەگرد[3].

مالیك لە (الموطأ)دا فەرموویەتی: بەڕای من قەیناكە موسڵمانان كاتێ خاكی دوژمنیان گرت لە خواردەمەنی‌یەكەیان بخۆن، ئەگەر بەدەستیان هێنا پێش ئەوەی بكەوێتە ناودەست كەوتەكانی ترەوە.

وە وتوویەتی: بەلای منەوە ووشتر و مانگا و مەڕ وەك خواردەمەنی وایە موسڵمانان بۆیان هەیە لێیان بخۆن، كاتێ خاكی دوژمنیان گرت، وەك چۆن لە خواردەمەنی‌یەكانیان ئەخۆن.

وە ووتوویەتی: ئەگەر ئەو شتانە نەخورێن هەتا كۆئەكرێنەوە ودابەش ئەكرێن زیان ئەگەیەنن بە سوپای موسڵمانان.

وتوویەتی: من بەخراپی نازانم ئەگەر بەپێی پێویست لێیان بخورێت، وە پێم وایە هەڵی نەگرن و لێی نەبەنەوە بۆ كەس وكاریان.

**موسڵمان كەل و پەلێكی خۆی دیبەوە لای دوژمن، هەر هی‌خۆیەتی:**

ئەگەر جەنگاوەرەكان ماڵی موسڵمانانیان لەدوژمن سەندەوە، ئەوە خاوەنەكانی ئەو ماڵە لەپێشترن پێی، وە هیچ لەوانە بۆ جەنگاوەرەكان نابێت، چونكە لە دەست كەوتە جەنگی‌یەكان نی‌یە.

١- لە ئیبن و عومەرەوە كە ماینێكی ڕای‌كرد لەدەستی و دوژمن بردی، دوایی موسڵمانەكان سەركەوتن بەسەریاندا ماینەكەیان بۆ گێڕایەوە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ.

٢- لە عیمرانی كوڕی حوصینەوە كە فەرموویەتی: بێباوەڕەكان هێرشیان بردەسەر لەوەڕگاكەی مەدینە و (العضباء) یان فڕاند -كە ووشترەكەی پێغەمبەر ﷺ بوو- لەگەڵ ئافرەتێكی

(١) أبو داود (٢٧٠٤) والحاكم (١٢٦/٢) والبيهقي في السنن الكبرى (٦٠/٩).

(٢) البخاري (٣١٥٤).

(٣) نيل الأوطار (١٣٤/٤).

موسـڵمانانندا. شـەوێکیان کـە ئـەوان ئەخـەون ژنەکـە هەڵئەسـتێ و بـەناو ووشـترەکاندا ئەگـەڕێت دەستئەخاتە سەر هەرکامیان ئەبارێنێ عەضباء نەبێت، ملی بۆ کەچ ئەکات، خێرا سواری ئەبێت و بەرەو مەدینە دێت، لە ڕێگا نەزر ئەکات ئەگەر خوا ڕزگاری بکـات ئـەو ووشـترە سـەربڕێت، کاتێ گەیشتەوە مەدینە ووشترەکەیان ناسییەوە، هێنایانەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ ژنەکەش نەزرەکەی خۆی پێ ڕاگەیاند، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

(بئس ماجزيتها، لا نذر فيما لايملك ابن آدم، ولانذر في معصية)[1].

واتە: پاداشتێکی خراپت داوەتەوە، نەزری ئادەمیزاد دروست نی‌یە لە شتێکدا کە خۆی خاوەنی نەبێت، وە نەزر لە سەرپێچی کردنی خوادا نی‌یە.

وە هەروەها ئەگەر بێ باوەڕێك موسڵمان بێـت و مالـی موسـڵمانێکی بەدەسـتەوە بێـت، ئـەبێ بیدەنەوە بەخاوەنی.

**جەنگاوەری بێ باوەڕ کە موسوڵمان ببێت.**

ئەگەر جەنگاوەرێکی بێباوەڕ موسوڵمان بوو کۆچی کرد بۆ خاکی ئیسلام، وە ژن و منداڵەکەی لەخاکی کوفردا بەجێ هێشت، ئەوە ئـەو ژن و مـنداڵـە وەك ژن و مـنداڵی موسـڵمانی لـێ دێـت و حەرام ئـەبێت، جا ئەگـەر موسـڵمانەکان ئـەو شـوێنەیان گـرت ناخرێتـە نـاو غەنیمەتـەوە، بـەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی:

(فإذا قالوها فقد عصموا مني دماءهم وأموالهم)[2].

واتە: ئەگەر ووشەی (لا إله إلا الله)یان وت ئەوە خوێن و مالـیان پاراستووە لەمن.

**دیلە جەنگی‌یەکان (أسرى الحرب)**

دیلە جەنگی‌یەکانیش بەشێکن لە دەستکەوتەکانی جەنگ ئەمانیش دووبەشن:

یەکەم: ئافرەت و منداڵ.

دووەم: پیاوی پێ گەیشتووی جەنگاوەری بێ باوەڕەکان، ئەگەر موسڵمانان بەزیندوویی بیانگرن.

---

(١) مسلم (١٦٤١) وأبوداود (٣٣١٦) وأحمد (٤/٤٣٠،٤٢٩).

(٢) البخاري (٢٥) ومسلم (٢٢).

ئیسلام کاری ئەو جەنگاوەرە پیاوانەی داوەتە دەست سەرکردەی موسڵمانان ئەگەر سەرکەوتن بەسەریانداو بوون بە دیل کە چی چاکترو بەسوودتر بێت ئەوەیان لەگەڵدا بکات، لە (مَنٍّ) یا (فداء) یا کوشتن.

وە (المنّ) واتە: بەبێ بەرامبەر بەرەڵا بکرێن.

وە (الفداء) بریتی وەرگرتن یا بە گۆڕینەوە ئەبێت لەگەڵ دیلە موسڵمانەکان، یان بە ماڵ ئەبێت، جا لە جەنگی بەدردا بەماڵ دیلەکانیان بەرەڵاکرد، وە بە صەحیحی هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ یەك پیاوێکی بێ باوەڕی بەنی عەقیل ی بەرداوە بەرامبەر دوو پیاوی موسڵمان. ئەحمەد و ترمژی کە بە صحیحی داناوە گێڕاویانەتەوە[1].

خوای گەورە ئەفەرموێت:

﴿فَإِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّى إِذَا أَثْخَنْتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّى تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا﴾ (محمد:٤).

واتە: جا کاتێك گەیشتن بەوانەی بێباوەڕن لە مەیدانەکانی جەنگا بەڕاستی جەنگیان لەگەڵدا بکەن و بدەن لە ملیان، تا کاتێ بە کوشتاری زۆر لاوازتان کردن و هێزو تواناتان شکاندن، دیلەکان باش پەیوەند بکەن، جا پاشان یا منەتیان بەسەردا بکەن و بەرەڵایان بکەن بێ بریتی، یا بریتی خۆیان ئەدەن بە ماڵ و شتی تر، هەتا جەنگ کۆتایی دێت.

وە موسلیم لە حەدیسی ئەنەسەوە ئەگێڕێتەوە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ ئەوانەی کە بەدیلی گرتبوونی بەرەڵای کردن، وە ژمارەیان هەشتا کەس بوو، کە پەلاماری پێغەمبەر ﷺ و یارەکانیان دابوو، لە کێوەکانی تەنعیم لە کاتی نوێژی بەیانیدا بۆ ئەوەی بیان کوژن، وە لەو بارەیەوە ئەم فەرموودەیەی خوای گەورە هاتە خوارەوە: ﴿وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنْكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُمْ بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنْ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ﴾ (الفتح:٢٤)[2].

واتە: بەڕاستی خوای گەورە بوو کە دەستی ئەوانی لە ئێوە گێڕایەوەو دەستی ئێوەی لەوان گێڕایەوە لەناو مەککەدا لە دووای ئەوەی ئێوەی سەرکەوتاند و زاڵی کردن بە سەریاندا، لەپاشاندا ئێوە ئازادتان کردن.

(١) أحمد (٤/٤٢٦) والترمذي (١٥٦٨).

(٢) أحمد (٣/١٢٤) ومسلم (١٨٠٨/١٣٣) وأبوداود (٢٦٨٨) والترمذي (٣٢٦٤).

وە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی فەتحی مەککە بە خەڵکی مەککەی فەرموو: (إذهبوا فأنتم الطلقاء)[1].

واتە: بڕۆن ئێوە ئازادن.

لەگەڵ ئەوەشدا بۆ سەرکردەی موسڵمانەکان هەیە دیلی بێ باوەڕکان بکوژێت کاتێ بەرژەوەندی وەهای ویست،

وەك ئەوە سابت بووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە نەضری کوڕی حاریث و عوقبەی کوڕی موعیطی کوشتووە لەجەنگی بەدردا، وە ئەبا عیززەتی جوحی کوشتووە ڕۆژی جەنگی ئوحود وە لەو بارەیەوە خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَنْ يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الْأَرْضِ﴾ (الأنفال:٦٧)

واتە: کاری هیچ یەك لە پێغەمبەران و یاسای نیەیە لە شەڕدا کە دیلی ببێت و دوو دڵ بێ لەنێوان ئازاد کردن و فیدیە لێ وەرگرتنیان مەگەر دوای ئەوەی زیادەڕەوی ئەکات لەکوشتنی دوژمنداو هێزو دەسەڵات بە دەست ئەهێنێ.

وە ئەوانەی بۆ ئەوە چوون جەماوەری زانایانن کە ووتوویانە:

سەرکردەی موسڵمانان مافی یەکێ لەو سێ شتەی پێشووی هەیە.

حەسەن و عەطاء وتوویانە: دیل ناکوژرێت بەڵکو یا ئازاد ئەکرێت یا بریتی لێ ئەسەندرێ.

وە زوهری و موجاهید و کۆمەڵێ لە زانایان ووتویانە: دروست نیەیە بریتی وەربگیرێ لە دیلی بێباوەڕ لەبنەڕەتدا.

مالیك وتوویەتی: ئازادکردن بێ بریتی دروست نیەیە.

حەنەفیەکان وتوویانە: ئازاد کردن دروست نیەیە لە بنەڕەتدا نە بە بریتی نە بەشتیتر.

**مامەڵە کردن لەگەڵ دیلەکاندا:**

ئیسلام بەشێوەیەکی مرۆڤایەتی و میهرەبانی لەگەڵ دیلەکاندا ڕەفتار ئەکات، وە داوای ڕێزگرتنیان و چاکە لەگەڵ کردنیان ئەکات، وە مەدحو ستایشی ئەوانە ئەکات کە بەچاکی لە گەڵیاندا ئەجولێنەوە. خوای گەورە ئەفەرموێت:

﴿وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّهِ مِسْكِيناً وَيَتِيماً وَأَسِيراً (٨) إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لا نُرِيدُ مِنْكُمْ جَزَاءً وَلا شُكُوراً﴾ (الانسان:٩). واتە: وە خواردەمەنی ئەدەن هەرچەندە خۆیان حەزیان

(١) إبن سعد في طبقاته (٢/١٤١و١٤٢) والسيرة النبوية لابن هشام (٤/٧٨).

لۆیەتی و پێویستی‌یا پێ‌یەتی بەلام ئەیدەن بە هەژار و بێ‌باوك و دیل، وە لە دڵی خۆیاندا ئەڵێن: ئێمە لەرێی خوا ئەو خواردنەتان ئەدەینێ نە پاداشتمان لە ئێوە ئەوێ نە سوپاس گوزاری.

ئەبو موسای ئەشعەری لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەگێرێتەوە کە فەرموویەتی: (فُکُّوا العانِيَ، وأجيبوا الدّاعِيَ، وأطْعِموا الْجائِعَ، وَعودوا المرَيضَ)[1].

واتە: دیل ئازاد بکەن و بەدەم داواکاری خەڵکەوە بچن و برسی تێر بکەن و سەردانی نەخۆش بکەن.

وە لە پێشەوە باسکرا کە یومامەی کوری ئەپپال موسڵمانەکان دیلی ئەکەن و ئەیهێنن بۆلای پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أحسنوا أساره).

واتە: بە چاکی مامەڵەی لەگەڵدا بکەن. وە فەرمووی: هەرچی خواردەمەنیتان هەیە کۆی بکەنەوە بۆی ببەن، وە هەموو بەیانی و عەسرێك شیری ووشترەکەی پێغەمبەریان ئەدایە.

وە پێغەمبەر ﷺ داوای لێ‌کرد موسڵمان بێت، کەچی موسڵمان نەبوو ووتی: ئەگەر داوای بریتی ئەکەیت بەئارەزووی خۆت چەند داوا ئەکەی بیکە. پێغەمبەریش ﷺ بەبێ بەرامبەر ئازادی کرد، جا هەر ئەوەش بوو بە هۆی موسڵمان بوونی[2].

وە لە صحاح دا هاتووە دەربارەی دیلەکانی غەزای بەنی موصطەلەق -وە لەنێوان دیلەکاندا جوەیریەی کچی حاریسی تێدابوو-، کە حاریسی کوری ئەبی ضیراری باوکی هات بۆ مەدینە و ژمارەیەکی زۆر ووشتری هێنابوو بۆ ئەوەی بیدات بە بریتی کچەکەی، بەلام لە شیوی (عەقیق) پێش گەیشتنە مەدینە، بە چەند میلێك دوو ووشتری لێ شاردەوە کە پێی چاك بوو لەناو دۆڵێکدا لە کێوەکە.

جا کاتێ گەیشتە لای پێغەمبەرﷺ ووتی: ئەی موحەممەد کچەکەمتان بەدیلی گرتووە ئەو وشترانەم هێناوە بۆ ئازادکردنی.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئەو دوو ووشترە کووان کەشاردووتەوە لە (عەقیق) لەفلان دۆڵا؟

حاریس وتی: (أشهد أن لا اله إلا الله و أنك رسو ل الله).

سوێند بەخوا ئەوە تەنها خوا ئاگاداری کردوویت، ئیتر حاریس خۆی و دوو کوڕ و کچەکەی موسڵمان بوون.

---

(١) البخاري (٣٠٤٦).

(٢) البخاري (٤٣٧٢) ومسلم (١٧٦٤/٥٩).

ئیتر پێغەمبەر ﷺ ئەو کچەی لەباوکی خواست و هێنای، پاشان خەڵك ووتیان: ئەو دیلانەی بەدەستمانەوە بوون بوونە خزمی پێغەمبەر ﷺ ئیتر بێ بەرامبەر ئازادکران.

عائیشە خوای لێ ڕازی بێت ئەڵێت: نازانم کەس لە جوەیریە پیت و فەڕی زۆرتر بوبێت بۆ نەتەوەکەی، چونکە کاتێ مێردی کرد بە پێغەمبەر ﷺ سەد کەسی لە بنەماڵەی (بنی مصطلق) لێ ئازاد کردن[1].

وە پێغەمبەریش ﷺ هەر لەبەر ئەوە بوو کە مارەی کرد، نەك بۆ ئارەزوبازی، بەڵکو لەبەر بەرژەوەندی‌یەکی شەرعی کە ئەوەی پێویست کردووە، وە ئەگەر بۆ ئارەزوبازی بوایە بەدیلی جەنگی ئەی برد بۆ خۆی، ئەو کاتە بەمولکی یەمین ئارەزوی لێ ئەشکاند.

## کۆیلەیی (الإسترقاق)

بەڕاستی لە قورئانی پیرۆزدا دەقێك نەهاتووە کە کۆیلەیەتی بەڕەوا دانابێت، بەڵکو بانگەوازی ئازادی کردووە.

وە لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەچەسپاوە کە دیلێکی کردبێت بە کۆیلە، بەڵکو هەموو کۆیلەکانی مەککەو بەنی موصطلق و حونەینی ئازاد کردووە .

وە سابت بووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هەرچی کۆیلەیەکی سەردەمی نەفامی کە لای بووبێت ئازادی کردووە، وەهەروەها ئەو بەندانەی ئازاد کردووە کە پێی بەخشراوە.

لە سەر ئەمانەوە سابت بووە کە خەلیفەکانی ڕاشیدین خوا لێ یان ڕازی بێت هەندێ لە دیلە جەنگی‌یەکانیان کردە کۆیلە لەسەر بنەمای (معاملة بالمثل) مامەڵە بە هاوشێوەی خۆی، بەڵام لەهەموو شێوەیەکدا کردنە بەندەیان بەڕەوا دانەناوە، وەك لە یاسا ئاسمانیەکان و یاسا دانراوەکان دایان ناوە، بەڵکو تەنها لەو جەنگانەدا ڕێیان پێداوە کە یاسایی بووە دژی دوژمنە بێ باوەڕەکان، وە هەموو شێوەکانی تریان هەڵوەشاندۆتەوە، وە بە حەرامیان داناوە لەرووی شەرعەوە.

وە لەگەڵ ئەوەشدا کە ئیسلام سەرچاوەکانی کۆیلەیەتی تەنگ کردۆتەوەو بەو شێوەیە بەستویەتی‌یەوە، لەلایەکی ترەوە بە شێوەیەکی جوان مامەڵەی لەگەڵ کۆیلەدا کردووە، وە دەرگای ئازادی بۆ خستۆتە سەر پشت وەك لەمانەی خوارەوەدا دەرئەکەوێت:

---

(١) أحمد (٤/٢٧٧) وأبوداود (٣٩٣١) والبيهقي في دلائل النبوة (٤/٤٩-٥٠) والطبراني في للمعجم الكبير (٢٤/٦١).

**مامەڵەکردن لەگەڵ کۆیلەدا:**

ئیسلام ڕێزی زۆری بۆ بەندەکان داناوە وچاکەی زۆری لەگەڵدا کردوون، و دەستی میهرەبانی بۆ ڕاخستوون، وە نەی‌کردون بەگاڵتە جاڕ و شوێنی قسەپێ ووتن و بە سووك زانین، وە ئەوە لەمانەی خوارەوەدا دەرئەکەوێت:

١- خوای گەورە ڕاسپاردەی موسڵمانانی کردووە دەربارەیان و فەرموویەتی: ﴿وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً وَبِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَالْجَارِ ذِي الْقُرْبَى وَالْجَارِ الْجُنُبِ وَالصَّاحِبِ بِالْجَنْبِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾ (النساء:٣٦).

واتە: خوا بپەرستن و کەس لە پەرستندا مەکەنە هاوبەشی، وە چاکە بکەن لەگەڵ باوك و دایك و مافەکانیان بەجێ بهێنن، هەروەها مافی خزمان و هەتیوان و هەژاران و دراوسێی نزیك و دوور و هاوڕێ لەسەفەرداو لەنیشتەجێ‌ییداو ڕێبواری دەست کورت و ئەو بەندانەی کە ئێوە خاوەنیانن بەجێ بهێنن.

وە لە عەلی‌یەوە خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أتقوا الله فیما ملکت أیمانکم)[1].

واتە: ترسی خواتان هەبێت لەمامەڵە کردن لەگەڵ ئەوانەی کەوتونەتە ژێردەستان لەکۆیلەکانتان.

٢- قەدەغەی کردووە بە شێوەیەك بانگ بکرێن کە بە سوك زانین و بەندایەتی بگەیەنێت، لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لایقل أحدکم عبدي أو أمتي، ولیقل فتاي وفتاتي، وغلامي)[2].

واتە: کەستان بە بەندە و کنیزەکەکانی خۆتان نەڵێت بەندەکەم و کەنیزەکەم، بەڵکو بڵێت کوڕەکەم یا کچەکەم یا غوڵامەکەم.

٣- فەرمانی داوە کە خاوەنەکەی چی ئەخوات و چی لەبەر ئەکات لەوەش بەشی ئەو بدات، لە ئیبن و عومەرەوە خوا لێ یان ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (خولکم إخوانکم جعلهم

---

(١) أحمد (٦/٢٩٠) وأبوداود (٥١٥٦) وإبن ماجة (٢٦٩٨).

(٢) البخاري (٢٥٥٢) ومسلم (٢٢٤٩).

الله تحت أيديكم، فمن كان أخوه تحت يده فليطعمه مما يأكل، وليلبسه مما يلبس، ولا تكلفوهم مايغلبهم، فإن كلفتموهم مايغلبهم فأعينوهم)[1].

واتە: خزمەت کارەکانتان براتانن، خوا خستونی‌یە ژێر دەستان، جا هەرکەس براکەی لەژێر دەستی خۆیدا بوو، ئەوە چی ئەخۆن لەوەش بیدەن بەوان، وە چی ئەپۆشن لە وەش بۆ ئەوانە بکەن، و لەتوانای خۆیان زیاتر کاریان پێ‌مەکەن، وە ئەگەر لەتوانای خۆیان زیاترتان پێ‌کردن، یارمەتی‌یان بدەن.

٤- قەدەغەی کردووە ستەمیان لێ بکرێت و ئازار بدرێن، لە ئیبن و عومەرەوە خوا لێیان رازی بێت: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من لطم مملوكه أو ضربه فكفارته عتقه)[2].

واتە: هەرکەسێ زللەی دا لە خزمەت کارەکەی یا لێ‌یدا کەفارەتەکەی ئازاد کردنێتی.

وە لە ئەبی مەسعودی ئەنصاری‌یەوە کە ووتوویەتی: جارێکیان لە خزمەتکارێکی خۆمم ئەدا گوێم لە دەنگێك بوو لەدوامەوە، سەیرم کرد پێغەمبەرە ﷺ ئەی فەرموو: (إعلم أبا مسعود أن الله أقدرُ عليك منك على هذا الغلام).

واتە: ئەی ئەبا مسعود بزانە تۆ چەند دەسەڵاتت هەیە بەسەر ئەو غولامەدا خوا بەدەسەڵات ترە بەسەر تۆدا. ئەبو مەسعود ئەڵێ ووتم: وا لە رێی خوادا ئازادم کرد.

فەرمووی: (لولم تفعل لمستك نار)[3].

واتە: ئەگەر وەهات نەکردبایە ئاگرت بەر ئەکەوت.

وە دەسەڵاتی داوە بەقازی کە ئەگەر چەسپا مامەڵەی توندوتیژی لەگەڵدا ئەکرێت، حوکم بە ئازاد کردنی بدات.

٥- بانگەوازی فێرکردن و پەروەردەکردنیان ئەکات، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من كانت له جارية فعلمها، وأحسن إليها وتزوجها، كانت له أجران في الحياة وفي الأخرى، أجر بالنكاح و التعليم، و أجر بالعتق)[4].

---

(١) البخاري (٦٠٥٠) ومسلم (١٦٦١) وأبوداود (٥١٥٧و٥١٥٨و٥١٦١) والترمذي (١٩٤٥) من حديث أبي ذر.

(٢) مسلم (١٦٥٧) وأبوداود (٥١٦٨).

(٣) مسلم (١٦٥٩) وأبوداود (٥١٥٩) والترمذي (١٩٤٨).

(٤) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابوورد.

واتە: هەرکەس کەنیزەکێکی هەبێت فێری بکات و بەچاکی لەگەڵیا بجوڵێتەوە و بیهێنێت دوو پاداشتی هەیە، لەژیان و مردندا، پاداشتێك بەوەی کە هێناویەتی و فێری کردووە، و پاداشتێك بە ئازادکردنی.

**ڕێگای ئازادی:**

ئیسلام دەرگاکانی ئازادی خستۆتە سەرپشت و ڕێی ڕزگاری ڕوون کردۆتەوە، وەچەندەها هۆی جیاجیای ئامادە کردووە بۆ ڕزگار کردنی ئەوانە لە کۆیلەیەتی:

١- کەواتە ئازاد کردن ڕێگایەکە بۆ چوون بەرەو میهرەبانی خوا و بەهەشتەکەی، خوای گەورە ئەفەرموێت:

﴿فَلا اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ (١١) وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ (١٢) فَكُّ رَقَبَةٍ﴾ (البلد:١٣) واتە: ئەی بۆچی لەتەنگانەو نارەحەتی ڕۆژی دوایی تێ ناپەڕێت بە بەخشینی ماڵەکەی، تا دڵنیا بێت.

تۆ چوزانیت ئەو تەنگانەیە چی‌یەو، بەچی لێی ئەپەڕیتەوە؟ ئازاد کردنی گەردنێکی باوەڕدارە لەبەندی کۆیلەیەتی.

عەرەبێکی دەشتەکی هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی نێرراوی خوا کارێکم پێ بڵێ بم خاتە بەهەشتەوە، ئەویش فەرمووی: (عتق النَّسمة وفك الرقبة).

کابرا ووتی: هەر یەکێك نین ئەی نێرراوی خوا؟

فەرمووی: (لا، عتق النسمة أن تنفرد بعتقها، وفك الرقبة أن تعين في ثمنها)[1].

واتە: عتق النسمة: ئەوەیە بە تەنها ڕزگاری بکەیت.

وفك الرقبە: ئەوەیە یارمەتی بدەیت لە نرخی ئازادکردنیا.

٢- وە ئازادکردن کەفارەتی کوشتنی بەهەڵەیە، خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَمَنْ قَتَلَ مُؤْمِناً خَطَأً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ﴾ (النساء:٩٢).

واتە: وە هەرکەس باوەڕدارێکی کوشت بەهەڵە، کەفارەتەکەی ئازادکردنی بەندەیەکی باوەڕدارە.

٣- وە ئازادکردن، کەفارەتی سوێند خستنە، بە پێی فەرموودەی خوای گەورە کە فەرموویەتی: ﴿فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ﴾ (المائدة:٨٩).

---

(١) أحمد (٤/٢٩٩) وابن حبان (٣٧٥) والبيهقي في شعب الإيمان (٤٣٣٥) ومجمع الزوائد (٤/٢٤٠).

واتە: جا کەفارەتەکەی تێرکردنی دە هەژارە لە ناوەندی ئەو خواردنەی ئەیدەن بە خێزانەکانتان، یا پۆشاك پێدانیانە، یا ئازادکردنی بەندەیەکە.

٤- وە ئازاد کردن کەفارەتە بۆ (ظهار)، خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا﴾ (المجادلة: ٣).

واتە: وە ئەو کەسانەی ژنەکانیان لەسەر خۆیان حەرام ئەکەن بە (ظهار) لەپاشاندا پاشگەز ئەبنەوە لەوەی ووتویانە ئەبێ بەندەیەك ئازادبکەن پێش ئەوەی بچنە لای یەك.

٥- ئیسلام نرخی کڕینی کۆیلە و ئازاد کردنیانی داناوە لە مەسرەفەکانی زەکات، خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ﴾ (التوبة: ٦٠).

واتە: زەکات ئەدرێ بە هەژاران و کەم دەسان و ئەوانەی خەریکی کار وباری زەکاتن، وە ئەوانەی دڵیان ڕائەهێنرێ بە زەکات، وە ئەدرێ بۆ ئازادکردنی کۆیلە.

٦- فەرمانی داوە نامە بنوسرێ بۆ ئازاد کردنی کۆیلە لەسەر هەندێ ماڵ، لەو بارەیەوە ئەفەرمووێ: ﴿وَالَّذِينَ يَبْتَغُونَ الْكِتَابَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْراً وَآتُوهُمْ مِنْ مَالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ﴾ (النور:٣٣).

واتە: وە ئەو بەندانەی کە ئەیانەوێ خۆیان ئازاد بکەن لەسەر هەندێ ماڵ کە بیدەن بە خاوەنەکانیان، ئەبێ خاوەنەکانیان نامەیان بۆ بنوسن لەسەر ئەوە ئەگەر زانیتان خێریان تێدایە، وە ژیری و توانای کارکردنیان هەیە، وە گەورەکانیان و جگە لەوانیش لەسەریانە کە یارمەتیان بدەن لەو سامانەی خوا پێیانی داوە.

٧- هەرکەس نەزر بکات بەندەیەك ئازاد بکات پێویستە لەسەری نەزرەکە بەجێ بهێنێ هەرکاتێ مەبەستەکەی هاتەدی.

وە لەمانەوە دەرئەکەوێت کە ئیسلام سەرچاوەی کۆیلەیەتی تەنگ کردۆتەوە، و مامەڵەیەکی بەرێزانەی لەگەڵدا کردوون، وە دەرگاکانی ئازادی خستۆتەوە سەرپشت، تا ئامادەبن بۆ ڕزگار بوونیان بە تەواوی لە نیری زەلیلی و بەندایەتی، بەو شێوەیە دەستێکی بۆ درێژ کردوون کە لەبیر ناچێتەوە بەدرێژایی ڕۆژگار.

## زەوی جەنگاوەرە بێ باوەڕەکان کە بە غەنیمەت ئەگیرێ

ئەو زەویـیەی کە بەزۆر ئەگیرێ:

ئەگەر موسڵمانەکان خاکێکیان گرت بەزۆری جەنگ و کوشـتار، و خەڵکەکـەیان لەسـەر لابـرد، کاربەدەستی موسڵمانەکان لەم دووکارە کامیان بکات ئارەزوی خۆیەتی:

١- یا دابەشی ئەکات بەسەر جەنگاوەرەکاندا.

٢- یا ئەیکاتە وەقف لەسەر موسڵمانان.

جا ئەگەر کردیە وەقف، بەشـێوەیەکی هەمیـشەیی خـەراجی لەسـەر دائـەنێ، وە وەرئـەگیرێ لـەو کەسانەی زەوی‌یەکە لەدەستیاندایە، موسڵمان بن یا زیمی، وە ئەو خەراجە کرێـی زەوی‌یەکەیـە کـە هەموو ساڵێك وەرئەگیرێ.

وە بنەمای خەراجیش کاری عومەر بووە خوا لێی ڕازی بێت، لەو زەوی‌یانەدا کە فـەتحی ئـەکردن وەك زەوی شام و میصر و عێراق.

### ئەو زەوییەی خەڵکەکەی بەجێی ئەهێڵن لە ترسان یا بەصوڵح

وەك چۆن پێویستە دابەشکردنی زەوی بەغەنیمەت گیراو بەسەر جەنگاوەرەکاندا، یا وەقف کردنی لەسەر موسوڵمانان.

بەو شێوەیەش پێویستە بۆ ئەو زەوی‌یانەی کە خاوەنیان لەترسان بۆمـان بـەجێ ئـەهێڵن، یـا ئـەو زەوی‌یانەی کە صوڵحیان لەگەڵدا ئەکەین لەسەر ئەوەی کە بۆ موسڵمانان بێـت، و ئـەیان هێڵینـەوە لەسەریان بە خـەراج، بـەڵام ئـەو زەوی‌یانـەی بـە صـوڵح ئەدرێتـەوە بـەوان، و ئێمـە خـەراجمان هەیـە لەسەریان، ئەوە وەك سەرانە وایە و بە موسڵمان بوونیان لەسەریان لا ئەچێت.

وە ئەگەر خەراج کرێ بێت دانانی ئەگەڕێتـەوە بـۆ حـاکم بـە پێـی ئیجتهـادی خـۆی دای ئـەنێت، چونکە ئەوە ئەگۆڕێت بە پێی جیاوازی سەردەم و شوێن، وە پێویـست نیـیە گەڕانـەوە بکرێـت، بـۆ ئەوەی عومەر دایناوە خوا لێی ڕازی بێت.

وە ئەوەی عومەر و پێشەواکانیتر دایان ناوە چۆن بووە هەربەو شێوەیە ئەمێنێتەوە، وە کەس بۆی نییە بیگۆڕی هەتا هۆکەی ئەگۆڕێت چونکە دانانی حوکمە.

### نەبوونی توانا بۆ ئاوەدان کردنەوەی زەوی خەراجی:

هەرکەس زەوی‌یەکی باجی لە ژێـر دەسـت دابـوو، و نـەیتوانی ئـاوەدانی بکاتـەوە ناچـار ئـەکرێ لەسەر یەکێ لەمانە:

١- یان ئەیدات بەکرێ
٢- یا وازی لێ ئەهێنێ.

چونکە ئەو زەویانە لە ڕاستیدا زەوی هەموو موسڵمانانە، وە دروست نیە پەك بخرێن.

**میراتی زەوییە بەغەنیمەت گیراوەکان:**

وە ئەو جۆرە زەوییانە بەمیراتیش وەرئەگیرێن لەو کەسەوە کە بەدەستییەوەیە هەر بەو شێوەیە ئەگوێزرێتەوە بۆ میراتگرەکانی.

**(الفيء)**

پێناسەکەی: (فيء) لە (فاء يفيء) وەرگیراوە بەمانای (رجع) وە (فيء) بریتییە لەو ماڵەی کە موسوڵمانان بەبێ جەنگ لە دوژمنانیانەوە بەدەستیان هێناوە،

وە ئەوەیە کە خوا لەم فەرموودەیەدا باسی کردووە:

﴿وَمَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْهُمْ فَمَا أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلا رِكَابٍ وَلَكِنَّ اللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُ عَلَى مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (٦) مَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ كَيْ لا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاءِ مِنْكُمْ وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ (٧) لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَاناً وَيَنْصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ (٨) وَالَّذِينَ تَبَوَّأُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِنْ قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (٩) وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلّاً لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَؤُوفٌ رَحِيمٌ﴾ (الحشر:٦-١٠). واتە: ئەوەی خوا دەستی پێغەمبەری خستووە لە سامان و ماڵی بەنی نەضیر، کە ئێوە نە ئەسپ نە ووشترتان بۆ تاو نەداوە، بەڵکو خوا نێرراوەکای خۆی زاڵ ئەکات بەسەر هەرکەسدا بیەوێ لەدوژمنانی، وە خوا دەسەڵات و توانای هەیە بەسەر هەموو شتێکدا، ئەوەی خوا دەستی پێغەمبەری خستووە لە سامان و ماڵی بێ باوەڕە دێهاتییەکان، بۆ خواو پێغەمبەرکەیەتی، سەرف ئەکرێ بۆ بەرژەوەندییە گشتییەکانی موسوڵمانان، وە هەروەها بۆ خزمانی پێغەمبەر و هەتیوان و کەم دەست و ڕێبوارانە، ئەمەش بۆ ئەوەی نەبێتە ماڵێك تەنها دەوڵەمەندەکان دەستاو دەستی پێ بکەن و فەقیرو هەژارەکان لێی بێ بەش بن. وە پێغەمبەر ﷺ هەرچی پێیدان وەری بگرن و هەرچی

لێقەغەکردن وازی لێ بهێنن، وە لەخوا بترسن، چونکە خوا سزای توندە، هەروەها لەو دەستکەوتە ئەدرێ بە کۆچکەرە هەژارەکان کە لە ماڵ و خانەی خۆیان دەرکراون و داوای بەخششی خوا ئەکەن لە دنیاو ڕەزامەندی لە ڕۆژی دواییدا، وە یارمەتی دەری ئاینی خوا و پێغەمبەرەکەین، بەڕاستی ئەوانە ڕاستگۆن. وە ئەو کەسانەی دانیشتووی مەدینە بوون باوەڕیان هێنابوو پێش کۆچ کردنی کۆچکەرەکان —کە یاریدە دەرانن﴾ ئەوانەیان خۆش ئەوێ کە کۆچیان کردووە بۆلایان و یارمەتی‌یان ئەدەن بە ماڵیان و لە دڵیانا هیچ حەسوودی و ناڕەحەتی‌یەك نی‌یە لەوەی کە لە ماڵی (فيء) و جگە لەو پێ‌یان ئەدرێ، وە ئەوان و کەسانی تری ئەبوو پێش خۆیان ئەخەن، هەرچەند خۆشیان هەژار بن و پێویستی‌یان ببێت، وە هەرکەس لە پیسکەیی نەفسی خۆی پارێزراو بێت ئەوانەن براوەو سەرکەوتوو.

وە ئەو بڕوادارانەی کە دووای یاریدەدەران و کۆچ کەران هاتوون ئەڵێن: پەروەردگارمان لەئێمە و لەو برایانەمان خۆش ببە لەباوەڕدان کە پێشمان کەوتوون، وە ڕق و کینەیەك لە دڵمانا دروست مەکە بەرامبەر بەوانەی باوەڕدارن، پەروەردگارمان بەڕاستی تۆ میهرەبان و بە بەزەییت.

جا ئەبینین خوا باسی ئەو کۆچ کەرانەی کردووە کە کۆچیان کردووە بۆ مەدینەو پێش فەتحی مەککە موسڵمان بوون. وە باسی یارمەتی دەرانی کردووە ئەوانەی جێی کۆچکەرانیان کردەوە. وە باسی ئەوانەشی کردووە کە دووای ئەوان دێن هەتا ڕۆژی دوایی.

**دابەشکردنی (فيء) :**

قورطوبی وتوویەتی: مالیك وتوویەتی: دابەشی کردنی ئەو دەستکەوتە (الفيء) خراوەتە سەرشانی ئیمام و بیروڕای خۆی، جا خۆی بێ دیاری کردن لێی هەڵئەگرێت، وە بەڕای خۆی بەشی خزمانی ئەدا، وە ئەوەی مایەوە لەبەرژەوەندی‌یەکانی موسڵمانان سەرفی ئەکات.

وە جێنشینەکانی پێغەمبەر ﷺ هەرئەوەیان ووتووە و بەو شێوەیە کاریان کردووە، وە فەرموودەی پێغەمبەرﷺ بەڵگەیە لەسەری کە ئەفەرمووێ: (مالي مما أفاء الله عليكم إلا الخمس، و الخمس مردود عليكم).

واتە: لە پێنج یەك زیاتر بۆ من نی‌یە لەوەی دەستان کەوتوە، پێنج یەکەکەش هەر بۆخۆتان سەرف ئەکرێتەوە.

چونکە پێغەمبەرﷺ بە پێنج یەك‌و سێ یەك دابەشی نەکردووە، وە ئەوەی لە ئایەتەکەدا باس کراوە بۆ ئاگادارکردنەوەیە لەسەریان، چونکە ئەوانە لە پێشترن کە پێ‌یان بدرێ.

(زجاج) بەرپەرچی مالیکی داوەتەوە و ووتوویەتی: خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنْفِقُونَ قُلْ مَا أَنْفَقْتُمْ مِنْ خَيْرٍ فَلِلْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ﴾ (البقرة:٢١٥).

واتە: لێت دەپرسن —ئەی محمد- چی بکەن بەخێر لە جۆرەکانی ماڵ کە هەیانە، بڵێ: هەرچیتان بۆ ئەکرێ لە جۆرەکانی ماڵی حەڵاڵ، وە بەخششەکەتان بدەن بە دایك و باوك و خزمانتان، وە بە هەتیوان و هەژاران و ئەو ڕێبوارە هەژارەی کە دوور کەوتۆتەوە لە ماڵ و کەس و کاری.

لە کاتێکدا بەرای هەموو زانایان دروستە پیاو خێر بکات بە جگە لەوانەش ئەگەر بە بەرژەوەندی زانی.

نسائی باسی کردووە لە عەطائەوە کە فەرموویەتی: پێنج یەکی خوا و پێنج یەکی پێغەمبەر ﷺ هەریەکە، پێغەمبەر لێی هەڵئەگرت و لێی ئەبەخشی و بە ئارەزوی خۆی دابەشی ئەکرد و سەرفی ئەکرد و ئارەزوی خۆی بوو چی پێ ئەکرد.

وە لە (حجة الله البالغة)دا هاتووە ئەڵێت: لە سونەتەکاندا جیاوازی هەیە لە چۆنێیەتی دابەشکردنی (الفيء)دا، پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئەو دەست کەوتەی بۆ بهاتایە هەر ئەو ڕۆژە دابەشی ئەکرد، خاوەن خێزان دووبەشی ئەدایە و بێ خێزان یەك بەش، وە ئەبوبەکر خوای لێ ڕازی بێت دابەشی ئەکرد بەسەر بەندە و ئازاددا و بەشی پێویستی ئەدانێ.

وە عومەر خوای لێ ڕازی بێت تۆماری بۆ دانا بەپێی لەپێشتری و پێویستی دابەشی ئەکرد، پیاوی وا هەبوو، بە پێی دێرینی لەئیسلامدا، وە پیاوی وا هەبوو بەپێی ئازایەتی لە جەنگدا، وە هەبوو بە پێی خێزانی، وە هەبوو بە پێی پێویستی ئەیان درایە.

وە ئەوەی ڕاستر بێت لە هەموو ئەو جیاوازیانەی کە وەکو ئەمەیە، ئەوەیە کە ئەم کارە بە پێی ئیجتهاد کراوە.

## پەیمانی بێ وەیی (عقد الأمان)

ئەگەر هەر کەسێك لە جەنگاوەرەکانی دوژمن داوای پەیمانی بێ وەیی کرد، ئەبێ لێی وەربگیرێ، وە بەو پەیمانە بێ وەی و ئاسوودە ئەبێت و دروست نابێت بەهیچ شێوەیەك دەست درێژی بکرێتەسەر.

خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَإِنْ أَحَدٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (التوبة:٦). واتە: ئەگەر کەسێك لە بێباوەڕان کە خوێن و ماڵیان ڕەوا کراوە داوای ئەمانی کرد، پەنای بدە هەتا قورئان و ڕێنمایی قورئان ببیستێ،

لەپاشاندا بە ئەمینی بیگەیەنەوە بە جێگای خۆی، چونکە بێ باوەڕەکان حەقیقەت و ڕاستی‌یەکانی ئیسلام نازانن.

**کێ مافی بەستنی ئەو پەیمانەی هەیە:**

ئەو مافە چەسپاوە بۆ ژن و پیاو و ئازاد و بەندە، وە بۆ هەریەك لەمانە هەیە کە پەنای هەرکەسێکی بێ باوەڕ بدات کاتێ داوای پەنا بکات، وە نابێ ئەو مافە لە هیچ کەسێکی موسڵمان قەدەغە بکرێت منداڵ و شێت نەبێت، جا ئەگەر منداڵێك یا شێتێك پەنای کەسێکی دوژمنیدا ئەو پەنایە دروست نی‌یە.

ئەحمەد و ئەبوداود و نەسائی و حاکم لە عەلی‌یەوە ئەگێڕنەوە، خوا لێی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ذمة المسلمين واحدة، يسعى بها أدناهم، وهم يد على من سواهم)[1].

واتە: موسڵمانان هەموو یەك پەنایان هەیە و لە بچوکترینیان پەنا ئەدات، وە هەروەها دەستێکن لەسەر دوژمنیان.

وە بوخاری و ئەبو داود و ترمذی لە (أم هانيء) کچی ئەبو طالیبەوە خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕنەوە کە فەرمورویەتی: ووتم ئەی نێرراوی خوا کوڕەکەی (أم علي) ئەڵێت: ئەو پیاوە ئەکوژم کە تۆ پەنات داوە -کە ئیبنو هوبەیرەیە- پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (قد أجرنا من أجرتِ يا أم هانيء)[2].

واتە: پەنای ئەو کەسە ئەدەین کە تۆ پەنات داوە ئەی (أم هانيء).

**ئەنجامی پەنادان:**

پەنادان هەر چۆنێك بڕیاری لە سەر بدرێ، بەووتن یابە ئیشارەتەوە بکرێت، دروست نی‌یە دەست درێژی بکرێتە سەر پەنادراو لەلایەن موسڵمانانەوە، چونکە بەو پەنادانە خوێنی لە ڕشتن ئەپارێزرێ، وە هەروەها گەردنی لەبەندایەتی ئەپارێزرێ.

وە ئەگێڕنەوە لە عومەری کوڕی خەگگابەوە خوای لێی ڕازی بێت: کە پێی گەشتووە هەندێ لە موجاهیدەکان بەجەنگاوەرە فارسەکان ئەڵێن: (مەترسە، لە پاشاندا ئەیکوژێت) عومەر خوا لێی ڕازی بێت بۆ سەرکردەی سوپاکەی نووسی:

---

(١) أحمد (١/٨١) وأبوداود (٤٥٣٠) والنسائي (٨/١٩) والحاكم (٢/١٤١).

(٢) البخاري (٣١٧١) وأبوداود (٢٧٦٣) والترمذي (٢٧٧٥).

(پێم گەیشتوە کەهەندێ لە پیاوەکانتان سەرئەکەونە سەر شاخەکە بۆ جەنگاوەرە فارسەکان. کاتێك خۆی قایم ئەکات پێی ئەڵێ: (مەترسە) کەچی کە ئەیگاتێ ئەی کوژێت! وە من سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، پێم بگات کسێك کاری وەهای کردبێت لەملی ئەدەم).

بوخاری لە تەئریخەکەیدا هەروەها نەسائی ئەگێڕنەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: (مَن أمَّنَ رجلاً على دمه فقتله، فأنا بريئ من القاتل وإن كان المقتول كافراً)[1].

واتە: هەرکەس پەنای پیاوێکیدا کە گیانی بپارێزێ و پاشان کوشتی، من بێبەریم لەو بکوژە با کوژراوەکەش بێ باوەڕ بێت.

وە بوخاری و موسلیم و ئەحمەد لە ئەنەسەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لكل غادر لواء يعرف به يوم القيامة)[2].

واتە: هەموو غەدرکەرێك ئاڵایەکی ئەبێت کە ڕۆژی دوایی پێی ئەناسرێتەوە.

**کەی ئەو مافە ئەچەسپێ:**

مافی ئەمان هەر بە پەنادانەکە ئەچەسپێ و کاریگەر ئەبێ لەکاتی دەرچوونیەوە، بەڵام بەتەواوی دائامەزرێت هەتا حاکم یا سەرکردەی سوپا بڕیاری لەسەر نەدات.

جا ئەگەر بڕیار درا لەسەر ئەمان، لەلایەن حاکم یا سەرکردەی سوپاکەوە، ئەو پەنا دراوە ئەبێتە ئەهلی زیمە، ئیتر چی بۆ موسوڵمانانە بۆ ئەویشە، وە چی لەسەر موسڵمانانە لەسەر ئەویشە.

وە دروست نیە هەڵوەشاندنەوەی ئەو ئەمانەی مەگەر بچەسپێت کە ئەو مافە بەکاردێنی بۆ ئەوەی زیان بە موسڵمانان بگەیەنێت، وەك ئەوەی جاسوسی کۆمەڵەکەی خۆی بێت، و چاو بێت لەسەر موسڵمانان.

**بەستنی پەیمانی ئەمان بۆ ناوچەیەك:**

کاتێك ئەمان دروستە لە یەکە یەکەی موسڵمانانەوە، ئەگەر ئەمانی یەك یا دوو نەفەر بدات، بەڵام عەقدی ئەمان بۆ خەلکی شوێنێك بە گشتی دروست نیە، لەلایەن ئیمامەوە نەبێت ئەویش بە پێی ئیجتهاد و گەڕان بەشوێن بەرژەوەندیدا هەروەك پەیمانی زیمە، جا ئەگەر ئەو کارە بۆتاکە کەسی موسڵمانان بێت، ئەبێتە هۆیەك بۆ پوچەڵکردنەوەی جیهاد.

---

(١) صحيح الجامع (٦١٠٣) والسلسلة الصحيحة (٤٤١).

(٢) مسلم (١٧٣٨/١٥و١٦) وأحمد (٢/٧٥و١١٦) من حديث أبي سعيد.

## نێرراو حوکمی پەنادراوی هەیە

نێرراو وەك ئەمان پێ دراو وایە، ئیتر نامە هەڵگر بێت، یا لەنێوان دوو کۆمەڵدا بۆ صولح هاتوچۆ بکات، یا هەوڵی وەستانی شەڕ بدات بۆ ماوەیەك بتوانرێت کوژراو و برینداری هەردوولا بگوێزرێتەوە.

پێغەمبەر ﷺ بە هەردوو نێرراوەکەی موسەیلەمەی فەرموو:

(لولا أن الرُّسُل لاتقتل لَضربت أعناقكما)[1] أخرجه أحمد و أبوداود من حديث نعيم بن مسعود.

واتە: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە کە نێرراو ناکوژرێ، لە ملتانم ئەدا.

وە قورەیش ئەبا رافعیان نارد بۆ لای پێغەمبەر، ﷺ ئەویش باوەڕ چووە ناو دڵیەوە، ووتی: ئەی نێرراوی خوا ناگەڕێمەوە بۆناویان موسڵمان ئەبم و ئەمێنمەوە لەگەڵتان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ( إني لا أخيس بالعهد، ولا أحبس البُرُدَ فارجع إليهم آمناً، فإن وجدت بعد ذلك في قلبك مافيه الآن، فارجع إلينا) أخرجه أحمد و أبو داود و النسائي وأبن حبان و صححه[2].

واتە: من نە پەیمان هەڵئەوەشێنمەوە نە نێرراو بەند ئەکەم، بە سەلامەتی بگەڕێرەوە ناویان، جا ئەگەر دووای ئەوە ئەوەی ئێستا لە دڵت دایە هەر هەستت پێکرد بگەڕێرەوە ناومان.

لە کتێبی (الخراج) ی ئەبی یوسف و کتێبی (السير الكبير)ی محمدا هاتووە: ئەگەر نێرراو مەرجی بۆ دانرا پێویستە لەسەر موسڵمانان بەجێی بهێنن، وە دروست نییە غەدر لە نێرراوی دوژمن بکەن، هەتا ئەگەر بێ باوەڕەکان بارمتەی موسڵمانانیش بکوژن کە لایانن، ئێمە نابێ نێرراوەکەیان بکوژین، بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر کە فەرموویەتی: (وفاء بغدر خير من غدر بغدر).

واتە: وەفا کردن بەغەدر باشترە لە غەدر بە غەدری دوژمن.

---

(١) أحمد (٣/٤٨٧) وأبوداود (٢٧٦١).

(٢) أحمد (٦/٨) وأبوداود (٢٧٥٨) والنسائي في الكبرى (٨٦٧٤) إبن حبان (٤٨٧٧).

## ئەمان پێدراو – (المستأمن)

ئەو جەنگاوەرە بێ باوەڕەیە کە دێتە خاکی ئیسلامەوە بە ئەمان[1] بێ ئەوەی نیازی جێگیر بوون و مانەوەی هەبێت، بەشێوەیەکی دایمی، بەڵکو مەبەستی مانەوەیە لەو خاکەدا بۆ ماوەیەکی دیاری کراو کە لە ساڵ تێ نەپەڕێ، بەڵام ئەگەر لە ساڵێ تێ پەڕی و مەبەستی مانەوە بوو بۆ هەمیشە، ئەبێ بە زیمی، وە حوکمی زیمی ئەبێ لەمەدا کە تابیعی دەوڵەتی ئیسلامە، وە ژن و منداڵ و نێرینەی پێ نەگەیشتو و کچەکانی هەموویان پێی ئەگەن، هەروەها دایك و نەنك و خزمەتکار، مادام لەگەڵ ئەو جەنگی‌یە ئەمان پێ دراوەدا بژین هەر حوکمی ئەویان هەیە لە ئەماندا.

وە بنەمای ئەمەش فەرموودەی خوای گەورەیە: ﴿و إن أحَدٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ اسْتَجَارَكَ فَأجِرْهُ حَتَّى يَسْمَعَ كَلامَ اللَّهِ ثُمَّ أبْلِغْهُ مَأْمَنَهُ﴾ (التوبة:٦).

واتە: ئەگەر کەسێك لە بێباوەڕەکان کە خوێن و ماڵیان ڕەوا کراوە داوای ئەمانی کرد، تۆش پەنای بدە بۆ ئەوەی فەرموودەکانی خوا ببیستێ و لێیان تێبگات، لەپاشاندا بیگەیەنەوە بە جێگای خۆی بە ئەمینی.

### مافەکانی ئەمان پێ دراو:

ئەگەر جەنگاوەری بێ باوەڕ هاتە خاکی ئیسلامەوە بە پەنادراوی، مافی پاراستنی گیانی خۆی و ماڵ و هەموو ماف و بەرژەوەندی‌یەکی هەیە، بەمەرجێ لەسەر پەیمانی ئەمان بمێنێتەوەو لێی لانەدابێت، وە نابێت ئازادی بیەسترێتەوە و ڕێی لێبگیرێ، وە نابێت بگیرێت هەرگیز، نە بە مەبەستی دیلکردنی، نە بە مەبەستی بەندکردنی، تەنها لەبەرئەوەی سەر بە دوژمنە یا تەنها لەبەر ئەوەی جەنگێك بەرپا بووە لە نێوان ئێمەو بێ باوەڕاندا.

(سرخسی) وتوویەتی: ماڵەکانیان دەستبەر کراوە بە حوکمی ئەو ئەمانە، ئیتر نابێت ببرێت بە حوکمی ڕەوا بوون، هەتا ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ خاکی بێ باوەڕانیش ئەوە پەنادانەکەی خۆی هەڵئەوەشێتەوە نەك هی ماڵەکەی.

لە کتێبی (المغني)دا وتوویەتی: (ئەگەر جەنگاوەرێکی بێ باوەڕ هاتە خاکی ئیسلامەوە بە ئەمان، و ماڵەکەی سپارد بە موسڵمانێك یا بە زیمی‌یەك، یا دابووی بە قەرز پێی، پاشان گەڕایەوە

(١) ئەگەر هاتە خاکی ئیسلامەوە بۆ ڕاگەیاندنی نامەو ئەو جۆرە شتانە، یا بۆ بیستنی فەرمودەی خوا هاتبوو، ئەوە ئەمینە بەبێ ئەوەی پێویستی بە عەقد بێت، بەڵام ئەگەر بۆ بازرگانی هات و لەلایەن کاربەدەستی ئەوێوە ئیزنی پێ درابوو، ئەوە خاوەن ئەمانە.

بۆ خاکی بێ باوەڕەکان، سەیر ئەکەین، ئەگەر بۆ بازرگانی، یا بە نێرراوی، یا بۆ ڕابواردن، یا بۆ بەجێهێنانی پێویستی گەڕابووە و لەپاشاندا ئەگەڕێتەوە بۆ خاکی ئیسلام، ئەو کەسە هەر لەسەر ئەمانی خۆی و ماڵی ئەمێنێتەوە، چونکە بەوە دەرنەچووە لە نیازی مانەوە لە خاکی ئیسلام، جا بۆیە چوێندراوە بە زەمی یەوە.

بەڵام ئەگەر گەڕابووە وە بۆ خاکی بێباوەڕان بە نیازی مانەوە و جێگیر بوون، ئەمان لەسەر خۆی هەڵئەوەشێتەوە، بەڵام لەسەر ماڵەکەی هەر ئەمێنێتەوە، چونکە بەهاتنی بۆ خاکی ئیسلام بە ئەمان بۆ ماڵەکەشی ئەچەسپێت، جا ئەگەر لە سەر خۆی ئەما بەوەی گەڕاوەتەوە، ئەوە لەسەر ماڵەکەی هەر ئەمێنێ، چونکە لەسەر خۆی هەڵی وەشاندۆتەوە و تایبەت ئەبێت بەخۆیەوە.

ئەوەی پێویست ئەبێ لەسەر ئەمان پێ دراو:

پێویستە لەسەر ئەمان پێ دراو ئاسایش و یاسای وڵات بپارێزێ و لێیان دەرنەچێ و سەرپێچی نەکات، بەوەی ببێتە جاسوس، چونکە ئەگەر جاسوسی کرد بۆ حیسابی دوژمنانی ئیسلام لەو حاڵەتەدا کوشتنی ڕەوا ئەبێت بەوکارە.

جێبەجێ کردنی حوکمی ئیسلام بەسەر ئەمان پێ دراودا:

یاساکانی ئیسلامی بەسەر ئەمان پێ دراودا بەجێ دێت بە نیسبەت مامەڵە ماڵی یەکان، جا ئەتوانێ کڕین و فرۆشتن بکات بە پێی یاسای ئیسلام، وە لێی قەدەغە ئەکرێت مامەڵەی سوود بکات چونکە لە ئیسلامدا حەرام کراوە.

بەڵام بە نیسبەت سزاکان، بە پێی یاسایی ئیسلامی سزای ئەدرێت، ئەگەر دەست درێژی کردە سەر مافی موسڵمانێك.

وە هەروەها ئەگەر پەلاماری زەمی یەك بدات، یا پەلاماری کەسێکی ئەمان پێ دراوی وەك خۆی بدات، هەر سزا ئەورێت، چونکە سەندنی سزا بۆ ستەم لێکراو لە ستەمکار و بڵاوکردنەوەی داد و عەدالەت، لەو واجبانەن کە نابێت کەم تەرخەمیان تێدا بکرێت.

بەڵام ئەگەر تەعەدداکەی بۆ سەر مافێك لە مافەکانی خوا بوو، وەك ئەوەی تاوانی زینا بکات ئەو کاتە وەك موسڵمانێك سزا ئەدرێت، چونکە ئەو تاوانە لەو تاوانانەیە کە کۆمەڵگای موسڵمانان تێك ئەدات[1].

---

(١) ئەبو حنیفە لەمەدا جیاوازە و فەرموویەتی: ئەو سزایانەی کە مافی خوان یان مافی خوا تیایاندا زۆرترە، ئەوە لەو سزایانەدا حەد بەجێ نایەت لەسەر ئەمان پێ دراو، وە ئەم ڕایە لاوازە.

دەستگرتن بەسەر ماڵی ئەمان پێ دراودا:

ماڵی ئەمان پێ دراو دەستی بەسەردا ناگیرێ، مەگەر جەنگ لەگەڵ موسڵمانان بکات، ئەو کاتە بەدیل ئەگیرێت و ئەکرێتە کۆیلە، وە لەو شێوەیەدا خاوەنێتی نامێنێ بەسەر ماڵەکەیەوە، لەبەر ئەوە وای لێهاتووە کە شایستەی خاوەنیەتی نی‌یە.

وە میرات گرەکانیشی مافی میرات گرتنیان نامێنێ با لەخاکی ئیسلامیشدابن، چونکە ئەو مافەیان بەجێنشینی ئەو هەیە، وە ئەوەش دووای مردنی ئەبێت، وە ئەو هێشتا نەمردوە و دیلە، وە ماڵەکەشی لەم حاڵەتەدا ئەخرێتە (بیت المال)ی موسڵمانانەوە، بە پێی ئەوەی کە غەنیمەتە، وە ئەگەر قەرزێکی لای هەندێ لە موسڵمانان یا زمی‌یەکان بێت، لە کۆڵیان ئەکەوێت لەبەر نەبوونی کەسێك کە داوای بکات.

میراتی ئەمان پێ دراو:

ئەگەر ئەمان پێ دراو لەخاکی ئیسلامدا بمرێت، یا لە خاکی خۆیدا بمرێت ئەوە خاوەنێتی لەسەر ماڵەکەی ئەمێنێ و ئەگوێزرێتەوە بۆ میرات گرەکانی، بەڕای جەماوەری زانایان، بە پێچەوانەی ڕای شافیعی‌یەوە. وە لەسەر دەوڵەتی ئیسلامی پێویستە ماڵەکەی بگوازێتەوەو بینێرێ بۆ میرات گرەکانی، بەڵام ئەگەر میرات گری نەبوو ئەبێت بەدەست کەوتی موسڵمانان.

پەیمانەکان و بڕوانامەکان (العهود و المواثیق)

ڕێزگرتنی پەیمانەکان:

ڕێزگرتنی پەیمان و بڕوانامەکان واجبێکی ئیسلامی‌یە، لەبەر ئەوەی شوێنەواری باشی هەیە، وە ڕۆڵێکی گەورەی هەیە بۆ پاراستنی ئاشتی، هەروەها گرنگی‌یەکی گەورەی هەیە بۆ کۆتایی پێ هێنانی گیروگرفتەکان و چارەی بەربەرەکانی‌یەکان، و ڕێك خستنی پەیوەندی‌یەکان .

لە وتەی عمرەبدا هاتووە:

(هەرکەس لەگەڵ خەڵکدا مامەڵە بکات و ستەمیان لێ نەکات، وە قسەیان لەگەڵدا بکات و درۆیان لەگەڵدا نەکات، وە کاتێك پەیمانی پێدان پەیمان نەشکێنێ، ئەوە لەو کەسانەیە کە ئادەمیزادێکی تەواو و دادپەروەری‌یەکەی دەرکەوتووە، وە پێویستە برایەتی لەگەڵیا بگیرێت).

ئەم قسەیەش بەجێ‌یە، چونکە مامەڵە کردن بە باشی لەگەڵ خەڵکدا و وەفاکردن بەرامبەریان، و ڕاستگۆیی لەگەڵیان، نیشانەی پیاوەتی تەواو و دیمەنی دادپەروەری‌یە، بۆیە دەبێتە هۆی پێویست بوونی برایەتی و دۆستایەتی لەگەڵیا.

خوای گەورەش فەرمان ئەدات بە وەفا کردن بە هەموو پەیمانەکان و پابەندەکانەوە، ئیتر یەکسانە ئەو پەیمانانە لەگەڵ خوادا بێت یا لەگەڵ خەڵکدا، ئەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ﴾ (المائدة:١).

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە پەیمانەکانتان بەرنە سەر.

وە هەرچی کەم و کوڕییەك بکرێ بۆ نەبردنە سەری ئەو پەیمانانە بە گوناهێکی گەورە دائەنرێت کە ڕق و کینەی خوا لەسەر ئەو کەسە پێویست ئەکات، بۆیە ئەفەرمووێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لا تَفْعَلُون ، كَبُرَ مَقْتاً عِنْدَ اللَّهِ أَنْ تَقُولُوا مَا لا تَفْعَلُونَ﴾ (الصف:٣). واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە بۆچی ئەو قسەیەی کە بۆخۆتان ئەیڵێن بە کردەوە نایکەن، زۆر مایەی ڕق و کینەی خوایە کە ئەوەی ئەیڵێن بە کردەوە نایکەن.

جا هەرچی ئادەمیزاد لەسەر خۆی بیکات بە پەیمان، ئەوە بەرپرس ئەبێ لەسەری و موحاسەبە ئەکرێ.

﴿وَأَوْفُوا بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْؤُولاً﴾ (الاسراء:٣٤).

واتە: پەیمانەکانتان ببنە سەر و پەیمان شکێن مەبن، چونکە بەڕاستی پەیمان خاوەنەکەی لەڕۆژی دواییدا خوا لێی ئەپرسێتەوە.

وە مافی پەیمان بەستن لە مافی ئاینیش لە پێشترە. ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يُهَاجِرُوا مَا لَكُمْ مِنْ وَلَايَتِهِمْ مِنْ شَيْءٍ حَتَّى يُهَاجِرُوا وَإِنِ اسْتَنْصَرُوكُمْ فِي الدِّينِ فَعَلَيْكُمُ النَّصْرُ إِلَّا عَلَى قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثَاق﴾ (الأنفال:٧٢).

واتە: وە ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و کۆچیان نەکردووە لەخاکی کوفرەوە بۆ لاتان ئێوە لەسەرتان پێویست نییە پاراستن و یارمەتییان هەتا کۆچ نەکەن، وە ئەگەر لەلایەن بێ باوەڕانەوە ستەمیان لێ کراو داوای یارمەتی و سەرخستنییان لێ‌کردن ئەبێ یارمەتییان بدەن، مەگەر یارمەتییەکەتان دژی کۆمەڵێك بێت کە لە نێوانتانا پەیمانی بەهێز هەبێ و هەڵیان نەوەشاندبێتەوە، ئەوە دروست نییە یارمەتییان بدەن .

وە پەیمان بردنەسەر بەشێکە لە باوەڕ بە پێی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرموێت: (إن حسن العهد من الأيمان) صححه الحاكم، وأقره الذهبي[1].

واتە: چاکی پەیمان لەباوەڕەوەیە.

---

(١) الحاكم (١/٥-٦) والقضاعي في مسند الشهاب (٦٢٨) وابن عبد البر في الإستيعاب (٤/١٨١٠).

وە پاداشتی پەیمان بردنە سەر جگە لە بەهەشت هیچی تر نیە:

﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُون ، وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ، أُولَئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ ، الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ (المؤمنون:١١). واتە: وە ئەوانەی پارێزگاری سپاردەو پەیمانەکانیان ئەکەن، وە ئەوانەی پارێزگاری نوێژەکانیان ئەکەن، ئەوانە لەو کەسانەن کە بەهەشتی فردەوس جێگەکەیانە و تێیدا ئەمێننەوە بۆ هەمیشە.

وە وەفا کردن خورەوشتی پێغەمبەران بووە سەلامی خوایان لەسەر بێت:

﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِسْمَاعِيلَ إِنَّهُ كَانَ صَادِقَ الْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولاً نَبِيّاً﴾ (مريم:٥٤).

واتە: لەم کتێبەدا باسی ئیسماعیلیان بۆبکە کە ڕاستگۆ بووە لە بەڵێنیدا، وە پێغەمبەر و نێرراوی خوا بووە.

وە پێغەمبەرمان ﷺ نمونەی بەرز بووە لەو ڕەوشتەدا. عەبدوڵلای کوڕی حەمساو وتوویەتی: مامەڵەیەکی کڕین و فرۆشتنم لە گەڵ پێغەمبەردا کرد پێش ئەوەی ببێتە پێغەمبەر ﷺ هەندێ لە نرخی شتەکەم مابور کە بیدەم، بەڵێنم دایە کە لەشوێنی خۆی بمێنێتەوە تەیهێنم، لەبیرم چووەوە، لەپاشاندا وە بیرم هاتەوە سێ ڕۆژ بەسەردا تێ پەڕی بوو، هاتمەوە بۆ شوێنەکە سەیرم کرد لە جێی خۆی بوو، فەرمووی: ﷺ (يافتى لقد شققت عليَّ، أنا هاهنا منذ ثلاث أنتظرك)[1].

واتە: کوڕە زۆر ئازارت دام من ئەمە سێ ڕۆژە لێرە چاوەڕوانت دەکەم.

وە پێغەمبەر ﷺ دووای کۆچ کردنی بۆ مەدینە پەیمانی بەست لەگەڵ جولەکەکانی مەدینەدا کە لەسەر ئاینی خۆیان بمێننەوە و لەسامان و ماڵی خۆیان نەترسن بەمەرجێ یارمەتی موشریکەکان نەدەن دژی ئەمان.

بەڵام جولەکەکان پەیمانەکەیان شکاند، لەپاشاندا داوای لێ بوردنیان کرد و پەیمانیان بەستەوە، پاشان جارێکی تریش پەیمانەکەیان شکاندەوە، جا خوای گەورە لەم بارەیەوە ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە:

﴿إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِنْدَ اللَّهِ الَّذِينَ كَفَرُوا فَهُمْ لا يُؤْمِنُونَ ، الَّذِينَ عَاهَدْتَ مِنْهُمْ ثُمَّ يَنْقُضُونَ عَهْدَهُمْ فِي كُلِّ مَرَّةٍ وَهُمْ لا يَتَّقُونَ﴾ (الأنفال: ٥٦). واتە: خراپترین جانەوەر لای خوا ئەوانەن کە بێباوەڕن و باوەڕ ناهێنن، وە ئەوانەی کە پەیمانت لەگەڵدا بەستوون و هەموو جارێ پەیمانەکەیان ئەشکێنن و لە خوا ناترسن.

---

(١) أبوداود (٤٩٩٦) وابن أبي الدنيا في الصمت (٤٥٧).

وە ثەعلبە کە صەحابەیەك بوو پەیمانیدا بە خوا، ئەگەر دەوڵەمەندی کرد و سامانێکی زۆری پێ بەخشی، هەموو خاوەن مافێك مافی خۆی بداتێ. کاتێ وا دەوڵەمەندی کرد و سامانی ڕژاند بەسەریا پەیمانەکەی خۆی شکاندو دڵ و دەست بەستراو بوو بەرامبەر بە بەندەکانی خوا، خوا دەربارەی ئەم ئایەتانەی نارده خوارەوە: ﴿وَمِنْهُمْ مَنْ عَاهَدَ اللَّهَ لَئِنْ آتَانَا مِنْ فَضْلِهِ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ الصَّالِحِينَ ، فَلَمَّا آتَاهُمْ مِنْ فَضْلِهِ بَخِلُوا بِهِ وَتَوَلَّوْا وَهُمْ مُعْرِضُونَ ، فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقاً فِي قُلُوبِهِمْ إِلَى يَوْمِ يَلْقَوْنَهُ بِمَا أَخْلَفُوا اللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ﴾ (التوبة: ٧٧).

واتە: وە لە هەژارە دووڕووەکاندا هەیە کە پەیمانیداوە بە خوا ئەگەر دەوڵەمەندی بکات بە فەزڵی خۆی، خێرێکی زۆر ئەکات و لەچاکان ئەبێت، بەڵام کاتێ خوا لەفەزڵی خۆی پێی بەخشی دەست و دڵییان بەستراو پشتیان لە ئیسلام کرد، جا خوا بەوە سزای دان کە زیاتر نیفاقی خستە دڵییانەوە هەتا ئەو ڕۆژەی پێی ئەگەن، بە هۆی ئەو پەیمانەوە کە شکاندبوویان، وە بە هۆی ئەو درۆیەوە کە کردبوویان.

عەبدوڵلای کوڕی عومەر کاتی سەرەمەرگ فەرمووی: پیاوێکی قورەیشی داوای کچەکەمی کرد، منیش نیمچە پەیمانێکم پێدا، سوێند بەخوا بەسێیەکی نیفاقەوە نامەوێ بگەم بەخوا، ئێوە شایەت بن وا کچەکەم پێدا.

بەو قسەیە ئیشارەت بۆ فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ ئەکات کە فەرموویەتی: (ثلاث من كنَّ فيه فهو منافق، وإن صام وصلى وزعم أنه مسلم: من إذا حدَّث كذب ، وإذا وعد أخلف، وإذا اؤتمن خان) رواه البخاري[1].

واتە: سێ شت هەیە هەرکەس ئەو سێ شتەی تێدا بێت مونافیقە، با نوێژ و ڕۆژووش بکات و خۆی بە موسڵمان بزانێ: ئەو کەسەی کاتێك قسە ئەکات درۆ ئەکات، وە کاتێك پەیمان ئەدات ئەیشکێنێ، وە کاتێ سپاردەی لا دابنرێ ناپاکی پێ ئەکات.

وە دەربارەی ناشیرین کردنی ئەوانەی کە پەیمان ئەشکێنن خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿وَأَوْفُوا بِعَهْدِ اللَّهِ إِذَا عَاهَدْتُمْ وَلَا تَنْقُضُوا الْأَيْمَانَ بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ جَعَلْتُمُ اللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلاً إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ، وَلَا تَكُونُوا كَالَّتِي نَقَضَتْ غَزْلَهَا مِنْ بَعْدِ قُوَّةٍ أَنْكَاثاً تَتَّخِذُونَ أَيْمَانَكُمْ دَخَلاً بَيْنَكُمْ أَنْ تَكُونَ أُمَّةٌ هِيَ أَرْبَى مِنْ أُمَّةٍ إِنَّمَا يَبْلُوكُمُ اللَّهُ بِهِ وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَا كُنْتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ (النحل:٩٢). واتە: پابەندی وەفا بن بە هەموو پەیمانێك کە پێوەستتان کردووە لەگەڵ

---

(١) أبو يعلي في مسنده (٤٠٩٨) ومجمع الزوائد (١/١٠٧) وبنحوه رواه البخاري (٣٣) ومسلم (٥٩).

خۆتان لەنێوان خۆتان و خوای گەورەدا، یان لە نێوان خۆتان و خەڵکدا، وە لە سوێندەکانتان پاشگەز مەبنەوە دووای ئەوەی تەئکیدتان کردوونەوە، و خواتان کردووە بە کەفیل و زامن، بەڕاستی خوا ئەزانێ کە چی ئەکەن. وە ئێوە لە هەڵوەشاندنەوەی پەیماندا وەك ئەو ژنە مەبن کە ڕێسراوی خۆی دووای ئەوەی کرژ ئەبێت خاوی ئەکاتەوە، ئەو سوێندەتان کە لەسەر پەیمانەکە ئەیخۆن ئەیکەنە فێڵ و هەڵخەڵەتاندن بۆ ئەوەی لێتان دڵنیابن، وە پەیمانەکەتان هەڵئەوەشێننەوە ئەگەر کۆمەڵێکتان دیەوە کە ماڵیان زۆرترەو سوودیان زۆرترە لەوانەی کە ئێوە پەیمانتان لەگەڵ بەستوون، ئەوە خوا هەر تاقیتان ئەکاتەوە بەو فەرمانی وەفا بە پەیمانە، وە لەڕۆژی دواییدا ڕوونی ئەکاتەوە بۆتان ئەوەی کە ئێوە لەسەری ناکۆك بوون.

**مەرجەکانی پەیمان:**

بە مەرج گیراوە لەو پەیمانانەدا کە پێویستە ڕێزیان لێ بگیرێ و جێبەجێ بکرێن، ئەم مەرجانەی خوارەوە هەبێت:

١- پێچەوانەی حوکمێك لە حوکمەکانی شەرع نەبێت کە ڕێکەوتن هەیە لەسەری.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (كل شرط ليس في كتاب الله فهو باطل، وإن كان مائة شرط)[1].

واتە: هەر مەرجێك لە کتێبی خوادا نەبێت پوچەڵە با سەد مەرجیش بێت.

٢- ئەبێ ئەو پەیمانە بەڕەزامەندی بێت، چونکە زۆر لێکردن ئیرادەو ویست ناهێڵێت، وە ئەو پەیمانەی مەرجی ئازادی تێدا نەبێت ڕێزی نییە.

٣- ئەبێ ڕوون و ئاشکرا بێت و شاراوەیی تێدا نەبێت، بۆ ئەوەی مانای تر نەبەخشێ و کاتی جێبەجێ کردن ببێتە هۆی جیاوازی.

**هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکان:**

پەیمان نابێت هەڵبوەشێتەوە لەیەکێ لەم شێوانەی خوارەوە دانەبێت.

١- ئەگەر کاتی بۆ دانرابێت، یا بۆ بارودۆخێك بێت، وە ماوەکەی تەواو بێت و بارودۆخەکە بەسەر بچێت.

---

(١) أحمد (٦/٢١٣) وإبن ماجة (٢٥٢١).

ئەبو داود و ترمذي لە عەمری کوڕی عەبسەوە ئەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: گوێم لە پێغەمبەر بووە ﷺ ئەی فەرموو: (من كان بينه وبين قوم عهد، فلا يَحُلَّن عهداً، ولا يشدنه، حتى يمضي أمده، أو ينبذ إليهم على سواء)[1].

واتە: هەرکەس لە نێوان ئەو و کۆمەڵێکدا پەیمانێك هەبوو، با هەڵی نەوەشێنێنەوە، وە تەنگی پێ هەڵنەچنێت هەتا ماوەکەی تەواو ئەبێت، یا وازی لێ بهێنێ بۆیان وەك یەك.

خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرمووێ: ﴿إِلَّا الَّذِينَ عَاهَدْتُمْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنْقُصُوكُمْ شَيْئاً وَلَمْ يُظَاهِرُوا عَلَيْكُمْ أَحَداً فَأَتِمُّوا إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَى مُدَّتِهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ﴾ (التوبة:٤).

واتە: جگە لەو بێ باوەڕانەی کە کەم و کوڕیان نەبووە لە پەیمانەکانیاندا بەرامبەرتان و پشتی کەسیان نەگرتووە دژی ئێوە، جا پەیمانەکەیان هەتا کاتی خۆی بۆ تەواو بکەن، بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش ئەوی کە لەخوا ئەترسن.

٢- ئەگەر دوژمن پەیمانەکەی شکاند:

﴿فَمَا اسْتَقَامُوا لَكُمْ فَاسْتَقِيمُوا لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ﴾ (التوبة: ٧).

واتە: هەتا ئەوانە لەسەر پەیمانەکەی خۆیان بن و پەیمان شکێن نەبن، ئێوەش پەیمانەکەیان لەگەڵدا بەرنەسەر. بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش ئەوێ کە خۆ ئەپارێزن.

﴿وَإِنْ نَكَثُوا أَيْمَانَهُمْ مِنْ بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُوا فِي دِينِكُمْ فَقَاتِلُوا أَئِمَّةَ الْكُفْرِ إِنَّهُمْ لا أَيْمَانَ لَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَنْتَهُونَ ، أَلا تُقَاتِلُونَ قَوْماً نَكَثُوا أَيْمَانَهُمْ وَهَمُّوا بِإِخْرَاجِ الرَّسُولِ وَهُمْ بَدَأُوكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ أَتَخْشَوْنَهُمْ فَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَوْهُ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ (التوبة:١٣).

واتە: ئەگەر ئەو بێ باوەڕانە پەیمانەکەیان شکاند کە بەستبووتان و قایمتان کردبوو، وە بە ئاشکرا تانەیان لە دینی ئیسلام دا، ئەوە جەنگیان لەگەڵدا بکەن، چونکە ئەوان سەرکردەی گومڕایین و پەیمانیان نی‌یە هەتا واز لەکوفرو دوژمنایەتی‌یان ئەهێنن. ئایا ناجەنگن دژی ئەو کۆمەڵەی پەیمانەکەیان شکاند و ئەیان ویست پێغەمبەر ﷺ دەربکەن، وە هەر ئەوانیش دەست پێشخەر بوون بە ئازاردانتان یەکەم جار. ئایا ئێوە لێیان ئەترسن، جا خوا شایستەترە کە لێی بترسن ئەگەر ئێوە بەڕاستی باوەڕدارن.

٣- ئەگەر نیشانەی ستەمکاری و ناپاکیان دەرکەوێت:

---

(١) أحمد (٤/١١١) وأبوداود (٢٧٥٩) والترمذي (١٥٨٠) والنسائي في الكبرى (٨٧٣٢).

﴿وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِنْ قَوْمٍ خِيَانَةً فَانْبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَى سَوَاءٍ إِنَّ اللَّهَ لا يُحِبُّ الْخَائِنِينَ﴾ (الأنفـال:٥٨).
واته: ئەگەر —ئەی محمد- ترسی ئەوەت هەبوو ئەو کۆمەڵەی پەیمانت لەگەڵدا بەستبوون ناپاکی بکەن بەوەی نیشانەی ناپاکی‌یانت بۆ دەرکەوت، پەیمانەکەیان بۆ فڕێ بدەرەوە و هەڵی بوەشێنەرەوە، تا هەردوولا بزانن کە ئیتر پەیمان نەماوە، بەڕاستی خوا ناپاکانی لا خۆشەویست نیيە.

**ڕاگەیاندنی هەڵوەشاندنەوەکە لەبەر خۆپاراستن لە ستەم**

ئەگەر حاکم ناپاکی دوژمنی بۆ دەرکەوت دروست نیيە جەنگ دژیان بکات هەتا هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکەیان پێ ڕانەگەیەنرێت، وە ئەبێ هەواڵەکە بگات بە دوور و نزیکیان، بۆ ئەوەی پەلاماریان نەدرێت لە پڕ.

وە بنەمای ئیسلام: (وەفاکردن بە ستەمێك باشترە نەك ستەم کردن بەرامبەر بە ستەم)

محمدی کوڕی حەسەن لە کتێبی (السير الكبير)دا ووتوویەتی:

ئەگەر سەرکردەی موسڵمانەکان هەواڵی نارد بۆ دەسەڵاتداری بێ باوەڕەکان کە پەیمانەکە هەڵوەشاوەتەوە، کاتێ هۆی هەڵوەشاندنەوە هاتەدی، نابێت موسڵمانەکان پەلاماریان بدەن، یا پەلاماری چواردەوری وولاتەکەی بدەن هەتا ماوەیەکی وا تێنەپەڕی بەسەردا کە دەسەڵاتدارەکەیان ئەو هەڵوەشاندنەوەی بگەیەنێتە هەموو دەوروبەری وولاتەکەی بۆ ئەوەی لە پڕ پەلاماریان نەدرێت.

وە لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر موسڵمانەکان زانیان ئەو نەتەوە هەواڵەکەیان پێ نەگەیشتووە لەلایەن پاشاکەیانەوە، وا پەسەندە کە هێرشیان نەکرێتە سەر هەتا ئاگادارئەکرێن، چونکە ئەوە وەك فێڵ وا دەبێت.

وە موسڵمان وەك چۆن خۆیان ئەپارێزن لە فڕوفێڵ ئاوەهاش ئەبێ خۆیان لە نیمچە فێڵ بپارێزن.

وە لە سەردەمی (عبدالملك)ی کوڕی مەڕوان دا خەڵکی قوبڕص ئاژاوەیەکی گەورەیان بەرپا کرد عەبدولەلیك ویستی پەیمانەکەیان هەڵبوەشێنێتەوە، بۆ ئەو مەبەستە ڕاوێژی بە زاناکانی ئیسلامی سەردەمی خۆی کرد لەوانە لەیسی کوڕی سەعدو مالیکی کوڕێ ئەنەس.

لەیسی کوڕی سەعد بۆی نوسی‌یەوە:

(خەڵکی قوبڕص ئێستاش هەر تاوانبارن بەوەی فێڵ و ناپاکیان کردووە دژی موسڵمانان و یارمەتی دوژمنی ئیسلامیان داوە کە ڕۆمەکانن، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِنْ قَوْمٍ خِيَانَةً فَانْبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَى سَوَاءٍ﴾ (الأنفال:٥٨).

ڕای من وایە پەیمانەکە بدەیتەوە بەسەرو چاریانداو ماوەی ساڵێك مۆڵەتیان بدەیت.

بەڵام مالیکی کوڕی ئەنەس بۆی نوسییەوەو فەرموی:

(ئەمانەدانی قوبرصییەکان کۆنە و لەلایەن فەرمانڕەوایانەوە کراوە، وە من هیچ کام لە فەرمانڕەواکانم نەدیوە پەیمانەکەیانی شکاندبێت، وە دەریان نەکردوون لە شوێن و جێگایان، وە ڕای من وایە پەلە نەکەی لە پەیمان دانەوە بەڕوویاندا هەتا بەڵگەکان ڕوونەکەنە ئەوان، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَأَتِمُّوا إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَى مُدَّتِهِمْ﴾ (التوبة:٤).

واتە: پەیمانەکانیان تەواو بۆ بێنە سەر هەتا ماوەکەیان تەواو ئەبێت. پاشان ئەگەر خۆیان چاك نەکردو دەستیان لە ناپاکییەکەیان هەڵنەگرت و ستەمکاری چسپا بەسەریاندا، ئەو کاتە گیڕۆدەیان بکە درواى دانەوەی پەیمانەکە بەڕویاندا، و بیانو هێنانەوە بۆیان، جا خوا سەرخستن ئەکاتە بەشت.

## لە پەیمانەکانی پێغەمبەر ﷺ

١- پێغەمبەر ﷺ پەیمانی لەگەڵ بەنی چهمرەدا بەست کە هۆزێکی عەرەب بوو، ئەمەش دەقی ئەو پەیمان نامەیەیە.

(ئەمە نوسراوی موحەممەد نێرراوی خوایە ﷺ بۆ بەنی ضەمرە، کە لەماڵ و گیانیان ئەمین بن، وە یارمەتی ئەدرێن دژی ئەوانەی پەلاماریان ئەدەن، مەگەر دژی ئاینەکەی خوا بجەنگن، هەتا دەریا خوری تەڕ بکات ئەو پەیمانە هەر ئەمێنێت).

وە کاتێك پێغەمبەر ﷺ کە داوای یارمەتی‌یان لێ بکات بێن بەدەنگییەوە، بەمەش پەیمان و زیمەی خواو نێرراوی خوا لەسەریان ئەبێت، وە ئەبێ یارمەتی چاكو خۆپارێزیان بدرێ.

٢- وە هەروەها پەیمانی بەستووە لەگەڵ جولەکەکان لەسەر چاکی دراوسێیەتی، هەریەکەم جار کە لە مەدینەدا جێگیر بووە ئەمەش دەقی پەیمانەکەیە:

بسم الله الرحمن الرحيم

(ئەمە نوسراوێکە لە موحەممەد پێغەمبەرەوە ﷺ لە نێوان باوەڕداران و موسڵمانانی خەڵکی قوڕەیش و خەڵکی یەثریب وە ئەوانەی سەربەوانن و تێکۆشاون لەگەڵیان).

کە ئەمانە هەموو یەك نەتەوەن جیا لە خەڵکی تر.

کۆچەرەکان لەسەر ئەوە ئەمێننەوە کە لەسەری بوون، خوێن بایی لەنێوانیاندا ئەمێنێ و وەرئەگیرێ، وە خۆیان بریتی دیلەکانیان ئەدەن بە چاکی و بەدادپەروەری لە نێوان باوەڕدارەکاندا.

وە بەنی عەوف لەسەر حاڵەتی خۆیان ئەمێننەوە وەك یەكەم جار، خوێن بایی ئەدەن و وەری ئەگرن لە نێوانیاندا، وە هەموو هۆزێك بریتی دیلی ئەدات بەچاكی و دادپەروەری لەنێوان موسڵمانان‌اندا.

وە بەنی حاریس (لە خەزرەج) لەسەر حاڵەتی خۆیان ئەمێننەوە خوێن بایی ئەدەن و وەریشەگرن لە نێوانیاندا، وە هەموو هۆزێك بریتی دیلی خۆی ئەدات بە دادپەروەری لەنێوان باوەڕداراندا.

وە بەنی ساعیدە لەسەر حاڵەتی خۆیان ئەمێننەوە و وەك جاران خوێن بایی وەرئەگرن، وئەیدەن، وە هەر تیرەیەك بریتی دیلی خۆی ئەدا بەراستی و دادپەروەری لەنێوان باوەڕداراندا.

وە بەنوجوشەم هەربەو شێوەیە.

وە بەنو نەججار هەربەو شێوەیە.

وە بەنو عەمری كوڕی عەوف هەربەو شێوەیە.

وە بەنو نەبیت هەربەو شێوەیە.

وە بەنو ئەوس هەربەو شێوەیە.

وە باوەڕداران كەس بە باری گرانی قەرزەوە ناهێڵنەوە، وە یارمەتی ئەدەن بۆ خوێن بایی بێت یا بۆ كڕینەوەی دیل.

وە نابێت هیچ بەندەیەكی باوەڕدار سەرپێچی گەورە باوەڕدارەكەی بكات.

وە باوەڕدارە لە خواترسەكان دەبێت یەك بن دژی ئەوەیان كە زیادەڕەوی ئەكات یان داوای ئەوە ئەكات كە پێی ببەخشرێ لەرێی ستەمەوە، یا لەرێی گوناح و دەست درێژییەوە، یا لەرێی خراپەكاری لەنێوان باوەڕدارانا، وە ئەبێ هەموویان ببنە یەك دەست دژی ئەو تاوانبارە گەرچی كوڕی یەكێك بێت لەخۆیان.

وە نابێ باوەڕدار باوەڕدار بكوژێت لەجیاتی بێباوەڕ، وە نابێت بێ باوەڕ سەربخات بەسەر باوەڕداردا.

وە زیممەو پەیمانی خوا یەكە، بچوكترینیان پەنا ئەدات، وە باوەڕداران هەندێكیان دۆست و هاوكاری هەندێكیانن جیا لەخەڵك.

وە ئەو جولەكانەی لایەنگری ئێمەن یارمەتی و سەرخستنیان بە یەكسانی بۆ هەیە بێ ئەوەی ستەمیان لێ بكرێت و یارمەتی كەس بدرێت لە دژیان، وە ئاشتی موسڵمانان یەكە، باوەڕدارێك

بێ باوەڕدارانی تر پەیمانی ئاشتی نابستێ له جەنگەکانی ڕێگای خوادا، لەسەر دادپەروەری و یەکسانی نەبێت له نێوانیاندا.

وە هەموو کۆمەڵێك بە نۆبە غەزا ئەکات لەگەڵمان کۆمەڵ دووای کۆمەڵ. وە باوەڕداران لەنێوانیاندا تۆڵەی کوشتن لەیەك ئەسێنن ، بەوەی کە گیانیان بەدەستی هێناوە له ڕێگای خوادا.

وە باوەڕدارە لەخوا ترسەکان لەسەر چاکترین و ڕاسترین ڕێنماییین. وە نابێ هیچ موشریکێك پەنای ماڵ و گیانی کەس بدات له قورەیش، و لایەنی بگرێت لەسەر بڕوادار. وە هەرکەس باوەڕ دارێکی بێ تاوانی کوشت ئەبێ له جیاتی بکوژرێتەوە، مەگەر خاوەن کوژراوەکە ڕازی بێت بەخوێن بایی، وە ئەبێ باوەڕداران یەك بن لەسەری،

وە دروست نیيە کارێکی تر بکەن جگە لەوەی یەك بن لەسەری.

وە دروست نیيە بۆ هیچ باوەڕدارێك کە بڕیاری داوە لەسەر ئەوەی لەم نامەیەدایە. یارمەتی یان پەنای کەسێك بدات کە شتێکی تازەی داهێنابێت له دیندا.

وە هەرکەس یارمەتی بدات یان پەنای بدات، نەفرینی خوا و تورەیی خوای لەسەر بێت، هەتا ڕۆژی دوایی، و هیچ فەرز و سوننەتێکی لێ وەرناگیرێ.

وە ئێوە لەسەر هەرچی ناکۆکی بکەن ئەبێ بیگێڕنەوە بۆ لای خوا و بۆ لای موحەممەدی نێرراوی.

وە جولەکەکان خەرجی ئەکێشن لەگەڵ موسڵمانەکاندا هەتا له جەنگدا بن دژی دوژمنەکەیان.

وە جولەکەی بەنی عەوف نەتەوەیەکن لەگەڵ باوەڕداراندان، جولەکەکان ئاینی خۆیان هەیەو موسڵمانەکانیش ئاینی خۆیان هەیە، وە هەروەها ئەوانەش کە سەربەوانن مەگەر کەسێکیان کە ستەمێك یا تاوانێك بکات، وە ئەو کەسە خۆی و خێزانی ماڵەکەی نەبێت کەسی تر لەناو نابات.

وە ئەوەی بۆ جولەکەکانی بەنی عەوفە بۆ جولەکەکانی بەنی نەججاریشە، وە هەروەها بۆ جولەکەکانی بەنی حاریسیشە، وە بۆ بەنی ساعیدە و بەنی جوشەم و بەنی ئەوس و بەنی پەعلەبەیشە.

مەگەر کەسێك ستەمێك یا تاوانێك بکات، ئەو کەسە خۆی و خێزانی ماڵەکەی نەبێت کەس لەناو نابات.

وە جوفنە -کە خێڵێك بوون لەبەنی پەعلەبە- وەك بەنی پەعلەبە وان، وە ئەوەی بۆ بەنی عەوفە بۆ بەنی شەطبیەشە، وە چاکە جیایە لەگەڵ خراپەدا، وە کۆیلەکانی بەنی ثەعلەبە وەك خۆیان وان.

وە ئەوانەی دۆستی جولەکەن هەروەك جولەکەکانن.

وە نابێت تاوانی بریندار کردن لەسەر یەك تۆڵە ڕابوەستێ، وە هەرکەسیش کەسێ لەناو بەرێت ئەوە هەر خۆی و خێزانەکەی بە هیلاکدا بردووە، مەگەر ئەو کەسەی ستەمی لێ کرا ئەوە باشترین سزا و بریتی بۆ ئەسەندرێ.

وە نابێت کەس لێیان دەرچێت بێ پرسی موحەممەد ﷺ.

وە ئەبێ جولەکە خەرجی خۆیان بکێشن و موسڵمانانیش خەرجی خۆیان، وە ئەبێ یارمەتی یەك بدەن دژی ئەوەی شەڕبکات لەگەڵ ئەهلی ئەم صەحیفەیەدا.

وە ئەبێ لەنێوانیاندا پەندو ئامۆژگاری هەبێت، وە چاکە هەبێت نەك خراپە.

وە کەس بە تاوانی هاوپەیمانەکەی تاوانبار ناکرێ، وە یارمەتی بۆ ستەم لێ کراوە.

وە ئەبێ جولەکەکان خەرجی بکێشن لەگەڵ موسڵمانەکاندا مادام لە جەنگدا بن. وە ناوخۆی یەسریب حەرامە بۆ ئەهلی ئەم لاپەڕەیە.

وە دراوسێ وەك خۆی وایە نابێ زیانی پێ بگەیەنرێت و تاوانیشی بەرامبەر بکرێت.

وە هیچ خێزانێك پەنا نادرێ بە ئیزنی خاوەنەکەی نەبێت.

وە هەرچی لە نێوان ئەهلی ئەم لاپەڕەیە دروست بێت لە قسە یا دەمەقاڵە کە ترسی تێکدانی لێ‌کرا ئەبێ بگێڕرێتەوە بۆ لای خوا و محمد نێرراوی خواﷺ خواش لەسەر چاکترین و پارێزراوترین شتی ناو ئەم لاپەڕەیە، وە نابێت پەنای قورەیش و ئەوانەی یارمەتی دەری قورەیشن بدرێت، وە ئەبێ یارمەتی یەکتر بدەن دژی ئەو دوژمنەی ئەیەوێ دەورەی یەسریب بدات.

وە ئەگەر داوای ڕێك کەوتنیان کرد ئەبێ لەگەڵیاندا ڕێك بکەون، جا هەرکاتێ داوای ئەوەیان کرد چی لەسەر باوەڕداران ئەبێت لەسەر ئەوانیش پێویست ئەبێت، ئەوانە نەبن کە دژی ئایین ئەجەنگن، وە هەرکەس بەشی خۆی لەو لایەنە وەرئەگرێ کە وەریان گرتووە.

وە جولەکەی ئەوس خۆیان و بەندەکانیان لەسەر ئەوەن کە ئەهلی ئەم لاپەڕەیە وان لەسەری لەگەڵ چاکیەتی لە لایەن ئەهلی ئەم لاپەڕەیە بە چاکە کردن نەك تاوان، وە هەرکەس هەوڵ بۆ نەفسی خۆی ئەدات و کردەوەی خۆی بۆ هەیە، خواش لە سەر ڕاسترین و چاکترین شتی ئەم لاپەڕەیە.

وە ئەم نوسراوەیە ستەم کار و تاوانبار ناگرێتەوە و، ڕێ لە سزادانیان ناگرێ.

وە هەرکەس دەرچوو ئەمینە، وە هەرکەس لە مەدینەدا دابنیشێ ئەمینە، مەگەر کەسێك ستەمێك یا تاوانێك بکات، وە خوا پشت و پەنای پیاو چاکان و لەخوا ترسانە، وە موحەممەدیش نێرراوی خوایە[1] ﷺ.

وصلى الله على محمد وعلى آله وصحبه وسلم

## سوێندەکان (الأيمان)

پێناسەی (الأيمان):

(الأيمان) کۆی وشەی (يمين)ە کە (يمين) لە عەرەبیدا ئەو دەستەیە بەرامبەر دەستی چەپە (واتە: دەستی ڕاست) وە (الحلف)یشی پێ ئەڵێن چونکە کاتێ پەیمانیان ئەبەست هەرکەس دەستی ڕاستی ئەخستە دەستی بەرامبەرەکەیەوە.

وتراوە: بۆیە پێی ئەوترێ (يمين) چونکە سوێند شت ئەپارێزێ وەك چۆن دەستی ڕاست ئەیپارێزێ. وە (اليمين) لە یاسای ئیسلامدا: بەدیهێنان یان جەخت کردنەوەی فەرمانێکە بەهۆی ناوبردنی خوای بەرزەوە یا بەهۆی ناوبردنی سیفەتێك لە سیفەتەکانی خوا.

یاخود (يمين) قەواڵەیەکە سوێند خۆرەکە وورەی خۆی پێ بەهێز ئەکات لەسەرکردنی کارێك یاوازلێ هێنانی.

وە لە زمانی عەرەبی دا(يمين) و (حلف) و (إيلاء) و (قسم) یەك واتایان هەیە (کە بە کوردی سوێندە).

**سوێند خواردن بە ناوی خوا یا بە سیفەتێك لە سیفەتەکانی نەبێت نابێت:**

سوێند خواردن دروست نی‌یە بە ناوی خوا نەبێت یا بە سیفەتێك لە سیفەتەکانی. جا ئەو سیفەتە هی زاتی خوا خۆی بێت،

یا سیفەتی کارێك لە کارەکانی، وەك ئەوەی بوترێت: سوێند بە خوا، سوێند بە عیززەتی خوا، سوێند بە گەورەیی خوا، سوێند بە دەسەڵاتی خوا، سوێند بە ئیرادەی خوا، سوێند بە عیلمی خوا .

وە هەروەها دروستە سوێند خواردن بە قورئان یا بە سورەتێك لە سورەتەکانی یا بە ئایەتێك لە ئایەتەکانی.

---

(١) أحمد (١/٧٩و١١٩) وطبقات إبن سعد (١/٢/١٧٢) والمصنف لعبد الرزاق (١٧١٨٣و١٧١٨٤).

خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت: ﴿وَفِي السَّمَاءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ ، فَوَرَبِّ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ إِنَّهُ لَحَقٌّ مِثْلَ مَا أَنَّكُمْ تَنطِقُونَ﴾ (الذاريات/٢٢-٢٣) واتە:

وە لە ئاسمانەوە رۆزیتان وئەو بەڵێنانەی کە پێتان دراوە لەخێرو شەڕو پاداشت و سزاو جگە لەوانە نوسراوەو دانراوە. جا سوێند بە پەروەردگاری ئاسمان و زەوی ئەو بەڵێنەی کە پێتانی داوە راستە، گومانتان تێیدا نەبێت وەك گومانتان نی یە لەقسەکردنی خۆتاندا).

وە ئەفەرمووێت: ﴿فَلاَ أُقْسِمُ بِرَبِّ الْمَشَارِقِ وَالْمَغَارِبِ إِنَّا لَقَادِرُونَ ، عَلَى أَنْ نُبَدِّلَ خَيْرًا مِنْهُمْ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ﴾ (المعارج/ ٤٠-٤١ ) واتە:

سوێند بە پەروەردگاری شوێن هەڵاتنەکانی رۆژو ئەستێرەکان و شوێن ئاوابوونەکانیان ئێمە توانای ئەوەمان هەیە ئەوان لەناو بەرین وکۆمەڵێك لەوان چاکتر بهێنین، وە ئێمە هیچ شتێك لە دەستمان دەرناچێت.

وە لە ئیبنو عومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت گەووتویەتی: سوێندی پێغەمبەر ﷺ کاتێك سوێندی بخواردایە، ئەیفەرموو: (لا، و مُقَلِّبِ القلوب)[1].

واتە: نا سوێند بەو زاتەی کە دڵان دەگۆڕێ.

وەلە ئەبوسەعیدی خودری یەوە خوای لێ ڕازی بێت ووتویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر زۆر دوعای بکردایە ئەی فەرموو: (والذي نفس أبي القاسم بيده) رواه أبوداود.

واتە: بەو زاتەی گیانی ئەبی قاسمی بە دەستە.

وشەی (أَيمُ اللهِ وعَمْرُالله وأقسمت عليك) سوێندن:

(أيم الله)سوێندە، چونکە مانای (والله) یا (وحقِّ الله) ئەگرێتەوە.

و (يمين الله)، هەر سوێندە لای حەنەفی یەکان و مالیکی یەکان، چونکە سوێند بە خوا ئەگرێتەوە.

شافیعی یەکان ووتویانە: ئەم ووشانە نابنە سوێند بە نییەت نەبێت، جا ئەگەر سوێند خۆرەکە بە نیازی سوێندەوە بیانڵێت دائەبەسترێ، وە ئەگەر بە نیازی سوێندەوە نەیانڵێت دانابەسترێ.

وە لای ئەحمەد دوو ڕیوایەت هەیە، ڕاست ترینیان ئەوەیە کە دائەبەسترێ و ئەبێتە سوێند.

---

(١) أحمد (٢/٢٦) والبخاري (٣٧٩١) وأبو داود (٣٢٦٣) وترمذي (١٥٤٠) ونسائي (٧/٢) وابن ماجة (٢٠٩٢).

وه ووشەی (عمرُ الله) سوێنده لای حەنەفی‌یەکان و مالیکی‌یەکان، چونکه مانای ژیان ومانەوەی خوایه.

شافیعی و ئەحمەد وئیسحاق ڕەحمەتی خوایان لەسەر بێت وتویانه: وتنی ئەو وشەیه نابێته سوێند مەگەر به نیەت نەبێت،

وه وشەی (أَقْسَمْتُ عليك) (أقسمت بالله) واته سوێندم خوارد لەسەرت، وه سوێندم خوارد به خوا، هەندێ له زانایان ڕایان وایه وتنی ئەو وشەیه سوێنده به گشتی، وه بەشی زۆریان ڕایان وایه که به نیەت نەبێت نابێته سوێند،

وه شافیعی‌یەکان بۆ ئەوە چوون که هەرچی ناوی خوای تێدا هێنرا ئەبێته سوێند. وه ئەوەی ناوی خوای تێدا نەهێنرا نابێته سوێند، با به نیازی سوێندیشەوە بیڵێت.

مالیك ڕەحمەتی خوای لێ بێت ووتویەتی: ئەگەر سوێندخۆر بڵێت: (أقسمت بالله) ئەبێته سوێند بەڵام ئەگەر وتی: (أقسمت) یا (أقسمت عليك) لەم شێوەیەدا به نییەت نەبێت نابێته سوێند

سوێند خواردن به سوێندی موسوڵمانان

له پێشەوە باسی ئەوەمان کرد که هەرکەسێك سوێند به سوێندی موسوڵمانان بخوات، لەپاشان پەشیمان بێتەوە یان نەیکات، ئەوە کەفارەتی سوێندی لەسەر دەکەوێت لای شافیعی‌یەکان، بەڵام لای مالیك هیچی لەسەر ناکەوێت،

وه ئەگەرکەسێك سوێند بخوات بڵێت: ئەگەر ئەوەم کرد مانگێك ڕۆژوم بکەوێتە سەر، یا حەجێکم بکەوێتە سەر، یا بڵێت: ئەگەر ئەوەم کرد حەڵاڵم لەسەر حەرام بێت. یا بڵێت: ئەگەر ئەوەم کرد هەرچیم هەیە خێربێت.

ئەوە و وێنەی ئەم سوێندانه کەفارەتیان لەسەرە کاتێ سوێندەکەی خست، ئەوەش ڕاسترین قسەی زانایانه، وه وتراوە: هیچی ناکەوێتە سەر، وه ووتراوە: ئەگەر سوێندەکەی خست، سوێندەکەی بەستووە به چی‌یەوە ئەبێ بیباتە سەر.

**سوێند خواردن بەوەی بڵێت من موسوڵمان نیم یا لە ئیسلام بەری بم**

هەرکەس سوێند بخوات بڵێت: چولەکە بم، یا گاور بم، یا لە ئیسلام و پێغەمبەری ﷺ بەری بم ئەگەر ئەو کارە بکەم، کارەکەشی کرد. کۆمەڵێك لە زانایان لەوانە شافیعی خوایان لێ ڕازی بێ وتویانە: وتنی ئەمانە سوێند نی یە، وە کەفارەتیشی لەسەر نی یە، چونکە دەقی حەدیسەکان لەو بارەیەوە تەنها وەك هەڕەشە وتەمیّ کردنە.

ئەبوداود و نەسائی لە بورەیدەوە ئەگێڕنەوە لە باوکیەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من حلف فقال: إني بريئ من الإسلام فإن كان كاذبا فهو كما قال. وإن كان صادقاً فلن يرجع إلى الاسلام سالماً)[1]. واتە: هەرکەس سوێند بخوات بڵێت: لە ئیسلام بەری بم ئەوە ئەگەر[2]. درۆی کرد چی وتووە ئەوە ئەبێت، وە ئەگەر ڕاست بکات بە سەلامەتی ناگەڕێتەوە ناو ئیسلام

وە لە ثابتی کوڕی (ضحاك)ەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من حلف بغير ملة الإسلام فهو كماقال) واتە: هەرکەس سوێند بە جگە لە ئایینی ئیسلام بخوات (واتە: بڵێت: ئەگەر فڵان کار بکات یان نەیکات ئەوە لەسەر فڵان دین بێت) هەروا ئەبێت کە وتویەتی.

وە حەنەفی یەکان و ئەحمەد و ئیسحاق وسوفیان و ئەوزاعی بۆ ئەوە چوون: کە وتنی ئەوە سوێندە، ئەگەر خستی ئەبێ کەفارەت بدات.

**سوێند خواردن بە جگە لە خوا قەدەغەیە:**

ئەگەر سوێند خواردن تەنها بە ناوی خواوە یا بە سیفەتێك لە سیفەتەکانی یەوە دروست بێت، ئەوە حەرامە سوێند خواردن بە جگە لەوانە، چونکە سوێند خواردن بە شتێك مانای گەورەیی ئەو شتە پێویست ئەکات،گەورەیش تایبەتە بە خوا خۆیەوە.

ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد بە غەیری خوا وەك ئەوەی سوێند بخوات بە پێغەمبەر، ﷺ یا بە پیاو چاکێك، یا بە باوك، یا بە کەعبەو ئەو جۆرە شتانە، ئەوە سوێندەکەی پێك نایەت وە ئەگەر سوێندەکەی بخات کەفارەتی ناچێتە سەر. بەڵام گوناهبار ئەبێت بەوەی غەیری خوای بە گەورە داناوە.

---

(١) أبوداود (٣٢٥٨) والنسائي (٧/٦) وابن ماجة (٢١٠٠).

(٢) ئەگەر بەو سوێندە مەبەستی دوورخستنەوەی خۆی بێت کافر نەبووە. وە با بڵێت: لا إله إلا الله محمد رسول الله . وە داوای لێخۆشبوون لە خوا بکات و تۆبە بکات. بەڵام ئەگەر مەبەستی کوفر بوو بێت کاتێك ئەو شتەی کرد کە سوێندەکەی لەسەر خواردووە، کافر بووە پەنا بەخوا.

١ - لە ئیبنوعومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێت: کە پێغەمبەر ﷺ گەیشتە عومەر لەگەڵ کۆمەڵێك سواردا بوو سوێندی بە باوکی ئەخوارد، پێغەمبەر ﷺ بانگی کردن و فەرمووی:

(ألا إن الله عزوجل ينهاكم أن تحلفوا بآبائكم. فمن كان حالفا فليحلف بالله او ليصمت)[1] واتە: ئاگاداربن خوا قەدەغەی کردووە لەسەرتان سوێند بخۆن بە باوکتان. جا هەرکەسێك سوێند بخوات با بە خوا سوێند بخوات یا بێ دەنگ بێت.

عومەر ﷺ فەرموویەتی: سوێند بەخوا لەو کاتەوە لە پێغەمبەرم ﷺ بیست قەدەغە کردنی سوێند خواردن بە جگە لە خوا، سوێندم پێ نەخواردووە، نە خۆم و نە لەکەسم گێڕاوەتەوە.

٢- وە ئیبنوعومەر ڕەزای خوایان لێ بێت گوێی لێ بوو پیاوێك سوێندی ئەخوارد و ئەی وت: (لا، والكعبه) ئەویش فەرمووی:

گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە فەرموویەتی: (من حلف بغير الله فقد أشرك)[2] واتە: هەرکەس سوێند بە جگە لە خوا بخوات هاوبەشی بۆ خوا پەیدا کردووە.

٣- وە لە ئەبو هورەیرەوە خوای لێ ڕازی بێت دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: (من حلف منكم فقال في حلفه: باللات والعزى: فليقل: لا إله إلا الله. ومن قال لصاحبه: تعال أقامِركَ فليتصدق)[3] واتە: هەرکەس لەئێوە سوێندی خوارد و لە سوێندەکەیدا ووتی: سوێند بە لات وعوززا، با خێرا بڵێت: (لا إله إلا الله) هیچ پەرستراوێکی بەحەق نیە جگە لە الله. وە هەرکەس بە هاوەڵەکەی بڵێت: وەرە قومار بکەین با صەدەقە بکات.

٤- وە لای ئەبوداود هاتووە: کە فەرموویەتی: (من حلف بالأمانة فليس منا)[4] واتە: هەرکەس سوێند بە ئەمانەت بخوات لە ئێمە نیە واتە: لەسەر ڕێگای ئێمە نیە.

٥- وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا تحلفوا بآبائكم ولا بأمَّهاتكم ولا بالأنداد ولا تحلفوا الا بالله ولا تحلفوا إلا و أنتم صادقون)[5] رواه أبوداود والنسائي عن أبي هريرة. واتە: نە بە باوکتان

---

(١) البخاري (٦٦٤٦) ومسلم (٣/١٦٤٦).

(٢) أحمد (٢/٣٤).

(٣) البخاري (٤٨٦٠) ومسلم (٥/١٦٤٧).

(٤) أبوداود (٣٢٥٣) وأحمد (٥/٣٥٢).

(٥) أبو داود (٣٢٤٨) والنسائي (٧/٥).

نە بە دایکتان نە بە بتەکان سوێند مەخۆن، وە سوێند مەخۆن بە خوا نەبێت، وە هەتا قسەکانتان ڕاست نەبێت سوێند مەخۆن.

**سوێند خواردن بە جگە لە خوابێ ئەوەی سوێند پێ خوراوەکە بە گەورە دابنرێت:**

باس کرا کە سوێند خواردن بە غەیری خوا قەدەغەیە ئەگەر مەبەست لەناو هێنانی ئەو شتە بە گەورەدانان بێت وەك چۆن ناوی خوا ئەهێنرێ مەبەست لەناو هێنانەکەی بە گەورە دانانیەتی. بەڵام ئەگەر مەبەست لەناو هێنانی ئەو شتە بە گەورەیی دانانی نەبێت، بەڵکو بۆ تەئکیدی قسەیەك بێت مەکروهە، لەبەر ئەوەی لێك چواندنی تێدا نەبێت، وەلەبەر ئەوەی هەست بە گەورە دانانی جگە لە خوا ئەکرێت.

پێغەمبەر ﷺ بە عەرەبێکی دەشتەکی فەرموو: (أفلح و أبيه)[1] واتە: ڕزگاری بوو بە سەری باوکی.

بەیهەقی ووتویەتی: ئەو جۆرە سوێندانە لە عەرەبەکانەوە ڕوی داوە، وەبە سەر زمانیان دا ئەهات بەبێ مەبەست . وە ئەوەوی پشتگیری ئەو ڕایەی کردووەوە و وتویەتی: بە ڕاستی ئەوە وەڵامێکی ڕازی کەرە.

**سوێندی خوا بە دروست کراوەکانی:**

عەرەب زۆرگرینگی یان ئەدا بەو قسانەی لەسەرەتاوە بە سوێند دەستی پێ ئەکرد وگوێیان بۆ شل ئەکرد، چونکە ڕایان وابوو سوێند خواردنی قسەکەر بەڵگەیە لەسەر گرینگی ئەو شتە کە قسەکەر ئەیەوێ بیڵێت، وە ئەو کەسە بۆیە سوێند ئەخوات بۆ تەئکیدی قسەکەی. وەلەسەر ئەوە قورئان هاتووە سوێند بە شتی زۆر ئەخوات، لەوانە بە قورئانی خۆی، وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ق والقران المجيد﴾

وە بە هەندێ لە دروست کراوەکانی خوا خۆی وەك: ﴿والشمس وضحها﴾وە ﴿واليل إذا يغشى. والنهار إذا تجلى﴾

ئەوەش لەبەر چەند حیکمەتێکی زۆرە لە سوێند پێ خوراوەکەدا و ئەو شتەی سوێندی لەسەر خوراوە، لەو حیکمەتانە سەرنج ڕاکێشانە بۆشوێنی عیبرەت وەرگرتن لەو شتانەی کە سوێندی پێ خوراوە، وە پاڵ پێوە نانە بۆ بیر لێکردنەوەیان بۆ ئەوەی بگەنە ڕاستی.

---

(١) أبوداود (٣٩٢).

خوای گەورە سوێندی بە قورئان خواردووە بۆ دەرخستنی ئەوەی کە ئەو قورئانە قسەی خوایە بە هەق وە هەموو هۆکانی بەختەوەری بە قورئانەوەیە،

وە سوێندی بە فریشتەکان خواردووە بۆ دەرخستنی ئەوەی کە ئەوانیش بەندەی خوان و مل کەچی فەرمانەکانی ئەون و خوا نین تا بپەرسترێن.

وە سوێندی خواردووە بە خۆر و مانگ و ئەستێرەکان لەبەر ئەوەی کەڵك وسودیان بۆئادەمیزاد زۆرە، وە گۆڕانیان لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی‌تر نیشانەیە لەسەر ئەوەی بەدی هاتوون و دروست کراون. وە بەڵگەن لەسەر ئەوەی بەدیهێنەرێك و دروستکەرێکی دانایان هەیە، کەواتە نابێت کەس لە سوپاس گوزاری و ڕوتێکردنی بێ ئاگا بێت.

وە سوێند ئەخوات بە با، وە بە طور، وە بە قەڵەم، وە بە ئاسمانی بورجدار چونکە ئەمانە هەموو نیشانەیەکن لە نیشانەکانی خوا کە پێویستە ڕوی تێ بکرێت بە بیر و هۆش.

ئەمما سوێند لەسەرخوراوەکە گرینگ ترینیان تەنهایی خوایە. وە ناردنی پێغەمبەرە. ﷺ وە زیندو کردنەوەی لاشەیە جارێکی تر. وە ڕۆژی دوایی‌یە. چونکە ئەوانە بناغەکانی ئایینن کە پێویستە ڕەگ لەدەروندا دابکوتن.

وە سوێند بە دروست کراوەکان تایبەتە بە خواوە. بەڵام ئێمەی ئادەمیزاد دروست نی‌یە بۆمان سوێند بە غەیری خوا و سیفەتەکانی بخۆین بەو شێوەیەی لە پێشەوە باس کرا.

**مەرجی سوێند و ڕوکن و کۆڵەکەکەی:**

مەرجە لە سوێند خواردندا ژیری و بلوغی و ئیسلامەتی وتوانایی بەجێ هێنانی سوێندەکە و ئیختیار، چونکە ئەگەر بە زۆر سوێندی پێ بخورێت سوێندەکەی پێك نایەت. وە ڕوکنەکەی ئەو زاراوەیە کە بەکار هاتووە تێیدا.

**حوکمی سوێند خوادن:**

حوکمی سوێند خواردن ئەوەیە کە سوێندخۆر ئەوەی کە سوێندی لەسەر دەخوات بەجێی بێنێت و بیکات، جا بەوە ئەبێ بە (بار) چاك، یان بەجێی نەهێنێ بەوەش سوێندەکەی ئەکەوێ و کەفارەتی ئەکەوێتە سەر.

## جۆرەکانی سوێند

**سوێند ئەکرێت بەسێ بەشەوە:**

١- سوێندی سەرزاری (اليمين اللغو).

٢- سوێندی پێك هاتوو (اليمين المنعقدة).

٣- سوێندی ماڵ نوقمکەر (اليمين الغموس).

**سوێندی سەرزاری و حوکمەکەی:**

سوێندی سەرزاری سوێندێکە مەبەست تێیدا سوێند خواردن نەبێ، وەك ئەوەی پیاو بڵێت: بە خوا ئەخۆی، یا بە خوا ئەخۆیتەوە، یا بە خوا ئەبێ بێیت، وە ئەو جۆرە سوێندانە

کە مەبەستی ئەوەنییە سوێند بخوات، کەواتە لە هەڵەکانی دەمە.

لە عائیشەی دایکی موسوڵمانانەوە خوا لێی رازی بێت فەرموویەتی: ئەم ئایەتە: ﴿لايؤاخذكم الله باللغو في أيمانكم﴾ واتە: خوا لەسەر سوێندی سەرزارەکی لێتان ناگرێت. هاتۆتە خوارەوە دەربارەی ووتنی پیاو: نە بەخوا، بەڵێ بەخوا، نەء بەخوا. بوخاری و موسلیم وجگە لەوانیش ڕیوایەتیان کردووە[1].

وە مالك ڕەحمەتی خوای لێ بێت، وە هەروەها حەنەفییەکان ولەیث وئەوزاعی فەرموویانە: سوێندی سەرزارەکی ئەو سوێندانەن کە سوێند بخوات لەسەر شتێك وابزانێ ڕاستە، بەڵام بە پێچەوانەوە بێت، ئەویش لەبەشی هەڵەدایە.

وە لای ئەحمەد ڕەحمەتی خوای لێ بێت: دوو ڕیوایەت هەیە وەك دوو مەزهەبەکە.

وە حوکمی ئەم سوێندە: ئەوەیە کە کە فارەتی لەسەر نییە ولێی ناگیرێ.

**٢- سوێندی پێکهاتوو حوکمەکەی:**

سوێندی دامەزراو ئەو سوێندەیە کە سوێندخۆر لەسەری بە جەخت بێت و مەبەستی سوێند خواردن بێت، وە ئەو سوێندە وەك سوێندی هەڵەو سەرزارەکی نییە کە بەسەر دەمدا دێ بەپێی عورف و عادەت.

---

(١) البخاري (٦٦٦٣).

وە وتراوە: سوێندی پێك هاتوو ئەوەیە کە سوێند لەسەر کارێکی داهاتوو بخورێت کە بکرێت یا نەکرێت.

حوکمەکەشی ئەوەیە: کەفارەت لەسەر سوێندخۆر پێویست ئەبێت کاتێ سوێندەکەی بکەوێت.

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ لاَ يُؤَاخِذُكُمُ اللّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِنْ يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ وَاللّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ (البقرة:٢٢٥) واتە:

خوا سوێندی سەر زارەکیتان لێ ناگرێ، بەڵام ئەو سوێندەتان لێ ئەگرێ کە بە دڵ بتانەوێت، وە خوا لێبوردە و بەسەبرە.

وە هەروەها فەرموویەتی: ﴿ لاَ يُؤَاخِذُكُمُ اللّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ ذَلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ وَاحْفَظُوا أَيْمَانَكُمْ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ (المائدة:٨٩) واتە:

خوا سوێندی سەرزارەکی‌تان لێ ناگرێت کە مەبەستتان دامەزرانی نی‌یە، بەڵام ئەو سوێندەتان لێ ئەگرێ کە بە دڵ پێکتان هێنابێت، جا ئەگەر ئەو سوێندەتان نەبردە سەر ئەوە کەفارەتەکەی تێرکردنی دە هەژارە لەناوەندی ئەو خواردنەی خۆتان وکەس وکارتان ئەیخۆن یا پۆشاك پێدانیان یا ئازادکردنی کۆیلەیەك، هەرکەس ئەوانەی نەبوو ئەبێ سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بێت، ئا ئەوەیە کەفارەتی سوێندەکانتان کە خوارتان و شکانتان، وە سوێندەکانتان بپارێزن، بەو شێوەیە خوا حوکمەکانی ئاینەکەیتان بۆ ڕوون ئەکاتەوە بە ئومێدی ئەوەی ستایشی خوا بکەن.

**سوێندی نوقمکەر و حوکمەکەی:**

وە هەروەها بە(صابرة)ش ناو ئەبرێت.

ئەویش ئەو سوێندە درۆیەیە کە مافی کەسانێکی پێ ئەخورێت، یا ئەو سوێندەیە مەبەست تێیدا گزی و ناپاکی‌یە.

ئەو سوێندەش تاوانێکە لە تاوانە گەورەکان-کەفارەتی تێدا نی‌یە-چونکە زۆر لەوە گەورەترە کە بریتی بدرێت، وە پێی ئەڵێن: (غموس) چونکە خاوەنەکەی لە ئاگری جەهەننەمدا نوقم ئەکات.

وە پێویستە تۆبەی لەسەر بکرێت و مافەکان بگێڕدرێتەوە بۆ خاوەنی ئەگەر بەهۆی ئەو سوێندەوە مافی تێدا خورابێت.

خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ ولاَ تَتَّخِذُوا أَيْمَانَكُمْ دَخَلاً بَيْنَكُمْ فَتَزِلَّ قَدَمٌ بَعْدَ ثُبُوتِهَا وَتَذُوقُوا السُّوءَ بِمَا صَدَدْتُمْ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ ولَكُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ (النحل:٩٤)واته:

سوێندەکانتان مەکەنە هۆیەك بۆ ئەوەی فێڵ لەیەکتر بکەن، ئەو کاتە لەناو بچن دووای ئەوەی که دڵنیا بوون، وەك کەسێك که پای هەڵخلیسکێ پاش جێگیر بوونی، وە چەژی ناخۆشی بکەن هەر لە دنیادا، بەوەی بوونە هۆی ڕێگری کردن لە ئاینی خوا، وە لە ڕۆژی دووایشدا سزای گەورەتان بۆ هەیە.

١- ئەحمەد ڕەزای خوای لێ بێت، وە ئەبو شێخ ئەگێڕنەوە لە ئەبو هورەیرەوە که پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (خمس ليس لهن كفارة: الشرك بالله، وقتل النفس بغير حق، وبَهْتُ مؤمن، ويمين صابرة يقطع بها مالاً بغير حق)[1] واته:

پێنج شت بریتیيان بۆ نیيە: هاوبەش بۆ خوادانان، کوشتنی کەسێك بە ناحەق، وە درۆ هەڵبەستن بە دەم باوەڕدارێك، وە سوێندی ماڵ وێرانکەر که ماڵی کەسێکی تێدا ببرێت بە ناحەق.

٢- بوخاری لە عبدالله ی کوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێت ئەگێڕێتەوە: که پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الكبائر: الإشراك بالله، وعقوق الوالدين، وقتل النفس، واليمين الغموس)[2]. واته:

گوناهە گەورەکان: هاوبەش بۆ خوا دانان، ئازاردانی دایك و باوك، کوشتنی کەسێك بە ناحەق، وە سوێندی نوقمکەر.

٣- ئەبوداود لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە ئەگێڕێتەوە که پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من حَلَف علي يمين مصبورة كاذباً، فليتبوأ بوجهه مقعده من النار)[3] واته:

هەرکەس سوێندی نوقمکەر بە درۆ بخوات، با خۆی بە چاوی خۆی جێگە لە ئاگردا بۆ خۆی دابنێت.

## سوێند بە پێی عورف و نیاز دائەنرێت:

سوێندەکان لەسەر ئەو عادەت و نەریتە دائەنرێن که خەڵك لەسەری ڕاهاتوون نەك لەسەر ووتنی قسە و ڕستە شەرعی‌یەکان. بۆ نموونە هەرکەس سوێند بخوات که گۆشت نەخوات، کەچی ماسی

(١) أحمد (٢/٣٦٢) وأبو الشيخ كما في نيل الأوطار (٥/٤٩٣)

(٢) البخاري (٦٦٧٥) وأحمد (٢/٢٠١) والنسائي (٧/٨٩).

(٣) أبوداود (٣٢٤٢) والحاكم (٤/٢٩٤).

خوارد ، سوێندی ناكەوێت. هەرچەندە خوای گەورەش بە گۆشت ناوی بردووە، مەگەر ئەو كەسە لە نیەتی خۆیدا بوبێت، یا بە نەریتی نەتەوەكەی وشەی گۆشت ماسیش بگرێتەوە.

وە هەركەس سوێند لەسەر شتێك بخوات و بە قسەیەكی تر بیشارێتەوە ئەوە نیازەكەی حیسابە نەك زاراوەكەی.

مەگەر كەسێكی تر لەسەر شتێك سوێندی بدات، ئەو كاتە لەسەر نیەتی سوێنددەرەكە دائەنرێت نەك لەسەر نیەتی سوێند خۆرەكە، وە گەرنا سوێند خواردن سوودی نابێت بۆ حوكم كردن لە نێوان یەكتردا.

ئیمامی نەوەوی دەفەرموێت: سوێند لەسەر نێتی سوێند خۆرەكەیە لە هەموو حاڵەتەكاندا، مەگەر قاضي یا جێگرەكەی سوێندی بدات لەسەر دەعوایەك كە بەرەو ڕووی كرابێت ئەو كاتە سوێندەكەی لەسەر نیەتی قازی یا جێگرەكەی ئەبێت. وە شاردنەوە دروست نیە لێرەدا بەڵام لە هەموو شێوەكانی تردا دروستە. وە سوێندەكەی ناكەوێت با بۆ شتێكی پوچەڵ، وحەرامیش بێت.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی كە بەپێی نیەتی سوێند خۆر دائەنرێت مەگەر كەسێكی تر سوێندی بدات، حەدیسەكەی ئەبوداود و ئیبنوماجەیە كە لە سوەیدی كوڕی حەنظەلەوە ئەگێڕنەوە فەرمویەتی: ڕۆیشتین ئەمان ویست بچین بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وائیلی كوڕی حوجرمان لەگەڵ دا بوو، دوژمنێكی خۆی گرتی، جا كۆمەڵەكە لایان گران بوو سوێند بخۆن، بەڵام من سوێندم خوارد كە برای منە، ئەوانیش بەرەڵایان كرد.

كاتێ هاتینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پێم ڕاگەیاند كە كۆمەڵەكە نەیان وێرا سوێند بخۆن، بەڵام من سوێندم خوارد كە برامە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕاستت كردووە موسڵمان برای موسڵمانە[1].

وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی بەپێی نیەتی سوێند دەر دائەنرێت ئەگەر لەسەر شتێك سوێند بدرێت ئەوەیە كە

موسلیم وئەبوداود و ترمذي ئەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (اليمين على نية المستحلف)[2] واتە: سوێندەكەت لەسەر ئەو شێوەیە دائەنرێ كە سوێند دەرەكەت باوەڕت پێ ئەكات[1]. وە لەڕیوایەتێكی تردا: (يمينك على مايصدقك عليه صاحبك).

---

(١) أبوداود (٣٢٥٦) وإبن ماجة (٢١١٩) وأحمد (٤/٧٩).

(٢) مسلم (١٦٥٣/٢١) وإبن ماجة (٢١٢٠).

به له بیرچوونەوە یا هەڵە سوێند ناكەوێت:

هەركەس سوێندی خوارد لەسەر شتێك كە ئەیكات پاشان بیری نەبووكردی یا بە هەڵە كردی ئەوە ئەو سوێندە ناكەوێت. بەپێی فەرموودەكەی پێغەمبەر ﷺ كە فەرموویەتی: (إن الله تجاوز لي عن أمتي الخطأ والنسيان وما استكرهوا عليه)[2].

واتە: خوا لە ئەتەوەكەم ئەبورێ لەسێ شتدا: شتێك بەهەڵە بیكات یا لە بیری چوبێتەوە یا زۆری لێ كرابێت لەسەری.

وە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُمْ بِهِ﴾ (الأحزاب/٥) واتە: تاوانتان لەسەر نی‌یە لەو شتانەدا كە بەهەڵە كردوتانە.

سوێندی زۆرلێ كراو ناسەپێ:

پێویست نی‌یە ئەو سوێندە بیرێتەسەر كە زۆر لەپیاو كرابێت لەسەری، وە گوناهبار نابێت ئەگەر سوێندەكەی بخات بەپێی حەدیسەكەی پێشوو، چونكە زۆر لێ كراو ئیرادەو ویستی لێ سەندراوە، و نەمانی ئیرادەش تەكلیف ئەخات. هەر لەبەر ئەوە سێ پێشەوا ئایینی‌یەكە بۆ ئەوە چوون كە سوێندی زۆر لێ كراو پێك نایەت، بە پێچەوانەی ئەبوحەنیفەوە.

جیاكردنەوە لە سوێنددا:

هەركەس سوێند بخوات بڵێت: (إن شاء الله) واتە: خوا بیەوێ، ئەوە جیای كردۆتەوە و سوێندی ناكەوێت.

لە ئیبنوعومەرەوە هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من حلف على يمين فقال: إن شاء الله. فلاحنث عليه) (رواه احمد و غيره وصححه ابن حبان)[3] واتە:

هەركەس سوێندی خوارد لەسەر شتێك و وتی: ئەگەر خوا بیەوێت. سوێندی ناكەوێت.

---

(١) أحمد (٢/٢٢٨) ومسلم (١٦٥٣/٢٠) والترمذي (١٣٥٤) وابن ماجة (٢١٢١).

(٢) ابن ماجة (٢٠٥٤) وابن حبان (٧٢١٩) والدارقطني (٤/١٧٠-١٧٠) والطبراني في المعجم الصغير (١/٢٧٠) والبيهقي (٧/٣٥٦) والحاكم (٢/١٩٨).

(٣) أحمد (٢/١٠) والترمذي (١٥٣٢) والنسائي (٧/٢٥) وابن ماجة (١/٢١٠٥)

**دووباره کردنەوەی سوێند:**

ئەگەر کەسێك لەسەر شتێك چەند جار سوێندی خوارد یا لەسەر کۆمەڵێك شت، دووایی سوێندەکەی خست.

ئەبوحەنیفە و مالك و یەکێ لە ڕیوایەتەکانی ئەحمەد ئەوەیە کە: هەر سوێندەی کەفارەتی خۆی لەسەرە ئەبێ بیدات.

وە لای حەنبەلیەکان: هەرکەس چەند سوێندێکی کەوت پێش کەفارەتدانی لەسەر یەك شت، تەنها کەفارەتێکی لەسەر ئەبێت، چونکە بریتین بۆ یەك ڕەگەز. بەڵام ئەگەر هۆی سوێندەکان جیاواز بوو وەك ڤیهار و سوێند بەخوا ئەوە دوو کەفارەتی ئەکەوێتە سەر و ناچنە ناو یەك.

**کەفارەتی سوێند**

(کفارە) وشەی مبالەغەیە لە (کفر) ەوە وەرگیراوە، واتە: داپۆشین.

وە لێرەدا مەبەست لە کەفارەت ئەو کردەوانەیە کە هەندێك گوناه ئەسڕێتەوە دایئەپۆشێ بۆ ئەوەی شوێنەواریان نەمێنێ لە دونیا و قیامەتدا.

وە ئەوەی ئەبێتە کەفارەت و بریتی سوێندە دامەزراوەکان کاتێ سوێند خۆرەکە شکاندنی ئەمانەن:

١- هەژار تێرکردن.

٢- جل وبەرگ دان بە هەژار.

٣- ئازادکردنی بەندە.

لەو سێیانە یەکێکیان بە ئارەزووی خۆی، جا هەرکەس ئەو سێیانە نەتوانێ با سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت.

وە ئەو سێیانە یەك بە دوای‌یەکدا دانراوە لە بچووکەوە بۆ گەورە، واتە: هەژار تێرکردن لای خوارەوەیانە و جل و بەرگدان بە هەژار ناوەندیانە و بەندە ئازاد کردن لای سەرەوەیانە.

خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ ذَلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ وَاحْفَظُوا أَيْمَانَكُمْ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ (المائدە/٨٩) واتە: جا کەفارەتی ئەم جۆرە سوێندە، خۆراك دان بە دە هەژارە لەخۆراکی ڕۆژانە کە بە ماڵ و منداڵی خۆتانی ئەدەن، یا پۆشاکی ئەوان، یا ئازاد کردنی کۆیلەیەك، جا کەسێ کە ئەوانەی بۆ نەکرا، ئەبێ سێ ڕۆژ بەڕۆژو

بێت، ئەمە کەفارەتی سوێندەکانتانە ئەگەر سوێندتان خواردو نەتان بردەسەر، وە سوێندی خۆتان ڕاگرن (و نەی شکێنن) بەم جۆرە خوا حوکمەکانی دینەکەیتان بۆ ڕوون ئەکاتەوە بەڵکو سوپاسی خوا بەجێ بهێنن.

**حیکمەتی بریتی دان (کەفارەت):**

سوێند خستن پەشیمان بوونەوە و پەیمان نەبردنە سەرە، جا کەفارەت پێویست کراوە بۆ قەرەبوو کردنی.

**هەژار تێرکردن:**

دەقێکی شەرعی نەهاتووە دەربارەی چەندێتی خواردنەکە وجۆرەکەی، بەڵکو هەرچی بووە بە پێی عورف و عادەت دانراوە، کەواتە ئەبێ ئەو خواردنە دابنرێت بە پێی ئەو چەندێتی‌یەی کە ئەیدا بە خێزانی خۆی بە زۆری. نە لەلایەنی زۆرور و کە لەکاتی بۆنەو جەژنەکاندا دەست بڵاوی تیا ئەکرێت، وە نە لە لایەنی خواررووی کە هەندێ جار ئەیدات بە خاو و خێزانی.

جا ئەگەر خواردنی ئەو کەسە بە زۆری لە ماڵەوە خواردنی گۆشت و سەوزە و نانی گەنم بێت ئەوە دروست نی‌یە لەوە کەمتر بدات لە کەفارەتدا، واتە: کەفارەتێك بدات ئەوانەی تیادا نەبێت بەڵکو وێنەی ئەوە و زۆرتر لەوە دروستە. چونکە وێنەی ئەوانە بە ناوەند دائەنرێت، وە لای زۆرروی ناوەندیشە و زیادەشی لەسەرە، ئەمەش بەپێی جیاوازی کەسەکان و وڵات ئەگۆڕێت.

ئیمامی مالیك ڕای وابوو کە مشتێ دروستە بۆ شاری مەدینە، فەرموویەتی: بەڵام ووڵاتەکانی تر وەك ئێمە ناژین ڕام وایە کە لە ناوەندی ئەوەی پێی ئەژین کەفارەت بدەن، بەپێی فەرموودەکەی خوای گەورە: ﴿من اوسط ماتطعمون اهليكم﴾ واتە:

لە ناوەندی ئەوەی ئەیدەن بە کەس وکارتان.

وە زانایان مەرجی ئەوەیان داناوە کە ئەبێ ئەو دە هەژارە موسڵمان بن جگە لە ئەبوحەنیفە، کە بە دروستی دانابوو بدرێت بە هەژارانی خەڵکی (ذمة).

وە ئەگەر ئەو کەسە دە ڕۆژ هەژارێکی تێرکرد، ئەکەوێتە بریتی دە هەژار لای ئەبوحەنیفە، وە زانایانی تر ئەڵێن: هەر بریتی‌یەك هەژارە.

وە ئەو کەفارەتە لەسەر کەسێك پێویستە کە بتوانێت و لە ئەفەقەی خۆی وخێزانەکەی زیاد بێت،

وە زانایان ڕادەی توانایان داناوە بە بوونی پەنجا درهەم لای ئەو کەسە، وەك قەتادە وتویەتی: وە بە بیست درهەم وەك نەخەعی وتویەتی.

**پۆشتە کردنەوە:**

ئەمیش جل و بەرگ پێ دانە، وە هەرچی لەبەر بکرێت و پێی بوترێ پۆشتەو جل و بەرگ دروستە، وەلایەنی کەمی ئەوەیە کە هەژاران لەبەری ئەکەن بە عادەت، چونکە ئایەتەکە بە ناوەندەوە نەی بەستوتەوە، یا بەوەوە کە خێزانەکەی لەبەری ئەکەن، کەواتە کراسێکی ئاودامان وشەرواڵێك بەسە، وە هەروەها عەبایەك یا پەشتە مالێك و کراسێك بەسە.

بەڵام کڵاو، یا مێزەر، یا پێڵاو، یا خاولی و دەستە سڕ دروست نین.

وە لە حەسەن وئیبنو سیرینەوە کە ووتویانە: ئەوەی پێویستە دووکراس دووکراسە.

وە لە سەعدی کوڕی موسەییبەوە: مێزەرێك بیبەستێ بە سەریەوە و عەبایەك بیئاڵێنێ لە خۆیەوە دروستە.

وە لە عطاء وطاوس و نەخەعی‌یەوە: کراسێك کە هەموو لەشی داپۆشێ دروستە، وەکو(ملحفة) پێخەو، وە یا هەرچی بە سەرکراسدا ئاودامان لەبەر بکرێت.

وە لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ : عەبایەك بۆ هەر هەژارێك یا کراسێکی ئاودامان.

مالك و ئەحمەد ڕەحمەتی خوایان لێ بێ ووتویانە: ئەبێ بە هەر هەژارێك شتێك بدرێت کە دروست بێ نوێژی پێوەبکات، پیاو بێت یا ئافرەت، هەر یەکیان بە گوێرەی خۆی.

**ئازادکردنی بەندە:**

واتە ئازادکردنی بەندەو رزگارکردنی لەبەندایەتی با بێ‌باوەڕیش بێت بەپێی (إگلاق) ڕەهایی ئایەتەکە. لای ئەبوحەنیفە و ئەبو پەور و ئیبنو مونژیر.

بەڵام جەماوەری زانایان باوەڕیان بە مەرج داناوە بە هەڵگرتنی (مطلق) ڕەها لە کەفارەتی سوێندا بۆ سەر (مقید) بەستراوە لە کەفارەتی کوشتن و ڤیهاردا. چونکە ئایەتەکە لەوێدا ئەفەرموێت: ﴿فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ﴾ (النساء/٩٢) واتە:

ئازادکردنی گەردنی باوەڕدارێك لە بەندایەتی.

**بەڕۆژووبوون کاتی دەست کورتی:**

وە هەرکەس دەسەڵاتی‌یەکێ لەو سیانەی نەبوو پێویستە لەسەری کە سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت، بەڵام ئەگەر بە هۆی نەخۆشی و شتی واوە نەیتوانی بەرۆژوو بێت نیازی بەڕۆژوو بونی بێت کاتێ توانایی هەبوو، ئەگەر هەر نەیتوانی لێ بوردنی خوا فراوانە.

وە مەرج نی یە ئەو سێ ڕۆژە لەسەریەك بگرێت. چونکە دروستە بەسەر یەکەوە بەڕۆژوو بێت، وەك دروستیشە بە جیا جیا.

وە ئەوەی حەنەفی یەکان وحەنبەلی یەکان باسی ئەکەن لەمەرجی لەسەریەك بەڕۆژوو بوون ڕاست نی یە. چونکە قیرائەتێك لە قورئانیان کردۆتە بەڵگە کە ووشەی(متتابعات) دێت لە ئایەتەکەدا، ئەویش خوێندنەوەیەکی (شاژ)ەو خوێندنەوەی (شاژ)یش ئاوازە ناکرێتە بەڵگە، چونکە قورئان نی یە، وە لەو بارەشەوە فەرموودەیەکی صەحیح نی یە کە ئەوە ڕوون بکاتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ

**دەرکردنی نرخەکەی:**

هەر سێ پێشەوا ئایینی یەکان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە لەبری کەفارەتی سوێند نابێت نرخی خواردنەکە یا پۆشاکەکە بدرێت، بەڵام ئەبوحەنیفە بە دروستی داناوە و ڕێی پێ داوە.

**کەفارەت پێش سوێند خستن یا دووای:**

زانایان لەسەر ئەوە ڕێکن کە بریتی بە سوێندخستن نەبێت واجب نابێت، بەڵام جیاوازی یان هەیەلە پێش خستنی:

جەماوەری زانایان ڕایان وایە کە دروستە پێش ئەوەی سوێندەکە بخرێت بریتی بدرێت، وە هەروەها دواخستنی.

لە فەرموودەیەکی لای موسلیم وئەبوداود و ترمزی دا هاتووە: (من حلف على يمين فرأى غيرها خيراً فمنها فليكفِّرْ عن يمينه وليفعل)[1] واتە: هەرکەس سوێندی لەسەر شتێك خوارد و بۆی دەرکەوت شێوەکەی تری ڕاست ترە، با کەفارەتی سوێندەکەی بدات و ئەوەیان بکات کە خێرترە.

لەم فەرموودەیەدا دروستی پێش خستنی کەفارەت بە سەر سوێندخستندا هەیە،

جا ئەگەرکەفارەتەکەی پێش سوێندخستن خست ئیتر دەست کردن بەوکارەی سوێندەکەی پێ ئەکەوێ دەست کردن بە گوناە نی یە، چونکە بە پێش خستنی کەفارەتەکە، سوێند لەسەر خوراوەکە ڕەوا نەبێت،

وە هەروەها لای موسلیم فەرموودە هەیە کە سوودی دوواخستنی کەفارەتەکەی دەردەخات بەپێی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (من حلف على يمين فرأى غيرها خيراً منها فليأتها، وليكفر عن يمينه)[1]. واتە:

---

(١) مسلم (١٦٥٠/١٢) وأبوداود (٣٢٧٨) والترمذي (١٥٣٠).

هەرکەس سوێندی خوارد لەسەر شتێك، پاشان بینی جگە لەو خێرترە، با ئەویان بکات، ئینجا کەفارەتی سوێندەکەی بدات.

ئەوان ئەڵێن: هەرکەس سوێند خستن پێش کەفارەت دان بخات دەستی بە تاوان کردووە، وە لەوانەیە بمرێت پێش ئەوەی بتوانێت کەفارەتەکە بدات، وە لەوانەیە ئەوە بێت حیکمەتی رێنمای یەکەی پێغەمبەر ﷺ بۆ پێش خستنی کەفارەتەکە.

وە ئەبوحەنیفە ڕای وایە کە بڕیتی دان دروست نی یە دووای سوێند کەوتن نەبێت، چونکە پێویستکەری کەفارەتەکەیە. وە ئەوەی پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (فليكفرعن يمينه وليفعل الذي هوخير).

واتاکەی: لای ئەبوحەنیفە ئەوەیە: ئەو کەسە مەبەستی بێت کەفارەت بدات. وەك فەرموودەی خوای گەورە: ﴿فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ ﴾ (النحل:٩٨) واتە: ئەگەر ویستت قورئان بخوێنی پەنا بە خوابگرە و بڵێ: (أعوذبالله من الشيطان الرجيم).

بەڵام ڕای یەکەم ڕاست ترە.

**دروستی سوێندخستن لەبەر بەرژەوەندی:**

ئەسڵ و بنەڕەت ئەوەیە کە سوێندخۆر سوێندەکەی بپارێزێ.

وە دروستە بۆی لە بردنەسەری پەشێمان بێتەوە ئەگەر بەرژەوەندی یەکی پەسەندی تێدا بێت.

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلاَ تَجْعَلُوا اللَّهَ عُرْضَةً لأَيْمَانِكُمْ أَنْ تَبَرُّوا وَتَتَّقُوا وَتُصْلِحُوا بَيْنَ النَّاسِ ﴾ (البقرة:٢٢٤) واتە: سوێند خواردن بە خوامەکەنە بەربەست بۆکردنی کاری چاك و سیلەی ڕەحم و خۆپارێزی و ڕێك خستنی خەڵك، پاشان بەڵگە بهێننەوە کە سوێندتان بە خوا خواردووە. بەڵکو سوێند خۆر ئەبێ لە سوێندەکەی لابدات و کردەوە چاکەکان بکات و کەفارەت بدات لە بڕیتی سوێندەکەی، وە ناشبێ ئەوە بکات بە عادەت و خو.

وە هەروەها خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قَدْ فَرَضَ اللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ﴾ (التحريم:٢) واتە: خوا بۆی داناون ڕەواکردنی خستنی سوێندەکانتان بە دانی کەفارەت.

---

(١) مسلم (١٦٥٠/١٧).

ئەحمەد و بوخاری و موسلیم ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذاحلفت علي يمين فرأيت غيرها خيراً منها، فأت الذي هوخير، وكفّر عن يمينك)[1] واتە: ئەگەر سوێندت لەسەر کارێك خوارد و بینیت کارێکی تر خێرترە لەوە، ئەوە کارە خێرترەکەیان بکە و کەفارەتی سوێندەکەت بدە.

**جۆرەکانی سوێند بەپێی سوێند لەسەر خوراوەکە:**

لەسەر ئەوە ئەتوانرێت سوێند دابەش بکرێت بە گوێرەی سوێند لەسەر خوراوەکە بەم بەشانەی خوارەوە:

١- سوێندخواردن لەسەر کردنی کاری پێویست یا وازهێنان لە کاری حەرام، ئەم جۆرە سوێندانە حەرامە خستنیان، چونکە تەئکیدە لەسەر ئەوکارانەی خوا داوێتی بە سەر بەندەکانی خۆیدا.

٢- سوێندخواردن لەسەر نەکردنی کاری پێویست وکردنی کاری حەرام، ئەمەیان پێویستە سوێندەکە بخرێت، چونکە سوێندی لەسەر کردنی سەرپێچی کردنی خوا خواردووە وە ئەبێ کەفارەتیش بدات.

٣- سوێندخواردن لەسەر کردنی کاری ڕەوا یاواز لێ هێنانی ئەمەش کەراهەتی هەیە خستنی وە بردنە سەری چاکەیە.

٤- سوێندخواردن لەسەر نەکردنی کاری (مندوب) چاك وکردنی کاری (مکروە) ناڕەوا. لێرەدا سوێندخستن چاکە، وە بردنەسەری کەراهەتی هەیە، وە کەفارەتیش پێویستە.

٥- سوێندخواردن لەسەرکردنی کاری (مندوب) چاك و وازهێنان لەکاری (مکروە) ناڕوا، ئەمانە خوا پەرەستین، جا بردنە سەری چاکە وخستنی خراپە، (مەکروهە).

## نەزر (نذر)

**واتاکەی:**

داسەپاندنی خواپەرستی‌یەکە بە سەر خۆدابێ ئەوەی لە بنەمای شەرع دا پێویست بێت بە زاراوەیەك کە هەست بەوە بکات، وەك ئەوەی بڵێت: بۆ خوا لەسەرم نەزر بێت ئەوەندە پارە بکەمە خێر، یا ئەوەندەم دینارە خێر بێت، یا بڵێت: ئەگەر ئەو نەخۆشەم خوا چاکی کردەوە سێ ڕۆژ بەڕۆژوو ئەبم، وە لەو شێوانە.

---

(١) أحمد (٥/٦١) والبخاري (٦٦٢٢) ومسلم (١٦٥٢/١٩).

وه ئەو نەزره له بالّغی ژێری خاوەن ئیختیار نەبێت دروست نی‌یه با بیّ باوەڕیش بێت.

**نەزر خواپەرستی‌یەکی دێرینەیە:**

خوای گەوره باسی دایکی مەریەممان بۆ ئەگێڕێتەوه که ئەو منالّەی له زگیا بوو نەزری کرد بۆ خوا، ئەفەرموێ: ﴿إِذْ قَالَتْ امْرَأَةُ عِمْرَانَ رَبِّ إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّي إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ (آل عمران:٣٥) واته: باس بکه –ئەی محمد- کاتێك ژنەکەی عیمران ووتی: پەروەردگار من ئەو مندالّەی له زگمایه ئەیکەم به نەزر خالیس بۆ تۆ، تا خزمەتی خانەی تۆ بکات، جا لێم وەربگره چونکه تۆ پاڕانەوەی بەندەکانت ئەبیستی و زانای به مەبەستیان.

وه خوا خۆی فەرمانی دا به مەریەم نەزر بکات فەرمووی: ﴿فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنْ الْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنسِيًّا﴾ واته: کاتیّ مرۆڤێکت بینی هات بۆ لات پێی بلّیّ من بۆ خوای میهرەبان ڕۆژووم لەسەر خۆم نەزر کردووه، جا ئەمڕۆ قسه لەگەلّ هیچ ئادەمیزادێکدا ناکەم.

**نەزر له سەردەمی (جاهلية) نەفامیدا:**

وه خوای گەوره باسی ئادەمیزادی سەردەمی نەفامی ئەکات که چی‌یان ئەکرده نەزر بۆ خواکانیان بۆ ئەوەی لێیان نزیك ببنەوه، وه داوای ئەوەیان لیّ ئەکردن که لای خوا تکایان بۆ بکەن و له خوایان نزیك بکەنەوه، ئەفەرموێت: ﴿وجَعَلُوا لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنْ الْحَرْثِ والأَنْعَامِ نَصِيبًا فَقَالُوا هَذَا لِلَّهِ بِزَعْمِهِمْ وهَذَا لِشُرَكَائِنَا فَمَا كَانَ لِشُرَكَائِهِمْ فَلاَ يَصِلُ إِلَى اللَّهِ ومَا كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَى شُرَكَائِهِمْ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾ (الأنعام:١٣٦) واته: وه موشریکەکان بەشێکیان لەوەی خوا دروستی کردووه له کشتوکالّ و بەرو بوم و ئاژەلّ دانا بۆ خواو بەشێکیش بۆ بتەکانیان، جا له بەشی یەکەمدا به درۆی خۆیان وتیان: ئەمه بەشی خوایه، وه له بەشی دووەمدا وتیان: ئەمه بەشی شەریکەکانمانه له بتەکان، جا ئەوەی که تایبەت بوو به شەریکەکانیان سەرفیان نەئەکرد لەو ڕێگایانەدا که بەشەکەی خوایان تێدا سەرف ئەکردو بۆ خوایان دانابوو، بەلّکو گرینگی‌یان ئەدا به ئاگاداری کردنی و سەرف کردنی بۆ خزمەتچی‌یەکانی بتخانەو سەربڕینی قوربانی‌یەکانیان. بەلاّم ئەوەی بۆ خوا دایان نابوو ئەگەیی به شەریکەکانیان. چ خراپ داوەری‌یان ئەکرد.

**دانانی نەزر له یاسای ئیسلامدا:**

نەزر به پیّی قورئان و سوننەت (مشروع) و دانراوه، خوای گەوره له قورئاندا ئەفەرموێت: ﴿ومَا أَنفَقْتُمْ مِنْ نَفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُمْ مِنْ نَذْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُهُ﴾ (البقرة: ٢٧٠) واته:

چیتان کردووه به خێر یا نەزرتان کردووه و بەجێتان هێناوه خوا ئاگاداره پیّی.

وە هەروەها فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ لْيَقْضُوا تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ﴾ (الحج:٢٩) واتە: پاشان با حاجی‌یەکان ئەوەی ماوەتەوە لەخوا پەرستی و قوربانی تەواوی بکەن بە دەرچوونیان لە ئیحرامەکەیان، ئەویش بەوەی چڵك و پەڵۆخی لە خۆیان بکەنەوە و نەزرەکانیان بە جێ بهێنن و بە چواردەوری کەعبەدا بسوڕێنەوە و گەواف بکەن.

وە ئەفەرمووێت: ﴿يُوفُونَ بِالنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْمًا كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيرًا﴾ (الدهر:٧) واتە: نەزرەکەیان ئەبەنە سەر و ئەترسن لەو ڕۆژەی کە شەڕەکەی هەموو لایەك ئەگرێتەوە[1].

وە لە سوننەتدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من نذر أن يطيع الله فليطعه، ومن نذر أن يعصيه فلايعصه) (رواه البخاري ومسلم عن عائشة)[2] واتە: هەرکەس نەزری کردووە مل کەچی فەرمانەکانی خوابێت با مل کەچی فەرمانەکانی بێت، وە هەرکەس نەزری کردووە سەرپێچی فەرمانەکانی خوا بکات با سەرپێچی نەکات.

وە ئیسلام هەرچەندە نەزر کردنی بەشتێکی (مشروع) داناوە بەڵام بە پەسەندی دانەناوە.

لە ئیبنو عومەرەوە خوایان لێ رازی بێت، ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ نەزرکردنی قەدەغە ئەکرد و ئەی فەرموو: (إنه لايأتي بخير، وإنما يُستَخْرَجُ به من البخيل) (رواه البخاري ومسلم)[3]. واتە: نەزرکردن خێر ناهێنێت بەڵکو شتێك لە دەستی بەخیل دەرئەهێنرێ.

**نەزر کەی دروستە وکەی دروست نی‌یە:**

نەزر دروستە کاتێ بۆکردنی خوا پەرستی‌یەك و خۆنزیك کردنەوە بێت لە خواوە، وە پێویستە ببرێتە سەر.

بەڵام کاتێ نەزرەکە بۆ سەرپێچی کردنی فەرمانی خوا بێت دروست نی‌یە و پێك نایەت.

وەك نەزرکردن لەسەر گۆڕ و نەزر کردن لەسەر گوناهباران، وەك ئەوەی نەزر بکات عارەق بخواتەوە، یا کەسێك بکوژێت، یا واز لە نوێژ بهێنێ، یا ئازاری دایك وباوکی بدات.

---

(١) لە قەتادەوە هاتووە لەبارەی ئەم ئایەتەوە فەرموویەتی: ئەوان نەزریان ئەکرد کە تاعەتی خوا بکەن لە نوێژ و ڕۆژو و زەکات و حەج و عەمرە و ئەو شتانەی کە لە سەریان فەرز کرابوو، جا خوای گەورە بە (أبرار) ناوی بردن. (طبراني) تەخریجی کردووە بە سەنەدێکی صەحیح.

(٢) البخاري (٦٦٩٣) ومسلم (٤/١٦٣٩).

(٣) أحمد (٦/٢٤٧) وأبوداود (٣٢٩٨) والترمذي (١٥٢٤) والنسائي (٧/٢٦) وابن ماجة (٢١٢٥).

جا ئەگەر ئەم جۆرە نەزرانە کران نابێت بیرێنە سەر بەڵکو حەرام ئەبێت لەسەری شتێك لەوانە بکات وە کەفارەتیشی نایەتە سەر، چونکە نەزرەکەی پێك نەهاتووە بە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (لانذر في معصية)[1] (رواه مسلم من حديث عمران بن حصين) واتە: بۆ سەرپێچی کردنی خوا نەزرکردن نی‌یە.

وە وتراوە: کەفارەتی لەسەر پێویست ئەبێ بۆ تەمێ کردنی کە جارێکی تر شتی وا نەکاتە نەزر لەسەر خۆی.

نەزری (مباح) ڕەوا :

لە پێشەوە باسمان کرد نەزر دروستە ئەگەر بۆ نزیك بوونەوە بێت لە خواوە، وە دروست نی‌یە ئەگەر بۆ سەرپێچی کردنی فەرمانی خوا بێت.

بەڵام نەزری ڕەوا وەك ئەوەی بڵێت: نەزر بێت لەسەرم بۆ خوا سواری ئەو شەمەندەفەرە ببم، یا ئەو جلە لەبەرکەم، جەماوەری زانایان ووتویانە: ئەوانە نەزر نین، و هیچ ناکەوێتە سەری.

ئیمامی ئەحمەد ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ووتاری ئەدا سەیری کرد پیاوێکی عەرەبی دەشتەکی لەبەر خۆرەکە ڕاوەستاوە، پێی فەرموو: ئەوە چیتە؟ ووتی: نەزرم کردووە لەبەر خۆرەکە بم هەتا پێغەمبەر ﷺ لە ووتار ئەبێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ليس هذا بنذر، إنما النذر فيما ابتُغِيَ به وجه الله)[2] واتە: ئەوە نەزر نی‌یە، نەزر ئەوەیە بۆ ڕەزامەندی خوا بکرێت.

ئەحمەد وتویەتی: ئەو جۆرە نەزرانە پێك دێن، بەڵام نەزرکەر ئارەزووی خۆیەتی ئەیباتە سەر یا وازی لێ ئەهێنێ وە بریتی ئەکەوێتە سەر ئەگەر نەیکات.

خاوەنی (الروضة الندية) ئەو قسەیەی پێش خستووە و وتویەتی: نەزری ڕەوا پێك دێت وپێی ئەووترێ نەزر و ئەچێتە ناو ئەو شتە گشتی‌یانەی کە فەرمانی بردنە سەریان هەیە. وە ئەوەی ئەبوداود گێڕاویەتی‌یەوە پشتگیری ئەمە ئەکات کە: (ئافرەتێك ووتی: ئەی نێرراوی خوا من نەزرم کردووە ئەگەر بە سەلامەتی لەم جەنگەدا بگەڕێیتەوە لە پشت سەرتەوە دەف لێدەم) پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (أوفي بنذرك) [3] واتە: نەزرەکەت ببەرە سەر.

---

(١) البخاري (٦٦٩٣) ومسلم (٤/١٦٣٩).

(٢) أبوداود (٣٣١٢).

(٣) أحمد (٢/٢٠٠).

وە لێدانی دەف ئەگەر ڕەوا نەبێت کەراهەتی هەیە یا زۆر کەراهەتی هەیە و بە هیچ شێوەیەك نزیك بوونەوە نی‌یە لە خواوە، جا ئەگەر ڕەوابێت ئەوە بەڵگەیە کە ئەبێت کاری ڕەوا ببرێتە سەر، بەڵام ئەگەر مەکروە بێت وری پیَ درابێت ببرێتە سەر ئەبێتە بەڵگەی ئەوەی کاری ڕەوا لە پێش ترە بە جیَ بهێنرێت.

**نەزری بە مەرج و بیَ مەرج:**

نەزر جاری وا هەیە مەرجی لەگەڵدا ئەبێت، وە جاری وا هەیە بیَ مەرج ئەبێت.

یەکەمیان: کردنی چاکەیە کە لەسەر خۆی واجبی بکات کاتیَ خوا نیعمەتێکی پیَ ببەخشیَ یا بەڵایەکی لەسەر لابات.

وەك ئەوەی بڵێت: ئەگەر خوا نەخۆشەکەم چاك بکاتەوە سیَ هەزار تێر ئەکەم، یا بڵێت: ئەگەر خوا ئەوەم بۆ جێبەجیَ بکات ئەوەم لەسەر نەزر بێت، ئەم جۆرە نەزرانە ئەبێت ببرێتە سەر کاتیَ گەیشتن بە داواکە بەدیهات.

دووەم: نەزری (مطلق) ڕەهایە: ئەویش ئەوەیە شتێك لەسەر خۆی دابنێت بیَ ئەوەی بی بەستیَ بە هیچەوە، وەك ئەوەی بڵێت: نەزر بێت لەسەرم دوو ڕکات نوێژ بکەم بۆ خوا، ئەم جۆرانەش ئەبیَ ببرێنە سەر و وەفایان پیَ بکرێت. چونکە ئەچێتە ناو فەرموودەی پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: (من نذر أن يطيع الله فليطعه)[1] واتە:

هەرکەس نەزری کرد کە تاعەتی خوا بکات با تاعەتەکەی بباتە سەر.

**نەزرکردن بۆ مردوو:**

لە کتێبی حەنەفی‌یەکاندا هاتووە: ئەو نەزرانەی بۆ مردوو ئەکرێت لە لایەن بەشی زۆری خەڵکی عەوامەوە، وە ئەوەی ئەبرێت بۆ سەر گۆڕی پیاوچاکان لە پوڵ و پارە وەمۆم و ڕۆن وئەو جۆرە شتانە بۆ نزیك بوونەوە لی‌یان، وەك ئەوەی بڵێت: ئەی گەورەم فڵان کەس، ئەگەر کەسە نادیارەکەم بگەڕێتەوە یا فڵانە نەخۆشم چاك بێتەوە یا پێویستی‌یەکەم جیَ بەجیَ بێت، ئەوەندە پارە یا خواردن یا مۆم یا ڕۆن خێر بێت بۆت. ئەم کارە بە ئیجماعی هەموو زانایان پوچەڵە ولە چەند ڕوویەکەوە حەرامە:

---

(١) أحمد (٦/٤١) والبخاري (٦٦٩٦) وأبوداود (٣٢٨٩) والترمذي (١٥٢٦) والنسائي (٧/١٧) وابن ماجة (٢١٢٦).

١- ئەو کارە نەزرکردنە بۆ مەخلوقی خوا، وە نەزرکردنیش بۆ دروست کراوانی خوا دروست نی‌یە، چونکە نەزر عیبادەتە، عیبادەتیش بۆ خوا نەبێت نابێت.

٢- ئەوەی نەزرەکەی بۆ ئەکرێت مردووە، مردووش خاوەنی هیچ نی‌یە.

٣- جا ئەگەر ئەو کەسە وابزانێت کە ئەو مردووە کار وفەرمانی بە دەستە ئەوە ئەو بیرو باوەڕەی کوفرە پەنا بە خوا.

مەگەر ئەو کەسە بڵێت: ئەی خوایە لەسەرم نەزر بێت ئەگەر نەخۆشەکەمت چاك کردەوە یا کەسە نادیارەکەمت بۆ هێنامەوە یا ئەو پێویستیەمت بۆ بەجێ هێنام، ئەو کۆمەڵە هەژارە تێر ئەکەم کە لەبەردەم دەرگای فڵانە پیاوچاکن، یاحەسیرێك ئەکڕم بۆ مزگەوت، یا نەوت بۆ چراکانی، یا ئەوەندە پارە ئەدەم بەوکەسەی خزمەتی ئەکات، وە وێنەی ئەو جۆرە شتانە کە خێری بۆ هەژاران تێدایە و نەزریشە بۆ خوای گەورە، وە ناوهێنانی پیاو چاکەکەش لەبەر ئەوە بێت کە شوێنی سەرف کردنی نەزرەکە بێت بۆ ئەوانەی کە شایستەن و دانیشتوون لەبەر دەرگاکەدا یا لەبەر دەرگای مزگەوتدا. ئەوە بەو جۆرە دروستە. وە دروست نی‌یە بدرێت بە دەوڵەمەند و دەسەڵاتدار، یا بە کەسێك پلە و پایەی لە کۆمەڵدا هەبێت، یا پلە و پایەی زانیاری هەبێت بە مەرجێ هەژار نەبێت. وە لە شەرعدا نەچەسپاوە دروست بێت بدرێت بە دەوڵەمەند.

**نەزری خوا پەرەستی لە شوێنێکی دیاری کراودا:**

ئەگەر کەسێك لەسەر خۆی نەزرکرد لە شوێنێکی دیاری کراودا نوێژبکات یا بەرۆژوو بێت، یا قورئان بخوێنێت، یا ئیعتیکاف بکات، ئەوە ئەگەر ئەو شوێنە لە شەرعدا چاکێتی تایبەتی هەبوو وەك نوێژکردن لە سێ مزگەوتەکاندا. مزگەوتی حەرام و مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ وە مزگەوتی قودس، ئەبێ ئەو نەزرە وەفای پێ بکرێت، ئەگینا ئەو نەزرەی دانەناوە کە خوا فەرمانی داوە بەبردنە سەری.

وە شافیعی‌یەکان وتوویانە:

ئەگەر کەسێك نەزر بکات شتێك بکات بە خێر و بیدات بە خەڵکی شارێکی دیاری کراو لەسەری پێویستە وەفای پێ بکات، وە ئەگەر لەسەرخۆی نەزر بکات لە شارێکدا بەرۆژوو بێت،ئەبێ ئەو نەزرە بەجێ بگەیەنێت، چونکە خواپەرەستی‌یە، وە ئەگەر شوێنی نەزرەکەی دانەنابوو لە شارە دیاری کراوەکە بۆی هەیە لە شوێنێکی تریشدا بێت هەر بەرۆژوو بێت.

وە ئەگەر نەزری کرد لە شارێکدا نوێژ بکات و شوێنی بۆ دیاری نەکرد، نوێژەکەی لە شوێنێکی تردا بکات، لەبەر ئەوەی جیاوازی نی‌یە لەگەڵ شوێنەکانی تردا، جگە لە مزگەوتی حەرام

واتە:حەرەم هەمووی، وە مزگەوتی مەدینە و مزگەوتی ئەقسا،ئەگەر نەزری کرد لە یەکێ لەم سێ مزگەوتەدا نوێژ بکات، ئەوە لەبەر گەورەیی و فەضلی ئەو شوێنانە پێویست دەبێت، بە پێی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (لاتشد الرحال إلا إلي ثلاثة مساجد: المسجد الحرام ومسجدي هذا والمسجد الأقصى)[1]. واتە: بنەو بارگە ناپێچرێتەوە بۆ سێ مزگەوت نەبێت: مزگەوتی حەرام وئەم مزگەوتەی من ومزگەوتی ئەقصا.

وە بەلگەیەکی نەقلییان هێناوەتەوە لەسەر دیاری کردنی شوێنی خێر کردن بە نەزر. ئەویش ئەوەیە کە: عەمری کوری شوعەیب لە باوکییەوە لە باپیرەیەوە ئەگێرێتەوە:کە ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ووتی: ئەی نێرراوی خوا، من نەزرم کردووە ئەوە و ئەوەسەربیم لەو شوێنەدا کەخەلکی جاهیلی لێیان سەر ئەبرِی، فەرمووی: بۆ بت؟ ووتی: نەو، فەرمووی: نەزرەکەت بەرەسەر[2].

وە حەنەفیەکان ووتویانە: کەسێك بلێت: نەزر بێت بۆ خوا دوو رکات نوێژ لە فلانە شوێندا بکەم یا خێربکەم بە هەژارانی فلانە شار، دروستە لە شوێنێکی تر بە جێیان بهێنێ، لای ئەبوحەنیفە و هەردوو هاوەلەکەی چونکە مەبەست لە نەزر نزیك بوونەوەیە لە خواوە و هیچ پەیوەندی‌یەکی بەو شوێنەوە نی‌یە.

وە ئەگەر نەزری کرد دوو رکات نوێژ لە مزگەوتی حەرامدا بکات ئەگەر لە شوێنێکی‌تر کردی کە لەو شوێنە رێزی کەمتر بوو، یا خود رێزی نەبوو لای ئەوان دروستە، چونکە مەبەست نزیك بوونەوەیە لە خواوە، ئەوەش لەهەر شوێنێکدا بێت پێك دێت.

**نەزرکردن بۆ شێخێکی دیاری کراو:**

وە هەرکەس نەزر بکات بۆ شێخێکی دیاری کراو، ئەگەر ئەو شێخە زیندو بوو مەبەستی نەزرکەرەکە ئەوە بوو خێری پێ بکات لەبەر دەست کورتی شێخەکە لە ژیاندا ئەو نەزرە دروستە، وە ئەوە لەبەشی چاکەکردنە لە ئایینی ئیسلام کە هانی خەلکی داوە لەسەر کردنی.

بەلام ئەگەر مردبێت و مەبەستی نەزرکەرەکە پەنا پێ بردنی بێت و داوای بەجێ هێنانی پێویستی لێ بکات، ئەوە نەزرەکەی نەزری سەرپێچی فەرمانی خوایە و نابێت بە جێ بهێندرێت.

**کەسێك رۆژوو نەزر بکات و توانای گرتنی نەبێت:**

---

(١) البخاري (١١٨٩) ومسلم (١٣٩٧/٥١١).

(٢) أبوداود (٣٣١٢).

کەسێك ڕۆژووی مەشروعی لەسەر خۆی نەزر کردوو نەیتوانی لەبەر پیری یا لەبەر بوونی نەخۆشی‌یەك کە ئومێدی چاك بوونەوەی لێ نەئەکرا . . . بۆی هەیە نەیگرێت وکەفارەتی سوێند بدات، یا لە جیاتی هەر ڕۆژێك هەژارێك تێربکات.

**سوێند خواردن لەسەر ئەوەی کە هەموو ماڵەکەی خێر بێت:**

هەرکەس سوێند بخوات هەرچی ماڵێکی هەیە بیکات بەخێر یا بڵێت: چی ماڵم هەیە بۆ ڕێگای خوا بێت، ئەوە نەزری (لجاج) پێ داگرتنە، ئەبێ کەفارەتی سوێندەکە بدات، نەك ماڵەکەی بدات بە خێر، وە شافیعی لەسەر ئەو ڕایەیە.

وە مالیك وتویەتی: ئەبێ سێ‌یەکی ماڵەکەی بکات بە خێر،

ئەبوحەنیفە ووتویەتی: ئەبێ هەرچی زەکاتی لەسەر بێت لەماڵەکەی بکرێت بە خێر، و ئەوەی زەکاتی ناکەوێتە سەر وەك خانوو وولاغ و ئەو جۆرە شتانە ئەمێنێتەوە.

**کەفارەتی نەزر:**

ئەگەر نەزرکەر نەزرەکەی جێبەجێ نەکرد یان پەشیمان بۆوە ئەبێ کەفارەتی سوێند بدات.

عوقبەی کوڕی عامر ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (كفارة النذر إذا لم يسم كفارة يمين) رواه إبن ماجة والترمذي وقال: حسن صحيح غريب[1]. واتە: کەفارەتی نەزر ئەگەر ناوی نەهێنرابوو کەفارەتی سوێندە.

**کەسێك بمرێت و نەزری ڕۆژووی لەسەر بێت:**

ئیبنوماجە ئەگێڕێتەوە: کە ئافرەتێك پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ ووتی: دایکم مردووە، وە ڕۆژووی نەزری لەسەر بوو پێش ئەوەی ڕۆژووەکەی بگرێت کۆچی دوایی کرد. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ليصم عنها الولي)[2] واتە: با سەرپەرشتی کەرەکەی لە جیاتی بەرۆژوو بێت.

---

(١) الترمذي (١٥٢٨) وإبن ماجة (٢١٢٧).

(٢) إبن ماجة (٢١٣٣).

# کڕین و فرۆشتن (البیع)

زوو چوون بە پیر پەیداکردنی ڕۆزییەوە:

ترمذی ئەگێڕێتەوە لە صەخری غامدییەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (اللهم بارك لأمتي في بكورها) واتە:

خوایە ئەو کار و فرمانەی کە ئوممەتم سەر لە بەیانی زوو هەوڵی بۆ ئەدات، پیرۆز و پڕبەرەکەتی بکەیت.

وە وتویەتی: ئەگەر یەکێك یا سوپایەکی بناردایە بەیانی زوو ڕەوانەی ئەکرد، وە صەخر خۆی پیاوێکی بازرگان بوو کە کەل وپەلی بناردایە بەیانی زوو ڕەوانەی ئەکرد، ئیتر خوا دەوڵەمەندی کردبوو سامانێکی زۆری پێ دابوو[1].

کاسبی حەڵاڵ:

---

(١) أبوداود (٢٦٠٦) والترمذي (١٢١٢) والنسائي في الكبرى (٨٨٣٣) وابن ماجة (٢٢٣٦) وابن حبان (٢٧٣٥).

لە عەلییەوە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إن الله تعالى يحب أن يرى عبده يسعى في طلب الحلال)رواه الطبراني والديلمي)[2] واتە: خوا پێی خۆشە کە بەندەکانی ببینێ هەوڵی پەیدا کردنی ماڵی حەڵاڵ ئەدەن.

وە لە مالکی کوڕی ئەنەسەوە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (طلب الحلال واجب على كل مسلم) (رواه الطبراني.[3] قال المنذري: وإسناده حسن إن شاء الله). واتە: هەوڵ دان بۆ پەیداکردنی ماڵی حەڵاڵ پێویستی سەرشانی هەموو موسڵمانێکە.

وە لەڕافیعی کوڕی خەدیجەوە هاتووە کە پرسیار کرا: ئەی نێرراوی خوا، چ کاسبییەك حەڵاڵ ترو بەرەکەتی زیاترە؟ فەرمووی: (عَمَلُ المرءِ بِيَدِهِ، وكل بيع مبرور) (رواه أحمد والبزار. و رواه الطبراني

---

(٢) إتحاف السادة (٥/٤٦٥) والتذكرة (١٣٣) والأسرار المرفوعة (١٢٨).

(٣) مجمع الزوائد (١٠/٢٩١).

عن ابن عمر بسند رواته ثقات)[1] واته: کارێك كه ئادەمیزاد به دەستی خۆی بیکات و هەموو کڕین و فرۆشتنێك كه حەرام و فێڵ کردنی تیا نەبێت.

**زانینی حوکمەکانی کڕین و فرۆشتن پێویستە:**

پێویستە لەسەر هەموو ئەو کەسانەی دەست ئەکەن بە کاسبی کە زانیاریان هەبێت بەو حوکمانەی کە کاسبی‌یەکەیان دروست ئەکات و تێکی ئەدات بۆ ئەوەی مامەڵەکەیان دروست بێت، وە هەڵسوکەوتیان دووربێت لە خراپە.

ئەگێڕنەوە کە عومەر ﷺ لە بازاردا ئەسوڕایەوە بەسەر بازرگانەکانەوە هەندێکیانی بەرشوڵك ئەداو ئەی فەرموو: لەم بازاڕەی ئێمەدا کەسێك زانا نەبێت بە مامەڵەکردن با کڕین و فرۆشتن نەکات، ئەگینا ئەبێتە سوود خۆر بیەوێ یا نەیەوێ،

وە بەشی زۆری موسڵمانان ئێستا فێربوونی مامەڵە کردنیان پشت گوێ خستووە، وە لەم لایەنەوە بێ ئاگان وە وایان لێ هاتووە،گوێ نادەنە حەرام خواردن، و قازانجەکەیان هەر چەند زۆر بێت پێیان باشە، ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە پێویستە هەموو ئەو کەسانە خۆیانی لێ بپارێزن کە خەریکی کڕین وفرۆشتنن. بۆ ئەوەی حەڵاڵ وحەرامیان بۆ لە یەك جیابکرێتەوە وکاسبی‌یەکەیان حەڵاڵ بێت و دووربێت لە گومان بە پێی توانا.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (طلب العلم فریضة علي کل مسلم ومسلمة)[2] واتە: هەوڵی فێربوون فەرزێکە لەسەرشانی هەموو موسڵمانێکی نێر و مێ .

جا کەواتە ئەو کەسانەی ئەیانەوێ حەڵاڵ خۆر بن و ڕۆزی خاوێن بە دەست بێنن، وە ببنە جێی متمانەی خەڵکی با ئاگایان لەم مەسەلەیە هەبێت.

لە نوعمان کوڕی بەشیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الحلال بَیِّنٌ، والحرامُ بیِّنٌ، وبینهما أمور مشتبهة، فمن ترك مایُشتبه علیه من الإثم کان لما استبان أترك، ومن اجترأ علی مایُشك فیه من الإثم أوشَك أن یواقع ما استبان. والمعاصي حمی الله، من یرتع حول الحمی یوشك أن یواقعه). (رواه البخاري ومسلم)[3] واتە:

---

(١) أحمد (٤/١٤١) ومجمع الزوائد (٤/١٠) من حدیث رافع، ومجمع الزوائد (٤/٦١) من حدیث ابن عمر.

(٢) إبن ماجة (٢٢٤).

(٣) البخاري (٥٢) ومسلم (١٥٩٩).

حەڵاڵ ئاشکرایە وحەرام ئاشکرایە، وە لە نێوان ئەو دووانەدا چەند شتانێك هەن (مشتبە)ن وگومانیان لەسەرە، جا هەرکەس واز لەو شتانە بهێنێ کە گومانی گوناهی لێ دەکرێ ئەوە لەو شتانەدا کە گوناهیان ئاشکرایە باشتر خۆی دەپارێزێ، وە هەرکەس جورئەتی هەبێت کە بچێتە بەلای ئەوانەدا کە گومانی گوناهی لێ ئەکرێ نزیکە بکەوێتە ئەوانەشەوە کە حەرامیان دیارە، وە حەرامەکان سنووری خوان، هەرکەس بە دەوری سنووردا ئاژەڵ بلەوەڕێنێ نزیکە تێی بکەوێت.

**مانای (بیع):**

(بیع) ماناکەی لە لۆغەتدا: ئاڵوگۆڕ کردنە بە گشتی.

وە لە شەرعدا گۆڕینەوەی ماڵە بە ماڵ بە ڕەزامەندی، یا گواستنەوەی موڵکێکە لەبەرابەر بریتی‌یەك لە کەسێکەوە بۆ کەسێك بەو شێوەی کەڕێی پێ دراوە.

**مەشروعیەتی کڕین وفرۆشتن لە ئیسلامدا:**

کڕین و فرۆشتن بە پێی قورئان و سوننەت و ئیجماعی ئوممەت مەشروعە. بە پێی فەرموودەی خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وحَرَّمَ الرِّبَا﴾ (البقرة/٢٧٥) واتە: خوا فرۆشتنی حەڵاڵ کردووە و (ربا) سوودی حەرام کردووە.

وە بە پێی سوننەت فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (أفضل الکسب عملُ الرجل بیده، وکل بیع مبرور)[1]. واتە: باشترین کاسبی ئەوەیە پیاو بە دەستی خۆی بیکات و هەموو فرۆشتنێکی حەڵاڵ و بێ فرت‌وفێڵە.

وە نەتەوەی ئیسلامیش هەموو کۆن لەسەر دروستی (بیع) کڕین و فرۆشتن ومامەڵە پێ‌کردنی لەسەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ هەتا ئەمڕۆ.

**حیکمەتی مامەڵە کردن:**

خوا کڕین و فرۆشتنی داناوە لەبەر فراوانی لەسەر بەندەکانی، چونکە هەموو تاکێك لە تاکەکانی جۆری مرۆڤ پێویستی هەیە بە خواردەمەنی و پۆشاك و گەلێ شتی‌تر کە ناتوانێ لێیان بێ‌نیاز بێت هەتا لە ژیاندا بێت، وە خۆشی ناتوانێ بە تەنها ئامادەیان بکات بۆ خۆی، چونکە ناچارە لە کەسێکی تریان وەربگرێت. وە هیچ ڕێگایەك لەئاڵ و گۆڕکردن تەواوتر نی‌یە بۆ بە دەست هێنانیان، جا ئەوەی لە خۆی زیادە ئەیگۆڕێتەوە بەوانەی کە پێویستی پێی هەیە.

(١) مجمع الزوائد (٤ /٦١) من حدیث ابن عمر (٦١/٤).

**شوێنەواری مامەڵە کردن:**

کاتێ پەیمانی (بیع) مامەڵە کە تەواو ئەبێت بە هەموو مەرجەکان و پایەکانیەوە خاوەنێتی شتە فرۆشراوەکە بەو هۆیەوە ئەگوێزرێتەوە بۆ کڕیار، وخاوەنێتی نرخی شتەکە لە کڕیارەوە ئەگوێزرێتەوە بۆ فرۆشیار، وە بۆ هەر دوولا ڕەوا نەبێت مامەڵە بەو شتە بکەن کە خاوەنێتی بۆ گوێزراوەتەوە بە هەموو شێوەیەك کە ڕەوا بێت.

**(أركان) پایەکانی کڕین و فرۆشتن:**

کڕین و فرۆشتن بە (الإیجاب والقبول) (پێدان و وەرگرتن) پێك دێت، جگە لە هەندێ شتی کەم نرخ کە پێویست بە (إیجاب وقبول) ناکات، بەڵکو تەنها بە پێ دان پێك دێت، وە ئەوەش زۆر جار ئەگەڕێتەوە بۆ عورف وعادەتی خەڵك کە چۆن ڕۆیشتووە.

لە(ئیجاب وقەبول) پێدان و وەرگرتندا زاراوەی دانراوی تایبەتی نیە، چونکە ئەوەی گرنگە لە عەقدو ڕێکەوتنەکاندا ماناو مەبەستە نەك زاراوە و داڕێژان.

وە ئەوەش بە ڕەزامەندی بە گۆڕینەوەکە پێك دێت، وە بەوانەی ئەبنە بەڵگەی وەرگرتن و پێ دان، یا هەرچی شتێك کە ڕەزامەندی بگەیەنێت و مانای خاوەنێتی و تاپۆکردن بگرێتەوە، وەك ئەوەی فرۆشیار بڵێت: پێم فرۆشتی یا پێم دای یا بویتە خاوەنی یا ئەوە بۆتۆ یا نرخەکەیم بدەرێ، وە کڕیار بڵێت: کڕیم یا وەرم گرت یا قەبوڵم کرد یا ڕازیم یا نرخەکەی بگرە.

**مەرجەکانی صیغەی عەقدەکە:**

وە بە مەرج گیراوە لە (إیجاب) و (قبول)دا کە هەردووکیان سیغەو داڕشتەی پەیمانەکەن:

(یەکەم)-هەر دووکیان لە یەك کۆڕدا ڕووبدات بێ ئەوەی ماوەیەکی زیان بەخش لە نێواندا هەبێت کە لە یەکیان دابڕێت.

(دووەم) ایجاب و قەبوڵەکە ڕێك لەو شتەدا بێت کە ڕازی بوون لەسەری پێویستە کە فرۆشراوەکەو نرخەکەیە، چونکە ئەگەر جیاوازییان هەبوو مامەڵەکە پێك نایەت.

بۆ نمونە ئەگەر فرۆشیار بڵێت: ئەو کراسەم بە پێنج دینار پێ فرۆشتی، کڕیاریش بڵێت: بە چوار دینار قەبوڵم کرد، ئەو فرۆشتنە پێك نایەت لە نێوانیاندا لەبەر جیاوازی ایجاب وقەبوڵەکە.

(سێیەم)-ئەبێ بە زاراوەی ڕابوردو بێت وەك ئەوەی فرۆشیار بڵێت: پێم فرۆشتی، وە کڕیار بڵێت: قەبوڵم کرد، یا بە زاراوەی داهاتوو بێت ئەگەر مەبەست ئەو کاتە بێت کە تێیدایە، وەك ئەوەی بڵێت: پێت ئەفرۆشم وە ئەیکڕم لەگەڵ ئەوەدا مەبەست ئەوکاتە بێت.

بەڵام ئەگەر مەبەست لە زاراوەکە داهاتوو بێت ئەبێتە بەڵێندان بە عەقد، وە بەڵێندان بە عەقدیش، بە عەقدی شەرعی دانانرێت، کەواتە ئەم عەقدە بەم زاراوەیە دروست نی‌یە.

**عەقد بە نووسین:**

وەك چۆن پەیمانی کڕین و فرۆشتن بە (الإیجاب والقبول) پێك دێت هەروا بە نووسینیش پێك دێت بە مەرجێ هەر دوولا لە یەکەوە دوربن، یا پەیمان بەست بە نوسین کەڕ و لاڵ بێت و توانای قسەکردنی نەبێت. بەڵام ئەگەر هەرددلا لەیەك کۆڕدابن و بەهانەیەك نەبێت ڕێ بە قسەکردن بگرێت ئەوە پەیمانی فرۆشتن بە نوسین پێك نایەت، چونکە لادان ناکرێ لە قسە، کە ئاشکراترینی جۆرەکانی گەیاندنە، بۆ جگە لەو، مەگەر هۆیەکی ڕاستەقینە هەبێت پێویست بکات واز لە قسەکردن بهێنرێت و بە شتی تر بکرێت.

وە مەرجە بۆ تەواوێتی پەیمانەکە ئەوەی کە نامەکەی بۆ نوسراوە قەبوڵی بکات هەر لەو دانیشتنەدا کە ئەخوێنرێتەوە.

**پەیمان بەستن بە هۆی نێرراوەوە:**

وەك چۆن پەیمانی کڕین و فرۆشتن بە زاراوە ونوسین پێك دێت بە هۆی نێرراویشەوە لە لایەن یەکێ لە پەیمان بەستەکانەوە دروستە، بە مەرجێك ئەوەی نێرراوەکەی بۆ لانێرراوە قەبوڵی بکات دوای پێ ڕاگەیاندنەکە.

هەرکاتێ قەبوڵ کردن هاتەدی لەم دوو شێوەیەدا پەیمانەکە تەواو ئەبێت و لەسەر ئەوەش ناوەستێ کە لایەنی‌یەکەم کە پەیمانەکەی ناردووە بزانێت قەبوڵ کراوە.

**پەیمانی کەڕ و لاڵ :**

وە هەروەها بە ئیشارەتی ناسراوی کەڕ و لاڵیش پێك دێت، چونکە ئیشارەتی ئەو کە دەربڕی ئەوە بێت کە لە دڵیایەتی ڕێك وەك قسەکردن وایە بە زمان، وە دروستە بۆ کەڕ ولاڵ بە نوسین پەیمان ببەستێ لە جیاتی ئیشارەت ئەگەر خوێندەواری هەبێت.

وە ئەو شتانەی هەندێ لە زانایان کردویانەتە مەرج بۆ ئەوەی هەندێ زاراوەی تایبەتی دیاری کراو بووترێت، نە لە قورئاندا هاتووە و نە لە سوننەتدا.

**مەرجەکانی کڕین و فرۆشتن:**

ئەبێ چەند مەرجێك هەبێت لە کڕین و فرۆشتندا بۆ ئەوەی دروست بێت، وە ئەو مەرجانەش هەندێکیان بەستراون بە پەیمان بەستەوە، وە هەندێکیان بەستراوە بەو شتەوە کە پەیمانی لەسەر

بەستراوە، واتە ئەو ماڵەی ویستراوە بگوێزرێتەوە لە یەکێکیانەوە بۆ ئەوی تریان، نرخەکە یا فرۆشراوەکە.

**مەرجەکانی پەیمان بەست:**

مەرجە پەیمان بەست ژیر و خاوەن تەمیز بێت کەواتە پەیمانی شێت و سەرخۆش ومنداڵی بێ تەمیز دروست نیە.

جا ئەگەر شێتەکە هەندێ جار چاك ئەبۆوە وە هەندێك جاریش شێت ئەبوو ئەوە ئەو پەیمانەی لە کاتی چاك بوونەوەدا بەستی دروستە وە ئەوەی لە کاتی شێتی دا بەستی دروست نیە.

وە ئەو منداڵەی خاوەن تەمیز بێت (واتە چاکەو خراپە لەیەك جیابکاتەوە) پەیمانی دروستە، و ئەوەستێ لەسەر ڕێ پێدانی سەرپەرشیارەکەی، ئەگەر ئەو ڕێی پێ دا ئەوە بە پێی شەرع بە پەیمان دائەنرێت.

**مەرجەکانی پەیمان لەسەر بەستراو -فرۆشراو-:**

وە ئەو شتەی پەیمانی لەسەر بەستراوە ئەبێ شەش مەرجی تێدا بێت:

١- پاکیەتی شتەکە. ٢- سوود وەرگرتن لەشتەکە.

٣- خاوەنێتی فرۆشیار بۆ شتەکە. ٤- بوونی توانا بۆ سپاردنی شتەکە.

٥- زانستی دەربارەی فرۆشراوەکە هەبێت ٦- فرۆشراوەکە وەربگیرێت

وا لە خوارەوە یەکە یەکە ڕوون ئەکرێنەوە:

یەکەم: شتەکە لەخۆیدا پاك بێت، بە پێی حەدیسەکەی جابیر کە گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە فەرموویەتی: (إن الله حرم بيع الخمر والميتة والخنزير والأصنام) واتە:

خوا حەرامی کردووە فرۆشتنی عارەق وگۆشتی مردارەوەبوو گۆشتی بەراز و بت.

ووتیان: ئەی نێرراوی خوا، ئەی ڕات چیە بەرامبەر بەز و پیوی مردارەوەبوو کە کەشتی پێ سیواغ دەدرێت و پێستی پێ چەور ئەکرێت وخەڵك ئەیکەنە چراوە بۆ داگیرساندن، فەرمووی: (لا، هوحرام) واتە: نا، فرۆشتنی حەرامە[1].

---

(١) البخاري (٢٢٣٦) ومسلم (١٥٨١).

به پێی ئەوە دروستە سود لە بەزی مردارەوەبوو وەربگیرێ بێ ئەوەی بفرۆشرێت، وەك ئەوەی پێستی پێ چەور بکرێت و بکرێتە چراوە بۆ ڕوناکی وە گەلێ شتی تر کە بۆ خواردن نەبێت و نەچێتە ناو جەستەی ئادەمیزادەوە.

ئیبنوقەییم لە کتێبی (أعلام الموقعين)دا دەربارەی ووشەی(حرام)کە هاتووە لە فەرموودەکەدا وتویەتی: دوو قسە هەیە:

یەکەمیان: مانای ئەوەیە ئەم کارانە حەرامن.

دووەمیان: فرۆشتنی ئەمانە حەرامن، ئەگەر کڕیار بۆ ئەو مەبەستانە بیان کڕێت.

وە هەروەها دوو قسەکە لەسەر ئەوە دانراون کە ئایا پرسیارەکە: لەسەر فرۆشتنەکەیە لەبەر ئەو کەڵکە باسکراوەی یا لەسەر کەڵکە باس کراوەکەیە.

وە شێخەکەمان یەکەمیانی هەڵبژاردووە. کە ئەوەشیان راسترە. چونکە یەکەم جار حەرامی ئەو کەڵك لێ وەرگرتنەی پێ ڕانەگەیاندن هەتا ئەوان باسیان نەکرد، بەڵکو پێی ڕاگەیاندن کە فرۆشتنی حەرامە ئەوانیش پێ یان ڕاگەیاندکە ئەوان لەبەر ئەو سوودانە ئەی فرۆشن ئەویش ڕێی نەدان بیفرۆشن. بەڵام ڕێی ئەوەی لێ نەگرتن ئەو سوودانەی لێ وەربگرن.

وە پەیوەندی نی‌یە لە نێوان حەرامی فرۆشتنیا و حەڵاڵی سوود لێ وەرگرتنیا) تەواو بوو.

پاشان پێغەمبەر ﷺ ئەوەی فەرموو: (قاتل الله اليهود، إن الله لما حرَّم شحومها جَمَلوه ثم باعوه وأكلوا ثمنه)[1]. واتە:

خوا جولەکە بکوژێت کاتێ خوا پیوەکەی لێ حەرام کردن هاتن توانیانەوە ئینجا ئەیان فرۆشت و نرخەکەیان ئەخوارد.

وە هۆی حەرامی ئەو سێ شتەی یەکەم: پیسی‌یە لای جەماوەری زانایان، جا ئەوە هەموو شتێکی پیس ئەگرێتەوە.

وە حەنەفی‌یەکان و زاهیری‌یەکان هەموو ئەو شتانەی کە سوودیان هەیە و سوودەکەیان حەڵاڵە جیایان کردۆتەوەو بە دروستیان داناوە فرۆشتنی، وە وتویانە:

دروستە فرۆشتنی پەین و زبڵی پیس کە زۆر پێویستە بەکار بێت لە باغ و باغاتدا، وە کەڵکیشیان هەیە بۆ سوتەمەنی و کودکردن.

(١) تەخریج کراوە لەمەو پێش.

وە هەروەها دروستە فرۆشتنی هەموو ئەو شتانەی کە بۆ خواردن و خواردنەوە بەکار ناهێنرێت، وەك زەیتی پیس بە کار بێت بۆ سیواغ دان و چرا، وە بۆیەی پیسیش هەیە ئەفرۆشرێ بۆ بۆیە کردن و ڕەنگ کردن وئەو جۆرە شتانە، بە مەرجێ سوودی لێ وەربگیرێ بۆ شتێك جگە لە خواردن.

بەیهەقی بە سەنەدێکی صەحیح ئەگێڕێتەوە کە پرسیارکرا لە ئیبنو عومەر خوایان لێ ڕازی بێت دەربارەی زەیتێك مشکی تێ بکەوێت، ئەویش وتی: (بەکاری بهێنن بۆ ڕوناکی و چەورکردنی پێستەکانتان)[1].

وە پێغەمبەر ﷺ بەلای مەڕێکی مەیمونەدا تێ پەڕی بە مردارەوە بوویی فڕێ درابوو فەرمووی: (هلا أخذتم إهابها فدبغتموه وانتفعتم به؟) واتە: ئەی بۆ پێستەکەیتان دانەماڵی پاشان دەباغی بکەن و سوودی لێ وەربگرن.

وتیان: ئەی نێرراوی خوا، مردار بۆتەوە ئەویش ﷺ فەرمووی: (إنما حرم أكلها)[2] واتە: ئەوەی کە حەرام کراوە خواردنی‌یەتی.

مانای ئەوەیە دروستە بۆ جگە لە خواردن سوودی تری لێ وەربگیرێ. وە مادام کەڵك لێ وەرگرتنی دروست بێ، فرۆشتنیشی دروستە، بە مەرجێ مەبەست لە فرۆشتنەکە سوودی ڕەوا بێت.

دووەم: ئەبێ ئەو شتە سوودی لێ وەربگیرێ، کەواتە دروست نی‌یە کڕین و فرۆشتنی مێش و مەگەز و مار و مشك مەگەر سودیان هەبێت.

وە دروستە کڕین و فرۆشتنی پشیلە و هەنگ و پڵنگ و شێر و ئەوانەی بۆ ڕاو بە کار دێن یا سوود لە پێستەکەیان وەرئەگیرێت.

وە هەروەها دروستە کڕین و فرۆشتنی فیل بۆ بار هەڵگرتن. وە فرۆشتنی توتی و تاووس و باڵندەی جوان هەرچەندە گۆشتیان ناخورێت، چونکە گوێ گرتن لە دەنگە خۆشەکەیان و سەیرکردنیان مەبەستێکی ڕەوایە.

وە کڕین و فرۆشتنی سەگ دروست نی‌یە لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لێی، وە ئەوە لەبارەی سەگی فێرنەکراوەوەیە. بەڵام سەگی فێرکراوو ئەو سەگانەی ڕائەگیرێن، وەك سەگی پاسەوانی و سەگی کشتوکاڵ، ئەبوحەنیفە ووتویەتی: دروستە فرۆشتنی.

---

(١) البيهقي (٩/٣٥٤).

(٢) البخاري (١٤٩٢) ومسلم (٣٦٣).

وە (عطاء) و نەخەعی وتویانە: دروستە کڕین و فرۆشتنی سەگی ڕاوی نەك سەگی تر، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە وەرگرتنی نرخی سەگ جگە لە سەگی ڕاو،[1] نسائی لە جابیرەوە گێڕاویەتیەوە. وە حافظ وتویەتی: پیاوەکانی جێی بڕوان.

وە ئایا بژاردنی پێویستە لەسەر ئەو کەسەی ئەو شتانە لەناو بەرێت؟

شەوکانی وتویەتی: ئەوانەی وتویانە: کڕین و فرۆشتنی حەرامە ئەڵێن: بژاردنی پێویست نیە. وە ئەوانەی ئەڵێن: دروستە کڕین و فرۆشتنی ئەڵێن: پێویستە بژاردنی. وە ئەوانەی وتویانە: لەفرۆشتنەکەیدا قسە هەیە ئەڵێن: لەبژاردنەکەشیدا هەر قسە هەیە.

وە لە مالیکەوە ئەگێڕنەوە کە وتویەتی: ئەو شتانە دروست نیە کڕین و فرۆشتنی بەڵام بژاردنی پێویستە، وە هەرلێوەی گێڕراوەتەوە کە فرۆشتنی مەکروهە.

وە ئەبوحەنیفە وتویەتی: دروستە کڕین و فرۆشتنی، وە ئەو کەسەی لەناویان بەرێت ئەبێ نرخەکەیانی لێ بسەندرێت.

**کڕین و فرۆشتنی ئامێرەکانی مۆسیقا:**

فرۆشتنی ئامێرەکانی مۆسیقا و گۆرانی ئەچێتە ناو ئەو بەشەوە کە باس کرا.

چونکە گۆرانی لە شوێنی خۆیدا دروستە، وە ئەو گۆرانیانەی کە مەبەست پێیان سودی ڕەوایە حەڵاڵە، وە گوێ لێ گرتنیان ڕەوایە، بەو شێوەیە کەڵکەکەی شەرعی ئەبێت و دروستە کڕین و فرۆشتنی لەبەر ئەوەی قازانجیان هەیە.

**نموونەی گۆرانی حەڵاڵ:**

١- گۆرانی ئافرەت بۆ منداڵەکەی و دڵنەوایی کردنی.

٢- گۆرانی وتنی کاسب کارەکان وخاوەن پیشەکان کاتی ئیشکردن بۆ سوك کردنی ماندو بوونیان و هاوکاری نێوانیان

٣- گۆرانی وتن کاتی شادی بۆ دەربڕینی شادی

٤- گۆرانی وتن کاتی جەژنەکان و دەربڕینی شادی تێیاندا

٥- گۆرانی وتن بۆ گورج و گۆڵ کردنەوە بۆ جیهاد. وە هەروەها لە هەموو ئەو کاراندا کە دەروون گورج بکات وتوانای پێ بدات.

(١) النسائي (٧/٣٠٩).

وە گۆرانی تەنها قسەیە، چاکی چاکە وناشیرینی ناشیرینە. ئەگەر شێوەیەکی وەهای بە سەردا بێت لە چوارچێوەی حەڵاڵی دەربکات وەك ئەوەی ئارەزوو بورووژێنێت یا بانگەواز بکات بۆ خراپە و شەڕ، یا بۆ ئەوە بووترێت کە خەڵك دوور بخاتەوە لە خواپەرستی، ئەوکاتە حەڵاڵ نییە.

کەواتە خۆی لە خۆیدا حەڵاڵ بووە بەڵام شتێکی بە سەردا هاتووە لە چوارچێوەی حەڵاڵ دەری کردووە.

وە لەسەر ئەم شێوەیەیانە کە فەرموودە هاتووە گۆرانی وتن قەدەغە ئەکات.

وە بەڵگەی حەڵاڵی ئەمانەن:

١- ئەوەی بوخاری وموسلیم وکەسانی تر ئەگێڕنەوە لە عائیشەوە خوا لێی ڕازی بێت.کە ئەبوبەکر ئەچێتە ماڵیان دوو جارییەی لە لا ئەبێت. گۆرانی ئەڵێن: و دەف ئەژەنن، وە پێغەمبەر ﷺ خۆی ئەناڵێنێ لەسەرچەفێکەوە. ئەبوبەکر کە ئەوە ئەبینێ لێیان تووڕە ئەبێت. پێغەمبەر ﷺ سەری دەرئەخات وئەفەرموێت: (دعهما يا أبابكر فإنها أيام عيد)[1]. واتە: وازیان لێ بێنە ئەی ئەبوبەکر ئەمرۆژانە جەژنن.

٢- وە بە پێی ئەوەی ئیمامی ئەحمەد و (ترمذي) بە ئیسنادێکی ڕاست گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەچێ بۆ غەزایەك لە غەزاکانی، کاتێ ئەگەڕێتەوە جاریەیەکی ڕەش پێست دێتە خزمەتی وئەڵێ: ئەی نێرراوێ خوا، من نەزرم کردووە ئەگەر خوا بە سەلامەتی گێڕایتییەوە لەبەر دەمتا دەف بژەنم وگۆرانی بڵێم. فەرمووی: (إن كنتِ نذرتِ فاضربي)[2]. واتە: ئەگەر نەزرت کردووە بژەنە.ئەویش دەستی کرد بە دەف ژەندن.

وە ئەوەی بە صەحیحی هاتووە لە کۆمەڵێکی زۆر لە صەحابە وتابعیییەوە کە گوێیان گرتووە لە گۆرانی وئاوازی مۆسیقا. لە صەحابەکان عبداللە ی کوڕی زوبەیر، عبداللە ی کوڕی جەعفەر و چەند کەسانیتر لەصەحابە.

وە لە تابیعییەکان: عومەری کوڕی عبدالعزیز وشورەیحی قازی وعبدالعزیزی کوڕی (مسلمة) موفتی مەدینە وچەند کەسانی تر.

سێیەم:

---

(١) البخاري (٩٤٥) ومسلم (٨٩٢) وأحمد (٦/٣٣و١٢٧) والنسائي (٣/١٩٥).

(٢) أحمد (٥/٣٥٣) والترمذي (٣٦٩٠) وابن حبان (٦٨٩٢) والبيهقي في سنن الكبرى (١٠/٧٧).

ئەبێ ئەو شتەی مامەڵەی پێ ئەکرێت خاوەنەکەی دەسەڵاتدار بێت، یا لە لایەن خاوەنەکەیەوە ڕێی پێدرابێت. جا ئەگەر کڕین و فرۆشتن لەو جۆرە ڕویدا بێ ئەوەی خاوەنە ئەسڵی‌یەکەی ڕێی پێ دابێت، ئەوە بە مامەڵەی فضولی دائەندرێت.

**کڕین و فرۆشتنی فضولی:**

فضولی ئەو کەسەیە کە بێ ئەوەی ڕێی پێ درابێت پەیمان لە جیاتی خاوەن شت ئەبەستێ، وەك ئەوەی پیاو شتی ژنی خۆی بفرۆشێت بێ ئەوەی پرسی پێ کردبێت یا مولکێکی بۆ بکرێت بێ ئەوەی ڕێی پێ دابێت کە بیکرێت، یا کەسێك مولکی کەسێکی‌تر بفرۆشێت کاتێ خۆی غایب بێت، یا شتێکی بۆ بکرێت بێ ئەوەی پێی ووتبێت وەك زۆر جار ڕوودەدات.

وە پەیمانی فضولی بە پەیمانێکی دروست دائەنرێت بەڵام ئەوە شتێ لەسەر خاوەنەکەی یان سەرپەرشتیکەری خاوەن شتەکە، جا ئەگەر ڕێیدا ئەوە دروستە، ئەگینا پوچەڵە،

وە بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە کە بوخاری ئەگێڕێتەوە لە عورووەی (بازقی)یەوە کە وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ دینارێکی پێ دام بچم بەرخێکی بۆ بکڕم، منیش بە دینارەکە دوو بەرخم کڕی، لە پاشاندا یەکێکیانم فرۆشتەوە بە دینارێك ئینجا بەرخێك و دینارێکم بۆ هێناوە. ئەویش پێی فەرمووم: (بارك الله في صفقة يمينك)[1]. واتە: خوا فەڕ و پیرۆزی بخاتە مامەڵەکەتەوە.

وە ئەبو داود و (ترمذي) لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە ئەگێڕنەوە کە: پێغەمبەر ﷺ ناردویەتی مەڕێکی بۆ بکڕێت بۆ قوربانی بە دینارێك. ئەمیش قوربانی‌یەکەی بۆ ئەکڕێت وئەیفرۆشێتەوە بە دوو دینار، لە پاشاندا مەڕێکی تر ئەکڕێت بە دینارێك لە جیاتی مەڕەکەی پێشوو، بەو پێیە کە گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ دینارێك ومەڕێکی بۆ هێنایەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بارك الله لك في صفقتك)[2].

لە فەرموودەی‌یەکەمدا: عورووە مەڕی دووەمی کڕی و فرۆشتی‌یەوە بێ پرسی خاوەنەکەی کە پێغەمبەر ﷺ بوو. بەڵام کاتێ گەڕایەوەو پێی ڕاگەیاند بڕیاری لەسەردا و بۆی پاڕایەوە، ئەمەش ئەبێتە بەڵگەی دروستی کڕینی مەڕی دووەم و فرۆشتنەوەی.

ئەمەش ئەبێتە بەڵگەی فرۆشتنەوەی شتی خەڵك وکڕینی بێ پرسی خاوەنی. بەڵام ئەوەستێ لەسەر ڕێ پێدانی خاوەنی لە ترسی ئەوەی نەك زیان بگەیەنێت.

---

(١) البخاري (٣٦٤٢) وأبوداود (٣٣٨٤) والترمذي (١٢٥٨).

(٢) أبوداود (٣٣٨٦) والترمذي (١٢٥٧).

وە لە حەدیسی دووەمدا: حەکیم ئەو مەڕەی فرۆشتەوە کە کڕیبووی و پێغەمبەر ﷺ خاوەنی بووە، لە پاشاندا مەڕی دووەمی کڕیەوە بۆی بێ ئەوەی پرسی پێ بکات، بەڵام دوایی پێغەمبەر ﷺ بڕیاری لەسەردا، وە فەرمانی پێدا کە بیکاتە قوربانی و بۆی پارایەوە. ئەمەش ئەبێتە بەڵگەی دروستی فرۆشتنی مەڕەیەکەم و کڕینی مەڕی دووەم. وە ئەگەر دروست نەبوایە ئینکاری کارەکەی ئەکرد وپێی ئەگێڕاوە.

چوارەم:

ئەبێ ئەو شتەی پەیمانەکەی لەسەر بەستراوە بتوانرێت تەسلیم بکرێت بە شەرع و هەست.

وە ئەوەی نەتوانرێت تەسلیم بکرێت بە هەست دروست نی‌یە بفرۆشرێت وەك ماسی ناو ئاو.

وە ئەحمەد ئەگێڕێتەوە لە ئیبنومەسعودەوە رضي الله عنه كە فەرموویەتی: ماسی لە ئاودا مەکڕن چونکە غەرەرە[1]. واتە: زەرەرە.

وە گێڕراوەتەوە لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە بە مەرفوعی لە پێغەمبەرەوە ﷺ. وە هەروەها ئەوە قەدەغەکراوە، یەکێك خۆی بکات بە ناو ئاودا بڵێت، چیم بۆ دەرهێنای بە ئەوەندە پارە، ئەویش بیداتێ. وە کۆرپەی سکی دایکیش وەك ئەوەیە.

وە باڵندەی لە دەست دەرچوو کە عادەتی گەڕانەوەی نەبێت هەر لەوانەیە. وە ئەگەریش هەر شەوانە بگەڕێتەوە بۆ کولانەکەی هەر فرۆشتنی دروست نی‌یە، لای بەشی زۆری زانایان جگە لە هەنگ، چونکە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە ئادەمیزاد شتێك بفرۆشێت کە لای خۆی نەبێت.

وە لای حەنەفی‌یەکان دروستە چونکە توانای تەسلیم کردنی هەیە جگە لە هەنگ. وهەروەها پەڕاندنی کەڵەگایش لەم بابەتەیە وە هەر نێرینەیەکی ئاژەڵ وەك ئەسپ و ووشتو و گا، چونکە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە، بە پێی ئەوەی بوخاری وکەسانی تر ئەگێڕنەوە. چونکە ئەوە نە هەڵئەسەنگرێت و نە چەندێتی دائەنرێت، وە نە توانای تەسلیم کردنیشی هەیە.

وە جەماوەری زانایان بۆ حەرامی فرۆشتن و ئیجارەی ئەوە چوون، بەڵام بە بێ بڕیتی دروستە، واتە:کەڵەکە بە بێ مەرج بدرێت بە کەسێکی تر.

وە ووتراوە: دروستە بە ئیجارەدانی کەڵ بۆ پەڕین ماوەیەکی دیاری کراو.

---

(١) أحمد (١/٣٨٨).

حەسەن و ئیبنو سیرین ئەوە ئەڵێن و لەمالیکیشەوە گێڕراوەتەوە، وە ڕایەکی شافیعی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکانیشە.

وە هەروەها فرۆشتنی شیری گوان دروست نی‌یە پێش دۆشینی چونکە گۆترە و نامەعلومی تێدایە، وە شەوکانی ووتویەتی: مەگەر بە پێوانە کردن پێی بفرۆشێت، وەك ئەوەی بڵێت: صاعێکم لە شیری ئەم مانگایەم ئەفرۆشم پێت. چونکە حەدیسەکە ئەبێتە بەڵگەی دروستی ئەو فرۆشتنە لەبەر لابردنی گۆترە و نامەعلومی‌یەکە، جگە لە شیری دایەن کە دروستە کاتی پێویستی بفرۆشرێت، وە هەروەها دروست نی‌یە فرۆشتنی خوری پێش برینەوەی، چونکە گرانە تەسلیم کردنی لەبەر تێکەڵی فرۆشراو و نە فرۆشراوەکە.

لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ کە فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردبوو خورما بفرۆشرێت هەتا نەخورێت، یا خوری بە پشتی ئاژەڵەوە، یا شیر لەگواندا، یا ڕۆن لەناو ماست دا. (دارقوطني گێڕاویەتی‌یەوە)[1].

وە ئەوەی نەتوانرێت تەسلیم بکرێت بە شەرع، وەك شتی ڕەهن کراو و وەقف کراو دروست نی‌یە فرۆشتنیان.

وە ئەخرێتە پاڵ ئەمانە جیاکردنەوە بەهۆی فرۆشتنەوە لە نێوان دایك و بەچکەکەی و لێك دابڕانیان، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە سزای ئاژەڵ بدرێت. بەڵام هەندێ لە زانایان بە دروستی ئەزانن دابڕینی دایك وبەچکەکەی بە فرۆشتن بە (قیاس) لەسەر سەربڕینی، وە ئەمەش لە پێش ترە بۆ ڕاستی.

**کڕین و فرۆشتنی قەرز:**

جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون دروستە فرۆشتنی قەرز بە قەرزار. بەڵام فرۆشتنی بە کەسێکی تر . حەنەفی‌یەکان وحەنبەلی‌یەکان وزاهیری‌یەکان بۆ ئەوە چوون کە دروست نی‌یە، چونکە فرۆشیار تواناى تەسلیم کردنی نی‌یە، با بە مەرجیش دابنێت کە تەسلیم کردنی لەسەر قەرزارەکە بێت هەر دروست نی‌یە، چونکە مەرجی تەسلیم کردنی لەسەر فرۆشیار نی‌یە، بەو شێوەیە مەرجەکە فاسیدە و فرۆشتنەکەشی پێ فاسید ئەبێت.

پێنجەم:

---

(١) الدارقطني (٣/١٤).

ئەبێ فرۆشراو و نرخەکەی دیار بێت. جا ئەگەر ئەو دووانە نا دیار بوون یا یەکێکیان نادیار بوو، فرۆشتنەکە دروست نی‌یە، لەبەر ئەوەی غەرەری تێدایە، وە تەنها چاو پێکەوتن و پێزانینی بەسە با سەنگەکەشی نەزانێ، وەك لە فرۆشتنی (جزاف)دایە.

بەڵام ئەوەی لە زیمەدایە ئەبێ چەندێتی‌یەکەی و سیفەتەکەی بزانرێت بە گوێرەی هەردوو لاوە، وە نرخەکەش ئەبێ ئەندازە و سیفەتەکەی مەعلوم بێت، وە هەروەها ماوەکەی.

بەڵام فرۆشتنی شتێك کە لەو شوێنەدا ئامادە نەبێت، و فرۆشتنی شتێك بینینی گران بێت، وەفرۆشتنی (جزاف) گۆترە هەریەکە لەمانە حوکمی خۆی هەیە وا لە خوارەوە باس ئەکرێت:

١- فرۆشتنی ئەو شتەی کە کاتی کۆڕی فرۆشتنەکە ئامادە نەبێت:

دروستە فرۆشتنی شتێك کە ئامادەی کۆڕەکە نەبێت بە مەرجێ خاوەنەکەی وەسفێکی وای بکات کە کڕیارەکە بزانێت شێوەی چۆنە، لەپاشاندا ئەگەر دەرکەوت بەو شێوەیە بوو کە وەسفی کردبوو فرۆشتنەکە پێك دێ، بەڵام ئەگەر پێچەوانەی ئەو وەسفە بوو ئارەزووی خۆیانە پەیمانەکە بەجێ ئەگەیەنن یارەتی ئەکەنەوە، فرۆشیار وکڕیار لەوەدا یەکسانن.

بوخاری وکەسانی تر ئەگێڕنەوە لە ئیبنو عومەرەوە خوایان لێ رازی بێت کە ووتویەتی: ماڵێکم فرۆشت بە خەلیفەی موسوڵمانان عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ لە شیوێك دا بوو بە ماڵێکی ئەو کە لە خەیبەر بوو.

وە ئەبوهورەیرە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (من اشترى شيئاً لم يره، فله الخيار إذا رآه) واتە:

هەرکەس شتێکی کڕی بێ ئەوەی چاوی پێ بکەوێت، کاتێ چاوی پێ‌ی کەوت ئارەزووی خۆیەتی ئەیەوێ یان نا.

ئەم فەرموودەیە (دارقطني) و بەیهەقی دەریان هێناوە ولە ئیسنادەکەیدا عومەرەی کوڕی ئیبراهیم ی کوردی هەیە کە زەعیفە[1].

کڕین و فرۆشتنی شتێك کە بینینی گران بێت یا زیانی هەبێت:

وە هەر بەو شێوەیە هەموو ئەو شتانەی کە نادیارن و ئەفرۆشرێن ئەگەر بە شێوەیەك وەسف بکرێن بە وەسفەکانیدا دەربکەوێت چۆنە بە عادەت وعورف.

(١) دارقطني (٣/٤) والبيهقي (٥/٢٦٨).

ئەویش وەك خواردنی پارێزراو و دەرمانی پارێزراو لە شیشە و بۆری ئۆکسجین و تەنەکەی بەنزین وگاز وئەو جۆرە شتانەی کە کاتی بەکارهێنان نەبێت ناکرێتەوە لەبەر ئەوەی کردنەوەیان زیانی هەیە و گرانە.

وە ئەو شتانەی بەرەکانیان لە ژێر زەویدایە و دەرناکەوێت هەر وەك ئەوانە وەهایە وەك گێزەر و شێلم و پەتاتە و قەڵقاس -وەك پەتاتە وایە- و پیاز، وە هەروەها ئەو شتانەی لەوانە ئەچن.

چونکە ئەم جۆرە شتانە ناتوانرێت بە سەربەکەوە دەربێت و بفرۆشرێت لەبەر گرانی ئەو کارە بۆ فرۆشیارەکەی، وە ناشتوانرێت نەختە نەختە بفرۆشرێت و دەربێت لە زەوییەکە لەبەر ئەوەی ئەم کارەش گرانە وئەرکی تێدایە، وە لەوانەیە ببێتە هۆی لەناو چوونی و پەك کەوتنی.

بەڵکو ئەم جۆرە شتانە پەیمانی کڕین و فرۆشتنیان پێ دەکرێت بە سەربەکەوە لە کێڵگە پان و بەرینەکاندا چونکە بەو شێوە فرۆشتنە نەبێت نابێت.

وە ئەگەر دەرکەوت ئەو شتە فرۆشراوە جیاوازە لەگەڵ ئەوانەی لە کێڵگەکانی تردا هەن بە شێوەیەکی زۆر خراپ کە زیان بەیەکێ لە پەیمان بەستەکان بدات، ئەو وەختە (خیار) هەڵبژاردن ئەچەسپێ، ئەگەر بیەوێ بەجێی ئەگەیەنێ ئەگینا بۆی هەیە فرۆشتنەکە هەڵوەشێنێتەوە. وەك لە شێوەیەکدا ئەگەر کەسێك هێلکە بکڕێت سەیری بکات پیس بووە، تارەزووی خۆیەتی یا هەڵی ئەگرێت یا ئەیداتەوە بە خاوەنی[1].

**کڕین و فروشتن بە (جزاف) گۆترە:**

(جزاف): ئەوەیە کە ئەندازەکەی بە تەواوی نەزانرێت.

وە ئەم جۆرە فرۆشتنە لە نێوان صەحابەکاندا هەبوو کاری پێ ئەکرا لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ، وە هەردوولا یەك ئەکەوتن لەسەر شتێکی بینراو کە چەندێتییەکەی نەئەزانرا بە خەمڵاندن نەبێت لە لایەن پسپۆڕی خۆیەوە کە خەڵك باوەڕیان پێ ئەکەن و جێی بڕوای خەڵك بن لەبەر ئەوەی کەم هەڵە ئەکەن لە دانانیدا، وە ئەگەر لەشتێك هەڵەی تێدا بکرێت ئەوەندە کەم ئەبێت کە خەڵك چاوپۆشی تێدا ئەکەن.

---

(١) ئەمە مەزهەبی مالیکییەکانە، وە هەر ئەوەشە (إبن القیم) پێشی خستووە لە (أعلام الموقعین)دا. بەڵام مەزهەبی جەماوەر ئەوەیە کە مامەڵە بەو شێوەیە پوچەڵە لەبەر ئەوەی خەڵەتاندن و نەزانی تیایە کە قەدەغە کراوە، وە حەنەفییەکان مامەڵەکەیان بە دروست داناوەو (خیار) هەڵبژاردن ئەچەسپێنن لەکاتی بینیندا.

ئیبنو عومەر خوایان لێ ڕازی بێت فەرموویەتی: ئێمە خواردەمەنیمان ئەفرۆشت بە (جزاف) لەسەرووی بازاڕ، پێغەمبەر ﷺ لێی قەدەغەکردین بیفرۆشین هەتا نەیگوێزینەوە[1].

پێغەمبەر ﷺ بڕیاری بۆداون لەسەر فرۆشتن بە گۆترە تەنها ئەوەی قەدەغە کردووە کە بفرۆشرێت پێش گوێزانەوەی.

ئیبنو قودامە فەرموویەتی: دروستە فرۆشتنی کادان بە خەملاندن با کڕیار و فرۆشیارەکەی چەندێتی نەزانن، وە ئێمە نازانین کەسێك هەبێت لە زانایان پێچەوانەی ئەوەبێت.

شەشەم:

ئەبێ شتە فرۆشراوەکە بکەوێتە دەستی کڕیارەکە بەڵام ئەگەر بە موعاوەزە و گۆڕینەوە سوودی لێ وەرگرت، ڕوون کردنەوەی لە خوارەوە دێت:

دروستە فرۆشتنی میرات و وەسیەت و بارمتەو ئەوەی کە موڵك تێیدا بەدی نەیەت بە گۆڕینەوە پێش وەدەست هێنانی و دووای وەدەست هێنانی.

وە هەروەها دروستە بۆ کەسێك کە شتێکی کڕی بیفرۆشێتەوە یا بیبەخشێت یا بە ئارەزووی خۆی تەسەرروفی مەشروعی تێدا بکات، دوای دەستکەوتنی، بەڵام ئەگەر دەستی نەکەوتبوو ئەتوانێ هەموو تەسەڕروفێکی مەشروعی تێدا بکات جگە لە فرۆشتن.

وە بۆیە دروستە هەموو تەسەڕروفێکی تێدا بکات جگە لە فرۆشتن، چونکە کڕیار هەر بە پەیمانەکە بۆتە خاوەنی لەبەر ئەوە مافی خۆیەتی شتی خۆی چی لێ ئەکات بیکات بە ئارەزووی خۆی.

ئیبنو عومەر ڕەزای خوایان لێ بێت فەرموویەتی: سوننەت وابووە هەرچی بەر مامەڵەی فرۆشتنەکە کەوتبێت بە زیندوویی و بە کۆمەڵی ئەوەماڵی کڕیارەکەیە[2].

بەڵام تەسەڕروف کردن بە فرۆشتنی پێش ئەوەی وەریبگرێت دروست نیە، چونکە لەوانەیە لای فرۆشیاریەکەم ئەو ماڵە لەناو چووبێت ئەوکاتە ئەبێتە فرۆشتنی غەرەر (واتە خەڵەتاندن)، وە فرۆشتنی غەرەریش دروست نیە، خانو و زەوی و باغ و کێڵگە بێت یا شتی گوێزراوە بێت ئەندازەکەی زانرابێت یا خەملێندرابێت.

---

(١) البخاري (٢١٣٧) ومسلم (١٥٢٦/٣٥).

(٢) البخاري تعليقاً (٤/٣٥١).

بە پێی ئەوەی ئەحمەد و بەیهەقی و ئیبنو حیببان بە ئیسنادێکی حەسەن گێڕاویانەتەوە کە حەکیمی کوڕی حیزام ووتویەتی: ئەی نێرراوی خوا، من شت ئەکڕم و شت ئەفرۆشمەوە چی حەرامە و چی ڕەوایە؟ ئەویش ﷺ فەرمووی: (إذا اشتريت شيئاً فلا تبعه حتى تقبضه)[1]. واتە: ئەگەر شتێکت کڕی مەی فرۆشەرەوە هەتا وەری ئەگریت.

وە بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە: کە خەڵك لێیان ئەدرا لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ئەگەر شتێکیان بکڕیایە بە (جزاف) خەمڵاندن و بیان فرۆشتایەوە هەر لە شوێنی خۆیدا تاوەکو ئەیان گوێزایەوە بۆ شوێنی خۆیان[2].

وە دروستی فرۆشتنی جۆری پارەکان بەیەکتر پێش ئەوەی وەربگیرێت لەم قاعیدەیە بەدەربوو.

ئیبنو عومەر پرسیاری کردووە لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی فرۆشتنی ووشتر بە دینار و دوایی لە جیاتی درهەم وەربگرێت، پێغەمبەریش ﷺ ڕێی پێ دا.

**مانای وەرگرتن:**

وەرگرتن لە عیقار زەوی و ماڵ و خانودا ئەوەیە کە کڕیار بۆی چۆڵ بکرێت بە شێوەیەك بتوانێت ئەو سوودەی مەبەستێتی لێی وەربگرێت، وەك ئەگەر زەوی بێت بیکاتە کشت وکاڵ وئەگەر خانوو بوو تێیدا دابنیشێت، وە ئەگەر باغ بوو سوود لە سێبەرەکەی وەربگرێ و میوەکەی بڕنێت و ئەو جۆرە شتانە.

وە وەرگرتنی ئەو شتانەی ئەتوانرێت بگوێزرێتەوە وەك خواردەمەنی و جل و بەرگ و ئاژەڵ و ئەو جۆرە شتانە بەم شێوەیەی خوارەوە ئەبێت:

یەکەم: کێشان یان پێوانی تەواو بێت ئەگەر ئەندازەکەی زاندرا.

دووەم: لەشوێنی خۆی بگوێزرێتەوە ئەگەر (جزاف) بوو

سێیەم: جگە لەمانە ئەبێ بە پێی عورف وەربگیرێت

وە بەڵگەی ئەوەی کە وەرگرتن لەماڵی گوێزراوەدا ئەبێ کێش و پێوانی تەواو بێت ئەوەیە کە بوخاری ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ بە عوسمانی کوڕی عەففانی فەرموو: (إذا سميت الكيل فكل)[1].

---

(١) أحمد (٣/٤٠٢) والبيهقي (٥/٣١٣) والطبراني في المعجم الكبير (٣١١٠).

(٢) أحمد (٢/١٥) والبخاري (٢١٣٧) ومسلم (١٥٢٦/٣٥) وأبوداود (٣٤٩٤) والنسائي (٧/٢٨٧).

واتە: ئەگەر ناوی پێوانت برد بی پێوە.

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێویستە پێوانە کاتێ پێواندن مەرج بوو، وە کێشانەش هەر وەك ئەوە چونکە هەر دوو لایان بە میعیار دەبژێردرێن بۆ پێوانی شت.

ئیتر پێویستە کە هەر شتێکی نرخێندراو خاوەنی‌یەتی بکرێت وەرگرتنی بەجێ بێت بە زانینی چەندی‌یەتی ئەو شتە، جا خواردەمەنی بێت یا شتی تر.

وە بەڵگەی ئەوەی کە ئەبێ بگوێزرێتەوە لە شوێنەکەی خۆی ئەوەیە کە بوخاری و موسلیم لە ئیبنو عومەرەوە خوایان لێ ڕازی بێت ئەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: (خواردەمەنیمان لە کاروانەکان ئەکڕی بە (جزاف) گۆترە، پێغەمبەر ﷺ نەی ئەهێشت بیفرۆشینەوە هەتا لە شوێنەکەی خۆی نەیگوێزینەوە)[2].

ئەمەش تایبەت نی‌یە بە خواردەمەنی‌یەوە، بەڵکو خواردەمەنی و شتی تریش ئەگرێتەوە وەك: لۆکە و کەتان وئەو شتانەی بە (جزاف) خەمڵاندن ئەفرۆشرێن، چونکە جیاوازی نی‌یە لە نێوانیاندا.

بەڵام جگە لەمانە کە دەقێك دەربارەیان نەهاتووە ئەگێڕرێتەوە بۆ عورف و عادەتی خەڵك وشێوەی مامەڵە پێ کردنیان. بەم شێوەیە بە دەق کارمان کردوو، ئەوەش کە دەقی لەسەر نەبوو گێڕامانەوە بۆ عورفی خەڵك.

**حیکمەتەکەی:**

حیکمەتی قەدەغەکردنی فرۆشتنی کەل و پەل پێش وەرگرتنی جگە لەو حیکمەتانەی باس کران:

ئەوەیە کە فرۆشیار ئەگەر ئەو شتەی فرۆشتویەتی بە کڕیار هێشتا وەری نەگرتبوو لە فرۆشیار، ئەوە لە ئەستۆیدا ماوەتەوە، وە ئەگەر لەناو چوو خەساراتەکەی لەسەر خۆیەتی نەك لەسەر کڕیار، جا ئەگەر کڕیار پێش ئەوەی وەری بگرێت فرۆشتی‌یەوە سوودێکی دەست ئەکەوێت لەشتێکدا کە خەسارەتەکەی هەڵناگرێت.

وە لەم بارەیەوە خاوەن سوننەکان ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردبوو قازانج کردن لە شتێکدا کە هێشتا نەهاتۆتە ئەستۆی و خاوەنی‌یەتی نەکراوە.

---

(١) إبن ماجة (٢٢٣٠).

(٢) تەخریجەکەی ڕابورد.

وە ئەو کڕیارەی کە ئەو شتەی کڕیوەتی بیفرۆشێتەوە پێش ئەوەی وەری بگرێت وەك ئەوە وایە مەبلەغێك پارەی دابێت بە کەسێك بەرامبەر مەبلەغێکی زۆرتر.

بەڵام ئەم ویستوویەتی فێڵ بکات بۆ بەجێ هێنانی مەبستەکەی بەوەی ئەو کاڵایە ئەخاتە نێوانیانەوە کاتێ پارە زیادەکە وەرئەگرێت، بەو شێوەیە ئەو کارە زیاتر لە سوود ئەچێت.

ئیبنو عەبباس خوایان لێ ڕازی بێت هەستی بەوە کردووە کاتێ پرسیاری لێکرا دەربارەی قەدەغەیی فرۆشتنی شتێك کە هێشتا وەرنەگیرابێت، فەرمووی: (ئەم کارە پارە گۆڕینەوەیە بە پارە، و خواردەمەنی‌یەکە دوواخراوە).

**شایەت گرتن لەسەر پەیمانی کڕین و فرۆشتن:**

خوای گەورە فەرمانی داوە کە ئەبێ شایەت هەبێ کاتی بەستنی پەیمانی کڕین و فرۆشتن، ئەفەرمووێت: ﴿وأشْهِدُوا إِذَا تَبَايَعْتُمْ ولاَ يُضَارَّ كَاتِبٌ ولاَ شَهِيدٌ﴾ (البقرة:١٨٢) واتە:

شایەت بگرن کاتی کڕین و فرۆشتن و نابێت زیان بە نوسەر و شایەتەکەی بگەیەنن.

وە فەرمان بە شایەت گرتن بۆ ڕێنمایی و پەسەندی‌یە لەبەر ئەوەی خێر وبەرژەوەندی تێدایە. وە ئەو فەرمانە بۆ پێویست بوون نی‌یە وەك هەندێ لە زانایان بۆی چوون.

(جصاص) لە کتێبی (أحكام القرآن)دا فەرموویەتی: (جیاوازی نی‌یە لەنێوان زانایانی بەشەکانی وڵاتی ئیسلامدا کە فەرمان بە نوسین وشایەت گرتن وئەو ڕەهنەی لە ئایەتەکەدا هاتووە بۆ پەسەندی و ڕێنمایی‌یە لەبەر بوونی باشی و ئیحتیاط بۆ دین و دنیا، وە هیچ لەوانە بۆ پێویست بوون نی‌یە).

وە ئەم ئەتەوەی ئیسلامە یەك لەدوای‌یەکدا پەیمانی قەرزدان و کڕین و فرۆشتنیان ئەقڵ کردووە لە وڵاتەکانیاندا بێ ئەوەی شایەتی لەسەر بگرن بە ئاگاداری زانایانی ئیسلامی هەر سەردەمێك بێ ئەوەی ئینکاری لێ بکەن، جا ئەگەر شایەت گرتن واجب بوایە ئەوان وازیان نەئەهێنا لەکردنی ئەو کارانە،

ئەمەش ئەبێتە بەڵگەی ئەوەی کە ئەوانیش بە پەسەندیان داناوە، وە ئەوەش لەسەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ نەقڵ کراوە هەتا ئەم سەردەمەی ئێمە.

وە ئەگەر صەحابە و تابعی‌یەکان شایەتیان بگرتایە لەسەر کڕین و فرۆشتنەکانیان بە دەماودەم نەقڵ ئەکرا، وە ئینکاری لەوانە ئەکرا کە شایەتیان نەئەگرت.

جا کاتێك شایەت گرتن بە زۆری نەقڵ نەکراوە، هەروەها ئینکاری نەکراوە لەسەر ئەوانەی شایەتی‌یان نەگرتووە لە عامەی خەڵکی، بەوە پابت ئەبێ کە نووسین و شایەتی گرتن لە قەرزەکان و فرۆشتنەکاندا واجب نین -تەواو- .

مامەڵە بەسەر مامەڵەدا :

حەرامە کڕین و مامەڵە بە سەر مامەڵەی کەسێکی تردا، بە پێی ئەوەی ئیبنو عومەر خوایان لێ ڕازی بێت گێڕاویەتی‌یەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: (لا یبیع أحدکم علی بیع أخیه) (رواه أحمد والنسائی)[1]. واتە: کەستان مامەڵە بە سەر مامەڵەی براکەیدا نەکات.

وە لە صەحیحەین دا هاتووە لەئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا یبیع الرجل علی بیع أخیه)[2].

واتە: هیچ پیاوێك بەسەر شتی براکەیدا شت نەفرۆشێت.

وە لای ئەحمد و نەسائی و ئەبوداود و (ترمذي) پلەی حەسەنی بۆ داناوە، فەرموویەتی: (إن من باع من رجلین فهو للأول منهما)[3]. واتە: هەرکەس مامەڵەی لەگەڵ دوو پیاودا کرد، ئەبێ مامەڵەکە بۆ یەکەم کەس بێت.

وە شێوەی ئەمەش وەك ئەوەوی فەرموویەتی: (کەسێك شتێك بفرۆشێت بە کەسێك بە مەرجی ئەوەی کە (خیار) ئارەزوی تێدا بێت بۆ کڕیار، جا کەسێکی تر بێت هەروەك ئەوشتەی بخاتە بەردەست کە پەیمانەکەی‌یەکەم هەڵوەشێنێتەوە و لەم بکڕێت بە نرخێکی کەمتر).

وە شێوەی کڕین بەسەر کڕینی کەسێکی تردا بە جۆرێکە کە ئارەزووەکە بۆ فرۆشیار بێت، جا چەند کەسێك دێن داوای لێ ئەکەن کە ئەو شتەی بە کەسی‌یەکەمی فرۆشتووە ئەم بە نرخێکی گرانتر لی‌ی ئەکڕێت، وە ئەم کارە لە کڕین وفرۆشتندا تاوانە و قەدەغەی لێ کراوە.

بەڵام ئەگەر چەند کەس هاتن بۆ لای، ئەویش فرۆشتی یا کڕی ئەوە کڕین و فرۆشتنەکە پێك دێت لای شافیعی و ئەبو حەنیفە و زانایانی تر، وە لای داودی کوڕی عەلی کە شێخی زاهیری‌یەکانە پێك نایەت. وە لەمالیکەوە دوو ڕیوایەت ئەگێڕنەوە -تەواو- .

ئەمەش پێچەوانەی شت فرۆشتن بە موزایەدەیە کە دروستە، چونکە پەیمانەکە هێشتا جێگیر نەبووە.

---

(١) أحمد (٢/١٤٢) والنسائي (٧/٢٥٨).

(٢) البخاري (٢١٤٠) ومسلم (١٤٠٨/٣٨).

(٣) أحمد (٥/١٨،٨) وأبوداود (٢٠٨٨) والترمذي (١١١٠) والنسائي (٧/٣١٤).

وە سابتە کە پێغەمبەر ﷺ هەندێ شتی ئەخستە بەرچاو بۆ فرۆشتن و ئەی فەرموو: کێ زیاتر ئەدات؟

**هەرکەس شتێکی فرۆشت بە دوو کەس بۆ یەکەمیان ئەبێت :**

کەسێك شتێك بفرۆشێت بە کەسێك لەپاشاندا هەر ئەو شتە بفرۆشێت بە کەسێکی تر، فرۆشتنی دووەمی حوکمی نی‌یە، بەڵکو پوچەڵە چونکە شتێکی فرۆشتووە خۆی خاوەنی نەبووە، بەڵکو بووەتە ماڵی کڕیاری یەکەم، ئیتر فرۆشتنی دووەمی لە ماوەی خیاردا بوویێت یا لەکاتی دوایی هاتنی ماوەکەدا بوویێت وەك یەکە، چونکە ئەو شتە فرۆشراوە و هەر بە فرۆشتنەکە لەدەست ئەو دەرچووە.

لە سەمورەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أيما امرأة زوَّجها وليّانِ فهِيَ للأوّلِ منهما، وأيما رجل باع بيعاً من رجلين فهو للأول منهما)[1]. واتە: هەر ئافرەتێك دوو سەرپەرشتیکەری بیدات بە شوو، بۆ یەکەم کەسیانە. وە هەر پیاوێك شتێکی فرۆشت بە دوو پیاو بۆ یەکەمیان ئەبێت.

**زیادکردنی نرخ بە زیادکردنی ماوە**

دروستە شتێك بفرۆشرێت بە نرخێك کە دەم و دەست پارەکەی بدرێتێ، وە بە نرخێکی تر بیفرۆشێت کە ماوەی نرخ پێدانەکەی دووا بکەوێت.

وەك چۆن دروستە هەندێ لە نرخەکەی دەم و دەست وەربگرێت وهەندێکی دووا بخرێت، ئەگەر هەردوولا ڕازی بوون لەسەری، وە ئەگەر نرخەکەی دواخرا و فرۆشیار نرخەکەی زیادکرد لەبەر دواخستنەکە دروستە، چونکە ماوەکە بەشێکی هەیە لەنرخەکەدا.

حەنەفی‌یەکان و شافیعی‌یەکان و زەیدی کوڕی عەلی و (مؤيد بالله) و جەماوەری زانایانیش بۆ ئەوە چوون، بەپێی گشتێتی بەڵگەکان کە ئەبنە هۆی دروستی، وە شەوکانی پارسەنگی ئەوەی داوەتەوە.

**دروستی دەڵاڵی**

ئیمامی بوخاری ڕەحمەتی خوای لێ بێت فەرموویەتی: ئیبنوسیرین و عطاء و ئیبراهیم و حەسەن، کرێی دەڵاڵی بە خراپ نازانن.

---

(١) تەخریجی ئەم حەدیسە باس کرا.

وە ئیبنوعەبباس ڕەزای خوایان لێ بێت فەرموویەتی: خراپ نی‌یە کەسێك بڵێ: ئەو کراسەم بۆ بفرۆشە بە ئەوەندە لەوە زیاتری کرد بۆ خۆت.

وە ئیبنو سیرین فەرموویەتی: ئەگەر بڵێت: بە ئەوەندە بۆم بفرۆشە هەرچی قازانج کرد بۆخۆت یا بەشی ئەکەین خراپ نی‌یە.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (المسلمون علي شروطهم) (رواه أحمد وأبوداود والحاكم عن أبي هريرة وذكره البخاري تعليقاً) واتە: موسوڵمانان لەسەر مەرجەکانیانن.

**فرۆشتنی زۆر لێ کراو**

جەماوەری زانایان ئەوەیان بە مەرج داناوە کە فرۆشیار ئەبێ ئارەزووی خۆی بێت لە فرۆشتنی کەلوپەلەکانیدا، جا ئەگەر بەناحەق زۆری لێ کرا ماڵێکی خۆی بفرۆشێت، ئەوە ئەو فرۆشتنە پێك نایەت، بە پێی فەرموودەی خوای گەورە کە ئەفەرمووێت: ﴿إِلاَّ أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ﴾ (النساء:٢٩) واتە: مەگەر بازرگانی‌یەك بێت خۆتان ڕازی بن بە فرۆشتنی.

وە بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە ئەفەرمووێت: (إنما البيع عن تراض)[1] واتە: فرۆشتن بە ڕەزامەندی پێك دێت.

وە بەپێی ئەو حەدیسەی کە ئەفەرمووێت: (رفع عن أمتي الخطأ والنسيان وما استكرهوا عليه)[2] (رواه ابن ماجة وابن حبان والدارقطني والطبراني والبيهقي والحاكم) واتە: لەسەر ئۆمەتم سزای هەڵەکردن و لەبیر چوونەوە و ئەوەی زۆریان لێ کردبێت لەسەری لابراوە. وە زانایان جیاوازیان هەیە لەسەر پلەی (حسن) و (ضعيف)ی ئەم فەرموودەیە.

بەڵام ئەگەر زۆری لێ بکرێت ماڵەکەی بفرۆشێت لەسەر حەق، ئەوە فرۆشتنەکە دروستە.

وەك چۆن زۆر لە کەسێك بکرێت خانووەکەی بفرۆشێت بۆ فراوان کردنی جادە یا مزگەوت یا گۆڕستان دروستە.

یا زۆری لێ بکرێ بۆ فرۆشتنی کەلوپەلێکی بۆ دانەوەی ئەو قەرزەی کە لەسەریەتی، یا بۆ نەفەقە کێشانی ژن یا دایك و باوکی، لەم حاڵەتانەدا و وێنەی ئەمانە فرۆشتن دروستە لەبەر ئەوەی ڕازی بوونی شەرع جێی ڕازی بوونی خۆی ئەگرێتەوە.

---

(١) أبوداود (٣٤٥٨) والترمذي (١٢٤٨).

(٢) تەخریجەکەی باس کرا.

عبدالرحمن ی کوڕی کەعب فەرموویەتی: موعازی کوڕی جەبەل لاوێکی سەخی بوو هیچی بەدەستەوە نەئەما، ئەوەندەی قەرز کردبوو ماڵەکەی هەموو ببووە قەرز، ئەویش هاتە لای پێغەمبەر ﷺ داوای لێ کرد بە خاوەنی قەرزەکانی بڵێت: یارمەتی بدەن، جا ئەگەر وازیان لە قەرز بهێنایە لەبەر کەسێك، وازیان لە موعاذ ئەهێنا لەبەر پێغەمبەر ﷺ. پێغەمبەر ﷺ هەرچی ماڵی هەبوو فرۆشتی هەتا موعاز بێ شت مایەوە[1].

**فرۆشتنی (ناچار):**

جاری وا هەیە پیاو ناچار ئەبێت کە چی لە دەستدا بێت بیفرۆشێت لەبەر قەرزاری یا پێویستی یەك لە پێویستی یەکانی ژیان.

ئیتر هەرچی هەیەئەی فرۆشێت بە نرخێکی کەم لەبەر ئەو پێویستی یە. جا فرۆشتن لەم شێوەیەدا دروستە لەگەڵ بوونی کەراهەت بێ ئەوەی هەڵبوەشێتەوە.

وە ئەوەی دروستە لەم حاڵەتانەدا تەنها ئەوەیە یارمەتی ناچارەکە بدرێت و قەرزی بدرێتێ بۆ ئەوەی رزگاری بێت لەو تەنگ و چەڵەمەیەی تووشی بووە.

وە لەو بارەیەوە پیاوێکی نەناسراو فەرموودەیەك ئەگێڕێتەوە کە لای ئەبوداوده لە شێخێکی بەنی تەمیمەوە کە ووتویەتی: علی کوڕی ئەبو طالب ﷺ ووتارێکی بۆ داین و فەرمووی: (بەسەر خەلکدا زەمان و کاتێك دێت کە دەسەڵات دارەکان دەست ئەگرن بەوەی لە دەستیاندایە هەر چەندە فەرمانیان بەوە پێ نەکراوە، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَنسَوُا الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ﴾ واتە: چاکەی نێوانتان لە بیرمەکەن. وە ناچارەکان کڕین و فرۆشتنیان لەگەڵ ئەکرێ، لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ فرۆشتنی ناچاری و فرۆشتنی خەڵەتاندن و فرۆشتنی میوەی پێش گەیشتنی قەدەغە کردووە).

**فرۆشتنی پەناگرتن**

ئەگەر کەسێك ترسی ستەمکارێکی هەبوو ماڵەکەی لێ بسەنێ ئەمیش وای دەربخات کە ماڵەکەی ئەفرۆشێت بۆ ئەوەی لەدەست ئەو ستەمکارە رزگار بێت، وە لەگەڵ کەسێکدا پەیمانی فرۆشتنی بەست بە تەواوی و هەموو مەرجەکانی فرۆشتنی بەجێ هێنا، ئەوە ئەو جۆرە پەیمانە دروست نابێت، چونکە هەردوو لایان مەبەستیان فرۆشتن نی یە، وە وەك دوو گاڵتەکەر وەهان.

وە وتراوە: ئەو پەیمانە دروستە چونکە هەموو پایەکانی و مەرجەکانی بەجێ هاتووە.

---

(1) أبو نعيم في الحلية (١/٢٣١) وأبوداود في المراسيل (١٧٢) وعبدالرزاق في المصنف (١٥١٧٧) ومجمع الزوائد (٤/١٤٤).

ئیبنو قودامە فەرموویەتی: فرۆشتنی پەنابەر دروست نییە و پوچەڵە، وە ئەبوحەنیفە و شافیعی وتویانە: دروستە چونکە فرۆشتنەکە بە هەموو پایەکان و مەرجەکانییەوە بەجێ هاتووە، و هیچ شتێکی تێدانییە تێکی بدات، وەك ئەوەی ڕێك بکەون لەسەر مەرجێکی فاسید، لەپاشاندا پەیمانی فرۆشتەکە ببەستن بەبێ ئەو مەرجە.

وە ئێمە ئەو ڕایەمان هەیە کە ئەو دووانە مەبەستیان فرۆشتن و کڕین نەبووە، لەبەر ئەوەی ڕاست نییە و بەجێ نایەت و وەك دوو گاڵتەکەر وەهان.

**فرۆشتن لەگەڵ جیاکردنەوەی شتێکی دیاری کراو**

دروستە کەسێك کۆمەڵێك کەل و پەل بفرۆشێت و شتێکی لێ جیابکاتەوە، وەك ئەوەی چەند دارێك بفرۆشێت، بێجگە لەیەك دار نەبێت. یا چەند خانوو بەسەر یەکەوە بفرۆشرێت بێجگە لە خانوویەکیان، یا پارچەیەك زەوی بفرۆشرێت و بەشێکی لێ جیا بکاتەوە.

لە جابیرەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فرۆشتنی موحاقەلە و موزابەنە و جیاکردنەوەی لە فرۆشتندا قەدەغە کردووە مەگەر دیاری بکرێت. جا ئەگەر شتێکی دیاری نەکراو و نەزانراوی جیاکردەوە ئەو فرۆشتنە دروست نییە، چونکە نەزانین و سەرلێ تێك دانی تێدایە.

**تەواوی پێوان و کێشان**

خوای گەورە فەرمانی داوە کە کێشان و پێوان لەکڕین و فرۆشتندا ئەبێ تەواو بێت بۆیە ئەفەرموێت: ﴿وأَوْفُوا الْكَيْلَ والْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ﴾ (الأنعام/١٥٢) واتە: کێشانەو پێوانەتان تەواو و ڕاست بێت.

وە هەروەها ئەفەرموێت: ﴿وأَوْفُوا الْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ وزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ ذَلِكَ خَيْرٌ وأَحْسَنُ تَأْوِيلاً﴾ (الأسراء/٣٥) واتە: با پێوانەکەتان تەواو بێت کاتێ کڕین و فرۆشتنتان بە پێوانە کرد، وە بە تەرازووی ڕاست شت بکێشن لەکڕین و فرۆشتندا، چونکە ئەوە چاکترە بۆتان لە دنیاو ئەنجامی باشتری هەیە لای خوا لەڕۆژی دواییدا.

وە خوای گەورە قەدەغەی کردووە کە یاری بە کێشان و پێوان وکەم کردنی بکرێت، وە ئەفەرموێت: ﴿وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ(١)الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ(٢)وإِذَا كَالُوهُمْ أَوْ وَزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ(٣)أَلاَ يَظُنُّ أُولَئِكَ أَنَّهُمْ مَبْعُوثُونَ(٤)لِيَوْمٍ عَظِيمٍ(٥)يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (المطففين: ١-٦) واتە: سزای سەخت بۆ تەرازووبازان، ئەوانەی کاتێ شت لەخەڵك ئەکڕن بە تەواوی پێوانەی ئەکەن، وە ئەگەر شتیان پێوا یا کێشانە کرد بۆ خەڵك کە پێیان بفرۆشن کەمیان ئەدەنێ،

ئایا ئەوانە باوەڕیان نی‌یە کە زیندوو ئەکرێنەوە لە ڕۆژێکی گەورەدا، ئەو ڕۆژەی کە خەڵك لە بارەگای پەروەردگاری جیهانیاندا ئەوەستن، و موحاسەبەیان ئەکات لەسەر کەم و زۆر.

**وە پەسەندە سەنگین کردنی تەرازوو:**

لە سوەیدی کوڕی قەیسەوە فەرموویەتی: من و مەخرەفەی عەبدی قوماشمان هێنا لەهەجەرەوە بۆ مەککە، پێغەمبەر ﷺ هات بۆلامان سودای شەڕواڵێکی کرد و پێمان فرۆشت، لەو لاوە پیاوێك بەکرێ شتی ئەکێشا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (زن وأرجح). (أخرجه الترمذي والنسائي وابن ماجة وقال الترمذي: حسن صحيح)[1]. واتە: بیکێشەو سەنگینی بکێشە.

**لێبووردەیی و ئاسان کردن لە کڕین و فرۆشتندا:**

بوخاری و (ترمذي) ئەگێڕنەوە لەجابیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (رحم الله رجلاً سمحاً، إذا باع وإذا اشترى وإذا اقتضي) واتە: ڕەحمەتی خوا لەسەر پیاوێك مامەڵەی ئاسان بکات کاتێ ئەفرۆشێت، وە کاتێك ئەکڕێ، وە کاتێ داوای مافی خۆی ئەکات.

**فرۆشتنی غەرەر:**

فرۆشتنی غەرەر -خەڵەتاندن- ئەوەیە کە فرۆشتنەکە شتێکی نەزانراوی تێدابێت، یا کارێکی تێدا بێت کە ترسی زیانی هەیە، یا قوماری تێدا بێت، وە یاسادانەری ئیسلام ئەم جۆرە فرۆشتنەی قەدەغە کردووە. نەوەوی فەرموویەتی: قەدەغەکردنی فرۆشتنی غەرەر بنەڕەتێکە لە بنەڕەتەکانی شەرع کە زۆر کێشەی تێدا جێ ئەبێتەوە، وە لە فرۆشتنی غەرەر دوو شت لە قەدەغە کردنەکەیا جیا ئەکرێنەوە:

یەکەمیان: هەرچی لەگەڵ فرۆشراوەکەدا بێت بەجۆرێك ئەگەر تاك بکرێتەوە فرۆشتنی دروست نابێت، وەك کەرەسەی خانوو کە بە خانووەکەوەن، یا شیری گوانی ئاژەڵ کە لەگەڵ ئاژەڵەکەدایە.

دووەمیان: ئەوەی کە بە عادەت چاوپۆشی لێ ئەکرێ، لەبەر کەم نرخی، یا لەبەر گرانی جیاکردنەوەو دیاری کردنی، وەك چوونی ناو گەرماو بەکرێ لەگەڵ جیایی خەڵك لەمانەوە و ئاو بەکار هێناندا، وە هەروەها وەك خواردنەوەی ئاوی هەڵگیراو لەکوندە و جەوەندەدا، وە وەك جبەیەك کە ناو ئاخنەکەی لۆکە بێت.

وە یاسادانەری ئیسلام بەزۆری باسی ئەو جێگایانەی کردووە کە غەرەر تێیاندا ڕوو ئەدات، وا لە خوارەوە هەندێکیان ئەهێنین بەپێی ئەوەی لەسەردەمی نەفامی‌دا مامەڵەی پێ کراوە:

---

(١) أحمد (٤/٣٥٢) وأبوداود (٣٣٣٦) والترمذي (١٣٠٥) والنسائي (٧/٢٨٤) وابن ماجة (٢٢٢٠).

**١- قەدەغە کردنی فرۆشتن بە بەرد:**

خەڵکی سەردەمی نەفامی ئەچوونە سەر ئەو زەویانەی کە ڕووبەرەکانیان دیاری نەبوو، بەردوچکەیەکیان هەڵ ئەدا و ئەیان ووت: ئەم بەردە لەکوێدا کەوتەوە ئەوەندەت پێ ئەفرۆشم، یا خود شتێکیان ئەفرۆشت کە دیاری نەبوو، لەپاشاندا بەردوچکەیەکیان هەڵئەدا بکەوتایە سەر هەرجێیەك ئەیان ووت: ئەمەمان پێ فرۆشتوویت بەم جۆرە فرۆشتنەیان ئەووت: فرۆشتن بە بەرد.

**٢- قەدەغە کردنی فرۆشتن بەخۆ نوقم کردنی مەلەوان:**

ئەوان مامەڵەیان ئەکرد لەگەڵ مەلەواندا لەسەر ئەو شتانەی کە جاری وا هەبوو ئەیدۆزیەوە لەناو دەریادا لەکاتی خۆنوقوم کردنیا، ئیتر ئەبوایە هەردوولا پەیمانەکەیان بەجێ بگەیاندایە و کڕیار نرخەکەی بدایە ئەگەر هیچیشی نەدۆزیایەوە، وە فرۆشیار ئەو شتەی بدایە بە کڕیار، با نرخەکەی چەند جار بەسەر ئەو نرخەدا زیاد بوایە کە وەری ئەگرت و لەسەری ڕێك کەوتبوون. ئەمەش بەلێدانی مەلەوان ناوئەبرا.

**٣- فرۆشتنی بەروبوم:**

ئەویش فرۆشتنی بەری ناژەڵ بووە پێش ئەوەی بە بەرهەمی بهێنێت، هەروەها فرۆشتنی شیری ناو گوانەکەی هەر لەو جۆرە فرۆشتنانە بووە.

**٤- فرۆشتن بە دەست لێ دان:**

ئەوەش هەریەکەیان دەستی ئەدا لەکەل و پەلی بەرامبەرەکەی، یا جل و بەرگەکەی هەر بەو دەست لێدانە پەیمانی کڕین و فرۆشتن پێك ئەهات، بێ ئەوەی بزانن چۆنە یا ڕازی بن پێی.

**٥- فرۆشتن بە هەڵدان :**

ئەویش هەریەکەیان چی‌یان هەبوایە بۆ فرۆشتن هەڵیان ئەدایە سەر زەوی، وە هەر بەو هەڵدانە ئەبوایە کڕین و فرۆشتن پێك بهاتایە بێ ئەوەی ڕازی بن.

**٦- کڕین و فرۆشتنی ناو کێڵگە:**

ئەویش دەغڵەکەی ناو کێڵگە ئەفرۆشرا بە پێوانەیەك لەخواردنی دیاری کراو.

**٧- کڕین و فرۆشتنی موزابەنە:**

ئەویش فرۆشتنی بەری داری خورمایە بە چەند هۆقەیەك لەخورما.

**٨- کڕین و فرۆشتن بە سەوزی:**

ئەویش فرۆشتنی بەری درەختە بە سەوزی پێش گەیشتنی.

٩- کڕین و فرۆشتنی خوری بە سەر پشتی مەڕەوە.

١٠- کڕین و فرۆشتنی ڕۆن لەناو شیردا.

١١- کڕین و فرۆشتنی کۆرپەی ئەو کۆرپەڵەی کە لەناو زگی ئاژەڵدایە.

لە هەردوو صەحیحی موسلیم و بوخاری دا هاتووە: کە خەڵکی سەردەمی نەفامی گۆشتی ئەو کۆرپەڵەیان ئەفرۆشت کە هێشتا دایکەکەی کۆرپەڵەیەو لەناو سکی دایکی‌دایە.

واتە: وشترێك ئاوس بوایە و بەچکەکەی ببوایە دوایی بەچکەکە ئاوس بوایە بەچکەیەکی ببوایە ئەهاتن پێش بوونی ئەو بەچکەڵەی دوایی‌یان ئەفرۆشت. جا پێغەمبەر ﷺ لێی قەدەغە کردن.

ئەم فرۆشتنانە و وێنەی ئەمانە یاسادانەری ئیسلام قەدەغەی کردوون، چونکە ئەو شتەی پەیمانەکەی لەسەر ئەبەسترێ نەزانراوە و خەڵەتاندنی تیایە.

**حەرامی کڕینی داگیرکراو و دزراو:**

حەرامە لەسەر موسوڵمان شتێك بکڕێت کە بزانێت بە ناحەق لە خاوەنی سەندراوە، چونکە شت بە ناحەق سەندن خاوەنێتی ئەو شتە ناگوێزرێتەوە لە خاوەنەکەیەوە بۆ یەکێکی تر، کەواتە ئەو شتە لەکەسێك کڕراوە کە خاوەنی نی‌یە، لەگەڵ ئەوەشا کە هاوکاری کردنە لەسەر تاوان و دەست درێژکردن بۆ ماڵی خەڵکی.

بەیهەقی ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من اشترى سرقة وهو يعلم أنها سرقة فقد اشترك في إثمها وعارها)[1] واتە: هەرکەس شتێکی دزراوی کڕی و زانی دزراوە ئەوە هاوبەشە لە تاوان و ئەنگی‌یەکەیدا.

**فرۆشتنی ترێ بەو کەسانەی عارەقی لێ دروست ئەکەن و فرۆشتنی چەك بۆ ئاژاوە نانەوە:**

دروست نی‌یە ترێ بفرۆشێت بە کەسێك عارەقی لێ دروست بکات، وە هەروەها دروست نی‌یە کاتی فیتنە کەوتنەوە چەك فرۆشتن، وە هەروەها دروست نی‌یە چەك فرۆشتن بە ئەهلی جەنگ، وە بەو کەسانەی مەبەستی حەرامیان پێی هەبێت، وە ئەگەر پەیمانەکەش بسترابێ باتڵە، چونکە مەبەست لە کڕین و فرۆشتن ئەوەیە کە هەردوولا سود وەربگرن، فرۆشیار لە نرخەکەی و کڕیار لە کەل و پەلەکە، بەڵام لێرەدا ئەو سود و کەڵکە نایەتەدی چونکە ئەبێتە هۆ بۆ ئەنجامدانی کاری قەدەغەکراو، وە لەبەر ئەوەی ئەو مامەڵەیە هاوکاری و یارمەتی‌دانە لەسەر تاوان و دوژمنکاری کە

(١) البيهقي (٥/٣٣٦).

یاسای ئیسلام هەردووکیانی قەدەغە کردووە، خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُوا عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾ (المائدة:٢) واتە: هاوکاری و یارمەتی‌یەکتر بدەن لەسەر چاکە و تەقوا، وە هاوکاری یەکتری مەکەن لەسەر تاوان و دوژمنکاری.

لە ئیبنو عومەرەوە خوایان لیّ ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لعن الله الخمر وشاربها وساقيها وبائعها ومبتاعها وعاصرها ومعتصرها وحاملها والمحمولة إليه)[1]. واتە: خوا نەفرینی کردووە لەعارەق و عارەق خۆر وعارەق گێڕ و عارەق فرۆش و عارەق بۆ کڕاو و عارەق دروستکەر و ئەوەشی بۆی دروست ئەکرێ، وە هەڵگری و ئەو کەسەش بۆی هەڵئەگیرێ.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من حبس العنب أيام القطاف حتى يبيعه ممن يتخذه خمراً، فقد تقحَّمَ النار على بصيرة)[2]. واتە: هەرکەس کاتی لیّ کردنەوەی تریّ بێت و ئەم لیّی نەکاتەوە و هەڵی بگرێت هەتا بیفرۆشێت بە کەسێك عارەقی لیّ دروست بکات ئەو کەسە بە ئاشکرا خۆی ئەخاتە ئاگرەوە.

وە لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە هاتووە فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ فرۆشتنی چەکی قەدەغە کردووە کاتی شەڕ و ئاژاوەی ناو موسوڵمانان (بەیهەقی دەری هێناوە)[3].

ئیبنو قودامە فەرموویەتی: (فرۆشتنی شیلەی تریّ بە کەسێك کە وابزانرێت عارەقی لیّ دروست ئەکات حەرامە). وە ئەگەر سابت بوو عارەقی لیّ دروست ئەکات فرۆشتنەکە حەرامە و پوچەڵە ئەگەر مەبەستی کڕیار بزانرێت لەو بارەیەوە، جا یا بە قسەیدا یا بە هۆی شتێکەوە تایبەت بێت پێ‌ی،

بەڵام ئەگەر لەوانە بوو بۆ ئەوکارە بەکار بێت وەك ئەوەی کەسێك بیکڕێت کە نەزانرێت بۆچی ئەوێت، یا کەسێك بێت عادەتی وابێت ترشیات و عارەق دروست بکات، بەڵام قسەیەکی وانەکات کاتی کڕین کە بەڵگەی ئەوە بێت عارەقی لیّ دروست بکات ئەو فرۆشتنە دروستە.

ئەم حوکمە هەموو ئەوشتانە ئەگرێتەوە کە مەبەستی حەرامیان لیّ بکرێت، وەك فرۆشتنی چەك بە خەڵکی جەنگ (لەبیّ باوەڕان یا لەو کەسانەی کە جەنگ لەگەڵ موسوڵماناندا دەکەن) یا بە جەردە

(١) أبوداود (٣٦٧٤) وابن ماجة (٣٣٨٠).

(٢) مجمع الزوائد (٤/٩٠).

(٣) البيهقي (٥/٣٢٧).

و ڕێگر یا کاتی شەڕ و ئاژاوە. یا بەکرێدانی خانووەکەی بۆ ئەوەی عارەقی تێدا بفرۆشرێت و گەلێ شتی لەو جۆرە، ئەمانە هەموو حەرامن و پەیمانەکە بەتاڵە -تەواو- .

**فرۆشتنی شتێك حەرامی تێکەڵاو بێت:**

ئەگەر کەلوپەلە فرۆشراوەکە تێکەڵ بوو لەشتی حەڵاڵ و حەرام وتراوە: هەرچی حەڵاڵەکەیەتی فرۆشتنەکەی دروستە و ئەوی‌تر نادروستە، ئەوە بەناوبانگترین قسەی شافیعی و مەزهەبی مالیکە، وە وتراوە: عەقدەکە هەمووی بەتاڵ ئەبێتەوە.

**سوێند خواردنی زۆر قەدەغە کراوە:**

١- پێغەمبەر ﷺ سوێند خواردنی زۆری قەدەغە کردووە، و فەرموویەتی: (الحلف مَنْفَعَةٌ للسلعة، مَمْحَقَة للبركة) (رواه البخاري وغيره عن أبي هريرة)[1]. واتە: سوێند خواردن بایەخ بۆ شتەکە پەیدا ئەکات و بەرەکەتەکەی ناهێڵێ.

چونکە سوێند خواردن لەسەر کەلوپەل بۆ فرۆشتن بە گەورە زانینی خوا کەم ئەکاتەوە، وە لەوانەشە هۆیەك بێت بۆ هۆکانی فرۆشتنی خەڵەتاندن.

٢- وە لای موسلیم هاتووە:

(إياكم وكثرة الحلف في البيع، فإنه ينفق ثم يمحق)[2]. واتە: دوور بکەونەوە لە سوێند خواردنی زۆر لەفرۆشتندا، چونکە سوێند شتەکە ڕەواج پێ‌ئەدا لەپاشاندا بەرەکەتی ناهێڵێ.

٣- وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إن التجار هم الفجار، فقيل: يا رسول الله، أليس قد أحل الله البيع؟ قال: نعم، ولكنهم يحلفون فيأثمون ويحدثون فيكذبون) (رواه أحمد وغيره بإسناد صحيح)[3] واتە: بازرگانەکان هەموو تاوانبارن، ووتیان: ئەی نێرراوی خوا، ئەی خوا فرۆشتنی حەڵاڵ نەکردووە؟ فەرمووی: بەڵێ، بەڵام ئەمان ئەوەندە سوێند ئەخۆن گوناهبار ئەبن وە کە قسە ئەکەن درۆ ئەکەن.

٤- وە لە ئیبنو مەسعودەوە ﷺ هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من حلف على مال امريء مسلم بغير حقه لقي الله وهو عليه غضبان) (متفق عليه) واتە: هەرکەس سوێند لەسەر ماڵی موسوڵمانێك بخوات بە ناحەق کاتێ ئەگات بە خوا لێی بەقین و توڕەیە.

---

(١) البخاري (٢٠٨٧) ومسلم (١٦٠٦).

(٢) مسلم (١٦٠٧) والنسائي (٧/٢٤٦) وابن ماجة (٢٢٠٩).

(٣) أحمد (٤/٤٢٨،٤٤٤) والحاكم (٢/٦) ومجمع الزوائد (٤/٧٣).

ئەڵێ: پاشان پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی بۆ خوێندینەوە کە بەڵگەیە بۆ فەرمودەکەی: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً أُوْلَئِكَ لاَ خَلاَقَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ ولاَ يُكَلِّمُهُمْ اللَّهُ ولاَ يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ولاَ يُزَكِّيهِمْ ولَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ (آل عمران:٧٧) (متفق عليه)[1]. واتە:

بە ڕاستی ئەو کەسانەی پەیمانی خواو وەسیەتی خوا کە کردویەتی لە کتێبە نێرراوەکاندا بۆ سەر پێغەمبەران بەوەی کە پەیوەست بن بەڕاستی و پەیمان پارێزی لەو شتانەدا کە بەڵێن ئەدەن و پەیمان ئەبەستن ئەگۆڕنەوە بە نرخێکی کەم، بەشیان نیە لەپاداش لە ڕۆژی دواییداو خوا قسەیان لەگەڵدا ناکات، و بە چاوی بەزەییەوە سەیریان ناکات، و پاکیان ناکاتەوە لە پیسی گوناه و کوفر، وە سزایەکی دەردناکیان بۆ هەیە.

٥- وە بوخاری ﷺ گێراویەتیەوە کە عەرەبێکی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و ووتی: ئەی نێرراوی خوا، گوناهی گەورە کامەیە؟ ئەویش ﷺ فەرمووی: (الإشراك بالله) واتە: شەریك دانان بۆ خوا، وتی: پاشان چی تر؟ فەرمووی: (اليمين الغموس) واتە: سوێندی نوقمکەر، ووتی: سوێندی نوقمکەر چیە؟ فەرمووی: (الذي يقتطع مال امرئ مسلم، يعني بيمين هو فيها كاذب)[2] واتە: ئەو سوێندەیە کە ماڵی موسوڵمانێکی پێ داگیر بکرێت، واتە: بە سوێندی درۆ.

وە بۆیە پێی ئەڵێن: نوقمکەر، چونکە خاوەنی لەئاگری دۆزەخدا نوقم ئەکات، وە لای هەندێ زانایان کەفارەتی نیە، وە لەبەر قورسی و گەورەیی گوناهەکە کەفارەت جێی ناگرێتەوە.

٦- وە لەئەبو ئومامەوە ئیاسی کوڕی پەعلەبەی حارپی خوا لێیان ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من اقتطع حق امرئٍ مسلم بيمينه فقد أوجب الله له النار وحرم عليه الجنة، فقال رجلٌ: وإن كان شيئاً يسيراً يارسول الله؟ قال: وإن كان قضيبا من أراك)[3] (رواه مسلم) واتە: هەرکەس بە سوێندی درۆ مافی موسوڵمانێك ببڕێت خوا ئاگری بۆ پێویست ئەکات وە بەهەشتی لەسەر حەرام ئەکات، پیاوێك ووتی: ئەگەرشتێکی کەمیش بێت، ئەی نێرراوی خوا؟ فەرمووی: ئەگەر داری سیواکێکیش بێت.

---

(١) البخاري (٦٦٧٦/٦٦٧٧) ومسلم (١١٠).

(٢) البخاري (٦٦٢٠).

(٣) أحمد (٥/٢٦٠) ومسلم (١٣٧) والنسائي (٨/٢٤٦).

**فرۆشتن و کڕین لە مزگەوتدا:**

ئەبو حەنیفە ڕێی داوە مامەڵەی کڕین و فرۆشتن بکرێت لەمزگەوتدا، وە بە کەراهەتی داناوە کەلوپەلەکە بهێنرێت بۆ مزگەوت لەبەر ڕێزی مزگەوت.

وە مالیك و شافیعی ڕێیان داوە لەگەڵ کەراهەت بوون.

وە ئەحمەد قەدەغەی دروستی و ڕێ پێدانی کردووە و بە حەرامی داناوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا رأيتم من يبيع أو يبتاع في المسجد فقولوا: لا أربح الله تجارتك)[1] واتە: ئەگەر کەسێکتان بینی لە مزگەوتدا کڕین یا فرۆشتنی ئەکرد پێی بڵێن: خوا قازانج نەخاتە بازرگانی‌یەکەتەوە.

**کڕین و فرۆشتن کاتی بانگی هەینی:**

کڕین و فرۆشتنی کاتی نوێژە فەرزەکان کە ئەوەندەیان ماوە بە بەرەوە نەبوو یا کاتی بانگی نوێژی هەینی حەرامەو دروست نی‌یە لای ئەحمەد بەپێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِي لِلصَّلَاةِ مِن يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ (الجمعة:٩)

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە کاتێ بانگدەر بانگی دا بۆ نوێژی ڕۆژی هەینی بەپەلە بڕۆن بۆ نوێژەکە و واز لە کڕین و فرۆشتن بهێنن ئەوە خێرترە بۆتان ئەگەر ئێوە بەرژەوەندی خۆتان بزانن.

وە ئەو قەدەغەیە بە گوێرەی نوێژی هەینی لەبەر حەرامی‌یە، بەو شێوەیە هەموو نوێژەکانی تریشی لەسەر پێوانە ئەکرێت.

**دروستی (تولية) سەر بەسەر فرۆشتن و (مرابحة) بە قازانج فرۆشتن و (وضيعة) بە کەم فرۆشتن:**

شت سەر بەسەر بفرۆشرێت یا بە قازانج یا بە کەمتر لە نرخەکەی دروستە بە مەرجێك فرۆشیار و کڕیار ئەو نرخە بزانن کە کەلوپەلەکەی پێ فرۆشراوە.

**فرۆشتنی قورئان و کڕینی:**

زانایان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە دروستە قورئان بکڕرێت بەڵام جیاوازیان هەیە لە فرۆشتنیدا.

---

(١) الترمذي (١٣٢١) والنسائي في عمل اليوم والليلة (١٧٦) والحاكم (٢/٥٦) وابن خزيمة (٢/٢٧٤) وابن حبان (١٦٤٨).

هەر سێ ئیمامەکە بە ڕەوایان داناوە. بەڵام حەنبەلی‌یەکان حەرامیان کردووە. وە ئەحمەد فەرموویەتی: دەربارەی فرۆشتنی قورئان نازانم کەسێك ڕێی دابێت.

**فرۆشتنی خانووەکانی مەککە و بەکرێ گرتنیان:**

زۆر لە زانایان ڕێیان داوە لەوانە ئەوزاعی و پەوری و مالیك و شافیعی، وە قسەیەکی ئەبوحەنیفەش.

**فرۆشتنی ئاو:**

ئاوی دەریا و ڕووبارەکان و کانیاو و باراناو ئەمانە ڕەوایە بۆ هەموو کەس و تایبەت نی‌یە بە کەسێکەوە بێ کەسێکی‌تر، لەبەر ئەوە دروست نی‌یە کڕین و فرۆشتنیان هەتا لە شوێنەکانی خۆیاندا بن.

وە لەفەرموودەیەکی ئەبو داوددا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێت: (الناس شركاء في الماء والكلأ والنار) واتە:

خەڵك هاوبەشن لە ئاو ولەوەڕگە و پاوەن و ئاگردا[1].

وە ڕیوایەت کراوە ئیاسی موزەنی کەسانێکی بینی ئاویان ئەفرۆشت، فەرمووی: ئەو ئاوە مەفرۆشن چونکە من لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە قەدەغەی ئەکرد کە ئاو بفرۆشرێ.

بەڵام ئەگەر کەسێك جیای کردەوە و چاودێری ئەکرد ئەوە دەبێتە ملکی ئەو و دەتوانێ بیفرۆشێ، یا بیرێکی لە زەوی‌یەکەی خۆیدا هەڵکەند، یا ئامێرێکی دانا ئاوەکەی پێ دەرئەهێنا ئەوە ئەبێت بە مولکی خۆی و دروستە بۆی لەم حالەتانەدا ئاوەکە بفرۆشێت، چونکە سابتە کە پێغەمبەر ﷺ چووە مەدینە و بیرێکی لێبوو ناوی (رومة) بوو مولکی یەهودی‌یەك بوو ئاوەکەی بە خەڵکی ئەفرۆشت، جا پێغەمبەر ﷺ هێشتیەوە لەسەر فرۆشتنەکەی و موسوڵمانانیشی هێشتەوە لەسەر کڕینەکەیان لێی، وە هەر بەم شێوە بەردەوام بوو تا عوسمان ﷺ لێی کڕیەوە و وەقفی کرد لەسەر موسوڵمانان. وە فرۆشتنی ئاو لەم شێوەیەدا وەك داری سوتانی لێ دێت دوای هێنان و کۆکردنەوەی چونکە داریش پێش کۆکردنەوەو سەرپەرشتی کردنی بۆ هەموو کەس ڕەوایە، بەڵام کاتێك کۆکرایەوە بوو بە مولکی کەسێکی دیاری کراو فرۆشتنی دروستە. وە لە فەرموودەیەکی

---

(١) أحمد (٥/٣٦٤) وأبوداود (٣٤٧٧) وابن ماجة (٢٤٧٢).

پێغەمبەردا ﷺ هاتووە ئەفەرموێت: (لئن یأخذ أحدکم حبلاً فیحتطب حزمة من حطب فیبیعها خیر له من أن یسأل الناس، أعطوه أو منعوه)[1].

واتە: کەسێکتان بچێت کۆڵێك دار بهێنێت و بیفرۆشێت چاکترە لەوەی داوا لەخەڵك بکات بیدەنێ یا نەی دەنێ.

وە کاتێك ئاو فرۆشرا. ئەگەر ئامێرێکی هەبوو ئەندازەی ئاوەکەی حسێب ئەکرد، وەکو بژێرەر ئەوە دروستە، وە ئەگەر شتی وا نەبوو ئەوە بە پێی عورف ئەفرۆشرێ. ئەمە هەمووی لە حاڵەتی عادیدا، بەڵام ئەگەر حاڵەتێکی ناچاری بۆ خەڵکی پێش هات، واجبە لەسەر خاوەنی ئاوەکە بە خۆرایی و بێ فرۆشتن بدا بە خەڵکی. لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (ثلاثة لا یکلمهم الله یوم القیامة، رجل منع ابن السبیل فضل ماء عنده، ورجل حلف علی سلعة بعد العصر کاذباً، ورجل بایع إماماً، فإن أعطاه وفی له، وإن لم یعطه لم یف له)[2].

واتە: سێ کەس خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتا قسەیان لەگەڵ ناکا: پیاوێك کە ئاوی زیادە لەخۆی هەیەو نایدات بە ڕێبواری لێقەوماو، وە پیاوێك لە دوای عەسر لەسەر کەلوپەلێك سوێندی درۆ بخوات، وە پیاوێك لەگەڵ ئیمام و پێشەوایەکدا بەیعەت ببەستێ، جا ئەگەر شتی بداتێ ئەوە وەفا بە بەیعەتەکە بکا، وە ئەگەر نەیداتێ سەر پێچی بکا و وەفای پێ نەکا.

**فرۆشتنی (وفاء):**

ئەوەیە کە کابرایەك پێویستی بە پارە هەبێت خانووەکەی ئەدات بە مەبلەغێك پارە یا زەوییەکەی، بە مەرجێ هەر کاتێ ئەو پارەیەی هەبوو بیداتەوە و خانووی خۆی یا زەوی خۆی وەربگرێتەوە... حوکمەکەی لای ئێمە وەك ڕەهن وەهایە بە پێی بەهێزترین بۆ چوونەکان.

**کڕینی (الإستصناع) ئەو شتەی کە داوای دروست کردنی ئەکرێت:**

ئەوەش کڕینی ئەو شتەیە کە بەپێی داوا دروست ئەکرێت، وە ئەم کارە پێش ئیسلام باو بووە و نەتەوەی ئیسلامیش هەموو لەسەر مەشروعی ئەو فرۆشتنەن.

و ڕوکنەکەشی (الإیجاب) و (القبول)ە، وە ئەو فرۆشتنە دروستە لە هەموو ئەو شتانەی کە بە داوای دروست کردنی مامەڵە ئەکرێن.

---

(١) البخاري (١٤٧١) وإبن ماجة (١٨٣٦) من حدیث الزبیر بن عوام).

(٢) البخاري (٢٣٦٩) ومسلم (١٠٨).

وە حوکمەکەی: سوودی بە موڵك بوونە لە نرخ و لە فرۆشراودا.

وە مەرجی دروستی ئەو فرۆشتنە: ڕوون کردنەوەی جۆری ئەو شتەی داوای دروست کردنی کراوە، شێوەکەی و جۆرەکەی و ئەندازەکەی بە شێوەیەك کە زانراو بێت و کێشەی لەسەر دروست نەبێت.

وە کڕیار کاتی بینینی فرۆشراوەکە بۆی هەیە بەو پارەیە بیەوێ، وە بۆی هەیە پەشێمان بێتەوە، ئیتر بەو شێوەیە بێت کە بۆی باس کردووە یا بەو شێوەیە نەبێت، لای ئەبوحەنیفە و محمد ڕەحمەتی خوایان لێ بێت.

وە ئەبویوسف فەرموویەتی: ئەگەر بینی بەو شێوەیە بوو کە بۆی وەسف کردبوو ئارەزووی تێدا نامێنێ ئەمەش بۆ ئەوەی دروستکەرەکە تووشی زیان نەبێت، چونکە لەوانەیە کەسێکی تر بەو نرخە نەیکڕێت کە ئەو کڕیویەتی.

**کڕین و فرۆشتنی میوە ودانەوێڵە:**

فرۆشتنی میوە پێش پێگەیشتنی و کشت وکاڵ پێش کامڵ بوونی دروست نی یە، لە ترسی ئەوەی نەك ئافەتێکی بۆ پەیدا بێت پێش ئەوەی بگاتە دەستی کڕیار.

١- بوخاری و موسلیم لە ئیبنوعومەرەوە خوایان لێ ڕازی بێت گێڕاویانەتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ (نهى عن بيع الثمار حتى يبدو صلاحها: نهى البائع والمبتاع)[1] واتە:

پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لە فرۆشتنی میوە پێش گەیشتنی، و نەهی لە فرۆشیار و کڕیار کردووە.

وە موسلیم ئەگێڕێتەوە لێی کە پێغەمبەر ﷺ (نهى عن بيع النخل حتى يزهو وعن بيع السنبل حتى يبيض ويأمن العاهة نهى البائع والمشتري)[2].

واتە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە فرۆشتنی خورما هەتا نەگات وخۆش نەبێت و دەغڵ و دان هەتا گوڵەکەی زەرد نەبێت و لەئافات دوور نەکەوێتەوە. لەفرۆشیار و کڕیاری قەدەغەی کردبوو.

٣- وە بوخاری لە ئەنەسەوە ئەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أرأيت إن منع الله الثمرة، بم يأخذ أحدكم مال أخيه)[3]؟.

---

(١) البخاري (٢١٩٤) ومسلم (١٥٣٤/٤٩).

(٢) مسلم (١٥٣٤/٥٠).

(٣) البخاري (٢٢٠٨) ومسلم (١٥٥٥/١٥و١٦).

واتە: ئەی ئەگەر خوا میوەکە پێ نەگەیەنێت بەچی‌یەکێ لەئێوە ماڵی برا موسوڵمانەکەی ئەبات؟

جا ئەگەر میوە فرۆشرا پێش گەیشتنی و دانەوێڵە پێش گەیشتنی بە مەرجی بڕینەوەی دەستبەجێ لەوکاتەدا، دروستە ئەگەر بتوانرێ کەڵکی لێ وەربگیرێ، وە ئەو دانەوێڵەیە یان ئەو میوەیە لێك بڵاو نەبن، چونکە لەم حاڵەتەدا ترسی لەناو چوون و ڕوودانی بەڵای تێدا نابێت.

وە ئەگەر فرۆشرا بە مەرجی لێ کردنەوەی دەم و دەست، بەڵام کڕیارەکە وازی لێ هێنا هەتا جوان پێ ئەگات – وتراوە: فرۆشتنەکە بەتاڵە- وە وتراوە: بەتاڵ نابێتەوە، بەڵام لە زیادەکەیدا هاوبەشن.

**فرۆشتنی بە خاوەنی بنەدارەکە یا خاوەنی زەوی‌یەکە:**

ئەو حوکمانە بۆ کەسێکن کە خاوەنی بنەدارەکان نەبێت یا خاوەنی زەوی نەبێت و پێی بفرۆشرێت.

جا ئەگەر میوەهات بفرۆشرێت بە خاوەنی بنەدارەکان، ئەوە فرۆشتنەکە دروستە، وەك ئەوە وایە کە بەرەکە بفرۆشرێت لەگەڵ بنەکەدا پێش ئەوەی پێ بگا.

وە هەروەها دروستە فرۆشتنی دانەوێڵە بە خاوەن زەوی پێش گەیشتنی لەبەر ئەوەی تەسلیم کردن بە ئەنجام ئەگات بە کڕیار بە شێوەیەکی تەواو.

**بەچی گەیشتنی ئەزانرێت؟**

گەیشتنی بەرسیلە خورما بە سوربوون و زەرد بوون دەرئەکەوێت و ئەزانرێت.

بوخاری و موسلیم تەخریجیان کردووە لە ئەنەسەوە کە پێغەمبەر: (ﷺ) **(نهى عن بيع الثمرة حتى تزهو)**[1].

واتە: فرۆشتنی بەری درەختی قەدەغە کردبوو هەتا خۆش نەبێت.

بە ئەنەسیان ووت: خۆش بوونی چۆنە؟ فەرمووی: سوربوون و زەرد بوونە[2].

وە پێ گەیشتنی ترێ بە شیرین بوون و نەرم بوون و زەرد بوون ئەزانرێت[3].

وە گەیشتنی میوەهاتی تر بە تامی خۆش و ڕەنگی میوەکە دەرئەکەوێت.

بوخاری و موسلیم لە جابیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فرۆشتنی میوەی قەدەغە کردبوو هەتا خۆش نەبێت[1].

---

(١) البخاري (٢٢٨٠) ومسلم (١٥٥٥/١٥و١٦).

(٢) البخاري (٢١٩٥) ومسلم (١٥٥٥/١٥).

(٣) ئەو قەدەغە کردنەی هاتووە کە ترێ نافرۆشرێت هەتا ڕەش نەبێت بە گوێرەی ترێی ڕەشە.

وە گەیشتنی دانەوێڵە بە گەیشتنی دانەکە ئەزانرێت.

**فرۆشتنی ئەو میوانەی کە وردە وردە پێ ئەگات:**

کاتێ پێگەیشتنی میوەهات و دانەوێڵە دەرکەوت لەهەندێکیدا دروستە هەمووی بەسەریەکەوە بفرۆشرێت ئەوەی پێ گەیشتووە و ئەوەی پێنەگەیشتووە هەر کاتێ پەیمانەکە لەسەر فرۆشتنییەك پارچە بوو.

وە هەروەها دروستە فرۆشتنی ئەگەر عەقدەکە لەسەر پارچەیەك زیاتر بوو و ئەیویست دووای پێگەیشتنی پارچەی یەکەم بیان فرۆشێت.

وە ئەمەش بۆ کاتێکە کە باغەکە چەند جۆرە میوە و سەوزەی تێدا بەرهەم بێت، وەك مۆز لەمیوەهات و خەیار لە سەوزە و گوڵ و ئەو جۆرە شتانە کە بەر لەدوای بەر پێ ئەگا،

وە زانایانی مالیکی و هەندێ لە زانایانی حەنەفی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکان بۆ ئەوە چوون و بەڵگەشیان ئەمانەی لای خوارەوەیە:

١- سابتە لەیاسا دانەری ئیسلامەوە دروستی فرۆشتنی میوەهات کاتێ هەندێکی پێگەیشتبێت جا ئەوەشی کە پێ نەگەیشتووە هەر ئەخرێتە سەر ئەو پێگەیشتووە.

جا ئەمەی ئێرەش هەروەك ئەو شێوەیەیە عەقدەکە ئەبەسترێ لەسەر ئەوەی کە مەوجودە، وە ئەوەش کە مەوجود نەبوو ئەخرێتە سەری، ئەمە ئەگەر ئەو کەسە هەموو میوەکەی کڕی، بەڵام ئەگەر هەندێکی کڕی ئەوە هەردار میوەیەی حوکمی خۆی هەیە.

٢- دروست نەبوونی ئەو فرۆشتنە دوو شتی خراپی لێوە ئەکەوێتەوە:

أ- ڕوودانی کێشە.

ب- پەك خستنی سامان.

ئەمما ڕودانی کێشە چونکە زۆر جار پەیمانی کڕین و فرۆشتن ئەکرێ لەسەر کێڵگە پان و بەرینەکان، وە کڕیار ناتوانێ میوەی پارچەی یەکەم وەربگرێ، چونکە جاری وایە کاتەکەی درێژە ئەکێشێ هەتا پارچەکانی تریش لێیان پێ ئەگات، وە ناتوانرێت لەیەك جیا بکرێنەوە، بەم شێوەیە گیر و گرفت ئەکەوێتە نێوان هەردوو کڕیار و فرۆشیار وە هەر یەکەیان ماڵی ئەوی تریان ئەخوات.

---

(١) البخاري (٢١٨٩) ومسلم (٥٢/١٥٣٦).

بەڵام گرفتی دووەم کە پەکخستنی ماڵە: فرۆشیار کەم جار بۆی ئاسان نەبێت ئەو بەشەی پێ گەیشتووە بیدات بە کڕیارەکە یەك بە دوای‌یەکدا ئەمەش ئەبێتە هۆی لەناوچوونی ماڵەکەی.

جا مادام ئاوهایە ئەوە فرۆشتنی دروستە بە یەکەوە لەم شێوەیەدا.

وە ووتن (قەول کردن) بە نادروستی فرۆشتنی خەڵك ئەخاتە ناخۆشی و بارگرانی‌یەوە کە ئەو دوو شتەش لە ئایینەدا لابراون بە پێی فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرمووێت: ﴿وماجعل الله عليكم في الدين من حرج﴾

واتە: خوا هیچ ناخۆشی و گرانی لەسەر دانەناون لەم ئایینەدا.

ئیبنو عابدین ئەم قەولەی پارسەنگ داوەتەوە و گۆڤاری (الأحكام الشرعية)ش وەری گرتووە.

**فرۆشتنی گەنم لە گوڵەکەیدا:**

دروستە گەنم لە گوڵەکەیدا بفرۆشرێت، وە هەروەها پاقلە و برنج و کونجی و گوێز و بادام بە توێکڵەکەیەوە چونکە دانەوێڵەیەو ئەتوانرێت سوودیان لێ وەربگیرێت هەر وەك جۆ کە لەگوڵەکەیدا دەفرۆشرێت. وە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردبوو کە دانەوێڵە لە گوڵەکەیدا بفرۆشرێت هەتا تەواو زەرد نەبێت و لەبەلاو نەخۆشی دوور نەکەوێتەوە[1]، لەبەر ئەوەی پێویستی داوای ئەو کارە ئەکات و ئەو زەرەرەش کە تێیدایە لێ بوراوە. ئەوەش مەزهەبی حەنەفی‌یەکان و مالیکی‌یەکانە.

**کەوتنەوەی بەلاو ئافەت (وضع الجوائح):**

(جوائح) کۆی (جائحة)یە، کە ئەو دەردو بەلایەیە تووشی دانەوێڵە و میوەهات دەبێت بێ ئەوەی ئادەمیزاد دەستی تێدا بێت، وەك بێ بارانی و سەرما و بێ ئاوی. ئەمەش حوکمی تایبەتی خۆی هەیە.

ئەگەر بەر و بومێك فرۆشرا دوای ئەوەی دەرکەوت کە ئەشێ بۆ کڕین، وە فرۆشیار تەسلیمی کڕیاری کرد بەو مەرجەی لایبات، لەپاشاندا بە ئافات لەناو بچێت پێش ڕنینەوەی، ئەوە هەر لە ئەستۆی فرۆشیاردا ئەبێت، وە کڕیارەکە لەسەری نی‌یە کە نرخەکەی بدات.

لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ (أمر بوضع الجوائح) واتە: فەرمانی داوە ئافات کەوتنەوە حسابی بۆ بکرێت (موسلیم لە جابیرەوە گێڕاویەتی‌یەوە)[2].

---

(١) البخاري (٢١٨٣) ومسلم (١٥٣٤/٥١) و (١٥٣٥/٥٠) وأحمد (٢/٥٩) والنسائي (٧/٢٦٢).

(٢) أحمد (٣/٣٠٩) ومسلم (١٥٥٤/١٧) وأبوداود (٣٣٧٤) والنسائي (٧/٢٦٥).

وه لهزاراوهیهکی تردا فهرموویهتی: (ئهگهر شتێکت له میوههات و دانهوێڵه فرۆشت به برایهکی موسوڵمانت پاشان توشی ئافات بوو ڕهوا نییه بۆت نرخهکهی لێ بستێنی، ئایا تۆ بهچی ماڵی برا موسوڵمانهکهت به ناحهق وهردهگریت؟)[1].

وه ئهم حوکمه بۆ حاڵهتێکه ئهگهر فرۆشیار به بنهوه نهی فرۆشتبێت، یا نهی فرۆشتبێت به خاوهنی بنهدارهکه، یا کڕیار به بێهۆ لابردنی دووا خستبێت، لهم حاڵهتانهدا له ئهستۆی کڕیاردایه.

بهڵام ئهگهر لهناو چوونهکه به هۆی ئافهتهوه نهبوو بهڵکو به دهستی ئادهمی لهناو چووبوو، کڕیار ئارهزووی خۆیهتی پهیمانهکه ههڵئهوهشێنێتهوه یان نا، بهڵام ئهوهی لهناو چووه به فرۆشیاری ئهژمێرێ ئهگهر ههڵی نهوهشێنێتهوه.

ئهحمهدی کوڕی حهنبهل و ئهبوعوبهید و کۆمهڵێك لهئههلی حهدیس بۆ ئهوه چوون، وه ئیبنوقهییم پارسهنگی ئهو بۆ چوونهی داوهتهوه و له پوختهکردنی سونهنی ئهبوداودا ووتویهتی:

وه جهماوهری زانایان بۆ ئهوه چوون که حیساب کردن بۆ ئافات کارێکی پهسهنده، لهڕێگهی چاکی و پیاوهتییهوه نهك له ڕێگهی پێویست و واجبهوه.

مالیك فهرموویهتی: سێیهکی ئهگهر لهناو چوو بوو ئهوه حیسابی بۆ ئهکرێت، له سێیهکی کهمتر به هیچ دانانرێت.

هاوهڵهکانی مالیك ووتویانه: مانای ئهمه ئهوهیه که لهناو چوونی بهروبوومهکه به هۆی ئافهتهوه ئهگهر له سێیهك کهمتر بوو ماڵی کڕیاره، وه ههرچی له سێیهك زیاتر بوو ماڵی فرۆشیاره.

وه ئهوانهی فهرموودهکهیان لهسهر پهسهندی ئهو کاره لێك داوهتهوه نهك پێویستی بهڵگهیان ئهوهیه: ئهو ڕووداوه کاتێك ڕوویداوه که بووهته ماڵی کڕیار، وه ئهگهر بیویستایه بی فرۆشتایه یا ببهخشیایه دروست بوو.

وه پێغهمبهر ﷺ قهدهغهی کردووه قازانج له شتێك بکرێت زهمانهتی نهبێت[2].

جا ئهگهر فرۆشتنی دروست بێت، زامن بوونی خاوهنیشی سابت ئهبێ.

وه پێغهمبهر ﷺ قهدهغهی فرۆشتنی میوههاتی کردووه پێش گهیشتنی. جا ئهگهر ئافاتهکه دوای پێ گهیشتن بێت و ههر ماڵی فرۆشیار بێت ئهوه ئهو قهدهغهیه بێ سووده.

---

(١) مسلم (١٥٥٤) وأبوداود (٣٤٧٠) والنسائي (٧/٢٦٥) وابن ماجة (٢١١٩).

(٢) أحمد (٢/١٧٥و١٧٩) وأبوداود (٣٥٠٤) والترمذي (١٢٣٤) والنسائي (٧/٢٩٥) وابن ماجة (٢١٨٩).

**مەرجەکانی کڕین و فرۆشتن:**

مەرجەکانی کڕین و فرۆشتن دوو بەشە:

بەشی یەکەم: مەرجی صەحیح و سەپێنراو

بەشی دووەم: مەرجی پوچەڵکەرەوەی پەیمانەکەیە

جا یەکەمیان: ئەوەیە کە لەگەڵ پەیمانەکەدا ڕێك بکەوێت ئەویش سێ جۆرە:

١- مەرجێك کە فرۆشتنەکە پێویستی ئەکات وەك مەرجی وەرگرتن و دانی نرخ.

٢- مەرجێك لەبەرژەوەندی پەیمانەکە بێت، وەك مەرجی دوواخستنی نرخ، یا دواخستنی هەندێ لە نرخەکەی، یا مەرجی بوونی سیفەتێکی دیاری کراو لە فرۆشراوەکەدا، وەك ئەوەی بە مەرج بگیرێت کە ئەبێت وڵاغەکە شیردار بێت یا ئاوس، وە وەك ئەوەی کە ئەبێ بازەکە ڕاو بکات، جا ئەگەر ئەو مەرجەی تێدا بوو ئەبێ فرۆشتنەکە بەجێ بێت، بەڵام ئەگەر ئەو مەرجەی تێدا نەبوو بۆ کڕیار هەیە بەڵێنەکە هەڵبوەشێنێتەوە لەبەر نەبوونی مەرجەکە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (المسلمون علی شروطهم)[1].

واتە: موسوڵمانان لەسەر مەرجەکانیانن.

وە هەروەها کڕیار بۆی هەیە کە نرخەکە کەمتر بدات ئەگەر ئەو مەرجەی دایناـبوو نەهاتە دی.

٣- مەرجێك کە سوودێکی ئاشکرای تێدا بێت بۆ فرۆشیار یا کڕیار، وەك ئەوە کەسێك خانوویەکی فرۆشت و مەرجی دانا کە سوودی لێ وەربگرێ بۆ ماوەیەکی دیاری کراو، وەك ئەوەی مانگێ یا دوومانگ تێیدا بمێنێتەوە، وە هەروەها ئەگەر وڵاغێکی فرۆشت، و مەرجی ئەوەی دانا کە ئەبێت سواری بێت هەتا شوێنێك کە خۆی دیاری بکات.

بەپێی ئەوەی بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە: کە جابیر ووشترێکی فرۆشت بە پێغەمبەر ﷺ مەرجی ئەوەی دانا کە هەتا مەدینە سواری بێت.(ئەم حەدیسە بوخاری و موسلیم لەسەری ڕێکن)[2].

وە هەروەها دروستە کە کڕیار سوودێکی دیاری کراو لەسەر فرۆشیار دابنێت بە مەرج، وەك ئەوەی فرۆشراوەکەی بۆ بگەیەنێتە شوێنێکی دیاری کراو، یا بیشکێنێت، یا بیدورێت، یا بیبڕێت.

---

(١) تەخریج کراوە لەمەو پێش.

(٢) البخاري (٢٧١٨) ومسلم (١٠٩/٧١٥).

بەڵام ئەگەرشوێنەکە دیاری نەبوو مەرجەکە دروست نی‌یە، وەك ئەوەی داوای لێ بکات بیگەیەنێتەوە ماڵەوە بۆی، بەڵام فرۆشیار ماڵەکەی نەزانێ. (محمدی کوڕی مەسەلەمە بارێك داری لە کابرایەکی نیبگیکڕی بە مەرجێك کە بۆی هەڵگرێت بۆ ماڵەوە. ئەو شتە بڵاو بۆوە کەسیش ئینکاری لێ نەکرد.) (ئەمەش مەزهەبی ئەحمەد و ئەوزاعی و ئەبو ئەور و ئیسحاق و ئیبنو مونذیرە).

وە شافیعی و حەنەفی‌یەکان بۆ دروست نەبوونی ئەو فرۆشتنە چوون، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فرۆشتن ومەرجی قەدەغە کردووە. بەڵام ئەو قەدەغەیە ڕاست نی‌یە، بەڵکو دوو مەرجی لە فرۆشتندا قەدەغە کردووە،

جۆری دووەم لە مەرجەکان: مەرجی فاسیدە ئەویش چەند جۆرێکە:

١- ئەو مەرجەی کە بەڵێنەکە لە بناغەوە پوچەڵ ئەکاتەوە، وەك ئەوەی پەیمانێکی تر بکاتە مەرج لەسەر هاوەڵەکەی، بۆ نمونە فرۆشیار بە کڕیار بڵێت: ئەم شتەت پێ ئەفرۆشم بە مەرجێك تۆش فڵانە شتم پێ بفرۆشی، یا ئەوەندەشم بدەیتێ بە قەرز. وە بەڵگەی ئەمەش فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ کە فەرموویەتی: (لایحل سلف وبیع، ولا شرطان في بیع).(رواه الترمذي وصححه)[1].

واتە: قەرز و فرۆشتن بەسەر یەکەوە دروست نی‌یە، وە هەروەها دوو مەرج لە فرۆشتندا دروست نی‌یە.

ئەحمەد فەرموویەتی: هەموو شتێك لەسەر ئەو شێوەیە بێت دروست نی‌یە، وەك ئەوەی بڵێت: ئەو شتەت پێ ئەفرۆشم بە مەرجێك کچەکەتم لێ مارەکەی، یا کچەکەمت لێ مارەکەم. ئەمانە هەمووی دروست نین. ئەوەش قسەی ئەبوحەنیفە و شافیعی و جەماوەری زانایانە. بەڵام مالیك بە دروستی داناوە، وە ئەوەی بەتاڵ کردۆتەوە کە کراوە بە مەرج، وە فەرموویەتی: من سەیری زاراوەی فاسید ناکەم ئەگەر مامەڵەکە ئاشکرا و حەڵاڵ بێت.

٢- ئەو مەرجەی کە فرۆشتنەکەی لەگەڵدا دروستە و مەرجەکە پوچەڵ ئەکاتەوە. ئەویش ئەو مەرجەیە کە پێچەوانەی ئەنجامی بەڵێنەکەیە، وەك ئەوەی فرۆشیار ئەوە بکاتە مەرج بەسەر کڕیارەکەوە کە نابێت ئەو شتە بفرۆشێتەوە، یا بیبەخشێت، بە پێی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (کل شرط لیس في کتاب الله فهو باطل، وإن کان مائة شرط)[2].

---

(١) الترمذي (١٢٣٤).

(٢) لەمەو پێش تەخریج کراوە.

واتە: هەر مەرجێك لە کتێبەکەی خوادا نەبێت پوچەڵە، با سەد مەرجیش بێت.

ئەحمەد و حەسەن و شەعبی و نەخەعی و ئیبنو ئەبولەیلا و ئەبوثەور بۆ ئەوە چوون. وە ئەبوحەنیفە و شافیعی فەرموویانە: فرۆشتنەکە فاسیدە.

٣- ئەو مەرجەی فرۆشتنی لەگەڵدا پێك نایەت، وەك ئەوەی بڵێت: ئەوەت پێ ئەفرۆشم ئەگەر فڵانەکەس ڕازی بوو، یا ئەگەر فڵانە شتت بۆ هێنام. و هەروەها هەر فرۆشتنێك ببەسترێ بە مەرجێکەوە لە داهاتوودا بێت.

**فرۆشتنی -پێشەکی- عەربوون:**

شێوەی ئەم فرۆشتنە ئەوەیە: کڕیار شتێك ئەکڕێت، وە بەشێك لە نرخەکەی ئەدات بە خاوەن شت. جا ئەگەر پێك هاتن حیساب ئەکرێ لە نرخەکەو بەشەکەی تریشی ئەداتێ، وە ئەگەر پێك نەهاتن، فرۆشیار ئەو بەشە هەڵ ئەگرێ بۆ خۆی، وەك بەخشینێك لەکڕیارەوە. وە جەماوەری زانایان بۆ نادروستی ئەم فرۆشتنە چوون، بە پێی ئەوەی ئیبنو ماجە گێڕاویەتیەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فرۆشتنی عەرەبوونی قەدەغە کردبوو[1].

وە ئیمام ئەحمەد ئەم حەدیسەی لاواز کردووە و ڕێی داوە بە فرۆشتنی عەرەبوون بەپێی ئەوەی لە نافیعی کوڕی (عبدالحارپ) وە گێڕاویەتی‌یەوە کە خانوویەکی کڕیوە بۆ عومەر ؓ بیکاتە بەندیخانە لە صەفوانی کوڕی ئومەییە بە چوار هەزار درهەم، بەو مەرجەی ئەگەر عومەر ؓ ڕازی بوو ئەوە فرۆشتنەکە بەجێ ئەگەیەنرێت، بەڵام ئەگەر ڕازی نەبوو چوارصەد درهەم بدرێت بە صەفوان و خانووەکە بگەڕێتەوە بۆ خۆی.

ئیبنو سیرین و ئیبنو موسەییب فەرموویانە: ئەگەر خاوەن شت لای ناخۆش بوو فرۆشراوەکەی بۆ بگەڕێتەوە خراپ نی‌یە شتێکی لەگەڵدا بدرێتێ، و ئیبنو عومەریش خوایان لێ ڕازی بێت ڕێی پێ داوە.

**فرۆشتن بە مەرجی بێ عەیبی :**

وە ئەگەر فرۆشیار شتێکی فرۆشت بە مەرجی بێ عەیبی لە هەموو عەیبێکی نادیار، شتەکەی لەکۆڵ فرۆشیار ناکەوێت، وە هەرکاتێك کڕیار عەیبی لە فرۆشراوەکەدا بینی (خیار) سەرپشکی

(١) أحمد (٢/١٨٣) وأبوداود (٣٥٠٢) ومالك في الموطأ (٢/٦٠٩ ) والنسائي (٦/٣٤٢) وابن ماجة (٢١٩٣).

بۆ هەیە، و ئەتوانێ پەشێمان بێتەوە، چونکە سەرپشکی دووای فرۆشتنی سابت ئەبێ، کەواتە پێش فرۆشتنی ناکەوێت.

بەڵام ئەگەر فرۆشراو عەیبەکەی وون بوو یا کڕیارەکە بەبێ عەیبی دانا دوای بەڵێنەکە، ئەوە لە مل فرۆشیار ئەکەوێت.

وە بە سابتی هاتووە کە عبداللە ی کوڕی عومەر ڕەزای خوایان لێ بێت بەندەیەکی فرۆشت بە زەیدی کوڕی حاریثە بە مەرجی بێ عەیبی، بە هەشت صەد درهەم، زەید عەیبێکی لێ دیەوە ویستی بیداتەوە بە ئیبنوعومەر ئەویش وەری نەگرتەوە، کێشەکەیان گەیاندەلای عوسمان رضي الله عنه عوسمان رضي الله عنه بە ئیبنو عومەری فەرموو: سوێند بخۆ تۆ بەو عەیبەت نەزانیوە، ئەویش ووتی: سوێند ناخۆم، بەندەکەیان دایەوە، دوای ئەوە ئیبنو عومەر فرۆشتیەوە بە هەزار درهەم (ئیمامی ئەحمەد و چەند کەسی تر گێڕاویانەتەوە).

ئیبنو قەییم فەرموویەتی: بەو کارە ڕێك کەوتنیان دەرخستووە لەسەر دروستی فرۆشتن ودروستی مەرجی بێ عەیبی دانان، وە هەروەها ڕێکەوتنی عوسمان و زەید دەرئەخات لەسەر ئەوەی کە فرۆشیار ئەگەر بە عەیبەکەی زانی مەرجی بێ عەیبی بۆی سوودی نیە.

**جیاوازی نێوان فرۆشیار و کڕیار:**

ئەگەر فرۆشیار وکڕیار جیاوازیان هەبوو لە نرخی شتەکەدا و شایەت لە نێوانیان نەبوو قسە قسەی فرۆشیارە لەگەڵ سوێند دانی. وە کڕیار موخەییەرە، لەنێوان ئەوەدا ئەو شتە وەربگرێ بەو نرخەی کە فرۆشیار ئەیڵێت یا سوێند بخوا کە بەو نرخە کەمتر لێم کڕیوە. جا ئەگەر سوێندی خوارد لە ملی ئەکەوێ و کەلوپەلەکە ئەدرێتەوە بە فرۆشیار، کەلوپەلەکە مابێت یا فەوتا بێت.

وە بنەمای ئەمەش بە پێی ئەوەیە کە ئەبوداود لە عبدالرحمن ی کوڕی قەیسی کوڕی ئەشعەثەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ئەشعەث بەندەیەکی لە دیلەکانی ناو پێنج یەك کڕی لە عبداللە بە بیست هەزار، عبداللە ناردی بۆ پارەکە، ئەشعەث ووتی: من بە دە هەزار لێم کڕیوی، عبداللە ووتی: پیاوێك هەڵبژێرە با بکەوێتە نێوانمان، ئەشعەث ووتی: خۆت لە نێوان خۆم و خۆتدابە، عبداللە ووتی: من گوێم لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بووە ئەی فەرموو: (إذا اختلف البیعان لیس بینهما بینة فهو ما یقول رب السلعة أو یتتارکان)

واتە: ئەگەر لەسەر نرخی فرۆشراوێك جیاوازی هەبوو لە نێوان فرۆشیار و کڕیاردا و شایەت لە نێوانیاندا نەبوو قسە قسەی خاوەن کەلوپەلە، یا پەیمانەکە هەڵئەوەشێننەوە[1]. (زانایانی ئیسلامی ئەم حەدیسەیان وەرگرتووە).

وە ئیمامی شافیعی فەرموویەتی: ئەم حەدیسە گشتی‌یە. و فرۆشیار و کڕیار وەك چۆن سوێند خواردنیان بۆ هەیە کاتێ لەنرخدا جیاوازیان هەبێت هەر بەو پێیە ئەگەر جیاوازیان هەبوو لە ماوە و مەرجی ویستن و ڕەهن و چەهماندا سوێند خواردنیان بۆ هەیە.

**حوکمی کڕین و فرۆشتنی (فاسد) تێك چوو:**

کڕین و فرۆشتنی صەحیح و دروست ئەوەیە کە ڕێك بکەوێت لەگەڵ فەرمانی یاسادانەردا و مەرجەکانی و ڕوکنەکانی بەجێ هاتبێ، بەوەش بوون بە مولکی فرۆشراوەکەو نرخەکەو سوود لێ وەرگرتنی ڕەوا ئەبێت.

بەڵام ئەگەر پێچەوانەی فەرمانی یاسادانەری ئیسلام بوو، ئەو فرۆشتنە دروست نی‌یە بەڵکو تێك ئەچێت و باتڵ ئەبێت.

کەواتە کڕین و فرۆشتنی (فاسد) ئەو فرۆشتنەیە کە ئیسلام داینەناوە، وە هەر لەبەر ئەوە نابەستری، وە نە سوودی حوکمی شەرعی هەیەو نە خاوەنێتی لەسەر پێك دێت با کڕیار وەریشی گرتبێ چونکە شتی قەدەغەکراو نابێت بە ڕێگا بۆ خاوەنێتی.

(قرطبي) فەرموویەتی: هەرچی بە ئاشکرا ناڕەوا بوو هەڵئەوەشێتەوە، وە لەسەر کڕیارەکەیە کەلوپەلەکە وەك خۆی بگێڕێتەوە، بەڵام ئەگەر بە دەستی‌یەوە لەناو چووبوو، ئەبێ نرخی ئەو شتە لەناو چووە بدات بە خاوەنی ئەگەر نرخی هەبوو، وەك خانووبەرە و شتی بازرگانی و ئاژەڵ، وە ئەبێ شتێکی وەك خۆی بۆ بگێڕێتەوە ئەگەر وەك خۆی هەبوو لە کێشانە و پێوانەدا وەك خواردەمەنی و شتی بازرگانی.

**قازانج لە فرۆشتنی فاسد دا:**

حەنەفی‌یەکان بۆ ئەوە چوون کە شتی فرۆشراو بە فرۆشتنی (فاسد) تێك چوو ئەگەر فرۆشیار نرخەکەی وەرگرتبوو مامەڵەی پێوە کردوو قازانجی کرد، ئەوە لەسەریەتی کە فرۆشتنەکە هەڵوەشێنێتەوە و نرخەکە بداتەوە بە کڕیارەکە و قازانجەکەش بکات بە خێر، چونکە لە ڕێگایەکەوە بەدەستی هێناوە کە قەدەغەی لێ کراوە بە دەقی قورئان و سوننەت.

---

(١) أحمد (١/٤٦٦) وأبو داود (٣٥١١) والنسائي (٧/٣٠٢و٣٠٣) وابن ماجة (٢١٨٦).

**لەناو چوونی فرۆشراوەکە پێش وەرگیران:**

١- هەرکاتێك شتە فرۆشراوەکە هەمووی یا هێندێکی پێش وەرگیران بەهۆی کڕیارەوە لەناو چوو، ئەوە مامەڵەکە هەڵناوەشێتەوە و هەر بەجێی خۆیەتی، وە کڕیار دەبێ هەموو نرخەکە بدات چونکە ئەو هۆکاری لەبەین بردن بووە.

٢- وە ئەگەر بە هۆی کەسێکی دیکەوە لەناو چووبێ کە بێگانەیە نە فرۆشیارە و نە کڕیارە، ئەوە کڕیار سەرپشکە لەبەینی هەڵوەشاندنەوە و لەبەینی پێ بژاردن بەوە کە لەناوی بردوە.

٣- مامەڵە هەڵ ئەوەشێتەوە هەرکاتێك هەموو شتە فرۆشراوەکە لەلایەن فرۆشیارەوە پێش وەرگیران، وە یان بە هۆی بەڵایەکی ئاسمانییەوە لەناو ببرێ.

٤- جا هەر کاتێك فرۆشیار هێندێك لە فرۆشراوەکەی لەناو برد ئەوە بە ئەندازەی ئەو بەشە لەناوچووە نرخەکەی لەسەر کڕیار لائەچێ

٥- بەڵام ئەگەر ئەو بەشە لەناوچووە بۆ خۆی لەناو چوو، ئەوە هیچی لەنرخەکەی کەم نابێتەوە و کڕیار لەبەینی هەڵوەشاندنەوە و لەبەینی هەڵگرتنی ئەوەی ماوە بە تەواوی نرخەکە سەرپشکە و ئارەزووی خۆیەتی.

٦- وە هەرکاتێك تیاچوونی فرۆشراوەکە بە بەڵایەکی ئاسمانی بێ، ئەوە بە ئەندازەی لەناوچوونەکە لەنرخەکەی کەم ئەبێتەوە، جا کڕیار بە ئارەزووی خۆیەتی مامەڵەکە هەڵ ئەوەشێنێتەوە یان ئەوەی ماوە بە گوێرەی نرخەکەی هەڵی ئەگرێ.

**تیا چوونی فرۆشراوەکە دووای وەرگیران:**

هەرکات دوای وەرگیران فرۆشراوەکە لەناوچوو، لەزمانەتی کڕیاردایە، جا ئەگەر فرۆشیار مافی هەڵوەشاندنەوەی نەمابوو ئەوە نرخەکەی لەکڕیار دەسەندرێ، بەڵام ئەگەرفرۆشیار مافی هەڵوەشاندنەوەی مابوو ئەوە یان ئەو پارە ئەداتەوە کە لێی وەرگرتووە یان شتێکی وەك ئەو شتە لەناو چوەی ئەداتێ.

**نرخ دانان (التسعیر):**

**واتاکەی:**

نرخ دانان ئەوەیە کە نرخێکی دیاری کراو دابنرێت بۆ ئەو کەلوپەلانەی ئەویستری بفرۆشرێت بە شێوەیەك کە ستەم لەخاوەن شت نەکرێت و کڕیار بارگران نەکرێت.

**قەدەغە کردنی:**

خاوەن سونەنەکان بە سەنەدێکی صحیح ئەگێڕنەوە لە ئەنەسەوە ﷺ کە فەرموویەتی: خەڵکی ووتیان: ئەی نێرراوی خوا، نرخی شتومەك بەرزبۆتەوە نرخمان بۆ دابنێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إن الله هو المسعِّر، القابض الباسط الرازق، وإني لأرجوا أن ألقي الله وليس أحدٌ منكم يطالبني بمظلمة في دم ولامال)[1].

واتە: بە ڕاستی هەر خوا دانەری نرخ و ڕۆزی گرو فراوانکەر و ڕۆزی دەرە. وە من هیوام ئەوەیە بگەم بە خواو کەس لە ئێوە شتێکی لەسەرم نەبێت داوام لێ بکات نە لەخوێندا و نە لەماڵدا، زانایان لەم فەرموودەیەدا ئەوەیان دەرهێناوە کە حەرامە بۆ کاربەدەستی میری کە نرخی کەلوپەل دابنێت، چونکە ئەوە گومانی ستەمی تێدایە.

وە خەڵك ئازادن لە مامەڵە کردنداو سنوور بۆدانانیان پێچەوانەی ئەو ئازادی‌یەیە.

وە پاراستنی بەرژەوەندی کڕیار لەپێشتر نی‌یە لە پاراستنی بەرژەوەندی فرۆشیار.

جا کاتێ هەر دوو بەرژەوەندی وەك یەك پێویست بوو ئەبێ هەردوو لا هەوڵی ئەوە بدەن کە کەسیان ئەوی تریان تووشی زیان نەکات.

شەوکانی فەرموویەتی: خەڵکی ماڵەکانیان لە ژێر دەستی خۆیاندایە، وە نرخ بۆ دانانیان ڕێ لێ گرتنە بۆیان وکار بەدەستی موسوڵمانان ئەبێ چاوی لەبەرژەوەندی موسوڵمانانەوە بێت، وە لەبەر چاوگرتنی بەرژەوەندی کڕیار بۆ کەم کردنی نرخ لە پێشتر نی‌یە لە لەبەر چاوگرتنی بەرژەوەندی فرۆشیار بۆ زیاد کردنی نرخ لە بازاڕدا.

وە کاتێك هەردوو بەرژەوەندی‌یەکە بەرامبەر بوون پێویستە کە هەردوولا ڕێگایان پێ بدرێ کە هەوڵ بۆ خۆیان بدەن، چونکە بە زۆر سەپاندن بە سەر خاوەن کەلوپەلدا کە کەلوپەلەکەی بەو نرخە بفرۆشێت کە خۆی پێی ڕازی نی‌یە پێچەوانەی فەرموودەی خوای گەورەیە کە ئەفەرموێت: ﴿إِلاَّ أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ﴾ (النساء:٢٩) واتە:

مەگەر ئەو شتە بازرگانی بێت و بە ڕەزامەندی خۆتان بێت.

پاشان نرخ دانان ئەبێتە هۆی شاردنەوەی کەلوپەل، وە ئەوەش ئەبێتە هۆی بەرز بوونەوەی نرخی شت، وە بەرزبوونەوەی نرخیش زیان لە هەژاران ئەدات چونکە ناتوانن ئەو شتانە بکڕن، لەکاتێکدا دەوڵەمەندەکان توانای کڕینی کەل و پەلیان هەیە لەو بازارە نادیارەدا بە نرخێکی زۆر گران، جا بەو شێوەیە هەردوولا ئەکەونە تەنگی و گیر و گرفتەوە وبەرژەوەندیان بەجێ نایەت.

---

(١) أحمد (٣/٢٨٦) وأبوداود (٣٤٥١) والترمذي (١٣١٤) وإبن ماجة (٢٢٠٠).

**نرخ دانان لە کاتیَ پێویستیدا:**

بەڵام ئەگەر بازرگانەکان کەوتنە ستەمکاری و زیادەڕەوی بە شێوەیەك زیانی گەیاند بە بازار، لەسەر حاکم پێویستە خۆی هەڵبقورتێنیَ ونرخ دابنێت بۆ پاراستنی مافی خەڵك، وە بۆ ئەوەی قۆرخ کردن (احتکار) دروست نەبێت وخەلکی لە لایەن بازرگانانەوە ستەمیان لیَ نەکریَ.

لەبەر ئەوە ئیمامی مالیك ڕای وایە دروستە نرخ دانان، وەك چۆن هەندیَ لە شافیعیەکان بە دروستی ئەزانن کاتی بەرز بوونەوەی نرخ، وە وەك چۆن کۆمەڵێك لە ئیمامە زەیدیەکان ڕۆیان داوە بۆ زۆرێك لە کەلوپەلەکان، لەوانە سەعیدی کوڕی موسەیب و ڕەبیعەی کوڕی عبدالرحمن و یەحیای کوڕی سەعیدی ئەنصاری، هەموویان ڕایان وایە کە دروستە نرخ دابنرێت کاتیَ بەرژەوەندی کۆمەڵ پێویست بکات.

خاوەنی کتێبی (الهدایة) وتویەتی:

وە پێویست نیە لەسەر سوڵتان نرخ بۆ خەڵك دابنێت، بەڵام ئەگەر خاوەن خۆراکەکان زیادەڕەویان کرد لە نرخدا بە شێوەیەکی خراپ، وە قازی نەیتوانی بەرژەوەندی موسوڵمانان بپارێزێت بە نرخ دانان نەبێت، ئەو کاتە خراپ نیە ئەگەر ڕاوێژ بە کەسانی خاوەن ڕاوێژکار بکات.

**قۆرخ کردن (الإحتکار):**

**پێناسەکەی :**

(إحتکار) کڕینی شتومەکە لەبازاڕو شاردنەوەو بەندکردنیەتی بۆ ئەوەی ئەو شتە کەم بێتەوە لەناو خەڵکدا و نرخەکەی بەرز بێتەوە[1]، بەهۆی ئەوەوە خەڵك تووشی زیان بێت.

**حوکمی قۆرخ کردن :**

یاسادانەری ئیسلام قۆرخ کردنی حەرام کردووە و قەدەغەی کردووە لەبەر ئەوەی تەماع و چڵێسی و بەدڕەوشتی تێدایەو باری خەڵك گران ئەکات.

---

(١) هەندیَ لە زانایان ئەو ماددانەیان تەنگ کردۆتەوە کە ئیحتیکاری تێدا ئەکریَ. شافیعی و ئەحمەد ڕایان وایە کە ئیحتیکار تەنها لە خواردەمەنیدایە چونکە بژێوی خەڵکە. وە هەندێکی تر لە زانایان فراوانیان کردووە. وە ڕایان وایە کە ئیحتیکار لەهەر شتێکدا بێت هەر حەرامە لەبەر زەرەرو زیانەکەی چونکە نرخەکە یەکسان نابێت لەگەڵ کەلوپەلە دەست بەسەراگیراوەکەدا، وە هەندێك ڕایان وایە ئەگەر دەست بگریَ بەسەر چاندنی خۆی یا پیشەی دەستی خۆیدا قەیناکا.

١- ئەبوداود و (ترمذي) و موسلیم لە موعەممەرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من احتكر فهو خاطيء)[1]. واتە: هەرکەس شتێك ئیحتیکار بکات تاوانبارە

٢- وە ئەحمەد و حاکم و ئیبنو ئەبی شەیبە و بەززار ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من احتكر الطعام أربعين ليلة فقد بريء من الله وبريء الله منه)[2].

واتە: هەرکەس خواردەمەنی چل ڕۆژ قورخ بکات لەخوا بەرییە و خواش لەو بەرییە.

٣- وە ڕەزین لە کتێبی (الجامع)دا باسی ئەوەی کردووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (بئس العبد المحتكر: إن سمع برخص سائه وإن سمع بغلاءٍ فرح)[3].

واتە: خراب ترین بەندەی خوا قورخ کەرە: کاتێ بیستی شت هەرزان بووە دڵتەنگ ئەبێت وە کاتێ بیستی نرخ بەرز بۆتەوە دڵخۆش ئەبێت.

٤- وە ئیبنو ماجە و حاکم ئەگێڕنەوە لە ئیبنو عومەرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الجالب مرزوق، والمحتكر ملعون)[4].

واتە: ڕۆزی هێنەر لەلایەن خواوە ڕۆزیدار ئەبێت، و قورخکەریش لەلای خواوە نەفرینی لێ کراوە.

٥- وە ئەحمەد و طەبەرانی لە مەعقەلی کوڕی یەسارەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من دخل في شيءٍ من أسعار المسلمين لِيُغْلِيَهُ عليهم كان حقاً على الله تبارك وتعالى أن يقعده بِعُظْم من النار يوم القيامة)[5]. واتە:

هەرکەس خۆ هەڵقورتێنێ لەشتێکدا کە نرخ لەسەر موسڵمانان زیاد بکات مافی خوایە کە لەناو ئاگردا دایبنیشێنێ لەڕۆژی دواییدا.

**ج کاتێك (إحتكار) حەرامە؟ :**

زۆر لەزانایانی ئیسلام بۆ ئەوە چوون ئەو دەست بەسەرا گرتنەی کە حەرامە پێویستە ئەم سێ مەرجانەی لای خوارەوەی تێدا بێت:

---

(١) مسلم (١٦٠٥) وأبوداود (٣٤٤٧) والترمذي (١٢٦٧) وابن ماجة (٢١٥٤).

(٢) أحمد (٢/٣٣) والحاكم (٢/١٢) وأبو يعلى (١٠/٥٧٤٦) ومجمع الزوائد (٤/١٠٠).

(٣) البيهقي في شعب الإيمان (١١٢١٥) وابن عدي (٢/٥٣٠).

(٤) إبن ماجة (٢١٥٣) والحاكم (٢/١١).

(٥) أحمد (٥/٢٧) والحاكم (٢/١٢) ومجمع الزوائد (٤/١٠١).

١- ئەبێ ئەو شتە دەست بەسەرا گیراوە لەخۆی و ئەوانەی بەخێویان ئەکات زیاد بێت بۆ ماوەی یەك ساڵ، چونکە دروستە ئادەمیزاد نەفەقەی ساڵێکی خۆی و خێزانی دابنێت، وەك پێغەمبەر ﷺ ئەیکرد.

٢- ئەبێ چاوەڕوانی ئەو کاتەی کردبێت کە نرخی شتومەك بەرز ئەبێتەوە بۆ ئەوەی بە نرخێکی زۆر گران بیفرۆشێت، چونکە خەڵك زۆر پێویستیان پێی هەیە.

٣- ئەبێ ئەو قورخ کردنە کاتێك بێت کە خەڵك پێویستیان بە شتە قورخ کراوەکە هەبێت وەك خواردەمەنی و جل و بەرگ و شتی تر، چونکە ئەگەر ئەو شتانە لای چەند بازرگانێك بن، بەڵام خەڵك پێویستیان پێی نەبێت. ئەوە بە ئیحتیکار دانانرێت لەبەر ئەوەی بەو شێوەیە زیان بە کەس ناگات.

سەرپشکی لە مامەڵەدا (الخیار):

(خیار) داواکردنی هەڵبژاردنی یەکێك لەدوو ڕێگایە، یا پێك هێنانی پەیمانەکە، یا هەڵوەشاندنەوەی، ئەمیش چەند جۆرێکە وا لە خوارەوە باسیان ئەکەین:

سەرپشکی ناو کۆڕ (خیار المجلس):

کاتێ دانان و وەرگرتن (إیجاب و قبول) بە ئەنجام گەیشت لە فرۆشیار و کڕیارەوە، وە پەیمانەکە تەواوبوو هەر یەکیان مافی ئەوەی هەیە پەیمانەکە هەڵوەشێنێتەوە، یا بەجێی بگەیەنێت مادام لە کۆڕدابن (کۆڕی پەیمانەکە)بە مەرجێك پەیمانەکەیان لەسەر ئەوە نەبەستبێت کە (خیار) هەڵبژاردن نەبێت.

چونکە جاری وائەبێت یەکێ لە دوو لایەنەکە پەلە ئەکات لە (إیجاب) و (قبول)دا، پاشان بۆی دەرئەکەوێت کە بەرژەوەندی لەوەدایە پەیمانەکە بەجێ نەگات.

جا بۆیە یاسادانەری ئیسلام ئەو مافەی داوەتێ کە سەرپشك بێت نەوەك بەرژەوەندی لە دەست بچێت بەهۆی پەلەکردنەوە.

بوخاری و موسلیم لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (البیّعان بالخیار مالم یتفرّقا، فإن صَدَقا وبیّنا بورك لهما في بیعهما، وإن کتما وکذَبا مُحقت برکة بیعهما)[1].

(١) البخاري (٢٠٧٩) ومسلم (١٥٣٢).

واتە: فرۆشیار و کڕیار هەردوولا سەرپشکن بۆ بەئەنجام گەیاندنی پەیمانەکە مادام لەیەك جیا نەبوونەوە، جا ئەگەر لەگەڵ یەکدا ڕاست بن و عەیبی شاراوەی شتەکەیان دەرخست خوا بەرەکەت و فەڕ ئەخاتە مامەڵەکەیانەوە، بەڵام ئەگەر نەنگە شاراوەکەیان شاردەوە و درۆیان کرد لەگەڵ یەکدا، خوا بەرەکەت و فەڕی مامەڵەکەیان ناهێڵێ.

واتە: هەردوولا مافی ئەوەیان هەیە پەیمانەکە بەردەوام بکەن یا هەڵی وەشێننەوە بەمەرجێ لەیەك جیا نەبوبنەوە بە لاشە، جیابوونەوەش لە هەر حاڵەتێکدا بەپێی خۆی دائەنرێت، جا لە خانوویەکی بچوکدا بەوە ئەبێت یەکێکیان بچێتە دەرەوەوە، وە لە خانووی گەورەدا بە جێ گۆڕینیەکێکیان یا هەردووکیان بۆ ماوەی دوو یا سێ هەنگاو. جا ئەگەر هەردووکیان بە یەکەوە هەڵسان یا ڕۆیشتن سەرپشکیەکە هەر ئەمێنێت. بەڵام ئەوەی ڕاستر بێت ئەوەیە جیابوونەوە ئەگەڕێندرێتەوە بۆ عورف و عادەت، جا ئەوەی کە لەعورفدا بەجیابوونەوە بزاندرێت ئەوە جیابوونەوەیە، وە ئەگەر نە، نا.

بەیهەقی لەعبداللە ی کوڕی عومەرەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:ماڵێکم فرۆشت بە گەورەی موسڵمانان عثمانی کوڕی عەفان ﷺ بە ماڵێکی‌کە لە خەیبەر هەیبوو، کاتێ مامەڵەکەمان تەواوکرد پاشە ڕپاش گەڕامەوە هەتا لە ماڵەکەی چوومە دەرەوە لەترسی ئەوەی نەك پەشیمان بێتەوە. وە سوننەت وابووە کە کڕیار و فرۆشیار سەرپشکن لە مامەڵەکەیاندا هەتا لێك جیا نەبنەوە.

جەماوەری زانایان لە صەحابە و تابیعی بۆ ئەوە چوون، وە شافیعی و ئەحمەدیش لەسەر ئەوە ڕۆیشتون وە فەرموویانە: سەرپشکی ناوکۆڕ سابتە لە فرۆشتن و صولح و حەواڵە و بەکرێداندا، وە لەهەموو پەیمانەکانی ئاڵوگۆڕدا کە مەبەست تێیدا ماڵ بێت[1]. بەڵام پەیمانی زەواج و (خلع)، سەرپشکی کۆڕ تێیدا سابت نیە، وە هەروەها ئەو پەیمانەی کە ئەنجامدانیان واجب نیە وەك موضارەبە و شەریکایەتی و وەکالەت.

---

(١) ئەبو حەنیفەو مالیك جیاوازیان کردووەو فەرموویانە: سەرپشکی ناو کۆڕ باتڵە. وە (عقد) پەیمان بە قسە بەسەر سابت ئەبێ، وە ئەگەر فرۆشتنەکە پێك هات ئیتر کەسیان (خیار) سەرپشکی بۆ نیە با هەر لە کۆڕەکەشدا بن. وە ئەوان جیابوونەوەی ناو فەرمودەکە بە جیابوونەوە لە قسەدا دائەنێن.

**ج کاتێك سەرپشکی نامێنێت:**

سەرپشکی بە مەرج دانراو لانەچێت کاتێ هەردووکیان ئەو مەرجە لابەرن دووای عەقدەکە، بەڵام ئەگەر یەکێکیان لای بەرێت ئەوەی تریان هەر سەرپشکی بۆ ئەمێنێتەوە، هەروەها بە مردنی یەکێکیان دائەبڕێت و نامێنێ.

**هەڵبژاردنی مەرج (خیار الشرط):**

هەڵبژاردنی مەرج ئەوەیە کە یەکێك لە دوولایەنەکە شتێك بکرێت بەو مەرجەی سەرپشکی بۆ هەبێت تا ماوەیەکی دیاریکراو، با ماوەکە درێژیش بێت[1]، ئەگەر ویستی پەیمانەکە بەجێ بگەیەنێت لەو ماوەیەدا، وە ئەگەر نەیویست هەڵی وەشێنێتەوە.

وە ئەو مەرجە بۆ هەردوولا دروستە، وە بۆ یەکێکیان ئەگەر بەمەرجی دانابوو،

وە بنەمای دانرانی لە یاسای ئیسلامدا ئەمانەی خوارەوەیە:

١- بەپێی ئەوەی هاتووە لە ئیبنو عومەرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (کل بیِّعین لابیع بینهما حتی یتفرقا إلا بیع الخیار)[2]. واتە: کڕین و فرۆشتنەکە ناسەپێ هەتا لەیەك جیانەبنەوە مەگەر هەردوولایان یا لایەکیان مەرجی سەرپشکی دانابێت بۆ ماوەیەکی دیاری کراو.

٢- وە هەر لەوەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا تبایع الرجلان فکل واحدٍ منهما بالخیار مالم یتفرقا وکانا جمیعاً، أو یخیر أحدهما الآخر فیتبایعا علي ذلك فقد وجب البیع). (رواه الثلاثة)[3]. واتە: ئەگەر دوو پیاو مامەڵەیەکی کڕین و فرۆشتن کەوتە نێوانیان هەریەکەیان سەرپشکە بۆ هەڵوەشاندنەوەی یا دامەزراندنی هەتا هەردووکیان بەیەکەوە بن و لەیەك جیانەبونەوە، یا کەسێکیان کەسەکەی تریان بکاتە سەرپشکی هەڵگرتنەوەی فرۆشراوەکە ئەو کاتە سەوداکەیان پێك دێت.

وە هەر کاتێك ماوە دیاری کراوەکە تەواو بوو، وە مامەڵەکە هەڵنەوەشایەوە، ئەوە سەوداکەیان پێك دێت.

---

(١) ئەمە مەزهەبی ئەحمەدە. وە ئەبو حەنیفەو شافیعی بۆ ئەوە چوون کە ماوەی سەرپشکی سێ ڕۆژ کەمتر لەوەیە. وە مالیك وتوویەتی: ماوەکە بەپێی پێویست دائەنرێت.

(٢) البخاري (٢٠٠٩) ومسلم (١٥٣١/٤٣).

(٣) أحمد (٢/١١٩) والبخاري (٢١١٢) ومسلم (١٥٣١).

سەرپشکی بە قسە هەڵئەوەشێتەوە، وەك چۆن بە تەسەرروفی کڕیار بە کەلوپەلەکەوە هەڵ ئەوەشێتەوە، بە وەقف کردنی، یا بەخشین، یا نرخ دانان لەسەری، چونکە ئەمانە بەڵگەی ڕەزامەندیەقینە، وە هەتا سەرپشکی بۆ هەبێ تەسەرروفی بەسەردا نامێنێ.

سەرپشکی لە بوونی عەیبدا (خیار العیب):

حەرامی شاردنەوەی عەیب کاتی فرۆشتن:

حەرامە لەسەر ئادەمیزاد کەلوپەلێکی عەیبدار بفرۆشێت و باسی عەیبەکەی نەکات بۆ فرۆشیار.

١- لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە هاتووە کە ووتویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە ئەیفەرموو: (المسلم أخو المسلم، لایحل لمسلم باع من أخیه بیعاً وفیه عیب إلابینه). (رواه أحمد وابن ماجه والدارقطني والحاکم والطبراني)[1].

واتە: موسڵمان برای موسڵمانە، دروست نی‌یە بۆ موسڵمان شتێك بە براکەی بفرۆشێت عەیبی تێدا بێت و دەری نەخات.

وە عەددائی کوڕی خالید فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ نووسی بۆم: ئەمە کڕینی عەددائی کوڕی خالیدی کوڕی هوژەیە بەندەیەکی یا کەنیزێکی کڕی لە محمد ﷺ نێرراوی خوا، نە نەخۆشی هەیە و نە نەنگی هەیە، و نە خووڕەوشتی پیسی هەیە، فرۆشتنی موسڵمان بە موسڵمان[2].

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من غشنا فلیس منا)[3].

واتە: هەرکەس گزیمان لێ بکات لە ئێمە نی‌یە.

حوکمی فرۆشتن لەگەڵ بوونی عەیبدا:

وە هەرکاتێك پەیمان تەواو بوو، وە کڕیار بە عەیبی شتە فرۆشراوەکەی ئەزانی، ئەو پەیمانە سەپاوە و سەرپشکی تێدانی‌یە چونکە خۆی ڕازی بووە پێی.

بەڵام ئەگەر کڕیار بە عەیبەکەی نەزانی بوو لەپاش پەیمان بەستنەکە پێی زانی پەیمانەکە لەخۆیدا دروستە و هەڵناوەشێتەوە، بەڵام سەپاو نی‌یە بەسەر کڕیاردا.

---

(١) أحمد (٤/١٥٨) وابن ماجة (٢٢٤٦) والحاکم (٢/٨) والبخاري تعلیقاً (٤/٣٠٩) ومجمع الزوائد (٤/٨٠).

(٢) الترمذي (١٢١٦) وابن ماجة (٢٢٥١).

(٣) أحمد (٢/٢٤٢) ومسلم (١٠٢/١٦٤) وأبوداود (٣٤٥٢) والترمذي (١٣١٥) وابن ماجة (٢٢٢٤).

وە ئارەزووی خۆیەتی کڕراوەکە ئەگێڕێتەوە و نرخەکەی وەرئەگرێتەوە ئەونرخەی داویەتی بە فرۆشیار، یا هەڵیئەگرێ و ئەوەندەی کەم و کوڕی عەیبەکە نرخەکە لە فرۆشیار وەرئەگرێتەوە، مەگەر خۆی پێی ڕازی بێت یا شتێك بکات بەڵگەی ڕازی بوونی بێت وەك ئەوەی بیەوێ بیفرۆشێتەوە یا بەکاری بهێنێ یا تەسەررووفی تێدا بکات.

ئیبنومنزیر فەرموویەتی: حەسەن و شورەیح و عبداللە ی کوڕی حەسەن و ئیبنوئەبی لەیلا و پەوری وخاوەن ڕاکان فەرموویانە: کاتێ کەسێك شتێکی کڕی و خستیە پێش چاو بۆ فرۆشتن دووای ئەوەی بە عەیبەکەی زانی سەرپشکی بۆ کڕین یا پەشێمان بوونەوە نامێنێ. ئەمەش قسەی شافیعی خۆیەتی.

**کێشەی نێوان کڕیار و فرۆشیار :**

هەرکاتێ کێشە کەوتە نێوان کڕیار و فرۆشیار لەسەر شتێك کە لای کڕیار عەیبی تێدا دەرکەوتبێت یا ڕەنگە وانەبێت و پێش فرۆشتنەکە ئەو عەیبەی هەبوو بێت، بەڵام شایەت لە نێوانیان نەبێت، قسە قسەی فرۆشیارە دوای سوێند خواردنی، عوسمان ﷺ بەوە کاری کردووە.

وە ووتراویشە: قسە قسەی کڕیارە دوای سوێند خواردنی وە ئەبێ شتەکە بگێڕێتەوە بۆ فرۆشیار.

**کڕینی هێلکەی تێك چوو:**

هەرکەس هێلکەی مریشکی کڕی و شکاندی سەیری کرد پیس بووە، نرخەکە هەمووی لە فرۆشیار ئەسێنێتەوە ئەگەر ئارەزوو بکات، چونکە پەیمانەکە لەم شێوەیەدا فاسیدە، وە لەسەری نی‌یە هێلکەکان بباتەوە بۆ فرۆشیار چونکە بێ کەڵکن.

**سوود و کەڵك بە (ضمان) دەستەبەرییە:**

ئەگەر پەیمانی کڕین وفرۆشتنەکە هەڵوەشایەوە وفرۆشراوەکە ئەو ماوەیەی لای کڕیار بوو سوودێکی گەیاند، ئەو سوودە بۆ کڕیار ئەبێت.

لە عائیشەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الخراج بالضمان) (رواه أحمد وأصحاب السنن وصححه الترمذي)[1].

واتە: ئەو سوودەی لە فرۆشیار بەدی دێت مافی کڕیارە، چونکە ئەگەر لەناو چوو ئەم (ضامن) دەستەبەریەتی و ئەبێ بیبژێرێت.

(١) أحمد (٦/٤٩) وأبوداود (٣٥٠٨) والترمذي (١٢٨٥) والنسائي (٧/٢٥٤) وابن ماجة (٢٢٤٣).

چونکە ئەگەر وڵاغێکی کڕی و چەند ڕۆژێك بەکاری هێنا لەپاشاندا کۆنە عەیبێکی لێ دەرکەوت بە قسەی کەسانی خاوەن خیبرە عەیبی کۆن بوو، کڕیار بۆی هەیە پەیمانەکە هەڵوەشێنێتەوە و مافی ئەو بەکار هێنانەشی هەیە بێ‌ئەوەی هیچ بدات بە فرۆشیار لەجیاتی.

لە هەندێ گێڕراوەدا هاتووە: کە پیاوێك غوڵامێکی کڕی لە پیاوێك، ماوەیەك کاری پێ‌کرد لەپاشاندا سەیری کرد عەیبێکی تێدایە، گێڕایەوە بۆ فرۆشیار لەبەر عەیبەکە، فرۆشیار داوای کرێی ماوەی کار پێ کردنی غوڵامەکەی لێ کرد. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (الغلة بالضمان) (ئەبوداود گێڕاویەتی‌یەوەو ووتویەتی ئیسنادەکەی وانی‌یە)[1].

واتە: کڕیار دەستەبەرە بۆ فرۆشراوەکە لەبەر ئەوەی کرێی ماوەی بەکارهێنانی ناچێتە سەر.

سەرپشکی بەهۆی شاردنەوەی عەیب لە فرۆشراودا:

حەرامە لەسەر فرۆشیار بە شتێك سەر لەکڕیار تێك بدات و زیادی لێ بستێنێ، وە لەو شێوەیەدا کڕیار ماوەی سێ ڕۆژی بۆ هەیە ئەو شتە بگێڕێتەوە، وە ئەڵێن: ئەبێ خێرا بۆی بگێڕێتەوە.

حەرامی‌یەکە لەبەر گزی و فێڵ کردنێتی، وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من غشنا فليس منا)[2].

واتە: هەرکەس گزیمان لێ بکا لە ئێمە نی‌یە.

ئەما مافی گێڕانەوەکە بۆ کڕیار لەبەر ئەوەی ئەبوهورەیرە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا تُصرُّوا الإبل والغنم، فمن ابتاعها فهو بخير النظرين بعد أن يحلبها، إن شاء أمسك وإن شاء ردها وصاعاً من تمر)[3]. (رواه البخاري ومسلم).

واتە: شیری گوانی ووشتر و مەڕەکانتان قەتیس مەکەن بۆ ئەوەی گوانیان زل و گەورە دەرکەوێت، ئینجا بیان فرۆشن، جا هەرکەس بیان کڕێت، دوای ئەوەی دۆشی بۆی دەرکەوت بەو شێوەیە نی‌یە ئارەزووی لێ بێت ئەو شتەی ئەوێت و ئارەزووی کرد ئەی گێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی لەگەڵ صاعێك خورمادا.

ئیبنو (عبدالبر) فەرمویەتی: ئەم فەرموودەیە بناغەی قەدەغەکردنی گزی وفێڵە، وە بناغەیە لەوەدا کە -غەش و گزی کردن- بنەڕەتی فرۆشتن هەڵناوەشێتەوە، هەروەها بناغەیە لەوەدا کە

(١) أحمد (٦/ ٨٠،١١٦،١٦١) وأبوداود (٣٥١٠) بلفظ (الخراج بالضمان).

(٢) تەخریجەکەی ڕابوورد.

(٣) البخاري (٢١٤٨/ ٢١٥١) ومسلم (١٥٢٤/ ٢٦و٢٨).

ماوەی هەڵبژاردن سێ ڕۆژە، هەروەها بناغەیە بۆ حەرامی شیر قەتیس کردن، وە ئەو (خیار) سەرپشکی‌یە بەوە سابت ئەبێ.

بەڵام ئەگەر سەر لێ تێك دانەکە لە فرۆشیارەوە بوو بێ ئەوەی مەبەستی ئەوە بێت، حەرامی‌یەکە نامێنێ بەڵام سەرپشکی‌یەکە بۆ کڕیار هەر ئەمێنێ نەك تووشی زیان بێت پێی.

**سەرپشکی بەهۆی (غَبْن) فێڵ کردن لە کڕین و فرۆشتندا:**

غەبن جاری واهەیە بە نیسبەت فرۆشیارەوە ڕوو ئەدات، وەك ئەوەی شتێك بایی پێنج بێت، ئەیفرۆشێت بە سێ.

وە جاری واهەیە بە نیسبەت کڕیارەوە ڕوو ئەدات، وەك ئەوەی شتێك ئەکڕێت بایی سێ‌یە ئەو پێنج ئەدات بە فرۆشیار.

جا ئەگەر کەسێك شتێکی فرۆشت یا کڕی و تووشی غەبن بوو، بۆی هەیە پەشێمان بێتەوە لە فرۆشتنەکەدا وپەیمانەکە هەڵبوەشێنێتەوە، بە مەرجێ نرخی ئەو کەلوپەلانەی نەزانیبێت وچاك نەزانێ دەست بە شتەوە بگرێت.

چونکە لەم شێوەیەدا خەڵەتاندنی تیا ئەبێت کە پێویستە موسوڵمان لێی دوور بێت، جا ئەگەر ئەوە ڕووی دا سەرپشکە یا پەیمانەکە بەجێ ئەگەیەنێت یا هەڵی ئەوەشێنێتەوە.

بەڵام ئایا ئەو سەرپشکی‌یە بە غەبنی ڕووتی ئەچەسپێ؟

هەندێ لە زانایان بەستویانەتەوە بە غەبنی لەڕادە بەدەر، وە هەندێکیان بەستویانەتەوە بەوەوە کە بگاتە سێ‌یەکی نرخی شتەکە، وە هەندێ بەستویانەتەوە بە غەبنی ڕووت وپەتی‌یەوە.

وە ئەوانەش بۆیە بەو شێوەیە بەستویانەتەوە، چونکە فرۆشتن نی‌یە بێ غەبن بێت، بەڵام کەمەکەی چاوپۆشی لێ ئەکرێ بەپێی عادەت.

وە لەپێشترین ڕاکان ئەواەیانە کە بەستویەتی‌یەوە بە عورف وعادەتەوە، جا هەرچی بەپێی عادەت بە غەبن دانرا ئەوە (خیار) سەرپشکی تێدا سابت ئەبێ، وە هەرچی عورف وعادەت بە غەبنی دانەنا سەرپشکی تێدا ناچەسپێ.

ئەمەش مەزهەبی ئەحمەد ومالیکە، وە بەڵگەشیان لەسەر ئەوە ئەوەیە کە بوخاری وموسلیم گێڕاویانەتەوە لە ئیبنوعومەرەوە خوایان لێ ڕازی بێت فەرمویەتی: باسی پیاوێکیان کرد بۆ

پێغەمبەر ﷺ کە ناوی حەببانی کوڕی مونقیز بوو کە لە کڕین وفرۆشتندا ئەخەڵەتێنرێت. پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: (إذا بايعت فقل: لاخِلابَةَ)[1]. واتە: ئەگەر مامەڵەی کڕین وفرۆشتنت کرد بڵێ: بێ خەڵەتاندن.

ئیبنوئیسحاق لە ڕیوایەتی یونسی کوڕی بەکیر وعبدالأعلی ئەمەی زیاد کردووە لەو حەدیسەی ئیبنوعومەرەو: (ثم أنت بالخيار في كل سلعة ابتعتها ثلاثة ليال، فإن رضيت فأمسك، وإن سخطت فاردد)[2].

واتە: پاشان تۆ سەرپشك بە تا سێ ڕۆژ لەهەر شتێکدا کە کڕیوتە، ئەگەر پێی ڕازی بویت باشە ئەگینا ئەگەر پێت ناخۆش بوو پەشێمان ببەرەوە.

وە ئەو پیاوە هەر مایەوە هەتا خەلافەتی عوسمان ﷺ تەمەنی صەدوسی ساڵ ئەبوو.

هەتا لەسەردەمی عوسمان دا ﷺ خەڵك زیادی کرد وزۆربەیان نەیان ئەناسی جا ئەگەر شتێکی بکڕیایە پێیان بوتایە: خەڵەتاوی، شتەکەی ئەبردەوە بۆ خاوەنی، پیاوێك لە صەحابە شایەتی بۆ ئەدا کە پێغەمبەر ﷺ هەتا سێ ڕۆژ مۆڵەتی سەرپشك بوونی پێ داوە.

وە جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون کە سەرپشکی بە غەبن ناچەسپێ بەپێی گشتێتی بەڵگەکانی کڕین و فرۆشتن و جێبەجێ بوونیان بێ ئەوەی جیا کرابێتەوە لە نێوان ئەوەی غەبنی تێدا بووە و ئەوەی تێیدا نەبووە.

وە وەڵامی فەرموودەکەی پێشوریان بەوە داوەتەوە کە ئەو پیاوە کەم عەقڵ بووە، هەر چەندە کەم عەقڵیەکەی لە سنووری شت جیاکردنەوەی دەرنەکردبوو، جا بەوە تەسەروفی وەك منداڵێکی جیاکەرەوەی لێ هاتبوو کە ڕێی بازرگانی پێدرابێت، لەبەر ئەوە بە غەبن هەڵبژاردنی بۆ سابت ئەبێ، وە چونکە پێغەمبەر ﷺ فێری کردبوو کە بڵێت: بێ خەڵەتاندن، ئەمەش ئەچێتە بەشی هەڵبژاردن بە مەرج (خيار الشرط).

بەرگرتنی (جلب) ئەو کەلوپەلانەی ئەهێنرێ:

وە لە شێوەکانی غەبن بەرگرتنە لە جەڵەب، ئەوەش بە شێوەیەکە کاتێ کۆمەڵێ کەلوپەل و باری بازرگانێك نزیك ئەبێتەوە لە شار پێش ئەوەی بچێتە ناوشار ونرخی شت بزانن، پیاوێك پێیان ئەگات وشتەکانیان بە هەرزانتر لە کەلوپەلی بازرگانی ناو شار لێ ئەکڕێت، جا ئەگەر ئەوەیان بۆ

---

(١) البخاري (٢١١٧) ومسلم (١٥٣٣/٤٨).

(٢) البخاري في تأريخه (١٧/٢/٤) والترمذي (٥٥/٣) وابن ماجه (٢٣٥٥).

دەرکەوت سەرپشکی‌یان بۆ هەیە لە پێك هاتن یا پەشێمان بوونەوە، بۆ ئەوەی تووشی زیان نەبن، بە پێی ئەوەی موسلیم لە ئەبوهورەیرەوە ئەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردبوو چوونە پێش جەلەب وئەی فەرموو: (لاتلقوا الجلب، فمن تلقاه فاشترى منه، فإذا أتى السوق فهو بالخيار)[1].

واتە: مەچنە پێش جەلەب، هەرکەس چووە پێشیان وشتێکی لێ کڕین، ئەگەر هاتنە ناو شار ئارەزووی خۆیانە مامەڵەکە پەسەند ئەکەن یا پەشێمان ئەبنەوە.

وە ئەو قەدەغە کردنەی پێغەمبەر ﷺ بۆ حەرامی ئەو کارەیە لەسەر قسەی بەشی زۆری زانایان.

فێڵ کردن لە فرۆشتندا (التناجش):

(تناجش)یش دیسانەوە هەر غەبنە (واتە جۆرێکە لە فێڵ کردن)، ئەویش کەسێك خۆی نایەوێ کەلوپەلێك بکڕێت بەڵکو ئەیەوێ فێڵ بکات لە خەڵك بۆ ئەوەی نرخی شتەکە زیاد بکەن، ئەو دێت نرخەکە زیاد ئەکات بە ڕێکەوتنی خۆیان، بۆ ئەوەی خەڵك بڵێن: ئەو شتە چاکە بۆیە ئەوەندەی ئەداتێ، ئەوانیش دێن زیاتری ئەدەنێ.

بوخاری وموسلیم لە ئیبنوعومەرەوە خوایان لێ ڕازی بێت ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ (النجش) ی قەدەغەکرد بوو[2]. وە حەرامیشە بە ئیتفاق وڕێکەوتنی زانایان.

ئیبنوحەجەر لە کتێبی (فتح الباري)دا فەرمویەتی:

زانایان جیاوازیان هەیە لەو کڕین وفرۆشتنەدا کە بەو شێوەیە بێت.

وە ئیبنو مونذیر لە کۆمەڵی ئەهلی حەدیسەوە فسادی ئەو مامەڵەیە نەقڵ ئەکات، وە ئەوەش قسەی ظاهیری‌یەکان و ڕیوایەتێکە لە مالیکەوە، و هەر ئەوەش بەناوبانگە لای حەنبەلی‌یەکان، ئەگەر خاوەن شت ئاگای لێ بێت یا کاری خۆی بێت.

وە ئەوەی بەناوبانگە لە مالکی‌یەکانەوە سابت بونی (خیار) سەرپشکی‌یە لەو جۆرە سەودایانەدا، وە ڕوویەکە لە شافیعی‌یەکانەوە بە قیاس کردن لەسەر تەتیس کردنی شیری گوانی ئاژەڵ . وە ئەوەی ڕاستتر بێت لایان ئەوەیە مامەڵەکە دروستە بەڵام گوناهباری تێدایە. ئەوەش قسەی حەنەفی‌یەکانە.

---

(١) أحمد (٢/٤٠٣) ومسلم (١٥١٩/١٧) وأبوداود (٣٤٣٧) والترمذي (١٢٢١) والنسائي (٧/٢٥٧) وابن ماجه (٢١٧٨).

(٢) البخاري (٢١٤٢) ومسلم (١٥١٦/١٣).

**هەڵوەشاندنەوە (الإقالة)**

کەسێك شتێکی کڕی لەپاشاندا بۆی دەرکەوت پێویستی بەو شتە نییە، یا شتێکی فرۆشت و بۆی دەرکەوت خۆی پێویستی پێی هەیە، بۆ هەر یەکیان هەیە داوای ئیقالە وهەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکە بکات، وە ئیسلام رەغبەتی داوە بەو کارە وبانگەوازی بۆ کردووە.

ئەبوداود و ئیبنو ماجە لە ئەبوهورەیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من أقال مسلما أقال الله عثرته)[1].

واتە: هەرکەس لە موسڵمانێك ببورێت خوای گەورە لە هەڵەکانی ئەبورێت[2].

وە ئیقالە هەڵوەشاندنەوەیە نەك فرۆشتن .

وە دروستە پێش ئەوەی فرۆشراوەکە وەربگیرێت، وە سەرپشکی کۆڕو سەرپشکی بە مەرجی تێدا نییە، هەروەها شوفعەی تێدا نییە چونکە فرۆشتن نییە.

وە کاتێ پەیمانەکە هەڵوەشایەوە هەر لایەکیان چی داوە ئەی درێتەوە، کڕیار نرخەکە وەرئەگرێتەوە، وە فرۆشیاریش شتەکەی خۆی.

وە ئەگەر شتە فرۆشراوەکە خۆی لەناو چوبوو، یا یەکێ لە دوو لایەنەکە مرد بێت، یا نرخەکە زیادی کردبێت، یا کەمی کرد بێت ئیقالە دروست نییە.

**السَّلم**

پێناسەکەی: سەلەم کە (سلف)یشی پێ ئەوترێ، ئەویش فرۆشتنی شتێکی دیاری کراوە لە زیممەدا بە نرخێکی پێش خراو، زانایان پێی ئەڵێن: فرۆشتنی تەنگانە چونکە فرۆشتنی شتی نادیارە لەبەر ئەوەی هەردوو لای سەوداکەرەکە پێویستیان پێی هەیە. خاوەن دارایی پێویستی بەوە هەیە کە کەلوپەلێك بکرێت، وە خاوەن کەلوپەلیش پێویستی بە نرخی ئەو شتە هەیە پێش ئەوەی بەرهەمی بهێنێ بۆ ئەوەی سەرفی بکات بۆ خۆی وکشتوکاڵەکەی تاوەکو پێ بگات، کە وایە لەبەرژەوەندیی پێویستەکانە.

---

(١) أبوداود (٣٤٦٠) وابن ماجه (٢١٩٩) وابن حبان (٥٠٠٧و٥٠٠٨/) والحاكم (٢/٤٥).

(٢) بەتایبەتی ئەگەر کەسێك لە کڕین و فرۆشتندا پەشیمان بێت و بەرامبەرەکەشی بەدەنگیەوە بێت و چاوپۆشی لە مامەڵەکە بکات، ئەوە خوا لە هەڵەکانی ئەبورێ.

وە بە کڕیار ئەووترێ: خاوەن سەلەم یان سەلەم دەر، وە بە فرۆشیار ئەووترێ: سەلەم پێ دراو وە بە شتە فرۆشراوەکە ئەوترێت سەلەم لەسەر کراو، و بە نرخەکەی ئەوترێت سەرمایەی سەلەم.

**دانانی لە یاسای ئیسلامدا:**

سەلەم بە کیتاب و سوننەت و ئیجماع سابتە لە ئیسلامدا.

١- ئیبنوعەبباس ﷺ فەرمویەتی: (أشهد أن السلف المضمون إلي أجلٍ قد أحلّه الله في كتابه وأذن فيه)

واتە: شایەتی ئەدەم سەلەمی دەستەبەرکراو بۆ ماوەیەکی دیاری کراو خوا لە کتێبەکەیدا حەڵاڵی کردووە و ڕێی پێ داوە.

لە پاشاندا ئەم ئایەتەی خوێندۆتەوە: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَدَايَنتُمْ بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَاكْتُبُوهُ﴾ (البقرة/٢٨٢)

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر قەرزێکتان دا بە کەسێك بۆ ماوەیەکی دیاری کراو بینوسن.

٢- وە بوخاری وموسلیم ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ هاتە مەدینە خەڵکەکە بۆ بەروبوم ساڵێك و دوو ساڵ سەلەمیان ئەکرد ئەویش فەرمووی: (من أسلف فليسلف في كيل معلوم و وزن معلوم إلى أجل معلوم)[1].

واتە: هەرکەس سەلەم ئەکات با پێوانەکەی دیاری کراوبێت و کێشانەکەی و وادەکەی دیاری کراو بێت.

ئیبنومونزیر فەرمویەتی: هەموو ئەوانەی زانستی‌یان لێوە فێر بووین لەسەر ئەوە ڕێك بوون کە سەلەم دروستە.

**ڕێك کەوتنی لەگەڵ بنەماکانی یاسای ئیسلامدا:**

دانانی سەلەم ڕێك ئەکەوێت لەگەڵ داخوازی شەریعەتدا، و ڕێکە لەگەڵ بنەماکانیدا، وە پێچەوانەیی (قیاس)ی تێدا نی‌یە، چونکە وەك چۆن دروستە دواخستنی نرخەکە لە فرۆشتندا، ئاواش دروستە دواخستنی شتە فرۆشراوەکە لە سەلەمدا، بێ جیا کردنەوە لە نێوانیاندا، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِذَا تَدَايَنتُمْ بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَاكْتُبُوهُ﴾ واتە:

---

(١) البخاري (٢٢٣٩) ومسلم (١٦٠٤/١٢٧).

ئەگەر قەرزێکتان دا بە کەسێك بۆ ماوەیەکی دیاری کراو بینوسن.

وە قەرزەکە لێرەدا دواخراوە لە دارایيە دەستەبەرەکان کە لە زیمەدان، وە هەر کاتێکیش فرۆشراو دیاری کراوو دەستەبەرکراو و لە زیمەدا بوو، وە کڕیار لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە فرۆشیار فرۆشراوەکەی ئەداتێ لەوکاتە دیاری کراوەدا، ئەوە ئەو شتە فرۆشراوە قەرزێکە لەو قەرزانەی دروستە دوا بخرێت وئایەتەکە ئەیگرێتەوە، وەك ئیبنوعەبباس ﷺ فەرمویەتی:

وە ناچێتە ناو ئەوەوە کە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە، نابێت هیچ موسوڵمانێك ئەو شتە بفرۆشێت کە لای نيیە، وەك لە فەرموودەکەیدا هاتووە کە بە حەکیمی کوڕی حیزامی فەرموو: (لاتبع ما لیس عندك) رواه أحمد وأصحاب السنن وصححه الترمذي وابن حبان[1].

واتە: شتێك مەفرۆشە کە لات نيیە.

چونکە مەبەست لەو قەدەغە کردنە فرۆشتنی شتێکە کە فرۆشیار نەتوانێت تسلیمی بکات، چونکە ئەو شتەی توانای تسلیم کردنی نەبێت شتی خۆی نيیە بەڕاستی، کەواتە فرۆشتنەکەی نەزانین و موغامەرەی تێدایە.

بەڵام فرۆشتنی شتی دیاری کراوی دەستەبەر لە ئەستۆدا لەگەڵ ئەوەدا کە گومان نيیە کە توانای تسلیم کردنی هەیە لەکاتی دیاری کراودا، ئەوە لەوبەشە نيیە.

**مەرجەکانی سەلەم:**

سەلەم چەند مەرجێکی هەیە کە ئەبێت تێیدا هەبێت بۆ ئەوەی دروست بێت، ئەو مەرجانەش هەیانە لە دەست مایەکەدان. وە هەیانە لە شتە کەدایە کە سەلەمەکەی لەسەر کراوە.

**مەرجەکانی دەس مایە ئەمانەن:**

١- ئەبێ جینسەکەی دیاری کراو بێ.

٢- ئەبێ چەندێتیيەکەی دیاری کراو بێت.

٣- ئەبێ لە کۆڕەکەدا تسلیم بکرێت.

وە مەرجەکانی سەلەم لەسەر کراوەکەش ئەمانەن:

١- ئەبێ لە زیمەدا بێت.

---

(١) أحمد (٣/٤٠٢) وأبوداود (٣٥٠٣) والترمذي (١٢٣٢) والنسائي (٧/٢٨٩) وابن ماجه (٢١٨٧).

٢- ئەبێ بە شێوەیەك وەسف کرابێت کە ئەندازەکەی پێ بزانرێت، وە ئەو سیفەتانەش کە جیای ئەکاتەوە لەشتی تر بۆ ئەوەی فریو و ناکۆکی تێدا نەبێ.

٣- ئەبێ ماوەکە دیاری کراو بێت.

وە ئایا دروستە بۆ کاتی درێنە کردنی وبڕینەوەو هاتنەوەی حاجی بدرێت؟

مالیك فەرمویەتی: هەرکاتێك دیاری کرا بێت وەك مانگەکان وساڵەکان دروستە.

دواخستنی ماوە مەرجە:

جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون کە دواخستنی ماوە لە سەلەمدا ئیعتیباری بۆ ئەکرێت، وە ووتویانە: دروست نییە بە حازر بکرێت، وە شافیعییەکان ئەڵێن: دروستە لەبەر ئەوەی ئەگەر بە دواخراوی لەگەڵ بوونی غەرەرو نەزانیندا دروست بێت، ئەوە دروستی دەم ودەستی لە پێشترە. وە باسی ماوەی ناو فەرموودەکە بۆ ئەوە نییە کە ئەو ماوەیە بەمەرج بگیرێت، بەڵکو مانای ئەوەیە ئەگەر بۆ کاتێکی دواخراو بوو ئەبێ کاتەکە مەعلوم بێت.

شەوکانی فەرمویەتی: ئەوەی ڕاست بێت ئەوەیە کە شافیعییەکان بۆی چوون کە ماوە ئیعتیباری بۆ ناکرێت لەبەر نەهاتنی بەڵگە لەسەری، جا پێویست نییە پەیوەست بوون بە حوکمێك کە بەڵگەی لەسەر نەبێت. وە ئەوەی ئەوترێت: کە سەلەمی بێ ماوەو مۆڵەت، وەك فرۆشتنی شتی نەبووی لێ دێ، وە لە سەلەمدا نەبێت ڕێی پێ نەدراوە، وجیاوازی نییە لە نێوان سەلەم و نێوان فرۆشتندا ماوە نەبێت! وەڵامی ئەوە ئەدرێتەوە کە داڕشتنەکە جیاکەرەوەیە وە ئەوەش بەسە بۆ جیاوازی نێوان فرۆشتن و سەلەم.

مەرج نییە ئەو شتەی سەلەمەکەی لەسەر کراوە لای سەلەم پێ دراو بێت:

لە سەلەمدا مەرج نییە ئەوەی سەلەمەکە وەرئەگرێت خاوەنی ئەو شتە بێت کە لەجیاتی سەلەمەکە ئەدرێت، بەڵکو تەنها گوێ ئەدرێتە ئەوەی کاتی تەسلیم کردنەکە لای ئەو کەسە بێت.

وە هەر کاتێك فرۆشیارەکە لە شوێنە دیاری کراوەکەدا ولە ماوە دیاری کراوەکەدا نەبوو پەیمانەکە هەڵئەوەشێتەوە، وە پێش هاتنی ماوەکەش پێدانی زیانی نییە.

بوخاری لە موحەممەدی کوڕی موجالیدەوە گێڕاویەتییەوە کە فەرمویەتی: عبداللە ی کوڕی شەدداد وئەبوبوردە ناردمیان بۆلای عبداللە ی کوڕی ئەبی ئەوفا پێیان ووتم:

پرسیاری لێ بکەن ئایا هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ سەلەفەیان ئەکرد لە گەنمدا؟

عبدالله فەرموی: ئێمە سەلەفمان ئەدا بە ئەوانەی زەراعەتیان ئەکرد لە خەلکی شام بۆ گەنم و جۆ وزەیت بە پێوانەیەکی دیار وماوەیەکی دیاری کراو.

وتم: ئایا لەگەڵ کەسانێکدا کە ئەسڵی ئەو شتانەیان لە لابوو؟

فەرموی: پرسیارمان نە ئەکرد لەو بارەیەوە.

لەپاشاندا ناردمیان بۆ لای عبدالرحمن ی کوڕی ئەبزا، پرسیارم لێ کرد لەوبارەیەوە، فەرموی: هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ سەلەفیان ئەکرد لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ وە پرسیاریان لێ نەئەکردن کشتوکاڵیان هەیە یان نا.

به باس نەکردنی شوێنی وەر گرتن پەیمان هەڵناوەشێتەوە:

ئەگەر هەردوو لایەنەکە شوێنی وەرگرتنی شتەکەیان دیاری نەکردبو، وە بێ دەنگ بوون لێی، سەلەم کردنەکە دروستە، چونکە لە فەرموودەکەدا ڕوون نەکراوەتەوە. وە ئەگەر مەرجی دروستی بوایە پێغەمبەر ﷺ باسی ئەکرد وەك چۆن باسی پێوان وکێشان وماوەکەی کردووە.

سەلەم کردن لە شیر وخورمادا:

(قرطبـي) فەرمویەتی: سەلەم کردن لە شیر وخورمادا لەگەڵ دەست پێکردن بە وەرگرتنی، مەسەلەیەکی مەدینەیی‌یە و خەلکی مەدینە لەسەری کۆن، وە لەسەر بنەمای بەرژەوەندی دامەزراوە، چونکە ئادەمیزاد ڕۆژانە پێویستی بە وەرگرتنی شیر وخورما هەیە، و گرانە لەسەری هەموو ڕۆژێك لەسەرەتاوە وەری بگرێت، چونکە جاری وا هەیە پارەکەی لانی‌یە، وە لەبەر ئەوەی نرخەکەی جاری وایە ئەگۆڕێت، وە خاوەنی باخی خورما وشیریش پێویستی بە پارە هەیە چونکە ئەو شتەی هەیەتی شتی فرۆشتنە بۆی سەرف نابێت.

جا کاتێ هەردوولا هاوبەش بن لە پێویستیدا ڕێیان پێ دراوە ئەو مامەڵەیە بکەن بە قیاس بۆسەر (عاریە)و شتی تر وەك پێویستی‌یە بنەمایی‌یەکان و بەرژەوەندی‌یەکانی تر.

دروستە شتی تر وەربگیرێ لە جیاتی ئەو شتەی سەلەمەکەی لەسەر کراوە:

جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون کە دروست نی‌یە شتێکی تر وەربگیرێ لە جیاتی ئەوەی سەلەمەکەی لەسەر کراوە لەگەڵ مانەوەی پەیمانی سەلەمەکەدا.

چونکە قەرزی ئەو شتەی سەلەمەکەی لەسەر کراوە پێش وەرگرتنی فرۆشتویەتی.

وە بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (من أسلف في شئ فلا يصرفه إلى غيره).[1] (دارقطني) لە ئیبنوعومەرەوە گێڕاویەتیەوە.

واتە: هەرکەس سەلەفی کرد لەسەر شتێك با نەیگۆڕێ بە شتێکی تر.

وە ئیمامی مالیك وئەحمەد ڕێیان پێ داوە.

ئیبنومونذیر فەرمویەتی: لە ئیبنوعەبباسەوە سابتە کە فەرمویەتی: ئەگەر سلفەت کرد لەسەر شتێك بۆ ماوەیەك، ئەگەر ئەو شتەت وەرگرت وا باشە ئەگینا شتێکی تر وەریگرە لەو کەمتر بێت، وە دوو جار قازانج وەر مەگرە. شوعبە گێڕاویەتیەوە، ئەوەش قسەی صەحابیە وقسەی صەحابییش بەڵگەیە ئەگەر موخالیفی نەبوو.

ئەما فەرموودەکە لە گێڕەوەکانیدا عەطیەی کوڕی سەعدی تێدایە کە حەدیسەکانی ناکرێنە بەڵگە.

وە ئیبنوقەییم ئەوەی پارسەنگ داوەتەوە -دوای ئەوەی بەڵگەی هەردوولای شی کردۆتەوە- و فەرمویەتی: کەواتە سابتە کە دەقێك نیە بۆ حەرام کردنی، وە هەروەها ئیجماع و قیاسیش نیە، وە دەق وقیاس ڕەوایی ئەو شتە پێویست ئەکەن. وە پێویستە کاتی ناکۆکی وکێشە بگێڕرێتەوە بۆ لای خوا وبۆ لای پێغەمبەر ﷺ.

بەڵام ئەگەر پەیمانی سەلەمەکە هەڵوەشاوە بە ئیقالە یا شتێکی تر. وتراوە: دروست نیە لەجیاتی ئەو شتە شتێکی تر وەربگرێتەوە جگە لە جینسی شتەکەی خۆی.

وە ووتراوە: دروستە لە جیاتی ئەو شتێکی تر وەربگیرێ، ئەوەش مەزهەبی شافیعی و قازی ئەبویەعلا و ئیبنو تەیمیەیە.

ئیبنوقەییم فەرمویەتی: ئەو کارە ڕاستە، لەبەر ئەوەی ئەو شتەی لە جیاتی وەری ئەگرێ لە زیمەدایە و وەك هەموو قەرزێکی تر دروستە بریتیەکەی وەربگیرێت.

---

(١) أبوداود (٣٤٦٨) وابن ماجه (٢٢٨٣).

## سوود (الربا)

**پێناسەکەی:**

(ربا) لە زمانی عەرەبی دا یەعنی زیادە.

وە لێرەدا مەبەست لیٚ‌ی: ئەو زیادەیە کە لە دەستمایە زیاترە، کەم بێت یا زۆر، خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿وإِنْ تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَالِكُمْ لاَ تَظْلِمُونَ ولاَ تُظْلَمُونَ﴾ (البقرة:٢٧٩).

واتە: ئەگەر پەشیمان بوونەوە سەرمایەی خۆتان بۆ خۆتان ئەبێت نە ستەم ئەکەن ونە ستەمتان لیٚ ئەکرێت.

**حوکمەکەی:**

سوود لە هەموو ئایینە ئاسمانی‌یەکاندا حەرامە، وە قەدەغەیە لە ئایینی‌یەهودی ومەسیحی و ئیسلامدا.

لە عەهدی قەدیم دا هاتووە: (ئەگەر شتێك قەرزت دا بە یەکیٚ لە رۆڵەکانی گەلەکەم، جێگەی قەرز دەری لیٚ مەگرەوە و داوای قازانجی لیٚ مەکە).

ئایەتی ٢٥، فەصلی ٢٢، لە (سفر الخروج).

وە هەروەها هاتووە تیٚ‌یدا: (کاتێك براکەت کەم دەست بوو یارمەتی بدە. . . و داوای قازانج وسوودی لیٚ مەکە.

ئایەتی ٣٥، فەصلی ٢٥، (سفر الدواویین).

بەڵام جولەکەکان رایان وایە کە هیچ مانعێك نی‌یە بۆ وەرگرتنی لە کەسانێك کە جولەکە نەبن.

وەك لە ئایەتی ٢٠، لە فەصلی٢٣، لە (سفر التثنية)دا هاتووە.

وە قورئان رەدی داونەوە لە سورەتی(النساء)دا کە ئەفەرمووێت: ﴿وأخذهم الربا وقد نهوا عنه﴾ (النساء:١٦١) واتە:

لەگەڵ ئەوەی سوودیان لیٚ قەدەغە کرا بوو هەر وەریان ئەگرت.

وە لە کتێبی (العهد الجديد) دا هاتووە: (کاتێك قەرز ئەدەن بە کەسانێك وچاوەڕوانی پاداشت ئەکەن لیٚ‌یانەوە، ئیتر چ چاکەیەکتان لێوە ئەبینرێت؟ بەڵام ئێوە چاکە بکەن وقەرز بدەن بەو کەسانەی پێویستی‌یان پیٚ‌ی هەیە بیٚ ئەوەی چاوەڕوانی سوودەکەی بکەن، بەو شێوەیە پاداشتان زۆر ئەبێت لای خوا) ئایەتی ٣٤و٣٥ فەصلی ٦ لە (إنجيل لوقا).

وە قسەی پیاوەکانی کەنیسە لەسەر حەرامی سوود رێك کەوتووە بە شێوەیەکی براوە بەپێی ئەم دەقانە.

سکوبار وتویەتی: هەرکەس ئەڵێت: سوود سەرپێچی کردن نی‌یە بە مولحید و لە ئایین دەرچوو دائەنرێت.

وە ئەب بۆتی وتویەتی: ئەوانەی پارە ئەدەن بە سوود لە ژیانی دنیادا شەرەفیان لە دەست داوە، و شایستەی کفن کردن نین پاش مردن.

وە لە قورئانی پیرۆزدا لە چەند جێگادا باسی سوودی کردووە پلە پلە بەپێی سەردەم وکات، لە سەردەمی مەککەدا ئەم ئایەتە هاتۆتە خوارەوە:

﴿وَمَا آتَيْتُمْ مِنْ رِبًا لِيَرْبُوا فِي أَمْوَالِ النَّاسِ فَلاَ يَرْبُوا عِنْدَ اللَّهِ وَمَا آتَيْتُمْ مِنْ زَكَاةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمْ الْمُضْعِفُونَ﴾ (الروم:٣٩) واتە:

ئەوەی ئەیدەن بە سوود بۆ ئەوەی بە سامانی خەڵك سامانتان زیاد بکات لای خوا زیاد ناکات و بەرەکەتی تێ ناکەوێت. وە ئەوەی ئەیدەن بە خێرو صەدەقە و مەبەستتان تەنها ڕەزامەندی خوایە و بەس ئەوەیە کە خوا قەبوڵی ئەکاو چەند بەرابەر زیادی ئەکات.

وە لەسەردەمی مەدینەدا حەرام کردنی سوود بە ئاشکرا هاتە خوارەوە لەم فەرموودەی خوای گەورەدا:

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَأْكُلُوا الرِّبَا أَضْعَافًا مُضَاعَفَةً وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ (آل عمران:١٣٠) واتە:

ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە خۆتان بپارێزن لە سوود بە هەموو جۆرەکانی‌یەوە، وە زیادە لە ماڵەکانتان وەرمەگرن لە قەرزا با کەمیش بێت، چ جێیەك ئەگەر ئەو زیادە چەند ئەوەندەش زیاتر بێت هەر کە کاتی دانەوەی قەرزەکە بێت، وە لەخوا بترسن بە ئومێدی ئەوەی ڕزگار بن لە دونیاو ئاخیرەتدا.

وە دووا ئایەت کە کۆتایی بە سوود هێنا فەرمودەی خوای گەورەیە کە ئەفەرموێت:

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَذَرُوا مَا بَقِيَ مِنْ الرِّبَا إِنْ كُنتُمْ مُؤْمِنِينَ فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا فَأْذَنُوا بِحَرْبٍ مِنْ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَإِنْ تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَالِكُمْ لاَ تَظْلِمُونَ وَلاَ تُظْلَمُونَ﴾ (البقرة:٢٧٩-٢٧٨) واتە:

ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە لەخوا بترسن و واز لەو سوود بهێنن کە لای خەڵك ماوتانە، ئەگەر ئێوە بەڕاستی بڕواکەتان بەدی ئەهێنن بە قسەو بە کردەوە. جا ئەگەر وازی لیٚ ناهێنن ئاگاداری جەنگ بن لەگەڵ خوا وپێغەمبەردا، وە ئەگەر پەشێمان بوونەوە و وازتان لە سوود خواردن هێنا، ئەوە سەرمایەی خۆتان بۆ خۆتانە نە ستەم ئەکەن ونە ستەمتان لیٚ ئەکرێت.

لەم ئایەتەدا ڕەددی براوە هاتووە لەسەر ئەوانەی ئەڵێن: سوود حەرام نیيە هەتا چەند جارە نەبێتەوە، چونکە خوای گەورە بەڕەوای دانەناوە ئیللا ئەوە نەبێت کە سەرمایەکە بیٚ زیادە بگەڕێتەوە بۆ خاوەنی، وە ئەمەش دوا فەرمان بووە هاتۆتە خوارەوە لەو بارەیەوە.

وە سوود وەر گرتن لە گوناهەگەورەکانە، بوخاری وموسلیم لە ئەبوهورەیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إجتنبوا السبع الموبقات).

واتە: دوور بکەونەوە لە حەوت بکوژەرەکە. ووتیان: ئەو حەوت کوژەرە چین ئەی نێرراوی خوا؟

فەرمووی: (الشرك بالله، والسحر، وقتل النفس التي حرم الله إلا بالحق، وأكل الربا، وأكل مال اليتيم، والتولي يوم الزحف، وقذف المحصنات الغافلات المؤمنات)[1].

واتە: هاوبەش بۆ خوادانان، سیحرکردن، کوشتنی کەسانێك کە خوا حەرامی کردوون بە حەق نەبێت، وە خواردنی سوود، وە خواردنی ماڵی هەتیوان، وە هەڵاتن لە ڕۆژی جەنگ دژی بیٚ باوەڕان، وە تاوانی داوێن پیسی خستنە پاڵ ئافرەتانی موسوڵمانی بیٚ ئاگا لەو کارە.

وە خوای گەورە نەفرینی کردووە لەو کەسانەش کە هاوبەشن لە بەستنی پەیمانی سووددا، وە نەفرینی لەو کەسەش کردووە کە قەرزەکە بە سوود وەرئەگرێت، وە ئەوەش کە پارەکە ئەدا بە قەرز بە سوود، وە ئەو نوسەرەش کە پەیمانەکە ئەنوسیٚ بۆیان، وە ئەو شایەتانەش کە شایەتن بە سەر پەیمانەکەوە.

بوخاری وموسلیم وئەحمەد وئەبوداود و (ترمذي) ئەگێڕنەوەو (ترمذي) بە صەحیحی گێڕاوە، لە جابیری کوڕی عبدالله، وە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لعن الله آكل الربا، ومؤكله، وشاهديه، وكاتبه)[2].

---

(١) لەمەو پێش تەخریج کراوە.

(٢) مسلم (١٥٩٨).

واتە: خوا نەفرینی کردووە لە سوود خۆر، وئەوەش پارەی سوودەکە ئەدات، و هەردوو شایەتەکە و نوسەری پەیمانەکە.

(دارقطني) گێڕاویەتی‌یەوە لە عبداللە ی کوڕی حەنظەلەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لدرهم ربا أشد عند الله تعالي من ست وثلاثين زنية في الخطيئة)[1].

واتە: تاوانی درەمێك سوود زۆر توندترە لەلای خوا لە سی وشەش زینا کردن.

وە هەروەها فەرمویەتی: (الربا تسعة وتسعون باباً، أدناها كأن يأتي الرجل أمه)[2].

واتە: سوود خواردن نەوەدونۆ دەرە، بچوکترینیان وەك ئەوە وایە پیاو زینا لەگەڵ دایکیدا بکات.

**حیکمەت لە حەرام کردنی سوود:**

سوود خواردن حەرامە بەپێی هەموو ئایینە ئاسمانی‌یەکان، وە هۆی حەرام کردنیشی ئەوەیە کە زیانێکی گەورەی تێدایە:

١- سوود وەرگرتن ئەبێتە هۆی کەوتنەوەی دوژمنایەتی لە نێوان تاکە تاکەکانی کۆمەڵدا و گیانی یارمەتی لەناویاندا هەڵئەگرێت. ئایینەکان هەموویان بە تایبەت ئیسلام بانگەواز ئەکات بۆ یارمەتی وله خۆ بوردن ونەهێشتنی خۆویستی وبە کارهێنان وکێشانەوەی دەست ڕەنج و زەحمەتی خەلکی دیکە.

٢- سوود خواردن ئەبێتە هۆی دروست بوونی چینێکی خۆش گوزەران بێ ئەوەی هیچ کارێك بکەن، وەك چۆن ئەبێتە هۆی سەربەککەوتنی سامانیان بێ هیچ ماندوبوونێك، بەم شێوەیە وەك ڕوەکە خۆرەکانیان لێ دێ کە گەشە ئەکات لەسەر حسابی کەسانی تر. وە ئیسلام کارکردنی بە گەورە داناوە و ڕێزی کارکەران ئەگرێت و کارکردن ئەکا بە باشترین هۆ لەهۆیەکانی بەدەست هێنان، چونکە کارکردن ئەبێتە هۆی ئەوەی ئەو کەسە کارامەیی پەیدا بکات وگیانی مەعنەوی بەرز ببێتەوە تێیدا.

٣- وە هۆیە بۆ ئیستیعمار لەبەر ئەوە وتراوە: ئیستیعمار یا بەدوای بازرگانەوە یا بە دوای قەشەوە ئەڕوات. وە ئێمە خۆمان زانیومانە کە سوودو شوێنەوارەکانی چ ڕۆڵێکیان بووە لە داگیرکردنی وڵاتەکانماندا.

---

(١) أحمد (٥/٢٢٥) ومجمع الزوائد (٤/١١٧) والدارقطني (٣/١٦).

(٢) البيهقي في شعب الإيمان (٥٥٢٠).

٤- وە ئیسلام لە پاش ئەوە بانگەوازی ئەوە ئەکات کە ئادەمیزاد قەرز بدات بە براکەی بە شێوەیەکی چاك کاتێ پێویستی بە ماڵ هەبوو، وە لەسەر ئەو قەرزیێ دانە گەورەترین پاداشت ئەدرێتەوە. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا آتَيْتُمْ مِنْ رِبًا لِيَرْبُوا فِي أَمْوَالِ النَّاسِ فَلاَ يَرْبُوا عِنْدَ اللَّهِ وَمَا آتَيْتُمْ مِنْ زَكَاةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُضْعِفُونَ﴾ (الروم آية ٣٩). ڕوون کراوەتەوە.

**بەشەکانی سوود:**

سوود دوو بەشە:

١-سوودی دواخراو. (ربا النسيئة)

٢-سوودی زیادە. (ربا الفضل)

**سوودی دواخراو:**

ئەو زیادە بە مەرج دانراوەیە کە خاوەن قەرز وەری ئەگرێت لە قەرزار بەرامبەر دواخستنی قەرزەکە.

وە ئەم جۆرە سوودە حەرامە بە کیتاب وسوننەت وئیجماعی پێشەواکانی ئایین.

**سوودی زیادە:**

ئەمیش فرۆشتنی پارەیە بە پارە یا خواردەمەنی بە خواردەمەنی لەگەڵ وەرگرتنی زیادەدا، ئەمەش حەرامە بەپێی سوننەت وئیجماع، چونکە ئەبێتە هۆو ڕێگا بۆ سوودی دواخراو.

ئەبوسەعیدی خودری ﷺ ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لاتبيعوا الدرهم بالدرهمين، فإني أخاف عليكم الرماء)[1].

واتە: درهەمێك مەفرۆشن بە دوو درهەم، بە ڕاستی من ترسی سوودم هەیە لەسەرتان.

قەدەغە کردنی سوودی زیادە لەبەر ئەوە بووە کە پێغەمبەر ﷺ ترسی ئەوەی هەبووە بچن بۆ سوودی دوا خراو.

وە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ دانی بە حەرامی سووددا ناوە لە شەش شتدا:

زێڕ وزیو وگەنم وجۆ وخورما وخوێ

لە ئەبوسەعیدەوە هاتووە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الذهب بالذهب والفضة بالفضة والبر بالبر والملح بالملح مثلاً بمثل يداً بيد، فمن زاد أو استزاد فقد أربى، الآخذ والمعطي سواء)[1].

---

(١) أحمد (٣/٤٩-٥٠) ومسلم (١٥٩٤/٩٨) والنسائي (٧/٢٧٢) وانظر الموطأ (٢/٦٣٤).

واته: زێڕ به زێڕ و زیو به زیو وگەنم به گەنم وخوێ به خوێ وەك یەك دەست به دەست بدەن و وەربگرن، هەركەس زیاد وەربگرێت یا داوای زیادە بكات ئەوە سوود خۆرە، وەرگر و بدەر وەك یەكن. بوخاری وئەحمەد گێڕاویانەتەوە.

هۆی حەرام بوونی:

ئەو شەش شتانەی فەرموودەكەی پێغەمبەر ﷺ به تایبەتی باسی كردوون ڕێكخەری ئەو شتە بنەڕەتی‌یانەن كە خەڵك زۆر پێویستی پێ یان هەیە وناتوانرێ وازیان لێ بهێنرێت.

چونكە زێڕ و زیو دوو ڕەگەزی سەرەكین بۆ پارە ومامەڵە وئاڵ وگۆڕ لەسەر ئەوان ڕێكخراوە.

كەواتە ئەو دووانە عەیارەن و نرخی هەموو ئەو كەلوپەلانە ئەگەڕێتەوە سەریان. وە چوار شتەكەی تر بنەڕەتی خواردەمەنی‌یەكانن و سەرچاوەی ئەو بژێوەن كە ڕاگری ژیانە.

جا ئەگەر سوود لەسەر ئەمانە وەربگیرێت زیان به خەڵك ئەگات وئەبێتە هۆی تێك چوونی مامەڵە و ئاڵ وگۆڕ، هەر بۆیە یاسادانەری ئیسلام قەدەغەی كردوون، لەبەر بەزەیی به خەڵكداو پاراستنی بەرژەوەندی‌یەكانیان.

بەوەدا بۆمان دەر ئەكەوێت كە حەرام كردن به گۆڕەی زێڕ وزیو لەبەر ئەوەیە كە نرخن بۆ شتومەك.

وە هۆی حەرام كردنی شتەكانی تریش لەبەر ئەوەی خواردەمەنین بۆ خەڵك.

جا ئەگەر ئەو هۆیە لە هەر پارەیەكی تردا به دی كرا جگە لە زێڕ و زیو حوكمی زێڕ و زیو وەرئەگیرێت، لەبەر ئەوە نافرۆشرێن ئەوەندەی‌یەك نەبن ودەست به دەست نەبێت.

وە هەروەها ئەگەر ئەو هۆیە بەدی كرا لە خواردەمەنی‌یەكی تردا جگە لە گەنم وجۆ وخورما وخوێ هەر حوكمی ئەمانە وەرئەگرێت، وە نابێت بفرۆشرێت به ئەوەندەی خۆی نەبێت ودەست به دەست نەبێت.

موسلیم ئەگێڕێتەوە لە موعەمەری كوڕی عبدالله وە لە پێغەمبەرەوە ﷺ كە قەدەغەی كردبوو خواردەمەنی سەربەسەر نەبێت بفرۆشرێت به شتێكی وەك خۆی.

جا هەرچی لە جێگای ئەم شەش جینسەدا بێت قیاس ئەكرێتە سەر ئەمان و حوكمی ئەمان وەرئەگرێت. وە ئەگەر دوو شتی ئاڵوگۆڕ كراو وەك یەك بوون لە جینس وعیلەتدا حەرامە زیادە

---

(١) أحمد (٢/٢٦٢و٣/١٠و٤٩و٦٦) والبخاري (٢١٧٥و٢١٧٧) ومسلم (١٥٨٤/٧٥و٧٦).

وەرگرتن لەسەری، وە دواخستنی هەر حەرامە. ئەگەر زێڕ بە زێڕ فرۆشرا یا گەنم بە گەنم بۆ ئەوەی ئەو گۆڕینەوە دروست بێت دوو شت ئەکرێت بە مەرج:

١- یەکسان بوون لە چەندێتی دا، بێ ئەوەی سەیری چاکی وخراپی یان بکرێت بەپێی فەرمودەکەی باس کرا. وە بەپێی ئەو فەرموودەی موسلیم گێڕاویەتی‌یەوە کە پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ هەندێ خورمای پێ بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەمە لە خورمای ئێمە نی‌یە؟ پیاوەکە ووتی: ئەی نێرراوی خوا، دوو صاع خورمای خۆمانمان داوە بە صاعێك لەم خورمایە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە (ربا) سودە بیگێڕنەوە لەپاشاندا خورماکەی خۆمان بفرۆشن وبە پارەکەی لەم خورمایەمان بۆ بکڕن[1].

وە ئەبوداود لە فوضالەوە ئەگێڕێتەوە کە وتویەتی: گەردن بەندێکیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ زێڕ و موروی تێدا بوو کابرایەك بە نۆ دینار یا بە حەوت دینار کڕیبووی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نابێت، هەتا زێڕەکەی لێ جیا نەبێتەوە کابراش گێڕایەوە هەتا زێڕەکەی لێ جیاکرایەوە[2].

وە لای موسلیم هاتووە: فەرمانی دا زێڕی ناو گەردن بەندەکەیان دەرهێنا، لە پاشاندا فەرمووی: زێڕ بە زێڕ لە کێشانەدا وەك یەك بن[3].

ئیبنوقەییم فەتوای داوە کە حەڵاڵە فرۆشتنی خشڵ بە کێشی خۆی زیاتر زێڕ، وە هەروەها خشڵی زیو.

٢-نابێت هیچیان دوا بخرێت بەڵکو ئەبێت گۆڕینەوەکە دەم ودەست بێت، بەپێی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (إذا کان یداً بید) واتە: ئەگەر دەست بە دەست بوو.

وە لەو بارەیەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لاتبیعوا الذهب بالذهب إلامثلاً بمثل، ولاتُشِفُّوا بعضها علی بعض، ولاتبیعوا الورق بالورق الا مثلاً بمثل، ولا تُشِفُّوا بعضها علي بعض، ولاتبیعوا غائباً منها بناجز). رواه البخاري ومسلم عن أبي سعید[4].

---

(١) مسلم (١٥٩٤/٩٧).

(٢) أبوداود (٣٣٥١و٣٣٥٢).

(٣) أحمد (٢/٢٦٢) ومسلم (١٥٨٨/٨٤) والنسائي (٧/٢٧٣).

(٤) البخاري (٢١٧٥و٢١٧٧) ومسلم (١٥٨٤/٧٥و٧٦).

واتە: زێڕ بە زێڕ مەفرۆشن وەك یەك نەبێت، وە زیادە وەرمەگرن، وە زیو مەفرۆشن بە زیو ئەوەندەیەك نەبێ، وە زیادە وەرمەگرن، وە شتی نادیار مەفرۆشن بە شتی ئامادە.

وە ئەگەر دوو شت جیاوازیان لە ڕەگەزدا بوو بەڵام لە عیلەتدا یەکیان گرتەوە حەڵاڵە زۆر وەرگرتنی یەکێکیان لەوی تریان بەڵام دوا خستنی حەرامە. جا ئەگەر زێڕ فرۆشرا بە زیو، یا گەنم بە جۆ لێرەدا مەرجێك هەیە بۆ گۆڕینەوەیان ئەویش ئەوەیە دەم ودەست بێت، ئیتر مەرج نی یە یەکسان بن لە چەندێتیدا بەڵکو دروستە زیاتر وەرگرتن.

ئەبوداود ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لابأس ببيع البر بالشعير والشعير أكثرهما يداً بيد)[1].

واتە: قەیناکە گەنم بدەی بە جۆ، جۆکەش زۆرتر بێت، دەست بە دەست. وە لە حەدیسی عوبادەدا لای ئەحمەد وموسلیم هاتووە: (فإذا اختلفت هذه الأصناف فبيعوا كيف شئتم إذا كان يداً بيدٍ)[2].

واتە: ئەگەر ئەم جۆرانە جیاواز بوون چۆن ئارەزووتان کرد بیفرۆشن، ئەگەر دەست بە دەست بوو.

وە ئەگەر شتە ئاڵوگۆڕکراوەکان لە جینس وعیلەتدا جیاواز بوون ئەوە هیچ شتێك مەرج نی یە لە گۆڕینەوەدا، دروستە زیاد وەرگرتن و دواخستن، جا ئەگەر خۆراك فرۆشرا بە زیو دروستە زیاد وەرگرتن و دووا خستن. وە هەروەها ئەگەر قوماشێك بە دوو قوماش یا قاپێك بە دوو قاپ فرۆشرا.

بە کورتی هەرچی شت هەیە جگە لە زێڕ وزیو وخواردەمەنی وشتی خواردنەوە سود وەرگرتن تێیاندا حەرام نی یە، وە دروستە بگۆڕرێنەوە بە یەك بە زیاد وەرگرتن و دوا خستنەوە، وە دروستە جیا کردنەوەیان پێش وەرگرتن. ئیتر دروستە مەڕێك بە دوو مەڕ بفرۆشرێت بە پارە و بە دواخستن، وە هەروەها مەڕ بە مەڕ بەپێی حەدیسەکەی عەمری کوڕی عاص کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ دابوو لە ووشتری زەکات ووشترێك بەرێت بیدات بە دوو ووشتر بۆ خێر. ئەحمەد وئەبوداود وحاکم گێڕاویانەتەوە، وە حاکم فەرمویەتی: صەحیحە بەپێی مەرجەکانی موسلیم. وە بەیهەقی گێڕاویەتی یەوە ئیبنوحەجەر ئیسنادەکەی بەهێز کردووە[3].

---

(١) أبوداود (٣٣٤٩).

(٢) أحمد (٥/٣٢٠) ومسلم (٧/١٥٨/٨١) والنسائي (٧/٢٧٤) وأبوداود (٣٣٥٠).

(٣) أبوداود (٣٣٥٧) والحاكم (٢/٥٦) والبيهقي (٥/٢٨٨).

ئیبنومونذیر فەرمویەتی: چەسپاوە کە پێغەمبەر ﷺ بەندەیەکی کڕی بە دوو بەندەی ڕەش، وە جاری‌یەکی کڕی بە حەوت سەر. شافیعی بۆ ئەوە چووە[1].

**فرۆشتنی ئاژەڵ بە گۆشت:**

جەماوەری پێشەوایانی ئیسلام فەرمویانە: دروست نی‌یە ئاژەڵێ گۆشتی بخورێت بفرۆشرێت بە گۆشتێك وەك جنسی خۆی بێت. وە دروست نی‌یە فرۆشتنی مانگای سەر بڕاو بە مانگای زیندوو کە مەبەست خواردنی بێت.

بەپێی ئەوەی سەعیدی کوڕی موسەییب گێڕاویەتی‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە ئاژەڵی گۆشت خوراو بفرۆشرێت بە گۆشت[2]. مالیك گێڕاویەتی‌یەوە لە (الموطاء) دا لە سەعیدەوە بە مورسەلی، و فەرموودەی تریش شایەتیەتی.

شەوکانی فەرمویەتی: ناشارزێتەوە فەرموودەکە ئیشی پێ ئەکرێ بە هەموو رێگاکانی .

وە بەیهەقی ئەگێڕێتەوە لە پیاوێك لە خەڵکی مەدینە کە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە فرۆشتنی ئاژەڵی زیندوو بە مردوو(سەربڕاو) لەپاشاندا فەرمویەتی: ئەمە مورسەلە پشتگیری مورسەلەکەی ئیبنوموسەیب ئەکات[3].

**فرۆشتنی خورمای تەڕ بە ووشك:**

دروست نی‌یە خورمای تەڕ بفرۆشرێت بە خورمای ووشك مەگەر بۆ ئەهلی عەرایا کە کۆمەڵێك هەژارن ودارخورمایان نی‌یە، بۆیان هەیە لە خاوەن خورماکان بکڕن بە تەڕی وبە دارەکەوە بیخۆن وبە ووشك بیخەمڵێنن.

مالیك وئەبوداود لە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصەوە گێڕاویەتی‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ کرا دەربارەی خورمای تەڕ بە خورمای ووشك، فەرمووی: ئایاتە ڕەکە کەم ئەکات کە ووشك بووە؟ وتیان: بەڵێ، جا قەدەغەی کرد[4].

---

(١) أحمد (٣/٣٤٩) ومسلم (١٦٠٢) وأبوداود (٣٣٥٨) والترمذي (١٢٣٩) والنسائي (٧/١٥٠).

(٢) مالك في الموطأ (٢/٦٥٥) وأبوداود في المراسيل (١٧٨) والحاكم (٢/٣٥) والدارقطني (٣/٧١) والبيهقي (٥/٢٩٦).

(٣) البيهقي (٥/٢٩٦).

(٤) أحمد (١/١٧٥،١٧٩) وأبوداود (٣٣٥٩) والترمذي (١٢٢٥) والنسائي (٧/٢٦٩) وابن ماجه (٢٢٦٤).

بوخاری و موسلیم ئەگێڕنەوە لە ئیبنوعومەرەوە کە فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ موزابەنەی قەدەغە کردبوو. واتە پیاو ڕوتەبی باغە خورماکەی بفرۆشێت بە خورمای پێوانە کراوو کێشراو. وە تریێ دارمێوەکەی بفرۆشێت بە مێوژی پێوانە کراو، وە ئەگەر دەغڵ ودان بوو بیفرۆشێت بە خۆراکی پێوانە کراو، پێغەمبەر ﷺ ئەمانەی هەموو قەدەغە کردبوو[1].

وە بوخاری لە زەیدی کوڕی پابتەوە ئەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ ڕێی دابوو بە ئەهلی عەرایا کە ڕوتەبی تەڕو تازە بکڕن بە خەمڵاندنی بە پێوانە[2].

فرۆشتنی عینە:

پێغەمبەر ﷺ فرۆشتنی عینەی قەدەغە کردبوو چونکە سوودە هەرچەند لەسەر شێوەی کڕین وفرۆشتنە. ئەویش ئەوەیە پیاوێك پێویستی بە پارە هەیە کەلوپەلێك لە کابرایەك ئەکڕێت بە نرخێکی دیاری کراو بۆ ماوەیەك، لە پاشاندا ئەیفرۆشێتەوە بەو کەسەی لێی کڕیوە بە نرخی ئێستا، بەڵام لە نرخەکەی خۆی کەمتر. ئەو جیاوازی‌یە لە نرخەکەدا سوودەکەیە کابرا وەری ئەگرێت. وە ئەم جۆرە فرۆشتنە حەرام و پوچەڵە.

١- ئیبنوعومەر ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا ضن الناس بالدينار والدرهم وتبايعوا بالعينة، واتبعوا أذناب البقر، وتركوا الجهاد في سبيل الله، أنزل الله بهم بلاءً فلايرفعه حتى يراجعوا دينهم)[3]. أخرجه أحمد وأبوداود والطبراني وابن القطان وصححه، وقال الحافظ ابن حجر: رجاله ثقات).

واتە: کاتێ خەڵکی دینار ودرهەمیان لاخۆشەویست بوو بەخیلی‌یان پێوە کرد، و بە عینە کڕین وفرۆشتنیان کرد، وشوێن کلکی گاو گۆتاڵ کەوتن، و وازیان لە جیهادی ڕێگەی خوا هێنا، خوا بەڵایەکیان بۆ ئەنێرێتە خوارەوەو لەسەریان لانابات هەتا نەگەڕێنەوە بۆ سەر ئایینەکەیان.

٢- وە عالیە[4] وتویەتی: کە کچی ئەیفەعی کوڕی شەرحەبیلە (من ودایکی کوڕی زەیدی کوڕی ئەرقەم و ژنەکەی چوینە خزمەت عائیشە خوای لێ ڕازی بێت، دایکی کوڕەکەی زەیدی کوڕی

(١) البخاري (٢١٨٥) ومسلم (١٥٤٢/٧٦).

(٢) البخاري (٢١٩٢) ومسلم (١٥٣٩/٥٩و٦١).

(٣) أحمد (٢/٨٢) وأبوداود (٣٤٦٢) والطبراني في الكبير (١٣٥٨٥) وصححه ابن القطان كما في (بلوغ المرام) (٨٦١).

(٤) خێزانی (أبي أسحاق الهمداني الكوفي السبيعي)یە.

ئەرقەم ووتی: من غولامێکم بە زەیدی کوڕی ئەرقەم فرۆشت بە هەشت سەد درهەم کە ماوەیەکی تر پارەکەم بداتێ. لە پاشاندا لێم کڕیەوە بە شەش سەد درهەمی نەقد وحازر. ئەویش فەرموی: کڕین وفرۆشتنێکی خراپت کردووە، بە زەیدی کوڕی ئەرقەم بڵێ: بەو کارە ئەو جیهادەی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کردوتە پوچەڵ بۆتەوە مەگەر تۆبە بکات. مالیك و (دارقطني) تەخریجیان کردووە[1].

**قەرز (القرض)**

(قرض) ئەو ماڵەیە کە قەرز دەر ئەیدات بە قەرزکەر کە وەك خۆی بێ زیاد وکەم بیداتەوە کاتێ توانای هەبوو. وە (قرض) لە ئەسلی زماندا بە مانای برین وجیا کردنەوەیە بۆیەش بەو ماڵەیان قەرز ووتووە چونکە قەرز دەر ئەوە لە ماڵی خۆی جیا ئەکاتەوە.

**دانانی لە یاسای ئیسلامدا:**

قەرز دان ئادەمیزاد پێی نزیك ئەبێتەوە لە خوای گەورە، وە لەبەر ئەوەی دڵنەرمی تێدایە بەرامبەر بە خەڵك ومیهرەبانی لەگەڵیان وئاسان کردنی کاروباریان وکردنەوەی گرێی پەژارەکانیان. و کاتێك ئیسلام بانگەوازی بۆ کردبێت وبە پەسەندی دانابێت وپاڵی بە خەڵکەوە نابێت کە قەرز بدەن بەوانەی پێویستیان پێی هەیە بە ڕەواشی داناوە کە کەسێك پێویستی هەبوو قەرز بکات و لە بەشی گەدایی مەکروهی دانەناوە، چونکە ئەم ئەو ماڵە وەرئەگرێت بۆ ئەوەی کەڵکی لێ وەرگرێت وپێویستی خۆی پێ جێبەجێ بکات، لەپاشاندا ئەوەندەی وەری گرتووە بیداتەوە بە خاوەن قەرز.

لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من نَفَّس عن مسلم كُرْبَةً من كُرَبِ الدنيا نفس الله عنه كربة من كرب يوم القيامة، ومن يَسَّر على معسرٍ يسرالله عليه في الدنيا والآخرة. والله في عون العبد مادام العبدُ في عون أخيه)[2].

واتە: هەرکەس تەنگ وچەڵەمە وناخۆشی‌یەك لە تەنگ وچەڵەمەکانی دونیا لە کۆڵ موسڵمانێك بخات خوا تەنگ وچەڵەمەیەك وناخۆشی‌یەك لە تەنگ وچەڵەمە وناخۆشی‌یەکانی ڕۆژی دوایی لە کۆڵ ئەخاتەوە. وە هەرکەس باری گرانی موسڵمانێك سوك بکات خوا باری گرانی دونیا ودوایی بۆ سووك ئەکات. وە هەتا بەندەکانی خوا یارمەتی دەری‌یەکتری بن خوا یارمەتی دەریانە. موسلیم وئەبوداودو (ترمذي) گێڕاویانەتەوە.

---

(١) الدارقطني (٣/٥٢).

(٢) مسلم (٢٦٩٩) وأبوداود (٤٩٤٦) والترمذي (١٩٣٠) وابن ماجه (٢٢٩).

٢- وە لە ئیبنومەسعودەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ما من مسلم يُقرِضُ مسلماً قرضاً مرتين إلا كان كصدقة مرةً)[١]. رواه ابن ماجه وابن حبان.

واتە: هیچ موسڵمانێك نی‌یە کە دوو جار قەرز بدات بە موسڵمانێك ئیللا وەك صەدەقەی‌یەك جار ئەبێت.

٣- وە لە ئەنەسەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (رأيت ليلة أسريَ بي على باب الجنة مكتوباً، الصدقه بعشر أمثالها، والقرض بثمانية عشر. فقلت: يا جبريل، ما بال القرض أفضل من الصدقة؟ قال: لأن السائل يسأل وعنده، والمستقرض لايستقرض إلا من حاجة)[٢].

واتە: ئەو شەوەی شەوڕەویم پێ کرا بینیم لەسەر دەرگای بەهەشت نوسراوە: چاکە دە قات بۆی ئەنوسرێتەوە، بەڵام قەرز هەژدە قات، وتم: ئەی جوبریل قەرز چی‌یە وا لە صەدەقە چاکترە؟ وتی: چونکە سواڵ کەر هەیەتی وداوای شتیش ئەکات، بەڵام قەرزکەر هەتا پێویستی پێی نەبێت قەرز ناکات.

**پەیمانی قەرز:**

وە پەیمانی قەرز پەیمانی بوون بە خاوەنە، کەواتە پێك نایەت بەو کەسە نەبێت کە مافی مامەڵەکردنی هەبێت، وە بە (إيجاب) و (قبول) دان و وەرگرتن نەبێت بەجێ نایەت وەك پەیمانی فرۆشتن و بەخشین.

وە بە لەفزی قەرز یا سەلەف پێك دێت، وە هەروەها بە هەموو ئەو لەفزانەی واتای قەرز ئەبەخشن.

وە لای مالیکی‌یەکان بوونە خاوەنی بە پەیمانەکە سابت ئەبێ با ماڵەکەش وەرنەگرێت، وە دروستە قەرزکەر وەك خۆی یا ئەو شتە خۆی بداتەوە بە خاوەنی، ئیتر شێوەیەك بن یا جیاواز بە مەرجێ نەگۆڕێ بە زیاد وکەم، جا ئەگەر گۆڕابوو ئەبێ وەك خۆی بدرێتەوە.

**بە مەرج گرتنی ماوە لە قەرزدا:**

جەماوەری فوقەها بۆ ئەوە چوون کە دروست نی‌یە ماوە دانان بۆ قەرز، چونکە بەخشینێکی پەتی‌یە وە خاوەن قەرز بۆی هەیە خێرا داوای بکاتەوە.

---

(١) ابن ماجه (٢٤٣٠) وابن حبان (٥٠١٨٠) والبيهقي (٥/٣٥٣-٣٥٤).

(٢) ابن ماجه (٢٤٣١).

جا ئەگەر قەرزەكە دواخرا بۆ ماوەیەكی دیاری كراو دوا نا كەوێت و هەر بە دەم ودەستی نەمێنێتەوە، واتە: بۆی هەیە خێرا داوای بكاتەوە.

مالیك فەرمویەتی: دروستە مەرج بۆ دانان ومەرجەكەش ئەسەپێ وپێویستە. جا ئەگەر قەرزەكە بۆ ماوەیەكی دیاری كراو دوا خرا ئەوە دوا ئەخرێت هەتا ئەوماوەیە، وە خاوەن قەرز بۆی نی‌یە داوای بكاتەوە هەتا ئەو كاتە نەیەت، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە كە فەرموویەتی: ﴿إِذَا تَدَايَنتُمْ بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى﴾ (البقرة:٢٨٢).

واتە: ئەگەر قەرزێكتان دا بۆ ماوەیەكی دیاری كراو بینوسن.

وە بەپێی ئەوەی عەمری كوڕی عەوفی موزەنی لە باوكی‌یەوە لە باپیری‌یەوە گێڕاویەتی‌یەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (المسلمون عند شروطهم)[1]. رواه أبوداود وأحمد والترمذي والدارقطني.

واتە: موسوڵمانان لەسەر مەرجەكانیانن.

**ئەو شتانەی قەرز كردن تیایاندا دروستە:**

دروستە ئاژەڵ وقوماش قەرز بكرێت، چونكە سابتە پێغەمبەر ﷺ نوێنگینە ووشترێكی قەرز كردووە[2].

وەك چۆن دروستە ئەو شتانەی پێوانە ئەكرێن وكێشانە ئەكرێن قەرز بكرێت یا ئەو شتانەی بۆ بازرگانی دائەنرێن. هەروەها دروستە نان وهەویر قەرز بكرێت بەپێی حەدیسەكەی عائیشە ڕەزای خوای لێ بێت كە فەرمویەتی: ووتم: ئەی نێرراوی خوا دراوسێكانمان نان وهەویر قەرز ئەكەن لە یەكتر بە زیادی وناتەواوی ئەی بەئەوە بۆ خاوەنی، فەرمووی: قەیناكە، ئەوە لەبەر میهرەبانی خەڵكە بە خەڵك مەبەست زیادە وەرگرتن نی‌یە تێیدا[3].

وە لە موعاذەوە كاتێ لێیان پرسی دەربارەی قەرز كردنی نان و هەویر فەرموی: سبحان الله ئەوە لە ڕەوشت چاكی‌یەوەیە. جا گەورە وەریگرەو بچوك ببەخشە، وە بچوك وەریگرە و گەورەتر

(١) أبوداود (٣٥٩٤) وابن ماجه (٢٣٣٥) وأحمد (٣٦٦/٢) والدارقطني (٢٧/٣).

(٢) أبوداود (٣٥٩٤) والترمذي (١٣٥٢) وابن ماجه (٢٣٥٣) وأحمد (٣٦٦/٢) والدارقطني (٢٧/٣).

(٣) إرواء الغليل (٢٣٢/٥).

بەخشەرەوە. چاکترین کەستان ئەوەتانە کە قەرزەکەی بە چاکی ئەداتەوە، خۆم لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە ئەوەی ئەفەرموو[1].

**هەر قەرزێك کەلکی لەگەڵ خۆی ڕاکێشا ئەوە سوودە:**

مەبەست لە پەیمانی قەرز بەزەیی هاتنەوەیە بە خەڵکدا ویارمەتی دانیانە لە کاروباری ژیانیاندا و ئاسان کردنی هۆیەکانی ژیانە، وە هۆیەك نییە لە هۆیەکانی کاسبی، وە شێوەیەك نییە لە شێوەکانی فرسەت خوازی.

هەر لەبەر ئەوەیە کە دروست نییە قەرزار زیاتر لەوەی کە قەرزی کردووە یا زیاتر لە وەك ئەو بگێڕێتەوە بۆ خاوەن قەرز، بەپێی قاعیدەی فیقهی کە ئەڵێت: (کل قرض جر نفعاً فهو رباً) واتە: هەر قەرزێك سوودێکی لەگەڵ خۆی ڕاکێشا ڕیبایە[2].

وە حەرامی‌یەکە لێرەدا ئەبەسترێتەوە بەوەوە کە ئەگەر ئەو سوودە بە مەرج دانرابێت یا لەسەری ڕێك کەوتبن.

جا ئەگەر بە مەرج دانەنرابێت و لەسەری ڕێك نەکەوتبن، بۆ قەرزدار هەیە کە لە شتە قەرز کراوەکە چاکتر بداتەوە لە سیفەتدا یا لە ئەندازەی ئەو زیاتر بداتەوە، یا خانووەکەی پێ بفرۆشێت ئەگەر مەرج بوو خانووەکەی پێ بفرۆشێت.

وە خاوەن قەرز مافی وەرگرتنی هەیە بێ کەراهەت، بەپێی ئەوەی ئەحمەد و موسلیم و خاوەن سونەنەکان گێڕاویانەتەوە لە ئەبی ڕافیعەوە کە ووتویەتی: پێغەمبەر ﷺ نوێنگینە ووشترێکی بە قەرز وەرگرت لە کابرایەك. پاش ماوەیەك ووشتری زەکاتی بۆ هات، فەرمانی پێ دام کە قەرزی کابرا بدەمەوە وەك خۆی. ئەڵێ: ووتم: لەناو ووشترەکاندا وشتری گەورە وحەوت ساڵ زیاتری تێدا نییە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أعطه إياه، فإن خيركم أحسنكم قضاءً)[3].

واتە: لەوانە بیدەرێ بەڕاستی چاکترینتان ئەوەتانە کە بە چاکی قەرز ئەداتەوە.

---

(١) إرواء الغليل (٢/٢٣٣) ومجمع الزوائد (٤/١٣٩).

(٢) ئەم قاعیدەیە ڕاستە لەڕوی شەرعەوە هەرچەندە حەدیسیش لەبارەیەوە سابت نەبووە، وە ئەو حەدیسەش کە لەو بارەوە هاتووە لە عەلی‌یەوە ئیسنادەکەی کەوتووە. وە (حافظ) وتوویەتی: شایەتێکی لاوازی هەیە لە فوچالەی کوڕی عبید لەلای بەیهەقی، وە شایەتێکی تر کە مەوقوفە لە عبدالله ی کوڕی سەلامەوە لای بوخاری.

(٣) أحمد (٦/٣٩٠) ومسلم (١٦٠٠) وأبوداود (٣٣٤٦) والترمذي (١٣١٨) والنسائي (٧/٢٩١) وابن ماجه (٢٢٨٥).

وە جابیری کوڕی عبداللە فەرمویەتی: قەرزێکم لەسەر پێغەمبەر ﷺ هەبوو قەرزەکەی دامەوە بە زیادەوە. ئەحمەد[1] و بوخاری وموسلیم گێڕاویانەتەوە.

پەلە کردن لە قەرز دانەوە پێش مردن:

١-ئیمامی ئەحمەد ئەگێڕێتەوە کە پیاوێك پرسی لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی برایەکی کە کۆچی دوایی کردبوو قەرزی لەسەر بوو، ئەویش ﷺ فەرمووی: (هو محبوس بدينه، فاقض عنه).

واتە: ئەو بەهۆی قەرزەکەیەوە بەند کراوە، لە جیاتی ئەو قەرزەکە بدەرەوە.

ووتی: ئەی نێرراوی خوا، قەرزەکەم داوەتەوە دوو دیناری نەبێت کە ژنێك داوای ئەکات وشایەتی نی‌یە.

فەرمووی: بیدەرێ ڕاست ئەکات[2].

٢- وە ئەگێڕنەوە پیاوێك ووتی: ئەی نێرراوی خوا، ئایا ئەگەر بە گیان وبە ماڵ جیهادم کرد بە هیوای پاداشت لە خواوە و کوژرام لە کۆڕی جەنگدا و ئارامم گرت و ڕووم لە مەیدانی جەنگ کرد بێ ئەوەی پشتم هەلکردبێت ئەچمە بەهەشتەوە؟ فەرمووی: بەڵێ، دوو جار یا سێ جار ئەوەی فەرموو.

فەرمووی: (إلا إن مُتَّ وعليك دين وليس عندك وفاءٌ).

واتە: مەگەر کە مردی قەرزت لەسەر بێت و ئەوەندەت نەبێ قەرزەکەی پێ بدرێتەوە.

وە جارێکیان پێ ی ڕاگەیاندن شتێکی توند وتیژ هاتۆتە خوارەوە ئەوانیش پرسیاریان لێ کردچی‌یە؟ فەرموی: (الدين، والذي نفسي بيده لو أن رجلاً قتل في سبيل الله ثم عاش، ثم قتل في سبيل الله ثم عاش، ثم قتل في سبيل الله مادخل الجنة حتى يقضي دينه)[3].

واتە: قەرزە، بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە، ئەگەر پیاوێك کوژرا لە ڕێگای خوادا پاشان زیندو بۆوە، پاشان کوژرایەوە لە ڕێگای خوادا، پاشان زیندو بۆوە، پاشان کوژرایەوە لە ڕێگەی خوادا ناچێتە بەهەشتەوە هەتا قەرزەکەی نەداتەوە.

---

(١) أحمد (٣/٣٠٢) والبخاري (٢٣٩٤) ومسلم (٧١٥/٧١).

(٢) أحمد (٥/٧).

(٣) مسلم (١٨٨٥).

٣- له ئەبی سەلەمەی کوری عبدالرحمن ەوە له جابیری کوری عبدالله وە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر پیاوێك نە ئەکرد بمردایە و قەرزی لەسەر بوایە، جارێکیان مردو یەکیان هێنا بۆلای فەرمووی: ئایا قەرزی کەسی لەسەرە؟ ووتیان: بەڵێ، دوو دینار، فەرمووی: خۆتان نوێژ لەسەر هاوەڵەکەتان بکەن.

ئەبوقەتادەی ئەنصاری ووتی: هەردوو دینارەکە لەسەر من، من ئەیان دەمەوە ئەی نێرراوی خوا، ئیتر پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر کرد. کاتێ خوا دەروی کردەوە له پێغەمبەرەکەی ﷺ فەرمووی: (أنا أولى لكل مؤمن من نفسه، فمن ترك ديناً فعليَّ قضاؤه، ومن ترك مالاً فلورثته). أخرجه البخاري ومسلم والترمذي والنسائي وابن ماجة من حديث أبي سلمة ابن عبدالرحمن عن أبي هريرة[1].

واتە: من له باوەر داران له پێش ترم بۆ خۆیان، هەرکەسێکیان مرد وقەرزی لەسەر بوو دانەوەی لەسەر منە، وە هەرکەس ماڵی بەجێ هێشت بۆ میرات گرەکانی‌یەتی.

٤-وە حەدیسەکەی بوخاری له ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من أخذ أموال الناس يريد أداءها أدي الله عنه. ومن أخذها يريد إتلافها أتلفه الله)[2].

واتە: هەرکەس ماڵی خەڵك وەربگرێت بە مەبەستی دانەوەی، خوا بۆی ئەداتەوە، وە هەرکەس وەری گرت بە مەبەستی لەناوبردنی خوا لەناوی ئەبات.

دوا خستنی قەرز له لایەن دەست دارەوە ستەمکاری‌یە:

له ئەبوهورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مطل الغني ظلم، وإذا أُتْبِعَ أحدُكم على مليء فليتبع)[3]. رواه أبوداود وغيره.

واتە: دوا خستنی قەرزدانەوە له لایەن دەوڵەمەندەوە ستەمکاری‌یە، وە ئەگەر کەسێکتان حەواڵە کرا بۆ سەر دەوڵەمەندێك با قبوڵی بکات.

پەسەندی وەستان لەسەر کەم دەست:

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِنْ كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ وَأَنْ تَصَدَّقُوا خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ (البقرة:٢٨٠).

---

(١) البخاري (٢٢٨٩) وأحمد (٤/٤٧و٥٠) والترمذي (١٠٦٩) والنسائي (٤/٦٥) وابن ماجه (٢٤٠٧).

(٢) البخاري (٢٣٨٧) وابن ماجه (٢٤١١).

(٣) البخاري (٢٢٨٨) ومسلم (١٥٦٤) وأبوداود (٣٣٤٥).

واتە: ئەگەر قەرزدار دەست کورت بوو با مۆڵەت بدرێت هەتا تواناى ماڵى ئەبێت، وە ئەگەر گەردنیان ئازاد بکەن لەرێی خوادا چاکترە بۆتان ئەگەر پێی بزانن.

١-وە ئەگێڕنەوە لە ئەبى قەتادەوە کە داواى قەرزى کرد لە پیاوێك کە قەرزارى بوو ئەویش خۆى شاردەوە پاشان دیەوە، کابرا ووتى: تەنگە دەستم، ووتى: تو خوا بەڕاستتە؟ ووتى: ئەرێ وەڵلاە وتى: من خۆم گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە ئەى فەرموو: (من سره أن ينجيه الله من كرب يوم القيامة فلينفس عن معسر أو يضع عنه)[1].

واتە: کێ لاى خۆشە خوا لە تەنگ وچەڵمەکانى رۆژى دوایى رزگارى بکات با مۆڵەتى تەنگە دەست بدات یا گەردنى ئازاد بکات و لەسەرى لابدات.

٢- وە لە کەعبى کوڕى عومەرەوە هاتووە فەرمویەتى: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو ئەیفەرموو: (من أنظر معسراً أو وضع عنه أظله الله في ظله)[2].

واتە: هەرکەس مۆڵەتى تەنگە دەستێك بدات یا لە کۆڵى بخات خوا ئەیخاتە ژێر سێبەرى خۆى.

لابردنى هەندێ لە قەرز لەسەر قەرزار بۆ ئەوەى بەپەلە بیداتەوە:

جەماوەرى زانایان بۆ ئەوە چوون کە لابردنى هەندێکى قەرزەکە لەسەر قەرزدار بۆ ئەوەى پێش ماوە دیارى کراوەکە بیداتەوە بە پەلە کارێکى حەرامە.

جا هەرکەس قەرزێك بدات بە کەسێکى تر بۆ ماوەیەکى دیارى کراو، لەپاشاندا خاوەن قەرز بە قەرزارەکە بڵێت: لە هەندێکى قەرزەکە گەردنت ئازاد ئەکەم بۆ ئەوەى پێش کات بە پەلە قەرزەکەم بدەیتەوە ئەمەش کارێکى حەرامە.

ئیبنوعەبباس و زۆربەر ئەو کارە بە دروست ئەزانن، بەپێی ئەوەى ئیبنوعەبباس گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ فەرمانى دا بە دەرکردنى بەنى نەچیر، کۆمەڵێ لە خەڵکى بەنى نەچیر هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ووتیان: ئەى نێرراوى خوا تۆ فەرمانى دەرکردنى ئێمەت داوە، ئێمە قەرزمان هەیە لەسەر خەڵك ماوەکەى تەواو نەبووە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: (ضعوا وتعجلوا)[3].
واتە: کەمى بکەن و پەلە بکەن.

واتە: هەندێکى لێ لا بەرن وئەوەکەى تریش زووتر لە مۆڵەتى خۆى وەربگرنەوە.

---

(١) مسلم (١٥٦٣).

(٢) ابن ماجه (٢٤١٩) والحاكم (٢/٢٨-٢٩) ومجمع الزوائد (٤/١٣٤).

(٣) الحاكم (٢/٥٢).

## بارمته (رهن)

**پێناسه‌که‌ی:**

ڕه‌هن له‌ لۆغه‌تا به‌ مانای جێگیر بوون وده‌وامه‌، هه‌روه‌ك به‌ حه‌بس وبه‌ند کردنیش ئه‌ووترێ، مانای یه‌که‌م وه‌کو ئه‌ڵێن: (نعمة راهنة) واته‌: نیعمه‌تێکی به‌رده‌وام و سابت.

وه‌ مانای دووه‌م وه‌ك ئه‌م ئایه‌ته‌: ﴿کل نفس بما کسبت رهینة﴾ واته‌: هه‌موو نه‌فسێك به‌ند کراوه‌ لای خوا به‌ هۆی کرده‌وه‌کانی‌یه‌وه‌.

به‌ڵام مانی ڕه‌هن له‌ شه‌رعدا: زانایان پێناسه‌یان کردووه‌ که‌: دانانی شتێکه‌ نرخی سامانی هه‌بێت به‌پێی شه‌رع، وه‌ به‌ستنه‌وه‌ی به‌ قه‌رزه‌وه‌ به‌ شێوه‌یه‌ك بتوانرێت ئه‌و قه‌رزه‌ یا هه‌ندێ له‌و قه‌رزه‌ له‌و شته‌ هه‌ڵبگیرێت.

جا ئه‌گه‌ر که‌سێك قه‌رزی دا به‌ که‌سێکی تر وه‌ به‌رامبه‌ر ئه‌و قه‌رزه‌ شتێکی وه‌ك خانوو و زه‌وی یا ئاژه‌ڵ به‌ندکرد له‌ ژێر ده‌ستی خاوه‌ن قه‌رزدا هه‌تا قه‌رزه‌که‌ ئه‌داته‌وه‌ ئه‌وه‌ پێی ئه‌ڵێن: بارمته‌ به‌پێی یاسای ئیسلام.

وه‌ به‌ خاوه‌ن شتی قه‌رزکه‌ر ئه‌وترێ: بارمته‌ دانه‌ر (راهن)، وه‌ به‌ خاوه‌ن قه‌رزه‌که‌ی شته‌که‌ وه‌رئه‌گرێت و به‌ندی ئه‌کات لای خۆی له‌ بریتی قه‌رزه‌که‌ ئه‌ووترێ: بارمته‌ وه‌رگر (المرتهن) وه‌ك چۆن به‌ شته‌ دانراوه‌که‌ له‌ بریتی قه‌رزه‌که‌ ئه‌ووترێ: بارمته‌ (رهن).

**دانانی له‌ یاسای ئیسلامدا:**

بارمته‌ دروسته‌ به‌پێی کیتاب وسوننه‌ت وئیجماع. به‌پێی کیتاب خوای گه‌وره‌ فه‌رموویه‌تی: ﴿وَإِنْ كُنتُمْ عَلَى سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا فَرِهَانٌ مَقْبُوضَةٌ فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُمْ بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ وَلْيَتَّقِ اللَّهَ رَبَّهُ﴾ (البقرة/٢٨٣).

واته‌: وه‌ ئه‌گه‌ر ئێوه‌ له‌ سه‌فه‌ر بوون ونوسه‌رێکتان ده‌ست نه‌که‌وت، بارمته‌یه‌ك وه‌ربگرن، وه‌ کاتێ له‌ یه‌کتری دڵنیا بوون با ئه‌و که‌سه‌ی سپارده‌که‌ی لا دانراوه‌ بیداته‌وه‌ به‌ خاوه‌نی وله‌ خوای په‌روه‌رده‌گاری خۆی بترسێت.

وه‌ به‌پێی سوننه‌تیش: پێغه‌مبه‌ر ﷺ درعه‌که‌ی به‌ بارمته‌ داناوه‌ لای جوله‌که‌یه‌ك. کاتێ داوای جۆی لێ کرد به‌ قه‌رز، جوله‌که‌که‌ ووتی: موحه‌مه‌د ئه‌یه‌وێ ماڵه‌که‌م ببات. پێغه‌مبه‌ر ﷺ

فەرمووی: (كذب، إني لأمين في الأرض، أمين في السماء، ولو ائتمنني لأدَّيت، إذهبوا إليه بدرعي)[1].

واتە: درۆ ئەکات، من ئەمینم لە زەوی وئاسماندا، و ئەگەر بە ئەمانەت بیداماية ئەمداوە، درعەکەمی بۆ ببەن بالای بێت بە بارمتە.

وە بوخاری وکەسانی تر لە دایکی موسڵمانانەوە عائیشە خوای لێ ڕازی بێت ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ خواردنی لە جولەکەیەك کڕی و درعەکەی بە بارمتە لا دانا[2].

زانایان هەموو لەسەر ئەوە کۆن و کەس جیاوازی نی‌یە لە دروستی و مەشروعیدا، هەر چەندە جیاوازیان هەیە لە مەشروعی بوونیدا لەناو شاردا.

جەماوەر ووتویانە: لە شاردا مەشروعە، وەك چۆن لە سەفەردا مەشروعە، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کاتێ لەناو شاری مەدینەدا بووە کردویەتی، بەڵام بەستنەوەی بە سەفەرەوە لە ئایەتەکەدا لەبەر ئەوەیە کە زۆری بارمتە لە سەفەردا ئەکرێت.

موجاهید و ضەححاك و ڤاهیری‌یەکان ووتویانە: بارمتە لە سەفەردا نەبێت دانەنراوە بەڵگەشیان ئایەتەکەیە، وە حەدیسەکە بەڵگەیە بەسەریانەوە.

مەرجەکانی دروستی:

مەرجە بۆ دروستی پەیمانی بارمتەکە ئەمانەی خوارەوە:

١- ژیری.

٢- پێگەیشتویی (بلوغ).

٣- شتە بە بارمتە دانراوەکە ئامادە بێت کاتی پەیمانەکە باشتێکی هاوبەشیش بێت.

٤- ئەبێ بارمتە وەرگر خۆی یا وەکیلەکەی وەری بگرن.

ئیمامی شافیعی فەرمویەتی: خوا حوکمەکەی دانەناوە ئیللا بە بارمتەیەکەوە کە وەرگیرابێت، جا ئەگەر سیفەتی وەرگرتن نەبوو، پێویستە حوکمەکەش نەبێت.

وە مالیکی‌یەکان ووتویانە: بارمتە بە پەیمانەکە ئەسەپێت، وە زۆر لە بارمتە دانەرەکە ئەکرێت بارمتەکە بدات بە بارمتە لادانراوەکە بۆ ئەوەی لە ژێر دەستی بێت. وە هەر کاتێ بارمتەکەی

(١) النسائي في الكبرى (٦٢٢٤).

(٢) البخاري (٢٥١٣) ومسلم (١٦٠٣).

وەرگرت خاوەن بارمتە توانای سوود لیٚ وەرگرتنی هەیە. بە پیٚچەوانەی شافیعی‌یەوە کە فەرموویەتی: بە شیٚوەیەك مافی سوود لیٚ وەرگرتنی هەیە کە زیان بە بارمتەوەرگر نەگەیەنیٚت.

**سوود وەرگرتنی بارمتە وەرگر لە بارمتەکە:**

پەیمانی (رهن) بارمتە پەیمانیٚکە مەبەست لیٚی بەستنەوە و چەمانەتی قەرزەکەیە، مەبەست لیٚی بەکارهیٚنان وقازانج لیٚ وەرگرتنی نی‌یە، وە مادام ئەوە بەو شیٚوەیە دروست نی‌یە بۆ بارمتە وەرگر سوود لە بارمتەکە وەربگریٚت، با خاوەن بارمتەکەش ریٚی پیٚ بدات، چونکە قەرزیٚکە سوودی راکیٚشاوە، وە هەر قەرزیٚکیش سوودی راکیٚشا ریبایە. ئەمە لە شیٚوەیەکدا کە بارمتەکە وولاّغ نەبیٚت بۆ سواری، یا ئاژەڵ نەبیٚت بدۆشریٚت. جا ئەگەر وولاّغ بوو یا ئاژەڵ بۆی هەیە سوودی لیٚ وەربگریٚت بەرامبەر بەو نەفەقەیەی سەرفی ئەکات بۆی. وە ئەگەر نرخی کیٚشا ئەوە بۆی هەیە سوودی لیٚ وەربگریٚ، جا ئەوەی بۆ سواری ببیٚت وەك ووشتر و ئەسپ و هیٚستر و ئەو جۆرانە سواری بیٚت و باری پیٚ هەڵبگریٚت و شیری ئاژەڵەکە وەربگریٚت، ئەگەر مانگا ومەڕ وئەو شتانە بوو. وە بەڵگەی ئەمانیش ئەمانەی خوارەوەیە:

(أ) لە شیعبی‌یەوە لە ئەبوهورەیرەوە لە پیٚغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: (لبن الدَّر يحلب بنفقته إذا كان مرهوناً، والظهر يركب بنفقته اذا كان مرهوناً، وعلى الذي يركب ويحلب النفقة)[1].

واتە: شیری گوان ئەدۆشریٚ کاتیٚ بارمتە بیٚت لە جیاتی نەفەقەکیٚشانی، وە وولاّغی سواری سوار ئەبن ئەگەر بارمتە بوو لە جیاتی نەفەقە کیٚشانی، وە نەفەقە کیٚشان لەسەر ئەو کەسەیە کە شیرەکە ئەدۆشیٚ وسوار ئەبیٚت.

ئەبوداود فەرموویەتی: ئەم حەدیسە لای ئیٚمە راستە، وە کەسانی تریش تەخریجیان کردووە لەوانە بوخاری و (ترمذي) و ئیبنوماجە

(ب) وە هەروەها لە ئەبوهورەیرەوە لە پیٚغەمبەرەوە ﷺ کە ئەیفەرموو: (الظهر يركب بنفقته إذا كان مرهوناً ولبن الدَّرِّ يُشرب بنفقته إذا كان مرهوناً وعلي الذي يركب ويشرب النفقة)[2]. رواه الجماعة إلا مسلماً والنسائي.

---

(١) البخاري (٢٥١٢) وأبوداود (٣٥٢٦) والترمذي (١٢٥٤) وابن ماجه (٢٤٤٠).

(٢) تەخریجەکەی باس کراوە.

واته: وولاغی سواری ئەگەر لە بارمتەدا بوو بارمتە لادانراو دروستە سواری ببێت، وە ئاژەڵی شیردار ئەگەر لە بارمتەدا بوو دروستە شیرەکەی بخواتەوە، وە نەفەقە کێشانی لەسەر ئەو کەسەیە کە سواری ئەبێت وشیرەکەی ئەخواتەوە.

وە لە زاراوەیەکی تردا هاتووە (إذا كانت الدابة مرهونة فعلى المرتهن علفها، ولبن الدَّرِّ يشرب وعلى الذي يشرب نفقته). رواه أحمد رحمه الله[1].

واته: ئەگەر وولاغ بارمتە بوو ئالفی لەسەر بارمتە وەرگرەکەیە، وە شیری گوانی بارمتە ئەخورێتەوە، وە نەفەقەی لەسەر ئەو کەسەیە شیرەکەی ئەخواتەوە.

(ج) لە ئەبو صالحەوە لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (الرهن محلوب مركوب. أو مركوب محلوب) وەك لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە[2].

واته: بارمتە ئەدۆشرێ وسواری ئەبن.

**تفاقی بارمتە و سوودەکانی:**

تفاقی بارمتەو کرێی پاراستن و کرێی گێڕانەوەی بۆ خاوەنی لەسەر خاوەنەکەیەتی، وسوودی ڕەهن بۆ بارمتە دەرە، وە زیاد بوونی بارمتەکەش هەر ئەبێت بە بارمتە، و لەگەڵ ئەسڵەکەدا دەمێنێتەوە، وە بەچکە و خوری و بەروبوم و شیر ئەگرێتەوە. بەپێی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (له غنمه وعليه غرمه)[3].

واته: سوودەکەی بۆ ئەوە و زیان دانەوەشی لەسەر ئەوە.

وە شافیعی فەرمویەتی: ئەوانە هیچیان ناچنە سەر بارمتەکە و نابن بە بارمتە.

وە مالیك فەرمویەتی: بەچکە وکۆرپەڵەی دارخورما نەبێت هیچ ناچنە سەر بارمتە.

جا ئەگەر بارمتەگر نەفەقەی بارمتەکەی کێشا بە پرسی حاکم کاتێ بارمتەدەر دیار نەبوو لەگەڵ ڕێ نەدانی بارمتەدەردا، ئەوە ئەبێتە قەرز بەسەر بارمتەدەرەوە.

---

(1) أحمد (٢/٤٧٢).

(2) الحاكم (٢/٥٨) والدارقطني (٣/٣٤).

(3) الشافعي في مسنده (٢/١٦٤) والدارقطني (٣/٣٣).

**بارمته ئهمانهته:**

وه بارمته سپاردهیه به دهست بارمته وهرگرهوهو (چمان) دهستبهری نیيه هەتا به قهستی زیانی پیّ نهگهیهنیّت له لای ئهحمهد و شافیعی.

**مانهوهی بارمتهکه ههتا قهرزهکهی ئهدرێتهوه:**

ئیبنومونزیر فهرمویهتی: ههموو ئهوانهی زانستیيان لیّوه فیّر بووم لهسهر ئهوه کۆن که ههرکهس شتیّکی کرده بارمته له جیاتی مالیّك پاشان ههندیّ لهو مالّهی داوه ویستی ههندیّکی بارمتهکه له بارمتهیی دهربهیّنیّ، ئهو کارهی بۆ نیيه ههتا ههموو مالّهکه نهداتهوه، یا کابرا گهردنی ئازاد نهکات.

**دواخستنی بارمته:**

خووڕهوشتی عهرهب وابوو ئهگهر بارمته دانهر نهیتوانیایه ئهوهی لهسهریهتی بیداتهوه له قهرز ئهو بارمتهیه له مالّی ئهو دهرئهچوو، وه بارمتهگر دهستی بهسهرا ئهگرت. بهڵام کاتیّ ئیسلام هات ئهم شێوهیهی پوچهڵ کردهوه و قهدهغهی کرد. وه ههرکاتیّ ماوهکه تهواو بوو ئهبیّ بارمتهدهر ئهو قهرزهی لهسهریهتی بیداتهوه، بهڵام ئهگهر نهیداوه و ڕهیّ نهدا به فرۆشتنی بارمتهکه حاکم ئهبیّت زۆری لیّ بکات یا قهرزهکهی بداتهوه یا بارمتهکه بفرۆشیّت، جا ئهگهر فرۆشرا وله نرخی قهرزهکه زیاتر بوو ئهوهی ئهمیّنیّتهوه بۆ خاوهنی ئهبیّت، بهڵام ئهگهر قهرزهکهی تهواو نهکردو شتیّکی مایهوه لهسهر بارمته دانهرهکهیه ئهبیّ بیداتهوه.

وه له حهدیسهکهی موعاویيهی کوڕی عبدالله ی کوڕی جهعفهردا هاتووه: که پیاویّك خانوویهکی کرده بارمته بۆ ماوهیهکی دیاری کراو له شاری مهدینه، ماوهکه کۆتایی هات، ئهوهی بارمتهکهی لهلا دانرا بوو ووتی: ئیتر خانووی خۆمه. پیّغهمبهر ﷺ فهرمووی: (لایغلق الرهن من صاحبه الذي رهنه، له غنمه وعلیه غرمه).

واته: بارمته وهرگر شایستهی بوونه خاوهنی بارمتهکهی نیيه کاتیّ خاوهنه ئهسڵیيهکهی نهیتوانی قهرزهکه بداتهوه، سوودهکهی ههر بۆ ئهوه و زیانهکهشی ههر لهسهر ئهوه. شافیعی و ئهبورهم و (دارقطني) ڕیوایهتیان کردووه، دارقطني فهرمویهتی: ئیسنادهکهی حهسهن و (متصل)ه.

ئیبنوحەجەر لە کتێبی (بلوغ المرام) دا فەرمویەتی: پیاوەکانی جێی باوەڕن، بەڵام ئەوەی لای ئەبوداود وکەسانی تر لەبەر کراوە ئەوەیە کە مورسەلە[1].

مەرج دانان بۆ فرۆشتنی بارمتە کاتی هاتنی ماوەکە:

بەڵام ئەگەر مەرجی فرۆشتنی بارمتەکە دانرا کاتێ ماوەکە کۆتایی هات و بارمتە دانەر نەیتوانی قەرزەکە بداتەوە دروستە فرۆشتنی و بارمتەگر مافی ئەوەی ئەبێت کە بارمتەکە بفرۆشێت بە پێچەوانەی شافیعی‌یەوە کە ڕای وایە مەرج لێرەدا پوچەڵە.

پوچەڵ بوونەوەی بارمتە:

هەرکاتێ بارمتەکە دراوە بە بارمتەدانەر بە ئارەزووی بارمتەگر بارمتە دانانەکە پوچەڵ ئەبێتەوە.

زەوی داچاندن (المزارعة)

فەضل و چاکی (مزارعة):

(قرطبـي) فەرمویەتی: کشت وکاڵ کردن فەرزی کیفایەتە، لەسەر پێشەوا پێویستە زۆر لە خەڵك بکات بۆ کشت وکاڵ کردن، وە هەرچی لەو بارەیەوەیە وەك چاندنی دارو درەخت.

١- بوخاری وموسلیم لە ئەنەسەوە ﷺ ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ما من مسلم يغرس غرساً، أو يزرع زرعاً، فيأكل منه طير أو إنسان أو بهيمة إلا كان له به صدقة)[2].

واتە: هیچ موسڵمانێك نی‌یە کە دارێك بچەقێنێت یا شتێك بچێنێت باڵندە یا ئادەمیزاد یا ئاژەڵ لێی بخوات ئیللا بۆی ئەبێت بە خێر و صەدەقە.

٢- وە (ترمذي) تەخریجی کردووە کە عائیشە ڕەزای خوای لەسەربێ فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی‌یەتی: (التمسوا الرزق من خبايا الأرض)[3].

واتە: بگەڕێن بۆ ڕۆزیتان لە چینەکانی زەویدا.

---

(١) الشافعي (٢/١٦٤) والدارقطني (٣/٣٢) والحاكم (٢/٥١) والبيهقي (٦/٣٩) وابن حبان (٥٩٣٤) وابن ماجه (٢٤٤١).

(٢) مسلم (١٥٥٢/٨و٩).

(٣) ضعيف الجامع (١١٥٠) والسلسلة الضعيفة (٢٤٨٩).

**پێناسەی (مزارعة):**

واتای (مزارعة) لەلوغەتدا: مامەڵە کردنە لەسەر زەوی بۆ دەرهاتنی هەندێ شت لێی.

وە واتاکەی لێرەدا: زەوی دانە بەو کەسانەی کشتوکاڵی لەسەر ئەکەن بۆ ئەوەی بەشێکی ئەو کەسەی تێدا بێت لەوەی کە لێی دەردێ وەك نیوەی یا سێ‌یەکی یا زیاتر لەوە یا کەمتر لەوە بەپێی ڕێکەوتنی هەردوولا.

**مەشروعی‌یەتی:**

چاندن جۆرێکە لە هاوکاری نێوان جوتیار وخاوەن زەوی، چونکە جاری وا ئەبێت جوتیار زۆر پسپۆڕە لە چاندندا بەڵام زەوی نی‌یە بۆچاندن.

وە جاری وا ئەبێت کە خاوەن زەوی تواناى چاندنی نامێنێ، جا ئیسلام (مزارعە)ی دایناوە بۆ یارمەتی هەردوولا.

وە (مزارعة)زەوی دان بۆ چاندن، پێغەمبەر ﷺ لە ژیانیدا کردویەتی و هەروەها هاوەڵەکانی دووای ئەو کاریان پێ کردووە.

بوخاری وموسلیم لە ئیبنوعەبباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێت ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ زەوی داوە بە خەلکی خەیبەر بە نیوەیی، کشتوکاڵ بوایە یا بەروبومی درەختی.

محمد الباقری کوڕی علی کوڕی حسین خوا لێ‌یان ڕازی بێت فەرمویەتی: لە مەدینەدا کۆچکەر نی‌یە زەوی نەچاندبێ بە سێ‌یەك یا چواریەك.

وە عەلی وسەعدی کوڕی مالیك وعبدالله کوڕی مەسعود وعومەری کوڕی عبدالعزیز وقاسم وعوروە و خزم و کەسی ئەبوبەکر و عومەر و عەلی و ئیبنوسیرین ڕەزای خوایان لەسەربێ زەوی‌یان داچاندووە. بوخاری گێڕاویەتی‌یەوە.

لە کتێبی (المغني)دا هاتووە: ئەو کارە کارێکی بە ناو بانگ بووە پێغەمبەر ﷺ هەتا کۆچی دوایی کردووە کاری پێ کردووە، وە لە پاش ئەو خەلیفەکانی راشدین هەتا کۆچی دوایی‌یان کردووە لەپاشاندا کەس وکاریان.

و هیچ ماڵێك نەماوە لە مەدینەدا کە کاری پێ نەکردبێت، وە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ کاریان پێ کردووە دوای پێغەمبەر ﷺ وە شتی ئاوها دیارە کە دروست نی‌یە نسخ بێتەوە، چونکە نسخ -سڕینەوە- لەکاتی ژیانی پێغەمبەردا ﷺ دەبێت.

**بەڵام ئەو شتەی خۆی ﷺ کاری پێ کردووە بێت هەتا مردن، لە پاشاندا خەلیفەکان دوای ئەو ﷺ لەسەری رۆیشتون، وە صەحابە ئیجماعیان هەبووە لەسەری وکاریان پێ کردووە خوایان لێ رازی بێت و کەسیان موخالەفەی نەکردووە، چۆن ئەبێت سڕرابێتەوە؟**

**جا ئەگەر سڕرانەوەی لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ بووە، ئەی چۆن کاری پێ کردووە دوای سڕرانەوەی، وە چۆن سڕرانەوەی شاراوەتەوەو نەگەیشتوە بە خەلیفەکانی لەگەڵ بە ناوبانگی بەسەرهاتی خەیبەر و کارکردنیان تێیدا.**

**ئایا گێڕەرەوەی سڕرانەوەی لە کوێ بووە کە کەس باسی نەکردووە و پێی رانەگەیاندوون؟**

**ئەوەی هاتووە دەربارەی قەدەغە کردنی:**

**وە ئەوەی رافیعی کوڕی خەدیج باسی کردووە کە پێغەمبەر ﷺ (مزارعة)ی قەدەغەی کردووە، زەیدی کوڕی پابیت رەددی داوەتەوە ﷺ و، رایگەیاندووە ئەو قەدەغە کردنەی بۆ نەهێشتنی ناکۆکی‌یەك بووە، جا فەرمویەتی: خوا لە رافیعی کوڕی خەدیج خۆش بێت، سوێند بە خوا من لەو زیاتر ئاگاداری حەدیسەکەم. کە دوو پیاوی ئەنصاری بە شەڕ هاتبوون، هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمووی: ئەگەر ئێوە ئەوە حاڵتان بێت زەوی مەدەن بە چاندن، رافیع تەنها گوێی لەوە بووە کە فەرموویەتی: زەوی مەدەن بە چاندن. ئەبوداود ونسائی گێڕاویانەتەوە[1].**

**وەك چۆن ئیبنوعەبباس رەددی داوەتەوە و دەری خستووە کە قەدەغە کردنەکە لە پێناوی رێنمایی کردنیان بووە بۆ شتێك کە لەوە چاکتر بووە بۆیان. جا فەرموی: بەڕاستی پێغەمبەر ﷺ زەوی دان بە چاندنی حەرام نەکردووە. بەڵام فەرمانی داوە کە ئەبێ خەڵك یارمەتی‌یەك بدەن تێیدا و بەزەیی‌یان بە یەکدا بێتەوە[2]. کە فەرموویەتی: (من كانت له أرض فليزرعها أو يمنحها أخاه، فإن أبى فليمسك أرضه)[3].**

**واتە: هەرکەس زەوی هەیە با بیچێنێ یا بیدات بە براکەی کە بیچێنێ، جا ئەگەر ئەوەی نەکرد زەوی خۆی رابگرێت.**

**وە لە عەمری کوڕی دینارەوە ﷺ هاتووە فەرمویەتی: گوێم لە ئیبنوعومەر بووە ئەیفەرمو: ئێمە زەوی دانمان بە چاندن بە خراپ نەئەزانی، هەتا گوێم لە رافیعی کوڕی خەدیج بوو ئەیووت:**

---

(١) أبوداود (٣٣٩٠) والنسائي (٣٩٥٩) وابن ماجه (٢٤٦١).

(٢) الترمذي (١٣٨٥).

(٣) البخاري (٢٣١٤) ومسلم (١٥٤٤).

پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە. عەمر ئەڵێت: باسی ئەوەم کرد بۆ طاووس وتی: لە هەموویان شارەزاتر(مەبەستی ئیبنوعەبباس بووە) پێی ووتم: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی نەکردووە بەڵام فەرموویەتی: (لأن يمنح أحدكم أرضه خير من أن يأخذ عليها خراجاً معلوماً) رواه الخمسة[1].

واتە: هەرکەسێکتان زەوی‌یەکەی ببەخشێت بۆ چاندن خێرترە بۆی لەوەی خەراجی دیاری کراوی لەسەر وەربگرێت.

زەوی دان بەکرێ بە پارە:

وە دروستە زەوی دان بە چاندن بە پارە وخواردەمەنی وبەو شتانەی بە ماڵ دائەنرێت.

لە حەنظەلەی کوڕی قەیسەوە ﷺ هاتووە فەرمویەتی: پرسیم لە رافیعی کوڕی خەدیج دەربارەی زەوی دان بەکرێ فەرموی: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە، ووتم: بە زێڕ و زیویش؟ ووتی: بە زێڕ وزیو خراپی تێدا نی‌یە، هەر پێنجەکە ڕیوایەتیان کردووە جگە لە (ترمذي)[2].

ئەمەش مەزهەبی ئەحمەد وهەندێ لە مالیکی‌یەکان وشافیعی‌یەکانە.

ئیمامی نەوەوی فەرمویەتی: ئەمەیان بەهێزترو هەڵبژێراوترە لە هەموو قسەکانی تر.

زەوی دان بە چاندن بە شێوەیەکی (فاسد) خراپ:

لە پێشەوە باسمان کرد زەوی دان بە چاندن بە شێوەیەکی صەحیح ئەوەیە زەوی‌یەکە بدەی بە کەسێك بیچێنێت بەومەرجەی بەشی خۆی تێدا بێت لە بەروبومەکە وەك سێ‌یەك وچوار یەك وئەو جۆرانە، واتە: بەشەکەی دیاری کراو نەبێت.

جا ئەگەر بەشەکەی دیاری کرد وەك ئەوەی ئەندازەکە دابنێت لە بەروبومەکە، یا سنووری دیاری بکات لەنار هەموو زەوی‌یەکەداو بڵێت: بەروبومی ئەو پارچەیان چەندە بوو بۆ من، ئەوەی تری بۆ جوتیارەکە یا هاوبەش بن تێیدا.

ئەوە زەوی دان بە چاندن بەو جۆرە (فاسد) خراپە چونکە غەرەرو نەزانینی تێدایە وئەبێتە هۆی ناکۆکی.

بوخاری لە ڕافیعی کوڕی خەدیجەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی:

---

(١) أحمد (١/١٧٨و٢٨١) والبخاري (٢٣٤٢) وأبوداود (٣٣٨٩و٣٣٩١) والنسائي (٧/٤١) وابن ماجه (٢٤٥٧).

(٢) أحمد (٣/٤٦٣و٤٦٥) والبخاري (٢٧٢٢) ومسلم (١٥٤٧/١١٧) وأبوداود (٣٣٩٢) والنسائي (٧/٤٩).

ئێمە لە هەموو کەس زیاتر زەویمان ئەچاند(مەبەستی مەدینە بووە)جاری وابووە زەویمان بۆ چاندن لە خاوەن زەوی وەرئەگرت، لایەکمان بە ناوی خاوەن زەوییەکەوە ئەچاند، جا جاری وائەبوو ئەو بەشە چاك دەر ئەچوو بەشەکانی تر خراپ دەر ئەچوون یا بە پێچەوانەوە، لەبەر ئەوە لێمان قەدەغە کرا[1].

وە هەروەها هەر لەوەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ما تصنعون بمحاقلكم).

واتە: چی لە کێڵگەکانتان ئەکەن؟ ئەوانیش ووتیان: ئەی دەین بە چواریەك یا لەسەر چەند وەسەقێك خورما یا جۆ ئەیدەین بە چاندن. فەرمووی: (لاتفعلوا) واتە: کاری وا مەکەن[2].

وە موسلیم لێوەی ئەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: خەڵك لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ زەوییان دائەچاند لەسەر ئەوەی چی لە قەراغی ڕووبارەکەدا یا جۆگەکەدا هەبوو بیدەن بە خاوەن زەوی یا بە شتێکی تر لەبەروبوم.

جاری وا ئەبوو ئەوانەی بۆ خاوەن زەوی دائەنرا باش دەرئەچوو ئەوانی تر خراپ یا بە پێچەوانەوە، ئیتر خەڵك لەوە زیاتر کرێی بەرنەئەکەوت بۆیە لێمان قەدەغەکرا[3].

**زیندو کردنەوەی زەوییە مردووەکان (إحياء الموات)**

**واتاکەی:**

(إحیاو الموات) واتە: ئامادە کردنی زەوییە مردووەکان کە لە پێشەوە بەکار نەهاتوون وئاوەدان نەکراونەوە بە شێوەیەك بەکار بێت بۆ کەڵك لێوەرگرتن بۆ کشتوکاڵ یا بۆ خانووبەرە.

**بانگەوازی ئیسلام بۆی:**

ئیسلام بە پەسەندی ئەزانێ خەڵك بڵاوە بکەن وئاوەدانی بخەنە وڵاتەوە و هەموو ئەو زەوییە مردووانە ئاوەدان بکەنەوە، تاوەکو سامان و دارایییان زۆر بێت ولە خۆشی وهەرزانیدا بژین و بەوە سامان و هێزیان بۆ بەدی بێت.

لەبەر ئەوە ئیسلام داوا لە موسوڵمانان ئەکات ولایان شیرین ئەکات کە بەرەو زەوییە مردووەکان بکشێن و ئاوەدانی بکەنەوە بۆ ئەوەی بەروبومیان زۆر بێت وسوود لەبەرەکەتی ئەو زەوییانە وەربگرن.

---

(١) تەماشای تەخریجی حەدیسەکەی پێشو بکە.

(٢) البخاري (٢٣٣٩).

(٣) مسلم (١٥٤٧/١١٧).

١- پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(من أحيا أرضا ميتةً فهي له) رواه أبوداود والنسائي والترمذي وقال: إنه حسن[1].

واتە: هەرکەس زەوی‌یەکی مردوو زیندو بکاتەوە ئەو زەوی‌یە بۆ خۆی ئەبێت.

٢- وە عوروە فەرمویەتی: بەڕاستی زەوی هەر هی خوایە و بەندەکانی کە لەسەری ئەژین هەموویان بەندەی خوان، وە هەرکەس زەوی‌یەکی مردوو زیندو بکاتەوە خۆی شایستەترە کە بۆ خۆی بێت. ئەم قسەیە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بۆمان هاتووە ئەوانە هێناویانە کە سڵاواتی لەسەر ئەدەن.

٣- وە پێغەمبەر فەرموویەتی ﷺ : (من أحيا أرضاً ميتةً فله فيها أجر، وما أكله العوافي فهو له صدقة) رواه النسائي وصححه ابن حبان[2].

واتە: هەرکەس زەوی‌یەکی مردوو زیندو بکاتەوە پاداشتی لەسەر وەرئەگرێ لەلایەن خواوە، وە هەرچی باڵندە ودڕندەی کێوی لی‌ی ئەخوات بە خێر و صەدەقە بۆی ئەنوسرێت.

٤- وە لە سەمورەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرمویەتی: (من أحاط حائطاً على أرض فهي له) رواه أبوداود.

واتە: هەرکەس لەسەر زەوی‌یەک دیوارێك پێك بێنێت و چوار دەوری بگرێت ئەو زەوی‌یە هی خۆیەتی.

٥- لە ئەسمەری کوڕی (مضرس)ەوە هاتووە کە فەرمویەتی: هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ (بیعە) بەڵێنی باوەڕم پێ دا، ئەویش فەرمووی: (من سبق إلى ما لم يسبقه إليه مسلم فهو له).

واتە: هەرکەس بگاتە سەر ئەوزەوی‌یەی موسوڵمانی پێ نە گەیشتوەو ئاوەدانی بکاتەوە، بۆ خۆی ئەبێت. ئەڵێت: ئیتر هەر خەڵك بوون ئەچوون پەرژینی زەوی‌یان ئەکرد و ئاوەدانیان ئەکردەوە[3].

مەرجەکانی زیندو کردنەوەی زەوی مردوو:

ئەو زەوی‌یەی کە بە مردوو دائەنرێت مەرجە لە ئاوەدانی‌یەوە دوور بێت نەك بەشێك بێت لە بەشەکانی ئەو ئاوەدانی و شارەوە. وە پێش بینی ئەوەشی لێ نەکرێت کە بەشێك بێت لی‌ی.

وە بۆ زانینی ئەندازەی دووری لە ئاوەدانی‌یەوە تەماشای عورف و عادەت ئەکرێ.

---

(١) أحمد (٣/٣٨١و٥/١٢و٢١) وأبوداود (٣٠٧٧) والترمذي (١٣٧٩).

(٢) النسائي في الكبرى (٥٧٥٦و٥٧٥٨) وابن حبان (٥٢٠٢).

(٣) أبوداود (٣٠٧١).

**ڕێ پێ دانی حاکم :**

زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە زیندو کردنەوەی زەوی هۆیەکە بۆ بوون بە خاوەن.

بەڵام جیاوازی‌یان هەیە لەوەدا کە ئەبێ بۆ زیندوکردنەوەی زەوی پرسی حاکمی لەسەر بێت یان نا؟

بەشی زۆری زانایان فەرمویانە:

بەڕاستی ئاوەدان کردنەوە هۆی بوون بە خاوەنە بێ ئەوەی مەرجی ئەوەی تێدا بێت حاکم ڕێ بدات یان نا ، جا هەرکاتێك کەسێك زەوی‌یەکی زیندوکردەوە بێ پرسی حاکم ئەو زەوی‌یە ئەبێتە مولکی خۆی، وە لەسەر حاکمەکە مافی خۆی بداتێ کاتێ کێشەی ئەو زەوی‌یە چووە لای، بەپێی ئەوەی ئەبوداود لە سەعیدی کوڕی زەیدەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من أحيا أرضاً ميتة فهو له).

واتە: هەرکەس زەوی‌یەکی کوێرەوەبووی ئاوەدان کردەوە ئەبێ بە بەشی خۆی.

ئەبوحەنیفە فەرمویەتی: زیندوکردنەوەی زەوی هۆی بوون بە خاوەنە، بەڵام مەرجەکەی ڕێ پێدانی حاکم وبڕیار لەسەر دانێتی.

وە مالیك ئەو زەوی‌یانەی جیا کردۆتەوە کە نزیکن لە ئاوەدانی‌یەوە لەو زەوی‌یانەی دوورن. ئەگەر نزیك بوون ئەبێ حاکم ڕێ بدات. بەڵام ئەگەر دوور بوون مەرج نی‌یە حاکم ڕێ بدات، و ئەبێ بە مولکی ئەو کەسەی زیندویان ئەکاتەوە.

**کەی مافی خاوەنێتی نامێنێ لەسەر ئەو زەوی‌یانە:**

هەرکەس زەوی گرت بۆ خۆی ودیاری کرد وبەرژینی کرد لە پاشاندا بە کردەوە وکار ئاوەدانی نەکردەوە وهیچی تێدا نەچاند دوای سێ ساڵ مافی خاوەنێتی ئەو زەوی‌یەی نامێنێ.

لە سالمی کوڕی عبداللە وە کە عومەری کوڕی خەططاب ﷺ لەسەر دوانگە فەرمویەتی: هەرکەس زەوی‌یەکی مردوو زیندو بکاتەوە ئەبێتە خاوەنی، وە دوای سێ ساڵ دەست بە سەردا گرتن. ئەگەر بە کاری نەهێنا مافی بەسەر ئەو زەوی‌یەوە نامێنێ. ئەویش لەبەر ئەوە بوو کە هەندێ پیاو زەوی‌یان ئەگرتە دەست وکاریان تێدا نەئەکرد.

وە لە طاووسەوە هاتووە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (عاديُّ الأرض لله وللرسول، ثم لكم من بعد، فمن أحيا أرضاً ميتةً فهي له، وليس لمحتجر بعد ثلاث سنين) رواه أبوعبيد في الأموال[1].

واتە: زەوییە کوێرەوەبووەکان زەوی خوا و بۆ پێغەمبەرن ﷺ، لەپاشاندا بۆ ئێوەیە، جا هەرکەس زەوییەکی مردوو زیندو بکاتەوە ئەبێ بە خاوەنی، وە ئەوەی دەستی بە سەردا ئەگرێ و بەکاری ناهێنێ دوای سێ ساڵ مافی بەسەر ئەو زەوییەوە نامێنێ.

**کەسێك زەوی کەسێکی تر ئاوەدان بکاتەوە بێ ئاگاداری خاوەنی:**

ئەوەی کە عومەری کوڕی خەگگاب و عومەری کوڕی عبدالعزیز لەسەری ڕۆیشتون ئەوەیە: ئەگەر پیاوێك زەوییەکی ئاوەدان کردەوەو وای زانی زەوی بێ خاوەنە واتە مولکی کەس نییە، پاش ماوەیەك پیاوێکی تر بێت و سابتی کات کە زەوی خۆیەتی، ئەو کابرایە ئارەزووی ئەدرێتە دەست، یا زەوی لە کابرا ئەستێنێتەوە وپارە وخەرجی ئاوەدان کردنەوەی ئەداتێ، یا ئەیدات بەو کابرایە ونرخی زەوییەکەی لێ ئەستێنێ.

وە لەو بارەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من أحيا أرضاً ميتة فهي له، وليس لعرق ظالم حق)[2].

واتە:

هەرکەس زەوییەکی مردوی زیندو کردەوە ئەبێتە زەوی خۆی و وەچەی ستەمکار مافی بە سەرەوە نییە.

**بەشکردنی زەوی وکان و مەعدەنەکان وئاوەکان:**

دروستە بۆ حاکم زەوی مردووەکانەکان و ئاوەکان بۆ هەندێ کەس بەش بکات و جیابکاتەوە ئەگەر بەرژەوەندی تێدا بوو. بەڵام ئەگەر بەرژەوەندی لەو بەشکردنەدا نەبوو وەك هەندێ لە حوکمڕانە ستەمکارەکان ئەیکەن دروست نییە.

وە پێغەمبەر ﷺ ئەو کارەی کردووە وخەلیفەکانی دوای خۆی هەر کردوویانە وەك لەم حەدیسەدا دەرئەکەوێت:

---

(١) الشافعي (١٣٤٩) والأموال لأبي عبيد (٦٤٧) والبيهقي (١٤٣/٦).

(٢) أبوداود (٣٠٧٣) والترمذي (١٣٧٨) من حديث سعيد بن زيد، وأحمد (٣٢٧/٥) من حديث عبادة.

١-لە عورووەی کوڕی زوبەیرەوە کە عبدالرحمن ی کوڕی عەوف فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ بۆ من و عومەری کوڕی خەططاب، فلانە زەوی وفلانە زەوی جیاکردەوە، پاشان زوبەیر چوو بۆ لای ئالی عومەر و بەشەکەیانی لێ کڕینەوە، پاشان هاتە لای عشمان و وتی: عبدالرحمن ی کوڕی عەوف ئەڵێت: پێغەمبەر ﷺ بۆ من و عومەری کوڕی خەططاب فلانە زەوی وفلانە زەوی جیاکردۆتەوە، ئەڵێت وە من بەشەکەی ئالی عومەرم لێ کڕیونەوە. عشمان وتی: عبدالرحمن شایەتی دروستە، بە قازانجی خۆی بێ یا بەزیانی خۆی. ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە[1].

٢- لە عەلقەمەی کوڕی وائیلەوە لە باوکی‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ زەوی‌یەکی لە(حضرموت) بۆ دابڕی[2].

٣- وە لە عەمری کوڕی دینارەوە کە فەرمویەتی: کاتێ پێغەمبەر ﷺ هاتە مەدینە زەوی بۆ ئەبوبەکر و عومەر جیاکردەوە.

٤- لە ئیبنوعەبباسەوە هاتووە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ زەوی قەبەلی بە بەرزایەکانی و شیوەکانی‌یەوە بۆ بیلالی کوڕی حارپ ی موزەنی جیاکردەوە کە کانزایان تێدا بوو. ئەحمەد وئەبوداود تەخریجیان کردووە[3].

ئەبویوسف وتویەتی: ئەم شوێنەوارانە هاتوون کە پێغەمبەر ﷺ زەوی جیاکردۆتەوە بۆ هەندێ کەس، وە هەروەها خەلیفەکانی دوای خۆی، وە پێغەمبەر ﷺ بەرژەوەندی بینیوە لەو کارانەدا. چونکە دڵ ڕامکردنی بۆ ئیسلام تێدا بووە وە هەروەها بۆ ئاوەدان کردنەوەی زەوی، وە هەروەها خەلیفەکان زەوی‌یان بۆ خەلکانێك جیاکردۆتەوە کە بینیویانە سودیان هەبووە بۆ ئیسلام و بۆ قەلاچۆکردنی دوژمن، وە پێیان وابووە ئەوەی کە کردویانە باشتر بووە، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە نەیان ئەکردو مافی هیچ موسڵمان و موعاهیدێکیان نەئەبڕی .

**زەوی سەندنەوە لەو کەسانەی ئاوەدانی ناکەنەوە:**

حاکم تەنها لەبەر بەرژەوەندی زەوی بۆ خەلك جیائەکاتەوە، جا ئەگەر ئەو بەرژەوەندی‌یە نەهاتەدی، وە ئەوەی زەوی‌یەکەی بۆ جیاکراوەتەوە هەر بەکاری ناهێنێ وکاری تێدا ناکات ئەو کاتە لێی ئەسەندرێتەوە.

---

(١) أحمد (١/١٩٢).

(٢) أبوداود (٣٠٥٨) والترمذي (١٣٨١) والبيهقي (٦/١٤٤) وابن حبان (٧٢٠٥).

(٣) أحمد (١/٣٠٦) وأبوداود (٣٠٦٢).

١- لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکی یەوە کە پێغەمبەر ﷺ زەوی بۆ کەسانێك کە لە هۆزی موزەینە و جوهەینە بوون جیاکردەوە، بەڵام ئاوەدانیان نەکردەوە، پاشان کۆمەڵێك هاتن ئاوەدانیان کردەوە. جوهەینی یەکان و موزەنی یەکان هاتنە لای عومەر بۆ ئەو کێشەیە، عومەر فەرمووی: ئەگەر لە لایەن منەوە یا ئەبوبەکرەوە بوایە ئەمگێڕایەوە بۆتان، بەڵام ئەوە پێغەمبەر ﷺ بۆی جیاکردوونەوە. پاشان فەرمووی: هەرکەس زەوی یەکی هەبوو سێ ساڵ وازی لێ هێنا و ئاوەدانی نەکردەوە پاشان کۆمەڵێك هاتن ئاوەدانیان کردەوە ئەوان شایستەترن کە ئەو زەوی یە بۆ ئەوان بێت.

٢- لە حارثی کوڕی بیلالی کوڕی حاریسموزەنی یەوە لە باوکی یەوە، کە پێغەمبەر ﷺ هەموو عەقیقی (کە شوێنێکە) بۆ بیلالی باوکی جیاکردۆتەوە.

وتی: کاتێ سەردەمی عومەر ﷺ هات عومەر بە بیلالی فەرموو: پێغەمبەر ﷺ ئەم زەوی یانەی بۆ نەبڕیویتەوە کە لە خەڵکی دابڕیت، بەڵکو بۆ ئەوەی ئیشی تێدا بکەی، جا ئەو بەشەی ئەتوانی ئاوەدانی بکەیتەوە بۆ خۆت وئەوی تری بگێڕەرەوە.

## بەکرێ دان (الإجارة)

**پێناسەکەی:**

(إجارة) لەشەرعدا پەیمانێکە لەسەر قازانج و بەروبوومەکان لە بەرابەر بڕیتی یەك، جا دروست نی یە درەخت بە کرێ بگیرێ لەبەر سوود وەرگرتن لەبەرەکەی، چونکە درەخت کەڵك نی یە.

وە هەروەها زێڕ و زیو وخواردەمەنی بۆ خواردن، وە هەروەها شتی پێوانە کراو وکێشانە کراو چونکە ئەمانە ناتوانرێت سوودیان لێ وەربگیرێ بە سەرف کردن و لەناوچوونی خودی خۆیان نەبێت.

وە هەروەها دروست نی یە بە کرێ گرتنی مانگا ومەڕ و ووشتر بۆ دۆشینی شیرەکەی، چونکە بە کرێ گرتن بۆ بوونە خاوەنی سوودەکەیەتی، بەڵام ئەمانە لەو حاڵەتەدا بوونە خاوەنی شیرەکەیە کە شتەکە خۆیەتی. و پەیمانەکە ئەگێڕرێتەوە بۆ کەڵك وەرگرتن نەك شتەکە خۆی . . .

وە کەڵك جاری واهەیە کەڵکی خودی شتەکە ئەبێت کە بە کرێ ئەگیرێت، وەك دانیشتن لەناو خانوودا یا سوار بوونی سەیارە . . . وە جاری واهەیە کەڵکی کارو پیشە ئەبێت، وەك کاری ئەندازیارو بەننا و جۆڵا و ئاڵتون چی و بەرگ دروو و ئوتوچی. وە جاری واهەیە کەڵکی کەسێك ئەبێت کە تێنەکۆشێ، وەك خزمەتکار و کرێکار.

وە ئەو خاوەن ماڵەی سوودەکە بە کرێ ئەدات پێی ئەڵێن: (مؤجِّر) بە کرێدەر. وە لایەنەکەی تر کە کرێکە ئەدات پێی ئەڵێن: (مستأجِر) کرێ دەر

وە ئەو شتەی کە سودەکەی لەسەر بەستراوە پێی ئەوترێ: (مأجور) بەکرێ دراو.

وە ئەو شتەی ئەدرێ لە کرێدا پێی ئەڵێن: کرێ (أجر)، وە هەرکاتێ پەیمانی ئیجارە دروست بوو خاوەنیەتی سوود وەرگرتن بۆ کرێدەر ئەچەسپێ. وە بۆ بەکرێدەر خاوەنیەتی کرێ ئەچەسپێ، چونکە پەیمانی گۆڕینەوەیە.

**مەشروعی‌یەتی:**

به کرێ دان بەپێی کیتاب وسوننەت و ئیجماع ڕەوایە:

خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَةَ رَبِّكَ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُمْ مَعِيشَتَهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ لِيَتَّخِذَ بَعْضُهُمْ بَعْضًا سُخْرِيًّا وَرَحْمَةُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِمَّا يَجْمَعُونَ﴾ (الزخرف:٣٢).

واتە: ئایا ئەوان پێغەمبەرایەتی دابەش ئەکەن، ئێمە بژێوی‌یانمان لە نێوانیاندا دابەش کردووە لە ژیانی دونیادا، وە پلەو پایەی هەندێکیانمان بەرزتر کردووە لە هەندێکیان لە دەوڵەمەندی و هەژاری بەدەسەڵاتی و لاوازیدا، بۆ ئەوەی‌یەکتر بە کرێ بگرن، وە ڕەحمەتی پەروەردگارت زۆر چاکترە لە وەی ئەوان کۆی ئەکەنەوە.

٢- وە هەروەها خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿وَإِنْ أَرَدْتُمْ أَنْ تَسْتَرْضِعُوا أَوْلَادَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُمْ مَا آتَيْتُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ (البقرة:٢٣٣).

واتە: وە ئەگەر ویستتان دایەن بۆ منداڵەکانتان بگرن گوناه نی‌یە لەسەرتان ئەگەر ئەو کرێ‌یەی داتان ناوە بۆیان بە چاکی بیان دەنێ، وە لەخوا بترسن وبزانن خوا ئاگادارە بەسەر ئەو کاراندا کە بەجێی ئەهێنن.

وە هەروەها خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿قَالَتْ إِحْدَاهُمَا يَا أَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ قَالَ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُنْكِحَكَ إِحْدَى ابْنَتَيَّ هَاتَيْنِ عَلَى أَنْ تَأْجُرَنِي ثَمَانِيَةَ حِجَجٍ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِنْدِكَ وَمَا أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ (القصص: ٢٦-٢٧).

واتە: یەکێك لە کچەکانی شوعەیب ووتی: بابە ئەم کابرایە بە کرێ بگرە چونکە باشترین کەس کە بە کرێی بگری پیاوێکی بە هێزو بەتوانا و دەست پاك و داوێن پاکە. باوکیشیان بە موسای ووت: من ئەمەوی‌یەکێ لەو کچانەم لێت مارە بکەم بە مەرجێ لە جیاتی مارەی‌یەکە هەشت ساڵ شوانیم بۆ بکەی ئەگەر کردیشت بە دەساڵ ئەوە چاکەیەکە لە خۆتەوە، وە من نامەوێ بێزارت بکەم ویارت گران بکەم، وە إن شاو الله ئەم بینی من لە پیاو چاکانم.

وە لە سوننەتیشدا ئەمانەی خوارەوە هاتووە:

١- بوخاری ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کابرایەکی لە بەنی دیل بەکرێ گرت پێیان ئەووت: عبداللە ی کوڕی ئورەیقیط، زۆر شارەزا و لێ هاتوو بوو بۆ ڕێگا و چاوساغی[1].

٢- وە ئیبنوماجە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أعطوا الأجیر أجره قبل أن یجف عرقه)[2].

واتە: کرێی کرێکار بدەن پێش ئەوەی عارەقەکەی ووشك بێتەوە.

٣-ئەحمەد وئەبوداود ونسائی ئەگێڕنەوە لە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصەوە ﷺ کە فەرمویەتی: ئێمە زەویمان ئەدا بە کرێ بەوەی لەسەر قەراغی جۆگەلەکان ئەڕوا، پێغەمبەر ﷺ لێی قەدەغەکردین وفەرمانی پێ داین کە بە زێڕ و زیو بیدەین بە کرێ[3].

٤- وە بوخاری وموسلیم لە ئیبنوعەبباسەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: کەڵەشاخ لە خۆت بگرە وکرێ بە کەڵەشاخ گرەکە بدە[4].

وە لەسەر ڕەوابوونی ئیجارەو بەکرێ دان ئەتەوەی ئیسلام ئیجماعیان هەیە، وە ئەو کەسەش کە پێچەوانەی ئەم ئیجماعە ئەکات لە زانایان بە هیچ دانە نراوە.

**حیکمەت لە دانانی:**

وە ئیجارە دانراوە لە ئیسلامدا لەبەر ئەوەی خەڵك پێویستیان پێی هەیە، چونکە ئەوان پێویستیان هەیە بە خانوو بۆ نیشتەجێ بوون، وە هەندێك پێویستی بە خزمەتی هەندێك هەیە، هەروەها پێویستیان بە وڵاغ هەیە بۆ سواری و بار هەڵگرتن، وە پێویستیان بە زەوی هەیە بۆ کشتوکاڵ، وە بە جۆرەها ئامێر کە بەکاری بهێنن لە پێویستیەکانی ژیاندا.

**پایەکانی:**

ئیجارە پێك دێت بە (إیجاب و قبول) بە زاراوەی کرێ و شێوەکانی، وە بە هەر زاراوەیەك کە دەلالەت لەسەر ئەوە بکات.

---

(١) البخاري (٣٩٠٥).

(٢) ابن ماجه (٢٤٤٣).

(٣) أحمد (١/١٧٨و١٨٢) وأبوداود (٣٣٩١) والنسائي (٣٩٢٥).

(٤) البخاري (٢١٠٣) ومسلم (٢/١٢٠٢/٦٦) موقوفاً على ابن عباس.

**مەرجی پەیمان بەستن لەنێوان بە کرێ دەرو بەکرێدا:**

مەرجە هەر دوو لایەن کە پەیمانەکە ئەبەستن شایستەیی‌یان ببێ، بەوە کە هەریەکەیان ژیرو خاوەن تەمیز بێت، کەواتە ئەگەر لایەکیان شێت یا منداڵی بێ تەمیز بوو پەیمانەکە دروست نابێت.

شافیعی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکان مەرجێکی تر یان زیاد کردووە ئەویش پێگەیشتویی(بلوغ)ە. کەواتە پەیمانی منداڵ با خاوەن تەمیزیش بێت دروست نی‌یە لایان.

**مەرجی دروستی ئیجارە:**

بۆ دروستی ئیجارە ئەم مەرجانە پێویستە:

١- رازی بوونی هەردوولا، چونکە ئەگەر یەکێکیان زۆری لێ کرا لەسەر ئەو کارە دروست نی‌یە. بەپێی فەرموودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێت: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ وَلاَ تَقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾ (النساء:٢٩).

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە سامان وماڵی‌یەکتری مەخۆن بە ناهەق، مەگەر بازرگانی‌یەك بێت لەناوتاندا و بە ڕەزامەندی خۆتان بێت، وە خۆتان مەکوژن چونکە خوا میهرەبانە پێتان.

٢- زانینی ئەو کەڵك وسوودەی پەیمانەکەی لەسەر بەستراوە بە تەواوی بە شێوەیەك رێگا لە ناکۆکی بگرێت.

وە ئەو زانینەی ڕێی کێشە وناکۆکی ئەگرێت بە بینینی ئەو شتە تەواو ئەبێت کە مەبەستە بە کرێ بگیرێ یا بە وەسف کردنی ئەگەر وەسفەکە تەواو بێت، وە هەروەها ماوەی ئیجارەکە بزانرێت بە مانگە یا ساڵ یا زۆرتر یا کەمتر، وە کارە وبەستراوەکەش ڕوون بکرێتەوە.

٣- ئەوەی پەیمانەکەی لەسەر بەستراوە ئەبێ بەجێ بگات بە راستی و بەپێی شەرع. چونکە لە زانایان کەسانێك هەیە کە ئەم مەرجەیان داناوەو ڕایان وایە کە دروست نی‌یە ئیجارە کردنی شتی هاوبەشی بێ ڕەزایەت و ئاگا لێبوونی هاوبەشەکە چونکە سوودی شتی هاوبەش ناکرێ بەجێ بگات، ئەمەش مەزهەبی ئەبوحەنیفە وزوفرە.

وە جەماوەری زانایانی شەرع فەرمویانە: دروستە ئیجارە کردنی شتی (مشاع) هاوبەشی، بە ڕەهایی لە شەریك و جگە لەوەوە، چونکە شەراکەت کەڵکی هەیە وتەسلیم ئەکرێت بە چۆڵ کردنی، یا دابەش کردنی سوودەکانی، وەك چۆن ئەوکارە لە فرۆشتندا دروستە، لە ئیجارەشدا هەر دروستە

چونکە ئیجارەش جۆرێکە لە دوو جۆرەکەی فرۆشتن، بەڵام ئەگەر سوودەکەی ئاشکرا نەبێت ئیجارەکە فاسیـدە.

٤-توانای تەسلیم کردنی کرێ گرتەکە وکەڵك لێ وەرگرتنی بە گشتی، کەواتە دروست نی‌یە بەکرێدانی وڵاغی بەرەڵا بوو یا داگیر کراوێك کە نەتوانرێت لە دەست داگیرکەر دەربهێنرێت. چونکە توانای تەسلیم کردنی نی‌یە.

هەروەها ئەو زەوی‌یانەی کە شتیان تێدا سەوز نابێت یا وولاغێکی باری کە پیر ونەخۆش بێت لەبەر نەبوونی ئەو کەڵکەی کە پەیمانەکەی لەسەر بەستراوە.

٥- ئەبێ کەڵکەکە ڕەوا بێت و حەرام نەبێت و واجب نەبێت، کەواتە لەسەر کاری خراپ وسەرپێچی ئیجارە دروست نی‌یە، چونکە سەرپێچی پێویستە دوور کەوتنەوە لێی.

جا هەرکەس پیاوێك بە کرێ بگرێت، پیاوێکی بە ستەم بۆ بکوژێت، یا پیاوێك بە کرێ بگرێت عارەقی پێ هەڵبگرێت، یا خانوویەك بدات بە کرێ بە کەسێك عارەقی تێدا بفرۆشێت، یا قوماری تێدا بکرێت، یا بیکات بە کەنیسە ئەمانە هەمووی ئیجارەی فاسیدن.

وە هەروەها حەرامە پارە دان بە کاهین وعەڕڕاف (فالچی)لە جیاتی فالچێتی‌یەکەیان، چونکە ئەمانە بەرامبەر شتێکی حەرامن ومالی خەڵك خواردنە بە ناهەق.

وە دروست نی‌یە ئیجارە کردن لەسەر نوێژ و ڕۆژوو، چونکە ئەمانە فەرزی عەینن پێویستە لەسەر ئەوانەی لەسەریان فەرز کراوە بەجێی بهێنن.

**کرێ لەسەر خوا پەرستی‌یەکان (طاعات):**

بەڵام کرێ دان لەسەرخوا پەرەستی‌یەکان، زانایان جیاوازیان هەیە لە حوکمەکەیدا، وا لە خوارەوە بۆ چوونەکانیان باس ئەکەین

حەنەفی‌یەکان ئەڵێن: کرێ دان لەسەر خوا پەرستی، وەك ئەوەی کەسێك بە کرێ بگرێت لە جیاتی کەسێك نوێژ یا ڕۆژو یا حەج یا قورئان بخوێنێ وپهوابەکەی ببەخشێ یا بانگ بدات، یا بەرنوێژی بکات، ئەو جۆرە شتانە دروست نی‌یە. وە حەرامە کرێ وەرگرتن لەسەریان بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (إقرؤا القرآن ولا تأكلوا به)[1].

واتە: قورئان بخوێنن وخۆتانی پێ مەژێنن.

---

(١) أحمد (٣/٤٢٨) والبزار (٢٣٢٠).

وە هەروەها بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە بە عەمری کوڕی عاصی فەرمووە: (وأن اتخذت مؤذناً فلا تأخذ علي الأذان أجراً).

واتە: ئەگەر کردیانی بە بانگبێژ لەسەر بانگبێژی‌یەکەت کرێ وەرمەگرە.

وە لەبەر ئەوەی کاری نزیك بوونەوە لە خوا هەرکاتێك پێك هات بۆ بکەرەکەیە، ئیتر دروست نی‌یە کرێ لە کەسی تر وەربگرێت لەسەری.

وە ئەوەی بڵاوە لە وڵاتەکەماندا لەراسپاردە کردن بە خەتمی قورئان و(لا إله إلا الله) و (سبحان الله و...) بە کرێ‌یەکی دیاری کراو کە پەوابەکەی ئەبەخشرێ بە گیانی ئەو مردووەی کە خەتمەکەی بۆ ئەکرێ. ئەمانە هەمووی بەپێی شەرع دروست نین، چونکە کەسێك بۆ پارە بخوێنێ وخەتمە بکات پاداشتی نی‌یە، جا کە پاداشتی نەبوو ئیتر چی هەدیە ئەکات بە مردووەکە؟

وە زانایان دانیان بەوەدا ناوە ئەو کرێیەی لە جیاتی خوا پەرستی وەربگیرێت حەرامە، بەڵام زانایانی دوایی لەو ئەسڵە فێر کردنی قورئان وزانستی شەرعی یان لێ دەرکردووە. وە فتوایان داوە بە دروستی کرێ لەسەر ئەو دووانە لەرووی پەسەندی‌یەوە، دوای ئەوەی ئەو بەخششانە نەما و بڕا کە ئەدرا بەو مامۆستایانە لەسەرەتای ئیسلامەوە لە پیاوە دەوڵەمەندەکان و(بیت المال)ەوە بۆ ئەوەی باری ناخۆشی ژیانیان پێی چاك بێت، چونکە پێویستی‌یان بە شتێك هەیە بۆ بژێوی خۆیان و خێزانەکەیان.

چونکە ئەگەر ئەمانە خەریکی کشت وکاڵ وبازرگانی وکاری دەست بن بەفیڕۆدانە بۆ قورئان و یاسای بەرزی ئیسلام بە لەناو چوونی هەڵگریان. لەبەر ئەوە دروستە کرێیان بدرێتێ لەسەر وتنەوە و فێرکردنی ئەو بابەتانە.

وە حەنبەلی‌یەکان ووتویانە: دروست نی‌یە کرێ وەرگرتن لەسەر بانگ دان وقامەت کردن وفێر کردنی قورئان وزانستی ئایینی وحەدیس، وە هەروەها کەسێك لە جیاتی کەسێکی تر حەج بکات، و داوەری بکات. چونکە ئەمانە بۆ کرێ نابن جگە لەوەی ئەنجام دەری ئەمانە پاداشتیان لای خواوە بۆ ئەنوسرێ، وە حەرامە کرێ وەرگرتن لەسەریان. وە ووتویانە: وە دروستە لە (بیت المال) یا لە وەقف ڕۆزی وەربگرێت، لەسەر کارێك کە کەڵکەکەی تێپەڕ بێت لە بە کرێ گیراوەوە، وەك دادوەری وفێر کردنی قورئان وحەدیس و زانستی شەرعی، و جێگری لە حەجدا وهەڵگرتنی شەهادەت و بانگ دان، چونکە ئەمانە لە بەرژەوەندی‌یەکانن، و بەکرێ نابن بەڵکو ئەو ڕۆزی‌یەی لەسەر ئەمانە وەرئەگیرێت شتێکە بۆ یارمەتی دان لەسەر خوا پەرستی، وە کارەکەش لە خوا پەرستی دەرناکات و ئیخلاصی تێك نادات، ئەگینا غەنیمە و کەلوپەلی کوژراوی بێ باوەڕیش حەڵاڵ نەئەبوو.

وە شافیعی‌یەکان ومالیکی‌یەکان وئیبنوحەزم بۆ ئەوە چوون: کە دروستەکرێ وەرگرتن لەسەر فێر کردنی قورئان و زانستی ئایینی، چونکە بە کرێ گرتنە بۆ کارێکی دیاری بە کرێیەکی دیاری کراو.

ئیبنوحەزم فەرمویەتی: کرێ دروستە لەسەر فێر کردنی قورئان و فێرکردنی زانستی ئایینی بە گشتی. وە هەروەها لەسەر دوعاو قورئان بە سەرا خوێندن و نوسینەوەی قورئان وکتێبی زانستی، چونکە قەدەغە کردنیان بە دەقێك نەهاتووە، بەڵکو ڕەوایی‌یان هاتووە. وە ئەم بۆ چوونە بە هێز ئەکات ئەوەی کە بوخاری ئەگێڕێتەوە لە ئیبنوعەبباسەوە ﷺ کە چەند کەس لە صەحابەکانی پێغەمبەر ﷺ بەلای کانی وئاوێکدا تێ پەڕین خێڵێکی کۆچەری لەسەر بوو یەکێکیان مار پێوەی دابوو، یەکێکیان هاتە بەردەم صەحابەکان ووتی: کەسێکتان تێدا نی‌یە دوعا خوێن بێت؟ چونکە یەکێکمان مار پێوەی داوە، صەحابەیەکیان چوو لەگەڵیا بە چەند سەر مەڕ فاتیحەیەکی بە سەردا خوێند، پاشان مەڕەکانی هێناوە بۆ ناو هاوەڵەکانی، ئەوانیش بە باشیان نەزانی و وتیان: لەسەر کتێبەکەی خوا کرێت وەرگرتووە؟ کاتێ هاتنەوە مەدینە وتیان: ئەی نێرراوی خوا، ئەم هاوەڵەمان لەسەر قورئان کرێی وەرگرتووە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إن أحق ما أخذتم عليه أجراً كتاب الله)[1].

واتە: شایستەترین شتێك کە کرێتان لەسەر وەرگرتبێ کتێبەکەی خوایە.

وەك چۆن زانایان جیاوازیان هەیە دەربارەی کرێ وەرگرتن لەسەر قورئان وفێر کردنی، بەو شێوەیە جیاوازیان هەیە دەربارەی وەرگرتنی کرێ لەسەر حەج وبانگ دان وپێش نوێژی کردن.

ئەبوحەنیفە و ئەحمەد فەرمویانە: ئەو کارە دروست نی‌یە بەپێی ئەسڵەکەی کە وەرنەگرتنی کرێیە لەسەر خوا پەرستی‌یەکان.

وە مالیك فەرمویەتی: وەك چۆن دروستە کرێ وەرگرتن لەسەر فێرکردنی قورئان دروستیشە وەرگرتنی لەسەر حەج وبانگ دان. بەڵام بەر نوێژی کردن دروست نی‌یە کرێی لەسەر وەربگیرێ ئەگەر بە تەنها بێت، بەڵام ئەگەر بانگ دانیشی لەگەڵدا بێت دروستە، ئەو کاتە لەسەر بانگ دان وخزمەت کردنی مزگەوت ئەبێت نەك لەسەر نوێژ.

---

(١) البخاري (٥٧٣٧).

وه شافیعی فەرمویەتی: دروستە کرێ لەسەر حەج، بەڵام دروست نی‌یە لەسەر بەر نوێژی کردن لە نوێژە فەرزەکاندا. وە دروستە بە ڕێك کەوتنی زانایان کرێ وەرگرتن لەسەر فێرکردنی ژمارە وخەت وزمان و (فقه) و حەدیس ودروست کردنی مزگەوت و قوتابخانە.

وه شافیعی‌یەکان وتویانە: دروستە کرێ وەرگرتن لەسەر شتنی مردوو تەڵقین کردنی و شاردنەوەی.

ئەبوحەنیفەش فەرمویەتی: دروست نی‌یە کرێ وەرگرتن لەسەر شتنی مردوو، وە دروستە لەسەر هەڵکەندنی گۆڕ وهەڵگرتنی مردوو.

**کرێی کەڵەشاخ گرتن:**

کرێی کەڵەشاخ گرتن حەرام نی‌یە، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کەڵەشاخیان لێ گرتووە وکرێی داوە بە کەڵەشاخ گرەکە. وەك بوخاری وموسلیم لە ئیبنوعەبباسەوە گێڕاویانەتەوە[1]، جا ئەگەر حەرام بوایە کرێی نەئەدایە.

ئیمامی نەوەوی فەرمویەتی: ئەو حەدیسانەی کە هاتووە دەربارەی قەدەغە کردنی ئەو کاسبی‌یە لەسەر ئەوە دادەنرێن کە قەدەغە کردنەکە بۆ (تنزیه) خۆدوور خستنەوە و وازهێنانە لە کاسبی سووك، وە هەڵنانە بۆ جوانی ڕەوشت و بەرزی کار.

٥-ئەبێ کرێ‌یەکە ماڵێکی دیاری کراوی هەڵسەنگاو بێت بە بینین یا بە وەسف، چونکە نرخی کەڵکەکەیە، وە مەرجی نرخەکە ئەوەیە کە مەعلوم بێت بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمورویەتی: (من استأجر أجيراً فليعلمه أجره). رواه عبدالرزاق عن أبي سعيد قال ابوزرعة: الصحيح وقفه على أبى سعيد[2].

واتە: هەرکەس کەسێکی بە کرێ گرت بۆ کارێك با کرێکەی پێ بڵێ چەندە، وە دانانی کرێ بەپێی عورف دروستە.

ئەحمەد وخاوەن سونەنەکان تەخریجیان کردووە و ترمزی بە صەحیحی گێڕاوە کە سوەیدی کوڕی قەیس فەرمویەتی: من و مەخرەمەی عەبدی گەنمان هێنا لە هەجەرەوە و بردمان بۆ مەککە پێغەمبەر ﷺ هاتە لامان مامەڵەی کۆمەڵێك شەرواڵی لەگەڵدا کردین و پێمان فرۆشت، پیاوێك لەو لاوە گەنمی کێشانە ئەکرد بە کرێ بۆمان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (زن وأرجح).

واتە: بکێشە وپارسەنگ بدەرەوە. واتە: قورسی بکێشە.

---

(١) تەخریجەکەی باس کراوە.

(٢) البيهقي (٦/١٢٠) وأبوداود في المراسيل (١٨١) والنسائي (٧/٣١).

لێرەدا ناوی کرێکەی نەبرد چەندە بەڵکو خەڵك چۆنی داوە ئەوەندەی داونێ.

ئیبنوتەیمی‌یە فەرمویەتی: ئەگەر کەسێك سوار ووڵاغی کرێ بوو، یا چووە گەرماوی کرێ، یا جلەکانی دا بە کەسێك بۆی بشوات، یا خواردەمەنی‌یەکی دا بە کەسێك بۆی لێ بنێت، ئەوە کرێی دیاری خۆی هەیە.

وە ئەوەی ئەبێتە بەڵگە بۆ سابت کردنی کرێی بەکرێ گرتن بە پێی عورف، فەرمودەی خوای بەرزە ﴿فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ (الطلاق/٦).

واتە: جا ئەگەر دایەتان گرت وشیری دا بە منداڵەکانتان ئێوەش کرێکەیان بدەنێ.

لێرەدا خوای گەورە فەرمان ئەدات بە دانی کرێکەیان هەر بە شیر پێدانەکە، وە چەندێتی کرێکە ئەگەڕێتەوە بۆ عورف و عادەت.

مەرجی لە پێشەوە پێدانی کرێ و دواخستنی:

کرێکار بە پەیمان بەستنی کرێکاریەکە نابێتە خاوەنی کرێ کە بە لای حەنەفی‌یەکانەوە.

وە دروستە مەرج دابنرێت بۆ پێش خستنی کرێ یا دووا خستنی، وەك چۆن دروستە هەندێکی لە پێشەوە بدرێت و هەندێکی دوا بخرێت. بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (المسلمون عند شروطهم)[1].

واتە: موسوڵمانان لەسەر مەرجەکانیانن.

جا ئەگەر رێك کەوتنێك نەبوو لەسەر پێشخستنی کرێ یا دوا خستنی، ئەوە ئەگەر بسترابوو بە کاتێکی دیاری کراوەوە ئەبێ کاتێ ماوەکە کۆتایی هات کرێکە بدرێت، بۆ نموونە هەرکەس خانوویەکی بە کرێ گرت بۆ مانگێك ومانگەکە تێپەڕ بوو ئەبێ کرێکە بدات.

وە ئەگەر پەیمانەکە لەسەر کارێك بێت ئەبێ کرێکەی بدرێت کاتێك کارەکە کۆتایی هات.

وە ئەگەر پەیمانەکە مەرجی وەرگرتنی کرێی تێدا نەبوو، یا لە دەقەکەیدا باسی دوا خستنی تێدا نەبوو:

ئەبوحەنیفە ومالیك خوایان لێ ڕازی بێت فەرمویانە: پێویستە بە بەش بەش بدرێت بەپێی کەڵك وەرگرتن.

---

(١) تەخریجەکەی باس کراوە.

وە شافیعی وئەحمەد ڕەزای خوایان لێ بێت فەرمویانە: هەر بەو پەیمانە مافی کرێ وەرگرتنی پێویست ئەبێت.

وە ئەگەر خاوەن شت، شتە بەکرێ دراوەکەی تەسلیم بە لایەنەکەی تر کرد شایستەی هەموو کرێکە ئەبێت، لەبەر ئەوەی کەڵك وسوودەکەی داوە بەو کەسە بەپێی پەیمانی ئیجارەکە، بەوە تەسلیم کردنی کرێ پێویست ئەبێت بۆ ئەوەی تەسلیم کردنی شتەکەش پێویست ببێت.

**شایستە بوونی کرێ**

وە شایستە بوونی کرێ بەمەانەی خوارەوە ئەبێت:

١- لێ بوونەوە لە کارەکە، بەپێی ئەوەی ئیبنوماجە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أعطوا الأجير أجره قبل أن يجف عرقه)[1].

واتە: کرێی کرێ گرتە بدەن پێش ئەوەی عارەقەکەی ووشك بێتەوە.

٢- کەڵك لێ وەرگرتنی شتەکە ئەگەر ئیجارەکە لەسەر شتێکی بە کرێ دراو بوو، چونکە ئەگەر شتەکە لەناو چوو پێش ئەوەی سوودی لێ وەربگرێت وماوەی بەسەردا تێ نەپەڕی بێت ئیجارەکە پوچەڵ ئەبێتەوە.

٣- توانای کەڵك لێ وەرگرتنی هەبێت، ئەگەر ماوەیەك بەسەر پەیمانەکەدا بڕوات وشتەکە تەسلیم کرا بێت وتوانای کەڵك لێ وەرگرتنی هەبێت با بە کردەوەش کەڵکی لێ وەرنەگرتبێ.

٤- پێشخستنی کرێکە بە کردەوە یا بە ڕێکەوتنی هەردوولا لەسەر پێشخستنی.

**ئایا کرێکە ئەکەوێ بە لەناو چوونی شتەکە لە پەیمانی ئیجارەی کاروباردا؟**

ئەگەر کرێ گرتە کاری کرد لە موڵکی خاوەن شتدا یا بە ئامادە بوونی، شایستەی کرێ ئەبێت چونکە کەوتووەتە ژێر دەستی‌یەوە، هەرکاتێ شتێکی ئەنجام دا ئەوە تەسلیمی کردووە.

وە ئەگەر کارەکە لە دەستی کرێ گرتەکەدا بێت شایستەی کرێ نابێت ئەگەر شتەکە بە دەستی‌یەوە لەناو بچێت، چونکە کارەکەی تەسلیم نەکردووە، ئەمەش مەزهەبی شافیعی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکانە.

---

(١) تەخریجەکەی باس کراوە.

**به کرێ گرتنی دایەن:**

پیاوێك ژنەکەی خۆی بگرێت بە کرێ کە منداڵەکەی شیر بدات دروست نی‌یە، چونکە ئەو کارە پێویستە لەسەری بەپێی ئەوەی لە نێوان خۆی وخوای خۆیدایەتی.

بەڵام بە کرێ گرتنی ئافرەتی تر کە دایکی منالەکەی نەبێت دروستە بە کرێی دیاری کراو، وە دروستە لەسەر خواردەمەنی وجل وبەرگ، وە نادیاری کرێکە لەم حاڵەتەدا نابێتە هۆی گێرەوکێشە، وە عادەت وا رۆیشتووە کە لەگەڵ دایەندا موسامەحە وچاوپۆشی کردن وبارمەتی دان ببێت لەبەر منداڵەکە.

وە مەرجە ماوەی شیر دانەکە مەعلوم بێت، وە ناسینی منداڵ بە بینین و بە شوێنی شیر پێ دانەکە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ أَرَدْتُمْ أَنْ تَسْتَرْضِعُوا أَوْلاَدَكُمْ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُمْ مَا آتَيْتُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ (البقرة: ٢٣٣).

واتە: وە ئەگەر ویستان دایەن بگرن بۆ منداڵەکانتان، تاوان نابێت بۆتان ئەگەر ئەو کرێیەی بۆتان داناون بیان دەنێ بەپێی عورف، وە لە خوا بترسن وبزانن کە خوا چاوی لە کردەوەکانتانە.

وە ئەو دایەنەش وەك بە کرێ گیراوی تایبەت وایە، لەبەر ئەوە دروست نی‌یە منداڵێکی تر شیر بدات.

وە لەسەر دایەن پێویستە هەڵسێت بە شیر دان وئەوەی منداڵەکە پێویستی پێی هەیە لە شۆردنی خۆی وجل وبەرگ وخواردەمەنی بۆ دروست کردنی، وە لەسەر باوك پێویستە نەفەقەی خواردەمەنی و ئەوەی منداڵ پێویستی‌یەتی وەك چەوری و بۆنی خۆش و شتی تر.

وە ئەگەر منداڵەکە یا دایەنەکە یەکێکیان مرد ئیجارەکە هەڵئەوەشێتەوە، چونکە کەڵکەکە لە حاڵەتی مردنی دایەنەکە لە دەست ئەچێت بە لەناو چوونی شوێنەکەی، وە لە حاڵەتی مردنی منداڵەکەدا توانای پێدانی ئەو شتە نامێنێ کە پەیمانەکەی لەسەر بەستراوە.

**بە کرێ گرتن بە خواردەمەنی و جل وبەرگ:**

زانایان جیاوازی‌یان هەیە دەربارەی بە کرێ گرتن بە خواردەمەنی وپۆشاك، هەندێکیان رێیان داوەو هەندێکیان قەدەغەیان کردووە، وە بەڵگەی ئەوانەی رێیان پێ داوە ئەوەیە کە ئەحمەد وئیبنوماجە لە عوتبەی کوڕی (نُدَّر)ەوە گێڕاویانەتەوە فەرمویەتی: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین (طسم) ی خوێندەوە هەتا گەیشتە بە سەرهاتی موسی عليه السلام فەرمووی: (إن موسى أجَرَ نفسه ثمان سنين أو عشر سنين على عفة فرجه وطعام بطنه).

واتە: موسی خۆی دا بە کرێ هەشت یا دە ساڵ لەسەر پاك داوێنی وخواردنی سکی[1].

وە ئەم فەرموودەیە لە ئەبوبەکر و عومەرو ئەبو موساشەوە ئەگێڕنەوە.

وە مالیك وحەنبەلی یەکان بۆ ئەوە چوون، وە ئەبوحەنیفە بۆ دایەن ڕێ ئەدا لەسەر خواردن وپۆشاك، بەڵام بۆ خزمەتکار ڕێ نادات. وە شافیعی وئەبویوسف وموحەممەد و هادەوی یەکان ومەنصور باللە ووتویانە: بە کرێ گرتن لەسەر خۆراك وپۆشاك دروست نی یە چونکە نادیاری تێدایە.

وە ئەو مالیکی یانەی ڕێیان داوە بە کرێ گرتنی خزمەتکار بە خواردەمەنی وپۆشاك ڕایان وایە کە ئەبێت ئەو کارە بەپێی عورف وعادەت بێت ووتویانە: ئەگەر بڵێت: دەغڵەکەم ئەدرومەوە نیوەی بۆ تۆ یا ئەی هاڕم یا زەیت دروست ئەکەم، ئەگەر ئەو نیوەیەی بداتێ دروستە: وە ئەگەر مەبەستی نیوەی ئەوە بێت کەلی ی دەر ئەچێت دروست نی یە، چونکە نادیاری تێدایە.

**ئیجارە کردنی زەوی**

زەوی بە کرێگرتن یا بە کرێ دان دروستە، وە مەرجە کە بۆچی بە کرێ بگیرێت دیاری بکات، بۆ چاندنە یا دار ڕواندنە یا بۆ خانووە.

وە ئەگەر بۆ چاندن بێت ئەبێ چی تێدا ئەچێنێ ئاشکرای بکات، مەگەر خاوەن زەوی ڕێ بدات بە ئارەزووی خۆی چی تێدا ئەچێنێ بیچێنێ.

جا ئەگەر ئەم مەرجانە نەهاتنە دی ئیجارەکە فاسیدە.

چونکە کەڵکەکانی زەوی ئەگۆڕێ بەپێ ی خانوو کردن لەسەری و چاندنی، وەك چۆن ئەگۆڕێ بەپێ ی دوا کەوتنی کشتوکاڵەکە لە زەوی یەکەدا، وە بۆی هەیە بیکات بە کشت وکاڵێکی تر جگە لەوەی لەسەری ڕێك کەوتوون بە مەرجێك زیانەکەی وەك زیانی ئەو زەرعە بێت کە لەسەری ڕێك کەوتوون یا لەو کەمتر بێت.

وە داود فەرمویەتی: ئەوەی بۆ نی یە.

***بە کرێ گرتنی وڵاغ***

بە کرێ گرتنی وڵاغ دروستە ومەرجی ئەوەی تێدایە کە ئەبێت ماوەکە یان جێگاکە ئاشکرا بێت، وەك چۆن مەرجیشە ئاشکرا بکرێت کە بۆچی ئەو وڵاغە بەکرێ ئەگیرێ، بۆ بار یا بۆ سواری یە، وە ئاشکرا کردنی ئەوەی لی ی بارئەکرێ یا لی ی سوار ئەبێت.

---

(١) ابن ماجه (٢٤٤٤) وفتح الباري (٤/٤٤٥).

وە ئەگەر وولاغە بە کرێ گیراوەکە مرد کە بۆ بار یا سواری بە کرێ گیراوە، ئەوە ئەگەر عەیبداربوو ئیجارەکەی هەڵئەوەشێتەوە.

بەڵام ئەگەر عەیب دار نەبوو مرد ئیجارەکە پوچەڵ نابێتەوە.

وە لەسەر خاوەنی پێویستە وولاغێکی تری بۆ پەیدا بکات وبۆی نی یە پەیمانەکە هەڵوەشێنێتەوە، چونکە ئیجارەکە لەسەر کەڵکێکە کە لە زیمەدایە، وە خاوەنی نەتوان نی یە لە پەیدا کردنی ئەوەی کە پەیمانەکە پێویستی کردووە.

ئەمەش زانایانی هەر چوار مەزهەبەکە لەسەری ڕێکن.

*بە کرێ گرتنی خانوو بۆ دانیشتن*

وە بە کرێ گرتنی خانوو بۆ دانیشتن سوودی تێدا دانیشتن ڕەوا ئەکات، ئیتر خۆی تیایدا دابنیشێ یا کەسێکی تری تیێ بخات، بە خواستن بێ یا بەکرێ ئەوەی تیایدا دائەنیشێ، بە مەرجێك زیان بە خانووەکە نەگەیەنێت یا شێوەکەی بشێوێنێ وەك ئاسنگەر و وێنەی ئەو.

وە لەسەر خاوەنی پێویستە هەموو ئەو شتانە تەواو بکات کە بۆ خانووەکە پێویستە بەپێی عادەت.

بەکرێ دانەوەی ئەو شتەی کە بە کرێ گیراوە:

ئەو کەسەی کە شتەکە بە کرێ ئەگرێ بۆی هەیە بیداتەوە بە کرێ.

جا ئەگەر وولاغ بوو ئەبێ بۆ شتێکی بدات بە کرێ کە یەکسان بێت لەگەڵ ئەو شتەدا خۆی بۆی بە کرێ گرتووە بۆ ئەوەی زیان بە وولاغەکە نەگات.

وە دروستە ئەو شتە بە کرێ بدات بەو ئەندازەیە کە بە کرێی گرتووە یا زیاتر یا کەمتر، وە بۆی هەیە ئەوە وەربگرێت کە (الخلو) خەڵوی پێ ئەووترێ.

لەناو چوونی شتە بە کرێ گیراوەکە:

شتە بە کرێ گیراوەکە سپاردەیەکە بە دەستی ئەو کەسەوەیە کە بەکرێ گرتووە، چونکە بۆیە وەری گرتووە کە ئەو سوودەی شایستەیەتی لێی بگرێت، جا ئەگەر لەناو چوو پێی ناژمێرێت بە شێوەیەك نەبێت کە دەست درێژی بۆ کردبێت یا کەم تەرخەمی کرد بێت لە پاراستنیدا.

وە ئەگەر کەسێك وولاغێکی بە کرێ گرت، وە وەك عادەتە لغاوی کردە دەم و لەناو چوو، پێی ناژمێرێت.

**کرێ گرتە (الأجیر)**

کرێ گرتە: تایبەت وگشتی هەیە.

کرێ گرتەی تایبەت: ئەو کەسەیە بە کرێ ئەگیرێ بۆ ماوەیەکی دیاری کراو کە ئیشی تێدا بکات، جا ئەگەر ماوەکە دیاری نەکرابوو ئیجارەکە فاسیدە

وە بۆ هەردوولا هەیە هەرکاتێ ویستی پەیمانەکە هەڵبوەشێنێتەوە.

وە لە ئیجارەدا ئەگەر کابرای کرێ گرتە خۆی تەسلیمی ئەو کەسە کرد کە بەکرێی گرتووە بۆ ماوەیەك، ئەوە تەنها ئەوەندەی کرێ ئەدرێتێ کە ئەدرێ بە هاوەڵەکانی لەو ماوەیەی ئیشی تێدا ئەکات. وە کرێ گرتەی تایبەت دروست نی‌یە بۆی لەو کاتەدا کە پەیمانیان لەسەر بەستووە بۆ کەسێکی تر کار بکات. وە ئەگەر لەو ماوەیەدا ئیشی کرد بۆ کەسێکی تر، ئەوە بە ئەندازەی ئەو ئیشە لە کرێکەی کەم ئەکرێتەوە.

وە هەر کاتێ هاتە پێشەوە ونامادەیی خۆی دەربڕی بە کردنی ئەو کارەی بۆی بە کرێ گیاوە مافی هەموو کرێی ئەکەوێت.

وە هەروەها مافی وەرگرتنی کرێی تەواوی هەیە ئەگەر ئەو کەسەی بە کرێی گرتووە پەیمانەکە هەڵوەشێنێتەوە پێش ئەو کاتەی پەیمانیان لەسەر بەستووە، بە مەرجێ بەهانەیەکی وا نەیەتە کایەوە پێویست بکات بە هەڵوەشاندنەوە، وەك ئەوەی کابرای بە کرێ گیاو توانای کارەکەی نەبێت یا نەخۆش بکەوێت بە شێوەیەك توانای هەڵسان بەو کارەی نەمێنێ.

بەڵام ئەگەر عەیبێك یا نەتوانایی‌یەك پەیدابوو، جا کابرای کرێ دەر پەیمانەکەی هەڵوەشاندەوە، کرێ گرتە لەم شێوەیەدا تەنها کرێی ئەو ماوەیە وەرئەگرێت کە ئیشەکەی تێدا کردووە، وە لەسەر کرێدەر پێویست نی‌یە کە کرێی تەواو بدات. وە کرێ گرتەی تایبەت وەك وەکیلە لەوەدا کە باوەڕ پێ کراوە لەسەر ئەوەی کە بە دەستی‌یەوەیەتی، جا هەرچی بە دەستی‌یەوە لەناو بچێت دەستەبەر نابێت مەگەر بە هۆی کەم تەرخەمی‌یەوە یا بە دەستی قەست لەناوی بەرێت، بەڵام ئەگەر بەو شێوەیە بوو دەستەبەر ئەبێت و ئەبێ بیژمێرێت وەك هەموو پێ سپێراوێك.

**کرێ گرتەی هاوبەشی:**

کرێ گرتەی هاوبەشی ئەو کەسەیە بۆ چەند کەسێك کار ئەکات جا هەموویان هاوبەش ئەبن لە سوودەکەیدا وەك بۆیەچی(صباغ) و بەرگ درو و ئاسنگەر ودارتاش وئوتوچی.

وە بۆ ئەو کەسە نىیە کە بە کرێی گرتووە ڕێی لێ بگیرێت بۆ کەسێکی تر کار بکات، وە بەپێی کاری خۆی نەبێت کرێی نادرێتێ.

وە ئایا دەستی ئەمیش (ضامن) دەستەبەرە یا سپاردەیە؟

ئیمامی عەلی وعومەر ڕەزای خوایان لێ بێت بۆ ئەوە چوون کە دەستی کرێ گرتەی هاوبەش دەستی دەستەبەرە، وە هەروەها شورەیحی قاضي و ئەبویوسف وموحەممەد و مالیکی‌یەکان ئەو بۆچوونەیان هەبووە.

وە ئەبێ ئەو شتەی بە دەستی‌یەوە لەناو چوو بیژمێرێت، با بەقەستیش نەبێت یا لە کەم تەرخەمی‌یەوە نەبێت، لەبەر پاراستنی ماڵی خەڵك و پاراستنی بەرژەوەندیان.

وە بەیهەقی لە عەلی‌یەوە ئەگێڕێتەوە ﷺ کە ئەو شتانەی بە بۆیەچی و خاوەن پیشە ئەژمارد و ئەیفەرمو: ئەم خەڵکە بەو شێوەیە نەبێت چاك نابن.

وە هەروەها ئەگێڕێتەوە کە شافیعی ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت باسی کردووە کە شورەیح بۆ ئەوە چووە کە بۆیاخچی دەستەبەرە، جارێکیان بۆیاخچی‌یەکی دەستەبەر کرد لە کاتێکدا ماڵەکەی سوتابوو.

کابرای بۆیاخچی ووتی: ماڵەکەشم سوتاوە ودەستەبەریشم ئەکەی؟

شورەیح فەرموی: ئەگەر ماڵەکەی ئەو بسوتایە لە کرێکەی خۆت خۆش ئەبوویت وە وازت لێ ئەهێنا؟

ئەبوحەنیفە وئیبنوحەزم بۆ ئەوە چوون کە دەستی کرێ گرتە دەستی سپاردە (ئەمانەتە) و (ضمان) ناکرێت مەگەر ئەوکاتەی کە کەمتەرخەمی یان دەست درێژی تێدا بکرێت. ئەوەش ڕاستە لە مەزهەبی حەنبەلی‌یەکان و لە قسەکانی شافیعی دا ڕەحمەتی خوای لێ بێت. وە ئیبنوحەزم فەرمویەتی: چەمانەت بۆ کرێ گرتەی هاوبەشی وتایبەتی وسەنعەتکار نىیە لە بنەڕەتدا، مەگەر ئەوە سابت بێت کە بە قەستی لەناوی بردووە.

**هەڵوەشاندنەوەی ئیجارەکە و کۆتایی هاتنی**

ئیجارە پەیمانێکی سەپێنراوە کەسیان خاوەنی ئەوە نین بتوانن هەڵیوەشێننەوە، چونکە پەیمانێکی ئاڵ وگۆڕ کردنە؛ مەگەر شتێك بێتە کایەوە هەڵوەشاندنەوە پێویست بکات، وەك بوونی عەیب، بەم شێوەیەی خوارەوە:

جا ئیجارەکە هەڵناوەشێتەوە بە مردنی یەکێ لە هەردوو لایەنەکە کاتێ ئەو شتەی پەیمانەکەی لەسەر بەستراوە ساغ بێت، وە میراتگر ئەچێتە جێگای ئەو کەسە کرێ گرتەکە بوو یا کرێ دەر.

پێچەوانەی حەنەفی‌یەکان وە ڤاهیری‌یەکان وشیعەبی و ثەوری ولەیسی کوڕی سەعد.

وە هەروەها پەیمانەکە هەڵناوەشێتەوە بە فرۆشتنی شتە بە کرێ گیراوەکە بە کرێ دەر یا بە کەسێکی تر، وە کڕیار وەری ئەگرێت ئەگەر کرێ دەرەکە نەبوو دوای تەواو بوونی ماوەی ئیجارەکە.

وە بە مانەی خوارەوە هەڵئەوەشێتەوە:

١- لە پڕ عەیبێکی لێ ڕووبدات یا عەیبی کۆنی لێ دەرکەوێت کاتێ بە دەستی کرێ دەرەکەوە بێت.

٢- لەناو چوونی ئەو شتە دیاری کراوەی بە کرێ گیراوە وەك خانوو یا ووڵاغی دیاری کراو.

٣- لەناو چوونی ئەو شتە کە کرێی لە پێناودا ئەدرێ وەك قوماشی کرێ لەسەردراو بۆ دروون، چونکە ناتوانرێت ئەو شتە بدرێتە کرێ گرتەکە دووای لەناوچوونی.

٤- تەواو بوونی ئەو کەڵك وسوودەی پەیمانەکەی لەسەر بەستراوە یا کۆتایی هاتنی کارەکە یا کۆتایی هاتنی ماوەکە، مەگەر بەهانەیەك هەبێت ڕێ لە هەڵوەشاندنەوە بگرێت، وەك ئەوەی ماوەی ئیجارەی زەوی کشتوکاڵی کۆتایی بێت پێش ئەوەی دەغڵەکە دروابێتەوە، جا هەر بەو کرێیەی کە لەمەوپێش داوی‌یەتی ئەیداتێ و لە دەستیا ئەمێنێتەوە هەتا دروێنەی ئەکات، با خاوەن زەوی‌یەکەش زۆری لێ بکرێ، بۆ ئەوەی ئەو کەسە تووشی زیان نەبێت بە هەڵکەندنی دەغڵەکەی پێش پێگەیشتنی.

٥- وە حەنەفی‌یەکان ووتویانە: دروستە هەڵوەشاندنەوەی ئیجارە بە بەهانەیەك کە پەیدا ببێت هەرچەند لەلایەن خۆشیەوە ڕوو بدات، وەك ئەوەی دوکانێك بگرێ بە کرێ بۆ بازرگانی کردن تێیدا بەڵام ماڵەکەی بسوتێ یا بدزرێت یا لێی داگیر بکرێت یا ئیفلاس بکات، ئەوە بۆی هەیە ئیجارەکە هەڵبووەشێنێتەوە.

***گێڕانەوەی شتە بەکرێ گیراوەکە***

وە هەرکاتێك ماوەی ئیجارەکە کۆتایی هات پێویستە شتە بە کرێ گیراوەکە بگێڕێتەوە بۆ خاوەنی، جا ئەگەر شتی گوێزراوە بێت ئەبێت بدرێتەوە بە دەست خاوەنی.

بەڵام ئەگەر خانوو بەرە بێت ئەبێ بە چۆڵی بیداتەوە بە خاوەنی، وە ئەگەر زەوی کشت وکاڵی بێت بەبێ ئەوەی هیچی تێدا مابێت ئەیداتەوە بە خاوەنی، مەگەر بەهانەیەك هەبێت وەك لە پێشەوە باس

كرا، لەو كاتەدا بە دەستی‌یەوە ئەمێنێ هەتا دەغڵەكە دروێنە ئەكات هەر بەو ئەندازە كرێیەی كە لەوەوپێش داویەتی ئەیداتێ.

وە حەنبەلی‌یەكان وتویانە: هەركاتێك ماوەكە كۆتایی هات دەستی لەسەر شتەكە نامێنێ، بەڵام لەسەری نی‌یە وەك خۆی بیگێڕێتەوە، چونكە پەیمانێكە دەستەبەری (ضمان) پێویست ناكات، كەواتە پێویست ناكات بیگێڕێتەوە و خەرجی لێ بكات.

وە ووتویانە: وە دوای كۆتایی هاتنی ماوەكە وەك سپاردەیەكە بە دەستی‌یەوە ئەگەر لەناو چوو بێ ئەوەی كەمتەرخەمی تێدا كردبێت پێی نابژێررێت، واتە دەستەبەر نی‌یە.

**بازرگانی كردن بە پارەی خەڵكەوە (مچاربە)**

(مضاربة) وەرگیراوە لە (الضرب في الأرض) كە ئەویش سەفەر كردنە بۆ بازرگانی، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وآخرونَ يَضْرِبونَ في الأرضِ يَبْتَغونَ مِنْ فَضْلِ الله﴾ المزمل: ٢٠. وە پێشی ئەوترێ: (قراض) وە پێشی ئەوترێ: (معاملة) وە لێرەدا مەبەست لە (مضاربة) پەیمانێكە لە نێوان دوو لایەندا دەبەسترێ كە یەكێكیان پارەیەك بدا بەوی تریان بۆ ئەوەی بازرگانی پێوە بكا، لەسەر ئەوە كە قازانجەكەیان بە گوێرەی بڕیاری بەینی خۆیان بەش بكەن.

**حوكمەكەی:**

كردنی (مضاربة) بە ئیجماعی هەموو زانایان دروستە.

پێغەمبەر ﷺ بازرگانی كردووە بۆ خەدیجە خوای لێ ڕازی بێت بە ماڵی خۆی وپێوەی چووە بۆ شام پێش ئەوەی ببێتە پێغەمبەر، وە لەسەردەمی نەفامی دا كاری پێ كراوە، وە كاتێ ئیسلام هات بڕیاری مانەوەی دا.

ئیبنوحەجەر فەرمویەتی: ئەوەی ئێمە تەئكیدی ئەكەین ئەوەیە كە (مچاربە) سابت بووە لە سەردەمی پێغەمبەردا، ﷺ وە پێغەمبەر ﷺ خۆی ئاگای لێ بووە و هێشتویەتی‌یەوە، ئەگەر وانەبوایە هەرگیز دروست نەئەبوو.

وە ئەگێڕنەوە كە عبدالله وعبيدالله دوو كوڕی عومەری كوڕی (خطاب) خوایان لێ ڕازی بێت لەگەڵ ئەو سوپایەدا بوون كە بەرەو عێراق كشا بوو، كاتێ گەڕانەوە بە لای فەرمانبەرێكی عومەردا رضي الله عنه تێپەڕین كە ئەویش ئەبوموسای ئەشعەری بوو، ئەمیری بەصرە بوو بە خێرهاتنی كردن و ووتی: ئەگەر بتوانم بە كارێك سوودێكاتن پێ بگەیەنم ئەم كرد.

له پاشاندا وتی: ئەتوانم سامان ومالی خوامان لایه ئەمەوێ بینێرم بۆ گەورەی موسوڵمانان عومەر ﷺ ئەتان دەمێ کەلوپەلی پێ بکڕن له عێراق وله مەدینە بیفرۆشنەوە سەرمایەکە بدەنەوە به گەورەی موسوڵمانان وقازانجەکەی بۆ خۆتان، ئەوانیش وتیان: حەزئەکەین، ئەویش ماڵەکەی دا به هەردووکیان ونامەیەکی نوسی بۆ عومەر ﷺکە ماڵەکەیان لێ وەربگرێت، جا کاتێ گەیشتنە مەدینە کەلوپەلەکەیان فرۆشت وقازانجیان کرد.

عومەر ﷺ فەرمووی: ئایا سلفەی به هەموو سپاکە داوە وەك به ئێوەی داوە؟

وتیان: نەء، عومەر ﷺ فەرمووی: لەبەر ئەوەی کوڕی گەورەی موسوڵمانان بوون بۆیە سلفەی داونێ، سەرمایەکە وقازانجەکەم بدەنەوە.

عبدالله قسەی نەکرد بەڵام عبیدالله وتی: ئەی گەورەی موسوڵمانان ئەگەر سەرمایەکە لەناو بچوایە ئێمە ئەمان بژارد، وتی: هەرئەبێ سەرمایە وقازانجەکە بگێڕنەوە، عبدالله هەر دەنگی نەکرد. بەڵام عبیدالله قسەکەی دووبارە کردەوە، پیاوێك له کۆڕەکە دابوو وتی: ئەی گەورەی موسوڵمانان ئەگەر وەك موچارەبەی لێ بکەیت قازانجەکەیان لەگەڵدا بەش بکەی باشتر نی‌یە؟ عومەر ﷺ ڕازی بوو سەرمایە و نیوەی قازانجەکەی لێ سەندن

ئیتر عبدالله وعبیدالله نیوەی قازانجەکەیان وەرگرت.

حیکمەتی (مضاربة) :

ئیسلام دایناوە و ڕەوای کردووە بۆ کار ئاسانی خەڵك، چونکە کەسی وا هەیە ماڵی هەیەو بەڵام توانای بەکار هێنانی نی‌یە، وە هەروەها کەسانێك هەن ماڵیان نی‌یە، بەڵام توانای کارکردنیان هەیە، جا یاسادانەری ئیسلام ئەم مامەڵەیەی داناوە بۆ ئەوەی له یەکتر سوود وەربگرن.

جا خاوەن سامان هەیە به پسپۆری بازرگانەکە قازانج ئەکات، و بازرگانەکەش سوود له ماڵەکە وەرئەگرێت، بەم کارەش هاوکاری نێوان ماڵ وکار دێتەدی.

وە خوای گەورە پەیمانەکانی دانەناوە ئیللا بۆ بەدی هێنانی بەرژەوەندی ولابردنی پێویستی نەبێت.

پایەکانی:

پایەکانی دان و وەرگرتنە (الإیجاب والقبول) که له کەسێکەوە به دی بێت توانای پەیمان بەستنیان هەبێت. وە زاراوەی دانراو مەرج نی‌یە تێیدا، بەڵکو پەیمانەکە به هەرچی زاراوەیەك که مانای بازرگانی کردنی هەبێت تەواو ئەبێت، چونکە گرینگ له پەیمانەکاندا مەبست و واتایە، نەك زاراوە و داڕشتن.

مەرجەکانی:

ئەبێ ئەم مەرجانەی خوارەوە لە موضارەبەدا هەبن:

١- ئەبێ سەرمایەکە نەقد بێت، چونکە ئەگەر زێڕی بەکار نەهێنراو بوو یا خشڵ یا شتی بازرگانی دروست نیــیە. (ابن منذر) فەرمویەتی: هەموو ئەوانەی زانیاری شەرعیمان لێ وەرگرتوون کۆن لەسەر ئەوە کە دروست نیــیە پیاو قەرزێك کە لەسەر کەسێك هەیەتی بیکاتە (مضاربة) و قازانج بە شەریکایەتی. تەواوبوو.

٢- ئەبێ سەرمایەکە دیاری کراو بێت بۆ ئەوەی سەرمایەکە لە قازانجەکە جیا بکرێتەوە بە گوێرەی ڕێ کەوتنی هەردوولا.

٣- ئەبێ ڕێژەی قازانجەکە لە نێوان (عامل) بکەرو خاوەنماڵەکەدا دیاری کراو بێت، وەك سیــیەك ونیوە وچوار یەك، چونکە پێغەمبەر ﷺ مامەڵەی لەگەڵ خەڵکی خەیبەردا کردووە کە زەویــیەکانی بچێنن بە نیوەی ئەوەی بەرهەم دێ تیــیاندا[1].

وە ئیبنومونذیر فەرمویەتی: ئەوانەی زانیاریان لێوە فێر بووین هەموو لەسەر پوچەڵ کردنەوەی ئەو موچارەبەیە کۆن کە ئەگەر یەکێکیان یا هەردوو لایان پارەی مەعلوم بۆ خۆی دابنێت.

وە هۆی ئەو پوچەڵ بوونەوەش ئەوەیە ئەگەر بە مەرج دانرا یەکێکیان ئەندازەیەکی دیاری کراو بۆ خۆی دابنێت، ئەوە جاری وا ئەبێت قازانجەکە هەر ئەوەندەی ئەو ئەندازەیە، ئیتر ئەوەیان کە مەرجەکەی داناوە بەشەکە ئەبات وئەوی تریان هیچی دەست ناکەوێت، وە ئەمەش پێچەوانەی مەبەستە لە پەیمانی (مضاربة) کە مەبەست لێی سوود وەرگرتنی هەردوو لایە.

٤- ئەبێ بازرگانی کردنەکە (مطلق) ڕەها بێت، وە خاوەن سەرمایە کابرای بازرگان نەبەستێتەوە بەوەوە کە ئەبێت بچێت بۆ ئەو شارەی خۆی بۆی دیاری ئەکات، یا ئەو کەلوپەلە بهێنێت کە خۆی دیاری کردووە، یا لە وەرزێکدا بازرگانیــیەکەی بکات ولەوەرزێکی تردا نەیکات، یا لەگەڵ کەسێکی دیاری کراودا نەبێت مامەڵە نەکات و وێنەی ئەو شتانە.

چونکە بە مەرج گرتنی بەستنەوە زۆر لە مەبەستی پەیمانەکە لە دەست ئەدات، -کە ئەویش قازانجە- کەواتە نابێ بەستنەوە بکرێ بە مەرج، ئەگینا (مضاربة)ەکە فاسید ئەبێت.

ئەوەش مەزهەبی مالیك وشافیعیــیە.

---

(١) تەخریجی ئەم حەدیسە باس کراوە.

بەڵام ئەبوحەنیفە وئەحمەد ئەو مەرجەیان دانەناوە و فەرمویانە: (مضاربة) وەك چۆن بە ڕەهایی دروستە بە بەستراوەییش هەر دروستە.

جا لە شێوەی بەستنەوە(مقید)دا دروست نی‌یە کابرای بازرگان لەو مەرجانە تێپەڕێت، ئەگەر تێپەڕی زامن و دەستەبەرە.

ئەگێڕنەوە لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە کە: ئەگەر ماڵی بدایە بە کەسێك بازرگانی پێوە بکات ئەم مەرجانەی بۆدا ئەنا:

نابێت ماڵەکەی بدرێت بە ئاژەڵ، وە لە دەریاوە نەگوێزرێتەوە، وە لە شوێنێکدا داینەنێت کە لافاوی هەبێت، ئەگەر ئەوەت کرد ئەبێ هەرچی بە سەرماڵەکەمدا هات دەستەبەر بیت.

وە لە (مضاربە)دا دیاری کردنی ماوەکەی مەرج نی‌یە تێیدا، چونکە پەیمانێکی دروستە ئەتوانرێت هەڵوەشێتەوە هەر کاتێك بێت، وە مەرجی ئەوەی تێدا نی‌یە کە لە نێوان موسوڵمان و موسوڵماندا بێت، بەڵکو دروستە لە نێوان موسوڵمان و زیممی دا بێت.

**ئەوکەسەی کە پارەکە بە (مضاربة) وەرئەگرێت ئەمینە:**

هەرکاتێك پەیمانی (مضاربە)کە تەواو بوو، وە کابرای بازرگان ماڵەکەی وەرگرت لەسەرمایەدار وەك سپاردەیەك وایە لە دەستیا، دەستەبەر نی‌یە مەگەر زیادەڕەوی بکات تێیدا، جا ئەگەر ماڵەکە لەناو چوو بێ ئەوەی زیادەڕەوی تێدا کردبێت هیچی نایەتە سەر، وە قسەش قسەی ئەوە لەگەڵ سوێند خواردندا کاتێك بڵێت: ماڵەکە لەناو چوو، چونکە ئەسڵی ئەم کارە خەیانەت نەکردنە.

**بازرگانەکە ئەو ماڵەی وەری گرتووە بیداتەوە بە کەسێکی تر:**

بۆ بازرگانەکە نی‌یە ئەو ماڵەی وەری گرتووە بیداتەوە بە کەسێکی تر بازرگانی پێوە بکات ئەگەر ئەوەی کرد بە زیادەڕەوی دائەنرێت.

لە کتێبی (بدایة المجتهد)دا هاتووە: زانا بەناوبانگەکانی وڵاتانی ئیسلام جیاوازی‌یان نی‌یە کە ئەگەر کابرای بازرگانی کەر ئەو ماڵەی وەری گرتووە بۆ بازرگانی بیدات بە کەسێکی تر بە قازانج بە هاوبەشی خۆی دەستەبەرە ئەگەر تووشی زیان بوو، بەڵام ئەگەر قازانجی کرد ئەوە لەسەر مەرجەکەیەتی، پاشان بۆ ئەو کەسە ئەبێت کە مەرجەکەی بەجێ هێناوە لەسەر ئەوەی کە پێی داوە، جا بەشەکەی لەوە ئەداتێ کە ماوەتەوە لە ماڵەکە.

**نەفەقەی ئەوکەسەی (مضاربة) وەرئەگرێت:**

نەفەقەی کابرای (مضارب) لە ماڵی خۆی ئەبێت مادام جێ نشین بوو، وە هەروەها ئەگەر سەفەریشی کرد بۆ بازرگانی، چونکە جاری وا ئەبێت نەفەقەکەی ئەوەندەی قازانجەکەیە جا ئەو هەمووی ئەبات وکابرای سەرمایەداریش قازانجی بۆ نامێنێتەوە، وە لەبەر ئەوەی بەشی خۆی لە قازانجەکە بۆ دانراوە بە مەرج ئیتر لەوە زیاتر مافی شتی تری نی یە.

بەڵام ئەگەر خاوەنی ماڵەکە رێ ی دا بە بازرگانی کەرەکە نەفەقەی خۆی لەسەر ماڵەکە بێت کاتی سەفەرەکەی، یا عادەت بەو شێوەیە بوو، ئەو کاتە دروستە نەفەقەی خۆی لەو ماڵە هەڵگرێت.

وە ئیمامی مالیك ڕای وایە بۆ کابرای (مضارب) هەیە لە ماڵی بازرگانی یەکە مەسرەف بکات هەرکاتێك ماڵەکە ئەوەندە زۆر بوو کە بەشی مەسرەف کردنیشی ئەکرد.

**هەڵوەشاندنەوەی (مضاربة) :**

**کاری بازرگانی هاوبەش بە مانەی خوارەوە هەڵئەوەشێتەوە:**

**١-یەکێ لە مەرجەکانی صەحیح بوون نەمێنێ:**

ئەگەر مەرجێك لە مەرجە دروستەکان نەما، وە کابراش ماڵەکەی وەرگرتبوو بازرگانی پێوە ئەکرد لەم شێوەیەدا مافی کرێ وەرگرتنی هەیە ئەوەندەی ئەو کەسانە وەری ئەگرن کە وەك ئەو ئیش ئەکەن، چونکە ئەو کارکردنەی بەرێ دانی خاوەن ماڵ بووە و مافی کرێ وەرگرتنی هەیە.

وە هەرچی قازانجێکی کردبوو بۆ خاوەن ماڵەکەیە و هەرچی زیانێکی کردبوو هەر لەسەر ئەوە، چونکە بازرگانەکە تەنها کرێگرتەیە، وە کرێگرتەش (چامن) دەستەبەر نی یە مەگەر لەکاتی زیادەڕەویدا نەبێت.

**٢-** (مضارب) زیادەڕەوی بکات یا کەمتەرخەمی بکات لە پاراستنی ماڵەکەدا، یا کارێك بکات پێچەوانەی مەبەستی پەیمانەکە بێت. پەیمانی بازرگانی یەکە لەم شێوەیەدا پوچەڵ ئەبێتەوە، وە دەستەبەرە ئەگەر ماڵەکە لەناو چوو چونکە ئەو بووەتە هۆی لەناوچوونی.

**٣-** کابرای (مضارب) بمرێت یا خاوەن ماڵەکە ئەگەر هەر کامێکیان بمرن کارەکە هەڵئەوەشێتەوە.

**تەسەڕوفی (مضارب) دوای مردنی خاوەن ماڵەکە:**

کاتێ خاوەن سەرمایە مرد پەیمانەکە هەڵئەوەشێتەوە، وە هەرکاتێکیش پەیمانەکە هەڵوەشایەوە (مضارب)ەکە مافی تەسەروف کردنی نی یە لەو ماڵەدا، جا ئەگەر کاری پێ کرد دوای ئەوەی بە

مردنی خاوەنەکەی زانی وە بێ‌پرسی میراتگرەکانی ئەوە داگیرکەرە، وە هەرچی لەناو چوو ئەبێ بیژمێرێت.

وە ئەگەر قازانجی کرد بۆ هەردوولا ئەبێت، ئیبنوتەیمییە فەرمویەتی: وە گەورەی موسوڵمانان عومەری کوڕی (خطاب) ﷺ بەوە کاری کرد لەگەڵ هەردوو کوڕەکەیدا کاتێ ماڵەکەیان لە (بیت المال) وەرگرتبوو بازرگانیان پێوە کرد کە مافیان بە سەریەوە نەبوو جیا بۆی کردن بە ماڵی بازرگانی.

وە ئەگەر پەیمانەکە هەڵوەشایەوە و سەرمایەکە کەلوپەل بوو، ئەوە بۆ هەردوولایان هەیە بیفرۆشن یا بەشی بکەن چونکە مافی هەردوولایانە.

وە ئەگەر (مضارب) ڕازی بوو بە فرۆشتنی بەڵام خاوەن سەرمایە ڕازی نەبوو، زۆری لێ ئەکرێ بۆ فرۆشتن، چونکە کرێکارەکە مافی هەیە لە قازانجەکەیدا، وە ناتوانێت بەدەستی بێنێت هەتا ماڵەکە نەفرۆشێت، ئەوەش مەزهەبی شافیعی‌یەکان وحەنبەلی‌یەکانە.

مەرجە خاوەن ماڵ ئامادە بێت کاتی بەش کردنی:

ئیبنوڕوشد فەرمویەتی: زانایانی هەموو وڵاتانی ئیسلام لەسەر ئەوە کۆن کە دروست نی‌یە بۆ کاربەڕێوەبەرەکە بەشی خۆی لە قازانجەکە هەڵبگرێت هەتا خاوەن سەرمایەکە ئامادە نەبێت، وە ئامادە بوونی خاوەن پارەکە مەرجە بۆ دابەش کردنی و بۆ ئەوەی بەشی کاربەڕێوەبەرەکە بدرێت وە تەنها ئەوە بەس نی‌یە کە (مضارب) شایەت بگرێ بۆ بەش کردنی.

(حەواڵە)

(حوالة) لە (تحویل)ەوە وەرگیراوە کە بە مانای گواستنەوەیە.

وە لێرەدا مەبەست لە حەواڵە ئەوەیە ئەو قەرزەی لە ئەستۆی قەرزداردا هەیە بگوێزرێتەوە وبخرێتە سەر کەسێکی تر.

وە ئەبێ لەوکاتەدا هەر سێ لایەنەکە ئامادە بن ئەویش: قەرزدار وقەرزدەر و ئەو کەسەیە کە قەرزەکە لە جیاتی قەرزدارەکە ئەداتەوە.

وە حەواڵەش یەکێکە لەو کارانەی کە پێویستی بە (إیجاب و قبول) نی‌یە، وە بە هەموو شێوەیەك دروستە کە بەڵگە بێت لەسەری، وەك ئەوەی بڵێت: حەواڵەم کردیت یا قەرزەکەتم خستە سەر فڵانەکەس، و ئەو جۆرانە.

**ڕەوابوونی:**

**ئیسلام حەوالەی داناوە و ڕێ ی پێ داوە لەبەر ئەوەی خەڵك پێویستی بەوکارە هەیە.**

**بوخاری وموسلیم لە ئەبوهورەیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مطل الغني ظلم، وإذا أتبع أحدكم علي مليء فليتبع)[1].**

**واتە: قەرز کوێری دەوڵەمەند ستەمکاری‌یە، وە ئەگەر کەسێك قەرزەکەی حەواڵەی دەوڵەمەندێك کرایەوە با بچێت لەو دەوڵەمەندە وەریبگرێت.**

**لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی داوە بە خاوەن قەرز ئەگەر قەرزدار قەرزەکەی بەرەو ڕوی دەوڵەمەندێك کردەوە با قبوڵی بکات، وە ئەو کەسەی قەرزەکەی بەرەو ڕوکراوەتەوە با قەرزەکە لە جیاتی قەرزدارەکە بداتەوە.**

**ئایا ئەو فەرمانە بۆ (إستحباب) پەسەندی‌یە یا واجبە؟ :**

**زۆر لە حەنبەلی‌یەکان وئیبنوجەریر وئەبوثەور و ظاهیری‌یەکان بۆ ئەوە چوون کە پێویستە لەسەر خاوەن قەرز ئەو ئیحالەیە قبوڵ بکات کە ئیحالەی دەوڵەمەندێك کراوە بەپێی ئەو فەرمانە.**

**وە جەماوەری زانایان فەرمویانە: ئەو فەرمانە بۆ پەسەندی‌یە.**

**مەرجی دروستی حەواڵە:**

**بۆ دروستی حەواڵە ئەم مەرجانە پێویستە.**

**١- ڕازی بوونی حەواڵەکەرو حەواڵە کراو نەك حەوالە لەسەر کراو بەپێی حەدیسەکەی پێشوو، چونکە پێغەمبەر ﷺ هەر ئەو دووانەی باس کردووە، وە لەبەر ئەوەی حەواڵەکەر بۆی هەیە قەرزەکە بداتەوە کە لەسەریەتی لە هەرلایەکەوە بیەوێ، وە لەبەر ئەوەی حەواڵەکراویش مافەکەی لە ئەستۆی حەواڵەکەردایەو ناگوێزرێتەوە بۆ کەسێکی تر بە ڕەزامەندی خۆی نەبێت.**

**وە وتراوە: بۆیە ڕازی بوونی حەواڵە لەسەر کراو مەرج نی‌یە، چونکە پێویستە لەسەری قبوڵی بکات بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: ئەگەر کەسێکتان بەرەوڕوی دەوڵەمەندێك کرایەوە با قەرزەکەی لەو دەوڵەمەندە وەربگرێتەوە، چونکە ئەو تەنها ئەوەندەی بۆ هەیە مافی خۆی دەست بکەوێتەوە لە قەرزدارەکەوە بێت یا لە کەسێکەوە کە جێگای ئەوی گرتبێتەوە.**

---

(١) البخاري (٢٢٨٨) ومسلم (١٥٦٤).

وە ڕازی نەبوونی حەوالە لەسەرکراو بۆیە مەرج نی‌یە لێرەدا، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەکەدا باسی نەکردووە.

وە چونکە قەرزدار حەوالە لەسەر کراوەکەی لە جێگەی خۆی داناوە کە مافەکەی بداتەوە، کەواتە ڕازی بوونی ئەو کەسەی مافەکەی لەسەرە پێویست نی‌یە.

وە لای حەنەفی‌یەکان و (إصطخري) لە شافیعی‌یەکان ڕازی بوونی ئەو لایەنەش مەرجە.

٢- ئەبێ هەردوو مافەکە لە جنس و چەندیەتی و ماوەو چاکێتی وخراپێتی دا وەك یەك بن، کەواتە ئەو حەوالە کردنە دروست نی‌یە ئەگەر قەرزەکە زێڕ بێت و حەوالە کرابێتەوە کە زیو لە جیاتی وەربگرێت.

وە هەروەها ئەگەر قەرزەکە حازر بوو، وە ئەو ئیحالەی کرد بە موئەججەلی وەری بگرێتەوە یا بە پێچەوانەوە.

وە هەروەها حەوالەکە دروست نی‌یە ئەگەر مافەکان هەردووکیان جیاوازیان هەبوو لە ڕووی چاکی و خراپی‌یەوە، یا یەکێکیان زۆرتر بێت لەوەی تریان.

٣- ئەبێ قەرزەکە جێگیر بوو بێت، چونکە ئەگەر حەوالەی کاربەدەستێك کرابۆوە کە هێشتا مانگانەکەی وەر نەگرتبوو ئەو حەوالەیە دروست نی‌یە.

٤- ئەبێ هەر دوو مافەکە دیارین.

**ئایا قەرزەکە لە کۆڵ حەوالەکەر ئەکەوێ بەو حەوالە کردنە؟ :**

ئەگەر حەوالەکە دروست بوو لە کۆڵی ئەکەوێت، جا ئەگەر ئەو کەسەی قەرزەکەی بۆ سەر حەوالە کراوە ئیفلاسی کرد یا دانی نەنا بە حەوالەکەدا یا مرد، ئەوە قەرزدارەکە هیچ ناداتەوە بە خاوەن قەرزەکە.

ئەمە بۆچوونی جەماوەری زانایانە.

بەڵام مالیکی‌یەکان ووتویانە: مەگەر قەرزدار فێڵی لە خاوەن قەرز کردبێت بەرەو ڕووی کەسێکی کردبێتەوە کە دەست کورت و نەدار بێت.

مالیك لە (الموطأ) دا فەرمویەتی: ئەم کارە لای ئێمە ئەوەیە ئەگەر پیاوێکی قەرزدار خاوەن قەرزەکەی بەرەوڕووی کابرایەك کردەوە بۆ ئەوەی قەرزەکەی بداتەوە، ئەگەر ئەو پیاوە ئیفلاسی کرد یا مرد وقەرزەکەی نەداوە وئەوەندەی لە پاش خۆی بەجێ نەهێشت کە بدرێتەوە لە جیاتی قەرزدارەکە،

ئەوە قەرزدارەكە هیچی لەسەر نامێنێ، وە حەواڵە كراو بۆی نی‌یە بگەڕێتەوە سەر ئەو. وە فەرمویەتی: ئەمە شتێكە لای ئێمە جیاوازیمان نی‌یە لەسەری.

وە ئەبوحەنیفە و شورەیح وعوسمانی بەتتی و كەسانی تر فەرمویانە: ئەگەر ئەو كەسەی قەرزەكەی بەرەو ڕوكراوەتەوە مرد یا ئیفلاسی كرد یا دانی پێدا نەنا، ئەوە ئەگەڕێتەوە سەر قەرزداری‌یەكەم وقەرزەكەی لەو دەستێنێتەوە.

**هەڵگرتنەوە (الشفعة)**

**پێناسەكەی:**

شوفعە لای عەرەب هەر بووە و زانراوە.

وە پیاوی سەردەمی نەفامی ئەگەر بیویستایە خانوو یا باخێك بفرۆشێت دراوسێ‌یەكەی یا هاوبەشەكەی یا هاورێكەی ئەهات داوای لێ ئەكرد كە خۆی هەڵی ئەگرێتەوە، ئەویش ئەو كەسەی لە هەموو كەس بە لەپێشتر دائەنا وئەیدا بە ئەو، جا ئەو كارە ناو نراوە بە (شفعة)، وە داواكەرەكەش ناونراوە بە (شفیع)

وە لە شەرعدا مەبەست لە شوفعە: بوون بە خاوەنی ئەو شتەیە كە شوفعەی تیاكراوە بەزۆر لە جیاتی كڕیار بەو نرخەی كە ئەو داویەتی و بەوەی لێی خەرج كردووە،

واتە ئەو ماڵە لە كڕیار ئەسەندرێتەوە و دەیدەن بەوكەسەی كە مافی هەڵگرتنەوەی هەیە.

**ڕەوا بوونی :**

هەڵگرتنەوە سابتە بە سوننەت، وە موسوڵمانان ڕێك كەوتون لەسەر ئەوە كە ڕەوایە بەپێی شەرع.

بوخاری ئەگێڕێتەوە لە جابیری كوڕی عبداللە وە كە پێغەمبەر ﷺ هەڵگرتنەوەی داناوە لەو شتە هاوبەشیانەدا كە بەش نەكراون، بەڵام ئەگەر بەش كران وسنووری بۆ جیا كرایەوە و ڕێگەی بۆ دانرا، ئیتر هەڵگرتنەوەی بە سەرەوە نامێنێ لە لایەن هاوبەشەكەوە[1].

(١) أحمد (٣/٢٩٦و٣٩٩) والبخاري (٢٢٧٣و٢٢٥٧) وأبوداود (٣٥١٤) والترمذي (١٣٧٠) وابن ماجه (٢٤٩٩).

**حیکمەتی ڕەوا بوونی :**

ئیسلام شوفعەی داناوە بۆ دوور خستنەوەی زیان وناکۆکی لەنێوان خەڵکدا، چونکە مافی بوونە خاوەنی هاوبەشەکە بۆ شتە فرۆشراوەکە کە بێگانەیەك کڕیویەتی ئەو زیانانەی لێ دوور ئەخاتەوە کە لەوانەیە لە یەکێکی بێگانەوە ڕوبدات کاتێ کوتوپڕ ئەبێتە خاوەنی ئەو شتە.

شافیعی ئەوەی هەڵبژاردووە کە: ئەو زیانە زیانی مەسرەفی بەش کردنە وشتی تازە لێ دروست کردنی‌یەتی.

وە وتراوە: زیانی خراپی هاوبەشی‌یە.

**شوفعە بۆ زیمیش هەیە:**

وەك چۆن هەڵگرتنەوە بۆ موسوڵمان سابتە بۆ زیمیش سابتە لای جەماوەری زانایانی ئیسلام.

وە ئەحمەد و حەسەن وشیعبی فەرمویانە: بۆ زیمی سابت نی‌یە بەپێی ئەوەی (دارقطني) لە ئەنەسەوە گێڕاویەتی‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لاشفعة لنصراني)[1]. واتە: واتە شوفعە بۆ گاور نی‌یە.

**پرس کردن بە شەریك لە فرۆشتندا:**

وە پێویستە لەسەر شەریك پرس بە شەریکەکەی بکات پێش فرۆشتنی بەشەکەی خۆی. ئەگەر فرۆشتی وپرسی پێ نەکردبوو ئەو شەریکەی شایستەترە بۆ ئەو شتە.

وە ئەگەر پرسی پێ کرد بۆ فرۆشتنەکەی و ووتی: من پێویستیم پێی نی‌یە، ئیتر کە فرۆشرا بۆی نی‌یە دارای بکات، ئەوەش بەپێی حوکمی پێغەمبەرە، ﷺ کە بەرهەڵستی نی‌یە لە هیچ ڕویەکەوە.

١- موسلیم لە جابیرەوە ئەگێڕێتەوە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ هەڵگرتنەوەی داناوە لە هەموو ئەو شتە هاوبەشی‌یانەدا کە بەش نەکرا بوون: خانوو بەرە بێت یا باغ و بێستان. وە دروست نی‌یە بۆ هاوبەش بەشەکەی خۆی بفرۆشێتەوە هەتا پرس نەکات بە هاوبەشەکەی، جا ئەو هاوبەشە ئارەزووی لێ بێت هەڵی ئەگرێتەوەو ئارەزووی لێ بێت وازی لێ ئەهێنێت، بەڵام ئەگەر فرۆشتی وپرسی پێ نەکردبوو ئەو لە هەموو کەس لەپێشترە بۆی[2].

---

(١) البیهقي (٦/١٠٨) ومجمع الزوائد (٤/١٩٥).

(٢) مسلم (١٦٠٨/١٣٣) وأبوداود (٣٥١٣) والنسائي (٧/٣٢٠).

٢- وه له جابیرەوە که فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من كان له شرك في نخل أو ربعة فليس له أن يبيع حتى يؤذن شريكه، فإن رضي أخذ وإن كره ترك) (رواه يحيى بن آدم عن زهير عن أبي الزبير، وإسناده على شرط مسلم[1].

واتە: هەرکەس لە خورمادا یا لە خانوودا هاوبەشی هەبوو بۆی نی‌یە بەشەکەی خۆی بفرۆشێتەوە هەتا پرس بە هاوبەشەکەی نەکات، جا ئەگەر ڕازی بوو هەڵی ئەگرێتەوە، وە ئەگەر نەیویست وازی لێ دێنێ.

ئیبنوحەزم فەرمویەتی: ڕەوا نی‌یە بۆ کەسێك هاوبەشی هەبێت بەشەکەی خۆی بفرۆشێتەوە هەتا بە هاوبەشەکەی یا هاوبەشەکانی نەڵێت. جا ئەگەر هاوبەشەکە ویستی بەو نرخەی خەڵك پێی دابوو ئەو هاوبەشە لەپێشترە بۆی، بەڵام ئەگەر نەیویست مافی ئەفەوتێ، ئیتر بۆی نی‌یە داوای بکات بە هەرکەسی فرۆشتەوە.

بەڵام ئەگەر بە هاوبەشەکەی نەوت بوو وەك باسمان کرد هەتا فرۆشتی بە کەسێکی تر ئەو کاتە هاوبەشەکەی تارەزووی خۆیەتی یا ڕێ ئەدات بەو فرۆشتنە یا پوچەڵی ئەکاتەوە و خۆی ئەو بەشە هەڵئەگرێتەوە بۆ خۆی بەو نرخەی فرۆشتبووی.

وە ئیبنوقەییم فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەیە حوکمی کردووە لە هەڵگرتنەوەدا، وە لە هیچ ڕویەکەوە پێچەوانەی نی‌یە، وە هەر ئەوەش ڕاست و بڕاوەیە. وە هەندێ لە زانایان لەوانە شافیعی‌یەکان بۆ ئەوە چوون کە ئەم فەرمانە لەسەر پەسەندی دائەنرێت.

ئیمامی نەوەوی فەرمویەتی: ئەو فەرمانە لەسەر پەسەندی دائەنرێت لای هاوەڵەکانمان کە ئەبێت پرس بە هاوبەشەکە بکرێت، وە کەراهەتی هەیە فرۆشتنی پێش ئاگادارکردنی، بەڵام حەرام نی‌یە.

فێڵ کردن بۆ لابردنی شوفعە :

دروست نی‌یە فێڵ بکرێت بۆ ئەوەی هاوبەش مافی هەڵگرتنەوەی نەمێنێ، چونکە ئەو کارە بەتاڵ کردنەوەی مافی موسڵمانی تێدایە. بەپێی ئەوەی لە ئەبوهورەیرەوە بە مەرفوعی گێڕراوەتەوە: (لا ترتكبوا ما ارتكب اليهود، فتستحلوا محارم الله بأدنى الحيل).

واتە: ئەو تاوانە مەکەن کە جولەکە ئەیکات، جا ئەو شتانەی خوا حەرامی کردووە بە فێڵێکی بچوك حەڵاڵی بکەن[2].

---

(١) مسلم (١٦٠٨) وأحمد (٣/٣١٢).

(٢) إرواء الغليل (٥/٣٧٥).

ئەمە مەزهەبی مالیك و ئەحمەدە.

وە ئەبوحەنیفە وشافیعی ڕایان وایە کە دروستە بۆ ئەو کارە فێڵ بکرێت. وە فێڵ کردن بۆ لابردنی هەڵگرتنەوە وەك ئەوە کە هەندێ لە مولکەکە ببەخشرێت بەوکەسەی ئەیەوێت بەشەکەی خۆی پێ بفرۆشێتەوە، جا بەوکارە نەبێتە شەریکی، پاشان ئەوەی کە دەیەوێ پێی دەفرۆشێتەوە یان پێی دەبەخشێ.

مەرجەکانی شوفعە :

بۆ هەڵگرتنەوە ئەم مەرجانەی خوارەوە پێویستە:

یەکەم: ئەبێ ئەو شتەی داوای هەڵگرتنەوەی ئەکرێت عەقار بێت وەك زەوی وخانوو، وە ئەو شتانەی لەو شێوانەن وەك دیوار و دەرگا و ڕەفە و داری سەر دیوار، وە هەموو ئەو شتانەی ئەچنە ناو ئەو شتانەوە کە ئەفرۆشرێ. بەپێی ئەوەی جابیر فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ هەڵگرتنەوەی داناوە لە هەموو ئەو شتانەدا کە هاوبەشن و بەش نەکراون خانوو بێت یا باغ و بێستان.

ئەمەش مەزهەبی جەماوەری زانایانە.

وە خەڵکی مەککە و ظاهیری‌یەکان پێچەوانەی ئەوەن، وە هەروەها ڕیوایەتێك لە ئەحمەدەوە، وە ووتویانە: هەڵگرتنەوە لە هەموو شتێکدا ئەبێت، چونکە ئەو زیانەی دروست ئەبێت بۆ هاوبەشەکەی لە خانوو و زەویدا، بۆ هاوبەشی شتی گوێزراوەش دروست ئەبێت، وە بەپێی ئەوەی جابیر فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ هەڵگرتنەوەی لە هەموو شتێکدا داناوە. ئیبنوقەیم فەرمویەتی: گێڕەرەوەکانی ئەم فەرموودەیە جێی باوەڕن. و بەپێی حەدیسی ئیبنو عەبباس کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (الشفعة في كل شيء)[1] وە پیاوەکانی سیقەن،

بەڵام عیللەتی ئیرسالیان داوەتە پاڵ . وە طەحاوی شایەتێکی بۆ دەرهێناوە لە حەدیسی جابیرەوە بە ئیسنادێك کە خراپ نی‌یە، وە ئیبنوحەزم پاڵپشتی ئەوە ئەکات و دەڵێت: شوفعە پێویستە لە هەموو بەشێکی هاوبەشی فرۆشراودا کە بەش نەکرابێت لە نێوان دووان و بەرەوژوور، وە لە هەموو شتێك لەو شتانەدا کە بەش ناکرێن یا بەش ئەکرێن لە زەوی یا درەخت، یەك دانە یا زۆرتر، بەندە یا جاری‌یە، یا شمشێر، یا خواردەمەنی، یا ئاژەڵ، یا لە هەموو ئەوشتانەدا کە ئەفرۆشرێت.

دووەم: ئەبێ ئەوەی بەشەکە هەڵئەگرێتەوە هاوبەش بێت لەو شتەدا، وە ئەبێ هاوبەشی‌یەکە پێش فرۆشتن بێت، وە بەشی کەسیان دیاری نەکرابێت بەڵکو هاوبەشی‌یەکە بە تێکەڵی بێت.

---

(١) البيهقي (٦/١٠٩).

له جابیره‌وه ﷺ كه فه‌رمویه‌تی: (پێغه‌مبه‌ر ﷺ حوكمی به‌ شوفعه‌ كردووه‌ بۆ هه‌موو ئه‌و شتانه‌ی هاوبه‌شی‌یان تێدایه‌ و به‌ش نه‌كراون، جا ئه‌گه‌ر سنوریان بۆ دانا و ڕێگایان له‌ناودا دروست كرد ئیتر هه‌لگرتنه‌وه‌ی نامێنێ). هه‌ر پێنجه‌كه‌ گێراویانه‌ته‌وه‌[1].

واته‌: هه‌لگرتنه‌وه‌ سابته‌له‌ هه‌موو شتێكی هاوبه‌شی تێكه‌لّدا كه‌ بتوانرێت دابه‌ش بكرێت، به‌لاّم ئه‌گه‌ر به‌ش كراو نێوان ده‌ركه‌وت وڕێگایان بۆ كێشا له‌ نێوانیاندا ئیتر هه‌لگرتنه‌وه‌ی تێدا نامێنێ.

وه‌ ئه‌گه‌ر هه‌لگرتنه‌وه‌ چه‌سپابێت بۆ شه‌ریك بۆ ئه‌و شتانه‌ش ئه‌چه‌سپێ كه‌ دابه‌ش ئه‌كرێن، وه‌ زۆر له‌ هاوبه‌شه‌كه‌ ئه‌كرێ به‌شی بكات به‌ مه‌رجێك كه‌لّك له‌و به‌شه‌ وه‌ربگیر یّت به‌و شێوه‌یه‌ی كه‌ له‌ پێش به‌ش كردندا لی‌ێ وه‌رئه‌گیرێت.

وه‌ له‌به‌رئه‌وه‌ شوفعه‌ ناچه‌سپێت له‌ شتێكدا كه‌ ئه‌گه‌ر به‌ش كرا كه‌لّكی نه‌مێنێ.

له‌ (المنهاج)دا فه‌رمویه‌تی: هه‌موو ئه‌و شتانه‌ی ئه‌گه‌ر به‌ش كران كه‌لّكیان نه‌مێنێ، وه‌ك گه‌رماو و ناش، ئه‌وه‌ هه‌لگرتنه‌وه‌ی تێدا نی‌یه‌ له‌سه‌ر ڕاسترین ڕا.

وه‌ مالیك له‌ ئیبنوشیهابه‌وه‌ له‌ ئه‌بی سه‌له‌مه‌ی كوڕی عبدالرحمن وسه‌عیدی كوڕی موسه‌ییبه‌وه‌ ئه‌گێڕێته‌وه‌ كه‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ هه‌لگرتنه‌وه‌ی داناوه‌ له‌و شته‌ هاوبه‌شیانه‌دا كه‌ به‌ش نه‌كراون له‌نێوان هاوبه‌شه‌كاندا، جا ئه‌گه‌ر سنوور له‌نێوانیاندا دانرا شوفعه‌ی تێدا نی‌یه‌[2].

وه‌ ئه‌مه‌ش مه‌زهه‌بی عه‌لی و عوسمان وعومه‌ر سه‌عیدی كوڕی موسه‌ییب وسوله‌یمانی كوڕی یه‌سار و عومه‌ری كوڕی عبدالعزیز و ڕه‌بیعه‌ و مالیك و شافیعی و ئه‌وزاعی و ئه‌حمه‌د و ئیسحاق وعبیدالله‌ ی كوڕی حه‌سه‌ن و ئیمامی‌یه‌كانه‌.

له‌ (شرح السنه‌)دا فه‌رمویه‌تی: زانایان هه‌موو ڕێك كه‌وتون له‌سه‌ر چه‌سپانی هه‌لگرتنه‌وه‌ بۆ هاوبه‌ش له‌ چواریه‌كی هاوبه‌شی‌یه‌كدا ئه‌گه‌ر یه‌كێ له‌ هاوبه‌شه‌كان به‌شه‌كه‌ی خۆی فرۆشته‌وه‌ پێش دابه‌ش كردنی، وه‌ هاوبه‌شه‌كانی تریش بۆیان هه‌یه‌ هه‌لّی بگرنه‌وه‌ به‌و نرخه‌ی كه‌ پێ‌ی فرۆشراوه‌.

وه‌ ئه‌گه‌ر به‌ كه‌لوپه‌ل فرۆشرا بوو ئه‌وه‌ به‌ نرخی ئه‌و شتانه‌ هه‌لّی ئه‌گرنه‌وه‌. ته‌واوبوو. به‌لاّم دراوسێ لای ئه‌وانه‌ مافی هه‌لگرتنه‌وه‌ی نی‌یه‌.

---

(١) ته‌خریجه‌كه‌ی باس كراوه‌.

(٢) مالك في الموطأ (٢/٧١٣).

وە حەنەفی‌یەكان بە پێچەوانەی ئەمەوە ووتویانە: شوفعە پلە پلەیە، سابتە بۆ ئەو هاوبەشەی ماڵەكەیان بەش نەكردووە یەكەم جار، لەپاشاندا بۆ هاوبەشێك كە بەشی خۆی هەڵگرتۆتەوە، بەڵام هاوبەشی‌یەكەیان ماوە لە ڕێگاوباندا. لەپاشاندا بۆ دراوسێی ماڵ بە ماڵەوە.

وە لە زانایان هەیە كە لەم كارەدا ڕای ناوەندی هەیە ئەویش هەڵگرتنەوەی سابت كردووە كاتی هاوبەش بوون لە مافێك لە مافەكانی مولكدا وەك ڕێگا وئاو ئەو شتانە، وە هەڵگرتنەوەی لابردووە لەسەر هەموو ئەو مولكانەی كە بە ڕێگا جیا كراونەوە بە شێوەیەك هاوبەشی نەمێنێ لەنێوان خاوەنەكانیاندا. وە بەڵگەشیان بۆ ئەوە ئەوەیە كە خاوەن سونەنەكان بە ئیسنادێكی صحیح گێڕاویانەتەوە لە جابیرەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (الجار أحق بشفعة جاره، ينتظر بها وإن كان غائباً إذا كان طريقهما واحداً)[1].

واتە: دراوسێ لە هەموو كەس زیاتر مافی هەڵگرتنەوەی شتی دراوسێی هەیە، ئەگەر لەو كاتەدا دیار نەبوو ئەبێ چاوەڕوانی بكرێت بە مەرجێك ڕێگاكەیان یەكێك بێت.

ئیبنوقەیم فەرمویەتی: حەدیسەكانی جابیر بە لەفزو بە مانایانەوە دەلالەت ئەكەن و بەڵگەن لەسەر ئەو قسەیە و هیچ جیاوازی ودانانێك لەبەریا نامێنێ. وە فەرمویەتی: ئەو سێ فتوایەی لە مەزهەبی ئەحمەد دایە، ڕاست ترین و جوانترینیان ئەم قسەیەی سێیەمە.

سێیەم: ئەبێ شتە هاوبەشەكە لە مولكی خاوەنی دەربچێت بە بریتی‌یەكی ماڵی، وەك ئەوەی فرۆشراو بێت[2]، یا واتای فرۆشتنی هەبێت، وەك صولح كردن بە ماڵ لەجیاتی ئیعتیراف كردن، یا لە جیاتی تاوانێك ماڵ پێویست بكات، یا بەخشش بە فرۆشتن بە ماڵێكی دیاری كراو، چونكە ئەمانە فرۆشتنن لە ڕاستیدا.

كەواتە شوفعە نی‌یە لە شتێكدا مولكایەتی‌یەكەی بە شتێك جگە لە فرۆشتن گوێزرابێتەوە، وەك ماڵی بەخشراو بەبێ بەرامبەر، وە وەك وەسیەت پێكراو و میراتی.

وە لە(بداية المجتهد)دا هاتووە: زانایان جیاوازیان هەیە لە باغەوانیدا، ئەویش گۆڕینەوەی زەوی‌یە بە زەوی، لە مالیكەوە لەو بارەیەوە سێ ڕیوایەت هەیە: دروستی ونادروستی و سێیەمیان كە گواستنەوەكە یان لەنێوان هاوبەشەكاندا بێت، یان لەنێوان بێگانەكاندا بێت، جا ڕای نەبووە كە لەنێوان هاوبەشەكاندا دروست بێت، بەڵام ڕای هەبووە كە لەناو بێگانەدا دروستە.

---

(١) أحمد (٣/٣٠٣) وأبوداود (٣٥١٨) والترمذي (١٣٦٩) وابن ماجه (٢٤٩٤).

(٢) حەنەفی‌یەكان ڕایان وایە كە شوفعە تەنها لەماڵی فرۆشراودا ئەبێت بەپێی ڕواڵەتی حەدیسەكان.

چوارەم: ئەبێ هاوبەشەکە خێرا داوای بکات، واتە کاتێ هەڵگرەوەکە زانی هاوبەشەکەی بەشەکەی خۆی ئەفرۆشێتەوە پێویستە لەسەری داوای هەڵگرتنەوە بکات کاتێ پێی زانی وبۆی لوا، بەڵام ئەگەر پێی زانی و داوا کردنەوەکەی دواخست بە بێ بەهانە مافەکەی ئەفەوتێ.

وە هۆی ئەوەش ئەوەیە ئەگەر هاوبەشەکە خێرا داوای هەڵگرتنەوەکە نەکات مافی داوا کردنی لەسەر ئەو شتە ئەمێنێتەوە ئەوەش زیان بە کڕیار ئەگەیەنێت. چونکە خاوەنێتی لە شتە فرۆشراوەکە جێگیر نابێت وناتوانێ مامەڵەی پێوە بکات لە ترسی ئەوەی تێکۆشانەکەی بە خۆڕایی ئەڕوات و هاوبەشەکە لێی بستێنێتەوە. وە ئەبوحەنیفەش بۆ ئەوە چووە، وە لە مەزهەبی شافیعیشدا پارسەنگ دراوەتەوە، هەروەها ڕاسترینی دوو ڕیوایەتەکانە لە ئەحمەدەوە، وە ئەمە ئەگەر هەڵگرەوەکە غایب نەبێت، یا بە فرۆشتنەکەی نەزانیبێت، یا نەزانێ کە دواکەوتنی داواکەی مافەکەی ئەفەوتێنێ.

بەڵام ئەگەر هاوبەش غایب بوو یان بە فرۆشتنەکەی نەزانی، یان نەیزانی کە دوواکەوتن مافەکەی ئەفەوتێنێ، ئەو وەختە شوفعەکە هەر دەمێنێ.

وە ئیبنوحەزم وچەند کەسی تر ڕایان وایە کە هەڵگرتنەوە مافێکی چەسپاوە خوا پێویستی کردووە، کەواتە بە داوا نەکردنی ئەو مافە نا فەوتێ ئەگەر هەشتا ساڵ وزیاتریش دوا بکەوێت، مەگەر خۆی بیفەوتێنێ.

وە ڕای وایە کە ئەو قسەیەی دەڵێت شوفعە بۆ ئەو کەسەیە زوو پەلاماری بداتێ. زاراوەیەکی فاسیدە و دروست نی‌یە نیسبەت بدرێت بۆ پێغەمبەر ﷺ.

وە مالیك فەرمویەتی: هەڵگرتنەوە بە داوا کردنی خێرا پێویست نابێت، بەڵکو کاتی پێویست بوونی فراوانە.

ئیبنوروشد فەرمویەتی: قسەکانی مالیك دەربارەی ئەو ماوەیە جیاوازن کە ئایا دیاری کراوە یان نا؟

جارێك ووتویەتی: دیاری نەکراوە وە ئەو مافە هەرگیز نابڕێتەوە مەگەر شتە فرۆشراوەکە زۆر بگۆڕێت و ئەو ئاگای لێ بێت و بزانێ بەڵام بێ دەنگ بێت.

وە جارێکی تر ئەو کاتەی دیاری کردووە بە ساڵێك وئەڵێن: بە ساڵێك زیاتر دیاری کردووە بەڵام ساڵەکە بەناوبانگترە.

وە ئەگێڕنە لێیەوە: کە بە پێنج ساڵ مافی هەڵگرتنەوەی نابڕێت.

پێنجەم: ئەبێ هەڵگرەوەکە ئەو نرخە بداتەوە بە کڕیار کە داوێتی بە فروشیار کاتی پەیمانەکە، وە ئەبێ هاوبەشەکە ئەو شتە هەڵبگرێتەوە بەو نرخەی پیێ فرۆشراوە، یان وەك نرخی ئەو شتەی پیێ فرۆشراوە.

لە حەدیسەکەی جابیردا هاتووە بە مەرفوعی: (هو أحق به بالثمن) رواه الجوزجاني.

واتە: هاوبەشەکە لە هەموو کەس زیاتر مافی هەڵگرتنەوەی هەیە بە نرخەکەی خۆی.

وە ئەگەر نەیتوانی نرخەکەی بدات مافەکەی هەموو ئەفەوتێ.

مالیك وحەنبەلی یەکان ڕایان وایە ئەگەر نرخەکە هەندێکی یا هەمووی دوا خراو بوو ئەوە بۆ هەڵگرەوەکە هەیە دوای بخات یا بە بەش بەش بیدات بەپێی ئەو دەقەی لە پەیمانەکەدا هاتووە.

بە مەرجێك دەسەڵاتی هەبێت یا کەسێکی تر بێنێت کە دەسەڵاتی هەبێت و ببێتە چامنی ئەگینا ئەبێ خێرا نرخەکەی بدرێت لەبەر چاودێری کردنی کڕیارەکە.

بەڵام شافیعی وحەنەفی یەکان ڕایان وایە کە هاوبەشەکە نارەزووی خۆیەتی، ئەگەر پەلەی کرد هەڵگرتنەوەکەش خێرا ئەبێت ئەگینا ئەکەوێتە دواوە هەتا ئەو ماوەیەی بۆی دانراوە.

شەشەم: ئەبێ هاوبەشەکە هەموو ئەو بەشە هەڵگرێتەوەکە ئەفرۆشرێت

وە ئەگەر داوای هەندێکی بکات مافی هەڵگرتنەوەی لەسەر هەمووی نامێنێ

وە ئەگەر هەڵگرتنەوەکە لە نێوان کەسێك زیاتر بوو، وە هەندێکیان وازیان لێ هێنا ئەوە بۆ ئەوانی تر نییە ئەوە نەبێت کە ئەبێ هەموو بەشەکە هەڵگرنەوە بۆ ئەوەی بەش بەش نەبێت لەسەر کڕیارەکە.

**شوفعە لەنێوان چەند کەسێکدا:**

ئەگەر هەڵگرتنەوەکە لە نێوان چەند کەسێکدا بوو کە بەشەکانیان لەو هاوبەشی یەدا جیاواز بوو، ئەوە ئەبێ هەر یەکەیان بە ئەندازەی بەشەکەی خۆی هەڵگرێتەوە لە فرۆشراوەکە بەلای ئیمام مالیکەوە، و ڕاست ترین قەول لە هەردوو قەولەی شافیعی و ئەحمەد.

چونکە مافێکە بە هۆی مولکیەتی یەوە کەڵکی لێ وەرئەگیرێ بۆیە بەپێی مولکەکان دائەندرێ.

وە حەنەفی یەکان وئیبنوحەزم ووتویانە: بەپێی ژمارەی سەرە لەبەر یەکسانی هەموویان لە هۆی شایستە بوون بۆ ئەو مافە.

**ئایا شوفعە ئەبێتە میراتی:**

مالیك وشافیعی ڕایان وایە هەڵگرتنەوە ئەبێتە میراتی وبە مردن ئەو مافە پوچەڵ نابێتەوە، جا ئەگەر کەسێك هەڵگرتنەوەی بۆ پێویست بوو مرد و پێ ی نەزانی یا پێی زانی ومرد پێش ئەوەی بتوانێ وەری بگرێت، ئەوە ئەو مافە بە میراتی ئەگوێزرێتەوە بۆ میرات گر بە قیاس کردنی لەسەر ماڵ وسامان.

ئەحمەد فەرمویەتی: نابێتە میراتی مەگەر مردووەکە لە ژیاندا داوای کردبێت.

وە حەنەفی‌یەکان وتوویانە: ئەم مافە نابێتە میراتی وەك چۆن نافرۆشرێت.

هەرچەندە مردووەکەش داوای کردبێت، مەگەر ئەوەی حاکم حوکمی دابێت بۆی ولە پاشاندا مردبێت.

**تەسەڕوف کردنی کڕیار:**

تەسەڕوف کردنی کڕیار لە فرۆشراودا دروستە پێش ئەوەی هاوبەشەکەی هەڵیبگرێتەوە، چونکە مامەڵەی لە موڵکی خۆیدا کردووە، جا ئەگەر فرۆشتبوی بۆ هاوبەشەکە هەیە بە یەکێ لە نرخە فرۆشراوەکان هەڵی بگرێتەوە.

وە ئەگەر کڕیار بەخشی بووی یا وەقفی کرد یا کردبووی بە خێر یا کردبوویە مارەیی، شوفعەی لەسەر نامێنێ. چونکە زیانی بۆ ئەو کەسە تێدایە کە وەری گرتووە، چونکە موڵکایەتی لەناو ئەچێت بێ ئەوەی شت لە جیاتی وەربگرێت واتە بێ بەرامبەر، وە زیان بە زیان لا نابرێت.

بەڵام مامەڵەی کڕیار دوای ئەوەی کە هاوبەش هەڵی گرتەوە پوچەڵە لەبەر ئەوەی کە خاوەنێتی گوێزراوەتەوە بۆ هاوبەشەکە بە داواکردنی.

**کڕیار خانوو بکات پێش ئەوەی شایستەی هەڵگرتنەوە بێت:**

ئەگەر کڕیار خانووی کرد یا داری چاند لە بەشێك لەو زەوی‌یە هاوبەشەدا پێش ئەوەی هەڵ بگیرێتەوە، لەپاشاندا مافی هەڵگرتنەوەی هاتەسەر.

شافیعی و ئەحمەد فەرمویانە: بۆ هەڵگرەوەکە هەیە نرخی خانووەکەی بداتێ بە ڕوخاوی، وە هەروەها نرخی دارە چانراوەکانی بداتێ بە هەڵکەنراوی، یا پێی بسپێرێ کە بیڕوخێنێ.

مالیك فەرمویەتی: شوفعە نی‌یە هەتا نرخی خانووەکە یا چاندراوەکە نەداتەوە بە کڕیار.

**ڕێ کەوتن و صولح کردن لەسەر لابردنی (شفعە) هەڵگرتنەوە:**

ئەگەر هاوبەشەکە ڕێ کەوت دەربارەی وازهێنانی لە هەڵگرتنەوە یا کڕییەوە لە کڕیار ئەو کارەی پوچەڵە و مافی هەڵگرتنەوەی ناهێڵێ، وە لەسەری پێویستە هەرچی وەرگرتووە لە کڕیار بیداتەوە. ئەمە بەلای شافیعی یەوە.

وە لای سێ پێشەوا ئاییینی یەکەی تر ئەو کارەی دروستە و بۆی هەیە ئەوەی کڕیار داوێتی یە هەڵی گرێت بۆ خۆی.

**الوکالة**

**پێناسەکەی :**

(الوکالة) بە مانای پێ سپاردنە دەڵێی: (وکلت أمری إلی الله) واتە: کار وئیشم بەخوا سپاردو دامە دەست ئەو.

وە بە مانای پاراستنیش هاتووە، وەك فەرمودەی خوای گەورە: ﴿حسبنا الله ونعم الوکیل﴾ واتە: خوا بۆ ئێمە بەسە کە پارێزەرمان بێت و ئەو باشترین پارێزەرە.

وە لێرەدا: مەبەست لە (وکالة) بریکاری ئەوەیە کە ئادەمیزادێك جێگەی ئادەمیزادێکی تر بگرێتەوە لە شتێکدا کە جێگری وەربگرێت.

**ڕەوا بوونی :**

ئیسلام داینارە لەبەر ئەوەی زۆر پێویستە، چونکە هەموو کەس ناتوانێ ڕاستەوخۆ کارەکانی بەجێ بهێنێت بۆیە پێویستی بەوە هەیە کەسێکی تر بکاتە بریکاری خۆی بۆ ئەوەی لە جیاتی ئەو بە کارەکانی هەڵسێت، لە قورئانی پیرۆز دەربارەی بەسەرهاتی ئەوانەی چوونە ئەشکەوتەکەوە ئەفەرمووێت: ﴿وَكَذَلِكَ بَعَثْنَاهُمْ لِيَتَسَاءَلُوا بَيْنَهُمْ قَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ قَالُوا لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ قَالُوا رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ فَابْعَثُوا أَحَدَكُمْ بِوَرِقِكُمْ هَذِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ فَلْيَنْظُرْ أَيُّهَا أَزْكَى طَعَامًا فَلْيَأْتِكُمْ بِرِزْقٍ مِنْهُ وَلْيَتَلَطَّفْ وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا﴾ (الكهف:١٩) واتە: وەك چۆن خەوانماندن و ئاگادارمان کردن لەو ماوە درێژەدا بەو شێوەیە هەڵمان ساندنەوە لە خەو بۆ ئەوەی لە یەکتر بپرسن یەکێکیان وتی: چەندەیە بە خەوتوویی ماوینەوە؟ هەندێکیان وتیان: ڕۆژێکە یا هێندێك لە ڕۆژێکە، هەندێکی تر وتیان: پەروەردگارتان زاناترە بەوەی چەند ماونەوە، یەکێکتان بنێرن بەو درهەمانەوە بۆ شار با سەیرکات کام خواردنە حەڵاڵترو باشترە بۆمان بکڕێت و بیهێنێ، وە با هێمن و لەسەرخۆ بێت و کەس پێتان نەزانێت.

وە خوا لە یوسفەوەئەگێڕێتەوە کە بە پادشاکەی ووت: ﴿إجعلني على خزائن الأرض إني حفيظ عليم﴾. (يوسف: ٥٥).

واتە: بمکە بە سەرپەرشت لەسەر گەنجینەکانی میسر، چونکە من گەنجینەوانێکی دەست پاکو شارەزام.

وە فەرموودەی زۆریش هاتووە کە دروستی وەکالەت دەرئەخەن، لەوانە پێغەمبەر ﷺ ئەبو رافیع وپیاوێکی ئەنصاری کردە وەکیل مەیمونەیان بۆ مارە کردووە[1].

وە سابتە لێیەوە ﷺ کە بۆ دانەوەی قەرز وەکیلی گرتووە، وە هەروەها وەکیلی گرتووە بۆ سابت کردنی حەددی شەرعی و بەجێ هێنانی، وە وەکیلی گرتووە بۆ ئەوەی بەسەر قوربانی‌یەکانی‌یەوە بوەستێ گۆشتەکەی و پێستەکەی بەش بکەن.

وە موسوڵمانان هەموو کۆن لەسەر دروستی وەکیل گرتن، بەڵکو پەسەندیشی، چونکە جۆرێکە لە یارمەتی دان لەسەر چاکە وخوا پەرستی ئەو چاکە وخوا پەرستی‌یەی قورئان بانگەوازی بۆ کردووە و سوننەت بە پەسەندی داناوە، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وتعاونوا على البر والتقوى ولا تعاونوا على الإثم والعدوان﴾.

واتە: یارمەتی یەکتر بدەن لەسەر چاکە و خواپەرستی وە یارمەتی یەکتر مەدەن لەسەر تاوان و شەڕەنگێزی.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (والله في عون العبد ما كان العبد في عون أخيه)[2].

واتە: هەتا بەندەی خوا یارمەتی‌دەری براکەی بێت خواش یارمەتی دەریی‌یەتی.

وە خاوەنی کتێبی (البحر) ئیجماعی زانایان ئەگێڕێتەوە لەسەر ئەوەی وەکالەت ڕەواو مەشروعە.

وە دەربارەی ئەوەی کە وەکالەت جێگری‌یە یا سەر پشتی‌یە دوو قسە هەیە:

وتراوە: (نیابة) جێگری‌یە لەبەر ئەوەی پێچەوانە کردنی حەرامە.

وە ووتراوە: سەرپەرشتی‌یە لەبەر دروستی پێچەوانەکردنی بۆ چاکتر وەك فرۆشتن بە پارەی حازر لەکاتێکدا ئەو فەرمانی دابێت بە موئەجەل و دواخراو بیفرۆشێت.

---

(١) الترمذي (٨٤١) والتمهيد (٣/١٥٢) وزاد المعاد (١/١١٣).

(٢) مسلم (٢٦٩٩) وأبوداود (٤٩٤٦) والترمذي (١٩٣٠) وابن ماجه (٢٢٥).

**پایەکانی:**

وەکالەت پەیمانێکە لە پەیمانەکان و دروست نابێت هەتا پایەکانی جێگیر نەبێت بە دان و وەرگرتن (الإیجاب والقبول) وە زاراوەیەکی دیاری کراو تیایاندا مەرج نی‌یە، بەڵکو هەر قسەیەك یا کردەوەیەك بەڵگە بێت لەسەری دروستە. وە بۆ هەردوولا هەیە هەرکاتێك بیەوێ پەشێمان بێتەوە لە وەکالەتەکە، چونکە لە پەیمانە دروستەکانن کە بە زۆر ناسەپێن.

**ڕاپەڕاندن و بەستنەوە :**

وە پەیمانی وەکالەت دروستە ڕاپەڕێندرێ، وە دروستە بە شتێکەوە ببەسترێتەوە یا بدرێتە پاڵ داهاتوو، وە دروستیشە کاتێکی بۆ دیاری بکرێت، یا کارێکی بۆ دیاری بکرێت، جا وەکالەتی دەست بەجێ وەك ئەوەی بڵێت: کردومی بە وەکیل لە کڕینی ئەو شتەدا، وە وەکالەتی بەستراوەش وەك ئەوەی بڵێت: ئەگەر ئەو شتە تەواو بوو وەکیلم بە، وە ئەوەش کە دراوەتە پاڵ داهاتوو وەك ئەوەی بڵێت: کاتێ مانگی ڕەمەزان هات ئەت کەم بە وەکیل، وە ئەمەش کە کاتی بۆ دابنرێت: وەك ئەوەی بڵێت: بۆ ماوەی ساڵێك وەکیلم بە یا ئەو کارەم بۆ بکە، ئەوەش مەزهەبی حەنەفی‌یەکان وحەنبەلی‌یەکانە.

وە شافیعی‌یەکان ڕایان وایە کە وەکالەت دروست نی‌یە ببەسترێتەوە بە مەرجەوە.

وە وەکالەت کردنیش جاری واهەیە بەخشین ئەبێت لە لایەن وەکیلەکەوە، جاری وایە بەکرێ ئەبێت، چونکە کاری کەسێکی ترەو زۆری لێ ناکرێ کە بیکا لەبەر ئەوە دروستە بریتی و کرێ وەربگیرێت.

وە ئەگەر بەوشێوەیە بوو بۆ وەکیلگر هەیە مەرجی ئەوەی لەسەر دابنێت کە نابێت لە وەکیلی دەربچێت هەتا کاتی دیاری کراو، ئەگینا تەعویزی ئەخاتە سەر.

وە ئەگەر لە پەیمانەکەدا باسی کرێ کرابوو بۆ وەکیلەکە ئەوە بە کرێ گرتە دائەنرێت وحوکمی کرێ گرتەی بەسەردا ئەڕوات.

**مەرجەکانی:**

وە وەکالەت دروست نابێت هەتا مەرجەکانی تەواو نەبێت.

ئەو مەرجانەش هەندێکیان تایبەتن بە وەکیلەوە و هەندێکیان بەو کەسەوە کە وەکیلەکە ئەگرێ وهەندێکیان بەو کارەوە کە وەکیلەکەی بۆ ئەگیرێ، واتە شوێنی وەکالەتەکە.

**مەرجەکانی وەکیل گر:**

ئەبێ خاوەنی مامەڵەکردن و تەسەڕروف بێت لەو شتەدا کە وەکیلەکەی بۆ ئەگرێ، چونکە ئەگەر خاوەن تەسەڕروف نەبوو دروست نی‌یە وەکیل بگرێت، وەك شێت ومندالی بێ تەمییز، کە دروست نی‌یە کەسیان کەسێکی تر بگرێت بە وەکیلی خۆی لەبەر ئەوەی ئەهلی ئەو کارە نین، وە هەر لەسەرەتاوە خاوەنی تەسەڕروف نین بەڵام مندالی خاوەن تەمییز دروستە لەو شتانەدا وەکیل بگرێت کە سوود وکەڵکی پەتیان هەیە بۆی، وەك ئەوەی کەسێك بکات بە وەکیل بۆ وەرگرتنی بەخشش و صەدەقەو وەسیەت.

بەڵام ئەگەر تەسەڕروفاتەکە زیانی پەتی هەبوو بۆی، وەك تەڵاق دان وبەخشین وخێر کردن، ئەوە وەکیل گرتنەکەی دروست نی‌یە.

**مەرجەکانی وەکیل:**

مەرجە بریکار ژیر بێت، چونکە ئەگەر شێت یا گەوج یا مندالی بێ تەمییز واتە جیا نەکەرەوە بوو ئەوە دروست نی‌یە بکرێت بە وەکیل.

بەڵام مندالی خاوەن تەمییز لای حەنەفی‌یەکان دروستە بێتە وەکیل، چونکە وەك بالغ وەهایە بۆ کاروباری دونیا، وە لەبەر ئەوەی عەمری کوڕی ئوموسەلەمەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ دایکی مارە کرد لە پێغەمبەر ﷺ و هێشتا بالق نەبوبو[1].

**مەرجەکانی ئەو کارەی کە وەکیلی بۆ گیراوە:**

مەرجە ئەو کارە بۆ وەکیلەکە ئاشکرا بێت یا زۆر نادیار نەبێت، مەگەر وەکیل گر بە ڕاشکاوی شتەکەی بۆ دیاری نەکات وەك ئەوەی بڵێت: بە ئارەزووی خۆت شتم بۆ بکڕە، وە هەروەها مەرجە کە کارەکە قابیل بێت بۆ جێگری و نیابەتی.

وە ئەمەش بۆ هەموو ئەو پەیمانانەیە کە دروستە بۆ ئادەمیزاد بۆ خۆی بیبەستێ: وەك کرین وفرۆشتن و بە کرێ دان وچەسپاندنی قەرز و (عین) شت و ناکۆکی و شکات کردن و ئاشتی و داوای هەڵگرتنەوە و بەخشین و صەدەقە و بارمتە و ژن هێنان وتەڵاق دان وکار بەڕێوە بردن. ئیتر وەکیل گرەکە ئامادە بێت یان نا، ژن بێت یا پیاو وەك یەکە.

(١) أحمد (٦/٣١٣) وأبويعلى (٦/٢٤٤) والمطالب العالية (٤/١٣٣) والنسائي (٦/٨١) وابن حبان (١٢٨٢ الموارد) والحاكم (٤/١٧) وابن سعد (٨/٩٣).

بوخاری لە ئەبوهورەیرەوە گێڕاویەتی‌یەوە کە فەرمویەتی: پیاوێك ووشترێکی لەسەر پێغەمبەر ﷺ بوو هات وداوای کردەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بیدەنەوە، ئەوانیش گەڕان وەك ووشترەکەی خۆی لە تەمەندا نەبوو بەڵکو لەو گەورەتر بوو فەرمووی: بیدەنێ .

کابرا ووتی: چاکت دامەوە خوا چاکت بداتێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إن خيركم أحسنكم قضاءً)[1].

واتە: باشترین کەستان ئەوەتانە کە قەرز بە چاکی بداتەوە.

قرگبی فەرمویەتی: ئەم فەرموودە لەگەڵ ئەوەدا کە صەحیحە بەڵگەشە بۆ ئەوە کە دروستە وەکیل گرتن لەکاتی ئامادەیی ولەش ساغیدا، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا بە یارەکانی کە وشترەکە بدەنەوە بە کابرا، ئەمەش وەکیل گرتنە لەوکارەدا، لە کاتێکدا خۆی نە نەخۆش بوو نە لە سەفەر بوو، ئەمەش رەددی قسەی ئەبوحەنیفە وسەحنون ئەداتەوە کە ووتویانە: دروست نی‌یە وەکیل گرتنی ئامادەی لەش ساغ مەگەر بەرامبەرەکەی ڕازی بێت. وە ئەم فەرموودەیە پێچەوانەی قسەکەیانە.

ئەو شتانەی دروستە وەکیلی تیایاندا:

زانایان ڕێکخەرێکیان داناوە بۆ ئەو کارانەی وەکالەت تیایاندا دروستەو فەرمویانە: هەموو ئەو پەیمانانەی دروست بێت ئادەمیزاد خۆی بۆ خۆی بیبەستێ دروستە کەسێکی تریش بکاتە وەکیل بۆیان. بەڵام ئەوەی وەکیلی دروست نی‌یە تیایاندا، هەموو ئەو کارانەن کە جێگری تیایاندا دروست نی‌یە، وەك نوێژ وسوێند وطهارة، لەم شێوانەدا دروست نی‌یە ئادەمیزاد کەسێکی تر بکاتە وەکیلی، چونکە مەبەست لەمانە تاقی کردنەوەو ئیمتیحانە کە ئەمەش بەو کەسە خۆی نەبێت نایەتە دی.

وەکیل بە ئەمین ئەژمێردرێت:

وە هەرکاتێك وەکالەتەکە تەواو بوو پێی هات ئیتر ئەو وەکیلە ئەبێتە ئەمین بۆ ئەو شتانەی کراوە بە وەکیل تیایاندا و دەستبەر نابێت، مەگەر زیادەڕەوی یا کەمتەرخەمی بکات، وە قسەی وەکیل وەرئەگیرێ لە کاتی لەناوچوونی شتەکەدا وەك هەموو ئەمینەکانی تر[2].

---

(١) البخاري (٢٣٩٢) ومسلم (١٦٠١).

(٢) نمونە بۆ کەمتەرخەمی کردنی ئەوەیە کە کەلوپەلەکە بفرۆشێت وبیدات بە کڕیارەکە پێش ئەوەی نرخەکەی وەربگرێت، یا شتەکە بۆ خۆی بە تایبەتی بەکار بهێنێ، یا لە شوێنی پارێزراودا دایان نەنێت.

**وەکیل گرتن بۆ بەر بەرەکانێ کردن:**

وەکیل گرتن لەکاتی کێشەو ناکۆکیدا دروستە بۆ بەرامبەری کردن لە سابت کردنی قەرز و هەموو مافەکانی ئادەمیزاددا، ئیتر وەکیل گرەکە (مدعي) داواکار بێت یا داواکراو، پیاو بێت یا ژن، بەرامبەرەکەی ڕازی بێت یان نا.

چونکە کێشەو ناکۆکی مافی تایبەتی وەکیل گرە، جا بۆی هەیە خۆی سەرپەرشتی بکات و بۆشی هەیە کەسێکی تر بکاتە بریکاری خۆی.

وە ئایا ئەم جۆرە وەکیلە مافی بڕیاردانی هەیە لەبری ئەو کەسەی کە بۆتە وەکیلی ؟ وە ئایا مافی وەرگرتنی ئەومالّەی هەیە کە لەجیاتی وەکیل گرەکە بۆی بڕیار ئەدرێ؟ وەڵامی ئەمانە لە خوارەوە ڕوون ئەکەینەوە:

**ئیعتیراف کردنی وەکیل لەبری وەکیل گرەکەی :**

ئیعتیراف کردن و دان پیانانی وەکیل لەجیاتی وەکیل گر لە حەددە شەرعیەکان وقەصاصدا بە هیچ جۆرێك وەرناگیرێ لە کۆڕی قەزادابێت یا لە جێی تر.

بەڵام ئیعتیراف کردن لە غەیری حەددەکان و قەصاصدا، پێشەواکانی ئایینی ڕێك کەوتوون لەسەر ئەوەی کە ئەویش وەرناگیرێ لە کۆڕی قەزادا نەبێت.

وە جیاوازیان هەیە لەوەدا ئەگەر ئیقراری کرد لەبری ئەو لە کۆڕی (قەچاو) دادوەریدا، سێ پێشەوا ئاینیی‌یەکە فەرمویانە: دروست نی‌یە، چونکە ئیقرارە لە شتێکدا کە خاوەنی نی‌یە.

وە ئەبوحەنیفە فەرمویەتی: دروستە مەگەر مەرجی ئەوەی لەگەڵ کردبێت کە ئیقرار نەکات لەبری ئەو.

**ئەو کەسەی کە وەکیلە لەکێشەو ناکۆکیدا وەکیل نی‌یە بۆ وەرگرتنی ماڵ :**

ئەو کەسەی کراوە بە وەکیل بۆ کێشەو ناکۆکی وەکیل نی‌یە بۆ ئەوەی ماڵ وەربگرێ، چونکە جاری وایە ئەو کەسە لێهاتووە بۆ داواگەری و کێشە کردن، بەڵام ئەمین و دەست پاك نی‌یە لە وەرگرتنی مافەکاندا.

ئەمەش بۆچوونی هەر سێ پێشەوا ئایینی‌یەکەیە، بە پێچەوانەی حەنەفی‌یەکان کە ڕایان وایە بۆی هەیە ئەو ماڵەش وەربگرێت کە حاکم بۆ وەکیل گرەکەی داناوە، چونکە ئەوە لە تەواوکردنی کێشە کردندایە کە بەوە نەبێت کۆتایی نایەت، کەواتە لەمەشدا هەر بە وەکیل دائەنرێت.

**وەکیل بۆ جێ بە جێ کردنی تۆڵە سەندن:**

وە ئەوەی زانایان تێیدا جیاوازیان هەیە وەکیل گرتنە بۆ بەجێ هێنانی تۆڵە سەندن، ئەبوحەنیفە فەرمویەتی: دروست نی یە مەگەر وەکیل گرەکە خۆی ئامادە بێت، وە ئەگەر غایب بوو دروست نی یە، چونکە ئەو خاوەن مافەکەیە و لەوانەیە لی ی ببورێت، و جێبەجێ کردنی تۆڵەسەندن لەکاتی بوونی ئەو شوبهەیەدا دروست نی یە.

مالیك فەرمویەتی: ئەگەر وەکیل گرەکەش ئامادە نەبوو هەر دروستە.

ئەوەش ڕاستترین دوو قەولی شافیعی یە، وە ئاشکراترین ئەو دوو ڕیوایەتەیە کە لە ئەحمەدەوە گێڕراوەتەوە.

**وەکیل گرتن بۆ فرۆشتن :**

وە هەرکەس کەسێکی تر بکاتە وەکیلی خۆی بۆ ئەوەی شتێکی بۆ بفرۆشی، وە وەکیلەکەی ئازاد کردو نەیبەستەوە بە نرخێکی دیاری کراوە وە یا بیفرۆشێت بە نرخی حازریا قەرز.

ئەوە ئەو وەکیلە بۆی نی یە بیفرۆشێ بە نرخی هاو وێنەی خۆی نەبێت، وە بە پارەی حازر نەبێت، وە ئەگەر بەو شێوەیە نەیفرۆشت دروست نی یە مەگەر وەکیل گر خۆی ڕازی بێت، چونکە ئەو کارەی لەبەرژەوەندی ئەو نی یە لەبەر ئەوە ئەگەڕێتەوە بۆ ڕازی بوونی خۆی.

وە ئەگەر نەیبەستەوە بە نرخەوە مانای ئەوە نی یە وەکیلەکە بە ئارەزووی خۆی بیفرۆشێت، بەڵکو مانای وایە کە ئەبێ خەڵك چۆن شت ئەفرۆشن ئاوها بیفرۆشێت، وە بە شێوەیەك بێت سوودی زۆرتر بێت بۆ خاوەنی.

ئەبوحەنیفە فەرمویەتی: دروستە بە ئارەزووی خۆی بیفرۆشێت بە حازر یا بە قەرز، وە بێ ئەوەی بە نرخی هاو وێنەی خۆی بێت، یا بەو نرخە بێت کە زۆربەی خەڵکی مامەڵەی پێ ئەکەن، وە پارەی ئەو وڵاتە بێت یا بە پارەی وڵاتێکی تر، چونکە ئەوەیە مانای (إطلاق) ڕەهایی. وە جاری واش هەیە ئادەمیزاد حەز ئەکات ڕزگاری بێت لە هەندێ لەو شتانەی هەیەتی ئەگەر بە زەرەری زۆریش بێت.

ئەمە ئەگەر وەکالەتەکە موطلەق و ڕەها بوو، بەڵام ئەگەر موقەییەد بوو لەسەر وەکیلەکە پێویستە بەو شێوەیە بجوڵێتەوە کە خاوەنەکەی ووتویەتی: وە دروست نی یە بە پێچەوانەی ئەوەوە کار بکات مەگەر بۆ شتێك خێری زۆرتر بێت بۆ وەکیل گرەکە. وە ئەگەر داوای لێ کرد بە نرخێکی دیاری

کراو بیفرۆشێت ئەم بە زیاتر فرۆشتی یا ووتی: بە قەرزیش بیفرۆشە ئەم بە حازر فرۆشتی ئەو فرۆشتنە دروستە.

بەڵام ئەگەر پێچەوانەیی‌یەکە بۆ شتێك نەبوو کە خێری تێدا بێت بۆ وەکیل گر، ئەوکارەی باتڵە لای شافیعی.

وە حەنەفی‌یەکان ڕایان وایە ئەو کارە لەسەر ڕازی بوونی وەکیل گر ئەوەستێ ئەگەر ڕێی پێ دا ئەوە دروستە ئەگینا نا.

**کڕینی وەکیل لە خۆی بۆ خۆی:**

ئەگەر کەسێك بکرێ بە وەکیل بۆ فرۆشتنی شتێك ئایا دروستە بۆ خۆی بیکڕێت؟

مالیك فەرمویەتی: وەکیل بۆی هەیە بۆ خۆی بیکڕێتەوە بە نرخی زیاتر.

وە ئەبوحەنیفە وشافیعی وئەحمەد لە ئاشکراترین دوو ڕیوایەتەکەیدا فەرمویانە: دروست نی‌یە وەکیل ئەو شتە لە خۆی بۆ خۆی بکڕێت، چونکە ئادەمیزاد پەرۆشی ئەوەی هەیە کە شت بۆ خۆی بە هەرزان بکڕێت، وە مەبەستی وەکیل گریش هەوڵدانە بۆ فرۆشتنی بە زیادە ئەم دوو مەبەستەش پێچەوانەی‌یەکن.

**وەکیل گرتن بۆ کڕین:**

وەکیل بۆ کڕین ئەگەر بەستراوە بوو بە چەند مەرجێکەوە کە وەکیل گر بۆی داناوە پێویستە ئاگاداری ئەو مەرجانە بکات، ئیتر ئەو مەرجانە بۆ شتە کڕاوەکە بێت یا بۆ نرخەکە بێت وەك یەکە. جا ئەگەر وەکیل بە پێچەوانەوە شتێکی کڕی کە ئەو داوای ئەوەی نەکردبوو، یا لەو نرخە زیاتری پێدا کە بۆی دیاری کردبوو ئەوە ئەو کڕینە بۆخۆی ئەبێت نەك بۆ وەکیل گر، بەڵام ئەگەر پێچەوانەکە بۆ شتێکی باشتر بوو دروستە.

لە عوروەی باریقی‌یەوە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ دینارێکی پێ دا بەرخێکی بۆ بکڕێت ئەویش دوو بەرخی بەو پارەیە کڕی ویەکێکیانی فرۆشتەوە بە دینارێك و بەرخێکی بۆ هێناوە ئەویش ﷺ دوعای پیرۆزی وبەرەکەتی بۆ کرد لە فرۆشتنەکەیدا

جا وای لێ هاتبووگڵی بکڕیایە قازانجی لێ ئەکرد (بوخاری وئەبو داودو (ترمذي) گێڕاویانەتەوە).

لە مەدا بەڵگەی ئەوە هەیە کە دروستە بۆ وەکیل ئەگەر خاوەن شت پێی ووت: مەڕێکی شێوە ئاوام بۆ بکڕە، ئەو دوو مەڕی وەك ئەو شێوەیەی بۆ بکڕێ هەر بەو پارەیە، چونکە مەبەستی وەکیل گر هاتۆتە دی وە وەکیل قازانجیشی دەست کەوتووە.

وە وەك ئەم نمونەیە: ئەگەر داوای لێ کرد مەڕێکی بۆ بفرۆشێت بە درهەمێك وەکیلەکە بۆی فرۆشت بە دوو درهەم هەر دروستە. یا ئەگەر بلێت: بە درهەمێك بۆم بکڕە ئەو بە نیودرهەم بۆی کڕی.

وە ئەمە ڕاستە لای شافیعی‌یەکان وەك ئیمامی نەوەوی نەقڵی کردووە لە (زیادة الروضة)دا.

بەڵام ئەگەر وەکالەتەکە موطلەق بوو بۆی نی‌یە ئەو نرخە زیاتری پێ بدات کە لەناو خەڵکدا باوە یان بە نرخێك بیکڕێت کە فریوی زۆری تێدا بێت، وە ئەگەر پێچەوانەی کرد ئەو تەسەروفەی بۆ وەکیل گر نابێت بەڵکو کڕینەکە ئەکەوێتە سەر وەکیل خۆی.

**کۆتایی هاتنی پەیمانی وەکالەت :**

پەیمانی وەکالەت بەمانەی خوارەوە کۆتایی دێت:

١- مردنی لایەکیان یا شێت بوونی، چونکە لە مەرجەکانی وەکالەت زیندویی و ژیری‌یە، جا ئەگەر مردن و شێتی ڕویدا، ئەوەی دروستی وەکیلایەتی لەسەر وەستاوە وون ئەبێت و نامێنێ

٢- کۆتایی هێنان بەو کارەی کە وەکیلەکەی بۆ گیراوە، چونکە ئەگەر کارە مەبستەکە کۆتایی هات ئیتر وەکالەت بێ مانایە.

٣- وەکیل گر وەکیلەکە لابیات با وەکیلەکەش نەزانێ.

وە حەنەفی‌یەکان ڕایان وایە کە پێویستە وەکیل بزانێ بەو دەرکردنە، وە پێش پێزانینی کارەکانی وەك ئەو کارانەیە کە هێشتا دەر نە کراوە لە هەموو حوکمەکاندا.

٤- وەکیلەکە خۆی وازبهێنێ لە وەکیلایەتی، و مەرج نی‌یە وەکیل گر بزانێ کە وازی هێناوە یا ئامادە بێت.

وە حەنەفی‌یەکان مەرجی زانین وئامادە بوونی وەکیل گریان داناوە بۆ ئەوەی تووشی زیان نەبێت.

٥- دەرچوونی ئەو شتەی کە وەکیلەکەی بۆ گیراوە لە موڵکی وەکیل گر.

**خواستەمەنی (عارية)**

(عارية) خواستەمەنی کارێکە لە کارە چاکەکان کە ئیسلام بە پەسەندی داناوەو هانی خەڵکی بۆ داوە، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَتعاوَنوا على البرِّ والتَّقوَي ولا تعاوَنوا على الإثم والعدوان﴾.

لەسەر چاکە وخوا پەرستی یارمەتی یەك بدەن، وە یارمەتی یەکتر مەدەن لەسەر تاوان و دوژمنکاری.

وە ئەنەس ﷺ فەرمویەتی: دەنگێکی ترسناك لە قەراغ شاری مەدینەدا لە شەودا پەیدا بوو ڕێغەمبەر ﷺ ئەسبێکی لە ئەبوطەلحە خواست کە پێ یان ئەووت: (المندوب) سواری بوو کاتێ گەڕایەوە فەرمووی: (ما رأينا من شيء وإن وجدناه لبحراً)[1].

واتە: هیچمان نەبینی ئەگەر بشمان دۆزیایەوە گەیشتبووە دەریا.

وە زانایان پێناسەیان کردووە بەوە کە عاریە بریتی‌یە لەوە کە خاوەن شت ڕوخسەت بدا بە کەسێك بەبێ کرێ و بەرامبەر لە شتەکەی کەڵك وەربگرێ.

**بە چی دائەمەزرێت:**

بە هەموو ئەو قسەو کردەوانە پێك دێت کە بەڵگەن لەسەری.

**مەرجەکانی:**

ئەم مەرجانەی خوارەوە بۆ (عارية) دانراوە:

١- ئەوەی شتەکە ئەدات ئەبێ ئەهلی تەبەرروع بێت.

٢- ئەبێ شتەکە کەڵکی هەبێت وبمێنێتەوە.

٣- ئەبێ کەڵکەکە ڕەوا بێت.

**دانی (عارية) خواستەمەنی بە کەسێکی ترو بە کرێ دانی:**

ئەبوحەنیفە ومالیك بۆ ئەوە چوون کە بۆ خوازەر هەیە ئەو شتەی خواستویەتی بیداتەوە بە کەسێکی تر بێ ئەوەی خاوەنی ڕێی پێ بدات، ئەگەر هەر بۆ یەك مەبەست و بەکارهێنانی وەرگرێ.

دووەم: جیاوازی نەبێت لە بەکارهێنانی وەرگری یەکەم.

وە لای حەنبەلی‌یەکان هەرکاتێ (عارية) خواستن تەواو بوو بۆ خوازەر هەیە خۆی یان کەسێکی تر لە جیاتی خۆی کەڵکی لێ وەربگرێت، بەڵام ئەبێ بە کرێی نەدات و نەیدا بە کەسێکی تر بێ پرسی خاوەنی.

جا ئەگەر دای بە کەسێکی تر بەبێ پرسی خاوەنی وە لای خوازەری دووەم لەناو چوو بۆ خاوەنی هەیە بەئارەزووی خۆی بە کامیانی ئەبژێرێت بیبژێرێت.

وە خوازەری دووەم (ضامن) دەستەبەر ئەبێت، چونکە بە شێوەی (ضمان) وەری گرتووە و بە دەستی ئەمەوە لەناو چووە، وەك داگیرکەر لە داگیرکەرێکی تر.

(١) البخاري (٢٦٢٧) ومسلم (٢٣٠٧/٤٩).

**چ کاتێك خاوەن شت ئەو شتە داوا ئەکاتەوە؟:**

خاوەن شت بۆی هەیە ئەو شتەی داوێتی بە (عاریة) خواستن هەرکاتێك ئارەزووی کرد داوای بکاتەوە وبیگێڕێتەوە بە مەرجێك زیان بە خوازەر نەگات. بەڵام ئەگەر بە گێڕانەوەی زیان بە خوازەرەکە گەیشت ئەبێ دوای بخات هەتا کاتێك زیانی پێ نەگات.

**واجبێتی گێڕانەوەی :**

وە لەسەر خوازەر پێویستە خواستەمەنی‌یەکە بگێڕێتەوە بۆ خاوەنی دوای ئەوەی کە سوودی تەواوی لێ وەرگرت، بەپێی فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا﴾ (النساء: ٥٨).

واتە: خوا فەرمانتان پێ ئەکات کە ئەسپەردەکان بگێڕنەوە بۆ خاوەنەکانیان.

وە لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أد الأمانة إلي من أئتمنك ولا تخن من خانك) أخرجه أبوداود والترمذي، وصححه الحاكم وحسنه[1].

واتە: هەرکەسێ ئەسپەردەیەکی لا دانایت بیدەرەوە، وە خیانەت لە کەسێك مەکە کە خیانەتی پێ کردووی.

وە ئەبوداودو (ترمذي) کە بە صەحیحی داناوە ئەگێڕنەوە لە ئەبی ئومامەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (العارية مؤداة)[2].

واتە: خواستەمەنی ئەبێ بگێڕرێتەوە بۆ خاوەنی.

**خواستنی ئەو شتەی کە زیان ناگەیەنێت بە خاوەنی وە کەڵکی بۆ خوازەر هەیە:**

پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە کە ئادەمیزاد ڕێ نەدات بە دراوسێکەی تەختە بکوتێت بە دیوارەکەیدا بە مەرجێ زیانی پێ نەگەیەنێت و دیوارەکە تێك نەدات.

لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا يمنع أحدكم جاره أن يغرز خشبة في جداره)[3].

واتە: کەستان ڕێ لە دراوسێیەکەی نەگرێت کە دار بە دیوارەکەی دابکوتێت.

---

(١) أبوداود (٣٥٣٥) والترمذي (١٢٦٤) والحاكم (٢/٤٦).

(٢) أبوداود (٣٥٩٥) والترمذي (١٢٦٥) وابن حبان (٥٠٩٤).

(٣) البخاري (٢٤٦٣) ومسلم (١٦٠٩).

ئەبوهورەیرە کە زانی خەلکەکە لایان ناخۆش بوو فەرموی: بۆچی ئەبینم پشتی تێ ئەکەن؟ سوێند بە خوا تەختە ئەکوتم بە ناو شانتانا. مالیك ڕیوایەتی کردووە.

وە زانایان جیاوازیان هەیە لە واتای فەرموودەکەدا ئایا بۆ پەسەندی‌یەکە دراوسێ دار و تەختە بکوتێتە دیواری دراوسێ یان بۆ پێویست و واجبە، لەلایەن شافیعی وهاوەڵەکانی مالیکەوە دوو قەول هەیە ڕاست ترینیان لە هەردوو مەزهەبەکەدا بۆ پەسەندی‌یە و بۆ واجبی نی‌یە. وە ئەبوحەنیفە وکوفی‌یەکانیش ئەوە دەڵێن.

قەولی دووەم: واجب بوونە، ئەمیش ئەحمەد وئەبوپەور و زانایانی حەدیس ئەیڵێن وئەوەش ڕەواڵەتی فەرموودەکەیە، وە ئەوەی ئەڵێ بۆ پەسەندی‌یە وتویەتی: بە ڕواڵەتی فەرموودەکە ئەوان کارەکەیان نەکرد بۆیە ئەبوهورەیرە ووتی: چی‌یە نەتان بینم پشتی تێ ئەکەن. ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە ئەوان لە حەدیسەکە وا تێگەیشتن کە بۆ پەسەندی‌یە نەك بۆ واجب بوو، وە ئەگەر بۆ واجب بوون بوایە بەو شێوەیە پشتیان تێ نەئەکرد (ئیتر خواش زاناترە).

وە هەموو ئەو شتانەی خوازەر سوودی لێ وەربگرێ وزیانی بۆ خاوەن شت نەبێ ئەچنە ناو ئەوەوە. وە دروست نی‌یە کەس ڕێ لە کەس بگرێ، وە ئەگەر ڕێی لێ گرت حاکم حوکمی ئەدات بە دانی، بەپێی ئەوەی مالیك لە عومەری کوڕی خەططابەوە ﷺ ئەگێڕێتەوە کە چەحاکی کوڕی قەیس ویستی جۆگەلەیەك ڕابکێشێت بە ناو زەوی محمدی کوڕی سەلەمەدا بۆ باغەکەی خۆی ئەویش ڕێی نەدا، ضەححاك پێی ووت: تۆ ڕێم لێ ئەگری لەکاتێکدا سوودی بۆ خۆت هەیە لەسەرەتا و کۆتایی‌یەوە ئاوی پێ ئەدەی وزیانی نی‌یە بۆت، موحەممەد هەر ڕازی نەبوو ئەویش چووە لای عومەری کوڕی خەططاب و پێی ووت: عومەر ﷺ موحەممەدی کوڕی سەلەمەی بانگ کرد فەرمانی پێدا کە ڕێی بدات، موحەممەد هەر ووتی: ڕێی نادەم، عومەر ﷺ پێی فەرموو: براکەت بێبەش مەکە لە شتێك کە سوودی بۆی هەیە وزیانی بۆ تۆ نی‌یە، موحەممەد هەر ووتی: نایەڵم، عومەر ﷺ فەرموی: سوێند بەخوا ئەبێ جۆگەکە ڕابکێشرێت ئەگەر بە سەر ورگیشتا بێ، ئیتر عومەر ﷺ فەرمانی پێ دا جۆگەلەکە ڕابکێشێت، چەحاکیش ڕای کێشا.

وە بەپێی ئەوەی عەمری کوڕی یەحیای مازنی لە باوکی‌یەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: لەناو باغچەکەی باپیرەمدا سەرچاوە ئاوێکی عبدالرحمن ی کوڕی عەوفی تێدا بوو ویستی بیگوێزێتەوە بۆ لایەکی تر خاوەنی باغچەکە ڕێی نەدا-ئەویش بە عومەری کوڕی خەططابی ﷺ ووت-حوکمی دا بۆ عبدالرحمن ی کوڕی عەوف کە بیگوێزێتەوە.

وە ئەمەش مەزهەبی شافیعی وئەحمەد و ئەبوثەور و داود وکۆمەڵێك لە حەدیس ناسانە.

وە ئەبوحەنیفە و مالیك ڕایان وایە کە بە شتی وا ڕێ نادرێ چونکە خواستەمەنی حوکمی نادرێ بە سەردا.

وە فەرموودەکانی پێشوو ڕای یەکەم بەهێز ئەکەن.

**دەستەبەر بوونی خوازەر :**

وە هەرکاتێك خوازەر کەلوپەلە خواستووەکەی کەوتە دەست ضامن ئەبێ‌و ئەگەر لەناو چوو پێی ئەبژێرێت کەمتەرخەمی تێدا کردبێت یان نا.

وە ئیبنوعەبباس وعائیشە وئەبو هورەیرە وشافیعی وئیسحاق بۆ ئەوە چوون.

چونکە لە حەدیسەکەی سەمورەدا ﷺ هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (علی الید ما أخذت حتی تؤدي). أخرجه أحمد، وأبوداود والحاکم وصححه، وابن ماجه[1].

واتە: خوازەر دەستەبەرە هەتا کەلوپەلەکە ئەداتەوە دەست خاوەنی.

وە حەنەفی‌یەکان و مالیکی‌یەکان بۆ ئەوە چوون کە خوازەر دەستەبەر نی‌یە بە کەمتەرخەمی کردن نەبێت، بەپێی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (لیس علی المستعیر غیر المُغِل ضمان، ولا المستودع غیر المُغِل ضمان). أخرجه الدارقطني[2].

واتە: شت خوازی ناپاك نەبێت دەستەبەر نی‌یە، وە سپاردە لادانراوی ناپاك نەبێت دەستەبەر نی‌یە.

**ئەمانەت (ودیعة)**

**پێناسەکەی:**

(ودیعة) دانانی کەلوپەلە لای کەسێك بۆ ئەوەی بۆی بپارێزێت.

**حوکمەکەی:**

سپاردنی شت و وەرگرتنی سپاردە دروستە، وە پەسەندە قبوڵ کردنی بۆ ئەوکەسانەی بە خۆیان ڕائەبینن بۆ پاراستنی، وە پێویستە لەسەر ئەو کەسەی شتەکەی لا دائەنرێت لە شوێنێکی پارێزراودا دایبنێت.

---

(١) أحمد (٥/٨) وأبوداود (٣٥٦١) والترمذي (١٢٦٦) وابن ماجه (٢٤٠٠) والحاکم (٢/٤٧).

(٢) الدارقطني (٣/٤١).

وه (وديعة) ئەمانەتێكە لای ئەوكەسە پێویستە هەركاتێك خاوەنی داوای كردەوە بیداتەوە دەستی. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُمْ بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ وَلْيَتَّقِ اللَّهَ رَبَّهُ﴾ (البقرة/٢٨٣).

واتە: ئەگەر لە یەكتری ئەمین ودڵنیا بوون با ئەو كەسەی ئەمانەتەكەی لا دانراوە ئەمانەتەكە بداتەوە بە خاوەنی و لە خوای پەروەردگاری بترسێت.

وه لە پێشەوە ئەو فەرموودەیە باس كراوە كە ئەفەرموێت: ﴿أد الأمانة إلي من ائتمنك...﴾.

**(ضمان) دەستەبەربوون لە وەدیعەدا :**

ئەوكەسەی شتێكی لا دائەنرێت بە ئەمانەت ئەگەر لەناو چوو دەستەبەر نابێت، مەگەر بە كەمتەرخەمی ودەست درێژی بێت بۆ سەر شتەكە، بەپێی ئەو فەرموودەیەی لە بەشەكەی پێشودا (دارقطني) گێراویەتی‌یەوە. وە عەمری كوڕی شوعەیب لە باوكی‌یەوە لە باپیرەیەوە ئەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمورویەتی: (من أُودعَ وديعةً فلا ضمان عليه).[1]

واتە: كەسێك ئەسپەردەیەكی لەلا دانرابوو، دەستە بەر نی‌یە لەسەری.

وە لە فەرموودەیەكدا هاتووە كە بەیهەقی گێراویەتی‌یەوە: (لا ضمان على مؤتَمَنٍ).

واتە: هەركەس بە ئەمین دانراو شتێكی لا دانرا دەستەبەری نی‌یە.

وە ئەبوبەكر حوكمی دا بۆ سپاردەیەك كە لە تورەكەیەكدا دانرابوو، وە لەناو چوبوو بە كون بوونی تورەكەكە (ضمان) ی تێدا نی‌یە.

وە عوروەی كوڕی زوبێر ماڵێك لە ماڵی بەنی موصعەبی لای ئەبوبەكری كوڕی (عبدالرحمن)ی كوڕی حارسی كوڕی هیشام دانا. ئەڵێ: ماڵەكە یا هەندێ لە ماڵەكە لای ئەبوبەكر لەناو چوو، عوروە وەڵامی بۆ نارد كە دەستەبەریت لەسەر نی‌یە، چونكە تۆ بە ئەمین دانراوی. ئەبوبەكریش ووتی: منیش ئەمزانی كە دەستەبەریم لەسەر نی‌یە، بەڵام ناموێت قورەیش باسی ئەوە بكات كە ماڵی ئەمانەتەكە لای من لەناو چووە، لەپاشاندا ماڵێكی خۆی فرۆشت و دایەوە بە خاوەنی.

**وەرگیرانی قسەی پێ سپێرراو لەگەڵ سوێند خواردنیدا :**

ئەگەر سپاردە لا دانراوەكە بڵێت: شتە سپێرراوەكە لەناو چووە بێ ئەوەی دەستی منی تێدا بێت، ئەوە قسەكەی وەرئەگیرێت لەگەڵ سوێند خواردنی. ئیبنومونزیر فەرمویەتی: هەموو ئەوانەی ئێمە

---

(١) ابن ماجه (٢٤٠١).

زانیاری‌یان لێوه فێر بووین لەسەر ئەوه کۆن که ئەگەر کەسێکی سپارده لادانراو سپاردەکەی له شوێنێکی پارێزراودا دانا پاشان بلێت: لەناو چووه قسەکەی وەرئەگیرێت.

**ئیددیعا کردنی دزرانی ئەمانەتەکە :**

له کتێبی (مختصر الفتاوی)ی ئیبنوتەیمی‌یەدا هاتووه: کەسێك بلێت: سپاردەکەم له گەڵ ماڵەکەی خۆمدا پاراستووه، بەڵام سپاردەکه دزراوه و ماڵەکەم نەدزراوه، ئەو کەسەی دەستەبەره و دەبێ بیبژێرێ.

وه عومەر ﷺ سپاردەیەکی به ئەنەسی کوڕی مالیك بژارد کاتێ ووتی دزراوه بێ‌ئەوەی ماڵەکەی خۆی دزرابێ.

**کەسێك بمرێت و ئەسپەردەیەکی لەلا بێت:**

کەسێك بمرێت و سابت بێت که ماڵی کەسێکی تری لا دانراوه، بەڵام نەیان دۆزیوەتەوه قەرز ئەبێت لەسەری ئەبێ لەوماڵەی بەجێی هێشتووه بدرێتەوه.

وه ئەگەر نوسراوێك به نوسینی خۆی دۆزرایەوه و دانی به سپاردەکه دانابوو تێیدا ئەو نوسراوه وەرئەگیرێت و پەیڕەوی ئەکرێت، چونکه نوسین وەك دان پێدانانه به مەرجێ خەتەکەی بناسرێتەوه.

**داگیرکردن (الغصب)**

**پێناسەکەی:**

له قورئانی پیرۆزدا هاتووه: ﴿أَمَّا السَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَاكِينَ يَعْمَلُونَ فِي الْبَحْرِ فَأَرَدْتُ أَنْ أَعِيبَهَا وكَانَ وراَءَهُمْ مَلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا﴾ (الكهف/٧٩).

واته: ئەمما کەشتی‌یەکه هی کۆمەڵێك هەژار بوو له دەریادا کاریان پێ ئەکرد، جا ویستم عەیبداری بکەم، چونکه له دوایانەوه پاشایەك هەبوو که هەرچی کەشتی باش هەبوو داگیری ئەکرد.

وه (غصب) داگیر کردن ئەوەیه کەسێك دەست بەسەر مانی کەسێکی تردا بگرێت به زۆر و دوژمن کاری.

**حوکمەکەی:**

داگیرکردن کارێکی حەرامەو ئەنجام دەری تاوان بار ئەبێت، خوای گەوره فەرموویەتی: ﴿ولا تأكلوا أموالكم بينكم بالباطل﴾ (البقرة/١٨٨).

واته: ماڵی یەکتری له نێوان خۆتاندا به نارەوا مەخۆن.

١- وە لە ووتاری ماڵ ئاواییدا کە بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إن دماءكم وأموالكم وأعراضكم حرام عليكم كحرمة يومكم هذا، في شهركم هذا، في بلدكم هذا).

واتە: خوێن وماڵ و ناموستان حەرامە بۆ یەکتری وەك حەرامی ئەم ڕۆژەتان، لەم مانگەتانا، و لەم شارەتانا[1].

وە بوخاری وموسلیم گێڕاویانەتەوە لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لايزني الزاني حين يزني وهو مؤمن، ولا يشرب الشارب حين يشرب وهو مؤمن، ولايسرق السارق حين يسرق وهو مؤمن، ولا ينتهب نهبة يرفع الناس إليه فيها أبصارَهم حين ينتهبها وهو مؤمن)[2].

واتە: ئەوکاتەی زیناکەر زینا ئەکات باوەڕدار نی‌یە، وە ئەو کاتەی تارەق خۆر تارەق ئەخواتەوە باوەڕدار نی‌یە، وە ئەوکاتەی دز دزی ئەکات باوەڕدار نی‌یە، وە ئەو کەسەی ماڵی خەڵك تاڵان ئەکات کە خەڵك چاو لەدوای بن باوەڕدار نی‌یە.

٣- وە لە سائیبی کوڕی یەزیدەوە لە باوکی‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لايأخذنَّ أحدكم متاع أخيه جاداً ولا لاعباً، وإذا أخذ أحدكم عصا أخيه فليردها عليه). أخرجه أحمد وأبوداود والترمذي وحسنه[3].

واتە: کەستان شتومەکی براکەی نەبات بە ڕاستی بێت یا بە گاڵتەوە، وە ئەگەر کەسێکتان داردەستی براکەی برد با بۆی بگێڕێتەوە.

٤- وە لای (دارقطني) لە ڕێگای ئەنەسەوە بە مەرفوعی هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا يحل مال امرئ مسلم إلا بطيبةٍ من نفسه)[4].

واتە: ماڵی هیچ موسڵمانێك بۆ کەس حەڵاڵ نی‌یە مەگەر بەڕەزامەندی خۆی نەبێت.

٥- وە لە فەرمووده‌دا هاتووە: (من أخذ مال أخيه بيمينه، أوجب الله له النار وحرم عليه الجنة. فقال رجل: يارسول الله وإن كان شيئاً يسيراً؟ قال: وإن كان عوداً من أراك)[5].

---

(١) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

(٢) البخاري (٢٤٧٥) ومسلم (٥٧).

(٣) أحمد (٤/٢٢١) وأبوداود (٥٠٠٣) والترمذي (٢١٦٠).

(٤) ابن عبدالبر في التمهيد (١٠/٢٢٢) وأحمد (٥/٧٢) والدارقطني (٣/٢٦).

(٥) أحمد (٥/٢٦٠) ومسلم (٣/٢١٨) والنسائي (٨/٢٤٦) وابن ماجه (٢٣٢٤).

واتە: هەرکەس بە سوێندی درۆ ماڵی برا موسڵمانەکەی داگیر بکات خوا ئاگری بۆ پێویست ئەکات و بەهەشتی لەسەر حەرام ئەکات. کابرایەك ووتی: ئەگەر شتێکی کەمیش بێت ئەی نێرراوی خوا؟ فەرمووی: چیلکەیەك لە دار ئەراکێکیش بێت.

٦- وە بوخاری وموسلیم لە عائیشەوە ئەگێرنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من ظلم شبراً من الأرض طوقه الله من سبع أرضين)[١].

واتە: هەرکەس بستێ زەوی بە ستەم داگیر بکات خوا لە حەوت چینی زەویدا پێوەندی ئەکات.

**چاندن یا ناشتن یا خانوو لەسەر کردنی ئەو زەوییەی کە داگیر کراوە:**

هەرکەس زەوییەکی داگیر کراویدا چاند، کشتوکاڵەکەی بۆ خاوەنیەتی و خەرجییەکەی بۆ داگیرکەر ئەگەڕێتەوە. ئەمە ئەگەر دەغڵەکە نەدروابۆوە. بەڵام ئەگەر درونە کرابوو بۆ خاوەن زەوی لە کرێ زیاتر هیچی تر نییە. بەڵام ئەگەر داری تیا نێژرابوو ئەبێ دارەکان هەڵکەندرێت، وە هەروەها ئەگەر خانووی لەسەر کرابوو ئەبێ خانووەکە بڕوخێت، وە لە حەدیسەکەی ڕافیعی کوڕی خەدیجدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من زرع في أرض قوم بغير إذنهم، فليس له من الزرع شيء، وله نفقته). رواه أبوداود وابن ماجه والترمذي وحسنه، وأحمد[٢].

واتە: هەرکەس زەوی کۆمەڵێکی بێ پرس چاند، لە نەفەقەکەی بەولاوە هیچ لە کشتوکاڵەکەی بۆ نییە.

وە ئەحمەد فەرمویەتی: من بۆیە بۆ ئەو حوکمە ئەچم لەڕوی (استحسان) پەسەندییەوە بە پێچەوانەی قیاس.

وە ئەبوداود و (دارقطنی) لە حەدیسی عوروەی کوڕی زوبێرەوە تەخریجیان کردووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من أحيا أرضاً فهي له وليس لعرق ظالم حقٌ).

واتە: هەرکەس زەوییەکی زیندوو کردەوە بۆ خۆی ئەبێت، وە ئەوەی ستەمکار مافی تێدا نییە.

فەرمویەتی: ئەو کەسەی ئەو فەرموودەیەی بۆ گێڕامەوە پێی ڕاگەیاندم کە دوو پیاو کێشەیان بوو هاتنە لای پێغەمبەر، ﷺ یەکێکیان لە زەوی ئەوی تریاندا خورمای ناشتبوو، جا پێغەمبەر ﷺ

---

(١) البخاري (٣١٩٥) ومسلم (١٦١٢).

(٢) أحمد (٤/٤١) وأبوداود (٣٤٠٣) والترمذي (٨٣٦٦) وابن ماجه (٢٤٤٦).

زەوی‌یەکەی دایەوە بە خاوەنی. وە بە خاوەن دارخورماکان، فەرمانی دا کە دارخورماکانی هەڵکەنێتەوە. وتویەتی: چاوم لێ بوو بە پاچ لەبنی دارخورماکان ئەدرا کە کۆمەڵێکی زۆر بوون[1].

**حەرامێتی کەڵك وەرگرتن لە شتی داگیر کراو:**

وە مادام زەوت کردن حەرامە دروست نی‌یە سوود لەداگیرکراوەکە وەربگرێ بە هیچ شێوەیەك، وە پێویستە ئەوشتە ئەگەر مابوو لەگەڵ بەروبومەکەیدا بدرێتەوە بە خاوەنی، بەیەکەوە بن یا لە یەك جیابن[2].

چونکە لە حەدیسەکەی سەمورەدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (علی الید ما أخذت حتی تؤدیه). أخرجه أحمد وأبوداود والحاکم وصححه ابن ماجه[3].

واتە: ئەو دەستەی شتی وەرگرتووە دەستە بەرە هەتا ئەیداتەوە بە خاوەنی.

جا ئەگەر شتە داگیرکراوەکە لەناو چوو لەسەر داگیرکەر پێویستە وەك خۆی بیگێڕێتەوە،یا نرخەکەی بداتەوە، ئیتر خۆی لەناوی بردبێت، یا بە ئافاتێکی ئاسمانی لەناو چووبێت.

وە مالیکی‌یەکان بۆ ئەوە چوون کە شتی بازرگانی وئاژەڵ وشتی تر لەوانەی کە پێوانە وکێشانە ناکرێن، داگیرکەر دەستەبەرە بە نرخەکەی ئەگەر لەناو چوو.

وە لای حەنەفی‌یەکان و شافیعی‌یەکان ئەوکەسەی بەکاری هێناوە یا لەناوی بردووە (ضمان) دەستەبەری وێنەی ئەو شتەی لەسەر پێویستە، وە نابێ لەوە لابدرێ مەگەر وێنەی ئەو شتە نەبێ. وە رێك کەوتوون لەسەر ئەوەی شتی کێشراوو پێوراو ئەگەر داگیرکراو لەناو چوو، ئەبێ وەك خۆی پەیدا بکرێتەوە بۆ خاوەنی ئەگەر وێنەی هەبوو، بەپێی فەرموودەی خوای بەرز کە ئەفەرموێت: ﴿فَمَنْ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ﴾ (البقرة/١٩٤).

واتە: جا ئەگەر کەسێك دەست درێژی کردە سەرتان ئێوەش وەك ئەو دەست درێژی‌یە تۆڵەی لێ بسێننەوە.

---

(١) أبوداود (٣٠٧٤) والدارقطني (٣/٣٥).

(٢) جا ئەگەر بەروبومەکە لە داگیرکەرەوە بوو، هەندێ لە زانایان رایان وایە کە بەروبوومەکە لە نێوان خاوەن زەوی و داگیرکەردا بەش ئەکرێت وەك (مضاربة).

(٣) أحمد (٥/٨) وأبوداود (٣٥٦١) والترمذي (١٢٦٦) وابن ماجه (٢٤٠٠).

وه پارهو کرێی گێڕانهوهشی لهسهر داگیرکهره ههرچهندێك بێت. وه ئهگهر شته داگیرکراوهکه کهمی کرد بوو ئهبێ نرخی ئهو کهمی یهی بداتهوه به خاوهنی .کهمهکه له شتهکه خۆیدا بێت یا له سیفهتیدا.

**بهرگری کردن له سامان و ماڵ :**

وه لهسهر ئادهمیزاد پێویسته بهرگری له ماڵ وسامانی بکات ههرکاتێك کهسێکی تر بیهوێ داگیری بکات وبه تاڵان بیبات. وه ئهبێ له پێشهوه به سوك ترین شێوه بێت جا ئهگهر سوودی نهبوو به توندوتیژی، ئهگهرچی ببێته هۆی کوشتاریش.

پێغهمبهر ﷺ فهرمویهتی: (من قتل دون ماله فهو شهید، ومن قتل دون دمه فهو شهید ومن قتل دون أهله فهو شهید). رواه البخاري ومسلم والترمذي[1].

واته: ههرکهس لهپێناوی ماڵ و خوێن و ئاییین و کهسوکاری بکوژرێت ئهوه شههیده.

**ههرکهس ماڵی خۆی لای کهسێك دی یهوه مافی گێڕانهوهی ههیه:**

ههرکاتێك کهسێکی شت لێ داگیرکراو ماڵهکهی لا کهسێکی تر دۆزی یهوه مافی گێڕانهوهی ههیه، با داگیرکهرهکهشی فرۆشتبێتی بهو کهسه، چونکه داگیرکهرهکه کاتێ فرۆشتویهتی که خاوهنی ئهو شته نهبووه، کهواته عهقدی فرۆشتنهکه دروست نهبووه.

و لهوحاڵهتهدا کڕیار نرخهکه له داگیرکهر ئهسێنێتهوه.

ئهبوداود ونهسائی له سهمورهوه رضي الله عنه ئهگێڕنهوه که پێغهمبهر ﷺ فهرمویهتی: (من وجد عین ماله عندرجل فهو أحق به، ویتبع البیع من باعه).

واته: ههرکهس شتی خۆی لای پیاوێك بینی مافی گێڕانهوهی ههیه، وکڕیارهکهش نرخهکهی له فرۆشیار بسێنێتهوه.

**کردنهوهی دهرگای قهفهز:**

ههرکهس دهرگای قهفهزێکی کردهوهو باڵندهیهکی تێدابوو ههڵی فڕاند پێی ئهبژێرێت.

---

(١) البخاري (٢٤٨٠) ومسلم (١٤١) وأبوداود (٤٧٧١) والترمذي (١٤٣٠) والنسائي (١٤٢٠) وأحمد (١٦٣/٢).

وە زانایان جیاوازیان هەیە لەوەدا کە ئەگەر دەرگای قەفەزەکەی کردەوە و باڵندەیەکی تێدا بوو فڕی، یا ئاوساری ووشترێکی کردەوە هەڵات، ئەبوحەنیفە فەرمویەتی: دەستەبەر نابێت بە هیچ شێوەیەك.

وە مالیك وئەحمەد فەرمویانە: دەستەبەر ئەبێت، چ دوای کردنەوە دەرچێت یا پاش ماوەیەك.

وە لە شافیعی‌یەوە دوو قەول هەیە:

لە قەولە کۆنەکەیدا: دەستەبەر نی‌یە هەرگیز

وە لە نوێکەیدا: ئەگەر دوای کردنەوەی دەرچوو دەستە بەر ئەبێت.

بەڵام ئەگەر ماوەیەك وەستا لەپاشاندا فڕی، دەستەبەر نابێت.

**منداڵی دۆزراوە (لقیط)**

**پێناسەکەی:**

(لقیط) ئەو منداڵە نا باڵقەیە کە لە ڕێگاو بان ئەدۆزرێتەوە، یا سەرلی‌تێکچووی ڕێگایە و ڕەگەزی نازانرێت.

**حوکمی هەڵگرتنەوەی:**

وە هەڵگرتنەوەی منالی دۆزراوە فەرزێکە لە فەرزەکانی کیفایەت وەك هەموو ئەو شتانەی وون ئەبن و کەس نی‌یە سەرپەرشتیان بکات، چونکە بە واز لێ هێنانیان ئەفەوتێن. وە حوکمی موسوڵمانی بەسەردا ئەدرێت هەرکاتێ لە وڵاتی ئیسلامدا دۆزرایەوە.

**کێ بە دۆزراوەکە لەپێشترە:**

ئەوکەسەی ئەی دۆزێتەوە لە هەموو کەس لەپێشترە بۆ ئەوەی بیگرێتە لای خۆی بەمەرجێك ئازاد و ڕاستگۆو دەست پاك وپێ‌گەیشتو بێت.

وە لەسەریەتی کە هەڵسێت بە پەروەردەکردنی و فێر کردنی.

سەعیدی کوڕی مەنصور لە سونەنەکەیدا ئەگێڕێتەوە کە (سنین)ی کوڕی جەمیلە فەرمویەتی:

منداڵێکم دۆزی‌یەوە و هێنام بۆ لای عومەری کوڕی خەططاب ﷺ هاوەڵەکەم ووتی: ئەی گەورەی موسوڵمانان، ئەمە پیاوێکی چاکە، عمر ﷺ فەرموی: ئایا بەو شێوەیەیە؟ ووتی: بەڵێ، عمر ﷺ فەرموی: لەگەڵ خۆتا بیبە ئەوە ئازادە و سەرپەرشتی کردنی لەسەر تۆیە و نەفەقەکەشی لەسەر ئێمەیە، وە لە زاراوەیەکی تردا هاتووە: شیر دان لەسەر ئێمەیە.

جا ئەگەر کەوتە دەستی فاسقێك یا دەست کەسێك کە مەترسی لێبکرێت بیفەوتێنێ، لێی وەرئەگیرێ وحاکم سەرپەرشتی پەروەردەکردنی ئەکات.

**نەفەقە کێشانی:**

ئەگەر منداڵە دۆزراوەکە ماڵی لەگەڵ دۆزرایەوە نەفەقەی لەسەر ئەو ماڵەیەتی کە لەگەڵیا دۆزراوەتەوە، بەڵام ئەگەر ماڵی لەگەڵدا نەدۆزرایەوە، لە نەفەقەی (بیت المال) نەفەقەی ئەدرێت، چونکە (بیت المال) بۆ گیروگرفتی موسوڵمانان دانراوە.

ئەگەر ئەوەش نەلوا هەرکەس بە حاڵی ئەزانی ئەبێ نەفەقەی بکێشێ، چونکە ئەو کارە رزگارکردنی‌یەتی لە مردن، وە ناگەڕێتەوە بۆ (بیت المال) مەگەر قازی رێ بدات، جا ئەگەر قازی رێی نەدا، ئەوە نەفەقەکەی وەك بەخشش وخێر پێ‌کردن ئەبێت.

**میراتی دۆزراوە:**

وە ئەگەر دۆزراوەکە مرد ومیراتی بەجێ هێشت و میرات گری نەبوو، ئەوە میراتەکەی بۆ (بیت المال) ئەبێت، وە هەروەها خوێن بایی‌یەکەی بۆ (بیت المال) ئەبێت ئەگەر کوژرا، وە دۆزەرەوەکەی مافی میراتەکەی نی‌یە.

**کەسێك بڵێت منداڵی منە (إدعاء نسبه) :**

وە هەرکەس هات و وتی: ئەو منداڵە هی منە نێر بوو یا مێ ئەیدرێتێ، مادام رێی تێ بچێ، چونکە ئەوە بەرژەوەندی دۆزراوەکەی تێدایە بێ ئەوەی بەوکارە زیان بە کەسی تر بگات. ئەو کاتە نەسەب ومیراتی بۆ ئەو کەسەیە کە ئیدعای کردووە.

بەڵام ئەگەر لە یەکێك زیاتر ئیددیعای ئەوەی کرد، بۆ ئەو کەسە سابت ئەبێت کە بەڵگە لەسەر ئیددیعاکەی ئامادە بکات. ئەگەر بەڵگەیان نەبوو یا هەموویان بەڵگەیان هێنا، نیشان کەسانێك ئەدرێت کە بە عەرەبی پێ‌یان ئەووترێت (القافة) کە نەسەب بە لێك چوون ئەدۆزنەوە.

هەرکاتێك یەك (قائف) قیافەناس حوکمی دا بۆیەکێکیان کار بە حوکمەکە ئەکرێت بە مەرجێك ئەو کەسە تەکلیفی شەرعی لەسەر بێت و نێرو راست گۆ و تاقی کراوە بێت لە پێکانی راستیدا.

لە عائیشەوە خوا لێی رازی بێت فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ رۆژێکیان هاتە ژوورەکەم بۆلام دڵخۆش بوو سەروچاوی ئەدرەوشایەوە و فەرمووی: (ألم ترى أن مجزراً المدلجي نظر آنفاً إلى زيد

وأسامة وقد غطيا رؤسهما وبدت أقدامهما، فقال: إن هذه الإقدام بعضها من بعض) رواه البخاري ومسلم[1].

واتە: ئایا نازانی کە موجزەری مودەلەجی سەیری زەید وئوسامەی کرد کە داپۆشرا بوون، تەنها قاچیان بە دەرەوە بوو، ووتی: ئەم قاچانە لە یەکترین.

وە ئەگەر ئەوەش نەگونجا قورعە ئەکرێت لە نێوانیاندا بۆ هەرکامیان دەر چوو بۆ ئەو دەبێت.

وە حەنەفیەکان ووتویانە: نە بە قائیف کار ئەکرێت و نە بە قورعە، بەڵکو ئەگەر کۆمەڵێك یەکسان بوون لە داواکردنی منداڵێکی دۆزراوەدا، وە هاوبەش بوو لە نێوانیاندا ئەوە وەك کوڕی تەواو میراتگری هەریەکەیان ئەبێت، وە ئەوانیش وەك یەك باوك میراتگری ئەبن.

**شتی دۆزراوە (اللقطة)**

**پێناسەکەی:**

(لقطة) هەموو ماڵێکی پارێزراوە کە لە مەترسی لەناوچووندا بێت و خاوەنی نەناسرێت.

وە بە زۆری بەو شتانە ئەووترێت کە ئاژەڵ نین، بەڵام بە ئاژەڵی وون بوو ئەووترێت: سەرلێ شێواو (ضالة).

**حوکمەکەی:**

هەڵگرتنەوەی شتی وون بوو پەسەندە وە وتراوە: پێویستە.

وە وتراوە: ئەگەر لە شوێنێکدا بێت دزەرەوەکەی لێی ئەمین بێت کە نابرێت ئەگەر هەڵی نەگرێتەوە، پەسەندە هەڵی گرێتەوە. بەڵام ئەگەر لە شوێنێکدا بوو دزەرەوەکەی لێی ئەمین نەبوو ئەگەر هەڵی نەگرێتەوە ئەوە پێویستە لەسەری هەڵی گرێتەوە.

وە ئەگەر مەترسی ئەوەی هەبوو کە تەماع بیگرێت و هەڵی گرێت بۆ خۆی ئەوە حەرامە هەڵگرتنەوی، ئەم جیاوازیەش بە نیسبە کەسێکە کە باڵغ و ئازاد بێت، هەرچەند موسوڵمانیش نەبێت.

بەڵام ئەگەر ئازاد نەبوو یا منداڵ بوو یا ژیر نەبوو، پێویست نیە لەسەری هەڵی گرێتەوە.

وە بنەما لەمەدا ئەوەیە کە لە زەیدی کوڕی خالیدەوە ﷺ هاتووە فەرمویەتی: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پرسیاری دەربارەی شتی دۆزراوە لێ کرد ئەویش ﷺ فەرموی: (اعرف

---

(١) البخاري (٦٧٧٠و٦٧٧١) ومسلم (١٤٥٩/٣٨-٤٠).

عفاصها، ووكاءها، ثم أعرفها سنة، فإن جاء صاحبها، وإلاشأنك بها. قال: فضالةُ الغنم؟ قال ﷺ: هي لك، أو لأخيك، أو للذئب. قال: فضالة الإبل؟ قال ﷺ: مالك ولها، معها سقاؤها وحذاؤها، وترد الماء، وتأكل الشجر حتي يلقاها ربها) رواه البخاري وغيره بألفاظ مختلفة[1].

واتە: تورەکەکەی و پەتەکەی کە پێی بەستراوە بیناسە و باش سەیری بکە لە پاشاندا بۆ ماوەی ساڵێك بانگەوازی بۆ بکە، ئەگەر خاوەنی هات بیدەرەوە، ئەگینا دوای ئەو ساڵە چی لێ ئەکەیت بیکە.

کابرا ووتی: ئەی مەڕ وبزنی سەر لێ تێك چووو؟ فەرمووی ﷺ: یا بۆ تۆیە کە ئەیبەیتەوە، یا بۆ براکەتە کە ئەیباتەوە، یا بۆ گورگ ئەبێت کە ئەیخوات. کابرا ووتی: ئەی ووشتری سەر لێ تێك چوو؟ فەرمووی ﷺ تۆ چیتە بەسەر ووشتری وون بووەوە، چەوەندە ئاوی خۆی پێیە و پێڵاوی هەیە، ئاوی خۆی ئەخواتەوە گەڵای دار ئەخوات هەتا خاوەنی ئەی دۆزێتەوە.

دۆزراوەی حەرەم:

ئەوانەی باس کران ئەو شتانە بوون کە لە دەرەوەی حەرەم ئەدۆزرێنەوە، بەڵام شتی دۆزراوەی حەرەم حەرامە هەڵگرتنی بۆ دۆزینەوەی خاوەنی نەبێت، بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی:

(ولايلتقط لقطتها إلا من عرفها)[2].

واتە: دۆزراوەی هەڵناگیرێتەوە بۆ دۆزینەوەی خاوەنی نەبێت.

وە هەروەها فەرمویەتی: (لا يرفع لقطتها إلا منشد)[3].

واتە: شتی وون بوی هەڵنا گیرێتەوە مەگەر کەسێك کە بۆ بانگەواز کردن و ناساندنی هەڵی ئەگرێتەوە.

---

(١) البخاري (٢٤٢٩) ومسلم (١٧٢٢/٥و٦).

(٢) أحمد (١/٢٥٩) والبخاري تعليقاً (٥/٨٧).

(٣) البخاري (٢٤٣٣) من حديث ابن عباس، ومسلم (١٣٥٥/٤٧٧) من حديث أبي هريرة.

**پاراستن و بانگەواز بۆکردنی:**

پێویستە لەسەر هەڵگرەوی باش سەیری بکات و تورەکە و پەت وشتی تر باش بزانێت و بیناسێت، وە هەروەها چەندێتی و چۆنی‌یەتی و رەگەزەکەی، وە ئەبێ بیپارێزێت وەك ماڵی خۆی بێ نرخ بێت یا بە نرخ.

وە لای ئەمینێتەوە بە ئەمانەت، وە ئەگەر لەناو چوو دەستەبەر نابێت مەگەر خۆی لەناوی بەرێت.

پاشان لەناو خەڵکدا باسی ئەکات بە هەموو شێوەیەك لە بازار ولەو شوێنانەدا کە گومانی ئەوە هەیە خاوەنەکەی لەو شوێنەدا بێت.

جا ئەگەر خاوەنی هات ونیشانەکانی ووت بە تەواوی دروستە بۆ هەڵگرەوەکەی بیداتەوە دەستی ئەگەرچی بەڵگەشی نەبێت.

وە ئەگەر خاوەنی نەهات ئەبێ ماوەی ساڵێك بانگەوازی بۆ بکات، ئەگەر لەپاش ساڵەکە خاوەنی نەبوو دروستە بۆی بیکات بە خێر یا سوودی لێ وەربگرێت ئەو کەسە دەوڵەمەند بێت یا هەژار، ئیتر ضامن و دەستەبەر نی‌یە.

بەپێی ئەوەی بوخاری و (ترمذي) ئەگێڕنەوە لە سوەیدی کوڕی غەفلەوە کە فەرمویەتی: بە ئەوسی کوڕی کەعب گەیشتم ووتی: کیسەیەکم دۆزی‌یەوە صەد دیناری تێدا بوو، بردم بۆلای پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ماوەی ساڵێك بانگەوازی بۆ بکە، منیش ساڵێك بانگەوازم بۆ کرد خاوەنی نەبوو، لە پاشاندا سێ جار هاتمە خزمەتی فەرمووی: باش کیسە وپەتەکەی بناسە ئەگەر خاوەنی هات بیدەرەوە ئەگینا بۆ خۆت سوودی لێ وەربگرە[1].

وە لە پێغەمبەر ﷺ پرسرا دەربارەی شتی دۆزراوە لە رێگای ئاوەدانیدا فەرمویەتی ﷺ: ساڵێك بانگەوازی بۆ بکە ئەگەر خاوەنی هات بیدەرەوە ئەگینا بۆ خۆت.

ووتیان: ئەی ئەوەی لە وێرانەدا ئەدۆزرێتەوە؟ فەرمووی: لەوەداو لە گەنجا پێنج یەکی لەسەرە (بە زەکات بدرێت)[2].

---

(١) البخاري (٢٤٢٦) والترمذي (١٣٧٤).

(٢) أبوداود (١٧٠٦).

ئیبنوقەییم فەرمویەتی: فەتواداران بەوە دیاری کراوە، وە ئەگەر کەسێك پێچەوانە کاربکات پێچەوانەی ئەو فەتوایەی پێغەمبەرە، ﷺ چونکە شتێکی وا نەهاتووە پێویست بێت واز لەو فەتوایە بهێنرێت.

**جیاکردنەوەی خواردەمەنی و شتی بێ نرخ:**

ئەوانەی پێشەوە بە گوێرەی ئەو شتانەیە کە خواردەمەنی نی یە یا بێ نرخ نین.

چونکە شتی خواردەمەنی پێویست نی یە بانگەوازی بۆ بکرێت، بەڵکو دروستە بخورێت.

لە ئەنەسەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ بە لای خورمایەکدا تێ پەڕی لە ڕێگادا: فەرمووی: (لولا أني أخاف أن تكون من الصدقة لأ كلتها) رواه البخاري ومسلم[1].

واتە: ئەگەر ترسی ئەوەم نەبوایە کە لە صەدەقە بێت هەڵم ئەگرتەوە و ئەم خوارد.

وە هەروەها شتی کەم نرخ ماوەی ساڵێك بانگەوازی بۆ ناکرێت، بەڵکو ماوەیەك بانگەوازی بۆ ئەکات هەتا گومانی ئەوە ئەبرێت کە تیتر خاوەنی هەوڵی بۆ نادات.

وە بۆ دۆزەرەوەکەی هەیە سوودی لێ وەربگرێت ئەگەر خاوەنی نەبوو.

لە جابیرەوە ﷺ هاتووە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ ڕێی پێ دابوین داردەست وقامچی وگوریس وئەو شتانە پیاو هەڵی بگرێتەوە و سوودی لێ وەربگرێت. ئەحمەد وئەبوداود تەخریجیان کردووە[2].

وە لە عەلی یەوە ﷺ کە دینارێك لە بازار ئەدۆزێتەوە ئەی هێنێ بۆلای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ پێی ئەفەرموێت: سێ ڕۆژ بانگەوازی بۆ بکە، ئەویش بۆی ئەکات لە پاشاندا پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: خۆت بیخۆ. عبدالرزاق لە ئەبوسەعیدەوە تەخریجی کردووە[3].

**بزن و مەڕی سەر لێ تێك چوو:**

مەڕ و بزنی سەر لێ تێك چوو دروستە هەڵبگیرێتەوە، چونکە لاوازن ودڕندەی کێوی لەناویان ئەبەن، جا ئەگەر خاوەنی بە دوایدا نەگەڕا پێویستە بناسێنرێ و گەڕان بە شوێن خاوەنیدا بکرێت.

پاشان بۆ دۆزەرەوەی هەیە هەڵی بگرێت بۆ خۆی، وئەگەر خاوەنی هات نرخەکەی بداتێ.

---

(١) البخاري (٢٤٣١) ومسلم (١٠٧١/١٦٥).

(٢) أبوداود (١٧١٧).

(٣) عبدالرزاق في المصنف (١٨٦٣٧)، (١/١٤٢).

وە مالیکی‌یەکان وتویانە: هەر بە دۆزینەوەی ئەبێتە خاوەنی و پێی نابژێررێت ئەگەر خاوەنیشی هات.

چونکە فەرموودەکە گورگ ودۆزەرەوەکەی‌یەکسان کردووە، وە گورگ غەرامەی لەسەر نی‌یە هەروەها دۆزەرەوەی.

وە ئەو جیاوازی‌یەی نێوان زانایان لە شێوەیەکدایە کە ئەگەر دوای ئەوەی خورا خاوەنی پەیدا بوو.

بەڵام ئەگەر پێش خواردنی لەلایەن دۆزەرەوەی، خاوەنی پەیدا بوو بە رای هەموو زانایان ئەبێ شتەکەی بدرێتەوە.

**ووشتر و مانگا و ئەسپ و هێستر و گوێدرێژی سەر لێ تێك چوو (وون بوو):**

زانایان هەموو لەسەر ئەوە رێکن کە ووشتری وون بوو هەڵناگیرێتەوە.

لە بوخاری وموسلیمدا هاتووە: لە زەیدی کوڕی خالیدەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ پرسیاریان لێ کرد دەربارەی ووشتری سەر لێ تێك چوو فەرموویەتی: (مالك ولها، دعها فإن معها حذاءها وسقاءها ترد الماء وتأكل الشجر حتى يجدها ربها)[1].

واتە: تۆ چیت لێ داوە وازی لێ بهێنە سمی خۆی هەیە وجەوەندەی خۆی هەیە وئاوی خۆی ئەخواتەوە وگەڵای درەخت ئەخوات هەتا خاوەنی پەیدا ئەبێت.

واتە: ووشتری سەر لێ تێك چوو دروست نی‌یە بردنەوە و پاراستنی، چونکە سروشتی بە شێوەیەکە خۆراگرە لەسەر تینوێتی وتوانای خواردنی گەڵای داری هەیە بە ئاسانی لەبەر درێژی ملی، ئیتر پێویستی بە بردنەوە نی‌یە لەلایەن دۆزەرەوەی. وە هەروەها مانەوەی لەو شوێنەدا کە وون بووە دۆزینەوەی بۆ خاوەنی ئاسان ئەکات لە جیاتی ئەوەی بە ناو ووشتری خەڵکدا بگەڕێت.

وە کار بەو شێوەیە رۆیشتووە هەتا سەردەمی عوسمان ﷺ بەڵام کاتێ عوسمان ﷺ هات رای وابوو کە هەڵگیرێتەوە و بفرۆشرێت، ئەگەر خاوەنی هاتەوە نرخەکەی ئەباتەوە.

ئیبنوشیهابی زوهری فەرمویەتی: ووشتری سەر لێ تێك چوو لەسەردەمی عومەری کوڕی (خطاب)دا ﷺ بەو شێوەیە بوو هەتا سەردەمی عوسمان هات فەرمانی دا بە هەڵگرتنەوە و

---

(١) البخاري (٢٤٢٩) ومسلم (١٧٢٢/٥و٦).

بانگەواز بۆ کردنی، لە پاشاندا فرۆشتنی، جا کاتێ خاوەنی پەیدا بوو نرخەکەیان ئەدایەوە. مالیك لە (الموطاء)دا گێڕاویەتی‌یەوە[1].

بەڵام عەلی دوای عوثمان کاتێ هات فەرمانی دا کە دۆزەرەوەی شوێنێکی بۆ دروست بکات و تێیدا بیپارێزێت، وە ئالفی بداتێ ئەوەندە کە نە قەڵەو بێت نە لاواز. لە پاشاندا هەرکەس هات و بەڵگەی هێنا کە خاوەنێتی بیدرێتەوە، ئەگینا ئەبێت بەو شێوەیە بمێنێتەوە. وە ئیبنوموسەییب ئەوەی بە باش داناوە (الإستحسان).

ئەمما مانگاو ئەسپ و ئێستر و کەر، ئەوە وەك وشترن لای شافیعی وئەحمەد (وە شافیعی بەچکەی ئەمانە جیا ئەکاتەوە و ئەڵێت: دروستە بردنەوەیان). وە بەیهەقی ئەگێڕێتەوە کە مونژیری کوڕی جەریر فەرمویەتی: لەگەڵ باوکمدا بووم لە بەوازیج (شارێکی کۆنە لەسەر دیجلە لەسەرو بەغداوە) کاتێ گاگەلەکە لای دا بۆ حەوانەوە مانگایەکی بینی لای غەریب بوو فەرمووی: ئەم مانگایە چی‌یە؟ وتیان: مانگایەکە هاتۆتە ناو گاگەلەکەوە ئەویش فەرمانی دا دەریان کرد ودوریان خستەوە هەتا لە چاو وون بوو، لەپاشاندا فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو ئەیفەرموو: (لا يأوي الضالة إلا ضال)[2].

واتە: ئاژەڵی سەر لێ تێك چوو گل ناداتەوە گومڕا نەبێت.

وە ئەبوحەنیفە فەرمویەتی: دروستە بردنەوەی.

وە مالیك فەرمویەتی: ئەبێ گلی بداتەوە کاتێ ترسی لەناو چوونی هەبوو بە دەستی دڕندەی کێوی‌یەوە ئەگینا نابێت بیباتەوە.

نەفەقە کێشانی دۆزراوە:

وە ئەوەی دۆزەرەوەی شتەکە سەرفی بکات لەسەر دۆزراوەکە ئەبێ لە خاوەنی وەریگرێتەوە، مەگەر نەفەقە لەجیاتی سواربوون و بار لێنان و شتی تر دابنرێت.

---

(١) مالك في الموطأ (٢/٧٥٩).

(٢) أحمد (٤/٣٦٠) .أبوداود (١٧٢٠) والنسائي في الكبرى٥٨٠١) وابن ماجه (٢٥٠٣)، ومالك في الموطأ (٢/٧٥٩) والبيهقي (٦/١٩٠).

**خواردەمەنی (الأطعمة)**

**پێناسەکەی:**

(أطعمة) ئەو شتانەیە کە ئادەمیزاد ئەیان خوات و لەسەریان ئەژی.

وە لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿قُلْ لاَ أَجِدُ فِي مَا أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَى طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ﴾ (الأنعام:١٤٥).

واتە: بڵێ: لەوەی کە بۆ من هاتووە بە وەحی هیچ حەرامێك بۆ کەسێك کە خۆراك دەخوا شك نابەم.

وە ئەو خواردەمەنیانە هەرچی خاوێن نەبێت و نەفس نەچێتە سەری حەڵاڵ نییە، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَسْأَلُونَكَ مَاذَا أُحِلَّ لَهُمْ قُلْ أُحِلَّ لَكُمْ الطَّيِّبَاتُ﴾ (المائدة:٤).

واتە: پرسیارت لێ ئەکەن چی حەڵاڵە بۆیان، بڵێ: هەرچی شتی خاوێنە حەڵاڵ کراوە بۆتان.

مەبەست لەخاوێن لێرەدا ئەوەیە کە نەفس بچێتە سەری و بە پاکی بزانێت.

وەك فەرمودەی خوای گەورە: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمْ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ﴾ (الأعراف: ١٥٧).

واتە: خاوێنەکانیان بۆ حەڵاڵ ئەکات و پیسەکانیان لەسەر حەرام ئەکات.

وە خواردەمەنی، یا شتی بێ‌گیانە، یا گیاندارە.

وە بێ گیانەکان هەموویان حەڵاڵن جگە لە پیسەکانیان و پیس کراوەکانیان وزیان بەخش و سەرخۆش کەرەکانیان، وە ئەو شتانەی مافی خەڵکی‌یان بەسەرەوەیە.

جا پیسەکانیان وەك خوێن، وە پیس کراوەکان ئەوانەن شتی پیسیان تێکەڵ بووە وەك ڕۆن کە مشکی تێدا بتۆپێت، بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە بوخاری لە مەیمونەوە ئەگێڕێتەوە کاتێ پرسیاری لێ کرادەربارەی ڕۆن مشکی تێ بکەوێت فەرموی: (ألقوها، وما حولها فاطرحوه، وكلوا سمنكم)[1].

واتە: مشکەکە فڕێ بدەن و ئەو ڕۆنەی بە چواردەوری مشکەکەوەیە فڕێی بدەن، و ڕۆنی خۆتان بخۆن.

لەم فەرمودەیەدا ئەوە وەرئەگیرێت شتی بەستو وە مەییو ئەگەر شتی تۆپیوی تێ کەوت شتەکە و چواردەورەکەی فڕێ ئەدرێت بەمەرجێك دەرکەوێت لەوەزیاتری تێوەی نەچووە.

(١) البخاري (٢٣٥) وأحمد (٦/٢٣٠) والنسائي (٧/١٧٨).

بەڵام شلەمەنی وشتی ئاوەکی بە بەرکەوتنی پیسی پیس ئەبێت. زوهری وئەوزاعی وئیبنوعەبباس وئیبنومەسعود و بوخاری ئەگێڕنەوە کە شلەمەنی ئەگەرپیسی تێ کەوت پیس نابێت هەتانەگۆڕێت، ئەگەر نەگۆڕا پاکە.

وە زیان بەخشەکان وەك زەهر و شتی تر.

زەهریش وەك زەهری دەرهاتو لە دوپشك و زەرگەتە و مارە ژەهراوییەکان و ئەوژارانەی لە گیای ژاراوی ومەعدەنەکان دەردێت وەك زەرنیخ، بەپێی فەرمودەی خوای گەورە: ﴿وَلاَ تَقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾ (النساء: ٢٩).

واتە: وە خۆتان مەکوژن بەڕاستی خوا پێتان میهرەبانە.

وە هەروەها ئەفەرموێت: ﴿وَلاَ تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾ (البقرة:١٩٥).

واتە: بەدەستی خۆتان، خۆتان مەخەنە ناو تالوکە و لەناوچوونەوە.

وە فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە ئەبوهورەیرە گێڕاویەتیەوە فەرمویەتی: (من تردى من جبل فقتل نفسه فهو في نار جهنم يتردى فيها خالداً مخلداً أبداً).

واتە: هەرکەس لەشاخێکەوە خۆی بەربداتەوە و خۆی بکوژێت ئەچێتە ئاگری دۆزەخەوە هەتا هەتایە هەر بەر ئەبێتەوە.

وە هەروەها فەرمویەتی: (ومن تحسى سماً فقتل نفسه فسمه في يده يتحساه في نار جهنم خالداً مخلداً فيها أبداً، ومن قتل نفسه بحديدة فحديدته في يده يتوجأُ بها في نار جهنم خالداً مخلداً فيها أبداً) رواه البخاري[1].

واتە: هەرکەس زەهری خواردەوەو خۆی کوشت زەهرەکە بەدەستیەوە ئەبێت لەناو دۆزەخدا بۆ هەتا هەتایە هەرئەی خواتەوە، وە هەرکەس خۆی بە تیغێك بکوژێت ئەو تیغە بە دەستەوە ئەگرێت لەناو ئاگری دۆزەخدا بۆ هەتا هەتایە ئەیکات بە خۆیدا.

وە زەهریش ئەوەندە حەرامە کە زیان بگەیەنێت.

وە ئەوانەی لەبەر زیان بەخشین حەرام کراون جگە لە ژەهرەکان، وەك خۆڵ و قوڕ و بەرد و خەڵوز نیسبەت ئەو کەسانەی بە خواردنیان زیانیان پێ بگات حەرامن، بەپێی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی: (لاضرر ولا ضرار) رواه أحمد وابن ماجه[1].

---

(١) البخاري (٥٧٧٨) ومسلم (١٠٩).

واتە: زیان و زیان گەیاندن نی‌یە.

وە جگەرەش ئەچێتە ناو ئەم بەشەوە، چونکە زیان گەیەنەرە بە تەندروستی و ماڵ لەدەست دانە.

وە سەرخۆش کەریش وەك: ئارەق و جۆرەکانی تر لە سرکەرەکان.

وە ئەو شتانەی مافی خەڵکیان بەسەرەوەیە وەك دزراوو داگیرکراو ئەمانە هیچیان حەڵاڵ نین.

وە ئاژەڵیش دوو جۆرن: ئاویو ووشکانی. ئاوی‌یەکان هەموویان حەڵاڵن، بەڵام ووشکانی‌یەکان هەیانە حەڵاڵە خواردنی و هەیانە حەرامە. وە ئیسلام ئەمانەی هەموو بە تەواوی ڕوون کردونەوە، بەڵگەش فەرمودەی خوای گەورەیە کە ئەفەرموێت: ﴿وقَدْ فَصَّلَ لَكُمْ مَا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إلاَّ مَا اضْطُرِرْتُمْ إلَيْهِ﴾ (الأنعام/١١٩).

واتە: ئەوانەی خواردنیان لەسەر ئێوەحەرام کراوە بۆتان جیا کراوەتەوە مەگەر ئەوەی کە ناچار بن بیان خۆن.

وە ئەو جیاکردنەوەش ئەم سێ شتانەی خوارەوە ئەگرێتەوە:

یەکەم: دەق دەربارەی ئەوشتانەی ڕەوان و حەڵاڵن.

دووەم: دەق دەربارەی ئەوشتانەی حەرامن.

سێیەم: دەق دەربارەی ئەوشتانەی یاسادانەری ئیسلام بێ‌دەنگە لێیان.

**ئەو شتانەی یاسادانەری ئیسلام بە دەق ڕەوای کردوون:**

**ئەو شتانەی یاسادانەری ئیسلام بە دەق ڕەوای کردوون بەم شێوەیەی خوارەوە ڕوونی ئەکەینەوە:**

١- گیانداری ئاوی: گیاندارە ئاوی‌یەکان (دەریایی‌یەکان) هەموویان حەڵاڵن جگە لەوانەی ژاراوین و زیانیان هەیە بۆ ئادەمیزاد، ئیتر ماسی بێت یاشتی تر، ڕاوکرابن یا بە مردویی بدۆزرێنەوە، موسڵمان ڕاوی کردبێت یا ئەهلی کیتاب یا بت پەرست وەك یەکن، وە هەروەها ئەگەر شێوەیان هەبێت لە ووشکانیدا یان شێوەیان نەبێت. وە گیان لەبەرە ئاوی‌یەکان پێویست بە سەربڕین ناکەن، بنەما لەمانەشدا فەرمودەی خوای گەورەیە کە فەرمویەتی: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ وطَعَامُهُ مَتَاعًا لَكُمْ ولِلسَّيَّارَةِ﴾ (المائدة/٩٦).

واتە: بۆتان حەڵاڵ کراوە نەچیری دەریا و ئەو شتانەی دەریا فڕێی ئەدەنە دەرەوە بۆ نیشتەجێ و ڕێبوارتان و لە ئیحرامدا بن یان لەئیحرامدا نەبن.

---

(١) أحمد (٥/٣٢٧) وابن ماجه (٢٣٤١).

ئیبنوعەبباس فەرمویەتی: ﴿صید البحر وطعامه﴾ ئەو شتانەیە کە دەریا دەریان ئەداتە دەرەوە. (دارقطني) گێڕاویەتی‌یەوە.

وە هەروەها ئەگێڕنەوە لێیەوەکە مانای ﴿طَعَامُهُ﴾ مردارەوە بووەکانی دەریا ئەگرێتەوە بەپێی حەدیسەکەی ئەبوهورەیرە ﷺ کە فەرمویەتی: پیاوێك لە پێغەمبەری ﷺ پرسی ئێمە بەناو دەریادا دەڕۆین ئاوی کەم لەگەڵ خۆماندا هەڵئەگرین ئەگەر دەست نوێژی پێ بگرین تینومان ئەبێت ئایا بە ئاوی دەریاکە دەست نوێژ بگرین؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (هو الطهور مائه والحل میتته)[1].

واتە: دەریا ئاوەکەی پاك کەرەوەیە و مردارەوەبوشی حەڵاڵە.

هەر پێنجەکە گێڕاویانەتەوە، و (ترمذي) فەرمویەتی: ئەمە فەرمودەیەکی حەسەن و صەحیحە. وە پرسیاریشم کردووە لە موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری ووتویەتی: فەرمودەیەکی صەحیحە.

**ماسی خوێ کراو:**

زۆر جار ماسی خوێی زۆری پێوە ئەکرێت بۆئەوەی ماوەیەکی زۆر بمێنێتەوە و خراپ نەبێت بە هەموو جۆرەکانی‌یەوە، وەك ماسی سەردین و فەسیخ ورەنجە و مەلوحە، ئەمانە هەموو خاوێنن وحەڵاڵە خواردنیان بە مەرجێ زیانی تێدا نەبێت، جا ئەگەر زیانی تێدا بێت ئەوە بەهۆی زیانەکەیانەوە حەرام ئەبن، چونکە زیان ئەگەیەنن بە تەندروستی.

دەردیری کە شێخێکە لە شێخەکانی مالیکی ڕەزای خوای لێ بێت وتویەتی: ئەوەی کە باوەڕم پێیەتی و بە دینی ئەزانم ئەوەیە کە ماسی فەسیخ پاکە، چونکە خوێ ناکرێت و پاك ناکرێت دوای مردن نەبێت. وە خوێنی ڕژاو حوکم بە پیسی‌یەتی نادرێت هەتا نەیەتە دەر لە لاشە. وە دوای مردنی ماسی ئەگەر خوێنی تێدا مابێت وەك ئەو خوێنە حیسابی بۆ ئەکرێت کە لە دەمارەکانی گیان لەبەری سەربڕاوا ئەمێنێتەوە کە ئەویش بە پاك دائەنرێت بە بێ‌گومان، کەواتە ئەو تەڕیانەی کە لە دوای مردنەکەی دێتە دەر، گومان لەوەدا نی‌یە کە پاکە.

وە حەنەفی‌یەکان و هەندێ لەزانایانی مالیکی بۆ ئەوە چوون.

---

(١) أبوداود (٨١) والترمذي (٦٩) وابن ماجه (٣٨٦) والنسائي (١/١٧٦) ومالك في الموطأ(١/٢٢) وأحمد (٢/٢٣٧).

**گیان لەبەری تەڕو ووشكی:**

ئیبنوعەرەبی فەرمویەتی: ئەوەی ڕاست بێت ئەوەیە كە ئەو گیانلەبەرانەی لە تەڕی و ووشكیدان ڕێگری بكرێ لە خواردنیان، چونكە بەڵگەكان بەرەنگاری یەكتر دەبنەوە. بەڵگەی حەڵاڵی و بەڵگەی حەرامی، بەڵام ئێمە بەڵگەی حەرامی سەرئەخەین لەبەر ئیحتیات.

بەڵام زانایانی تر ڕایان وایە هەموو ئەوانەی لە دەریادا دەتوانن بژین حەڵاڵە، وە ئەگەر بشتوانێ لە ووشكانیدا بژی هەر حەڵاڵە، جگە لە بۆق لەبەر ئەوەی كوشتنی قەدەغەیە.

لەعبدالرحمن ی كوڕی عوسمانەوە ﷺ فەرمویەتی: پزیشكێك پرسیاری لەپێغەمبەر ﷺ كرد دەربارەی بۆق كە بۆ دەرمان بەكاری دەهێنا ئەویش ﷺ كوشتنی بۆقی لێ قەدەغە كرد.

ئەبوداود و نسائی و ئەحمەد گێڕاویانەتەوە و حاكم بە صەحیحی گێڕاوە[1].

**ئەوگیان لەبەرە ووشكانیانەی كە حەڵاڵن:**

ئەو گیان لەبەرە ووشكانیانەی كە لەسەر حەڵاڵی‌یان دەق هاتووە لە خوارەوە ڕوونی ئەكەینەوە:

ئاژەڵە ماڵی‌یەكان: بەپێی فەرمودەی خوای گەورە حەڵاڵن كە فەرمویەتی: ﴿والأَنْعَامَ خَلَقَهَا لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ ومَنَافِعُ ومِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾ (النحل: ٥).

واتە: وە بزن و مەڕ و گاو ووشتری بۆ ئێوە دروست كردووە، كە لە خوری و توكەكانیاندا پۆشاك و ڕاخەری تێدایە، وە چەندەها سوودی تریش، وە لە گۆشتی ئەوانە دەخۆن.

وە هەروەها ئەفەرموێت: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ أُحِلَّتْ لَكُمْ بَهِيمَةُ الأَنْعَامِ إِلاَّ مَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ﴾ (المائدة: ١).

واتە: ئەی ئەوكەسانەی باوەڕتان هێناوە پەیمانەكانتان بەرنە سەر، ئاژەڵە ماڵی‌یەكانتان بۆ حەڵاڵ كراوە جگە لەوانەی بۆتان ڕوون كراوەتەوە كە حەرامن.

وە ئاژەڵە ماڵی‌یەكان: ووشتر و ڕەشەووڵاغ و گامێشیش ئەگرێتەوە، هەروەها مەڕو بزنیش، وە مانگای كێوی و ئاسكەكێویش ئەخرێنە پاڵ ئەوانە، جا ئەمانە هەموویان حەڵاڵن بە ئیجماعی هەموو زانایان. وە سابتە بەسوننەت و ڕێ دراوە بە خواردنی:

---

(١) أحمد (٣/٤٩٩) وأبوداود (٣٨٧١) والنسائي (٨/٢١٠) والحاكم (٤/٤١١)، وە لە خواردنی بۆقدا قسە كراوە لەم بەشەدا باسی دێت.

مریشك[١] و کەڵەشێر و مراوی و قاز و عەلەشیش و ئەسپ[٢] و کەری کێوی[٣] و سوسمار و کەروێشك[٤] و کەمتیار[٥] و کوللە[٦] و چۆلەکە.

لە عومەری کوڕی خەططابەوە ﷺ لەوەی کە موسلیم لەصەحیحەکەیدا گێڕاویەتی‌یەوە لە ئەبی زوبەیرەوە کە فەرمویەتی: پرسیارم کرد لە جابیر دەربارەی سوسمار فەرموی: مەیخۆن، وە بە پیسی دانا و فەرموی: عومەری کوڕی خەططاب فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ حەرامی نەکردووە، وە خوا دایناوە سوود بە زۆرکەس ئەگەیەنێت، چونکە خواردەمەنی بەشی زۆری شوانەکانە، ئەگەر دەستم بکەوتایە لێم ئەخوارد[٧].

وە ئیبنوعەبباس لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە ئەگێڕێتەوە خوا لێیان ڕازی بێت، کە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ چوونە ماڵی پوری (مەیمونەی کچی حاریث)، گۆشتی سوسماری هێنایە بەردەم پێغەمبەر ﷺ کە خزمێکی لە نەجدەوە بۆی هێنا بوو -وە پێغەمبەر ﷺ هیچی نەئەخوارد هەتا نەیزانیایە ئەو شتە چی‌یە- ژنەکانیش ڕێك کەوتبون کە پێی نەڵێن بۆ ئەوەی بزانن چۆن لێی ئەچەژێ وە کاتێ لێی چەشت چۆن ئەیناسێ، کاتێ پرسیاری کرد و زانی چی‌یە وازی لەخواردنی هێنا، خالید پرسیاری لێ کرد ئایا حەرامە؟

فەرمووی: نەو، بەڵام خواردەمەنی‌یەکە کە لای ئێمە نی‌یە بۆیە نایخۆم، خالید ئەڵێت: ڕام کێشا بۆلای خۆمەوە و خواردم وە پێغەمبەریش ﷺ سەیری ئەکردم[٨].

وە لە عبدالرحمن ی کوڕی ئەبی عەممارەوە گێڕراوەتەوە فەرمویەتی: پرسیارم لە جابیر کرد دەربارەی کەمتیار (ضبع) گۆشتی بخۆم؟ فەرموی: بەڵێ، ووتم: ڕاوی بکەم؟ فەرموی: بەڵێ. وتم: ئایا ئەوەت لە نێرراوی خواوە بیستووە (صلی الله علیه وسلم) فەرموی: بەڵێ

---

(١) بوخاري و موسلیم و (ترمذي) و نەسائی گێڕاویانەتەوە.

(٢) بوخاري ڕیوایەتی کردووە، وە مالیك و ئەبو حەنیفە لایان وایە کە خواردنەکەی مەکروهە، چونکە خوای گەورە لە ئایەتەکەدا لە ڕیزی ئەو ئاژەڵانەدا باسی کردووە کە بۆ جوانی و بۆ سواربوونن و باسی خواردنی نەکردووە.

(٣) بوخاري و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە.

(٤) بوخاري و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە.

(٥) (ترمذي) ڕیوایەتی کردووە.

(٦) بوخاري و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە.

(٧) مسلم (١٩٥٠).

(٨) البخاري (٥٥٣٧) ومسلم (١٩٤٥و١٩٤٦/٤٤).

ترمزی گێڕاویەتیەوە بە سەنەدێکی صەحیح"[1].

وە ئەوانەی بۆ دروستی خواردنی گۆشتی کەمتیار چوون: شافیعی و ئەبویوسف و موحەممەد و ئیبنوحەزمە.

وە شافیعی دەربارەی فەرمویەتی:عەرەب بەپاکی زانیوە، وە بە چاکی باسیان کردوە، وە هەتا ئێستاش ئەفرۆشرێ و ئەکڕیێ لە نێوان صەفا و مەروەدا بێ ئەوەی کەس ڕێی لێ بگرێت.

وە هەندێ لەزانایان ڕایان وایە کە حەرامە خواردنی، چونکە دڕندەیە، بەڵام فەرموودەکە بەڵگەیە بەسەریانەوە.

وە ئەبوداود و ئەحمەد باسی ئەوەیان کردووە کە پرسیار کرا لە ئیبنوعومەر دەربارەی خواردنی گۆشتی ژیشك (قنفذ) ئەویش ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿قلْ لا أجِدُ فيما أوحِيَ إليَّ مُحَرَّماً على طاعِمٍ يَطْعَمُهُ﴾.

واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بڵێ لەوەی کەوا بۆ من بە وەحی هاتووە هیچ حەرامێك بۆ کەسێك کە خۆراك دەخوا شك نابەم.

پیاوێك لای بو ووتی: گوێم لەئەبی هورەیرە بووە ئەیفەرموو: باسی ئەوەیان کرد لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرموی: (خبيثة من الخبائث). واتە: گۆشتی ژیشك لە گۆشتە پیسەکانە.

ئیبنوعومەر فەرموی: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ ئەوەی فەرمووبێت هەروایە"[2]، وە ئەم فەرمودەیە لە ڕیوایەتی عیسای کوڕی نەمیلەیە، ئەویش لاوازە، شەوکانی فەرمویەتی: فەرمودەکە بۆ تایبەت کردنی ژیشك ناشێت لەبەر بەڵگە حەڵاڵە گشتیەکان، وە بەپێی ئەوەی شەوکانی ئەڵێت: گۆشتەکەی حەڵاڵە.

وە مالیك و ئەبوثەور، و هەروەها لە شافیعی و لەیسیشەوە ڕیوایەت کراوە کە فەرمویانە، لە خواردنەکەیدا هیچ خراپەیەکی تێدا نی‌یە، چونکە عەرەب بە پاکی دائەنێن وە لەبەر ئەوەی ئەو حەدیسەی کە لەوبارەوە هاتووە زەعیفە، بەڵام حەنەفیەکان بە مەکروهیان داناوە.

وە عائیشە دەربارەی ژیشك فەرمویەتی: گۆشتەکەی حەرام نی‌یە وەئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿قلْ لا أجِدُ فيما أوحِيَ إليَّ مُحَرَّماً على طاعِمٍ يَطْعَمُهُ﴾ .

---

(١) الترمذي (٨٥١).

(٢) أحمد (٢/٣٨١) وأبوداود (٣٧٩٩).

وە لای مالیك خراپ نی‌یە خواردنی شتی ناو زەوی بە دووپشك وکرمەکانی‌یەوە، وە خراپ نی‌یە خواردنی بێچوەهەنگ وکرمی پەنیر و خورما و ئەوجۆرە شتانە، قرطبـي فەرمـویەتی: بەلگەی مـالیك قسـەی ئیبنـوعەبباس وئەبی دەرداية كە فەرمویانە: هەرچی خوا حەلالی کردووە حەلالە، وە هەرچی خوا حەرامی کردووە حەرامە، وە هەرچی لی‌ی بیٚ دەنگ بووە لی‌بوراوە.

ئەحمەد دەربارەی باقلەی کرماوی فەرمویەتی: پێم خۆشە نەخورێت هەرچەندە بە پیسیش نەزانراوە، وە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕراوەتەوە کە خورمای کۆنیان بۆ هێناوە، سەیری کردووە و پاکی کردۆتەوە و کرمەکەی دەرهێناوەو خواردویەتی، ئیبنوقودامە فەرمویەتی: ئەوە چاکترە[1].

وە ئیبنوشەهاب و عورۆە و شافیعی و حەنەفی‌یەکان وهەندێ زانایانی مەدینە رایان وایە کە دروست نی‌یە خواردنی شتی ناو زەوی وەك مار و مشك و ئەوجۆرە شتانە، وە هەموو ئەوانەی دروستە کوشتنیان دروست نی‌یە خواردنیان، وە لای ئەمانە نابێت سەربېڕرێن.

وە شافیعی فەرمویەتی: یەربوع[2] و وەبەر[3] خواردنیان خراپ نی‌یە.

وە دەربارەی خواردنی گۆشتی چۆلەکە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: (ما من إنسان قتل عصفوراً فما فوقها بغير حقها إلا سأل الله تعالي عنها، قيل: يا رسول الله وما حقها؟ قال: يذبحها فيأكلها، ولا يقطع رأسها يرمي بها) رواه النسائي[4].

واتە: هیچ ئادەمیزادێك نی‌یە چۆلەکەیەك و زیاتر لە چۆلەکەیەك بکوژێت بەبیٚ مافی خۆی ئیللا خوا لی‌ی ئەپرسێتەوە لەسەری. ووتیان: ئەی نێرراوی خوا، مافی خۆی چی‌یە؟ فەرموی: سەری ببڕێت و گۆشتەکەی بخوات نەك ملی هەلکەنیٚ و فڕی‌ی بدات.

وە هەندێ لە یارەکانی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خۆیدا گۆشتی ئەو بالندەیان خواردوە کە ناوی حوبارایە. ئەبوداود و ترمذي گێڕاویانەتەوە[5].

---

(١) أبوداود (٣٨٣٨).

(٢) جۆرێك جانەوەرە لە جرج ئەچێت کە لە کوردیدا پی‌ی دەوترێ ڕسق.

(٣) گیاندارێکە لە سمۆرە ئەچێت و گوپ خڕە، لەژێر زەویدا دەژی ڕەنگەکەی مەیلەو خۆلەمێشی‌یە پێستەکەی بەنرخە و پی‌ی دەلێن کولکن.

(٤) النسائي (٧/٢٣٩) والحاكم (٤/٢٣٣).

(٥) أبوداود (٣٧٩٧) والترمذي (١٨٢٨).

**ئەوانەی یاسادانەری ئیسلام بەدەق حەرامی کردوون:**

وە خواردنە حەرام کراوەکان لە کتێبەکەی خوای گەورەدا کۆکراونەوە لە دە شتدا بە دەقی فەرموودەی خوای گەورە کە ئەفەرمووێت: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ والدَّمُ و لَحْمُ الْخِنزِيرِ و مَا أُهِلَّ لغَيْرِ اللَّهِ بِهِ والْمُنْخَنِقَةُ والْمَوْقُوذَةُ والْمُتَرَدِّيَةُ والنَّطِيحَةُ ومَا أَكَلَ السَّبُعُ إلاَّ مَا ذَكَّيْتُمْ ومَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وأَنْ تَسْتَقْسِمُوا بِالأَزْلاَمِ ذَلكُمْ فِسْقٌ﴾ (المائدة:٣).

واتە: حەرام کراوەلەسەرتان: ١- گۆشتی مردارەوەبوو. ٢- خوێنی ڕژاو. ٣- گۆشتی بەراز. ٤- ئەوەی لە کاتی سەربڕین دا ناوی جگە لە خوای لەسەر هێنراوە. ٥- مردارەوەبوو بە خنکان. ٦- ئەو ئاژەڵەی بەدار لیّ درابێت و مرداربوبێتەوە. ٧- ئەو ئاژەڵەی لە شوێنی بەرزەوە بەربوبێتەوە و مردبێت. ٨- ئەوئاژەڵەی ئاژەڵێکی تر قۆچی لیّ دابێت و کوشتبێتی.٩- وە ئەو ئاژەڵەی دڕندە برینداری کردبێت و مردبێت، جگە لەو ئاژەڵانەی فریای سەربڕینیان ئەکەون کە گیانیان تێدا مابێت. ١٠- ئەو ئاژەڵانەی لەسەر بت سەربڕابن.

هەروەها حەرام کراوە لەسەرتان هەوڵ دان بۆزانینی ئەوەی خوابەشتان ئەدات بەهۆی پشك خستنەوە، ئەمانە هەموویان حەرامن و کردنیان دەرچوونە لە فەرمانی خوا.

وە ئەمە شیکردنەوە و لێکدانەوەی ئەو کورتە باسەیە کە خوای گەورە باسی کردووە لەو فەرموودەیەیدا: ﴿قُلْ لاَ أَجِدُ فِي مَا أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَى طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ﴾ (الأنعام: ١٤٥).

واتە: بڵێ -ئەی محمد- من نابینم لەوەدا کە خوا بۆی ناردومە خوارەوە شتێکی حەرام کراو لەسەر بخۆری، جگە لە گۆشتی مردارەوەبوو، یا خوێنی ڕژاو، یا گۆشتی بەراز، چونکە ئەوە پیسە، یا ئەو ئاژەڵانەی لەکاتی سەربڕیندا نافەرمانی خوا کراوە و ناوی جگە لە خوایان لەسەر هێنراوە.

لەم ئایەتەدا ناوی چواریان هاتووە بە کورتی، وە لە ئایەتەکەی پێشودا بە درێژی باسی کردوون، کەواتە لەنێوان ئەم دوو ئایەتە پێچەوانەیی‌یەك نی‌یە.

**ئەو بەشەی لە ئاژەڵی زیندو ئەبڕرێتەوە :**

وە ئەو بەشەی کە لە ئاژەڵی زیندو ئەبڕێ پاڵ ئەو شتە حەرام کراوانە ئەخرێ کە باس کران. بەپێی فەرموودەکەی ئەبو واقیدی لەیسی کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ما قطع من البهيمة وهي حية فهو ميتة). رواه أبوداود والترمذي وحسنه[1].

(١) أبوداود (٢٨٥٨) والترمذي (١٤٨٠).

واتە: ئەوەی لەئاژەڵ ئەبڕێت بە زیندوویی بە مردارەوەبوو ئەژمێررێت.

ترمذي فەرمویەتی: زانایان لەسەر ئەوە کاریان کردووە.

وە ئەمانەی خوارەوە لەمانە جیا ئەکرێتەوە:

أ- مردارەوەبووی ماسی و کوللە کە ئەمانە خارێنن بەپێی حەدیسی ئیبنوعومەر ﷺ کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أحل لنا ميتتان ودمان. أما الميتتان فالحوت والجراد، وأما الدمان فالكبد والطحال).

واتە: دومردارەوەبو وە دوو خوێنمان بۆحەڵاڵ کراوە. دوو مردارەبووەکە ماسی وکوللەن، وە دوو خوێنەکەش جگەر و سپڵە. ئەحمەد و شافیعی و ئیبنوماجە و بەیهەقی و دارقطني گێراویانەتەوە[1]، وە فەرمودەکە زەعیفە، بەڵام ئیمام ئەحمەد (موقوف)ی فەرمودەکەی بەصەحیح داناوە، وەك ئەبو زەرعە و ئەبو حاتیمیش فەرمویانە: وە فەرمودەی لەم شێوانە حوکمی مەرفوعی هەیە، چونکە قسەی صەحابی کە بڵێت: بۆمان حەڵاڵ کراوە یا لێمان حەرام کراوە. وەك ئەوە وایە بڵێن: فەرمانمان پێکراوە یا لێمان قەدەغە کراوە، وە لە پێشەوە ئەوەمان باس کردووە کە پشتگیری ئەم فەرمودەیە ئەکات.

وە ئەگەر مردارەوەبوو حەرام کرابێت مەبەست لە حەرام کردنەکە خواردنی گۆشتەکەیەتی، بەڵام جگە لە گۆشتەکەی خارێنە و دروستە سوودیان لێ وەربگیرێت.

ب- ئێسك و شاخ و سم و موو توك و پەڕ و پێستی مردارەوەبوو پاکن، وهەرچی لە جنسی ئەمانە بێت پاکە چونکە ئەسڵ لە ئەمانەدا هەموو هەر پاکی‌یە، وە بەڵگە نی‌یە لەسەر پیسی‌یەتی.

زوهری دەربارەی ئێسکی مردارەوەبوو وەك دانی فیل و شتی تر فەرمویەتی: گەیشتوم بەکۆمەڵێك خەڵك لە زانایانی (سلف) پێشین کە سەریان پێ دائەهێناو چەوریان تێ ئەکرد و بە خراپیان نەئەزانی. بوخاری ڕیوایەتی کردووە[2].

وە لە ئیبنوعەبباسەوە ﷺ کە فەرمویەتی: مەڕێکیان دا بە جاری‌یەکەی مەیمونە بە صەدەقە مردار بووەوە پێغەمبەر ﷺ بەلای کەلاکەکەیدا تێ پەڕی فەرمووی: (هلا أخذتم إهابها فدبغتموه

---

(١) أحمد (٢/٩٧) وابن ماجه (٣٣١٤) والدارقطني (٤/٢٧١و٢٧٢) والشافعي (٢/١٧٣) والبيهقي (١/٢٥٤).

(٢) البخاري (١/٣٤٢) تعليقاً.

فانتفعتم به؟ فقالوا: إنها میتة، فقال: إنما حرم أكلها). رواه الجماعة إلا ابن ماجه، قال فیه عن میمونة. ولیس في البخاري ولا النسائي ذكر الدباغ[1].

واتە: ئەی نەئەبو پێستەکەی لێ بکەنەوەو دەباغی بکەن و سودی لێ وەرگرن؟ ووتیان: ئەی نێرراوی خوا، مرداربۆتەوە. فەرمووی: تەنها خواردنی حەرامە.

لە بوخاری و نەسائی دا باسی دەباغ کردن نەهاتووە.

وە لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ کەئەم ئایەتەی خوێندۆتەوە: ﴿قل لا أجد فیما أوحي إلي محرماً﴾. فەرمویەتی: تەنها ئەوە حەرام کراوە کە ئەخورێت ئەویش گۆشتە، بەڵام پێستە و ددان و ئێسك و موو خوری‌یەکەی حەڵاڵە. ئیبنومونزیر و ئیبنوئەبی حاتەم گێراویانەتەوە.

وە هەروەها ژیلاوکی مردارەوەبوو (الأنفحة) و دووگەکەی پاکە، چونکە صەحابەکان کاتێ وڵاتی عێراقیان کردەوە لە پەنیری مەجوسەکانیان ئەخوارد کە بەوانە دروست ئەکرا، هەرچەندە سەربڕاوی مەجوسی بە مردارەوەبوو دائەنرێت.

وە سابتە لە سەلمانی فارسی‌یەوە ﷺ کە پرسیاری لێ کراوە دەربارەی پەنیر و رۆن و پێستەی مردارەوەبوو، ئەویش فەرمویەتی: حەڵاڵ ئەوانەن کە خواحەڵاڵی کردوون، وە حەرام ئەوانەن کە خواحەرامی کردوون، وەئەوەی لێی بێ دەنگ بووە لێ بورراون. وەئەوەش ئاشکرایە ئەم پرسیارەی کاتێك لێ کراوە کە جێگری عومەری کوڕی خەططاب بووە لەسەر مەدائین.

جـ﴾ خوێن: وە خوێنی کەم عەفوی لێ کراوە. لە ئیبنوجوڕەیجەوە دەربارەی فەرمودەی خوای گەورە کە فەرمویەتی: ﴿أو دماً مسفوحاً﴾ فەرمویەتی: (المسفوح) خوێنی ڕژاوە، و ئەوەی لەناو دەمارەکاندایە قەیناکە. ئیبنومونزیر تەخریجی کردووە.

وە لە ئەبو میجلەزەوە ڕیوایەت کراوە ئەو خوێنەی لەشوێنی سەربڕینی ئاژەڵ، یا ئەو خوێنەی بەسەر مەنجەڵەوەیە قەیناکە، چونکە تەنها خوێنی ڕژاو قەدەغە کراوە. ئیبنوحومەید و ئەبوشەیخ تەخریجیان کردووە.

وە لە عائیشەوە خوای لێ ڕازی بێت کە فەرمویەتی: ئێمە کە گۆشتمان ئەخوارد دەزولە خوێن بەسەر مەنجەڵەکەوە ئەبوو.

---

(١) البخاري (١٤٩٢) ومسلم (٣٦٣) وأحمد (١/٢٢٧) وأبوداود (٢١٢٦) والترمذي (١٧٢٧) والنسائي (١٧١/٧).

**حەرامی گۆشتی گوێ درێژ و هێستر:**

وە ئەوەی کە ئەچێتە بازنەی حەرام بوونەوە: گوێ درێژی ماڵی و هێسترە بە فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێت: ﴿والخيل والبغال والحمير لتركبوها وزينة﴾ (النحل:٨).

واتە: وەئەسپ و هێستر وگوێ درێژ بۆ سواربون و بۆ جوانی.

١- ئەبوداود و (ترمذي) بە سەنەدێکی حەسەن لە میقدادی کوڕی مەعدی کەریبەوە ﷺ ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ألا إني أوتيت الكتاب ومثله معه ألايوشك رجل شبعان على أريكته يقول عليكم بهذا القرآن فما وجدتم فيه من حلال فأحلوه، وما وجدتم فيه من حرام فحرموه، ألا لايحل لكم الحمار الأهلي، ولا يحل كل ذي نابٍ من السبع، ولا لقطة معاهد إلا أن يستغني عنها صاحبها، ومن نزل بقوم فعليهم أن يَقْروه، فإن لم يقروه فله أن يُعَقِّبهم بمثل قراه).

واتە: بزانن من ئەم قورئانە و وێنەی ئەم قورئانەم لەگەڵدا بۆ هاتووە، وە لەوانەیە کاتێك بێت کەسێکی تێروپڕ لەسەر سەرینەکەی پاڵ بداتەوە، و بڵێت لەسەرتانە تەنها شوێن قورئان بکەون هەرچیتان بینی لە قورئاندا حەڵاڵ کرابوئێوەش بە حەڵاڵی بزانن، وە هەرچیتان بینی لە قورئاندا حەرام کرابوو ئێوەش بە حەرامی بزانن. بزانن گۆشتی گوێ درێژی ماڵی و هەموو دڕندەیەکی کەڵبەدار، و هەموو دۆزراوەیەك کە خاوەنەکەی موعاهەد بێت جگە لەوانەی کە خاوەنی وازی لێ هێناون حەرامن، وە هەرکەس لای دا بۆمیوانی کەسانێك لەسەریانە میوانداری بکەن و ڕێزی بگرن، ئەگەر ئەوەیان نەکردبۆی هەیە بە زۆر بەشی خۆی بستێنێت[1].

٢- وە لە ئەنەسەوە ﷺ کە فەرمویەتی:کاتێ پێغەمبەر ﷺ خەیبەری فەتح کرد لەدێکەدا گوێ درێژمان دەست کەوت، ئێمە لێمان سەربڕی و کوڵاندمان پێغەمبەر ﷺ بانگی کردو فەرمووی: بزانن خواو پێغەمبەر ﷺ لێتان قەدەغە ئەکەن کە گۆشتی کەر بخۆن، بزانن گۆشتەکەی پیسەو خواردنی لە کارەکانی شەیتانە، ئەنەس ئەفەرموێ: مەنجەڵەکان قڵپ کرانەوە بە کوڵاوی. هەر پێنجەکە گێڕاویانەتەوە[2].

٣- وە لە جابیرەوە ﷺ کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی خەیبەر گۆشتی کەر و هێستری لێ قەدەغە کردین، بەڵام گۆشتی ئەسپ و ماینی لێ قەدەغە نەکردین.

---

(١) أبوداود (٤٦٠٤) والترمذي (٢٦٦٦) وابن ماجه (١٢).

(٢) البخاري (٥٥٢٨) ومسلم (١٩٤٠/٣٤و٣٥) والنسائي (٧/٢٠٤) وابن ماجه (٣١٩٦).

وە ئەوەی کە لە ئیبنوعەبباسەوە گێڕراوەتەوە کە خواردنی گۆشتی کەری بە ڕەوا داناوە. ئەوەی ڕاست بێت ئەوەیە کە ووتویەتی: نازانم ئایا پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردبێت لەبەر ئەوەی خەڵك بۆ بار بەکاریان ئەهێنا بۆ ئەوەی لەدەستیان نەچێت یا ڕۆژی خەیبەر حەرامی کردبێت. وەك بوخاری گێڕاویەتی‌یەوە.

**حەرام کردنی ئاژەڵ و باڵندەی دڕندە:**

وە لەو جۆرانەی کە ئیسلام حەرامی کردووە گیانەوەرو باڵندەی دڕندەیە.

موسلیم لە ئیبنوعەبباسەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ خواردنی گۆشتی هەموو دڕندەیەکی کەڵبەدار و باڵندەیەکی چنگ داری قەدەغەکردووە[1]. وە مەبەست لە کەڵبەدار ئەوەیە بە کەڵبەکانی پەلامار بداتە خەڵك و سامانیان، وەك گورگ و شێر و سەگ و پڵنگ و فەهد[2] و پشیلە ئەمانە هەموو حەرامن لای جەماوەری زانایان.

وە ئەبوحەنیفە ڕای وایە کە هەرچی گۆشتخۆر بێت بە دڕندە ئەژمێررێت، وەك فیل و کەمتیار و یەربوع –گۆڕ هەڵکەنە- و پشیلە، هەموویان گۆشتیان حەرامە لای ئەو.

وە شافیعی ڕای وایە کە دڕندەی حەرام کراو ئەوانەن کە پەلاماری ئادەمیزاد ئەدەن، وەك شێرو پڵنگ و گورگ.

مالیك لە (الموطأ)دا ئەگێڕێتەوە لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أكل كل ذي نابٍ من السباع حرام)[3]. واتە:خواردنی گۆشتی هەموو کەڵبەدارێك لە دڕەندەکان حەرامە.

مالیك دوای ئەم حەدیسە فەرمویەتی: کاری ئێمە لەسەر ئەوەیە. وە ئیبنوقاسم ئەگێڕێتەوە لێیەوە کە مەکروهە خواردنی، وە هاوەڵەکانی ئەو ڕایەیان وەرگرتووە.

وە شافیعی و هاوەڵەکانی ئەبوحەنیفە ڕێیان داوە بە خواردنی گۆشتی ڕێوی. وە ئیبنوحەزم ڕێی داوە بە خواردنی گۆشتی فیل و سمۆرە، وە گۆشتی مەیمون حەرامە، ئەبوعومەر فەرمویەتی: موسڵمانان هەموو لەسەر ئەوە کۆن کە دروست نی‌یە خواردنی گۆشتی مەیمون لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە.

---

(١) مسلم (١٩٣٤) وأحمد (١/٢٤٤) وأبوداود (٣٨٠٥) والنسائي (٧/٢٠٦) وابن ماجه (٣٢٣٤).

(٢) جۆرێکە لە دڕندە لە نێوان سەگ و پڵنگدایە، قاچ و دەستی درێژترە لە قاچ و دەستی پڵنگ.

(٣) مالك في الموطأ (٩٧٠) ومسلم (١٥) والشافعي في الرسالة، الفقرة (٥٦٢).

ئەما باڵندە چنگ دارەکان مەبەست لەو باڵندانەیە کە بە چنگ پەلامار ئەدەن وەك باز و شاهین و داڵ و سیسارگە کەچەڵەو باشقە و ئەو جۆرانە، ئەمانە هەمووحەرامن لای جەماوەری زانایان. وە مالیك ڕای وایە ئەمانەش خواردنیان ڕەوایە، با پیس خۆریش بن.

**حەرامی خواردنی گۆشتی پیسی خۆر (الجلَّالة) :**

پیسی خۆر (الجلَّالة) ئەوانەن کەپیسایی ئادەمیزاد ئەخۆن لە مانگا و ووشتر و مەڕ و مریشك و قاز و مراوی وشتی تر هەتا ئەوەندە ئەخۆن بۆنیان ئەگۆڕێت. وە قەدەغەیی هاتووە بۆ سوار بوونیان و خورادنی گۆشتیان و خواردنەوەی شیرەکەیان.

١- لەئیبنوعەبباسەوە ﷺ فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ نەهی کردبوو لە خواردنەوەی شیری پیسی خۆر (جلَّالة). هەر پێنجەکان گێڕاویانەتەوە جگە لە ئیبنوماجە، وە ترمذي بە صەحیحی داناوە[1].

وە لە ڕیوایەتێکی تردا: نەهی کردبوو لە سواربوونی (جلَّالة). ئەبوداود گێڕاویەتیەوە[2].

٢- وە لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکیەوە لە باپیرەیەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ نەهی کردبوو لە خواردنی گۆشتی کەر، وە نەهی کردبوو لە سواربوون و خواردنی گۆشتی (جلالة). ئەحمەد و نسائی و ئەبوداود گێڕاویانەتەوە[3].

بەڵام ئەگەر ماوەیەك دوور لە پیسایی بەسترایەوە و ئالفی خاوێنی دەرخوارد درا و گۆشتەکەی خۆش بوۆوە و ناوی جەللالەی لەسەر نەما حەڵاڵ ئەبێت، چونکە هۆی قەدەغە کردنەکە گوڕانەکە بوو، وە لاچووە.

**حەرامێتی شتە پیسەکان :**

لەگەڵ ئەم ڕوون کردنەوەدا قورئانی پیرۆز بنەما و ئەسڵێکی گشتی داناوە بۆ هەموو ئەو شتانەی کە حەرامن. ئەفەرموێت: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ﴾ (الأعراف/١٥٧).

واتە: وەئەو شتانەی کە خاوێنە بۆیان حەڵاڵ ئەکات و ئەو شتانەی کە پیسن لەسەریان حەرام ئەکات.

---

(١) أحمد (١/٢٢٦) وأبوداود (٣٧٨٦) والترمذي (١٨٢٥) والنسائي (٧/٢٤٠).

(٢) أبوداود (٢٥٥٧).

(٣) أحمد (٢/٢١٩) والنسائي (٧/٢٣٩) وأبو داود (٣٨١١).

وە شتە پاکەکان ئەوانەن کەخەڵك بەپاکیان دائەنێن و بەخۆشی ئەزانن بێ ئەوەی دەقێك هاتبێت بۆ حەرام بوونی، جا ئەگەر بە پیسیان دانا ئەوە حەرامە.

وە شافیعی و حەنبەلی‌یەکان ڕایان وایە شتی خاوێن ئەوەیە عەرەب بە خاوێنی ئەزانێ و بە خۆشی داناوە نەك نەتەوەکانی تر، وە مەبەستیش لە عەرەب دانیشتوانی شار و دێهاتەکانە، نەك کۆچەرە دەشتەکی‌یەکان.

وە لە کتێبی (الدراري المضيئة) ئەو قسەیە پارسەنگ ئەداتەوە کە ئەڵێت: هەرچی خەڵك بەپاکی داناوە نەك عەرەب بە تەنها، وە ئەڵێت: هەرچی خەڵك بەپیسی داناوە لە گیان لەبەران، بێ هۆو بێ ڕاهاتن بەڵکو تەنها بە پیسی دائەنێن ئەوە حەرامە، بەڵام ئەگەر هەندێك بە پاکی دابنێن وهەندێکی تر بە پیس بەشە زۆرەکە ئیعتیباری بۆئەکرێت، وەك حەشەراتی زەوی و زۆر لە گیان دارەکان کە خەڵك وازیان لە خواردنی گۆشتەکەی هێناوە، وە بەڵگەی تایبەتیش نی‌یە لەسەر حەرام کردنیان، ئەوە واز لێ هێنانیان بە زۆری لەبەر ئەوە ئەبێت کە پیسە، کەواتە ئەچێتە ژێر ئەو فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێت: ﴿ويحرم عليهم الخبائث﴾ واتە: وە شتە پیسەکانیان لەسەر حەرام دەکات.

وە هەموو ئەو شتانەی خەڵك بێزیان لی‌ی ئەبێتەوە وەك چڵم و بەڵغەم و عارەق و مەنی و شیاکە و ئەسپێ وکێچ و ئەو جۆرەشتانە ئەچنە ناو شتە پیسەکانەوە.

**حەرامی ئەوەی یاسادانەری ئیسلام فەرمانی داوە بە کوشتنی:**

هەندێ لەزانایان ڕایان وایە هەرچی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی داوە بە کوشتنی حەرامە، وە هەروەها ئەوەی کە کوشتنی قەدەغە کردووە.

وە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی داوە بە کوشتنی لە جانەوەران پێنجن کە ئەمانەن: قەلەڕەش، کۆلارە، دووپشك، مشك، و سەگی قەپگر.

بوخاری و موسلیم و ترمزی و نەسائی لە عائیشەوە خوای لێ ڕازی بێت ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (خمس من الدواب كلهن فواسق يقتلن في الحرم: الغراب والحدأة والعقرب والفأر والكلب العقور)[1].

واتە: پێنج لەجانەوەرەکان لەحەرەمیش دائەکوژرێن: قەلەڕەش و کۆلارەو دووپشك و مشك و سەگی قەپاڵە گر.

---

(١) أحمد (٦/٩٨) والبخاري (١٨٢٩) ومسلم (١١٩٨/٦٧) والترمذي (٨٣٧) وابن ماجه (٣٠٧٨).

وە ئەوانەی کوشتنی قەدەغە کراوە: مێروله و هەنگ و پەپۆسلێمانه و صوردە[1].

ئەبوداود بە ئیسنادێکی صەحیح لە ئیبنو عەبباسەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ چوار گیان لەبەری قەدەغە کردبوو بکوژرێت: ئەوانیش مێروله و هەنگ و پەپوسلێمانە و صوردن.

شەوکانی لێکۆڵینەوەیەکی کردووە دەربارەی ئەو ڕایەو نەقدی کردووە و فەرمویەتی:

وتراوە لە هۆکانی حەرام کردن فەرمان دانی پێغەمبەرە ﷺ بە کوشتنی هەندێك گیانەوەر وەك پێنج فاسقەکان و وەزەغ (بزن مژە) و شتی تر، وە قەدەغە کردنی کوشتنی هەندێکی ترە وەك: مێروله و هەنگ و پەپوسلێمانکە و صورد و بۆق و ئەو شتانە.

وە یاسادانەر شتێکی وای نەهێناوە کە ئەوانەی فەرمانی داوە بەکوشتنیان، یا نەهی کردووە لە کوشتنی هەندێکی تر ئەوە بگەیەنێت کە حەرامن هەتا ئەوفەرمان ونەهی یەی بەڵگە بن لەسەر حەرامی یان. وە نە عەقڵ بۆی ئەچێ و نە لە عورفیشدا هاتووە، وە هیچ ڕێگایەك نی یە بۆئەوەی ئەوە بکرێتە بنەمایەك لە بنەماکانی حەرام بوون، بەڵکو ئەگەر ئەوانەی فەرمانی داوە بە کوشتنیان یا کوشتنیانی قەدەغە کردووە لە پیسەکان بن ئەوە حەرام بوونیان بە ئایەتە پیرۆزەکەیە. وە ئەگەر قورئان باسی نەکردبێت ئەوە خواردنیان حەڵاڵە. بەپێی ئەوەی لە پێشەوە باس کرا کە ئەسڵ لە هەموو شتێکدا حەڵاڵ بوونە (تا بەڵگەی حەرام بوونی دەرئەکەوێت) وە لەبەر بوونی بەڵگە گشتی یەکان لەسەر ئەوە.

**ئەوانەی بێ دەنگەیان لێ کراوە:**

بەڵام ئەوانەی یاسادانەر لێی بێدەنگ بووە و دەقێك نەهاتبێت بۆ حەرامی یان ئەوە حەڵاڵە، بەپێی ئەو قاعیدەی لەسەری ڕێ کەوتون ئەویش ئەوەیە: بنەمای هەموو شت حەڵاڵی یە، وە ئەم بنەمایەش یەکێکە لە بنەماکانی ئیسلام.

وە دەقی زۆریش هاتووە کە بڕیاری لەسەر داوە لەوانەش:

١- فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێت: ﴿هو الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا﴾ (البقرة:٢٩).

واتە: هەر ئەو خوایەیە کە هەرچی لە زەویدایە بۆ ئێوەی دروست کردووە.

---

(١) صورد باڵندەیەکی سەر زلی سك سپی و پشت سەوزە و باڵندەی بچوکتر ئەخوات.

٢- وە (دارقطني) لە ئەبی پەعلەبەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إن الله فرض فرائض فلا تضيعوها، وحد حدوداً فلا تعتدوها، وسكت عن أشياء رحمة لكم غير نسيان فلا تبحثوا عنها)[١].

واتە: خوای گەورە کۆمەڵێ شتی فەرز کردووە لەسەرتان لە دەستی مەدەن، وە چەند سنوورێکی بۆ داناون مەیان شکێنن، وە لە هەندێ شت بێ دەنگی کردووە بێ ئەوەی لە بیری چووبێت لەبەر میهرەبانی، لێیان مەکۆڵنەوە.

٣- وە لە سەلمانی فارسی‌یەوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ کرا دەربارەی ڕۆن وپەنیر وفەروە ئەویش فەرمووی: (الحلال ما أحله الله في كتابه، والحرام ما حرمه الله في كتابه، وما سكت عنه فهو مما عفا لكم)[٢].

واتە: حەڵاڵ ئەو شتانەیە خوا لە کتێبەکەیدا حەڵاڵی کردووە، وە حەرام ئەوانەن خوا لە کتێبەکەیدا حەرامی کردووە، وە ئەوانەی لێی بێ دەنگ بووە ئەوانە لەو شتانەیە لێی بوراوە بۆتان.

ئەم فەرموودەیە ئیبنوماجە و ترمذي تەخریجیان کردووە و ترمزی فەرمویەتی: ئەمە فەرموودەیەکی غەریبە لەو ڕووەوە نەبێت ئاگاداری نین، وە هەروەها حاکم لە (المستدرك) دا بە شاهید ڕیوایەتی کردووە.

٤- وە بوخاری و موسلیم لە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إن أعظم المسلمين في المسلمين جرماً، من سأل عن شيء لم يحرم على الناس، فحرم من أجله مسألته)[٣].

واتە: گەورەترین تاوانبار لەناو موسوڵمانانا ئەوکەسەیە کە پرسیار ئەکات لە شتێك لەسەر خەڵك حەرام نەکرابێت کەچی لەبەر پرسیارەکەی ئەو حەرام بکرێت.

٥- وە لە ئەبی دەرداوە هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ما أحل الله في كتابه فهو حلال، وما حرم فهو حرام، وما سكت عنه فهو عفو، فاقبلوا من الله عافيته فإن الله لم يكن لينسى شيئاً وتلا: ﴿وما كان ربك نسياً﴾. أخرجه البزار وقال: سنده صحيح، والحاكم وصححه[٤].

---

(١) الحاكم (٤/١١٥) والدارقطني (٤/١٨٤).

(٢) الحاكم (٤/١١٥) والدارقطني (٤/١٨٤).

(٣) البخاري (٧٢٨٩) ومسلم (٢٣٥٨/١٣٢).

(٤) البزار كما في كشف الأستار (١٢٣) والحاكم (٢/٣٧٥).

واتە: هەرچی خوا لە کتێبەکەیدا حەڵاڵی کردبێت ئەوە حەڵاڵە، وە هەرچی خوا حەرامی کردبێت ئەوە حەرامە، وە ئەوەی لێی بێدەنگ بووە لێی بوراوە، ئێوەش چاکەکانی خوا وەرگرن چونکە خوا هەرگیز شتی لەبیر ناچێت.

لەپاشاندا ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە ئەفەرمووێت: پەروەردگاری تۆ هەرگیز شتی لە بیر ناچێت.

**گۆشتی هێنراو لە دەرەوە:**

ئەو گۆشتەی لە دەرەوەی وڵاتە ئیسلامی‌یەکانەوە دێن حەڵاڵە خواردنی بە دوو مەرج:

١- ئەبێ لەو گۆشتانە بێت کە خوا حەڵاڵی کردووە.

٢- ئەبێ سەربڕرابێ بە سەربڕینی شەرعی.

جا ئەگەر ئەو دوو مەرجەی تێدا نەبوو وەك ئەوەی لەو گۆشتانە بێت کە خوا حەرامی کردون، وەك گۆشتی بەراز یا سەربڕینەکەی شەرعی نەبوو، ئەوە لەو حاڵەتەدا قەدەغە کراوە و خواردنی حەڵاڵ نی‌یە.

وە ئێستا زانینی ئەو دوو مەرجە زۆر ئاسانە بە هۆی هۆیەکانی ڕاگەیاندنەوە کە زانستی تازە ئامادەی کردووە. وە زۆر جار ئەوقوتووانەی ئەو جۆرە گۆشتانەی تێدایە لەسەریان نوسراوە چ جۆرێکن و چ گۆشتێکیان تێدایە، وە ئەتوانرێت ئیکتیفا بکرێت بەو زانیارانەی لەسەریان نوسراوە، چونکە ئەسڵ ئەوەیە بە زۆری ڕاستن.

وە زانایانی ئایینی لە پێش ئەوەدا فەتوایان لەسەر ئەو جۆرە شتانە داوە، وەك لە کتێبی ئیقناعی خەتیبی شەربینی دا هاتووە کە کتێبی شافیعی‌یەکانە: ئەگەر فاسقێك یا خاوەن کتێبێکی ئاسمانی پێی ڕاگەیاندی ئەو مەڕەی سەربڕیوە، حەڵاڵە خواردنی، چونکە ئەهلی سەربڕینن، وە ئەگەر لە شارەکەدا موسڵمان ومەجوسی هەبوو. نەزانرا کێ ئاژەڵەکەی سەربڕیوە موسڵمان یا مەجوسی؟ دروست نی‌یە خواردنی لەبەر ئەو گومانەی لە سەربڕینە ڕەواکەدایە، وە ئەسڵ ئەوەیە کە سەربڕینەکەی ڕەوا نەبوبێت. بەڵێ ئەگەر موسڵمانەکان بەشی زۆری دانیشتوان بوون پێویستە حەڵاڵ بێت، وە مانای مەجوسی هەیە هەمور ئەوانەی سەربڕاویان حەڵاڵ نی‌یە.

**حەڵاڵی خواردنی ئەوانەی حەرام کراوون لەکاتی ناچاریدا :**

بۆ ناچار هەیە گۆشتی مردارەوەبوو وگۆشتی بەراز بخوات، و لە گۆشتی ئەو حەیوانانەی[1] کە گۆشتیان ناخورێت وئەوانەی خوا حەرامی کردوون، بۆ پاراستنی ژیان و دوورکەوتنەوە لە مردن. وە مەبەست لە ڕەوابوون لێرەدا واجب بوونی خواردنییەتی، بەپێی فەرمودەی خوای گەورە: ﴿وَلاَ تَقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾ (النساء/٢٩).

واتە: خۆتان مەکوژن چونکە خوا میهرەبانە پێتان.

**ڕادەی ناچاری و زۆر بۆ هاتن:**

ئادەمیزاد کاتێك بە ناچار دائەنرێت کە برسێتییەکەی بیگەیەنێتە ڕادەی مردن، یا تووشی نەخۆشییەکی بکات کە دوایی بیکوژێت ئیتر ئەو کەسە گوێ ڕایەڵی فەرمانی خوا بێت یا سەرپێچی کەر بێت. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فمن اضطر غير باغ ولا عادٍ فلا إثم عليه إن الله غفور رحيم﴾.

واتە: هەرکەس پێویستی ناچاری کرد بۆ خواردنی شتێك لەو حەرام کراوانە، بێ ئەوەی حەزی لێ بێت، وە دەرنەچو لە سنووری ئەوەی کە بۆی ڕەوا کراوە، ئەوە تاوانی لەسەر نییە لەوەدا، چونکە بەڕاستی خوا لێخۆشبووە بۆ بەندەکانی و میهرەبانە پێیان.

وە ئەبوداود ئەگێڕێتەوە لە فوجەیعی عامرییەوە کە هاتۆتە لای پێغەمبەر ﷺ ووتویەتی: چی لە مردارەوە بوو بۆ ئێمە حەڵاڵە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خواردنتان چییە؟ ووتی: بەیانی وئێوارە شیر ئەخۆینەوە. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: بە سەری باوکم ئەوە برسێتییە[2]. ئینجا مردارەوەبوی بۆ حەڵاڵ کردن لەسەر ئەو حاڵەتە.

ئیبنوحەزم فەرمویەتی: ڕادەی زەرورەت بوون ئەوەیە شەو ڕۆژێك بمێنێتەوە بێئەوەی خواردن وخوادنەوەی دەست بکەوێت. جا ئەگەر ترسی لاوازی هەبوو ئەو لاوازییەی بەرەو مردنی بەرێت، یا دایبڕێ لە کاروباری، بۆی هەیە ئەوەندە خواردن وخواردنەوە بخوات کە مردن لە خۆی دوور بخاتەوە ئەو مردنەی بە برسێتی و تینوێتی تووشی ئەبێت.

(١) هەتا شافیعییەکان و زەیدییەکان بە دروستیان داناوە گۆشتی ئادەمی لەکاتی نەبوونی جگە لەوەدا. بەڵام حەنەفییەکان و ظاهیرییەکان پێچەوانەی ئەوەن و وتوویانە: گۆشتی ئادەمی ڕەوا ناکرێت با مردوش بێت.

(٢) أبوداود (٣٨١٧).

وە ئەم ڕادە دانانەی ئێمە بە شەوو ڕۆژێك لەبەر ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ حەرامی کردبوو شەوو ڕۆژێك لەسەر یەك ڕۆژوو نەشکێنرێت (وصل الصیام).

وە ئەوەی ووتومانە: ئەگەر ترسی مردنی هەبوو لەو ڕووەوە لەبەر ئەوەیە کە ناچارە.

مالیکی‌یەکان بۆچوونیان وایە ئەگەر سێ ڕۆژ هیچی نەخوارد بۆی دروستە لەوەی خوا حەرامی کردووە بخوات هەرچی بۆی ڕێکەوێت ئەگەرچی لەماڵی خەڵکیش بێت.

ئەو ئەندازەیەی وەرئەگیرێ :

ئەبێ ئەو کەسەی کە ناچارە ئەوەندە لەو حەرامە بخوات کە ژیانی پێ بپارێزێت وبتوانی هەڵس وکەوت بکات، وە بۆی هەیە بەپێی پێویستی خۆی لێی هەڵبگرێت.

لە ڕیوایەتێکدا هاتووە لە مالیك وئەحمەدەوە کە فەرمویانە: دروستە بۆی تێری لێ بخوات بەپێی ئەوەی ئەبوداود لە جابیری کوڕی سەمورەوە ئەگێڕێتەوە کە پیاوێك لە حەڕە لای دا ووشترەکەی گیانی لە دەست دا، ژنەکەی پێی ووت: بیگرو بۆ ئەوەی گۆشت وچەوری‌یەکەی لەت لەت بکەین و ووشکی بکەینەوەوبیخۆین، پیاوەکەش ووتی: هەتا لە پێغەمبەر ﷺ نەپرسم دەستی لێ نادەم. کابرا هات پرسیاری لێ کرد ئەویش فەرمووی: ئەوەندەت هەیە تێری پێ بخۆیت؟ ووتی: نە. فەرمووی: دە بیخۆ[1].

هاوەڵەکانی ئەبوحەنیفە ووتویانە: نابێ تێری لێ بخورێت. وە لە شافیعی‌یەوە دوو قسە ئەگێڕنەوە.

**ناچار نی‌یە کەسێك لە شوێنێکدا بێت کە خواردنی لێ دەست بکەوێت با خۆشی خاوەنی نەبێت:**

تەنها کاتێك مرۆڤ ناچارە ئەگەر خواردنی دەست نەکەوت بیخوات، با موڵکی کەسی تریش بێت.

جا ئەگەر زۆری بۆ هات وخواردنی کەسێکی تری دەست کەوت، بۆی هەیە لێی بخوات با خاوەنەکەشی ڕێی پێ نەدات. وە زانایان لەسەر ئەوە جیاوازیان نی‌یە، بەڵام جیاوازی‌یان لەوەدا هەیە کە ئایا نرخەکەی بژمێرێت بۆ خاوەنی یان نا.

کۆمەڵێك لە زانایان بۆ ئەوە چوون ئەگەر کەسێك برسی بوو زۆری بۆهات وخاوەنی خواردەمەنی‌یەکە لەوێ نەبوو بۆی هەیە لێی بخوات و دوایی نرخەکەی بداتێ، چونکە ناچاری مافی خەڵکی پوچەڵ ناکاتەوە.

---

(١) أبوداود (٣٨١٦).

شافیعی فەرمویەتی: نرخەکەی ناداتەوە چونکە لێ پرسین بە ناچاری لە کۆڵ ئەکەوێت لەبەر ئەوەی ڕێ پێ دان لە یاسادانەرەوە هەیە. وە ڕێ پێ دان و دەستەبەری کۆ نابنەوە لەسەر کەسێك.

جا ئەگەر خواردن هەبوو بەڵام خاوەنی ڕێی پێ نەدا بۆ ناچارەکە هەیە بە زۆر بیستێنێ ئەگەر توانی.

وە مالیکی‌یەکان وتویانە: لەو حاڵەتەدا دروستە جەنگین بە چەك لەگەڵ خاوەن خواردنەکە دوای ئەوەی پێی ڕائەگەیەنێت کە ناچارەو ئەگەر بەشی نەدات شەڕ ئەکات لەگەڵیا، جا ئەگەر دوای ئەوە خاوەن خواردنەکەی کوشت خوێنی هەدەر نەبێت. لەبەر ئەوەی واجبە خواردنەکەی بدات بە کەسێك کە ناچارە، بەڵام ئەگەر خاوەن خواردنەکە ناچارەکەی کوشت تۆڵەی ئەکەوێتە سەر.

وە ئیبنوحەزم فەرمویەتی: ئەگەر کەسێك ناچار بوو کە خواردەمەنی‌یەکی حەرام بخوات، وە نە ماڵی موسڵمانی دەست کەوێت نە زیمی ئەوە بۆی هەیە لەو حەرامە بخوات هەتا تێر ئەبێت و لێی هەڵبگرێت هەتا حەڵاڵی دەست ئەکەوێت. جا ئەگەر حەڵاڵی دەست کەوت ئەوە ئەوشتە حەرام ئەبێتەوە لەسەری.

وە ئەگەر ماڵی موسڵمان یا زیمی دەست کەوت ئەوە ئەوەی دەست کەوتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ داوە کە دەرخواردی بدرێ، وەك ئەفەرموێت: (أطعموا الجائع)[1]. واتە: برسی تێر بکەن. چونکە مافی خۆی لەو خواردنەدا هەیە، جا ئەگەر ئەوە هەبوو ئیتر ناچار نی‌یە هەتا مردارەوەبوو بخوات، بەڵام ئەگەر بە ستەم بەشی نەدرا ئەوکاتە هەر ناچار وزۆر بۆ هاتووە.

**ئایا ئارەق بۆ چارەسەرکردن ئەشێت؟**

زانایان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە حەرام بۆ ناچار ڕەوایە وکەس لە زانایان لەوەدا جیاوازی نی‌یە.

بەڵکو جیاوازی‌یان لەوەدا هەیە کە ئارەق بۆ تەداوی بەکار بێت. هەیانە قەدەغەی کردووە، وە هەشیانە ڕەوای کردووە.

وە ئەوەی ئاشکرایە قەدەغەکردنەکە بەهێزترە، چونکە خەڵك لەسەردەمی نەفامیدا ئارەقیان خواردۆتەوە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی، کاتێ ئیسلام هات لێی قەدەغەکردن و حەرامی کرد کە بۆ دەرمان بەکاری بهێنن.

ئیمامی ئەحمەد وموسلیم و ئەبوداودو ترمذي ئەگێڕنەوە لە گاریقی کوڕی سوەیدی جوعفی‌یەوە ئەگێڕنەوە کە خۆی پرسیاری کردووە لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئارەق. ئەویش لێی

---

(١) أحمد (٤/٢٩٩) والبيهقي (١٠/٢٧٣) والدارقطني (٢/١٣٥) وابن أبي الدنيا في الصمت (٦٧).

قەدەغەکردووە، ئەویش ووتویەتی: دەرمانی لێ دروست ئەکەم. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إنه ليس بدواءٍ ولكنه داء)[1].

واتە: ئارەق دەوا نی‌یە، بەڵکو دەردە.

وە ئەبوداود لە ئەبو دەردائەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إن الله أنزل الداء والدواء، فجعل لكل داءٍ دواءً فتداووا ولا تتداووا بحرام)[2].

واتە: بەڕاستی خوا دەرد و دەوای ناردۆتە خوارەوە، و بۆ هەردەردێك دەوای داناوە، ئێوەش نەخۆشەکانتان تەداوی بکەن بەڵام بە شتی حەرام تەداوی مەکەن.

وە پێش هاتنی ئیسلام جاری وابوو ئارەقیان ئەخواردەوە لەبەر سەرما، کاتێ ئیسلام هات ئەوەشی لێ قەدەغەکردن.

ئەبوداود ئەگێڕێتەوە کە دەیلەمی حیمیەری لە پێغەمبەری ﷺ پرسی ووتی: ئەی نێرراوی خوا، ئێمە لە وولاتێکی کوێستاندا ئەژین، و کاری قورس و گران ئەکەین. وە ئێمە لە گەنم شەرابێك دروست ئەکەین بۆ ئەوەی توانای کارکردنمان هەبێت و لەسەرما بپارێززێین لەو شوێنەدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سەرخۆش کەرە؟ ووتی: بەڵێ. فەرمووی: کەواتە لێی دوور بکەونەوە. ئەویش ووتی: خەڵك وازی لێ ناهێنن. فەرمووی: ئەگەر وازیان لێ نەهێنا شەڕیان لەگەڵ بکەن[3].

وە هەندێ لە زانایان ڕێیان داوە تەداوی بەئارەق بکرێت بە مەرجێك دەوایەکی حەڵاڵ نەبێت جێی ئەو حەرامە بگرێتەوە. وە ئەو کەسەی بۆ تەداوی بەکاری ئەهێنێت مەبەستی خۆشی و سەرخۆشی نەبێت، وە لەو ئەندازەیەش تێ نەپەڕێت کە پزیشك بۆی دیاری کردووە. وەك چۆن ڕێیان داوە ئارەق بخورێتەوە کاتی ناچاری، وەزانایان نمونەیان بۆ ئەوە هێناوەتەوە کە ئەگەر کەسێك پارویەکی لە بین گیرا خەریك بوو بخنکێت و جگە لە ئارەق لەوێدا هیچی تر نەبوو بیکات بە سەریا دروستە ئەو ئارەقە بکات بە سەریا.

وە هەروەها نمونەیەکی تریان بۆ هێناوەتەوە کەئەگەر کەسێك خەریك بوو لەسەرما ڕەق ببێتەوەو هیچی دەست نەکەوێت ئەو سەرمایە لە کۆڵ بخات پەرداخێك ئارەق نەبێت. یا کەسێك تووشی

(١) مسلم (١٩٨٤) وأبوداود (٣٨٧٣) والترمذي (٢٠٤٧) وابن ماجه (٣٥٠٠).

(٢) أبوداود (٣٨٧٤).

(٣) أبوداود (٣٦٨٣).

نەخۆشی دڵ بوو خەریك بوو بمرێت. خۆی نەیزانی یا پزیشك پێی ڕاگەیاند كە هیچ نی‌یە ئەو مەترسی‌یەی لە كۆڵ بخات جگە لە ئەندازەیەكی دیاری كراو لە ئارەق.

ئەمەش لە بابی ئەو پێویستی‌یانەیە كە قەدەغەكراوەكان ڕەوا ئەكەن.

**سەربڕینی شەرعی**

**پێناسەكەی:**

(ذكاة) لە ئەسڵدا ماناكەی: بۆن خۆش كردنە، وە (رائحة ذكية) واتە بۆنی خۆش، وە بە سەربڕینیش ئەوترێ (ذكاة) چونكە ڕەوا بوونە شەرعی‌یەكە خۆشی ئەكات.

وە وتراویشە كە (ذكاة) بە مانای تەواو كردن دێت.

وە لێرەدا مەبەست لە (ذكاة) سەربڕینی ئاژەڵ وشێوەكانی بە بڕینی قوڕقوڕاگە یا بڕینی سورینجك، چونكە ئەو ئاژەڵەی دروستە گۆشتی بخورێت دروست نی‌یە گۆشتەكەی بخورێت هەتا سەر نەبڕرێت جگە لەماسی وكوللە.

**ئەوەی پێویستە لە سەربڕیندا :**

**بۆ سەربڕینی شەرعی ئەمانە پێویستە:**

١- ئەبێ سەربڕەكە ژیر بێت ئیتر نێر بێت یا مێ، موسڵمان بێت یا كیتابی، جا ئەگەر شایستەیی سەربڕینی نەبوو، وەك ئەوەی سەر خۆش بێت، یا شێت، یا منداڵی بێ تەمییز بێت ئەوە سەربڕاوەكەی حەڵاڵ نی‌یە. وە هەروەها سەربڕاوی بێ باوەڕ لە بت پەرست و زەندیق و هەڵگەڕاوە لە ئیسلام دروست نی‌یە.

**سەربڕاوی ئەهلی كیتاب :**

(قرطبي) دەفەرموێت: ئیبنوعەبباس فەرمویەتی: خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ولاَ تأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرْ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وإِنَّهُ لَفِسْقٌ﴾ (الأنعام/١٢١).

واتە: -ئەی موسوڵمانەكان- گۆشتی ئەو شتانە مەخۆن كە لەكاتی سەربڕیندا ناوی خوایان لەسەر نەهاتووە، چونكە خواردنی ئەو سەربڕاوانە دەرچوونە لە فەرمانی خوا.

وە لەپاشاندا ئەمەی لێ جیاكردۆتەوە كە ئەفەرموێت: ﴿وطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَكُمْ وطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَهُمْ﴾ (المائدە/٥).

واتە: وە خواردەمەنی ئەوانەی كتێبی ئاسمانیان بۆ هاتووە ڕەوایە بۆتان وخواردەمەنی ئێوەش بۆ ئەوان ڕەوایە.

واتە: سەربڕاوی جولەکە و گاور. هەرچەندە گاور کاتی سەربڕینەکە ئەڵێت: بە ناوی مەسیحەوە، یا جولەکەکە ئەڵێت: بە ناوی عوزەیرەوە، چونکە ئەوان لەسەر ئایینەکەیان سەری ئەبڕن.

عطاء فەرمویەتی: گۆشتی سەربڕاوی نەصرانی بخۆ با لەکاتی سەربڕینیشدا ووتبێتی بە ناوی مەسیحەوە. چونکە خوای گەورە سەربڕاوەکانی حەڵاڵ کردوون و زانیویەتی چی ئەڵێن.

قاسمی کوڕی موخەیمیرە فەرمویەتی: گۆشتی ئەو سەربڕاوە بخۆ با سەربڕەکەی ووتبێتی بە ناوی سەرجیسەوە (کە ناوی کەنیسەیەکیانە) ئەوەش قسەی زوهری و ڕەبیعە وشیعبی و مەکحولە.

وە لە ئەبودەرداو عوبادەی کوڕی صامیتەوە کە دوو صەحابە بوون ئەو قسەیە ئەگێڕنەوە. وە کۆمەڵێك ووتویانە: ئەگەر گوێت لە ئەهلی کیتابێك بوو ناوی جگە لە خوای لەسەر هێنا، مەیخۆ.

وە لە صەحابەکان عەلی و عائیشەو ئیبنوعومەر ڕەزای خوایان لێ بێت ئەوە دەفەرموون.

هەروەها قسەی گاوس و حەسەنە.

بەلگەشیان فەرمودەی خوای گەورەیە کە فەرمویەتی: ﴿ولا تأكلوا مما لم يذكر اسم الله عليه وانه لفسق﴾.

وە مالیك فەرمویەتی: کەراهەتی هەیە، بەڵام بە حەرامی دانەناوە.

**سەربڕاوی مەجوسی و صابیئی یەکان:**

زانایان جیاوازیان هەیە لە سەربڕاوی مەجوسی دا بەپێی جیاوازیان لە ئەسڵی دینەکەیاندا. چونکە هەیانە ئەڵێت: ئەمانە خاوەنی کتێبی ئاسمانین و دوایی لابراوە وەك لە عەلی یەوە ئەگێڕنەوە، وە هەیانە ڕای وایە ئەمانە موشریکن.

وەئەوانەی ڕایان وایە کە خاوەنی کتێبی ئاسمانین ئەڵێن: سەربڕاوەکانیان حەڵاڵە وئەچنە ناو فەرموودەی خوای گەورەوە کە فەرمویەتی: ﴿وطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَكُمْ وطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَهُمْ﴾ (المائدة/٥).

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (سنوا بهم سنة أهل الكتاب)[١].

واتە: وەك خاوەن کتێبەکان ڕەفتاریان لەگەڵدا بکەن.

ئیبنوحەزم دەربارەی مەجوسی فەرمویەتی: ئەمانە خاوەنی کتێبی ئاسمانین و حوکمیان حوکمی خاوەن کتێبە ئاسمانی یەکانە لە هەموو شتێکدا.

(١) تلخيص الحبير (٣/١٩٦) ونيل الأوطار (٤/٥٩٧).

وە ئەبوثەور و ظاهیریەکان بۆ ئەوە چوون، بەڵام جەماوەری زانایان حەرامیان کردووە خواردنی شتەکانیان، چونکە بە لایانەوە وایە ئەمانە هاوبەش بۆ خوا دائەنێن.

وە لەبارەی صابیئیەکانەوە[1] ووتراوە گۆشتی سەربڕاوەکانیان دروست نیە، وەلە بارەی ئەوەوە کە دروستیش بیَ قسە کراوە.

٢-ئەبیَ ئەو ئامێرەی پیَ ی سەرئەبڕرێت تیژبێت کە خوێن برێژرێت و قورقوراگە ببڕێت، وەك چەقۆ وبەرد وتەختەو شمشێر وشیشە وقامیش کە لای تیژیان هەبێت وەك چەقۆو ئێسك شت ببڕن، جگە لە ددان ونینۆك کە دروست نیە.

(أ) مالیك ئەگێڕێتەوە ژنێك مەڕ ئەلەوەڕێنێت مەڕێکیانی توش ئەبێت، فریای ئەکەوێت بە بەردێك سەری ئەبڕیَ. لەوبارەیەوە پرسیارکرا لە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (لابأس بها) [2]. واتە: خراپی تێدا نیە.

(ب) وە ئەگێڕنەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە پرسیاری لیَ کرا ئایا بە پارچە بەرد (کە بەزدی سپی بوو) و پارچەی داردەست شت سەربڕین؟ فەرموی: پەلەی لیَ بکەن و بیلەرێننەوە، وەهەرچی خوێنی لیَ بهێنیَ وناوی خوای لەسەر هێنرابێت بیخۆن، جگە لە ددان ونینۆك. موسلیم گێڕاویەتیەوە[3].

(ج) وە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردبوو لە (شریطة الشیطان) ئەویش ئەوەیە کە تەنها پێست ببڕێت و خوێنەکەی بڕوات بیَ ئەوەی دەمارە ئەستورەکانی لا مل ببڕێت کە پیَی ئەڵێن: (أوداج)[4]. ئەبوداود لە ئیبنوعەبباسەوە تەخریجی کردوە، وە لە ئیسنادەکەیدا عەمری کوڕی عبدالله ی صەنعانی تێدایە کە زەعیفە.

٣-بڕینی قورگ و سورێنچك، وە مەرج نیە بە تەواوی لێك جیاوەبن، وە هەروەها مەرج نیە دوو دەماری مل ببڕێن، چونکە قورگ و سورێنچك شوێنی خواردن وخواردنەوەن و ژیانیان لەگەڵدایە، وە بڕینی ئەوانەش مەبەستە بۆ مردن، جا ئەگەر سەری لیَ کرایەوە ئەو سەربڕاوە حەرام نابێت، وە

---

(١) ئەوانیش ئاینێکیان هەیە کە لەنێوان مەجوسیەت و گاوریدایە، وە باوەڕیان بە کاریگەری ئەستێرە هەیە.

(٢) البخاري (٥٥٠٥) ومالك في الموطأ ١٥٣).

(٣) البخاري (٢٥٠٧) ومسلم (١٩٦٨/٢٠-٢٢).

(٤) أبوداود (٢٨٢٦).

هەروەها ئەگەر لە پشتی ملەوە سەر بڕاو ئامێرەکە گەیشتە شوێنی سەربڕین کە قورگ و سورێنچکە[1].

٤- ناوی خوا هێنان: مالیك فەرمویەتی: هەرچی سەربڕاو ناوی خوای لەسەر نەهات ئەوە حەرامە خواردنی، لە بیری چوبێت یا لە قەستی وازی لیّ هێنا بێت. ئەمەش قسەی ئیبنوسیرین و کۆمەڵێك لە ئەهلی کەلامن.

ئەبوحەنیفە فەرمویەتی: ئەگەر ناوی خوای لیّ نەهێنابیّ بە قەستی ئەوە حەرامە، وەئەگەر لەبیری چوو حەڵاڵە.

وە شافیعی ووتویەتی: حەڵاڵە گۆشتی ئەو ئاژەڵەی ناوی خوای لەسەر نەهاتووە، بە قەستی بێت یان بە هەڵە ئەگەر ئەو کەسە شیاوی سەربڕین بێت.

لە عائیشەوە: کە کۆمەڵێك ووتیان: ئەی نێرراوی خوا، کۆمەڵێك گۆشتمان بۆ ئەهێنن نازانین کاتی سەربڕین ناوی خوای لەسەر هاتووە یان نا؟ ئەویش فەرمووی: ئێوە ناوی خوای لەسەر بهێنن و بیخۆن. عائیشە ئەڵێت: تازە موسڵمان بوون کە ئەو پرسیارەیان کرد. بوخاری و جگە لەو تەخریجیان کردووە[2].

**ئەوەی کەراهەتی هەیە لەسەربڕیندا:**

**ئەمانەی خوارەوە کەراهەتیان هەیە بۆ سەربڕین:**

١- سەربڕینەکە بە ئامێرێکی کول بێت، بەپێی ئەوەی موسلیم لە شەددادی کوڕی ئەوسەوە گێراویەتیەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: (إن الله كتب الإحسان على كل شئ، فإن قتلتم فأحسنوا القتلة، وإذا ذبحتم فأحسنوا الذبحة، وليُحدَّ أحدُكم شفرَتَه ولْيُرِحْ ذبيحته)[3].

واتە: بەڕاستی خوا چاکەی لەسەر هەموو شتێك داناوە، ئەگەر کەسێکتان لە تۆڵەدا کوشتەوە بەچاکی بیکوژنەوە، وەئەگەر شتێکتان سەربڕی بە چاکی سەری ببڕن، با هەر یەکێکتان چەقۆکەی تیژ بکات وسەربڕاوەکەی بحەوێنێتەوە و ئاسودەی بکات.

---

(١) ئەمەش مەزهەبی شافیعی وئەحمەدە، بەڵام مالیك و ئەبوحەنیفە فەرمویانە: سەربڕینی شەرعی پێك نایەت بە بڕینی سورێنچك وهەردوو دەماری مل نەبێت.

(٢) البخاري (٥٥٠٧) والنسائي (٧/٢٣٧) وابن ماجه (٣١٧٤).

(٣) مسلم (١٩٥٥) وأبوداود (٢٨١٥) والنسائي (٧/٢٢٩) وابن ماجه (٣١٧٠).

٢- وەلە ئیبنوعومەرەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا چەقۆكان تیژ بكرێن وپێشان ئاژەڵەكە نەدرێن. ئەحمەد گێڕاویەتی‌یەوە[١].

٣- شكاندنی ملی ئاژەڵ و گرونی پێش گیان دەرچوونی. بەپێی ئەوەی (دارقطني) لە ئەبوهورەیرەوە گێڕاویەتی‌یەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا تعجلوا الأنفس قبل أن تزهق)[٢].

واتە: پەلە مەكەن لە گیانەكان پێش دەرچوونی.

بەڵام دەربارەی ڕوەو قیبلەكردنی، هیچ شتێك دەربارەی پەسەندێتی نەهاتووە.

**سەربڕینی ئاژەڵێك كە گیانی تێدا مابێت یا نە خۆش بێت:**

ئەگەر ئاژەڵێك سەربڕراو كاتی سەربڕینەكە گیانی تێدا مابێت حەڵاڵە خواردنی. با ئەو گیانە هیوای ژیانیشی پێوە نەبێت.

وە هەروەها ئەو ئاژەڵە نەخۆشانەی هیوای ژیانیان بۆ نامێنێ وكاتێ سەرئەبڕێن گیانیان تێدا مابێت. وەگیان تێدامانیش بە جوڵاندنی دەست وقاچ وكلك وهەناسە هەڵكێشان وئەو جۆرە شتانە ئەزانرێت.

وە ئەگەر گەیشتبووە حاڵەتی مردنەوە ودەست و قاچی نەئەجوڵاند، لەم شێوەیەدا بە مردارەوەبوو ئەژمێررێت و سەربڕینی سوودی نی‌یە، بەپێی فەرمودەكەی خوای گەورە: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ والدَّمُ ولَحْمُ الْخنزِيرِ ومَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ والْمُنْخَنِقَةُ والْمَوْقُوذَةُ والْمُتَرَدِّيَةُ والنَّطِيحَةُ ومَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلاَّ مَا ذَكَّيْتُمْ﴾ (المائدە/٣).

واتە: لەسەرتان حەرام كراوە گۆشتی مردارەوەبوو، وخوێنی ڕژاو و گۆشتی بەراز و گۆشتی ئەوانەی كاتی سەربڕین ناوی جگە لە خوایان لەسەر هاتووە، وە مردارەوە بوو بە خنكان، وە مردارەوە بوو بە لێدان بە دار، وە مردارەوەبوو بە بەربوونەوە لە شوێنی بەرزەوە، وە مردارەوە بوو بە شۆق لێدانی ئاژەڵێكی تر، وە ئەو ئاژەڵەی دڕندە بریندارى كردبێت و مردبێت، جگە لەو ئاژەڵانەی كە فریای سەربڕینیان ئەكەون كە گیانیان تێدا مابێت.

واتە: ئەمانە هەموو حەرامن لەسەرتان جگە لەوانەی پێی دائەگەن سەری ئەبڕن، چونكە ئەو سەربڕینە حەڵاڵی ئەكات.

---

(١) ابن ماجه (٣١٧٢).

(٢) البيهقي (٩/٢٧٨) والثقات لابن حبان (١/١٨٤) وإرواء الغليل (٨/١٧٦) ونصب الراية (٢/٤٨٤).

وە لە ئیبنوعەبباس پرسرا دەربارەی گورگ پەلاماری مەڕێك بدات وسکی بدڕێت و ڕیخۆڵەکانی بڕژێتەدەر ئینجا سەرببڕرێت، فەرمویەتی: بیخۆن، و ئەوەی ڕژاوەتە سەرزەوی مەیخۆن.

دەست هەلگرتن پێش تەواوبوونی سەربڕین:

ئەگەر ئەو کەسەی ئاژەڵێك سەرئەبڕێت دەستی هەلگرت هێشتا تەواو سەری نەبڕی بوو پاشان خێرا گەڕایەوەو سەربڕینەکەی تەواو کرد، ئەوە دروستە، چونکە بریندارى کردووە لەپاشاندا سەری بڕیوە کە هێشتا گیانی تێداماوە، وە ئەچێتە ناو فەرموودەکەی خواوە کە ئەفەرموێت: ﴿إلا ما ذكيتم﴾ واتە: جگە لەوانەی سەرتان بڕیون.

بریندار کردنی گیان لەبەر کاتێ نەتوانرا سەرببڕێت:

ئەو ئاژەڵەی بەسەربڕین گۆشتی حەڵاڵ ئەبێت ئەگەر تواناى سەربڕینی هەبوو لە شوێنی سەربڕیندا سەرئەبڕرێت، بەڵام ئەگەر تواناى بە سەربڕیا نەبوو، ئەوە سەربڕینەکە بە بریندارکردنی شوێنێکی ئەبێت بە مەرجێك برینەکەی خوێنی لێ بێت و پێی بمرێت.

ڕافیعی کوڕی خەدیج فەرمویەتی: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بووین لە سەفەرێکدا ووشترێك لەناو ووشترەکاندا هەڵات و ئەسپیان پێ نەبوو بیگرنەوە، کابرایەك تیرێکی تێگرت و کوشتی. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إن لهذه البهائم أوابد كأوابد الوحش، فما فعل منها هذا فافعلوا به هكذا).(رواه البخاري و مسلم)[1].

واتە: ئەم ئاژەڵانە دڕندەیەتی‌یەکیان تێدایە وەك دڕندەیی حەیوانی کێوی، جا هەرکامیان ئەوەی کرد، ئێوەش بەو شێوەیەی لێ بکەن.

ئەحمەد و خاوەن سونەنەکان لە ئەبوعەشرائەوە لە باوکی‌یەوە گێڕاویانەتەوە کە فەرمویەتی: ئەی نێرراوی خوا سەربڕین هەرئەبێت لە ملەوە بێت؟ فەرمووی: (لو طعنت في فخذها أجزأ عنك)[2].

واتە: ئەگەر ڕانیشی هەڵدری هەر ئەبێت.

ئەبوداود فەرمویەتی: ئەوە تەنها بۆ ئەو ئاژەڵانە ئەبێت کەلە شوێنی بەرزەوە بەرئەبنەوە، یا کێوی ئەبن.

---

(١) البخاري (٥٤٩٨) ومسلم (١٩٦٨/٢٠).

(٢) أحمد (٢/٣٣٤) وأبوداود (٢٨٢٥) والترمذي (١٤٨١) والنسائي (٧/٢٢٨) وابن ماجه (٣١٨٤).

(ترمذي) فەرمویەتی: ئەوە بۆ کاتی پێویستە کە ئاژەڵێك هەڵات یا هەڵبگەڕێتەوە و دەسەڵاتمان بە سەریا نەبێت، یا بکەوێتە دەریایەکەوە ترسی نوقم بوونمان لێی هەبێت، ئەو کاتە بە چەقۆ یا بەتیر لێی ئەدەین هەتا خوێنەکەی ئەڕوات ئیتر ئەمرێو حەڵاڵە.

بوخاری ئەگێڕێتەوە لە عەلی و ئیبنوعەبباس و ئیبنوعومەر و عائیشەوە ڕەزای خوایان لێ بێت کە فەرمویانە: هەرچی ئاژەڵێك توانات بە سەریا نەبوو وەك نەچیر وایە، وە هەرچی بکەوێتە بیرێکەوە سەربڕینەکەی بەو شێوەیە ئەبێت کە بتوانیت.

**سەربڕینی کۆرپەلە:**

ئەگەر کۆرپەڵە لە سکی دایکیدا هاتە دەرەوەو بە جیا زیندو بوو پێویستە سەرببڕێت بەڵام ئەگەر دایکەکە سەر بڕرابوو ئەویش لە زگی دایکی دا بوو سەربڕینی دایکی بۆ ئەویش ئەبێت، بە مردوویی بێتە دەرەوە یا گیانی تێدا بمێنێ، بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی کۆرپەڵە: (ذكاته ذكاة أمه).

واتە: سەربڕینی بە سەربڕینی دایکی پێك دێت.

لە ئەبوسەعیدەوە ئەحمەد و ئیبنوماجە و ئەبوداود و (ترمذي) و (دارقطني) و ئیبنوحیببان کە بە صەحیحی گێڕاوە گێڕاویانەتەوە[1].

ئیبنومونذیر فەرمویەتی: ئەوانەی ووتویانە: سەربڕینی کۆرپەڵە بە سەربڕینی دایکی پێك دێت، وە باسی ئەوەیان نەکردووە توکی دەرکردبێت یان ناو:

عەلی کوڕی ئەبی طالب و سەعیدی کوڕی موسەییب و ئەحمەد و ئیسحاق و شافیعین، وە فەرمویەتی: وە لە هیچ صەحابەیەکەوە نەهاتووە یا لە هیچ زانایەکەوە کە ووتبێتی کۆرپەلە گۆشتی ناخورێت هەتا کە هاتەدەرەوە سەر نەبڕێت، ئەوە نەبێت کە لە ئەبی حەنیفە ڕەحمەتی خوای لێ بێ گێڕراوەتەوە.

وە ئیبنوقەییم فەرمویەتی: سوننەتی صەحیح و ئاشکراو مەحکەم هاتووە کە سەربڕینی کۆرپەڵە بە سەربڕینی دایکەکە پێك دێت، بە پێچەوانەی بنەماکان کە ئەویش حەرامی مردارەوەبووە.

جا لە وەڵامدا ئەوترێ: ئەوکەسەی حەرامی مردارەوەبووی لە دەم وەرگێراوە (کە یاسادانەرە) ماسی و کوللەی لێ جیاکردوەتەوە.

---

(١) أحمد (٣/٣٩) والترمذي (١٤٧٦) وابن ماجه (٣١٩٩) والدارقطني (٤/٢٧٤) وابن حبان (٥٨٨٩).

جا چۆن کۆرپەڵە مردارەوەبووە؟، کە بەشێکە لە ئەندامانی دایکە سەربڕاوەکە، وە سەربڕینەکە بەسەر هەموو ئەندامەکانیدا هاتووە، کەواتە پێویست ناکات هەربەشێك بە جیا سەرببڕێت.

وە کۆرپەڵەش بەشێکە لە دایکەکەو لەگەڵ ئەودایە، چونکە بنەما صەحیحەکان ئەوە ئەگەیەنن، با سوننەتیش نەهاتایە بۆ حەڵاڵ کردنی، جا چۆن حەلاڵ نییە لە کاتێکدا سوننەت هاتووە بۆ ڕەواکردنی، وە لەگەڵ قیاس و ئوصولیشدا ڕێك کەوتووە.

وە ئەبینین دەق و بنەماو قیاس ڕێك کەوتوون، سوپاس بۆ خوا.

**ڕاو (الصید)**

**پێناسەکەی:**

(صید) ڕاوکردنی گیان لەبەری حەڵاڵی کێوی‌یە کە دەسەڵات بە سەریا نی‌یە.

**حوکمەکەی:**

ڕاو حەڵاڵە خوای گەورە بەم ئایەتە حەڵاڵی کردووە: ﴿وإِذَا حَلَلْتُمْ فَاصْطَادُوا﴾ (المائدة:٢) واتە: کاتێ خۆتان کردەوە لەبەرگی ئیحرام ڕاو بکەن.

ڕاو هەمووی حەڵاڵە، جگە لەڕاوی ناو حەرەم، کە لەباسی حەجدا باسی کراوە.

وە ڕاوی دەریایی لەسەر هەموو شێوەیەك حەڵاڵە، وە هەروەها ڕاوی ووشکانی جگە لە حاڵەتی ئیحرامدا. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ وطَعَامُهُ مَتَاعًا لَكُمْ ولِلسَّيَّارَةِ وحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ الْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا﴾ (المائده/٩٦).

واتە: حەڵاڵ کراوە بۆتان ڕاوی دەریا لە حاڵەتی ئیحرامتانا، وە خواردەمەنی‌یەکەی بۆ ئەوەی سوودی لێ وەربگرن لەکاتی نیشتەجێ‌یی و لە کاتی سەفەرتاندا، ڕاوی دەریا ئەوەیە کە ڕاو ئەکرێ لە دەریا بە زیندویی، وە خواردەمەنی دەریا مردارەوەبووی دەریایە. وە ڕاوی زەمینیتان لێ حەرام کراوە هەتا لە ئیحرامدا بن.

**ڕاوی حەرام:**

ڕاوی حەڵاڵ ئەو ڕاوەیە کە مەبەست لی‌ی سەربڕین و خواردنی گۆشتەکەی بێت، بەڵام ئەگەر مەبەست لی‌ی سەربڕین نەبێت ئەو ڕاوە حەرامە.

**باسی تێك دان و لەناو بردنی ئاژەڵ بەبێ سوود:**

پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە ئاژەڵ بکوژرێت بۆ خواردن نەبێت.

نسائی و ئیبنوحیببان ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من قتل عصفوراً عبثاً عجَّ إلي الله يوم القيامة، يقول: يارب، إن فلاناً قتلني عبثاً ولم يقتلني منفعة)[1].

واتە: هەرکەس چۆلەکەیەك بە بێ هوودە بکوژێت، ڕۆژی دوایی بە دەنگی بەرز سکاڵاو هاوار ئەکات بۆ لای خوا وئەڵێت: ئەی پەروەردگار فڵانە کەس منی بەبێ هوودە کوشت نەك بۆ کەڵك و سوود.

وە موسلیم ئەگێڕێتەوە لە ئیبنو عەبباسەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا تتخذوا شيئاً فيه الروحُ غرضاً)[2].

واتە: هەرشتێك گیانی تێدابێت مەیکەنە نیشانە.

جارێ‌گیان پێغەمبەر ﷺ بە لای باڵندەیەکدا تێ پەڕی هەندێ کەس کردبوویانە نیشانە وبە تیر لێیان ئەدا، فەرمووی: (لعن الله من فعل هذا)[3].

واتە: نەفرینی خوا لەو کەسە بێت ئەو کارەی کردووە.

**مەرجەکانی ڕاوچی:**

ئەو ڕاوکەرەی کە حەڵاڵە خواردنی گۆشتی نەچیرەکەی بخورێت ئەبێ ئەومەرجانەی تێدا بێت کە لە سەربڕیندا هەیە، وەك ئەوەی ئەبێت موسڵمان یا خاوەن کتێبی ئاسمانی بێت. کەواتە نەچیری جولەکەو گاور وەك سەربڕاویان وایە.

وە هەروەها ئەوەی کە لە حوکمی گاورو جولەکەدایە وەك لە بابی سەربڕینی شەرعیدا ڕوون کراوەتەوە.

**ڕاوکردن بە چەکی بریندارکەر و بە گیان لەبەر :**

ڕاوکردن بە چەکی بریندارکەر ئەبێت، وەك ڕم وشمشێر و تیر و شێوەکانی، لەو بارەیەوە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَيَبْلُوَنَّكُمُ اللَّهُ بِشَيْءٍ مِنَ الصَّيْدِ تَنَالُهُ أَيْدِيكُمْ وَرِمَاحُكُمْ﴾ (المائدە/٩٤).

---

(١) أحمد (٢/١٦٦) والنسائي (٧/٢٠٧) وابن حبان (٥٨٤٩).

(٢) أحمد (١/٢٨٥) ومسلم (٥٨/١٩٥٧) والترمذي (١٤٧٥) والنسائي (٧/٢٣٩) وابن ماجه (٣١٧٨).

(٣) البخاري (٥٥١٥) ومسلم (١٩٥٨) والنسائي (٧/٢٣٨).

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوڕتان هێناوە بەتەئکید خوا تاقی‌تان ئەکاتەوە بە شتێك لە ڕاو کە لێتان نزیك ئەبێتەوە لەسەر غەیری عادەتی بەشێوەیەك ئەتوانن بەچکەکانی بەبێ سیلاح بگرن، و گەورەکانیش بە سیلاح.

وە ڕاو بەگیان لەبەریش ئەبێت. خوای گەورە لەو بارەیەوە ئەفەرموێت: ﴿يَسْأَلُونَكَ مَاذَا أُحِلَّ لَهُمْ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَمَا عَلَّمْتُمْ مِنَ الْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ اللَّهُ فَكُلُوا مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ﴾ (المائدە/٤).

واتە: پرسیارت لێ ئەکەن —ئەی محمد- کە خواردنی چیان بۆ حەڵاڵ کراوە؟ تۆش بڵێ: بۆتان حەڵاڵ کراوە شتە پاکەکان، و ئەو نەچیرانەی کە گیان لەبەر بۆتان پەیدا ئەکات ئەوانەی فێری ڕاوکراون وەك سەگ و فەهد و باز و ڕێتەی ئەوانە، کە فێریان ئەکەن ڕاوتان بۆ بکەن، لەوەی کە خوا فێری کردوون، جا گۆشتی ئەو نەچیرانە بخۆن کە بۆتان ئەگرن وناوی خوایان لەسەر بهێنن کاتێ بەرئاڵیان ئەکەن بۆ نەچیرەکە، وەلە خوا بترسن، چونکە بەڕاستی خوا لێ پرسینەوەی خێرایە.

وە لە ئەبوثەعلەبەی خشەنی‌یەوە کە فەرمویەتی: ووتم: ئەی نێرراوی خوا، ئێمە لە شوێنێکداین کە شوێنی ڕاوە بە تیروکەوانەکەم وسەگە فێرکراوەکەم وئەو سەگەم کە فێرنەکراوە ڕاوئەکەم کامیان چاکە بۆم کە ڕاوی پێ ئەکەم؟ فەرموی: (ماصدت بقوسك فذكرت اسم الله عليه فكل، وما صدت بكلبك غير المعلم فأدركت ذكاته فكل). رواه البخاري ومسلم[1].

واتە: هەرچیت ڕاوکرد بە تیروکەوانەکەت و ناوی خوات لەسەر هێنابوو بیخۆ، وەهەرچیت ڕاوکرد بە سەگە فێرنەکراوەکەت وپیاگەیشتی سەری بڕی هەر بیخۆ.

مەرجەکانی ڕاوکردن بە چەك:

ئەبێ ڕاوکردن بە چەك ئەم مەرجانەی خوارەوەی تێدابێت:

١- ئەبێ چەکەکە لاشەی نەچیرەکە ببڕێت و بەناو لەشیدا بڕوات، لە حەدیسەکەی عدی کوڕی حاتیم دا هاتووە کە ووتویەتی: ئەی نێرراوی خوا، ئێمە قەومێکین بە چەك ڕاوئەکەین چی بۆمان حەڵاڵە؟ فەرمووی: (يحل لكم كلُّ ما ذكَّيْتُمْ وما ذكرتُمُ اسم الله عليه فَخَزَقْتُمْ فكلوا)[2].

واتە: حەڵاڵە بۆتان ئەوانەی سەرتان بڕیون، وە ئەوەش کە ناوی خواتان لەسەر هێناوە، و بە تیرەکانتان بڕیوتانن و بریندارتان کردوون بیخۆن.

---

(١) البخاري (٥٤٨٧) ومسلم (١٩٣٠/٨).

(٢) أحمد (٣٧٩/٣).

شەوکانی فەرمویەتی: ئەم فەرمودەیە ئەبێتە بەڵگە کە ئەوەی ئیعتیباری بۆ ئەکرێت بڕین و کون کردنە با بەشتێکی قورسیش بێت.

کەواتە حەڵاڵە ئەوەی بە چەکی ئەمڕۆ ڕاوئەکرێت لە باروت و گوللە کە ئەتەقێنرێت، چونکە گوللە بە باشی لاشەی نەچیرەکە ئەبڕێت، لەبەرئەوە حوکمی چەکە کۆنەکانی بۆ ئەکرێت با ڕاوکەرەکە نەشگات نەچیرەکە سەربڕێت، بە مەرجێك ناوی خوای لەسەر هێنابێت حەڵاڵە.

بەڵام ئەو قەدەغەیەی هاتووە دەربارەی ئەو نەچیرانەی بە تفەنگ ئەکوژرێن وسەرنابڕرێن و وەك کوژراو بە دار حیساب ئەکرێن، ئەوە مەبەست لەو تفەنگانەیە کە گوللەکانی لە قوڕ دروست ئەکرێت، وە دائەنرێت هەتا وشك ئەبێتەوە ئینجا ئەهاوێژرێت. نەك ئەم تفەنگانەی کە ئەمڕۆ بەکاردێت و باروت و گوللەی قورقوشم ئەهاوێژێت.

وە ئیسلام چۆن نەهی لە خواردنی نەچیری ئەو قوڕە ووشکانە کردووە، بەو شێوەیەش نەهی لە بەکار هێنانی چەو و بەرد و ئەو شێوانە کردووە.

پێغەمبەر ﷺ بۆ شیکردنەوەی ئەوە ئەفەرموێت: (إنها لاتصيد صيداً ولا تَنْكَأُ عدواً، لكنها تكسر السِّنَّ وتفقأُ العين)[1].

واتە: ئەو جۆرە شتانە نەچیر ناکوژێت و دوژمن ناشکێنێت، بەڵکو ددان ئەشکێنێت وچاووکوێرئەکات. وەهەروەها حەرامە گۆشتی ئەوشتانەی بە شتی قورس ئەکوژرێن، وەك داردەست و جۆرەکانی، مەگەر پیابگات بە زیندوویی و سەری ببڕێت.

لە حەدیسەکەی عەدی دا هاتووە ئەڵێت وتم: من بە شتی کۆڵ ڕاو ئەکەم. فەرمووی: (وإذا رميت بالمعارض فخزق فكل، وإن أصابه بعرضه فلا تأكل)[2].

واتە: ئەگەر بەشتی کۆڵ یا پان ڕاوت کرد ونەچیرەکەی بڕی گۆشتەکەی بخۆ، بەڵام ئەگەر بە باری پانی کوشتی گۆشتەکەی مەخۆ.

٢- ئەبێ ڕاوچی‌یەکە لە کاتی هاویشتندا ناوی خوا بهێنێ، پێشەواکانی ئیسلام جیاوازیان نی‌یە لەوەدا کە ناوی خواهێنان دانراوە لە یاسای ئیسلامدا، بەپێی حەدیسەکەی ئەبوسەعلەبە کە لە پێشەوە باس کراوە وحەدیسەکانی تر، بەڵام لە حوکمی ناوی خوا هێناندا جیاوازیان هەیە.

---

(١) البخاري (٦٢٢٠) ومسلم (١٩٥٤/٥٥).

(٢) أحمد (٤/٣٧٧).

ئەبوثەور و شیعبی و داودی ظاهیری و کۆمەڵێك لە ئەهلی حەدیس بۆ ئەوە چوون کە ناوی خواهێنان مەرجە بۆ حەڵاڵ کردنی نەچیرەکە بە هەموو شێوەیەك، جا ئەگەر بە هەڵە یا بە قەستی وازی لێ هێنا نەچیرەکە حەڵاڵ نی‌یە . . . وە ئەوەش روون ترین ریوایەتە لە ئەحمەدەوە.

ئەبوحەنیفە فەرمویەتی: ناوی خوا هێنان لەکاتێکدا مەرجە ئەو کەسە بیری هەبێت، بەڵام ئەگەر بیری نەبوو نەچیرەکە حەڵاڵە، وەئەگەر بە قەستی وازی لێ هێنا حەڵاڵ نی‌یە. وە هەروەها مالیك ئەوەی وتووە لەو فەتوایەدا کە بەناوبانگە لێوەی.

وە شافیعی وکۆمەڵێك لە مالیکی‌یەکان فەرمویانە: ناوی خواهێنان سوننەتە، جا ئەگەر وازی لە وتنی هێنا با بە قەستیش بێت، نەچیرەکە حەرام نابێت وحەڵاڵە خواردنی گۆشتەکەی، وە ئەو فەرمانەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ناوی خواهێنان لەکاتی سەربریندا داویەتی بۆ واجبێتی نی‌یە و بۆ پەسەندی‌یە.

**مەرجەکانی ڕاو بە گیان لەبەر:**

وە ڕاوکردن بە گیان لەبەر وەك هەڵۆ وباز وفەهد وسەگ وشتی تر وئەوشتانەی توانای فێربوونیان هەیە دروستە بەم مەرجانەی خوارەوە:

١- گیان لەبەرەکە فێری ڕاوکردن بکرێت، ئەوەش بەوەدا ئەزانرێت کە فەرمانی پێ بکەیت فەرمانەکە بەجێ بهێنێت و ئەگەر لێی تورە بویت کپ بێت.

٢- ئەبێ نەچیرەکە بۆ خاوەنەکەی بگرێت ئەویش بەوەی لێی نەخوات، جا ئەگەر لێی خوارد بۆخۆی گرتووە و نەچیرەکە حەڵاڵ نی یە، لە حەدیسەکەی عدی کوری حاتیم دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: (إذا أرسلت كلابك المعلَّمة وذكرت اسم الله عليها فكل مما أمسكن عليك، وإن أكل الكلب فلا تأكل، فإني أخاف أن يكون مما أمسك على نفسه)[1].

واتە: ئەگەر سەگە فێرکراوەکانت تێ کرد و ناوی خوات هێنا گۆشتی ئەوانە بخۆ کە بۆ تۆی ئەگرێت، وە ئەگەر سەگەکە لێی خوارد تۆ لێی مەخۆ، چونکە ترسی ئەوەم هەیە کە بۆ خۆی گرتبێت.

٣- ئەبێ بەرەڵای بکات وناوی خوا بهێنێت، ناوی خوا هێنانەکە حوکمەکەی لە پێشەوە باس کرا، بەڵام گیان لەبەر تێ‌کردنەکە مەرجێکە لە مەرجەکانی ڕاوکردن، جا ئەگەر گیان لەبەرەکە لە خۆیەوە ڕاپەری بێ ئەوەی خاوەنەکەی تێی کردبێت یا بێ ئەوەی تێی بەردابێت لە لایەن ڕاوچی یەکەوە، ڕاوەکەی دروست نی یە، وە حەڵاڵ نی یە خواردنی گۆشتەکەی، لای مالیك و شافیعی و ئەبوپەور و خاوەن ڕاکان.

چونکە بۆ خۆی ڕاو کردووە بێ ئەوەی خاوەنەکەی بەرەڵای کردبێت و ناردبێتی، کەواتە دەستی ڕاوچی یەکەی تێدا نی یە و بۆ ئەو نی یە، چونکە فەرموودەکەی پێشووی بە سەردا سابت نابێت کە ئەفەرموێت: (إذا أرسلت كلابك المعلمة.....الخ) واتە ئەگەر ناردت . . جا مانای ئەو مەرجە ئەوەیە کە ئەوەی نەنێردرا وەك ئەوە نی یە.

وە عطاء و ئەوزاعی فەرمویانە: گۆشتی نەچیرەکە ئەخورێت ئەگەر خاوەنی بردبێتی بۆ ڕاوو فێرکراو بێت.

---

(١) البخاري (١٧٥) ومسلم (١٩٢٩/٢).

**هاوبەشی دوو گیانلەبەر لە ڕاوێکدا:**

ئەگەر دوو گیانەوەر هاوبەش بوون لە کوشتنی نێچیرەکەدا ئەوە حەڵاڵە ئەگەر هەریەکەیان خاوەنەکەی بەرەڵای کردبێت بۆ ڕاو، بەڵام ئەگەر یەکێکیان بەڕەڵا کرابوو ئەوی تریان خۆی پەلاماری دابوو ئەوە گۆشتی نەچیرەکە ناخورێت، بەپێی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی: (فإنما سميت على كلبك ولم تسم على غيره).

واتە: چونکە تۆ ناوی خوات هەر لەسەر سەگەکەی خۆت هێناوە، وە لەسەر سەگی ترت نەهێناوە.

**ڕاوکردن بە سەگی جولەکە و گاور:**

وە دروستە ڕاوکردن بە سەگی جولەکە و گاور، وە بە باز و هەڵۆکانیان ئەگەر هاتوو ڕاوچی‌یەکە موسوڵمان بوو، ئەوەش وەك چەقۆکەی وەهایە.

**گەیشتن بە نەچیرێك گیانی تێدا مابێت:**

ئەگەر ڕاوچی گەیشت بە نەچیر وگیانی تێدا مابوو بەڵام قورگی هەڵهاتبوو یا زگی دڕابوو ناو زگی دەرهاتبوو، لەم شێوەیەدا حەڵاڵە بێ سەربڕین.

بەڵام ئەگەر پێی گەیشتوو تەواو زیندو بوو ئەوە پێویستە لەم شێوەیەدا سەرببڕێت، وە بێ سەربڕین گۆشتەکەی حەرامە.

**دۆزینەوەی نەچیر بە مردویی دوای پێکاندنی :**

ئەگەر ڕاوچی نەچیرەکەی پێکاو لێی وون بوو، لەپاشاندا دۆزی‌یەوە بە مردویی گۆشتەکەی حەڵاڵە بە سێ مەرج:

١- لە بەرزایی‌یەوە هەڵنەدێرابێت یا لەناو ئاودا نەی دۆزیبێتەوە، چونکە لەوانەیە بە هەڵدێران یا بە نوقوم بوون مردبێت.

بوخاری و موسلیم لە عەدی کوڕی حاتیمەوە ئەگێڕنەوە کە ووتویەتی: پرسیم لە پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمووی: (إذا رميت بسهمك فاذكر الله، فإن وجدته قد قتل فكل إلا أن تجده قد وقع في ماء، فإنك لا تدري الماء قتله أو سهمُك)[1].

واتە: ئەگەر تیرەکەت هاویشت ناوی خوا بهێنە، ئەگەر بە کوژراوی دۆزیتەوە گۆشتەکەی بخۆ مەگەر دۆزیبێتەوە لە ئاودا بێت، چونکە نازانی ئاوەکە کوشتویەتی یا تیرەکەت.

---

(١) البخاري (٥٤٨٤) ومسلم (١٩٢٩/٧).

٢- نەبێ بزانێت کە تیرەکەی ئەو کوشتویەتی ونیشانەی تیری کەسی تر یا ئاژەڵی تری پێوە نەبێت، لە عەدی ڕیوایەت کراوە کە فەرمویەتی: ووتم: ئەی نێرراوی خوا، تیرەکەم ئەهاوم بۆ نەچیرەکە بەیانی کە ئەی دۆزمەوە تیرەکەی خۆمی پێوەیە ئەویش ﷺ فەرمووی: (إذا علمت أن سهمك قتله ولم تر فيه أثر سبع فكل)[١].

واتە: ئەگەر بۆت دەرکەوت تیرەکەت کوشتویەتی و هیچ نیشانەی دڕندەی پێوە نەبوو، گۆشتەکەی بخۆ.

وە لە ڕیوایەتێکی بوخاری دا هاتووە: عەدی فەرمویەتی: ئێمە کاتێ نەچیرەکە تیرباران ئەکەین دو سێ ڕۆژ بە دوایدا ئەگەڕێین لە پاشاندا ئەی دۆزینەوە بە مردووی و تیرەکەی پێوەیە، ئەویش ﷺ فەرمووی: ئەگەر ویستی بیخوات[٢].

٣- نەبێ ئەو نەچیرە بۆگەنی نەکردبێت، ئەگەر بۆگەنی کردبوو ئەوە لە شتە قێز لێ کراوەکانە کە خواردنی زیانی هەیە و سروشتی مرۆڤ بێزی لێ ئەکاتەوە.

لە ئەبی ثەعلبەی خوشەنی‌یەوە ڕیوایەت کراوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا رميت بسهمك فغاب ثلاثة أيام وأدركته فكله ما لم ينتن) أخرجه مسلم[٣].

واتە: ئەگەر تیرت هاویشت بۆ نەچیرەکە و تا سێ ڕۆژ وون بوو پاشان دۆزیتەوە بیخۆ ئەگەر بۆگەنی نەکردبوو.

**قوربانی (الأضحية)**

**پێناسەکەی:**

قوربانی ناوە بۆ ئەو شتانەی کە سەرئەبڕرێن لە ووشتر و ڕەشەووڵاغ و مەڕ ڕۆژی سەربڕین و ڕۆژانی جەژنی قوربان بە مەبەستی نزیك بوونەوە لە خواوە.

دانانی لە یاسای ئیسلام دا: خوای گەورە قوربانی کردنی داناوە بە ئایەتی: ﴿إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ،فَصَلِّ لِرَبِّكَ وانْحَرْ، إِنَّ شَانِئَكَ هُو الأَبْتَرُ﴾ (الكوثر: ٣-١).

(١) الترمذي (١٤٦٨).

(٢) البخاري (٤٥٨٥).

(٣) مسلم (١٩٣١/٩) وأحمد (١٩٤/٤) وأبوداود (٢٨٦١) والنسائي (١٩٤/٧).

واتە: ئێمە -ئەی محمد- خێری زۆرمان بە تۆ بەخشیوە لە دنیاو ڕۆژی دوایی دا، لەوانە چەمی کەوسەرە لە بەهەشتدا، جا تۆش هەر بۆ پەروەردگارت نوێژ بکە و تەنها بۆ ئەو سەربڕە، بەڕاستی ئەوەی ڕقی لێتەو گاڵتەت پێ ئەکات، ئەو دوابڕاوە و شوێنەواری نامێنێ.

وە هەروەها بە ئایەتی: ﴿وَالْبُدْنَ جَعَلْنَاهَا لَكُمْ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ﴾ (الحج: ٣٦).

واتە: ئێمە سەربڕینی ووشتر و مانگامان بۆ ئێوە کردووە بە یەکێ لە دروشمەکانی دینی خوا، بۆ ئەوەی پێی نزیك ببنەوە بۆ لای خوا، لە دنیادا سوودیان هەیە بۆتان لە ڕۆژی دوایشدا پاداشتان هەیە بە سەربڕینەکەی.

وە سابتە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە قوربانی کردووە و موسوڵمانانیش کردویانە و هەموو کۆن لەسەر قوربانی کردن.

**چاکێتی قوربانی کردن:**

ترمذي لە عائیشەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ما عمل آدمي من عمل يوم النحر أحب إلي الله من إهراق الدم. إنها لتأتي يوم القيامة بقرونها وأشعارها وأظلافها، وإن الدَّمَ ليقعُ من الله بمكانٍ قبل أن يقع علي الأرض، فطيبوا بها نفساً)[1].

واتە: ئادەمیزاد لە ڕۆژی جەژنی قورباندا کارێکی نەکردووە چاکتربێت لە خوێن ڕشتن (واتە قوربانی کردن)وە ئەو ئاژەڵە کە کراوەتە قوربانی لە ڕۆژی دواییدا بە شاخ و موو و سمەکانیەوە دێت، وە خوێنەکە ئەکەوێتە شوێنێك نزیك لە خوا پێش ئەوەی بکەوێتە سەرزەوی (واتە زوو قەبوڵ ئەبێت) کەواتە دڵ خۆش بن، و بە دڵ قوربانیەکە بکەن.

**حوکمی قوربانی کردن:**

قوربانی کردن سوننەتێکی جەخت لێ کراوە، وە واز لێ هێنانی کەراهەتی هەیە بۆ ئەو کەسانەی توانایان بە سەریدا هەیە، بەپێی فەرمودەی ئەنەس کە بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دوو بەرانی بەڵەکی شاخ داری کردۆتە قوربانی بە دەستی خۆی، ناوی خوای هێناوەو (الله أكبر)ی کردووە[2].

---

(١) الترمذي (١٤٩٣) وابن ماجه (٣١٢٦).

(٢) البخاري (٥٥٦٥) ومسلم (١٩٦٦/١٨).

وە موسلیم لە ئوموسەلەمەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذا رأيتم هلال ذي الحجة وأراد أحدكم أن يضحي فليمسك عن شعره وأظفاره)[1].

واتە: ئەگەر هیلالی مانگی ژی حیججەتان بینی و یەکێکتان ویستی قوربانی بکات با موونینۆکی خۆی کورت نەکاتەوە.

وە کە ئەفەرموێ (وویستی) بەلگەیە کە قوربانی کردن سوننەتە نەك واجب.

وە ئەگێڕنەوە لە ئەبوبەکر وعومەرەوە کە ئەوان قوربانیان نەئەکرد لە جیاتی خێزانەکانیان لە ترسی ئەوەی نەك ئەو کارە بە واجب بزانرێت.

**کەی واجب ئەبێ :**

بە یەکێ لەم دوو کارە نەبێت واجب نابێت:

١- نەزری بکات لەسەر خۆی. بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی: (من نذر أن يطيع الله فليطعه)[2].

واتە: هەرکەس لەسەر خۆی نەزر بکات خواپەرستییەك بکات با بەجێی بگەیەنێت.

وە هەتا ئەگەر نەزرکەرەکە بشمرێت دروستە ئەو حەیوانەی خۆی دیاری کردووە پێش مردنی لە جیاتی ئەو بکرێ بە قوربانی و نەزرەکەی بەجێ بێت.

٢- ئەگەر بڵێت: ئەمە بۆ خوا، یا ئەمە بۆ قوربانی. وەلای مالیك ئەگەر بە نیازی قوربانی بیکڕێت واجب ئەبێت.

**حیکمەتی قوربانی:**

قوربانی کردن کە خوا دایناوە بۆ زیندوو کردنەوەی یادی ئیبراهیمە ویارمەتی دانی هەژارانە لە ڕۆژی جەژندا، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنما هي أيام أكل وشربٍ وذكر لله عزوجل)[3].

واتە: ئەم ڕۆژانەی جەژن ڕۆژی خواردن و خواردنەوەن و ڕۆژی یادی خوا کردنە.

---

(١) مسلم (١٩٧٧/٤١).

(٢) أحمد (٤١/٦) والبخاري (٦٦٩٦) وأبوداود (٣٢٨٩) والترمذي (١٥٢٦) والنسائي (١٧/٧) وابن ماجه (٢١٢٦).

(٣) النسائي في الكبرى (٢٩٠٠) والبيهقي (٢٩٨/٤).

**قوربانی به چی ئه‌کرێت؟**

قوربانی به‌ووشتر ورِه‌شه‌وولاّغ و ئاژه‌ڵ نه‌بێت ناکرێت، وه به‌و سیانه نه‌بێت بری ناکه‌وێت، خوای گه‌وره ئه‌فه‌رموێت: ﴿لِيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَى مَا رَزَقَهُمْ مِنْ بَهِيمَةِ الأَنْعَامِ﴾ (الحج/٣٤).

واته: بۆ ئه‌وه‌ی ناوی خوا بهێنن له‌سه‌ر ئه‌و ئاژه‌ڵانه‌ی خوا پێی به‌خشیون کاتی سه‌ربڕین.

وه له مه‌ڕدا به‌رخی ته‌مه‌ن شه‌ش مانگ (به لای حه‌نه‌فی‌یه‌وه، وه به‌لای شافیعی‌یه‌وه یه‌ك ساڵ) دروسته بۆ قوربانی، وه ته‌مه‌ن یه‌ك ساڵ له‌بزن دا، وه‌له ڕه‌شه‌وولاّغدا ته‌مه‌ن دوو ساڵ، وه‌له ووشتردا ته‌مه‌ن پێنج ساڵ. نێر ومێ‌یان وه‌ك یه‌كه.

١- ئه‌حمه‌د و ترمذی گێڕاویانه‌ته‌وه له ئه‌بوهوره‌یره‌وه كه فه‌رمویه‌تی: گوێم له پێغه‌مبه‌ر ﷺ بووه ئه‌یفه‌رموو: (نعمت الأضحية الجذعة من الضأن)[1].

واته: باشترین قوربانی كاوره له مه‌ڕدا[2].

٢- وه عوقبه‌ی كوڕی عامیر فه‌رمویه‌تی: ووتم: ئه‌ی نێرراوی خوا ﷺ، كاورێكم پێدراوه. فه‌رمووی: بیكه به قوربانی. موسلیم و بوخاری گێڕاویانه‌ته‌وه[3].

٣- وه موسلیم له جابیره‌وه ئه‌گێڕێته‌وه كه پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی: (ولا تذبحوا إلا مسنة، فإن تعسر عليكم فاذبحوا جذعة من الضأن)[4].

واته: (مسنة) نه‌بێت سه‌ری مه‌بڕن، ئه‌گه‌ر گران بوو له‌سه‌رتان كاورێك له مه‌ڕ سه‌ربڕن.

وه(مسنة)له ووشتردا ئه‌وانه‌ن كه ته‌مه‌نیان پێنج ساڵ بێت وله گاو ومانگادا ئه‌وانه‌ن دوو ساڵ بن، وه‌له بزندا یه‌ك ساڵ، وه‌له‌مه‌ڕدا یا شه‌ش مانگ یا ساڵێكه ته‌مه‌نی به‌پێی جیاوازی زانایان. وه به (مسنة) (ثنية)ش ئه‌وترێت.

**ئاژه‌ڵی خه‌ساو بۆ قوربانی:**

خراپ نی‌یه ئاژه‌ڵی خه‌ساو بكرێت به قوربانی.

---

(١) أحمد (٢/٤٤٥) والترمذي (١٤٩٩).

(٢) كه شه‌ش مانگ ته‌واو ده‌كات لای حه‌نه‌فی‌یه‌كان، و لای شافیعی‌یه‌كان یه‌ك ساڵ.

(٣) البخاري (٥٥٤٧و٥٥٥٥) ومسلم (١٩٦٥/١٥و١٦).

(٤) أحمد (٣/٢٣٢) ومسلم (١٩٦٣/١٣) وأبوداود (٢٧٩٧) والنسائي (٧/٢١٨) وابن ماجه (٣١٤١).

ئەحمەد لە ئەبورافیعەوە گێڕاویەتی‌یەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ دوو بەرانی بەڵەکی شاخداری خەساوی کردە قوربانی چونکە گۆشتەکەی بەتامتر و خۆشتر بوو[1].

**ئەوانەی دروست نی‌یە بکرێن بە قوربانی:**

لەمەرجەکانی قوربانی ئەوەیە کە بێ عەیب بێت، کەواتە دروست نی‌یە قوربانی کردن بە ئاژەڵی عەیبدار وەك:

١- نەخۆش کە نەخۆشی‌یەکەی دیاربێت.

٢- کوێر کە کوێری‌یەکەی دیاربێت.

٣- شەل کە شەلی‌یەتی دیار بێت.

٤- لات بە شێوەیەك قەڵەو نەبێتەوە و عەقلی لە دەست دابێت لەبەر لاتی.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أربعة لاتجزئ في الأضاحي: العوراء البين عورها، والمريضة البين مرضها، والعرجاء البين ظلعها، والعجفاء التي لا تنقي) (رواه الترمذي وقال: حسن صحيح)[2].

واتە: چوار جۆر دروست نین بۆ قوربانی: کوێرێك کوێرێتی‌یەکەی دیار بێت ونەخۆشێك نەخوشی‌یەکەی دیاربێت وشەلێك کە شەلی‌یەکەی دیاربێت و لاتێك کە قەڵەو نەبێتەوە.

٥- کوڵ بەشێوەیەك بەشی زۆری گوێی یا شاخی ڕۆشتبێت.

هەروەها دان کەوتوو شاخ شکاو و کوێر و حەیوانێك کە لە لەوەڕگادا بسوڕێتەوەو نەلەوەڕێ، وگەڕ کە گەڕی‌یەکەی زۆربێت ئەخرێتە پاڵ ئەو.

بەڵام کوڵ وکلك بڕاو و ئەوانەی گوێچکەیان بۆ دروست نەکراوە، و ئەوانەی گوێ و دوگیان بۆ دروست نەکراوە یان نەماوە قەیناکات.

وە ڕاسترین قسە لای شافیعی‌یەکان ئەوەیە کە دوگ بڕاو وگوان بڕاو دروست نین بۆ قوربانی چونکە بەشێکی لەشی کە ئەخورێت ڕۆیشتووە، وە هەروەها کلك بڕاو. وە شافیعی فەرمویەتی: دەربارەی ددان لە پێغەمبەرەوە ﷺ هیچمان لەبەر نی‌یە.

---

(١) أحمد (٦/٨).

(٢) أحمد (٤/٣٠١) وأبوداود (٢/٢٨٠٢) والترمذي (١٤٩٧) والنسائي (٧/٢١٤-٢١٥) وابن ماجه (٣١٤٤).

**کاتی سەربڕین:**

وە مەرجە کە قوربانی‌یەکە سەرنەبڕرێت دوای ڕۆژ هەڵاتن نەبێت لە ڕۆژی جەژندا، وەئەوەندەش بەسەر هەڵاتنەکەیدا بڕوات کە نوێژی جەژنی تێدا بکرێت، وە دوای ئەوە دروستە لە سێ ڕۆژەکەی تردا بە شەوبێت یا بە ڕۆژ سەربڕبڕێت، وەکاتەکەشی بە تەواوبوونی ڕۆژی جەژن کۆتایی دێت.

لە بەڕائەوە خوا لیٌی ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إن أول ما نبدأ به في يومنا هذا أن نصلي ثم نرجع فننحر، فمن فعل ذلك فقد أصاب سنتنا، ومن ذبح قبلُ فإنما هو لحم قدمه لأهله ليس من النسك في شيء)[1].

واتە: یەکەم شت لەم ڕۆژەماندا (ڕۆژی جەژنی قوربان) کە دەستی پێ ئەکەین ئەوەیە نوێژ بکەین و پاشان بگەڕێینەوە قوربانی‌یەکانمان سنگ هەڵبدڕین، جا هەرکەس بەو شێوەیەی کرد ئەوە ڕەفتاری ئێمەی پێکاوە، وە هەرکەس پێش ئەو کاتە قوربانی‌یەکەی سەربڕێت گۆشتێکی پێشکەش بە کەسوکاری کردووە و هیچ پەیوەندی نی‌یە بە قوربانی‌یەوە.

وە ئەبو بوردە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی جەژنی قوربان ووتاری بۆ داین وفەرمووی: (من صلي صلاتنا ووجه قبلتنا ونسك نسكنا فلا يذبح حتى يصلي)[2].

واتە: هەرکەس وەك ئێمە نوێژ بکات وروو بکاتە قیبلەکەمان و وەك ئێمە قوربانی بکات نابێت قوربانی سەربڕێت هەتا نوێژ نەکات.

هەر دوو شێخ موسلیم وبوخاری لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: (من ذبح قبل الصلاة، فإنما يذبح لنفسه ومن ذبح بعد الصلاة والخطبتين فقد أتم نسكه وأصاب سنة المسلمين)[3].

واتە: هەرکەس پێش نوێژ قوربانی‌یەکەی سەربڕێت ئەوە بۆ خۆی سەربڕیوە، وەهەرکەس دوای نوێژ ودوو ووتارەکە سەری ببڕێ ئەوە خواپەرستی‌یەکەی تەواوە و ڕەفتاری موسڵمانانی پێکاوە.

---

(١) البخاري (٥٥٤٥) ومسلم (١٦٩١/٦).

(٢) النسائي (٢٢٢/٧) وابن حبان (١٠٥٣).

(٣) البخاري (٥٥٤٦و٥٥٦١) ومسلم (١٩٦٢/١٠).

**قوربانی‌یەك بەسە بۆ خێزانێك:**

ئەگەر کەسێك مەڕێك یا بزنێکی کردە قوربانی، بۆ خۆی وخێزانەکەی ئەبێت. پیاوی صەحابە خوا لە هەموویان ڕازی بێت مەڕێکی ئەکردە قوربانی بۆ خۆی وخێزانەکەی. چونکە قوربانی سوننەتی کیفایەتە.

ئیبنوماجە و ترمذي کە بەصەحیحی زانیوە ئەگێڕنەوە کە ئەبوئەیوب فەرمویەتی: پیاو لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ مەڕێکی سەرئەبڕی بۆ قوربانی لە جیاتی خۆی و خێزانەکەی، ئەیان خوارد و بەشی خەلکیان لیٚ ئەدا هەتا خەلك کەوتنە شانازی کردن و وەك ئێستەی لیٚ هات کە ئەیبینی[1].

**هاوبەشی لە قوربانی دا دروستە:**

دروستە هاوبەشی کردن لە قوربانی دا ئەگەر ووشتر وڕەشەوولاغ بوو، مانگایەك یا ووشترێك بۆ حەوت کەس ئەبێت ئەگەر مەبەستیان قوربانی کردن بێت ونزیك بوونەوە لە خواوە.

لە جابیرەوە کە فەرمویەتی : لە حودەیبیـیەدا لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ قوربانی مان کرد ووشتر بۆ حەوت کەس ومانگا بۆ حەوت کەس. موسلیم وئەبوداود وترمذي گێڕاویانەتەوە[2].

**دابەش کردنی گۆشتی قوربانی:**

سوننەتە بۆ ئەو کەسەی قوربانی ئەکات خۆی لە قوربانی‌یەکەی بخوات وبەشی خزمانی لیٚ بدات ولێشی بکات بە خێر بۆ هەژاران. پێغەمبەر ﷺ فەرمووبەتی: (كلوا وأطعموا وادخروا)[3].

واتە: لیٚی بخۆن وبەشی خەلکی لیٚ بدەن ولیٚی هەلگرن.

زانایان ووتویانە: وا باشە سیٚیەکی بکات بە خێر و سیٚیەکی بخوات و سیٚیەکی هەلگرێت، وە دروستە لە شارێکەوە ببرێت بۆ شارێکی تر، وەدروست نی‌یە فرۆشتنی گۆشت و پێستەکەی (وە نابێت لەجیاتی کریٚ بەشی قەصاب هیچ بدات، بەلام بۆی هەیە کریٚی بداتیٚ لە جیاتی کارەکەی). بەلکو بۆی هەیە بیکاتە خێر یا سوودی لیٚ وەربگرێت.

---

(١) الترمذي (١٥٠٥) وابن ماجه (٣١٤٧).

(٢) مسلم (١٣١٨) وأبوداود (٢٨٠٧و٢٨٠٩) والترمذي (٩٠٤).

(٣) البخاري (٥٥٦٧) ومسلم (١٩٧٢).

لای ئەبوحەنیفە دروستە فرۆشتنی پێستەکەی، و نرخەکەی بکرێت بەخێر یا بە پێستەکە شتێك بکرێت سوودی بۆ ماڵەکەی هەبێت.

**قوربانی‌کەر خۆی قوربانی‌یەکە سەربیڕێت:**

سوننەتە بۆ ئەوکەسەی ئەزانێ سەربیڕێت خۆی قوربانی‌یەکەی خۆی سەربیڕێت و بڵێت: (بسم الله والله أكبر) خوایە ئەوە لە بریتی خۆم ـناوی خۆی ئەهێنێ﴾ چونکە پێغەمبەر ﷺ بەرانێکی کردە قوربانیو فەرمووی: (بسم الله والله أكبر، اللهم هذا عني وعن من لم يضح من أمتي) رواه أبوداود والترمذي[1].

واتە: بەناوی خوا، خوا لە هەمموو شت گەورەترە، خوایە ئەمە بۆ خۆم و ئەوکەسانەی قوربانیان نەکردووە لە ئۆمەتم.

بەڵام ئەگەر سەربڕینی نەئەزانی ئەبێ ئامادەبێت و چاوی لیّی بێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ بە فاطیمەی فەرموو: (يا فاطمة، قومي فاشهدي أضحيتك فإنه يغفر لك عند أول قطرة من دمها كل ذنب عملته، وقولي: ﴿إن صلاتي و نسكي و محياي ومماتي لله رب العالمين، لاشريك له وبذلك أمرت وأنا أول المسلمين﴾ فقال أحد الصحابة يا رسول الله، هذا لك ولأهل بيتك خاصة أو للمسلمين عامة؟ قال: رسول الله ﷺ بل للمسلمين عامة[2].

واتە: فەرمووی: فاطمە هەڵسە قوربانی‌یەکەت ببینە چونکە هەر لە یەکەم دڵۆپە خوێنەوە خوا لە هەمموو ئەو گوناهانەت خۆش ئەبێت کە کردووتە، وە بڵێ: بە ڕاستی نوێژ و سەربڕینم و ژیان ومردنم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانە کە هاوبەشی نی‌یە، وە منیش بەوە فەرمانم پێ کراوە و من یەکەم کەسم کە ملکەچم بۆ فەرمانەکانی خوا. یەکێك لە صەحابەکانی ووتی: ئەی نێرراوی خوا، ئەوە تایبەتە بۆ خۆت وخێزانەکەت یا بۆ هەمموو موسوڵمانانە بەگشتی؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵکو بۆ هەمموو موسوڵمانانە بە گشتی.

---

(١) أبوداود (٢٨١٠) والترمذي (١٥٢١).

(٢) الحاكم (٤/٢٢٢).

**العقیقة**

**پێناسەکەی:**

**عەقیقە ئەو ئاژەڵەیە کە بۆ منداڵی لەدایك بوو سەردەبڕێت.**

**خاوەنی کتێبی لۆغەتی (مختار الصحاح) ئەڵێ: بەو مووە ئەڵێن بەسەری لەدایك بووەوەیە لەکاتی لەدایك بووندا، ئادەمی بێت یان ئاژەڵ، وە هەر لەوەوە ئەو ئاژەڵەی کە بۆ منداڵی تازە بوو سەرئەبڕێت ڕۆژی حەوتەمی ناونراوە عەقیقە.**

**حوکمەکەی:**

**سوننەتێکی جەخت لەسەر کراوە ئەگەر باوکەکەش دەست کورت بێت.**

**پێغەمبەر ﷺ خۆی کردویەتی، وە صەحابەکان کردویانە، خاوەنی سوننەکان ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ بۆ حەسەن وحسێن هەریەکی بەرانێکی سەربڕی[1].**

**وە لەیس و داودی ظاهیری بە واجبی ئەزانن، وەهەرچی حوکمی قوربانی هەیە لەحەوتەمیش دا هەیە. ئەوە نەبێت کە حەوتەم دروست نی‌یە بە شەریکی بکرێت.**

**چاکێتی حەوتەم:**

**خاوەن سونەنەتەکان لە سەمورەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:**

**١- (کل مولود رهینة بعقیقته تذبح عنه یوم سابعه ویُحْلَق ویسمَّی)[2].**

**واتە: هەموو منداڵێکی تازەبوو پەروەردەبوونی بە شێوێکی چاك و تەواو و پاراستنی بەستراوە بە حەوتەمەکەیەوە، ڕۆژی حەوتەم بۆی سەربېڕێت و سەری بتاشرێت و ناوی لێ بنرێت.**

**٢- وە لە سەلمانی کوڕی عامیری ضەبی‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مع الغلام عقیقته، فأهریقوا علیه دماً، وأمیطوا عنه الأذی). رواه الخمسة[3].**

**واتە: حەوتەم لەگەڵ منداڵدایە، کەواتە خوێنی بۆ بڕێژن و پیسی و پۆخڵی لێ دوور بخەنەوە.**

---

(١) أبوداود (٢٨٤١)، من حدیث ابن عباس.

(٢) أبوداود (٢٨٣٨) والترمذي (١٥٢٢) والنسائي (٧/١٦٦) وابن ماجه (٣١٦٥) وأحمد (٥/١٧).

(٣) البخاري (٥٤٧٢) وأبوداود (٢٨٣٩) والترمذي (١٥١٥) والنسائي (٧/٦٤) وابن ماجه (٣١٦٤).

**ئەوەی بۆ کوڕ وکچ سەرئەبڕرێت:**

چاکتر وایە بۆ کوڕ دوو مەڕی وەك یەك لە تەمەن و شێوەدا سەربېڕرێت و بۆ کچ یەك سەر.

لە ئوموکەرزی کەعبی‌یەوە کە فەرمویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو ئەیفەرموو: (عن الغلام شاتان متكافئتان وعن الجارية شاة)[1].

واتە: بۆ کوڕ دوو مەڕی هاوتاڵە تەمەن وشێوەدا و بۆ کچ مەڕێك. وەدروستە مەڕێکیش سەربېڕرێت بۆ کوڕ لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی بۆ حەسەن و حوسەین خوایان لێ ڕازی بێت. وەك لە پێشەوە باس کراوە لە فەرمودەکەدا.

**کاتی سەربڕین:**

سەربڕینەکە لە ڕۆژی حەوتەمدا ئەبێت ئەگەر گونجا، ئەگینا لە ڕۆژی چواردەهەمدا ئەبێت، یا لەڕۆژی بیستویەکەمدا ئەبێت لە ڕۆژی لە دایك بونی‌یەوە، جا ئەگەر نەگونجا لە هەر ڕۆژێك دابێت ئەبێت، لە حەدیسەکەی بەیهەقی دا هاتووە: (تذبح لسبع، ولأربع عشر، و لإحدى وعشرين).

واتە: لە ڕۆژی حەوتەمدا سەرئەبڕرێت یا ڕۆژی چواردەهەم یا ڕۆژی بیست ویەکەم.

**کۆکردنەوەی قوربانی وحەوتەم :**

حەنبەلی‌یەکان وتویانە: وەئەگەر ڕۆژی قوربان و ڕۆژی حەوتەم یەکیان گرت ئەتوانرێت تەنها ئاژەڵێك سەربېڕرێت، وەك چۆن ئەگەر ڕۆژی جەژن وهەینی یەکیان گرت یەك جار بۆ هەردووکیان خۆ ئەشۆررێت .

**ناو نان و سەرتاشین:**

وە سوننەتە بۆ منداڵ ناوی خۆش هەڵبژێررێت وسەری بتاشرێت وقژەکەی بە زیو کیشانە بکرێت و بدرێت بە صەدەقە ئەگەر گونجا، بەپێی ئەوەی ئەحمەد لە ئیبنوعەبباسەوە گێڕاویەتی‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ بۆ حەسەن مەڕێکی سەربڕی وفەرمووی: (يا فاطمة احلقي رأسه وتصدقي بوزنه فضة علي المساكين) فوزناه فكان وزنه درهماً أو بعض درهم[2].

واتە: ئەی فاطمە سەری بتاشە وبەزێو بیکێشە و بەسەر هەژاراندا دابەشی بکە. ئەڵێت: کێشانەمان کرد درهەمێك یا چەند درهەمێك وەزنی هەبوو.

---

(١) أحمد (٦/٤٢٢) والترمذي (١٥١٦).

(٢) الترمذي (١٥١٩) والحاكم (٤/٢٣٧).

**خۆشترین ناو:**

خۆشترین ناو(عبدالله و عبدالرحمن)ە بەپێی حەدیسەکەی موسلیم، وە ڕاستترینیان (هەمام حاریثە)، وەك لە فەرمودەی صەحیحدا سابتە.

وە دروستە ناونان بە ناوی فریشتەوە، وەهەروەها بە ناوی پێغەمبەرەکانەوە، وەك طه و یاسین.

وە ئیبنوحەزم فەرمویەتی: زانایان ڕێك کەوتوون لەسەر حەرامێتی هەموو ئەو ناوانەی عەبدایەتی جگە لە خوایان پێوە بێت وەك:

عبدالعز و عبدهبل وعبدعمر وعبد الكعبة جگە لە عبد المطلب.

**خراپی هەندێ ناو:**

پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە منداڵ بەم ناوانەی خوارەوە ناوبنرێت:

یەسار، ڕەباح، نەجیح و ئەفلەح، چونکە ئەمانە هۆیەکن لە هۆیەکانی ڕەش بینین، لە حەدیسەکەی سەمورەدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لاتسم غلامك یساراً ولارباحاً ولانجیحاً ولا أفلح، فإنك تقول: أثمَّ و -فلا یکون- فیقول: لا). رواه مسلم[1].

واتە: منداڵەکەت ناو مەنێ یەسار یا ڕەباح یا نەجیح یا ئەفلەح، چونکە تۆ کە ناوی ئەبەی و ئەڵێی: فلانە کەسی لێیە -جا کە لەوێ نەبێت- ئەڵێ: نە[2].

**بانگ دان بە گوێی منداڵدا :**

وە سوننەتە کە بانگ بدرێت بە گوێی ڕاستی منداڵدا، وە قامەت بدرێت بەگوێی چەپیدا بۆ ئەوەی یەکەم شتێك کە ئەدرێ بە گوێی دا ناوی خوا بێت.

ئەحمەد وئەبوداود و ترمذي کە بە صەحیحی داناوە ئەگێڕنەوە لە ئەبو ڕافیعەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەرم ﷺ بینیوە بانگی داوە بە گوێی حەسەنی کوڕی عەلیدا کاتێ فاطمە بووی خوا لێیان ڕازی بێت[3].

وە ئیبنوسوننی لە حەسەنی کوڕی عەلییەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من ولد له ولد فأذَّن في أذنه الیمنى وأقام في الیسرى لم تضره أم الصبیان)[4].

واتە: هەرکەس کوڕێکی بوو بانگی بەگوێی ڕاستیدا داو قامەتی کرد بەگوێی چەپیدا ئوموصوبییان (کە دەڵێن شەیتانەکەیەتی) زیانی پێ ناگەیەنێت.

**نە فەرەع هەیە نە عەتیرە:**

فەرەع: سەربڕینی یەکەم بەچکەی وشترە، عەرەب سەریان ئەبڕی بۆ بتەکانیان.

عەتیرە: ئەو ئاژەڵەیە لە مانگی ڕەجەبدا سەریان ئەبڕی بۆ گەورەیی ڕەجەب.

---

(١) مسلم (٢١٣٦/١١و٢١٣٧/١٢) وأبوداود (٤٩٥٨) والترمذي (٢٨٣٧).

(٢) یەسار لە ئاسانەوە هاتووە، ڕەباح لە قازانجەوە هاتووە، نەجیح واتە: سەرکەوتو، ئەفلەح واتە: ڕزگار بوو.

(٣) أبوداود (٥١٠٥) والترمذي (١٥١٤) وأحمد (٦/٩و٣٩١).

(٤) ابن السني (٦٢٣).

وەکاتێ ئیسلام هات نەهی کرد لەسەربڕینی ئەوشتانە لەبەر گەورەیی بتەکانیان. وەشێوەکانی سەردەمی نەفامی گۆڕی. وە بە ڕەوای دانا کە بە ناوی خواوە ئاژەڵ سەربڕێت.

ئەبی هورەیرە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لافرَع ولاعتيرة). رواه البخاري و مسلم[1].

واتە: نە فەرەع هەیە ونە عەتیرە.

وە نوبەیشە خوا لێی ڕازی بێت فەرمویەتی: پیاوێك هاواری کرد ووتی: ئەی نێرراوی خوا ئێمە لەسەردەمی نەفامیدا عەتیرەمان ئەکرد لە ڕەجەبدا ئێستە تۆ چ فەرمانێکمان پێ ئەکەی؟ فەرموی: (إذبحوا لله في أي شهرٍ كان، وبرُّوا لله وأطعموا).

واتە: تەنها بۆ خوا سەربڕن لە هەر مانگێکدا بێت، وە چاکە بکەن لە ڕێی خواداو خواردن بدەن بە خەڵك. کابرا ووتی: ئێمە فەرەعمان ئەکرد لەسەردەمی نەفامی دا ئێستا چ فەرمانێکمان پێ ئەکەی؟ فەرمووی: (في كل سائمة فرع تغذوه ماشيتك حتّي إذا استجمل ذبحته، فتصدقت بلحمه علي ابن السبيل، فذلك خير). رواه أبوداود والنسائي[2].

واتە: لە هەموو بەچکە ووشترێکدا کە تۆ پەروەردەی ئەکەیت لەناو ئاژەڵەکانتا تا کاتێك بوو بە وشتر سەری ئەبڕیت و گۆشتەکەی ئەبەخشیت بە ڕێبواران، ئەوە خێرە.

وە لە ئەبو ڕەزینەوە کە فەرمویەتی: ووتم: ئەی نێرراوی خوا، ئێمە لە مانگی ڕەجەبدا ئاژەڵمان سەرئەبڕی، بۆ خۆمان لێمان ئەخوارد و هەرکەس بهاتایە ئەمان دایە. فەرمووی: قەیناکە[3].

وە ئەحمەد ونەسائی لە حاریسی کوڕی عەمرەوە ئەگێڕنەوە کە خۆی گەیشتووە بە پێغەمبەر ﷺ لە حەجی ماڵ ئاواییدا. پیاوێك ووتی: ئەی نێرراوی خوا، ئەی فەرەع و عەتیرەکان؟ فەرمووی: (من شاء فرع ومن شاء لم يفرع، ومن شاء عتر ومن شاء من لم يعتر، في الغنم الأضحية)[4].

واتە: هەرکەس ئارەزوو بکات فەرەع بکات و هەرکەس ئارەزو بکات فەرع ناکات، وە هەرکەس ئارەزو بکات عەتیرە ئەکات، وە هەرکەس ئارەزوو بکات عەتیرە ناکات، و قوربانی لە مەڕدا هەیە.

---

(١) البخاري (٥٤٧٣) ومسلم (١٩٧٦/٣٨).

(٢) أبوداود (٢٨٣٠) والنسائي (٧/١٧١) وابن ماجه (٣١٦٧) وأحمد (٥/٧٦).

(٣) أحمد (٤/١٢و١٣) والنسائي (٧/١٧١).

(٤) أحمد (٣/٤٨٥) والنسائي (٧/١٦٨و١٦٩).

**سمینی گوێی منداڵ:**

لە کتێبەکانی حەنبەلی‌یەکاندا هاتووە: سمینی گوێی کچ دروستە بۆ گوارە و بۆ کوڕ کەراهەتی هەیە. وەلە فتواکانی قاصی خانی حەنەفی دا هاتووە: گوێ سمینی کچ ئەیناکە، چونکە لەسەردەمی نەزانیدا ئەکرا و پێغەمبەر ﷺ لێی قەدەغە نەکردوون.

**کەفالەت**

**پێناسەکەی:**

کەفالەت لە زمانی عەرەبی دا، گرتنەلایە. وەفەرموودەی خوا: ﴿وکفلها زکریا﴾ (آل عمران/۲۷). واتە: زەکەریا مەریەمی بۆ چاودێری کردن گرتە لای خۆی.

وە کەفالەت لە شەرعدا بریتی‌یە لە خستنە پاڵ و لکاندنی زیممەی کەفیل (دەستەبەر) بە زیممەی ئەو کەسەوە کە کەفالەتەکە کراوە لەبری ئەو لە داواکاری گیانێکدا یا قەرزێکدا یا لە عەینێکدا یا لە کارێکدا، ئەمە پێناسەی زانایانی حەنەفی‌یە.

بەڵام لە لای زانایانی تر پێناسەی ئەکەن بە لکاندنی دوو زیمە لە داواکاری و قەرزدا. وە بە کەفالەت حەمالەت و ضەمانەت و زەعامەتی پێ ئەوترێ.

وە ئەبێ لە کەفالەتدا کەفیل و ئەصیل و (مکفول لە) (مکفول بە) هەبن.

کەفیل ئەو کەسەیە کە هەڵئەستێ بە جێبەجێ کردنی ئەو شتە یا ئەو کارەی کە بۆی بووەتە کەفیل، وە ئەبێ ئەو کەسە بالغ و ژیر بێت وتوانای هەموو تەسەروفێکی هەبێت لە ماڵەکەیدا و ڕازی بێت بەو کەفالەتە، کەواتە نابێت کەفیل شێت بێت یا منداڵ، با منداڵێکی جیاکەرەوەش بێت، و بە کەفیل (ضامن) و زەعیم و حەمیل و قەبیل ئەوترێت.

وە ئەصڵ کە قەرزدارە ئەوکەسەیە کە کەفالەتەکەی لەبری کراوە، وە مەرج نی‌یە بالغ بێت و ژیر بێت، هەروەها مەرج نی‌یە ئامادە بێت و ڕازی بێت بەو کەفالەتە، بەڵکو دروستە کەفالەت کردن بۆ منداڵ و شێت وغایب، بەڵام کەفیلەکە کاتێ کەفیلی کرد لەبری ئەمانەو ماڵیدا، نابێت بگەڕێتەوە بۆ لای ئەمان بۆ پرس و ڕا وەرگرتن، بەڵکو بە بەخشەر دائەنرێت لە حاڵەتێکدا نەبێت کە کەفیلی‌یەکە بۆ منداڵێك گیرابێت کە ڕێی پێ درابێت بازرگانی بکات وئەو کەفالەتەش بە فەرمانی منالەکە خۆی بێت.

وه (مکفول له) ئەوەی کەفیلەکەی بۆ گیراوە خاوەن قەرزەکەیە، کە ئەبێ کەفیل بیناسێت، چونکە خەڵك جیاوازیان هەیە لە داواکردنی قەرزدا، هەیانە لێ بوردەیە و هەیانە توندوتیژە لە داواکردندا.

وه مەبەستەکانیش بەپێی لێ بوردنی خاوەن قەرز یا توند وتیژی لە وەرگرتنەوەدا ئەگۆڕێت، وە دەستەبەری کردنی بەبێ ناسینی خاوەن قەرز غەرەرە. بەڵام مەرج نی یە ئەو کەسە بناسێت کە لەبەر ئەو کەفیلەکە گیراوە کە قەرزدارەکەیە.

وه (مکفول به) ئەوەی کەفیلەکەی لە پێناودا ئەگیرێت یا گیانە یا قەرزە یا شتێکە یا کارێکە کە ئەبێت جێبەجێ بکرێت لە جیاتی ئەو کەسەی کەفیلی یەکە لەبری ئەو ئەکرێ، کە چەند مەرجێکی هەیە لە شوێنی خۆی دا باس ئەکرێت.

**دانانی:**

کەفالەت دانراوە بەپێی کیتاب وسوننەت وئیجماعی زانایان، لە کیتابدا خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قَالَ لَنْ أُرْسِلَهُ مَعَكُمْ حَتَّى تُؤْتُونِ مَوْثِقًا مِنَ اللَّهِ لَتَأْتُنَّنِي بِهِ﴾ (یوسف/٦٦).

واتە: من یوسف لەگەڵتان نانێرم هەتا پەیمانم ئەدەنێ و سوێندم بۆ ئەخۆن بەخوا کە بۆم ئەگێڕنەوە بە سەلامەتی.

وه هەروەها ئەفەرموێت: ﴿وَلِمَنْ جَاءَ بِهِ حِمْلُ بَعِيرٍ وَأَنَا بِهِ زَعِيمٌ﴾ (یوسف/٧٢) واتە: بۆ ئەو کەسەی بیهێنێتەوە باری وشترێك خواردەمەنی بۆ هەیە، وە من دەستەبەر و کەفیلم کە باری وشترەکەی بدرێتێ.

وه لەسوننەتدا هاتووە لە ئەبی‌ئومامەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الزعيم غارم) رواه أبوداود والترمذي وحسنه، وصححه ابن حبان[1].

واتە: کەفیل دەستەبەر و (ضامن)ە.

وه زانایان هەموو لەسەر ئەوە ئیجماعیان هەیە کە کەفالەت دروستە، وە هەتا ئێستاش موسڵمانەکان ئەبنە کەفیلی یەکتری لەسەردەمی پێغەمبەرەوە هەتا سەردەمی ئێمە بێ ئەوەی کەس لە زانایان پێچەوانەیان بکات.

---

(١) أبوداود (٣٥٥٩) والترمذي (١٢٦٥) وابن حبان (٥٠٩٤).

**کەفالەتی پێك هاتوو بەستراوە و کات بۆدانراو:**

**کەفالەت بە پێك هاتوویی یا بەستراوەیی یا بە کات بۆ دانراوی دروستە.**

**کەفالەتی پێك هاتوو وەك ئەوەی کەفیلەکە بڵێت: من ئەبمە دەستەبەری فلانەکەس ئێستا و کەفیلی ئەکەم.**

**زانایان فەرمویانە: ئەگەر پیاوێك ووتی: کۆڵی فلانەکەسم هەڵگرت یا دەستەبەری بووم، یا من لە جیاتی ئەوم، یا ئەبمە زامنی، یا بڵێت: لەسەر منە چیت لایەتی، یان بۆ من، یان بڵێت: ئەوە کەفالەتەکەیم وەرگرت ئەمانە هەموو کەفالەتن .**

**وە هەرکاتێك کەفالەتەکە پێك هات وەك قەرزی لێ دێت بۆ حازرو دوواخستنو کردنی بە (قسط).**

**ئەوە نەبێت ئەگەر قەرزەکە حاڵ بوو بەڵام کەفیلەکە بەو مەرجە ببێتە کەفیل کە قەرزەکە دووا بخرێت بۆ کاتێکی دیاری کراو ئەو مەرجەش دروستە.**

**بەپێی ئەوەی ئیبنوماجە ئەگێڕێتەوە لە ئیبنوعەبباسەوە**

**کە پێغەمبەر ﷺ دە دیناری کابرای‌یەکی خستە سەر خۆی کە بیداتەوە بۆی و داوای لە خاوەن قەرزەکە کرد هەتا مانگێ لەسەری بووەستێ، ئینجا دایەوە[1].**

**ئەمەش ئەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەگەر قەرز حاڵ بوو وە کەفیلەکە بووە دەستەبەری بۆ ماوەیەکی دیاری کراو دروستە وە داوای لێ ناکرێت هەتا کاتەکە نەیات.**

**بەڵام کەفیلی بەستراوە وەك ئەوەی بڵێت: ئەگەر قەرزت دا بە فلانەکەس من ئەبمە زامنی، وەك لە ئایەتە پیرۆزەکەدا هاتووە کە ئەفەرموێت: ﴿ولمن جاء به حمل بعير﴾ (یوسف/٧٢).**

**واتە: وە بۆ ئەوکەسەی بیهێنێتەوە باری ووشترێکی بۆ هەیە.**

**وە ئەوەی بۆ کاتە وەك بڵێت: ئەگەر مانگی ڕەمەزان هات من زامنی ئەبم، ئەمەش (مژهب)ی ئەبوحەنیفەو هەندێ لە حەنبەلی‌یەکانە.**

**وە شافیعی فەرمویەتی: دروست نی‌یە بەستنەوە لە کەفالەتدا.**

**داواکردنی کەفیل و ئەصیل بەیەکەوە:**

**وە هەرکاتێك کەفالەتەکە پێك هات دروستە بۆ خاوەن هەق داوای هەقەکەی لە کەفیلەکەو ئەوکەسە بکات کە کەفیلەکەی بۆ گیراوە.**

---

(١) أبوداود (٣٣٢٨) وابن ماجە (٢٤٠٦).

وەك چۆن بۆی دروستە بەئارەزووی خۆی داوای هەرکامێکیان بکات لەبەر ئەوەی شوێنی ماف بۆتە چەند شوێن، وەك جەماوەری زانایان ڕایان لەسەرەیەتی.

**جۆرەکانی کەفالەت:**

کەفالەت دوو جۆرە:

یەکەم: کەفالەت بە گیان.

دووەم: کەفالەت بە ماڵ.

کەفالەت بە گیان: ئەمەش داواکردنە لە کەفیل کە ئەوکەسە ئامادە بکات کە بووەتە کەفیلی، وەئەم کەفالەتەش کاتێکە کە کەفیلەکە بڵێت: ئەبمە کەفیلی ئەوکەسە بە گیان و بە ڕووم، یا بڵێت: من کەفیلی فلان کەسم. وەئەو کەفالەتە دروستە ئەگەر ئەوکەسەی کەفیلەکەی بۆ ئەگیرێ مافی ئادەمیزادی بەسەرەوە بێت، وە مەرج نی یە بزانرێت چەندی‌یەتی ئەوەی لەسەری‌یەتی چونکە بە گیان و لاشە بووەتە کەفیلی نەك بە ماڵ.

بەڵام کەفیلی بۆ حەددێك لە حەددە شەرعی‌یەکان دروست نی‌یە، جا ئەو حەددە مافی خوا بێت وەك حەددی ئارەق خۆر یان مافی ئادەمیزاد بێت وەك حەددی تۆمەت هەڵبەستن (قذف).

ئەمەش (مذهب)ی بەشی زۆری زانایانە بەپێی حەدیسەکەی عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکی‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا كفالة في حدٍ) رواه البيهقي بإسنادٍ ضعيف وقال: إنه منكر[1].

واتە: بۆ حەد کەفیل دروست نی‌یە.

وە لەبەر ئەوەی ئەسڵ لە حەددا ئەوەیە بە شوبهە لابرێ و دوور بخرێتەوە، کەوایە وەخۆگرتن نایگرێتەوە.

وە ناتوانرێت لەسەر کەسێکی تر بێجگە لە تاوانبار بەجێ بێت.

وە لای هاوەڵەکانی شافیعی کەفالەت دروستە بۆ ئامادە کردنی ئەکەسەی سزای ئادەمیزادی لەسەرە، وەك تۆڵە (قصاص) و حەددی تۆمەت هەڵبەستن، چونکە ئەمانە مافێکن ئەبێ بدرێنەوە، بەڵام ئەگەر حەددەکان مافی خوابن دروست نی‌یە کەفیل گرتن بۆی.

وە ئیبنو حەزم قەدەغەی کردووە و فەرمویەتی:

---

(١) البيهقي (٦/٧٧).

دروست نی‌یه دەستەبەری به گیان له بنەڕەتدا، نه له ماڵدا و نه له تۆڵەداو نه له هیچ شتێکدا، چونکه هەر مەرجێك له کتێبەکەی خوادا نەبێت پوچەڵە.

وه له ڕێگای عەقڵەوه بپرسین لەوانەی به دروستی‌یان داناوه ئەگەر کەسێك به گیان بووه کەفیلی کەسێك و ئەوکەسه ئامادە نەبوو چی له کەفیلەکه ئەکەن؟ ئایا ئەوەی لەسەر (مضمون) دەستەبەر کراوەکەیه لەمی ئەسێنن؟ ئەگەر شتی وەها بکەن ئەوه ستەمەو ماڵی خەڵك خواردنه به باتڵ، چونکه ناکەوێته ملی هەرگیز. یا وازی لێ ئەهێنن؟ ئەگەر وازتان لێ‌هێنا ئەوه کەفیلی گیانتان پوچەڵ کردەوه، یا زۆری لێ ئەکەن بۆ ئامادە کردنی؟ ئەوەش زۆر لێ‌کردنێکه که توانای بەسەردا نی‌یه، وه خوا هەرگیز ئەوزۆرەی لی‌ناکات.

وه کۆمەڵێك له زانایان کەفالەتی به گیانیان به دروست داناوه، وه بەڵگەشیان ئەوەیه که پێغەمبەر ﷺ بۆ تۆمەتێك کەفیلی وەرگرتووه.

وه ووتویەتی: ئەو خەبەره خەبەرێکی پوچەڵە چونکه له ڕیوایەتی ئیبراهیمی کوڕی (خیثمه)ی کوڕی عەراکەوەیه که خۆی و باوکیشی زۆر لاوازن و دروست نی‌یه ڕیوایەت کردن لێیانەوه.

لەپاشاندا باسی چەند (أثر)ێکی کردووه که له عومەری کوڕی عبدالعزیزەوه ئەگێڕنەوه. وه هەموویانی ڕەت کردۆتەوه بەوەی که بەڵگه نین، چونکه تەنها فەرمودەی خواو پێغەمبەر ﷺ بەڵگەن نەك کەسی تر.

وه هەرکاتێك کەفیلەکه بووه کەفیل بۆ ئامادەکردنی ئەبێ ئامادەی بکات

وه ئەگەر نەیتوانی ئامادەی بکات لەگەڵ ئەوەشدا زیندوو بێت، یا کەفیلەکه خۆی ئامادەی نەکات چی لەسەر ئەوبێ لێی ئەسێندرێت، بەپێی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ که فەرموویەتی: (الزعيم غارم).

واته: کەفیل دەستەبەره.

مەگەر کەفیلەکه بەو مەرجه بوبێته کەفیل که ئامادەی بکات بێ ماڵ، وه مەرجەکەی به صەراحەت ووتبێت لەبەر ئەوەی چونکه ئەوه سەپاندن ئەبێت دژی ئەو مەرجەی که دایناوه، ئەمەش مەزهەبی مالیك وخەڵکی مەدینەیه.

وه حەنەفی‌یەکان ووتویانه: کەفیلەکه بەند ئەکرێت هەتا کەسەکه ئامادە ئەکات یا مردنی ئەزانرێت، وەماڵی لێ ناسەندرێت مەگەر خۆی لەسەر خۆی دابنابێت.

وه ووتويانه: ئەگەر ئەسڵى‌يەكە (واته دەستەبەر كراوەكە) مردبێت كەفيلەكە بە زۆر ئەو مافەی لێ ناسەندرێت كە لايەتی، چونكە بە گيان كەفيلە نەك بەماڵ. كەواته شتێك ناخرێته ملی كە بۆخۆی نەبۆتە كەفيل تێيدا. ئەمەش بەناوبانگترين قسەی شافيعی‌يە.

وه كەفيلەكە ڕزگاری ئەبێت بەوەی كە ئەسڵى‌يەكە خۆی بدات بەدەستەوە، بەڵام بە مردنی (مكفول له) خاوەن قەرزەكە ڕزگاری نابێت، بەڵكو ميرات گرەكانی جێی ئەگرنەوە بۆ داوا كردن بە ئامادەكردنی ئەسڵى‌يەكە، كە قەرزارەكەيە.

**كەفيلی كردن بە ماڵ:**

كەفالەت بەماڵ: ئەو كەفالەتەيە كە كەفيل تێيدا دەستەبەر ئەبێت بە دەستەبەری ماڵی، كە ئەويش سێ جۆرە:

١- كەفالەت بە قەرز: ئەوەش دەستەبەری دانەوەی قەرزێكە كە لە زيمەی كەسێكی تردايە.

لە حەديسەكەی سەلەمەی كوڕی ئەكوعەدا هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ نوێژی نەكرد لەسەر ئەو جەنازەی قەرزی لەسەربوو. ئەبوقەتادە ووتی: ئەی نێرراوی خوا نوێژی لەسەر بكە قەرزەكەی لەسەر من، ئەويش نوێژی لەسەر كرد[1].

وه بۆ قەرزيش ئەم مەرجانە هەيە:

أ- ئەبێ كاتی زەمانەت كردنەكە سابت بێت وەك قەرزكردنی پارە يا نرخی شت يا كرێ يا مارەيی، جا ئەگەر سابت نەبوو كەفالەتەكە دروست نی‌يە، چونكە دەستەبەربونی شتێك كە پێويست نەبوبێت صەحيح نی‌يە. وەك ئەوەی ئەگەر بڵێت: ئەو شتە بفرۆشە بە فڵانە كەس من ئەبمە كەفيلی بۆ نرخەكەی، يا قەرزی بدەرێ لەسەر من، من ئەيدەمەوە. ئەمەش مەزهەبی شافيعی ومحمدی كوڕی حەسەن و ڤاهيری‌يەكانە.

وه ئەبوحەنيفە وماليك وئەبو يوسف ڕێ يان بەوە داوە، وەبە دروستی زامن بوون بۆ شتێك كە پێويست نەبووبێت ڕايان داوە.

ب- ئەبێ ديار و مەعلوم بێت: وە دروست نی‌يە دەستەبەری شتی ناديار، چونكە غەرەرە.

---

(١) أحمد (٣/٣٣٠) وأبوداود (٣١٨٩) والنسائي (٤/٦٨) والدارقطني (٣/٨٩) وابن حبان (٣٠٦٤) والحاكم (٢/٢٥٨).

جا ئەگەر بڵێت: هەرچی لە زیممەی فڵانەکەس دایە من زامنی ئەکەم، وە هەردووکیان ئەندازەکەیان نەزانی دروست نی‌یە، ئەمەش مەزهەبی شافیعی و ئیبنوحەزمە.

وە ئەبوحەنیفە ومالیك وئەحمەد ووتویانە: دروستە زەمانەتی شتی نادیار و نامەعلوم.

٢- کەفالەت بە شت یا بە تەسلیم کردن: کە ئەویش دەستەبەری تەسلیم کردنی شتێکی دیاری کراوە کە بە دەستی کەسێکی ترەوەیە، وەك: گێڕانەوەی شتی داگیرکراوو لە داگیرکەر یا تەسلیم کردنی شتی فرۆشراو بە کڕیار.

وە مەرجە لەم کەفالەتەدا ئەبێ ئەو شتە زامن کراوبێت لەسەر قەرزارەکە وەك لە ماڵی داگیرکراودا بەو جۆرەیە.

جا ئەگەر زامن نەکرابوو وەك (عاریة) خواستەمەنی و (ودیعة) ئەمانەت، ئەوە کەفالەت بۆ ئەمانە دروست نی‌یە.

٣- کەفالەت بە پێداگەیشتن:

واتە: کەفالەت بەو مەترسی‌یەی کە شوێن ماڵە فرۆشراوەکە ئەکەوێت بە هۆی شتێکەوە کە لە پێش فرۆشتنەدا بەسەری هاتبێ. واتە: ئەوە کەفالەتە و زەمانەتە بۆ مافی کڕیار بەرامبەر فرۆشیار، ئەگەر دەرکەوت شتە فرۆشراوەکە مافی کەسێکی ترە، وەك ئەوەی دەرکەوێت شتە فرۆشراوەکە ماڵی کەسێکی تر یا بارمتەیە.

**گەڕانەوەی کەفیل بۆ لای ئەو کەسەی بۆتە کەفیلی:**

وە هەرکاتێ کەفیلەکە ئەو قەرزەی لەسەر ئەسڵی‌یەکە بوو دایەوە، ئیتر کەفیل ئەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەسڵی‌یەکە مادام زەمانەت و دانەوەکە بە پرسی خۆی بووبێت. چونکە کەفیلەکە ماڵی خۆی سەرف کردووە لە شتێکدا کە سودی ئەوی تیابووە و بە ئیزنی خۆشی بووە.

ئەمەش زانایانی هەرچوار مەزهەب لەسەری رێك کەوتوون. بەڵام جیاوازیان هەیە لەوەدا ئەگەر دەستەبەری مافێکی کردبێت لەجیاتی کەسێکی تر بێ پرسی خۆی.

شافیعی وئەبوحەنیفە ووتویانە: ئەو کەسە وەك بەخشەرێکی لێ دێت و بۆی نی‌یە بگەڕێتەوە سەری و داوای لێ بکاتەوە. (واتە: کەفیلەکە داوای نرخی ئەو قەرزە بکات کە بۆی داوەتەوە).

وەئەوەی بە ناوبانگە لە مالیکەوە: ئەوەیە کە بۆی هەیە داوای لێ بکاتەوە، وە لە ئەحمەدەوە دوو ریوایەت هەیە.

ئیبنوحەزم فەرمویەتی: کەفیل بۆی نی‌یە داوای مافەکەی بکات لەوکەسەی کە بۆتە کەفیلی. بە فەرمانی خۆی بێت یا بێ فەرمانی خۆی بێت، مەگەر ئەو کەسەی قەرزەکەی لەجیاتی دراوەتەوە لە کەفیلەکەی قەرز کردبێت. وە فەرمویەتی: ئیبنوئەبی لەیلا و ئیبنو شیبیرمە و ئەبوپەور و ئەبوسولەیمان وەك ئێمە ئەڵێن.

**لە حوکمەکانی کەفالەت:**

١- هەرکاتێ (مضمون) دەستەبەرکراو لەناوچوو یا دیارنەبوو کەفیلەکە دەستە بەرە، وەلەو کەفالەتە دەرناچێت هەتا قەرزەکە نەداتەوە یا ئەسڵی‌یەکە نەیداتەوە. یا خاوەن قەرز خۆی بەری بکات لەوقەرزەدا، یا لە کەفالەتەکە پەشیمان بێتەوە، وە ئەو پەشیمان بوونەوەی بۆ هەیە چونکە مافی خۆیەتی.

٢- بۆ (مکفول لە) واتە خاوەن قەرز هەیە کە کەفالەتەکە هەڵوەشێنێتەوە لە ڕوویەکەوە، با قەرزاریش ڕازی نەبێت بەوشتە، یا کەفیلەکە ڕازی نەبێت، وە مافی هەڵوەشاندنەوە بۆ ئەو کەسە نی‌یە کە کەفیلی‌یەکەی لەبری کراوە، هەروەها بۆ کەفیلەکە نی‌یە.

**ئاودێری (المساقاة)**

**پێناسەکەی:**

لە شەرعدا ئەوەیە: یەکێك باغی دار بدات بە کەسێك کە هەڵسێت بە ئاودان وخزمەت کردنی ولە ئەستۆی دانەبێت هەتا تەواو گەورە ئەبێت وبەر دەرئەکەن بەرامبەر بەشتێکی دیاری کراوو لە میوەو بەرهەمەکەی.

کەواتە باغەوانی هاوبەشی‌یەکی کشتوکاڵی‌یە بۆ بەرهەم هێنانی دار ودرەخت کە درەختەکان لە لایەك وکارەکەش لە لایەکی تر، وبەرە بەرهەم هێنراوەکە هاوبەشە لە نێوانیاندا بە نیسبەتێك کە خۆیان لەسەری ڕێك بکەون وەك بە نیوەیی یا سێ‌یەك و ئەو جۆرانە.

وە کارکەرەکە پێی ئەڵێن: ئاودێر (مساقي)، وەلایەنەکەی تر پێی ئەڵێن: خاوەنی درەختەکان.

درەخت بە هەموو ئەو شتانە ئەوترێت کە ئەڕوێنرێت تا بمێنێتەوە لە زەویدا بۆ ماوەی ساڵێك وزیاتر لە هەموو ئەو شتانەی بۆ بڕینی ماوە و کۆتایی‌یەکی دیاری کراوی نی‌یە، بەردار بێت یان بێ بەر.

وە باغەوانی بۆ ئەو درەختانەش ئەبێت کە بەر ناگرن بەرامبەر شتێك لەگەڵاو پەلك ودار کە ئاودێرەکە وەری بگرێت.

**دانانی:**

باغەوانی بەپێی سوننەت دانراوە، وەزانایان لەسەری رێك كەوتوون لەبەر ئەوەی بۆ خەڵك پێویستە، جگە لە ئەبو حەنیفە کەڕای وایە دروست نی‌یە. وەجەماوەری زانایان بەڵگەیان لەسەر دروستی، ئەمانەی خوارەوەیە:

١- موسلیم لە ئیبنوعومەرەوە ئەگێڕێتەوە کەپێغەمبەر ﷺ باغەکانی دابە خەڵکی خەیبەر بەرامبەر نیوەی ئەو بەروبومەی کە لیّی بە ئەنجام ئەگات[1].

٢- بوخاری ئەگێڕێتەوە کە ئەنصاری‌یەکان وتیان بە پێغەمبەر ﷺ: باغە خورماکەمان بەش بکە لە نێوان ئێمە وبرا موهاجیرەکانمان دا. فەرمووی: نا. ئەوانیش وتیان: یارمەتیمان بدەن بۆ پێ گەیاندنی ئێمەش هاوبەشتان ئەکەین لە بەروبومەکەیدا. ئەویش فەرمووی باشە، ئەوانیش ووتیان گوێمان لیّ بوو گوێ رایەڵیمان کرد[2].

واتە: ئەنصاری‌یەکان ویستیان برا کۆچەرەکانیان هاوبەش بکەن لەخورماکانیاندا. بۆ ئەو مەبەستە بە پێغەمبەریان ﷺ ووت. ئەویش ڕێی نەدا، پاشان داوایان لیّ کردکە سەرپەرستیان بکەن و نیوەی بەرهەمەکە بۆ ئەوان قبوڵی کرد.

وە لە (نیل الأوطار) دا هاتووە: حازمی ووتویەتی: ئەگێڕنەوە لە عەلی کوڕی ئەبوطالیبەوە رضي الله عنه وەلە عبدالله ی کوڕی مەسعود و عەمماری کوڕی یاسر وسەعیدی کوڕی موسەییب و موحەممەدی کوڕی سیرین و عومەری کوڕی عبدالعزیز و ئیبنوئەبی لەیلا وئیبنو شیهابی زوهری، وە لە ئەهلی ڕەئی ئەبو یوسفی قاضي ومحمدی کوڕی حسەن کە ووتویانە: دروستە وەرزێری وباغەوانی بە بەشێك لە دەغڵەکە یا بەرەکەی، وە ووتویانە: دروستە پەیمان بەستن لەسەر وەرزێری و باغەوانی بەیەکەوە، بەوشێوەیە کە پەیمانی ئاودێری لەسەر دارخورما ببەسترێ و پەیمانی کشتوکاڵ لەسەر زەویەکە ببەسترێ وەك لە خەیبەردا ڕووی دا. وە دروستیشە پەیمان بەستن لەسەر هەر یەکەیان بە تەنها.

**پایەکانی:**

**باغەوانی دوو پایەی هەیە:**

١-دان (الإیجاب).

٢- وەرگرتن (القبول)

---

(١) البخاري (٢٣٢٩) و (٢٣٣١) ومسلم (١٥٥١/٦).

(٢) البخاري (٢٧١٩).

وە بەهەرچی دەلالەت بکا لەسەر ئیجاب وقەبولْ پێك دێت لە قسە ونوسین وئیشارەت بە مەرجێ لە کەسێکەوە دەرچووبێت کە تەسەڕروفی دروست بێت.

**مەرجەکانی باغەوانی:**

**چەند مەرجێك هەیە لە باغەوانی‌دا کە ئەمانەن:**

١- ئەبێ ئەو درەختانەی ئەدرێن بە ئاودێر دیاری کراوبن بە بینین یا بە سیفەت کە جیاوازی نەبێت لەگەلْ بینینەکەدا، چونکە دروست نی‌یە پەیمان بەستن لەسەر شتێکی نامەعلوم.

٢- ئەبێ ماوەکەی دیاری کرابێت، چونکە پەیمانێکی لازمە لە پەیمانی بەکرێ دان ئەچێ، هەتا غەرەری تێدا نەبێت.

ئەبویوسف و محمد ووتویانە: دیاری کردنی ماوە مەرج نی‌یە لە باغەوانی دا لەبەرچاکی (استحسان)، چونکە کاتی گەیشتنی میوە دیارە بە زۆری، و ئەوەندە جیاوازیان نی‌یە کە بە هیچ دابنرێت و ئیعتیباری بۆ بکرێت.

وە ئەوانەی کە ئەومەرجەیان بە پێویست دائەناوە ظاهیری‌یەکانن، وەبەلْگەشیان بۆ ئەوە ئەوەیە کە مالیك بە مورسەلی ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ بەجولەکەکانی فەرموو: (أقركم ما أقركم الله)[1]. واتە: ئەتان هێلْمەوە ئەوەندەی کە خوا هێشتانی‌یەوە.

وە لای حەنەفی‌یەکان هەر کاتێك ماوەی باغەوانی‌یەکە کۆتایی هات پێش پێگەیشتنی بەری درەختەکان وازی لێ ئەهێنرێت بۆ باغەوانەکە کەکاری تێدا بکات بێ کرێ هەتا بەرەکەی پێ ئەگات.

٣- ئەبێ پەیمانی باغەوانی‌یەکە پێش گەیشتنی بەرو میوەکەی پێك هاتبێ، چونکە لەم حالْەتەدا پێویستی بەکار هەیە.

بەلْام دوای گەیشتنی بەرەکە، لە زانایاندا هەیە ڕای وایە کە باغەوانی (مساقاة) ئەوکاتە دروست نی‌یە، چونکە پێویستی بەوە نی‌یە، ئەگەر پەیمانەکەش بەسرا بەکرێ دان ئەبێت نەك بە باغەوانی، وە هەندێك لە زانایان پەیمانی باغەوانی لەم کاتانەشدا بە دروست دائەنێت، چۆنکە ئەگەر دروست بێت پێش ئەوەی خوا بەرەکەی دروست بکات، ئەوە کاتی دەرکەوتنی بەرەکە لەپێش ترە کە دروست بێ.

---

(١) مالك في الموطأ ١٦٢٤).

٤- ئەبێ بەشی کرێکار بەشێکی هاوبەش و دیاری کراو بێت لەبەرەکەیدا، واتە: ئەبێ بەشەکەی دیاریێت بە جوزئی وەك نیوە وسێ‌یەك. کەواتە ئەگەر باغەوان یا خاوەن باغ مەرجیان کرد کە میوەی کۆمەڵە درەختێکی دیاری کراو لە بریتی کرێ بدرێ بە باغەوان ئەوە ئەو پەیمانە بەتاڵە (چونکە لەوانەیە بەرهەمی ئەو چەند دارە لەناو بچێت).

وە لە (بداية المجتهد)دا ووتویەتی: ئەوانەی ئەڵێن (مساقاة) ئاودێری دروستە لەسەر ئەوە رێك کەوتوون کە ئەگەر بە نەفەقە و خەرجی خاوەن باغ بوو، وە هیچ لەسەر ئاودێرەکە نەبوو ئەوەندە نەبێت کە بە دەستی کاری تێدا ئەکات ئەوە دروست نی‌یە، چونکە بە کرێ گرتنە بۆ شتێك کە هێشتا دروست نەبووە ونەهاتۆتە دی.

وە هەرکاتێك یەکێ لە مەرجەکان نەما پەیمانەکە هەڵئەوەشێتەوە وئاودێری‌یەکەش تێك ئەچێت. بەڵام ئەگەر ئاودێر کاری تێدا کردبوو درەختەکان یا دەغڵەکە گەورە بوو بە دەستی ئاودێرەکە، کرێی تەواوی بۆ هەیە وەك ئەوانەی بە کرێ ئەگیرێن بۆ ئەو جۆرە کارانە، وەگەورە بوون وپێگەشتنی دەغڵەکە یا درەختەکە بۆ خاوەنەکەیەتی.

**ئەو شتانەی کە (مساقاة) ئاودێری بۆیان دروستە:**

زانایان جیاوازیان هەیە لەوەدا کە دروستە ئاودێری تێدا بکرێت؟ بەشێ لە زانایان تەنها لە دارخورمادا بەدروستی داناوە وەك داود، وە هەیانە لە دارخورما بەولاوە باغی رەزیشی داناوە وەك شافیعی، وە هەیانە زۆرفراوانی کردووە وەك حەنەفی‌یەکان، وەلای ئەمان دروستە بۆ درەخت ومێو و دانەوێڵە باقلەیی‌یەکان، وە بۆ هەموو ئەوانەی رەگیان هەیە و لەزەویدا ئەمێننەوەو بۆ هەڵکەندن کۆتایی دیاری کراوی نەبێت، بەڵکو هەرکاتێك دروا سەوز بێتەوە وەك کەوەر و قامیشی فارسی، وە ئەگەر ماوەکە دیاری نەکرابوو پەیمانەکە پێك دێت لەسەر یەکەم درونەوەی کە بەئەنجام ئەگات دوای پەیمانەکە، وە هەروەها (مساقاة) ئاودێری بۆ ئەوشتانەش دروستە کە بەرە بەرە گەورە ئەبێت وەك باینجان.

وە ئەگەر کەسێك خورمایەك بدات بە کەسێکی تر کە رنینی کۆتایی هاتبێت بەو مەرجەی هەڵسێت بە خزمەت کردنی درەختەکان وئاودێریان هەتا تۆوەکەی سەوز ئەبێت بە نیوەیی، ئەو کارە دروستە بێ ئەوەی ماوەکە ئاشکرا بکرێت.

وە لای مالیك ئاودێری دروستە بۆ هەموو ئەوانەی رەگی جێگیریان هەیە وەك هەنار و هەنجیر و زەیتون، وە ئەوانەی لەو شێوەیەن بەبێ زەرورەت، وەئاودێری بۆ هەموو ئەوانەش ئەبێت کە

ڕەگەکانیان چەسپاو نی‌یە وەك خەیار و کالەك، بەمەرجێ خاوەنی توانای بە سەریاندا نەبێت، وە هەروەها دەغڵ ودان.

وە لای حەنبەلی‌یەکان باغەوانی دروستە بۆ هەموو دارێکی بەری کە میوەکەی بخورێ.

لە (المغنی) دا ووتویەتی: باغەوانی دروستە بۆ هەموو ئەو درەختانەی تۆی نێرینە هەڵئەگرن، وەك چۆن دروستە بۆ هەموو ئەو شتانەی پێویستیان بە ئاودێری هەیە. وە مالیکیش هەر ئەوە ئەڵێت و فەرمویەتی: خیلاف لەسەر ئەوە نازانین کە هەبێت لەناو زانایاندا.

**وەزیفە و ئیشی ئاودێر:**

کاری ئاودێر -وەك ئەوەوی فەرمویەتی- هەرچی پێویست بێت بۆ چاك بوونی بەری درەختەکان لەسەر ئاودێر پێویستە. وە ئەوکارانەش کە ئەکرێن بۆ زیاد کردنی و هەموو ساڵێك دووبارە ئەبێتەوە، وەك ئاودان وچاك کردنەوی جۆگەو ڕوبارەکان، وە چاك کردنی بنی درەختەکان و موتوربە کردنیان و گیارِن کردنیان و هەڵپاچینیان و پاراستنی بەری درەختەکان و لێکردنەوەیان و ئەو جۆرانە.

بەڵام ئەوانەی کە مەبەست پێ‌ی پاراستنی ئەسڵەکەیەتی و هەموو ساڵێك دووبارە نابنەوە وەك: دیواری باغ وهەڵکەندنی جۆگاو ڕوبار، لەسەر خاوەنەکەیەتی.

**ناتوانایی ئاودێر:**

ئەگەر بەهانەیەك هاتە کایەوە کە ڕێ لە ئاودێر بگرێت لە ئیش کردن وەك ئەوەی نەخوش بکەوێت یا تووشی نەخۆشی بێت یا سەفەرێکی کوت وپڕی بێ بەتوشەوە ئەو کاتە پەیمانی باغەوانی‌یەکە هەڵئەوەشێتەوە. ئەوە لە حاڵەتێکدا ئەبێ کە خاوەنەکەی بە مەرجی دانابێت ئاودێر خۆی بە تەنها کار بکات، بەڵام ئەگەر ئەو مەرجەی لەسەر دانەنابێت باغەوانی‌یەکە هەڵناوەشێتەوە بەڵکو لەسەر ئاو دێر پێویستە کەسێکی تر لە جێ ی خۆی دابنێت، ئەوەش ڕای حەنەفی‌یەکانە.

مالیك فەرمویەتی: ئەگەر ئاودێرەکە توانای ئەماوکاتی فرۆشتنی بەرەکەی هات بۆی نی‌یە بیدات بە ئاودێرێکی تر، بەڵکو پێویستە لەسەری کەسێکی تر بە کرێ بگرێت ئیش بکات، وە ئەگەر دەسەڵاتی نەبوو لە بەشەکەی کرێکار ئەگیرێت.

شافیعی فەرمویەتی: بە نەتوانینی ئاودێر پەیمانەکە هەڵئەوەشێتەوە.

**مردنی یەکێ لە پەیمان بەستەکان:**

ئەگەر یەکێ لە پەیمان بەستەکان مرد ئەوە ئەگەر درەختەکان بەریان پێوە بوو هێشتا پێ نەگەیشتبوو بۆ پاراستنی بەرژەوەندی هەردوو لا ئەبێ ئاودێرەکە بەردەوام بێت یا میرات گرەکانی بەردەوام بن لەسەر کار هەتا بەری درەختەکان پێ ئەگات، ئەگەرچی زۆریش لە خاوەن باغەکە یا لە واریسەکانی بکرێت، چونکە بەوشێوەیە کەسیان زیانیان پێ ناگات، وە کرێ نادرێت بە ئاودێر ماوەی نێوان هەڵوەشاندنەوەی پەیمان و بەروبومەکەی.

وە ئەگەر ئاودێرەکە یا میراتگرەکانی نەیان ویست کار بکەن دوای کۆتایی پێ هاتنی ماوەکە یا هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکە، نابێت زۆریان لێ بکرێت، بەڵام ئەگەر ویستیان بەرەکە پێش گەیشتن بڕنن ناتوانن ئەو کارە بکەن، بەڵکو ماف بۆ خاوەنەکەی یا میرات گیرەکانی هەیە یەکێ لەم سێ شتانە بکەن:

١- موافەقە کردن لەسەر بەر ڕنین، وە دابەش کردنی بەپێی ئەوەی لەسەری ڕێك کەوتون.

٢- دانی نرخی ئەو بەشەی کە ئاودێرەکە یا میرات گرەکەی ئەیان کەوێت ئەو کاتە خۆی مافی ڕنینی ئەبێت.

٣- نەفەقەی درەختەکان بکێشێ هەتا بەرەکەیان پێ ئەگات لە پاشاندا ئەوەی کە سەرفی کردووە لە ئاودێرەکە یا وەرەسەکەی وەریگرێتەوە، یا لەبەری درەختەکە هەڵی گرێت لە بەشی ئەوان. ئەوەش مەزهەبی حەنەفی یەکانە.

**(جعالة)**

**پێناسەکەی:**

(جعالة) پەیمانێکە لەسەر سوودێك کە گومانی بەدەست هێنانی ئەکرێت وەك ئەوەی کەسێك مەبلەغێکی دیاری کراوی دابنێت لەسەر خۆی بیدات بەوکەسەی کەلوپەلێکی وون بووی بۆ بهێنێتەوە، یا ووڵاغە هەڵاتووەکەی، یا ئەو دیوارەی بۆ دابنێت، یا ئەو بیرەی بۆ هەڵکەنێت هەتا ئەگاتە ئاو، یا قورئان بە کوڕەکەی لەبەر بکات، یا نەخۆشەکەی تیمار بکات هەتا چاك ئەبێتەوە، یا لە پێش برکەیەکدا سەرکەوێت. . . هتد.

**دانانی:**

بنەمای دانانی، فەرمودەی خوای گەورەیە کە ئەفەرموێت: ﴿ولِمَنْ جَاءَ بِهِ حِمْلُ بَعِيرٍ وأَنَا بِهِ زَعِيمٌ﴾ (یوسف/٧٢).

واتە: بۆ ئەو کەسەی بیهێنێتەوە باری ووشترێکی خواردەمەنی ئەدرێتێ، وەمنیش دەستەبەر ئەبم بۆی.

وە لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ڕێی داوە (جعل) وەربگیرێت لەسەر دوعاکردن یا خوێندنی سوڕەتی فاتیحە وەك لە بەشی بە کرێ دان دا باس کرا، وە ڕێی پێ دراوە لەگەڵ ئەوەشدا کە نادیاری تێدایە ئەویش لەبەر زەرورەتە کە لە شتەکانی تردا دروست نی‌یە، وە لەمەدا دروستە با کارەکەش نادیار بێت.

وە مەرج نی‌یە لە پەیمان پێداندا هەردوو لا ئامادە بن وەك لە پەیمانەکانی تردا مەرجە، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿ولمن جاء به حمل بعير﴾ واتە: بۆ ئەو کەسەی بیهێنێتەوە باری ووشترێك هەیە.

وە (جعالة) وەك هەموو پەیمانە دروستەکانی تر وایە، کە بۆ یەکێ لە لایەنەکان هەیە هەڵی بوەشێنێتەوە.

وە ئەوەی کارەکە ئەکات مافی ئەوەی پێ دراوە کە پەیمانەکە هەڵبوەشێنێتەوە پێش دەست کردن بە کارەکە، وەك چۆن بۆی هەیە دوای دەست پێ کردنیش هەڵی بوەشێنێتەوە ئەگەر ڕازی بێت بە نەویستنی مافەکەی.

بەڵام ئەوکەسەی کارەکەی بۆ ئەکرێت بۆی نی‌یە پەیمانەکە هەڵبوەشێنێتەوە ئەگەر ئەو کەسەی کارەکە ئەکات دەستی بە کار کرد.

وە هەندێ لە زانایان (جعالة) یان قەدەغە کردووە لەوانە ئیبنوحەزم کە لە کتێبی (المحلى) دا فەرمویەتی: دروست نی‌یە حوکم کردن بە (جعالة) بۆ کەس.

جا هەرکەس بە کەسێکی تر بڵێت: ئەگەر ئەو بەندە فەراری‌یەم بۆ بهێنیتەوە دینارێکت ئەدەمێ، یا بڵێت: ئەگەر فلانە کار وفلانەکار بکەیت درهەمێك بۆ تۆ-هتد. ئەویش بۆی هێنا.

یا بلاوی بکاتەوە بڵێت: هەرکەس ئەوەم بۆ بهێنێت ئەوەندەی ئەدەمێ ئەویش بۆی هێنا، وە هیچی نەدایە هیچ حوکمێکی بۆ ناکرێ.

بەڵام پەسەندە وەفا بە وەعدەکەی بکات.

وە هەروەها ئەگەر کەسێك بەندەیەکی فەراری بهێنێت هیچ حوکمێکی بۆ نادرێت چ بزانێت کە بەندە فەراری‌یەکەی هێناوەتەوە چ نەزانێ.

مەگەر کەسێك بە کرێی گرتبێ بۆ گەڕان بە شوێن بەندەکەدا بۆ ماوەیەکی دیاری کراو، یا لە شوێنێکی دیاری کراوەوە بیهێنێتەوە، ئەوە پێویستە لەسەری لەسەر چی بەکرێی گرتووە بیداتێ.

وە کۆمەڵێك (جعل)یان بە پێویست و واجب داناوە و سەپاندویانە بەسەر ئەو کەسەدا کە کارەکەی بۆ ئەکرێت کە پەیمانەکەی بەرێتە سەر، وە ئەم فەرموودەیەی خوای گەورەیان کردۆتە بەڵگە کە ئەفەرموێت: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ﴾ (المائدة:١).

واتە: ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە ئەپەیمانەکانتان بەرنە سەر.

وە بە فەرموودەکەی یوسف: (علیه السلام) ﴿قالوا نفقد صواع الملك ولمن جاء به حمل بعير وأنا به زعيم﴾.

واتە: ووتیان: صاعەکەی پاشامان وون بوە، وە هەرکەس بیهێنێتەوە باری ووشترێکی خواردەمەنی ئەدرێتێ، وە من کەفیلم.

وە بە حەدیسی ئەو صەحابی‌یەی کە دوعاکەی خوێند لەسەر چەند سەر مەڕ —قسەکە تەواو بوو—.

هاوبەشی (الشراكة)

پێناسەکەی:

(شراکة) هاوبەشی.

وە زانایانی ئایینی پێناسەیان کردووە بەوەی کە: پەیمانێکە لە نێوان هاوبەشەکاندا لە سەرمایە و قازانجدا.

دانانی:

هاوبەشی دانراوە بەپێی کیتاب وسوننەت و ئیجماع.

بەپێی کیتاب خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فَهُمْ شُرَكَاءُ فِي الثُّلُثِ﴾ (النساء: ١٢).

واتە: ئەوان هاوبەشن لە سێیەکدا.

وە هەروەها ئەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ كَثِيرًا مِنَ الْخُلَطَاءِ لَيَبْغِي بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَقَلِيلٌ مَا هُمْ﴾ (ص:٢٤).

واتە: وە بەڕاستی زۆر لە هاوبەشەکان ستەم لە یەکتری ئەکەن جگە لەوانەی باوەڕیان بە خوا هەیە وکردەوەی چاکە ئەکەن وە ئەوانەش کەمن.

وە بەپێی سوننەتیش پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێت: (خوای گەورە ئەفەرمووێت: (أنا ثالثُ الشَّریکَین ما لم یَخُنْ أحَدُهُما صاحِبَهُ. فإن خانَ أحدُهما صاحِبَهُ خَرَجْتُ مِن بینهما). رواه أبوداود عن أبي هریرة[1].

واتە: ئەگەر دوو کەس هاوبەشی‌یان کرد لە کارێکدا من سێیەمم. واتە: بەرەکەت ئەخەمە کارەکەیانەوە بە مەرجێ گزی لە یەك نەکەن. بەڵام کاتێ گزیان کرد لە یەك من لەنێوانیاندا دەرئەچم واتە بەرەکەتەکەی ناهێڵم.

وە زەید فەرمویەتی: من و بەرڕاو هاوبەش بوین. بوخاری گێڕاویەتی‌یەوە. وە زانایان هەموو ئیجماعیان هەیە لەسەر ئەوە، ئیبنومونذیر باسی ئەوەی کردووە.

بەشەکانی شەریکایەتی:

شەریکایەتی دوو بەشە:

بەشی‌یەکەم: هاوبەشی لە خاوەنێتی دا:

بەشی دووەم: هاوبەشی لە پەیمان دا:

هاوبەشی لە خاوەنێتی دا: ئەوەیە کە زیاد لەکەسێك خاوەنی یەك شت بن بە بێ پەیمان بەستن لەسەر ئەو شەریکایەتی‌یە. ئەمەش یا بە ئارەزووە یا بەزۆرە:

بەئارەزوو، وەك ئەوەی کەسێك شتێك ببخشێت بەدوو کەس یا وەسیەت بۆ دوو کەس بکات لە یەك شتداو هەردووکیان ڕازی بن، ئەو کاتە شتە بەخشراوەکە یا وەسیەت بۆکراوەکە ئەبێتە مولکی هەر دووکیان بە هاوبەشی، وەهەروەها ئەگەر هەر دووکیان شتێك بکڕن لەسەر حیسابی هەردوولایان ئەو شتە کڕراوە هاوبەشی نێوانیانە بە هاوبەشی خاوەنێتی.

هاوبەشی بە زۆر: ئەو هاوبەشی‌یەیە کە بۆ زیاتر لە یەکێ سابت ئەبێت بە زۆر بێ‌ئەوەی کارێکیان ئەنجام دابێت بۆ خاوەنێتی‌یەکە وەك شتی میراتی، کە هاوبەشی بۆ وەرەسە دروست ئەبێت بێ ئەوەی ئارەزوویان هەبێ تێیدا، وە هاوبەشی‌یەکە هاوبەشی خاوەنێتی‌یە.

حوکمی ئەم هاوبەشی‌یە: حوکمی ئەم هاوبەشی‌یە ئەوەیە کە دروست نی‌یە بۆ هیچ کامیان تەسەڕروف لە بەشی ئەوەی تردا بکات بێ پرسی خۆی، چونکە هیچیان مافی سەرپەرشتی بەشی ئەوەی تری نی‌یە، و وەك ئەوەیە بێگانە بێت.

(١) أبوداود (٣٣٨٣) والحاکم (٢/٥٢) والدارقطني (٣/٣٥).

هاوبەشی لە پەیماندا ئەوەیە: دوو کەس یا زیاتر پەیمان ببەستن لەسەر هاوبەشی کردن لە ماڵێکدا، وە لەوقازانجەی کە بەدەستی ئەهێنن.

جۆرەکانی:

وە جۆرەکانی هاوبەشی وەك خوارەوەیە:

١- هاوبەشی (عنان)

٢- هاوبەشی (مفاوضة)

٣- هاوبەشی (أبدان) لاشەییەکان

٤- هاوبەشی (وجوه) ڕووەکان

پایەکەی:

وە پایەکە (الإیجاب) و (القبول) دان و وەرگرتنە، یەکێکیان بڵێت: هاوبەشیت ئەکەم لە فلانە شت وفلانە شتدا ئەوی تریان بڵێت: قەبوڵم کرد.

حوکمەکەی:

حەنەفییەکان هەموو جۆرەکانی هاوبەشی ڕابوردو بەدروست دائەنێن هەر کاتێك ئەو مەرجانەی تێدابێت کە باسیان کردووە.

وە مالیکییەکان: هەموو هاوبەشییەکانیان بە دروست داناوە، جگە لە هاوبەشی (وجوه) ڕووەکان.

وە شافیعییەکان: هەموو هاوبەشییەکانیان بە پوچەڵ داناوە جگە لەهاوبەشی عینان.

وە حەنبەلییەکان: هەموو هاوبەشییەکیان بەدروست داناوە جگە لە هاوبەشی موفاوەچە.

هاوبەشی عینان:

ئەویش ئەو هاوبەشییەیە کە دوو کەس هاوبەش ئەبن لە ماڵێکدا ماڵی هەردووکیان بێت کە بازرگانی پێوە بکەن، وە قازانجەکەی لەنێوانیاندا بێت -وە مەرج نییە ئەوماڵە یەکسان بێت نە لە تەسەرڕوفدا نە لەقازانجیا- وە ئەکرێ ماڵییەکێکیان زۆرتر بێت لەوی تریان، وە ئەشبێت یەکێکیان لێ پرسراو بێ بێجگە لە هاوبەشەکەی، وە دروستیشە قازانجەکەیان یەکسان بێت، وەك چۆن دروستە جیاوازی هەبێت بەپێی ڕێك کەوتنیان.

جا ئەگەر خەسارەتێك هەبوو بەپێی سەرمایەکە ئەبێت.

**هاوبەشی موفاوەضە :**

ئەویش پەیمان بەستنێکە لە نێوان دوو کەس یا زیاتر لەسەر ئەوەی هاوبەش بن لە کارێکدا بەم مەرجانەی خوارەوە:

١- سەرمایەکانیان یەکسان بێت، جائەگەر یەکێکیان سەرمایەکەی زۆرتربوو ئەو هاوبەشی‌یە دروست نی‌یە.

٢- یەکسانی لە تەسەڕروفدا، کەواتە هاوبەشی نێوان منداڵ وگەورە دروست نی‌یە.

٣- یەکسانی لە تاییندا، کەواتە لەنێوان بێ باوەڕ وموسڵماندا نابەسترێت.

٤- ئەبێ هەریەك لە شەریکەکان کەفیلی ئەوی تریێت لەوەی لەسەری پێویستە لەکڕین و فرۆشتندا، وە هەروەها وەکیلی بێت.

کەواتە دروست نی‌یە تەسەڕروفی یەکێکیان زۆرتربێت لەوی تریان.

جا ئەگەر یەکسانی لەو شێوانەدا بە جێ هات ئەوە پەیمانەکە پێك دێت وهەریەکەیان وەکیلی هاوەڵەکەیەتی وکەفیلی‌یەتی، وەهاوەڵەکەی داوای پێك هاتنی لێ ئەکات و بەرپرسیارە لە هەموو هەڵسوکەوتەکانی.

حەنەفی‌یەکان ومالیکی‌یەکان ئەم جۆرە هاوبەشی‌یەیان بە دروست داناوە، بەڵام شافیعی بڕی پێ نەداوەو فەرمویەتی: ئەگەر هاوبەشی مفاوچە باتڵ نەبێت ئیتر هیچ شتێکی باتڵ لە دونیادا نازانم، چونکە پەیمانێکە شەرع بەو شێوەیە واریدی نەکردوە.

وە جێ بەجێ بوونی ئەو یەکسانی‌یانە لەوهاوبەشی‌یەدا کارێکی گرانە، وە لەبەر ئەوەی غەرەرو نامەعلومی تێدایە، وەئەو حەدیسەی هاتووە (فاوضوا فإنه أعظم للبركة).

واتە: هاوبەشی مفاوچە بکەن چونکە کارێکی گەورەو پیرۆزە[1].

وە هەروەها (إذا تفاوضتم فأحسنوا المفاوضة).

واتە: ئەگەر هاوبەشی مفاوچەتان کرد بە چاکی بیکەن.

هیچ کام لەم حەدیسانە صەحیح نین.

وە شێوەی ئەم هاوبەشی‌یە لای ئیمامی مالیك ئەوەیە کە: هەریەکەیان کاری خۆی بداتە دەست ئەوی تریان حازربێ یا غایب بێ. وە دەستی وەك دەستی ئەو ئەبێت. وە کەسیان لە هیچ شتێکدا

---

(١) نصب الراية للزيلعي (٤/٣٩٠).

نابنه هاوبەشی ئەوی تریان بەو پەیمانە نەبێت کە بەستویانە لەسەری، وە مەرج نی‌یە سەرمایەکان یەکسان بێت یا کەسیان پارەیان لانەبێت کە نەیخستبێتە هاوبەشی‌یەکەوە.

هاوبەشی ڕووەکان (الوجوه):

ئەویش ئەوەیە دوو کەس یا زیاتر شتێك بکڕن بە قازانج بە شەریکی بێ ئەوەی پارەیان هەبێت بەڵکو خەڵك باوەڕیان پێ بکات، کەواتە ئەمە شەریکایەتی‌یە لە زیممەدا نەك لەکار و ماڵ و سەرمایەدا. ئەم جۆرەش لای حەنەفی‌یەکان وحەنبەلی‌یەکان دروستە، چونکە کارێکە لە کارەکان دروستە پەیمانی هاوبەشی لەسەر ببەسترێت، وەدروستە کە خاوەنێتی‌یان لە شتەکڕراوەکەدا جیاوازبێت.

وە قازانجەکەشی لەنێواندا بەپێی بەشی خاوەنێتی هەر یەکەیانە، بەڵام شافیعی‌یەکان و مالیکی‌یەکان پوچەڵیان کردۆتەوە، چونکە هاوبەشی تەنها بەستراوە بەسەرمایە وکارەوە، وە ئەو دوانەش لەم هاوبەشی‌یەدا نی‌یە.

هاوبەشی لاشەکان (الأبدان):

ئەویش ئەوەیە کە دوو کەس ڕێك بکەون کارێك بکەن کرێی ئەو کارە لە نێوانیاندا بەپێی ڕێکەوتنیان بێت، وەبە زۆری لەنێوان دارتاشەکان و ئاسنگەرەکان و کۆڵ هەڵگرەکان و بەرگ دروەکان و زڕەنگەرەکان و خاوەن پیشەکانی تردا ڕوو ئەدات، وە ئەم هاوبەشی‌یە دروستە ئیتر پیشەکانیان یەك جۆر بن یا جیاوازبن یەکسانە وەك: دارتاش لەگەڵ دارتاشدا یا دارتاش لەگەڵ ئاسنگەردا، یا هەموو بەیەکەوە کاربکەن یا هەریەکە بۆ ئەوەی تریان کاربکات. وەبەم هاوبەشی‌یە ئەوترێت: هاوبەشی کار یا لاشە یا پیشە یا ڕازی بوون.

وە بەڵگەی دروستی ئەم هاوبەشی‌یە ئەوەیە کە ئەبوعوبەید لە عبدالله وە ئەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: من و عەممار و سەعد بووینە هاوبەش لەسەر ئەوەی لە جەنگی بەدردا بە دەستی بهێنین، ئەڵێ: سەعد دوو دیلی هێنا بەڵام من و عەممار هیچمان بۆ نەهات. ئەبوداود و نەسائی و ئیبنوماجە گێڕاویانەتەوە[1].

وە شافیعی ڕای وایە ئەم هاوبەشی‌یە پوچەڵە، چونکە هاوبەشی لای ئەو تایبەتە بە سەرمایەوە نەك بە کارەوە.

---

(١) أبوداود (٣٣٨٨) والنسائي (٧/٣١٩) وابن ماجه (٢٢٨٨).

وەلە کتێبی (الروضة الندیة) ووتەیەکی جوان هەیە لەسەر ئەم بابەتە، وا باسی ئەکەین: (بزانن کە ئەو ناوانەی هاتوون لە کتێبەکاندا بۆ جۆرەکانی هاوبەشی وەك: موفاوچە و عینان وڕووەکان (وجوە) و لاشەکان (أبدان) نە ناوی شەرعین ونە ناوی زمانی بەڵکو زاراوەی سازکراوو تازەو داهاتوون. وە هیچ لارییەك نی‌یە لە دووکەسدا کە سەرمایەکانیان تێکەڵ بکەن وبازرگانی پێوە بکەن وەك مانای ئەو مفاوچەیەی کە ناسراوە، چونکە بۆ خاوەن ماڵ هەیە بە ئارەزووی خۆی بە ماڵەکەیەوە کار بکات بەومەرجەی ئەو تەسەڕڕوفە لە کاری حەرامدا نەبێت، ئەو حەرامانەی (شارع) یاسادانەر حەرامی کردوە، بەڵام ئەو مەرجانەی دانراون بۆ یەکسانی سەرمایەکەیان و نەقدبونیان و مەرجی پەیمان بەستن تی‌یاندا، لەوبارەیەوە هیچ نەهاتووە کە بەڵگە بێت بۆ ئەوەی ئیعتیباریان پێ بکرێت، بەڵکو هەر تەنها ڕازی بوونیان بە تێکەڵ کردنی سەرمایەکانیان وبازرگانی پێوەکردنیان بەسە.

وە هەروەها هیچ لاری نی‌یە لەوەدا کە دووکەس شتێك بکڕن بە مەرجێك هەریەکەیان ئەوەندەی نرخەکەی کەداوێتی بەشی هەبێت وەك کە ناسراوە بە هاوبەشی عینان.

وە ئەم هاوبەشی‌یە بووەو چەسپاوە لەسەردەمی پێغەمبەردا، ﷺ وە کۆمەڵێك لە یارەکانی پێغەمبەر ﷺ هاوبەشی‌یان کردووە لە کڕینی شتێك دا وە هەر یەکەیان بەشێکی لە نرخەکەی داوە یا هەردوولایان یا یەکێکیان سەرپەرشتی کڕینەکەی کردووە، بەڵام ئەوە کە پەیمان بەستن و تێکەڵ کردن بە مەرج دابنرێت، شتێك نەهاتووە بەڵگە بێت بۆ ئەوەی ئیعتیباری پێ بکرێت.

وە هەروەها خراپی تێدا نی‌یە کە یەکێکیان ئەوی تریان بکاتە سەرکار و قەرزی بۆ بکات وبازرگانی پێوە بکات و هاوبەش بن لە سودەکەیدا وەك ناسراوە بە هاوبەشی (وجوە) ڕووەکان، بەڵام هیچ ڕویەك نی‌یە بۆ ئەو مەرجانەی باسیان کردووە.

وە هەروەها قەیناکە یەکێکیان ئەوی تریان بکاتە وەکیل لە جیاتی خۆی کار بکات و کرێی بداتێ وەك ئەوەی ناسراوە بە هاوبەشی (أبدان) لاشەکان، وە هیچ مانایەك نی‌یە بۆ ئەو مەرجانەی دایان ناوە.

سەرئەنجام ئەو جۆرە هاوبەشی‌یانە هەموویان تەنها ڕازی بوون تی‌یاندا بەسە بۆ چوونە ناویان، چونکە هەرچی تەسەروف کردن هەیە لەو ماڵەدا بەستراوە بە ڕازی بوونەوە، ئیتر پێویست نی‌یە هیچی تر ئیعتیباری بۆ بکرێت.

وە هەرچی لە بەشی وەکالەت وبەکرێ داندا هەیە بەسە بۆ ئەمانیش، ئیتر ئەم جۆرانە چین و ئەم مەرجانە چین دروستیان کردووە؟ وە چ بەڵگەیەکی عەقلی و نەقلی پاڵی پێوە ناون بۆ ئەو کارە؟

وە کارەکە زۆر لەوانە ئاسانترە کە گەورەیان کردووەو درێژەیان پێ داوە.

چونکە پوختەی ئەوەی کە وەربگیرێت دەربارەی هاوبەشی مفاوچە و عینان و (وجوه) ئەوەیە کە: دروستە بۆ پیاو هاوبەشی بکات لەگەڵ کەسێکی تردا بۆ کڕینی شتێك وفرۆشتنی، وە قازانجەکەی بەپێی بەشەکەی لە نرخەکەدا بێت.

وە ئەوە شتێکە کە واتاکەی ئاشکرایە و هەموو کەس تێی ئەگات نەخوێندەوار و زانا، وە ئەوەی کە زانیاری کەمی هەیە فەتوا بە دروستی ئەدات چ جای ئەوەی کە زانیاری کامڵە.

وە لەوە گشتی ترە کە ئەو سەرمایەی هەریەکەیان ئەیدات یەکسان بێت لە نرخەکەدا یا جیاواز بێت.

وە گشتی ترە لەوەی کە پارەکە یا کەلوپەلەکە نەقد بێت یا شت بێت، وە گشتی ترە لەوەی کە ئەوەی بازرگانی پێوە ئەکەن سەرمایەی تەواوی هەموویان بێت یا هەندێ لەسەرمایەکەیان بێت.

وە گشتی ترە لەوەی کە سەرپەرشتی کەری کڕین وفرۆشتنەکە یەکێکیان بێت یا هەموویان.

با بڵێین ئەوانە بۆ هەر بەشێك لەم بەشانە ناوێکی تایبەتی یان بۆ دانابێت-کە لە بنەمادا هەموویان یەك شتن -بەڵام دانانی ئەو عیبارەتانەو خۆماندو کردنیان لە دانانی ئەو مەرجانەدا و دوورخستنەوەی ماوە لەسەر ئەوانەی هەوڵی زانیاری ئەدەن وماندو کردنیان بەبێ سوود چ مانایەکی هەیە؟

وە تۆ ئەگەر لە جوتیارێك یا بەقاڵێك بپرسی دەربارەی دروستی شەریکایەتی لە کڕینی شتێك داو لە قازانجەکەی دا، لای گران نییە و وەڵام ئەداتەوە بە بەڵێ، بەڵام ئەگەر پێی بڵێت: ئایا عینان یا (وجوه) یا ئەبدان دروستە؟ سەری سوڕ ئەمێنێ لەو زاراوانە و واتای ووشەکان.

هەتا ئێمە زۆرمان بینیوە لەوانەی نوقمن لە زانستە فەرعی‌یەکاندا ئەمانەی لێ تێك ئەچێت کاتێك بیەوێ لە یەکیان جیا بکاتەوە، مەگەر ئەو کەسە بەو نزیکانە کورتەیەك لە کورتەکانی کتێبە شەرعی‌یەکانی لەبەر کردبێت ئەوە لەوانە بێت لای ئاسان بێت زانینی ئەو زاراوانە.

وە ئەوکەسە موجتەهید نی‌یە کە بازنەی ڕاکان فراوان بکات بێ ئەوەی بەڵگەیان هەبێت، وە هەرچی قیل وقال هەیە وەربگرێ، چونکە ئەوە عادەتی ئەوانەیە کە تەقلید ئەکەن، بەڵکو موجتەهید کەسێکە بڕیاری پێکەر وڕاست بدات وشتی ناڕەوا پوچەڵ بکاتەوە، وە بگەڕێت بە شوێن بەڵگەدا بۆ هەموو مەسەلەیەك و کیشەیەك، وە هیچ شتێك ڕێی ئەوەی لێ نەگرێت کە حەق ئاشکرا بکات وەك موخالەفە کردنی ئەوانەی کورتن لە ئاست دۆزینەوەی حەق.

چونکە هەق بەپیاو ناناسرێت، هەر لەبەر ئەوە ئەم ڕێگایەمان گرتووە، کە کەس قەدری نازانێت جگە لەوانەی وازیان لە دەمارگیری و تەعەصوبی هێناوە وە بیری خۆیان پاك کردۆتەوە لە بۆچونە باوەکان، ئیتر خوا یارمەتی دەرە. تەواو بوو.

**هاوبەشی کردن لە ئاژەڵدا :**

وە ئیبنوقەییم ڕای وایە کە دروستە هاوبەشی کردن لە ئاژەڵدا، بەم شێوە کە ئاژەڵەکەماڵی کەسێك بێت وکەسێکی تر هەڵسێ بە پەروەردە کردنی، بەو مەرجەی سوودەکەی لە نێوانیاندا بەش بکرێت بەپێی ئەوەی لەسەری ڕێ کەوتوون. لە(إعلام الموقعين) دا فەرمویەتی:

لای ئێمە هاوبەشی کردن بۆ چاندنی دارگوێزو شتی تر دروستە، بەوەی خاوەن زەوی زەوی‌یەکەی بدات بە کەسێکی تر و پێی بڵێت: بە داری فڵان وفڵان بیتێژە، وە هەرچی تێدا ڕوا بە هاوبەشی، ئەمەش وەك ئەوەیە کەسێك ماڵێك بدات بە کەسێکی تر بازرگانی پێ بکات وە لە قازانجەکەی دا هاوبەش بن، وە وەك ئەوەیە زەوی‌یەکەی بداتێ بیکاتە کشتوکاڵ بە هاوبەشی، وە وەك ئەوە وایە درەختەکانی بدات بە کەسێکی تر بەخێویان بکات و بەرەکەی بە نیوەیی، وە وەك ئەوە وایە کە مانگاکانی یا مەڕەکانی یا وشترەکانی بدات بە کەسێکی تر بە خێوی بکات بەربەنیوەیی، (کە شەریك بن لە بەچکەو لە شیردا)، وە وەك ئەوە وایە وڵاغێکی بداتێ کرێکاری پێ بکات و کرێکەی بە شەریکایەتی.

وە وەك ئەوەی ئەسپەکەی بدات بۆ غەزا کردن لە ڕێی خوادا، لەپاشان هەرچی تاڵانی‌یەك بۆ ئەسپەکەی داندرا تێیدا شەریك بن.

وە وەك ئەوەی چاڵاوەکەی بدات بە کەسێك ئاوەکەی دەرهێنێ بە شەریکی وە شێوەی ئەمانە.

ئەوانە هەموو هاوبەشی ڕاستن ودروستن، دەق و قیاس و ڕێکەوتنی صەحابەو بەرژەوەندی خەڵك بەڵگەن لەسەر دروستیان، وە هیچ شتێکیان تێدا نی‌یە کە حەرامی یان پێویست بکات لە قورئان و سوننەت و ئیجماع و قیاس و بەرژەوەندی خەڵك.

وە ئەوانەی قەدەغەیان کردووە هیچ بەهانەیەکیان نی‌یە جگە لەوەی گومانیان ئەوەیە ئەمانە هەموو وەك بەشی بە کرێ دانە، وە بریتی‌یەکەی دیار نی‌یە لەبەر ئەوە تێك ئەچێت.

لەپاشاندا لە زانایان هەیە ئاودێری و وەرزێری بە دروست داناوە لەبەر بونی دەق لەوبارەیە، وە هەیانە کە (مضاربة) بە دروست ئەزانێت لەبەر بونی ئیجماع لەسەری بێجگە لە شتەکانی تر.

وە هەیانە هەندێك لە جۆرەکانی (مساقاة) ئاودێری و(مزارعة) کشتوکاڵ بە دروست دائەنێت، وە هەیانە ئەوجۆرە قەدەغە ئەکات کە هەندێك لە ئەسڵی سەرمایەکە بگەڕێتەوە بۆ کرێکارەکە، وەك

ناشەوانی دەست کورت (کاتێك باراشەکە دەکات هەندێك لە باراشەکەی دەدەنێ)، وە هەیانە ئەوجۆرە بە ڕەوا دائەنێت کە بەرەکەی بگەڕێتەوە بۆی و ئەسڵی شتەکە هەر بمێنێتەوە وەك شیری ئاژەڵ و بەرەچە و بێچوەکەی، بەڵام ڕاستی ئەوەیە کە ئەمانە هەموویان دروستن، و لە داخوازی‌یەکانی بنەماو ئەسڵی یاسای ئیسلامە.

چونکە ئەوە لەو هاوبەشی‌یەیە کە کرێکار تێیدا هاوبەش بێت لەگەڵ خاوەن شت دا ئەویان بە سەرمایەکەی وئەویان بە کارەکەی، وە هەرچی خوا دای هاوبەشن تێیدا.

وە ئەمە لای کۆمەڵێك لە هاوەڵەکانمان لە پێش ترە بۆ دروستی لە بە کرێ دان.

هەتا شێخی ئیسلام فەرمویەتی: ئەم هاوبەشی کردنانە حەڵاڵ ترە لە بە کرێ دان.

فەرمویەتی: چونکە بە کرێ گر سەرمایە ئەدات جا یا مەبەستەکەی دێتە جێ یا نایەتەجێ، جا بەکرێ گیراوەکە ماڵەکەی دەست ئەکەوێت، بەڵام بە کرێ گرەکە لە خەتەردایە، وە جاری وایە کشتوکاڵەکە تەواو ئەبێت وە جاری وا ئەبێت ناتەواو، بە پێچەوانەی هاوبەشی‌یەوە کە هەر دوو شەریکەکە لەسەرکەوتن و سەرنەکەوتندا یەکسانن، جا ئەگەر خوا سوودیان پێ ببەخشێ ئەوە لە سودەکەدا هاوبەشن، وە ئەگەر خوا نەیدانێ هەر دووکیان لە بێ‌بەش بووندا یەکسانن، وە ئەمەش ئەوپەڕی دادپەروەری‌یە، ئیتر یاسای ئیسلام نایەت ئەوەیان حەڵاڵ بکات و شەراکەت حەرام بکات.

وە پێغەمبەر ﷺ بڕیاری داوە لەسەر موچارەبە بەو شێوەیەی لە پێش ئیسلامدا هەبووە، وە صەحابەکان لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ و دوای مردنیشی بازرگانی‌یان کردووە بە موچارەبە، وە نەتەوەی ئیسلام لەسەری ئیجماعیان هەبووە، وە خۆی ﷺ زەوی و زاری خەیبەری دا بە جولەکەکانی خەیبەر سەرپەرشتی بکەن وئاوەدانی بکەنەوە بە ماڵی خۆیان و بەرەکەی بە نیوەیی بێت، ئەمەش وەك بە چاو ببینرێت وایە، لەپاش ئەوە نە نەسخی کردەوە، نە قەدەغەی کرد وە نە خەلیفە ڕاشیدەکانیش وهاوەڵەکانیان ئەوەیان قەدەغە کردووە دوای پێغەمبەر ﷺ، بەڵکو صەحابە ئەو کارەیان ئەکرد بە زەوی‌یەکانیان و سامانەکانیان.

ئەیاندا بەوکەسەی سەرپەرشتی بکات و لە جیاتی کرێ بەشێك لەبەرهەمەکەی دەرهێنێ، و خۆیان بە جیهادەوە خەریك ئەبوون، وە لە هیچ کەسێکیانەوە قەدەغەیی ئەو کارە نەقڵ نەکراوە ئەوانە نەبێت کە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردبێت.

لەپاشاندا فەرمویەتی: حەرام تەنها ئەوانەن کە خواو پێغەمبەر ﷺ حەرامیان کردووە، وە خوا وپێغەمبەر ﷺ هیچ لەوانەیان حەرام نەکردووە.

وە زۆر لە زانایان ئەوانەیان قەدەغە کردووە.

جا ئەگەر پیاو تووش بوو بە کەسێکەوە کە بەڵگەی هێنایەوە بۆ حەرامیەتی بەوەی لە کیتابدا بەو بەو جۆرەیەو بەو جۆرەشیان وتووە، وە ئاشکرای نەکرد کە کێ ئەوەی کردووە، چونکە گوایە بەو شێوەیە نەبێت بەرژەوەندی نەتەوەی ئیسلامی نایەتەجێ، ئەوە بۆی هەیە فێڵ بکات لەسەر ئەوە بە هەموو شێوەیەك کە پێی بگات، چونکە ئەوانە کۆمەڵێك فێڵ وتەڵەکەن کە ئەبنە هۆی کردنی ئەو کارەی کە خوا و پێغەمبەر ﷺ ڕەوایان کردووە، وە حەرامییان نەکردووە لەسەر ئوممەت.

**هەندێ نموونە لە هاوبەشییە دروستەکان :**

ئیبنوقودامە هەندێ نمونەی لە هاوبەشییە دروستەکان هێناوەتەوە لە (المغني)داو فەرمویەتی: ئەگەر کەسێك ئامێری هەبێت وکەسێکی تر خانووی هەبێت، وە بوونە هاوبەش لەسەر ئەوەی بە ئامێری ئەو لە خانووی ئەودا کار بکەن وە دەست کەوتەکەیان هاوبەشی بێت، دروستە.

وە کرێکەش بەوشێوەیە ئەبێت کە خۆیان دایان ناوە، چونکە هاوبەشییەکە دروست بووە لەسەر کارەکەیان، وە بەکار کردنیش قازانج لە هاوبەشییەکەدا بەدی دێت، وە ئامێر و خانووەکە شایستەی هیچ نین چونکە بە کاردێن لە کارە هاوبەشییەکەدا.

کەواتە ئامێرو خانووەکە وەك دوو وڵاغن کە بە کرێ ئەگیرێن بۆ گواستنەوەی شتێك خۆیان توانای هەڵگرتنیان هەبێت.

وە هەرکاتێك هاوبەشییەکە تێك چوو چییان بە دەست هێناوە بەش ئەکرێت لە بەینیان دا بەپێی کرێی کارەکەیان و کرێی ئامێر و خانوەکە.

وە ئەگەر یەکێکیان ئامێری هەبێت و ئەوی تریان هیچی نەبێت، یا یەکێکیان خانوی هەبێت و ئەوی تریان هیچی نەبێت، وە ڕێك کەوتن لەسەر ئەوەی بەو ئامێرە ئیش بکەن یا لە خانوەکەدا، و کرێکەی بەش کەن دروستە بەپێی ئەوانەی باسمان کردن.

وە فەرمویەتی: وە ئەگەر پیاوێك وڵاغەکەی دا بە کەسێکی تر کاری پێ بکات و خوا هەرچی پێدان بە نیوەیی یا بە سێیەك یان بەو شێوەیەی دایان ناوە بەشی بکەن، دروستە.

ئەپرەم لە ڕیوایەتێکدا دانی بەوەدا ناوە، هەروەها موحەممەدی کوڕی ئەبوحەرب و ئەحمەدی کوڕی سەعید، وە لە ئەوزاعیشەوە شتێك نەقڵ کراوە کە بەڵگە بێت لەسەر ئەوە.

وە حەسەن ونەخەعی بە کەراهەتیان داناوە.

وە شافیعی و ئەبوپەور و ئیبنومونذیر و خاوەن ڕاکان فەرمویانە: دروست نییە، وە قازانجەکە ئەبێ بۆ خاوەن وڵاغەکە بێت، چونکە بار هەڵگرتنەکە شایستەی ئەوەیە شتی لە جیاتی وەربگیرێت

لەوەوەیە، وە کرێکارەکەش کرێی وەك خۆی وەربگرێت، چونکە ئەمە لە بەشەکانی هاوبەشی نیە مەگەر (مضاربة) بازرگانی کردن بێت بە سەرمایەی کەسێکی تر.

وە بازرگانی کردن بە کەلوپەلی کەسێکی ترەوە دروست نیە، وە لەبەر ئەوەی (مضاربة) ئەبێت لە (عین) خودی شتدا بێت، وە ئەوشتانە دروست نیە فرۆشتنیان و دەرهێنانیان لە موڵکی خاوەنەکەی. وە قاضي فەرمویەتی: وا دەرئەچێت کە ئەو جۆرە دروست نەبێ بە گوێرەی ئەوەی کە موچارەبە بە (عروض) کەلوپەلەوە دروست نیە.

بەو شێوەیە ئەگەر کرێی وڵاغەکە لەسەر وڵاغەکە بێت ئەوە بۆ خاوەنەکەیەتی، وە ئەگەر قەبوڵی بکات شتێکی لێ بار بکرێت یا شتێکی ڕەوای لێ بار کرد وفرۆشتی کرێ ونرخەکە بۆ ئەوە، وە ئەبێ کرێیەك کە وەك ئەو بدرێت بە خاوەنەکەی بدات.

وە بەلای ئێمەوە وڵاغ شتێکە بەکار لەسەر کردن زیاد ئەکات کەواتە دروستە پەیمانی لەسەر ببەسترێت لەسەر هەندێ لەو زیاد بوونەی، وەك درهەم و دینار، وە وەك درەخت کە درا بە ئاودێر، وە وەك زەوی کە درا بە چاندن.

وە ئەوەی کە ئەڵێن: ئەمە نە لە بەشەکانی هاوبەشیە وە نە لە موچارەبەشە ئێمە ئەڵێین: بەڵێ، بەڵام خۆ لە باغەوانی وزەوی دان بە چاندن دەچێت، چونکە دانی عەینی ماڵە بە کەسێك کاری لەسەر بکات بەرامبەر هەندێ لە بەرهەم و پەرەسەندنەکەی لەگەڵ مانەوەی عەینی ماڵەکە، وە بەوە ڕوون ئەبێتەوە کە ئەگەر بیچوێنین بە مچاربەی (عرج) کەلوپەلەوە ئەوە کارێکی فاسیدە.

چونکە مچاربە تەنها بە بازرگانی ومامەڵەکردن ئەبێت بە ماڵ، وە ئەمەش بە پێچەوانەوەیە.

و فەرمویەتی: وە ئەبوداود نەقلی کردووە لە ئەحمەدەوە دەربارەی کەسێك ئەسپی خۆی لەسەر نیوەی غەنیمەت بدات بە کەسێك، فەرمویەتی: هیوادارم کە خراپی تێدا نەبێت.

ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم فەرمویەتی: ئەبوعبداللە فەرمویەتی: ئەگەر لەسەر نیوە یا چارەك بێت ئەوە دروستە، ئەوزاعیش ئەوەی وتووە، فەرمویەتی: وە زانایان وتویانە: ئەگەر تۆڕێك بدرێت بە ڕاوچیەك ماسی پێ ڕاو بکات بەوەمەرجەی هەرچی لێ دەست کەوت بە نیوەیی بێت.

ئەوە هەرچی ڕاوبکات بۆ ڕاوچیە و بۆ خاوەن تۆڕەکە کرێی ئەدرێتێ وەك عادەت، چۆن تۆڕ ئەدرێ بە کرێ ئەویش بەوشێوە ئەدرێ بە کرێ، وە ئەو قیاسەی لە ئەحمەدەوە نەقڵ کراوە ئەوەیە کە دروست بێت، وە ئەوەی بە دەستی ئەهێنن بەو شێوەیە بەش ئەکرێت کە خۆیان بریاریان داوە، چونکە شتێکە بە کار زیاد ئەکات، بەو پێیە دروستە بدرێت بە کەسێك لەسەر هەندێك لەوەی لێی زیاد ئەبێ وەك زەوی.

**كومپانیاكانی (تأمين) بيمەی ژيان :**

**شێخ ئەحمەد ئیبراهیم فەتوای داوە بە نادروستی پەیمانەكانی تەئمین لەسەر ژیان و ووتویەتی:**

ئەوەی ڕاست بێت دەربارەی پەیمانەكانی تەئمین لەسەر ژیان ئەوەیە كە كارێكی دروست نییە، وە بۆ ڕوون كردنەوەی ئەوە ئەڵێم: ئەو كەسەی كە هاوبەشی ئەكات لە كۆمپانیاكانی تەئمین دا ئەگەر لە ژیان دا هەموو قیستەكانی دا، بۆی هەیە هەموو ئەو مەبلەغەی بە قیست داویتی بە كۆمپانیاكە وەری بگرێتەوە لەگەڵ ئەو قازانجەی كردوویەتی بەپێی ئەوەی لەگەڵ كۆمپانیاكەدا ڕێك كەوتووە، جا ئەمە لە كوێ و پەیمانی موضاربەی دروست بە شەرع لە كوێ؟

پەیمانی موضارەبە: ئەوەیە یەكێك صەد دینار بدات بە كەسێكی تر بۆ ئەوەی بازرگانی پێوە بكات بەو مەرجەی قازانجەكەی بە نیسبەتێك بەش بكەن لە نێوانیاندا وە بەوپێیەی كە ڕێك ئەكەون لەسەری، نیوەی بۆ خاوەن سەرمایەكەو نیوەی بۆئەوەی كارەكە ئەكات، یەكەمیان ئەو بەشەی وەری ئەگرێ بەرامبەر ماڵەكەیەتی، وە دووەمیان بەرامبەر كارەكەی، یا ئەبێ بۆ یەكەم دوو سێ‌یەك بێ و بۆ دووەم سێ‌یەك یا بە پێچەوانە، وە بەو شێوەیە ئەبێت.

جا مەرجی بنەڕەتی دروستی موضارەبە ئەوەیە كە خاوەن سەرمایە مافی خۆی وەرئەگرێت لە قازانجەكە كە بەماڵی ئەو قازانجی كردووە بە كاری ئەو كەسەی بازرگانی‌یەكەی پێوە كردووە، جا ئەگەر بازرگانی‌یەكە نە قازانجی كردو نە زیان، سەرمایەكە بە سەلامەتی ئەدرێتەوە بە خاوەنی و هیچی تری بۆ نییە، وە هیچ نادرێت بە بازرگانی كەرەكەش لەبەرئەوەی قازانجی نەكردووە، ئەوەش بەپێی حوكمی موضارەبەیە.

وە ئەگەر بازرگانی‌یەكەی زیانی كرد زیانەكە لەسەر خاوەن سەرمایەكە ئەبێت بێ ئەوەی كابرای بازرگانی‌كەر هیچ زیانێك بكات، وە هیچیچشی نادرێتێ بەرامبەر كارەكەی، چونكە لەم حاڵەتەدا هاوبەشە نەك بە كرێ‌گیراو.

بەڵام ئەگەر خاوەن ماڵەكە مەرجی ئەوەی دانابێت لەسەر بازرگانی‌كەرەكە كە ئەندازەیەكی دیاری كراو وەربگرێت لەسەر سەرمایەكەوە، بازرگانی‌یەكە قازانج بكات یا زیان، ئەم مەرجە بەتاڵە، چونكە ئەوە ئەبێتە هۆی بڕینی هاوبەشی‌یەكە لە قازانجەكەدا، ئەوەش پێچەوانەی حوكمی موچارەبەیە، یا ئەبێتە هۆی ناچار كردنی بازرگانی كەرەكە بە دانی مەبلەغێك لەماڵی تایبەتی خۆی بە خاوەن ماڵەكە، ئەمەش مەرجێكی فاسیدە و خواردنی ماڵی خەڵكە بە ناهەق.

لەپاشاندا ئەگەر پەیمانی موضارەبە بەو مەرجەی باسمان كرد پوچەڵ بێتەوە كە ئەو مەرجە لە پەیمانی تەئمین دا هەیە، ئەگەر بازرگانی‌یەكە قازانجی كرد قازانجەكە هەمووی بۆ خاوەن سەرمایە

ئەبێت و کابرای بازرگانی‌کەریش ئەوەندە کرێ وەربگرێت کە هاوشێوەی خۆی وەری ئەگرێت لە خاوەن سەرمایە هەرچەندە بێت، لەسەر ڕیوایەتی ئەسڵ لە محمەدەوە ڕەحمەتی خوای لێ بێت (کە قوتابی ئەبوحەنیفەیە) چونکە کابرای بازرگانی کەر بە پوچەڵ بوونەوەی موچارەبەکە ئەبێت بە کرێ گیراو، وە لەوە دەرئەچێت کە هاوبەش بوبێت.

وە لەسەر قسەی ئەبویوسف کە فەتوای پێ داوە، بۆ کارگێڕەکە کرێی دانراو ئەبێت بەرامبەر کارەکەی بێ ئەوەی لەو ڕادەیە دەرچێت کە لەسەری ڕێك کەوتوون لە پەیمانەکەدا، ئەمەش بۆیە بەو شێوەیەیە چونکە موضارەبەکە ئەگەر دروست بوایە هیچ نەئەدرا بە کارگێڕەکە جگە لەوەی کە لەسەری ڕێك کەوتبون لە قازانجەکەیدا، جا ئەگەر پەیمانەکە پوچەڵ بوو ئیتر پێویست ناکات کارگێڕەکە سوودێکی زۆرتر وەربگرێت لەوەی کە پەیمانەکەی ڕاست بێت. وە قسەکەی موحەممەد لە ئەسڵدا (قیاس)ە.

وە قسەکەی ئەبویوسفیش (استحسان)ە لەبەر ئەو واتایەی باسمان کرد، جا ئەوەیە موچارەبەی شەرعی، وە ئەوەیە حوکمەکانی . . . ، جا ئایا پەیمانی تەئمین (بیمە) ئەچێتە ژێر موچارەبەی دروستەوە؟ وەڵام: نەء.

کەواتە ئەچێتە ژێر موچارەبەی بەتاڵەوە، وە حوکمەکەشی بەپێی شەرع ئەبێ کە لێرەدا بیستت.

کە ئەویش پێچەوانەی حوکمی پەیمانی تەئمینە بەپێی یاسا وقانون. وە ناتوانرێت بووترێت کومپانیاکە چی لەسەر دانراوە ئەیبەخشی بەو کەسەی خۆی تەئمین کردووە، چونکە تەبیعەتی پەیمانی تەئمین لە ڕوی یاساییەوە ئەوەیە کە لە پەیمانەکانی (معاوضە)ی ئیحتیمالیە. (واتە گۆڕینەوەیەك کە ڕێی تێ ئەچێ) وە ئەگەر ووترا ئەو پارەیەی کە تەئمین کەر (بیمە کراو) خۆی ئەیدات بە کومپانیاکە بە قەرز دائەنرێت لەگەڵ قازانجەکەیدا وەری ئەگرێتەوە ئەگەر ژیا، کەواتە ئەوە قەرزێکە سوودی ڕاکێشاوە، ئەوەش حەرامە و ئەو (ربا)یەیە کە قەدەغە کراوە.

بە گشتی ئەم بابەتە لەسەر هەرچی ڕویەك دایبنێیت لەگەڵ ئەو پەیمانانەدا جۆر نایێت کە شەریعەتی ئیسلام بە ڕاستی داناوە، جائەوەی پێشکەشمان کرد دەربارەی ئەو کەسەیە ئەگەر لە ژیانی دا ماو دوای ئەوەی چی لەسەر خۆی دانابوو بەقیست تەواوی کردبوو، بەڵام ئەگەر مرد پێش ئەوەی قیستەکان تەواو بدات –چونکە جاری وا دەبێت ئەو کەسە ئەمرێت قیستێك نەبێت نەیداوە–، وە جاری وایە ئەو مەبلەغە کە ئەمێنێ بیدات زۆر زۆرە، چونکە مەبلەغی تەئمین لەسەر ژیان چەندێتی‌یەکەی بەستراوە بە دوو لایەنی پەیمانەکەوە، وەك مەعلومە، جا ئەگەر کومپانیاکە ئەوە مەبلەغەی لەسەری ڕێك کەوتبون بە تەواوی دای بە میرات گرەکانی کابرا یا بەو کەسەی کە

مردووەکە خۆی کردبووی بە سەرپەرشتی کەری وەرگرتنی ئەوەی لەسەر کومپانیاکە دانراوە دوای مردنی.

ئایا کۆمپانیاکە بەرامبەر چ شتێك ئەو مەبلەغە زۆرە بدات؟.

ئایا ئەمە (مغامرة) خستنە مەترسی و جەربەزەیی نی‌یە؟

وە ئەگەر ئەوە خوددی موغامەرە نەبێت ئەی موغامەرە چۆنە؟ !

وە ئایا بە بیردا دێت شەرعێك کە حەرامی کردبێت ماڵی خەڵك خواردن بە ناحەق، ڕێ بدات مردنی کەسێك سەرچاوە بێت بۆ میرات گیرەکانی یا ئەوانەی جێی ئەگرنەوە دوای مردنی کە قازانجێکی زۆریان دەست بکەوێت کە لەپێش مردنی لەگەڵ لایەنێکی تری سەرەڕۆ و هەڵەشەدا پەیمانی بەستووە کە لە دوای مردنی ئەم بیدات بەوان؟

لەگەڵ ئەوەی کە بۆیان هەیە ڕێك بکەون لەسەر هەر مەبلەغێك بێت؟

وە چ کاتێك ژیانی ئادەمیزاد و مردنی بووەتە جێی بازرگانی و بووەتە شتێك کە بە ماڵ هەڵسەنگێنرێ بێ ئەوەی چەندێتی‌یەکەی و ڕادەکەی و سنورەکەی وەستابێت، بەڵکو بدرێتە دەست پەیمان بەستەکان؟ لەسەر ئەوەشەوە موغامەرەکە لەلایەکی تریشەوە دێتە ئەنجام، چونکە ئەو کەسەی کە ژیانی تەئمین کراوە دوای ئەوەی هەموو ئەو قیستانەی لەسەری دانراوە بیدات ئینجا ئەوەی بۆ ئەبێت.

وە ئەگەر مرد پێش ئەوەی هەموویان بدات ئەوە بۆ وەرەسەکەی ئەبێت.

ئایا ئەمە قومارو موغامەرە نی‌یە؟

لەکاتێکدا نە خۆی و نە کۆمپانیاکە نازانن چی ڕوو ئەدات...

**ڕێك کەوتن (صلح)**

**پێناسەکەی:**

(صلح) لە لۆغەتدا: نەهێشتنی ناکۆکی و کێشەیە.

وە لە شەرعدا: پەیمانێکە کۆتایی بە کێشەو ناکۆکی دەهێنێت لەنێوان خاوەن کێشەکاندا، وە بە هەریەکێ لە پەیمان بەستەکان ئەوترێ ڕێك کەوتوو، وەبەو مافەی کێشەکەی لەسەرە ئەووترێت: ڕێك کەوتوو لە جیاتی. وە بەو شتەی کە یەکێ لە خاوەن کێشەکان ئەیدات بەوی تر بۆ نەهێشتنی کێشە: ڕێك کەوتوو لەسەری، یا بریتی ڕێك کەوتن.

**دانانی:**

ڕێك کەوتن بە قورئان و سوننەت و ئیجماع دانراوە بۆ ئەوەی‌یەك کەوتن جێگای ناکۆکی بگرێتەوە. وەبۆ ئەوەی ڕق وکینە لە نێوان ئەوانەدا نەمێنێ کە لە نێوان یەکدا گێرە وکێشەیان هەیە. لە قورئاندا خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ (الحجرات/٩).

واتە: وە ئەگەر دوو کۆمەڵ لە موسڵمانەکان بە جەنگ هاتن ئێوە ڕێکیان بخەنەوە، جا ئەگەر کۆمەڵێکیان زیادەڕەوی کرد بەسەر کۆمەڵەکەی تردا ئێوە بە هەمووتان لەو کۆمەڵە بدەن کە زیادەڕەوی ئەکات هەتا ئەگەڕێتەوە ژێر فەرمانی خوا، جا ئەگەر گەڕایەوە ئەوە بە دادپەروەری ڕێکیان بخەنەوە، وە دادپەروەری بکەن، چونکە خوا دادپەروەرانی خۆش ئەوێت.

وە لە سوننەت دا: ئەبوداود و ترمژی و ئیبنوماجە وحاکم و ئیبنوحیببان ئەگێڕنەوە لە عەمری کوڕی عەوفەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الصلح جائزٌ بين المسلمين، إلا صلحاً حَرَّمَ حلالاً أو أحلَّ حَراماً)[1].

واتە: ڕێك کەوتن دروستە لە نێوان موسڵمانان دا جگە لەو ڕێك کەوتنەی کە حەڵاڵێك حەرام بکات، یا حەرامێك حەڵاڵ بکات.

وە ترمذي ئەوەی زیاد کردوە (والمسلمون على شروطهم).

واتە: موسڵمانەکان لەسەر مەرجەکانیانن.

لەپاشاندا فەرمویەتی: ئەمە فەرمودەیەکی حەسەن و صەحیحە.

وە عومەر ﷺ فەرمویەتی: (رُدُّوا الخصومَ حتى يصطَلِحوا، فإنَّ فصلَ القضاءِ يورِثُ بينهم الضغائنَ).

واتە: ناکۆکی و کێشە بگێڕنەوە هەتا ڕێك ئەکەون، چونکە کاری دادگا ڕق و کینە لە دڵیاندا ئەهێڵێتەوە.

وە موسڵمانان هەموو ئیجماعیان هەیە کە ڕێك کەوتن لەنێوان خاوەن کێشەکاندا دروستە.

---

(١) أبوداود (٣٥٩٤) والترمذي (١٣٥٢) وابن ماجه (٢٣٥٣) والحاكم (٢/٤٩) وابن حبان (٥٠٩١).

**پایەکانی:**

وە پایەکانی (صلح) ڕێك کەوتن: (الإیجاب) و (القبول) دان و وەرگرتنە بە هەر زاراوەیەك بێت کە سولحی پێ بکرێت وەك ئەوەی بلێت: ئەو سەدەی لەسەرمە بە پەنجا ڕێك ئەکەوم لەگەڵتا. ئەوی تریان بلێت: قەبولم کرد (وەرم گرت).

وە هەرکاتێك ڕێك کەوتنەکە تەواوبوو پەیمانەکە ئەبێتە پەیمانێکی لازم، وە دروست نی یە کەسیان بێ ڕازی بونی ئەوی تریان هەڵی وەشێنێتەوە، وە بەپێی ڕێك کەوتنەکە (مدعي) داواکار ئەبێتە خاوەنی (بدل) بریتی ڕێك کەوتنەکە وداوا لەسەرکراو مافی ئەوەی نی یە بیسێنێتەوە، وە داوای داواکارەکە کۆتای دێت و ئیتر جارێکی تر گوێی لێ ناگیرێ لەو بارەیەوە.

**مەرجەکانی:**

مەرجەکانی ڕێك کەوتن هەندێکیان ئەگەڕێنەوە بۆ ڕێك کەوتوەکە وهەندێکیان بۆ ئەوەی کە لەسەری ڕێك کەوتون، وە هەندێکیان بۆ ئەوەی کە ڕێك کەوتنەکە لە جیاتی کراوە.

**مەرجەکانی ڕێك کەوتوو:**

ئەبێ ئەوکەسە لەوانە بێت کە بەخشینی دروست بێت، چونکە ئەگەر ڕێك کەوتوەکە لە وانەبوو بەخشینی دروست نەبێت وەك شێت و منداڵ و سەپەرشتی کەری هەتیو یا سەرپەرشتی کەری شتی وەقف کراو، ڕێك کەوتنی ئەمانە دروست نی یە چونکە ڕێك کەوتن بەخشینە ئەوانیش خاوەنی بەخشین نین، وە دروستە ڕێك کەوتنی منداڵی خاوەن تەمییزو سەرپەرشتی کەری هەتیو و سەرپەرشتی کەری شتی وەقف، بەمەرجێك بەرژەوەندی منداڵەکەو هەتیوەکە ووەقفەکەی تێدابوو، وەك ئەوەی قەرزێك هەبێت لەسەر کەسێك بەڵام بەڵگەی وەها نەبێت ئەو قەرزە بچەسپێنێت. وە خاوەن قەرزەکە لە گەڵ قەرزارەکەدا ڕێك ئەکەوێت هەندێك لە قەرزەکەی بداتەوە ئەویش واز لە بەشەکەی تری بهێنێ.

**مەرجەکانی لەسەر ڕێك کەوتوو:**

١- ئەبێ ماڵێکی هەڵسەنگێنراوبێت و بتوانرێت تەسلیم بکرێت، یا ئەبێت کەڵك و سوود بێت.

٢- ئەبێ دیاری کراو بێت، و نادیاری نەبێت بەشێوەیەك کە بێتە هۆی کێشەوگێرە، ئەگەر پێویستی بە تەسلیم کردن و وەرگرتن هەبوو.

حەنەفی‌یەکان وتویانە: ئەگەر ئەو شتە پێویستی یە پێ دان و وەرگرتن نەبێت مەرج نی‌یە دیاری بێت، وەك ئەوەی دوو کەس داوای بوونی شتێك بکەن لە یەکتر لەپاشاندا ڕێك بکەون لەسەر ئەوەی هەرکەس مافەکەی بخاتە بریتی ڕێك کەوتنەکە.

وە شەوکانی دروستی ڕێك کەوتنی بە شتی نادیار لە جیاتی شتی دیار (تەرجیح) پارسەنگ داوە.

لە ئومو سەلەمەوە خوا لێی ڕازی بێت کە فەرمویەتی: دوو پیاو هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ کێشەیان هەبوو لەسەر میرات کە ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێ پەڕی بوو هیچیان شایەتیان نەبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إنکم تختصمون إلی رَسول الله، وإنما أنا بَشر، ولعل بَعضَکم ألحن بحجته مِن بعض، وإنما أقضي بینکم علی نحو ما أسمع، فمن قضیت له من حق أخیه شیئاً فلا یأخذه، فإنما أقطع له قطعة من النار یأتي بها إسطاماً في عنقه یوم القیامة).

واتە: ئێوە کێشەتان هێناوە بۆلای نێرراوی خوا، وە منیش ئادەمیزادێکم، وە لەوانەیە یەکێکتان لەوەی ترتان بەڵگە زۆرتر بهێنێتەوە، وە منیش لە نێواندا حوکم ئەکەم بەپێی ئەوەی ئەی بیسم. جا هەرکەس شتێکم لە مافی براکەی بۆ بڕی با وەری نەگرێت، چونکە پارچە ئاگرێکم بۆ پچڕیوە ڕۆژی دوایی کاتێ دێت وەك کۆڵەوژ لە ملیدا ئەبێت.

ئەڵێ: هەر دوو کیان دەستیان کرد بەگریان، هەریەکەیان ئەی وت: مافەکەی من بۆ براکەم. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (أما إذا قلتما فاذهبا فاقتسما ثم توخیا الحق، ثم استهما ثم لیحلل کل واحد منکما صاحبه). رواه أحمد وأبوداود وابن ماجه.

واتە: مادام ئەوەتان وت بڕۆن بەشی بکەن و بەهەق بەشی بکەن، پاشان قورعەی بۆ بکەن لە پاشاندا گەردنی‌یەکتر ئازاد بکەن.

وە لە ڕیواتەکەی ئەبوداوددا هاتووە: (وإنما أقضي بینکم برأیي فیما لم ینزل عليَّ فیه)[1].

واتە: من بە ڕای خۆم حوکمتان ئەکەم لەوەدا کە دەربارەی هیچم بۆ نەهاتۆتە خوارەوە.

شەوکانی فەرمویەتی: وە ئەو بەڵگەیەی تێدایە کە دروستە گەردن ئازادکردن لەسەرشتی نادیار، چونکە هەرچی لە ئەستۆی هەر یەکەیان دا هەیە لێرەدا دیاری نی‌یە، وە دووبارە ئەوەی تێدایە کە دروستە ڕێك کەوتن بەشتی دیاری لە جیاتی شتی نادیار، بەڵام ئەبێت گەردن ئازادکردنی تێدا بێت.

(١) أحمد (٦/٣٢٠) وأبوداود (٣٥٨٣-٣٥٨٥) وابن ماجه (٢٣١٧).

وە لە (البحر)دا هاتووە لە ناصر و شافیعی‌یەوە کە فەرمویانە: دروست نی‌یە ڕێك کەوتن بە شتی دیار لە جیاتی نادیار.

**مەرجەکانی ڕێك کەوتن لە بریتی (ئەو مافەی کێشەکەی لەسەرە):**

**ئەبێ ڕێکەوتن لەسەر کراو ئەم مەرجانەی خوارەوەی تێدا بێت:**

١- ئەبێ مالێکی هەڵسەنگێنراوبێت یان سوود و کەڵکێك بێت، وە زانین پێ‌ی مەرج نی‌یە چونکە پێویستی تەسلیم کردنی تێدا نی‌یە.

لە جابیرەوە ئەگێڕنەوە کە باوکی لە جەنگی ئوحوددا شەهید کرا، بەڵام قەرزداربوو خاوەن قەرزەکان زۆریان بۆ هێنا لەسەرمافەکەیان. ئەڵێت: هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی داوایان لێ بکات بەر وبومی باغەکەم قبوڵ بکەن وگەردنی باوکم ئازادکەن، بەڵام ئەوان قبوڵیان نەکرد، وە پێغەمبەر ﷺ نەیدانێ و فەرمووی: بەیانی دێین بۆ لات، پێغەمبەر ﷺ بەیانی هاتە لامان وبە ناو دارەکاندا سوڕایەوە ودوعای بۆ کردین کە خوا بەرەکەت بخاتە بەرەکەیەوە. ئەڵێ: کاتێ بەرەکەمان ڕنی قەرزەکانی ئەوانیشم دایەوەو بەشی خۆشمان مایەوە.

وە لە زاراوەیەکی تردا هاتووە: کە باوکی مرد و سی وەسەقی کابرایەکی جولەکە قەرزداربوو جابیر داوای لێ کرد لێ‌ی بوەستێت بەڵام قەبوڵی نەکرد، ئینجا جابیر هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ داوای لێ کرد کە بە کابرای جولەکە بڵێت. پێغەمبەر ﷺ هات بۆلای جولەکە وداوای لێ کرد بەر وبومی باغەکەی لێ وەربگرێت لە جیاتی قەرزەکە بەڵام قبوڵی نەکرد. پێغەمبەر ﷺ چووە ناو دارخورماکان و پێ‌یاندا گەڕا و بە جابیری فەرموو: (جُز لە فأوف الذي لە).

واتە: میوەکە بڕنە و چی لەسەر باوکتە بیدەرەوە بە جولەکەکە.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە جابیر باغەکەی ڕنی سی وەسەق خورماکەی داوە بە جولەکەکە وحەڤدە وەسەقیشی مایەوە بۆ خۆیان. بوخاری گێڕاویەتی‌یەوە[1].

شەوکانی فەرمویەتی: ئەم حەدیسە ئەوە ئەگەیەنێ کە دروستە سوڵح کردن بە شتی نادیار لەسەر شتی دیار و مەعلوم.

٢- ئەبێ مافێك بێت لە مافەکانی بەندەکانی خواو دروست بێت لە جیاتی ئەو بریتی وەربگیرێت، با ماڵیش نەبێت وەك تۆڵە (قصاص). بەڵام مافەکانی خوا ڕێك کەوتنیان تێدا نی‌یە، جا ئەگەر زیناکەر یا دز یا ئارەق خۆر لەگەڵ ئەو کەسەدا ڕێك بکەوێت کەگرتویەتی بۆ ئەوەی بیدات بەدادگا

(١) البخاري (٢٣٩٥و٢٣٩٦).

وە شتێکی بداتێ بۆ ئەوەی بەرەڵای بکات ئەو ڕێك کەوتنە دروست نیە، چونکە ئەو شتانە دروست نیە شتیان لە جیاتی وەربگیرێت، وە وەرگرتنی بریتی لەو شێوەیەدا بەرتیلە.

وە هەروەها دروست نیە ڕێك کەوتن لەسەر حەددی قەزف (تۆمەتی زینا هەڵبەستن) چونکە بۆ تەمێ کردن و ترساندنی خەڵك دانراوە کە بەلای شەرەف و نامووسی کەسدا نەچن. هەرچەندە ئەمە مافی بەندەکانی خوای تێدایە بەڵام بەزۆری مافی خوایە.

وە ئەگەر تاوانبارێك لەگەڵ شایەتدا ڕێك بکەوێت کەشایەتیەکە بشارێتەوە کە مافی خوای تێدا بێت، یا مافی ئادەمیزادێکی تێدا بێت، ئەو ڕێك کەوتنە دروست نیە لەبەر حەرامی شاردنەوەی شایەتی، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلاَ تَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ وَمَنْ يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ﴾ (البقرة/٢٨٣).

واتە: شایەتی مەشارنەوە، وە هەرکەس شایەتی بشارێتەوە ئەو کەسە دڵی ڕەشە وتاوانبارە.

وە هەروەها ئەفەرموێت: ﴿وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ﴾ (الطلاق/٢).

واتە: لەرێی خوادا شایەتی بدەن.

هەروەها ڕێك کەوتن لەسەر وازهێنان لە (شفعة) هەڵگرتنەوە دروست نیە، وەك ئەوەی کڕیار شتێك بدات بە هاوبەش کەواز لە بەشی هاوەڵەکەی بهێنێ و هەڵی نەگرێتەوە، ئەو ڕێك کەوتنە پوچەڵە، چونکە (شفعة) بەش هەڵگرتنەوە بۆ ئەوە دانراوە کە زیان لە هاوبەشەکان دوربخاتەوە، وە بۆ ئەوە دانەنراوە سوودی ماڵی بکەن، وە هەروەها ڕێك کەوتن لەسەر دەعوای ژن ومێردی دروست نیە.

**بەشەکانی ڕێك کەوتن:**

ڕێك کەوتن یا لەسەر دان پیانان ئەبێت، یا لەسەر ئینکاری کردن ئەبێت، یا لەسەر بێدەنگ بوون ئەبێت.

**ڕێك کەوتن لەسەر دان پیانان :**

ئەو جۆرە ڕێك کەوتنەیە کە ئادەمیزادێك داوای ئەوە بکات قەرزێك یا شتێك یا سودێکی لەسەر کەسێکی ترە. جا داوا لەسەرکراو دان ئەنێت بە داواکەیداو ئیعتیراف ئەکات لەپاشاندا ڕێك ئەکەون لەسەر ئەوەی کە داواکار شتێك لە داوا لەسەرکراو وەربگرێت، چونکە ئادەمیزاد ڕێی لەوە ناگیرێت کە هەموو مافەکەی بخات یا هەندێکی.

ئەحمەد ﷺ فەرمویەتی: ئەگەر کەسێك لەم بارەیەوە ببێتە تکاکار گوناهبار نابێت چونکە پێغەمبەر ﷺ لەو بارەیەوە قسەی لە گەڵ خاوەن قەرزەکانی جابیر کرد ئەوانیش لە نیوەی خۆش بوون، وە قسەی لەگەڵ کەعبی کوڕی مالیك کرد ئەویش لە نیوەی قەرزەکەی خۆش بوو.

وە ئیمامی ئەحمەد ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات کە ئەسائی و جگە لەو لە کەعبی کوڕی مالیکەوە ئەگێڕنەوە کە قەرزی لەسەر ئیبنو ئەبوحەدرەد بووە و داوای کردۆتەوە لە مزگەوتدا دەنگیان بەرز بۆوە لەسەری هەتا پێغەمبەر ﷺ گوێی لە دەنگیان بوو لە ماڵەوە، هاتەدەر بۆلایان پەردەی ژوورەکەی هەڵدایەوەو فەرموی: ئەی کەعب. ووتی: بەڵێ ئەی نێرراوی خوا، و ئاماژەی بۆ کەعب کرد کە لە نیوەی قەرزەکەی خۆش ببێت، ئینجا پێغەمبەر ﷺ بە کابراکەی فەرموو: هەڵسە برۆ ئەوەی ماوە بیدەرەوە[1].

لەپاشاندا ئەگەر داوا لەسەرکراو دانی نا بەوەدا کە پارەی لایەو لەسەر پارە رێك کەوتن ئەوە ئەم کارە بە صەرف دائەنرێت و ئەبێ مەرجەکانی تێدابێ، بەڵام ئەگەر دانی بە پارەدا ناو لەسەر کەلوپەل رێك کەوتن یا بە پێچەوانەوە. ئەمە فرۆشتنەو هەموو حوکمەکانی فرۆشتنی تێدا ئەچەسپێت.

وە ئەگەر دانی نا بە پارەدا یا بە کەلوپەلدا و لەسەر شتێك رێك کەوتن کە سوودی هەبێت وەك خانوو و شوێنی دانیشتن و خزمەت گوزاری ئەمەشیان ئیجارەیە، وە حوکمەکانی ئیجارەی تێدا سابت ئەبێت.

وە ئەگەر ئەو مافەی کێشەکەی لەسەرە جێبەجێ کرا، داوا لەسەرکراو مافی خۆیەتی کە بەدەلی سوڵح واتە ئەو شتەی لە جیاتی رێك کەوتنەکە داویەتی بیگێڕێتەوە، چونکە بۆیە داویەتی کە ئەوەی لە دەستیایەتی بمێنێتەوە. وە کاتێك بەدەلەکە پێویست بوو بۆ داواکار، ئەوکاتە ئەبێ داوا لە داوا لێکراو بکات، چونکە ئەو بۆیە دەستی لە شتەکەی هەڵگرتوە کە بەدەلەکەی بدرێتێ.

رێك کەوتن لەسەر ئینکاری کردن:

سوڵح لەسەر ئینکاری ئەوەیە: کە کەسێك داوای شتێکی یا قەرزێکی یا سوودێکی کە لای کەسێکی ترە بکات، ئەویش ئینکاری لێ بکات لەپاشاندا رێك بکەون.

---

(١) البخاري (٢٧١٠) ومسلم (١٥٥٨/٢٠).

**ڕێك کەوتن لەسەر بێدەنگی :**

ئەوەیە کەسێك داوا بکات کە شتێکی لەسەر کەسێکی ترە بەڵام داوا لەسەر کراو بێدەنگی لێ ئەکات، نە دانی پێدا ئەنێت نە ئینکاری لێ ئەکات.

**حوکمی ڕێك کەوتن لەسەر ئینکاری کردن و بێدەنگی لێ کردن:**

جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون کە دروستە ڕێك کەوتن لەبری ئینکاری وبێ دەنگی کردن.

وە ئیمامی شافیعی و ئیبنوحەزم ووتویانە: ڕێك کەوتن دروست نی‌یە جگە لە ڕێك کەوتن لەسەر (إقرار) دان پیانان، چونکە ڕێك کەوتن مافێکی سابت پێویست ئەکات، و ئەو مافە سابتە لە ئینکاری و بێدەنگی کردندا نی‌یە. ئەمما لە حاڵەتی ئینکاری دا بۆیە ڕێ‌کەوتن دروست نی‌یە چونکە ماف سابت نابێت، وە ئەو داواکردنە بەرپەرچ دراوەتەوە بە ئینکاری‌یەکە، وە لەگەڵ بەرپەرچ دانەوەدا ماف سابت نابێت. چونکە ئەو کەسەی بێ دەنگە لەسەر ئەو داوایەی کە لەسەری داوا کراوە، ئەوکارەی بە ئینکاری دائەنرێت، وە هەتا شایەت لەسەری نەبێت حوکم نادرێت، و لەبەر ئەوەی حوکمەکان (معارچهی یەکتر دەکەن ئەو مافە سابت نابێت.

وە ئەمما سوڵح کردن لەسەر بێ دەنگی بۆیە دروست نی‌یە، چونکە داوا لێ‌کراو کاتێك بێ دەنگ ئەبێت بەوە حیساب ئەکرێت کە ئینکاری ئەو مافە ئەکات، هەتاوەکو بەڵگەی ئیقراری لێوە نەبیسترێت، وە ماڵ دان لەلایەن ئەوانەوە بۆ لابردنی گێرەو کێشە دروست نی‌یە، چونکە گێرەو کێشە لەمەدا باتڵە -کەواتە ئەو ماڵ دانە بە بەرتیل دائەنرێت- کە ئەمیش قەدەغەیە لە شەرع دا بەپێی فەرمودەی خوای گەورە کە ئەفەرموێت: ﴿وَلاَ تَأْكُلُوا أَموالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ وتُدْلُوا بِهَا إِلَى الْحُكَّامِ لِتَأْكُلُوا فَرِيقًا مِنْ أَمْوَالِ النَّاسِ بِالإِثْمِ وأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ (البقرة: ١٨٨).

واتە: ماڵی‌یەکتری لەناو خۆتاندا بە نارەوا مەخۆن وە بە بەرتیل مەی بەن بۆ کاربەدەست و فەرمان ڕەوا بۆ ئەوەی کۆمەڵێك ماڵی خەڵك بە تاڵان بخۆن لەحاڵێکدا کە ئێوەش ئەزانن ئەو کارە قەدەغە کراوە.

وە هەندێ لە زانایان لەم بارەیەوە ڕای مام ناوەندی‌یان هەیە نە بە تەواوی قەدەغەیان کردووە نە بە تەواوی ڕەوایان کردوە، وە فەرمویانە: واباشە بوترێ کە ئەگەر داواکار بزانێت مافێکی هەیە بە سەر بەرامبەرەکەیەوە بۆی دروستە ئەوەی لەسەری ڕێك کەوتون وەری بگرێت.

یا بەرامبەرەکەشی ئینکاری لێ بکات، وە ئەگەر ئەوەی داوای ئەکرد نارەوابوو، ئەو کەسە حەرامە لەسەری داواکردن، وە وەرگرتنی ئەوەی کە لەسەری ڕێك کەوتون.

وە ئەگەر داوا لەسەرکراو مافی کەسێکی لابوو ئەشی زانی بەڵام ئینکاری لیّ ئەکرد لەبەر مەبەستێك پێویستە لەسەری ئەوە تەسلیم بکات کە لەسەری ڕێك کەوتون، وە ئەگەر ئەیزانی مافی کەسی لا نیيە دروستە بۆی هەندێ لە ماڵەکەی بدات بۆ ئەوەی ناکۆکی و کێشە لە نێوانیاندا کۆتایی بێت، بەڵام حەرامە لەسەر داواکار وەری بگرێت، وە بەو شێوەیە بەڵگەکان کۆئەبنەوە: کەواتە ناوترێت ڕێ کەوتن لەسەر ئینکاری دروست نیيە، یا بوترێت: بە هەموو شێوەیەك دروستە. بەڵکو شی کردنەوەی تێدا دەکرێت[1]. وە ئەوانەی ڕێکەوتنیان لەسەر ئینکاری و بێدەنگە کردن بە دروست داناوە وتویانە: بەڕاستی حوکمەکەی بۆ داواکار ئەبێت بە گۆڕینەوە.

وە حوکمەکەی بۆ داوا لەسەرکراو ئەبێتە بریتی بۆ سوێندەکەی وە بۆ ئەوەی ناکۆکی و کێشە لە خۆی دوور بخاتەوە.

وە لەسەر ئەوەوە ئەوترێت: بەدەلی سوڵح ئەگەر (عین) شت بوو ئەوە وەك کڕین و فرۆشتنی لیّ دێت و هەموو حوکمەکانی کڕین و فرۆشتنی بەسەردا ئەسەپێ .

وە ئەگەر ئەوشتەی سوڵحی لەسەر کراوە سوودو مەنفەعەت بوو مانای ئیجارەی هەیە و حوکمەکانی ئیجارە ئەیگرێتەوە.

بەڵام ئەوەی ڕێك کەوتنەکەی لە جیاتی کراوە وەك ئەوانە نیيە، چونکە بۆ نەهێشتنی ناکۆکیيە نەك بریتی بێت بۆ ماڵێك، وە هەرکاتێك داواکار شایستەی ئەوە بوو کە بریتی ڕێ کەوتن وەرگرێت بەڵام داوا لەسەرکراو نەیدایە، داواکار ناکۆکیيەکە ئەگێڕێتەوە سەر داوا لەسەرکراو، چونکە بۆیە وازی لە داواکەی هێناوە کە بەدەل و بریتیيەکەی تەسلیم بکرێت.

(١) لە کتێبی (فتح العلام شرح بلوغ المرام) وەرگیراوە.

وە هەرکاتێك داوا لیّ‌کراو بەدەلەکەی دا بە داواکار و داواکار ئەو شتەی کە سوڵحی لەجیاتی کراوە نەیدا بە داوا لیّ‌کراو ئەوکاتە داوا لەسەرکراو ئەگەڕێتەوە سەر داواکار، چونکە ئەو بریتیيەی بۆیە داوە کە کە ئەوشتەی سوڵحی لەجیاتی کراوە تەسلیمی بکرێت، جا ئەگەر بەدەلەکەی داو مەبەستەکەی نەهاتە دی ئیتر ئەگەڕێتەوە سەر داواکار.

**ڕێکەوتن لەسەر قەرزی دواخراو بە هەندێکی حازر:**

**ئەگەر دووکەس ڕێك کەوتن لەسەر قەرزێکی دواخراو بە هەندێکی حازر ئەو ڕێك کەوتنە دروست نی‌یە لای حەنبەلی‌یەکان و ئیبنوحەزم، ئیبنوحەزم لە (المحلی) دا فەرمویەتی:**

**ڕێك کەوتنێك کە گەردنی تێدا ئازاد بکرێت لەبری هەندێك قەرز کە دوا خراوە دروست نی‌یە بە هیچ شێوەیەك، چونکە مەرجێکە لە قورئان دا نی‌یە، لەبەر ئەوە پوچەو بەتاڵە.**

**بەڵام ئەگەر قەرزەکە ماڵ بێت بە گەردنی‌یەوە ئەوکاتە بۆی هەیە لەسەر قەرزدارەکەی دوا بخات بە ئارەزووی خۆی و بەبێ مەرج چونکە ئەوکارە کاری خێرە.**

**وە ئیبنوموسەییب و قاسم و مالیك و شافیعی و ئەبوحەنیفە بە کەڕاهەتی دائەنێن.**

**وە ئەگێڕنەوە لە ئیبنوعەبباس و ئیبنوسیرین و نەخەعی‌یەوە کە فەرمویانە: قەیناکە.**

## دادوەری (القضاء)

**دادوەری ئامانجی نامەو پەیامەکانی خوایە:**

**بەڕاستی دادوەری بەهایەکە لە بەها بەرزەکانی ئیسلامی.**

**چونکە بەرز کردنەوەو بەرپا کردنی ڕاستی و دادپەروەری‌یە کە دڵنیایی ئەخاتە دڵی هەموان، وە ئاسایش بڵاو ئەکاتەوە و پەیوەندی نێوان ئەندامەکانی کۆمەڵ بە هێز ئەکات، وە متمانە لە نێوان سەرۆك و بەردەستەکانی بە هێز ئەکات، وە سامان گەشە پێ ئەکا، و هەرزانی ئەخاتەوە، و وەزعی کۆمەڵ چاك ئەکات، و نایەڵێت تووشی شپرزەیی و تێك چوون بێت. وە کاربەدەست و ژێردەستەکانیان هەر یەکە بە لای ئەو مەبەستەوە ئەچێت کە لە کارەکەی دا هەیەتی لە بەرهەم هێنان و خزمەتی وڵات، بێ ئەوەی شتێك لە ڕێیدا بوەستێ و گورج و گۆڵی ڕابگرێت، یا پەکی بخات لە بوژانەوە و ڕاپەڕین.**

**وە دادپەروەریش تەنها بەوە بەدی دێت کە هەر خاوەن مافێك مافی خۆی پێ بگەیەندرێ و حوکم بکرێ بەپێی ئەوەی کە خوا دایناوە لە حوکمەکانی ئیسلام، وە بە دوورکەوتنەوە لە ئارەزووکاری و یەکسانی کردن لەنێوان خەڵکدا.**

**وە ئەرك و کاری گرینگی نێرراوەکانی خواش هەر ئەوە بووە کە بەو فەرمانە هەڵبستن و جێ‌بەجێی بکەن.**

**وە کاری شوێنکەوتوانی ئەو پێغەمبەرانەش هەر ئەوەبووە کە لەسەر ئەوبەرنامە و پرۆگرامە بڕۆن، بۆ ئەوەی پێغەمبەرایەتی بمێنێ و خەڵك لە سایەی دا بحەوێنەوە، خوای گەورە ئەفەرموێت:**

﴿لقَدْ أرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وأنْزَلْنَا مَعَهُمْ الْكِتَابَ والْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ﴾ (الحديد/٢٤).

واتە: ئێمە نێرراوەكانمان ناردووە بە بەڵگەی ئاشكراوە، وە لەگەڵیانا كیتابمان ناردووە بە یاساو ئەحكامەوە، وە تەرازومان ناردووە بۆ ئەوەی خەڵك بە دادپەروەری ئاڵوگۆڕ بكەن لە نێوان خۆیاندا.

## دادوەری لە ئیسلامدا:

لە گرینگ ترین ئەو هۆیانەی دادپەروەری پێ بەجێ دێت ومافەكان ئەپارێزرێن وگیان ومال و شەرەفی پێ ئەپارێزرێت بەرزكردنەوەو ڕاگرتنی یاسای دادوەری‌یە كە ئیسلام فەرزی كردووە وكردویەتی بە بەشێك لە ئامۆژگاری‌یەكانی و كۆڵەكەیەك لە كۆڵەكەكانی كە هەر ئەبێ هەبن و ناتوانرێت وازیان لێ بهێنرێت.

وە یەكەم كەس كە ئەم ئەركەی بەڕێوە برد لە ئیسلامدا پێغەمبەر بوو ﷺ چونكە لەو پەیمان نامەیەدا كە لەدوای كۆچ كردن بەسترا لە نێوان موسڵمانەكان و جولەكەكان و كەسانی تردا هاتووە: (هەرچی ڕویدا لە نێوان ئەوانەدا كە ئەم لاپەڕەیان مۆركردووە لە دەمەقاڵێ یا ناكۆكی كە ترسی ئەوەی هەبوو نێوان تێك بدات ئەبێ بگێڕدرێتەوە بۆلای خوای گەورەو موحەممەدی نێرراوی).

وە خوای گەورە فەرمانی پێ داوە كە حوكم بكات لەناو خەڵكدا بەپێی ئەوە كە خوا بۆی ناردۆتە خوارەوە، وە فەرمویەتی: ﴿إنا أنزلنا إليك الكتاب بالحق لتحكُمَ بين الناس بما أراك الله ولا تكن للخائنين خصيما واستغفرالله إن الله كان غفوراً رحيماً﴾ (النساء: ١٠٥-١٠٦).

واتە: ئێمە كتێبمان ناردۆتە خوارەوە بۆ تۆ -ئەی محمد- كە پێك هاتووە لەڕاستی؛ تاوەكو لە نێوان خەڵكدا بەو شێوەیە كە خوا بۆی ناردوی و نیشانی داوی ئاوها حوكم بكەیت، وە مەبە بە دیفاعكەر لە ناپاكان، و داوای لێ بوردن لە خوا بكە چونكە بەڕاستی خوا لێ بوردەو میهرەبانە.

وە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ عەتتابی كوڕی ئوسەید سەرپەرشتی دادپرسی مەككەی ئەكرد وەك چۆن عەلی كوڕی ئەبوطالب سەرپەرشتی دادپرسی یەمەنی گرتبوە دەست.

خاوەن سونەنەكان و جگە لەوان ئەگێڕنەوە كە عەلی ؓ كاتێ پێغەمبەر ﷺ ناردی بە قازێتی بۆ سەر یەمەن فەرمووی: ئەی نێرراوی خوا، من ئەنێری لەنێوان یارەكاندا كە گەنجێكم و هێشتا دادوەری نازانم ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ دەستی كێشا بە سەر سنگما و فەرمووی: (اللهم اهده وثبت لسانه).

واتە: خوایە ڕێنمایی بكە و زمانی سابت بكە.

عەلی فەرمویەتی: بەو زاتەی دانەوێڵە دەڕوێنێ و ئەیکاتەوە، هیچ کاتێك گومانم نەبووە لە حوکم کردنی نێوان دوو کەسدا[1].

وە لە عەلیەوە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (يا علي إذا جلس إليك الخصمان فلا تقض بينهما حتّي تسمع من الآخر، كما سمعت من الأول فإنك إذا فعلت ذلك تبين لك القضاء)[2].

واتە: ئەی عەلی ئەگەر دوو کەسی ناکۆك هاتنە بەردەمت، حوکم مەکە لە نێوانیاندا هەتا چۆن گوێت لە قسەکانی یەکەمیان بوو ئاواش گوێت لە قسەکانی ئەوی تریان نەبێت، چونکە ئەگەر بەو شێوەیە کارت کرد بۆت ڕوون ئەبێتەوە چۆن حوکم بدەیت. ئەحمەد وئەبوداود وترمژی گێڕاویانەتەوە.

**دادوەری لە چیدا ئەکرێت ؟**

دادوەری لە هەموو مافەکاندا ئەبێت چ مافی خوا بێت یا مافی ئادەمیزادبێت. وە ئیبنوخەلدون قسەیەکی بەسوودی کردووە لەو بارەیەوە کە ووتویەتی: کارو پلەی دادوەری لە دواییدا لەسەر ئەوە جێگیر کرا کە لەگەڵ جوێ کردنەوەی ناکۆکیەکان هەندێ مافی گشتی بۆ موسڵمانان بەجێ بگەیەنێت بەوەی سەیری حاڵی ئەوانە بکات کە لەبەر شێتی وهەتیوی هەندێ شتیان لێ قەدەغەکراوە، وە هەروەها سەیری نابووت و گەوجەکان بکات. وە هەروەها بنوارێت بۆ وەسیەتی موسڵمانان و وەقفەکانیان و بەشوودانی ئەو بێوەژنانەی سەرپەرشتیکەرەکانیان لەدەست داوە لەسەر ڕای ئەوانەی کە ڕایان لەسەر داوە. وەهەروەها سەیری پرۆژەکانی ڕێگاوبان و خانوبەرە، و وردبوونەوەو بەسەرکردنەوەی شایەت و ئەمینەکان و جێگیرەکان و وەرگرتنی زانیاری و ئەزمون دەربارەی عەدالەت و ناعەدالەتیان تا لە ئەنجامدا بین بە جێگای باوەڕی، ئەمانە هەموویان لەو شتانەن کە پەیوەندیان هەیەو بەستراون بە وەزیفەو ئەرکی قازیەتیەوە.

**پلە و پایەی دادوەری :**

دادوەری فەرزی کیفایەتە بۆ لابردنی ستەمکاری و نەهێڵانی ڕقەبەرایەتی و ناکۆکی، وە پێویستە لەسەر کاربەدەست قازی بۆ خەڵك دابنێت، و ئەگەر نەیان کرد زۆریان لێ بکات، وە ئەگەر ئادەمیزاد لە جێگەیەك بوو کە بۆ دادوەری جگە لەو کەسی تر شیاو نەبوو ئەوکاتە پێویستە

---

(١) أحمد (١/٨٨) وأبوداود (٣٥٨٢).

(٢) أحمد (١/١١١) وأبوداود (٣٥٨٢) والترمذي (١٣٣١) وابن حبان (٥٠٦٥).

لەسەری بچێتە ناو کارەکەوە بۆ دادوەری. وە ئیسلام هانی خەڵکی داوە کە حوکم لەنێوان خەڵکدا بکەن بە حەق، وە کردویەتی بە کارێك کە خۆزگەی پێ ببرێت.

بوخاری لە عبداللە ی کوڕی عومەرەوە ﷺ ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لاحسد إلا في اثنتين: رجل آتاه الله مالاً فسلطَهُ علي هلكته في الحق. ورجل آتاه الله الحكمة فهو يقضي بها ويعلمها الناس)[1].

واتە: ئاواتە خوازی لە شتی خەڵکدا بۆ دووان نەبێت دروست نیە: پیاوێك خوا ماڵێکی زۆری پێ دابێت و زاڵی بکات بەسەر ماڵەکەیا کە لەڕێی حەقدا سەرفی بکات، وە پیاوێك خوا حیکمەت و زانایی پێ دابێت و دادوەری پێ بکات، وە خەڵکیش فێر بکات.

وە خوای گەورە بەڵێنی بەهەشتی داوە بە قازی دادپەروەر.

لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من طلب قضاء المسلمين حتي يناله ثم غلب عَدلُهُ جورَهُ فله الجنة، ومن غلب جَورُه عدله فَلَهُ النار). رواه أبوداود[2].

واتە: هەرکەس هەوڵ بدات ببێتە دادوەری موسڵمانان، وە بە دەستی بهێنێت لە پاشاندا دادگەری بەسەر ستەم کردنیدا زاڵ ببێت بەهەشتی بۆ ئەبێت، وە هەرکەس ستەمی بەسەر دادگەریەکەیدا زاڵ بوو ئەچێتە دۆزەخەوە.

وە لەعبداللە ی کوڕی ئەبوئەوفاوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إن الله مع القاضي مالم يَجُر فإذا جار تخلى الله عَنه ولزمه الشيطان). رواه ابن ماجه والترمذي وحسنه[3].

واتە: بەڕاستی خوا لەگەڵ قازی دا ئەبێت هەتا ستەم نەکات، وە کاتێ کە ستەمی کرد خوا وازی لێ ئەهێنێ و شەیتان ئەبێتە هاوەڵی.

بەڵام ئەو فەرموودانەی هاتوون دەربارەی ترساندنی خەڵك بۆ چوونە ناو دادوەرییەوە وەك ئەوەی سەعیدی موقبەری گێڕاویەتییەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

(من ولي القضاء فقد ذبح بغير سكين) رواه أبوداود والترمذي، وقال: حسن غريب من هذا الوجه[4].

---

(١) البخاري (٥٠٢٥) ومسلم (٨١٥).

(٢) أبوداود (٣٥٧٥).

(٣) الترمذي (١٣٣٠) وابن حبان (٥٠٦٢) والحاكم (٤/٩٣).

(٤) أبوداود (٣٥٧١) والترمذي (١٣٢٥) وابن ماجه (٢٣٠٨) والحاكم (٤/٩١).

واتە: هەرکەس دادوەری گرتە خۆی وەختە تووش بێت بە سەربڕینی خۆی و لەناوچوونیەوە بەوەی کە دادوەری گرتۆتە خۆی).

ئەمە بۆ ئەوکەسانە ئەگێڕرێتەوە کە زانیاری‌یان نی‌یە بە حەق و توانای ئاشکرا کردنی حەقیان نی‌یە، وە ناتوانن دەست بەسەر نەفسی خۆیاندا بگرن و هەواو ئارەزوی نەفس دابین بکەن و ڕێی لێ بگرن لەلادان.

وە ئەوەی ڕێنمایی بۆ ئەمە ئەکات ئەوەیە کە ئەبوذەر ﷺ فەرمویەتی: ووتم ئەی نێرراوی خوا، بۆ نام کەیتە دادوەر؟ ئەڵێ: دەستی کێشا بەسەر شانمدا پاشان فەرمووی: ئەی ئەباذەر تۆ پیاوێکی لاوازیت دادوەریش ئەمانەتە، وە ئەوکارە ڕۆژی دوایی سەرشۆڕی و پەشیمانی دێنێ. مەگەر ئەوانە کە بە حەق ئەو ئەمانەتە ئەگرنە دەست، وە ئەوەی لەسەریان بێ لەو ئەمانەتەدا بەجێی ئەگەیەنن. موسلیم گێڕاویەتی‌یەوە[1].

وە لە ئەبوموسای ئەشعەری‌یەوە فەرمویەتی: چووینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ من و دووپیاو لە ئامۆزاکانم یەکێکیان ووتی: ئەی نێرراوی خوا، سەرۆکایەتی هەندێ لەو کارانەمان بدەرە دەست کە خوا پێی بەخشیوی، ئەوی تریشیان هەر ئەو قسەی کرد. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إنا والله لا نولي هذا العمل أحداً يسأله أو أحداً يحرص عليه)[2].

واتە: بە خوا ئێمە ئەم کارە نادەینە دەست کەسێك داوای بکات یا کەسێك بە پەرۆش بێت بۆ بە دەست هێنانی.

وە لە ئەنەسەوە ﷺ هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من ابتغى القضاء، وسأل فيه شفعاء وكل إلى نفسه، ومن أكره عليه أنزل الله عليه ملكاً يسدده)[3].

واتە: هەرکەس ئارەزووی قازی‌یەتی بکات و داوای لە کەسێك کرد تکای بۆ بکات، و ببێتە دادوەر ئەوە ئەسپێرێ بە نەفسی خۆی و خوا یارمەتی نادات، بەڵام ئەگەر بەزۆر کرا بە قازی خوا فریشتەیەکی بۆ ئەنێرێت ڕێنمایی بکات بۆ ڕاستی، ترمزی و ئەبوداود گێڕاویانەتەوە.

وە ترسی نەتوانین لەهەڵسان بەکاری دادوەری بە شێوەیەکی تەواو بۆتە هۆی ئەوەی هەندێك لە پێشەواکانی ئایینی خۆیان دووربگرن لە چوونە ناو دادوەری کردنەوە.

---

(١) مسلم (١٨٢٥).

(٢) البخاري (٧١٤٩) ومسلم (١٤/١٧٣٣).

(٣) أبوداود (٣٥٧٨) والترمذي (١٣٢٣و١٣٢٤) وابن ماجه (٢٣٠٩).

وە لەو بەسەرهاتە خۆشانەی کە لەو بارەیەوە ئەگێڕنەوە ئەوەیە: کە حەیاتی کوڕی شورەیح بانگ کرا بۆ ئەوەی دادوەری میسر بگرێتە دەست، کاتێ ئەمیر ئەوەی خستە پێش چاوی، ملی نەدا بۆ ئەو کارە، داوای کرد شمشێری بۆ بهێنن ئەویش کە بینی زۆری لێ ئەکەن کلیلێکی پێ بوو دەری هێنا و ووتی: ئەوە کلیلی ماڵەکەمە، چونکە من ئارەزومەندم بۆ گەیشتن بە پەروەردگارم. جا کاتێك ئەمیر ئەو وورەیەی لێ بینی وازی لێ هێنا.

**کێ شیاوی ئەوەیە ببێتە قازی :**

ئەوکەسەی کە دادوەری ئەکات ئەبێ ئاگای لە کیتاب وسوننەت بێت ولە دین دا شارەزایی ببێت وە توانای جیاکردنەوەی ڕاست وهەڵەی ببێت، وە ئەبێ ئەو کەسە بەری بێت لە ستەمکاری و دووربێت لە ئارەزووی نەفس.

وە زانایانی ئیسلام مەرجی ئەوەیان داناوە بۆ دادوەر کە ئەبێت پلەی ئیجتیهادی ببێت، وە ئەبێ بە ئایەت و حەدیسەکانی ئەحکام زانابێت، وە زانابێت بە ووتەی زانایانی پێشین کە لەسەرچی کۆبوون و لەسەر چی جیاوازیان هەبووە. وەزانابێت بە زمانی عەرەبی و بە (قیاس)، وە ئەبێت موکەللەف و نێرینە بێت ودادپەروەر وبیستەر وبینەر و قسەزان بێت.

وە ئەم مەرجانە بەپێی توانا ئیعتیباری بۆ ئەکرێت، وە پێویستە چاکتر و چاکتر بکرێتە دادوەر، کەواتە دادوەری (مقلد) شوێن کەوتە و کافر و منداڵ و شێت و فاسق و ئافرەت دروست نیيە، بەپێی حەدیسەکەی ئەبوبەکرە کاتێ بە پێغەمبەریان ﷺ ڕاگەیاند فارسەکان کچی کیسرا بووەتە پاشایان فەرمووی: (لن يفلح قومٌ ولّوا أمرهم إمرأةً). رواه أحمد والبخاري[1].

واتە: ئەو نەتەوەیە سەرکەوتو نابێت کە سەرپەرشتی کاریان بدەنە دەست ئافرەتێك.

وە زانایان ئەوەشیان کردۆتە مەرج کەئەبێت قازی حاکم دای بنێت، چونکە ئەوە مەرجی دروستی دادوەرييەکەيەتی. ئەمە بە پێچەوانەی ئەو دووکەسەوەیە کە کێشەیان لەنێواندا بێت و ڕازی بن بەوەی کەسێك ببێتە دادوەر و کێشەکەیان بۆ چارە بکات، بەڵام خۆی کاری دادوەری نەکات.

وە مالیك و ئەحمەد ڕێ ئەدەن کەسێك ئەو کارە بکات، بەڵام ئەبوحەنیفە ڕێ نادات بە مەرجێك نەبێت کە حوکمەکەی موافیقی حوکمی قازی وڵات بێت.

---

(١) أحمد (٥/٤٣) والبخاري (٤٤٢٥) والترمذي (٢٢٦٢) والنسائي (٨/٢٢٧).

وەخوای گەورە نمونەی بەرزی لە دادوەری دا بۆ باس کردوین کە فەرمویەتی: ﴿يَادَاوُدُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الأَرْضِ فَاحْكُمْ بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ ولاَ تَتَّبِعْ الْهَوى فَيُضِلَّكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ إِنَّ الَّذِينَ يَضِلُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا نَسُوا يَوْمَ الْحِسَابِ﴾ (ص)

واتە: ئەی داود ئێمە تۆمان کردۆتە جێ نشین لەسەرزەوی تۆش حوکم بکە لەنێوان خەلکدا بە عەدل و ڕاستی، وە شوێن ئارەزوو مەکەوە لە حوکمەکاندا، چونکە گومڕات ئەکات و لات ئەدات لە ئاین و یاسای خوا، بەڕاستی ئەو کەسانەی لە ڕێگای خوا گومڕا ئەبن سزایەکی توندیان بۆ هەیە لە ئاگردا، بەهۆی ئەوەی کە بێ ئاگا بوون لە ڕۆژی جەزاو لێپرسینەوە.

هەرچەندە ئەوە بەرەوڕوی داود وتراوە بەلاّم لە واقیعدا بەرەوڕوی هەموو ئەو کەسانەیە کە کاروباریان بە دەستە، چونکە خوا بۆیە باسی ئەوەی کردووە کە نمونەی بەرزی دادوەریمان بۆ ڕوون بکاتەوە، وە داود ﷺ کە پێغەمبەرێکی مەعصوم و پارێزراوە لەگەلّ ئەوەشدا خوا بەرەوڕوی ئەدوێ و پیێ ئەفەرموێت: ﴿ولاَ تَتَّبِعْ الْهَوى فَيُضِلَّكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ﴾.

واتە: شوێن ئارەزوو نەکەویت و لات بدات لەڕێگای خواو ئاینی خوا.

جا ئەگەر پێغەمبەرێکی پارێزراو و دوور لە تاوان و گوناە ترسی ئەوەی لێ بکرێت شوێن ئارەزوو بکەوێت، ئەوە کەسانی تر لەپێشترن بۆ گومڕابون کە مەعصوم و پارێزراو نین.

وە لە ئەبو بورەیدەوە لە باوکی‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (القضاة ثلاثة: واحد في الجنة، واثنان في النار. فأما الذي في الجنة فرجل عرف الحق فقضي به. ورَجل عرف الحق فجار في الحكم فهو في النار. ورجل قضي للناس علي جهلٍ فهو في النار). رواه أبوداود والترمذي والنسائي وابن ماجه والحاكم وصححه[1].

واتە: دادوەرەکان سیانن یەکێکیان ئەچێتە بەهەشت و دوانەکەی تر بۆ ئاگر، ئەمما ئەویان کە ئەچێتە بەهەشت پیاوێکە حەقی ناسیوە حوکمی پێ کردووە. وە پیاوێك کە حەقی ناسیوەو ستەمی کردووە لە حوکمەکەی دا ئەچێتە دۆزەخەوە. وە پیاوێك کە حوکمی خەلّك بکات بە نەزانی ئەویش بۆ ئاگرە.

وە لەگەلّ بوونی قورئان و سوننەتدا هەندێ لە دادوەرەکان لە حوکمەکانیان دا ئەگەڕێنەوە بۆ قسەکانی پێشەوا ئیسلامی‌یەکان وڕای بەهێز هەلّئەبژێرن ئەوڕایەی کە لەگەلّ ڕاستی‌دا بێت دوای ئەوەی کە سەردەمی (إجتهاد) کۆتایی هاتووە.

---

(١) أبوداود (٣٥٧٣) والترمذي (١٣٢٢) وابن ماجه (٢٣١٥).

موحەممەدی کوڕی یوسفی کیندی ئەگێڕێتەوە کە ئیبراهیمی کوڕی جەرڕاح لە ساڵی (٢٠٤ ھ) دا بووە بە قازی. وە عومەری کوڕی خالید ووتویەتی: هاوڕێیەتی هیچ کەسم نەکردووە وەك ئیبراهیمی کوڕی جەرڕاح بێت لە داوەری دا، کاتێك مەحزەرەکەم بۆ ئامادە ئەکرد و بۆم ئەخوێندەوە ئەوەندەی خوا حەزبکات لای ئەمایەوە ورای خۆی تەواو تێدا دەرئەبڕی، جا ئەگەر حوکمی پێ بکردایە ئەیدایەوە دەستم بۆئەوەی (سجل) تۆمارێکی بۆ دروست بکەم پاشان ئەم بینی لە پشتەکەی نوسیوە: ئەبوحەنیفە ئەوەی ووتوە. وەلە دێڕێکدا ئیبنوئەبولەیلا ئەوەی ووتوە، وەلە دێڕێکی تری دا: ئەبویوسف یان مالیك ئەوەیان ووتوە.

وە لەپاشاندا ئەم بینی لەسەر دێڕێك نیشانەیەك وەك هێڵێك کراوە ئیتر ئەمزانی کام قسەی هەڵبژاردووە تۆمارم ئەکرد.

وە هەندێ لە زانایان ڕایان وایە کە مەزهەبێکی دیاری کراو بسەپێنرێت بەسەر قازی‌یەکاندا بۆ ڕێگری لە پەشێوی و سەر لێ تێك چوون.

دەهلەوی فەرمویەتی: کاتێ هەندێ لە دادوەرەکان ستەمیان ئەکرد لە دادرسی‌یەکەیاندا سەرۆکەکان ئەیان سەپاند بە سەر قازی‌یەکان دا کە لەسەر مەزهەبێکی دیاری کراو حوکم بکەن، و لێی لانەدەن، وە تەنها ئەو شتەیان لێ وەردەگیرا کە خەڵك نەخاتە گومانەوەو شتێك بێت کە پێش تر ووترابێت، وە دەبوایە لەوە تێ نەپەڕێت.

**دادوەری کەسێك کە شیاوی دادوەری نەبێت:**

زانایان فەرمویانە: ئەو کەسەی شیاوی حوکم کردن نەبێت دروست نی‌یە بۆی حوکم بکات، جا ئەگەر حوکمی کرد گوناهبار ئەبێت وحوکمەی جێ بەجێ نابێت، ئیتر حوکمەکەی ڕاست بێت یان ڕاست نەبێ، چونکە پێکانی حەق بە ڕێکەوت لە بنەمایەکی شەرعی‌یەوە دەرنەچووە، کەواتە ئەو کەسە سەرپێچی کەرە لە هەموو حوکمەکانی دا ڕاستی پێکابێت یان نا، وەحوکمەکانی ڕەت ئەکرێتەوە بە گشتی ولە هیچ حوکمێکی‌دا لێی نابورێت.

**مەنهەج و پرۆگرامی دادوەری :**

پێغەمبەر ﷺ ئەو پرۆگرامەی بۆ ڕوون کردووینەوە کە پێویستە قازی لەسەری بڕوات لە دادوەری‌یەکەیدا. کاتێك موعازی نارد بۆ یەمەن پێی فەرموو: (بَم تقضي؟ قال: بكتاب الله. قال:

فإن لم تجد؟ قال: بسنة رسول الله. قال: فإن لم تجد؟ قال: فبرأيي). رواه عمرو بن شعيب عن أبيه عن جده[1].

واتە: بەچی حوکم ئەکەیت؟ ووتی: بە کتێبەکەی خوا. فەرموی: ئەگەر تێیدا نەبوو. ووتی: بە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر تێیدانەبوو؟ ووتی: بەرای خۆم.

وە لەسەر قازی پێویستە بگەڕێت بە شوێن ڕاستیدا جا ئەبێ لە هەموو ئەو شتانە خۆی دوربخاتەوە کە بیری تێك ئەدەن، ئەبێ کاتی تورە بوونی زۆر، یا برسی‌یەتی زۆر، یا ترس وخەفەتی وا کە بیر وهۆشی بشێوێنێ، یا گەرمای توند، یا سەرمای بەهێز، یا کاتی خەوهاتنی زۆر، یا کاتێك کە دڵی بە شتێکەوە خەریك بێت کە ڕاستی بۆ نەدۆزرێتەوەو باش تێی نەگات، لە هەموو ئەوکاتانەدا پێویستە لە دادوەری دوور بکەوێتەوە. وە لە حەدیسەکەی ئەبوبەکرەدا هاتووە لە هەردوو صەحیحی موسلیم و بوخاری و جگە لەوان کە فەرمویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە ئەیفەرموو: (لا يقضين حاكمٌ بين اثنين وهو غضبان)[2].

واتە: نابێت حاکم حوکم بکات لە نێوان دوو کەسدا کاتێك کە تووڕە بێت.

جا ئەگەر حاکم لەم حاڵەتانەدا حوکمی کرد و لەگەڵ حەقدا ڕێك کەوت ئەوە حوکمەکەی دروستە بەلای جەماوەری زانایان.

**قاچی (مجتهد) -ئەوکەسەی بە دوای حەقدا هەوڵ ئەدات- پاداشت ئەدرێتەوە:**

هەرچەندە قازی تێ بکۆشێت بۆدۆزینەوەی حەق و پێکانی ڕاستی ئەوە پاداشتی ئەدرێتەوە با ڕاستیش نەپێکێ.

لە عەمری کوڕی عاصەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذا اجتهد الحاكم فأصاب فله أجران. وإن اجتهد فأخطأ فله أجر). رواه البخاري ومسلم[3].

واتە: ئەگەر حاکم تێکۆشا وحەقی پێکا دوو پاداشتی هەیە. وەئەگەر تێکۆشا و هەڵەی کرد یەك پاداشتی هەیە.

خەگابی فەرمویەتی: هەڵەکەر کاتێك پاداشتی ئەدرێتەوە کە تێبکۆشێ بۆ دۆزینەوەی حەق، چونکە ئەو تێکۆشانەی خواپەرەستی‌یە، وە لەسەر هەڵەکە پاداشتی نادرێتەوە بەڵکو تەنها

(1) أحمد (٥/ ٢٣٠) وأبوداود (٣٥٩٢) والترمذي (١٣٢٧).

(2) البخاري (٢٥٧١) ومسلم (١٧١٧/ ١٦).

(3) البخاري (٧٣٥٢) ومسلم (١٧١٦/ ١٥).

گوناهەکەی لەکۆڵ ئەکەوێت. ئەمەش بۆ ئەو کەسانەیە کە هەموو ئامێرەکانی ئیجتیهادیان تێدا کۆبێتەوە، زانابێت بە (أصول) بنەما شەرعی‌یەکان و شێوەکانی قیاس، بەڵام ئەو کەسەی پیاوی ئیجتیهاد و تێ‌کۆشان نەبێت، ئەوە زۆر لە خۆی ئەکات و بە هەڵەکانی نابوررێت لە حوکم دانیدا، بەڵکو ترسی ئەوەی لێ ئەکرێت کە گەورەترین تاوان بکەوێتە سەری.

وە لە ئوموسەلەمەوە خوای لێ ڕازی بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إنما أنا بشرٌ وإنكم تختصمون إليَّ. ولعل بَعضَكُمُ أن يكونَ ألحن بحجته من بعض، فأقضي بنحو مما أسمع. فمن قضيت له من حق أخيه شيئاً فلا يأخذه فإنما أقطع له قطعة من النار). رواه البخاري ومسلم وأصحاب السنن[1].

واتە: منیش تەنها ئادەمیزادێکم وە ئێوە کێشەکانتان بەرەو رووی من ئەکەنەوە. وەجاری وائەبێت هەندێکتان زیرەکترە لەئەوەی تریان وە من بەوە حوکم ئەدەم کە ئەیبیسم، جا هەرکەس شتێك لە مافی براکەیم بۆ پچڕی با وەری نەگرێت چونکە ئەوە پارچە ئاگرێکم بۆ بڕیوە.

وە لە ئەبوهورەیرەوە ﷺ کە فەرمویەتی: خۆم گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە ئەیفەرموو: (كانت امرأتان معهما ابناهما، جاء الذئب فذهب بابنِ أحدهما، فقالت صاحبتها: إنما ذهب بابنك. وقالت الأخري: إنما ذهب بابنك. فتاحكما إلى داود فقضي للكبرى. فخرجتا علي سليمان بن داود ﷺ فأخبرتاه فقال: اتوني بالسكين أشقه بينهما. فقالت الصغرى: لاتفعل يرحمك الله هو ابنها. فقضي به للصغرى)[2].

واتە: دوو ئافرەت هەریەك کوڕێکی پێ ئەبێت، گورگێك دێت پەلاماری کوڕی یەکێکیان ئەدات و ئەی فرێنێ، ئەوەی کوڕەکەی براوە ئەڵێت: کوڕەکەی تۆی بردووە، ئەوەی تریان ئەڵێت: نا کوڕەکەی تۆی بردووە، لەپاشاندا کێشەکەیان بردە لای داود ﷺ ئەویش وای دانا کە ئەوکوڕەی ماوە کوڕی ژنە گەورەکەیانە. ئیتر هەردوکیان چوونە دەرو چوونە لای سولەیمانی کوڕی داود ﷺ بۆیان گێڕایەوە ئەویش ووتی: چەقۆیەکم بۆ بهێنن ئە یکەم بەدوو پارچە هەرپارچەی بۆ یەکێکتان، ژنە بچوکەکە ووتی: کاری وامەکە ڕەحمەتی خوات لێ بێت، کوڕی من نی‌یەو کوڕی ئەوە، ئیتر سولەیمان کوڕەکەی دا بە ژنە بچوکەکە .

---

(١) البخاري (٧١٦٩) ومسلم (٤/١٧١٣).

(٢) أحمد (٢/٣٤٠) والبخاري (٣٤٢٧) ومسلم (١٧٢٠).

ئەمەش لە زانایی سلیمانەوە بوو. کە ئەو ئوسلوبەی بە کارهێناوە بۆ ناسینی دایکە ڕاستەقینەکە کاتێ ووتی: چەقۆیەکەم بۆ بهێنن ئەیکەم بە دوولەت سۆزی دایکە ڕاستیەکە جوڵاو نەیویست کوڕەکەی بکوژرێت، وە وای بە باش زانی کە بە زیندویی بمێنێتەوەو لێی دوور بێت نەك بکوژرێت. سولەیمانیش بەو بەڵگەیەدا بۆی دەرکەوت کە ئەوە کوڕی ئەوە.

وە خوای گەورە باسی ئەو چیرۆکەی داود وسلیمان ئەکات و ئەفەرموێت: ﴿وداود وسليمان إذ يحكمان في الحرث إذ نفشت فيه غنم القوم وكنا لحكمهم شاهدين، ففهمناها سليمان وكلاً آتينا حكماً وعلماً﴾ (الأنبياء: ٧٨-٧٩).

وە باسی پێغەمبەری خوا داوود و سولەیمانی کوڕی بکە، کاتێك کە حوکمیان کرد لە کێشەیەکدا، کە پەزی لایەکیان بەشەو چوبووە کشتوکاڵی لایەکیانەوە و زیانی لێ دابوو، داود ووتی: ئەبێ پەزەکان لەباتی زیانی کشتوکاڵەکە بدرێ بە خاوەن زەرعاتەکە چونکە نرخەکەیان وەك یەکە)، وە ئێمە شایەدی داوەری کردنی ئەوان بووین ، جا ئێمە لە سولەیمانمان گەیاند کە بەرژەوەندی هەردوو لایەن پێش چاو بگرێت لەگەڵ عەدل دا، ئیتر فەرمانی دا کە خاوەن مەڕەکە کشتوکاڵە فەوتاوەکە چاك بکاتەوە لەماوەیەکدا، وە خاوەن کشتوکاڵەکە لەو ماوەیەدا سوود وەربگرێت لە مەڕو ماڵاتەکە لە شیرو خوری و ئەو جۆرە شتانە، دوایی مەڕەکان ئەگەڕێنەوە بۆ خاوەنەکەی و کشتوکاڵەکەش بۆ خاوەنی خۆی، وە ئێمە بە هەریەك لە داودو سولەیمان حوکم و زانستمان پێ دابوو.

وە زانایانی تەفسیری قورئان باسی ئەوەیان کردووە کە:

ڕانە مەڕەکە کەوتە ناو کشتوکاڵەکە و وێرانیان کرد، خاوەن دەغڵەکان وخاوەن ڕانەمەڕەکان بووە کێشە وناکۆکیان هەتا کێشەیان گەیاندە لای داود بۆ ئەوەی حوکمیان بکات، داودیش مەڕەکانی دا بە خاوەن دەغڵەکە. پاشان لای داود چونەدەرەوە بە لای سولەیماندا تێپەڕین سولەیمان پێی ووتن: چۆن کێشەکەی بۆ بڕینەوە؟ ئەوانیش بۆیان گێڕایەوە. سولەیمان ووتی: ئەگەر من سەر کاری کێشەکەم بکردایە لەوەم چاکتر ئەبڕییەوە بە شێوەیەك بۆ هەر دوو لا باش بوایە. ئەو قسەیە گەیشتەوە بە داود. سولەیمانی بانگ کرد وپێی ووت: چۆن کێشەکەت ئەبڕییەوە؟ ووتی: مەڕەکانم ئەدا بە خاوەن دەغڵەکە سوود لە شیر وخوری وبەرەکەی وەربگرتایە، وەخاوەن مەڕەکەش زەویەکەم ئەدایە بیکێڵێت تۆوی پێوەبکات بۆ خاوەن دەغڵەکە هەتا وەك دەغڵی کابرای لێ ئەهاتەوە، ئینجا ئەم دایەوە بە خاوەنەکەی ومەڕەکانیشم ئەگێڕایەوە بۆ خاوەنی. داود ووتی: تۆ چۆنت بڕیوەتەوە ئەبێ هەروابێت، ئیتر بەو شێوەیە حوکمی دا.

**ئەوەی لەسەر قازی پێویستە :**

**لەسەر قازی پێویستە کە لە پێنج شتدا بە یەکسانی سەیری هەردوولایەنی کێشەکە بکات:**

**١- کاتێ ئەچنە لای قازی.**

**٢- کاتێ لەبەردەمیدا ئەوەستن.**

**٣- کاتی ڕووتێکردنیان.**

**٤- کاتی گوێ بۆ گرتنیان.**

**٥- کاتێ حوکمیان ئەدات.**

**مەبەست ئەوەیە پێویستە لەسەری بە یەکسانی سەیریان بکات لە کردەوەکان دا نەك بە دڵ، جانەگەر دڵی بە لای یەکێکیان دا چوو وحەزی ئەکرد بەبەڵگەکانی سەرکەوێت بەسەر ئەوەی تریاندا ئەوە هیچی نایەتە سەر، چونکە ئەمە شتێکە بەدەست خۆی نی یە، بەڵام نابێت هیچ لایەکیان فێری بەڵگە هێنانەوە بکات، یا شایەت فێری شایەتی دان بکات، چونکە ئەوکارە بەیەکێك لە لایەنەکان زیان ئەگەیەنێت، وەنابێت داواکار فێری داوا و سوێندخواردن بکات، وەنابێت داوا لەسەرکراو فێری ئینکاری و دان پێدانان بکات، وە نابێت شایەتەکان فێری ئەوە بکات شایەتی بدەن یا شایەتی نەدەن، وە نابێت یەکێك لە دوو ناکۆکەکان بکاتە میوانی خۆی، چونکە ئەوکارە دڵی ئەوەی تریان ئەشکێنێ. وەنابێت بچێت بە دەم میوانداری کردنی هیچیانەوە یا بەدەم میوانداری هەردووکیانەوە بچێت هەتا ناکۆکی یەکەیان تەواو نەبێ.**

**وە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ هیچ کەسێکی نەئەکردە میوانی خۆی هەتا ناکۆکەکەی تری لەگەڵدا نەبوایە (واتە هەر دووکیانی بە یەکەوە دەعوەت ئەکرد).**

**وە نابێت قازی دیاری لە هیچ کەس وەربگرێت، ئەو کەسە نەبێت کە عادەتی وابووە پێش ئەوەی بێتە قازی هەر دیاری بۆ بردبێت. چونکە دیاری بردن بۆ قازی لەوانەوە نەبێ کە لەپێش قازی یەتی دا دیاری بۆ بردووە ئەبێتە بەرتیل. لە بورەیدەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من استعملنا على عَمل فرزقناه رزقاً فما أخذ بعد ذلك فهو غُلُول). رواه أبوداود[1].**

**واتە: ئێمە هەرکەسێکمان لەسەر کارێك دانا و ڕزقێکمان بۆ دانا لەوە بەولاوە هەرچی وەربگرێت دزی یە.**

---

(١) أبوداود (٢٩٤٣).

وە هەروەها فەرمویەتی: (لعنة الله على الراشي والمرتشي في الحكم). رواه أحمد وأبوداود وابن ماجه والترمذي وصححه[1].

واتە: نەفرینی خوا لە بەرتیل خۆر وبەرتیل دەرێت لە حوکمدا.

خەطابی ووتویەتی: ئەو سزایەیان کاتێ پێ ئەگات کە هەردووکیان وەك یەك بوون لە ویست ومەبەست دا. بەرتیل دەر بەرتیل ئەدات بۆ ئەوەی ناهەقی دەست بکەوێت وبگاتە ستەمکاری، بەڵام ئەگەر بەرتیلەکەی بدات بۆ ئەوەی بگات بەحەق یا ستەم لە خۆی دوور بخاتەوە، ئەو کەسانە ناکەونە بەر ئەو هەڕەشەیە.

ئەگێڕنەوە ئیبنومەسعود بەدیلی ئەگیرێ کاتێ لە خاکی حەبەشە ئەبێت، پاشان دوو دینار ئەدات بەرەڵای ئەکەن.

وە ئەگێڕنەوە لە حەسەن و شیعبی و جابیری کوڕی زەید و عەطائەوە کە فەرمویانە: قەیناکە کەسێك لەبەر گیان ومالّی بەرتیل بدات ئەگەر ترسی ستەمی هەبوو کە لێ‌ی بکرێت.

وە هەروەها ئەو کەسەی بەرتیلەکە وەرئەگرێت کاتێك موستەحەقی ئەوهەڕەشەیە ئەبێت ئەگەر ئەوەی وەری ئەگرێت لەسەر حەقێك بێت کە پێویست بێت لەسەری جێبەجێ‌ی بکات، جا ئەو حەقە نەکات هەتا بەرتیلی نەدرێتێ، یا لەبەر کارێکی ناڕەوا کە پێویست بێت لەسەری نەیکات بەڵام وازی لێ ناهێنێ هەتا بەرتیلی پێ نەدرێت.

لە (فتح العلام) دا فەرمویەتی: تێکڕای ئەو ماڵانەی کە قازی‌یەکان وەری ئەگرن لەسەر چوار بەشە:

بەرتیل، دیاری، کرێ، رزق.

یەکەمیان بەرتیلە: ئەگەر بۆ ئەوە بێت دادوەر حوکمێکی ناحەقی بۆ بدات، ئەمەش حەرامە لەسەر وەرگر و بدەر. بەڵام ئەگەر بۆ ئەوە بێت حوکمی بەحەق بۆ بدات بەسەر دوژمنەکەی دا ئەوە حەرامە لەسەر دادوەر نەك بدەر. چونکە بۆیە ئەوە ئەدات کە مافەکەی دەست بکەوێتەوە، وەك کرێ دان بۆ هێنانەوەی عەبدی هەڵاتوو یان کرێ‌ی وەکیل لەسەر کێشە. وە وتراوە: حەرامە چونکە دادوەر ئەخاتە ناو تاوانەوە.

ئەمما دیاری کە دووەمە: ئەگەر لەوکەسانە بوو پێش ئەوەی دادوەریش بووبێت هەر دیاری بۆ هێناوە، ئەوە حەرام نی‌یە ئەگەر بەردەوام بێت، بەڵام ئەگەر دیاری بۆ نەئەهێنا دوای ئەوە نەبێت کە

(١) أحمد (٢/٣٨٨) والترمذي (١٣٣٦) وابن حبان (٥٠٧٦).

ببووە دادوەر، ئەوە ئەگەر ئەوکەسەی دیاری‌یەکە ئەدات ناکۆکی لەگەڵ کەسدا نەبوو، دروستە بەڵام کەراهەتی هەیە، ئەمما ئەگەر ناکۆکی هەبوو لەگەڵ کەسێکدا و کێشەکەیان لای ئەو دادوەرە بوو ئەوە حەرامە لەسەر دادوەرو دیاری هێنەرەکە.

ئەمما کرێ کە سێ هەمە: ئەگەر حاکم مووچەی هەبوو لە (بیت المال) بە ڕای هەموو زانایان پیێ حەرامە، چونکە ئەو مووچەیەی بۆیە ئەدرێتێ کە بری کارەکەیەتی ئیتر لە چ ڕوویەکەوە کرێ وەرئەگرێت، بەڵام ئەگەر مووچەی لە (بیت المال) نەبو، بۆی دروستە کرێ وەربگرێت بە ئەندازەی ئەوکارەی کە ئەیکات ئەگەر قازی نەبوو. بەڵام ئەگەر زیاد لەوەی کە شایستەی بێت وەربگرێت حەرامە پیێ. چونکە بۆیە ئەو کرێیەی ئەدرێتێ لەبەر ئەوەی کارێکی ئەنجام داوە نەك لەبەر ئەوەی قازی‌یە، کەواتە وەرگرتنی زیاتر لە کرێی یەکێکی وەك خۆی کە قازی نەبێت لە بەرابەری هیچ شتێکدا نی‌یە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە قازی‌یە. لەکاتێکدا لەبەر ئەوە شایستە نی‌یە کە هیچ وەربگرێ لە ماڵی خەڵکی بە ڕای هەموو زانایان، وە کرێی کارەکەی کە وەری ئەگرێت ئەبێ وەکو کرێی کەسێکی تر وابێت کە کارێکی وەهای کردبێ، کەواتە زیاد وەرگرتن لەو کرێیەی حەرامە. لەبەر ئەوەیە وتراوە دەوڵەمەند باشترە ببێتە دادوەر لە هەژار، لەبەر ئەوەی پێ دەچێت هەژار بەهۆی هەژاری‌یەکەیەوە وای لێ بێت ماڵێك بخوات کە دروست نی‌یە بیخوات ئەگەر بژێوی نەبێت لە (بیت المال).

**نامەیەکی عومەری کوڕی خەططاب دەربارەی (قضاء) دادوەری :**

عومەری کوڕی خەططاب ﷺ دەستورێکی پتەوی بۆ دادوەری داناوە لەو نامەیەدا کە ناردویەتی بۆئەبو موسای ئەشعەری وا لە خوارەوە باسی ئەکەین:

بسم الله الرحمن الرحیم

لە بەندەی خواوە عومەری کوڕی خەططاب ئەمیری موسڵمانان بۆ عبداللە ی کوڕی قەیس سڵاوت لێ بێت. لەپاش ئەوە:

بەڕاستی دادوەری پێویستی‌یەکی دامەزراو و فەرمانێکی پەیڕەوی کراوە، بزانە ئەگەر ئەو کارەت پێ سپێررا قسەکردن بەحەق بەبێ جێبەجێ کردن کەڵکی نی‌یە. بە یەکسانی سەیری خەڵك بکە، بە یەك ڕوو لە یەك کۆڕی دانیشتندا هەتا خاوەن پلەو پایە تەماع نەکاتە مەیل کردنت بەلایدا، وە ئادەمیزادی لاواز هیوابڕاو نەبێت لە دادپەروەریت.

شایەت هێنان لەسەر داواكارە و سوێندخواردن لەسەر ئەو كەسەیە ئینكاری ئەكات، وە ڕێك كەوتن (صلح) دروستە لەنێوان موسڵمانانندا ئەو ڕێك كەوتنە نەبێت كە حەڵاڵ حەرام ئەكات یا حەرام حەڵاڵ ئەكات.

با ئەو حوكمەی ئەمڕۆ داوتە ڕێت لێ نەگرێ پەشیمان بیتەوە كاتێ پیاچوویتەوەو بیرت لێ كردەوە وخوا ڕێنمایی كردی و گەڕایتەوە بۆ حەق، چونكە حەق دێرینەیە، وە گەڕانەوە بۆحەق باشترە لەوەی لەسەر باتڵ بڕۆیت و بەردەوام بیت، هەوڵی تێ گەیشتن بدە لەو شتانەدا كە دڵت ڕاڕایە لەسەری ئەوانەی كە نە لە قورئان دا هەیە نە لە سوننەتدا.

لە پاشاندا لێكچوو و هاوشێوەكان باش بناسە و قیاسیان پێ بكە، وە هەمیشە ئەوە بەكار بهێنە كە زۆرتر نزیكە لە خواو زۆرتر لە حەق ئەچێت.

وە هەركەس ئیددیعای كرد كە مافێكی نادیاری هەیە یا بەڵگەیەكی هەیە ماوەیەكی بۆ دابنێ كە كارەكەی پێ كۆتایی بێت، جائەگەر بەڵگەكەی ئامادە كرد ئەوە حەقی خۆی بۆ وەرگرەوە، ئەگینا كێشەكەی لەسەر لابەرە، چونكە ئەوكارە زیاتر لابەری گومان و نادیاری‌یە، موسڵمانەكان ڕاست و عادلن كاتێ شایەتی لەسەر یەكتر بدەن، مەگەر كەسێك كە داری حەددی لێ درابێت یا شایەتی درۆی دابێت یا لە (ولاء) دڵسۆزی و لە نەسەب و بنەماڵەدا گومانی لێ بكرێت. (واتە موسڵمانان هەموو شایەتیان وەرگیراوە مەگەر ئەو چەند دەستەیەی كە باس كران).

چونكە خوای گەورە خۆی سەرپەرشتی ناو دڵەكان ئەكات، وە حەددی لابردووە بە شایەتی و سوێند. داوات لێ ئەكەم خۆت بە دوور بگرە لە كەم ئارامی و هەڵچوون، وە ئازار مەگەیەنە بە ناكۆكەكان ولە كاتی ناكۆكی‌دا خۆت مەگۆڕە، چونكە بە حەق ڕۆیشتن لە شوێنی خۆیدا خوا پاداشتی پێ گەورە ئەكات و زەخیرەی قیامەتی پێ زۆر ئەكات. جا هەركەس نیەتی پاك بێت و بە خۆیدا بچێتەوە، خوای بەسە لەنێوان خۆی وخەڵكدا، وە هەركەس ڕەوشتێك بۆ خەڵك دەربخات كەخوا ئەزانێت تێیدا نی‌یە خوا ئابرووی ئەبات.

جا تۆ چ گومانێك ئەبەی لەبارەی پاداشتی غەیری خوا لە بەرامبەر ڕزق و ڕۆزی‌یە دەستبەجێكەی و خەزنەكانی ڕەحمەتی.

**تكاكاری دادوەر:**

وە بۆ قازی هەیە تكاكاری بكات بەتكای چاكە، و داوا لە ناكۆكەكان بكا لەگەڵ یەكدا ڕێك بكەون، یا داوا لە كەسێكیان بكات واز لە هەندێ مافی خۆی بهێنێ.

لە کەعبی کوڕی مالیکەوە: کە دەمەقالێیان بوو لەگەڵ ئیبنوئەبی حەدرەددا لەسەر قەرز لەناو مزگەوتدا، دەنگیان لێ بەرزکردەوە هەتا پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەوە گوێی لە دەنگیان بوو هاتەدەرەوە بۆلایان هەتا پەردەی ژوورەکەی لادا و کەعبی کوڕی مالیکی بانگ کرد وفەرمووی: ئەی کەعب! ئەویش ووتی: لبیك ئەی نێرراوی خوا، پێغەمبەر ﷺ بە دەستی پیرۆزی ئیشارەتی بۆ کرد کە واز لە نیوەی قەرزەکە بهێنە. کەعب ووتی: وا نیوەم لەسەر لابرد ئەی نێرراوی خوا. پێغەمبەر ﷺ بە کابرای فەرموو: هەڵسە ئەوەی ماوە لەقەرزەکە بیدەرەوە. بوخاری و موسلیم و نسائی و ئیبنوماجە تەخریجیان کردوە[1].

جێ بەجێ کردنی حوکم بە ڕواڵەت:

حوکمی دادوەر نە حەڵال حەرام ئەکات نە حەرام حەڵاڵ ئەکات بەپێی حەدیسەکەی خاتو ئوممو سەلەمەی دایکی موسڵمانان کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنما أنا بشر وإنكم تختصمون إلي. ولعل بعضكم أن يكون ألحن بحجته من بعض فأقضي بنحو مما أسمع. فمن قضيت له من حق أخيه شيئاً فلا يأخذه فإنما أقطع له قطعة من النار) رواه البخاري و مسلم وأصحاب السنن.

واتە: من تەنها ئادەمیزادێکم، وە ئێوە گێرە و کێشەکانتان ئەهێنن بۆلای من. وە لەوانەیە هەندێکتان زیرەکتر بێت بۆ بەڵگە هێنانەوە لە هەندێکی ترتان، وە منیش بەپێی ئەوەی ئەیبیسم حوکم ئەدەم، جا هەرکەس مافی برا موسڵمانەکەیم بۆ بڕی با وەری نەگرێت، چونکە من پارچە ئاگرێکم بۆ بڕیوە.

وە شافیعی ئیجماعی زانایان ئەگێڕێتەوە لەسەر ئەوەی کە حوکمی حاکم حەرام حەڵاڵ ناکات.

جا ئەگەر کەسێك داواکاری مافێك بوو لەسەرکەسێکی تر و شایەتی هێنا لەسەر ئەوە، وە قازی حوکمەکەی وا دا کە بۆ داواکار بێت ئەوە حەڵاڵە ئەو کەسە ئەو مافە وەربگرێت هەرکاتێك شایەتەکانی ڕاست بوون، وە ئەگەر ئەو شایەتانەی داواکار هێنابونی درۆ بوو وەك ئەوەی بە درۆ شایەتی بدەن، جا قازی بەپێی ئەو شایەتیانە حوکمەکەی دەرکرد ئەوە ئەو حوکمە هیچ لە واقیع ناگۆڕێت، وەبۆ داواکار ڕەواناکات ئەوحەقە بەرێت، چونکە هەر ماڵی خاوەنێتی، وەکەس لە زانایان جیاوازیان نی یە لەوەدا. ئەبوحەنیفە نەبێت کە ووتویەتی: دادوەری کردن لە پەیمانەکان وهەڵوەشاندنەوەدا بە ڕواڵەت و نا ڕواڵەت جێبەجێ ئەبێت. کەواتە بەڕای ئەبوحەنیفە ئەگەر شایەتێکی درۆ لای قازی لەسەر تەڵاق کەوتنی ژنێك شایەتی دا وقازیش حوکمی تەڵاق دانی

(١) البخاري (٢٧١٠) ومسلم (١٥٥٨/٢٠).

ئەوژنەی دەرکرد ئەو ژنە تەڵاقی ئەکەوێت لەو پیاوە، وە دروستە بۆی شووبکاتەوە بە پیاوێکی تر، وە هەروەها دروستە ئەو کەسەی شایەتی‌یە درۆکەی داوە مارەی بکاتەوە بۆ خۆی. وە هەروەها ئەگەر شایەتێکی درۆ شایەتی دا لەسەر ژنێکی بێگانە کە ژنی کابرایەکی بێگانەیە، وە ژنیشی نەبوو، وە حاکمیش بەپێی ئەو شایەتی‌یە حوکمی دا کە ژنیەتی، ئەو نافرەتەی بۆ حەڵاڵ نەبێت بەپێی ئەو حوکمە.

وە ئەوەی ئەبوحەنیفە بۆی چووە لە جیاوازی دانان لە نێوان کێشەکانی خوێن و موڵك و کێشەکانی پەیمان بەستن و هەڵوەشاندنەوە ڕاست نی‌یە، چونکە لەنێوان ئەوانەدا هیچ جیاوازی نی‌یە.

**حوکم دانی قازی بە سەر کەسێکی غایب داکە وەکیلی نەبێت :**

دروستە داواکار(مدعي) داوا لەسەر کەسێك تۆمار بکات کە ئامادە نەبێت و وەکیلی نەبێت، وەدروستە بۆ حاکم حوکم بدات بەسەر کەسە نائامادەکەدا کاتێ داواکە سابت بوو، بەپێی ئەم بەڵگانە.

١- خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فَاحْكُمْ بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَق﴾ (ص/٢٦).

واتە: لەنێوان خەڵکدا بە دادپەروەری حوکم بکە.

جا ئەوەی بە شایەتی سابت بوو حەقە کەواتە ئەبێ حوکمی پێ بدرێت.

٢- هیند باسی ئەبوسوفیانی بۆ پێغەمبەر ﷺ کرد کە پیاوێکی دەست نوقاوە هیچیان ناداتێ ئایا دروستە بۆی بەبێ پرس لە ماڵەکەی هەڵبگرێت؟ پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (خذي مايكفيك وولدك بالمعروف)[1].

واتە: بەشی خۆت ومنداڵەکانت بە پێی عورف و عادەت هەڵبگرە.

ئەمەش حوکم دانی نائامادەیە (غائب).

٣- وە مالیك لە (الموطأ) دا ئەگێڕێتەوە کە عومەر فەرمویەتی: هەرکەس قەرزی هەیە بەیانی بێت ماڵەکەی ئەفرۆشین ودابەشی ئەکەین بە سەر خاوەن قەرزەکانی دا.

وە ئەوکەسەی ئەو حوکمەی بە سەرا دابوو خۆی ئامادە نەبوو.

٤- لەبەرئەوەی حوکم نەدان بەسەریا لەناوچوونی مافی خەڵکی تێدایە، چونکە ئەوکەسە غایبە ناتەوان نابێت لە دانەوەی ئەوەی لەسەریەتی، وە مالیك و شافیعی و ئەحمەدیش بۆئەوە چوون و

(١) البخاري (٥٣٦٤) ومسلم (٧/١٧١٤).

فەرمویانە: ئەو کەسەی غایبە مافەکەی لە دەست ناچێت. چونکە هەرکاتێك ئامادەبوو وبەڵگەکانی ڕاوەستاوبوون وبیستران بەپێی ئەو بەڵگانە کارئەکرێت ئەگەرچی ببێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی حوکمەکەش، چونکە حوکم دان بەسەر ئەو غائیبە لە حوکمی ئەوەدایە کە بەسترابێتەوە بە مەرجەوە.

وە شورەیح وعومەری کوڕی عبدالعزیز وئیبنوئەبی لەیلا و ئەبوحەنیفە فەرمویانە: قازی نابێت حوکمی غایب بدات، مەگەر کەسێك ئامادە بێت لە جیاتی ئەو وەك وەکیل یا وەصی چونکە لەوانەیە ئەوان بەڵگەیەکیان پێ بێت کە داواکردنی داواکارەکە پوچەڵ بکاتەوە، وە لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە حەدیسەکەی پێشودا بە عەلی فەرموو: (يا علي، إذا جلس إليك الخصمان فلا تقض بينهما حتّي تسمع من الآخر كما سمعت من الأول، فإنك إذا فعلت ذلك تبين لك القضاءُ). رواه أحمد وأبوداود والترمذي[1].

واتە: ئەی عەلی، کاتێ هەردووکەسە ناکۆکەکە لەبەر دەمتا دانیشتن حوکمیان مەکە هەتا گوێ لەوی تریان نەگریت، وەك چۆن گوێت گرتووە لە یەکەم، جا ئەگەر ئەوەت کرد دادوەریت بۆ ڕوون ئەبێتەوە.

خەطابی ووتویەتی: خاوەن ڕاکان حوکم ئەدەن بە سەر غایب دا لەم شوێنانەدا:

لەوانە حوکم دان بەسەر مردوو و منداڵدا

وە وتویانە: دەربارەی پیاوێك کە کەلوپەلێك ئەسپێرێت بەکەسێك لە پاشاندا دیار نامێنێ، جا ئەگەر ژنەکەی داوای نەفەقەی کردو شتە سپێرراوەکەی هێنا بۆ لای حاکم، حوکم ئەدرێت بۆ ژنەکە ئەو سپاردەیەی بدەنێ.

وە وتویانە: ئەگەر ئەو کەسەی مافی (شوفعة) هەڵگرتنەوەی هەیە ئیددیعای کرد لە هاوبەشەکەی کە غایب بوو، ئەو مولکەی فرۆشتووە وپارەکەی وەرگرتووە ئەوە حاکم حوکمی بۆ ئەدا بە (شوفعة) هەڵگرتنەوە. ئەمانە هەمووی حوکمدانە لەسەر غایب.

دادوەری کردن لە نێوان زیمی‌یەکاندا :

ئەگەر چەند زیمی‌یەك هاتن بۆلای قازی موسوڵمانان بۆ ئەوەی ببێتە دادوەری نێوانیان دروستە بۆ ئەو قازی‌یە ببێتە دادوەریان، وە ئەبێ بەپێی ئەوەی خوا ناردویەتی‌یە خوارەوەو حوکمی موسوڵمانانی پێ ئەکرێت حوکمیان بکات.

---

(١) أحمد (١/١١)، أبوداود (٣٥٨٢)، ترمذي (١٣٣).

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فَإِنْ جَاءُوكَ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ وَإِنْ تُعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَنْ يَضُرُّوكَ شَيْئًا وَإِنْ حَكَمْتَ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِالْقِسْطِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ (المائدة: ٤٢).

واتە: ئەگەر هاتنە لات و داوای حوکمیان لیّ کردی یا ببەرە دادوەریان یا ڕویان لیّ وەرگێڕە، وە ئەگەر ڕویان لیّ وەربگێڕی هیچ زیانت پیّ ناگەیەنن، وە ئەگەر بویتە دادوەریان بەڕاستی و دادپەروەری کێشەی نێوانیان کۆتایی پیّ بهێنە، لەبەر ئەوەی خوا دادپەروەرانی خۆش ئەوێت.

**ئایا بۆ خاوەن حەق هەیە لە ماڵی قەرزکوێر ببات بیّ ئەوەی بچێتە لای قازی :**

شافیعی‌یەکان ووتویانە:

هەرکەس مافێکی لای کەسێك بوو بەڵام شایەتی نەبوو، ئەویش دانی پێدا نەئەنا، بۆی هەیە لەجۆری شتەکەی خۆی لە ماڵی کابرا ببات ئەگەر توانی، وە نابێت لەو جۆرەی خۆی زیاتر ببات، ئەگەر توانای هەبوو هەر لەو جۆرە بەرێت.

وتویانە: بەڵام ئەگەر لە جۆری ماڵەکەی خۆی دەست نەئەکەوت دروستە بۆی بیبات.

وە ئەگەر توانرا مافەکە بە دەست بێت بە قازی-وەك ئەوەی ئەو کەسەی مافەکەی لەسەرە دانی پێدا ئەنێت، بەڵام قەرزکوێرە، یا دانی پێدا نانێت، بەڵام شایەتی بە سەرەوەیە-یا لەو کەسانەیە کە ئومێدی دان پیّ دانانی لیّ ئەکرێت ئەگەر ببرێتە بەردەم قازی وسوێند بدرێت، ئایا ئەمە ئەبێت خۆی مافەکەی وەربگرێتەوە یا ببرێتە لای قازی؟ خیلافی تێدایە، ئەوەی پارسەنگ بدرێتەوە ئەوەیە کە دروستە مافەکەی بە دەستی خۆی وەربگرێتەوە، وە کێشەکەی هیندی ژنی ئەبوسفیان شایەتە بۆ ئەوە.

لەبەر ئەوەی بەرزکردنەوەی حوکم بۆلای قازی دەردەسەری وپارە وکات لە دەست چوونی تێدایە.

ووتویانە: لە پاشاندا کاتیّ دروست بێت مافەکەی وەربگرێتەوەو نەتوانیّ بیگاتیّ هەتا دەرگا نەشکێنیّ یا دیواری ماڵەکەی کون نەکات دروستە بۆی ئەوانەش بکات ودەستبەریش نی‌یە لەو زیانانەی ئەیدات، وەك کەسێك نەتوانیّ ووشتری سەرشێت (صائل) لە خۆی دورخاتەوە هەتا زیانی لیّ نەدات ئەگەر زیانیشی لیّ دا دەستبەر نی‌یە.

وە ئەوەی بۆی چوون پێچەوانەی ئەو فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ نی‌یە کە فەرموویەتی: (أد الأمانة إلى من أئتمنك ولا تخن من خانك)[1].

---

(١) أبوداود (٣٥٣٤).

واتە: ئەو سپاردەیەی لات دانراوە بیدەرەوە بە خاوەنی وە ناپاکی مەکە لەگەڵ ئەوکەسەدا کە ناپاکیت بەرامبەر ئەکات.

(خطابي) ووتویەتی: لەبەر ئەوەی ناپاك ئەو کەسەیە کە دەست بەسەر شتێکدا ئەگرێت کە ماڵی خۆی نی‌یە بەڵام بە ستەم و دوژمنکاری ئەیبات.

بەڵام ئەو کەسەی ڕێی پێ دراوە مافی خۆی وەربگرێتەوە لە ماڵی دوژمنەکەی و ئەو ستەمەی لێ کراوە بە دەستی بهێنێتەوە ئەو کەسە ناپاك نی‌یە، بەڵکو مانای(ناپاکی مەکە بەرامبەر ئەو کەسەی ناپاکیت بەرامبەر ئەکات)ئەوەیە کە ناپاکی بەرامبەر ناپاکی ئەو کەسە مەکە. وە ئەمە ناپاکی نەکردووە بەرامبەری لەبەر ئەوەی مافی خۆی ئەهێنێتەوە، وە ئەوەی یەکەم مافی کەسێکی تری داگیر کردووە.

**دەرکەوتنی حوکمێکی تازە بۆ قازی:**

ئەگەر قازی حوکمێکی دا لە کێشەیەکدا بە ئیجتیهادی خۆی لە پاشاندا حوکمێکی تری بۆ دەرکەوت کە پێچەوانەی حوکمی‌یەکەم بوو نابێت حوکمەکەی یەکەم هەڵوەشێنێتەوە، وە هەروەها ئەگەر حوکمی قازی‌یەکی تری بۆلا بەرز کرایەوە ئەویش ڕای لەسەر نەبوو ئەوە نابێت هەڵی بوەشێنێتەوە وە بنەمای ئەمەش ئەوەیە کە عبدالرزاق گێڕاویەتی‌یەوە لە دادوەری عومەری کوڕی خەطابدا عليه‌السلام دەربارەی ژنێك کە ئەمرێت و مێردەکەی و دایکی و دوو برای باوکی ودایکی و دوو برای دایکی بەجێ دێڵێ، عومەر رضي الله عنه برا دایك وباوکی‌یەکان وبرا دایکی‌یەکان هاوبەش ئەکات لە سێ‌یەکی میراتەکە، پیاوێك پێی ئەڵێت: تۆ ساڵی ڕابوردو برا دایکی وباوکی وبرا دایکیت هاوبەش نەئەکرد، عومەر رضي الله عنه فەرموی: ئەوە لەسەر دادوەری ئەو کاتە بوو ئەمەشیان لەسەر هی ئێستایە.

ئیبنوقەییم فەرمویەتی: ئەمیری باوەڕداران لە هەر دوو ئیجتیهادەکەیدا بەوە حوکمی کردووە کە بەلایەوە حەق بووە.

**چەند نموونەیەك لە دادوەری لە سەرەتای ئیسلامەوە:**

ئەبونوعەیم لە (الحلیة)دا تەخریجی کردووە کە عەلی کوڕی ئەبوطالیب رضي الله عنه درعێکی خۆی دۆزی‌یەوە لای کابرایەکی یەهودی کە هەڵی گرتبوو ناسیەوە، عەلی رضي الله عنه ووتی: ئەوە درعی منە لە ووشترە ڕەنگ خاکی‌یەکەم کەوتۆتە خوارەوە، جولەکەکەش ووتی: درعی خۆم و ماڵی خۆمە، لەپاشاندا جولەکەکە ووتی: نێوانمان قازی‌یەکی موسوڵمانان بێت، هاتنە لای شورەیحی قازی، کاتێ شورەیح عەلی رضي الله عنه بینی لە شوێنەکەی لاچو، و عەلی رضي الله عنه لە شوێنەکەی دانیشت، لەپاشاندا عەلی

ﷺ ووتی: ئەگەر بەرامبەرەکەم موسوڵمان بوایە ئەبوایە بە یەکسانی سەیرت بکردینایە، بەڵام خۆم لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە ئەی فەرموو: لە کۆڕی دانیشتندا یەکسانیان مەکەن لەگەڵ موسوڵمان، ئینجا بەسەر هاتەکەی گێڕایەوە.

شورەیح ووتی: چی ئەفەرمووی ئەی گەورەی موسوڵمانان، فەرمووی: درعەکەم لە ووشترە ڕەنگ خاکی‌یەکەم کەوتۆتە خوارەوە ئەو جولەکەیە هەڵی گرتووە، شورەیح ووتی: ئەی جوو تۆ ئەڵێی چی؟

ووتی: درعی خۆمەو بەدەستمەوەیە.

شورەیح ووتی: ئەی گەورەی موسوڵمانان سوێند بە خوا ڕاست ئەکەیت ئەوە درعی تۆیە، بەڵام ئەبێ دوو شاهید بهێنی.

ئەویش قەنبەر وحەسەنی کوڕی بانگ کرد شایەتی‌یان دا کە درعی عەلی‌یە.

شورەیح ووتی: ئێمە شایەتی قەنبەری ژێر دەستت قبوڵ ئەکەین، بەڵام شایەتی کوڕەکەت بۆ تۆ دروست نی‌یە.

عەلی ﷺ فەرموی: دایکت جەرگ سوتاو بێ بۆت؛ ئەی نەت بیستووە لە عومەری کوڕی خطاب ﷺ ئەی فەرموو: پێغەمبەر ﷺ ئەی فەرموو: (الحسن والحسين سيدا شباب أهل الجنة).

واتە: حەسەن و حوسەین گەورەی لاوەکانی بەهەشتن.

ووتی: بەڵێ بیستومە.

عەلی ﷺ فەرموی: ئایا شایەتی گەورەی لاوەکانی بەهەشت بە دروست دانانێیت؟ لەپاشاندا بە جولەکەکەی ووت: درعەکە بەرە بۆ خۆت.

جولەکەکە ووتی: ئەمیری موسوڵمانان لەگەڵما هات بۆ لای قازی موسوڵمانان وئەویش دای بە من، وە ڕازی بوو، سوێند بە خوا ئەی گەورەی موسوڵمانان ڕاست ئەکەیت درعی خۆتە لە ووشترەکەت کەوتە خوارەوەو هەڵم گرتەوە (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله)

عەلی خوای لی‌ی ڕازی بێت دیرعەکەی پێ بەخشیی و نۆصەدی پێ بەخشی. و لەگەڵ عەلی دا ﷺ دا جەنگی لە صەفین دا هەتا کوژرا[1].

---

(١) حلية الأولياء (٤/١٣٩).

## داواكاری‌یەكان و بەڵگەكان (الدعاوى والبينات)

پێناسەكەی: (دعاوی) كۆی )دعوی)یە كە لەلۆغەتا بەمانای داواكاری‌یە،

وە لە شەرع دا داواكردنی مافێكە بە دەست كەسێكی ترەوە بێت یا لە ئەستۆی دا.

وە داواكار: ئەو كەسەیە داوای مافەكە ئەكات. و ئەگەر بێ دەنگەی كرد لەو داوایە وازی لێ ئەهێنرێت.

وە داوا لێ كراو: ئەو كەسەیە داوای مافەكەی لێ ئەكرێت. وە ئەگەر بێ دەنگەی كرد وازی لێ ناهێنرێت.

**داوا لە چ كەسێكەوە دروستە:**

داوا دروست نی‌یە لە كەسێكی ئازادی ژیری پێ گەیشتووەوە نەبێت، چونكە بەندە وشێت و گەوج و منداڵ وسەر لێ‌تێك چوو داوایان لێ وەرناگیرێ، وە وەك چۆن ئەم مەرجانە پێویستە لە داواكاردا هەبێت هەر ئەوانەش پێویستن بۆ ئەوكەسەی ئینكاری داواكە ئەكات.

**داوا دروست نی‌یە بێ بەڵگە:**

وە داوا ناچەسپێت بە بەڵگەیەك نەبێت كە هەقی پێ روون بێتەوە و ئاشكرابێت.

لە ئیبنوعەبباسەوە رەزای خوایان لێ بێت هاتووە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لو يعطي الناس بدعواهم لادعى ناس دماء رجال وأموالهم ولكن اليمين على المدعى عليه) رواه أحمد ومسلم[1].

واتە: ئەگەر خەڵك بە داواكردن شتیان بدرایە كۆمەڵە خەڵكێك داوای گیان ومالی هەندێكیان ئەكرد، بەڵام سوێندخواردن لەسەر داوا لەسەركراوە.

**داواكارەكە ئەبێ بەڵگە بهێنێت :**

وە داواكار ئەوكەسەیە كە ئەبێ بەڵگە بێنێت لەسەر راستێتی و دروستی داواكەی لەبەر ئەوەی بنەما لە داوا لێ‌كراودا ئەوەیە كە بەری‌یە لەو تاوانە، وە لەسەر داواكاریش پێویستە پێچەوانەی ئەوە بچەسپێنێت. بەیهەقی و گبرانی بە ئیسنادێكی صەحیح گێراویانەتەوە كەپێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (البينة على المدعي واليمين على من أنكر)[2].

---

(١) أحمد (٨/٣٥١) ومسلم (١/١٧١١).

(٢) البيهقي في الكبرى (٨/١٢٣).

واتە: بەڵگە هێنانەوە لەسەر داواکارە و سوێندخواردن لەسەر داوا لێکراوە کە دانی پێدا نانێت.

**مەرجە کە بەڵگە ئەبێ قەتعی بێت:**

وە مەرجە لە بەڵگەدا کە ئەبێت قەتعی و بڕاوە بێت چونکە بەڵگەی گومانـاوی کەڵکی تەواوی نیـیە ﴿وإن الظن لايغني من الحق شيناً﴾. (نجم: ٢٨)

واتە: بەڕاستی گومان هیچ کەڵکی نییە و هەرگیز جێی حەق ناگرێتەوە.

وە لە ئیبنوعەبباسەوە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ بەپیاوێکی فەرموو: خۆر ئەبینی؟ ووتی: بەڵێ. فەرمووی: لەسەر شێوەی ئەو بینینە شایەتی بدە یا داوا بکە[1]. خەللال ئەم حەدیسەی گێڕاوەتەوە لە جامیعەکەیدا، هەروەها ئیبنوعەدی. وە ئیبنوعەدی. وە حەدیسەکەش لاوازە چونکە لە ئیسنادەکەی دا محمدی کوڕی سلێمان هەیە کە نەسائی بە لاوازی داناوە، وە بەیهەقی ووتویەتی: لە ڕوویەکەوە نەهاتووە کە پشتی پێ ببەسترێت.

**ڕێگاکانی سابت کردنی داوا:**

ڕێگاکانی سابت کردنی داوا ئەمـانەن:

١- دان پیانان (الإقرار)).

٢- شایەتی دان.

٣- سوێند خواردن.

٤- بڕوانامەی ڕەسمی سابت.

وە هەریەکە لەم ڕێگایانە چەند حوکمی هەیە والە خوارەوە باسیان ئەکەین:

**١- دان پێدانان (إقرار)**

ئیقرار لە لۆغەتا سابت کردنە، وە لە شەرعدا ئیعتیراف و دان نانە بەو شتەدا کە داواکەی بۆ تۆمارکراوە، ئەمەش بەهێزترین بەڵگەی چەسپاندنی داوای داوا لەسەر کراوە.

ووتویانە: دان پێ دانان گەورەی هەموو بەڵگەکانە، وەبە شایەتی دان لەسەر خۆ ناوئەبرێت.

---

(١) الحاكم (٤/٩٨-٩٩) وبلوغ المرام (١٤٣٣).

**دانانی لە یاسای ئیسلامدا:**

زانایان هەموو ئیجماعیان هەیە لەسەر ئەوەی دان پێدانان بەپێی قورئان وسوننەت دانراوە، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَى أَنفُسِكُمْ﴾ (النساء/١٣٥).

واتە: ئەی باوەڕداران ڕاستی و عەدالەت بەڕێوەبەرن و شایەتی بۆ خوا بدەن ئەگەر بە زیانی خۆتانیش بێت.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئونەیس برۆ بۆ لای ژنی ئەو کابرایە ئەگەر دانی پێدانا بەردبارانی بکە.

وە هەروەها فەرموویەتی: (صل من قطعك، وأحسن إلي من أساء إليك وقل الحق ولو على نفسك) الجامع الصغير (٥٠٠٤).

واتە: هەرکەس خزمایەتی لەگەڵدا پچڕاندی تۆ بیگەیەنەرەوە، وە چاکە لە گەڵ ئەو کەسەدا بکە کە خراپەت لەگەڵدا ئەکات، وە حەق بڵێ ئەگەر بە زیانی خۆشت بووە[1].

وە لە ئەبوذەرەوە ﷺ کە فەرمویەتی: خۆشەویستەکەم پێغەمبەری خوا ﷺ وەسیتی بۆکردم کە سەیری ئەو کەسانە بکەم کە لە خوار خۆمەوەن، وە سەیری ئەو کەسانە نەکەم کە لەسەرو خۆمەوەن، وە هەژارانم خۆش بوێت و لێیان نزیك بمەوە، وە پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بێنم، ئەگەر کەسەکانیشم لێم جیاببنەوەو خراپەم لەگەڵ بکەن، وە ڕاست بڵێم با تاڵیش بێت، وە لەبەر خوا لە سەرزەنش و لۆمەی لۆمەکەران نەترسم، وە داوای هیچ نەکەم لە کەس، وە زۆر (لاحول ولا قوة إلا بالله) بڵێم چونکە لە گەنجینەکانی بەهەشتە. وە پێغەمبەر ﷺ کۆتایی ئەهێنا بەم زیکرە لە خوێن و حەددەکان و ماڵەکاندا[2].

**مەرجی دروستی ئیقرار:**

وە بۆ دروستی دان پێدانان ئەم مەرجانەی خوارەوە پێویستە:

ژیری و پێ گەیشتویی و ڕازی بوون و مامەڵە دروست بون مەرجە لە ئیقرار کردندا، و ئەبێ دان پێدانەرەکە بە گاڵتەی نەبێت، وە نابێت دانی نابێت بە شتێکدا کە بە عەقڵ وعادەت نەگونجێت.

---

(١) ابن النجار (كما في صحيح الجامع ٣٧٦٩) والسلسلة الصحيحة (١٩١١).

(٢) أحمد (٥/١٧٣) ومجمع الزوائد (٣/٩٣).

کەواتە دان پێدانانی شێت دروست نی یە، وە هەروەها منداڵ وزۆر لێ‌کراو وئەوانەی مەحجورن (لەبەر گەوجی یان هەر هۆیەکی دیکە کڕین وفرۆشتن وهەموو تەسەروفێکی ماڵی یان لێ قەدەغە ئەکرێ) وەهەروەها گاڵتەباز، وە بە شتێك نەبێت کە عەقڵ وعادەت قبوڵی ناکات، چونکە درۆ لەم شێوانەدا دیارە، وەدروست نی یە حوکم دان بە شتی درۆ.

**پەشیمان بوونەوە لە دان پێدانان:**

هەرکاتێك دان پێدانان دروست بوو ئەسەپێنرێت بە سەردان پێدانەرەکەدا و دروست نی یە پەشیمان بوونەوەی ئەگەر ئەو دان پێدانانە پەیوەندی بە مافێك لە مافەکانی خەڵك هەبوو. بەڵام ئەگەر پێ لێنانەکە پەیوەندی بە مافێك کە مافەکانی خواوە هەبوو، وەك حەددی زینا و ئارەق خواردن ئەوە دروستە پەشیمان بوونەوە لێی بەپێی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ: (إدرأوا الحدود بالشبهاتِ)[1].

واتە: تۆڵە شەرعی یەکان لەکۆل بخەن و لای بەرن ئەگەر گومانێکیان تێدا بوو.

وە بەپێی حەدیسەکەی ماعیز کە لەبابی حدوددا باس کراوە. وە ظاهیری یەکان پێچەوانەی ئەوەن و پەشیمان بوونەوە لە ئیقرارکردندا بە دروست دانانێن کە دەربارەی مافێك لە مافەکانی خوایی بێت یا ئادەمی.

**ئیقرار کردن حوجەیەکی (قاصر) تێ نەپەڕە:**

وە ئیقرار کردن بەڵگەیەکی تێ نەپەڕە لە دان پیانانەکە تێ ناپەڕێت، جا ئەگەر ئیقراری لەسەر کەسێکی تریش کرد ئەوە ئەو ئیعتیرافەی لەسەر ئەو کەسە دروست نی یە بە پێچەوانەی شایەتەوە کە بەڵگەیەکی تێپەڕە بۆ کەسانی تر.

ئەگەر داواکارێك داوای ئەوەی کرد کەقەرزی لەسەر کۆمەڵێکە وهەندێکیان پێ یان لێ ناو هەندێکی تریان ئینکاریان لێ کرد، ئەوە ئەو پێ لێ نانە هەر ئەوانە ئەگرێتەوە کە دانیان پێداناوە. بەڵام ئەگەر داواکەی چەسپاند بە شایەتی ئەوە هەموویان ئەگرێتەوە.

**ئیقرار کردن بەش بەش نابێت:**

ئیقرار کردن یەك قسەیە، هەندێکی وەرناگیرێ وهەندێکی وازی لێ بهێنرێت.

**ئیقرارکردن بە قەرز:**

---

(١) تلخيص الحبير (٤/٦٣) وضعيف الجامع (٢٥٨) والإرواء (٢٣١٦) والسلسلة الضعيفة (٢١٩٦).

ئەگەر کەسێك ئیعتیرافی کرد بۆ یەکێك لە میرات گرەکانی کە قەرزێکی لایە، ئەوە ئەگەر لە نەخۆشی مردندا بێت دروست نی یە هەتا هەموو میرات گرەکانی بەڕاستی دانەنێن لەبەر ئەوەی لەوانەیە مەبەستی لەو قسەیە بێبەش کردنی میرات گرەکانی بێت چونکە نەخۆشە، بەڵام ئەگەر ئیقرارەکە لە حاڵەتی ساغی دابێت ئەوە دروستە وئیحتمالی مەبەستی بێ بەش کردنی میرات گرەکانی لەم کاتەدا تەنها ئیحتیماڵە و جۆرێکە لە گومان بردن و ڕێگری لە بەڵگەی ئیقرار ناکات.

وە لای شافیعی یەکان ئیقراری ئادەمیزادی ساغ دروستە بەمەرجێك نەبێت بە مانیع وکۆسپ بۆ بوونی مەرجی تەندروستی.

بەڵام لە نەخۆشی مردندا، ئەگەر بۆ بێگانەیەك ئیقراری کردبێت ئەو ئیقرارەی ڕاستە و دروستە، ئیتر ئەوشتەی دانی پێداناوە قەرزبێت یا کەل وپەل و شتی تر.

وە ووتراوە: لە سێ یەك حیساب ئەکرێت.

وە ئەگەر ئیقرارەکە بۆ میرات گر بوو ئەوەی لایان بەهێزترە ئەوەیە ئەو ئیقرار کردنە دروستە، چونکە ئەو کەسە گەیشتۆتە حاڵێك کە درۆزنیش لەوحاڵەدا ئەبێتە ڕاستگۆ، وە تاوانبار تێیدا تۆبە ئەکات، وە ئەوەی ئاشکرا بێت لەم شێوانەدا ئەوەیە کە ئەوکەسە ئیقرارێك ناکات کە ڕاست نەبێت و مەبەستی بێ بەشکردن بێت، وەلەم بارەیەوە قسەیەکی تریان هەیە ئەویش نادروستی ئەو ئیقرارەیە، چونکە لەوانەیە مەبەست بێ بەش کردنی هەندێك لە میرات گرەکانی بێت.

وە هەر لای شافیعی یەکان ئەگەر کەسێك لە کاتی ساغی دا ئیعتیراف بکات کە قەرزی کەسێکی لایە پاشان لە نەخۆشی یەکەیدا دان بەوەدا بنێت کە قەرزی کەسێکی تری لایە، ئەوە بۆیان بەش ئەکرێت و نابێت ئەوەی یەکەم جار پێش بخرێت.

ئەحمەد فەرمویەتی: دروست نی یە بە هیچ جۆرێك نەخۆش ئیقرار بۆ میرات گرەکانی بکات، وە بەڵگەشی ئەوەیە کە کەس دڵنیا نی یە لەوەی دوای ئەوەی وەسێتی لێ قەدەغە کرا بیکات بە ئیقرار.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەوزاعی وکۆمەڵێك لە زانایان بە دروستیان داناوە ئیقراری نەخۆش بە شتێك لە ماڵەکەی بۆ میرات گرەکانی، چونکە تۆمەت دەربارەی ئەو کەسەی لەگیانەڵڵادایە دوورە، وە خولگەی حوکمەکان لەسەر ڕواڵەتە، کەواتە نابێت واز لە ئیقرارەکەی بهێنرێت لەبەر گومانێك، ئیتر کاریشی ئەدرێتە دەستی خوا.

**شایەتی (الشهادة)**

**پێناسەکەی:**

(شهادة) لە ووشەی (مشاهدة) وەرگیاوە کە بە مانای بە چاوبینینە، چونکە شایەت ئەوە ڕائەگەیەنێت کە بە چاو بینیویەتی، ئەویش بە زاراوەی شایەتی ئەدەم ڕائەگەیەنرێت، وە ئەڵێن: لە ڕاگەیاندنەوە وەرگیراوە لە فەرمودەی خوادا: ﴿شَهِدَ اللّهُ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هو﴾ (آل عمران/١٨).

واتە: خوای گەورە ڕای گەیاندووە کە هیچ پەرستراوێکی بەهەق نی‌یە شایستەی پەرستن بێت جگە لە خۆی.

وە شایەت هەڵگری بینینەکەیەو ڕاگەیەنەری‌یەتی چونکە ئەو شتێکی بینیوە کە کسانی تر نەیان دیوە.

**شایەتی بە بێ زانیاری نابێت:**

ڕەوا نی‌یە بۆکەس شایەتی بدات هەتا زانیاری نەبێت لەو بارەیەوە، وە زانیاریش دێتە دەست بە بینین یا بە گوێ لێ بوون یا بە بڵاوبوونەوەو دەماودەم لەو شتانەدا کە بەزۆری زانینیان بەبێ بڵاوبوونەوە گران بێت، وە بڵاوبوونەوەش ناوبانگە. وە شایەتی دروستە بە ناوبانگ لای شافیعی‌یەکان لە نەسەب و منداڵ بوون و مردن و ئازادکردن و (ولاء) دڵسۆزی و (ولایة) سەرپەرشتی و وەقف و عەزل و نیکاح و ئەوەی پەیوەندی بە نیکاحەوە هەیە، وەهەروەها لە تەعدیل وجەرح و وەسێت و ڕوشد و گەوجی و خاوەنێتیدا.

وە ئەبوحەنیفە فەرمویەتی: شایەتی بەناوبانگ لە پێنج شتدا دروستە: ئەوانیش نیکاح و چوونەلا و نەسەب و مردن و فەرمان ڕەوایی دادوەری.

وە ئەحمەد و هەندێ لە شافیعی‌یەکان فەرمویانە: لە حەوت شتدا دروستە: لە نیکاح و نەسەب و مردن و ئازادکردن و دڵسۆزی و وەقف و خاوەنیەتی ڕەها.

**حوکمەکەی:**

شایەتی دان فەرزی عەینە لەسەر ئەو کسانەی هەڵیان گرتووە هەر کاتێ بانگ کران بۆ ئەو مەبەستە، کە ترسی لەناوچوونی مافی تێدا بێت، بەڵکو نەبێتە واجب ئەگەر ترسی لەناوچوونی مافی تێدا بێت، ئەگەرچی بۆ شایەتی دانیش بانگ نەکرێ بەپێی فەرمودەی خوای گەورە: ﴿ولاَ تَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ﴾ (البقرة:٢٨٣).

واتە: شایەتی مەشارنەوە

وە هەروەها فەرمویەتی: ﴿وَمَنْ يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ﴾ (البقرة:٢٨٣).

واتە: هەرکەس بیشارێتەوە ئەو کەسە دڵ و دەرونی تاوانبارە.

وە هەروەها ئەفەرموێت: ﴿وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ﴾ (الطلاق:٢).

واتە: شایەتی لەسەر ڕاستی بدەن لە ڕێی خوادا.

وە لە فەرمودەی صەحیحدا هاتووە: (أنصر أخاك ظالماً أو مظلوماً)[1].

واتە: یارمەتی براکەت بدە ستەمکار بێت یا ستەم لێ کراو.

وە شایەتی دان یارمەتی‌ڕیە بۆی.

وە لە زەیدی کوڕی خالیدەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ألا أخبركم بخير الشهداء؟...الذي يأتي بشهادته قبل أن يسألها)[2].

واتە: ئایا پێتان ڕانەگەیەنم باشترین شایەت کێیە؟ ...ئەوکەسەیە بەبێ ئەوەی داوای لێ بکرێت شایەتی بدات.

وە شایەتی دان کاتێ واجبە کەئەو کەسە توانای بە جێ هێنانی هەبێت بێ ئەوەی زیان بە خۆی وعەرز ومال و کەسوکاری بگات، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَلاَ يُضَآرَّ كَاتِبٌ وَلاَ شَهِيدٌ﴾ (البقرة/٢٨٢).

واتە: وە دروست نی‌یە بۆ خاوەن حەق و ئەو کەسەی حەقەکەی لەسەرە زیان بگەیەنن بە شایەت و نوسەر.

وە هەرکاتێك شایەت زۆربوو ترسی لەناوچوونی ماف نەما، ئەوکاتە شایەتی پەسەندە ئەگەر بەبێ هۆ لێی دواکەوت گوناهبار نابێت، وە ئەگەر کەسێك دانرا بە شایەت حەرامە کرێی لەسەر وەربگرێت مەگەر بە پیادەڕۆیشتن ئازاری بدات ئەو کاتە کرێی ئەو شتەی بۆ ئەدرێت کە سواری ئەبێت، بەلآم ئەگەر شایەتی دانەکەی واجب نەبوو دروستە کرێی لەسەر وەربگرێت.

مەرجەکانی وەرگرتنی شایەتی :

بە مەرج گیراوە بۆ وەرگرتن وقەبوڵ کردنی شایەتی ئەمانەی خوارەوە:

---

(١) البخاري (٦٩٥٢) والترمذي (٢٢٥٥).

(٢) أحمد (٤/١١٥) ومسلم (١٧١٩) وأبوداود (٣٥٩٦) وابن ماجه (٢٣٦٤).

١- ئیسلامەتی: شایەتی بێ باوەڕ لەسەر موسڵمان دروست نییە لە وەسیەتدا نەبێت کاتی سەفەر لای ئیمام ئەبوحەنیفە کە بە دروستی داناوە لەم شێوەیدا، هەروەها شورەیح و ئیبراهیمی نەخەعی، وە قسەی ئەوزاعیشە بەپێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ حِينَ الْوَصِيَّةِ اثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِنْكُمْ أَوْ آخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ إِنْ أَنْتُمْ ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ فَأَصَابَتْكُمْ مُصِيبَةُ الْمَوْتِ تَحْبِسُونَهُمَا مِنْ بَعْدِ الصَّلاَةِ فَيُقْسِمَانِ بِاللَّهِ إِنِ ارْتَبْتُمْ لاَ نَشْتَرِي بِهِ ثَمَنًا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى وَلاَ نَكْتُمُ شَهَادَةَ اللَّهِ إِنَّا إِذًا لَمِنَ الآثِمِينَ ، فَإِنْ عُثِرَ عَلَى أَنَّهُمَا اسْتَحَقَّا إِثْمًا فَآخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا مِنَ الَّذِينَ اسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ الأَوْلَيَانِ فَيُقْسِمَانِ بِاللَّهِ لَشَهَادَتُنَا أَحَقُّ مِنْ شَهَادَتِهِمَا وَمَا اعْتَدَيْنَا إِنَّا إِذًا لَمِنَ الظَّالِمِينَ﴾ (المائدة/١٠٧،١٠٦).

واتە: ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە کاتێ مەرگی یەکێ لە ئێوە دەگا، لەسەر دەمی وەسیەت دا ئەبێ دووکەسی دادگەر لە خۆتان بگرن بە شایەد، جا ئەگەر لە سەفەرا بوون وە مەرگ بینی گرتن و موسڵمانتان دەس نەکەوت، دووکەسی تر لە غەیری خۆتان بکەنە شایەد، وە ئەگەر لە کاتی شایەدی داندا لێیان کەوتنە گومانەوە، دووای نوێژ ڕایان بگرن تا بە خوا سوێند بخۆن کە ئێمە حازر نین هەق بە هیچ شتێك بفرۆشین، وە لایەنی کەس ناگرین با خزم و کەسی خۆشمان بێت، وە شایەدی بۆ خوا کە لەلامانە ناپێۆشین، چونکە ئەگەر ئەوە بکەین لە گوناه باران دەبین. وە ئەگەر خزم و کەسی مردو زانیان کە ئەو دوو شایەتە تاوانبارن بە خیانەت کردن لە شایەتییەکەدا، یا لە وەسیەتەکەدا، با دوو کەسی تر لە خزم و کەسی مردووەکە لەباتی ئەو دوانە شایەدی بدەن، جا سوێندیش بخۆن کە شایەدی دانی ئێمە دروست ترە لە شایەدی دانی ئەوان، وە ئێمە لە هەق لامان نەداوە، دەنا بەڕاستی لە ستەمکاران دەبین.

وە هەروەها حەنەفییەکان شایەتی بێ باوەڕ لە نێوان خۆیاندا بە دروست دائەنێن، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دوو جولەکەی بەردباران کرد کە جولەکەیەك شایەتی لەسەردان کە زینایان کردووە.

وە شیعبی گێڕاویەتییەوە: کە پیاوێکی موسوڵمان کەوتە حاڵەتی سەرەمەرگ لەم (دەقوقاء)ەدا وە کەسی موسوڵمانی دەست نەکەوت شایەتی وەسیەتەکەی بێت، دوو کابرای ئەهلی کیتابی کردە شایەت، ئەوانیش هاتن بۆ کوفە بۆ لای ئەبوموسای ئەشعەری وە پێ یان ڕاگەیاند وە وەسیەتەکەی و چی بەجێ هێشتووە هێنایان.

ئەبوموسای ئەشعەری وتی: ئەم جۆرە لەو کاتەوە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بووە ڕووی نەداوە، ئەمە نەبێت، پاشان دوای نوێژی عەسر سوێندی دان کە نە ناپاکیان کردووەو نە درۆ وە نە شتیان

شاردزتەوەو نە گۆڕیویانە، وە ئەمە وەسیێت و میراتی ئەو پیاوەیە، جا کاتێ سوێندیان خوارد لیێ وەرگرتن.

خەطابی ووتویەتی: ئەمە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە شایەتی ئەهلی ژمە وەرئەگیرێ لەسەر وەسێتی موسوڵمان بەتایبەتی لە سەفەردا.

وە ئەحمەد فەرمویەتی: شایەتی‌یان وەرناگیرێ لەم شێوانەدا نەبێت لەبەر پێویستی.

وە شافیعی و مالیك فەرمویانە: دروست نی‌یە شایەتی دانی کافر لەسەر موسوڵمان نە لە وەسێتی کاتی سەفەرداو نە لە بێجگە لەوەدا، وە ئەو ئایەتە لای ئەوان سڕراوەتەوە (مەنسوخە).

**شایەتی کافری زیمی بۆ زیمی :**

بەڵام شایەتی زیمی بۆ زیمی جیاوازی زانایانی لەسەرە.

شافیعی و مالیك فەرمویانە: شایەتی زیمی نە لەسەر موسوڵمان نە لەسەر کافر وەرناگیرێت.

ئەحمەد فەرمویەتی: شایەتی ئەهلی کیتاب دروست نی‌یە لەسەر یەکتر.

وە حەنەفی‌یەکان ووتویانە: شایەتی‌یان لەسەر یەك دروستە چونکە کوفر هەموو یەك نەتەوەن.

وە شیعبی و ئیبنوئەبی لەیلا و ئیسحاق فەرمویانە: شایەتی جولەکە لەسەر جولەکە دروستە، وە دروست نی‌یە لەسەر نەصرانی و مەجوسی چونکە نەتەوەی جیاوازن، وە دروست نی‌یە شایەتی نەتەوەیەك لەسەر نەتەوەیەکی تر کاتێ ئایینیان جیاواز بێت.

٢- (عدالة) دادپەروەری: سیفەتێکی زیادە لە ئیسلامەتی، وە عەدالەت ئەبێ لە شایەتەکاندا هەبێت بە شێوەیەك چاکەکانیان زاڵ بن بە سەر خراپەکانیاندا، وە ڕانەهاتبن لەسەر درۆ کردن، بەپێی فەرمودەی خوای بەرز: ﴿وَأَشْهِدُوا ذَوِي عَدْلٍ مِنْكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ﴾ (الطلاق:٢).

واتە: دوو کەس لەوانەی دادپەروەرن لە خۆتان بکەنە شایەت لەسەر گێڕانەوەکەیان یا جیابوونەوەیان، وە ئێوە —ئەی شایەتەکان- تەنها لەبەر خوا شایەتی بدەن.

وە هەروەها فەرمویەتی: ﴿ممن ترضون من الشهداء﴾ (البقرة:٢٨٢).

واتە: ئەوانەی ڕازین لی‌یان بۆ شایەتی.

وە هەروها فەرموودەی: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا﴾ (الحجرات:٦).

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر فاسقێك هەواڵێکی بۆ هێنان باش لیێ بکۆڵنەوە بۆ ئەوەی ڕاستی و ناڕاستی ئەو هەواڵە دەرکەوێت.

وە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە ئەبی داود ئەگێڕێتەوە:

(لا تجوز شهادة خائن ولا خائنة ولازان ولا زانية)[1].

واتە: شایەتی ژن وپیاوی ناپاك وزیناکەر دروست نیە.

کەواتە شایەتی فاسق و ئەوکەسەی بە درۆزن یا بە ڕەوشت خراپی ناوی دەرکردبێ وەرناگیرێت، ئەمە هەڵبژێرراوە لەمانای عەدالەتدا.

بەڵام زانایانی ئاین ووتویانە: شایەتی بەستراوە بە چاکی لە ئایینداو ناسران بە پیاوەتی و جوامێری‌یەوە.

وە ئاین چاکی بە بەجێ هێنانی فەرزەکان وسوننەتەکان و دوورکەوتنەوە لە شتی حەرام و ناشیرین و نەکردنی گوناهی گەورە وبەردەوام نەبوون لەسەر گوناهی بچکۆلە تەواو ئەبێت.

وە پیاوەتی: ئەوەیە ئادەمیزاد ئەو کارە بکات کە پێی جوان بێت، وە واز لەهەموو ئەو شتانە بێنێت کە ناشیرینی ئەکات لە قسە وکردەوە.

وە ئایا شایەتی فاسق وەرئەگیرێ کە تۆبە بکات ؟

زانایانی ئایینی ڕێك کەوتون لەسەر ئەوەی شایەتی فاسق وەرئەگیرێ ئەگەر تۆبەی کرد.

ئیمام ئەبوحەنیفە نەبێت کە فەرمویەتی: ئەگەر فاسق بوونەکەی بە هۆی (قذف) تۆمەتی زینا هەڵبەستنەوەیە ئەوە شایەتی‌یەکەی وەرناگرێ بەپێی فەرمودەی خوای گەورە: ﴿والَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً ولاَ تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ (النور/٤).

واتە: وە ئەوکەسانەی تاوانی داوێن پیسی ئەگرنە داوێن پاکەکان وچوار شایەت ناهێنن لەسەر قسەکانیان، هەشتا قامچی‌یان لێ بدەن وە هەرگیز شایەتی‌یان لێ وەرمەگرن، وە ئەوانە دەرچون لە فەرمانی خوا.

٣و٤- پێگەیشتویی و ژیری (البلوغ والعقل). وە لەبەر ئەوەی دادپەروەری و ڕاستی مەرجێکە بۆ وەرگرتنی شایەتی پێگەیشتویی و ژیریش مەرجن لە عەدالەتدا.

کەواتە شایەتی منداڵی بچوك وەرناگیرێت -با شایەتی لەسەر منداڵێکی وەك خۆیشی بدات- وە هەروەها شایەتی شێت و گەوج وەرناگیرێت چونکە شایەتی ئەمانە یەقین ناگەیەنن ئەو یەقینەی کە

(١) أحمد (٢/١٨١) وأبوداود (٣٦٠٠) والبيهقي في الكبري (١٠/٢٠٠).

حوکم بەپێی بدرێت، وە ئیمامی مالیك رێی داوە بە وەرگرتنی شایەتی منداڵان لە (جراح) برینداركردندا بە مەرجێك قسەکانیان جیاوازی نەبێت و جیاوازیان نەکردبێ، هەروەك عبداللە ی کوڕی زوبێر بە دروستی داناوە.

وە هەروەها صەحابە و فوقەهای مەدینە کاریان بە شایەتی منداڵان کردووە لە برینداركردنی یەکتریدا، وە ئەم رایە لەپێشترە. لەبەر ئەوەی پیاوان ئامادەی یاری کردنیان نابن، وە ئەگەر شایەتی ئەوان و شایەتی ژنان بە تەنها وەرنەگیرێت مافەکان لەناو ئەچن و پەکیان ئەکەوێت و پشتگوێ ئەخرێن لەگەڵ ئەوەشدا کە بە زۆری راستەکەن، بە تایبەتی ئەگەر بە کۆمەڵ ئەهاتن پێش ئەوەی لە یەك جیابوونەوەو گەڕابێتنەوە ماڵەوە، و لەسەر یەك قسە رێك بکەون، وەکاتی شایەتی دانەکە لە یەك جیا بکرێنەوە، وە قسەکانیشیان لەگەڵ یەك رێك بکەوێت، لەم کاتەدا گومانی بەدی هاتوو لە شایەتی‌یان زۆر بە هێزترە لە گومانی بەدی هاتوو لە شایەتی دوو پیاو، وەئەمە لەوانەیە کە ناتوانرێت رەت بکرێتەوە وئینکاری لێ بکرێت، وەنابێت گومانمان هەبێت لە شەریعەتی تەواو و رێکو پێك بۆ بەرژەوەندی بەندەکانی خوا لە ژیان و رۆژی دواییدا، کە ئەو مافە وون بکات و پشت گوێی بخات لەگەڵ دەرکەوتنی بەڵگەی بەهێز، وەوەری بگرێت بە بەڵگەیەك کە لە خوار ئەوەوە بێت.

٥- قسەکردن: وە ئەبێت شایەت توانای قسەکردنی هەبێت جا ئەگەر لاڵ بوو نەی توانی قسە بکات شایەتی‌یەکەی وەرناگیرێت، هەرچەند بە ئیشارەتیش قسەبکات و لە ئیشارەتەکەشی بگەیت مەگەر بە دەست نووسی خۆی شایەتی‌یەکە بنوسێت، وە ئەمە لای ئەبوحەنیفە و ئەحمەد و رای صەحیح لە مەزهەبی شافیعی‌یە.

٦- لەبەرکردنی و دابین کردنی چونکە: شایەتی کەسێك وەرناگیرێت کەناسرابێت بەوەی بیری خراپ بێت و زۆر هەڵە بکات و لێی تێك بچێت لەبەر ئەوەی بڕوا بە قسەکانی ناکرێت، وە گێل و هاوشێوەکانی ئەخرێتە پاڵ ئەمانە.

٧- ئەبێ تۆمەتبار نەبێت: وە شایەتی کەسێك وەرناگیرێت کە تاوانبار کرابێت بەهۆی خۆشەویستی یان دوژمنایەتی‌یەوە. وە عومەری کوڕی خەطاب و شورەیح و عومەری کوڕی عبدالعزیز و عیترە و ئەبوپهور و ئیبنومونژیر و شافیعی لە قەولێکدا پێچەوانەی ئەوەن و فەرمویانە: شایەتی کوڕ بۆ باوکی و باوك بۆ کوڕ وەرئەگیرێت بەومەرجەی هەریەکەیان راستگۆ شایەتی لێ وەرگیرابێت، شەوکانی و ئیبنوروشد گێڕاویانەتەوە.

وە شایەتی دوژمن لەسەر دوژمنەکەی وەرناگیرێت ئەگەر هاتوو دوژمنایەتی‌یەکەیان دوژمنایەتی دونیایی بێت لەبەر بوونی تۆمەت، بەڵام ئەگەر دوژمنایەتی‌یەکە ئایینی بێت ئەوە تۆمەت پێویست ناکات لەبەر ئەوەی ئایین قەدەغەی شایەتی درۆئەکات. ئیتر تۆمەت لەم حاڵەتەدا نابێت.

وە هەروەها شایەتی ئەسڵ وەرناگیرێ وەک کوڕ شایەتی بۆ باوک بدات، وە هەروەها شایەتی فەرع وەک باوک شایەتی بۆکوڕەکەی بدات، بەڵام دروستە شایەتی لەسەریان، وە هەروەک ئەوەیە: دایک شایەتی بۆ کوڕەکەی بدات وکوڕ شایەتی بۆ دایک بدات، وە ئەو خزمەت کارەی خاوەن ماڵ نەفەقەی بکێشێ، شایەتی لەم شێوانەدا وەرناگیرێت لەبەربوونی تۆمەت.

وە بەپێی ئەوەی دایکی موسڵمانان عائیشە گێڕاویەتی‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا تقبل شهادة خائن، ولا خائنة، ولا ذي غِمر علي أخيه المسلم، ولا شهادة الولد لوالده ولا شهادة الوالد لولده)[1].

واتە: شایەتی دانی پیاو و ژنی ناپاک و ئەوکەسەی کینەو غەرەزی هەیە لەسەر برا موسڵمانەکەی دروست نی‌یە، وە هەروەها شایەتی دانی کوڕ بۆ باوک و باوک بۆ کوڕ دروست نی‌یە.

وە عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکی‌یەوە لە باپیری‌یەوە گێڕاویەتی‌یەوە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمویەتی: (لاتجوز شهادة خائن ولاخائنة ولا ذي غِمر علي أخيه، ولاتجوز شهادة القانع لأهل البيت. والقانع الذي ينفق عليه أهل البيت).

واتە: شایەتی پیاو و ژنی ناپاک دروست نی‌یە، وە شایەتی ئەوەی کینەی لە دڵدایە بەرامبەر برا موسڵمانەکەی، وە شایەتی خزمەتکار بۆ خاوەن ماڵ و ئەوانەی خاوەن ماڵ نەفەقەیان ئەکێشێ.

ئەحمەد و ئەبوداود گێڕاویانەتەوە. وە لە (التلخيص) ی ئیبنوحەجەردا ووتویەتی: سەنەدەکەی (قوي) بەهێزە[2].

وە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا تقبل شهادة خصم على خصمه)[3].

واتە: شایەتی دوژمن لەسەر دوژمنەکەی دروست نی‌یە.

شافیعی ئەوخەبەرەی بە جێی باوەڕ داناوە. حافظ فەرمویەتی: ئیسنادی صحیح نی‌یە، بەڵام چەند ڕێگای هەیە کە یەکتری بەهێز ئەکەن، شەوکانی گێڕاویەتی‌یەوە.

---

(١) الترمذي (٢٢٩٨) والدارقطني (٤/٢٤٤) والبيهقي (١٠/٢٠٢).

(٢) أحمد (٢/١٨١) وأبوداود (٣٦٠٠) والبيهقي (١٠/٢٠٠).

(٣) نيل الأوطار (٥/٥٧٩).

وە شایەتی مێرد بۆ ژنەکەی وە ژن بۆ مێردەکەی ئەچێتە ناو ئەم بەشەوە، چونکە ژن و مێردایەتی جێی گومانی تۆمەتە، لەبەر ئەوەی بەرژەوەندی لایەنگیری تێدایە.

وە لە هەندێ ریوایەتی حەدیسەکەدا هاتووە: (لا تقبل شهادة المرأة لزوجها، ولا شهادة الزوج لامرأته).

واتە: شایەتی ژن بۆ مێردەکەی و مێرد بۆ ژنەکەی وەرناگیرێت.

وە مالیك و ئەحمەد و ئەبوحەنیفە لەسەر ئەوە رۆیشتون.

وە شافیعی و ئەبوثەور و حەسەن بەدروستیان داناوە.

بەڵام شایەتی خزم و کەس وکار جگە لەوانەی سەرەوە دروستە وەك شایەتی برا بۆ براکەی.

وە ئەوەی هاتووە لە هەندێك لە فەرموودەکاندا بۆ نادروستی شایەتی خزم بۆ خزمەکەی، (ترمذي) فەرموویەتی: لەو ڕووەوە جگە لە حەدیسی زوهری هیچ نازانرێت وە لای ئێمە ئیسنادەکەی صحیح نی‌یە.

وە هەروەها شایەتی هاوەڵ بۆ هاوەڵەکەی دروستە.

وە مالیك فەرمویەتی: شایەتی برای دابڕاو بۆ براکەی دروست نی‌یە، هەروەها شایەتی هاوڕێی زۆر خۆشەویست.

**شایەتی کەسێك حاڵی نەزانرێت :**

لە ڕواڵەتدا شایەتی کەسێك حاڵی نەزانرابێت دروست نی‌یە، کابرایەك لای عومەر ڕەزای خوای لێ بێت شایەتی دا، عومەر پێی فەرموو: من تۆ ناناسم، وە ئەو نەناسینەی من زیانت لێ نادات، بچۆ کەسێك بهێنە بتناسێت.

پیاوێك لەناو کۆمەڵەکەدا ووتی: من ئەیناسم.

عمر ﷺ فەرمووی: بە چ شتێك ئەی ناسیت؟

ووتی: بە ڕاستگۆیی و پیاوچاکی.

عمر ﷺ فەرموی: ئەو پیاوە دراوسێی نزیکتە شەووڕۆژ ئاگات لە هەڵسوکەوتی بێت؟

ووتی: نا، عومەر ﷺ فەرموی: بە دینارو درهەم مامەڵەت لەگەڵدا کردووە کە ئەو دووانە ئەبنە بەڵگەی وەرعی ئادەمیزاد؟ ووتی: نەو.

عومەر ﷺ فەرموی: لە سەفەردا بویتە هاوڕێی کە بەڵگەی ڕەوشت جوانی‌یە؟ ووتی: نە.

عمر ﷺ فەرمووی: دەتۆ نایناسیت.

لەپاشاندا بە کابرای فەرموو: برۆ کەسێك بهێنە بتناسێت.

ئیبنوکەثیر ووتویەتی: بەغەوی بە ئیسنادێکی حەسەن گێراویەتیەوە.

**شایەتی کۆچەری و دەشتەکی:**

ئەحمەد و کۆمەڵێك لە هاوەڵانی وە ئەبوعوبێد لە ڕیوایەتێك دا لە مالیکەوە بۆ ئەوە چوون کە شایەتی کۆچەری لەسەر دێهات نشین دروست نیيە، بەپێی حەدیسەکەی ئەبوهورەیرە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا تجوز شهادة بدوي على صاحب قرية) رواه أبوداود و ابن ماجه و رجال إسناده احتج بهم مسلم في صحيحه[1].

واتە: شایەتی کۆچەری دروست نیيە لەسەر دێهات نشین.

وە کوچەریش ئەوانەن کە لە بیاباندا جێگرن و لە شوێنێکەوە کۆچ ئەکەن بۆ شوێنێکی تر.

وە دێهات نشین ئەوانەن کە لە شارۆچکەو دێهاتەکاندا دائەنیشن.

وە شایەتیەکەی بۆیە قەدەغەیە لەبەر نەزانی و دڵڕەقیان وە کەم بینینیی ئەو شتانەی لە شارەکاندا ڕوو ئەدەن لەبەر ئەوە شایەتیيەکەیان جێگای باوەڕ نیيە.

وە ئەوەی ڕاست بێت شایەتی دروستە ئەگەر ڕاست گۆو خەڵك لێی ڕازی بێت، وە لە کۆمەڵەی پیاوانی ئێمەو هاوئاییسمان بێت، وە عومومیيەکانی قوڕئان بەڵگەن لەسەر وەرگرتنی شایەتی ئادەمیزادی عادڵ و دادپەروەر وە ئەو عومومانە بە یەکسانی سەیری کۆچەری و شاری ئەکات. وە کۆچەریش وەك ئەوە وایە کە لە شارێکی تر بێت.

وە شافیعی و جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون.

بەڵام فەرموودەکەی پێشوو ئەزان ئەگرێتەوە، وە هەموو کۆچەریيەك ناگرێتەوە بە بەڵگەی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ شایەتی کۆچەری وەرگرت لە چەسپاندنی بینینی مانگ دا.

---

(١) أبوداود (٣٦٠٢) وابن ماجه (٢٣٦٧).

**شایەتی نابینا (کوێر):**

شایەتی کوێر و نابینا لای مالیك و ئەحمەد دروستە لەوانەدا کە ڕێگاکەی بیستن بێت ئەگەر دەنگەکەی ناسی یەوە.

کەواتە شایەتی نابینا لە نیکاح و تەڵاق و کڕین و فرۆشتن و بەکرێ دان و نەسەب و وەقف و خاوەنێتی ڕەهاو ئیقرار وئەو جۆرە شتانە دروستە، وە یەکسانە ئەو کەسە ئەوکاتە کوێر بووبێت کە گوێی لێ بووە یان دووای ئەوە کوێر بووبێت.

ئیبنوقاسم ووتویەتی: بە مالیکم ووت: پیاوێك لە پشت دیوارەوە گوێی لە دراوسێکەی بێت -بێ ئەوەی بەچاو بیبینێ- ژنەکەی تەڵاق بدات ئایا بێت شایەتی لەسەر بدات هەر بە ناسینی دەنگەکەی؟

مالیك فەرموی: شایەتی یەکەی دروستە).

وە شافیعی یەکان ووتویانە: شایەتی نابینا وەرناگیرێت لە پێنج شوێن دا نەبێت: نەسەب و مردن و خاوەنێتی و تەرجومە، وە لەسەر شتی چەسپاو و ئەوەی پێش کوێربوون هەڵی گرتبێت.

وە ئەبوحەنیفە فەرمویەتی: شایەتی نابینا لە بناغەوە وەرناگیرێ.

**ژمارەی شایەت :**

شایەتی دان یا لە مافەکانی سامانی ومالّی دا ئەبێت یا لە بەدەنی دا یا لە حەددەکان و تۆڵەکاندا، وە بۆ هەریەکێك لەم شێوانە ژمارەی شایەتی هەیە کە ئەبێت هەبێت هەتا داواکە بچەسپێت؛ وا لە خوارەوە هەموویان ڕوون ئەکەینەوە.

**شایەتی چوارکەس:**

ئەسڵی شایەتی لە حەددی زینادا چوار پیاوە بەپێی فەرموودەی خوای بەرز: ﴿واللاَّتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِنْ نِسَائِكُمْ فَاسْتَشْهِدُوا عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِنْكُمْ﴾ (النساء:١٥).

واتە: ئەو ئافرەتانەی داوێن پیسی ئەکەن لە ئافرەکانتان با چوار پیاو لەئێوە شایەتی یان لەسەر بدات

وە هەروەها ئەفەرموێت: ﴿والَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ﴾ (النور:٤).

واتە: وە ئەوانەی تاوانی داوێن پیسی ئەدەنە پاڵ ئافرەتانی داوێن پاك، لە پاشاندا چوار شایەت ناهێنن.

و هەروەها فەرموویەتی: ﴿لَوْلاَ جَاءُوا عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ﴾ (النور:١٣).

واتە: بۆ چوار شایەتیان نەدەهێنا لەسەری.

**شایەتی سێ کەس:**

حەنبەلی‌یەکان ووتویانە: ئەو کەسەی بە دەوڵەمەند ناسرابێت ئەگەر ئیددیعا بکات کە هەژار کەوتووە بۆ ئەوەی زەکاتی بدرێتێ لێی وەرناگیرێ هەتا سێ پیاو شایەتی لەسەر داواکەی نەدات.

وە بەڵگەش بۆ ئەم قسەیەی حەدیسەکەی قوبەیصەی کوڕی موخاریقە:

لە قوبەیصەی کوڕی موخاریقی هیلالی‌یەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە کە فەرمویەتی: قەرزداری باری شانی گران کردم و هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ داوام لێ کرد یارمەتیم بدات ئەویش ﷺ فەرمووی: لێرە بمێنەرەوە هەتا زەکاتمان بۆ دێت فەرمان ئەدەم بەشت بدەن. لەپاشاندا فەرمووی: ئەی قوبەیصە سواڵ کردن بۆ یەکێ لەم سێ کەسە نەبێت دروست نی‌یە، کەسێك قەرزدارێکی زۆر بێت بۆی هەیە داوا بکات هەتا قەرزەکەی لە کۆڵ ئەکەوێت و ئەبێ لەپاش ئەوە وازبهێنێ، وە پیاوێ توشی کارەساتێك بێت وە ماڵەکەی ڕاماڵێت ڕەوایە بۆی داوا بکات هەتا باری ژیانی ڕاست ئەبێتەوە، وە پیاوێك تووشی هەژاری بێت هەتا سێ کەسی عادڵ لە قەومەکەی بڵێن: فڵانە کەس توشی دەست کورتی بووە سواڵ کردن ڕەوایە بۆی هەتا باری ژیانی پێ ڕاست ئەکاتەوە، جگە لەمانە هەرکەس داوا بکات ئەی قوبەیصە ماڵێکی حەرامە، داواکەرەکە بە حەرامی ئەیخوات، موسلیم و ئەبوداود و نەسائی گێڕاویانەتەوە[1].

**شایەتی دوو پیاو بەبێ ئافرەت:**

شایەتی دوو پیاو وەرئەگیرێ بێ شایەتی ئافرەت لەگەڵیان لە هەموو مافەکاندا وە لە حەددەکاندا جگە لە زینا کە مەرجە چوار پیاو شایەتی تێدا بدات.

وە شایەتی ئافرەت لە حەددە شەرعی‌یەکاندا دروست نی‌یە لای بەشی زۆری زانایانی ئایینی، پێچەوانەی زاهیری‌یەکان. خوای گەورە دەربارەی تەڵاق و (رجعه) گێڕانەوە ئەفەرموێت: ﴿وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ﴾ (الطلاق:٢).

واتە: دوو کەس لەوانەی دادپەروەرن لە خۆتان بکەن بە شایەت.

---

(١) أحمد (٥/٦٠) ومسلم (١٠٤٤) وأبوداود (١٦٤٠) والنسائي (٥/٨٩).

وە بوخاری و موسلیم ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ بە أشعث ی کوڕی قەیسی فەرموو: (شاهداك أو يمينه)[1].

واتە: دوو پیاوی شایەت ئامادە ئەکەیت یا ئەو سوێند بدەین.

شایەتی دوو پیاو یا پیاوێك ودوو ژن:

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿واسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ مِنْ رِجَالِكُمْ فَإِنْ لَمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وامْرَأَتَانِ مِمَّنْ تَرْضَوْنَ مِنْ الشُّهَدَاءِ أَنْ تَضِلَّ إِحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الأخْرَى﴾ (البقرة:٢٨٢).

واتە: شایەتی دوو پیاوی موسوڵمانی پێگەیشتووی ژیر بکەن لە ئەهلی عەدالەت، جا ئەگەر دوو پیاو نەبوو پیاوێك و دوو ژن لەوانەی ڕازین لێیان بۆ شایەتی، بۆ ئەوەی ئەگەر یەکێ لە ژنەکان شتێکی لە بیر چوبێتەوە ئەوەی تریان بیری خاتەوە.

ئەمەش لە کێشەکانی سامان و ماڵدایە وەك کڕین و فرۆشتن و قەرز و بەکرێ دان و ڕەهن وئیقرار و داگیرکردندا، وە حەنەفییەکان ووتویانە:

شایەتی ئافرەت لەگەڵ پیاو دروستە لە سامانەکان و نیکاح و ڕەجعە و تەڵاق و هەموو شتێك جگە لە حەددەکان و تۆڵەکان.

وە ئیبنوقەییم ئەم ڕایەی پێش خستووە و فەرمویەتی:

ئەگەر یاسادانەری ئیسلام شایەتی دانی ژنانی بە دروست دانابێت لە بڕوانامەکانی قەرزدا کە پیاو نوسیبێتی لەگەڵ ئەوەدا کە ئەم جۆرە شتانە بە زۆری لای کۆڕی پیاوان ئەنوسرێت، کەواتە ئەبێ لەو شتانەدا کە ئافرەت بە زۆری ئامادەیان ئەبێت وەك وەسێت و ڕەجعە لە پێشتر بێ بۆ دروستی شایەتی ژنان تیایدا.

وە لای شافیعی و مالیك و زۆر لە زانایان، شایەتی ژنان دروستە لە سامان و ماڵ و پاشکۆکانی بە تایبەتی، وە لە حوکمەکانی بەدەنیدا وەرناگیرێت، وەك حەددە شەرعییەکان و تۆڵەکان و نیکاح و تەڵاق و ڕەجعە.

وە جیاوازیان هەیە لە وەرگرتنی شایەتی ئافرەت لە مافە لاشەییەکاندا کە تەنها پەیوەندییان بە ماڵەوە هەیە، وەك وەکالەت و وەسیەت کە هەر پەیوەندییان بە ماڵەوە هەیە ووتراوە: شایەتیکی پیاوو دوو ژن وەرئەگیرێ لەماندا وە ووتراوە: دوو پیاو نەبێت وەرناگیرێت.

(١) البخاري (٢٦٦٦) ومسلم (١٣٨/٢٢١).

وە (قرطبي) هۆی وەرگرتنی شایەتی ژنانی لە ماڵدا جگە لە شتەکانی تر ڕوون کردۆتەوەو فەرمویەتی:

چونکە ماڵ و سامان خوا زۆری هۆی قایم کردن بۆ داناوە لەبەر زۆری ئەو لایەنانەی لێوەی بەدەست ئەهێنرێت و زۆری بەلاَ لە ماڵداو چەند جار بوونەوەی.

جا خوا قایم کردنەکەی جارێك بە نوسین وە جارێك بە شایەتی و جارێك بە ڕەهن و جارێك بە زەمانەت پێك هێناوە، وە ژنانیشی خستۆتە ناو هەموو ئەمانەوە لەگەڵ پیاواندا.

**شایەتی تەنها پیاوێك:**

شایەتی تەنها پیاوێکی ڕاست گۆ وەرئەگیرێت لە خوا پەرستیەکاندا وەك بانگ و نوێژو ڕۆژوو.

ئیبنوعومەر ڕەزای خوایان لێ بێت فەرمویەتی: بە پێغەمبەرم ﷺ ڕاگەیاند من مانگم بینیوە، خۆی بەڕۆژوو بوو فەرمانی دا بە خەلکیش بەڕۆژوو بن[1]. واتە: ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان.

وە حەنەفیەکان شایەتی تەنها پیاوێکیان بە دروست داناوە لە هەندێ حاڵەتی تایبەتیدا، وەك شایەتی دانی لەسەر منداڵ بوون وشایەتی دانی مامۆستا بە تەنها لە کێشەکانی منداڵان دا، وەشایەتی پسپۆڕ لە هەڵسەنگاندنی شتە لەناو چووەکان.

وە شایەتی تەنها پیاوێك بۆ تەزکیەی شایەت وبریندارکردنیان وەرئەگیرێت، وەلە ڕاگەیاندنی لابردنی وەکیل وئاشکراکردنی عەیبی فرۆشراوەکان وەرئەگیرێت، وە زانایان جیاوازیان هەیە لە ژیان نامە نوسێکی تەنهای ڕاست گۆدا.

مالیك وە ئەبوحەنیفە وئەبویوسف بۆئەوە چوون: ژیان نامەکەی وەرئەگیرێت وپێشەواکانی تر و موحەممەدی کوڕی حەسەن ووتویانە: ژیان نامەش وەك شایەتیە یەك ژیان نامە نوسی تێدا وەرناگیرێت.

وەلە زانایاندا هەیە کە شایەتی پیاوێکی ڕاستگۆ وەرئەگرن.

وەك ئیبنوقەییم کە فەرمویەتی: ئەوەی ڕاست بێت هەرچی شتێك حەقی ڕوون کردەوە ئەوە شایەتە، وە خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی بە هیچ شێوەیەك حەقێك پەك ناخەن کە ڕوون کرابێتەوە بە ڕێگایەك لە ڕێگاکان، بەڵکو حوکمی خوا وحوکمی پێغەمبەرەکەی ﷺ کە هیچ حوکمێك نیە

---

(١) أبوداود (٢٣٤٢) والدارمي (٢/٤٢) وابن حبان (٣٤٤٧) والبيهقي (٤/٢١٢) والدارقطني (٢/١٥٦).

لەدوای حوکمی ئەو دوانە ئەوەیە کە هەر کاتێك حەق دەرکەوت و ڕوون کرایەوە بە هەر ڕێگایەك بێت پێویستە جێ بەجێ بکرێت و یارمەتی بدرێت، وە حەرامە یەك خستنی وپوچەڵ کردنەوەی.

وە فەرمویەتی: دروستە بۆ حاکم بە شایەتی پیاوێك حوکم بدات ئەگەر ڕاستگۆیی ئەو کەسەی بۆ دەرکەوت لە حەددە شەرعی یەکاندا نەبێت، وەخوای گەورە پێویستی نەکردووە لەسەر حاکمەکان کە حوکم نەدەن بە شایەتی دوو پیاو نەبێت، بەڵکو فەرمانی داوە بە خاوەن حەق حەقەکەی خۆی بپارێزێت بە دوو شاهید یا بە شایەتێکی پیاو و شایەتی دوو ژن، وە ئەوەش نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە حاکم حوکم نەدات بەلەوە کەمتر، بەڵکو پێغەمبەر ﷺ بە شایەتێك و بە سوێند وە بە تەنها شایەتێکیش حوکمی داوە، کەواتە ئەو ڕێگایانەی کە حاکم حوکمیان تیا ئەدا فراوانترە لەو ڕێگایانەی کە خوای گەورە خاوەن مافەکانی ڕێنمایی کردووە بۆ ئەوەی مافەکەیانی پێ بپارێزن:

پێغەمبەر ﷺ شایەتی عەرەبێکی دەشتەکی بە دروست دانا لەبینینی مانگی یەك شەوەدا.

وە شایەتی یەك شایەتی بە دروست داناوە لە سەلەبی جەنگی دا، وەشایەتی تەنها ژنێکی وەرگرتووە ئەگەر جێی بڕوابوبێت لەو کارانەدا کە تافرەت نەبێت کەس بە سەریانا ئاگادار نی یە.

وە شایەتی خوزەیمەی وەك شایەتی دوو پیاو داناوە و فەرموویەتی: (مَن شهد لهُ خزيمةُ فَحسبه)[1].

واتە: هەرکەس خوزەیمە شایەتی بۆ بدات ئەوە بەسیەتی.

وە ئەمەش تایبەت نی یە بە خوزەیمەوە بێجگە لەوکەسانەی کە لەو چاکتر بوون یا وەك ئەو بوون لە صەحابە چونکە ئەگەر ئەبوبەکر و عومەر وعوسمان و عەلی و ئوبەی کوڕی کەعب شایەتی بدەن ئەوە حوکم دان بە شایەتی بەتەنیایی ئەمان لە پێشترە.

ئەبوداود فەرمویەتی: ئەمە بابێکە دەربارەی ئەوەی ئەگەر حاکم بە ڕاستگۆیی شایەتی تەنهای زانی بۆی دروستە حوکمی پێ بکات.

**شایەتی لەسەر شیر پێدان:**

ئیبنوعەبباس وەئەحمەد بۆ ئەوە چوون کە شایەتی ژنە شیر دەرەکە بە تەنها وەرئەگیرێت، بەپێی ئەوەی بوخاری تەخریجی کردووە کە عوقبەی کوڕی حاریس ئوممو یەحیای کچی ئەبی ئیهابی مارەکرد پاشان ژنێك هات وتی: من شیرم داوە بە هەردووکتان. پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمووی: چۆن؟ ئەوە وتراوە؟ ئیتر عوقبە لێی جیا بۆوەو شوی کردەوە بە کەسێکی تر[2].

---

(١) أحمد (٥/٢١٦)، أبوداود (٣٦٠٧)، نسائي (٧/٣٠١)، حاكم (٥/٢١٥).

(٢) أحمد (٤/٣٨٤) والبخاري (٥١٠٤) وأبوداود (٣٦٠٣) والترمذي (١١٥١) والنسائي (٣٣٣٢).

وە حەنەفی‌یەکان وتویانە: شیرخواردنیش وەك کێشەکانی ترە ئەبێ شایەتی دوو پیاو یا شایەتی پیاوێك و دوو ژنی لەسەر بێت، وە تەنها شایەتی ژنە شیردەرەکە بەس نی‌یە، چونکە ئەو کارەکەی خۆی جێگیر ئەکات.

مالیك فەرمویەتی: ئەبێ دوو ژن شایەتی لەسەر بدات، وە شافیعی فەرمویەتی: شایەتی ژنە شیردەرەکە و لەگەڵ سێ ژنی تر وەرئەگیرێت بە مەرجێك رووبەروو نەبێتەوە بە داواکردنی کرێ.

وە دەربارەی حەدیسەکەی عوقبە وەڵامیان داوەتەوە کەئەو حەدیسە لەسەر پەسندی و خۆپاراستن لە گومان وشوبهە دائەنرێت.

**شایەتی دان لەسەر دەنگ هاتن و قیژە لە منداڵی تازەبوو:**

ئیبنوعەبباس شایەتی مامانی بە تەنها بە دروست داناوە لەدەنگ هاتن لە منداڵی تازەبوووەوە، وە لە شیعبی و نەخعی ئەگێڕنەوە، وە لە عەلی و شورەیحیشەوە ئەگێڕنەوە کە حوکمیان بەوە کردووە.

وە مالیك بۆ ئەوەچووە کە ئەبێت دوو ژن لەوەدا ببێتە شایەت وەك شیر پێدان.

وە شافیعیش لە وەرگرتنی شایەتی ئافرەت لە دەنگ هاتن لە منداڵی تازەوە بۆ ئەوە رۆیشتووە بەڵام مەرجی ئەوەی داناوە کە ئەبێت چوار ئافرەت شایەتی لەسەر بدات.

وە ئەبوحەنیفە فەرمویەتی: دەنگ هاتن لە منداڵی تازەبووەوە ئەچەسپێت بە شایەتی دوو پیاو یا پیاوێك و دوو ژن چونکە ئەمە میراتی پێ سابت ئەبێت. بەڵام دەربارەی ئەوەی کە نوێژی لەسەر بکرێت و بشۆرێت شایەتی‌یەك ئافرەت وەرئەگیرێت.

وەلای حەنبەلی‌یەکان: ئەو شتانەی بە زۆری پیاو ئاگای لێیان نی‌یە شایەتی ژنێکی راستگۆی تێدا وەرئەگیرێت. وەك لە حوزەیفەوە گێڕراوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ شایەتی مامانی بە تەنها بە دروست داناوە. زانایانی ئایینی لە کتێبەکانیاندا باسیان کردووە.

وە ئەو شتانەی کە پیاو بە زۆری بێ‌ئاگایە لێیان وەك عەیبی ژنان لەژێر جلوبەرگەوە، یا کچێتی و ژنێتی وبێ‌نوێژی ومنداڵ بوون ودەنگ هاتن لە منداڵی تازەبووەوە وشیرخواردن و ئەو عەیبانەی لە شوێنی شەرمگەی ئافرەت دان کە پیاو کەمتر ئامادەیان ئەبێ زانایان وتویانە: پیاویش وەك ئافرەتە لە ماندا بگرە لەپێشتریشە لەبەر تەواوێتی پیاو.

## سوێند (اليمين)

### سوێند کاتی پەك کەوتن بۆ شایەت:

ئەگەر داواکار پەکی کەوت و نەیتوانی شایەت بهێنێت لەسەر ئەو مافەی لەسەر کەسێکی تر هەیەتی، وە داوا لەسەر کراو دانی نەنا بەوەدا کە ئەو مافەی لەسەرە لە سوێند دانی داوا لەسەر کراو بەولاوە هیچی تری بۆ نابێ، ئەمەش تایبەتە بە ماڵ وشتی بازرگانی‌یەوە، وەدروست نی‌یە لە سزاکان وحەددە شەرعی‌یەکاندا.

بەپێی ئەو فەرموودەیەی کە بەیهەقی و گەبەرانی بە ئیسنادێکی صەحیح گێڕاویانەتەوە: (البينة على المدعي واليمين على من أنكر)[1].

واتە: شایەت ئامادەکردن لەسەر داواکارە و سوێند خواردن لەسەر ئەوکەسەیە کە ئینکاری ئەکات.

وە بەپێی ئەوەی بوخاری وموسلیم لە (أشعث)ی کوڕی قەیسەوە گێڕاویانەتەوە کە فەرمویەتی: من و پیاوێك ناکۆکی کەوتە نێوانمان لەسەر بیرێك پاشان کێشەکەمان گەیاندە لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمووی: (شاهداك أو يمينه).

واتە: دوو شایەت بێنە یا ئەو سوێند ئەدەین. ئەڵێ منیش ووتم: ئەو کابرایە سوێند ئەخوات و گوێ ناداتێ. فەرمووی: (من حلف على يمين يقتطع بها مال امرئ مسلم لقي الله وهو عليه غضبان).

واتە: هەرکەس سوێندێك بخوات بۆ ئەوەی ماڵی کەسێکی تر بپچڕێت کاتێ ئەگات بە خوا، خوا لێی توڕەیە.

وە موسلیم لە حەدیسی وائیلی کوڕی حوجرەوە تەخریجی کردووە کە پێغەمبەر ﷺ بە کیندی فەرمو: ئایا شایەتت هەیە؟ ووتی: نە. فەرمووی: دە بۆت هەیە سوێندی بدەیت. ووتی: ئەی نێرراوی خوا، ئەو پیاوێکی تاوان کارە گوێی ناداتێ سوێند ئەخوات و لە هیچ خۆی ناپارێزێت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەوە زیاتر هیچی ترت بۆ نی‌یە.

وە سوێند خواردنیش یا بە خوا یا بە ناوێك لەناوەکانی خوا نەبێت نابێت. وەلە فەرموودەدا هاتووە: (من كان حالفاً فليحلف بالله أو لِيَصمُت)[2].

واتە: هەرکەس سوێند بخوات با بە خوا سوێند بخوات یا بێ دەنگ بێت.

---

(١) الدارقطني (٤/٣١٨) والبيهقي (٨/١٢٣) وابن عبدالبر في التمهيد (٢٣/٢٠٤).

(٢) مسلم (١٣٩/٢٢٣) والترمذي (١٣٤٠).

وە لە ئیبنوعەبباسەوە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ کاتێ پیاوێکی سوێند ئەدا پێی فەرموو: (إحلف بالله الذي لا إله إلا هو ما له عندك شيء). رواه أبوداود والنسائي[1].

واتە: سوێند بخۆ بەو خوایەی کە هیچ پەرستراوێکی بە حەق نی‌یە کە شایستەی پەرستن بێت جگە لەو هیچی ئەو کابرایەم لا نی‌یە.

ئایا شایەت وەرئەگیرێت دوای سوێند دان:

هەرکاتێ داوا لەسەرکراو سوێندی خوارد داوای داواکار ڕەت ئەکرێتەوە بەبێ جیاوازی.

جا ئەگەر داواکار دوای سوێند دانی داوا لەسەر کراو وازی نەهێنا و دووبارە داواکەی دەست پێ کردەوە و شایەتی هێنا ئایا ئەو شایەتی‌یەی لێ وەرئەگیرێت؟ زانایان لەم کێشەیەدا لەسەر سێ قسەن:

١- لەزانایان هەیە ووتویەتی: لی‌ی وەرناگیرێ.

٢- لە زانایان هەیە ووتویەتی: لی‌ی وەرئەگیرێ.

٣- لەزانایان هەیە کە: جیاکردنەوەی تێدا کردووە ودەڵێ: ئەبێ شی وەکرێ.

ئەوانەی ڕایان وایە کە وەرناگیرێت ظاهیری‌یەکانن و ئیبنوئەبی لەیلا و ئەبوعوبەیدە، وە شەوکانی ئەو ڕایەی پێش خستوەو فەرمویەتی: بۆیە شاهید وەرناگیرێت دوای سوێندانی داوا لەسەرکراو، چونکە فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ ئەوە ئەگەیێنێت کە فەرموویەتی: (شاهداك أو يمينه).

جا ئەگەر سوێند خواردن لە داوا لەسەرکراو داوا بکرێت ئەوە ئەو سوێندە پاڵپشتی حوکمێکی صەحیح و ڕاستە، ئیتر پاڵ پشتێکی پێچەوانەی وەرناگیرێت دوای کردنی، لەبەرئەوەی بۆ هەر یەکەیان هیچ بە ئەنجام نایەت جگە لە گومانی ڕووت وە گومان بە گومان لاناب‌رێت.

وە ئەوانەی ڕایان وایە لی‌ی وەرئەگیرێت: حەنەفی‌یەکان و شافیعی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکان و گاوس و ئیبراهیمی نەخەعی و شورەیحە کە ووتویانە: شایەتی حەق و عادڵ لەپێش ترە لە سوێندخواردنی درۆ، وە ئەمەش ڕای عومەری کوڕی (خگاب)ە ﷺ.

وە بەڵگەشیان ئەوەیە کە سوێند دان بەڵگەیەکی لاوازە ناکۆکی بنەبڕ ناکات، لەبەر ئەوە لە دوای سوێندەکە شایەتی داواکار وەرئەگیرێت، شونکە شایەت ئەسڵە و سوێنددان دوای ئەو دێ، جا هەرکاتێك ئەسڵ هات دوای ئەو کۆتایی پێ دێت.

---

(١) أبوداود (٣٦٢٠) والنسائي في الكبرى (٦٠٠٧).

ئەما مالیك و غەزالی لە شافیعی‌یەکان ووتویانە: دروستە داواکار شایەت بهێنێتەوە پێش، لەسەر ڕاستی ئەو داوایەی کە هەیەتی دوای سوێند خواردنی داوا لیٚکراو ئەگەر پێش سوێند خواردنەکە نەیزانیبێ کە شاهیدی هەیە.

بەڵام ئەگەر ئەو مەرجەی نەبوو، وەك ئەوەی بزانێت شایەتی هەیە لەسەر داواکەی بەڵام سوێنددان بە چاکتر بزانێت و سوێنددان هەڵبژێرێت. لەپاشاندا شایەت پێشکەش بکات دوای سوێنددانی، ئەو کسە ئەو شایەتی‌یەی لێ وەرناگیرێت، چونکە حوکمی شایەتییەکەی بە سوێنددان نامێنێ.

**پەشیمان بوونەوە و سوێند نەخواردنی داوالیٚ کراو:**

ئەگەر داوای سوێند خواردن کرا لە داوالەسەرکراو لەبەرئەوەی داواکار شایەتی نەبوو ئەویش پەشیمان بوەوە و سوێندی نەخوارد، ئەوە وەك ئەوە وایە پیٚ لە داواکەی داواکار بنێت، چونکە ئەگەر ڕاست گۆ بوایە لە ئینکاری‌یەکەیدا خۆی نەئەپاراست لە سوێند خواردن.

وە پەشیمان بوونەوە یا بە ڕاستو ڕێکی ئەوترێت یا بە گەیاندن بەهۆی بیٚ دەنگی‌یەوە.

لەم حاڵەتەدا داوا لە داواکار ناکرێت سوێند بخوات و سوێند نادرێت لەسەر ڕاستی داواکەی، چونکە سوێنددان هەمیشە بۆشتێکە کە نەفی بکرێت، وە بەڵگەش فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ کە فەرمویەتی: (البينة على المدعي واليمين على من أنكر).

واتە: شایەت ئامادەکردن لەسەر داواکارە و سوێندیش لەسەر داوا لەسەرکراوە کە ئینکاری بکات.

ئەمەش مەزهەبی حەنەفی‌یەکان و یەکیٚ لە دوو ڕیوایەتەکەی ئەحمەدە کە گێڕاویەتی‌یەوە.

وە لای مالیك و شافیعی و ڕیوایەتەکەی دووەمی ئەحمەد: ئەوەیە کە نکول کردن و پەشیمان بوونەوە لە سوێنددا بە تەنها بەس نی‌یە بۆ حوکم دانی داوالەسەرکراو، لەبەر ئەوەی نکول بەڵگەیەکی لاوازە پێویستە بە سوێنددانی داواکار بە هێز بکرێت بەوەی داواکار سوێند بدرێت کە داواکەی ڕاستە با داوا لەسەرکراویش داوای ئەوە نەکات، جا ئەگەر سوێندی خوارد حوکمی بۆ ئەدرێت، ئەگینا داواکەی ڕەت ئەکرێتەوە، بەڵگەی ئەمەش ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ سوێند خواردنی گێڕاوەتەوە بۆ سەر داواکار، بەڵام لە ئیسنادی ئەم حەدیسەدا (مەسروق) هەیە کە نەناسراوە. وە هەروەها ئیسحاقی کوڕی فورات هەیە لە ئیسنادەکەیدا کە قسەی لەسەرە.

وە مالیك ئەو حوکمەی تایبەت کردووە بەو داوایانەوە کە پەیوەندی‌یان بە ماڵەوە هەیە.

وە شافیعی فەرمویەتی: ئەم حوکمە گشتی‌یە بۆ هەموو داواکانە.

وە ئەهلی زاهیر و ئیبنوئەبی لەیلا بۆ ئەوە چوون کە (نکول) پەشیمان بوونەوە هیچی بۆ دانانرێت و هیچ حوکمی پێ نادرێت لە هیچدا.

وە سوێند ناگێڕرێتەوە بۆ داواکار، وە داوالەسەرکراو یا پێ لەو مافە ئەنێت کە لەسەریەتی یا ئینکاری ئەکات، و سوێند ئەخوات کە هیچی لەسەر نی‌یە.

وە شەوکانی ئەوەی پێش خستوەو فەرمویەتی: نکول نابێت حوکمی پێ بدرێت چونکە ئەوپەڕی ئەوەی لە نکول دایە ئەوەیە ئەو کەسەی سوێند خواردنی لەسەرەو بەپێی شەرع قبوڵی ناکات و نکول ئەکات.

وە نەکردنی ئەو کارە ئیقرارو دان پیانان نی‌یە بەو مافە، بەڵکو واز هێنانە لەوەی کە یاسادانەر لەسەری داناوە بە فەرمودەی خۆی.

بەڵام سوێند لەسەر داوا لەسەرکراوە، جا لەسەر قازی پێویستە دوای نکول کردنی، یەکێ لەم دوانەی بەسەردا بسەپێنێت، یا سوێند لەسەر ئەو شتە بخوات کە نکوڵی کردوە تێیدا، یا دان بنێ بەو مافەدا کە داواکار داوای ئەکات.

وە هەرکامیان کرا، ئەوە چاکە حوکمی پێ بکرێت.

سوێند لەسەر نیازی سوێندەدەرە:

ئەگەر یەکێ لە ناکۆکەکان سوێند بخوات سوێندەکەی لەسەر نیازی قازی و لەسەر نیازی ئەو کەسەیە کە داوای سوێند خواردنەکە ئەکات کە سوێندی بۆ بخورێت لەسەر مافەکەی، نەك لەسەر نیازی سوێند خۆرەکە بێت.

بەپێی ئەوە فەرمودەیەی لە بەشی سوێنددا باس کرا کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (الیمین علی نیة المستحلف)[1].

واتە: سوێند خواردن لەسەر نیازی سوێندەدەر دەبێت.

جا ئەگەر سوێندخۆر سوێندەکەی بە شاراوەیی ووت بەوەی لە دڵیا ماناکەی بشارێتەوە وە سوێندەکەی بە شێوەیەك بخوات کە لەگەڵ ڕواڵەتی زاراوەی سوێندەکە جیاواز بێت، ئەو کارە دروست نی‌یە[1].

---

(١) مسلم (١٦٥٣/٢) وابن ماجه (٢١٢٠).

وە وترراوە: دروستە قسەکەی بە جۆرێك بکا کە دوو مانا هەڵگرێ و نیازی دڵی ئەو واتایانە نەبێ کە ئەوان مەبەستیانە ئەگەر ناچار بێت بۆی وەك ئەوەی ستەمی لێ کرابێت.

**حوکم دان بە شایەتێك لەگەڵ سوێند خواردن:**

ئەگەر داواکار لە شایەتێك زیاتری نەبوو بۆ داواکەی، ئەوە حوکم لە داواکەیدا ئەکرێت بە شایەتی دانی ئەو شایەتە و سوێند دانی داواکەر خۆی، بەپێی ئەوەی (دارقطني) گێڕاویەتی‌یەوە لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکی‌یەوە لە باپیری‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ حوکمی ئەکرد بە دوو شایەت، ئەگەر داواکار دوو شایەتی ئامادە بکردایە مافەکەی بۆ ئەسەند[2].

بەڵام ئەگەر یەك شایەت بهێنێ ئەوە لەگەڵ شایەتی دانی ئەو شایەتەدا سوێند ئەدرێ.

وە حوکم بە شایەتێك لەگەڵ سوێند خواردندا ئەکرێت لە هەموو کێشەکاندا جگە لە حەددە شەرعی‌یەکان و تۆڵەکان (قصاص).

وە هەندێ لە زانایان تەنها شایەتێك و سوێندی‌یان لە کێشەکانیماڵیدا و هەرچی پەیوەندی بەوەوە هەبێت داناوە، وە فەرموودەکانی حوکم کردن بە شایەتێك و سوێند لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیست و ئەوەندە کەس گێڕاویانەتەوە.

وە شافیعی فەرمویەتی: حوکم کردن بە شایەتێك و سوێندخواردنی داواکار موخالیفی ڕواڵەتی قورئان نی‌یە، لەبەر ئەوە ئەگەرچی شایەتێك و سوێند خواردن کەمترە لەوەی کە قورئان باسی کردووە بەڵام نابێتە بەربەست بۆ ئەوەی کە بڵێین دروستە.

وە ئەبوبەکر و عەلی و عومەری کوڕی عبدالعزیز و جەماوەری زانایانی سەلەف و خەلەف لەوانە مالیك و هاوەڵەکانی و شافیعی و شوێن کەوتوانی و ئەحمەد و ئیسحاق و ئەبوعوبەید و ئەبوثەور و داود بەوە حوکمیان داوە، وە ئەو ڕایە دروست نی‌یە پێچەوانەی بکرێت.

بەڵام حەنەفی‌یەکان و ئەوزاعی و زەیدی کوڕی عەلی و زوهری و نەخەعی و ئیبنوشیبرمە قەدەغەیان کردووەو فەرمویانە: حوکم بە شایەتێك و سوێند هەرگیز ناکرێت.

بەڵام ئەو فەرموودانەی لەو بارەیەوە هاتووە بەڵگەیە لەسەریان.

---

(1) وەك ئەوەی شوانێك دەست بدات بەڕانیدا بڵێت: ئەو ڕانەی من دەغڵی فڵانە کەسی نەخواردووە لێرەدا مەبەستی ڕانی خۆی بێت نەك ناژەڵەکانی.

(2) الدارقطني (٤/٢١٤).

**قەرینەی (قطعي) بڕاوە :**

قەرینە ئەو نیشانانەیە کە ئەگاتە سنوری باوەڕ پێ کردن و یەقین، بۆ نموونە:

ئەگەر کەسێك لە ماڵێکی چۆڵ بێتە دەر بە ترس و سەرسامی یەوە و چەقۆیەکی خوێناوی بە دەستەوە بێ، کەسێکیش بچێتە ناو ماڵەکەوە کەسێکی سەربڕاوی تێدا ببینێت ئەو کاتە تازە سەربڕرابێت، ئەوە گومان ناکرێ لەوەی کە ئەوکەسەی بە چەقۆکەوە هاتە دەرەوە کوشتویەتی، ئیتر ئاوڕ بۆ ئیحتیمالی خەیاڵی تر نادرێتەوە.

وەك ئەوەی کوژراوەکە خۆی کوشتبێت.

وە ئەو قەرینەیە کاری پێ ئەکرێت کاتێ قازی قەناعەتی کرد ئەوە بەڕاستی و یەقینی بووە.

ئیبنوقەییم فەرمویەتی: وە ئاشکرابونی حەق لەسەر شتێکی دیاری کراو ناوەستێت کە هیچ فائیدەیەك نەبێ لە تایبەت کردنی ئەو شتە، لە حاڵەتێکدا کە شتی تریش هەبێ. یەکسان بێ لەگەڵ ئەو شتەی یەکەمدا بۆ ئاشکرا بوونی حەق یان لە پێشتریش بێت بە شێوەیەك کە ئینکاری لێ نەکرێ، وەك پێش خستن و پارسەنگ دانی شاهیدی حاڵ بەسەر دەستێکی تەنهاوە، کە نمونەکەشی ئەمەیە: کابرایەك ڕانەکات و مێزەرێك بەسەری یەوەیە و مێزەرێکیش بەدەستی یەوە، وە لە دوایەوە پیاوێك ڕانەکات و سەری ڕوتە، لەحاڵێکدا کە عادەتی نی یە سەری ڕوت بێ، جا (بینة) بەڵگەی حاڵ و دەلالەت کردنەکەی لێرەدا ئاشکراکردنی ڕاستی داواکار ئەگەیەنێت چەند جارەی ئەوەی کە دەستێکی ڕووت ئەیگەیەنێت لای هەموو یەکێك، جا یاسادانەر وێنەی ئەو بەڵگەو دەلالەت کردنە پشت گوێ ناخات و مافێك بفەوتێنێ کە هەموو کەسێك ئاشکرابونەکەی و بەڵگەکەی ئەزانێ.

وە حەنەفی یەکانیش نمونەیان هێناوەتەوەو ئەڵێن:

ئەگەر دوو کەس لە کەشتی یەکدا کێشەیان بوو وە کەشتی یەکە ئاردی تێدا بوو، وە یەکێکیان بازرگان بوو ئەوی تریان کەشتی وان، وە هیچیان شایەتیان نەبوو، ئەوە ئاردەکە ماڵی یەکەمەو کەشتی ماڵی دووەم.

وە هەروەها سابت کردنی نەسەب و ڕەگەزی منداڵ لەلایەن مێردەوە لەسەر ئەو شێوەیە ئەژمێررێت بەپێی ئەو فەرموودەیەی کە ئەفەرمووێت: (الولد للفراش)[1]. واتە: منداڵ هی جێگەو نوێنە.

---

(١) البخاري (٦٧٥٠و٦٨١٨) ومسلم (١٤٥٨/٣٨).

**ناكۆكی نێوان پیاو و ژن لەسەر كەلوپەلی ناو ماڵ**

وە لای حەنبەلی‌یەكان ئەگەر دوو كەس لەسەر شتێك ناكۆكی‌یان كردو بە ڕواڵەت بۆ یەكێكیان نەبوو كاری پێ ئەكرێت، جا ئەگەر ژن و مێرد ناكۆكی‌یان بوو لەسەر كوتاڵی ماڵەكە ئەوە هەرچی بۆ پیاو شیا ئەدرێ بە پیاوەكە و هەرچی بۆ ژن ئەشیا ئەدرێ بە ژنەكە، وە هەرچی بۆ هەر دووكیان شیا بەش ئەكرێت لە نێوانیاندا بە نیوەیی.

وە ئەگەر بە دەستیانەوە بوو سوێندیان لەسەر ئەخوارد و داوای بەشكردنیان ئەكرد بە نیوەیی ئەوە ئەگەر دەستی یەكێكیان بە هێزتر بوو وەك ئەوەی وڵاغێك كەسێك لیَ‌ی بخوڕێت كەسێكیش سواری بوبێت ئەوە ماڵی ئەو كەسەیە سواری بووە لەبەر بەهێزی دەستی.

**نوسراو و بەڵگەنامەی باوەڕ پێ كراو:**

لەبەر ئەوەی خەڵك ڕاهاتوون بە (صك) چەك كار بكەن و پشتیان پێوە بەستووە.

هەندێ لە زانایانی دوایی فەتوایان داوە بەوەرگرتنی نوسراوو كار پێ كردنی.

وە گۆڤاری (الأحكام العدلية) بەوە كاری كردووە، وە چەسپاندی قەرزو شتە بازرگانی‌یەكان و شتی تری بە چەك وەرگرتووە.

بە مەرجێك ئەو چەكە دوور بێ لە گومانی تەزویر و دروست كردن، وە ئیقرار كردن بە نوسین وەك دان پێدانان بە زمان ئیعتیباری بۆ كراوە.

وە هەروەها بە نوسراوە ڕەسمی‌یەكان كار ئەكرێت ئەگەر خاڵی بن لە تەزویر و فساد.

واتە: لە پیسی دووربكەونەوە كە بتەكانن ولە شایەتی دانی درۆ دووربكەونەوە.

**پەشێمان بوونەوە (التناقض)**

**پەشێمان بوونەوە دوو بەشە:**

**١- پەشێمان بوونەوەی شایەتەكان.**

**٢- پەشێمان بوونەوەی داواكار.**

**پەشێمان بوونەوەی شایەتەكان لە شایەتی دان:**

ئەگەر شایەتەكان شایەتیان دا لەپاشاندا بە ئامادە بوونی قازی پەشێمان بوونەوە پێش دەرچوونی حوكم، ئەوە شایەتی‌یەكەیان وەك ئەوەیە كە هەر نەیان دابێ، بەڵام تەمێ ئەكرێن، ئەمەش ڕای جەماوەری زانایانە، بەڵام ئەگەر شایەتەكان دوای دەرچوونی حوكم بە ئامادە بوونی قازی پەشێمان

بوونەوە ئەوە حوکمەکە هەڵناوەشێتەوە، وە شایەتەکان دەستبەر ئەبن لەو حوکمەی دراوە وە هەر زیانێك بەو حوکمە ڕووی دابێ ئەبێ بیبژێرن.

وە ئەگێڕنەوە کە دوو پیاو لای ئیمامی عەلی ﷺ لەسەر کەسێکی تر شایەتیان دا لەسەر دزی، ئەویش دەستی بڕی، لەپاشاندا هەردووکیان پیاوێکی تریان هێنا ووتیان: دزەکە ئەمە بووە، عەلی ﷺ فەرمووی: باوەڕتان پێ ناکەم لەسەر ئەمەیان و خوێن بایی دەست بڕاوەکەی تریشتان لێ ئەسێنم، وە ئەگەر بمزانیبایە بە قەستی ئەو کارەتان کردووە دەستی هەردووکتانم ئەبڕی.

وە شهاب الدین ی قەرافی ڕای‌یەکەمی جەماوەری لێك داوەتەوە و ووتویەتی:

ئەو حوکمە بە قسەی کۆمەڵێك عادڵ سابت بووەو بە هۆیەکی شەرعی، وە داوای شایەتەکان دوای ئەو درۆیە —ئەوە کە بڵێن درۆمان کردووە- ئیعترافە لە خۆیانەوە کە (فاسق) تاوان کارن، وە بە قسەی تاوان کاریش حوکم هەڵناوەشێتەوە لەبەر ئەوە حوکمەکە وەك خۆی ئەمێنێتەوە.

وە ئیبنوموسەییب و ئەوزاعی و ڤاهیری‌یەکان بۆ ئەوە چوون کە حوکم هەڵئەوەشێتەوە بە پەشیمان بوونەوەی شایەتەکان لە شایەتی‌یەکەیان لە هەموو شێوەیەکدا، لەبەر ئەوەی ئەو حوکمە بە شایەتی ئەو شایەتانە سابتە.

جا کاتێك شایەتەکان پەشێمان بوونەوە ئەو شتە نامێنێ کە حوکمەکەی پێ ئەچەسپێت، وە هەروەها گشت حەددە شەرعی‌یەکان و تۆڵەکان لای هەندێ لە زانایان حوکمەکە جێ بە جێ ناکرێت ئەگەر شایەتەکان پەشێمان بونەوە پێش جێبەجێ کردنی حوکمەکە، چونکە حەددەکان بە گومان و شوبهە لەکۆڵ ئەکەون و لا ئەچن.

پەشێمان بوونەوەی داواکار:

ئەگەر قسەیەك لە داواکارەوە دەرچوو کە پێچەوانەی داواکەی بوو داواکەی پوچەڵ ئەبێتەوە، جا ئەگەر ئیعترافی کرد بە ماڵێك کە ماڵی کەسێکی ترەو دوایی پەشێمان بووەوە و داوای کرد کە ئەو ماڵە ماڵی خۆیەتی ئەوە ئەو داوایە کە دژی ئیعتیڕافەکەیەتی داواکەی باتڵ ئەکاتەوە، وە ڕێ لە قبوڵ کردنی ئەگرێت.

وە ئەگەر کەسێك گەردنی کەسێکی ئازاد کرد لە هەموو داواکاری‌یەکانی ئیتر دروست نی‌یە دوای ئەوە داوای هیچی تری لێ بکات.

هەڵوەشاندنەوەی بەڵگەو شایەتی داواکار:

دروستە بۆ داوالەسەرکراو بەڵگە پێشکەش بکات کە داوای داواکار ڕەت بکاتەوە بۆ ئەوەی خۆی پێ بەری بکات لە تۆمەت ئەگەر بەڵگەی بەدەستەوە بوو.

بەڵام ئەگەر ئەوجۆرە بەڵگەیەی نەبوو دروستە بۆی بەڵگەیەکی وا پێشکەش بکات کە تانە بدات لە دادپەروەری شایەتەکان و بریندار کردنی ڕوون کردنەوەی داواکارەکە بۆ ئەوەی بەشایەتی وەرنەگیرێن.

بەرەنگاری کردنی دوو بەڵگە :

ئەگەر بەڵگەی داواکار و داوالەسەرکراو بەرامبەر وەستان و شتێك نەبوو یەکێکیان پارسەنگ بدات، ئەو شتەی داواکەی لەسەرە لەنێوان هەردوکیاندا بەش ئەکرێت.

لە ئەبی موساوە هاتووە کە دوو پیاو لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ لەسەر ووشترێك ناکۆکیان کرد هەردووکیان یەکی دوو شایەتیان هێنا کە ووشتری خۆیەتی، پێغەمبەر ﷺ لە نێوانیاندا بۆی بەش کردن بە نیوەیی. ئەبوداودو حاکم و بەیهەقی گێراویانەتەوە[1].

وە ئەحمەد وئەبوداود وئیبنوماجە و نەسائی لە حەدیسی ئەبوموساوە تەخریجیان کردوە کە:

دوو پیاو ناکۆکی کەوتە نێوانیان لەسەر وڵاغێك هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وە هیچیان شایەتیان نەبوو لەسەری، پێغەمبەریش ﷺ کردی‌یە نیوەیی لە نێوانیاندا[2]. وە ئەبوحەنیفەش هەر بۆ ئەوە چووە.

جا ئەگەر داواکراوەکە بە دەست یەکێکیانەوە بوو لەسەر ئەوی تریانە بەڵگەو شایەت پێشکەش بکات، بەڵام ئەگەر شایەتی نەهێنا قسەی ئەویانە کە شتەکەی بە دەستەوەیە بەڵام ئەبێ سوێند بخوات، وە هەروەها ئەگەر هەردوو لایان شایەتیان هەبوو بەدەستەوە ئەوکاتە ئەدرێ بەوکەسەی کە شتەکەی بەدەستەوەیە.

وە لە جابیرەوە هاتووە کە دوو پیاو لەسەر ووشترێك کێشەیان کەوتە نێوانەوە هەر یەکەیان ووتی: لای من زاوە، وە شایەتی ئەهێنا، پێغەمبەر ﷺ دای بەو کەسەیان کە بە دەستی‌یەوە بوو. بەیهەقی تەخریجی کردوەوئیسنادەکەی زەعیف نەکردووە، وە شافیعیش شتێکی وای تەخریج کردووە[3].

سوێند دانی شایەت :

---

(١) أبوداود (٣٦١٦) والحاكم (٤/٩٥) والبيهقي في الكبرى (١٠/٢٥٩).

(٢) أحمد (٤/٤٠٢) وأبوداود (٣٦١٣) والنسائي (٨/٢٤٨) وابن ماجه (٢٣٣٠).

(٣) البيهقي (١٠/٢٥٦).

دادپەروەری و ڕاستی شایەتەکانی ئەم سەردەمە وای لێ هاتووە کە نازانرێت، لەبەر ئەوە پێویستە بە سوێند بە هێز بکرێت. لە گۆڤاری (الأحكام العدلية)دا هاتووە: ئەگەر شایەت لەسەرداو پێی داگرت کە حاکم پێش حوکمەکە شایەتەکان سوێند بدات: بەوە کە ئەوان لە شایەتی‌یەکەیانا درۆیان نەکردووە، وە پێویستی بووکە شایەتی‌یەکە بە سوێند بە هێزبکرێت، لەسەر حاکم پێویستە شایەتەکان سوێند بدات و پێیان بڵێت: ئەگەر سوێند نەخۆن شایەتی‌یەکەتان وەرناگرم.

ئیبنوئەبی لەیلی و ئیبنوقەیم و موحەممەدی کوڕی بەشیری قازی قورگوبە بۆ ئەوە چوون، وە ئیبنونەجیمی حەنەفی پارسەنگی داوەتەوە.

وە لای حەنەفی‌یەکان شایەت سوێند خواردنی لەسەر نی‌یە لەبەر ئەوەی زاراوەی شایەتی‌یە کە مانای سوێند خواردنی تێدایە.

وە لای حەنبەلی‌یەکان شایەتێك سوێند نادرێت کە ئینکاری هەڵگرتنی شایەتی بکات، هەروەها حاکمێکیش کە ئینکاری حوکم کردن بکات، وە ئەو وەصی‌یەی دان نەنێت بە بوونی قەرز لای ئەو کەسەی بۆوەتە وەصی. و هەروەها ئەو کەسەی ئینکاری مارەکردن و تەڵاق دان و ڕەجعە و (إيلاء)و نەسەب و تۆڵەکردنەوە وتاوان دانە پاڵ یەکێکی تر بکات سوێند نادرێت، لەبەرئەوەی ئەمانە ماڵ نین ومەبەستی ماڵیشیان تێدا نی‌یە، وە بە نکول و پەشیمان بوونەوە حوکمیان تێدا نادرێت.

**شایەتی (زور) درۆو ساختە[1]:**

شایەتی دان بە درۆ لە گەورەترین گوناهەکان و گەورەترین تاوانە، چونکە یارمەتی دانی ستەمکارە و خواردنی مافی ستەم لێ کراوانە، و سەرلێشێواندنی دادگایە، وە ڕق وکینە دروست ئەکات وناکۆکی و دژایەتی ئەخاتە نێوان خەڵکەوە. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَاجْتَنِبُوا الرِّجْسَ مِنَ الأَوْثَانِ واجْتَنِبُوا قَوْلَ الزُّورِ﴾ (الحج/٣٠).

وە لە ئیبنوعومەرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لن تزول قدم شاهد الزور حتى يوجب الله له النار) رواه ابن ماجه بسند صحيح[2].

واتە: قاضي شایەتی درۆ هەڵنایەتەوە هەتا خوا ئاگری بۆ پێویست نەکات.

---

(١) (ثعلبي) فەرمویەتی (زور) جوانکردنی شتەو وەسف کردنیەتی بە پێچەوانەی سیفەتی خۆی هەتا ئەو کەسەی گوێی لی‌یە یا ئە ئەیبینێ گومان ئەکات کە ئەو شتە پێچەوانەی ئەو سیفەتەی خۆیەتی، کەواتە (زور) ڕوکەش کردن و داپۆشینی باتڵە بەشێوەیەك کەوا بە بیەدا بێت کە ڕاستە.

(٢) ابن ماجه (٢٣٧٣).

وە بوخاری و موسلیم لە ئەنەسەوە ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: پرسیاری گوناهە گەورەکان کرا لە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (الشرك بالله، وقتل النفس، وعقوق الوالدين، وقال: ألا أنبئكم بأكبر الكبائر؟ قول الزور. أو قال: شهادة الزور)[1].

واتە: فەرمووی: هاوبەش پەیداکردن بۆ خوا وکوشتنی ئادەمیزاد وئازاردانی دایك و باوکە، وە فەرموی: ئایا ئاگادارتان نەکەمەوە لە گەورەترین گوناه؟ شایەتی درۆیە. یا فەرموی: قسەی درۆیە.

وە لە ئەبوبەکرەوە ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ألا أنبئكم بأكبر الكبائر؟ قلنا: بلى يا رسول الله. قال: الإشراك بالله، وعقوق الوالدين، وكان متكئاً فجلس. وقال: ألا وقول الزور وشهادة الزور...فما زال يكررها حتى قلنا: ليته سكت )[2].

واتە: ئایا لە گەورەترین تاوان ئاگادارتان نەکەمەوە؟ ووتمان: با ئەی نێرراوی خوا، ئاگادارمان بکەرەوە. فەرمووی: هاوبەش دانانە بۆ خوا وئازاردانی دایك وباوکە. ئەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پاڵی دابووەوە هەڵسا وفەرمووی: ئاگاداربن قسەی درۆ وشایەتی درۆشە. ئەڵێ: ئەوەندەی دووبارە کردەوە هەتا ئەمان ووت: خۆزگە بێ دەنگ بوایە[3].

سزای شایەتی درۆ:

ئیمامی مالیك و شافیعی وئەحمەد ڕایان وایە کە شایەتی درۆ تەمێ بکرێت و بە خەڵك بناسێنرێت کە شایەتی درۆیە.

وە ئیمامی مالیك ئەوەشی زیاد کردووەو فەرمویەتی: لەناو مزگەوتاندا ولە بازارەکاندا و لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا ئاشکرا بکرێت و جاڕی بۆ بدرێت هەتا ببێتە سزا بۆ ئەو وتەمێ کردنی خەڵك.

بەند کردن (السجن)

بەندکردن دێرینەو کۆنە، وە لە قورئاندا هاتووە کە یوسف (عليه السلام) فەرمویەتی: ﴿قَالَ رَبِّ السِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِي إِلَيْهِ﴾ (يوسف/٣٣).

واتە: ووتی: پەروەردگار بەندی وزیندانی لای من خۆشترە لەوەی کە بانگم ئەکەن بۆی.

---

(١) البخاري (٢٦٥٣) ومسلم (١٤٤/٨٨).

(٢) البخاري (٢٦٥٤) ومسلم (١٤٣/٨٧).

(٣) شایەتی (زور) درۆو ساختە گەورەترە لە تاوانی زینا کردن یا دزین. لەبەر ئەوەیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گرینگی پێ داوە بە هوشیار کردنەوە لێی، چونکە ئاسانترە لەسەر زمان، وە زیاتر پشت گوێ ئەخرێ، وە هۆکاریشی زۆرە لە ڕق و کینەو دوژمنایەتی و جگە لەوانە، جا پێویستی کردووە کە گرینگی پێ بدرێ.

وەخوا باسی ئەوەی کردووە کە یوسف چۆتە بەندیخانەوە وچەند ساڵێك تێیدا ماوەتەوە.

وە لەسەردەمی پێغەمبەر وصەحابە ودوای ئەوانیش بەندکردن هەبووە و هەتا ئەمڕۆ هەر ماوە.

ئیبنوقەییم فەرمویەتی: بەندکردنی شەرعی بەندکردن نیيە لە شوێنێکی تەسك وبچوکدا، بەڵکو بەستنەوەو ڕێ گرتنە لە کەسێك کە بۆ خۆی تەسەڕروف بکات. جا ئەو بەندکردنەی لە ماڵدا بێت یا لە مزگەوتدا، یا ئەدرێتە دەست ئەوکەسەی کە ناکۆکی لەگەڵدا هەیە یا وەکیلەکەی کە لای خۆی بیهێڵێتەوە، لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ ناوی ناوە دیل. وەك ئەبوداود وئیبنوماجە لە هیرماسی کوڕی حەبیبەوە لە باوکی یەوە ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: قەرزارێکم هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموم: لای خۆت بیهێڵەرەوە، لەپاشان فەرموی: (یا أخا بني تميم، ما تريد أن تفعل بأسيرك؟)[1].

واتە: ئەی برای هۆزی تەمیم ئەتەوێ چی لە دیلەکەت بکەی؟

وە لە ڕیوایەتێکی ئیبنوماجەدا هاتووە کە فەرمویەتی: لەپاشاندا ئێوارە سەری لێ دامەوەو فەرمووی: دیلەکەت چی لێ کرد ئەی برا تەمیمی یەکە؟

جا ئیبنوقەیم فەرمویەتی: بەندکردن بەو شێوەیە بوو لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ، وە هەروەها لەسەردەمی ئەبوبەکردا ﷺ. وە بەندی خانە ئامادە نەکرابوو بۆ بەندکردنی ناکۆکەکان. بەڵام کاتێك دەوڵەتی ئیسلام فراوان کراو موسڵمانەکان زۆر بوون لەسەردەمی عومەری کوڕی خەططابدا ﷺ. عومەر لە مەککە خانوویەکی کڕی و کردی بە بەندیخانە، خەڵکی تێدا بەند ئەکرا.

وە لەبەر ئەوە زانایان لە هاوڵانی ئەحمەد وکەسانی تر کێشەیان بووە: کە ئایا پێشەوا ئەبێت بەندیخانەی هەبێت، لەسەر دوو ووتە.

ئەوانەی ووتویانە: نابێت بەندیخانەی هەبێت ووتویانە: پێغەمبەر ﷺ بەندیخانەی نەبووە، وە هەروەها خەلیفەکانی دوای خۆی نەیان بووە، بەڵکو بەندەکەی لە شوێنێکدا دائەنا یا کەسێکی بە سەرەوە دائەنا. ئەوەیە کە (الترسيم)ی پێ ئەوترا. یا بە لایەنە ناکۆکەکەی فەرمان ئەکرا کە لای خۆی گلی بداتەوە، وەك پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی.

وەئەوانەی ووتویانە: بۆ پێشەوا هەیە بەندیخانەی هەبێت ئەڵێن: عومەری کوڕی خەططاب ﷺ لە صەفوانی کوڕی ئومەییە خانویەکی کڕی بە چوارهەزار وکردی بە بەندیخانە.

---

(١) أبوداود (٣٦٢٩) وابن ماجه (٢٤٢٨).

**لە بەندکردندا ئاسایش و بەرژەوەندی هەیە:**

شەوکانی فەرموویەتی: بەندکردن لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ هەبووە، وە هەروەها لەسەردەمی صەحابەکان و تابیعی‌یەکاندا ودوای ئەوانیش هەتا ئەمڕۆ، وەلە هەموو سەردەمێك و وڵاتێکدا هەبووە بێ ئەوەی کەس ئینکاری لە بوونی کردبێت، وە بەندکردنیش ئەوەندەی بەرژەوەندی تێدا هەیە کە شاراوە نی‌یە ئەگەر تەنها هەر ئەوەندەش بێت کە ئەو تاوان کارانە بپارێزێ کە خەریکی زیان گەیاندنن بە موسڵمانان و عادەتیان بە تاوان وفساد گرتووە، وە کارێکی واشیان نەکردووە کە شیاوی قیصاص وحەد بن تا تۆڵەیان لێ بسێنرێت وخەڵکی لە دەستیان بحەسێنەوە، جا ئەمانە ئەگەر وێڵ کرێن و وازیان لێ بهێنرێت ئەو پەڕی زیان بە موسڵمانان ئەگەیەنن، وە ئەگەر بکوژرێن خوێنیان بە ناحەق ئەرژێ، تیتر هیچ ڕێگایەك نەماوە ئەوە نەبێ کە لە بەندیخانەدا ئاگاداری بکرێن و ڕێگری بکرێ لە نێوان ئەوان و خەڵکدا هەتا تۆبەیەکی ڕاست ئەکەن یا خوا خۆی چۆنی بوێ بەو شێوەیە حوکمیان بکات.

خوای گەورە فەرمانی پێ داوین کە فەرمان بە چاکە بکەین و نەهی بکەین لە خراپە، وە هەڵسان بەو کارەش دەربارەی ئەو کەسانەی بەو شێوەیە بن ناکرێت هەتا لە خەڵك دانەبڕێن بە بەندکردن، هەروەك ئەوە ئەزانن ئەوانەی کە بارو دۆخی زۆر لەوانەیان ناسیوە. تەواو بوو.

**جۆرەکانی بەندکردن :**

خگابی ووتویەتی: بەندکردن لەسەر دوو شێوەیە: بەندکردنی سزادان وبەندکردنی پێ دەرخستن.

جا بەندکردنی سزادان لە شتە واجبەکاندا نەبێت نابێت، بەڵام ئەو بەندکردنەی لەبەر تۆمەتێك بێت بۆ دەرخستنی ئەوەیە کە لە دوای ئەو تۆمەتەوەیە.

وە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی لەسەر تۆمەت گرت و ماوەیەك لە ڕۆژا هێشتی‌یەوە لەپاشاندا بەرەڵای کرد.

ئەم فەرموودەیەش بەهزی کوڕی حەکیم لە باوکی‌یەوە لە باپیرەیەوە گێڕاویەتی‌یەوە[1].

---

(١) أحمد (٥/٢) وأبوداود (٣٦٣٠) والترمذي (١٤١٧) والنسائي (٨/٦٧).

**لێ دانی (متهم) تاوانبار:**

دروست نی‌یە کەس بەندبکرێت بە ناحەق، هەرکاتێکیش بە حەق بەندکرا ئەبێ خێرا لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکرێت، جا ئەگەر تاوانباربوو بەپێی تاوانەکەی ئەگیرێت، وە ئەگەر بێ تاوانیش بوو بەرەڵا ئەکرێت، وە حەرامە لە تاوانبار بدرێت، چونکە کەرامەتی بریندار ئەکات و سوکی ئەکات.

وە پێغەمبەر ﷺ لێدانی موسڵمانانی قەدەغە کردووە.

وە ئایا لێی ئەدرێت ئەگەر بە تاوانی دزی گیرا؟ دوو رای لەسەرە:

رای هەڵبژاردە لای حەنەفی‌یەکان و غەزالی لە شافیعی‌یەکان ئەوەیە کە (متهم) تاونبار بە دزی لێی نادرێت چونکە لەوانەیە بێ تاوان بێت، جا وازهێنان لە لێدانی تاوانبار هێواش تر وباشترە لە لێدانی بێ تاوانێك.

وە لە فەرمودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە: (لأن يخطيء الإمام في العفو خير من أن يخطيء في العقوبة)[1].

واتە: پێشەوا هەڵە بکات لە لێ بووردندا چاکترە لەوەی هەڵە بکات لە سزادانەدا و بە ناحەق لێی بدات.

ئیمامی مالیك رێی داوە بە بەندکردنی (متهم) تاوانبار کراو بە دزی، وە هاوەڵەکانی رێیان داوە بە لێدانیشی، بۆ ئەوەی هەم دزی‌یەکە دەرخات و هەم ببێتە پەند بۆ کەسانی تر.

وە هەرکاتێ بەو شێوەیە ئیقراری کرد نرخی نی‌یە چونکە یەکێ لە مەرجەکانی ئیقرارکردن نارەزووە، بەڵام ئەم لێرەدا لەژێر شکەنجەدا ئیقراری کردووە.

**بەندیخانە ئەبێت چۆن بێت؟ :**

پێویستە بەندیخانە فراوان بێت، وە هەرچی بەندکرا تێیدا لە (بيت المال) پارەی بۆ سەرف بکرێت و ئەوەندەی بدرێتێ کە بەشی خواردنی و پۆشاکی بکات، وە هەموو بەندی‌یەکان ئەوەندەی بەشیان ئەکات بۆ خواردن و پۆشاك بیان درێتێ؛ وە رێگری بەندکراوەکان لەوەی کە پێویستیانە وەك خواردن و جلوبەرگ و شوێنی حەوانەوەی پاکو خاوێن ستەمەو خوا سزای لەسەر ئەدات.

(١) الترمذي (١٤٢٤).

لە ئیبنوعومەرەوە ﵄ کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (عُذِبت امرأة في هرة سجنتها حتي ماتت فدخلت فيها النار، لاهي أطعمتها وسقتها، إذ حبستها، ولا هي تركتها تأكل من خشاش الأرض). رواه البخاري ومسلم[1].

واتە: ژنێك لەسەر پشیلەیەك شكەنجە درا، كە بەندی كردبوو هەتا مرد، جا چووە ئاگرەوە لەسەری، چونكە نە خواردن وخواردنەوەی پێدابوو كاتێ بەندی كردبوو، وە نە بەرەڵایشی كردبوو لە خشۆكەكانی زەوی بخوات.

زۆر لێ كردن (الإكراه)

پێناسەكەی:

زۆر لێ كردن: پاڵ نانە بە ئادەمیزادەوە بۆ كردنی فەرمانێك كە خۆی نەیەوێ بیكات لەڕوی سروشتەوە یا لە ڕوی شەرعەوە.

وە لە شەرعدا: پاڵ نانە بە كەسێكەوە بۆ كردنی ئەو شتەی لای ناخۆشە بەهۆی هەڕەشە لێ كردن بە كوشتن یان بە لێدان یان بە بەندكردن یان بە ماڵ لەناو بردن یان تەزیەتی زۆر یا سەرزەنشی توندو تیژ.

وە مەرجە تێیدا كە زۆر لێ كراوەكە گومانی ئەوەی زاڵ ببێت كە ئەو هەڕەشەیەی لێی ئەكرێت جێبەجێ ئەكرێت بە سەریا.

وە جیاوازی نییە لە نێوان زۆر لێ كردنی حاكم یا دز یا جگە لەوان.

عومەر ﵁ فەرمویەتی: ئەو پیاوەی بترسێنرێت یا پەیوەند بكرێت یا لێی بدرێت لە خۆی دڵنیا نییە.

ئیبنومەسعود فەرمویەتی: هەر كاربەدەستێك بیەوێ زۆرم لێ بكات كە قسەیەك بكەم قامچییەك یا دوو قامچیم لێ دوور بخاتەوە، ئەو قسەیە ئەكەم.

ئیبنوحەزم فەرمویەتی: نەزانراوە لە صەحابەوە كە پێچەوانەی ئەم قسەیە بێت.

بەشەكانی زۆر لێ كردن:

زۆر لێ كردن ئەكرێت بە دوو بەشەوە:

١- زۆر لێ كردن لەسەر قسە.

---

(١) البخاري (٢٣٦٥و٣٤٨٢) ومسلم (٢٢٤٢).

**٢- زۆر لێ کردن لەسەر کردەوەیەك.**

زۆر لێ کردن لەسەر قسە هیچی لەسەر نی‌یە، چونکە زۆر لێ کراو تەکلیفی لەسەر نی‌یە. جا بۆیە ئەگەر کوفریش بکات لێ‌ی ناگیرێت، وە ئەگەر بە زۆر تاوانی داوێن پیسی گرتە کەسێك تۆڵەی لێ ناسەندرێت. وە ئەگەر دانی نا بە شتێکدا لێ‌ی وەرناگیرێت.

وە ئەگەر پەیمانی ژن ومێردایەتی بەست یا شتێکی بەخشی یا پەیمانی کڕین و فرۆشتنی بەست ئەو پەیمانە پێك نایەت، وە ئەگەر سوێندی خوارد یا نەزری کرد هیچی لەسەر نی‌یە، وە ئەگەر ژنەکەی تەڵاق بدات یا بیگێڕێتەوە ئەوە تەڵاقەکەی ناکەوێت و گێڕانەوەکەی دروست نی‌یە. بنەمای ئەمانەش فەرموودەی خوای بەرزە کە فەرموویەتی: ﴿مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِهِ إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ وَلَكِنْ مَنْ شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِنَ اللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ (النحل: ١٠٦).

واتە: هەرکەس دوای بڕوا هێنان بە خوا کافر بێت ئەوە غەزەب و تووڕەیی خوای لەسەرە ئیللا کەسێك نەبێ کە زۆری لێ کراوەو دڵی سابتە لەسەر بڕوا، بەڵام ئەوەی سینگی بۆ کوفر کردۆتەوە غەزەبی توندو تیژی خوایان لەسەرەو سزای گەورە.

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە:**

وە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ئەمەیە کە ئیبنوکەثیر لە تەفسیرەکەیدا باسی ئەکات لە ئەبو عوبەیدەوە موحەممەدی کوڕی عەمماری کوڕی یاسر کە فەرمویەتی: بێ باوەڕەکان عەمماری کوڕی یاسر ئەگرن وسزای ئەدەن هەتا نزیك ئەبێتەوە لەوەی کە ئەوان دەیانەوێ. لای پێغەمبەر ﷺ باسی حاڵی خۆی ئەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ پێ ی فەرموو: (كيف تجد قلبك؟ قال: مطمئناً بالإيمان. قال: إن عادوا فعد)[1].

واتە: دڵت چۆن ئەبینی؟ (عەممار) ووتی: دڵنیایە بە باوەڕ، پێغەمبەر ﷺ فەرموی ئەگەر جارێکی تر ئاوایان لێ کردیتەوە، تۆش دووبارەی بکەرەوە بۆیان.

وە بەیهەقی لەوە سادەتر باسی کردووە کە گویا جوێنی داوە بە پێغەمبەر ﷺ وباسی خواکانی کردوون بە چاکە. ئەویش هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و ووتی: ئەی نێرراوی خوا، بەرەڵایان نەکردم هەتا جوێنم نەدا بە تۆ وباسی خواکانیانم نەکرد بە چاکە. ئەویش پێ‌ی فەرموو: دڵت چۆنە؟ ووتی: پڕ لە باوەڕە. فەرموی: ئەگەر گەڕانەوە داوایان لێ کردیتەوە بۆیان دووبارە بکەرەوە.

---

(١) تفسير ابن كثير (٢/٧٢٦).

جا لەو بارەیەوە ئەم ئایەتە نازڵ بوو: ﴿إلا من أكره وقلبه مطمئن بالإيمان﴾ [١].

ئەم ئایەتە کوفرکردن و شتی تریش ئەگرێتەوە:

وە ئایەتەکە هەرچەندە تایبەتە بە ووتنی ووشەی کوفرەوە بەڵام شتی تریش ئەگرێتەوە.

قرطبـي فەرمویەتی: کاتێ خوای گەورە لەکاتی زۆر لێ کردندا ڕێی دا بە کوفرکردن، کە بنەمای یاسای ئیسلامە، وە لێی نەگرتوون، زانایانیش لقەکانی یاسای ئیسلامیشیان خستۆتە پاڵی. جا ئەگەر زۆرکردن ڕویدا بۆ کردنیان یا ووتنیان، لێی ناگیرێ و حوکم نادرێ پێی، وە هەر لەو بارەیەوە فەرموودە بە ناو بانگەکە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە کە فەرموویەتی: (رفع عن أمتي الخطأ والنسيان وما استكرهوا عليه) [٢].

واتە: لەسەر ئۆمەتم ئەنجامی هەڵە ولەبیر چوونەوە وئەو شتەی بە زۆر پێیان بکرێت لابراوە.

ئەم خەبەرە هەرچەندە سەنەدەکەی صەحیح نی یە بەڵام ماناکەی ڕاستە بە ڕای هەموو زاناکان.

قازی ئەبوبەکری ئیبنوعەرەبی ئەوەی ووتوە و أبومحمد عبدالحق باسی کردووە کە ئیسنادەکەی صەحیحە، وە ئەبوبەکری ئەصیلی لە (الفوائد)دا باسی کردووە، هەروەها ئیبنومونژیر لە کتێبی (الإقناع)دا. تەواو.

---

(١) البيهقي (٨/٢٠٨).

(٢) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

**کاتی زۆر لیّ کردن بۆ کوفرکردن خۆڕاگری باشترە:**

ئەھەرچەند ووتنی ووشەی کوفر کاتی زۆر بۆ ھاتن ڕێی پیّ دراوە، بەڵام چاکتر وایە مرۆڤ خۆڕاگربێت و ئارام بگرێت لەسەر ئەو سزایەی کە ئەدرێت ئەگەر بشبێتە ھۆی کوشتنی لەبەر بەھێز کردن و سەربەرزی ئایین، وەك یاسر و سومەییە کردیان. وە ئەو خۆڕاگرتنە خۆ ھەڵدانە ناو تالوکە و خۆ لەناو بردن نی‌یە، بەڵکو وەك شەھید بوونە لە جەنگدا وەك زانایان ووتویانە.

ئیبنوئەبی شەیبە تەخریجی کردوە لە حەسەن و عبدالرزاق ەوە لە تەفسیرەکەیدا لە (معمر)ەوە کە موسەیلەمەی کژاب دوو پیاوی گرت بە یەکێکیانی ووت: تۆ دەربارەی محمد ﷺ چی ئەڵێیت؟ ووتی: نێرراوی خوایە. ووتی: ئەی بە من چی ئەڵێیت؟ ووتی: تۆش نێرراوی خوایت. ئیتر بەرەڵای کرد. وە بەوی تریانی ووت: بە محمد ﷺ ئەڵێی چی؟ ووتی: نێرراوی خوایە. ووتی: ئەی بە من ئەڵێی چی؟ ووتی: کەرم نابیستم، سیّ جار لیّی دووبارە کردەوە، ھەر بەو شێوەیە وەڵامی دایەوە ئەویش کوشتی. باسەکەیان گەیشتە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: یەکەمیان ڕوخسەتەکەی خوای وەرگرتووە. بەڵام ئەوەی تریان حەقی بەرز کردۆتەوەو لیّی پیرۆز بێت[1].

**زۆر لێکردن بۆ کردنی کارێك:**

بەشی دووەم زۆر لیّ کردنە بۆ کردنی کارێك، ئەمیش ئەکرێت بە دوو بەشەوە:

١- ئەوە کردەوەیەی کاتی پێویست کردنی ڕەوا ئەبێت.

٢- ئەوە کردەوەیەی پێویستیش ڕەوای ناکات.

یەکەمیان: وەك زۆر لیّ کردن بۆ خواردنەوەی ئارەق یا خواردنی گۆشتی مردارەوە بوو، یا گۆشتی بەراز، یا خواردنی ماڵی کەسێکی تر، یا خواردنی ئەوەی کە خوا حەرامی کردووە، ئەمانە لەو حاڵەتەدا خواردنیان ڕەوا ئەبێت. بەڵکو لە زانایاندا ھەیە کە خواردنیان بە واجب ئەزانێت، ئەگەر بەوە نەبێت ڕزگاری نەبێت. وە زیانیشی نی‌یە بۆ کەس، و زیادەڕەوی نی‌یە لە مافەکانی خوادا، وە خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ولا تلقوا بأيديكم إلى التهلكة﴾.

واتە: بە دەستی خۆتان، خۆتان فڕیّ مەدەنە ناو تالوکەو تیاچونەوە.

---

(١) السيوطي (الدر المنثور ٤/١٣٢).

وە هەروەها ئەگەر کەسێك زۆری لێ کرا بۆ شکاندنی ڕۆژووی ڕەمەزان، یا نوێژکردن بەرەو لایەکی تر، یا کڕنۆش بردن بۆ بت یا صەلیب، حەڵاڵە بۆی ئەو ڕۆژووە بشکێنێ یا نوێژ بەرەو لایەکی تر بکات، یا کڕنۆش ببات بۆ بت بە نیازی کڕنۆش بردن بۆ خوا.

دووەم: وەك زۆر لێ کردن بۆ کوشتنی کەسێك، یا بریندار کردنی، یا لێ دانی، یا زیناکردن، یا ماڵی خەڵك وێران کردن.

قرگبی فەرمویەتی: زانایان هەموو لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە ئەگەر کەسێك زۆری لێ کرا کەسێکی تر بکوژێت دروست نی‌یە ئەو کارە بکات یا ئابڕووی بەرێت بەوە کە لێی بدات یا بە هەر شێوەیەکی تر، بەڵکو ئەبێ ئارام گر بێت لەسەر ئەو بەڵایەی بە سەریا هاتووە، وە دروست نی‌یە گیانی خۆی بپارێزێت بە گیانی کەسێکی تر، واتە کەسێکی تر بکاتە قوربانی خۆی، وە ئەبێ ئارام بگرێت وداوای عافی‌یەتی دنیاو قیامەت لە خوا بکات.

**زۆر لێ کراو تۆڵەی لێ ناسەندرێت:**

ئەگەر ڕێ کەوت پیاوێك زۆری لێ کرا بۆ زیناکردن و ئەویش کردی حەددی شەرعی لەسەری جێبەجێ ناکرێت، وە هەروەها ئافرەت ئەگەر زۆری لێ کرا بۆ زیناکردن ئەویش هەر حەددی لەسەر نی‌یە، بەپێی فەرمودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی: (إن الله تجاوز عن أمتي الخطأ والنسيان وما استكرهوا عليه)[1].

واتە: خوا لە ئۆمەتم هەڵە ولە بیر چوونەوەو ئەوەی زۆریان لێ ئەکرێت لەسەری ئەبورێت.

مالیك و شافیعی و ئەحمەد ئیسحاق و ئەبوپهور و عەگاو و زوهری ڕایان وایە هەر ئافرەتێك زۆری لێ بکرێت بۆ زیناکردن: ئەبێ مارەیی وەك خۆی بدرێتێ.

**پۆشاك (اللباس)**

پۆشاك نیعمەتێکە لە نیعمەتەکانی خوای گەورە کە بەخشیوێتی بە بەندەکانی.

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَابَنِي آدَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَارِي سَوْآتِكُمْ وَرِيشًا وَلِبَاسُ التَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ ذَٰلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ﴾ (الأعراف/٢٦).

---

(١) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد

واتە: ئەی ڕۆڵەکانی ئادەم بەڕاستی جلکێکمان بۆ ئێوە نارد کە شەرمگاتان بپۆشێ، وە جلێکیش کە هۆی جووانی و زینەتی ئێوە بێ، وە جلکی تەقواو پارێزگاری باشترە، ئەمە لە نیشانەکانی خوایە، بەلکو یادی ئەو نیعمەتانە بکەن و سوپاسی خوایان لەسەر بکەن.

وە پێویستە جل وبەرگ چاك وجوان وخاوێن بێت. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَابَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ وكُلُوا واشْرَبُوا ولاَ تُسْرِفُوا إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ﴾ (الأعراف/٣١) واتە:

ئەی نەوەی ئادەم لە مزگەوتەکاندا و بۆ نوێژکردن خۆتان بڕازێننەوە، وە بخۆن و بخۆنەوە و زیادەڕەوی مەکەن چونکە خوا زیادەڕەوانی خۆش ناوێ.

وە هەروەها ئەفەرموێت: ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ والطَّيِّبَاتِ مِنْ الرِّزْقِ قُلْ هِيَ لِلَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾ (الأعراف/٣٢).

واتە: بلێ -ئەی محمد- کێ حەرامی کردووە ئەو پۆشاك و جوانی یەی کە خوا بۆ بەندەکانی دەرهێناوە، وەئەو خواردن وخواردنەوە ڕەوایانەی کە خوا بەخشیوێتی بە بەندەکانی، بلێ ئەو شتانە لە ژیانی دونیادا بۆ موسڵمانان وکەسانی تریشە، بەڵام لە ڕۆژی دواییدا تەنها بۆ موسڵمانانە، بەو شێوەیە خوا نیشانەکانی ڕوون ئەکاتەوە بۆ ئەو قەومەی ئەیزانن.

وە لە عبداللە ی کوڕی مەسعودەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: (لايدخل الجنة من كان في قلبه مثقال ذرة من كبر. فقال رجل: إن الرجل يحب أن يكون ثوبه حسناً ونعله حسنة. قال: إن الله جميلٌ يحب الجمال. الكبر بطر الحق وغمط الناس). رواه مسلم والترمذي[1].

واتە: کەسێك کە تۆزقاڵێك خۆ بە زل زانینی لە دڵدا بێت ناچێتە بەهەشت. پیاوێك ووتی: پیاوی وا هەیە حەز ئەکات جلەکانی چاك وجوان بێت و پێڵاوەکانی چاك بێت. فەرمووی: خوا جوانە وجوانی لا خوشەویستە، خۆ بە زل زانین ئینکاری کردنی حەقەو بە سوك زانینی خەڵکە.

ترمذي ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إن الله طيبٌ يحب الطيب، نظيف يحب النظافة، كريم يحب الكرم، جواد يحب الجود فنظفوا أفنيتكم ولاتشبهوا باليهود)[2].

---

(١) مسلم (٩١) والترمذي (١٩٩٩) والحاكم (١/٢٦).

(٢) الترمذي (٢٧٩٩).

واتە: خوا پاکە وپاکی خۆش ئەوێت، خاوێنە وخاوێنی خۆش ئەوێت، بەرێزە ورێزگری خۆش ئەوێت، بەخشەرە وبەخششی خۆش ئەوێت. جا دەورو بەری ماڵەکانتان خاوێن بکەنەوەو خۆتان بە جولەکەوە مەچوێنن.

حوکمەکەی:

پۆشاك هەیە واجبە وپۆشاك هەیە پەسندە وهەیە حەرامە:

پۆشاکی واجب: ئەوەی واجبە لە پۆشینی پۆشاك دا ئەوەیە کە ئادەمیزاد خۆی پێ داپۆشێت وشەرمگەی بشارێتەوە ولەسەرما وگەرما بیپارێزێت وزیانی لێ دور بخاتەوە.

لە حەکیمی کوڕی حیزامەوە لە باوکی یەوە کە فەرمویەتی: ووتم: ئەی نێرراوی خوا، شەرمگەمان لە کێ بپارێزین و لە کێ ی نەپارێزین؟ فەرمووی: شەرمگەت بپارێزە لە ژنەکەت نەبێت و لە کەنیزەکانت. ووتم: ئەی نێرراوی خوا، ئەگەر هەموو تێکەڵ بین و کەسوکاری یەك بین چی بکەین؟ فەرمووی: ئەگەر توانیت کەس نەیبینێ با نەیبینێ. ووتم: ئەگەر لە چۆڵەوایندا بووین؟ فەرمووی: خوای گەورە شایستەترە شەرمی لێ بکرێت. ئەحمەدو ئیبنوماجە و ترمزی و حاکم کە بە صەحیحی داناوە گێڕاویانەتەوە[1].

پۆشاکی مستحب: پۆشاکی پەسەند ئەو پۆشاکانەن کە جوانی و خۆ ڕازاندنەوەی تێدایە.

لە ئەبودەردائەوە ﷺ هاتوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إنكم قادمون على إخوانكم فأصلحوا رحالكم وأصلحوا لباسكم حتى تكونوا كأنكم شامه في الناس، فإن الله لايحب الفحش ولا التفحش). رواه أبوداود[2].

واتە: ئێوە ئەچنە لای براکانتان با بار وبارگەتان چاك بێت وجل وبەرگتان چاك بێت هەتا وەك نیشانەتان لێ دێ لەناو خەڵکدا، چونکە خوا پیس وپەڵۆخی و ڕەزا قورسی خۆش ناوێت.

وەلە ئەبوئەحوصەوە لە باوکی یەوە کە فەرمویەتی: هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بە جلوبەرگێکی شڕەوە. فەرمووی: ماڵ وسامانت هەیە؟ ووتم: بەڵێ. فەرمووی: چ جۆر ماڵێکە؟ ووتم: خوای گەورە لە ووشتر و مەڕو بزنو ئەسپ و بەندە پێی بەخشیوم. فەرمووی: ئەگەر خوا ماڵێکی پێ داوی با شوێنەواری نیعمەتی خواو گەورەیی خوات لەسەر دیار بێت. ئەبوداود گێڕاویەتی یەوە[3].

---

(١) أحمد (٣/٥)، وأبوداود (٤٠١٧)، والترمذي (٢٧٦٩)، وابن ماجه (١٩٢٠).

(٢) أبوداود (٤٠٨٩).

(٣) أبوداود (٤٠٦٣).

وە ئەو پەسەندی‌یە زیاتر ئەبێت لە کاتی خواپەرەستی وکاتی نوێژی هەینی وهەر دوو جەژن وکۆڕی خەڵکدا.

لە موحەممەدی کوڕی یەحیای کوڕی حیببانەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ما علي أحدكم إن وجد أن يتخذ ثوبين ليوم الجمعة سوى ثوبي مهنته) رواه أبوداود[1].

واتە: قەیناکە ئەوکەسەتان کە دەسەڵاتی هەبوو دوو کراس بۆ ڕۆژی هەینی دابنێت جگە لە دوو کراسی ئیش وکاری.

**پۆشاکی حەرام:**

ئەمما پۆشاکی حەرام ئەو جل وبەرگانەن کە لە حەریر وزێڕن بۆ پیاوان، وە ئەو جلانەی کە تایبەتن بۆ ژن پیاو لەبەریان بکات، وە ئەو جل وبەرگانەی کە تایبەتن بۆ پیاو ژن لەبەریان بکات، هەروەها لەبەرکردنی پۆشاك بۆ ناوو خۆ بە زل زانین و ئەوپۆشاکانەی ئیسراف وزیادەڕەویان تێدا ئەکرێت.

**لەبەرکردنی حەریر ودانیشتن لەسەری:**

حەدیسەکان بە ڕوونی و ئاشکرایی هاتون کە لەبەرکردنی حەریرو دانیشتن لەسەری حەرامە بۆ پیاو، وا لە خوارەوە باسیان ئەکەین:

١- لە عومەرەوە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لاتلبسوا الحرير فإن من لبسه في الدنيا لم يلبسه في الآخرة). رواه البخاري ومسلم[2].

واتە: جل‌وبەرگی ئاوریشمی لەبەر مەکەن چونکە هەرکەس لە دونیادا لەبەری کرد لە ڕۆژی دواییدا لەبەری ناکات.

٢- لە عبدالله ی کوڕی عومەرەوە هاتوە کە: عومەر پۆشاکێکی بینی کە لە (إستبرق) زێڕو ئاوریشم دروست کرابوو ئەفرۆشرا، هێنای بۆ پێغەمبەر ﷺ ووتی: ئەی نێرراوی خوا، ئەمە بکڕە بۆ خۆت کاتی هەینی‌و وەفد هاتن خۆتی پێ بڕازێنەرەوە. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (إنما هذه لباس مَن لاخلاق له).

واتە: ئەوە کاڵای کەسێکە کە بەش بڕاو بێت لە لای خوا.

---

(١) أبوداود (١٠٧٨)، ابن ماجه (١٠٩٥).

(٢) البخاري (٥٨٣٠) ومسلم (٢٠٦٩).

ماوەیەکی بەسەردا چوو، ئەوەندەی خوا بیەوێ، لەپاشاندا پێغەمبەر ﷺ جبەیەکی (دیباج) ئاوریشمی نارد بۆ عومەر. عومەریش هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ نەت فەرموو: ئەمە کاڵای کەسێکە کە بەش براو بێت کەچی بۆشت ناردوم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إني لم أرسلها إليك لتلبسها ولكن لتبيعها وتصيب بها حاجتك). رواه البخاري ومسلم وأبوداود وابن ماجه[1].

واتە: من بۆم نەناردووی لەبەری بکەی بەڵکو بۆ ئەوەی بیفرۆشیت و پێویستی خۆتی پێ جێبەجێ بکەیت.

٣- وە لە حوزەیفەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ لێی قەدەغە کردبوین لە قاپی زێڕ وزیودا بخۆین و بخۆینەوە، وە لێی قەدەغە کردبووین کاڵای حەریر ودیباج لەبەر بکەین ولەسەری دابنیشین، وە ئەیفەرموو: (هو لهم في الدنيا ولنا في الآخرة)[2].

واتە: ئەوە لە دونیادا بۆ بێباوەڕانەو لە ئاخیرەتدا بۆ ئێمەیە.

بەپێی ئەم فەرموودانە جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون کە لەبەرکردن و ڕاخستنی حەریر حەرامە، بەڵکو مەهدی لە (البحر)دا باسی ئەوەی کردووە کە زانایان لەسەری ئیجماعیان هەیە.

وە قازی (عیاض) لە کۆمەڵێکەوە مەباح بوونی پۆشینی ئەگێڕێتەوە لەوانە ئیبنوعولەییە. وە بەڵگەشیان بۆ قسەکانیان ئەم فەرموودانەی لای خوارەوەیە:

١- لە عوقبەوە کە فەرمویەتی: کەوایەکی حەریریان بە دیاری هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەویش لەبەری کرد ونوێژی پێوە کرد و لەپاشاندا کە لێ بۆوە لە نوێژەکەی بە توندی و توڕەیی‌یەوە لەبەری داکەند و فەرمووی: (لاينبغي هذا للمتقين). رواه البخاري ومسلم[3].

واتە: ئەمە بۆ لە خوا ترسەکان نابێت.

٢- لە میسوەری کوڕی مەخرەمەوە کە چەند جبەیەك پێشکەش بە پێغەمبەر ﷺ کرابوو، جا میسوەرو باوکی چوون بۆلای پێغەمبەر ﷺ بۆ شتێك لەوانە پێغەمبەر ﷺ کە هاتۆتە دەر بۆ

(١) البخاري (٨٨٦) ومسلم (٢٠٦٨/٦).

(٢) البخاري (٥٨٣١).

(٣) البخاري (٣٧٥) ومسلم (٢٠٧٥).

لایان کەوایەکی دیباجی زەرکەشی لەبەردا بو فەرموی: ئەی مەخرەمە ئەمەمان بۆ تۆ دانابو جا جوانی‌یەکانی نیشان داو فەرموی: (أرضي مخرمة). رواه البخاري ومسلم[1].

واتە: ئایا مەخرەمە پی‌ی ڕازی‌یە؟

٣- لە ئەنەسەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەروەیەکی قۆڵداری لە سوندس چنراوی لەبەردا بوو کە پاشای روم بە دیاری بۆی ناردبوو پاشان ناردی بۆ جەعفەر ئەویش لەبەری کرد وهاتەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من وام بۆ نەناردوی لەبەری بکەی. جەعفەریش ووتی: ئەی چی لێ بکەم؟ فەرمووی: بە دیاری بینێرە بۆ نەجاشی برات. ئەبوداود ڕیوایەتی کردووە[2].

٤- بیست صەحابی زیاتر حەریریان لەبەر کردووە لەوانە بەڕائی کوڕی عازیب و ئەنەس. ئەبوداود ڕیوایەتی کردووە.

جەماوەری زانایان وەڵامی بەڵگەکانی ئەوانەیان داوەتەوە کە بە دروستی ئەزانن بەو بەڵگانەی شایەتن لەسەر حەرامی لەبەرکردنی کە لە ئەوەڵەوە باسمان کرد، وە فەرمویانە: حەدیسەکەی عوقبە ئەوەی تێدایە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إنه لاينبغي هذا للمتقين)[3].

واتە: بەڕاستی ئەوە شیاو نی‌یە بۆ خواپەرەستان.

جا ئەگەر لەبەرکردنی گونجاو نەبێ بۆ لەخواترسان ئەوە زیاتر شایستەی حەرامی‌یە. وە دەربارەی حەدیسەکەی میسوەر و ئەنەس ووتویانە: ئەوانە وەك کردەوەن بەرەنگاری ئەو قسانە ناکات کە بەڵگەن لەسەر حەرامی.

هەرچەندە پێغەمبەر ﷺ حەریری لەبەرئەکرد بەڵام لە دواییدا حەرام کراوە وەك لە حەدیسەکەی جابیردا هەستی پێ ئەکرێت کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ کەوایەکی دیباج کە بە دیاری بۆی هاتبو لەبەرکردبوو پاشان ئەوەندەی پێ نەچوو لەبەری داکەند وناردی بۆ عومەری کوڕی خەطاب ﷺ پێیان ووت: بۆچی ئەوەندەت پێ نەچوو کە لەبەرت داکەند؟. فەرموی: جوبرائیل علیه السلام نەیهێشت. عومەر بە گریان هات بۆ لای و ووتی: ئەی نێرراوی خوا، خۆت ڕقت لە شتێك بوو کەچی ناردت بۆ من؟ ئەویش فەرمووی: بۆم نەناردوی لەبەری بکەی بەڵکو بۆم ناردی کە

---

(١) البخاري (٥٨٦٢)ومسلم (١٠٥٨).

(٢) أبوداود (٤٠٤٧).

(٣) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

بیفرۆشیت. ئەویش فرۆشتی بە دووهەزار درهەم. ئەحمد ریوایەتی کردوە، هەروەها موسلیمیش وێنەی ئەمەی هێناوە[1].

هەروەها وتویانە: حەدیسەکەی ئەنەس عەلی کوڕی زەیدی کوڕی جەدعانی تێدایە کە حەدیسەکەی نابێتە بەڵگە.

وەووتویانە: ئەوەی صەحابەکان لەبەریان کردبوو خەز بوو کە لە خوری و ئاوریشم چنرابوو.

وەخەطابی فەرمویەتی: لەوە ئەچێ ئەو فەروەیە کەنارەکانی بە سوندوس داگیرابێتەوە.

**ڕای شەوکانی:**

شەوکانی فەرمویەتی: حەدیسەکانی قەدەغە کردنی کەراهەت و ناپەسەندی ئەگەیەنن، لەبەر کۆ کردنەوەو یەکخستن لە نێوان ئەمان و بەڵگەکانی دروستێتیدا.

لە (نیل الأوطار) دا فەرمویەتی: ئەتوانرێت بوترێت لەبەرکردنی کەوای دیباج لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ وە دابەش کردنی (أقبیة) جبەکان بەسەر صەحابەکانی دا، شتێکی وای تێدا نی‌یە کە بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی پێش حەدیسەکانی قەدەغەکردن بکەوێت، هەروەها ئەوەشی تێدا نی‌یە کە دوای ئەوان بکەوێت، کەواتە ئەوە ئەگەیەنێت کە قەدەغە کردنەکە بۆ کەراهەت بێت، وە بەمەش بەڵگەکان کۆ ئەبنەوە.

وە لە بە هێز کەرەکانی ئەوە ئەوەیە کە لە پێشەوە باس کرا کە بیست صەحابی لەبەریان کردووە، وە زۆر دورە صەحابی شتێك بکات کە لە یاسای ئیسلامدا حەرام بێت، وە زۆر دوریشە صەحابەکانی تر بێ دەنگ بوەستن بەرامبەر ئەو کارەی کە بزانن حەرام کراوە، چونکە شتی تر هەبووە کە سوکەڵتر بووە لەوەو ئینکاریان لێ کردووە.

**ڕەوایی حەریر بۆ ئافرەت ولەبەرکردنی لەلایان پیاوەوە ئەگەر کەم بێ کاتێ بەهانەی هەبێ:**

ئەو حوکمەی پێشەوە بۆ پیاوان بوو، بەڵام بۆ ئافرەتان ڕەوایە لەبەرکردنی حەریر و ڕاخستنی، هەروەها بۆ پیاویش ڕەوایە لەکاتی بوونی (عذر) بەهانەدا، و لەوبارەیەوە ئەم دەقانەی خوارەوە هاتووە:

١- لە عەلی‌یەوە هاتوە کە فەرمویەتی: لیباسێکی خەتدار لە ئاوریشم بە دیاری هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەویش ناردی بۆ من و لەبەرم کرد. سەیرم کرد توڕەیی لەناوچاوانیدا دیار بوو

(١) أحمد (٢/٢٠و١٤٦).

ئینجا فەرمووی: من بۆم نەناردی لەبەری بکەی بەڵکو بۆ ئەوەی پارچە پارچەی بکەی و بیکەی بە لەچکە بۆ ئافرەتان. بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە[1].

٢- لە ئەنەسەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕێی دابوو بە عبدالرحمن ی کوڕی عەوف وزوبەیر حەریر لەبەربکەن لەبەر ئەوەی لەشیان خورووی هەبوو. بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە[2].

لە (الحجة البالغة)دا ووتویەتی: چونکە ئەوکاتە مەبەست پێی بۆ ڕابواردن نەبووە بەڵکو بۆ شیفا بووە.

٣- لە عومەرەوە رضي الله عنه کە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی لەبەرکردنی حەریری کردبوو جگە لە شوێنی دوو پەنجە یا سێ پەنجە یا چوار پەنجە (واتە ئەگەر کەم بێ دروستە). موسلیم و خاوەن سونەنەکان گێڕاویانەتەوە[3].

لە (الحجه البالغه)دا ووتویەتی: چونکە لەم شێوەیەدا لەبەشی لیباسەو لەبەر پێویستی‌یە.

**حەریرێك کە شتی تری تێکەڵ بوبێت:**

ئەوەی لەپێشەوە باس کرا تایبەت بوو بە حەریری پوختەوە، بەڵام حەریری تێکەڵ لای شافیعی‌یەکان ئەو کراسەی بەشی زۆری حەریر بێت حەرامە، بەڵام ئەگەر نیوە یا کەمتری حەریر بوو لەبەرکردنی حەرام نی‌یە، چونکە ئەمان ڕایان وایە بەشی زۆری حوکمی هەمووی وەرئەگرێت.

ئیمامی نەوەوی فەرمویەتی: ئەو قوماشەی تێکەڵە لە حەریر وشتی تر حەرام نی‌یە مەگەر کێشی حەریرەکەی زۆرتر بێت.

**دروستە بۆ منداڵ حەریر لەبەر بکات:**

بەڵام منداڵان بە تایبەتی نێرینەکان حەرامە حەریر لەبەر بکەن لای بەشی زۆری زانایان لەبەر گشتێتی قەدەغە بوونەکە[4].

بەڵام شافیعی‌یەکان ڕێیان پێ داوە.

---

(١) البخاري (٢٦١٤و٥٣٦٦) ومسلم (٢٠٧١).

(٢) البخاري (٥٨٣٩) ومسلم (٢٠٧٦).

(٣) البخاري (٥٨٢٧) ومسلم (٢٠٦٩).

(٤) حەرامی‌یەکە ئەگەڕێتە سەر بە خێو کەری منداڵەکە نەك منداڵەکە خۆی، چونکە ئەوان هیچیان لەسەر نی‌یە.

ئەوەی ووتویەتی: هاوەڵانمان ووتویانە: دروستە خشڵ وحەریر پۆشین بۆ منداڵان لە ڕۆژانی جەژندا چونکە تەکلیفیان لەسەر نییە، وە لە دروستی پۆشینیان لە ڕۆژانی تردا سێ ڕوو هەیە، ڕاست ترینیان دروستی‌یەتی‌یە، دووەم ڕوو حەرامە. سێیەم ڕوو دوای تەمەنی (تمییز) جیاکردنەوە حەرام ئەبێت.

## لە پەنجە کردنی ئەنگوستیلەی زێڕو زیو (التختم بالذهب والفضة)

جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چون کە حەرامە لە پەنجە کردنی زێڕ بۆ پیاوان جگە لە ژنان، بەڵگەشیان ئەم فەرمودانەی لای خوارەوەیە:

١- لە بەرائی کوڕی عازیبەوە ﷺ کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردنی حەوت شتی پێ داین و حەوت شتی تری لێ قەدەغە کردین:

فەرمانی پێ داوین کە شوێن جەنازە بکەوین، وە سەر لە نەخۆش بدەین، وە وەڵامی ئەوکەسە بدەینەوە کە بانگمان ئەکات بۆ نان خواردن، وە یارمەتی ستەم لێ کراو بدەین، وە قەسەم بەری بکەین (واتە: بەجێی بێنین)، وە وەڵامی سڵاو بدەینەوە.

وەلە ڕیوایەتێکی تردا: سڵاوکردن بڵاو بکەینەوەو دوعا بۆ ئەو کەسە بکەین کە ئەپژمێ، وە قەدەغەی کردبوو لەسەرمان قاپ وقاجاخی زیومان هەبێت و زێڕ لە پەنجە بکەین و حەریر و دیباج[1] و (قسي[2]) و ئیستەبرەق[3] بپۆشین و سەرزینی حەریر بە کار بهێنین[4].

٢- وە لە عبدالله ی کوڕی عومەرەوە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ ئەنگوستیلەیەکی زێڕ یا زیوی کردبووە پەنجەی وسەرەکەی لە ژێرەوە دائەنا و ووتەی (محمد رسول الله) ی لێ هەڵکەندبوو. خەڵکەکەش چاویان لێ کرد، کاتێ ئەوەی بینی فڕێی داو فەرمووی: ئیتر هەرگیز لە پەنجەی ناکەم. پاشان ئەنگوستیلەیەکی زیوی لە پەنجە کرد، ئیتر خەڵکەکەش چاویان لێ کردو ئەنگوستیلەی

(١) دیباج: ئەو پۆشاکەیە کە ڕویەکەی و بەرەکەی حەریرە.

(٢) (قسي) پۆشاکێکە لە کەتان و حەریر تێکەڵە.

(٣) ئیستەبرەق هەر دیباجە بەڵام ئەستورە.

(٤) البخاري (٦٢٢٢) ومسلم (٣/٢٠٦٦).

زیویان لەدەست کرد[1]، ئیبنوعومەر ئەفەرموێت: دوای پێغەمبەر ﷺ ئەبوبەکر لە پەنجەی کرد، دوای ئەو عومەر، لەپاشاندا عثمان هەتا لە دەستی کەوتە ناو بیری ئەریسەوە[2].

٣- پێغەمبەر ﷺ ئەنگوستیلەیەکی زێڕی لەدەستی پیاوێکدا بینی، دای کەندو فڕێی داو فەرمووی: (یعمد أحدکم إلی جمرة من نار فیطرحها في یده).

واتە: کەسێکتان پەلاماری پشکۆ ئاگرێك ئەدات و ئەیکاتە دەستیەوە.

جا دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت بە پیاوەکەیان ووت: ئەنگوستیلەکەت هەڵگرەوەو سودی لێ وەربگرە. ووتی: نە بە خوا لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فڕێی داوە هەڵی ناگرمەوە. رواه مسلم[3].

٤- لە ئەبوموساوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أُحلَّ الذهب والحرير للإناث من أمتي وحرم علي ذکورها). رواه أحمد والنسائي والترمذي وصححه[4].

واتە: زێڕو حەریر بۆ ئافرەتانی ئۆمەتم حەڵاڵە و لەسەر نێرینەکانیان حەرامە.

ئەهلی حەدیس ووتویانە: ئەم حەدیسە مەعلولە چونکە لە سەنەدەکەیدا سەعیدی کوڕی ئەبوهیند لە ئەبوموساوە گێڕاویەتیەوە، وە سەعید نەگەیشتووە بە ئەبوموساو لێی نەبیستووە.

٥- موسلیم وکەسانی تر تەخریجیان کردوە لە حەدیسی عەلیەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ لێی قەدەغە کردبووم ئاڵتون لە دەست بکەم و (قسي) بپۆشم (قسی لە کەتان و حەریر ئەچنرێت) وە قورئان بخوێنم لەناو رکوع و کڕنوش بردندا، وە هەروەها (معصفر) جلی ڕەنگ کراو لەبەر بکەم)[5]،[6].

ئەمانە بەڵگەی جەماوەرن بۆ حەرام بونی ئەنگوستیلەی ئاڵتون.

نەوەوی فەرمویەتی: وە هەروەها ئەگەر هەندێکی زێڕ بێت و هەندێکی زیو هەر حەرامە.

---

(١) البخاري (٥٨٦٥) ومسلم (٢٠٩١/٥٣).

(٢) أحمد (٢/٢٢) ومسلم (٢٠٩١/٥٤) والنسائي (٨/١٩٢).

(٣) مسلم (٢٠٩٠).

(٤) أحمد (٤/٣٩٢) والترمذي (١٧٢٠) والنسائي (٨/١٦١).

(٥) (معصفر) ئەو پۆشاکەیە کە ڕەنگێکی سور ئەکرێت بە شێوەیەکی تایبەت.

(٦) أحمد (١/١١٤) ومسلم (٢٠٧٨) وأبوداود (٤٠٤٤) والترمذي (١٧٣٧) والنسائي (٨/١٩١).

وە کۆمەڵێك لە زانایان بۆ مەکروهی زێڕ لەدەست کردن چوون لەلایەن پیاوەوە بە کەراهەتی تەنزیهی.

وە هەندێ صەحابە لە دەستیان کردووە لەوانە: سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و گەلحەی کوڕی عبیداللە و صوهەیب و حوزەیفە و جابیری کوڕی سەمورەو بەرائی کوڕی عازیب وە لەوانەیە ئەمانە قەدەغەکەیان بە (کراهة التنزیه) دانابێت.

**قاپ و قاپاخی زێڕ و زیو:**

حەرامە خواردن و خواردنەوە لە قاپ و قاجاخی زێڕ و زیودا، لەمەدا جیاوازی لەنێوان ژن و پیاودا نی یە[1].

وە زێڕ و زیو تەنها بۆ خشڵ و ڕازاندنەوەی ئافرەتان حەڵاڵە وەك باسکرا. بەڵام خواردن و خواردنەوە لەناو ئەم قاپ و قاجاغانە لەوشتانە نین کە خوا بۆ ئافرەتانی حەڵاڵکردبێت

وە بەڵگەی ئەوەش ئەم فەرموودانەی لای خوارەوەیە:

١- لە حوزەیفەوە ﵁ کە فەرمویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە ئەی فەرموو: (لا تلبسوا الحرير ولا الديباج و لا تشربوا في آنية الذهب و الفضة، و لا تأكلوا في صحافها فإنها لهم في الدنيا ولكم في الآخرة). رواه البخاري و مسلم[2].

واتە: جل و بەرگی حەریر و دیباج مەپۆشن و لەو قاپانەدا کە بەشی پێنج کس ئەکات و لەزێڕ و زیو دروست کراوە مەخۆنەوە چونکە ئەمانە لە دونیادا بۆ ئەوانەو لە ڕۆژی دواییدا بۆ ئێمەیە.

٢- لە ئومو سەلەمەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إن الذي يشرب في آنية الفضة إنما يجرجر في بطنه نار جهنم) بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە[3].

واتە: ئەوکەسەی لە قاپی زیودا بخواتەوە ئەوە ئاگری دۆزەخ ئەکاتە ناو زگیەوە.

لە ڕیوایەتێکی موسلیم دا هاتووە: (إن الذي يأكل أو يشرب في إناء الذهب أو الفضة...)[4].

---

(١) وە هەروەها حەرامە لەو قاپ و قاجاخانەشدا کە بە زێڕ و زیو ڕوکەش کراون بە مەرجێك بتوانرێت لە یەك جیا بکرێنەوە، بەڵام ئەگەر هەر ڕوکەش بوو نەتوانرێ لێی جیا بکرێتەوە حەرام نی یە.

(٢) البخاري (٥٨٣١) ومسلم (٢٠٦٨).

(٣) البخاري (٥٦٣٣) ومسلم (٢٠٦٥).

(٤) مسلم (٢٠٦٥).

واتە: ئەوکەسەی لە قاپی زێڕ یا زیودا ئەخوات یا ئەخواتەوە.....

وە هەندێ لە زانایان ڕایان وایە خواردن و خواردنەوە لە قاپی زێڕ و زیودا کەراهەتی هەیە نەك حەرام بێت وە ووتویانە: ئەو فەرموودانەی لەو بارەیەوە هاتوون تەنها بۆ زوهدە. وە جوابی ئەوانە دراوەتەوە بەوەی لە حەدیسەکەی ئومو سەلەمەدا بە شێوەی هەڕەشە هاتووە لەسەری.

وە کۆمەڵێك لە زانایان هەموو بەکارهێنانەکانی تریش ئەخەنە پاڵی، وەك بە کارهێنانی قاپی زێڕ و زیو بۆ تێ کردنی بۆن و کل و دەرمان.

بەڵام لێ کۆڵەرەوەکان ئەوە بە ڕاست نازانن.

لە حەدیسەکەی ئەحمەد و ئەبی داوددا هاتووە:

(عليكم بالفضة فالعبوا بها لعباً)[1].

واتە: ئێوە زیو بە یاری یاری پێ بکەن.

ئەمە پاڵپشتی ئەوەیە کە لێ کۆڵەرەوەکان بۆی چوون.

وە لە (فتح العلام) دا هاتووە: ڕاستی ئەوەیە کە لە خواردن و خواردنەوە بەولاوە حەرام نی‌یە، وە ئیدعای ئیجماعی زانایان لەسەر حەرامی هەموو جۆرە بەکارهێنانێك ڕاست نی‌یە.

ئەوەش لە خراپی گۆڕینی زاراوەی پێغەمبەرە ﷺ بە شتێکی تر.

چونکە لەوێدا حەرامی خواردن و خواردنەوە هاتووە کەچی لایان داوە بۆ بەکار هێنانی ترو لە عیبارەتەکەی پێغەمبەر ﷺ وازیان هێناوەو بە زاراوەیەکی گشتی‌یان هێناوە لە خۆیانەوە.

وە جەماوەری زانایان هەڵگرتنی ئەو قاپ و قاجاخانەیان قەدەغە کردووە بێ ئەوەی بە کاریش بێت.

بەڵام کۆمەڵێکی تر ڕێیان داوە.

**قاپ و قاجاغی جگە لە زێڕ و زیو:**

بەڵام هەڵگرتنی قاپ و قاجاخێك کە لە جەواهێری گرانبەها دروست کرابێت ئەگەر لە زێڕ و زیویش بە نرخ تر بێت دروستە، چونکە بنەما لەم شتانەدا ڕەوایی‌یە. وە هیچ بەڵگە لەسەر حەرامێتی‌یان نەهاتووە.

---

(١) أحمد (٢/٣٣٤) وأبوداود (٤٢٣٦)، من حديث أبي هريرة.

**ددان و لوت دروست کردن لە زێڕ دروستە:**

دروستە ئەگەر کەسێك پێویستی بەوە بوو ددان یا لوت لە زێڕ دروست بکات بۆ خۆی، (ترمذي) لە عەرفەجەی کوڕی ئەسعەدەوە ئەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: (لە جەنگی کولاب دا لوتم بەرکەوت و قرتا منیش لوتێکی زیوم بۆ خۆم دروست کرد پاش ماوەیەك بۆگەنی لێ ئەهات، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ دام لوتێك لە زێڕ دروست بکەم)[1].

(ترمذي) فەرمویەتی: لە یەکێ زیاتر لە ئەهلی زانست گێڕاویانەتەوە کە ددانی زێڕیان بۆ خۆیان دروست کردووە.

نسائی ئەگێڕێتەوە کە موعاوی‌یە کۆمەڵێك لە موهاجیر و ئەنصاری لە دەور بوو ئەیفەرمو: ئایا ئەزانن پێغەمبەر ﷺ لەبەرکردنی حەریری قەدەغە کردبوو؟ وتیان: بەڵێ، فەرموی: وە پۆشینی زێڕی بە پارچەی بچووك نەبێت قەدەغە کردبوو؟ وتیان: بەڵێ[2].

**خۆ چواندنی ژنان بە پیاوانەوە:**

ئیسلام ویستویەتی کە سروشتی ئافرەت جیاواز بێت، وە دیمەنیشی وێنەیەکی ڕاستی ئەو سروشتە.

وەك چۆن ویستویەتی پیاویش هەر بەو شێوەیە بێت، لەبەر ئەوە قەدەغەی کردووە هیچیان خۆیان بە هیچیان بچوێنن، ئیتر ئەو خۆچواندنە بە جل و بەرگ بێت یا بە قسە کردن یا بە هەڵسوکەوت و شتی تر.

لە ئیبنوعەبباسەوە خوا لێیان ڕازی بێت کە فەرمویەتی:

پێغەمبەر ﷺ نەفرینی لاهو پیاوە ژنانی‌یانە کردووە کە خۆیان وەکو ئافرەت ئەچوێنن و لەو ئافرەتانەی کە خۆیان وەکو پیاو ئەچوێنن. بوخاری گێڕاویەتی‌یەوە[3].

وە لە ریوایەتێکی تردا کە: پێغەمبەر نەفرینی لەو پیاوانە کردوە کە خۆیان ئەچوێنن بە ئافرەتانەوە، و لەوئافرەتانەی کە خۆیان ئەچوێنن بە پیاوانەوە. بوخاری گێڕاویەتی‌یەوە[4].

---

(١) الترمذي (١٧٧٠).

(٢) النسائي (٨/١٦٣).

(٣) أحمد (١/٣٣٩). مانای ئەم فەرمودەیەش ئەوەیە کە ئەو پیاوانە بە جۆرێك ڕەفتار ئەکەن کە لە ژنا ئەچن، وە هەروەها ئەو ژنانەش بەجۆرێك هەڵسوکەوت و ڕەفتار ئەکەن کە لە پیاوان ئەچن.

(٤) أحمد (١/٢٧٧) والبخاري (٥٨٨٦و٦٨٣٤) وأبوداود (٤٠٩٧) والترمذي (٢٧٨٤) وابن ماجة (١٩٠٤).

وە لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە کە فەرمویەتی:

پێغەمبەر ﷺ نەفرینی کردووە لەو پیاوەی کە جلی ژنانە لەبەر ئەکات. وە لەوژنەی جلی پیاوان لەبەر ئەکات. ئەبوداود و نەسائی و ئیبنوماجەو ئیبنوحیببان وحاکم گێڕاویانەتەوە و حاکم وتویەتی حەدیسەکە صەحیحە لەسەر مەرجی موسلیم[1].

جل و بەرگی شوهرەت:

ئەو جل وبەرگەیە کە ئەوکەسەی ئەیپۆشێت ناوبانگ دەرئەکات لەناو خەڵکدا وە هەموو ئەو شتانەی کە بۆ ناوبانگ لەبەر ئەکرێن ئەگرێتەوەو حەرامیشن.

١- بەپێی حەدیسەکەی ئیبنوعومەر کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووویەتی: (من لبس ثوب شهرة في الدنيا ألبسه الله ثوب مذلة يوم القيامة) أخرجه أحمد وأبوداود والنسائي وابن ماجه[2].

واتە: هەرکەس لە دونیادا جلوبەرگی ناوبانگ لەبەر بکات لە ڕۆژی دواییدا خوا پۆشاکی سەرشۆڕی بۆ لەبەر ئەکات.

٢- وە هەر لەوەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا ينظر الله إلي من جرَّ ثوبه خيلاء) رواه البخاري ومسلم[3].

واتە: خوا سەیری ئەو کەسە ناکات کە بە فیزەوە لیباس و پۆشاکی ڕاکێشێ بە زەویدا و درێژی دەکات.

٣- لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە کە فەرمویەتی:

پێغەمبەر ﷺ فەرمووویەتی: (کل واشرب والبس وتصدق في غير سرف ولا مخيلة) أخرجه أبوداود وأحمد وذكره البخاري تعليقاً[4].

واتە: بخۆ و بخۆرەوە و بپۆشە و خێر بکە بێ زیادڕەوی و فیزکردن.

---

(١) أحمد (٢/٣٢٥) وأبوداود (٤٠٩٨).

(٢) أحمد (٢/١٣٩) وأبوداود (٤٠٢٩) وابن ماجه (٣٦٠٧).

(٣) أبوداود (٤٠٩٥) والنسائي (٢/٢٠٨) وابن ماجه (٣٥٧٦).

(٤) أحمد (٢/١٨٢) والبخاري تعليقاً (١٠/٢٥٢) وابن أبي الدنيا في (كتاب الشكر برقم٥١).

قەدەغەیە ئافرەت قژی یەکێکی تر ببەستێ بە قژی‌یەوە:

١- لە ئەبوهورەیرەوە هاتووە کە ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ووتی: ئەی نێرراوی خوا، کچێکم هەیە ئەبرێ بە بووکی و بە هۆی نەخۆشی سورێژەوە قژی بە سەرەوە نەماوە، ئایا قژی تر ببەستم بەسەریەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لعن الله الواصلة والمستوصلة والواشمة والمستوشمة)[1].

واتە: نەفرینی خوا لەو ژنەی قژی تر ئەبەستێت بەسەرێیەوە و نەفرینی خوا لەوژنەی کە داوای بستنی قژی ئافرەتی تر ئەکات بە قژی خۆیەوە، و نەفرینی خوا لە خاڵ کوت و خاڵ بۆ کوتراو.

٢- لە عبدالله ی کوڕی مەسعودەوە ﷺ هاتووە کە فەرمویەتی: (لعن الله الواشمات والمستوشمات والنامصات والمتنمصات والمتفلجات للحسن المتغيرات خلق الله)[2].

واتە: نەفرینی خوا لە خاڵ کوت و خاڵ بۆکوتراو، وە لە دەم و چاو هەڵگر و دەم و چاو بۆهەڵگیراو، ئەوانەی بۆ جوانی دانیان شاش ئەکەن بە هەڵکەندن یا باریکیان ئەکەنەوەو شێوەی دروست کراوەکانی خوا ئەگۆڕن.

ئەم قسەیە گەیشتە ئافرەتێکی بەنی ئوسەید کە قورئان خوێن بوو پێیان ئەووت ئوم یەعقوب، هاتە لای عبدالله و لەو بارەیەوە قسەی لەگەڵ کرد، عبدالله فەرموی: چۆن نەفرین نەکەم لە کەسێك پێغەمبەر ﷺ نەفرینی لێ کردبێت وە لە قورئانیشدا هەبێت.

ژنەکە ووتی: من نێوان دو دەفەی قورئانم خوێندۆتەوە نەم بینیوە شتی وا، عبدالله ووتی: ئەگەر بت خوێندایەوە ئەتبینی کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وما آتاكم الرسول فخذوه وما نهاكم عنه فانتهوا﴾ رواه الخمسة إلا الترمذي.

واتە: هەرچی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کردن بیکەن و هەرچی لێی قەدەغە کردن وازی لێ بهێنن.

٣- وە هەر لە ئیبنومەسعودەوە کە فەرمویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە دەم و چاو هەڵگرتن و ددان باریك کردن و بارۆکە لەسەر کردن (واتە قژی دەستکرد کە بە شێوەی کڵاو دەری دێنن)و خاڵ کوتاندنی قەدەغە ئەکرد بۆ ئەو کەسانە نەبێت لەبەر نەخۆشی ئەیان کرد.

---

(١) البخاري (٥٩٤١) ومسلم (١١٥/٢١٢٢) من حديث أسماء.

(٢) البخاري (٥٩٤٨) ومسلم (١٢٠/٢١٢٥).

وە لە (نيل الأوطار)دا فەرمويەتی: باڕۆکە لەسەرکردن حەرامە چونکە نەفرین بۆ کارێك نابێت کە حەرام نەبێت. نەوەوی فەرمویەتی: ئەوە ئاشکراو هەڵبژاردەیە، ووتویەتی: هاوەڵەکانی ئێمە بە درێژی باسیان کردووە و ووتویانە: ئەگەر باڕۆکەیەکی قژی ئادەمیزاد لەسەر بکات ئەوە حەرامە بێ جیاوازی.

ئیتر قژەکە قژی پیاو بێت یا ژن وەك یەکە قژی مەحرەم بێت یا قژی ژن و مێردو جگە لەوان هەر حەرامە بێ جیاوازی لەبەر گشتێتی بەڵگەکان، وە لەبەر ئەوەی حەرامە کەڵك وەرگرتن لە قژو ئەندامەکانی لەشی ئادەمیزاد لەبەر ڕێزیان، بەڵکو قژو نینۆك و هەموو بەشەکانی تری ئەبێ بنێژرێت.

جا ئەگەر کەسێك باڕۆکەیەکی لە موی مردارەوەبوی کردە سەر ئەوە حەرامە چونکە قژی مردارەوەبوە، وە هەروەها موی ئەوانەی گۆشتیان ناخورێت و بە زیندویی لێیان بکرێتەوە بەپێی حەدیسەکەی پێشوو، وە لەبەر ئەوەی شتی پیس بە قەستی هەڵئەگرێت لە نوێژەکانیدا و لە غەیری نوێژدا.

جا لەو دوو شێوەیەدا ژنی مێردار یا بێ مێرد بێت یا پیاو وەك یەك وایە.

بەڵام ئەگەر مووی پاکی غەیری ئادەمیزاد لەسەر بکات ئەوە ئەگەر ئەوکەسە مێردی نەبێت یا بەندە بێ‌و گەورەی نەبێت دیسان حەرامە، وە ئەگەر ئەوانەی هەبوو واتە: ئافرەتی مێردار یا بەندەی ساحێبدار بوو سێ ڕووی هەیە: یەکەمیان دروست نی‌یە لەبەر ڕواڵەتی فەرموودەکە. دووەم: دروستە، وە ڕاسترینیان ئەگەر بە پرسی مێرد یا گەورە کرابێت دروستە ئەگینا حەرامە.

بەڵام باڕۆکەی مووی غەیری ئادەمیزاد وەك حەریر و خوری و کەتان و ئەو جۆرە شتانە. سەعیدی کوڕی جوبەیر و ئەحمەد و لەیس ڕێیان پێ داوە.

(قاضي عياض) فەرمویەتی: بەستنی داوی حەریری ڕەنگاوڕەنگ و جۆرەکانی ئەوانەی لە قژ ناچن قەدەغە نین، چونکە قژ بەستن نی‌یە، وە ئەو مەبەستەش ناگەیەنێت بەڵکو بۆ جوانی‌یە.

وەك چۆن بەستنی قژی تر حەرامە، بەوشێوەیەی لە پێشەوە باس کرا؛ هەروەهاش حەرامە لێ کردنەوەی مووی ئافرەتان واتە موی دەموچاوو هەڵکەندنیان مەگەر ئافرەتەکە ڕیشی لێ بروێت یا سمێڵ ئەو کاتە حەرام نی‌یە لێ کردنەوەی بەڵکو پەسەندیشە، وەك ئیمام نەوەوی و کەسانی تر باسیان کردووە.

وە دان شاش کردن کە بە عەرەبی (الوشر) ی پێ ئەوترێت نەوەوی فەرمویەتی: ئەم کارە حەرامە لەسەر بکەرو بۆکراو.

له (نيل الأوطار) دا فەرمویەتی: له ڕواڵەتدا ئەو حەرامی‌یەی که باس کراوه بۆ ئەوانەیە بۆ جوانی ئەو کاره ئەکەن نەك لەبەر نەخۆشی و عیللەت، ئەگینا حەرام نی‌یە.

وه ڕواڵەتی زاهیری فەرمودەی (المغيرات خلق الله) مانای ئەوەیە دروست نی‌یە هیچ شێوەیەك لەو شێوانه بگۆڕرێت که خوا دروستی کردووه.

ئەبوجەعفەری (طبري) فەرمویەتی: ئەم حەدیسه بەڵگەیه لەسەر ئەوەی دروست نی‌یه هیچ لەو شێوانه بگۆڕرێت که خوا بۆ ئافرەتی دروست کردووه به زیادەوه یا به کەم بۆ جوانی بێت لەبەر مێرد یا جگه لەو.

جا ئەگەر دانێکی زیادەی بوو یا ئەندامێکی زیاده، دروست نی‌یه لای بات به هەڵکەندن یا بڕین لەبەر ئەوەی ئەو شێوەیه ئەگۆڕێت که خوا دروستی کردووه.

وه هەر بەو شێوەیەیه ئەگەر دانی درێژی هەبوو ویستی سەرەکانی کورت بکاتەوه.

(قاضي عياض) بەو شێوەیەی وتووه وه ئەوەشی ووتووه: مەگەر ئەو زیادانه ئازاریان هەبێت و زیان بگەیەنن ئەوکاته قەیناکه هەڵکەندنیان یا بڕینیان.

## وێنەکردن (التصوير)

**حەرامی وێنەکێشان و دروست کردنی پەیکەر:**

فەرمودەی صەحیح و ئاشکرا هاتوون دەربارەی قەدەغەیی دروست کردنی پەیکەرو وێنەکردنی ئەو شتانەی گیانیان تێدایه وێنه و هەیکەلی ئادەمیزاد بێت یا ئاژەڵ بێت یا باڵندە.

بەڵام ئەوانەی گیانیان تێدا نی‌یه وەك دار و درەخت و گوڵ و شێوەکانی، دروسته وێنەکردنیان.

١- له ئیبنوعەبباسەوه هاتووه که فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووێتی: (من صور صورة في الدنيا كلف يوم القيامة أن ينفخ فيها الروح و ليس بنافخ) أخرجه البخاري[1].

واته: هەرکەس وێنەی گیان لەبەرێك بکات له دونیادا ڕۆژی دوایی خوا زۆری لیْ ئەکات گیانی بکات به بەردا و بۆشی ناکرێت.

٢- له پێغەمبەرەوه ﷺ که فەرمویەتی: (إن من أشد الناس عذاباً يوم القيامة الذين يصورون هذه الصور)[2].

---

(١) البخاري (٥٩٦٣) ومسلم (٢١١٠).

(٢) البخاري (٥٩٥٧) و (٥٩٦١) ومسلم (٢١٠٥).

واتە: ئەوکەسانەی لە هەموو کەس زیاتر سزای توند ئەدرێن ڕۆژی دوایی ئەوانەن کە ئەم وێنانە دروست ئەکەن.

٣- موسلیم گێڕاویەتی‌یەوە کە پیاوێك هاتە لای ئیبنوعەبباس و ووتی: من ئەم وێنانە ئەکێشم ئەیان ڕازێنمەوە، ئەویش پێی فەرمو: لێم نزیك بەرەوە، ئەویش لیی نزیك بووەوە پاشان فەرمووی: دەی لێم نزیك بەرەوە، ئەویش تەواو لیی نزیك بووەوە، دەستی خستە سەر سەری و فەرمووی: ئاگادارت بکەم چیم بیستووە، خۆم لە پێغەمبەرم ﷺ بیستوە کە ئەیفەرموو: (كل مصور في النار يجعل له بكل صورة صورها نفساً فتعذبه في جهنم)[1].

واتە: هەرچی وێنەکێشە لە ئاگردایە هەر وێنەیەك ئەکێشێ ئەکرێ بە گیانێك ئازاری ئەدا لە دۆزەخدا.

وە فەرمووی: ئەگەر هەر وێنەش ئەکێشی وێنەی دارو درەخت و ئەوانە بکێشە کە بێ‌گیانن.

٤- لە عەلی‌یەوە ﷺ هاتوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ جارێك لەگەڵ جەنازەیەکدا بور فەرمووی: کێ لە ئێوە ئەڕوات بۆ مەدینە بتی تێدا ناهێڵێ هەمووی نەشکێنێ و گۆڕی تێدا نەهێڵێ تەختی نەکات و وێنەی تێدا نەهێڵێ کە بە قوڕ دای نەپۆشی وپیسی نەکات؟ پیاوێك ووتی: من ئەچم ئەی نێرراوی خوا، ئەڵێ: خەڵکی مەدینە ترسان و کابرا ڕۆیی لە پاشاندا گەڕایەوە ووتی: ئەی نێرراوی خوا بتم تێدا نەهێشتووە هەمووم شکاندووە و قەبرم نەهێشتۆتەوە تەختم نەکردبێت و وێنەم نەهێشتووە پیسم نەکردبێت. پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من عاد إلى صنعة شئ من هذا فقد كفر بما أنزل على محمد). رواه احمد بإسناد حسن[2].

واتە: هەرکەس دوبارە ئەوانە بکاتەوە ئەوە کافر بوە بەوەی بۆ سەر محمد هاتۆتە خوارەوە.

**ڕەوایی وێنەی یاری منداڵان:**

یاری منداڵان وەك بوکە شیشە و ئەو جۆرانە لەوانە جیا ئەکرێتەوە چونکە دروست کردنیان و فرۆشتنیان دروستە بەپێی ئەم فەرموودانەی لای خوارەوە:

---

(١) البخاري (٢٢٢٥) ومسلم (٢١١٠).

(٢) أحمد (١/٨٧).

١- لە عائیشەوە هاتووە کە فەرموویەتی: یاریم ئەکرد بە بوکە شیشە لەگەڵ کۆمەڵێك کیژۆڵەدا کە هاتبوون بۆ لام کاتێ پێغەمبەر ﷺ ئەهاتەوە ئەوان ئەچوونە دەرەوە وە کاتێ ئەو ئەچووە دەرەوە ئەهاتنەوە. بوخاری و ئەبوداود گێڕاویانەتەوە[١].

٢- هەر لە عائیشەوە ئەفەرمووێ: کە پێغەمبەر ﷺ لە غەزای تەبوك یا خەیبەر، ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵێ و بەسەر ڕەفەکەیانەوە پەردەیەك ئەبێت با هەڵی ئەکات و بوکەکانی عائیشە دەرئەخات، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: ئەمانە چین ئەی عائیشە؟ ئەویش ئەڵێت: بوکەکانمە. وە لە نێوانیاندا ئەسبێکی باڵدار ئەبینێ بە پارچە پەڕۆ دروست کراوە، ئەفەرموێ: ئەوە چیە لەناوەڕاستیاندا؟ ئەویش ئەڵێت: ئەسپە، ئەفەرموێت: ئەوە چیە بەسەر پشتیەوە؟ ئەڵێت: باڵن، ئەفەرموێت: ئەسپو باڵی هەبێت؟ ئەڵێت: ئەی نەت بیستووە سولەیمان (عليه السلام) ئەسپی هەبووە باڵدار بوون، ئەڵێت: پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بە پێکەنین هەتا دانەکانی دەرکەوت. ئەبوداود و نەسائی گێڕاویانەتەوە[٢].

**قەدەغەیی دانانی وێنە لەناو ماڵدا:**

وەك چۆن حەرامە دروست کردنی پەیکەرو کێشانی وێنە حەرامیشە بوونی لە ماڵدا و دانانی وە پێویستە بشکێنرێت هەتا بە شێوەی پەیکەر نەمێنێتەوە.

١- بوخاری گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەر ﷺ هیچ شتێکی لە ماڵەکەیدا نەهێشتۆتەوە وێنەی خاچی پێوە بووبێت لیێ ئەکردبێتەوە[٣].

٢- وە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(إن الملائكة لا تدخل بيتاً فيه تماثيل). رواه البخاري ومسلم[٤].

واتە: فریشتە ناچێتە ماڵێك پەیکەری تێدا بێت.

(١) البخاري (٦١٣٠) ومسلم (٢٤٤٠).

(٢) أبوداود (٤٩٣٢).

(٣) البخاري )٥٩٥٢).

(٤) البخاري (٥٩٥٨) ومسلم (٢١٠٦/٨٥).

**ئەو وێنانەی سێبەریان نی یە (غیر مجسم):**

هەموو ئەوەی باس کرا تایبەتە بەو وێنانەوە کە سێبەریان هەیە، بەڵام ئەو وێنانەی سێبەریان نی یە وەك وێنەی کێشراو لەسەر دیوار و کاغەز وە ئەو وێنانەی لەسەر قوماش و پەردەدا هەن و وێنەی بە کامێرا گیراو ئەمانە هەمووی دروستن.

ئەمانەش لەسەرەتاوە قەدەغە بوون لەپاشاندا ڕێیان پێ درا. وە ئەوەی بەڵگەیە لەسەر قەدەغە بوونی ئەوەیە عائیشە ڕەزای خوای لێ بێت باسی کردووەو فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ هاتەوە ماڵەوە تاقێکمان هەبوو بە پەردەیەکی تەنك کە وێنەی تێدا بوو داپۆشیبو، کاتێ پەردە وێناوی یەکەی بینی دڕاندی و سور هەڵگەڕاو فەرمووی: ئەی عائیشە: (أشد الناس عذاباً عند الله يوم القيامة الذين يضاهون بخلق الله)[1].

واتە: کەسانێك کە توندترین سزایان هەیە لە ڕۆژی دوایی دا ئەوانەن وەك دروست کراوەکانی خوا دروست ئەکەن.

عائیشە ئەفەرموێت: پارچە پارچەمان کردو پشتی یەك یا دوو پشتیمان لێ دروست کرد.

وە ئەوەی بەڵگەیە لەسەر ڕێ پێ دانی، ئەوەیە کە بوسری کوڕی سەعید گێڕاویەتی یەوە لە زەیدی کوڕی خالیدەوە:

١- لە ئەبی طەلحەوە هاتوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرمویەتی: فریشتەکان ناچنە ماڵێك وێنەی تێدا بێت.

بوسر ئەڵێت: پاش ماوەیەك زەید نەخۆش کەوت ئێمەش چووین بۆ سەردانی سەیرمان کرد بە سەر دەرگاکەیانەوە پەردەیەك هەبوو وێنەی تێدا بوو منیش بە عبیداللە ی پەروەردەکراوی مەیمونەی خێزانی پێغەمبەرم ﷺ ووت: مەگەر زەید چی ووت دەربارەی وێنە ئەو ڕۆژە؟ عبیداللە ووتی: ئەی گوێت لێ نەبوو کاتێ گێڕایەوە ووتی: جگە لەوانەی کێشراون لەسەر قوماش. (رواه الخمسة)[2].

---

(١) البخاري (٥٩٥٤) ومسلم (٢١٠٥).

(٢) مسلم (٢١٠٦/٨٧و٢١٠٧) وأبوداود (٤١٥٤).

٢- لە عائیشەوە هاتوە کە فەرمویەتی: پەردەیەکمان هەبوو وێنەی باڵندەی تێدا بوو ئەگەر کەسێك بهاتایە ژورەوە بەرەو ڕوی بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (حولي هذا، فإني كلما دخلت فرأيته ذكرت الدنيا) رواه مسلم[1].

واتە: ئەوە لەوێدا لابە ببە بۆ لایەکی تر چونکە هەرکاتێ دێمە ژورەوەو چاوم پێی ئەکەوێ بیری دونیام ئەکەوێتەوە.

جا ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەیە کە ئەوە حەرام نییە چونکە ئەگەر حەرام بوایە لەدوا کاتدا فەرمانی ئەدا بە دڕاندنی، وە ڕازی نەئەبو بە گۆڕینی شوێنەکەی بە تەنها.

لەپاشاندا باسی هۆی گۆڕینی شوێنەکەی کردووە کە بیر کەوتنەوەی دونیایە

وە (طحاوي) کە یەکێکە لە پێشەوا حەنەفییەکان پشتگیری ئەوەی کردووە. ووتویەتی: یاسادانەر بۆیە یەکەم جار هەموو وێنەیەکی حەرام کردووە با وێنەی کێشراویش بێت لەسەر قوماش یا کاغەز و شتی تر، چونکە تازە باوەڕ بوون و نزیك بون لە پەرستنی پەیکەرو وێنەوە لەبەر ئەوە هەموو شێوەیەکی وێنەی حەرام کردبوو، دوای ئەوە کاتێك بڕیاری قەدەغەیی ئەوانە جێگیر بوو ڕێی دا بەوانەی کە کێشرابوون لە قوماشدا بۆ پێویستی و کردنیان بە جلوبەرگ، هەروەها ئەوەی بە سوك سەیر بکرێت بە ڕەوای دانا، لەبەر ئەوەی دڵنیا بوو لێیان کە ئەو شتەی بە سووك دائەنرێت بە گەورەی نازانن. بەڵام قەدەغە بوونەکە ئەمێنێتەوە لەسەر ئەوانەی بە سوك دانانرێن.

ئیبنوحەزم فەرمویەتی: دروستە بۆ منداڵان بە تایبەتی یاری بە وێنە بکەن بەڵام بۆ جگە لە منداڵان حەڵاڵ نییە. وە وێنە حەرامە جگە لەمەو ئەوانەی لە قوماشدا کێشراون. لە پاشاندا باسی حەدیسەکەی زەیدی کوڕی خالیدی کردووە لە ئەبوطەلحەی ئەنصارییەوە.

## پێشبڕکێ (المسابقة)

**ڕەوابونی:**

پێشبڕکێ کردن مەشروعە لە ئیسلامدا و لە وەرزشە باشەکانە وە جاری وایە پەسەندیش ئەبێت یا ڕەوا ئەبێت بەپێی نیاز و مەبەست.

پێشبڕکێ بە ڕاکردن لە نێوان چەند کەسێك دا ئەبێت وەك چۆن بە تیر وچەك وئەسپ هێستر وگوێ درێژیش ئەکرێت.

---

(١) أحمد (٦/٤٩و٥٣) ومسلم (٢١٠٧/٨٨و٩٠).

وە لەبارەی پێشبڕکێ بە ڕاکردن لە نێوان چەند کەسێکا سابتە کە عائیشە خوای لێ رازی بێت فەرمویەتی: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ پێش بڕکێم کردووە وپێشم داوەتەوە بەڵام کاتێ گۆشتم زۆر گرت پێش بڕکێم لەگەڵدا کرد پێشی دامەوە. منیش ووتم: ئەم پێش کەوتنەوەی ئەم جارەت بەو پێش کەوتنەوەی ئەو جارەی من. بوخاری گێڕاویەتیەوە[1].

پێشبڕکێ کردن بە تیر وڕم وهەموو جۆرە چەکێك کە ئەتوانرێت تەقەی پێ بکرێت دروستە، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ ومِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ﴾ (الأنفال/٦٠).

واتە: چەندە ئەتوانن لە هێز و وڵاغ وئەسپ بۆیان ئامادە بکەن.

١- لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە هاتوە کە فەرمویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە لەسەر دوانگە (مینبەر) ئەو ئایەتەی ئەخوێندەوەو ئەی فەرموو: ئاگادار بن (القوة) تیر هاویشتنە، سێ جار دوپاتی کردۆتەوە. موسلیم ریوایەتی کردوە[2].

٢- هەروەها فەرمویەتی: (عليكم بالرمي فإنه خيرُ لَهوكُم) رواه البزار والطبراني بإسناد صحيح[3].

واتە: خۆتان لەسەر تیر هاویشتن ڕابهێنن چونکە چاکترین ڕابواردنە بۆ ئێوە.

٣- وە هەروەها فەرموویەتی: (كل لَعب حرام إلا ثلاثة: ملاعبة الرجل أهله، ورميه عن قوسه، وتأديبه فرسه).

واتە: هەموو یاری‌یەك حەرامە سێ یاری نەبێت: یاری کردنی پیاو لە گەڵ خێزانەکەی، و تیرهاویشتن بە کەوانەکەی، و ڕاهێنانی ئەسپەکەی.

وە حەرامە کاتی نیشان گرتن نیشانی شتێك بگیرێت کە گیانی تێدا بێت.

عبداللە ی کوڕی عومەر کۆمەڵێکی بینی مریشکیان ناوەتەوە بە نیشانە وتیری تێ ئەگرن. پێی فەرمون: پێغەمبەر ﷺ نەفرینی لەو کەسانە کردووە کە گیان لەبەر ئەکەنە نیشانە، بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە[4].

وە پێشبڕکێ لەنێوان گیاندارانیدا بە فەرموودە سابتە.

---

(١) أحمد (٦/٢٦٤) وأبوداود (٢٥٧٨) والترمذي (١٧٨٥).

(٢) مسلم (١٩١٧).

(٣) البزار كما في كشف الأستار (١٧٠١) ومجمع الزوائد (٥/٢٦٨).

(٤) مجمع الزوائد (٥/٢٦٩).

١- لە ئەبوهورەیرەوە هاتوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لاسبق إلا في خف أو نصل أو حافر). رواه أحمد والثلاثة وصححه ابن حبان[١].

واتە: پێشبڕکێ بۆ ووشتر وئەسپ وتیر هاویشتن نەبێت نابێت.

٢- لە ئیبنوعومەرەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ بە ئەسپە دابەستەکەی پێشبڕکێی کردووە لە حەفیاوە هەتا (پنیە الوداع)، هەروەها پێشبڕکێی کردوە لەنێوان ئەو ئەسپانەی کە دانەبەسترابوون لە (ثنیة)وە هەتا مزگەوتەکەی بەنی زورەیق، وە ئیبنوعومەریش لەناویاندا بووە.

بوخاری ئەوەی زیاد کردووە: سوفیان ووتویەتی: لە حەفیاوە بۆ ثنیەی وەداع پێنج میلە یا شەش میل، وەلە ثنیەوە هەتا مزگەوتەکەی بەنی زورەیق میلێکە[٢].

دروستی گرەو کردن:

پێش برکێ بەبێ گرەو دروستە بە ئیجماعی هەموو زانایان وەك لە پێشەوە باس کرا، بەڵام بە گرەویشەوە هەر دروستە لەم شێوانەی خوارەوەدا:

١- ماڵ وەرگرتن لە پێشبڕکێدا دروستە ئەگەر لە حاکمەوە بێت یا لە کەسێکی ترەوە، وەك ئەوەی بە پێش برکێ کەران بڵێت: هەرکەسێکتان پێش کەوت ئەوەندەی پارە ئەدرێتێ.

٢- یا یەکێکیان لە دوو پێش برکێ کەرەکە ماڵێك دەربهێنێ وبڵێت: ئەگەر پێشم کەوتی ئەم ماڵە بۆ تۆ. وە ئەگەر من پێشت کەوتم هیچت نادەمێ و هیچیشم مەدەرێ.

٣- ئەگەر ماڵەکە لە هەر دووکیانەوە بوو یا لە کۆمەڵێك لە پێش برکێ کەرەکانەوە بێت، وەکەسێك لەناویاندا بێت کە ماڵەکەی بۆ بە ڕەوا دابنێ ئەگەر بردیەوە، وە ئەگەر پێش نەکەوت هیچی لێ نەسێنن.

بە ئەنەسیان ووت: ئایا ئێوە بەو شێوەیە گرەوتان ئەکرد لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ؟ وەئایا پێغەمبەر ﷺ گرەوی کردووە؟ فەرموی: بەڵێ سوێند بە خوا پێغەمبەر ﷺ گرەوی کردووە لەسەر ئەسپێك پێ ی ئەووترا سەبحە وپێش خەڵکەکە کەوتەوە و پێی خۆش بوو. (رواه أحمد)[٣].

---

(١) أحمد (٢/٤٢٥) وأبوداود (٢٥٧٤) والترمذي (١٧٠٠) والنسائي (٦/٢٦٦) وابن ماجه (٢٨٧٨).

(٢) البخاري (٢٨٧٠) ومسلم (١٨٧٠/٩٥).

(٣) أحمد (٣/١٦٠).

ئەو شێوانەی گرەویان تێدا حەرامە:

دروست نی‌یە گرەو کردن لە شێوەیەکدا کە ئەگەر هەر کامیان پێش کەوت ماڵی بدرێتێ وئەگەر پێش نەکەوت ماڵی لێ بسەندرێ بۆ بەرامبەرەکەی، چونکە ئەمە وەك قومارە کە حەرام کراوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الخيل ثلاثة: فرسٌ للرحمن وفرس للإنسان وفرس للشيطان. فأما فرس الرحمن فالذي يرتبط في سبيل الله، فعلفهُ وروثه وبوله، (وذكر...) ماشاء الله، وأما فرس الشيطان: فالذي يُقامَرُ أو يراهَن عليه، وأما فرس الإنسان: فالذي يرتبطه الإنسان يلتمس بطنها فهو ستر من الفقر)[1].

واتە: ئەسپ سێ جۆرە: ئەسپی خوا، ئەسپی ئادەمیزاد، ئەسپی شەیتان. ئەسپی خوا ئەوەیە لەڕێی خوادا ئەبەسترێتەوە وڕائەگیرێ ئەوە هەر نەفەقەیەکی لێ بکرێت لە ڕێی خوادایە، وە ئەسپی شەیتان: ئەوەیە قومار یا گرەوەی لەسەر بکرێت، وەئەسپی ئادەمیزاد: ئەو ئەسپەیە خاوەنی بە خێوی ئەکات وچاوەڕوانی بەرهەمێتی، وە ئەوەیان بەر بەستە بۆ هەژاری.

نە جەلەب هەیە نە جەنەب لە گرەوەی پێشبڕکێدا:

خاوەنی سونەنەکان ئەگێڕنەوە لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرمویەتی: (لاجلب ولاجنب في الرهان).

واتە: نە جەلەب و نە جەنەب هیچیان دروست نین لە گرەوی پێشبڕکێدا.

جەلەب: ئەوەیە کە کەسێك دوای ئەسپەکەی بخات بۆ ئەوەی هانی بدات و پێش بکەوێت.

وە جەنەب: ئەوەیە کە ئەسپێکی تری بێ سوار لەگەڵ خۆیدا ببات کاتێ ئەسپەکەی ماندو بوو سواری ئەوەی تریان ببێت.

ئیبنو ئوەیس ووتویەتی: جەلەب ئەوەیە کە کەسێك دابنێ لە پشتی مەیدانەکەیەوە کە وا لە ئەسپەکەی بکات پێش بکەوێت.

وە جەنەب ئەوەیە کە: ئەسپەکەی لەکاتی ڕۆیشتنیدا ڕوو بکاتە قەراغی ڕێگاکە ئەویش سوارێك دابنێ لە تەنیشتی‌یەوە پاڵ بە ئەسپەکەوە بنێت بۆ سەر ڕێگاکە.

---

(١) أحمد (١/٣٩٥).

ئەبوعوبەید ووتویەتی: جەنەب ئەوەیە کە ئەو سوارە ئەسپێکی بێسوار لەگەڵ خۆیدا بێنێت و پێی بێت. جا کاتێك ئەسپەکەی خۆی نزیك بۆوە لە مەبەست سواری ئەو ئەسپە ئەبێت کە کەسی بەسەرەوە نی‌یە، چونکە ئەو کەمتر ماندو بووە لەو ئەسپەی کە سواری بەسەرەوەیە.

**حەرامی ئازار دانی گیانەوەر:**

حەرامە گیانەوەر ئازاردان و بارکردنی لەسەرو توانای خۆیەوە. جا ئەگەر کەسێك زیاد لە ڕادە وولاغێکی بارکرد بۆ حاکم هەیە ڕێی لێ بگرێت ونەیەڵێ لە توانای خۆی زیاتر لێی بنێت.

ئەگەر ئاژەڵەکە شیردەر بور بەچکەی هەبور ئەوە دروست نی‌یە ئەوەندەی شیر لێ بدۆشێت کە زیان بە بەچکەکەی بگات، چونکە لە ئیسلامدا نە زیان گەیاندن هەیە نە زیان لێدان نە بۆ ئاژەڵ و نە بۆ ئادەمیزاد.

**داخ کردنی ئاژەڵ وخەساندنی:**

دروستە داخ نان بە هەر شوێنێکی ئاژەڵدا بێت لە لاشەی جگە لە دەم وچاوی. جارێکیان پێغەمبەر ﷺ گوێ درێژێکی بینی داخ نرابوو بە ڕویدا، فەرمووی: (أما بلغكم أني لعنت من وسم البيهمة في وجهها أوضربها في وجهها). رواه أبوداود[1].

واتە: ئایا پێتان نەگەیشتووە کە من نەفرینم کردووە لەو کەسەی سەروچاوی وولاغ داخ ئەکات یا لە سەروچاوی ئەدات.

وە لە جابیرەوە ﷺ کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردبوو لەسەروچاوی ئاژەڵ بدرێت وداخ بکرێت. موسلیم و (ترمذي) ریوایەتیان کردوە[2].

زانایان لەو نەهی‌یەوە حەرامی لەسەر وچاودان وداخ کردنیان دەرهێناوە بەبێ جیائازی لەنێوان ئادەمیزادو گیان لەبەردا، چونکە سەرو چاو خوای گەورە ڕێزی لێ گرتووە، وە سەروچاو جێی کۆبونەوەی جوانی‌یە.

بەڵام داخ کردنی شوێنەکانی تر جگە لەسەروچاو دروستە بەڵکو پەسەندە چونکە جاری وا هەیە پێویستە بۆ جیا کردنەوەیان لەیەك.

---

(١) أبوداود (٢٥٦٤).

(٢) أحمد (٣١٨/٣) ومسلم (١٠٦/٢١١٦) والترمذي (١٧١٠).

وە پێغەمبەر ﷺ خۆی بەو ئاسنەی کە ئاژەڵی پێ داغ ئەکرێ ووشتری زەکاتی داخ ئەکرد. موسلیم ریوایەتی کردوە[1].

ئەبوحەنیفە فەرمویەتی: کەراهەتی هەیە داخ کردنی ئاژەڵ چونکە ئازاردان وئەتك کردنە. وەپێغەمبەر ﷺخۆی هەر دووکیانی قەدەغە کردووە.

وە لەسەر قسەکەی ئەبوحەنیفە وەڵام ئەدرێتەوە بە وەی ئەو قەدەغە کردنە گشتی‌یە بەڵام تایبەت کراوە، وە ئەو تایبەت کردنەش سابتە بە کاری پێغەمبەر ﷺ خۆی.

واتە ئازاردان وئەتك کردن حەرامن لە هەموو حاڵەتێکدا جگە لە حاڵەتی داخ کردنی ئاژەڵ ئەوە دروستە.

بەڵام خەساندنی ئاژەڵ: کۆمەڵێك لە زانایان رێیان پێداوە ئەگەر مەبەست لێی کەڵك وەرگرتن بێت وەك قەڵەو بوون یا شتی تر.

عوروەی کوڕی زوبێر هێسترێکی هەبوو کە خەساندبووی.

وە عومەری کوڕی عبدالعزیز ڕێی داوە بە خەساندنی ئەسپ.

مالیك ڕێی داوە بە خەساندنی بەران.

**خەساندنی ئادەمیزاد:**

ئەوانە بە پێچەوانەی ئادەمیزادەوەن چونکە ئادەمیزاد دروست نی‌یە بخەسێنرێت لەبەر ئەوەی ئەتك کردن و گۆڕینی دروست کراوی خوایەو لەناوبردنی نەوەیە، وە لەوانەشە ببێتە هۆی مردنی.

**ئاژەڵ بە شەڕ دان:**

پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردبوو کە ئاژەڵ بدرێن بە شەڕ. لە ئیبنوعەبباسەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردبوو ئاژەڵ بدرێت بە شەڕ. ئەبوداود و (ترمذي) گێڕاویانەتەوە[2].

وەك چۆن قەدەغەی کردووە گیان لەبەر بکرێتە نیشانە.

١- ئەنەسی کوڕی مالیك چووە ماڵی حەکەمی کوڕی ئەییوب سەیری کرد کۆمەڵێك مریشکیان نابووەوە بە نیشانە تیریان تێ ئەگرت. پێ ی ووتن: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە کە ئاژەڵ ببەسترێتەوە وتیری تێ بگیرێ هەتا بمرێت. موسلیم ریوایەتی کردوە[1].

---

(١) مسلم (٢١١٨/١٠٨).

(٢) أبوداود (٢٥٦٢) والترمذي (١٧٠٨).

٢- لە جابیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە ئاژەڵ بە بەندکردن بکوژرێت. موسلیم ریوایەتی کردوە[٢].

٣- لە ئیبنوعەبباسەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لاتتخذوا شيئاً فيه الروح غرضاً)[٣].

واتە: هەرچی گیان دار بێت مەیکەنە نیشانە.

قەدەغەکردنی ئەوکارە لەبەر ئەوەیە کە ئازاردانی ئاژەڵ و لەناوبردنی تێدایە هەروەها لەدەست چونە بۆ سامانیەتی ئەو ئاژەڵەو بۆ سەربڕینی ئەگەر سەربڕدرێ، وە لەدەست چونی سوودەکەی ئەگەر سەر نەبڕدرێ.

**یاری کردن بە تاوڵە (نرد) :**

جەماوەری زانایان بۆ حەرامی یاری کردن بە تاوڵە چوون، وەبەڵگەشیان لەسەر حەرامێتی ئەمانەی خوارەوەیە:

١- بورەیدە لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: (من لعب بالنردشير فكأنما صبغ يده في لحم الخنزير ودمه). رواه مسلم وأحمد وأبوداود[٤].

واتە: هەرکەس بە تاوڵە یاری بکات وەك ئەوە وایە دەستی پیس کردبێ بە گۆشت وخوێنی بەراز.

٢- لە ئەبوموساوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمورویەتی: (من لعب بالنرد فقد عصي الله ورسوله). رواه أحمد وأبوداود وابن ماجه ومالك[٥].

واتە: هەرکەس یاری بە تاوڵە بکات سەرپێچی خوا وپێغەمبەرەکەی کردوە.

سەعیدی کوڕی جوبەیر کاتێك بەلای کۆمەڵێکدا بڕۆیشتایە یاری تاوڵە بکەن سڵاوی لێ نەئەکردن.

شەوکانی فەرمویەتی: ئەگێڕنەوە کە ئیبنوموغەففەل و ئیبنوموسەییب ڕێیان داوە بە یاری کردن بە تاوڵە کە لەسەر هیچ نەبێت. واتە بێ قومار کردن.

وا دەرئەکەوێت ئەم دووانە فەرموودەکەیان لەسەر ئەوە داناوە کە ئەگەر لەسەر قومار بێت حەرامە.

---

(١) البخاري (٥٥١٣) ومسلم (١٩٥٦/٥٨).

(٢) مسلم (١٩٥٩).

(٣) أحمد (١/٢٨٥) ومسلم (١٩٥٧/٥٨) والترمذي (١٤٧٥) والنسائي (٧/٢٣٩) وابن ماجه (٣١٨٧).

(٤) أحمد (٥/٣٥٢) ومسلم (٢٢٦٠/١٠) وأبوداود (٤٩٣٩).

(٥) أحمد (٤/٣٩٤) وأبوداود (٤٩٣١) وابن ماجه (٣٧٦٢) ومالك في الموطأ (٢/٩٥٨).

**یاری کردن بە شەترەنج:**

**فەرموودە هاتووە دەربارەی حەرامی یاری بە شەترەنج بەڵام هیچ لەم فەرموودانە سابت نین.**

**حافظ ئیبنوحەجەری عەسقەلانی فەرمویەتی: فەرموودەیەکی صەحیح یا حەسەن نەچسپاوە دەربارەی حەرامی یاری کردن بە شەترەنج.**

**لەبەر ئەوە زانایان جیاوازیان هەیە لە حوکمەکەیدا.**

**لە زانایاندا هەیە حەرامی کردووە.**

**وهەیە ڕەوای کردووە.**

**ئەوانەی حەرامیان کردووە ئەبوحەنیفەو مالیك و ئەحمەدن.**

**وە شافیعی و هەندێ لە تابیعی یەکان فەرمویانە: کەراهەتی هەیەو حەرام نی یە، چونکە کۆمەڵێك لە صەحابە یاری یان بە شەترەنج کردووەو ژمارەیەکی زۆر لە تابیعی یەکان کە لە ژمارە نایەن. ئیبنوقودامە لە موغنی دا فەرمویەتی: شەترەنج وەك تاوڵەیە لە حەرامی دا. بەڵام تاوڵە حەرامی یەکەی زیاتر جەختی لەسەر کراوە لەبەر ئەوەی دەق هاتووە دەربارەی حەرامی بەڵام شەترەنج وەك تاوڵەیە لەبەر ئەوە بە پێوانە (قیاس) حوکمی تاوڵەی بە سەردا سابت ئەبێت.**

**لە ئەبوهورەیرەو سەعیدی کوڕی موسەییب وسەعیدی کوڕی جوبەیرەوە بە حەڵاڵ دانانی ئەگێڕنەوە. وە بەڵگەشیان ئەوەیە کە بنەماکەی ڕەوایی یە. وە دەربارەی حەرامێتی دەقێك یا شتێك کە لە مانای ئەوەدا بێت نەهاتووە، کەواتە لەسەر ڕەوایی یەکەی ئەمێنێتەوە.**

**وە ئەوانەی بە ڕەوایان داناوە ئەم مەرجانەیان داناوە بۆ ڕەوا بوونی:**

**١- نابێت ئەو کەسە سەرقاڵ بێت و واجبە ئایینی یەکانی بۆ نەکرێت.**

**٢- نابێت قوماری تێدا بێت.**

**٣- نابێت کاتی یاری کردنەکە شتێك رووبدات پێچەوانەی یاسای خوا بێت.**

## ڕاگرتن (الوقف)

**(وقف) لە زمانی عەرەبی دا بە مانای بەند کردن دێت، وە لە شەرعدا ڕاگرتنی ئەصڵەو صەرف کردنی بەرەکەیەتی. واتە بەند کردنی ماڵە وصەرفی قازانجەکەیەتی لەرێی خوادا.**

**جۆرەکانی وەقف:**

وەقف کردن جاري وا ئەبێت لەسەر ئەوە ئەکرێت یا خزم وکەس وکار، وە لە دوای ئەوانە بۆ هەژاران، وە ئەمەش پێی ئەوترێ وەقفی ئەهلی یا ئەوەیی.

وە جاری وا ئەبێت کە وەقف لە دەرگاکانی خێردا ئەبێت هەر لەسەرەتاوە پێی ئەڵێن: وەقفی خێری.

**ڕەوابونی:**

خوای گەورە وەقفی داناوە وفەرمانی داوە بە کردنی وکردویەتی بە خواپەرستی و هۆی نزیك بوونەوە لە خواوە. وە لە سەردەمی نەفامیدا نەناسراوە ونەزانراوە وەقف کرابێت. بەڵکو پێغەمبەر ﷺ هەڵی هێنجاوەو بانگەوازی بۆ کردووەو خۆشەویستی کردووە لای خەڵك لەبەر چاکەکردن لەگەڵ هەژاران و بەزەیی هاتنەوە بە کەم دەستاندا.

لە ئەبوهورەیرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا مات الإنسان انقطع عمله إلا من ثلاثةِ أشياء: صدقة جارية أو علم ينتفع به أو ولد صالح يدعو له). رواه مسلم وأبوداود والترمذي والنسائي)[1].

واتە: ئەگەر ئادەمیزاد کۆچی دوایی کرد کردەوەی لە دونیادا ئەبرێت جگە لە سێ شت: خێری بەردەوام یا زانیاریەك کە کەڵك بگەیەنێت، یا منداڵێکی (صالح) کە بۆی بپارێتەوە. (واتە: پاداشتی بۆ تازە نابێتەوە جگە لەم سیانەدا)).

چونکە ئەمانە بەهۆی کەسبی خۆیەوە پەیدابوون، کەواتە کوڕەکەی و ئەو عیلمەی کە بەجێی دێڵێ و خێرە بەردەوامەکەی، لە هەوڵ دانی خۆیەتی.

وە مەبەست لە خێری بەردەوام (وەقفە).

وە ئیبنوماجە تەخریجی کردوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إن مما يلحق المؤمن من عمله وحسناته بعد موته: علماً نشره، أو ولداً صالحاً تركه أو مصحفاً ورثه أو مسجداً بناه أو بيتاً لابن السبيل بناه أو نهراً أجراه أو صدقة أخرجها من ماله في صحته وحياته تَلحقُهُ مِن بَعدِ موته).

واتە: ئەوەی بە ئیماندار ئەگات لە کردەوەکانی و چاکەکانی دوای مردنی زانستێکە بڵاوای کردبێتەوە یا منداڵێکی صالحە یا موصحەفێکە بە میراتی بەجێی هێشتبێت، یا مزگەوتێکە کە دروستی کردبێت یا خانووێکی دروست کردبێت بۆ ڕێبوار یا ڕووبارێکی ڕاکێشابێت یا خێرێك خۆی داینابێت لە ژیانی دا کاتی ساغی دوای مردن پێی ئەگات.

---

(١) مسلم (١٦٣١) والبخاري في الأدب المفرد (٣٨) وأبوداود (٢٨٨٠).

وە چەند شتێکی تریش هاتووە کە بەوەوە ژمارەیان ئەگاتە دە شت. ئیمامی (سیوطي) بە هۆنراوەیەك ڕێکی خستون ئەوانەش: بڵاوکردنەوەی زانست و دوعای منداڵی چاك و ڕواندنی درەختی دارخورماو خێری بەردەوام و بەجێ هێشتنی موصحەف و پاسەوانی سنورو بیرهەڵکەندن و ڕووبار ڕاکێشان و دروست کردنی خانوو بۆ غەریبان و ڕێبواران و دروست کردنی مزگەوتە.

پێغەمبەر ﷺ خۆی وەقفی کردووە هەروەها صەحابەکان مزگەوت وزەوی وبیر وباغ وئەسپیان کردۆتە وەقف، وە هەتا ئێستاش خەڵك وەقف ئەکەن.

وە ئەمانە هەندێ نمونەیە لەو وەقفانەی کراون لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ :

١- لە ئەنەسەوە ﷺ هاتوە کە فەرمویەتی: کاتێ پێغەمبەر ﷺ گەیشتە مەدینە وفەرمانی دا بە دروست کردنی مزگەوت فەرمووی: (يا بني النجار ثامنوني بحائطكم هذا؟ فقالوا: والله لا نَطلبُ ثمنه إلا إلى الله تعالى، أي فأخذه فبناه مسجداً). رواه الثلاثة[1].

واتە: ئەی بەنی نەججار! ئەمەوێ باغەکەتان لێ بکڕم نرخەکەی چەندە بتاندەمێ؟ ئەوانیش ووتیان: سوێند بە خوا داوای هیچ ناکەین تەنها داوا لە خوا ئەکەین. ئەویش وەری گرت ومزگەوتێکی لەسەر دروست کرد.

وەلەعوثمانەوە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من حفر بئر رومة فله الجنة. قال: فحفرتها). رواه البخاري والترمذي والنسائي.

واتە: هەرکەس بیری ڕۆمە هەڵکەنێت بەهەشت بۆ ئەوە. عوثمان ئەڵێت: منیش هەڵم کەند.

وە لە ڕێوایەتێکی بەغەوی دا هاتووە: کە کابرایەکی بەنی نەججار کانیەکی بوو پێیان ئەووت: ڕۆمە.

کوندەیەك ئاوی ئەفرۆشت بە مشتێك خواردەمەنی، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: نای فرۆشی بە کانیەکی بەهەشت؟ ووتی: ئەی نێرراوی خوا، خۆم وخێزانەکەم لەوە زیاترمان نیە. ئەو قسەیە گەیشت بە عیسمان. هات کڕی بە سی‌وپێنج هەزار درەم. پاشان هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و پێی ووت: ئەوەی بۆ ئەو کابرایەت دانابوو بۆ منیشی دائەنێت؟ فەرمووی: بەڵێ. ووتی: ئەوا ئەو کانیەم بەخشی بە موسڵمانان[2].

---

(١) البخاري (٤٢٨).

(٢) البخاري تعليقاً (٢٩/٥) والترمذي (٣٧٠٣) والنسائي في المجتبى (٢٣٥/٦) وفي الكبرى (٦٤٣٥).

٣- لە سەعدی کوڕی عوبادەوە ﷺ کە فەرمویەتی: ئەی نێرراوی خوا دایکی سەعد کۆچی دوایی کردووە چ خێرێك پاداشتی زۆرە؟ فەرمووی: ئاو. ئەویش بیرێکی هەڵکەند و ووتی: ئەمە بۆ دایکی سەعد[١].

٤- لە ئەنەسەوە ﷺ کە فەرمویەتی: (ئەبوطەلحە لە هەموو ئەنصارەکانی مەدینە ماڵی زۆرتر بوو، وە خۆشەویست ترین شت لای باغێکی دارخورما بو کە ناوی بەیرەحاء بوو لەبەر دەم مزگەوتەکەدا بوو، وەپێغەمبەر ﷺ ئەچووە ناوی لە ئاوە سازگارەکەی ئەخواردەوە کاتێ ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتە خوارەوە: ﴿لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ﴾ (آل عمران/٩٢).

واتە: چاکەتان دەستگیر نابێت هەتا ئەوەی خۆشتان ئەوێت نەیبەخشن لە رێگای خوادا.

ئەبوگەلحە هەڵسا چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ووتی: خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت: ﴿لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ﴾ وە من خۆشەویست ترین شتم بەیرحایە واکردم بە خێر لەرێی خوادا لە خوا ئەخوازم پاداشتم بداتەوە بۆم هەڵگرێت بۆ رۆژی دوایی. ئەی نێرراوی خوا خۆت چی لێ ئەکەی بیکە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بخٍ)[٢] ئەوەیە ماڵی بە کەڵك، گوێم لێ بوو چیت ووت، وەمن رام وایە بیدەی بە خزمەکانی خۆت. ئەبوطەلحەش دابەشی کرد بەسەر خزمەکانیداو بەسەر ئامۆزاکانیدا[٣]. بوخاری و موسلیم و (ترمذي) گێڕاویانەتەوە[٤].

٥- لە ئیبنوعومەرەوە ﷺ کە فەرمویەتی: عومەر پارچە زەوی‌یەکی دەستگیر بوو لە خەیبەر. هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ووتی: ئەی نێرراوی خوا، لە خەیبەر پارچە زەوی‌یەکم دەست کەوتووە هیچ ماڵێکم دەست نەکەوتووە ئەوەندە بە نرخ بێت لام تۆ چ فەرمانێکم پێ ئەکەی دەربارەی؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إن شئت حبست أصلها وتصدقت بها). واتە: ئەگەر حەز ئەکەیت ئەصڵەکەی وەقف بکەو بەرهەمەکەی بکە بە خێر.

عومەریش کردی بە وەقف کە نەفرۆشرێت ونەبەخشرێت وبە میرات نەگیرێت، وبەروبومەکەی کرد بە خێر ودابەشی کرد بەسەر هەژاران و خزمەکانیدا، وە هەروەها بۆ ئازادکردنی بەندەو لەرێی خواداو

---

(١) أبوداود (١٦٨١) والنسائي (٦/٢٥٤) وابن ماجه (٣٦٨٤) وابن خزيمه (٢٤٩٧) وابن حبان (٣٣٣٧).

(٢) وشەیەکە مەبەست پێی بە دڵ بون و بە گەورەدانانی کارەکەیە.

(٣) واتە کردی بە وەقف لەسەر خزمەکانی، وە ئەوە بو بنەرەتی وەقفی ئەهلی.

(٤) البخاري (٢٧٥٨) ومسلم (٩٩٨/٤٢و٤٣).

بەسەر ڕێبوارانی بەجێ ماوو میواندا. وەگوناه نیەیە لەسەر ئەو کەسانەی سەرپەرشتی ئەکەن لیێ بخۆن بەپێی عورف بە مەرجێ نەیکەنە مولکی خۆیان.

(ترمذي) فەرمویەتی: زانایانی صەحابە وکەسانی تر لەسەر ئەو فەرموودەیە کاریان کردووە، وەکەسێك نیەیە لە هاوەڵەکانمان پێچەوانەی ئەوە بوبێت. وە ئەمە یەکەم وەقف بووە لە ئیسلامدا[1].

٦- ئەحمەد و بوخاری لە ئەبوهورەیرەوە گێراویانەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من احتبس فرساً في سبيل الله إيماناً واحتساباً فان شبعه وروثه وبوله في ميزانه يوم القيامة حسنات)[2].

واتە: هەرکەس ئەسپێکی بەند کرد بۆ ڕێگای خوا بە باوەڕەوە وبە هیوای پاداشتەوە، ئەوە تێر بوونیو میزو تەرسەکەی ئەخرێتە تای تەرازووەکەیەوە لە ڕۆژی دواییداو بە چاکە بۆی ئەژمێررێت.

٧- لە حەدیسی خالیدی کوڕی وەلیددا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أما خالد فقد احتبس أدراعه وأعتاده في سبيل الله)[3].

واتە: ئەمما خالید ئەوە قەڵغان و چەك و کەرەسەکانی لەڕێی خوادا بەند کردووە.

**پێك هاتنی وەقف:**

وەقف پێك دێت ودروستە بە یەکێ لە مانەی خوارەوە:

١- بە کردەوەیەك کە بەڵگە بێت لەسەری، وەك ئەوەی مزگەوتێك دروست بکات وبانگی تێدا بدات بۆ نوێژکردن تێیدا، وە پێویستیش بە حوکمی حاکم ناکات.

٢- بە قسە: قسەش دووبەشە قسەی ڕاست وڕێك و قسەی کینایەت:

قسەی ڕاست و ڕێك: وەك ئەوەی بڵێت: کردمە وەقف وبەندم کرد لەڕێی خوادا بۆ هەمیشە.

قسەی کینایەتیش وەك ئەوەی بڵێت: کردمە خێرو مەبەستی وەقف بێت.

---

(١) البخاري (٢٣١٣و٢٧٣٧) ومسلم (١٦٣٢) وأبوداود (٢٨٧٨) والترمذي (١٣٧٥) والنسائي (٦/٢٣٢) وابن ماجه (٢٧١٨) وأحمد (٢/١٣).

(٢) أحمد (٢/٣٧٤) والبخاري (٨٢٥٣).

(٣) البخاري (٦/٩٩) تعليقاً، ومسلم (٩٨٣).

بەڵام وەقفی بەستراو بە مردنەوە وەك ئەوەی بڵێت: خانووەکەم یا ئەسپەکەم وەقف بێت دوای مردنم. ئەمەش دروستە لە ڕواڵەتی مەزهەبی ئەحمەددا، وەك خەرقی وکەسانی تر باسیان کردووە چونکە ئەمانە هەمووی لە بەشی وەسیەت کردنە ئیتر بەستنی بە دوای مردنەوە دروستە چونکە وسێتە.

سەپاندنی:

هەرکاتێك وەقفکەر شتێکی کرد کە وەقف کردنی ئەگەیاند یان زاراوەی وەقفی ووت ئەوە ئەو وەقفە ئەسەپێت بە مەرجێك وەقف کەر لەو کەسانە بێت تەسەروفی دروست بێت، وەك ئەوەی شایستەیی تەواوی هەبێت لە ژێری ڕێگەپشتویی وئازادی و ئیختیار، ئیتر بۆ پێکهێنانی وەقفەکە پێویست بە قەبوڵ کردنی ئەو کەسە ناکات کە لەسەری وەقف ئەکرێت.

وە کاتێك وەقفەکە سەپا ئیتر دروست نی‌یە فرۆشتنی وبەخشینی وکارتێدا کردنی بە شێوەیەك کە وەقف بوونەکە بسڕێتەوە، وەئەگەر وەقف کەر مرد ئەو شتەی کراوە بە وەقف بە میرات ناگیرێ چونکە وەقف وا پێویست ئەکات.

بەپێی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی: (لایباع ولایُوهب ولایورَثُ)[1].

واتە: شتی وەقف کراو نەئەفرۆشرێت ونەئەبەخشرێت ونە بە میرات ئەبرێت.

وە ئەبو حەنیفە ڕای وایە کە دروستە شتی وەقف کراو بفرۆشرێت.

ئەبویوسف ووتویەتی: ئەگەر ئەم فەرموودەیە بگەیشتایە بە ئەبوحەنیفە وەك فەرموودەکەی ئەووت ڕێنچەوانەی ئەوڕایەی نەئەبوو.

وە ئەوەی بەهێز بێت لە مەزهەبی شافیعی‌یەکاندا دا ئەوەیە ئەو مولکە لە گەردنی وەقف لەسەر کراودا ئەبێت وئەبێتە مولکی خوای گەورە، ئیتر نە مولکی وەقف کەر ئەبێت ونە مولکی وەقف لەسەر کراو.

وە مالیك و ئەحمەد فەرمویانە: مولکەکە ئەبێت بە مولکی وەقف لەسەر کراوەکە.

ئەو شتەی وەقف کردنی دروستەو ئەوەی وەقف کردنی دروست نی‌یە:

دروستە وەقف کردنی زەوی وخانووبەرە وئەو شتانەی ئەگوێزرێنەوە لە کەل وپەل وقورئان وپەرتوك وچەك وئاژەڵ. ئەمە مەزهەبی جەماوەری زانایانە بەڵام ئەبوحەنیفە وئەبویوسف وڕیوایەتێکی مالیك فەرمویانە: دروست نی‌یە وەقف کردنی ئاژەڵ وە حەدیسەکە بەڵگەیە بەسەریانەوە، هەروەها دروستە

---

(١) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

وەقف کردنی هەموو ئەو شتانەی فرۆشتنیان دروستە، وە دروستە کەڵك لێ وەرگرتنیان لەگەڵ مانەوەی شتەکە خۆی. وە ئەوەی ئەوە ئەگەیەنێ لە پێشەوە باس کرا، وەدروست نی‌یە وەقف کردنی ئەو شتانەی کە لەناو ئەچن بە کەڵك لێ وەرگرتن وەك پارەو مۆم و خواردن و خواردنەوە، وە ئەو شتانەش کە زوو تێك ئەچن وەك ئەو شتانەی بۆ بۆن بەکار دێن، چونکە ئەمانە زوو لەناو ئەچن.

هەروەها ئەو شتانەی فرۆشتنیان دروست نی‌یە وەك بارمتە کراوو سەگ وبەرازو هەموو گیانەوەرە درِندەکان کە بۆ راو ناشێن، وەهەروەها باڵندە گۆشت خۆرەکانیش ئەوانەی راویان پێ ناکرێت .

**وەقف کردن دروست نی‌یە بۆ جگە لە ناسراو یا رِێی چاکە:**

دروست نی‌یە وەقف کردن لەسەر ئەو کەسانە نەبێت کە ناسراون وەك کورِ یا خزم یا پیاوێکی دیاری کراو، وەهەروەها بۆ رِێگای چاکە نەبێت وەك دروست کردنی مزگەوت و پردو پەرتوکی ئایینی و زانستی و قورئان.

وە ئەگەر لەسەر یەکێکی نەناسراو وەقفی کرد وەك ئەوە بڵێ: وەقف بێ بۆ ژنێك یان پیاوێك ئەوە دروست نی‌یە.

وەهەروەها دروست نی‌یە لەرِێی سەرپێچی خوادا وەك وەقف کردن بۆ کڵێسەو کەنیشتە.

**وەقف کردن لەسەر کورِ منداڵەکانیشی ئەگرێتەوە:**

هەرکەس شتێك لەسەر منداڵی خۆی وەقف بکات کورِی کورِو هەرچی یان لێ کەوتەوە ئەیگرێتەوە، هەروەها منداڵی کچیش. وە ئەبوموسای ئەشعەری فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووریەتی: (إبن أخت القوم منهم). أخرجه البخاري ومسلم وأبوداود والنسائي والترمذي)[1].

واتە: خوشکەزای قەوم هەر لەوان دائەنرێت.

**وەقف کردن لەسەر ئەهلی زیمە:**

وەدروستە وەقف کردن لەسەر ئەهلی زیمە وەك گاور وەك چۆن دروستە خێریان پێ بکرێت.

صەفی‌یەی کچی حویەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ وەقفی لەسەر برایەکی جولەکەی کردووە.

**وەقفی هاوبەشی:**

(١) البخاري (٣٥٢٨) ومسلم (١٠٥٩/١٣٣).

دوستە شتی هاوبەشی کە بەش نەکرابێت وەقف بکرێت چونکە عومەر ﷺ سەد بەشی لە خەیبەر وەقف کرد بێ ئەوەی بەش کرا بێت، وە لە (البحر)دا گێڕاویەتی‌یەوە لە هادی و قاسم و ناصر و شافیعی و ئەبویوسف و مالیکەوە کە بە دروستیان داناوە.

وەهەندێ لە زانایان ڕایان وایە وەقفی شتی (مشاع) هاوبەشی کە بەش نەکرابێت دروست نی‌یە چونکە یەکێ لە مەرجەکانی وەقف دیاری کردنە. موحەممەدی کوڕی حەسەنیش هەروای وتووە.

لەسەر خۆ وەقف کردن:

هەندێك لە زانایان وەقف لەسەر خۆ کردن بە دروست دائەنێن بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە بەوپیاوەی کە وتی: دینارێکم هەیە. فەرمووی: (تصدق به علي نفسك). رواه أبوداود والنسائي[1].

واتە: لەسەر خۆت بیکە بە صەدەقە.

وەلەبەر ئەوەی مەبەست لە وەقف کردن نزیك بوونەوەیە لە خوا، وە سەرف کردن لەسەر خۆش نزیك بوونەوەی تێدایە لە خواوە.

ئەمەش قسەی ئەبوحەنیفە و ئیبنوئەبی لەیلاو ئەبویوسف و ئەحمەدە لە لەپێش‌ترین وتەیدا، ئیبنو شەعبان لە مالیکی‌یەکان و ئیبنوسورەیج لە شافیعی‌یەکان و ئیبنوشیبرمە و (ابن الصباغ)و عیترەیە، بەڵکو هەندێکیان بە دروستیان داناوە وەقف کردن لەسەر مەحجور لەبەر کەم عەقڵی ئەگەر لەسەر خۆی وەقف کرد پاشان لەسەر منداڵەکانی. چونکە حیجر دانان لەسەر کەسێك بۆ پاراستنی ماڵەکەیەتی وە وەقفەکەشی بەو ڕێگایە ئەو پاراستنە بەدی ئەهێنێ.

هەندێك لە زانایان قەدەغەی ئەو جۆرە وەقفەیان کردوە چونکە وەقف لەسەر خۆ کردن بوونە خاوەنە دروست نی‌یە خۆی لە خۆی بونە خاوەنی‌یەتی وەربگرێت وەك فرۆشتن وبەخشین.

بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (سبِّل الثمرة)[2].

واتە: بەرەکەی ببەخشە لە ڕێ ی خوادا بە کەسێکی تر.

شافیعی و جەماوەری مالیکی و حەنبەلی و موحەممەد و ناصر بۆ ئەوە چوون.

---

(١) أبوداود (١٦٩١) والنسائي في السنن الكبرى (٢٣١٤-٢٣١٥).

(٢) النسائي (٦/٢٣٢) وابن ماجه (٢٣٩٦).

## وەقفی موطلەق

ئەگەر کەسێك شتێکی کردە وەقف بە شێوەیەکی ڕەهاو ناوی کەسی نەهێنا کە لەسەری وەقف بێت، وەك ئەوەی بڵێت: ئەم خانووە وەقف بێت، ئەو وەقفە لای مالیکی‌یەکان دروستە.

وە ڕای بەهێز لای شافیعی‌یەکان ئەوەیە ئەو جۆرە وەقفە دروست نی‌یە کە شوێنی سەرف کردنی دیاری نەکرێت.

## وەقف کردن لە نەخۆشی مردندا

ئەگەر نەخۆشێك لە نەخۆشی مردنیدا شتێکی کردە وەقف بە بێگانەیەك ئەوە وەك وەسێت لە سی‌یەکی ماڵی دەرئەچێت، وە لەسەر ڕازی بوونی میرات گرەکان ناوەستێ مەگەر ئەو شتە لە سێ‌یەك زیاتر بێت، ئەو کاتە دروست نی‌یە وەقف کردنی ئەو زیادەیە بە پرسی ئەوان نەبێت.

## وەقف کردن لەسەر هەندێ لەمیرات گرەکان لە کاتی نەخۆشی دا:

شافیعی وئەحمەد لە یەکێ لە ڕیوایەتەکانیدا بۆ ئەوە چوون کە دروست نی‌یە وەقف کردن لەسەر هەندێ لە میرات گرەکان لەکاتی نەخۆشیدا.

وە جگە لە شافیعی وئەحمەد لە ڕیوایەتێکی تریدا بۆ ئەوە چوون کە دروستە وەقف کردنی سێ‌یەکی ماڵ لەسەر میرات گر کاتی نەخۆشی وەك لەسەر بێگانەش دروستە.

وە کاتێ لە ئیمامی ئەحمەدیان پرسی ئەی تۆ ڕات وانی‌یە کە وەسێت بۆ میرات گر ناکرێت؟ فەرمووی: بەڵێ. بەڵام وەقف وەسێت نی‌یە چونکە نەئەفرۆشرێت ونەئەبەخشرێت و نە میراتگر ئەیبات و نە ئەبێ بە موڵکی کەسێ لە میرات گرەکان، کەڵك لەبەرەکەی وەرئەگرێت.

## وەقف کردن لەسەر دەوڵەمەند:

وەقف کردن کارێکە بۆ نزیك بوونەوە لە خوا جا ئەگەر وەقف کەر شتێکی کردە مەرج کە نزیك بوونەوە نەبوو لە خواوە، وەك ئەوەی بە مەرجی دابنێت ئەو شتە هەر ئەبێت لەسەر دەوڵەمەند وەقف بێت، زانایان لەم ڕێنەیەدا جیاوازیان هەیە:

هەیانە ڕێی پێ داوە چونکە سەرپێچی کردنی خوا نی‌یە. و هەیانە قەدەغەی کردووە، چونکە ئەو مەرجە پوچەڵە لەبەرئەوەی بە شێوەیەك سەرف ئەکرێت وەقف کەر نە لە دونیاو نە لە ڕۆژی دوایی دا کەڵکی لێ وەرناگرێت.

ئیبنوتەیمی‌یە پارسەنگی ئەوەی داوەتەوەو فەرمویەتی: وەئەوە لە ئیسراف و ماڵ بە فیڕۆدانە کە نەبێ بەربەست بکرێت، وە لەبەر ئەوەی خوای گەورە لای ناخۆشە ماڵ لە نێوان دەوڵەمەندەکاندا

دەستاودەستی پێ بکرێت، ئەفەرموێت: ﴿كَيْ لاَ يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الأَغْنِيَاءِ مِنكُمْ﴾ (الحشر/٧) واتە: بۆ ئەوەی نەکەوێتە بەردەست دەوڵەمەندەکان.

جا هەرکەس بە مەرجی دانا وەقفەکەی یا وەسیەتەکەی بدرێت بە دەوڵەمەند ئەوە مەرجێکی داناوە کە پێچەوانەی قورئانەکەی خوایە.

وە هەرکەس مەرجێکی دانا پێچەوانەی قورئان بوو ئەو مەرجە پوچەڵە، با سەد مەرجیشی دانابێت چونکە (کتێبەکەی خوا ڕاست ترەو مەرجی خوا جێگیرترە).

وەهەر لەم بەشەدا:

ئەگەر وەقف کەر یا وەسێت کەر کارێکی کردە مەرج بۆ وەقفەکەی کە لە یاسای ئیسلامدا نەبوو نە بە واجبی‌و نە بە پەسەندی. ئەم مەرجانەش هەر پوچەڵن چونکە پێچەوانەی قورئانن، چونکە ئەگەر کەسێك خەڵك مولزەم بکات بە شتێك نە واجب بێت نە پەسەند بێ ئەوەی کەڵکی هەبێت بۆی ئەوە گێلی وماڵ بە فیڕۆ دانە ئەبێ ڕێگیری بکرێت.

### دروستە سەرپەرشتی کەر لە ماڵی وەقف بخوات

دروستە بۆ سەرپەرشتی کەری شتی وەقف کراو لێی بخوات بەپێی حەدیسەکەی ئیبنوعومەر کە لە پێشەوە باس کرا وتەمەی تێدا بوو: (لا جناح على من وليها أن يأكل منها بالمعروف) [1].

واتە: تاوان نیيە بۆ سەرپەرشتیاری وەقف کە بە مەعروف لێی بخوات، وە بە (معروف) خواردنیش ئەوەندەیە کە عادەتی بێت.

(قرطبي) فەرمویەتی: عادەت وا هاتووە کە سەرپەرشتی کەر لەبەروبومی وەقف ئەخوات تەنانەت ئەگەر وەقف کەر ئەو مەرجەی دانابێت کە نابێت سەرپەرشتی کەر لێی بخوات، بە شتێکی ناشیرین دائەنرێت.

### هەرچی لە بەروبومی وەقفەکە زیاد بوو بۆ شتی تری وەك خۆی سەرف ئەکرێت

ئیبنوتەیمیيە فەرمویەتی: هەرچی لەبەروبومی وەقف زیاد بوو لە وەقف لەسەر کراو ئەبێ بۆ شتێکی تری وەك ئەو شتە سەرف بکرێت، بۆ نمونە ئەگەر مزگەوت بەروبومی شتە وەقف کراوەکانی لە بەرژەوەندیيەکانی خۆی زیاد بوو ئەبێ بۆ مزگەوتێکی تر سەرف بکرێت، چونکە وەقف کەر مەبەستەکەی لە جۆرێکدایە، جۆرەکەش یەکە.

وە ئەگەر وا دانرا مزگەوتیيەکەم تێك چوو بوو کەس کەڵکی لێ وەر نەئەگرت ئەوە سودی وەقفەکەی بۆ مزگەوتێکی تر سەرف ئەکرێت، هەروەها ئەگەر لە بەرژەوەندیيەکەی شتێك زیاتری هەبوو، ئەوە ئەو زیادیيە هیچ رێگایەك نیيە بۆ سەرف کردنی هەر لەو مزگەوتەدا یا دانانی و پەك خستنی، کەواتە سەرف کردنی بۆ شتێك لە جۆری ئەوەی کە مەبەستە باشترە. وەئەمەش نزیك ترین رێگایە بۆ مەبەستی وەقف کەر.

### گۆڕینی نەزر کراوو وەقف کراو بە شتێکی چاکتر لە خۆی:

هەروەها ئیبنوتەیمیيە فەرمویەتی: بەڵام گۆڕینی نەزر کراوو وەقف کراو بە شتێك لە خۆی چاکتر وەك گۆڕینی بەخشش. ئەمە دوو جۆرە:

یەکەمیان: ئەبێ ئەو گۆڕینە بۆ پێویست بێت وەك ئەوەی پەکی بکەوێت جا بفرۆشرێت وبە نرخەکەی شتێکی تر لە جێگای بکڕێت، وەك ئەسپی بەند کراو بۆ غەزا ئەگەر نەکرێ لە غەزادا

---

(١) البخاري (٢٣١٣و٢٧٢٣) ومسلم (١٦٣٢).

کەڵکی لێ وەربگیرێ ئەوە ئەفرۆشرێت و بە نرخەکەی شتێکی تر لە جێگای ئەکرێت کە جێی بگرێتەوە.

وە مزگەوت ئەگەر ماڵەکانی چوار دەوری روخا ئەگوێزرێتەوە بۆ شوێنێکی تر، یا ئەفرۆشرێت و بە نرخەکەی مزگەوتێکی تر لەجێی ئەکرێتەوە، وەئەگەر وەقف لەسەر کراو ئەو کەڵکەی لێ وەرنەگرت کە وەقف کەر مەبەستی بووە ئەفرۆشرێ وشتێکی تر لە جێ ی ئەکرێت.

وەئەگەر تێك چووبوو نەئەتوانرا چاك بکرێتەوە ئەوە بە ڕماوی ئەفرۆشرێتەوە، وەبە نرخەکەی شتێکی تر لە جیاتی ئەکرێتەوە.

ئەمانە هەموو دروستن چونکە ئەگەر ئەصڵەکە مەبەستی پێ نەهاتە دی شتێکی تر ئەخرێتە جێی.

دووەم: گۆڕینەوە لەبەر بەرژەوەندی‌یەکی لەپێشتر، وەك گۆڕینی (هدی) بە قوربانی‌یەکی چاکتر، وە وەك مزگەوت کە لەجیاتی ئەو مزگەوتێکی شیاوترو چاکتر بۆ خەڵکی شارەکە دروست بکرێت و یەکەمیان بفرۆشرێت.

ئەوەو شێوەکانی لای ئەحمەد وزانایانی تر دروستە. وە ئەحمەد بەڵگەی بەوە هێناوەتەوە کە عومەر ﷺ مزگەوتە کۆنەکەی کوفەی گوێستەوە بۆ شوێنێکی تر ومزگەوتە، کۆنەکە کرا بە بازاڕی خورما فرۆشەکان. ئەمەش گۆڕینی زەوی مزگەوتە بەڵام گۆڕینی بیناکەی بە بینایەکی تر، عومەر و عثمان خوایان لێ ڕازی بێت مزگەوتەکەی پێغەمبەریان ﷺتێك دا وبیناکەیان گۆڕی وگەورەشیان کرد، وەهەروەها مزگەوتی حەرامیش بەوشێوەیە بوو. وە سابت بوە لە صەحیحی موسلیم و بوخاری‌دا کە پێغەمبەر ﷺ بە عائیشەی فەرموو: (لولا أن قومك حديثو عهد بجاهلية لنقضت الكعبة، ولألصقتها بالأرض ولجعلت لها بابين، باباً يدخل الناس منه، وباباً يخرج منه الناس)[1].

واتە: ئەگەر ئەم خەڵکە تازە ئیسلام نزیك بە سەردەمی جاهلی‌یەوە نەبونایە، کەعبەم لا ئەبرد وئەم لکاند بە زەوی‌یەوە و دوو دەرگام بۆ دروست ئەکرد، دەرگایەك بۆ چوونە ژوورەوەی خەڵك ودەرگایەك بۆ هاتنە دەرەوە.

جا ئەگەر ئەو بەرهەڵستە بەهێزە نەبوایە پێغەمبەر ﷺ شێوەی دروست کردنی کەعبەی ئەگۆڕی، کەواتە دروستە بینای وەقف بگۆڕرێت لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی تر لەبەر بەرژەوەندی‌یەکی لەپێشتر، بەڵام گۆڕینی زەوی‌یەکەی بە زەوی‌یەکی تر ئەوە ئەحمەد وجگە لەو دانیان بە دروستیدا ناوە

(١) البخاري (١٥٨٤) ومسلم (١٣٣٣/٣٩٨).

بە شوێن کەوتنی یارەکانی پێغەمبەر ﷺ چونکە عومەر ﷺ کردوویەتی، وە مەسەلەکە بڵاویش بۆتەوەو کەسیش ئینکاری لێ نەکردووە.

بەڵام ئەو شتانەی کە سودەکەیان ئەکرێت بە وەقف ئەگەر بە شتێکی چاك تر لە خۆی بگۆڕرێن وەك ئەوەی خانوویەك یا دووکانێك یا باغێك یا گوندێك بکاتە وەقف و سودەکەی کەم بێت، لەبەر ئەوە بیگۆڕێت بە شتێکی تر کە سودی زۆرتر بێت بۆ وەقف.

ئەوە ئەبوثەور وزانایانی تر ڕێیان داوە بە کردنی ئەو کارە، وەك ئەبوعوبەیدی کوڕی حەربەوەیهی قازی میصر کە بەوە حوکمی داوە. ئەوەش قیاس کراوە لەسەر قسەی ئەحمەد دەربارەی گۆڕینی مزگەوت لە زەوی‌یەکەوە بۆ زەوی‌یەکی تر لەبەر بەرژەوەندی. جا ئەگەر دروست بێت مزگەوت بگۆڕێت بە شتێك کە مزگەوت نەبێت وەك کردنی مزگەوت بە بازار، ئەوە گۆڕینی شتێکی بەرهەم دەر بە شتێکی تری بەرهەم دەر کە لەو بەرهەمەی زۆرترە لەپێشترو شیاوترە کە دروست بێت، ئەمەش قیاس کردنی‌یەتی لەسەر گۆڕینی (هدي) قوربانی بە قوربانی‌یەکی چاکتر. وە دانی بەوەدا ناوە ئەگەر مزگەوت بە زەوی‌یەوە لکابوو بەرز کرایەوە ژێرەکەیان کردە کانی ودراوسێکانی مزگەوت ڕازی بوون ئەکرێت.

بەڵام هەندێك لە هاوەڵەکانی (ئیمام ئەحمەد) گۆڕینی مزگەوتیان قەدەغە کردووە، وەهەروەها (هدی) و زەوی وەقف کراو، ئەمەش قسەی شافیعی وزانایانی ترە[1].

بەڵام دەقەکان و (آثار) بۆ ماوەکانو قیاس دروستی گۆڕینی پێویست ئەکات لەبەر بەرژەوەندی.

حەرامی زیان دان لە وەرەثە:

حەرامە کەسێك شتێك وەقف بکات ئەو وەقف کردنە زیان بگەیەنێت بە میرات گرەکان بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (لاضرر ولاضرار في الإسلام).

واتە: زیان و زیان گەیاندن نی‌یە لە ئیسلام دا.

جا ئەگەر بەو شێوەیە وەقف بکات بەتاڵە.

لە (الروضة الندية) دا فەرمویەتی: سەرئەنجام ئەو وەقفانەی مەبەست لێیان بڕینی ئەو شتانەیە کە خوا فەرمانی داوە بە گەیاندنیان وپێچەوانە کردنی فەرزەکانی خوا بێت لە بنەڕەتەوە باتڵن و بە

(١) ئەوەش قسەی مالیکە وبەڵگەشیان فەرموودەکەی پێغەمبەرە ﷺ کە فەرموویەتی: (لايباع أصلها ولاتبتاع ولاتوهب ولاتورث).

واتە: ئەصڵەکەی نە ئەفرۆشرێت و نە ئەبەخشرێت ونەبەمیرات ئەگیرێت.

هیچ جۆرێك پێك نایەن، وەك ئەوەی کەسێك وەقف بکات لەسەر ئەو منداڵانەی نێرن جگە مێینەکان، وەهەروەها ئەو شتەی لەم کارە ئەچێت، چونکە ئەو وەقفە بۆ نزیك بوونەوە نی‌یە لە خواوە بەڵکو مەبەست لێ‌ی پێچەوانە کردنی حوکمەکانی خوایە و بەربەرەکانی ئەو یاسایەیە کە خوا بۆ بەندەکانی داناوە. و ئەو جۆرە وەقفە ستەمە هۆیەکە بۆ گەیشتن بە مەبەستی شەیتانی.

جا با ئەمەت لەبیر بێت، چونکە زۆر لەم شێوانە ئەکرێت لەم سەردەم و زەمانەدا، وە هەر بەو شێوەیەیە وەقفی ئەوکەسەی کە ئەیەوێت ماڵەکەی لە بنەماڵەدا دەرنەچێت لەبەر ئەوە لەسەر نەوەکانی وەقف ئەکات، وەئەوە نەبێت هیچ پاڵی پێوە نەناوە بۆ ئەو کارە. ئەو جۆرە کەسانە مەبەستیان پێچەوانە کردنی حوکمی خوایە. کە ئەویش گوێستنەوەی موڵکە بە میراتی و دانە دەستی میراتگرەکەیەتی تا هەرچی لێ‌ی ئەکات بیکات، وە کاری دەوڵەمەندی وەرەسەو هەژاریان بەدەست ئەو وەقف کەرە نی‌یە بەڵکو بەدەست خوای گەورەیە، وە جاری وا هەیە بە دەگمەن لەم جۆرە وەقفەدا -وەقف کردن لەسەر نەوە- هۆی نزیك بونەوەی تێدایە لە خواوە بەپێ‌ی جیاوازی کەسەکان جا ئەبێ خاوەن هۆش باش سەیری ئەو هۆیانە بکات کە پێویستن بۆ ئەو نزیکی‌یە.

وە لەم حاڵەتە دەگمەنە ئەوەیە کە کەسێك وەقف بکات لەسەر ئەوانەی خەریکی خێرو چاکەن لە نەوەکانی یا خەریکی فێربونی زانستن، ئەوە ئەو وەقفە لەوانەیە مەبەست تێ‌یدا ڕەزای خوا بێت و نزیك بونەوەی تێدا بەدی بێت وە پاداشتی کردەوەکانیش بەپێ‌ی نیاز ونیەتن، بەڵام سپاردنی کارەکە بۆ ئەو جۆرەی کە خوا دایناوەو پێ‌ی ڕازی‌یە لەنێوان بەندەکانیا چاکترەو لەپێشترە.

## بەخشش (الهبة)

**پێناسەکەی:**

لە قورئان دا هاتووە کە ئەفەرموێت: ﴿قَالَ رَبِّ هَبْ لِي مِنْ لَدُنْكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ الدُّعَاءِ﴾ (آل عمران/٣٨).

واتە: ووتی: ئەی پەروەردگارم پێم ببەخشە لە لایەن خۆتەوە منداڵێکی سروشت پاك، بەڕاستی تۆ بیسەری پاڕانەوەیت.

(هبة) : لە هەڵکردنی باوە هاتووە. وە لێرەدا مەبەست لە هیبە بەخششو شت دانو چاکەکردنە لەگەڵ کەسێکی تر بە ماڵ بێت یا بە شتی تر.

وە لە شەرعدا: پەیمانێکە ناوەڕۆکەکەی ئەوەیە کە ئادەمیزاد کەسێکی تر ئەکاتە خاوەنی ماڵی خۆی لە ژیاندا بێ بەرامبەر وبریتی، جا ئەگەر کەسێك ماڵی خۆی ڕەوا کرد بۆ کەسێکی تر بۆ ئەوەی سوودی لێ وەربگرێت بەڵام نەیکردە خاوەنی ئەوە ئەبێتە خواستەمەنی و عاری‌یە.

وە هەروەها ئەگەر شتێكی پێ بەخشی كە ماڵ نەبو وەك ئارەق و مردارەوە بوو ئەوە نە ئەو كەسە بەخشەرە نەئەو پێ دانەش بەخشینە. وەئەگەر بوونە خاوەنی لە ژیانی ئەو كەسەدا نەبوو بەڵكو خرابووە دوای مردنی خاوەنی ئەوە وەسیّتە، وەئەگەر بە بریتی بوو[1] ئەوە فرۆشتنە وحوكمی فرۆشراوی لەگەڵدا ئەكرێت واتە بە تەواو بوونی پەیمان بەستن ئەبێتە خاوەنی ئیتر خاوەنەكەی پێشووی ناتوانێ تەسەروفاتی تێدا بكات بە پرسی ئەو كەسە نەبێت كە پێی بەخشراوە. وە ئارەزووی شوفعە و خیاری تێدا سابت ئەبێت. وە مەرجە كە بریتی‌یەكە مەعلوم و زاندراو بێت، جا ئەگەر نامەعلوم بو ئەوە بەخششەكە هەڵدەوەشێتەوە.

وە بەخششی موتڵەق ئەبێت بریتی نەبێت جا ئەو بەخششە بۆ كەسێكی وەك خۆی بێت یا لە خوار خۆیەوە یا لەسەرو خۆیەوە بێت یەكسانە. تا ئەوەیە مانای بەخشش بە واتای تایبەت. بەڵام بە واتای گشتی ئەمانەی خوارەوە ئەگرێتەوە:

١- گەردن ئازاد كردن: ئەویش بەخشینی قەرزە بە قەرزدار.

٢- خێر وصەدەقە: ئەویش بەخششێكە مەبەست لێی پاداشتی رۆژی دواییە.

٣- پێ بەخشین (الهدیة) : ئەوەیە كە پێ بەخشراو ناچار ئەكات كە بریتی بدات.

**دانانی لە یاسای ئیسلامدا:**

خوای گەورە بەخششی داناوە لەبەر ئەوەی دڵ ڕاهێنان وپێكەوە بەستنەوە وخۆشەویستی لە نێوان خەڵكدا بەهێز ئەكات.

لە ئەبوهورەیرەوە ﷺ كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (تهادوا تحابوا). أخرجه البخاري في الأدب المفرد. والبيهقي. وقال الحافظ: إسناده حسن[2].

واتە: دیاری ببەخشن بە یەك بۆ ئەوەی‌یەكترتان خۆش بوێت.

پێغەمبەر ﷺ خۆی دیاری وەرئەگرت و پاداشتی ئەدایەوە لەسەری و خۆی فەرمانی ئەدا بۆ وەرگرتنی و هانی خەڵكی ئەدا بۆ دیاری وبەخشش دان.

---

(١) ئەبو حنیفە ڕای وایە كە بەخشش بە مەرجی بریتی لە سەرەتاوە بەخششە وە لە كۆتاییدا فرۆشتنە، وە لەسەر ئەوەوە بەخشش پێش تەسلیم كردنی بریتی‌یەكە نابێ بە موڵك ئیللا بە وەرگرتن نەبێت، وە تەسەروفاتی پێ بەخشراو تێدا بەجێ نایات لە پێش وەرگرتنەكەدا. بەڵام بەخشەر ئەتوانێ تەسەروفی تێدا بكات.

(٢) البخاري في الأدب المفرد (٥٩٤) والبيهقي (١٦٩/٦) والحاكم في معرفة علوم الحديث (٨٠)، والقضاعي في مسند الشهاب (٤٢٧).

لای ئەحمەد لە حەدیسی خالدی کوڕی عەدیدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من جائه من أخيه معروف من غير إشراف ولا مسألة فليقبله ولايرده فإنما هو رزق ساقه الله إليه)[1].

واتە: هەرکەس لەلایان براکەیەوە دیارییەکی بۆهات بێ ئەوەی چاوەڕوانی بوبێت یا داوای کردبێت با وەری بگرێت ونەی گێڕێتەوە چونکە ئەوە ڕۆزیەکە خوا بۆی ناردووە.

پێغەمبەر ﷺ پاڵی بە خەلکەوە ناوە بۆ وەرگرتنی دیاری با شتێکی زۆر بێ نرخیش بێت. لەبەر ئەوە زانایان ڕایان وایە گێڕانەوەی کەراهەتی هەیە بە مەرجێك مانعێکی شەرعی نەبێت.

لە ئەنەسەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لو أهدي إلي كُراع لقبلتُ. ولو دعيتُ عليه لأجبت)[2]. رواه أحمد والترمذي وصححه.

واتە: ئەگەر قولەپێیەکم پێ ببەخشن وەری ئەگرم وئەگەر بۆ قولەپێیەك بانگم بکەن ئەچم.

وە لە عائیشەوە کە فەرمویەتی: ووتم: ئەی نێرراوی خوا، دوو دراوسێم هەیە، شت بۆ کامیان بە دیاری ببەم؟ فەرمووی: کامیان دەرگاکەی لێتەوە نزیك ترە[3].

لە ئەبوهوڕەیرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (تهادوا فإن الهدیه تذهب وَحَرَ الصدر)[4]. واتە: دیاری وبەخشش بدەن بە یەك چونکە دیاری ڕق وکینەی ناو سنگ ودڵ ئەتارێنێ.

(ولاتحقرن جارة لجارتها ولوشق فِرسَنِ شاةٍ)[5].

واتە: نابێ دراوسێ شتی دروسێ بە هیچ بزانێت با لەتە سمی بەرخۆلەیەکیش بێت.

وە پێغەمبەر ﷺ دیاری بێ باوەڕانی وەر گرتووە، دیاری کیسرای وەرگرتووە، وە هەروەها دیاری قەیسەر و موقەوقس، وەك چۆن خۆی دیاری و بەخششی داوە بە بێباوڕان.

بەڵام ئەوەی ئەحمەد وئەبوداود وترمزی گێڕاویانەتەوە کە (عیاض) دیاری بردووە بۆ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: موسڵمان بووی؟ ووتی: نە، فەرمووی: (إني نُهيت عن زبد المشركين)[6].

---

(١) أحمد (٤/٢٢١).

(٢) أحمد (٣/٢٠٩) والترمذي (١٣٣٨).

(٣) أحمد (٦/١٧٥) والبخاري (٢٢٥٩).

(٤) ترمذي (٢٢١٣).

(٥) البخاري (٦٠١٧) ومسلم (١٠٣٠).

(٦) أحمد (٤/١٦٢) وأبوداود (٣٠٥٧) والترمذي (١٥٥٧).

واتە: من بەخششی بێ باوەڕانم لێ قەدەغە کراوە.

(خطابي) ووتویەتی: لەوە ئەچێت ئەم فەرموودەیە (نسخ) سڕرابێتەوە چونکە پێغەمبەر ﷺ دیاری زیاتر لە چەند کەسی بێباوەڕ وەرگرتووە.

شەوکانی فەرمویەتی: بوخاری لە صەحیحەکەیدا فەرموودەیەکی هێناوە دروستی وەرگرتنی دیاری بت پەرستی لێ دەرهێناوە، لە بەشی وەرگرتنی دیاری لە بێ باوەڕان باسی کردووە لە کیتابی دیاری و بەخشش.

(حافظ) لە (فتح)دا فەرمویەتی: لەو فەرموودەیەدا پوچەڵ کردنەوەی ئەو ڕایەی تێدایە کە وەرگرتنی دیاری بتپەرستان جیا ئەکاتەوە لە دیاری ئەهلی کیتاب، چونکە بەخشەری ناو براو لە فەرموودەکەدا بت پەرەست بووە.

**پایەکانی بەخشین:**

بەخشش بە (الإيجاب و القبول) دان و وەرگرتن دروست ئەبێت بە هەر زاراوەیەك بێت کە سوودی بوونە خاوەنی ماڵێکی تێدا بێت بێ بریتی وەك ئەوەی بەخشەر بڵێت: پێم بەخشیت یا بە دیاری دامیتێ یا وئەو جۆرە شتانە. وە ئەوەی تریشیان بڵێت: قبوڵم کرد.

مالیك و شافیعی ڕایان وایە کە قەبوڵ کردن لە بەخشش دا ئەبێ ئیعتیباری بۆ بکرێت.

هەندێ لە حەنەفی‌یەکان بۆ ئەوە چوون کە دان (الإيجاب) بەسە بۆ بەخشش و ئەوەش ڕاسترین ڕایە.

حەنبەڵی‌یەکان ووتویانە: بە شێوەکانی پێدان دروستە بە مەرجێ دەلالەت بکات لەسەر بەخشین. چونکە پێغەمبەر ﷺ دیاری بۆ براوە ودیاریشی ناردووە بۆ کەسانی تر، ویارەکانیشی کردوویانە، وە لێیانەوە نەقڵ نەکراوە ئیجاب و قەبولیان کردبێتە مەرج.

**مەرجەکانی:**

بەخشش ئەمانە پێویست ئەکات: بەخشەر وپێ بەخشراو وبەخشراو.

بۆ هەر یەکێ لەمانەش مەرجی خۆیان هەیە لە خوارەوە باسی ئەکەین:

**مەرجەکانی بەخشەر:**

ئەم مەرجانەی خوارەوە ئەبێ لە بەخشەردا هەبێت:

١- ئەبێ خاوەنی بەخشراوەکە بێت.

٢- نابێت حیجری لەسەر بێت بە هۆیەك لە هۆیەکانی حیجر.

٣- ئەبێ پێ گەیشتوو بێت چونکە منداڵ (أهلیة) شایستەیەتی ناتەواوە.

٤- ئەبێ بە ئارەزووی خۆی بێت چونکە بەخشین پەیمانێکە ڕازی بوون مەرجە بۆ دروستی یەکەی.

مەرجەکانی پێ بەخشراو:

١- ئەبێ کاتی بەخشینەکە ئامادە بێت جا ئەگەر هەر لە ئەصلدا ئامادە نەبوو، یا بە تەقدیری ئامادە بێت وەك ئەوەی کۆرپەلە بێت لە سکی دایکدا ئەوە ئەو بەخشینە دروست نی یە.

جا هەرکاتێك پێ بەخشراو ئامادە بو کاتی بەخشینەکە وە منداڵ بو یا شێت بو ئەوە سەرپەرشتی کەری یا وەصی یەکەی یا ئەوکەسەی پەروەردەی ئەکات با بێگانەش بێت بۆی وەرئەگرێت.

مەرجەکانی بەخشراو:

١- ئەبێ بەڕاستی ئامادە بێت ولەو کاتەدا کە ئەبەخشرێ هەبێت.

٢- ئەبێ ماڵێکی هەڵسەنگێنراو بێت.

٣- ئەبێ خاوەنی هەبێت وئاڵوگۆری پێ بکرێت، و مولکایەتی یەکەی دەست بەدەستی پێ بکرێت، کەواتە بەخشینی ئاو لە ڕووباردا وماسی لە دەریادا وباڵندە لە هەوادا، وەمزگەوت دروست نی یە ونابەخشرێت.

٤- نابێت بە مولکی بەخشەرەوە بەستراو بێت بەشێوەیەکی جێگیر وەك کشت وکاڵ ودار ودرەخت وخانوو کە زەوی یەکەیان نەبەخشرابێت، بەڵکو ئەبێ بتوانرێت لە مولکی خاوەنی جیا بکرێتەوە بۆ ئەوەی بدرێت بە پێ بەخشراو.

٥- ئەبێ جیا کراوە بێت واتە شەریکایەتی وهاوبەشی نەبێت چونکە وەرناگیرێت بە جیا کراوەیی نەبێت وەك (رهن) بارمتە، بەڵام مالیك و شافیعی وئەحمد وئەبوپهور ڕایان وایە کە ئەوە ناکرێتە مەرج وە فەرمویانە: بەخشینی شتی هاوبەشی کە بەش نەکرابێت دروستە.

وە لای مالیکی یەکان: دروستە بەخشینی ئەو شتانەی کە فرۆشتنیان دروست نی یە وەك ووشتری هەڵاتوو بەری درەختی پێ نەگەیشتوو شتی داگیرکراو کە لای داگیرکەر بێت.

بەخششی نەخۆشێك کە لە نەخۆشی سەرە مەرگدا بێت:

ئەگەرکەسێك لەسەرە مەرگ دابوو شتێکی بەخشی بە کەسێکی تر ئەوە حوکمی بەخشینەکەی وەك حوکمی وەصی یەتە هەیە. جا ئەگەر شتێکی بەخشی بە یەکێ لە میرات گرەکانی پاشان مردو میرات گرەکانی تر ووتیان: لەسەرە مەرگدا پێی بەخشیوە بەڵام پێ بەخشراو بڵێت: لە ساغیدا پێی بەخشیوم، ئەوە لەسەر پێ بەخشراو پێویستە قسەکەی سابت بکات و بەڵگە بێنێت، وە ئەگەر

بۆی سابت نەبو ئەو بەخششە بە شێوەیەك حیسابی بۆ ئەكرێت كە لەسەرە مەرگدا پێك هاتووەو حوكمەكەی ئەوەیە كە دروست نی‌یە مەگەر میرات گرەكانی تر ڕێی پێ بدەن.

وە ئەگەر بەخششەكەی لە نەخۆشی مردندا بوو لەپاشاندا چاك بووەوە ئەوە بەخششەكە دروستە.

وەرگرتنی بەخشراو:

لە زانایاندا هەیە كە ڕای وایە بەخشراو نەبێتە مافی پێ بەخشراو هەر بە پەیمانەكە، ئیتر ئەسلەن مەرج نی‌یە وەری بگرێت؛ چونكە ئەصڵ لە پەیمانەكاندا ئەوەیە كە دروست بێت بە بێ ئەوەی وەرگرتن مەرج بێت تێ‌یاندا وەك فرۆشراو، كە لەپێشەوە باس كرا.

ئەحمەد و مالیك و ئەبوثەورو ظاهیری‌یەكان بۆ ئەوە چوون.

وە لەسەر ئەوە ئەگەر بەخشەر یا پێ بەخشراو مردن پێش تەسلیم كردن ئەو بەخشینە بەتاڵ نابێتەوە چونكە تەنها بە پەیمانەكە بووەتە مولكی پێ بەخشراو.

بەڵام ئەبوحەنیفە و شافیعی و ثەوری فەرمویانە: وەرگرتن مەرجێكە لە مەرجەكانی دروستی بەخشین، جا ئەگەر وەرگرتن تەواو نەبوو ناسەپێنرێت بە سەر بەخشەردا كە بیدات بە پێ‌بەخشراو، جا ئەگەر پێ بەخشراو یا بەخشەر پێش تەسلیم كردن مرد، بەخشینەكە بەتاڵ ئەبێتەوە.

بەخشینی هەموو ماڵ:

مەزهەبی جەماوەری زانایان ئەوەیە كە بۆ ئادەمیزاد هەیە هەمو ماڵەكەی خۆی ببەخشێ بە كەسێكی تر.

موحەممەدی كوڕی حەسەن وهەندێ لە لێكۆڵەوەرەكانی مەزهەبی حەنەفی ووتویانە: دروست نی‌یە بەخشینی هەمو ماڵ با لە ڕووی خێریشەوە بێت، وە ئەوكەسەی ئەو كارە بكات بە گەوج دائەنرێت پێویستە حیجری بخرێتە سەر.

وە خاوەنی (الروضة الندیة) لەم كێشەیە كۆڵاوەتەوەو فەرمویەتی: هەركەسێك توانای ئارام گرتنی هەبێت لەسەر هەژاری و كەم دەستی قەیناكە بەشی زۆری یا هەمرو ماڵەكەی ببەخشێت، وە هەركەسێك كاتێ پێویست بوو دەستی لە خەڵك پان كردەوە وسواڵی كرد حەڵاڵ نی‌یە بۆی هەمرو یا بەشی زۆری ماڵەكەی ببەخشێت.

ئا ئەوەیە ڕوی كۆكردنەوە لە نێوان ئەوفەرموودانەی بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە تێپەڕ بون لە بەخشینی سێ‌یەكی ماڵ مەشروع نی‌یە وە لەنێوان ئەو بەڵگانەی كە دروستی بەخشینی زیاتر لە سێ‌یەك ئەگەیەنن.

**پاداشت لەسەر بەخشش:**

**پەسەندە پاداشت وەرگرتن لەسەر بەخشش ئەگەرچی لە گەورەوە بۆ خوارتریش بێ.**

**بەپێی ئەوەی ئەحمەد و بوخاری وئەبوداودو (ترمذي) لە عائیشەوە ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ دیاری وەرئەگرت و پاداشتی ئەوکەسەی ئەدایەوە کە دیارییەکەی داوە.**

**وە لە لەفزی ئیبنوئەبو شەیبەدا بەم جۆرەیە (ویثیب ماهو خیر منها)[1]. واتە: وەبە لە خۆی چاکتر پاداشتی ئەدایەوە.**

**بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئەوەی کردووە بۆ ئەوەی پاداشتی چاکە بداتەوە بە چاکەیەکی وەك خۆی تا کەس مننەتی نەبێت بە سەریەوە.**

**(خطابي) ووتویەتی: هەندێ لە زانایان خەڵکیان لەبارەی بەخششەوە کردووە بە سێ چینەوە:**

**١- بەخشینی پیاو بە لە خۆی خوارتر وەك خزمەت کار وئەو جۆرانە بۆ ڕێز لێنان ودڵ نەرمی، ئەم جۆرەیان پێویست بە پاداشت دانەوە ناکات.**

**٢- بەخششی بچوك بۆ گەورە: بۆ ئەوەی کەڵك وسوود لەوگەورەیەوە وەربگرێت وە پاداشت دانەوە لەمەدا پێویستە.**

**٣- بەخششی هاوتا بۆ هاوتا: بە زۆری لەمەیاندا بۆ خۆشەویستی ونزیك بوونەوە لە یەکەوە ئەکرێت، وە ووتراوە: کە پاداشت دانەوەی تێدا هەیە بەڵام ئەگەر شتێك بەخشرا بە کەسێك بە مەرجی پاداشت دانەوەی، ئەو پاداشت دانەوەیە لازمە.**

**حەرامی پێش خستنی هەندێ لە منداڵان لە بەخششدا:**

**دروست نییە بۆ هیچ کەس کە هەندێك لە منداڵەکانی پێش هەندێکیان بخات لە بەخششدا؛ چونکە ئەبێتە هۆی چاندنی دوژمنایەتی وبڕینی سیلەی ڕەحم کە خوا فەرمانی داوە بە بەستنی.**

**ئیمامی ئەحمەد و ئیسحاق و ثەوری و طاووس و هەندێ لە مالیکییەکان بۆ ئەوە چوون و فەرمویانە: فەزڵ دانی هەندێ لە منداڵان بەسەر هەندێکیاندا کارێکی باتڵ و ستەمە، وە پێویستە لەسەر ئەو کەسەی ئەو کارەی کردووە بەتاڵی بکاتەوە، بوخاریش بە ڕاست وڕێکی دانی ناوە بەوەدا؛ وە بەڵگەشیان لەسەر ئەوە ئەوەیە کە ئیبنوعەبباس رضي الله عنه ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ**

---

(١) أحمد (٦/٩٠) والبخاري (٥٨٥) وأبوداود (٣٥٣٦) والترمذي (١٩٥٣).

فەرموویەتی: (سووا بين أولادكم في العطية. ولو كنت مفضلا أحداً لفضلت النساء). أخرجه الطبراني والبيهقي وسعيد بن منصور، وقد حسن الحافظ ابن حجر إسناده في الفتح[1].

واتە: بە یەکسانی سەیری منداڵەکانتان بکەن لە بەخشیندا. وە ئەگەر من کەسم پێش کەس بخستایە ئافرەتم پێش ئەخست.

لە مەزهەبی ئیمام ئەحمەددا فەزڵ دانی هەندێ لە منداڵ بەسەر هەندێکی تردا کاتێك حەرامە کە هۆیەك نەبێت ئەو کارە پێویست بکات، بەڵام ئەگەر هۆیەك هەبوو ئەوە ڕێی لێ ناگیرێ.

لە شیعبی‌یەوە هاتوە لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە کە فەرمویەتی: باوکم بەخششێکی دا بە من. ئیسماعیلی کوڕی سالم لەناو خەڵکەکەدا هاواری کرد کە ئەم کابرایە بەخششێکی داوە بە یەکێك لە کوڕەکانی. ئەفەرموێ: دایکم (کە عەمرەی کچی ڕەواحە بوو) بە باوکمی ووت: بچۆرە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و بیکە بە شایەت لەسەری. ئەویش چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ووتی: من زیادە بەخششێکم داوە بە نوعمانی کوڕم، وە عەمرە داوای لێ کردم تۆ بکەم بە شاهید لەسەری. ئەڵێ: فەرمووی: ئایا کوڕێکی ترت هەیە جگە لەو؟ ئەڵێ: ووتم: بەڵێ. فەرمووی: بە هەموویان ئەو بەخششەت داوە وەك بەشی نوعمانت داوە؟ ئەڵێ: ووتم: نەء، فەرمووی: ئەوە ستەمە بچۆ کەسێکی تر بکە بە شاهید لەسەری.

موغیرە لە حەدیسەکەی خۆیدا باسی کردوە کە پێی فەرموە: ئایا پێت خۆش نی‌یە هەمویان لە چاکەکردن و بەزەییدا بەرامبەرت یەکسان بن؟ ئەڵێت: ووتم: بەڵێ، فەرموی: دە بچۆ کەسێکی تر بکە بە شاهید لەسەری.

موجاهید لە حەدیسەکەی خۆی دا باسی کردووە کە فەرموویەتی: ئەوان مافی ئەوەیان بەسەرتەوەیە کە دادپەروەر بی لەنێوانیاندا هەروەك تۆ مافت هەیە بەسەریانەوە کە چاکەت لەگەڵ بکەن[2].

ئیبنوقەیم فەرمویەتی: ئەم فەرموودەیە بە درێژی باسی ئەوعەداڵەتە ئەکات کە خوا فەرمانی پێ داوە لە کتێبەکەیدا و ئاسمانەکان وزەوی لەسەری ڕاوەستاوە، وە شەریعەتی لەسەر سابت کراوە هەر بۆیە ئەو حوکمەی کە لەم فەرمودەیەدا هاتوە لە هەموو قیاس و پێوانەیەکی سەر ڕووی زەوی زیاتر ڕێك ئەکەوێت لەگەڵ قورئاندا وە دەلالەت کردنەکەی ئەوپەڕی موحکەم و ئاشکرایە، بەڵام

---

(١) الطبراني في الكبير (١١/٣٥٤) والبيهقي (٦/١٧٧) وتلخيص الحبير (٣/٧٢).

(٢) البخاري (٢٥٨٦و٢٥٨٧) ومسلم (١٦٢٣/١٣).

هەندێك بە حەدیسێکی موتەشابیە ڕەدی ئەم حەدیسە موحکەمەیان داوەتەوە، حەدیسە موتەشابیهەکەش ئەمەیە کە ئەفەرموێ: (کل أحد أحق بماله من ولده والناس أجمعين). واتە: هەرکەس شایستەترە بە ماڵ و دارایی خۆی لە کوڕەکەی و هەموو خەڵك بە گشتی.

جا لەبەر ئەوەی شایستەترە بە ماڵ و دارایی‌یەکەی خۆی مانای وایە بۆی هەیە بە ئارەزوی خۆی تەسەڕوفی تێدا بکات جا ئەو هەندە بەم حەدیسە موتەشابیهە ئەوەیان قیاس کردوە کە باوك بۆی هەیە لە ماڵ و دارایی‌یەکەی خۆی بێجگە لە ئەولادی بە بێگانەش ببەخشێ، بەڵام ئەمە وانی‌یە چونکە بە زەرورەت مەعلوم و ئاشکرایە کە ئەم فەرمودە موتەشابیهە لەو دەقانەیە کە ماناو دەلالەتێکی گشتی‌یان هەیە وە قیاس هەرگیز ناتوانێ ڕوبەڕوی ئەو حوکمە ڕون و ئاشکرایە بوەستێ کە لە حەدیسەکەی پێشودایە.

حەنەفی‌یەکان و شافیعی و مالیك و جەماوەرێك لە زانایان بۆ ئەوە چوون کە یەکسانی کردن لەنێوان ئەولاددا پەسەندە، وە جیاکردنەوەیان بە بەخشش کەراهەتی هەیە، بەڵام ئەگەر کردی جێبەجێ ئەکرێت.

وە وەڵامی حەدیسەکەی نوعمانیان داوەتەوە بە دە وەڵام کە هەمویان ڕەت کراونەوە، وەك حافظ لە (فتح)دا باسی کردووە. وە شەوکانی لە (نیل الأوطار)دا ئەو دە وەڵامەی هێناوە، وا ئێمەش بە کورتی باسیان ئەکەین لەگەڵ چەند زیادەیەکی بە کەڵك، ووتویەتی:

وەڵامی‌یەکەم:

ئەوەی بەخشرابوو بە نوعمان هەموو ماڵەکەی باوکی بوو. (ابن عبدالبر) باسی کردووەو فەرمویەتی: بەشی زۆری ڕێگاکانی حەدیسەکە بە ڕاست وڕێکی ئەڵێن: هەندێ لە ماڵەکەی بووە وەك لەو حەدیسەی کە لەم بابەدا هاتوە ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات کە ئەوکوڕەی بەخششەکەی دراوەتێ منداڵ بووە، وە وەك لە لەفزی موسلیمدا هاتووە کە فەرمویەتی: (تصدق علي أبي ببعض ماله). واتە: باوکم هەندێ لە ماڵەکەی پێش کەش کردم.

وەڵامی دووەم:

ئەو بەخششە جێبەجێ نەکرابوو، بەڵکو بەشیر هاتبوو ڕاوێژ بە پێغەمبەر ﷺ بکات ئەویش پێی فەرموو: وانەکات. ئیتر وازی لێ هێنا. طەبەری باسی کردووە.

وە وەڵامی ئەمە ئەدرێتەوە بەوەی کە فەرمانەکەی پێغەمبەر ﷺ بە بەشیر بۆ گەڕانەوە لەو کارە هەستی جێبەجێ بوونی لێ ئەکرێت، وە هەروەها قسەکەی عەمرە کە ئەڵێت: ڕازی نابم هەتا پێغەمبەر ﷺ شایەتی لەسەر ئەدا..

وەڵامی سێیەم:

نوعمان گەورە بوو وە پێ بەخشراوەکەی وەرنەگرتبو بۆیە پەشیمان بوونەوە بۆ باوکی دروست بو. طەحاوی باسی کردووە.

(حافظ) فەرمویەتی: ئەوە کە ئەڵێ وەری نەگرتبو پێچەوانەی ئەوەیە کە لە بەشی زۆری ڕێگاکانی حەدیسەکەدایە بە تایبەت ئەوەی کە ئەفەرموێ: (أرجعه) واتە: بیگێڕەرەوە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لەپێشەوە بەخششەکەی دراوەتێ. وە ئەوەی بەشی زۆری ڕیوایەتەکانی لەسەرە ئەوەیە کە نوعمان منداڵ بووەو باوکی بۆی ڕاگرتوە لەبەر منداڵی. جا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا بە بەشیر ئەو بەخششە بگێڕێتەوە دوای ئەوەی کە لە حوکمی وەرگیراودا بووە.

وەڵامی چوارەم:

ئەوە کە ئەفەرموێ: (أرجعه) واتە: بیگێڕەرەوە بەڵگەی دروستی ئەو بەخششە بووە، چونکە ئەگەر ئەو بەخششە دروست نەبوایە پەشیمان بوونەوە لێی صەحیح و دروست نەئەبوو، بەڵام ئەوەی کە فەرمانی پێ داوە بە پەشیمان بوونەوە لێی لەبەر ئەوە بووە کە بۆ باوك هەیە پەشیمان ببێتەوە لەو بەخششەی کە داویەتی بە منداڵەکانی، ئەگەرچی باش وایە کە لەوکارە نەگەڕێتەوە. بەڵام پەسەندی بە یەکسانی سەیر کردنی منداڵ پارسەنگ دراوە بە سەر ئەوەدا، بۆیە فەرمانی پێ داوە بە پەشیمان بوونەوەی.

لە (فتح)دا فەرمویەتی: بەڵگە هێنانەوەیە بەومەسەلەیە چاو پێدا خشاندنەوەی ئەوێ. وە ئەوەی کە دەرئەکەوێت ئەوەیە کە مانای (أرجعه) واتە ئەو بەخششەی باس کرا مەیدەو جێبەجێی مەکە، وە ئەوەش ئەوە ناگەیەنێت کە ئەو بەخششە پێش ئەوەی فەرمان بە نەکردنی بکرێت دروست بووە.

وەڵامی پێنجەم:

ئەوە کە ئەفەرموێ: (أشهد على هذا غيري) فەرمان دانە بە شایەت گرتن لەسەر ئەوکارە، وە خۆی بۆیە ئەوکارەی نەکردووە لەبەر ئەوەی خۆی پێشەوا بووە وەکو ئەوەی بفەرموێ: من شایەتیت بۆ نادەم لەبەر ئەوەی کاری پێشەوا نیە کە شایەتی بدات، بەڵکو کاری ئەو ئەوەیە کە حوکم بدات. طەحاوی باسی کردووەو ئیبنوقەصصاریش پێی ڕازی بووەو بەدوایدا ووتویەتی: ئەوە کە کاری پێشەوا شایەتی دان نیە ئەوە ناسەپێنێت کە ئەگەر شتێکی بینی شایەنی شایەتی بوو خۆی ڕابگرێ لە شایەتی دان وە ئەو فەرمان دانەش کە باس کراوە مەبەست لێی سەرزەنشت کردنە وەك ووشەکانی تری فەرموودەکە بەڵگەن لەسەری.

(حافظ) فەرمویەتی: جەماوەری زانایان لێرەدا بەو شێوەیە فەتوایان داوە. وە ئیبنوحیببان فەرمویەتی: کاتێ پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أشهد) واتە: شایەتێکی تر بگرە، لەسەر شێوەی فەرمانەو مەبەست لێی نادروستی‌یە، وەك ئەوەی بە عائیشەی فەرمووە: (إشترطي لهم الولاء)[1].

واتە: مەرجی ئەوەیان بۆ دابنێ کە خۆیان سەرپەرشتی بکەن.

وە ناونانی کارەکەی بەشیر بە ستەمکاری لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ پشتگیری ئەوە ئەکات وەك لە ڕیوایەتەکەی ئەم بەشەدا باس کراووە.

وەڵامی شەشەم:

ئەوەی کە فەرمویەتی: (ألا سويت بينهم؟).

واتە: نەئەبوو بە یەکسانی سەیرت بکردنایە؟

مەبەست لەم فەرمانە پەسەندی‌یە و قەدەغەیی‌یەکە بۆ تەنزیهە.

(حافظ) فەرمویەتی: ئەو بەڵگەیە چاك ئەبوو ئەگەر ئەو ووشە زیادانەی تر نەهاتایە بە تایبەتی ڕیوایەتی (سو بينهم).

وەڵامی حەوتەم:

ووتویانە: ئەوەی لە حەدیسەکەی نوعماندا لەبەر کراوە (قاربوا بين أولادكم)، (واتە: نزیکی بکەن لە نێوان منداڵەکانتاندا) نەك (سووا)، وە وەڵام دراوەتەوە بەوەی کە تێوە نە لێك نزیك کردنەوە بە واجب ئەزانن و نە یەکسان کردن.

وەڵامی هەشتەم:

ئەڵێن: یەکسان بون لە بەخشینەدا لەلایەنی باوکەوە بۆ ئەولاد شوبهاوەو چوێنراوە بە یەکسان بونیان لە چاکیدا بۆ باوکیان، وە لەم شوبهاندنەدا نیشانەو قەرینەیەك هەیە دەلالەت ئەکات لەسەر ئەوەی کە فەرمانەکەی پێغەمبەر ﷺ بۆ پەسەندی‌یەتی‌یە. ئەمەش ڕەد دراوەتەوە بەوەی کە: قەدەغە کردنی جیاوازی لەنێوان ئەولادو ناوبردنی یەکسانی نەکردن بە ستەم هەردوکیان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە فەرمانەکە بۆ پێوستی و واجب بوونە، کەواتە ئەو قەرینەیە بۆ ئەوە نابێت کە فەرمانەکە لە واجب بوونەوە وەرگێڕێ بۆ پەسەندی، وە ئەگەر بگونجایە ئەوە فەرمانەکەی پێغەمبەر ﷺ لە واجبی‌یەتی‌یەوە دەکرا بە پەسەندی.

---

(١) البخاري (٥٢٨٠) ومسلم (١٧٢/١٠٧٥).

وەڵامی نۆیەم:

ئەوەی لە پێشەوە باس کرا دەربارەی ئەوەی کە ئەبوبەکر بەخششی دا بە عائیشە ڕەزیی فەرمو: ئەگەر خۆت بتکێڵایە.

وە هەروەها ئەوەی طەحاوی گێڕاویەتی‌یەوە دەربارەی عومەر کە بەخششی داوە بە عاصمی کوڕی بێ ئەوەی ئەو بەخششەی بەشی منداڵەکانی تر دابێت، جا ئەگەر جیاکردنەوەی منداڵ بە بەخشش دروست نەبوایە ئەو دوو خەلیفەیە نەیان ئەکرد.

لە (فتح)دا فەرمویەتی: عوڕوە وەڵامی باسەکەی عائیشەی داوەتەوە بەوەی کە براکانی ڕازی بوون و هەر بەوشێوەیەش وەڵامی باسەکەی عاصمیش ئەدرێتەوە، لەگەڵ ئەوەش کە کاری ئەو دوانە ناکرێتە بەڵگە بە تایبەت ئەگەر بەرەنگاری حەدیسی مەرفوع بکات.

وەڵامی دەیەم:

ئیجماعی زانایان پێك هاتووە لەسەر ئەوەی دروستە پیاو ماڵی خۆی ببەخشێ بە جگە لە منداڵەکانی خۆی، جا ئەگەر دروست بێت هەموو منداڵەکانی دەربکات و ماڵەکەی ببەخشێت بە بێگانەیەك، دروستیشە کە هەندێکیانی لێ دەربکات و ماڵەکەی ببەخشێت بە هەندێکی تر. ابن عبدالبر باسی کردووە.

(حافظ) فەرمویەتی: ئەم قسەیە لاوازی‌یەکەی ئاشکرایە چونکە قیاس کردنە لە گەڵ بوونی (نص) دەقدا.

کەواتە ئەوەی ڕاست بێت ئەوەیە کە سەیر کردنی منداڵ بە یەکسانی پێویستەو جیا کردنەوە حەرامە.

وە ئەوانەی کە بە پێویستی دائەنێن جیاوازن لە چۆنێتی بە یەکسان سەیرکردنەکەدا. موحەممەدی کوڕی حەسەن وئەحمەد وئیسحاق وهەندێ لە شافیعی‌یەکان ومالیکی‌یەکان فەرمویانە: عەدالەت ئەوەیە کە بەشی نێرینەکان دوو قاتی مێ ینەکان بدرێت وەك میرات. وە بەڵگەشیان ئەوەیە کە بەشیان لە ماڵەکەدا هەر ئەوەیە ئەگەر باوکیان کە بەخشەرە بمرێت.

وەجگە لەوان ووتویانە: جیاوازی نێوان نێر و مێ نی‌یە وڕواڵەتی فەرموودەکە فەرمان دانە بە یەکسانی سەیرکردنیان.

**پەشیمان بوونەوە لە بەخشش:**

جەماوەری زانایان بۆ حەرامی پەشیمان بوونەوە لە بەخشش چوون، با لە نێوان برایاندا یا ژن و مێردیشدا بێت، بەخششی باوك بۆ منداڵی خۆی[1] كە بۆی هەیە پەشیمان بێتەوە، بەپێی ئەوەی خاوەن سوننەكان گێڕاویانەتەوە لە ئیبنوعەبباس و ئیبنوعومەرەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لايحل لرجل أن يعطي عطيةً أو يهب هبةً فيرجع فيها إلا الوالد فيما يعطي ولده. ومثلُ الذي يعطي العطية ثُمَ يرجعُ فيها كمثل الكلب يأكل فاذا شبع قاء ثم عاد في قيئه). رواه أبوداود والنسائي و ابن ماجه والترمذي وقال: حسن صحيح) [2].

واتە: ڕەوا نییە بۆ پیاو كە شتێك ببەخشێ و پاشان لێی پەشیمان ببێتەوە بێجگە لە باوك[3] لەوەدا كە ئەیبەخشێ بە منداڵی خۆی[4]. وە وێنەی ئەوكەسەی لە بەخشین پەشیمان ئەبێتەوە وەك سەگێك وایە ئەوەندە بخوات هەتا تێر ئەبێت و بڕشێتەوە لەپاشاندا ڕشانەوەكەی خۆی بخواتەوە.

ئەمەش چاكترین بەڵگەیە لەسەر حەرامێتی.

وەلە یەكێ لە ڕیوایەتەكاندا لە ئیبنوعەبباسەوە هاتوە: (ليس لنا مثل السوء، الذي يعود في هبته كالكلب يرجع في قيئه). واتە: لەناو ئێمەدا نییە ئەو نمونە خراپەی كە پەشیمان ئەبێتەوە لە بەخشینەكەی هەروەك سەگ كە ڕشانەوەی خۆی بخواتەوە.

وەهەروەها دروستە پەشیمان بوونەوە لە بەخشین لە حاڵەتێكدا بۆیە ئەو بەخششەی دابێتێ كە شتێكی لە جیاتی بداتەوە وپاداشتی بداتەوە، بەڵام پێ بەخشراو ئەوكارە نەكات؛ بەپێی ئەوەی سالم لە باوكیەوە ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ كە فەرموویەتی: (من وهب هبةً فهو أحق بها مالم يثب منها) [5].

---

(١) مالیك فەرموویەتی: بۆی هەیە پەشیمان بێتەوە مەگەر ئەو شتەی كە بەخشیویەتی گۆڕا بێت، لەو كاتەدا بۆی نییە شتەكە بگێڕێتەوە.

ئەبو حنیفە فەرموویەتی: بۆی نییە پەشیمان بێتەوە لەوەی بەخشیویەتی بە كوڕەكەی و بە خزمەكانی تریشی، بەڵام سەبارەت بە بێگانە بۆی هەیە پەشیمان بێتەوە. ئەم بۆچوونەش بێهێزە چونكە پێچەوانەی فەرمودەكانە.

(٢) أحمد (١/٤٠) وأبوداود (٣٥٣٩) والترمذي (٢١٣٢) والنسائي (٦/٢٦٥) وابن ماجه (٢٣٧٧).

(٣) حوكمی دایكیش هەروەك باوك وایە لای بەشی زۆری زانایان.

(٤) منداڵەكە گەورە بێت یا بچوك یەكسانە.

(٥) ابن ماجه (٢٣٨٧) والدارقطني (٣/٤٤).

واتە: هەرکەس شتێکی بەخشی خۆی شایستەترە بۆی ئەگەر پاداشتی نەدرابێتەوە لەسەری.
وەئیبنوقەیم ئەوەی پارسەنگ داوەتەوە لە (إعلام الموقعين)دا فەرمویەتی: ئەو بەخشەرەی بۆی ڕەوا نیە پەشیمان ببێتەوە لە بەخشینەکەی ئەو کەسەیە کە شتەکەی بەخشیوە بە بەخشین، نەك لە پێناوی بە دەست هێنانی بریتی دا، وە ئەو بەخشەرەی بۆی هەیە پەشیمان ببێتەوە کەسێکە شتێکی بەخشی بێت بۆ ئەوەی بریتی دەست کەوێت وپاداشتی بدرێتەوە لەسەری، بەلاّم پێ بەخشراوەکە کارەکە نەکات و پاداشتەکە نەدات بە بەخشەر. بەو شێوەیە سونئەتەکانی پێغەمبەر ﷺ هەموی بەکار ئەهێنرێن و نادرێن بەسەریەکدا.

**ئەو دیاری وبەخششانەی ڕەت ناکرێنەوە:**

١- لە ئیبنوعومەرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ثلاث لا تُردُّ: الوسائد والدهن واللبن). رواه الترمذي وقال هذا حديث غريب[1]. واتە: سێ شت ڕەت ناکرێنەوە: نوێن و بۆن و شیر.

٢- لە ئەبوهورەیرەوە هاتوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من عرض عليه ريحان فلا يرده لأنه خفيف المحمل طيب الريح)[2]. رواه مسلم. واتە: هەرکەس ڕێحانەی پێشکەش کرا با نەیگێڕێتەوە چونکە هەڵگرتنی سوکە و بۆنیشی خۆشە.

٣- لە ئەنەسەوە کە پێغەمبەر ﷺ بۆنی دیاری ڕەت نەئەکردەوە[3].

**سوپاس و ستایش کردنی بەخشەرو دوعا بۆ کردنی:**

لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من لم يشكر الناس لم يشكر الله) ئەحمد و (ترمذي) بە ئیسنادێکی صەحیح گێڕاویانەتەوە[4]. واتە: هەرکەس سوپاسی خەڵك نەکات سوپاسی خواش ناکات.

٢- لە جابیرەوە هاتوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرمویەتی: (من أعطي عطاءً فوجد فليجزيه، ومن لم يجد فَلْيُثن، فإن من أثني فقد شكر، ومن كتَمَ فقد كفر، ومن تحلى بمالم يعط كان كلابس ثوبي زور). رواه أبوداود والترمذي[5].

---

(١) الترمذي (٢٧٩٠).

(٢) أحمد (٢/٣٢٠) ومسلم (٢٢٥٣) وأبوداود (٤١٧٢) والنسائي (٨/١٨٩).

(٣) الترمذي (٢٧٨٩).

(٤) عبد الله بن أحمد كما في أطراف المسند (٧٤٥٧) وابن أبي الدنيا في كتاب الشكر (٦٣).

(٥) أبوداود (٤٨١٣و٤٨١٤٠) والترمذي (٢٠٣٤) وابن حبان (٣٤٠٦).

واتە: هەرکەس شتێکی پێ بەخشرا و دەوڵەمەند بوو با پاداشتی ئەوکەسە بداتەوە و هەرکەس نەیبوو با ستیاشی بکات چونکە هەرکەس ستایشی کرد ئەوە سوپاس گوزاری کردووە، وەهەرکەس شاردی‌یەوە کوفری کردووە. هەرکەس خۆی بە شتێکەوە هەڵنێت کە نەیبێت وەك کەسێکە کە دو جلی درۆی لەبەر کردبێت.

٣- لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە هاتوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من صُنع إليه معروفٌ فقال لفاعله: جزاك الله خيراً فقد أبلغ في الثناء). رواه الترمذي بأسنادٍ جيد[1]. واتە: هەرکەس چاکەیەکی لەگەڵدا کراو بە چاکە کەرەکەی ووت: خوا جەزای بە خێرت بداتەوە، ئەوە ئەوپەڕی ستایشی کردووە.

٤- لە ئەنەسەوە هاتوە کە فەرمویەتی: کاتێ پێغەمبەر ﷺ هاتە مەدینە کۆچ کەرەکان هاتن و وتیان: ئەی نێرراوی خوا! کەسمان نەدیوە ئەوەندە بەخشندە بێت لەکاتی ماڵ زۆریداو ئەوەندە جوان دڵنەوایی بکات لەکاتی ماڵ کەمیدا لەم خەڵکەی کە ئێمە هاتوینە ناویان، بەڕاستی ئەوان بەسمان بون لەوم سەختی و ناڕەحەتی‌یەدا، و هاوبەشیان کردین لە رزق و ڕۆزی و هەمو پێویستی‌یەکی ژیاندا، هەتا ترسی ئەوەمان هەبوو کە هەمو پاداشتەکان ببەن بۆ خۆیان. ئەویش فەرمووی: (لا، ما دعوتم لهم وأثنيتم عليهم). رواه الترمذي باسناد صحيح[2]. واتە: نا، مادام ئێوەش بۆیان بپارێنەوە وستایشیان بکەن.

## بەخششی تەمەنی (العُمْرَى)

(عُمْرَى) جۆرێك بەخشینە ئەویش ئەوەیە کە کەسێك دیاری‌یەك ببەخشێ بە کەسێکی تر هەتا کۆتایی تەمەنی. واتە کاتێ پێ بەخشراوەکە مرد شتەکە ئەگەڕێتەوە بۆ بەخشەر.

وە بە زاراوەی: ئەم شتە یا ئەم خانووەت پێ ئەبەخشم بە درێژایی تەمەنت بۆ خۆت، وەلەو شێوە زاراوانە.

وە بە زمانی عەرەبی بە بەخشەرەکە ئەووترێ: (مُعْمِر) وەبە پێ بەخشراوەکە ئەووترێ: (مُعْمَر).

پێغەمبەر ﷺ بۆچونی گێڕانەوەی بەخشراو لە دوای مردن بۆ بەخشەری بە بەتاڵ داناوە، وە بوونە خاوەنی هەمیشەیی لە بەخششی تەمەنی دا چەسپاندووە هەتا ئەو کەسە زیندو بێت پاشان

(١) ترمذي (٢٠٣٥) والنسائي في عمل اليوم والليلة ١٨١).

(٢) أبوداود (٤٨١٢)، نسائي في عمل اليوم والليلة ١٨١).

دوای خۆی بۆ میرات گرەکانی ئەبێت ئەگەر میرات گری هەبوو. وە ئەگەر میراتگری نەبو بۆ (بیت المال) ئەبێت، وە هیچ ناگەرێتەوە بۆ بەخشەر.

١- لە عوروەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من أعمر عمرى فهي له ولِعقبه يَرِثُها من يرثه مِنْ عقبه من بعده)[1]. واتە: هەرکس بەخششێکی تەمەنی بەخشی ئەوە پێ بەخشراو ونەوەکانی دوای خۆی ئەبنە خاوەنی ئەو شتە وئەبێتە ماڵی میرات گرەکانی کە بەجێی هێشتوون لەدوای خۆی.

٢- لە ئەبوهورەیرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (العُمرى جائزة) أخرجه البخاري ومسلم وأبوداود والنسائي[2]. واتە: بەخششی تەمەنی دروستە.

٣- لە ئەبوسەلەمەوە هاتوە لە جابیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرموو: (العمرى لمن وُهِبَت له). أخرجه البخاري ومسلم وأبوداود والنسائي[3]. واتە: بەخششی تەمەنی بۆ ئەوکەسەیە کە پێی بەخشراوە.

٤- وە هەر لە جابیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (أيما رجل أعْمَرَ عُمرى له ولعقبه فإنها للذي يُعطاها لاترجع للذي أعطاها لأنه أعطي عطاءً وقعت فيه المواريث). أخرجه مسلم وأبوداود والترمذي والنسائي وابن ماجه[4]. واتە: هەرپیاوێك بەخششێکی تەمەنی بەخشی بە کسێك، ئەو کسە ئەبێتە خاوەنی و هەروەها نەوەکانی دوای خۆی، وە ناگەرێتەوە بۆ ئەوکسەی بەخشیوێتی چونکە شتێکی پێ بەخشیوە میراتی تێ ئەکەوێت وبە میرات ئەبرێت.

٥- وە ئەبوداود لە طارقی مەککیەوە ئەگێرێتەوە کە جابیری کوڕی عبدالله فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ژنێکی ئەنصاری کە کوڕەکەی باغێکی دابو پێیو ژنەکە مردبوو. جا کوڕەکەی ئەی ووت: من داومەتێ بە درێژایی تەمەنی. وەئەو کوڕە برای هەبوو. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (هي لها حياتها وموتها). واتە: ئەو باغە بۆ خۆی ئەبێت لە ژیان دا ولە دوای مردنیش.

---

(١) البخاري (٢٦٢٥) ومسلم (١٦٢٥).

(٢) أحمد (٢/٤٦٨) والبخاري (٢٦٢٦) ومسلم (١٦٢٦) وأبوداود (٣٥٤٨) والنسائي (٣٧٨٦).

(٣) البخاري (٢٦٢٥) ومسلم (١٦٢٥) وأبوداود (٣٥٥٣) والنسائي (٦/٢٧٤).

(٤) مسلم (١٦٢٥) وأبوداود (٣٥٥٣/٣٥٥٨) والترمذي (١٣٥٠و١٣٥١) والنسائي (٦/٢٧٢)، وابن ماجه (٢٣٨٠).

کوڕەکە ووتی: بە خێر پێم بەخشی بوو. فەرموی: (ذاك أبعد لك)[1]. واتە: بەو شێوەیە زیاتر دورە لێتەوە وتازە ماڵی تۆ نیيە.

وەحەنەفیەکان وشافیعی و ئەحمەد بۆ ئەوە چوون.

مالیك فەرمویەتی: بەخششی تەمەنی بوونە خاوەنیيە لە کەڵکەکەیدا نەك لە شتە بەخشراوەکەدا، جا ئەگەر بە شێوەیەك پێی بەخشی هەتا تەمەنی ئەمێنێ، ئەوە بەدرێژایی تەمەنی خاونیيەتی و نادرێت بە میرات گرەکانی، بەڵام ئەگەر بەخشیبێتی بە خۆی ونەوەکانی ئەوە ئەبێتە میرات بۆ خێزانەکەی، بەڵام فەرموودەکەی پێشو بەڵگەیە لە دژی مالیك لەم بۆچوونەدا.

## بەخششی چاودێری (الرُقبی)

**پێناسەکەی:**

ئەوەیە کە یەکێك بە کەسێکی تر بڵێت: ئەم خانووەم دا بە تۆ هەتا ماوی جا ئەگەر پێش من مردی ئەگەڕێتەوە بۆ خۆم وئەگەر من پێش تۆ مردم ئەوە بۆ خۆت ونەوەکانت. جا هەریەکەیان چاودێری مردنی ئەوەی تریان ئەکات، ئیتر ئەو خانووە کە کراوە بە (رُقبی) بۆ ئەوکەسە ئەبێت کە ئەمێنێ لەو دووانە.

موجاهید فەرمویەتی: بەخششی تەمەنی ئەوەیە کە پیاوێك بە پیاوێکی تر بڵێت: ئەمە بۆ تۆ هەتا ئەمریت، کە ئەوەی ووت، ئیتر ئەو شتە ئەبێتە موڵکی ئەو کابرایە ومیرات گرەکانی.

و بەخششی چاودێری: ئەوەیە کەسێك بە کەسێکی تر بڵێت: لە منەوەو لە تۆوە. (واتە: ئەگەر مردیت ئەوە ماڵەکە ئەگەڕێتەوە بۆ من و ئەگەر مردم بۆ تۆ).

**ڕەوابونی ئەو جۆرە بەخششە لە یاسای ئیسلامدا:**

ئەو جۆرە بەخششە ڕەوایە لە یاسای ئیسلامدا.

لە جابیرەوە ﷺ هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (العُمری جائزة لأهلها. والرُقبی جائزة لأهلها). أخرجه أبوداود والنسائي وابن ماجه وقال الترمذي: حسن[2]. واتە: بەخششی تەمەنی دروستە بۆ خاوەنی خۆی. وە بەخششی چاودێری دروستە بۆ خاوەنی خۆی.

**حوکمەکەی:**

---

(١) أبوداود (٣٥٥٧).

(٢) أحمد (١/٢٥٠) والنسائي (٦/٢٧٢) وأبوداود (٣٥٥٨) والترمذي (١٣٥١) وابن ماجه (٢٣٨٣).

حوکمی بەخششی (رُقبی) هەروەك حوکمی بەخششی (عُمری) وایە لای شافیعی و ئەحمەد، کە ئەوەش حوکمی ڕواڵەتی فەرموودەکەیە.

ئەبوحەنیفە فەرمویەتی: (عُمری) بە میرات ئەبرڕێت، بەڵام (رقبی) (عاریة) خواستەمەنیە.

## نەفەقە

لە پێشەوە باسمان کرد کە نەفەقەی ژن پێویستە لەسەر مێردەکەی، ماوەتەوە باسی نەفەقەی دایك وباوك بکەین لەسەر کوڕەکانیان ونەفەقەی کوڕ لەسەر باوکی ونەفەقەی خزم وکەس وکار ونەفەقەی ئاژەڵ.

### نەفەقەی دایك وباوك و وەرگرتنی لە ماڵی کوڕەکانیان:

نەفەقەکێشانی دایك وباوکی دەست تەنگ پێویستە لەسەر کوڕ کاتێ ئەو کوڕە ئەوەندەی هەبوو نەفەقەیانی لێ بکێشێ.

لە عەمارەی کوڕی عومەیرەوە لە پوریەوە کە لە عائیشەی پرسیوەو ووتویەتی: من هەتیوێك بەخێو ئەکەم ئایا لە ماڵەکەی بخۆم؟ ئەویش فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إن أطيب ما أكل الرجل من كسبه، وولده من كسبه). أخرجه أبوداود والنسائي وابن ماجه والترمذي وقال: حسن[1].

واتە: حەڵاڵ ترین شت کە پیاو بیخوات ئەوەیە بە دەستی خۆی پەیدای بکات، وە منداڵیش پەیدا کردنی خۆیەتی.

بەڵام ئەوەی دایك وباوك لە ماڵی منداڵەکانیان هەڵیگرن دروستە بۆیان، بە پرسی کوڕەکە بێت یا بێ پرسی کوڕەکە بێت، وە بۆیان هەیە تەسەرروفی تێدا بکەن بە ئارەزووی خۆیان بە مەرجێك لە رووی ئیسراف و نەزانیەوە نەبێت، بەپێی فەرموودەکەی پێشوو، وە بەپێی حەدیسی جابیر کە پیاوێك ووتی: ئەی نێرراوی خوا، من خۆم ماڵ و منداڵم هەیە و باوکم ئەیەوێ ماڵەکەم ببرێت. ئەویش فەرمووی: (أنت ومالك لأبيك). رواه ابن ماجه[2]. واتە: خۆت وماڵەکەت هی باوکتن.

وە سێ پێشەواکە بۆ ئەوە چوون کە نابێت ئەو باوك ودایکە لە پێویستی خۆیان زۆرتر ببەن.

---

(١) أحمد (٦/٤١و١٢٦) وأبوداود (٣٥٢٨) والترمذي (١٣٥٨) والنسائي (٧/٢٤١) وابن ماجه (٢١٣٧و٢٢١٩).

(٢) ابن ماجه (٢٢٩١).

ئەحمەد فەرمویەتی: بۆی هەیە ماڵی منداڵی ببات هەر کاتێ ویستی، پێویست بێت یا پێویست نەبێت.

**نەفەقەی کوڕی دەست تەنگ پێویستە لەسەر باوکی دەسەڵاتدار:**

وەك چۆن نەفەقەی باوکی کەم دەست پێویستە لەسەر کوڕی دەست دار هەر بەو شێوەیە نەفەقەی کوڕی کەم دەستیش پێویستە لەسەر باوکی دەست دار، بەپێی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ کە بە هیندی فەرموو: (خذي من ماله مايكفيك وولدك بالمعروف)[1]. واتە: بەشی خۆت ومنداڵەکانت چەندە پێویستە و باوە لە ماڵی مێردەکەت هەڵگرە.

ئەحمەد ووتویەتی: ئەگەر کوڕ باڵغ بوو تەنگ دەست بوو یا کاری نەبوو نەفەقەی لەسەر باوکی لاناچێت ئەگەر کاسبی و ماڵی نەبوو.

**نەفەقەی خزم وخوێش:**

بەڵام نەفەقەی خزم و خوێشی کەم دەست لەسەر خزم و خوێشی دەست دار، زانایان جیاوازی‌یەکی زۆریان لەسەری هەیە، لە زانایان هەیە فەرمویەتی نەفەقەیان لەسەریان واجب نی‌یە لە ڕێگای خێر وسیلەی ڕەحمەوە نەبێت.

شەوکانی فەرمویەتی: نەفەقەی خزم لەسەر خزم واجب نی‌یە لە ڕێگای گەیاندنی سیلەی ڕەحمەوە نەبێت، لەبەرئەوەی بەلگەیەك نی‌یە تایبەت بێت بەوەوە، بەلکو دەربارەی گەیاندنی سیلەی ڕەحم چەندەها حەدیس هاتون و گشتین .

وە ئەو ڕەحمەی پێویست بە نەفەقە بێت لە پێش ترین ڕەحمە بۆ گەیاندن.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِنْ سَعَتِهِ وَمَنْ قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللَّهُ لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ مَا آتَاهَا سَيَجْعَلُ اللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا﴾ (الطلاق/٧).

واتە: با دەسەڵات دارو دەوڵەمەند بەگوێرەی دەسەڵاتەکەی و دەوڵەمەندی‌یەکەی نەفەقە بدات، و هەرکەس تەنگ دەست بوو با لەوەی کە خوا پێی داوە نەفەقە بدات، وە خوا تەکلیف و داوا لە هیچ کەس ناکات مەگەر بە ئەندازەی ئەوەی کە داویەتی، وە خوا لە دوای تەنگە دەستی و سەختی ئاسانی و فراوانی ساز ئەدات.

---

(١) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

وەهەروەها ئەفەرموێت: ﴿عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وعَلَى الْمُقْتِرِ قَدَرُهُ﴾ (البقرة/٢٣٦) واتە: ئەوەی توانای ماڵی هەیە بە ئەندازەی توانای خۆی وە ئەوەی توانای ماڵی کەمەو دەست تەنگە بە ئەندازەی توانای خۆی نەفەقە بدات.

شافیعی‌یەکان وەتویانە: نەفەقە لەسەر دەوڵەمەند پێویستە موسڵمان بێت یا موسڵمان نەبێت بۆ بنەماکان وەك باو وباپیران وبەرەوژوور، وەهەروەها بۆ لقەکان وەك کوڕ وکوڕەزاو بەرەوخوار، لەوانە زیاتر بۆ کەسی تر پێویست نی‌یە.

مالیکی‌یەکان وەتویانە: نەفەقە بۆ باوك ودایك وکوڕ وکچ نەبێت پێویست نی‌یە، وە پێویست نی‌یە بۆ باپیران وکوڕەزاکان و خزمەکانی تریش وە جیاوازی ئایین ڕێ لە پێویستی نەفەقە ناگرێت.

وە حەنبەلی‌یەکان: نەفەقە لەسەر خزمی دەوڵەمەند پێویست ئەکەن بۆ خزمی هەژار، ئەوانەی ئەبنە میراتگری‌یەکتری ئەگەر مردن وماڵێکیان بەجێ هێشت، کەواتە نەفەقە لەگەڵ میراتدا ئەڕوات یەك لەدوای یەك، چونکە ئەمان ئەگەر قەرزدار بن یا شتێکیان بێتە سەر کە دانی پێویست بێت ئەوە لەسەر کەسوکارەکەی واجبە کە بۆی بدەن، و ئەوەمافانەیان لەناویەکتردا لەسەر یەکتری هەیە. وە حەنبەلی‌یەکان نەفەقە پێویست ئەکەن بۆ باووباپیرو بەرەوژوور و کوڕو بەرەوخوار.

لای ئەمانە نەفەقە پێویست نی‌یە بۆ (ذوي الأرحام) خزمی بەری ئەوانەی کە (ذوي فروض) خاوەن بەش نین، واتە میراتگر نین و لە خزمی پشتی نین، جا ئەوانە نە نەفەقە وەرئەگرن و نە نەفەقەیان لەسەرە ئەگەر لەلایەنی ئەصل و فەرعەوە نەبن ئەوەش لەبەر لاوازی خزمایەتی‌یان و نەبونی دەقێکی قورئانی یا فەرموودەیەك لەبارەیانەوە.

وە ئیبنوحەزم فراوانی کردووەو فەرمویەتی: زۆر لە خزمی دەسەڵاتدار ئەکرێت بۆ کێشانی نەفەقەی باووباپیرەکانی و بەرەو ژوور ئەگەر دەست کورت بون، وە بۆ کوڕ و کچ وبەرەوخوار. وەهەروەها نەفەقەکێشان پێویستە بۆ براو خوشك وخێزان. ئەمانە هەموو یەکسانن لە پێویست بوونی نەفەقەداو کەسیان پێش کەسیان ناخرێت. جا ئەگەر دوای ئەوەی نەفەقە و پۆشاکی ئەوانە تەواو بوو، و شتێك زیاد بوو زۆری لیّ ئەکرێت کە سەرفی بکات بۆ خزمانی بەری ئەوانەیان کە میرات ئەگرن و مەحرەمن، بەمەرجێك ئەوانەی باسمان کردن نە شتێکیان هەبێ و نە کارێکیان بەدەستەوە بێت کە مەسرەفی خۆیانی لیّ بکێشن، ئەوانیش مام و پوری باوکی هەرچەندە بەرەوژوور بن، وە خاڵ و پوری دایکی هەرچەندە بەرەو خوار بن، هەروەها برازا یا بەرەو خواریش بن، جا هەریەکێك لەمانە ئەگەر توانای کاری هەبوو یا کارەکەشی نزم بێت نەفەقەی بۆ نی‌یە، جگە لە باوك و دایك و باپیرەکان و نەنکەکان و خێزانەکان، چونکە لەسەری واجبە کە لە کردنی کاری نزم

دوریان بخاتەوەو بیان پارێزێت ئەگەر توانای هەبو، ئەمانەی باسمان کردن هەرچی خانوبەرەو وئاژەڵ و شت و مەکی زیاد لە خۆی هەبێت ئەفرۆشرێت بۆ ئەوەی نەفەقەیانی لێ بکێشێت.

**نەفەقەی ئاژەڵ:**

پێویستە لەسەر ئادەمیزاد نەفەقەی ئاژەڵەکان و وولاغەکان وگیان لەبەرانی تری خۆی بکێشێ، و ئەوەی ژیانیان لەسەریەتی لە خواردن وخواردنەوە بۆیانی ئامادە بکات، وە ئەگەر نەی کرد ئەبێ حاکم زۆری لێ بکات بۆ کێشانی نەفەقەیان یان فرۆشتنیان یان سەربڕینیان، جا ئەگەر هەر نەیکرد حاکم چۆن بە باشی ئەزانێت تەسەڕروف ئەکات.

١- لە ئیبنوعومەرەوە ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (عذبت امرأة في هرة سجنتها حتى ماتت فدخلت فيها النار، لاهي أطعمتها وسقتها إذ حبستها، ولا هي تركتها تأكُلُ من خشاش الأرض)[1].

واتە: ژنێك ئەشکەنجە دراو چوە ئاگرەوە بەهۆی پشیلەیەکەوە کە بەندی کرد هەتا مرد، چونکە نە خۆی هیچی دایە بیخوات وبیخواتەوە کاتێك بەندی کردبو، و نە بەرلای کردبو لە خشۆکەکانی زەوی بخوات.

٢- لە ئەبوهورەیرەوە ﷺ هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (بينما رجل يمشي بطريق اشتد عليه العطش فوجد بئراً فَنَزَلَ فيها فشرب ثم خرج فإذا كلب يلهثُ يأكل الثرى من العطش فقال الرجل: لقد بلغ هذا الكلب من العطش مثل الذي كان بلغ مني. فنزل البئر فملأ خفه ماءً ثم أمسكه بفيه حتى رقي فسقى الكلب فشكر الله له فغفر له). واتە: جارێکیان پیاوێك بە ڕێگایەك دا ئەڕۆیشت تینویەتی زۆری بۆ هێنا پاشان بیرێکی دۆزیەوە چووە ناوی وتێر ئاوی خواردەوەو پاشان هاتە دەرەوە سەگێکی بینی هەناسە بڕکێی بوو گڵی ئەخوارد لە تینوا پیاوەکە ووتی: بەڕاستی ئەو سەگە لە تینوا وەك منی لێ هاتووە کە تینوم بوو. جا چووەوە ناو بیرەکەو پێڵاوەکەی پڕکرد لە ئاو وبەدەمی گرتی هەتا هاتەوە سەرەوەو سەگەکەی تێرئاو کرد، خوای گەورەش سوپاسی کردو لێی خۆش بوو. ووتیان: ئەی نێرراوی خوا، بۆچی لەسەر ئاژەڵیش پاداشتمان هەیە؟ فەرمووی: (في كل كبدٍ رطبة أجرٌ)[2].

واتە: لەسەر هەموو جگەر تەڕێك پاداشتان ئەدرێتەوە کە چاکەی لەگەڵ بکەن.

---

(١) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

(٢) أحمد (٢/٥١٧) والبخاري (٢٣٦٣) ومسلم (٢٢٤٤/١٥٣).

## ڕێ لێ گرتن (الحجر)

**پێناسەکەی:**

حیجر لە زمانی عەرەبیدا بە مانای تەنگ کردنەوەو ڕێ لێ گرتن دێت وە لەو مانایەیە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمووی بەو کەسەی ئەی ووت: (اللهم ارحمني وارحم محمداً ولا ترحم معنا أحداً) :

(لقد حجرت واسعاً يا أعرابي)[1].

واتە: کاتێ کابرا ئەپاڕایەوە ئەی ووت: (خوایە ڕەحم بە من و محمد بکەو ڕەحم بە کەسی تر مەکە لەگەڵماندا.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕەحمی فراوانت تەنگ کردەوە ئەی عەرەبی دەشتەکی.

وە ماناکەی لە شەرعدا: ڕێ گرتنە لە ئادەمیزاد گرتنە لە تەسەڕڕوف کردن لە ماڵەکەیدا.

**بەشەکانی:**

**حیجر ئەکرێت بە دوو بەشەوە:**

یەکەم: حیجرکردن لەبەر مافی کەسێکی تر وەك: حیجرکردن لەسەر موفلیس، کە قەدەغە کردنە لە کە تەسەڕڕوف کردن لە ماڵەکەیدا لەبەر پاراستنی مافی خاوەن قەرزەکان. وە پێغەمبەر ﷺ حیجری دانا لەسەر موعازو ماڵەکەی فرۆشت بۆ قەرزەکانی. سەعیدی کوڕی مەنصور گێڕاویەتیەوە[2].

دووەم: حیجر کردن لەبەر پاراستنی گیان وەك: حیجر دانان لەسەر منداڵ و گەوج و شێت، حیجر دانان لەسەر ئەمانە بەرژەوەندی‌یەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ خۆیان بە پێچەوانەی موفلیسەوە.

**حیجر دانان لەسەر موفلیس:**

موفلیس ئەو کەسەیە کە نە ماڵی هەیە و نە شتێکی هەیە پێویستی خۆی پێ جێبەجێ بکات وە لە هەژاریدا ئەگاتە پلەیەك پی‌ی ئەڵێن: فلسی پێ نی‌یە.

وە پی‌ی ئەوترێ: موفلیس هەرچەندە ماڵیشی هەبێت چونکە ماڵەکەی مافی خاوەن قەرزەکانی‌یەتی جا وەك ئەو کەسەی لێ دێ کە هیچی نەبێت، و زانایانی فیقهی پێناسەیان

---

(١) أحمد (٢/٢٣٩) والبخاري (٦٠١٠) وأبوداود (٣٨٠) والنسائي (٣/١٤).

(٢) الدارقطني (٤/٢٣١) والبيهقي (٦/٤٨) والحاكم (٣/٢٧٣).

کردووە: کە ئەوکەسەیە زۆر قەرزدار ئەبێت و هیچی بە دەستەوە نابێت قەرزەکانی پێ بداتەوە، جا حاکمیش حوکم ئەدا بە ئیفلاس بوونی.

دەستی دەستی کردنی ئەوکەسەی کە توانای دانەوەی قەرزی هەیە :

ئەوکەسەی توانای دانەوەی قەرزی هەیە ئەگەر دوای بخات و ئەو قەرزەی لەسەریەتی نەیداتەوە هەرچەندە کاتی دانەوەیشی هاتبێ بە ستەمکار دائەنرێت، بەپێی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی: (مطل الغني ظلم)[1] واتە: قەرزکوێری دەوڵەمەند ستەمکاری‌یە.

جەماوەری زانایان بەپێی ئەو فەرمودەیە قەرز کوێری لە لایەن دەوڵەمەندەوە بە گوناهی گەورە دائەنێن، وە پێویستە لەسەر حاکم کە فەرمانی پێ بدات قەرزەکەی بداتەوە، جا ئەگەر ئەو کارەی نەکرد ئەبێ بەندی بکات هەرکاتێك خاوەن قەرز داوای کرد، بەپێی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (ليُّ الواجد يحل عرضه وعقوبته)[2]. واتە: خۆداگرتنی ئەوکەسەی دەست تەنگ نی‌یە لە دانەوەی قەرز و دەستی دەستی ئەکات شکات لێ کردن و بەندکردنی ڕەوا ئەکات.

ئیبنوموندیر فەرمویەتی: بەشی زۆری ئەو کەسانەی زانیاری‌یان لێوە وەرئەگرین لە زانایانی وڵاتان و قازی‌یەکان ڕایان وایە کە بەندکردن لەسەر قەرز دروستە.

وە عومەری کوڕی عبدالعزیز ماڵەکەی لەنێوان خاوەن قەرزەکاندا بەش ئەکرد بەڵام بەندی نەئەکرد.

لەیسیش بەوە گفتی داوە و ڕای وابووە. جا ئەگەر پێی داگرت لەسەر نەدانەوەی قەرزەکە و ماڵەکەشی نەفرۆشت، حاکم ماڵەکەی ئەفرۆشێت و قەرزەکە ئەداتەوە لەبەر دور خستنەوەی زیان لە خاوەن قەرز.

حیجر دانان لەسەر موفلیس و فرۆشتنی ماڵەکەی:

وە هەرکەس ماڵی هەبێت بەڵام قەرزەکانی نەداتەوە ئەو کاتە لەسەر حاکم پێویستە حیجری لەسەر دابنێت هەرکاتێ خاوەن قەرزەکان یا هەندێکیان داوا بکەن، ئەو کارەش بۆیە ئەکرێت تا زیانیان پێ نەگات.

---

(١) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

(٢) أحمد (٤/٣٨٨) وأبوداود (٣٦٢٨) والنسائي (٧/٣١٦و٣١٧) وابن ماجه (٢٤٢٧) والبيهقي (٦/٥١) والحاكم (٤/١٠٢) وابن حبان (٥٠٨٩) والبخاري تعليقاً (٥/٦١).

وە بۆ حاکم هەیە ماڵەکەی بفرۆشێت ئەگەر خۆی نەیفرۆشت بۆیان وە ئەو فرۆشتنەش دروستە چونکە حاکم جێی ئەو ئەگرێتەوە.

وە بنەمای ئەمەش ئەوەیە کە سەعیدی کوڕی مەنصور و ئەبوداود و عبدالرزاق گێڕاویانەتەوە لە حەدیسی عبدالرحمن ی کوڕی کەعبی کوڕی مالیکەوە بە مورسەلی کە فەرمویەتی: موعاذی کوڕی جەبەل لاوێکی دەست بڵاوو دڵ نەرم بوو هیچ بە دەستیەوە نەئەما، ئەوەندەی قەرز کردبوو هەتا ماڵەکەی هەمو ببوو بە قەرز. هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ داوای لێ کرد کە داوا لە خاوەن قەرزەکانی بکات بۆ ئەوەی یارمەتی بدەن. جا ئەگەر وازیان بهێنایە لەبەر خاتری کەسێك وازیان لە موعاذ ئەهێنا لەبەر پێغەمبەر ﷺ. پاشان پێغەمبەر ﷺ ماڵەکەی فرۆشت بۆیان هەتا موعاز بێ ماڵ مایەوە[1].

لە (نیل الأوطار)دا هاتووە: ئەو حیجر دانانەی سەر موعاز بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دروستە حیجر لەسەر هەموو قەرزدارێك دابنرێت.

وە لەسەر ئەوەی کە دروستە بۆ حاکم ماڵی قەرزدار بفرۆشێت بۆ ئەوەی قەرزەکانی پێ بداتەوە بێ ئەوەی جیاوازی بکرێت لەنێوان ئەوانەدا کە ماڵەکەیان هەموو بوبێتە قەرز و ئەوانەی ماڵەکەیان وانەبێت.

وە هەرکاتێك حیجر دانانەکە تەواو بوو ئیتر مامەڵەی لە ماڵەکەیدا جێبەجێ ناکرێت؛ چونکە حیجر ئەوە پێویست ئەکات.

ئەمەش گفتی مالیك و راست ترین دوگفتەی شافیعیە.

وە ماڵەکەی بەسەر خاوەن قەرزەکاندا دابەش ئەکرێت بەپێی قەرزەکەیان ئەوانەی ئامادەن و داوایان کردووەو کاتی دانەوەی قەرزەکانیان هاتووە، ئیتر ئەوانە ناگرێتەوە کە ئامادەن و داوا ناکەن یا غایبن و وەکیلیان نیەیە، هەروەها ئەوانەش ناگرێتەوە کە کاتی دانەوەی قەرزەکانیان نەهاتووە، جا داوایان کردبێت یان نەیان کردبێت، ئامادە بن یا ئامادە نەبن.

ئەمەش ئەوەیە کە ئەحمەد بۆی چووە و راسترین دو قسەی شافیعیشە.

وە لای مالیك قەرزێك کە وەختەکەی نەهاتبێت حیجری لەسەر دائەنرێت و دروستە.

(١) أبوداود في المراسيل١٧٢) وعبدالرزاق في المصنف (١٥١٧٧) والدارقطني (٤/٢٣١).

بەڵام مردوی موفلیس قەرزی هەموو خاوەن قەرزێك ئەدرێتەوە قەرزەکە لە ماڵەکەی ئامادە بن یان نا، داوایان کردبێت یان نا، وە قەرزی هەموو خاوەن قەرزێك ئەدرێتەوە قەرزەکە ماوەدار بێت یان دەمودەست بێت .

بەڵام لە کاتی فرۆشتنی ماڵەکەیدا مافی خوا پێش مافی بەندەکانی ئەخرێت وەك زەکات و کەفارەت، بەپێی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (فإن دين الله أحق بالقضاء)[1].

واتە: قەرزی خوا لە پێش ترە بۆ دانەوە.

وە ئەبوحەنیفە بۆ ئەوە چووە کە دروست نی یە حیجر لەسەر قەرزدار دابنرێت و ماڵەکەی بفرۆشرێت بەڵکو حاکم بەندی ئەکات هەتا قەرزەکەی ئەداتەوە. بەڵام ڕای یەکەم لەپێشترە لەبەر ئەوەی لەگەڵ فەرموودەکەدا ڕێك ئەکەوێت.

**پیاوێك ماڵی خۆی بدۆزێتەوە لای موفلیسێك:**

ئەگەر پیاوێك ماڵی خۆی لای موفلیسێك بدۆزێتەوە ئەوە چەند شێوەیەکی هەیە لە خوارەوە باسی ئەکەین:

١- کەسێك خوددی شتەکەی خۆی لای موفلیسێك بدۆزێتەوە خۆی لە هەموو خاوەن قەرزەکان لە پێش ترە بۆ وەرگرتنەوەی.

بەپێی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: (من أدرك ماله بعينه عند رجل قد أفلس فهو أحق به من غيره) رواه البخاري ومسلم[2].

واتە: هەرکەس خوددی شتێکی خۆی دۆزیەوە لای پیاوێکی موفلیس ئەو کەسە لە هەموو کەس لەپێشترە بۆ ئەو شتە.

٢- ئەگەر ئەو شتە گۆڕانکاری بەسەردا هاتبوو بە زیادی و کەمی ئەوکاتە خاوەنەکەی لەپێشتر نی یە بۆی بەڵکو وەك خاوەن قەرزەکانی ترە بۆی.

٣- ئەگەر ئەو شتە فرۆشرابوو هەندێ لە نرخەکەی وەرگیرابوو ئەو کاتەش هەر وەك خاوەن قەرزەکانی ترە و مافی ئەوەی نی یە فرۆشراوەکە بگێڕێتەوە، بەڕای جەماوەری زانایان.

وە قسەی بەهێزتری شافیعی ئەوەیە کە فرۆشەر لەپێشترە بۆی.

---

(١) مسلم (١١٤٨).

(٢) البخاري (٢٤٠٢) ومسلم (١٥٥٩/٢٢و٢٣).

٤- ئەگەر کڕیار مرد و فرۆشەر نرخی شتەکەی وەرنەگرتبوو، پاشان فرۆشیار ئەوەی فرۆشتبووی دی‌یەوە ئەوە خۆی لە پێش ترە بۆ ئەو شتە بەپێی فەرموودەکەی پێشوو، وە چونکە جیاوازی نی‌یە لە نێوان مردن و ئیفلاس کردن. ئەمەش لای شافیعی بەوجۆرەیە.

وە ئەبو هورەیرە فەرمویەتی: من بە حوکمەکەی پێغەمبەر ﷺ کێشەکەتان بۆ ئەبڕمەوە، هەرکەس ئیفلاسی کرد یا مرد پاشان پیاوێك کەلوپەلی خۆی دی‌یەوە لای، وە عەینی ئەو کەلوپەلە بوو ئەوە خۆی لە پێش ترە بۆی، وە ئەم فەرموودەیە حاکم بە صەحیحی داناوە[1].

حیجر لەسەر دەست تەنگ دانانرێت:

ئەو حیجرەی ئەخرێتە سەر موفلیس لە شێوەیەکدا ئەبێت کە کەم دەستی دەرنەکەوێت، جا ئەگەر ئەبوری و کەم دەستی‌یەکەی دەرکەوت، ئەوە نە بەند ئەکرێت و نە حیجری لەسەر دائەنرێت، وە نابێت خاوەن قەرزەکانیش زۆری لێ بکەن، بەڵکو ئەبێ مۆڵەتی بدەن هەتا حاڵی چاك ئەبێت، بەپێی فەرموودەی خوای بەرز ﴿وَإِنْ كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ﴾ (البقرة:٢٨٠) واتە: ئەگەر قەرزدار دەست تەنگ بوو چاوەڕوان ئەکرێت و مۆڵەتی ئەدرێتێ هەتا دەوڵەمەند ئەبێت.

موسلیم ئەگێڕێتەوە کە پیاوێك بە هۆی کڕینی میوەوە قەرزدار بوو، پێغەمبەر ﷺ بە خەڵکەکەی فەرمو: یارمەتی بدەن، ئەوانیش یارمەتیان دا. وە ئەو یارمەتی‌یەش نەیگەیاندە ئەوەی قەرزەکانی بداتەوە، پاشان پێغەمبەر ﷺ بە خاوەن قەرزەکانی فەرموو: (خذوا ما وجدتم وليس لكم إلا ذلك)[2].

واتە: ئەوەی بۆی کۆکراوەتەوە وەری بگرن و لەوە زیاتر بۆتان نی‌یە هیچ بکەن.

وە مۆڵەت دانی دەست کورت پاداشتەکەی چەند بەرابەرە:

لە بورەیدەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من أنظر معسراً فله بكل يوم مثليه صدقة)[3]. واتە: هەرکەس مۆڵەتی دەست کورت بدات بە هەر ڕۆژێك دوو ئەوەندە خێری بۆ ئەنوسرێت.

---

(١) الشافعي (٢/١٦٣) وأبوداود (٣٥٢٣) وابن ماجه (٢٣٦٠) والحاكم (٢/٥٠-٥١).

(٢) مسلم (١٥٥٦/١٨).

(٣) أحمد (٥/٣٦٠) وابن ماجه (٢٤١٨) والحاكم (٢/٢٩).

**ئەوەندەی بۆ بهێڵرێتەوە کە خۆی پێ بژێنێت:**

ئەگەر حاکم ماڵی موفلیسی فرۆشت لەبەر خاوەن قەرزەکانی، پێویستە ئەوەندەی بۆ بهێڵرێتەوە کە خۆی پێ بژێنێت لە خانوو شوێنی دانیشتن[1]، کەواتە نابێت خانووەکەی بفرۆشرێت کە ناتوانرێت وازی لێ بهێنرێت. وە ئەبێت ئەوەندەی ماڵ بۆ بهێڵرێتەوە کە خزمەتکاری پێ بگرێت کە بتوانێت کەسێکی وەکو ئەو خزمەت بکات.

وە ئەگەر بازرگان بوو ئەوەندەی بۆ بهێڵرێتەوە بازرگانی‌یەتی پێوە بکات. وە ئەگەر خاوەن پیشە بوو ئامێری پیشەکەی نەفرۆشرێت.

وە پێویستە بۆ خۆی و بۆ ئەوکەسانەی نەفەقەیان لەسەریەتی کەمترین نەفەقەی هی وەکو خۆیان بۆ دابنرێت لە خواردن و پۆشاک.

شەوکانی فەرمویەتی: دروستە بۆ خاوەن قەرزەکان هەر چی‌یان دەست کەوت بیبەن، جگە لەو شتانەی کە ناکرێت وازیان لێ بهێنرێت وەك خانوو و پۆشاك و ئەو شتانەی لە سەرما ئەیپارێزن خۆی و ئەوکەسانەی نەفەقەیان لەسەر ئەوە.

وە لە شەرح کردنی ئەو قسەیەدا باسی فەرموودەکەی موعازی کردووە پاشان فەرمویەتی: بەڵام نەچەسپاوە جلەکانیان بردبێت کە لەبەریا بووە یا لە خانووەکەی دەریان کردبێت یا خۆی و خێزانەکەیان بەرەڵا کردبێت هیچیان نەبێت لەوانەی پێویستیان پێ‌یەتی، بۆیە باسی ئەوانەمان کرد کە بۆی جیا ئەکرێتەوە.

**حیجر دانان لەسەر گەوج:**

حیجر دائەنرێ لەسەر گەوجی پێ گەیشتوی بالغ لەبەر گێلی و خراپی مامەڵە کردنی. خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلاَ تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمْ الَّتِي جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ قِيَامًا﴾ (النساء:٥). واتە: ئەوماڵانەی کە خوا کردویەتی‌یە هۆی بژیوتان مەیدەنە دەست گێژ و نەفامەکانتان.

ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەیە کە دروستە حیجر لەسەر گەوج دابنرێت.

---

(١) ئەمە مەزهەبی ئەبوحەنیفەو ئەحمەدە، وە شافیعی و مالیك بۆ ئەوە چون کە لەو حاڵەتەدا ماڵەکەشی ئەفرۆشرێت.

ئیبنومونذیر فەرمویەتی: بەشی زۆری زانایانی وولآتان ڕایان لەسەر ئەوەیە کە حیجر لەسەر هەموو ئەو کەسانە دائەنرێت کە ماڵ بە فیڕۆ ئەدەن گەورە بن یا بچووك[1].

وە لە (نیل الأوطار) دا هاتووە کە خاوەنی (البحر) ووتویەتی:

ئەو گەوجی‌یەی حیجرکردن پێویست ئەکات لای ئەوانەی حیجرکردنیان چەسپاندووە ئەوەیە کە ماڵی خۆی سەرف بکات لە خراپەکاریدا یا لەو شتانەدا کە هیچ بەرژەوەندی و مەبەستێکی ئاینی و دنیایی تێدا نی‌یە، وەك ئەوەی کەسێك شتێك بێنێت کە درهەمێك بهێنێت ئەو بە صەد درهەم بیکڕێت، نەك ئەوەی کە سەرفی بکات بۆ خواردنی خۆش و پۆشاکی گران و چاك کە فەرموودەی خوای گەورە ئەیگرێتەوە کە فەرمویەتی: ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنْ الرِّزْقِ قُلْ هِيَ لِلَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ (الأعراف:٣٢).

واتە: بڵێ کێ زینەتەکانی خوا کە بۆ بەندەکانی خەڵق کردوە حەرامی کردووە، وە هەروەها ئەو ڕۆزی‌یە پاکانەی کە خەلقی کردون، بڵێ ئەمانە بۆ ئەو کەسانەیە کە باوەڕیان هێناوە لە ژیانی دونیادا، بەڵام لە ڕۆژی دواییدا بە خالیصی تایبەتی باوەڕدارانە، هەر بەوشێوەیە نیشانەکانی خۆمان بۆ کەسانێ کە ئاگادارن شی ئەکەینەوە.

وە هەروەها ئەگەر سەرفی بکات لە ڕێ ی خوادا.

**تەسەڕروفاتی گەوج:**

تەسەڕورفاتی گەوج پێش ئەوەی حوکم بە حیجرەکەی دەربچێت دروستە.

بەڵام کاتێك حوکمی حیجر لەسەردانانی دەرچوو هەرچی تەسەروفێك بکات دروست نی‌یە چونکە حیجرکردن ئەوە پێویست ئەکات کە تەسەڕرووف نەکا.

کەواتە کڕین و فرۆشتن و وەقفی پێك نایەت، هەروەها ئیعتیرافیشی لێوە دروست نی‌یە.

---

(١) ئەبو حەنیفە فەمرویەتی: حیجر دانانرێ لەسەر کەسێك کە پێ‌گەیشتبێ و ژیر بێ مەگەر ماڵەکەی خراپ بکات، جا ئەگەر وابو ڕێ‌گری ئەکرێت لەوەی کە ماڵی بدرێتێ هەتا ئەگاتە بیست‌وپێنج ساڵ، جا کە گەیشتە بیست‌وپێنج سال لە هەمو حاڵێکدا ماڵی پێ ئەدرێ، خراپی بکات یان خراپی نەکات.

مالیك فەرمویەتی: ئەگەر لەدوای پێ‌گەیشتن ڕوشدی نەبو حیجری لەسەر لاناچێت با پیریش ببێت.

**ئیقرار کردنی گەوج لەسەر خۆی:**

ئیبنومونذیر فەرمویەتی: هەموو ئەوانەی ئێمە زانستمان لێیانەوە لەبەر کردووە لە ئەهلی زانست ئیجماعیان هەیە لەسەر ئەوەی کە پێ‌لێنان و ئیقرارکردنی گەوج لەسەر خۆی دروستە ئەگەر ئیقرار بکات بە زینا کردن یا بە دزی یا بە ئارەق خواردنەوە یا بە تاوان دانە پاڵ داوێن پاك یا ئیقرار بکات بە کوشتنی کەسێك وە حەددی شەرعی لەسەر جێ بە جێ ئەکرێت.

وە ئەگەر ژن تەڵاق بدات جێ بە جێ ئەکرێت بەپێی قسەی بەشی زۆری زانایان.

وە ئەگەر ئیقراری کرد کە ماڵێکی لەسەر دروستە بەڵام لێی ناسەندرێت ئیللا دوای ئەوەی حیجرەکەی لەسەر لائەبرێت.

**ئاشکرا کردنی حیجر دانان لەسەر گەوج و موفلیس:**

وا پەسەندە حیجردانان لەسەر گەوج و موفلیس ئاشکرا بکرێت بۆ ئەوەی خەلك پێ یان بزانێت و هەڵنەخەڵەتێن پێیان و مامەڵەیان لەگەڵدا نەکەن.

**حیجردانان لەسەر منداڵ:**

وەك چۆن حیجر لەسەر گێل و گەوج لەبەر گێلی‌یەکەی دائەنرێت ئاواش لەسەر منداڵ دائەنرێت و مامەڵە کردنی لێ قەدەغە ئەکرێت لە سامان و ماڵەکەیدا بۆ ئەوەی لە لەناوچوون بپارێزرێت.

وە لەسەری لاناچێت بە دوو مەرج نەبێت:

یەکەم: ئەوە کە باڵغ ببێت.

دووەم: ژیری لێ دەربکەوێت.

خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿وَابْتَلُوا الْيَتَامَى حَتَّى إِذَا بَلَغُوا النِّكَاحَ فَإِنْ آنَسْتُمْ مِنْهُمْ رُشْدًا فَادْفَعُوا إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ﴾ (النساء:٦).

واتە: ئەو منداڵە هەتیوانەی سەرپەرشتیان ئەکەن تاقی‌یان بکەنەوە لە مامەڵەکانیاندا هەتا ئەگەنە تەمەنی هەرزەکاری، جا ئەگەر ژیریتان لێ بینین ماڵ و سامانەکەیان بدەنەوە دەستیان.

ئەم ئایەتە دەربارەی سابیتی کوڕی ڕیفاعە و مامەکەی هاتۆتە خوارەوە.

کاتێ ڕیفاعە مرد کوڕەکەی بە بچوکی بەجێ هێشت ئینجا مامی ثابیت هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وەوتی: ئەوە کوڕی برازامە هەتیوە و لە ماڵی مندایە چی لە ماڵی ئەو بە من حەڵاڵە و کەی ماڵەکەی خۆی بدەمەوە دەست خۆی؟ خوای گەورەش ئەو ئایەتەی نارده خوارەوە[1].

**نیشانەکانی باڵقی:**

باڵقی ئەچەسپێت بە دەرکەوتنی یەکێ لەم نیشانانەی خوارەوە:

١-هاتنەوەی مەنی لە خەودا بێت یا بە ئاگا بێت، بەپێی فەرموودەی خوای بەرز کە فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا بَلَغَ الأَطْفَالُ مِنكُمُ الْحُلُمَ فَلْيَسْتَأْذِنُوا كَمَا اسْتَأْذَنَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾ (النور: ٥٩) واتە:

ئەگەر منداڵەکانتان گەیشتە ئیحتلام بوون، با کە دێنە ژوورەوە بۆ لاتان پرس بکەن وەك چۆن ئەوانەی پێش ئەوان پرسیان کردووە.

ئەبوداود لە عەلی یەوە ﷺ ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (رفع القلم عن ثلاث: عن الصبي حتى يحتلم. وعن النائم حتى يستيقظ. وعن المجنون حتى يفيق)[2]. واتە: قەڵەم لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە: لەسەر منداڵ هەتا ئیحتلام ئەبێت. وە لەسەر خەو لێ کەوتوو هەتا ئاگای دەبێتەوە. وە لەسەر شێت هەتا چاك ئەبێتەوە.

ئیمامی عەلی ﷺ ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا يتم بعد احتلام) رواه أبوداود[3]. واتە: دوای ئیحتلام بوون هەتیوی نامێنێ.

٢- تەواو کردنی پانزدە ساڵ بەپێی فەرموودەی ئیبنوعومەر خوایان لێ رازی بێت کە فەرمویەتی: نیشان پێغەمبەر ﷺ درام کاتی جەنگی ئوحود تەمەنم چواردە ساڵ بوو ڕێی پێ نەدام. وە ڕۆژی جەنگی خەندەق نیشان درامەوە کە تەمەنم پانزە ساڵ بوو ڕێی پێ دام بچم بۆ جەنگ[4].

کاتێ عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەوەی بیست بۆ کاربەدەستەکانی نوسی هەرکەس تەمەنی نەگەیشتبووە پانزە ساڵ هیچی لێ نەکەن.

---

(١) تفسير القرطبي (٥/٣٤) والإصابة (١/١٩٣) وأسباب النزول للواحدي (١٧٥).

(٢) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

(٣) أبوداود (٢٨٧٣).

(٤) البخاري (٢٦٦٤) ومسلم (١٨٦٨).

مالیك و ئەبوحەنیفە فەرمویانە: حوكمی بالقی نادرێت بە سەر ئەو كەسانەدا كە ئیحتیلام نابن هەتا تەمەنیان نەگاتە حەڤدە ساڵ، وە لە ڕیوایەتێكی ئەبوحەنیفەدا كە بەناوبانگترە هاتووە: هەتا تەمەنی نەگاتە نۆزدە ساڵ. حوكمی بەسەردا نادرێت

وە دەربارەی كچ فەرمویەتی: بالق بوونی لە حەڤدە ساڵیدا ئەبێت.

داود ووتویەتی: بالقی بە تەمەن نابێت هەتا ئیحتلام نەبێت ئەگەر بشگاتە چل ساڵ.

٣- دەرهاتنی توكی بەر. مەبەستیش توكی ڕەشی لولە، نەك تەنها توك كە لە منداڵیشەوە هەیە. لە غەزای بەنی قورەیضەدا پیاوەكان بە توكە بەردا ئەناسرانەوە كە لە جەنگاوەرەكان بوون.

ئەبوحەنیفە فەرمویەتی: بە توكە بەرهاتن حوكمی بالقی نادرێت و بەوە بالق نابێت وبەڵگەش نی‌یە لەسەر بالقی.

٤- بێ نوێژی ودووگیانی: بالقی سابت ئەبێت بەوشتانەی لە پێشەوە باسمان كرد بە گوێرەی نێرینە ومێ‌ینە، وە بۆ مێ‌ینە بێ نوێژی و دووگیانیشی لێ زیاد ئەكرێ بەپێی ئەوەی بوخاری و جگە لەو گێڕاویانەتەوە لە عائیشەوە خوای لێ ڕازی بێت كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لایقبل الله صلاة حائض إلا بخمار)[1]. واتە: خوا نوێژی ئەو ئافرەتانە وەرناگرێت كە گەیشتوونە بێ نوێژی بە سەرپۆشەوە نەبێت.

ئەما ژیری و پێ‌گەیشتویی ئەوە بە توانای ڕێك خستنی ماڵ و پاراستنی‌یەتی لە لەناو چوون كە نەخەڵەتێ بە زۆری و سەرفی نەكات لە حەرام دا (واتە: بەمانە دەرئەكەوێت).

وە ئەگەر كەسێك بالق بوو ژیر نەبو ئەوە سەرپەرشتی بەسەر ماڵەكەیەوە بەردەوام ئەبێت هەتا ژیری لێ دەرئەكەوێت بەبێ دەست نیشان كردنی تەمەنێكی دیاری كراو بۆ چاوەڕوان كردنی، بەپێی ڕواڵەتی دەقە قورئانی‌یەكە. بە پێچەوانەی ڕای ئەبوحەنیفەوە، وە دووبارە حیجری ئەخرێتەوە سەر ئەگەر گەوجێتی لێ دەركەوت دوای ڕوشد، چونكە زیانی گەوج وەك جەصاص ووتویەتی گشت كەس ئەگرێتەوە، چونكە ئەگەر ماڵەكەی بێ هودە لەناوبرد ئەبێتە بار و ئەبو بەسەر خەڵك و(بیت المال)ەوە. ئەمە لە ڕووی سەرپەرشتی بەسەر ماڵەوە.

ئەما سەرپەرشتی لەسەر گیان تەنها بە بالق بوون بە ژیری و تەكلیف لەسەر بوون ئەبڕێتەوە.

(١) أحمد (٦/١٥٠) وأبوداود (٦٤١) والترمذي (٣٧٧) وابن ماجه (٦٥٥).

ئیبنوعەبباس کاتێ پرسیاریان لێ کرد کەی هەتیوی نامێنێ؟ فەرمووی: پیاوی وا هەیە ریش وسمێڵی لێ ئەڕوێت بەڵام لاوازە بۆ وەرگرتنی شت بۆ خۆی یا بەخشینی. جا کەسێك شتی چاکەی بۆ خۆی هەڵبژارد ئەوە هەتیوی نامێنێ.

سەعیدی کوڕی مەنصور لە موجاهیدەوە ئەگێڕێتەوە دەربارەی فەرموودەی خوای گەورە ﴿فإن آنستم منهم رشداً﴾ (النساء/٦).

فەرمویەتی: کەسوکار ماڵ ناداتەوە دەست هەتیو با بە تەمەن گەورەش بێت، هەتا تەواو ڕوشد و پێگەیشتویی لێ هەست ئەکرێ.

**کاری دانەوەی ماڵەکە بە حیجر لەسەر دانراو بەرز ئەکرێتەوە بۆلای حاکم:**

لە زانایان دا هەیە ڕای وایە کە مەرجە ئەو کارە ببرێتە لای حاکم و ئیسباتی ژیری‌یەکەی بکرێ لەلای حاکم ئینجا ماڵەکەی بدرێتەوە دەست، وەهەیانە ڕایان وایە ئەو کارە وازی لێ ئەهێنرێت بۆ وەصی، وەڕای‌یەکەم لە پێشترە لەم سەردەمەی ئێمەدا.

**سەپەرشتی کردنی منداڵ و گەوج و شێت:**

**ئەو سەرپەرشتی کردنە بۆ کێ ئەبێ؟:**

سەرپەرشتی کردنی منداڵ وگەوج وشێت ئەبێ بۆ باوك بێ، پاشان ئەگەر باوکەکە ئامادە نەبوو ئەو سەرپەرشتی‌یە ئەگوێزرێتەوە بۆ وەصی چونکە جێ گیری ئەوە. ئەوە ئەگەر وەصیش نەبوو ئەوە سەرپەرشتی کردن ئەگوێزرێتەوە بۆ لای حاکم، وە باپیرەو دایك و هەموو ئەو خزمە پشتی‌یانەی تر ویلایەتیان دروست نی‌یە بە وەسێت نەبێت.

**وەصی و مەرجەکانی:**

وەصی ئەو کەسەیە کار وباری ئەو کەسەی پێ ئەسپێردرێ کە حیجری لەسەر دانراوە جا پێ سپاردنەکە لە کەسوکاری‌یەوە بێت یا لە حاکمەوە، وە ئەبێ ئەو کەسە ئایین دار و دادپەروەر وژیر وناسراو بێت، ئیتر پیاو بێت یا ژن، چونکە عومەر وەسێتی کردووە بۆ حەفصە خوا لێیان ڕازی بێت.

**ئەوەی پێویستە لەسەر وەصی ؟**

ئەبێ بە ماڵی ئەو هەتیوە یان حیجر لەسەر دانراوکە کار بکات بۆ ئەوەی زیادی بکات.

لای ئیمامی مالیك دروستە بۆ وەصی وباوك کە شت لە ماڵی هەتیو بکڕن بۆ خۆیان، وە ماڵی خۆیان بفرۆشن بە ماڵی هەتیو ئەگەر بەلای خۆیاندا داینەشکێنن.

**خۆبەری کردن لەسەرپەرشتی کردن لەبەر لاوازی:**

لە ئەبوذەرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ پێ ی فەرموو: (يا أبا ذر، إني أراك ضعيفاً وإني أحب لك ما أحب لنفسي فلا تأمرن على اثنين ولا تولين مال يتيم)[1]. واتە: ئەی ئەبوذەر، من تۆ بە لاواز ئەزانم ومن چیم بۆ خۆم پێ خۆشە بۆ تۆشم پێ خۆشە، جا نە فەرمان ڕەوای دوو کەس بکەو نە سەرپەرشتی ماڵی هەتیو.

**سەرپەرشتی کەر لە ماڵی هەتیو ئەخوات:**

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَنْ كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَنْ كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ﴾ (النساء/٦) واتە: ئەگەر سەرپەرشتی هەتیو دەوڵەمەند بێت با خۆی لە کرێ وەرگرتن بپارێزێت و لیێ نەخوات، وە ئەوکەسەی فەقیرە با بە ئەندازەی کارکردنەکەی و بە مەعروف لەو ماڵە بخوات.

ئەم ئایەتە بڕیار ئەدات کە سەرپەرشتی کەری دەوڵەمەند مافی نیيە لە ماڵی هەتیودا، وە پاداشتی سەرپەرشتی کردنەکەشی لای خوایە. بەڵام ئەگەر حاکم شتێکی بۆ دانا ئەوە حەڵاڵە بیخوات.

بەڵام ئەگەر سەرپەرشتیار کەم دەست بوو بۆی هەیە بە پێی عورف لە ماڵەکەی بخوات. واتە ئەوەندەی عادەتە لە کرێی هی وەکو ئەو بۆ کارێکی ئاوها.

عائیشەی دایکی موسڵمانان خوا لیێ ڕازی بێت فەرمویەتی: ئەم ئایەتە دەربارەی سەرپەرشتی کەری هەتیو هاتۆتە خوارەوە کە سەرپەرشتی هەتیوەکە ئەکات و کاروباری بۆ ڕێك ئەخات ئەگەر هەژار بوو بە شێوەیەکی مەعروف لیێ بخوات.

لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکیەوە لە باپیرەیەوە کە پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ووتی: من پیاوێکی دەست تەنگم وهیچم نیيە وهەتیویشم لە ژێر دەستایە؟ فەرمووی: (كل من مال يتيمك غير مُسرِفٍ ولا مبادر ولا متأثل)[2]. واتە: لە ماڵی هەتیوەکەت بخۆ بە بێ ئیسراف وبێ ئەوەی پەلە بکەیت بۆ ئەوەی پێش بلوق و پێ گەیشتن لیێ هەڵگریت وبێ ئەوەی لە ماڵی ئەوان کۆی بکەیتەوە.

مەبەست ئەوەیە لە کرێی خۆی کە شایستەیەتی زیاتر هەڵنەگرێ.

---

(١) أحمد (١٨٠/٥) ومسلم (١٨٢٦/١٧).

(٢) أبوداود (٢٨٧٢) والنسائي (٣٦٩٨) وابن ماجه (٢٧١٨).

**نەفەقە کێشانی منداڵ :**

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ولاَ تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمْ الَّتِي جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ قِيَامًا وارْزُقُوهُمْ فِيهَا واكْسُوهُمْ وقُولُوا لَهُمْ قَوْلاً مَعْرُوفًا﴾ (النساء/٥) واتە: ئەو ماڵەی خوا کردویەتی‌یە هۆی ڕاگرتنی ئێوە، مەیدەن بە گەوج ونەفامەکانتان بەڵکو ڕۆزیان لەو ماڵە بدەنێ و پۆشاکیان بۆ بکڕن وقسەی چاك وخۆشیان لەگەڵدا بکەن.

(قرطبي) فەرمویەتی: وەصی نەفەقەی هەتیو ئەکێشێت بەپێی ماڵ وحاڵەکەی. جا ئەگەر هەتیوەکە منداڵ بوو ماڵەکەشی زۆر بوو ئەبێ دایەن و ئافرەتی بۆ بگرێ خزمەتی بکات وبە فراوانی نەفەقەی بکێشێ.

بەڵام ئەگەر گەورە بوو پۆشاکی چاك وخواردنی خۆش و خزمەتکاری بۆ بگرێت.

وە ئەگەر ئەوەندەی ماڵ نەبوو، ئەوە بەپێی خۆی خزمەتی بکات. وبە گوێرەی ماڵەکەی خەرجی لێ بکات وە ئەگەر لەوەش کەمتری بوو، ئەوە خورادن و جلوبەرگی هەرزانی بۆ دابین دەکرێت بەپێی توانا.

بەڵام ئەگەر هەتیوەکە زۆر.نەدار بوو ماڵی نەبوو لەسەر پێشەوا پێویستە لە (بيت المال) پارەی بۆ ببڕێتەوە. ئەگەر پێشەوا نەیکرد لەسەر موسڵمانان پێویستە بەپێی نزیك و دوری (لە خزمایەتی وغەیری خزمایەتی) خەرجی بکێشن.

وە دایکی لە هەموو کەس لەپێشترە پێی و نزیکترە کەواتە پێویستە لەسەری شیری پێ بدات وسەر کاری بکات، وە نە لە هەتیوەکە و نە لە کەسی تر داوای کرێ نەکات.

**ئایا وەصی و ژن و ئەوکەسەی ماڵەکەی بەدەستە بۆیان هەیە بێ پرسی خاوەنی صەدەقەی لێ بکەن؟:**

نە وەصی و نە ژن و نە ئەوکەسەی ماڵەکەی بەدەستە بۆیان نی‌یە کە صەدەقە لە ماڵەکە بکەن بێ پرسی خاوەنەکەی مەگەر شتێکی کەم کە زیان بە ماڵەکە نەگەیەنێت.

لە عائیشەوە خوای لێ ڕازی بێت هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إذا أنفقت المرأة من طعام زوجها غير مفسدة كان لها أجرها بما أنفقت ولزوجها أجر ما كسب. وللخازن مثل ذلك لاينقص بعضهم من أجر بعضٍ شيئاً)[1].

---

(١) البخاري (١٤٢٥) ومسلم (١٠٢٤/٨٠).

واتە: ئەگەر ژنێك لە ماڵی مێردەكەی كرد بە خێر بێ ئەوەی زیانی لێ بدات ئەوە پاداشتی لەسەر كارەكەی وەرئەگرێت و مێردەكەشی پاداشتی پەیدا كردنەكەی وەرئەگرێت. وە هەروەها ئەو كەسەی شتەكەی بۆ هەڵگرتون وەك ئەوان پاداشتی هەیە بەبێ ئەوەی كەسیان هیچ لە پاداشتی كەسیان كەم بكەنەوە.

## ڕاسپاردن (الوصية)

**پێناسەكەی:**

(وصية) لە لۆغەت وزاراوەدا بە مانای وەصڵ كردن و گەیاندنە چونكە ئەو كەسەی وەصیەت ئەكا ئەوەی لە ژیاندا هەیەتی وەصڵی ئەكا بە دوای مردنیەوە.

وە لە شەرعدا: ئەوەیە كە ئادەمیزادە شتێكی ئامادە یا قەرزێك یا سودێك ببەخشێ بە كەسێك بە مەرجێك وەصیەت بۆ كراوەكە ببێتە خاوەنی ئەو شتە دوای مردنی وەصیەت كەر.

وە هەندێ لە زانایان پێناسەی وەستیان كردوەو ئەڵێن: وەصیەت، كردنە خاوەنی شتە دوای مردنی خاوەنەكەی خۆی بە ڕێگای بەخشش، و لەم پێناسەیەوە جیاوازی نێوان بەخشش و وەصیەت دەردەكەوێت.

چونكە بونە خاوەنی بەخشش دەم ودەست سابت ئەبێ، بەڵام بونە خاوەنی وصیەت دوای مردنی خاوەنی ئەچەسپێت. ئەمە لە ڕویەكەوە لە رویەكی ترەوە، بەخشش لە شتی ئامادەدا نەبێ نابێت، بەڵام وەصیەت بە شتی ئامادەو قەرزو سوودی شتیش ئەبێت.

**دانانی:**

ڕاسپاردن بە قورئان وسوننەت وئیجماع دانراوە.

لە قورئاندا خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِنْ تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ والأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ﴾ (البقرة/١٨٠) واتە: فەرز كراوە لەسەرتان كاتێ كەسێكتان زانی مردنی نزیك بۆتەوە ئەگەر ماڵێكی بەجێ هێشت با ڕاسپێری تێدا بكات بۆ دایك وباوك وخزم وخوێش بە شێوەیەك زیان لە میرات گرەكانی نەدات ئەمەش حەقە لەسەر لەخواترسەكان.

وە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ...﴾ (النساء/١١) واتە: لە دوای ئەو وەصیەتەی ئەیكات، و لەدوای دانەوەی قەرزەكەی.

وەهەروەها ئەفەرموێت: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ حِينَ الْوَصِيَّةِ اثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِنْكُمْ﴾ (المائدة/١٠٦) واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە با بۆ شایەتی نێوانتان ئەگەر کەسێکتان زانی مردنی نزیك بۆتەوە کاتێ وەصیەت ئەکات دوو کەسی ڕاستگۆ لە خۆتان ئامادە بێت.

وە لە سوننەتدا ئەم حەدیسانە هاتووە:

١- بوخاری وموسلیم لە ئیبنوعومەرەوە ﷺ ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (ماحق امرئٍ مسلم له شيءُ يوصي فيه، يبيت ليلتين إلا ووصيتُه مكتوبة عنده)[1]. واتە: موسڵمان ئەگەر شتێکی هەبێت بیەوێت ڕاسپێری تێدا بکات، بۆی نی‌یە دوو شەو بمێنێتەوە ئیللا وەصیەتەکەی نوسرابێت لای خۆی.

ئیبنوعومەر فەرمویەتی: لەو کاتەوە ئەوەم بیستووە لە پێغەمبەر ﷺ شەوێك نەڕۆیشتووە وەصیەتەکەم لە پشت سەرمەوە نەبوبێت.

وە واتای فەرموودەکە ئەوەیە کە ئەبێ ئادەمیزاد دووربین بێت چونکە لەوانەیە لەپڕ مردن ڕێی پێ بگرێت.

شافیعی فەرمویەتی: دووربینی و ئیحتیات بۆ ئەو موسڵمانە نی‌یە کە وەصیەتەکەی لە ژوور سەریەوە نەنوسرابێت، ئەگەر شتێکی هەبێت بیەوێ وەصیەتی بۆ بکات، چونکە نازانێت کەی مردن دێت و ڕێگر ئەبێت لەوەی کە ئەیەوێ بیکات.

٢- ئەحمەدو (ترمذي)و ئەبوداودو ئیبنوماجە ئەگێڕنەوە لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إن الرجل ليعمل والمرأة بطاعة الله ستين سنة ثم يحضرهما الموت فيضاران في الوصية فتجب لهما النار). واتە: ژن وپیاوی وا ئەبێت شەست ساڵ خەریکی خوا پەرستی ئەبن، پاشان کە ئەمرن لە وەصیەتەکەیاندا زیان ئەگەیەنن و ئاگریان بۆ پێویست ئەبێت. ئەڵێ: لە پاشاندا ئەبوهورەیرە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَى بِهَا أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَارٍّ وَصِيَّةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ﴾[2] (النساء/١٢) واتە: دوای وەصیەت وقەرزدانەوە بەومەرجەی زیان بە کەس نەگات ڕاسپاردەیەکە لە خواوە، وەخوا زانا و حەلیمە.

---

(١) البخاري (٢٧٣٨) ومسلم (١٦٢٧/١).

(٢) أحمد (٢٧٨/٢) وأبوداود (٢٨٦٧) والترمذي (٢١١٧) وابن ماجه (٢٧٠٤).

٣- وە ئیبنوماجە لە جابیرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (من مات على وصية مات على سبيل وسنة ومات على تقى وشهادة، ومات مغفوراً له)[١].

واتە: هەرکەس مرد و وەصیەتی کردبوو ئەوە لەسەر ڕێباز و سوننەت و لە خوا ترسی و بە شەهیدی مردووەو خوا لیێ خۆش بووە.

وە نەتەوەی ئیسلام هەموو ئیجماعیان هەیە لەسەر مەشروعیەتی وەسیەت.

وەسیەتی یارەکانی پێغەمبەر ﷺ:

پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد وگەیشت بە خوای خۆی وهیچ ڕاسپێریەکی نەکرد لەبەر ئەوەی ماڵ و سامانی بەجێ نەهێشتبوو تا وەصیەتی تێدا بکات.

بوخاری لە ئیبنوئەبوئەبی ئەوفاوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ وەصیەتی نەکردووە[٢].

زانایان لە هۆی ئەوەدا وتویانە: لەبەر ئەوەی دوای خۆی ماڵی بەجێ نەهێشتبوو وزەویەکانیشی وەقف کردبوو لەڕێی خوادا، وە چەك وئێسترەکەی مابوو ڕای گەیاندبوون کە بە میرات ناگیرێن. ئەوەوی باسی کردووە.

بەڵام یارەکانی وەصیەتیان ئەکرد بە هەندێ لە ماڵەکانیان بە مەبەستی نزیك بوونەوە لە خواوە. وە وەسیەتەکانیان بە نوسراوی لای میرات گرەکانیان بوو.

عبدالرزاق بە سەنەدێکی صەحیح تەخریجی کردوە کە ئەنەس ﷺ فەرمویەتی: لە پێشەکی وەصیەتەکانیان ئەیان نوسی:

بسم الله الرحمن الرحيم

ئەمە ڕاسپاردەی فلانی کوڕی فلانە شایەتی ئەدات هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە کە شایستەی پەرستن بێت جگە لە پەروەردگاری بێهاوبەش، وەشایەتی ئەدات کە موحەممەد بەندە ونێرراوی خوایە، وە شایەتی ئەدات کە ڕۆژی دوایی دادێت و هیچ گومانی تێدا نیە، وەخوا هەرچی لە گۆڕەکاندایە زیندوویان ئەکاتەوە، وە ڕاسپاردەی ئەکرد بۆ ئەوانەی بەجێی ئەهێشتن کە لە خوا بترسن و لەنێوان یەکدا چاك بن وملکەچی خوا وپێغەمبەرەکەی ﷺ بن ئەگەر باوەڕدار بن و وەصیەتی بۆ ئەکردن بەو وەصیەتەی کە ئیبراهیم و یەعقوب بۆ کوڕەکانیان ئەیان کرد ﴿إن

(١) ابن ماجه (٢٧٠١).

(٢) البخاري (٢٧٤٠).

الله اصطفي لَكم الدين فلا تموتن إلا وأنتم مسلمون﴾ واتە: بەڕاستی خوا خۆی ئایینی بۆ هەڵبژاردوون کەواتە نابێ بمرن بە موسڵمانی نەبێت.

**حیکمەتەکەی:**

لە فەرمودەدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إن الله تصدق عليكم بثلث أموالكم زيادة في أعمالكم فضعوها حيث شئتم أو حيث أحببتم) والحديث ضعيف[1].

واتە: خوا سێ‌یەکی ماڵتانی بە خێر بۆ گێڕاون زیاد لە کردەوەکانتان، ئێوەش لە کوێ وبۆ کێ حەزتان کرد دای بنێن.

ئەم فەرموودەیە ئیفادەی داوە کە وەصیەت کردن خواپەرستی‌یەکە ئادەمیزاد لە خوا نزیك ئەکاتەوە لە کۆتایی ژیانیدا بۆ ئەوەی چاکەکانی زیاد بێت بگات بەوەی کە لە دەستی چووە، وە لەبەر ئەوەی چاکەکردنی لەگەڵ خەڵك تێدایە و یارمەتی‌یە بۆیان.

**حوکمەکەی:**

بەڵام حوکمەکەی واتە صیفەتە شەرعی‌یەکەی کە ئایا کردنی داوا کراوە یا واز لێ هێنانی؟ زانایان جیاوازیان هەیە تێ‌یدا بە چەند ڕاو بۆچوونێك وا بە کورتی باسیان ئەکەین:

**ڕای‌یەکەم:**

ئەوەیە کە وەصیەت کردن واجبە لەسەر هەموو ئەو کەسانەی ماڵ وسامان بە جێ ئەهێڵن، ماڵەکە کەم بێت یا زۆر.

زوهری وئەبومیجلەز ئەمەیان وتوە.

ئەمەش ڕای ئیبنوحەزمە، وە واجب بونی ئەو کارەی گێڕاوەتەوە لە ئیبنو عومەر وطەلحە وزوبەیر وعبدالله ی کوڕی ئەبی ئەوفا و طەلحەی کوڕی موطەڕریف و طاووس وشیعبی‌یەوە، ووتویەتی: ئەمەش قسەی ئەبوسولەیمان وهەموو هاوەڵەکانمانە. بەڵگەشیان بۆ ئەوە فەرموودەی خوای گەورەیە: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِنْ تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ﴾ (البقرة/١٨٠) واتە: نوسراوە لەسەرتان (فەرزە) کاتێ کەسێکتان نیشانەیەکی مردنی هەست کرد ئەگەر ماڵی بە جێ هێشتبوو وەصیەت بکات بۆ دایك وباوك وخزمانی بە چاکە (ئەوانەی میراتگرنین) وە وەصیەت کردن حەقە لەسەر لە خوا ترسەکان.

---

(١) الدارقطني (٥/١٥٠) وأحمد (٦/٤٤١) والبيهقي (٦/٢٦٩) وابن ماجة (٢٧٠٩).

**ڕای دووەم:**

ڕای وایە کە وەصیەت کردن پێویستە بۆ دایك وباوك وئەو خزمانەی میرات گر نین.

ئەمەش بۆچوونی مسروق و ئیباس و قەتادە وئیبنوجەریر وزوهری‌یە.

**ڕای سێیەم:**

کە گفتی هەر چوار پێشەواکە و زەیدی‌یەکانە ئەوەیە کە وەصیەت فەرز نی‌یە لەسەر هەموو ئەوانەی ماڵ بەجێ ئەهێڵن وەك لە ڕای یەکەمدایە. هەروەها فەرز نی‌یە بۆ دایك وباوك وخزمەکانی کە میراتگر نین وەك لە ڕای دووەمدا هاتووە، بەڵکو حوکمەکەی ئەگۆڕێت بەپێی گۆڕانی حاڵەتەکان.

جا جاری وا ئەبێت پێویست ئەبێت یا پەسەند ئەبێت یا حەرام ئەبێت یا مەکروە ئەبێت یا حەرام ئەبێت.

**پێویست بوونی:**

لەحاڵەتێکدا پێویست ئەبێت کە پیاو مافێکی شەرعی لەسەر بێت وترسی ئەوەی هەبێت ئەگەر وەصیەتی بۆ نەکات لەناو بچێت، وەك (وديعة) سپاردەو قەرزی خوا یا ئادەمی، وەك ئەوەی زەکاتی لەسەر بوبێت ونەیدابێت یا حەجی لەسەر بوبێت ونەچوبێت یا ئەمانەتێکی لابوبێت و پێویست بوبێت لەسەری بیداتەوە، یا قەرزێکی لەسەر بێت خۆی نەبێت کەسی تر پێی نەزانی بێت یا ئەسپەردەیەکی لا دانرابێت بێ شایەتی.

**پەسەندێتی:**

وە پەسەندە وەصیەت کردن بۆ ئەو ڕێگایانەی کە ئەبنە هۆی نزیکی لە خواوە وە بۆ خزم و کەسی هەژار وپیاو چاکان لە خەڵکی.

**حەرامێتی:**

وە حەرامە ئەگەر ئەو وەصیەتە زیان بە میرات گرەکان بگەیەنێت.

عبدالرزاق لە ئەبوهورەیرەوە ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إن الرجل ليعمل بعمل أهل الخير سبعين سنة فإذا أوصى جاف في وصيته فيختم له بشر عمله فيدخل النار. وإن الرجل ليعمل بعمل أهل الشر سبعين سنة فيعدل في وصيته فيختم له بخير عمله فيدخل الجنة)[1].

---

(١) أحمد (٢/٢٧٨) وأبوداود (٢٨٦٧) والترمذي (٢١١٧) وابن ماجه (٢٧٠٤).

واتە: پیاو هەیە حەفتا ساڵ کردەوەی چاکە ئەکات کاتێ وەصیەت ئەکات ستەم ئەکات لە وەصیەتەکەیدا جا کردەوەکانی بە خراپە کۆتایی دێت و ئەچێتە ئاگرەوە. وە پیاو هەیە حەفتا ساڵ خراپە کاری ئەکات بەڵام لە وەصیەتەکەیدا دادپەروەری ئەکات جا کردەوەکەی بە کاری چاکە کۆتایی دێت و ئەچێتە بەهەشتەوە.

ئەبوهورەیرە فەرمویەتی: ئەگەر حەز ئەکەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە: ﴿تِلْكَ حُدُودُ اللّٰهِ فَلاَ تَعْتَدُوهَا﴾ (البقرة/٢٢٩) واتە: ئەوانە سنوری خوان جا سنور مەبەزێنن و بەسەریا تێ مەپەڕن.

سەعیدی کوڕی مەنصور بە ئیسنادێکی صەحیح ئەگێڕێتەوە لە ئیبنوعەبباسەوە کە فەرمویەتی: (الإضرار في الوصية من الكبائر)[1]. رواه النسائي مرفوعاً ورجاله ثقات.

واتە: زیان گەیاندن لە وەصیەتدا لە گوناهە گەورەکانە.

وە ئەو وەصیەتەی کە بە مەبەستی زیان گەیاندن بێت باتڵە با لە سێ یەك کەمتریش بێت. وەهەروەها حەرامە ئەگەر وەصیەت بکات دەربارەی ئارەق یا دروست کردنی کڵێسە وخانووی ڕابواردن.

**کەراهەت بوونی:**

وە کەراهەتی هەیە ئەگەر وەصیەت کەرەکە ماڵی کەم بێت و میراتگری هەبێت و میراتگرەکەی یا میرات گرەکانی پێویستیان بەوماڵە بێت؛ هەروەك چۆن کەراهەتی هەیە وەصیەت بۆ (فاسق) خراپکار بکرێت ئەگەر بزانێت یا گومانی تەواوی هەبێت کە بە کاری دەهێنێت لە خراپەکاریو تاواندا، بەڵام ئەگەر بزانێت یا گومانی تەواوی هەبێت کە وەصیەت بۆ کراو ئەو شتە بەکار ئەهێنێ بۆ خوا پەرستی ئەوکاتە وەصیەت (مندوب) پەسەندە.

**ڕەوا بونی:**

وەڕەوایە ئەگەر وەصیەتەکەی بۆ دەوڵەمەند بێت، جا وەصیەت بۆ کراوەکە خزم بێت یا بێگانە.

**پایەکەی:**

پایەکەی (إيجاب) دانە لە لایەن وەصیەت کەرەوە، وە (إيجاب)یش بە هەموو ئەو زاراوانە ئەبێت کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە دوای مردنی کەسێکی تر ئەکاتە خاوەنی ئەو شتە بە بێ بەرامبەر،

---

(١) النسائي في السنن الكبرى (١١٠٩٢).

وەك ئەوەی بڵێت: وەصیەت بێت دوای مردنم ئەو شتە بۆ فلان بێ، یا پێم بەخشی یا كردمە خاوەنی.

وە وەك چۆن بە ووتە پێك دێت بەو شێوەیەش بە ئیشارەت پێك دێت بە مەرجێك ئیشارەتەكە لێی تێ بگەیەت و ئەوكەسەش توانای قسە كردنی نەبێت، وەهەروەها بە نوسینیش پێك دێت.

هەر كاتێ وەصیەتەكە بۆ شتێكی دیاری كراو نەبوو وەك ئەوە بۆ مزگەوت بێ یا پەناگە یا قوتابخانەكان یا نەخۆشخانەكان بێت ئەو وەصیەتە پێویستی بە (قبول) وەرگرتن نی‌یە، بەڵكو تەنها بە (إیجاب) تەواو ئەبێت چونكە لەم شێوانەدا صەدەقەیە، بەڵام ئەگەر وەصیەتەكە بۆ كەسێكی دیاری كراو بێت ئەوە پێویستی بە قبوڵ كردنی وەصیەت بۆ كراو هەیە دوای مردن یا قبوڵ كردنی سەرپەرشتی كەری، ئەگەر وەصیەت بۆ كراوەكە منداڵ بوو یا ژیر نەبوو. جا ئەگەر قبوڵی كرد پێك دێت، بەڵام ئەگەر قبوڵی نەكرد دوای مردنی وەصیەتەكە بەتاڵ ئەبێتەوەو لە موڵكی میرات گرەكاندا ئەمێنێتەوە.

وە وەصیەت لەو پەیمانە دروستانەن كە دروستە بۆ وەصیەت كەر بیگۆڕێت یا لە هەرچی‌یەك ئەیەوێت پەشیمان بێتەوە.

وە پەشیمان بوونەوە بە ئاشكرا ئەبێت بە قسە وەك ئەوەی بڵێت: لە وەصیەتەكەم پەشیمانم.

وە بە بەڵگەش ئەبێت بە كردەوە وەك ئەوەی ئەو شتەی وەصیەتەكەی تێدا كردووە بیفرۆشێت كە بە فرۆشتنەكە لە موڵكی دەرئەچێت.

**چ كاتێك وەصیەتەكە شایستە ئەبێت؟:**

وەصیەتەكە شایستەی وەصیەت بۆ كراو نابێت ئیللا دوای مردنی وەصیەتكەر نەبێت و دوای دانەوەی قەرزەكانی. جا ئەگەر قەرزەكانی هەمو ماڵەكەی گرتەوە ئەوە وەصیەت بۆ كراو هیچی بۆ نی‌یە بەپێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿من بعد وصية يوصي بها أو دين﴾ واتە: (ئەو میراتە كاتێك بە میراتگرەكان ئەگات) دوای ئەنجام دانی وەصیەتی مردووەكەو دانەوەی قەرزەكانی.

**ئەو وەصیەتەی خرابێتە پاڵ شتێكەوە یا هەڵواسراو بێت بە مەرجەوە:**

ئەو وەصیەتەی خرابێتە پاڵ شتەوە یا هەڵواسراو بێت بە مەرجەوە یا بەسترابێت پێوەی دروستە ئەگەر مەرجەكە ڕاست بێت.

وە مەرجی ڕاستیش ئەوەیە كە: بەرژەوەندی وەصیەت كەر و وەصیەت بۆ كراو یا جگە لەوانی تێدا بێت، وە نابێت قەدەغە كراو بێت یا پێچەوانەی مەبەستەكانی شەریعەت بێت.

وە کاتێ مەرجەکە ڕاست بوو چاودێری کردنی پێویستە مادام بەرژەوەندی تێدا بێت.

وە هەرکاتێك ئەو بەرژەوەندی‌یەی مەبستە لێی یا ڕاست و دروست نەبوو پێویست نی‌یە چاودێری کردنی.

مەرجەکانی وەصیەت:

وەصیەت پێویستی بە وەصیەت کەرو وەصیەت بۆ کراوو وەصیەت لەسەر کراو هەیە، وە هەریەکە لە مانە چەند مەرجی هەیە وا لە خوارەوە باسیان ئەکەین:

مەرجەکانی وەصیەت کەر:

مەرجە کە وەصیەت کەر ئەهلی بەخشش بێت و شایستەیی تەواوی بێت، ئەوەش بە ژیری و پێ‌گەیشتوویی وئازادی و ئیختیار ئەبێت، وە نابێت حیجری لەسەر دانرابێ لەبەر گێلی و بێ ئاگایی، جا ئەگەر وەصیەت کەر ئەهلی‌یەتی تەواوی نەبوو وەك ئەوەی منداڵ بێت یا شێت یا بەندە یا زۆر لێ کراو یا حیجری لەسەر بێت ئەوە وەصیەتەکەی دروست نی‌یە.

وە دوو حاڵەت لە مانە جیا ئەکرێتەوە:

١- وەصیەت کردنی منداڵی خاوەن تەمیز کە تایبەت بێت بە کاروباری کفن و دفنی‌یەوە، بەمەرجێك لە سنوری بەرژەوەندی دا بێت.

٢- وەصیەت کردنی حیجر لەسەر دانراو بە هۆی گەوجی‌یەوە دەربارەی ڕویەك لە ڕووەکانی خێر وەك فێرکردنی قورئان ودروست کردنی مزگەوت ودامەزراندنی نەخۆشخانە.

لە پاشاندا ئەگەر میرات گری هەبوو ڕێ‌یان پێدا ئەوە لە هەموو ماڵەکەی جێبەجێ ئەکرێت.

وە هەروەها بەوشێوەیە ئەگەر هەر میرات گری نەبوو لە ئەصڵدا.

بەڵام ئەگەر میرات گری هەبوو ڕازی نەبوون بە وەصیەتەکە ئەوە تەنها لە سێ‌یەکی ماڵەکەی جێبەجێ ئەکرێت. ئەمەش مەزهەبی حەنەفی‌یەکانە.

ئیمامی مالیك موخالەفەی ئەوە ئەکات وڕێ ئەدات بە دروستی وەصیەتی کەم عەقڵ و منداڵێکی وا کە واتای خواپەرستی ونزیك بوونەوە لە خواوە ئەزانێت، فەرمویەتی: ئەو کارەی ئێمە لەسەری ئیجماعمان هەیە ئەوەیە کە ئادەمیزادی کەم عەقڵ وگەوج و توش بویەك کە هەندێ جار چاك ئەبێت، وەصیەتەکانیان دروستە ئەگەر ئەوەندە ئاوەزیان هەبێت کە بزانن چ وەصیەتێك ئەکەن. وەهەروەها ئەو منداڵەی ئەوەندە ژیر بێت بزانێت چ وەصیەتێك ئەکات وقسەی خراپ نەکات ئەویش وەصیەتەکەی دروستە.

**مەرجەكانی وەصیەت بۆ كراو:**

وەصیەت بۆ كراو ئەبێ ئەم مەرجانەی خوارەوەی تێدا بێت:

١- ئەبێ میرات گری وەصیەت كەرەكە نەبێت.

ئەوانەی بەسەرهاتە جەنگی یەكان ئەنوسنەوە ئەگێڕنەوە كە پێغەمبەر ﷺ ساڵی فەتحی مەككە فەرمووی: (لاوصية لوارث). رواه أحمد وأبوداود والترمذي وحسنه[1].

واتە: وەصیەت كردن بۆ میراتگر نابێت.

ئەم فەرموودەیە هەرچەندە فەرموودەیەكی ئاحادە بەڵام زانایان وەریان گرتووە بە گشتی كۆن لەسەر گفت پێ كردنی.

وە لە ریوایەتێكی تردا: (إن الله أعطي كل ذي حقٍ حقهُ، ألا لاوصية لوارث)[2]. واتە: بەڕاستی خوای گەورە مافی هەموو مافدارێكی داوە، با بزانن كە وەصیەت بۆ میراتگر نی یە.

بەڵام ئایەتی ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِنْ تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ﴾ (البقرة/١٨٠).

ئەوەی جەماوەری زانایان ئەڵێن: نەسخ كراوەتەوە.

شافیعی فەرمویەتی: خوای بەرز ئایەتی وەصیەت وئایەتی میراتی ناردۆتە خوارەوە لەوانەیە هەردوو ئایەتەكە حوكمەكەیان هەرمابێت و لەوانەشە ئایەتی میرات نەسخ كەری ئایەتی وەصیەت بێت.

زانایان گەڕاون بە دوای بەڵگەیەكدا كە یەكێ لەو دو ئیحتیماله پێش بخات پاشان لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ دۆزیویانەتەوە كە خاوەن غەزاكان گێڕاویانەتەوە كە پێغەمبەر ﷺ لە ساڵی فەتحی مەككەدا فەرمویەتی: (لاوصية لوارث)[3]. واتە: وەصیەت بۆ میراتگر دروست نی یە.

وە ڕێك كەوتوون لەسەر ئەوەی كە: كاتێك وەصی یەتەكە دروست نی یە كە وەصی یەت بۆ كراو لە ڕۆژی مردنەكەدا وارس بێت تەنانەت ئەگەر وەصی یەتی كردبێت بۆ برایەكی میراتگری لەكاتێكدا كە كوڕی نەبوبێت پاشان پێش مردنی كوڕێكی ببێت ئەو وەصیەتە بۆ ئەو برایە دروستە. بەڵام

---

(١) أحمد (٤/١٨٦) والترمذي (٢١٢٠).

(٢) أبوداود (٢٨٧٠) والترمذي (٢١٢١) وابن ماجه (٢٧١٣).

(٣) تەخریجی ئەم حەدیسە ڕابورد.

ئەگەر وەصیەتی بۆ براکەی کردبێتو کوڕێکی هەبووبێت پاشان ئەو کوڕە پێش مردنی وەصیەتکەر مردبێت، ئەوەش هەر وەصیەتە بۆ میرات گر کە دروست نی‌یە.

٢- مەزهەبی حەنەفی‌یەکان ئەوەیە کە وەصیەت بۆ کراو ئەگەر کەسێکی دیاری کراوبوو ئەوە مەرجە بۆ دروستی وەصیەت بۆ کردنەکەی ئامادە بێت لە کاتی وەصیەتەکەدا بە حەقیقەت یا بە تەقدیر، واتە : یا (بالفعل) بەڕاستی ئامادە بێت لەکاتی وەصی‌یەتدا یا بونەکەی تەقدیر بکرێت لەو کاتەدا. وەك ئەوە کە وەصیەتی کردبێت بۆ منداڵی سکی ئافرەتێك و ئافرەتەکەش لەوکاتەدا دوو گیان بێت. بەلاَم ئەگەر وەصیەت بۆ کراوەکە دیاری نەکرابێت ئەوە مەرجە کە ئامادە بێت لە کاتی مردنی وەصیەت کەر بە حەقیقەت یا بە تەقدیر.

جا ئەگەر وەصیەت کەر ووتی: وەصیەت ئەکەم خانووەکەم بۆ منداڵەکانی فلاَنە کەس بێت ومنداڵەکانی دیاری نەکرد، لە پاشاندا مردو لە وەصیەتەکەی پەشیمان نەبوبۆوە ئەوە ئەو خانوە ئەبێت بە موڵکی ئەو منداڵانە کە کاتی مردنەکە ئامادە بوون بە حەقیقەت ئامادە بوبن یا بە تەقدیر وەك منداڵی سکی دایك با لەکاتی بونی وەصی‌یەتەکەشدا ئامادە نەبوبێت، وە ئەبێت تەحقیق بکرێت کە ئایا وەختی وەصیەتەکە یان وەختی مردنی وەصیەت کەر منداڵەکە لە سکی دایکی دا بووە یان نا، هەر کاتێك لە شەش مانگ کەمتر لە دایك بووبێت لە کاتی وەصیەتەکەوە یا لە کاتی مردنی وەصیەت کەرەوە.

جەماوەرێك لە زانایان ووتویانە: ئەگەر کەسێك وەصیەت بکات کە سێ‌یەکی ماڵەکەی دابەش بکرێت بەو جۆرەی کە خوا نیشانی وەصی‌یەت پێ‌سپێردراوەکەی بدات، ئەوە ئەو وەصی‌یەتەی دروستە وە ئەبێت وەصی‌یەت پێ سپێردراوەکە لە ڕێی خوادا سەرفی بکات بێ ئەوەی هیچی لێ بخوات یا هیچی لێ بدات بە میراتگرەکانی.

بەلاَم ئەبوثەور پێچەوانەی ئەوەیە. شەوکانی لە (نیل الأوطار) دا هێناویەتی.

٣- مەرجە کە وەصیەت بۆ کراوەکە وەصیەت کەر نە کوژێت بە حەرامی و بە ڕاستەوخۆ. جا ئەگەر وەصی‌یەت بۆ کراو وەصیەتکەری کوشت بە کوشتنی حەرام و ڕاستەوخۆ ئەوە وەصیەتەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە، چونکە هەرکەس پەلە لە شت بکات پێش کاتی خۆی سزا ئەدرێ بە بێ‌بەش بوونی لەو شتەدا. ئەمەش مەزهەبی ئەبویوسفە.

وەئەبوحەنیفە و موحەممەد ووتویانە: وەصیەتەکە بەتاڵ نابێتەوە بەلاَم لەسەر ڕێ پێدانی میرات گرەکان ئەوەستێ.

**مەرجەکانی ئەو شتەی کە وەصیەتی لەسەر کراوە:**

مەرجە کە ئەو شتەی وەصیەتەکەی لەسەر کراوە دوای مردنی وەصیەت کەرەکە توانای بوون بە خاوەنی هەبێت بە هەر هۆیەك لە هۆکانی بوون بە خاوەنی.

کەواتە وەصیەت کردن بە هەموو ماڵێکی نرخێندراو دروستە، چ عەین بێت چ سودو مەنفەعەت بێت، وە وەصیەت دروستە بە بەری دەرەخت و بەو بەچکانەی لەسکی مانگادا هەیە، چونکە ئەمانە بە میرات ئەبن بە موڵك، جا هەرچی لەکاتی مردنی وەصیەتکەر بونەکەی جێگر بێت ئەبێتە ماڵی وەصیەت بۆ کراو.

ئەمە بە پێچەوانەی ئەوەیە کە وەصیەتی بە شتێکی نەبوو کردبێت.

هەروەها وەصیەت دروستە بە شتی قەرز وکەلکی شت، وەك دانیشتن لە خانوداو شتی تر.

وە دروست نی‌یە بەو شتانە کە ماڵ نین وەك مردارەوە بوو، وە شتێکیش کە نرخێندراو نی‌یە لە حەقی هەردو لایەنی کڕیارو فرۆشیاردا وەك تارەق بۆ موسڵمانان ئەوە دروست نی‌یە.

**چەندێتی ئەو ماڵەی کە پەسەندە وەصیەتی تێدا بکرێت:**

ابن عبدالبر فەرمویەتی: پێشینان جیاوازیان هەیە لە چەندێتی ئەو ماڵەی کە پەسەندە وەصیەتی تێدا بکرێت، یا پێویستە لای ئەو کەسانەی بە واجبیان داناوە.

لە عەلی‌یەوە ﷺ ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: شەش سەد درهەم یا حەوت سەد درهەم ئەو ماڵە نی‌یە وەصیەتی تێدا بکرێت.

وە ریوایەت کراوە لێوەی کە هەزار درهەم وەصی‌یەتی تێدا نەکرێت.

وە ئیبنوعەبباس فەرمویەتی: هەشت سەد درهەم وەصیەتی تێدا ناکرێت.

وە عائیشە فەرمویەتی: دەربارەی ژنێك چوار مندالی هەبێت و سێ هەزار درهەمی هەبێت وەصیەتی تێدا نی‌یە.

وەئیبراهیمی نەخعی ووتویەتی: هەزار درهەم هەتا پێنج سەد درهەم وەصیەتی تێدا ئەکرێت.

وەقەتادە دەربارەی ئەو ئایەتەی کە فەرمویەتی: (إن ترك خيراً) واتە: ئەگەر ماڵی بە جێ هێشتبوو. ئەو ماڵە هەزار وبەرەوژوورە.

وەلە عەلی‌یەوە کە فەرمویەتی: هەرکەس ماڵێکی کەمی هەبوو با وازی لێ بهێنێ بۆ میرات گرەکانی باشترە.

وە لە عائیشەوە کە فەرمویەتی: هەرکەس هەشت سەد درهەمی بەجێ هێشتبێت مالی بەجێ نەهێشتووە با وەصیەت نەکات.

## وەصیەت کردن بە سێ یەکی ماڵ:

دروستە بە سێ یەکی ماڵ وەصیەت بکرێت، و لەوە زیاتر دروست نی یە، وە باشتر وایە لە سێ یەك کەمتر بێت، وە ئیجماعی زانایان لەسەر ئەوە جێگیرە.

بوخاری و موسلیم و خاوەن سوننەکان ئەگێڕنەوە لە سەعدی کوڕی ئەبو وەققاصەوە ﷺ کە فەرمویەتی: من لە مەککە بووم پێغەمبەر ﷺ هاتە دیدەنم سوئەو لای ناخۆش بوو لەو خاکەدا بمرێت کە کۆچی لێ کردبوو. فەرمووی: خوا بەزەیی بە کوڕی عەفرادا بێتەوە. ئەڵێ: ووتم: ئەی نێرراوی خوا، وەصیەت بکەم کە هەموو ماڵەکەم خێر بێت؟ فەرمووی: نەء. ووتم: نیوە؟ فەرموی نەء، ووتم: سێ یەکی؟ فەرمووی: سێ یەك، سێ یەکیش زۆرە، چونکە تۆ ئەگەر منداڵەکانت بە دەوڵەمەندی بەجێ بهێڵی خێرترە لەوەی بەهەژاری بە جێ یان بهێڵی و دەست لە خەڵك پان بکەنەوە، وەتۆ هەر چەندت سەرف کردبێت بۆیان هەمووی بە خێر بۆت نوسراوە هەتا ئەو پاروەی کە ئەیخەیتە ناو دەمی ژنەکەتەوە، وە بەڵکو خوا کە گیانت بکێشێ کۆمەڵێك سوودت لێ وەربگرێت وکۆمەڵێکی تر زیان. وەئەو کاتە سەعد تەنها کچێکی هەبوو[(١)،(٢)].

## سێ یەك لە هەموو ماڵەکە حیساب ئەکرێت:

جەماوەری زانایان بۆ ئەوە چوون کە سێ یەك لە هەموو ماڵەکە حیساب ئەکرێت کە وەصیەتکەر بەجێ ی ئەهێڵێت.

وە مالیك فەرمویەتی: لە سێ یەکی ئەو ماڵە حیساب ئەکرێت کە وەصیەتکەر پێ ی زانیوە، و لەوانە دەرناکرێت کە لێ ی شاراوەیە یا بۆی نوێ بۆتەوەو پێ ی نەزانیوە.

## ئایا ئەوەی دائەنرێت سێ یەکی کاتی وەصیەتەکەیە یا کاتی مردنی؟:

مالیك ونەخەعی و عومەری کوڕی عبدالعزیز بۆ ئەوە چوون کە ئەوەی دائەنرێت سێ یەکی بەجێ ماوە لەکاتی وەصیەتەکەدا. وە ڕای ئەبوحەنیفە وئەحمەد و ڕاست ترین گفتی شافیعی

---

(١) أحمد (١/١٧٩) والبخاري (٦٧٣٣) ومسلم (١٦٢٨/٥) والترمذي (٢١١٦) والنسائي (٦/٢٤١) وابن ماجه (٢٧٠٨).

(٢) ئەمە پێش ئەوە بو کە ئەولادی نێری ببێ، چونکە دوای ئەوە چوار کوڕی بو. واقیدی باسی کردوە، وە ووتراوە: زیاتر لە دە کوڕو دوانزە کچی بوە.

ئەوەیەکە سێ یەك لەو ماڵە حیساب ئەکرێت کە لەکاتی مردندا بەجێی ئەهێڵێت. ئەمەش قسەی عەلی و هەندێ لە تابیعی یەکانە.

**وەصیەت کردن بە زیاتر لە سێ یەك:**

وەصیەت کەر یا میرات گری ئەبێت یا نابێت. جا ئەگەر میرات گری هەبوو ئەوە دروست نی یە وەصیەت کردن بە سێ یەك زیاتر وەك لە پێشەوە باس کرا، وە ئەگەر وەصیەتی کرد بە زیاتر لە سێ یەك ئەوە وەصیەتەکەی جێبەجێ ناکرێت بە پرسی میرات گرەکان نەبێت.

**بۆ جێبەجێ کردنی دوو مەرج پێویستە:**

١- ئەبێ ڕێدانەکەیان دوای مردنی وەصیەت کەر بێت، چونکە پێش مردنی میرات گرەکانی مافی ئەوەیان نی یە ڕێ بدەن یا ڕێ نەدەن، کەواتە ڕێ پێدانیان هیچ ئیعتیباری نی یە، وە ئەگەر میراتگرەکان ڕێیان پێ دا وئەو لە ژیاندا بوو هەر کاتێك ئارەزویان هەبوو هەڵی ئەوەشێننەوە. بەڵام ئەگەر ڕێ پێدانەکە دوای مردنی وەصیەت کەر بوو ئەوە وەصیەتەکە جێبەجێ ئەکرێت.

زوهری ورەبیعە فەرمویانە: ڕێپێدەر بۆی نی یە بە هیچ جۆرێك پەشیمان بێتەوە.

٢- ئەبێ ئەوکەسەی ڕێ بە جێبەجێ کردنی وەصیەتەکە ئەدات ئەهلی یەتی تەواوی بێت و حیجری لەسەر نەبێت لەبەر گێلی یا لەبەر بێئاگایی.

وە ئەگەر میرات گریشی نەبوو هەر بۆی نی یە لە سێ یەکی ماڵ زیاتر بکات بە وەصیەت ئەمەش لای جەماوەری زانایان بەو شێوەیە.

وە حەنەفی یەکان وئیسحاق وشورەیك وئەحمەد لە ڕیوایەتێکدا بۆ ئەوە چوون کە دروستە لە سێ یەك زیاتر وەصیەت بکرێت، ئەمەش قسەی عەلی وئیبنومەسعودە. چونکە وەصیەت کەر لەم حاڵەتەدا کەسێك بەجێ ناهێڵێ ترسی هەژار بوونی لێ بکرێت، وە لەبەر ئەوەی وەصیەت لە ئایەتەکەدا بە موطلەقی هاتووە، بەڵام سوننەت بەستویەتی یەوە بەوکەسانەوە کە میرات گریان هەیە، ئیتر ئەوانە کە میراتگریان نی یە لەسەر موطلەقی یەکە ئەمێننەوە.

**پوچەڵ بوونەوەی وەصیەت نامە:**

وەصیەت بە نەمانی یەکێ لەو مەرجانەی پێشەوە پوچەڵ نەبێتەوە، وەهەروەها بە مانەی لای خوارەوە:

١- ئەگەر وەصیەت کەر شێت بوو بە تەواوی و هەتا مردن چاك نەبووەوە.

٢- ئەگەر وەصیەت بۆ کراو مرد پێش مردنی وەصیەت کەر.

٣- ئەگەر ئەو شتەی وەصیەتەکەی لەسەر کراوە دیاری کراو بێت و پێش ئەوەی وەصیەت بۆ کراو قەبوڵی بکات لەناو بچێت.

# بەشە دانراوەکان (الفرائض)

**پێناسەکەی:**

(فرائض) کۆی (فریضة)یە، (فریضة)یش لە (فرض)ەوە وەرگیراوە کە بە مانای دانانە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿فَنِصۡفُ مَا فَرَضۡتُمۡ﴾ واتە: نیوەی ئەوەی کە داتان ناوە. وە (فرض) لە یاسای ئیسلامدا ئەو بەشە دانراوەیە کە بۆ میراتگر دانراوە، وە بە عیلمەکەی ئەوترێ عیلمی میرات یا عیلمی (فرائض) بەشە دانراوەکان.

**دانانی:**

عەرەبەکان لە پێش ئیسلامدا میراتیان ئەدا بە پیاوان نەك بە ژنان. وە بە گەورەکان نەك بە بچوکەکان، وە ئەوکاتە میرات لەیەك گرتن هەبوو بە هۆی پەیمانەوە، جا خوای گەورە ئەمانەی هەموو پوچەڵ کردەوەو ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ فَإِن كُنَّ نِسَآءٗ فَوۡقَ ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَۖ وَإِن كَانَتۡ وَٰحِدَةٗ فَلَهَا ٱلنِّصۡفُۚ وَلِأَبَوَيۡهِ لِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٞۚ فَإِن لَّمۡ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٞ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُۚ فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخۡوَةٞ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُۚ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِي بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍۗ ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ لَا تَدۡرُونَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ لَكُمۡ نَفۡعٗاۚ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا﴾ (النساء/١١). واتە: خوای گەورە فەرمانتان پێ ئەدات دەربارەی منداڵەکانتان لە میراتدا، هەرنێرینەیەك ئەوەندەی دوو مێینەی بەر ئەکەوێت، جا ئەگەر هەر ئافرەت بوون ولە دووان زیاتر بوون ئەوە دووسێ‌یەکی ئەو ماڵەی بەجێی هێشتووە ئەیبەن، بەڵام ئەگەر یەك ئافرەت بوو نیوەی ئەبات، وە باوك ودایکی مردوەکە هەر یەکەیان شەش یەکی ئەو ماڵەی کە بەجێی هێشتووە ئەیبەن، ئەگەر مردووەکە ئەولادی هەبێت، بەڵام ئەگەر ئەولادی نەبوو دایك وباوکی بوونە میرات گری ئەوە دایکی سێ‌یەکی ئەبات، جا ئەگەر

مردووەکە برای هەبوو ئەوە دایکی شەش یەکی ئەبات، دوای جێبەجێ کردنی ئەو وەصیەتەی کە کردویەتی، یا دوای دانەوەی قەرزەکانی، بابتان یا کوڕەکانتان ئێوە نازانن کامیان کەلکی بۆ ئێوە نزیك ترە. ئەمە دانراوێکە لەلایەن خواوە بەڕاستی خوا عەلیم و حەکیمە.

**هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە:**

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ئەوەیە کە لە جابیرەوە هاتووە فەرمویەتی: ژنەکەی سەعدی کوڕی رەبیع هەردو کچەکەی سەعدی هێنایە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و ووتی: ئەی نێرراووی خوا، ئەم دوو کچە کچی سەعدی کوڕی رەبیعن که لە ئوحود لەگەڵتا بووەو کوژرا بە شەهیدی. مامەکەیان هەمو ماڵەکەیانی بردووە وهیچی بۆ نەهێشتونەوە، و ئەمانە بە ماڵ نەبێ نادرێن بە شوو. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوا حوکم ئەدات لەبارەی ئەو کێشەیەوە، پاشان ئایەتی میرات هاتە خوارەوە. ئینجا پێغەمبەر ﷺ ناردی بە شوێن مامەکەیان و پێی فەرموو: دوو سێیەکی ماڵەکە بدە بە دوو کچەکە وهەشت یەکیش بدە بە دایکیان وئەوەی مایەوە بۆ خۆت. خاوەنی هەر پێنج سوننەنەکان جگە لە نسائی گێڕاویانەتەوە[1].

**چاکێتی زانستی بەشە دانراوەکان (علم الفرائض) :**

١- لە ئیبنومەسعودەوە هاتوە کە فەرمویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (تَعَلَّمُوا القُرآنَ وَعَلِّمُوهُ النَّاسَ. وَتَعَلَّمُوا الفَرَائِضَ وَعَلِّمُوهَا فَإنِّي امرِئٌ مَقبُوضٌ وَالعِلمُ مَرفُوعٌ وَيُوشِكُ أن يَختَلِفَ اثنَانِ فِي الفَرِيضَةِ وَالمَسألَةِ فَلا يَجِدَانِ أحَداً يُخبِرُهُما). ذکره أحمد[2]. واتە: خۆتان فێری قورئان بکەن و خەڵکیش فێر بکەن. وە خۆتان فێری زانستی (فرائض) بەشە دانراوەکان بکەن وخەڵکیش فێر بکەن، چونکە من ئەمرم وزانیاری لەناوتاندا هەڵئەگیرێت وە لەوانەیە دوو ناو لە بەشێکدا یا لە کێشەیەکدا جیاوازیان هەبێت و کەسیش نەدۆزنەوە پێتان بڵێت.

٢- لە عبدالله ی کوڕی عەمرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (العِلمُ ثَلاثَةٌ وَمَا سوى ذَلِكَ فَضلٌ: آيَةٌ مُحكَمَةٌ أو سُنَّةٌ قَائِمَةٌ أو فَرِيضَةٌ عَادِلَةٌ). رواه أبوداود وابن ماجه[3]. واتە: زانست سیانە و لەوە بەولاوە زیادەیە؛ ئایەتێکی موحکەم، یا سوننەتێکی بەردەوام، یا (فريضة) بەشە دانراوێکی عادڵانە.

---

(١) أحمد (٣/٣٠٧) وأبوداود (٢٨٩١) والترمذي (٢٠٩٢) وابن ماجه (٢٧٢٠).

(٢) النسائي في الكبرى (٦٣٠٥) والحاكم (٤/٣٣٣) والدارمي (٣/٣٤٢) والدارقطني (٤/٨١).

(٣) أبوداود (٢٨٨٥) وابن ماجه (٥٤).

٣- لە ئەبوهورەیرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (تَعَلَّمُوا الفَرَائِضَ وَعَلِّمُوهَا فَإِنَّهَا نِصفُ العِلمِ وَهُوَ يُنسى وَهُوَ أَوَّلُ شَيءٍ يُنزَعُ مِن أُمَّتِي). رواه ابن ماجه والدارقطني[١]. واتە: خۆتان فێری زانستی (فرائض) بەشە دانراوەکان بکەن و خەڵکیش فێر بکەن چونکە عیلمی (فرائض) نیوەی زانستی یە ولە بیریش ئەچێتەوە، وە یەکەم زانستە کە لەناو ئۆمەتما هەڵئەگیرێ.

## بەجێ ماو (التركة)

**پێناسەکەی:**

(تركة) ئەو شتانەیە کە مردوو بەجێی ئەهێڵێ لە ماڵ و موڵك بە گشتی[٢].

ئیبنوحەزم بڕیاری لەسەر ئەو پێناسەیە داوەو فەرمویەتی: خوای گەورە میراتی پێویست کردووە لەو شتانەدا کە ئادەمیزاد دوای مردنی بەجێیان ئەهێڵێ ئەو شتانەی کە ماڵن نەك ئەوانەی کە ماڵ نین، بەڵام مافەکان بە میرات ناگیرێن ئەوانە نەبن کە تابیعی ماڵن یا لە واتای ماڵدان، وەك مافی بەندایەتی و پایەبەرزی و مافی مانەوە لە زەوی دەست بەسەرگیراو بۆ خانوو بۆ چاندن، وە (تركة) لای مالیکی یەکان و شافیعی یەکان و حەنبەلی یەکان هەموو ئەوانە ئەگرێتەوە کە مردوو بەجێیان دێڵێ لە موڵك و ماڵ و مافەکان. جا مافەکان ماڵی بن یا غەیرە ماڵی بن.

**ئەو مافانەی کە پەیوەندیان هەیە بە (تركة) بەجێ ماوەوە:**

ئەو مافانەی پەیوەندیان هەیە بە بەجێ ماوەوە چوارن، وە ئەوانە هەموویان وەك یەك نین بەڵكو هەندێکیان بە هێزترن لە هەندێکیان لەبەر ئەوە پێش ئەوانی تر ئەخرێن لە دەرهێنانا لە بەجێ ماوەکە بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- مافی یەکەم: کە لە سەرەتاوە دەرئەهێندرێ لە بەجێ ماوی مردوەکە کفن و ئامادە کردنی مردوەکەیە وەك لە پێشەوە لەبەشی جەنازەدا باس کراوە.

٢- مافی دووەم: دانەوەی قەرزەکانی یەتی لەو بەجێ ماوە. ئیبنوحەزم وشافیعی قەرزەکانی خوا وەك زەکات وکەفارەت پێش قەرزی بەندەکانی خوا ئەخەن.

حەنەفی یەکان قەرزەکانی خوا بە مردن لائەبەن، کەواتە پێویست نی یە لەسەر میراتگرەکان کە بیدەنەوە مەگەر خۆیان تەبەرروع بکەن وبە خێر بیدەنەوە یا مردوەکە خۆی وەصیەتی کردبێت بۆ دانەوەی، وە لە حاڵەتی وەصیەت کردن بۆ دانەوەی قەرزی خوا وەك وەصیەت کردن بۆ بێگانەی لێ

---

(١) ابن ماجه (٢٧١٩) والدارقطني (٤/٦٧) والحاكم (٤/٢٣٣).

(٢) ئەمە پێناسە کردنی حەنەفی یەکانە

دێت، وە میرات گرەکان یا وەصی لە سێیەکی ماڵەکەی دەری ئەکەن کە ماوەتەوە دوای کفن و دفن و دانەوەی قەرزی خەڵك. ئەوە ئەگەر میراتگری هەبوو بەڵام ئەگەر میرات گری نەبوو لە هەموو ماڵەکە دەرئەکرێت.

حەنبەلی‌یەکان هەر دوو قەرزەکە بە یەکسان دائەنێن بۆ دانەوە. وەك ئەبینین هەموویان لەسەر ئەوە رێك کەوتوون کە قەرزی عەینی[1] خەڵك پێش قەرزی گشتی ئەخرێت.

٣- مافی سێیەم: بەجێ گەیاندنی وەصیەتەکەی لە سێیەکی ئەو ماڵەی کە دوای دانەوەی قەرزەکانی ماوە.

٤- مافی چوارەم: دابەش کردنی ئەو ماڵەی ماوەتەوە لە نێوان میرات گرەکاندا.

**پایەکانی میرات:**

بۆ بونی میرات سێ شت پێویستە:

١- میراتگر: ئەو کەسەیە ئەچێتەوە سەر مردووەکە بە هەر هۆیەك بێت لە هۆکانی میرات.

٢-میرات لێ‌گیراو: ئەویش مردووەکەیە بە حەقیقەت یا بە حوکم وەك ئەو وون بووەی حوکم دراوە بە نەمانی.

٣- میرات: بەجێ ماویشی پێ ئەوترێت. کە ئەویش ماڵەکەیە یا مافی گوێزراوەیە لە مردووەکەوە بۆ میرات گر.

**هۆیەکانی میرات:**

میرات گرتن بەم سێ هۆیە ئەبێت:

١- نەسەب و خزمایەتی حەقیقی: بەپێی فەرمودەی خوای گەورە: ﴿وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ﴾ (الأنفال/٧٥). واتە: هەندێ لە خزم و کەسوکار لە کتێبی خوادا سەبارەت بە هێندێکی تر لە ئەحکامێکدا کە خوا دایناوە شیاوترن.

٢- نەسەب و خزمایەتی حوکمی[1]: بەپێی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ (الوَلاءُ لُحمَةٌ كَلُحمَةِ النَّسَبِ). رواه ابن حبان والحاكم وصححه. واتە: وەلائیش تێکەڵاوی و کەسایەتی‌یە هەروەك کەسایەتی نەسەب.

---

(١) قەرزی عەینی ئەوەیە کە پەیوەندی ببێ بە عەینی ماڵەکەوە.

٣- ژن ومێردایەتی دروست: بەپێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ﴾ (النساء/١٢). واتە: وە بۆ ئێوە نیوەی ئەو ماڵە هەیە کە ژنەکانتان بەجێی دێڵن.

**مەرجەكانی میرات:**

بۆ میرات گرتن سێ مەرج دانراوە:

١- مردنی میرات لێ گیراو بە حەقیقەت یا بە حوکم مردبێت، وەك ئەوەی قازی حوکم بدات بە مردنی وون بوویەك، جا ئەو حوکمە وا لەوکەسە ئەکات وەك بە حەقیقەت مردبێت، یا بە تەقدیری مردبێت وەك ئەوەی کەسێك لە ئافرەتێکی دووگیان بدات و منداڵەکەی بە مردویی لەبار بچێت، ئەوە ژیانی ئەو کۆرپەلەیە تەقدیر ئەکرێ با هێشتا بەدیش نەهاتبێ.

٢- ژیانی میرات گر دوای مردنی میرات لێ گیراو با بە حوکمیش بێت، وەك کۆرپەلەی سکی دایك کە بە زیندوو دائەنرێت لە حوکمدا تەنها لەبەر ئەوەی لەوانەیە هێشتا ڕۆحی بە بەردا نەکرابێت، جا ئەگەر ژیانی میرات گر نەزانرا دوای مردنی مێرات لێ گیراو وەك ئەوانەی لە ئاودا خنکابێتن یا کەوتبنە ناو ئاگرەوە یا شتیان بە سەردا ڕوخابێت ئەوە میرات گری یەکتری نین ئەگەر لەوانە بن کە میراتی یەکتری بگرن، وە ماڵی هەریەکە لە مانە دابەش ئەکرێت بە سەر میرات گرە زیندووەکانیدا.

٣- نەبێ ڕێگرێك لە ڕێگرەکانی میرات نەبێت کە لە خوارەوە دێن.

**ڕێگرەكانی میرات گرتن:**

میرات لێ قەدەغە کراو ئەو کەسەیە کە هۆیەکانی میرات گرتنی هەبێت بەڵام سیفەتێکی تێدا ئەبێت کە شایستەیی میراتی لێ ئەسێنێتەوە، وە بەوکەسە ئەوترێت بەش بڕاو.

---

(١) ئەویش وەلائە کە ئەو خزمایەتی‌یەیە بە هۆی ئازاد کردنەوە دروست ئەبێت، وە پێی دەوترێت: (ولاء العتق) واتە: خزمایەتی بەهۆی ئازادکردنەوە، یا ئەو خزمایەتی‌یەیە کە بەهۆی (موالاة)وە دروست ئەبێت. وە پێی ئەوترێت (ولاء الموالاة) واتە: خزمایەتی بەهۆی دۆستایەتی‌یەوە، کە ئەمیش پەیمان بەستنە لە نێوان دوو کەسدا کە یەکێکیان میرات گری نەسەبی نەبێت. وە بەوەی تریان بڵێت: تۆ دۆست و کەسی منی ئەگەر مردم میراتگرم بە، وە خوێن ببژێرە لە بری من ئەگەر تاوانم کرد واتە خوێن بایی شەرعیم بۆ بدە ئەگەر تاوانێکی بە هەڵە ڕووی دا لە منەوە لە کوشتن و بەرەوخوارتر، وە بە هۆی میرات گرتن دائەنرێت لای ئەبوحەنیفە، بەڵام لای جومهوری زانایان بە هۆ دانانرێت، وە پاساش بە لای ڕای جەماوەردا داشکاوە.

ڕێگرەکانیش چوارن:

١- کۆیلەیەتی: تەواو بێت یا ناتەواو.

٢- کوشتنی قستی حەرام: چونکە ئەگەر میرات گر بە ستەم میرات لێ گیراوەکە بکوژێت بە ڕای هەموو زانایان میراتەکەی ناگرێت، بەپێی ئەوەی نەسائی گێڕاویەتی‌یەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لیس للقاتل شيءٌ)[1].

واتە: قاتل هیچ ناگرێ لە میراتی ئەوکەسەی کە کوشتویەتی.

وە هەر کوشتنێك بێجگە لە کوشتنی قستی دوژمنایەتی زانایان جیاوازیان هەیە لەسەری.

شافیعی فەرمویەتی: هەموو کوشتنێك میرات قەدەغە ئەکات با لە منداڵ یا لە شێتیشەوە بێت، وە با بە حەقیش بێت وەك حەددو (قیصاص).

مالیکی‌یەکان وتویانە: ئەو کوشتنەی کە ڕێگرە لە میرات گرتن کوشتنی قستی زۆرداری‌یە ئیتر ڕاستەوخۆ بێت یا هۆکار بێت.

٣- جیاوازی لە ئاییندا: چونکە موسڵمان میراتگری کافر نی‌یە وکافریش میراتی موسڵمان نابات بەپێی ئەوەی خاوەنی هەر چوار سونەنەکان گێڕاویانەتەوە لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لايَرِثُ المُسلِمُ الكَافِرَ وَلا يَرِثُ الكَافِرُ المُسلِمَ)[2]. واتە: نە موسڵمان میرات گری کافرە ونە کافر میرات گری موسڵمانە.

گێڕراوەتەوە لە موعاذو موعاوی‌یەو ئیبنوموسەییب و مەسروق و نەخعی‌یەوە: کە موسڵمان میراتی کافر ئەگرێت بەڵام بە پێچەوانەوە نابێت، وەك چۆن پیاوی موسڵمان بۆی هەیە ژنی کافر بهێنێت، بەڵام کافر نابێت ئافرەتی موسڵمان بهێنێت. بەڵام غەیری موسڵمانان میرات لە یەکتری ئەگرن، چونکە هەموویان بە خاوەنی ئایینێك دائەنرێن.

٤- جیاوازی نیشتمانی میراتگرو میرات لێ گیراو:

مەبەست لە جیاوازی نیشتمان جیاوازی ڕەگەز نامەیە، جیاوازی ڕەگەزنامەش ڕێگری میرات گرتن نی‌یە لەنێوان موسڵماناندا. کەواتە موسڵمان میراتی موسڵمان ئەبات هەرچەندە وڵاتەکانیان زۆر بێت ودور بێت، بەڵام جیاوازی ڕەگەز نامە لە نێوان غەیری موسڵماناندا زانایان جیاوازیان هەیە لەسەری کە ئایا ئەوە ڕێگری میرات گرتنە یان نا؟ جەماوەرێك لە زانایان لەسەر ئەوەن کە

---

(١) النسائي في الكبرى (٦٣٦٧).

(٢) البخاري (١٥٨٨) ومسلم (١٦١٤).

ڕێگری ناکات لە میرات گرتن لە نێوان غەیری موسڵمانانداا، وەك چۆن ڕێگری میرات گرتن نی‌یە لە نێوان موسڵمانانداا.

لە (المغني) دا هاتووە: (قیاس)ی ئەومەزهەبە کە لای منە ئەوەیە کە خاوەنی یەك ئایین لەنێوان خۆیاندا میرات گری‌یەکتری ئەبن هەرچەندە وڵاتەکانیشیان جیاواز بێت. چونکە دەقە گشتی‌یەکان وا پێویست ئەکات کە میراتگر بن، وە هیچ دەقێك و ئیجماعێك نەهاتووە دەربارەی تایبەت کردنیان، وە قیاسیش لەوێدا ڕاست نی‌یە، کەواتە پێویستە کار بکرێت بە گشتێتی ئەو دەقانە.

## ئەوکەسانەی خاوەن مافن لە بەجێ ماودا (المستحقون في التركة)

ئەوکەسانەی مافیان هەیە لە بە جێ ماودا بەم شێوەیەی خوارەوە ڕیز ئەکرێن لە مەزهەبی حەنەفی دا:

١- (أصحاب الفروض) خاوەن بەشە دیاری کراوەکان.

٢- (العصبة النفسية) خزمی پشتی، یا خزمی باوکی.

٣- (العصبة السببية) خزمی هۆکاری. (واتە: بەندەی ئازادکراو).

٤- گێڕانەوەو دابەش کردنەوە بە سەر خاوەن بەشەکاندا.

٥- (ذوو الأرحام) خزمی دایکی.

٦- (مولی الموالاة) (واتە: خزمایەتی بەهۆی دۆستایەتی‌یەوە).

٧- کەسێك کە دان نرابێت بە نەسەب و بنەماڵەیدا.

٨- ئەوکەسەی بە سێ‌یەك زیاتر وەسێتی بۆکراوە.

٩- بيت المال (خانەی دارایی).

### ١- خاوەن بەشە دیاری کراوەکان:

خاوەن بەشەکان ئەوانەن کە بەشیان هەیە لەو شەش بەشەی کە بۆیان دیاری کراوە کە ئەمانەیە: (١/٢) ، (١/٤) ، (١/٨) ، (٢/٣) ، (١/٣) ، (١/٦) .

وە خاوەن بەشەکان دوانزەن: چواریان لە نێرینەکانە کە ئەمانەن: باوك، باپیرەی صەحیح هەرچەندە بەرەو ژوور بێت، وە برای دایکی، و مێرد.

وە هەشتیان لە مێینەکانە کە ئەمانەن: ژن، کچ، خوشکی دایك و باوکی، خوشکی باوکی، خوشکی دایکی، کچی کوڕ، دایك، نەنکی صەحیح هەرچەندە بەرەوژووریش بێت.

وا لە خوارەوەبەشی هەر یەکەیان بە درێژی ڕوون ئەکرێتەوە:

**حاڵەتەکانی باوك**

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُ وَلَدٌ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ الثُّلُثُ﴾ (النساء/١١). واتە: بۆ باوك و دایكی مردو بۆ هەر یەکەیان شەش یەك هەیە لەوماڵەی بەجێی هێشتووە ئەگەر مردووەکە ئەولادی هەبێت، نێر بێت یا مێ، یەك دانە بێت یا زیاتر. جا ئەگەر ئەولادی نەبوو، وە باوك و دایكی میراتگری بوون ئەوە سێ‌یەکی ئەو ماڵە بۆ دایکیەتی و باقی‌یەکەشی بۆ باوکی.

بۆ باوك سێ حاڵەت هەیە: حاڵەتێك میرات ئەگرێ بە ڕێگای بەش، وە حاڵەتێك میرات ئەگرێت بە هۆی ئەوەوە کە (عصبة)یە، وە لە حاڵەتێکی تردا میرات ئەگرێت هەم بە بەش و هەم بە (عصبة)ەیەتی.

**حاڵەتی یەکەم:**

بە ڕێگای بەش (فرض) میرات ئەگرێت ئەگەر لقێکی میرات گری نێری لەگەڵدا بێت، بە تەنها یا لەگەڵ کەسێکی تردا، وە لەم حاڵەتەدا بەشەکەی شەش یەك ئەبێت.

**حاڵەتی دووەم:**

بە ڕێگای (عصبة)ەیەتی میرات ئەگرێت ئەگەر لەگەڵ مردووەکەدا لقێکی میرات گری نێر یا مێ نەبێت، جا هەموو بەجێ ماوەکە وەرئەگرێت ئەگەر خۆی بە تەنها بوو، یا ئەوەی ئەمێنێتەوە لە خاوەن بەشەکان ئەگەر یەکێ لە خاوەن بەشەکانی لەگەڵدا بێت.

**حاڵەتی سێیەم:**

بە ڕێگای بەش و (عصبة)ەیەتی بەیەکەوە میرات ئەگرێت، ئەمەش لەکاتێکدا ئەبێت کە لقێکی میرات گری مێ‌ی لەگەڵدا بێت، وە لەم حاڵەتەدا شەش یەکە بەشەکەی خۆی وەرئەگرێت و لە پاشاندا هەرچی مایەوە لە خاوەن بەشەکان وەری ئەگرێت بە (عصبة)ەیی.

**حاڵەتەکانی باپیرەی صەحیح :**

باپیرە هەیە (صحیح)ە، وە هەیە (فاسد)ە:

باپیرەی صەحیح ئەوەیە کە بتوانرێت بدرێتە پاڵ مردووەکە بێ ئەوەی مێیینە بچێتە نێوانیان وەك باوکی باوك.

وە باپیرەی (فاسد) ناڕاستەکی ئەوەیە کە یەکسەر نادرێتە پاڵ مردووەکە ئیللا بە چوونی مێیەك نەبێ لەنێوانیان وەك باوکی دایك.

باپیرەی صەحیح میراتەکەی سابتە بە ئیجماعی زانایان، لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە هاتوە کە پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ووتی: کوڕی کوڕەکەم مردووە لە میراتەکەی چی بۆ منە؟ فەرمووی: شەش یەك. کاتێ پشتی هەلکردەوە بانگی کرد و پێی فەرموو: شەش یەکێکی ترت بەردەکەوێت، کاتێ پشتی هەلکردەوە بانگی کردەوە پێی فەرمووەوە: ئەو شەش یەکەی تر زیادە لە حەقی خۆت. (رواه أحمد وأبوداود والترمذي وصححه)[1].

وە بەشە میراتی باپیرەی صەحیح ئەبڕێت بە بوونی باوك، وە باپیرە جێی باوك ئەگرێتەوە کاتی نەبوونی باوك، تەنها لە چوار کێشەدا نەبێت:

١- دایکی باوك (نەنك) کە باوك هەبێت میرات ناگرێت، چونکە بەهۆی باوکەوە ئەگات بە مردوەکە، بەڵام میرات ئەگرێت لەگەڵ بوونی باپیرەدا.

٢- ئەگەر مردووەکە دایك و باوکی و یەکێ لە ژن و مێردی بەجێ هێشت، ئەوە دایك سێ‌یەکی ئەوەی کە ئەمێنێتەوە دوای دانانی بەشی یەکێ لە ژن و مێردەکە ئەگرێت.

بەڵام ئەگەر لە جێگای باوك باپیرە هەبوو ئەوە دایك سێ‌یەکی هەموو ماڵەکەی ئەکەوێت، ئەمە پێی ئەڵێن: کێشەی (عمرية) لەبەر ئەوەی عومەر حوکمی تێدا کردوە، وە هەروەها (غرائية) شی پێ ئەوترێت، چونکە وەك ئەستێرەی سپی بەناوبانگ و ئاشکرایە.

ئیبنوعەبباس پێچەوانەی ئەوەیەو فەرمویەتی: دایك هەمیشە سێ‌یەکی هەموو بە جێ ماوەکە وەرئەگرێت بەپێی فەرموودەی خوای بەرز کە ئەفەرموێت: ﴿فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ﴾.

٣- ئەگەر باوك هەبوو بەر لە خوشك و برای باوك و دایکی و خوشك و برای باوکی ئەگرێت، بەڵام باپیرە بەر لەوانە ناگرێت، بەڵکو لەگەڵ بوونی باپیرەشدا بەشیان هەیە.

ئەمەش مەزهەبی شافیعی و ئەبویوسف و موحەممەد و مالیکە.

---

(١) أحمد (٤/٤٢٨) وأبوداود (٢٨٩٦) والترمذي (٢٠٩٩).

ئەبوحەنیفە فەرمویەتی: خوشك و برا بە باپیرەش بەریان ئەگیرێت وەك چۆن بە باوك بەریان ئەگیرێت هیچ جیاوازی نی‌یە لەنێوان باوك و باپیرەدا.

## حاڵەتەکانی برای دایکی

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ ۚ فَإِن كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ ۚ﴾ (النساء/١٢). واتە: ئەگەر پیاوێك یا ژنێك مرد و نە باوکی هەبوو نە منداڵ، وە پیاوەکە یا ژنەکە برایەك یا خوشکێکی هەبوو لە دایکەوە ئەوە هەریەکە لە خوشك و برا دایکی‌یەکە شەش یەکی میراتەکەیان بۆ ئەبێت، بەڵام ئەگەر خوشك و برا دایکی‌یەکان زۆر بون، ئەوە هەموویان هاوبەشن ئەبن لە سێ‌یەکی ماڵەکەداو وەك یەك لێیان بەش دەکرێت بێ ئەوەی جیاوازی بکرێت لەنێوان نێرو مێ‌دا.

وە کەلالە لە ئایەتەکەدا کەسێکە کە نە باوکی هەبێت و نە کوڕ، ژن بێت یا پیاو.

وە لە ئایەتەکەدا دەرئەکەوێت کە ئەو خوشك و برا دایکی‌یانە سێ حاڵەتیان هەیە:

١- شەش یەك بۆ هەریەکێکە نێر بێت یا مێ.

٢- سێ‌یەك بە یەکسانی لە نێوان نێر و مێ‌یەکاندا بەش ئەکرێت دوان بن یا زیاتر.

٣- ئەمانە لەگەڵ لقی میرات گردا هیچ نابەن وەك کوڕ و کوڕی کوڕ، وە هەروەها بەشیان نی‌یە لەگەڵ ئەصڵی میرات گری نێردا وەك باوك و باپیرە، کەواتە بە بوونی دایك یا داپیرە بێ بەش نابن.

## حاڵەتەکانی مێرد:

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَٰجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ ۚ﴾ (النساء/١٢). واتە: نیوەی ئەو میراتی‌یەی ژنەکانتان پاش مردنیان بەجێی دەهێڵن بۆ ئێوەیە ئەگەر منداڵیان نەبوو نێر بێ یا مێ، بەڵام ئەگەر منداڵیان هەبوو چوار یەکی ئەوەتان بەر ئەکەوێت کە بەجێی دێڵن لەدوای جێبەجێ کردنی وەسیەتی دروست یا قەرز.

ئەم ئایەتە باسی ئەوە ئەکات کە مێرد دوو حاڵەتی هەیە:

**حاڵەتی یەکەم:**

نیوەی میراتەکە ئەبات لە کاتێکدا لقی میرات گر نەبوو کە کوڕە هەرچەندە بەرەو خوار بێت، وە کچ و کچی کوڕ هەرچەندە باوکی بەرەوخوار بێت، جا کوڕەکە لە خودی خۆی بێت یا لە کوڕێکی تری بێت.

**حاڵەتی دووەم:**

چوار یەك ئەبات ئەگەر لقی میرات گر هەبوو[1] (وەك کوڕو کچ).

**حاڵەتەکانی ژن:**

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم﴾ (النساء/١٢). واتە: ژنەکانتان چواریەکی ئەو میراتەی بەجێی دێڵن ئەیبەن ئەگەر کوڕو کچتان نەبوو لەوان یا لە غەیری ئەوان، بەڵام ئەگەر منداڵتان هەبوو کوڕ یا کچ ئەوە هەشت یەکی ئەوەی بە جێی دێڵن ئەیبەن.

ئەم ئایەتە ڕونی کردۆتەوە کە ژن دوو حاڵەتی هەیە:

**حاڵەتی یەکەم:**

شایستەی چوار یەکە لەکاتێکدا لقی میرات گر نەبوو، لەو مێردە بێ یا لە مێردی پێشوو فەرق ناکا.

**حاڵەتی دووەم:**

شایستەی هەشت یەکە لە کاتی بوونی لقی میرات گردا، وە ئەگەر ژنەکانیش زۆر بوون چوار یەکەکە یا هەشت یەکەکە لە نێوان خۆیاندا بە یەکسانی بەش ئەکەن.

**ژنی تەڵاق دراو:**

ژنی تەڵاق دراو بە تەڵاقی ڕەجعی میراتی مێردەکەی ئەگرێت ئەگەر مرد پێش کۆتایی هاتنی عیددەکەی؛ وە حەنبەلی‌یەکان ڕایان وایە کە ژنی تەڵاق دراو میرات ئەگرێت پێش چوونە لاو خەڵوەت پێ‌کردنی ئەگەر مێردەکەی لەکاتی نەخۆشی مردنەکەیدا تەڵاقی دابێت مادام ئەو ژنە

---

(١) بەڵام لقی میرات نەگر وەك کچی کچ ئەوە نە بەشی مێرد کەم ئەکاتەوەو نە بەشی ژن.

عیددەکەی کۆتایی نەهاتبێ و شوی نەکردبێتەوە، هەروەها دوای خەڵوەت پێ کردنیشی بە مەرجێك شوی نەکردبێتەوەو لە عیددەدا مابێت.

**حاڵەتەکانی کچی پشتی:**

خوای گەورە ئەفەرمووێت: ﴿يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ فَإِن كُنَّ نِسَآءٗ فَوۡقَ ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَۖ وَإِن كَانَتۡ وَٰحِدَةٗ فَلَهَا ٱلنِّصۡفُۚ﴾ (النساء/١١). واتە: خوا فەرمانتان پێ ئەکات دەربارەی منداڵەکانتان لە میراتدا: ئەگەر یەکێ لە ئێوە مردو ئەولادی نێرو مێی بەجێ هێشت، ئەوە میراتەکەی هەموی بۆ ئەوان ئەبێت: بۆ نێرینە ئەوەندەی بەشی دوو مێینەی بەرئەکەوێت ئەگەر واریسی تر نەبو بێجگە لە خۆیان، بەڵام ئەگەر هەر کچی بەجێ هێشت ئەوە بۆ دو کچ و زیاتر لە دووان دوو سێیەکی ئەوەیان بەرئەکەوێت کە بەجێ ماوە، وە ئەگەر تەنها کچێك بو، ئەوە نیوەی بەجێ ماوەکەی بەرئەکەوێت.

ئایەتەکە ئەوە ئەگەیەنێ کە کچی پشتی سێ حاڵەتی هەیە:

**حاڵەتی یەکەم:**

نیوەی بەرئەکەوێت ئەگەر تاقە کچ بێت.

**حاڵەتی دووەم:**

دوو سێیەکی میراتەکە بۆ دوو کچ و زیاتر ئەبێت، ئەگەر کوڕێك یا زیاتریان لەگەڵدا نەبوو.

ئیبنوقودامە فەرمویەتی: زانایان هەموو کۆن لەسەر ئەوەی کە بەشی دوو کچ دوو سێیەکە جگە لە ڕیوایەتێکی (شاذ) لە ئیبنوعەبباسەوە.

ئیبنوروشد فەرمویەتی: ووتراوە: ئەوەی لە ئیبنوعەبباسەوە بە ناوبانگە وەك ئەوەیە کە جەماوەر ووتویانە.

**حاڵەتی سێیەم:**

ئەوەیە کە میرات ئەگرێت بە بونی بە (عصبة) ئەگەر کوڕێك یا زیاتری لەگەڵدا بێت، ئەو کاتە میراتەکە بە (عصبة)یی ئەگرن، وە بەشی نێر ئەوەندەی بەشی دوو مێیە. وە هەروەها بەو شێوەیە ئەبێ کاتێ کچەکان زۆر بن یا کوڕەکان زۆر بن.

**حاڵەتەکانی خوشکی باوك و دایکی:**

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي ٱلْكَلَٰلَةِ ۚ إِنِ ٱمْرُؤٌا۟ هَلَكَ لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَهُۥٓ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ ۚ وَإِن كَانُوٓا۟ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾ (النساء/١٧٦). واتە: داوات لێ ئەکەن ـ ئەی موحەممەد ﷺ ـ فەتوایان بۆ بدەی دەربارەی حوکمی میراتی (کلالة) کە ئەویش کەسێکە بمرێت نە باوکی هەبێت و نە منداڵ، پێیان بڵێ: خوا حوکمی کەلالەتان بۆ ڕون ئەکاتەوە: ئەگەر پیاوێك مرد نە منداڵی هەبو نە باوك وە خوشکێکی باوك و دایکی یا هەر خوشکێکی باوکی هەبو، ئەوە نیوەی میراتەکەی ئەبات، وە ئەگەر خوشکەکە بمرێ و منداڵ و باوکی نەبێ و برای باوك و دایکی یا برای باوکی هەبێت ئەوە هەمو ماڵەکەی بە میرات ئەبات.

بەڵام ئەگەر پیاوە (کلالة)ەکە دو خوشکی هەبو ئەوە دو سێ‌یەکی میراتەکە ئەبەن. وەئەگەر خوشك و برا باوکی و دایکی‌یەکان یا هەر باوکی‌یەکان زۆر بون ئەوە بۆ نێر ئەوەندەی بەشی دو مێ‌ینە هەیە لە خوشکەکانی.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إجعلُوا الأخَوَاتِ مَعَ البَنَاتِ عَصَبَةً). واتە: خوشکەکان لەگەڵ کچەکان بکەن بە عەصەبە ـ میراتگری پشتی ـ .

**خوشکی دایك و باوکی پێنج حاڵەتی بۆ هەیە:**

١- نیوەی میراتی ئەکەوێ ئەگەر بە تەنها بوو نە کوڕی مردووەکەی لەگەڵدا بوو نە کوڕی کوڕی نە باوکی نە باپیرە نە برای دایك و باوکی.

٢- دوو سێ یەك بۆ دوو خوشك و زیاتر لە دو خوشك لەکاتی نەبونی ئەوانەدا کە باس کران.

٣- ئەگەر خوشکەکان برایەکی دایك وباوکیان لەگەڵدا هەبوو بەڵام ئەوانەی لە پێشەوە باس کرا لەگەڵیانا نەبوو، ئەوە ئەو برایە خوشکەکان ئەکات بە (عصبة)و هەرنێرێك ئەوەندەی دوو مێی بەرئەکەوێت.

٤- خوشکەکان ئەبن بە (عصبة) لەگەڵ چەند کچێکدا یان چەند کچێکی کوڕدا، ئەوکاتە پاش ماوەی میرات ئەگرن لەدوای بەشی کچەکان یا کچانی کوڕدا.

٥- بێ بەش ئەبن ئەگەر لقی نێری میراتگر هەبوو وەك كوڕ وكوڕی كوڕ، هەروەها بە ئەصلی میراتگری نێریش وەك باوك بە ڕای هەموو زانایان، وە بە باپیرەش بە ڕای ئەبوحەنیفە بەپێچەوانەی ئەبویوسف و موحەممەد كە لەپێشەوە خیلافەكەمان ڕوون كردەوە لەو بارەیەوە.

**حاڵەتەكانی خوشكە باوكی‌یەكان:**

**خوشكی باوكی شەش حاڵەتی بۆ هەیە:**

١- نیوەی میراتی ئەگرێت ئەگەر تاك و تەنها بوو، نە خوشكی وەكو خۆی هەبو و نە برای باوكی هەبوو نە خوشكی باوك ودایكی.

٢- دوو سێ‌یەكی میراتی‌یەكە بۆ دوو خوشكی باوكی و بەرەوژوور.

٣- شەش یەكی میراتی‌یەكەی بەرئەكەوێت لەگەڵ تەنها خوشكێكی باوكی و دایكیدا بۆ تەواو كردنی دوو سێ‌یەكەكە.

٤- بە بونیان بە (عصبة) میرات ئەگرن بە هۆی كەسێكی ترەوە ئەگەر یەك خوشك بوو یا زیاتر بو، وە لەگەڵیاندا برای باوكی هەبو، ئەوكاتە هەر نێرینەیەك دوو ئەوەندەی مێینەیەك ئەبات.

٥- میرات ئەگرن بە بونیان بە (عصبە) لەگەڵ غەیری خۆیاندا ئەگەر لەگەڵ ئەو خوشكە باوكی‌یە یا زیاترەكە كچ یا كچی كوڕی مردووەكە هەبێت، ئەوكاتە لەدوای بەش دانانی ئەو كچە یا كچی كوڕەكە ئەوەی مایەوە بە (عصبة)یی ئەیگرن.

٦- بەش بڕاو ئەبن بەمانەی خوارەوە:

١- بە ئەصل و فەرعی میراتگری نێرینە [1].

٢- بە برای باوك و دایكی.

٣- بە خوشكی باوك و دایكی ئەگەر بوو بە عەصەبە لەگەڵ كچدا یا كچی كوڕدا، چونكە لەم شێوەیەدا جێی برای باوك و دایكی ئەگرێتەوە، لەبەرئەوە پێش برای باوكی وخوشكی باوكی ئەخرێت كاتێ ئەبێ بە عەصەبە بەهۆی كەسێكی ترەوە.

٤- بە دوو خوشكی باوك و دایكی: مەگەر لە پلەی خوشكە باوكی‌یەكاندا برای باوكی هەبێ، ئەوكاتە ئەو برایە خوشكە باوكی‌یەكان ئەكات بە عەصەبەو دوای بەش دانانی دو خوشكە باوك و دایكی‌یەكە باقی میراتەكە ئەگرن، بۆ هەر نێرینەیەك دو بەشی مێینەی بۆ دائەنرێ.

---

(١) ئەصل وەكو باوك، فەرع وەكو كوڕ بەرەوخوار.

جا ئەگەر مردووەکە دوو خوشکی باوك و دایکی و چەند خوشکی باوکی و برایەکی باوکی بەجێ هێشت ئەوە بۆ دوو خوشکە باوك و دایکی‌یەکە لە سێ بەش دو بەش دائەنرێت و ئەوەی مایەوە دابەش ئەکرێت بەسەر خوشکە باوکی‌یەکان و برا باوکی‌یەکەدا بەشی هەر نێرینەیەك دوو ئەوەندەی مێینەیەك.

**حاڵەتەکانی کچی کوڕ:**

کچانی کوڕیش پێنج حاڵەتیان هەیە:

١- نیوەی میرات بۆ کچی کوڕی تەنها دائەنرێت لەکاتی نەبونی منداڵی مردووەکە.

٢- دوو سێ یەك بۆ دووان وبەرەو ژوور دائەنرێت لەکاتی نەبوونی منداڵی مردوەکە.

٣- شەش یەك بۆ تاکەکچی کوڕو زیاتر لە تاکە کچ، لەگەڵ یەك کچی مردوەکە بۆ ئەوەی دوو سێ‌یەکی پێ تەواو بکرێت، مەگەر کوڕێك لە پلەی کچەکانی کوڕدا هەبێت ئەوکاتە ئەیانکاتە عەصەبە و ئەوەی ئەمێنێتەوە دوای بەشی کچی مردوەکە بۆ هەرنێرینەیەك دوو ئەوەندەی مێینەیەك دائەنرێت.

٤- میرات نابەن ـ چونکە باوکی‌یەکان ـ لەگەڵ بوونی کوڕدا (کوڕی مردووەکە).

٥- میرات نابەن لەگەڵ بوونی دوو کچی پشت و زیاتر لە دو کچ مەگەر کوڕی کوڕیان[1] لەگەڵدا بێت لە پلەی خۆیاندا بێت یا لە خوار ئەوانەوە بێ لە پلەدا ئەوکاتە ئەیانکاتە عەصەبە.

**حاڵەتەکانی دایك**

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُ وَلَدٌ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ الثُّلُثُ فَإِن كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ السُّدُسُ﴾ (النساء/١١). واتە: وە بەشی دایك وباوکی بۆ هەر یەکەیان شەش یەکی ئەومیراتە هەیە کە بەجێی هێشتووە، ئەگەر منداڵی هەبوو نێر یا مێ، جا ئەگەر

(١) کوڕی کوڕ هەرکەس لە پلەی خۆیدا بێت ئەیکات بە عەصەبە، خوشك بێ یا کچی مامی بێ یەکسانە ، هەروەها ئەوەی پشت خۆشی‌یەوە ئەکا بە عەصەبە مەگەر خاوەن بەش بێت. وە بەشی ئەوکەسەی کە لە خوار خۆیەوە بێت ئەبرێت.

منداڵی نەبوو دایك وباوکی بوونە میراتگری، ئەوە بەشی دایك سێیەکی ماڵەکەیە وە ئەگەر مردووەکە خوشك و برای هەبوو دوان یا زیاتر، ئەوە بەشی دایکی شەش یەك ئەبێت.

بۆ دایك سێ حاڵەت هەیە:

١- شەش یەك وەرئەگرێت ئەگەر منداڵی مردووەکەی لەگەڵدا بوو یا منداڵی کوڕەکەی لەگەڵدا بوو یا دوو برای لەگەڵدا بوو یا چەند خوشك بە گشتی، ئیتر ئەم خوشکانە لە باوك و دایکەوە بوون یا تەنها لە باوکەوە بوون یا تەنها لە دایکەوە بوون جیاوازی نییە.

٢- سێیەکی هەموو ماڵەکە ئەبات ئەگەر هیچ یەك لەوانەی باس کران لەگەڵیا نەبوون.

٣- سێیەکی پاشماوەی میراتەکە ئەبات لە کاتی نەبوونی ئەوانەی باس کران دوای بەشی یەکێ لە ژن ومێردەکە، ئەویش لە دوو مەسئەلەدا کە ناوئەبرێن بە غەرائییە.

یەکەم: لە شێوەیەکدا ئەگەر مردووەکە ژن یا مێرد و باوك و دایکی بەجێ هێشتبو، ئەوە دایك سێیەکی ماڵەکە ئەگرێ.

دووەم: هەروەها ئەگەر ژن و دایك و باوکی بەجێ هێشتبوو.

**حاڵەتەکانی داپیرە**

لە قەبیصەی کوڕی ذوئەیبەوە هاتوە کە فەرمویەتی: داپیرەیەك (دایکی دایك) هاتە لای ئەبو بەکر وداوای میراتی ئەکرد، ئەویش فەرموی: لە کتێبەکەی خوادا تۆ بەشت بۆ دانەنراوە، وە لە سوننەتی پێغەمبەریشدا ﷺ هیچ نازانم کە بۆت دانرابێت، بڕۆرەوە هەتا لەو بارەیەوە پرسیارت بۆ ئەکەم ئینجا لە خەڵکی پرسی.

موغیرەی کوڕی شوعبە ووتی: لای پێغەمبەر ﷺ ئامادە بووم کە شەش یەکی داوە بە نەنك. ئەبوبەکر فەرموی: کەسی تر هەیە لەگەڵتا؟ موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی ئەنصاری هەڵسا، ئەویش موغیرە چی ووتبو هەرئەوەی ووت. ئەبوبەکریش شەش یەکی بۆ دانا. ئەڵێت: پاشان نەنکێکی تر (دایکی باوك) هاتە لای عومەر و داوای میراتی ئەکرد. ئەویش پێی فەرموو: لە کتێبەکەی خوادا هیچت بۆ دانەنراوە. بەڵام ئەوە شەش یەك ئەگەر پێکەوە بوون بۆ هەردوکتان، وە هەر کامێکتان بە تەنیا مایەوە بۆ ئەوە. خاوەنی هەر پێنج سوننەکان گێڕاویانەتەوە جگە لە نسائی. وە (ترمذي) بە صەحیحی داناوە[1].

---

(١) أحمد (٥/٢٧)، أبوداود (٢٨٩٤)، ترمذي (٢١٠٠)، ابن ماجه (٢٧٢٤).

بۆ نەنکی صەحیح سێ حاڵەت هەیە [1]:

١- شەش یەکیان بۆ هەیە بە تەنها بێت یا چەند نەنکێك بن بەمەرجێ یەکسان بن لە پلەدا وەك دایکی دایك ودایکی باوك.

٢- نەنکە نزیکەکان لە هەر لایەکەوە بن بەر لە نەنکی دور ئەگرن وەك دایکی دایك بەر لە دایکی دایکی دایك ئەگرێت وهەروەها بەر لە دایکی باوکی باوك ئەگرێت.

٣- نەنك لە هەرلایەکەوە بێت بە دایك بەش براو ئەبن، هەروەها هەر نەنکێك لەلایەنی باوکەوە بێت بە باوك بەش براو ئەبێت بەڵام ئەوەی لەلای دایکەوە بێت پێی بەش براو نابێت، وە باپیر بەر لە دایکی خۆی ئەگرێت چونکە لە دوای ئەو هاتووە.

٣،٢- عەصەبە، میراتگرانی پشتی:

پێناسەکەی:

عەصەبە پیاوو خزمە باوکی‌یەکانی‌یەتی، وە بۆیە پێیان ئەووترێ: عەصەبە چونکە یەکتر توند ئەبەستن بەیەکەوە.

چونکە کوڕ پەلێکە وباوك پەلێکی تر وبرا لایەکە ومام لایەکی ترە، وە مەبەست لێیان لێرەدا ئەوانەن کە هەرچی مایەوە لە میراتەکە دابەش ئەکرێت بە سەریاندا دوای ئەوەی خاوەن بەشەکان بەشی دیاری کراوەکانی خۆیان وەرگرت. جا ئەگەر هیچیان بۆ نەمایەوە ئەوکاتە هیچیان بەرناکەوێت مەگەر عەصەبەکە کوڕ بێت ئەوکاتە بە هیچ شێوەیەك بێ‌بەش نابێت.

هەروەها عەصەبە ئەوانەن کە مافی هەموو میراتەکەیان هەیە ئەگەر لە خاوەن بەشەکان کەس نەبوو. بەپێی ئەو حەدیسەی کە بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە لە ئیبنوعەبباسەوە کە پێغەمبەر

---

(١) نەنکی صەحیح ئەوەیە کە لە گەیشتنی بە مردووەکە باپیرەیەکی فاسید لە نێوانیاندا نەبێت، باپیرەی فاسیدیش ئەوەیە کە لە نێوان ئەو مردووەکەدا مێ‌ینەیەك هەبێت وەك باوکی دایك، چونکە باوکی دایك لە (ذوي الأرحام)ە، نەك لە خاوەن بەشەکان. بشزانە کە زۆری لە نەنکە صەحیحەکاندا تەنها لەلایەنی باوکەوە ئەبێت، وەك: دایکی دایکی باوك، وە دایکی دایکی باوکی باوك، وە دایکی باوکی باوکی باوك، بەڵام ئەو نەنکانەی کە لە لایەنی دایکەوەن صەحیح نابن، چونکە هەر کە باوکێك کەوتە نێوانیان فاسید ئەبن.

ﷺ فەرمویەتی: (أَلحِقُوا الفَرَائِضَ بِأَهلِهَا فَمَا بَقِيَ فِلأَولى رَجُلٍ ذَكَرٍ)[1]. واتە: بەشە دانراوەکان بدەن بە خاوەنەکانیان، هەرچیش مایەوە بۆ نزیکترین میراتگری عەصەبەیە[2].

لە ئەبوهورەیرەوە ﷺ هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (مَا مِن مُؤمِنٍ إلا أنا أولى بِهِ فِي الدُّنيَا وَالآخِرَةِ. إقرَؤوا إن شِئتُم النَّبِيُّ أولى بِالمُؤمِنِينَ مِن أنفُسِهِم. فَأَيُّما مُؤمِن مَاتَ وَتَرَكَ مَالاً فَلِيَرِثهُ عَصَبَتُهُ مَن كَانُوا وَمَن تَركَ دَيناً أو ضَيَاعاً فَلِيَأتِنِي فَأَنَا مَولاهُ)[3]. واتە: هەمو موسڵمانێك من لە خۆی لەپێشترم بۆی لە دونیا و ڕۆژی دواییدا، ئەگەر حەز ئەکەن لە قورئاندا بخوێننەوە کە ئەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ بۆ موسڵمانان لە پێش ترە لە خۆیان، جا هەر موسڵمانێك مرد ومالّی بەجێ هێشت بۆ میرات گرەکانیەتی هەرکەس بن، وە هەرکەس قەرزێك یا خێزانێکی هەژاری بەجێ هێشت من سەرپەرشتی کەریان ئەبم.

عەصەبە ئەبێ بە دوو بەشەوە:

١- عەصەبەی نەسەبی.

٢- عەصەبەی سەبەبی[4].

عەصەبەی نەسەبی سێ جۆرن:

١- عەصەبەی سەربەخۆ.

٢- عەصەبە بە هۆی کەسێکی ترەوە.

٣- عەصەبە لەگەڵ کەسێکی تردا ئەبێت.

عەصەبەی سەربەخۆ: هەمو ئەو نێرینانەن کە نژادیان بگاتە مردوەکەو هیچ مێینەیەك لەنێوان ئەوان و مردوەکەدا نەبێت کە ئەم چوار جۆرە ئەگرێتەوە:

١- کوڕایەتی کە بە بەشێك لە مردووەکە ناوئەبرێت.

٢- باوکایەتی کە بە ئەصڵی مردووەکە ناو ئەبرێت.

---

(١) البخاري (٦٧٣٢)، مسلم (١٦١٥/٢).

(٢) ئیبنو عەبباس ڕای وایە ئەگەر مردو کچێك و خوشکێك و برایەکی بەجێ هێشت کچەکە نیوەی میراتەکەی ئەبات و پاشماوەش بۆ براکە ئەبێت و خوشکەکە هیچ ناگرێ.

(٣) البخاري (٤٧٨١)، مسلم (١٦١٩/١٥).

(٤) مەبەست لە عەصەبەی سەبەبی ئازادکەری کۆیلەیە ئەگەر مردوەکە کاتی خۆی کۆیلە بوبێ و کەسێك ئازادی کردبێ ـ ئیتر ئازادکەرەکە پیاو بێت یا ئافرەت یەکسانە ـ.

٣- برایەتی کە بە بەشێکی باوکی مردووەکە ناو ئەبرێت.

٤- مامی‌ڕەتی کە بە بەشێکی باپیرە ناو ئەبرێت.

عەصەبە بە هۆی کەسێکی ترەوە: ئەو مێ‌ینەیە کە بەشەکەی نیوەی میراتەکەیە ئەگەر کەسی لەگەڵدا نەبێ و بە تەنها بێ، وە دوو سێ‌یەکی‌یەتی خوشکێکی خۆی لەگەڵدا بێت یا زیاتر، جا ئەگەر برایەکی لەگەڵدا بوو یا لەگەڵیاندا بوو ئەوکاتە بە هۆی ئەو برایەوە ئەبنە عەصەبە ئەمانیش چوارن:

١- کچ یا کچەکان.

٢- کچ یا کچانی کوڕ.

٣- خوشکێك یا چەند خوشکی دایك و باوکی.

٤-خوشکێك یا چەند خوشکی باوکی.

چونکە هەریەکێك لەمانە بە هۆی کەسێکی ترەوە ئەبێت بە عەصەبە کە ئەویش برایە، و میراتیش لەنێوانیاندا نێرینە ئەوەندەی دوو بەشی مێیینە ئەبات.

**عەصەبە لەگەڵ کەسێکی تردا[1]:**

هەموو مێ‌ینەیەکە کە بۆ ئەوەی ببێتە عەصەبە پێویستی بە مێ‌ینەیەکی تر هەیە.

ئەمەش تەنها بۆ دوو کەس ئەبێت لە مێ‌ینەکان کە ئەمانەن:

١- خوشکێکی دایك و باوکی یا چەند خوشکی دایك و باوکی لەگەڵ کچدا یا کچی کوڕدا.

٢- خوشکێکی باوکی یا چەند خوشکی باوکی لەگەڵ کچ دا یا لەگەڵ کچی کوڕدا، وە هەرچی لە میراتەکە مایەوە دوای بەشە دیارکراوەکان بۆ ئەوانە.

**چۆنیەتی میرات گرتنی عەصەبە بەهۆی خۆیەوە:**

لەپێشەوە باسی چۆنیەتی میرات گرتنی عەصەبە بە هۆی کەسێکی ترەوەو عەصەبە لەگەڵ کەسێکی تردا کرا.

---

(١) هەر ژنێك لە کاتی نەبونی برای عەصەبەی خۆی بەشی نەبێ، ئەوە بە بونی براکەش نابێ بە عەصەبە بۆ نمونە کەسێك بمرێ و مامێك یا پورێکی لەپاش بەجێ بهێڵێ ئەوە سامانەکەی هەمو بۆ مامەکەیە نەك پورەکە، وە ئەو پورە بە برای خۆی نابێ بە عەصەبە ، چونکە لە کاتی نەبونی براکەیدا حۆی بەشی نی‌یە. وەهەروەکو کوڕی برا لەگەڵ کچی خوشکدا وایە.

بەڵام چۆنیەتی میرات گرتنی عەصەبە بەهۆی خۆی وا لە خوارەوە باسی ئەكەین:

عەصەبە بەهۆی خۆیەوە چوار جۆرن وە بەم شێوەیە میرات ئەگرن:

١- كوڕایەتی كە كوڕان و كوڕانی كوڕ ئەگرێتەوە هەرچەندە بەرەو خواریش بن.

٢- جا ئەگەر لایەنی كوڕایەتی نەبو، ئەو كاتە میراتەكە یا ئەوەی ئەمێنێتەوە ئەگوێزرێتەوە بۆ لایەنی باوكایەتی كە باوك و باپیرەی صەحیح ئەگرێتەوە هەرچەندە بەرەو ژوریش بێت.

٣- ئەگەر كەسیش لە لایەنی باوكایەتی‌یەوە نەما بوو بە زیندویی، ئەو كاتە میراتەكە یا ئەوەی ئەمێنێتەوە لە میرات ئەبێتە مافی براكان كە برای دایك و باوكی و برای باوكی و كوڕەكانی و برای دایكی و باوكی و كوڕەكانی برای باوكی هەرچەندە بەرەوخوار بن ئەگرێتەوە.

٤- ئەگەر كەسێك لەم لایەنەشەوە بە زیندویی نەمابو، ئەوكاتە یا ئەوەی ماوەتەوە لە میراتەكەی ئەگوێزرێتەوە بۆ لایەنی مامی‌یەتی جا مامەكانی مردووەكە خۆی بێت یا مامەكانی باوكی یا باپیرەی، جیاوازی نی‌یە، بەڵام مامەكانی مردووەكە خۆی پێش مامەكانی باوكی ئەخرێت، وە مامەكانی باوكی پێش مامەكانی باپیرەی ئەخرێت، ئیتر بەو پێ‌یە.

ئەگەر كۆمەڵێك كەس هەبون لە یەك پلەدا بون، ئەوە شایستەترینیان بە میراتەكە نزیك ترینیانە لە مردووەكەوە.

وە ئەگەر كۆمەڵێك كەس هەبون یەكسان بوون بۆ مردووەكە لە ڕووی لایەن و پلەوە، ئەوە بەهێزترینیان لە ڕوی خزمایەتی‌یەوە لەپێشترە بە میراتەكە.

بەڵام ئەگەر مردوەكە كۆمەڵێكی بەجێ هێشت كە یەكسان بون بۆی لە ڕوی لایەن و پلەو هێزەوە ئەوە وەك یەك یەك شایستەی میراتەكە ئەبن و بەپێی ژمارەیان دابەش ئەكرێ لە نێوانیاندا.

ئەوەش واتای ئەو قسەیەی زانایانە كە ووتویانە: پێش خستن لە ڕیزی عەصەبەی سەربەخۆ بە لایەن ئەبێت، جا ئەگەر لە لایەندا وەك یەك بوون بە پلە ئەبێت، ئەگەر لە پلەشدا هەر یەكسان بوون بەهێزی خزمایەتی، بەڵام ئەگەر یەكسان بون لە پلە و لایەن و هێزدا ئەوە وەك یەك مافی میراتەكەیان هەیەو بەجێ ماوەكە بە سەریانا دابەش ئەكرێت بەپێی ژمارەیان.

عەصەبە بە هۆوە:

عەصەبە بون بە هۆوە ئازادكەری كۆیلەیە، نێر بێ یا مێ، كە ئەبێتە میراتگری پشتی بۆ كۆیلە ئازادكراوە مردوەكە لە كاتی نەبونی میراتگری پشتی لە نژادی مردوەكە. جا ئەگەر ئازادكەرەكە نەمابو، میراتەكە بۆ عەصەبە نێرینەكانی ئازادكەر ئەبێت.

## بەرگرتن و بێبەش کردن (الحجب و الحرمان)

(حجب) بەرگرتن: ئەوەیە کە کەسێکی دیاری کراو هەمو میراتەکەی یا بەشێکی لێ قەدەغە ئەبێت لەبەر بوونی کەسێکی تر.

(حرمان) بێبەش کردنیش: ئەوەیە کە کەسێکی دیاری کراو میراتەکەی لێ قەدەغە ئەکرێت بەهۆی بەربەستێك لە بەربەستەکانی میرات گرتن کە ڕوو ئەدات وەك کوشتن و وێنەی ئەو لە بەربەستەکان.

### بەشەکانی بەرگرتن:

بەرگرتن دوو بەشە:

١- بەرگرتنی ناتەواو.

٢- بەرگرتنی بەش بڕ.

بەرگرتنی ناتەواو ئەوەیە کە میراتەکەی‌یەکێ لە میرات گرەکان کەم ئەکات لەبەر بوونی کەسێکی تر، ئەمەش بۆ پێنج کەس ئەبێت:

١- مێرد لە نیوەی میراتەوە دێتە خوارەوە ئەبێ بە چارەك لە کاتی بوونی منداڵی مردووەکە(کە ژنەکەیەتی).

٢- ژن لە چارەکی میراتەکەوە ئەبێ بە هەشت یەك لە کاتی بوونی منداڵی مردووەکە (کە مێردەکەیەتی).

٣- دایك لە سێ‌یەکەوە دێتە خوارەوەو ئەبێ بە شەش یەك لە کاتی بوونی پەلی میرات گر(وەك کوڕ و کچ و نەوە).

٤- کچی کوڕ.

٥- خوشکی باوکی.

بەڵام بەرگرتنی بەش بڕ: مەنع کردن و بەربەست کردنی هەمو میراتەکەیە لە کەسێك لەبەر بوونی کەسێکی تر. وەك مەنع کردنی میرات لە برا بە هۆی بوونی کوڕەوە.

ئەم جۆرە ناچێتە ناو میراتی شەش کەس لە میرات گرەکان، هەرچەندە دروستە بەشەکەیان کەم بکرێتەوە بە بەر لێ گرتنی ناتەواو ئەوانیش ئەمانەن:

١ ، ٢- باوك و دایك.

٣، ٤- کوڕ و کچ.

**٥ ، ٦-ژن و مێرد.**

**بێجگە لە مانە بەر لێگرتنی بەش بڕ (حجب حرمان) هەموو میرات گرەکانی تر ئەگرێتەوە.**

**وە بەرگرتنی بەش بڕ لەسەر دوو بنەما دانراوە:**

**١- هەرکەسێك گەیشت بە مردووەکە بەهۆی کەسێکەوە بێت ئەوە کاتێك ئەوکەسە بۆ خۆی هەبوو ئەو میرات ناگرێت. وەك کوڕی کوڕ کە میرات ناگرێت لەگەڵ بوونی کوڕدا (واتە کوڕی مردووەکە).**

**جگە لە منداڵانی دایك کە میرات ئەبەن لەگەڵ دایکیان هەر چەندە بە هۆی دایکیانەوە سەر بە مردووەکە ئەبن.**

**٢- نزیك پێش دور ئەخرێت، بۆ نمونە کوڕ کوڕی کوڕ بێ بەش ئەکات ، چ کوڕی خۆی بێ چ برازای بێ. جا ئەگەر لە پلەدا یەکسان بوون بە هێزی خزمایەتی پێش ئەخرێت وەك برای دایکی و باوکی بەر لە برای باوکی ئەگرێت.**

**جیاوازی نێوان (محروم و محجوب) بەرلێ گیراوو بەش براو:**

**جیاوازی نێوان بەر لێ گیراوو بەش بڕاو لە دو شتدا دەر دەکەوێت:**

**١- بەش بڕاو هەر لە بنەمادا شایستەی میرات نیە: وەك (قاتل)، بە پێچەوانەی بەر لێ گیراوەوە کە شایستەیە بۆ میرات گرتن، بەڵام بە هۆی بوونی کەسێکی ترەوە کە لەو لەپێشترە بۆ میراتەکە بەری لێ ئەگیرێت.**

**٢- (محروم) بەش بڕاو لە میرات کار ناکاتە سەر میرات گرەکانی تر و لە بنەمادا بەر لە کەسی تر ناگرێت، بەڵکو وەك نەبوو دائەنرێ، جا ئەگەر کەسێك مرد کوڕێکی کافر و برایەکی موسوڵمانی بەجا هێشت میراتەکەی هەموو بۆ برا موسوڵمانەکەی ئەبێت و هیچ بۆ کوڕەکەی نی‌یە.**

**بەڵام بەرلێگیراو (محجوب) جاری وا هەیە کار ئەکاتە سەر کەسانی تر و بەریان لێ ئەگرێت، چ بە بێ بەش کردن بێت یا بە کەم کردنەوەی بەشەکەیان بێت.**

**بۆ نمونە دوو برا یا زیاتر لە دوو برا لەگەڵ بوونی دایك و باوکدا بە هۆی بوونی باوکەکەوە میرات ناگرن بەڵام بەر لە دایك ئەگرن و بەشەکەی کەم ئەکەنەوە لە سێیەکەوە بۆ شەش یەك.**

## عەول

عەول لە لۆغەتا بە مانای بەرز كردنەوەیە، وە بە مانای لادان بەلای ستەمیشەوە دێت، وە لای زانایان زیادەیەكە لە بەشی خاوەن بەشەكان و كەم لێ كردنەوەیانە لە میراتدا.

ئەگێڕنەوە كە یەكەم عەول كە كراوە خراوەتە بەردەم عومەر ﷺ ئەویش حوكمی بە عەول دا دەربارەی بەشی مێردێك و دوو خوشك، بەو صەحابیانەی لەگەڵیا بوون فەرمووی: ئەگەر لە مێردەكەوە یا لە دوو خوشكەكەوە دەست پێ بكەم بەشی ئەوی تریان نامێنێتەوە، ئێوە ڕاوێژێكم بۆ بكەن، عەبباسی كوڕی (عبد المطلب) ڕاوێژی بۆ كرد كە بە عەول كار بكات، وە ئەڵێن: عەلی ﷺ بووە، وە ووتراوە: زەیدی كوڕی ثابیت بوە.

**لە كێشەكانی عەول:**

١- ئافرەتێك مرد و مێردەكەی و دوو خوشكی دایكی و باوكی و دوو خوشكی دایكی و دایكی بەجێ هێشت ئەم كێشەیە بە شورەیحیەیە ناو ئەبرا، چونكە مێردەكە ناوی شورەیحی قازی زڕاند، چونكە لە جیاتی نیوەی میراتەكە سێ دە یەكی دابویە، بە ناو خێڵەكاندا ئەگەڕاو ئەی ووت: شورەیح نە نیوەكەی داومێ نە سێیەك، كاتێ شورەیح بەوەی زانی بانگی كرد و تەمێی كرد و پێی ووت: خراپت ووتووە عەولەكەت شاردۆتەوە.

٢- پیاوێك مرد و ژنێك و دوو كچ و باوك و دایكی بە جێ هێشت، ئەم مەسەلەیەش پێی ئەوترێت مینبەرییە چونكە ئەمیری موسوڵمانان عەلی ﷺ لەسەر دوانگەكەی كوفە ووتاری ئەداو ئەیفەرموو: سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە هەر بە حەق حوكم ئەدات. وە هەركەس چی بكات بەوە پاداشتی ئەداتەوەو گەڕانەوەش هەر لای ئەوە، لەو كاتەدا پرسیاری لێ كرا لەبارەی ئەو مەسەلەیەو ئەویش هەر لەسەر كێشی ووتارەكەی وەڵامی دایەوە، ـ ژنەكە هەشت یەكەكەی ئەبێت بە نۆ یەك ـ لە پاشاندا لەسەر ووتارەكەی ڕۆیشت.

وە ئەو كێشانەی كە عەولی تێ ئەكەوێت ئەوانەن كە بنچینەكانیان (٦-١٢-٢٤) بێت.

شەش عەول ئەكرێت بۆ حەوت و هەشت و نۆ و دە.

دوانزە عەول ئەكرێت بۆ سیانزە و پانزە و حەڤدە.

بیست و چوار عەول ئەكرێت بۆ بیست و حەوت نەبێت عەول ناكات.

وە ئەو كێشانەی عەولیان تێ ناكەوێت كێشانەن كە بنچینەكانیان (٢-٣-٤-٨)ن.

**ڕێگای شی کردنەوەی کێشەکانی عەول:**

ئەوەیە کە ئەبێت بنچینەی کێشەکە بزانیت، واتە (مخرج) لێ‌دەرچوی بەشە میراتەکان و بەشی هەمو خاوەن بەش بۆ دانراوەکان بزانێت، پاشان ئەو بنچینەیە واز لێ بهێنی و بەشەکانیان کۆ بکەیتەوە، وە ئەنجامی کۆکردنەوەکە بکەیت بە بنچینەو میراتەکە لەسەر ئەو بنچینەیە بەش بکەیت، بەو شێوەیە بەشی هەمو خاوەن بەشێك کەمی تێ ئەکەوێ بە گوێرەی بەشەکان. ئەوەش نە ستەمە و نە لاری، ئەوەش وەك مێردو دوو خوشك، بنچینەی کێشەکە لە شەشدایە، نیوەی بۆ مێردەکە کە ئەکاتە سێ وە بۆ دوو خوشکەکە دوو سێ‌یەکی کە ئەکاتە چوار کۆی هەموی ئەکاتە حەوت، جا میراتەکە لەسەر حەوتەکەدا دابەش ئەکرێت.

**دابەش کردنەوە (الرد)**

**پێناسەکەی: (رد) لە لای زانایان مەبەست لە دابەش کردنەوەیە:**

ئەوەیە کە هەرچی مایەوە لە بەشەکانی خاوەن بەشی ڕەگەزی دابەش ئەکرێتەوە بە سەریاندا بەپێی بەشەکانیان لەکاتێکدا کەسی تر نەبێ ئەو زیادەیەی بکەوێ.

**پایەکانی:**

(رد) نایەتە جێ هەتا ئەم سێ پایەیە نەبێت:

١- بوونی خاوەن بەشە دیاری کراوەکان.

٢- مانەوەی سامان لەپاش بردنی بەشەکان لە میراتەکە.

٣- نەبونی عەصەبە.

ڕای زانایان دەربارەی (رد):

دەربارەی (رد) دەقێکی قورئانی و حەدیس نەهاتوە کە بگەڕێینەوە بۆی، لەبەر ئەوە زانایان جیاوازیان هەیە لەسەری:

هەیە ئەڵێت: زیادە ناگەڕێندرێتەوە بۆ سەر هیچ یەك لە خاوەن بەشەکان، بەڵکو ئەخرێتە خانەی دارایی‌یەوە (بیت المال) بە مەرجێك عەصەبە نەبێت[1].

هەیە ووتویەتی: دابەش ئەکرێتەوە بەسەر خاوەن بەشەکاندا، هەتا ژن و مێردیش بەپێی بەشەکانیان[1].

---

(١) ئەوانەی بۆ ئەو ڕایە چوون زەیدی کوری ثابیتە، وە عورووەو زوهری و مالیك و شافیعی‌یە شوێنی کەوتون.

وە هەیە ووتویەتی: دابەش ئەکرێتەوە بە سەر هەموو خاوەن بەشەکاندا جگە لە ژن ومێرد و باوك و باپیرە، بەوپێیە دابەش کردنەوە بە سەر ئەم هەشت جۆردا ئەبێت:

١- کچ.

٢- کچی کوڕ.

٣- خوشکی دایك و باوکی.

٤- خوشکی باوکی.

٥- دایك.

٦- نەنك.

٧- برای دایکی.

٨- خوشکی دایکی

ئەمەیە ڕای هەڵبژاردە وە مەزهەبی عومەرو عەلی و جەماوەری صەحابە و تابیعی‌یەکانە، هەروەها مەزهەبی ئەبوحەنیفە و ئەحمەدە، وە شافیعی‌یەکان و هەندێك لە هاوەڵەکانی مالیك پشتیان پێ بەستووە، لە کاتی تێك چوونی (بیت المال)دا.

ووتویانە: بۆیە دابەش ناکرێتەوە بە سەر ژن ومێرددا، چونکە دابەش کردنەوە شایستە ئەبێت بە هۆی سیلەی ڕەحمەوە خۆ ژن و مێردیش لە ڕوی هاوسەری‌یەتی‌یەوە ئەوەیان نی‌یە، هەروەها دابەش ناکرێتەوە بە سەر باوك و باپیرەدا چونکە (رد) هەتا بونی عەصەبە نەبێت دروست نابێت، وە باوك و باپیرە خۆیان عەصەبەن، کەواتە ئەوەی مایەوە بە (تعصیب) وەری ئەگرن نەك بە (رد).

**چۆنی‌یەتی ڕێکخستنی کێشەکانی (رد):**

ئەوەیە کە کاتێ لەگەڵ خاوەن بەشەکاندا کەسێك هەبێت ئەوەی کە ماوەتەوە دابەش ئەکرێتەوە بەسەریا وەك یەکێ لە ژن و مێردەکە ئەوکاتە ئەو بەشەی کە ئەیکەوێت وەری ئەگرێت لە ئەصلی میراتەکە وە ئەوەی کە ماوە دوای ئەو بەشە دەدرێتەوە خاوەن بەشەکان بەپێی سەرەکانیان، ئەگەر یەك جۆر بون جا فەرقی نیە یەکێك بێت وەك کچێك یا زۆر بن وەك سێ کچ.

وە ئەگەر چەند جۆر بون وەك دایك و کچ، ئەوە زیادەکە دابەش ئەکرێتەوە بە سەریاندا هەر بە گوێرەی بەشەکانیان.

---

(١) ئەمە مەزهەبی عوسمانە خوای لێ ڕازی بێ.

بەڵام ئەگەر لەگەڵ خاوەن بەشەکاندا یەکێ لە ژن و مێردەکە نەبوو، ئەوە زیادەکە دوای بەشەکانیان دابەش ئەکرێتەوە بەسەریاندا بەپێی ژمارەی سەرەکانیان ئەگەر یەك جۆر بوون، بەڵام ئەگەر زۆرتر بوون لە جۆرێك ئەوە زیادەکە دابەش ئەکرێتەوە بەسەریاندا بەپێی بەشەکانیان، بەوە کۆی بەشی هەر خاوەن بەشێك بەپێی ئەوەی بۆی دانراوە زیاد ئەکات، وە بە گشتی شایستەی بەشەکەی خۆی و بەشە دابەش کراوەکە ئەبێت.

## خاوەن رەحمەکان (ذوو الأرحام)

خاوەن رەحمەکان: هەموو ئەو خزمانەن کە نە خاوەنی بەشن نە عەصەبەن.

وە زانایان جیاوازیان هەیە لە میرات گرتنیاندا:

مالیك و شافیعی فەرمویانە: میرات نابەن، و ماڵەکە بۆ خانەی دارایی (بیت المال) ئەبێت ئەمەش گفتی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و زەید و زوهری و ئەوزاعی و داوودە، وە ئەبوحەنیفە و ئەحمەد بۆ ئەوە چوون کە میرات ئەبەن، ئەو بوچونەش لە عەلی و ئیبنوعەبباس و ئیبنومەسعودەوە ئەگێڕنەوە، لەکاتێکدا کە خاوەن بەش و عەصەبە نەبن، وە لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە هاتوە کە خاڵ لەگەڵ کچ دا میرات ئەبات.

رەحم دارەکان چوار دەستەن کە هەندێکیان پێش هەندێکیان ئەخرێن لە میراتدا بەپێی ئەم ریز کردنەی خوارەوە:

دەستەی یەکەم: منداڵی کچ و منداڵی کچی کوڕ هەرچەندە بەرەو خوار بن.

دەستەی دووەم: باپیرەی ناتەواو[1] (الجد غیر الصحیح) هەتا بەرز بێتەوە. وە نەنکی ناتەواو[2] هەتا بەرەو ژوور بڕوات.

دەستەی سێیەم:

منداڵی برای دایکی و منداڵەکانیان هەتا بەرەوخوار بڕۆن، وە منداڵی خوشك بە گشتی، نێر بن یا مێ، چ خوشکی دایك و باوکی بێت یا دایکی یا باوکی، هەرچەندە بەرەوخوار بن، وە کچی برای دایك و باوکی، یا باوکی، یا دایکی، وە منداڵەکانیشیان هەرچەندە بەرەو خوار بن، هەروەها کچی کوڕی برای باوکودایکی یا باوکی و منداڵی ئەوانە هەرچەندە بەرەوخوار بن.

---

(١) باپیرێکە کە لەگەڵ مردوەکەدا ژن بکەوێتە نێوانی، وەك باوکی دایکی مردو، وە باوکی باوکی دایکی مردو.

(٢) ئەو نەنکەیە کە لە گەیشتنی بە مردوەکەدا باپیرێکی بێ بەش لە نێوانیاندا بێت، وەك دایکی باوکی دایکی مردوەکە، وە دایکی دایکی باوکی دایکی مردوەکە.

دەستەی چوارەم: ئەمەش شەش کۆمەڵ ئەگرێتەوە کە هەندێکیان پێش هەندێکیان ئەخرێن لە میراتدا بەپێی ئەم ڕیزەی خوارەوە:

١- مامە دایکی‌یەکانی مردووەکە و پورەکانی (خوشکی باوك بەڵام خوشکی دایکی) و خاڵەکانی و پورەکانی (خوشکی دایك) دایك و باوکی بن یا هەر یەکێکیان.

٢- منداڵی ئەوانەی لە خاڵی‌یەکەمدا هاتوون (واتە منداڵی مامی دایکی) هەتا بەرەو خوار ببنەوە، وە کچی مامی دایکی و باوکی یا هەر باوکی، وە کچی کوڕەکانیان و بەرەوخوار، وە منداڵی ئەوانەی باس کراون هەتا بەرەو خوار بڕۆن.

٣- مامە دایکی‌یەکانی باوکی مردووەکە، وە پورەکانی (لە باوکەوە) و خاڵەکانی و پورەکانی (لە دایکەوە) دایکی و باوکی بن یا هەر یەکێکیان بن، وە مامەکانی دایکی مردووەکە و پورەکانی و خاڵەکانی و پورەکانی (لە دایکەوە) دایکی و باوکی بن یا هەر یەکێکیان بن.

٤- منداڵانی ئەوانەی باس کران لەم بڕگەی سەرەوەدا هەتا بەرەو خوار بڕۆن.

کچانی مامی باوکی مردووەکە مامەکە باوك و دایکی بێت یا هەر باوکی، وە کچی کوڕەکانیان هەتا بەرەو خوار بڕۆن، وە منداڵی ئەو مێینانەی باس کراون هەتا بەرەو خوار بڕۆن.

٥- مامەکانی باوکی باوکی مردووەکە لە دایکەوە، وە مامەکانی باوکی دایکی مردووەکە و پورەکانی هەردوکیان (خوشکی باوك) وە خاڵەکانیان و پورەکانیان (خوشکی دایك)، دایکی و باوکی بن یا هەر یەکێکیان.

مامەکانی دایکی دایکی مردووەکە و دایکی باوکی و پورەکانی هەردوکیان (خوشکی باوك)، هەروەها خاڵ و پورەکانی هەردووکیان (خوشکی دایك) دایکی و باوکی بن یا هەر یەکێکیان.

٦- منداڵی ئەوانەی لە خاڵی پێشودا باس کران هەتا بەرەو خوار بڕۆن.

وە کچی مامەکانی باوکی باوکی مردووەکە باوکی و دایکی بن یا هەر باوکی، وە کچی کوڕەکانیان هەتا بەرەو خوار بڕۆن، وە منداڵی ئەو مێینانەی باس کران هەتا بەرەو خوار بڕۆن. وە بەو شێوەیە.

## کۆرپەلەی ناو زگ (الحمل)

ئەو کۆرپەلانەن کە لە زگی دایك دان و هێشتا لەدایك نەبوون.

ئێمە لێرەدا لە ڕووی میرات و ماوەی مانەوەی لە سکی دایکدا باسی لێ ئەکەین.

**حوکمی کۆرپەلەی ناوسك لە میراتدا:**

کۆرپەلە یان لە دایك بوە یان لە زگی دایکیدا ماوە، لە هەردوو شێوەکەدا حوکمی خۆی هەیە وا لە خوارەوە باسی ئەکەین:

**کۆرپەلەی لە دایك بوو:**

ئەگەر کۆرپەلە لە دایکی جیا بۆوە، یا بە مردوویی لە دایك بووە یا بە زیندوویی، ئەگەر بە مردوویی لە دایك بوبێت، ئەوە ئەو لە دایك بوونەی یا بەبێ دەست درێژی کردنە سەر دایکی لە دایك بووە، یان بە هۆی تاوانێکەوە کە بەرامبەر دایکی کراوە لە دایك ئەبێت. جا ئەگەر هەموی بە زیندووی لە دایك بوو، ئەوە خۆشی میرات ئەگرێت و میراتیشی لیٚ ئەگیرێت بەپێی ئەو حەدیسەی لە ئەبوهورەیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إِذَا اسْتَهَلَّ الْمَوْلُودُ وُرِّثَ)[1]. واتە: ئەگەر کۆرپەلە دەنگی لێوە هات میرات ئەگرێت.

واتە: ئەگەر گیانی تێدا بوو، وە نیشانەی گیان تێدا بوونی دەنگ یا هەناسە یا پژمین وئەو جۆرە شتانەیە.

ئەمەش ڕای (ثوري) و ئەوزاعی وشافیعی وهاوەڵەکانی ئەبوحەنیفەیە.

بەڵام ئەگەر لە دایکی جیا بووەوە بە مردوویی بێ ئەوەی تاوان بەرامبەر دایکی کرابێت، ئەوە نە میراتی لیٚ ئەگیرێت و نە میرات ئەگرێت بە ئیجماعی زانایان. بەڵام ئەگەر لە دایك بوو بوو بە مردوویی بە هۆی تاوانێکەوە کە بەرامبەر دایکی کرابوو، ئەوە لەم شێوەیەدا میرات ئەگرێت ومیراتیشی لیٚ ئەگیرێت لای حەنەفی یەکان.

شافیعی یەکان و حەنبەلی یەکان و مالیکی یەکان ووتویانە: میرات ناگرێت، بەڵام غوررەی (خوێن بایی) هەیە، وە لەوە زیاتر میراتی لیٚ ناگیریٚ وە ئەوانەی میراتگرنی بە میرات ئەیبەن.

لەیسی کوڕی سەعد ورەبیعەی کوڕی عبدالرحمن بۆ ئەوە چوون کە کۆرپەلە ئەگەر لە دایکی بووەوە بە مردوویی بە هۆی تاوانێکەوە کە بەرامبەر دایکی کرابێت نە میرات ئەبات و نە میراتی لیٚ ئەگیرێت.

وە تەنها دایکی غوررەی بۆ ئەبێت وتایبەتیشە بە خۆیەوە چونکە تاوان بەرامبەر بە شتێك لە خۆی کراوە کە ئەویش کورپەلەکەیە. وە هەرکاتێك تاوان تەنیا بەرامبەر ئەو بکرێت جەزاکەش تەنیا بۆ خۆی ئەبێت.

---

(١) أبوداود (٢٩٢٠).

**کۆرپەلەی ناو سکی دایك:**

١- ئەو منداڵەی لە سکی دایکیدایە هیچ لە میراتەکەی بۆ دانانرێت ئەگەر میرات گر نە بوو یا بە میرات گری تر بێ بەش دەبو بە هەمو بارێك.

کەواتە ئەگەر کەسێك مرد ژنێك وباوکی ودایکی بە سك پڕی لە پیاوێکی تر جگە لە باوکی بەجێ هێشت. ئەوە ئەو کۆرپەلەیە میرات نابات، چونکە لەوە بەدەر نیە کە لە کاتی لە دایك بوونیدا یا برای دایکی‌یە یا خوشکی دایکی، وە برای دایکی‌یەکان لەگەڵ ئەصلی میرات گردا میرات نابەن کە لێرەدا باوکەکەیە.

٢- هەموو میراتەکە ڕائەگیرێت هەتا منداڵەکە لە دایك ئەبێت ئەگەر میرات گر بوو، وە میرات گریشی لەگەڵدا نەبوە لە ئەصلدا یا میراتگری بە لەگەڵدا بو بەڵام بە منداڵەکە بێ بەش ئەبو، بە ڕێك کەوتنی زانایان.

هەروەها میراتەکە ڕائەگیرێت ئەگەر میراتگری وای لەگەڵدا هەبوو کە بەو بێ‌بەش نەدەبون، وە هەمویان ڕازی بوون بە دابەش نەکردنی بەوەی کە قسەیان نەکرد یا داوای بەش کردنیان نەکرد.

٣- هەر میرات گرێك کە بەشەکەی پەیوەندی بە منداڵەکەوە نەبێت و بەهۆی ئەوەوە نەگۆڕێت، بەشی خۆی بە تەواوی وەرئەگرێ و ئەوەی مایەوە ڕائەگیرێت هەتا منداڵەکە ئەبێت، وەك ئەوە مردووەکە نەنك وژنێکی دووگیانی بە جێ هێشت، شەش یەکی میراتەکە ئەدرێت بە نەنکەکە، چونکە بەشەکەی ناگۆڕێت ئەو کۆرپەلەیە کوڕ بێت یا کچ.

٤- ئەو میرات گرەی لە یەکێ لە دو حاڵەتی حەملەکەدا بێ بەش ئەبێت و لەوەی تریاندا بێ بەش نابێت هیچی نادرێتێ، چونکە لە ڕەوابونی ئەو بەشەدا کە دەیدرێتێ گومان هەیە.

جا هەرکەسێك مرد وژنێکی دووگیان وبرایەکی بە جێ هێشت هیچ نادرێت بە براکەی، چونکە لە وانەیە منداڵەکە کوڕ بێت. ئەمەش مەزهەبی جومهورە.

٥- هەرکەس لە خاوەن بەشەکان بەشەکەی گۆڕا بە گۆڕانی نێرینەیی منداڵەکە یا مێینەیی، ئەوە کەمترین بەشی ئەدرێتێ و زۆرترین بەش ڕائەگیرێ بۆ لەدایك بونی منداڵەکە. جا ئەگەر منداڵەکە بە زیندویی لە دایك بوو، وە شایستەی بەشە زۆرەکە بوو ئەوە ئەیبات، وە ئەگەر شایستەی بەشێکی کەمتر بوو مانی بەشەکەی لێ لا ئەبرێت و ماوەکەی دابەش ئەکرێتەوە بە سەر میرات گرەکانی تردا، وە ئەگەر بە مردویی بوو ئەوە مانی هیچی نیەو میراتەکە هەموی بەسەر میرات گرەکاندا دابەش ئەکرێت بێ ئەوەی گوێ بدرێتە سکەکە.

**لای کەم وزۆری ماوەی سك پڕی:**

لای کەمی ئەو ماوەیەی کە کۆرپەلەی تێدا دروست ئەبێت و بە زیندوویی لە دایك ئەبێ شەش مانگە، بەپێی فەرموودەی خوای گەورە: ﴿وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا﴾ (الأحقاف/١٥) واتە: ماوەی دووگیانی ولە شیر بڕینەوەکەی سی مانگە.

لەگەڵ ئەوەدا کە ئەفەرموێت: ﴿وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ﴾ (لقمان/١٤) واتە: لە شیر بڕینەوەی لە دوو ساڵدایە.

جا ئەگەر لە شیر بڕینەوەی دوو ساڵ بێت کە (٢٤مانگە) شەش مانگی زیاتر نامێنێتەوە بۆ ماوەی سکەکە.

وە جومهوری زانایان بۆ ئەوە چوون.

کەمالی کوڕی هەمام کە یەکێکە لە پێشەوا حەنەفی‌یەکان ووتویەتی: عادەتی بەردەوام ئەوەیە کە ماوەی سك پڕی لە شەش مانگ زۆرترە، چونکە لەوانەیە بە چەند ساڵێك جارێك نەبیسرێ کە منداڵێك بە شەش مانگی لە دایك بووە.

لە گفتی هەندێ لە زانایانی حەنبەلی‌یەکاندا هاتووە: لای کەمی ماوەی سك پڕی نۆ مانگە.

زانایان وەك چۆن جیاوازی‌یان هەیە لە لای کەمی ماوەی سك پڕی بەو شێوەیەش جیاوازیان هەیە لە لای زۆریدا.

هەیانە ئەڵێت: لای زۆری دوو ساڵە (ئەمە ڕای حەنەفی‌یەکانە).

هەیانە ئەڵێت: نۆ مانگە، وە هەیە ئەڵێت: ساڵێکی هیلالی‌یە کە(٣٥٤) ڕۆژە.

**بزر بوو (مفقود)**

بزر بوو: ئەگەر کەسێك دیار نەما وهەواڵی بڕا وشوێنی نەزانرا ونەزانرا زیندووە یا مردووە؟ و دادگا حوکمی مردنی دا بەو کەسە ئەوترێت بزر بوو.

حوکمی قازی: یا بەپێی بەڵگەیە وەك شایەتی ڕاستگۆ، یا بەپێی چەند نیشانەیەك ئەبێت کە ناگونجێن بێن بە بەڵگە، ئەمەش بە تێپەڕ بوونی ماوە ئەبێت.

لە حاڵەتی یەکەمدا مردنەکەی سەلمێندراوو سابتە لەو کاتەوە کە بەڵگە پەیدا بووە لەسەر مردنی.

لە حاڵەتی دووەمدا کە قازی حوکمی تێدا ئەدا بە مردنی گومبوەکە بەپێی ئەو ماوەیەی کە بەسەریدا تێپەڕیوە، مردنەکەی حوکمی‌یە، چونکە لەوانەیە هەر زیندوو بێت.

**ئەو ماوەیەی کە لە دوای ئەوە حوکمی مردنی وون بوو ئەدرێت:**

زانایان جیاوازیان هەیە لەو ماوەیەی کە دوای ئەوە حوکمی مردنی وون بوەکە ئەدرێت.

لە مالیکەوە ئەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: چوار ساڵە، چونکە عومەر ﷺ فەرمویەتی: هەر ژنێك مێردەکەی بزر بوو نەیزانی لە کوێیە؟ ئەبێ چوار ساڵ چاوەڕوانی بکات. پاشان چوارمانگ ودە ڕۆژ عیددە بکێشێ، دوای ئەوە بۆی هەیە شوو بکات. بوخاری و شافیعی تەخریجیان کردوە.

وە ئەوەی بەناوبانگە لە ئەبوحەنیفەو شافیعی ومالیکەوە ئەوەیە کە ماوە تەقدیر نەکرێت، بەڵکو ئەدرێتە دەست ئیجتیهادی قازی لە هەموو سەردەمێکدا.

خاوەنی (مغني) ووتویەتی: لە یەکێ لە ڕیوایەتەکاندا دەربارەی ئەو بزربوەی کە گومانی مردنەکەی زاڵ نی‌یە: نە ماڵەکەی دابەش ئەکرێت ونە ژنەکەی ئەدرێ بە شوو هەتا دڵنیا نەبن لە مردنی، یا ماوەیەکی ئەوەندە درێژ بەسەریا تێ بپەڕێت کە ئەو وون بوە لە ماوەیەکی تاوادا ناژی، ئەوەش ئەگێڕرێتەوە بۆ ئیجتیهادی قازی. ئەمەش گفتی شافیعی و موحەممەدی کوڕی حەسەنە، وە لە مالیك و ئەبوحەنیفە و ئەبویوسفیشە وە بەناوبانگە.

چونکە ئەصل زیندویی‌یەتی وون بوە، وە ماوە داناندرێ هەتا لەسەری ڕانەگیرێت، وە لێرەدا ڕاگرتن نی‌یە کەواتە وەستان پێویستە.

ئیمامی ئەحمەد ڕای وایە ئەگەر لە دیار نەبونەکەدا گومانی مردنی زۆرتر زاڵ بوو لە زیندویی، ئەوە دوای گەڕانێکی وورد بە دوایدا حوکم بە مردنی ئەدرێت بە تێ پەڕ بوونی چوار ساڵ چونکە لایەنی مردنی زاڵە. ئەوەش لەوە ئەچێ کە ماوەیەکی وا تێ پەڕی بێ‌و لە ماوەی ئاوهادا ناژی.

وە ئەگەر لە دیار نەبونەکەیدا سەلامەتی زاڵتر بوو تێیدا، کارەکەی ئەدرێتە دەست قازی کە ئەو حوکمی مردنی بدات دوای ئەو ماوەیەی کە خۆی ڕای وایە تێیدا مردووە وە دوای گەڕان بە دوایدا بە هەمو ئەو هۆیانەی کە بیگەیەنێت بە ڕاستی ئەوەی کە زیندوە یان مردوە.

**میراتی بزر بوو:**

میراتی بزر بوو دوو کاری پێوە بەستراوە، چونکە بزر بو یا خۆی میرات گرە یا میراتی لێ ئەگیرێ، جا لە حاڵەتێکدا ئەگەر میراتی لێ ئەگیرا، ئەوە ماڵەکەی لە موڵکی خۆی دا ئەمێنێتەوەو لەنێوان میرات گرەکانی دا دابەش ناکرێت هەتا مردنی بە تەواوی دەرئەکەوێت یا قازی حوکم ئەدات بە مردنی. جا ئەگەر زیندوو بوو ئەوە ماڵەکەی وەرئەگیرێتەوە، وە ئەگەر مردنی بە تەواوی

دەرکەوت یا حاکم حوکمی دا بە مردنی، ئەوە میراتەکەی ئەدرێ بەوکەسانەی کاتی دەرکەوتنی مردنەکەی میرات گری بوون، یا ئەوکاتەی قازی حوکمی مردنی دەرکردوە، وە نادرێ بەو کەسەی پێش ئەوکاتە مردوە، یا میرات گرتنەکەی دوای ئەوە هاتۆتە بە ئەمانی ڕێگرێك کە هەی بووە وەك موسڵمان بوونی میراتگرێکی.

ئەمە ئەگەر حوکم دان بە مردنەکەی ئەدرابێتە پاڵ کاتێکی پێش ئەوەی کە حاکم بڕیارەکەی دەر کردبێت، ئەگینا ئەوانە میراتی لێ ئەگرن کە لەکاتی حوکم دانەکەدا میراتگر بوون.

بەڵام لە حاڵەتی دوەمدا: ئەگەر خۆی میرات گری کەسێکی تر بوو، ئەوە بەشەکەی بۆ ڕائەگیرێت، وە دوای حوکم دان بە مردنی ئەوبەشەی دابەش ئەکرێتەوە بە سەر میرات گرەکانیدا.

## نێرە مووك (الخُنثي)

**پێناسەکەی:**

نێرەمووك ئەو کەسەیە کە نازانرێت نێرە یا مێیە؟ لەبەر ئەوەی یا ئەندامی نێرینە و مێینەی هەیە بە یەکەوە یا لەبەر ئەوەی هەر هیچیانی نییە لە ئەصلدا.

**چۆن میرات ئەگرێت؟:**

ئەگەر دەرکەوت نێرینە بوو ئەوە میراتی نێر ئەگرێت، وە ئەگەر دەرکەوت مێیە میراتی مێینە وەرئەگرێت.

وە نێری و مێیی بە دەرکەوتنی نیشانەکانی هەر یەکەیان ڕون دەبێتەوە کە پێش باڵغ بوون بە میز کردندا ئەزانرێت، جا ئەگەر بە ئەندامی تایبەتی بە نێرەوە میزی کرد ئەوە نێرە، وەئەگەر بەو ئەندامەی تایبەتە بە مێ وە میزی کرد ئەوە مێیە، وە ئەگەر لە هەر دووکیانەوە میزی کرد لە کامیانەوە لە پێشەوە کردی ئەوەیانە.

وە دوای باڵغ بوون ئەگەر ڕیشی لێ ڕوا یا توانی بچێتە پاڵ ئافرەت یا ئیحتیلام ببێت وەك پیاو ئەوە نێرە، بەڵام ئەگەر مەمکی لێ ڕوا وەك مەمکی ژن یا شیری لێ هات یا بێ نوێژ بوو یا دووگیان بوو ئەوە مێیە، وە لەم دوو شێوەیەدا بەو نێرەمووکە ئەوترێ نێرەموکی (غیر مشکل).

بەڵام ئەگەر نەزانرا ئایا نێرە یا مێ؟ بەوەی کە نیشانەیەك لە نیشانەکانی دەرنەکەوێت یا دەرکەوێت و ڕێك نەکەوێت، ئەوە نێرەمووکی (مشکل)ە.

وە زانایان لە حوکمی ئەم جۆرەدا جیاوازیان هەیە لە ڕووی میراتەوە.

ئەبوحەنیفە فەرمویەتی: وا فەرز ئەکرێت کە نێرە، پاشان وا فەرز ئەکرێت کە مێیە، وە بە خراپترینیان مامەڵەی لەگەڵ ئەکرێت، هەتا ئەگەر بە ئیعتیبارێك میرات بگرێت و بە ئیعتیبارێك میرات نەگرێت ئەوە ئیعتیباری میرات نەگرتنی بۆ ئەکرێت و هیچی نادرێتێ، وە ئەگەر لەسەر هەردو فەرزەکە میراتی گرت و بەشەکەی جیاوازی هەبوو، کەمترین بەشی ئەدرێتێ.

مالیك و ئەبویوسف وشیعەی ئیمامی فەرمویانە: ناوەندی (متوسط) بەشی نێرو مێ وەرئەگیرێت.

شافیعی ووتویەتی: میرات گر ونێرە مووك مامەڵەی کەمترین بەشیان بۆ ئەکرێت چونکە بۆ ماوەکە بۆ هەموویانە.

ئەحمەد ووتویەتی: ئەگەر بە هیوای دەرکەوتنی حاڵی بوون، ئەوە هەم نێرەموکەکەو هەم میرات گرەکان مامەڵەی کەمترین بەشیان بۆ ئەکرێت و پاش ماوەکە ڕائەگیرێت، بەڵام ئەگەر بە هیوای ئەوە نەبوون حاڵی دەربکەوێت، ناوەندی بەشی نێر ومێ وەرئەگرێت. وە ئەم ڕایەی دوایی تەرجیح دراوە، بەڵام یاسای میصر ڕای ئەبوحەنیفەی وەرگرتووە.

## میراتی (مرتد) هەڵگەڕاوە لە ئایین

هەڵگەڕاوە لە ئایین نە میراتی کەس ئەگرێت و نە کەسیش میراتی لێ ئەگرێت، بەڵکو ئەوەی بەجێی ئەهێڵێت بۆ (بیت المال)ی موسڵمانان ئەبێت، ئەمەش ڕای شافیعی و مالیك و ڕای بەناوبانگە لە ئەحمەدەوە.

حەنەفیەکان ووتویانە: ئەوەی پێش هەڵگەڕانەوە پەیدای کردووە خزمە موسڵمانەکانی بە میرات ئەیبەن، وە ئەوەی دوای هەڵگەڕانەوەی پەیدای کردووە بۆ خانەی دارایی ئەبێت کە لە پێشەوە لە بەشی (حدود)دا بە درێژی باسی لێ کراوە.

## منداڵی زیناو منداڵی نەفرین لێ کراو (ابن الزنا وابن الملاعنة)

منداڵی زینا ئەوەیە کە بە بێ زەواجی شەرعی لە دایك بوبێت، وە منداڵی نەفرین لێکراو ئەوەیە کە مێرد ئەڵێت لە من نییە.

منداڵی زیناو منداڵی نەفرین لێکراو میراتگر نین لەنێوان خۆیان و باوکیاندا بە ئیجماعی هەموو موسڵمانان، لەبەر نەبونی نەسەب و نەژادی شەرعی. بەڵکو لەگەڵ دایکیاندا میراتی یەکتر ئەگرن.

لە ئیبنوعومەرەوە هاتوە کە پیاوێك لیعانی کرد لە ژنەکەی لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ وە خۆی بەری کرد لە منداڵەکەی. پێغەمبەریش ﷺ لە یەکی جیا کردنەوە ومنداڵەکەی دا بە ژنەکە. بوخاری وئەبوداود گێڕاویانەتەوە.

وە لەفزەکەی ئەبوداوود بەم شێوەیە: پێغەمبەر ﷺ میراتی منداڵی مولاعنەی دانا بۆ دایکی و بۆ میرات گرەکانی دوای دایکی[1].

## دەر چوون لە بەش (تخارج)

**پێناسەکەی:**

ئەوەیە کە میرات گرەکان لەنێوان خۆیاندا رێك ئەکەون لەسەر دەرچوونی هەندێکیان لە مافی خۆی لە میراتەکە بەرامبەر شتێکی دیاری کراو لە میراتەکە یا لە شتێکی تر، وە دەرچوون لە بەش لەنێوان دوو میرات گردا ئەبێت بەوەی‌یەکێکیان بچێتە جێی ئەوی تریان لە بەشەکەیدا بەرامبەر مەبلەغێك پارە کە پێش کەشی بکات.

**حوکمەکەی:**

دەرچون لە بەش دروستە ئەگەر بە ڕەزامەندی بێت، چونکە (عبدالرحمن)ی کوڕی عەوف ژنەکەی تەڵاق دا کە ناوی تەماضوری کچی ئەصبەغی کەلبی بوو لە کاتی سەرەمەرگدا، پاشان لەکاتێکدا ژنەکە لە عیددەدا بوو (عبدالرحمن) مرد، عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ کردیە میراتگر لەگەڵ سێ ژنەکەی تریدا، پاشان ڕێك کەوتن لەگەڵیا کە لەبری چواریەکی بەشەکەی هەشتاو سێ هەزاری بدەنێ ـ وە ووتراوە: دینار بووە، وە ووتراوە: درهەم بووە.

**٦، ٧، ٨- وەرگرتنی میرات بە بێ ماف**

ئەگەر کەسێك مردو هیچ میراتگری نەبوو، سێ کەسی تر مافی وەرگرتنی میراتەکەیان هەیە بەپێی ئەم ڕێکخستنەی خوارەوە:

١- کەسێك کە مردوەکە بڕیاری لەسەر دابێت بە نەسەبی خۆی لەگەڵیدا.

٢- کەسێك کە مردوەکە وەسیتی بۆ کردبێت، بەوەی کە لە سێ‌یەکی زیاتر بدرێتێ.

٣- خانەی دارایی، (بیت المال).

وا لە خوارەوە باسی هەر یەکەیان ئەکرێت:

---

(١) أبوداود (٢٩٠٧).

**١- بڕیار لەسەر دراو لەلایەن مردووەکەوە بە نەسەب:**

ئەگەر مردووەکە دانی نا بە نەسەبی لەگەڵ کەسێکی تردا، ئەوە ئەو کەسە مافی میراتەکەی هەیە ئەگەر نەسەبی نەزانرابوو وە لە کەسێکەوە نەسەبی نەچەسپابێت و مردووەکەش لە ژیاندا پەشیمان نەبووبێتەوە لە دان پێدا نانەکەیدا، وە مەرجە لەم حاڵەتەدا بڕیار بۆدراوەکە لە کاتی مردنی بڕیاردەرەکەدا زیندوو بێت، یا کاتی حوکمەکەی کە بە مردوو دانرابێت، وە هیچ ڕێگرێك لە ڕێگرەکانی میراتی تێدا نەبێت.

لە (المذكرة الإيضاحية) دا هاتووە:

بڕیاربۆدراو میراتگر نیە، چونکە میرات گرتن بەپێی چەسپاندنی نەسەب ئەبێت ئەویش نەسەبی نەچەسپاوە تەنها بە بڕیار دان نەبێت، بەڵام زانایانی ئیسلام لە هەندێ شێوەدا حوکمی میراتگریان بۆ داناوە وەك پێش خستنی بە سەر ئەوەدا کە وەسێتی بۆ کراوە لە سێ یەك زیاتر، وە وەك دانانی بە جێگری مردووەکە لە ساماندا، ئەگەر مردووەکە شتێکی عەیبداری کڕیبێت ئەم بۆی هەیە بیداتەوە بە فرۆشیار، وە وەك مەنع کردنی لە میراتەکە بە هەر ڕێگرێك لە ڕێگرەکانی میرات، لەبەر ئەوە وایان بە بەرژەوەندی داناوە کە مافی هەبێت لەو بە جێ ماوەدا بێ ئەوەی میراتگر بێت.

**٢- ئەو کەسەی وەسێتی بۆ ئەکرێت کە لە سێ یەك زیاتر بیات.**

ئەگەر کەسێك مردو میرات گری نەبوو وە دانیشی نەنابو بە نەسەب و خزمایەتی لەگەڵ کەسێکی تردا، دروستە وەسێت بکات بۆ بێگانە بە هەموو میراتەکە یا بە هەندێکی، چونکە بەستنەوەی وەسیەت بە سێ یەکەوە لەبەر میرات گرەکانە، ئەمیش هیچ میرات گری نیە.

**٣- خانەی دارایی (بيت المال)**

ئەگەر کەسێك مردو میراتگری بەجێ نەهێشت وە دانیشی نەنابو بە نەسەب و خزمایەتی لەگەڵ کەسێکی تردا، وە وەسێتی بۆ کەس نەکردبوو بە سێ یەك زیاتر، ئەو کاتە ماڵەکەی ئەخرێتە خانەی دارایی موسوڵمانان بۆ ئەوەی لە بەرژەوەندی گشتی موسوڵماناندا سەرف بکرێت.

(وصلى الله على محمد وعلى آله وصحبه وسلم).

له خوای گەورە داوا ئەکەم بەم کارەم سود بە موسڵمانان بگەیەنێت و خالیس لەبەر ڕەزامەندی ئەو بێت.

وە داوا لە خوای گەورە ئەکەین کە باشترین پاداشتی دانەرەکەی بداتەوە، وە بەشێکیش لە ئەجرو پاداش بۆ ئێمە دابنێ، بەڕاستی هەر ئەو بەخشندەو بەڕێزە

والحمد لله رب العالمين وصلى الله على نبينا محمد

# فێرست